# ئافرەتان لە چیرۆکە قورئانییەکاندا

ئامادەکردنی

عبدالجبار قەرەداغی

چاپی یەکەم

١٤٣٢ك - ٢٠١١م

# ئافرەتان
# لە چیرۆکە قورئانییەکاندا

ئامادەکردنی

عبدالجبار قەرەداغی

چاپی یەکەم

١٤٣٢ ك    ٢٠١١ م

بسم الله الرحمن الرحيم

## ناسنامەی کتێب

- ناوی کتێب: ئافرەتان لە چیرۆکە قورئانییەکاندا
- نووسەر: عبدالجبار قەرەداغی
- تایپ: بەرهەم حەمە ئەمین ـ هیوا عەلی ـ رێبین حەسەن ـ سەرهەنگ ئەحمەد
- نەخشەسازی بەرگ: مەریوان مارف
- نۆبەتی چاپ: چاپی یەکەم / ٢٠١١
- چاپخانە: سیما – سلێمانی
- تیراژ: ١٠٠٠دانە

لە بەڕێوەبەرایەتی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارە(١٩٠١ ) ی ساڵی (٢٠١١ )ی پێ دراوە



ژ. موبایل : ٠٧٧٠١٩٢٨٧٤٨ - ٠٧٥٠١٦٢٧٨٥٥

بسم الله الرحمن الرحيم

**پێشەکی:**

إنَّ الحَمد للهِ نحمده ونستعِنهُ ونعوذ بالله مِن شرورِ أنفسنا ومِن سيئاتِ أعمالِنا من يهدِ الله فلا مُضِلَ لهُ ومن يُضلِلْ فلا هاديَ له. وأشهَدُ أن لا إلهَ إلا الله وَحْدَهُ لا شريكَ لهُ، وأشهدُ أنَّ محمداً عبدهُ ورسوله،صلواتُ الله وسلامُهُ عليه وعلى آلِه وصَحْبِه.

أما بَعدُ:

**سوپاس و ستایش بۆ خودای گەورە و بەدیهێنەری بونەوەر و مرۆڤەکان وگشت دروستکراوان. درود و سلاو و سەلام بۆ سەرگیانی پێغەمبەری مرۆڤایەتی (محمد) پێغەمبەر ﷺ وبۆ سەرگیانی یارو یاوەرانی تا رۆژی قیامەت.**

**لەم پێشەکییەدا دەمەوێت بڵێم: خوایە گیان هەمووکارو فەرمانێکی گەورە و مەزن و جوان و تەواو هەر شیاوی خۆتە و هەرچی خۆت بتەوێت هەر ئەوە دەبێت و هەرچی تۆنەتەوێت نابێت، خوایە گیان تۆ هەر خۆت زانا وشارەزایت و هەر خۆت ئەزانیت چی بۆ بەندەکانت چاکە و خەیرو سوودی تیایە بۆیان، خوایە گیان هیچ شتێك لەتۆ وون وشاراوەنابێت، با زۆر وورد و بچوکیش بێت، لە ئاسمانەکان ولەزەویدا هەرچی هەیە هەمووی موڵکی خۆتە و تۆخاوەنی هەموویت.**

**بێگومان ئەم بونەوەرە فراوان و بێ ئەندازەیە خوای گەورە بەدیهێناوە و هەموو دروستکراوەکانیش هەر خۆی فەراهەمی هێناون بەرێزترینی دروستکراوەکانیش ئینسانە، دەمانەوێت ئەم دیارییە لە(چیرۆکی ئافرەتانی ناوقورئانی پیرۆز)پێشکەش بەخوێنەرانی کورد زمانی خۆشەویست و ئیسلام پەروەر بکەین، و تکا کارین خوای گەورە و خاوەن سۆز و میهرەبانی بەبەشێك لەکردەوەی چاك و وەرگیراو لای خۆی بۆمان تۆمار بکات. خوایە گیاب هەر بەڵێن و ویستی خۆت بەجێ دەگات، ئەم کارەمان لێ وەرگریت وبیکەیتە توێشووی چاکەکانمان ویارمەتیدەر و کۆمەکیکارمان بیت بۆکاری لەم جۆرە و بەرەکەت برژێ بەسەر ئێمە وگشت خوێنەرانی ئەم کتێبەدا.**

**(ئافرەتان لە چیرۆکەقورئانییەکاندا) بەشێك لە چیرۆك و باسەکانی ناو قورئان پێك دەهێنێت کە لە یەکەم ئافرەتەوە دەست پێدەکات کەدایکە(حەوا)یە و هاوسەری باوکە (ئادەم)ە کە باوکی هەموو مرۆڤایەتییە. باسی ئافرەتان گرنگی وبایەخێکی زۆر گەورە و**

**گرنگی هەیە لەناو کایەکانی ژیاندا، خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا سوورەتێکی بەناوی (النساءُ) ئافرەتان و سوورەتێکی بە ناوی (مريم) ناو ناوە و لە زۆرێك لە سوورەتەکانی تردا ناوو باسی ئافرەتان هاتووە. لەبەر گرنگی و بایەخی زۆری ئەم باسانەحەزمان کرد،ئەم کتێبە لەسەر چیرۆك و باسی ئافرەتانی ناو قورئان ئامادەبکەین و کۆمەڵێك خوێندنەوە و وانەی گرنگ وتایبەت بەئافرەتانی تیا کۆبکەینەوە، تاوەکو سود و ڕونکردنەوەی زیاتر بگەیەنین بەخوێنەران. لەم ئامادەکردنەماندا پشتمان بە باشترین و ڕاستترین ئەو سەرچاوە و کتێبانە بەستووە کە لەم بوارەدا هەن، تابتوانین باشترین زانیاری و ڕاستی بەخوێنەرانی خۆشەویست بگەیەنین. خوێنەرانی بەڕێز و خۆشەویست... ئەو کەسەی کە هەڵە ناکات و کارەکانی بێ کەم وکورتییە، ئەوە تەنها خوای گەورەیە، ئێمەی بەندەی خوا دەکەوینە ناو هەڵەوە و هەڵە لە ئێمە دەوەشێتەوە لە نوسین و قسە و گوتار و کار و ئاڕاستەماندا، تۆی خوێنەری بەڕێز، ئەگەر هەر ڕاستی و تەواوی و چاکە و جوانییەکت بەرچاو وگوێ کەوت ئەوە لە خوای گەورەوەیە و ئێمە تەنها گەیاندنمان لەسەر بووە، ئەگەر هەڵە و ناتەواوی و کەم و کورتیت بەرچاو و گوێ کەوت ئەوە لە ئێمەوە بووە و داواکارین لە خوا لەو هەڵەو کەم وکورتیانەمان ببورێت و داخوازین تۆی بەڕێزیش ئاگادارمان بکەیت. پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ لە فەرمودەیەکدا دەفەرمووێت: هەموو نەوەکانی ئادەم هەڵە دەکەن، باشترین کەس ئەو کەسەیە کە داوای پەشیمان بوونەوە و لێخۆشبوون لەخوای گەورە دەکات.**

**عبدالجبار قرداغی**

**٨-ربيع الثاني-١٤٣٢**

**١٣-٣-٢٠١١**

**سلێمانی-دلێران**

## پێشەکییەك دەربارەی (القصص القرآني) چیرۆکە قورئانییەکان

**یەکەم: پێناسەی (القصص القرآني) چیرۆکە قورئانیەکان.**

القَصص: کۆی (القِصة)یە، بریتیە لە:هەواڵ یان ڕوداو.

(تقصص الخبر) واتە شوێنی کەوت، (اقتصصت الحديث) واتە: وەك خۆی، لەسەر شێوەی خۆی گێڕامەوە(القص) واتە: (البيان) ڕونکردنەوە و دەرخستن. (القاص) واتە:ئەو کەسەیە چیرۆکێك دێنیّ وەك خۆی دەیگێڕێتەوە، وەك شوێن مانا و وشەکانی کەوتبێت.

(قصَّ الأثر) بەشوێنیدا چوو، یان بەشوێنیدا گەڕایەوە.

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿فَارْتَدَّا عَلَى آثَارِهِمَا قَصَصًا﴾(الكهف:٦٤)

واتە: موساو کوڕەکەی هاوڕێی بەو ڕێگایەدا گەڕانەوە کەپێیدا ڕۆیشتبون و شوێن پێکانی خۆیانیان هەڵگرتەوە.[١]

*(القرآن):لەزمانەوانیدا (مصدر) ی (قرأ)یە، واتە خوێندیەوە لەسەر (وزن)ی (فُعلان)ە وەك (غُفران)،پاشان ئەم (مصدر)ە کراوە بەناوی وتە و کەلامی خوا، کەبۆسەر محمد پێغەمبەر ﷺ دابەزیوە، خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿إِنَّ عَلَيْنَا جَمْعَهُ وَقُرْآنَهُ-١٧- فَإِذَا قَرَأْنَاهُ فَاتَّبِعْ قُرْآنَهُ﴾ (القيامة:١٧-١٨) واتە: شوێن خوێندنەوەکەی بکەون.

*وتراوە: (قرآن)، (وصف)ێکی داڕێژراوە لە (القرْء) واتە: (الجمع) کۆکراوە، بەوە ناو نراوە، چونکە سوورەتەکانی قورئانی کۆ کردۆتەوە، یان چیرۆك و (مثَل) نمونە جوانەکان و پەند و حیکمەت و (الأمر) فەرمان و(النواهي)نەهیەکان و(الحكم) حوکم وبڕیارەکان، ئامۆژگاری و بەڵێن و هەڕەشەکان و شتانی تریش کۆدەکاتەوە، خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿وَنَزَّلْنَا عَلَيْكَ الْكِتَابَ تِبْيَانًا لِكُلِّ شَيْءٍ وَهُدًى وَرَحْمَةً وَبُشْرَى لِلْمُسْلِمِينَ﴾(النحل:٨٩). بەڵام بۆچونی دوەمیان لاوازە.

---

[١]- لسان العرب، مادة (ق ص ص)

(القرآن) لە زاراوەدا واتە: (کلام) وتەی خوای گەورە، کە بۆ سەر پێغەمبەری بەڕێز محمد ﷺ دابەزیوە و (موجود)ە لەنێوان دوتوێی (مصحف)ێکی نوسراودا کە بەڕێگای (تواتر) گێڕانەوەی ڕاست و دروست و تەواو بە ئێمە گەیشتووە، هەموو کەس بە خوێندنەوەکەی بەندایەتی ئەنجامداوە و بچوکترین و کورترین سوورەتی تەحەدی دەکات[٢].

*(القصص القرآني)بریتییە لە: هەواڵی خوای گەورەیە لە کتێبە پیرۆزو بەڕێزەکەیدا، دەربارەی حاڵی نەتەوە ڕابردو و پێشینەکان و پێغەمبەرانی پێشوو ڕوداو و ڕاستییەکان[٣].

بەپێی ئەو پێناسەیە (القصص القرآني) چیرۆکە قورئانیەکان، ئەمانەی لای خوارەوە دەگرێتەوە:

●(قصص الأنبياء) ژیاننامە و چیرۆکی پێغەمبەران کە مەنهەج و بەرنامەی ئەوان دەگرێتەوە لە بانگەواز کردن بۆ لای خوای گەورە و موعجیزەکانیان، کە خوای گەورە پشتگیری ئەوانی پێکردووە، و هەڵس و کەوتیان، و هەڵوێستی لەخوا یاخیبوان بەرامبەر ئەوان و پاداشتی باوەڕداران و پاشە ڕۆژی یاخی بوان و درۆزنان و گومڕایان.

●چیرۆکە قورئانییەکان، پەیوەندیدارە بەو ڕوداوانەی کە تێپەڕیون و ئەو کەسانەش لە پێغەمبەران نەبوون، وەك چیرۆکەکانی (قابيل و هابيل و أصحاب الكهف و أصحاب الجنتين و ذوالقرنين، و اصحاب السبت و اصحاب الأخدود و أصحاب الفيل).

●چیرۆکەکان پەیوەندی دارن بەو ڕوداوانەی کە لەسەردەمی پێغەمبەردا ﷺ بوون. وەك (الأسراء والمعراج، و الهجرة، و جەنگی بەدر و ئوحود و الأحزاب، و خێزانەکانی پێغەمبەر لە زينب ی کچی جحش، و ڕووداوی (الإفك) و جەنگی (حونين و تبوك) و چیرۆکی (المجادلة) و شتانی تریش[٤].

---

[٢]- مباحث في علوم القرآن / د.صبحي الصالح

[٣]- مباحث في علوم القرآن / مناع خليل القطان

[٤]- مباحث في علوم القرآن / مناع خليل القطان

## مەبەستەکانی چیرۆکە قورئانییەکان

**قورئانی پیرۆز کتێبی ڕێنمایی و هیدایەتدانە بۆ هەموو بەشەر، لە هەموو بوارە جیا جیاکانی ژیاندا، خوای گەورە فەرمویەتی:** ﴿وَنَزَّلْنَا عَلَيْكَ الْكِتَابَ تِبْيَانًا لِّكُلِّ شَيْءٍ وَهُدًى وَرَحْمَةً وَبُشْرَىٰ لِلْمُسْلِمِينَ﴾(النحل:٨٩).

**هەروەها فەرمویەتی:** ﴿إِنَّ هَٰذَا الْقُرْآنَ يَهْدِي لِلَّتِي هِيَ أَقْوَمُ وَيُبَشِّرُ الْمُؤْمِنِينَ الَّذِينَ يَعْمَلُونَ الصَّالِحَاتِ أَنَّ لَهُمْ أَجْرًا كَبِيرًا﴾ (الإسرا:٩).

**چیرۆکە قورئانیەکان مەبەستی بەرزو و بالاَ و حیکمەت و سودی گرنگیان تێدایە، کە هاوڕێك و گونجاون لەگەڵ مەبەستە گشتییەکانی قورئانی پیرۆزدا. کە بریتییە لە هیدایەتدانی بەشەر بۆ شتێك کە حاڵیان چاك بکات، ئیتر زوو بێت یان درەنگ، لە دنیا و لە گەڕانەوەیان.**

**خوای گەورە فەرمویەتی:** ﴿لَقَدْ كَانَ فِي قَصَصِهِمْ عِبْرَةٌ لِّأُولِي الْأَلْبَابِ ۗ مَا كَانَ حَدِيثًا يُفْتَرَىٰ وَلَٰكِن تَصْدِيقَ الَّذِي بَيْنَ يَدَيْهِ وَتَفْصِيلَ كُلِّ شَيْءٍ وَهُدًى وَرَحْمَةً لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ﴾ (یوسف:١١١).

**هەروەها فەرموویەتی:** ﴿وَكُلًّا نَّقُصُّ عَلَيْكَ مِنْ أَنبَاءِ الرُّسُلِ مَا نُثَبِّتُ بِهِ فُؤَادَكَ ۚ وَجَاءَكَ فِي هَٰذِهِ الْحَقُّ وَمَوْعِظَةٌ وَذِكْرَىٰ لِلْمُؤْمِنِينَ﴾ (هود:١٢٠).

**●چیرۆکە قورئانیەکان: ئامۆژگاری و پەندوو ڕێنمایی و ڕەحمەت و بەزەیی و ڕونکردنەو و بەدیارخستن[°]، و دامەزراوی بۆ دڵەکان و پاك کردنەوەی دەرونەکان و بەرزی و بڵندی ڕۆحەکانی تیایە.**

**●چیرۆکە قورئانیەکان بریتیە لە: بەڵگەی ڕونکەرەوە و نیشانەی یەکلاکەرەوە، کە شایەتی دەدات لەسەر ڕاستی پێغەمبەری خوا ﷺ لەو پەیامەدا کە نێردراوە. هەر چیرۆکێکی قورئانی، بە بەڵگەیەکی ڕون دەژمێرێت لەسەر پێغەمبەرێتی محمد ﷺ.**

---

°- حوى القصص القرآني في طياته موضوعات عديدة في العقيدة وفي الشريعة و الأخلاق والتأريخ والحضارات.

**خوای گەورە لە سوورەتی (آل عمران)دا لەباسی (مریم)دا (علیها السلام) فەرمویەتی:** ﴿ذَلِكَ مِنْ أَنبَاء الْغَيْبِ نُوحِيهِ إِلَيكَ وَمَا كُنتَ لَدَيْهِمْ إِذْ يُلْقُون أَقْلاَمَهُمْ أَيُّهُمْ يَكْفُلُ مَرْيَمَ وَمَا كُنتَ لَدَيْهِمْ إِذْ يَخْتَصِمُونَ﴾ (آل عمران:٤٤)، **ئەم چیرۆکە بە هەرچی ڕوداو و پەند و ڕونکردنەوە کە تیایەتی، پێغەمبەر ﷺ نەیزانیوە، تەنها لەڕێگەی وەحی خواییەوە زانیویەتی.**

**خوای گەورە لە سوورەتی (هود)دا دوای باسکردنی چیرۆکی (نوح) (علیه السلام) فەرمووی:** ﴿تِلْكَ مِنْ أَنبَاء الْغَيْبِ نُوحِيهَا إِلَيْكَ مَا كُنتَ تَعْلَمُهَا أَنتَ وَلاَ قَوْمُكَ مِن قَبْلِ هَذَا فَاصْبِرْ إِنَّ الْعَاقِبَةَ لِلْمُتَّقِينَ﴾(هود:٤٩).

**لە سوورەتی(یوسف)دا، دەفەرموێت:** ﴿ذَلِكَ مِنْ أَنبَاء الْغَيْبِ نُوحِيهِ إِلَيْكَ وَمَا كُنتَ لَدَيْهِمْ إِذْ أَجْمَعُواْ أَمْرَهُمْ وَهُمْ يَمْكُرُونَ* وَمَا أَكْثَرُ النَّاسِ وَلَوْ حَرَصْتَ بِمُؤْمِنِينَ﴾ (یوسف:١٠٢-١٠٣).

**●چیرۆکە قورئانیەکان ڕویەکن لە ڕوەکانی ئیعجازی قورئان، بە بەڵگەیەکی ڕون لێك دەدرێتەوە لەسەر ڕاستی پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەو پەیامەی کە لە لایەن پەروەردگارییەوە هێناویەتی.**

**●لە ئامانجەکانی چیرۆکە قورئانیەکان بریتییە لە دان نان بە عەقیدە و بیرو باوەڕی ئیسلامی و یەك خواناسیدا، کە بریتییە لە بیرو باوەڕی سەرجەم پێغەمبەران (علیهم السلام) هەر لە ئادەم (علیه السلام) تا کۆتا پێغەمبەر کە (محمد)ە ﷺ، خوای گەورە فەرمویەتی:** ﴿ وَإِذْ أَخَذَ اللّهُ مِيثَاقَ النَّبِيِّيْنَ لَمَا آتَيْتُكُم مِّن كِتَابٍ وَحِكْمَةٍ ثُمَّ جَاءكُمْ رَسُولٌ مُّصَدِّقٌ لِّمَا مَعَكُمْ لَتُؤْمِنُنَّ بِهِ وَلَتَنصُرُنَّهُ قَالَ أَأَقْرَرْتُمْ وَأَخَذْتُمْ عَلَى ذَلِكُمْ إِصْرِي قَالُواْ أَقْرَرْنَا قَالَ فَاشْهَدُواْ وَأَنَاْ مَعَكُم مِّنَ الشَّاهِدِينَ(٨١) فَمَن تَوَلَّى بَعْدَ ذَلِكَ فَأُوْلَـئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ(٨٢) أَفَغَيْرَ دِينِ اللّهِ يَبْغُونَ وَلَهُ أَسْلَمَ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ طَوْعاً وَكَرْهاً وَإِلَيْهِ يُرْجَعُونَ(٨٣) قُلْ آمَنَّا بِاللّهِ وَمَا أُنزِلَ عَلَيْنَا وَمَا أُنزِلَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَاقَ وَيَعْقُوبَ وَالأَسْبَاطِ وَمَا أُوتِيَ مُوسَى وَعِيسَى وَالنَّبِيُّونَ مِن رَّبِّهِمْ لاَ نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِّنْهُمْ وَنَحْنُ لَهُ مُسْلِمُونَ﴾ (آل عمران٨١- ٨٤).

**خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا فەرمویەتی:** ﴿وَإِذْ أَخَذْنَا مِنَ النَّبِيِّينَ مِيثَاقَهُمْ وَمِنكَ وَمِن نُّوحٍ وَإِبْرَاهِيمَ وَمُوسَى وَعِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ وَأَخَذْنَا مِنْهُم مِّيثَاقاً غَلِيظاً﴾(الأحزاب:٧).

●دین یەکە و، پەیامەکانیشی یەکن، و سەرچاوەکەشی یەك شتە، و دەروازەکەیشی یەکە، و زنجیرەکەشی ئەڵقە ئەڵقە بە یەکەوە بەندە و پەیوەندیدارە، لە ئادەمەوە تا دەگاتە خۆشەویستمان محمد ﷺ.

●چیرۆکە قورئانییەکان دڵی پێغەمبەر محمد ﷺ جێگیر و دامەزراو دەکات، دڵدانەوە و دڵ نەوایی و توێشوە بۆ بانگەوازەکەی: ﴿وَكُلًّا نَّقُصُّ عَلَيْكَ مِنْ أَنبَاءِ الرُّسُلِ مَا نُثَبِّتُ بِهِ فُؤَادَكَ وَجَاءَكَ فِي هَذِهِ الْحَقُّ وَمَوْعِظَةٌ وَذِكْرَى لِلْمُؤْمِنِينَ﴾(هود: ١٢٠).

●زۆرێك لە تاقی کردنەوە و ناڕەحەتی ڕویانکردە پێغەمبەر ﷺ، و زۆرێك بەربەستی بۆدانرا و ڕوبەڕوی بونەوەو ئازاری توش هات، و زۆرێك گاڵتە جاڕی بە کارەکەی کرا و چەوسێنرایەوە، زۆرێك هۆکاری دونیایی خرایە بەردەم تا سەری لێ تێکبدەن، خوای گەورە بۆی ڕونکردەوە، کە ئەوەی توشی ئەو هاتووە توشی پێغەمبەرانی پێش تۆیش هاتووە، و ئارامگر و خۆڕاگروو دامەزراو بوون، تا خوای گەورە ڕزگاری کردن و سەری خستن بەسەر کافراندا، ڕێگای بانگەوازی خوایی بەدڕك و داڵ چنراوە، و بەربەست و تاقی کردنەوە و ناڕەحەتی تیایە.

خوای گەورە لە سوورەتی (البقرة)دا، دەفەرموێت: ﴿أَمْ حَسِبْتُمْ أَن تَدْخُلُوا الْجَنَّةَ وَلَمَّا يَأْتِكُم مَّثَلُ الَّذِينَ خَلَوْا مِن قَبْلِكُم مَّسَّتْهُمُ الْبَأْسَاءُ وَالضَّرَّاءُ وَزُلْزِلُوا حَتَّى يَقُولَ الرَّسُولُ وَالَّذِينَ آمَنُوا مَعَهُ مَتَى نَصْرُ اللَّهِ أَلَا إِنَّ نَصْرَ اللَّهِ قَرِيبٌ﴾(البقرة: ٢١٤).

لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدِ اسْتُهْزِئَ بِرُسُلٍ مِّن قَبْلِكَ فَحَاقَ بِالَّذِينَ سَخِرُوا مِنْهُم مَّا كَانُوا بِهِ يَسْتَهْزِئُونَ﴾(الأنعام: ١٠).

●چیرۆکە قورئانییەکان داننانە بە بڕیارە شەرعیەکان، و هەرچەندە لە هەنێك لە لقەکانیشدا جیاواز بن، ئەوەش بە هۆی تێڕوانین لە جیاوازی زمان و بارو دۆخ و ژینگەکان، خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿وَكَتَبْنَا عَلَيْهِمْ فِيهَا أَنَّ النَّفْسَ بِالنَّفْسِ وَالْعَيْنَ بِالْعَيْنِ وَالْأَنفَ بِالْأَنفِ وَالْأُذُنَ بِالْأُذُنِ وَالسِّنَّ بِالسِّنِّ وَالْجُرُوحَ قِصَاصٌ فَمَن تَصَدَّقَ بِهِ فَهُوَ كَفَّارَةٌ لَّهُ وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ(٤٥)وَقَفَّيْنَا عَلَى آثَارِهِم بِعِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ التَّوْرَاةِ وَآتَيْنَاهُ الْإِنجِيلَ فِيهِ هُدًى وَنُورٌ وَمُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ التَّوْرَاةِ وَهُدًى وَمَوْعِظَةً لِّلْمُتَّقِينَ(٤٦)وَلْيَحْكُمْ أَهْلُ

الإنجيل بِمَا أَنزَلَ اللّهُ فِيهِ وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَا أَنزَلَ اللّهُ فَأُوْلَـئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ(٤٧)وَأَنزَلْنَا إِلَيْكَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ مُصَدِّقاً لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ الْكِتَابِ وَمُهَيْمِناً عَلَيْهِ فَاحْكُم بَيْنَهُم بِمَا أَنزَلَ اللّهُ وَلاَ تَتَّبِعْ أَهْوَاءهُمْ عَمَّا جَاءكَ مِنَ الْحَقِّ لِكُلٍّ جَعَلْنَا مِنكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهَاجاً وَلَوْ شَاء اللّهُ لَجَعَلَكُمْ أُمَّةً وَاحِدَةً وَلَـكِن لِّيَبْلُوَكُمْ فِي مَا آتَاكُم فَاسْتَبِقُوا الخَيْرَاتِ إِلَى اللّه مَرْجِعُكُمْ جَمِيعاً فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ(٤٨)وَأَنِ احْكُم بَيْنَهُم بِمَآ أَنزَلَ اللّهُ وَلاَ تَتَّبِعْ أَهْوَاءهُمْ وَاحْذَرْهُمْ أَن يَفْتِنُوكَ عَن بَعْضِ مَا أَنزَلَ اللّهُ إِلَيْكَ فَإِن تَوَلَّوْاْ فَاعْلَمْ أَنَّمَا يُرِيدُ اللّهُ أَن يُصِيبَهُم بِبَعْضِ ذُنُوبِهِمْ وَإِنَّ كَثِيراً مِّنَ النَّاسِ لَفَاسِقُونَ(٤٩)أَفَحُكْمَ الْجَاهِلِيَّةِ يَبْغُونَ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ اللّهِ حُكْماً لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ﴾(المائدة:٤٥-٥٠).

**●لە چیرۆکە قورئانییەکاندا دوژمنایەتی ئیبلیسی بە نەفرەت کراو بۆ هەموو مرۆڤایەتی ڕونکراوەتەوە، و باسی ڕەگ و ڕیشەی ئەو دوژمنایەتییە و درێژ بونەوەی کراوە، و باسی ترسانکی و پیلانەکانی بە درێژایی چاخەکان کراوە، خوای گەورە فەرمویەتی:** ﴿يَا بَنِي آدَمَ لاَ يَفْتِنَنَّكُمُ الشَّيْطَانُ كَمَا أَخْرَجَ أَبَوَيْكُم مِّنَ الْجَنَّةِ يَنزِعُ عَنْهُمَا لِبَاسَهُمَا لِيُرِيَهُمَا سَوْءَاتِهِمَا إِنَّهُ يَرَاكُمْ هُوَ وَقَبِيلُهُ مِنْ حَيْثُ لاَ تَرَوْنَهُمْ إِنَّا جَعَلْنَا الشَّيَاطِينَ أَوْلِيَاء لِلَّذِينَ لاَ يُؤْمِنُونَ﴾(الأعراف:٢٧).

**قورئان دوژمنایەتی شەیتان و هۆکار و پیلانەکانیمان لە تێکدان و سەر لێشێواندنی بەشەرەکاندا بۆ دەردەخات.**

**●هەروەها لە مەبەستەکانی چیرۆکە قورئانییەکان: هەڕەشەی تیایە بۆ خاوەن کتێبەکان بە بەڵگە و ڕونکردنەوەی جوان و ئاڕاستە کردنیان، بەوەی کە لە ناو ئەو تەحریف و گۆڕین و شاردنەوەی ڕاستیانەدایە، هەروەها ڕونکردنەوەی قسەی جیاکەرەوە لەو شتانەدا کە ئەوان جیاوازیان تیایدایە، و وەڵام دانەوەی پرسیارەکانیان و بەتاڵ کردنەوەی ئەو لێکدانەوە و گومانانەی کە دروستی دەکەن و بەڵگەکان دادەپۆشن و درۆ هەڵدەبەستن.**

**خوای گەورە فەرمویەتی:** ﴿كُلُّ الطَّعَامِ كَانَ حِلاًّ لِّبَنِي إِسْرَائِيلَ إِلاَّ مَا حَرَّمَ إِسْرَائِيلُ عَلَى نَفْسِهِ مِن قَبْلِ أَن تُنَزَّلَ التَّوْرَاةُ قُلْ فَأْتُواْ بِالتَّوْرَاةِ فَاتْلُوهَا إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ﴾(آل عمران:٩٣).

**هەروەها خوای گەورە لە سوورەتی (النمل)دا فەرمویەتی:** ﴿إِنَّ هَذَا الْقُرْآنَ يَقُصُّ عَلَى بَنِي إِسْرَائِيلَ أَكْثَرَ الَّذِي هُمْ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ﴾(النمل:٧٦).

**●هەروەها لە مەبەستەکانی چیرۆکە قورئانییەکان: ڕونکردنەوەی نازو نیعمەتەکانی خوای گەورە لەسەر نەوەی ئیسرائیل لەگەڵ پێغەمبەرانیاندا و خراپی سروشت و بەدی هەڵس و کەوت و ئەخلاقیان، تا ئێمە بە ئاگا و وریابین بەرامبەریان، و هەتا ئەوانیش بەئاگا بن کە ئەوەیان توش دێت کە توش پێشینەکانیان هاتووە کە تێپەڕ بوون.**

**خوای گەورە فەرمویەتی:** ﴿يَا بَنِي إِسْرَائِيلَ اذْكُرُوا نِعْمَتِيَ الَّتِي أَنْعَمْتُ عَلَيْكُمْ وَأَوْفُوا بِعَهْدِي أُوفِ بِعَهْدِكُمْ وَإِيَّايَ فَارْهَبُونِ(٤٠)وَآمِنُوا بِمَا أَنْزَلْتُ مُصَدِّقًا لِمَا مَعَكُمْ وَلَا تَكُونُوا أَوَّلَ كَافِرٍ بِهِ وَلَا تَشْتَرُوا بِآيَاتِي ثَمَنًا قَلِيلًا وَإِيَّايَ فَاتَّقُونِ(٤١) وَلَا تَلْبِسُوا الْحَقَّ بِالْبَاطِلِ وَتَكْتُمُوا الْحَقَّ وَأَنْتُمْ تَعْلَمُونَ﴾(البقرة:٤٠-٤٢).

**●هەروەها چیرۆکە قورئانییەکان هۆکارێکە لە هۆکارەکانی بانگەوازکردن بۆلای خوای گەورە وبەرنامەی پێغەمبەران (علیهم السلام) لە بانگەوازی خودا، هەروەها حاڵی ئەوکەسانەش دەزانین کەبانگەواز کراون و پاداشتی باوەڕداران و پاشەڕۆژی بێ بڕوایانیشمان بۆ دەردەکەوێت، ئەو بانگەوازە توێشو و ڕوناکی ڕێگایە بۆ باوەڕداران.**

**زانای پایەبەرز (محمد الغزالي)دەڵێت: چیرۆك لە دیارترین شێوازە قورئانییەکانە بۆ ڕونکردنەوەی ئیسلام و دەرخستنی پەیامەکەی و تێکەڵ کردنی بابەتەکانی بەدڵ و دەرونەکان، و چیرۆکە قورئانییەکان بریتیە لە مێژوی بانگەواز لەژیاندا و چۆن ڕێگا و ڕێڕەوی خۆی گرتووە لە بەرەبەیانی مێژووەوە لەناو خەڵکیدا؟**[٦].

[٦]- (نظرات في القرآن الكريم)

## لە نیشانە و تایبەتمەندی چیرۆکە قورئانییەکان

ئامانجی ڕون و بەرز و بالاّ، ڕاستی ڕوداو، هێنانی هەندێك چیرۆك لەزیاتر لە سوورەتێکدا.

١-ئامانجی ڕون و بەرز و بالاّ:

چیرۆکە قورئانیەکان ئامانجی ڕون و بەرزو بالاّیان هەیە، و مەبەستی بەرزو بڵندیان تیایە، بریتین لە شێوە و دیمەنێکی زیندوو ڕاستی و ئامۆژگاری و پەندوو وانەی گرنگ و بەسود، و بەڵگەی ڕون لەسەر ڕاستی پێغەمبەر ﷺ لەو پەیمانەدا کەپێی هاتووە.

●بەشێوەی گشتی، چیرۆکە قورئانیەکان بریتین لە هیدایەت و ڕونکردنەوە بەدیارخستن وپەندوو ئامۆژگاری وەرگرتن.

●چیرۆکە قورئانییەکان لە نێوان بەرزی ئامانجەکان و بەرزی و بڵندی شێوازەکان و جوانی و وردەکاریاندا کۆ کراونەتەوە.

٢-ڕاستی ڕوداو:

چیرۆکە قورئانیەکان، وێنە کێشانێکی زیندوو لێکدانەوەیەکی وردە دەربارەی ئەو ڕوداوانەی کە ڕویان داوە، ئەو ڕوداوانەیش پڕن لە وانە و پەندوو ئامۆژگاری، کە ئێمە وەرمانگرتوەو پاراستومانن، هەتا سەردەمی ئەمڕۆ، کە لەڕاستیدا ڕویانداوە و پەندو وانەکانیشیان ڕاستە.

٣-هێنانی هەندێك لە چیرۆکەکان لە زیاتر بە سوورەتێکدا:

ئەمیش نیشانەو تایبەتمەندیەکی دیارە و شێوازێکی تایبەتیشە لە چیرۆکە قورئانیەکان، لەمەیشدا ئەوە هەیە کە بەڵگە دەدات لەسەر بەلاغەتی داڕشتنی شێوازی قورئان وموعجیزەکانی.

پێشەوا (الباقلاني)دەڵێت: (هێنانی باسی چیرۆکێك بە ووشەو دەربڕینی جیاواز لە کارێکی قورس و گراندا یەك ماناو مەبەست دەبەخشێت کە ڕەوانبێژی و دەربڕینی جوانی تیادا دەردەکەوێت و ڕوون دەبێتەوە، هێنانی زۆرێك لە چیرۆکەکان لە چەند شوێنێکی جیاوازدا بە ڕێکخستنی جیاجیا، بەوە ئاگادار کراون کە ئەوان بێدەسەلاّت و بێ توانان لەوەی کە نمونەی بهێنن).

●(الزركشي) دەڵێت: حیکمەت لە هێنانی هەندێك لە چیرۆکە قورئانیەکان لەزیاتر لە سوورەتێکدا، چەند ڕویەکی هەیە، هەندێکیان باس دەکەین:

*هێنانی هەندێك لە چیرۆکە قورئانیەکان زیاتر لە سوورەتێکدا، هیچ عەیب و ناتەواویەکی لە دەربڕین و ووشەسازیدا نەکردوە، و هیچ گرفتێکیش ڕوینەداوە، بەڵکو بەوکارە دەربڕینی دروستکراوەکان ڕون کراوەتەوە.

*ئەو مانایەی کە چیرۆکێکی تەواوی لەسەر کۆدەبێتەوە، دابەش بووە بەسەر چەند شوێنیکدا، هەر جارەی بە جۆرێك دوبارە بووەتەوە –لەو لێکدانەوە جوانەیدا– کەسی ڕەوانبێژ هەمیشە حەزی وایە کە گوێی لێبگرێت، لەوەدا کە جوان داڕێژراوە، کەسەکان حەزدەکەن بەو گێڕانەوەیە لەشتە تازەکاندا هەریەکەیان بەشی خۆیان لەزەت وەرگرن تیایدا.

*هەروەها دەرکەوتنی کارو فەرمانی سەیر لە دەرهێنان و وێنەیەکی ڕونکەرەوە لە داڕشتندا بەیەك مانا، هاوەڵ دانەران لەسەردەمی پێغەمبەردا ﷺ سەریان سوڕدەما لە فراوانی کاری دووبارە بونەوە لەچیرۆکەکاندا، لەگەڵ گۆڕانی شێوازی داڕشتن و ڕونکردنەوەو پێکهاتەکیدا، خوای گەورە بۆی ڕونکردنەوەکە ئەوکارەی ئەوان سەریان لێی دەسوڕمێت هیچ توانایەك ناتوانێت پێی بگات و لە کۆتاییەکەی شارەزا بێت ووتە و دەربڕینی خوای گەورە بێ سنورە و ژمارەی نییە.

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿قُل لَّوْ كَانَ الْبَحْرُ مِدَادًا لِّكَلِمَاتِ رَبِّي لَنَفِدَ الْبَحْرُ قَبْلَ أَن تَنفَدَ كَلِمَاتُ رَبِّي وَلَوْ جِئْنَا بِمِثْلِهِ مَدَدًا﴾(الكهف:١٠٩).

لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿وَلَوْ أَنَّمَا فِي الْأَرْضِ مِن شَجَرَةٍ أَقْلَامٌ وَالْبَحْرُ يَمُدُّهُ مِن بَعْدِهِ سَبْعَةُ أَبْحُرٍ مَّا نَفِدَتْ كَلِمَاتُ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾[٧] (لقمان:٢٧).

[٧] –(البرهان في علوم القرآن للزكشي)

# چیرۆکی سەرەتای دروستکردن

**خوای گەورە دەفەرمووێت:** ﴿هُوَ الَّذِي خَلَقَ لَكُم مَّا فِي الْأَرْضِ جَمِيعًا ثُمَّ اسْتَوَىٰ إِلَى السَّمَاءِ فَسَوَّاهُنَّ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ وَهُوَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ﴾(البقرە/٢٩).

**واتە: (هەر ئەو زاتە (خوای گەورە) هەموو شتێکی لە زەویدا بۆ ئێوە دروستکردووە، پاشان ویستی ئاسمان دروست بکات بۆیە بە حەوت چین بەدیهێنا و ڕێکی خستن، هەر خۆیشی بە هەموو شتێك زانا وئاگادارە). خوای گەورە دەفەرمووێت:** ﴿الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَجَعَلَ الظُّلُمَاتِ وَالنُّورَ ثُمَّ الَّذِينَ كَفَرُوا بِرَبِّهِمْ يَعْدِلُونَ﴾(الأنعام/١)

**واتە: (سوپاس وستایش بۆ ئەو خوایەی کە ئاسمانەکان و زەوی دروست کردووە، تاریکی و ڕووناکی فەراهەم هێناوە (کەچی لەگەڵ ئەو هەموو بەڵگە بەهێز و سەرسام و ناوازانەدا) پاشان ئەوانەی بێ باوەڕبوون بە پەروەردگاریان یەکێك لە دروستکراوانی خوا دەکەنە هاوتای خوا) هەروەها دەفەرمووێت:** ﴿أَوَلَمْ يَرَ الَّذِينَ كَفَرُوا أَنَّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ كَانَتَا رَتْقًا فَفَتَقْنَاهُمَا وَجَعَلْنَا مِنَ الْمَاءِ كُلَّ شَيْءٍ حَيٍّ أَفَلَا يُؤْمِنُونَ﴾(الأنبیاء/٣٠).

**واتە: (ئایا ئەوانەی بێ باوەڕبوون نەیان بینیوە و بۆیان ڕوون نەبۆتەوە بەڕاستی ئاسمانەکان و زەوی یەك پارچە بوون لەوەو دوا لێکمان جیاکردنەوە (کە ئەمە ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە ئەم ڕاستەقینە زانستییە لەلایەن ئەوانەوە پەی پێ دەبرێت) لەئاویش هەموو شتێکی زیندوومان فەراهەم هێناوە (ئاو زۆربەی پێکهاتەی لەشی ئادەمیزاد و زیندەوەران وڕووەك پێك دەهێنێت) ئایا ئەوانە هەر باوەڕ ناهێنن (بەو ڕاستیانە و بەو دەستەڵاتە بێ سنورەی ئێمە؟).**

**خوای گەورە دەفەرمووێت:** ﴿وَجَعَلْنَا السَّمَاءَ سَقْفًا مَّحْفُوظًا﴾(الأنبیاء/٣٢).

**واتە: (ئێمە ئاسمانمان کردووە بە سەقفێکی پارێزراو).**

**هەروەها دەفەرمووێت:** ﴿خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ﴾(الفرقان/٥٩).

**واتە: (خوای گەورە ئاسمانەکان و زەوی و هەرچی وا لە نێوانیاندایە لەماوەی شەش ڕۆژدا دروستی کردووە).**

لە شوێنێکی تردا دەفەرمووێت: ﴿قُلْ أَئِنَّكُمْ لَتَكْفُرُونَ بِالَّذِي خَلَقَ الْأَرْضَ فِي يَوْمَيْنِ وَتَجْعَلُونَ لَهُ أَندَادًا ذَٰلِكَ رَبُّ الْعَالَمِينَ (٩) وَجَعَلَ فِيهَا رَوَاسِيَ مِن فَوْقِهَا وَبَارَكَ فِيهَا وَقَدَّرَ فِيهَا أَقْوَاتَهَا فِي أَرْبَعَةِ أَيَّامٍ سَوَاءً لِّلسَّائِلِينَ (١٠) ثُمَّ اسْتَوَىٰ إِلَى السَّمَاءِ وَهِيَ دُخَانٌ فَقَالَ لَهَا وَلِلْأَرْضِ ائْتِيَا طَوْعًا أَوْ كَرْهًا قَالَتَا أَتَيْنَا طَائِعِينَ (١١) فَقَضَاهُنَّ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ فِي يَوْمَيْنِ وَأَوْحَىٰ فِي كُلِّ سَمَاءٍ أَمْرَهَا وَزَيَّنَّا السَّمَاءَ الدُّنْيَا بِمَصَابِيحَ وَحِفْظًا ذَٰلِكَ تَقْدِيرُ الْعَزِيزِ الْعَلِيمِ (١٢)﴾(فصلت/٩-١٢).

واتە: (ئەی پێغەمبەر ﷺ پێیان بڵێ: باشە، ئاخر ئێوە باوەڕتان بەو زاتە نییە کە زەوی لە دوو ڕۆژدا دروستکردووە؟ ئەڵبەتە ئەو ڕۆژانە مەگەر خوا خۆی بزانێت درێژی ماوەکەیان چەندە؟) چەند هاوەڵێکیشی بۆ بڕیار دەدەن؟ ئەو بەدیهێنەر و دروستکارە، پەروەردگاری هەر هەموو جیهانیان و بوونەوەرە. لەسەر ڕوکاری زەوی کێوەکانی دامەزراندووە(کە کاردەکەنە سەر ئاوو هەوا، دیمەنی جوان دەسازێنن، لەنگەری دەگرن، ڕووبەری فراوانتردەکەن،...هتد) بەرەکەتی زۆری تێدا داپین کردووە(وەك نەوت وجۆرەها کانزا، سەرەڕای جیهانی ڕووەك و...هتد) هەموو ڕزق و ڕۆزییەکی تێدا بڕیار داوە هەمووی لەماوەی چوار ڕۆژدا بە دوو ڕۆژەکەی پێشوشەوە(قەبارە و ڕەنگ وتام و بۆن و وەرز و وشوێنی هەر میوەو دەغڵ ودانێك، هەروەها گیانداران و باڵندەکانیش) تا نیاز و داخوازییەکانی ئادەمیزاد جێ بەجێ بکات. ئینجا ویستی ئاسمان ڕێك بخات و دروستی بکات لە کاتێکدا کە دووکەڵ بوو، جا بە ئاسمان و زەوی فەرموو: فەرمانبەردار و ملکەچ بن بەخۆشی خۆتان یان بە زۆر بتانخەمە ژێر دەسەڵاتی خۆمەوە؟! هەردوولا خێرا وتیان: ملکەچی تۆین و چۆن دەفەرموویت وادەکەین (بێگومان کارێکی ئاسانە بۆ خوای بالادەست، زەوی وئاسمان بێنێتە قسە، چونکە ئادەمیزاد جۆرەها ئامێری هێناوەتە قسە، دەم و زمان و لێویشیان نییە!). لە ماوەی دووڕۆژدا (لەو ڕۆژانەی کە هەر خۆی ماوەیان دەزانێت) ئاسمانی کردە حەوت چین، فەرمانی بۆ هەر چینێکیش دەرکرد، ئینجا دەفەرمووێت: ئاسمانی دونیاشمان ڕازاندەوە بە ئەستێرە و کردمانە چراخان و کردمانە هۆی پاراستن (لەشەڕی شەیتانەکان) ئا ئەو شتانە هەموو بە ویست وفەرمانی زاتێکە کە بالادەست وزانایە). لە شوێنێکی تردا دەفەرمووێت: ﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَا السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ وَمَا مَسَّنَا مِن لُّغُوبٍ﴾(ق/٣٨).

واتە: (بەڕاستی ئێمە ئاسمانەکان و زەوی و هەرچی لە نێوانیاندا هەیە بە شەش ڕۆژ دروستمان کردوون، هیچ ماندویەتیەکیش ڕووی تێ نەکردووین).

لە شوێنێکی تردا دەفەرمووێت: ﴿أَلَمْ نَجْعَلِ الْأَرْضَ مِهَادًا (٦) وَالْجِبَالَ أَوْتَادًا﴾(النبأ/٦-٧).

واتە: (ئایا زەویمان وەك لانکە بۆ فەراهەم نەهێناون؟ ئایا کێوەکانمان وەك مێخ بۆ دانەکوتاون؟ (تا زەوی بپارێزێت لە فشاری بورکان ومادده تواوەکانی ناو ناخی، هەروەها تا لەنگەری ڕابگرێت و چەندەها سوودی ترتان پێ بگەیەنین؟).

هەروەها دەفەرمووێت: ﴿وَبَنَيْنَا فَوْقَكُمْ سَبْعًا شِدَادًا (١٢) وَجَعَلْنَا سِرَاجًا وَهَّاجًا﴾(النبأ/١٢-١٣).

واتە: (ئایا حەوت چین ئاسمانی بە هێز و پتەومان بە ڕاسەرتانەوە دروست نەکردووە؟ چرایەکی پرشنگدارمان بۆ فەراهەم نەهێناون؟) (کە مەبەست خۆرە).

هەروەها دەفەرمووێت: ﴿أَأَنتُمْ أَشَدُّ خَلْقًا أَمِ السَّمَاءُ بَنَاهَا (٢٧) رَفَعَ سَمْكَهَا فَسَوَّاهَا (٢٨) وَأَغْطَشَ لَيْلَهَا وَأَخْرَجَ ضُحَاهَا (٢٩) وَالْأَرْضَ بَعْدَ ذَٰلِكَ دَحَاهَا (٣٠) أَخْرَجَ مِنْهَا مَاءَهَا وَمَرْعَاهَا (٣١) وَالْجِبَالَ أَرْسَاهَا (٣٢) مَتَاعًا لَّكُمْ وَلِأَنْعَامِكُمْ﴾(النازعات/٢٧-٣٣).

واتە: (باشە ئاخر زیندوو کردنەوەی ئێوە سەختتر و گرانترە، یان بەدیهێنانی ئەم ئاسمانە، کە هەر خۆی بەرپای کردووە(کە پڕەلە ئەستێرە و هەسارەی گەورەی هەمەجۆر)، بە بەرزییەوە ڕای گرتووە و بەوپەڕی ڕێك و پێکی بەدی هێناوە (بەڕاسەرتانەوە)، شەوگارەکەی تاریك کردووە، کاتی چێشتەنگاویش ڕووناك خۆری دەرخستووە، دواتر زەویشی بە شێوەیەکی هێلکەیی بەدیهێناوە، ئاوی لێ دەرهێناوە و لەوەڕگای بۆ مالآت فەراهەم هێناوە، کێوەکانیشی بە تۆکمەیی دامەزراندووە، (هەمووئەمانەی دروستکردووە) تا ببێتەهۆی ئەوەی کە خۆتان و مالآتەکانیشتان سوودی لێ وەربگرن.). (خوای گەورە هەر بووە پێش ئەوەی هیچ شتێك بووبێت، عەرشی خوای گەورە لەپێشدا لەسەر ئاو بووە، هەر خۆی ئەمەی لە قورئاندا باس فەرموو، وئاسمانەکان وزەوی دروستکردووە).[8]

هەروەها پێغەمبەر ﷺ بە جوانی ڕوونی کردۆتەوە و فەرموویەتی: لە پێش دروستکراوەکاندا، هەموو شتێك بۆشایی بووە، نە هەوا بووە، نە زەوی نە ئاسمان نە شەو نە ڕۆژ نە تاریکی نە ڕووناکی، بێجگە لە خوای گەورە (الرحمن) هیچ شتێك نەبووە،

---

[8]- رواه البخاري في(بدأالخلق)برقم(٣١٩٠)

تاك و تەنها بووە و کەسی لەگەڵدا نەبووە، خوای گەورە لەسەر عەرشی خۆی ئیستوای کردووە، ئینجا خوای گەورە ویستی دروستکراوەکان بەدی بهێنێت و ئاسمانەکان و زەوی بۆ یەکەم جار دروست بکات و دابهێنێت، خوای گەورە هەرچی بوێت دروستی دەکات و ئەنجامی دەدات، فەرمانی ئەو زاتە لە نێوان کاف ونون دایە: ﴿إِنَّمَا أَمْرُهُ إِذَا أَرَادَ شَيْئًا أَنْ يَقُولَ لَهُ كُنْ فَيَكُونُ﴾(یس: ٨٢). ئینجا خوای گەورە ئاسمانەکان و زەوی دروستکرد، پێش ئەمانەیش، عەرش و قەڵەمی دروستکردووە، نەخشەی هەموو کار و فەرمانێکی داڕشتووە و کێشاوە و ئەندازەگیری بۆ کردووە و هەرچی لەم بوونەوەرە فراوانەدا بووە هەر خۆی هێناویەتییە بوون. (خوای میهرەبان بەسەر (عرش)تەختی فەرمان ڕەوایەتی خۆیەوە وەستاوە، یەکەم شت کە دروستی کرد بریتی بوو لەقەڵەم، پاشان پێی فەرموو: بنوسە، ئینجا قەڵەم دەستی کرد بە نوسینی ئەو شتانەی کە دەبن تا ڕۆژی قیامەت (بەویستی خوا).[9]

لە (عبدألله)ی کوڕی (عمر)ی کوڕی (عاص)ەوە (خوا لێیان ڕازی بێت) دەڵێت: (بیستومە لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەی فەرموو: خوای گەورە پەنجا هەزار ساڵ پێش ئەوەی ئاسمانەکان و زەوی دروست بکات هەموو کار و باری درووستکراوەکانی نوسیووە) فەرمووی: (هەروەها عەرشی پەروەردگار لەسەر ئاو بووە).[10] پاشان خوای گەورە تاریکی و ڕوناکی دروستکردووە، پاشان نێوانیانی جیاکردۆتەوە، ئینجا تاریکی کردە شەوی تاریك و نەبینراو و ڕوناکی کردە ڕۆژی ڕوناك و پرشنگدار).[11]

بە ڕاستی خوای گەورە هەواڵی داوە پێمان دەربارەی گەورەیی دروستکردنی تەختی فەرمان ڕەوایی و کورسی، وەك فەرموویەتی: ﴿وَسِعَ كُرْسِيُّهُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ﴾(البقرة/٢٥٥). واتە: (فەرمان ڕەوایی و زانین ودەستەڵاتی ئەو زاتە هەموو ئاسمانەکان و زەوی گرتۆتەوە). پاشان خوای گەورە ئاسمانەکان و زەوی دروست کرد، کە تۆپەڵێکی پتەوی پێکەوە نوساو بوون، ئینجا لەت و پەتی کردن و لێکی جیاکردنەوە، لەپێشدا زەوی لە ماوەی دوو ڕۆژدا (لەو ڕۆژانەی کەخۆی ئەندازەی دەزانێت) دروست کرد، پاشان

---

[9] - صححةألألباني(٤٧٠٠)في كتاب السنة من سنن أبي داود عن عبادة بن الصامت

[10] -صحيح مسلم(٢٦٥٣)في القدر.

[11] -ئەمە(أبن كثير)(١١/١)لە(البداية والنهاية)بە(سند)یکی(حسن)لە(مرةالهمداني)لە(أبن مسعود و أبى صالح والسدي)لە(أبن عباس)وکۆمەڵێك لە هاوەڵانەوە ڕیوایەتی کردووە.

ئاسمانی دروست کرد ئینجا ویستی ئاسمان ڕێك بخات و ڕێکی کات، ڕێکی خست و ڕیك وپێکی کرد لە دوو ڕۆژی تردا، پاشان شێوەی زەوی وەك هێلکەی نەعامە لیٚ کرد، ئینجا شاخەکانی تیا دروستکرد و وەکو مێخ دایکوتا و لە زەویدا چەسپاندی، کە زەوی ڕاگیر و هاوسەنگ کردووە، پاشان زەوی ڕاخست و وەك لانکەی ژیانی لیٚ کرد وەك گیانلەبەرێکی ژێر بارخراوی لیٚ کرد، سازاندی کە خەڵکی لەسەر بێت و بۆ کوێی بوێت پیایدا بڕوات، فراوانی کرد و ئارام و دڵنیای کرد بۆ ژیان، نە بجوڵێت و نەلابدات و نە ناهاوسەنگ بێت بەو کەسانەوە کە بەسەریدا دەڕۆن، ئینجا لەزەویدا ئاو ولەوەڕگای دەرهێنا و فەراهەم هێنا، ڕوبارەکانی دروست کرد کە ئاویان پیابێت و گژوگیاو تۆو و دانەوێڵە و ڕووەك وسەوزایی تیا ڕواند و سەوزکرد، لە بەشێکی ئاسمانەوەخۆری بەسەر زەویدا هەڵهێنا و دەرخست، و مانگ هەڵهات و دروشایەوە، ڕوناکی وەك خۆی مایەوە، بەڵام تیشکەکان ڕۆیشتن، وڕۆژی ڕووناك و بینراو کرد، و شوێنی ئەستێرە و هەسارەکان و شوێنی هەڵهاتن و ئاوابونیانی دیاری کرد، بە جۆرێك ڕێکی خستن کە هەریەك لە خولگەو شوێنی خۆیدا بسوڕێتەوە، و شەوی بەسەر ڕۆژدا هێنا و ڕوناکییەکەی کردە تاریکی، پاش ئەوەی باڵندەکانی دروست کرد کەبەسەر زەویدا بڕۆن).[١٢]

لە فەرموودەیەکدا لە (أبوهريرە)ەوە پێغەمبەر(ﷺ)فەرموویەتی: (خوای گەورە لە ڕۆژی شەممەدا خۆڵی دروست کرد و لە ڕۆژی یەك شەممەدا شاخەکانی دروستکرد، و لەڕۆژی دووشەممەدا ڕووەك و درەختەکانی دروستکرد و لەڕۆژی سیٚ شەممەدا (المكروه)واتە: شەڕ و ناڕەحەتی دروست کرد، یان ئەوشتانەی دروستکرد کە بۆ ژیان پێویستن وەك ئاسن و ئەو پێداویستیانەی کە لەناو زەویدان و دەردەهێنرێن، و لە ڕۆژی چوارشەممەدا (النور) ڕوناکی دروستکرد، و لە ڕۆژی پێنج شەممەدا گیانلەبەرانی تیادا بڵاوکردەوە، و ئادەمیشی لە ڕۆژی هەینی لەپاش عەسر دروستکرد، کە کۆتا دروستکراو بوو لە ڕۆژی هەینی لە کاتێك لە نێوان (عەسر تا شەو)[١٣]، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَهُوَ الَّذِي سَخَّرَ الْبَحْرَ لِتَأْكُلُوا مِنْهُ لَحْمًا طَرِيًّا وَتَسْتَخْرِجُوا مِنْهُ حِلْيَةً تَلْبَسُونَهَا وَتَرَى الْفُلْكَ مَوَاخِرَ فِيهِ وَلِتَبْتَغُوا مِنْ فَضْلِهِ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ (١٤) وَأَلْقَى فِي الْأَرْضِ رَوَاسِيَ أَنْ تَمِيدَ بِكُمْ وَأَنْهَارًا وَسُبُلًا لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ

---

[١٢]-بۆ ئەمە سوود لە فەرموودەیەك وەرگیراوەکە(البخاري)(باب٤١)لە(التفسير)دا ڕیوایەتی کردووە، لە(سعیدی کوڕی جبیر)ئەویش لە(ابن عباس)ەوە، و(الحافظ)لە(فتح الباري/٨/٥٥٦)دا بە(الصحيح) دایناوە.

٦-صحيح ألأسناد:مسلم(٢٧٨٩)في صفات المنافقين.

١) وَعَلَامَاتٍ وَبِالنَّجْمِ هُمْ يَهْتَدُونَ (١٦) أَفَمَنْ يَخْلُقُ كَمَنْ لَا يَخْلُقُ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ (١٧) وَإِنْ تَعُدُّوا نِعْمَةَ اللَّهِ لَا تُحْصُوهَا إِنَّ اللَّهَ لَغَفُورٌ رَحِيمٌ (١٨)﴾(النحل/١٤-١٨).

**واتە: (خوای گەورە ئەو زاتەیە کە دەریای بۆ بار هێناون تا گۆشتی تەڕ و تازەی لێ بخۆن، تا لە ناویدا جۆرەها گەوهەر و مرواری دەربهێنن و لە دەست و ملی بکەن، هەروەها کەشتییەکان دەبینیت دەریا لەت دەکەن تا فەزڵ وبەخششی تری پەروەردگار بەدەست بهێنن، بۆ ئەوەی سوپاسگوزاریش بکەن، هەر خوا لەسەر ڕووکاری زەوی چیاکانی چەسپاندووە تا لەنگەری بگرێت و ئێوە نەلەرزێنێت و لارتان نەکاتەوە و ژێر و ژوور نەبن، هەروەها چەم و ڕووبار و ڕێگە و بانی تیادا بەدیهێناوە بۆ ئەوەی ڕێ دەرکەن و بەمەرامی خۆتان بگەن، هەروەها نیشانەی زۆر و زەبەندی لە زەویدا دایین کردووە (وەکو کەژ و کێوەکان و چەم و ڕوبارەکان و بەرزی و نشێوەکان تا وون نەبن لە شەوگاریشدا) و بە هۆی ئەستێرەکانەوە خەڵکی ڕێی خۆیان دەربکەن، (باشە ئەی هۆشمەندەکان) ئایا ئەو زاتەی ئەم هەموو دروستکراوە سەرسوڕهێنەرانەی بەدیهێناوە وەکو ئەو کەسە وایە کە ناتوانێت هیچ بەدی بهێنێت، ئایا ئەوە بۆلێکی نادەنەوە و یاداوەری وەرناگرن؟! خۆ ئەگەر بێت و بتانەوێت ناز و نیعمەتەکانی خوای گەورە بژمێرن، بۆتان ناژمێردرێت (لە ئەندامەکانی دەرەوە و ناوەوەی خۆتان و ئەو ڕزق و ڕۆزیانەی کە دەیخۆن و ئەو پۆشاك و ڕایەخ و ناوماڵەی بەکاری دەهێنن...هتد، سەرەڕای هەزاران هەزار دروستکراوانی تری دیار و نادیار لە جیهانی مادده و ڕووەك وگیاندار و...هتد) سەرەڕای کەم سوپاسیتان لەو هەموو ناز و نیعمەتە بێشوومارە) بە ڕاستی خوای پەروەردگار هەر لێخۆش بوو میهرەبانە.**

**خوای گەورە لە شوێنێکی تردا فەرموویەتی:** ﴿إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَاخْتِلَافِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ وَالْفُلْكِ الَّتِي تَجْرِي فِي الْبَحْرِ بِمَا يَنْفَعُ النَّاسَ وَمَا أَنْزَلَ اللَّهُ مِنَ السَّمَاءِ مِنْ مَاءٍ فَأَحْيَا بِهِ الْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا وَبَثَّ فِيهَا مِنْ كُلِّ دَابَّةٍ وَتَصْرِيفِ الرِّيَاحِ وَالسَّحَابِ الْمُسَخَّرِ بَيْنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ لَآيَاتٍ لِقَوْمٍ يَعْقِلُونَ (١٦٤)﴾(البقرة/١٦٤).

**واتە: (بەڕاستی لە دروستکردنی ئاسمانەکان و زەوی و ئاڵوگۆڕی شەو و ڕۆژدا و لەو کەشتیانەدا کە دەگەڕێن بە دەریادا و بە هۆیەوە سوود بە خەڵکی دەگەیەنن و لەو ئاوەی کە خوا لە ئاسمانەوە دەیبارێنێت ئینجا بەهۆیەوە زەوی پێ زیندوو دەکاتەوە دوای**

ووشك بوون و مردنی، هەروەها جۆرەها زیندەوەر و گیانلەبەر و مارو مێروی لەسەر ڕووکاری زەویدا بلاوکردۆتەوە و وگۆڕاندن و هات و چۆ پێکردنی با و شەماڵ و ڕاگیرکردنی هەورەکان لەنێوان ئاسمان و زەویدا، ئەمانە هەموو بەڵگە و نیشانەی بەهێزن بۆ ئەوانەی کە عەقڵ و بیر و هۆشیان دەخەنە کار و بیر لە دەستەڵاتی بێ سنوری خوا دەکەنەوە).

لە شوێنێکی تردا دەفەرموویێت: ﴿أَمَّنْ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَأَنزَلَ لَكُم مِّنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَنبَتْنَا بِهِ حَدَائِقَ ذَاتَ بَهْجَةٍ مَّا كَانَ لَكُمْ أَن تُنبِتُوا شَجَرَهَا أَإِلَٰهٌ مَّعَ اللَّهِ بَلْ هُمْ قَوْمٌ يَعْدِلُونَ (٦٠) أَمَّن جَعَلَ الْأَرْضَ قَرَارًا وَجَعَلَ خِلَالَهَا أَنْهَارًا وَجَعَلَ لَهَا رَوَاسِيَ وَجَعَلَ بَيْنَ الْبَحْرَيْنِ حَاجِزًا أَإِلَٰهٌ مَّعَ اللَّهِ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ (٦١)﴾(النمل/٦٠-٦١).

واتە: (ئایا شەریك و هاوەڵ چاکترە بپەرسترێت) یان ئەو زاتەی کە ئاسمانەکان و زەوی دروستکردووە و لە ئاسمانەوە بارانی باراندووە، جا باخ و بێستانی جوان و ڕازاوەمان پێ بەرهەم هێناوە، ئێوە نەتاندەتوانی درەختەکانی بروێنن چ جای بەر و بوومەکەی، ئایا ڕەوایە کە خوایەکی تر لەگەڵ خوای پەروەردگاردا هەبێت!؟ نەخێر، لەگەڵ ئەو هەموو بەڵگانەدا زۆربەی ئەو خەڵکە لە ڕێبازی ڕاست لادەدەن و شوێنی چەوتی و نادروستی دەکەون، (ئایا تەنها ئەو زاتە نی یە) کە زەوی دامەزراندووە و لە ناویدا جۆگە و ڕووباری ڕەخساندووە هەروەها زنجیرەی چیای تیادا چەسپاندووە، لە نێوان دوو دەریاکەشدا بەربەستی بەرپاکردووە (کە ئاوی شیرین و سوێر تێکەڵ نابن) ئایا ڕەوایە خوایەکی تر لەگەڵ خوای پەروەردگاردا هەبێت!؟ نەخێر وانییە لەگەڵ ئەو هەموو بەڵگانەدا زۆربەی ئەو خەڵکە (ئەم ڕاستیانە) نازانن و تێناگەن).

لە سوورەتی (الطلاق)یشدا دەفەرموویێت: ﴿اللَّهُ الَّذِي خَلَقَ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ وَمِنَ الْأَرْضِ مِثْلَهُنَّ يَتَنَزَّلُ الْأَمْرُ بَيْنَهُنَّ لِتَعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ وَأَنَّ اللَّهَ قَدْ أَحَاطَ بِكُلِّ شَيْءٍ عِلْمًا﴾(الطلاق/١٢).

واتە: (خوا ئەو زاتەیە کە حەوت چین ئاسمانی دروستکردووە و فەرمانی خوا لە نێوانیاندا دادەبەزێت، هەروەها بە وێنەی ئەوان فەرمانی خوا بۆ زەویش دادەبەزێت و جێ بەجێ دەکرێت، بۆ ئەوەی بزانن کە بەڕاستی خوا دەستەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە، بێگومان خوا بە زانست و زانیاری خۆی گەمارۆی هەموو شتێکی داوە).

## پیاو و ئافرەت

کاتێك ئینسان دەڕوانێتە بابەتێك لە بابەتەکان کە عەقڵ و ژیری کەسەکان جیاوازییان تیایدا دەبێت، ئەوا پێویست دەکات بە شوێن بابەتێکی تردا بگەڕێت و لێکۆڵێتەوە کە عەقڵ و ژیری کەسەکان تیایدا یەك دەنگ و هاوڕا بن، لەبەر ئەوەی کە هێنانی بڕیارێك لەسەر شتێك جیاواز دەبێت لەسەر بڕیار لەسەر شتی دووەم. ووشەی (امرأة) ئافرەت، واتە لەبەرامبەریدا ووشەیەك هەیە کە (رجل) پیاوە، یەکەمیان واتە: (أنثی) مێینە، دووەمیان واتە: (ذکر) نێرینە، ئەگەر بڕوانینە هەردووکیان ئەوا دەبینین کە (جنس) ڕەگەزێك هەیە کە هەردووکیان کۆ بکاتەوە کە (انسان)ە، کاتێك دەڵێین (جنس) ڕەگەزێك هەردووکیان کۆدەکاتەوە کە ئینسانە، واتە دەگونجێت هەردوو جۆرەکەی لێ دروست ببێت، واتە تاکی یەکسانی لێ دروست ببێت، ئینسان (جنس) ڕەگەزێکە، چونکە هەردوو جۆرەکەی لێ دروست دەبێت (نێر و مێ). ئەگەر بڕوانینە (جنس) دەبینین دابەش دەبێت بۆ دووجۆر، پێویست دەکات بڵێین: (بەڕاستی دابەش نابێت بۆ دوو جۆر مەگەر بۆ دوو کاری گرنگ و گەورە و تەواو، خۆ ئەگەر یەك کاری گرنگ بوایە، ئەوا (جنس) ڕەگەز بەیەك جۆر و تاك دەمایەوە، بەڵام دابەش بوونی بۆ دوو جۆر، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە هەر جۆرێك تایبەتمەندی خۆیی هەیە، (جنس) ڕەگەزیش ئەو تایبەتمەندیانەیان بۆ کۆدەکاتەوە، بۆ نموونە (کات) ڕەگەزێکە کە شەو و ڕۆژ دەگرێتەوە، یەکێکیان تاریك و ئەوی تر ڕووناك ئاماژە دەکەن بۆ شەو و ڕۆژ، هەندێك کەس وا گومان دەبەن کە دژایەتی و نایەکسانی لە نێوانیاندا هەبێت، دەڵێین: نەخێر، ڕووناکی بۆ ئەوە نەهاتووە دژایەتی و بەرهەڵستی تاریکی بکات، و تاریکیش بۆ ئەوە نەهاتووە دژایەتی و بەرهەڵستی ڕووناکی بکات، لەبەر ئەوە ڕاست نابێت کە بەراوورد لە نێوان ڕووناکی و تاریکیدا بکەین چونکە هەریەکەیان گرنگی وکاری خۆیانیان هەیە کەبەجێی دەگەیەنن، یەکێکیان ناتوانێت کاری ئەوی تریان جێ بەجێ بکات، هەردووکیان تەواوکاری یەکترین بۆ پەیام و بەرنامەی ژیان. ئەو (کات)ەی کە بە ڕەگەزی خۆی دابەش دەبێت بۆ شەو و ڕۆژ، مانایەکی هاوبەشی هەیە کە بریتییە لە: کاتی دیاری کراوە بۆ ڕوودانی شتەکان تیایدا، پاشان دابەش دەبێت بۆ هەردوو جۆرەکەی (ڕۆژ و شەو)، کەواتە...شەو کار و گرنگی خۆیی هەیە، هەروەها ڕۆژ کار و گرنگی

خۆیی هەیە. خوای گەورە کاتێك ئەم مەسەلەیە ڕوون دەکاتەوە و دەردەخات، بە شێوەیەکی ڕوون دریدەخات و هۆکارەکەی شی دەکاتەوە، دەفەرموویێت: ﴿هُوَ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ اللَّيْلَ لِتَسْكُنُوا فِيهِ وَالنَّهَارَ مُبْصِرًا إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِقَوْمٍ يَسْمَعُونَ﴾(یونس/٦٧).

واتە: (هەر زاتی خوایە کە شەوی بۆ بەدیهێناون تاوەکو تیایدا بحەوێنەوە، ڕۆژیشی کردووە بە ڕووناککەرەوە، (تا کار و کاسبی تیادا ئەنجام بدەن) بەڕاستی ئا لەو دیاردانەدا بەڵگە و نیشانەی زۆر هەن (لەسەر دەستەڵات و توانای پەروەردگار) بۆ کەسانێك کە ببیستن وتێبگەن). کەواتە...هۆکاری شەو ڕونکرایەوە، بۆ حەوانەوە و ئارامی و ئیسراحەتە، و ڕۆژیش بۆ هەوڵدان و تێکۆشان و کارکردن، ناتوانین بڵێین کات هەمووی وەك ڕۆژ بێت، سوود بەخش دەبێت، بەڵکو هەردووکیان بەدوای یەکتردا دێن، ئەم بەدواى یەکدا هاتنەیش لە پێویستی تەواوکارییە، ئەگەر کاری ڕۆژ بەسەر نەبەین، ئەوا نرخ و بەهای شەو نازانین، ئەگەر هاوەڵی شەویش نەکەین، ئەوا نرخ و بەهای ڕۆژ نازانین، بەڵکو نرخ و بەهای تەواوکاری، جوانی تەواو دەبەخشێت، کاتێك خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿قُلْ أَرَأَيْتُمْ إِنْ جَعَلَ اللَّهُ عَلَيْكُمُ اللَّيْلَ سَرْمَدًا إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ مَنْ إِلَهٌ غَيْرُ اللَّهِ يَأْتِيكُمْ بِضِيَاءٍ أَفَلَا تَسْمَعُونَ (٧١) قُلْ أَرَأَيْتُمْ إِنْ جَعَلَ اللَّهُ عَلَيْكُمُ النَّهَارَ سَرْمَدًا إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ مَنْ إِلَهٌ غَيْرُ اللَّهِ يَأْتِيكُمْ بِلَيْلٍ تَسْكُنُونَ فِيهِ أَفَلَا تُبْصِرُونَ (٧٢)﴾(القصص/٧١-٧٢).

واتە: (ئەی محمد ﷺ بڵێ: خەڵکینە هەواڵم بدەنێ، ئەگەر خوا شەوگار بکات بە هەمیشەیی تا ڕۆژی قیامەت (هەر ڕۆژ نەبێتەوە) چ خوایەکی تر هەیەجگەلە (الله) بتوانێت ڕووناکیتان بۆ فەراهەم بهێنێت، ئایا ئێوە ئەم ڕاستیانە نابیستن؟، هەروەها پێیان بڵێ: هەواڵم بدەنێ، ئەگەر خوا ڕۆژگاری کردە هەمیشەیی لەسەرتان، تا ڕۆژی قیامەت خایاندی، کام خوا هەیە جگە لە (الله) کە شەوگارتان بۆ پێش بهێنێت، تا ئارامی تیادا بگرن، ئایا ئێوە سەرنجی ئەم دیاردانە نادەن و نایانبینن؟).

کەوتە...خوای گەورە ڕەحمەت و بەزەیی بە جۆرێکە کە کاتی کردووە بە ڕەگەزێك، ساتی ڕوودانی شتەکانی تیایە، دوو جۆرە، هەر جۆرێك کار وگرنگی خۆیی هەیە و جێ بەجێ ی دەکات، ئەگەر ویستمان شەو (تشبیه) لێکچووی ڕۆژ بکەین، یان بە پێچەوانەوە، ئەوا لە کار و گرنگی خۆی دەرمان کردوون، کە خوای گەورە بۆ ئەو کارە گرنگ و بنەڕەتییە دروستی کردوون، لەگەڵ ئەو دابەشکردنەدا بۆ شەو و ڕۆژ دەبینین لە ئایەتەکەدا

(أستفهام) پرسیار هەیە، کە مانای یەك خواناسی لە خۆی دەگرێت بۆ خوایەکی تاك و تەنها کە فەرمانی هەموو کارێك بە دەستی قودرەتی خۆیەتی.

## بەشی یەکەم
## ( حواء ) ( علیها السلام )

**کورتەیەك:**

(حواء) (علیها السلام)دایکی بەشەریەت، خوای گەورە لە یەکێك لە پەراسوەکانی باوکە ئادەم (علیه السلام)ی باوکمان دروستی کردووە، پاشان هەردوکیانی لە بەهەشتدا نیشتەجێ کرد، بۆ ئەوەی خۆشی و لەزەت لە یەکتری وەربگرن، بەو ناز و نیعمەتانەوە کە لە بەهەشتەکەدا بوون، و خوای گەورە قەدەغەی خواردنی ڕوەکێکی لێکردن، و ئاگاداریشی کردنەوە لە دوژمنایەتی شەیتان، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا شەیتانی بە نەفرەتکراو توانی بەفێڵ و هەڵخەڵەتاندن و هۆکارە خراپەکان و وەسوەسە سەریان لێ بشێوێنێت و پاڵیان بنێت بۆ خواردن لەو درەختەی کە قەدەغە کرابوو، کاتێك لێیان خوارد بەرگی بەریان کەوتە خوارەوە و جەستە و عەورەتیان دەرکەوت، ئینجا خوای گەورە بەشێوازی هەڕەشە و لۆمەکردن بانگی کردن و گفتو گۆی لەگەڵ کردن لەسەر ئەو کارەیان کەکردیان، پاشان هەردووکیان تەوبەیانکردو گەڕانەوە بۆلای خواو، خوایش تەوبەکەی لێ وەرگرتن، پاشان دایبەزاندن بۆسەر زەوی.

### باسی یەکەم:
### دروستبونی ( حواء ) ( علیها السلام ):

●پێش ئەوەی بێینە سەر باسی دروستبوونی (حواء) کە دایکی بەشەریەتە، وامان پێباشە کە باسی دروستکردنی ئادەم(علیه السلام)بکەین،کە باوکی بەشەریەت و ئەصڵ وبنەمای ئەوانە، خوای گەورە ئادەمی دروستکرد ئینجا (حواء)یشی لەو دروستکرد، ئینجا هەموو بەشەریەت لەوانەوە دروست بوون.

قورئانی پیرۆز باسی دروستکردنی ئادەم (علیه السلام)ی کردووە، لەزۆر شوێن و کات و بۆنەدا دوبارە بۆتەوە. کەسێك لەم ئایەتانە ڕابمێنێت کەباسی دروستکردنی ئادەم دەکەن، ئەوا هەموو قۆناغەکانی دروستبونی بۆ ڕوون دەبێتەوە، ودەزانێت کە ئادەم بەچەند قۆناغدا تێپەڕیوە تا دروست بووە.

خوای گەورەر لە سوورەتی (آل عمران)دا کە ئەمە ماناکەیەتی: (بەڕاستی نموونەی دروست بوونی عیسا لەلایەن خواوە وەك نموونەی ئادەم وایە کە لە خاك دروستی کرد و لەوەودوا فەرمانی داو پێی وت: ببە (بە ئینسان) ئەویش بوو، (عیسا دایکی هەبوو، ئادەم دایك و باوکیشی نەبوو) (آل عمران:٩٥).

کاتێك دروستبونی عیسا (علیه السلام) -بەبێ باوك- موعجیزەیەکی سەر سوڕهێنەر بێت، ئەوا دروستکردنی ئادەم (علیه السلام) لە گڵ، موعجیزە و نیشانەیەکی زیاتر سەرسوڕهێنەرە.

●خوای گەورە لە سوورەتی (ص)دا -کە ئەمە ماناکەیەتی- فەرمویەتی: (کێشەی فریشتەکان کاتێك بوو کە پەروەردگارت پێی وتن: من دەمەوێت بەشەرێك، لە قوڕ دروست بکەم)(ص:٧١).

هەروەها لە سوورەتی (الصافات)دا فەرمویەتی -کە ئەمە ماناکەیەتی-: (ئەی پێغەمبەر ﷺ لە بێ باوەڕان بپرسە: ئایا ئەوان گرنگتر و گەورەتر و بەهێزترن یان ئەو شتانەی تر کە دروستمان کردووە وەك (ئاسمان و زەوی و کێوەکان...هتد)، بێگومان ئێمە ئەوانمان لە قوڕێکی مچ دروست کردووە (کە یەکێکە لە قۆناغەکانی دروستکردنی باوکە ئادەم).)(الصافات:١١).

خوای گەورە لە سوورەتی (الحجر)دا -کە ئەمە ماناکەیەتی- دەفەرموێت: (سوێند بەخوا ئێمە سەرەتا ئینسانمان لە قوڕێکی وشك دروست کرد کە پێشتر قوڕێکی ڕەشباو و ترشاو بوو)(الحجر:٢٦).

خوای گەورە لە سوورەتی (الرحمن)دا -کە ئەمە ماناکەیەتی- دەفەرموێت: (خوای گەورە ئادەمیزادی درستکردووە لە قوڕێکی وشك بوو، وەك فەخفوری)(الرحمن:١٤).

و بەو جۆرە زۆر ئایەت دەبینین کە ئاماژەن بۆ دروستکردنی ئادەم (علیه السلام) و هەموو قۆناغەکانی ڕوندەکاتەوە کە ئادەم (علیه السلام)ی پیا ڕۆیشتووە لە ڕاستیدا هەموویان دەگەڕێنەوە بۆ یەك شت و یەك بنەما کە گڵە، لەگەڵ ئاودا تێکەڵ بکرێت دەگۆڕێت بۆ قوڕ، پاشان بۆ قۆناغەکانی تر.

●ئادەم (علیه السلام) ئەصل و بنەمای بەشەریەتە بەڵام (حواء) لقێکە لەو و شوێنکەوتوی ئەوە، و چیرۆکەکەیشی بەشێکە لە چیرۆکی ئادەم(علیه السلام).

لەقورئاندا چەند ئایەتێك لەسەر دروستبونی (حواء) بە شێوەی شوێنکەوتەی ئادەم (علیه السلام) هاتووە:

یەکەم:خوای گەورە –کە ئەمە ماناکەیەتی –دەفەرموێت: (ئەی خەڵکینە لە خەشم و ناڕەزایی ئەو پەروەردگارەتان خۆ بپارێزن کە ئێوەی لە تاکە نەفسێك دروست کردووە، هەر لەو نەفسەش هاوسەرەکەی بەدی هێناو لەو دووانە پیاوان و ژنانی زۆری خستۆتەوە و بڵاوکردەوە، هەروەها لەو خوایە بترسن کە لە یەکتر داوا دەکەن بەناوهێنانی ئەوەوە، هەوڵ بدەن پەیوەندی خزمایەتیش بپارێزن و (پتەوی بکەن) چونکە بەڕاستی خوا (هەمیشە و بەردەوام) چاودێرە بەسەرتانەوە).(النساء:١).

## ( حواء ) دروستکرا

ئیبلیس لە بەهەشت دەرکرا، ئادەم بە تەنها لە بەهەشتدا مایەوە، ماوەیەك تەنها خۆی بوو هەستی بە بێتاقەتی دەکرد، لە کاتێکدا ئادەم نوستبوو، خوای گەورە(حەوا )ی لە پەراسووی ئادەم دروستکرد، کاتێك ئادەم خەبەری بوویەوە، حەوای لەپاڵ خۆیدا بینی، پرسیاری لیّ کرد تۆ کێیت؟ وتی: من ئافرەتێکم، ئادەم پرسی: ناوت چییە؟ وتی: ناوم(حوا )ە، ئادەم پرسی: بۆچی دروستکراویت؟ وتی: بۆ ئارامی تۆ لەگەڵمدا.

بۆچی ناوی (حوا )ە؟

چوونکە لە زیندوو دروست بووە کە پەراسوی ئادەمە، بۆچی پێی دەوترێت: (امرأة) ئافرەت؟ چونکە (مرء)واتە لە ئادەم دروستکراوە، بۆچی لەکاتی خەوتنی ئادەمدا دروستکرا لە ئادەم؟ بۆئەوەی ئادەم هەست بە ئازار نەکات و بەهۆی ئەوئێش وئازارەوە (حوا )ی خۆش نەوێت، چونکە بەهۆی ئەوەوە ئازاری پیّ گەیشت. بەڵام ئافرەت کاتێك منداڵی دەبێت تووشی ئازاری زۆر توند دەبێت، تەنانەت پێش بوونی منداڵەکەیش بە هەڵگرتن لەسکیدا چەند مانگ ئازاری بووە، وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَوَصَّيْنَا الْإِنسَانَ بِوَالِدَيْهِ حَمَلَتْهُ أُمُّهُ وَهْنًا عَلَىٰ وَهْنٍ وَفِصَالُهُ فِي عَامَيْنِ أَنِ اشْكُرْ لِي وَلِوَالِدَيْكَ إِلَيَّ الْمَصِيرُ﴾(لقمان/١٤).

واتە: (دایکی بەپێستی سك هەڵی گرتووە لاوازی لەسەر لاوازی، لەگەڵ ئەوەیشدا کە دایك چەند لە هەڵگرتن و بوونی منداڵەکەوە تووشی ئازاری زۆر دەبێت، لەگەڵ ئەوەیشدا ئەوەندە منداڵەکەی خۆش دەوێت لە ئەندازە بەدەر، چونکە سۆزی دایکایەتی زۆرە.

مانای (سکن) چییە؟ کە (حەوا ) بە ئادەمی وت: بۆ سوکنایەتی تۆ دروستکراوم، واتە: ئارامی دان بە یەکتری و هێمنی وجێگیری دان بە یەکتری، پیاو بیّ ژن و ژن بیّ پیاو

لەزەت لەژیان نابەن بەو ئەندازەی کە لەگەڵ یەکدا لەزەتی پێ دەبەن، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَ لَكُمْ مِنْ أَنْفُسِكُمْ أَزْوَاجًا لِتَسْكُنُوا إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُمْ مَوَدَّةً وَرَحْمَةً إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ﴾(الروم/٢١).

واتە: (لە نیشانەکانی بوون و دەستەڵاتی خوایە کە لە جنسی خۆتان، واتە لە ڕەگەزی ئادەمیزاد هاوسەری بۆ دروستکردن، تا لە پەنایاندا بحەسێنەوە و خۆشەویستی و میهرەبانیشی خستۆتە نێوانیان بۆ ئەوەی بتوانن پێکەوە باری گرانی ژیان هەڵبگرن و درێژە بەژیان بدەن، ئەی ئافرەتی هاوسەری بەڕێزی باوەڕدار، تۆ خوا کردویتی بە نیشانەیەکی خۆی، ئەمە ڕێزێکی تایبەتە بۆ تۆی ئافرەت، ئایا چیت زانیوە و نرخی ئەو ڕێزەت دەزانیت؟ ئایا زانیت تۆی ئافرەت کانگا و جێی سۆز و خۆشەویستی ناو خێزانیت، ئایا ئەم هۆکارە پیرۆزەی خۆتت بەکارهێناوە بۆ ئەو سۆز و خۆشەویستییە؟. خۆ ئەبوایە خوا لەیەک کاتدا ئادەم وحەوا پێکەوەدروست بکات، بەڵام خوا بۆیە پێکەوە دروستی نەکردن، بۆ ئەوەی ئادەم ماوەیەک هەست بەبێ تاقەتی بکات بە تەنها، ئینجا نرخی هاوسەرەکەی دەزانێت، ئەگەر چی ئادەم لە بەهەشتیشدا بوو هەستی بە بێتاقەتی دەکرد هەتا خوای گەورە حەوای بۆ دروستکرد، ئیتر بێتاقەتی و تەنهاییەکەی نەما، ئا لەمەوە ژن و مێرد با سوپاسی خوا بکەن کە کردونی بە هاوسەر و هاوبەشی ژیانی یەکتر و بە هەردووکیان خۆشترین گوزەران دابین دەکەن.

## نواندن بەر لە داواکردن

بە هیچ شێوەیەک نابێت ئافرەت بۆ دەرەوەیماڵەکەی خۆی ئارایش بدات، بەڵام کە هاتە ماڵەوە بۆ مێردەکەی پۆشاکێکی عادەتی ناوماڵ لەبەر بکات. ئافرەتی موسوڵمان دەبێت ماڵەکەی بکات بە شوێنی حەوانەوەی لەش و دڵخۆشکردنی هاوسەرەکەی، کاتێک کە هاوسەرەکەی لە دەرەوەی ماڵە ئاگای لە ماڵەکە و منداڵەکان ببێت و کاری ناوماڵی خۆی بە تەواوی بکات. کە هاوسەرەکەی هاتەوە بە ڕووی خۆشەوە پێشوازی و بە خێرهاتنەوەی لێ بکات.

خوشکی موسوڵمان و هاوسەری بەڕێز تۆ جێگە ئارامی هاوسەرەکەتی، ڕووت لەگەڵی خۆش بێت، زمانت شیرین بێت، بەژن و باڵا و ڕوخسارت تەنها بۆ هاوسەرەکەت جوان بکە و برازێنەوە. زۆرجار ژن گلەیی ئەوەدەکات لە هاوسەرەکەی، دەڵێت تا لە دەرەوەیە،

ئەوە لە دەرەوەیە، کاتێك دێتەوە ماڵ، خۆی بە ڕۆژنامە و شتی ترەوە خەریك دەکات، بەڵێ ئەم گلەییە ڕەوایە، بەڵام پێش ئەوەی ئەم گلەییە لە مێردەکەی بکات، یان هاوسەرەکەی لە گەڵیدا دانیشێت کە دێتەوە، با ئەم ئافرەتە بەڕێزە سەرنج لە خۆی بدات، ئایا خۆی هەرچی پێویستی خۆی هەیە ئەنجامی داوە یان نا؟ خۆزگە خوشکانی ئیماندار چاویان لە دایکی ئیمانداران خاتوو خەدیجە بکردایە، چۆن جێگەی ئارامی بووە بۆ پێغەمبەر ﷺ بۆیە شایستەی ئەوە بوو لە کاتی وەفاتیدا جوبرەئیل دابەزێت بۆ لای پێغەمبەر و پێی بفەرموێت: ئەی (محمد)من خوا ناردوومی پێت بڵێم: بە خەدیجەی هاوسەرت بڵێیت: خوا سەلامت لێ دەکات، و پێی ڕابگەیەنە خوا مژدەی پێ دەدات بە قەسرێك لە بەهەشتدا کە هیچ خەم و پەژارە و ناخۆشی تیا نییە.[١٤]

هەموو کەسێك مافی لەسەر کەسێك یان کەسانێك هەیە و کەسێك یان کەسانێك مافی لەسەر ئەو هەیە، هەر کەسێك داوای ئەو مافانەی دەکات با بەخۆیدا بچێتەوە. ئایا ئەو مافانەی کە لەسەر خۆیەتی ئەنجامی داوە؟ کەواتە کاتێك چاوەڕوانی مافی خۆت ببە کە خۆت مافێکت بەجێ هێناوە کە لەسەرت بووە، کەوا بوو ژن و مێرد با هەریەکەیان مافی بەرامبەرەکەی بدات، ئینجا ئەگەر بەرامبەرەکەی مافی ئەوی ئەنجام نەدا گلەیی بکات.

●تێبینی: ئادەم لە گڵ دروستکراوە، و حەوا لە پەراسووی ئادەم دروستکراوە، ئەو پەراسووەی کە چەماوەتەوە بەرەو لای دڵ، (الله اکبر) ئەمە ئاماژەیە بۆ کاری پیاوان و ئافرەتان، مامەڵە لەگەڵ زەویدا دەکەن و کشت و کاڵ و ئاژەڵداری و باخداری و شتی لەو جۆرە دەکەن، بەڵام ئافرەتان مامەڵە و کاریان لە ماڵدایە بۆ هاوسەرەکانیان بە چاوی سۆزی مێردایەتی و، بۆ کوڕ و کچ و دایك و برا و خوشك، هەروەها سۆزی بۆیان سۆزی خۆشەویستتر بێت بۆیان. ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە کاری ئافرەتان خزمەت کردنە بەماڵ بەڵام کاری پیاوان کاری خزمەتگوزارییان لە دەرەوەی ماڵە. هەردوولا بە سۆز و خۆشەویستی، دوور لە خۆهەڵکێشانی کەسیان بەسەرکەسیاندا.

---

[٧]-أخرجه مسلم برقم(٦٢٢٣)

## دەربارى مارەیی ( حواء )

(الثعلبي) لە کتێبی (عوائس المجالِس)دا، باسیکردووە، دەڵێت: (لە هەندێك لەهەواڵ و گێڕانەوەکاندا هاتووە، کاتێك ئادەم (علیه السلام) (حواء)ی بینی، دەستی بۆ درێژکرد، فریشتەیەك وتی: ئەی ئادەم وازی لێبهێنە، ئەویش وتی: ئەی بۆچی خوای گەورە بۆی دروست کردوم؟ ووتیان: بۆ ئەوەی تا مارەییەکەی بدەیت، ووتی: مارەییەکەی بریتییە لەچی؟ ووتیان: سێ جار (صلوات)درود بدەیت لەسەر (محمد) ﷺ، ئەویش ووتی: (محمد) کێیە؟  ووتیان: کۆتایی پێغەمبەرانە، ئەگەر (محمد) نەبوایە (حواء) دروست نەدەکرا). ئەو پیاوە چەندین لاپەڕەی لە کتێبەکەی بەم بابەتانە ڕەش کردۆتەوە کە کەس نازانێت سەرچاوەکەی کوێیە مەگەر  خوا خۆی، خوای گەورە درۆ و درۆزنانی بێزراو و ناپەسەند کردووە، ئەم گێڕانەوانە، نە سەنەدی هەیە  نە ڕاوی، ئەو کەسەی ئەوە دروست دەکات، دەیەوێت ڕەواج بدات بە درۆکانی کەهەڵی بەستوون، دەیەوێت فێڵ بکات و ڕاستی تێك بدات، تا کەسە عەوامەکان بڕوای پێ بکەن و بەڕاستی بزانن.

## ( حواء ) فەرمووی: نەخێر

پێشەوا (القرطبي) بۆچونێکی جوانی هەیە لە دروستکردنی (حواء)دا، فریشتە پرسیاریان کرد لە ئادەم  کاتێك کە دیت (حواء) دروستکراوە ئایا خۆشت دەوێت؟ ئادەم فەرمووی: بەڵێ، بە (حواء)یان وت: ئەی تۆ ئادەمت خۆش دەوێت؟ وتی: نەخێر، پێشەوا(القرطبي) فەرموویەتی: خۆ (حواء) چەند ئەوەندەی ئادەم بۆ حەوا، سۆز و خۆشەویستی بۆ ئادەم زیاتر بوو، بەڵام شەرمی ئافرەتایەتی وای لێکرد کە بڵێت: نەخێر.

## هەڵوێستەیەك لەگەڵ ئایەتە پیرۆزەکەدا

سوورەتی (النساء) بەم ئایەتە پیرۆزە دەستی پێکردووە، کە ئاڕاستەی هەموو خەڵکی کراوە بەگشتی، بە ووتەی: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ﴾ ئاڕاستەکردنی یەکەم لە ئایەتەکەدا، بانگەوازە بۆ هەموو خەڵکی کە تەقوای خوا بکات: ﴿اتَّقُوا رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ﴾.

تەقوا و لەخواترسان بنەمای هەمو خێر و چاکەیەکە، کە بریتییە لە خۆ پاراستن و پاکبوون لە هەموو گوناهێك، هەموو خەڵکی بەوە ڕاسپێردراون کە تەقوای خوا بکەن کە بەدی هێناون لە: ﴿مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ﴾ کە ئادەمە (علیه السلام)، ﴿وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا﴾ کە بریتییە لە (حواء) ی هاوسەری ئادەم و لەیەکێك لە پەراسوەکانی دروست کراوە.

(مِنْ)لە ئایەتی: ﴿خَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا﴾ بۆ (تبعیض)ە چونکە (حواء) لە بەشێکی ئادەم (علیه‌السلام) دروستکراوە.

دەگونجێت (مِنْ) بۆ (بیان) بێت، چونکە (حواء) لە ڕەگەزی ئادەم دروستکراوە، ئەوەش بۆ ئەوەی کە هاوسۆزی و تەبایی و خۆگری و خۆشەویستی و پێکەوە گونجان لە نێوانیاندا هەبێت، چونکە ڕەگەز لەگەڵ ڕەگەزی خۆیدا گونجاوتر و لەبارترە.

## -لە سوننەتی پێغەمبەریشدا ﷺ هاتووە کە دەفەرموێت: (حواء) لە پەراسوی ئادەم (علیه السلام)دروستکراوە:

* لە (ابي هريرة)ەوە (خوا لێی ڕازی بێت) ووتی: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (ئامۆژگاری خەیر و چاکەی ئافرەتان بکەن چونکە ئەوان لەپەراسو دروستکراون، و لارترین شتیش لە پەراسودا بەشی سەرەوەیەتی، ئەگەر چویت ڕاستی بکەیتەوە ئەوا دەیشکێنیت، و ئەگەر وازت لێهێنا بەردەوام لار دەبێت، جا لەبەر ئەوە ئامۆژگاری خەیر و چاکەی ئافرەتان بکەن.).[١٥]

فەرموودەکە ئەوە دەگەیەنێنت کە (حواء) لە یەکێك لە پەراسوەکانی ئادەم (علیه‌السلام) دروست کراوە، بە شێوازێك کە ئێمە نایزانین، بەڵکو زانستی دروستکردنەکەی دەدەینە پاڵ خوا، و سروشتی ئافرەت لە سروشتی پیاو جیاوازە، ئەمەش بە پێی تێڕوانین لە جیاوازی هەموو شتێك لە ژیاندا. ئەوەی لە فەرمودەکەدا هات لە ئامۆژگاری ئافرەتان و بانگەواز بۆ ئارامگرتن لە سەریان و نەرمی نواندن لە گەڵیانداوو ڕەچاوکردنی باروو زروفیان، ئەوە ناگەیەنێت کە دروستکردنی (حواء) لە پەراسوی ئادەم ببێتە هۆی کەم و

---

[١٥]- رواهُ البخاري (كتاب النكاح)

کووڕی لە پەراسووەکانی ئادەمدا لەچاو پەراسووەکانی (حواء)دا، هەندێك لە زانایانی تەفسیر باسی ئەوەیان کردووە.[16]

بەڵکو ڕاست ئەوەیە کە ژمارەی پەراسووەکانی پیاو یەکسانە بە ژمارەی پەراسووەکانی ئافرەت.

دەڵێین: بێگومان دروستکردنی (حواء) لە پەراسوویەکی ئادەم بەڵگەیە لەسەر گەورەیی دەسەڵاتی خوای گەورە و جوانی دروست کراوەکەی: ﴿فَتَبَارَكَ اللَّهُ أَحْسَنُ الْخَالِقِينَ﴾(المؤمنون:١٤).

●ئایەتێکی تر کە ماناکەی لە ئایەتەکەی سوورەتی (النساء)ەوە نزیکە، بریتیە لە ئایەتی: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَىٰ وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ﴾(الحجرات:١٣).

واتە: (ئەی خەڵکینە بێگومان ئێمە هەموتانمان لەنێرو مێیەك دروستکردووە (کە باوکە ئادەم و دایکە حەوایە) و کردوومانن بە چەندەها گەل و تیرە و هۆزی جۆر بە جۆر، تا یەکتر بناسن و پەیوەندیتان خۆش بێت بە یەکەوە. . بەڕاستی بەڕێزترینتان لای خوا ئەو کەسانەتانە کە زۆرتر لە خواترسەو فەرمانبەرداری خوایە، بێگومان خوا زانا و ئاگایە بە هەمووان).

لەم ئایەتەدا جیاوازی لە نێوان ڕەنگ و زمان و ڕەگەزەکاندا نییە، لەبەر ئەوەی کارەکە بەم جۆرەیە، ئیتر بۆچی دەبێت ئینسان شانازی و فەخر بکات بە زمان و ڕەگەزی خۆیەوە، هەندێکی تریان خۆیان بە بەرزتر بزانن بەسەر هەندێکی تریاندا؟!

لە فەرمودەیەکی پێغەمبەردا ﷺ هاتووە دەفەرموێت: (بێگومان خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا سەیری شێوە و لاشەتان ناکات بەڵکو سەیری دڵ و کردەوەکانتان دەکات).

●تێبینی ئەوەی دەکرێتە پەیوەندیەکی پتەو و دامەزراو لە نێوان هەردوو ئایەتەکەی سوورەتی (النساو) و (الحجرات) ئەویش لەسەرەتاوو ناوەڕۆك و کۆتایی هەردوو ئایەتەکەدا هەیە، لە سەرەتادا هەردوو ئایەتەکە بە: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ﴾ دەست پێ دەکەن، و لە ناوەڕۆکیشدا هەردووکیان لە باسی دروستکردن و بانگەواز بۆ تەقوا و لەخوا ترسان

[16]- (شهاب الدين الخفاجي) لە حاشیەی (عناية القاضي وكفاية الراضي) لەسەر تەفسیری (البيضاوي)(انوار التنزيل وأسرار التأويل)دا باسیکردووە.

دەدوێن، و کۆتایی ئایەتی یەکەم بریتی بوو لە: ﴿إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا﴾، و کۆتایی ئایەتی دووەمیش بریتی بوو لە: ﴿إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ﴾ چاودێری خوا بەسەر بەندەکانییەوە لە زانستی خۆی بە حاڵیان و شارەزایی بە نهێنی و شارەوەکانیان بنیات نراوە، پاك و بێگەردی بۆ ئەو خوایەی کە هیچ شتێکی لێ وون نابێت.

● خوای گەورە لە سوورەتی (الأعراف)دا –کە ئەمە ماناکەیەتی– دەفەرموێت: (خوا ئەو زاتەیە کە ئێوەی لەیەك نەفس و لەیەك شت دروست کردوەو هەر لەویش جوتەکەی بەدی هێنا، بۆئەوەی ئارامی لەلا بگرێت، جا کاتێك پیاوەکە چووە لای هاوسەرەکەی، ئەویش سکی پڕبوو بە کۆرپەلەیەکی سووك، (تا ماوەی ١٢٠ ڕۆژ) ئافرەتەکەش تێپەڕی کرد بەو ماوەیەدا، ئینجا کاتێك کە باری بەرەو سەنگینی دەچێت ئەو ژن و مێردە لە خوا دەپاڕێنەوەو دەڵێن: خوایە سوێند بە تۆ، ئەگەر منداڵێکی باش و بێ عەیبمان پێببەخشیت، ئەوە بەڕاستی لە سوپاسگوزارانی تۆ دەبین).

● هەروەها خوای گەورە لە سوورەتی (الزمر)دا –کە ئەمە ماناکەیەتی–دەفەرموێت: (خەڵکینە بیرتان نەچێت خوا ئێوەی لە تاکە نەفسێك هێناوەتە کایەوە لەوەودوا لەو تاکە نەفسە هاوسەرەکەشی فەراهەم هێناوە، لە ماڵاتیشدا هەشت جۆری دروست کردووە لەوەودوا لە سکی دایکتاندا ئێوە دروست دەکات بەچەند قۆناغێك، لەناو سێ تاریکیدا (مەبەست سێ پێستەکەیە کە کۆرپەلەی تێدا حەشارەدراوە)، جا گۆڕانکاری بەردەوامە و گەورە بوون و جیابوونەوەی ئەندامەکان (ڕۆژ لە دوای ڕۆژ زیاتر ڕوو دەدات) ئا ئەوەیە خوا، ئا ئەوەیە پەروەردگارتان، خاوەنی هەموو بەدیهێنراوەکانە جگە لەو خوایەکی تر نیە، جا ئیتر بۆ کوێ لا دەدرێن لە خواپەرستی؟!).

● (حواء) و هەموو ئافرەتانی تریش بەگشتی، سروشت و فیترەتیان لەگەڵ کارو بارو ڕۆڵی ژیانیاندا گونجاوە، هەر گۆڕانکاریەك لەم فیترەتەدا، ئەوا گۆڕانکاریە لە دروستکراوی خوادا و وەڵام دانەوەی بانگەوازی شەیتانی نەفرەت لێکراوە، کە ئامانجی ئەو گومڕاکردنی خەڵکیە.

خوای گەورە لە سوورەتی (النساء)دا لایەنێکی لە نەخشە و فێڵ و پیلانەکانی شەیتان بۆ ڕونکردوینەتەوە، کە لەو ڕێگایانەوە هەوڵ دەدات و کاردەکات لەسەر گومڕاکردن و سەر لێتێکدان و بەربەست دروستکردن و لادانی خەڵکی لەڕێگای ڕاست، بە هەموو هۆکارێکی خەڵەتێنەر و فێڵاوی و دروشمی بریقەدار و بەڵێنی درۆ وەك خوای گەورە دەفەرموێت: –

که ئەمە ماناکەیەتی- (بەڕاستی خوا خۆش نابێت لەوە هاوەڵ و شەریکی بۆ بڕیار بدر ێت و جگە لەو (هاوبەش دانانە) لە گوناهانی تر بۆ هەر کەس بیەو ێت و شایستە بێت و (پەشیمان بێت) خۆش دەبێت، جا ئەوەی شەریك و هاوەڵ بۆ خوا بڕیار بدات، ئەوە بەڕاستی گومڕا بووە بەگومڕاییەکی زۆر دوور (١١٦) (ئەو هاوەڵگەرانە) ئەوەی هاناو هاواری بۆ دەبەن و دەیپەرستن . جگە لەخوا . چەند پەرستراوێکی کارتێکراون (پەرستراو دەبێت کارتێکەر بێت نەك کار تێکراو، بۆیە بتەکانیان بەمێینە ناوناوە وەك: لات و عوززا)، تەنها هاناو هاواریشیان هەر بۆ شەیتانی سەرکەش و یاخییە کە لە هەموو خێرێك داماڵراوە (١١٧) ئەو شەیتانەی کە خوا نەفرینی لێکردووە وتوویەتی: سو ێند بێت بە تۆ ئەی خوا بەشێکی دیاریکراو لە بەندەکانت دائەبڕم لە ئیمان و خواناسی (١١٨) سو ێند بێت بە تۆ گومڕایان دەکەم و بە ئاوات و خەیاڵ ی پووچەوە سەرگەرمیان دەکەم و خۆم فرمانیان پێدەدەم و هانیان دەدەم و ئەوجا ئەوانیش بێگومان گوێی ئاژەڵەکانیان دەبڕن، هەروەها فرمانیان پیَ دەدەم ئەوانیش دروست کراوانی خوا دەستکاری بکەن و بیگۆڕن (لەم سەردەمەدا ئەڵقە لەگو ێکانی بەناو زانا دەستکاریی جینات و سیفاتی ڕەچەڵەکیی دەکەن و بەگوێی شەیتان دەکەن، ئادەمیزادو زیندەوەران تێکدەدەن، جگە لەهەندێکیان نەبێت کە مەبەستیان خزمەتی ئادەمیزادە)، جا ئەوەی لە جیاتی خوا شەیتان بکاتە پشتیوانی خۆی، ئەوە بەڕاستی دووچاری زیان و خەسارەتمەندیەکی ئاشکرا بووە (١١٩) (شەیتان) بەڵێنیان دەداتیَ و ئاوات و ئارەزو دەڕازێنێتەوە بۆیان، دیارە کە شەیتانیش هیچ بەڵێنێکیان پێنادات جگە لە فریودان و خەڵەتاندن نەبێت)(النساء:١١٦-١٢٠).

●بەڵام دەربارەی چۆنیەتی دروستکردنی (حواء) لە یەکێك لە پەراسوەکانی ئادەم، ئەمە ڕاستیەکی غەیبە، تەنها خوای گەورە دەیزانێت، ئێمە نازانین چۆنە، خوای گەورە ڕاستی فەرمووە -کە ئەمە ماناکەیەتی- دەفەرموێت: (وە نەبێت من لەکاتی دروستکردنی ئاسمانەکان و زەویدا ئەوانم ئامادە کردبێت، بگرە هەتا لە دروست بوونی خۆشیان ئاگادارنین، بەڕاستی من هەرگیز ئەوانەی خەڵك گومڕا دەکەن نەمکردووە بەیارمەتیدەری خۆم و پشتم پیَ نەبەستوون)(الکهف:٥١).

●ئەو کەسانەی چون بۆ ئەو مەسەلەیەی، پەراسوەکە دیاریبکەن کە (حواء)ی لیَ دروستبووە، هیچ بەڵگەیەکیان نییە، چونکە نە لەقورئان و نە لە فەرمودەدا هیچی لەسەر نەهاتووە دیاری بکات، کە لە کام پەراسوە دروستبووە، تەنها خوا دەیزانێت.

## باسی دووەم:

## نیشتەجێ بوونی (حواء) لەگەڵ (ئادەم) لەبەهەشتدا:

ئەم باسە دابەش دەبێت بۆ دوو لایەن:

●لایەنی یەکەم: ڕونکردنەوەی مەبەست لەو بەهەشتەی کە ئادەم و حواء ی تیا نیشتەجێ بوو.

زانایانی ڕاو بۆچونی جیاوازیان هەیە سەبارەت بەو بەهەشتەی کە ئادەم و (حواء) ی تیا نیشتەجێ بوو، زۆرینەی زانایان دەڵێن: ئەو بەهەشتە بوو کە خوای گەورە بەڵێنی داوە لە قیامەتدا لەخوا ترسانی تیا نیشتەجێ بکات.

بەم بەڵگە ڕاستانەی لای خوارەوە بەڵگەیان لەسەر هێناوەتەوە:

١- کاتێك وشەی (الجنّة) لە قورئاندا دێت، یەکسەر بیری مێشك بۆ ئەوە دەچێت کە ئەوە بەهەشتی هەتا هەتایی یە، پیتی (ال) لە (الجنّة)دا بۆ (العهد الذهني)یە، ئیمامی (ابن قیم) دەفەرموێت: بەڵگە ئاشکراکان بۆ ئەوە دەچن کە ئەوبەهەشتە بووە کەخوا بەڵێنی داوە بە لەخواترسان: (هەروەها وتوویانە: (الجنّة) بە (تعریف) هاتووە -واتە ناسراوە-وەك لە ئایەتی: ﴿ اسْكُنْ أَنتَ وَزَوْجُكَ الْجَنَّةَ﴾(البقرة:٣٥). چونکە بەهەشتێك نییە کە خوا بەڵێنی بدات بەو کەسانەی کە لەگەڵیان دەدوێت، کە بیناسن و زانراو بێت تەنها بەهەشتی هەتا هەتایی نەبێت، کە بەڵێنی داوە بە لەخوا ترسان ئەم ناوە بۆتە ناوێکی ناسراو، وەك (المدینة، النجم، البیت، الکتاب) و هاوشێوەکانی چونکە بە جۆرێکە کە ناوەکە بە (معرف)ی هاتووە و گۆڕاوە بۆ (الجنة)ی بەڵێن پێدراو و ناسراو لەدڵی باوەڕدارانا، بەڵام ئەگەر مەبەستی بەهەشتێکی تر بوایە ئەوا بە (منکر) نەناسراوی دەیهێنا، یان دەیخستە پاڵ شتێکی (إضافة) کراو، یان (مقید)ی دەکرد و لە ناوەڕۆکی ئایەتەکەدا وا دەردەکەوت کە باخێکی سەر زەوی بێت، وەك ئایەتی: ﴿جَنَّتَيْنِ مِنْ أَعْنَابٍ﴾(الكهف ٣٢). هەروەها ئایەتی: ﴿وَلَوْلَا إِذْ دَخَلْتَ جَنَّتَكَ قُلْتَ مَا شَاءَ اللَّهُ﴾(الكهف:٣٩). چەندین ئایەتی تریش.[١٧]

---

[١٧] -حادي الأرواح إلى بلاد الأفراح لابن القيم.

(إبن كثير) دەڵێت: (زۆرینە لەسەر ئەوەن کە ئەو بەهەشتە بوو لە ئاسماندایە، کە بەهەشتی (المأوى)یە شوێنی ئارامگرانە ئەمە بەپێی ڕواڵەتی ئایەت و فەرمودەکان، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَقُلْنَا يَا آدَمُ اسْكُنْ أَنتَ وَزَوْجُكَ الْجَنَّةَ﴾(البقرة:٣٥). واتە: ئینجا وتمان: ئەی ئادەم خۆت و هاوسەرت لەم بەهەشتەدا ژیان بەرنەسەرو نیشتەجێ بن.[18]

٢-هەروەها بە ئایەتی -کە ئەمە ماناکەیەتی-دەفەرموێت: (خوای گەورە فەرمووی: ئیتر دابەزن هەندێکتان دوژمنی هەندێکتانن (شەیتان و دارو دەستەی دوژمنی ئێوەن و نەوەی ئادەمیش بەهۆی پیلانی شەیتانەوە دوژمنایەتی یەکتر دەکەن)، بۆتان هەیە لە زەویدا نیشتەجێ بوون و هۆی ڕابواردن و ژیان تا ماوەیەك (٢٤) خوا فەرمووی (پێیان): هەر لە زەویدا دەژین و لەوێش دەمرن و (تێکەڵ بەخاك دەبن، لە کاتی دیاری کراویشدا) هەر لە ناخیەوە دەهێنرێنە دەرەوە (بۆ لێپرسینەوە)(الأعراف:٢٤-٢٥).

ووشەی: ﴿اهبطوا﴾ لە ئایەتەکەدا واتە: لەشوێنی بەرزەوە دابەزن بۆشوێنی نزم، لەدوای ئەوەش هاتنی: ﴿وَلَكُمْ فِي الْأَرْضِ مُسْتَقَرٌّ﴾ بەڵگەیە لەسەرئەوەی کە پێشتر لەسەر زەویدا نەبوون.

پاشان ئەمە بەئایەتی: ﴿قَالَ فِيهَا تَحْيَوْنَ وَفِيهَا تَمُوتُونَ وَمِنْهَا تُخْرَجُونَ﴾(الأعراف:٢٥). دەکاتەوە (ئەگەر بەهەشتەکە لەسەر زەویدا بوایە، ئەوا ژیانی ئەوانی تیادەبوو لەپێش دەرکردنیاندا و لەدوای دەرکردنیشیاندا)[19].

٣-هەروەها بە فەرموودەی (الشفاعة)یش بەڵگەیان هێناوەتەوە، کە(حذيفة ی کوڕی اليمان) ووتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا هەموو خەڵکی کۆ دەکاتەوە، ئینجا باوەڕداران ڕاوەستن هەتا بەهەشتیان لێ نزیك دەخرێتەوە، ئینجا دێن بۆلای ئادەم (عليه السلام)و دەڵێن: ئەی باوکی هەمومان داوا بکە دەرگای بەهەشتمان بۆ بکرێتەوە ئەویش دەفەرموێت: ئایا هەر گوناهی باوکە ئادەم نەبوو ئێوەی لەبەهەشت دەرکرد؟ بەڕاستی من خاوەنی ئەو کارە نیم داوای بکەم بچن بۆلای ئیبراهیمی خەلیلی کوڕم..)[20].

(بەڵگەکان زۆرن لێرەدا ئەوەندەمان بەسە).

---

[18]- (قصص الأنبياء لأبن كثير)

[19]- حادي الأرواح إلى بلاد الأفراح لأبن قيم.

[20]- رواه مسلم في كتاب الأيمان.

● دەستەو کۆمەڵێکی تر وای بۆچوون، کە ئەو بەهەشتەی ئادم و (حواء)ی تیا نیشتەجێ بوو، ئەو بەهەشتە نەبوو کە خوای گەورە بەڵێنی داوە کە بۆ لە خوا ترسان بێت.
وتویانە: بەهە شتی هەتاهەتایی، کەس ناتوانێت لە دنیادا بچێتە ناوی، بەڵکو خوای گەورە بە کۆمەڵێك شێوە باسی کردوە، و دوورە کە خوای گەورە شتێك بەبێ سیفەتی خۆی باس بکات، بەوە باسی کردوە کە ماڵی هەتا هەتایی یە و شوێنی نیشتەجێ بوون و مانەوەیە، بەڵام ئادەم تیایدا نەمایەوە و تیایدا نیشتە جێ نەبو. و بەوە باسی کردوە کە ماڵی پاداشت و بە خشینی خوایی یە، و ئە وان لەوێدا ڕاسپێردران کە لەبەری ئەو دارە نەخۆن، بەڵکو نزیکیشی نەکەونەوە: ﴿فَكُلَا مِنْ حَيْثُ شِئْتُمَا وَلَا تَقْرَبَا هَٰذِهِ الشَّجَرَةَ فَتَكُونَا مِنَ الظَّالِمِينَ﴾(الأعراف:١٩).

واتە: (بخۆن لە هەرچی نازو و نیعمەتی ناو ئەو بەهەشتەیە چیتان دەوێت، بەڵام نزیکی ئەو درەختە مەکەونەوە، ئەگینا دەبن بە کەسانێك لە ستەمکاران).
هەروەها بەوە باسی کردوە کە ماڵی ئاشتی و ئارامی ڕەهایە، وشوێنی ناڕەحەتی و تاقیکردنەوە نییە، بەڵام ئادەم و (حواء)ی تیا تاقی کرایەوە، و بەوە باسی کردوە کە هەرگیز سەرپێچی خوای تیا ناکرێت، بەڵام ئادەم سەرپێچی پەروەردگاری تیادا ئەنجامدا، و بەوە باسی کردوە کە ماڵی دڵخۆش بوون و خۆشییە و خەفەت و ترسی تیا نییە، بەڵام ئادەم و هاوسەرەکەی کاتێك لە بەری درەختەکەیان خوارد، خەتابار بوون و پەشیمانبونەوە لە کارەکەیان، و بەوە باسی کردووە کە: ﴿لَا تَأْثِيمٌ﴾(الطور:٢٣).

واتە: (ڕەفتاری ناشیرین و گوناه و تاوانکردنی تیا نییە) بەڵام لەوێ ئیبلیس ڕەفتاری ناشیرینی نواند و وەسوەسەی بۆ ئادەم (علیه السلام) دروست کرد. ئە گەر بەهەشتی هەتا هەتایی بوایە، ئیبلیسی بە نەفرەتکراو چۆن دەیتوانی بچێتە ناوی و لەوێش دەرکرا؟

● کۆمەڵێکی زۆریش ڕەدی ئەم بۆچونە دەدەنەوە بە کۆمەڵێك بەڵگە کە لێرەدا باسیان دەکەین: بەوەی کە ئە وان دە ڵێن: بەهەشتی هەتاهەتایی لە دنیادا کەسی تێ ناچێت ئەمە ڕاستە، لەڕوی بەردەوامی و جێگیربونی هەمیشەییەوە، بەڵام بۆماوەی کاتی و کورت، پێش هاتنی ڕۆژی قیامەتیش ڕوو دەدات، وەك ئەوەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە شەوی (اسراء ومعراج)دا چووە ناو بەهەشت. ئێوە ئەوەتان لە کوێ هێنا کە چوونە بەهەشت لە دنیادا نابێت؟!

- وەی کە دەڵێن بەهەشت ماڵی بەخشش و پاداشتی خوایە نەك ماڵی تەکلیف کردن و ڕاسپاردن، بێگومان لە ڕۆژی قیامەتدا کە باوەڕدارانی تێدەچن تەکلیف نامێنێت، بەلاّم لە دنیادا تەکلیف قەدەغە ناکرێت و هەر دەبێت، هیچ بەڵگەیەك لەسەر ئەوە نییە کە بە تەواوی قەدەغە بێت.

-بەوەی کە دەڵێن: سەرپێچی خوای تیا ناکرێت وترس وخەفەت و غەم و پەشیمانی تیا نییە، بێگومان ئەوەش لە قیامەتدا دەبێت، کاتێك باوەرداران دەچنە ناوی و بە ژیانێکی پاك و خۆش تیایدا دەژین، بەلاّم کاتێك ئادەمی تێ چوو، بۆ ئەوە بوو کە نازو نیعمەتەکانی بناسێت ولێی شارەزا بێت و لە خەیر و بەرەکەتەکەی سودمەند بێت، و کاتێك لێی دەرکرا، زۆری حەز کرد بگەرێتەوە ناوی و کارێك بکات کە لەوێی نزیك بخاتەوە، سەرپێچی ئەو کەسەی کرد کە بویە هۆکاری دەرکردنی لەوێ.

خوای گەورە بە فریشتەکانی فەرموو: ﴿إِنِّي جَاعِلٌ فِي الْأَرْضِ خَلِيفَةً﴾(البقرە:٣٠).

واتە: (بەڕاستی من جێنشین لە سەر زەویدا دروست دەکەم).

دابەزینی ئادەم (علیه السلام) بۆ سەر زەوی، جێبەجێکردن و ڕاستیەك بوو بۆ ئەو قەدەرەی کە خوا بڕیاری دابوو بە حیکمەت و ویستی خۆی: ﴿قَالَ اهْبِطُوا بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ وَلَكُمْ فِي الْأَرْضِ مُسْتَقَرٌّ وَمَتَاعٌ إِلَى حِينٍ (٢٤) قَالَ فِيهَا تَحْيَوْنَ وَفِيهَا تَمُوتُونَ وَمِنْهَا تُخْرَجُونَ﴾(الاعراف:٢٤-٢٦).

(ابن كثير) لە وەلاّمی ئەو کەسانەدا کە دەڵێن: ئەگەر ئەو بەهەشتە، بەهەشتی هەتاهەتایی بێت، ئیبلیس چۆن توانی بچێتە ناوی دوای ئەوەی دەرکرابوو، دەفەرموێت: (قەدەغەی ئەوە ناکرێت کە لەسەر شێوەی تێپەڕبوون نەك مانەوە لەگەڵیاندا لە بەهەشتدا کۆ ببێتەوە و ئەو وەسوەسەی بۆ دروستکردن کە لەسەر دەرگای بەهەشت یان لەژێر ئاسماندا بوو).[٢١]

ئێمەش دەڵێین: ڕێگرێك نییە لەوەی کە وەسوەسەی ئیبلیس لە دەرەوەی بەهەشت بە شێوازێك کە ئێمە نایزانین گەیشتبێت بەئادەم (علیه السلام)، زانستی نوێ شایەتی لەسەر ئەوە دەدات و دڵنیایی دەکاتەوە، کە دەگونجێت پیاوێك لەم هەرێمەوە گفتوگۆ

[٢١]- قصص الأنبياء لأبن كثير

لەگەڵ کەسێکی تر لە ئەمریکا یان ئەورووپا یان ئاسیا بکات، و گفتوگۆکەیش بە شێوەی دەنگی و وێنەیی بەڕێوەبچێت، و ڕاستە و خۆ لە هەوادا ئەنجام بدرێت.
لەمەوە ڕێگرێك نابێت کە ئیبلیس لە دەرەوەی بەهەشت وەسوەسە دروست بکات، و بگاتە ئادەم (علیه السلام) و(خواش زاناترە).
(بۆچون ولێکدانەوەکان زۆرن، لێرەدا ئەوەندەمان بەسە تا خوێنەر بێزار نەبێت و دوورنەکەوێتەوە).

● لایەنی دووەم: شی کردنەوەی ئەو ئایەتانەی کە دەربارەی نیشتەجێ بوونی ئادەم و (حواء)ی هاوسەری لەبەهەشتدا هاتون:

١_خوای گەورە لە سوورەتی (البقرة)دا فەرمویەتی: ﴿وَقُلْنَا يَا آدَمُ اسْكُنْ أَنتَ وَزَوْجُكَ الْجَنَّةَ وَكُلَا مِنْهَا رَغَدًا حَيْثُ شِئْتُمَا وَلَا تَقْرَبَا هَٰذِهِ الشَّجَرَةَ فَتَكُونَا مِنَ الظَّالِمِينَ﴾(البقرة:٣٥).

٢_لە سوورەتی (الاعراف)دا فەرمویەتی: ﴿وَيَا آدَمُ اسْكُنْ أَنتَ وَزَوْجُكَ الْجَنَّةَ فَكُلَا مِنْ حَيْثُ شِئْتُمَا وَلَا تَقْرَبَا هَٰذِهِ الشَّجَرَةَ فَتَكُونَا مِنَ الظَّالِمِينَ﴾(الأعراف:١٩).

٣_لە سوورەتی (طه)دا فەرمویەتی: ﴿وَلَقَدْ عَهِدْنَا إِلَىٰ آدَمَ مِن قَبْلُ فَنَسِيَ وَلَمْ نَجِدْ لَهُ عَزْمًا (١١٥) وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَائِكَةِ اسْجُدُوا لِآدَمَ فَسَجَدُوا إِلَّا إِبْلِيسَ أَبَىٰ (١١٦) فَقُلْنَا يَا آدَمُ إِنَّ هَٰذَا عَدُوٌّ لَّكَ وَلِزَوْجِكَ فَلَا يُخْرِجَنَّكُمَا مِنَ الْجَنَّةِ فَتَشْقَىٰ (١١٧) إِنَّ لَكَ أَلَّا تَجُوعَ فِيهَا وَلَا تَعْرَىٰ (١١٨) وَأَنَّكَ لَا تَظْمَأُ فِيهَا وَلَا تَضْحَىٰ﴾(طه:١١٥-١١٩).

(القرطبی) زانای تەفسیر دەڵێت: لە ئایەتی: ﴿اسْكُنْ﴾دا ئاگادارکردنەوەیەك هەیە بۆ دەرچون لێی، چونکە شوێنی نیشتەجێ بوون نابێتە موڵك، لەبەر ئەوەی هەندێك لە خواناسان وتویانە: (سکنی) بۆ ماوەیەك دەبێت و پاشان تەواو دەبێت، چونی ئادەم و (حواء) بۆ ناو بەهەشت، چونێکی کاتی دیاریکراو بوو، نەك مانەوەی هەمیشەیی.[٢٢]
ووشەی (الْجَنَّةِ) لە (الجن)ەوە هاتووە واتە: شاردنەوە وداپۆشینی شتێك لە هەستەکان، وتراوە: (جَنَهُ الليلُ واجنَهُ وجنَ عليه فجنهُ) واتە: داپۆشی (الجنان) واتە (القلب) لەبەر ئەوەی لە هە ستەکانەوە دیار نییە (الْجَنَّةِ) واتە: باخێك پڕبێت لە درەختی زۆری گەڵادار

---

[٢٢] (تفسير القرطبي).(جامع لأحكام القرآن).

ێ سێبەر دروست بکات، بۆ ئەوەی هەرکەس چووە ناوی لە ناو درەختەکانیدا شاراوە بیت لەچاوی خەڵکی، و ناونراوە بە: (الْجَنَّةِ الأخرة) چونکە درەختەکانی زۆرن و سێبەرەکەی دوور و درێژە، وتراوە: ناز ونیعمەتەکانی ناوی شاراوە و داپۆشراون لێمان، هەموو شتانێکی تیایە کە حەزی لێ بکەین، و لە سەرو ئەوەشەوە تیایەتی.

خوای گەورە فەرمویەتی: (هەمو شتێکی تیایە کە نەفسەکان حەزی پێبکەن وچاو لەزەت لە بینینی وەرگرێت)(الزخرف:٧١).

لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت: (جا هیچ کەس لەو بەختەوەرانە نازانێت، چی بۆ هەڵگیراوە وشاراوەتەوە لە ناونیعمە تی جۆراو جۆر لای پەروەردگار، جا چاوان پێی گەش دەبنەوە و بەدیتنی شاد دەبن لە پاداشتی کار وکردەوەی چاك وپاکیاندا کە ئە نجامیا دەدا) (السجدة:١٧).

ئەو بەهەشتەی کە لە ئایەتی: ﴿اسْكُنْ أَنتَ وَزَوْجُكَ الْجَنَّةَ﴾دا هاتوە، ئەوە بەهەشتی هەتا هەتاییە، لەسەر ڕا و بۆچونی زۆرینە، ئادەم و هاوسەرەکەی چونە ناوی، کە ڕێز و تاقیکردنەوەی تیابوو بۆیان، هەتا ناز و نیعمەتەکەی بناسن و زۆرترین شەوقیان هەبێت بۆی، چونکە هەر کەس تامی ناز ونیعمەتەکانی بکات دەیناسێت.

ئایەتی: ﴿وَكُلَا مِنْهَا رَغَداً حَيْثُ شِئْتُمَا﴾ فەرمانێك بوولە خوای گەورەوە بۆ ئادەم وحەواء، کە لە ناز و نیعمەتی ئە و بەهەشتە بخۆن، بە شێوەی فراوان و زۆر.

(الرغد) ژیانێکی فراوان و پڕ لە ناز و نیعمەتە کە کۆتای نایەت.

خاوەنی (المفردات) دەڵێت: (ژیانێکی خۆش و پاك و فراوانە).

خوای گەورە فەرموویە تی: ﴿وَكُلَا مِنْهَا رَغَداً﴾(البقرة:٣٥).

هەروەها لە ئایەتێکی تردا فەرمویە تی: ﴿يَأْتِيهَا رِزْقُهَا رَغَداً مِّن كُلِّ مَكَانٍ﴾(النحل:١١٢).[٢٣]

ئایەتی: ﴿حَيْثُ شِئْتُمَا﴾ واتە: (لە هەر شوێنێك لە بەهەشتدا کە خۆتان بتانەوێت و حەزی پێ بکەن).

ئایەتی: ﴿وَقُلْنَا يَا آدَمُ اسْكُنْ أَنتَ وَزَوْجُكَ الْجَنَّةَ﴾ گفتو گۆ و ووتەیە بۆ ئادەم (علیه السلام) بە شێوەی سۆز و خۆش ویستی و بەزەیی و وەرگرتن و پێگەیشتن پاش ئەوەی کە بە

---

[٢٣] المفردات للراغب الأصبهاني مادة (ر غ د).

دوورخستنەوە و پشت هەڵکردن گفتوگۆی لە گەڵ ئیبلیس کرد خوای گەورە ڕووی کردە ئادەم (علیه السلام) پێی فەرموو: ﴿وَقُلْنَا يَا آدَمُ اسْكُنْ أَنتَ وَزَوْجُكَ الْجَنَّةَ وَكُلَا مِنْهَا رَغَدًا حَيْثُ شِئْتُمَا﴾ واتە: (خۆت و هاوسەرەکەت لە خواردنی بەتامی بەهەشت بخۆن نۆشی گیانتان بێت کە کۆتایی نایەت، کە ژیانێکی بەرفراوان و پڕ لە ناز و نیعمەت و خەیر و بەرەکەتە و لەویێ دەست دەکەوێت و کۆتایی نایەت.

لێرەدا بە ڕەها باسی خواردنی کرد، بە فراوانی بۆ ئادەم و حەواء هەتا عوزریان نەبێت، کە نزیك بکەونەوە لە درەختە قەدەغە کراوەکان، ﴿وَلَا تَقْرَبَا هَٰذِهِ الشَّجَرَةَ فَتَكُونَا مِنَ الظَّالِمِينَ﴾، واتە: (بە هیچ شێوەیەك نزیکی ئەو درەختە مەبنەوە، ئەگینا دەبن بەکەسانێك لەستەمکاران)، ئەمەش بۆ (مبالغة) بوو، تا بە تەواوی نەهییان لێبکات، نەك لە خواردنەکەی تەنانەت لە نزیك بونەوەشی.

- دەربارەی ئەودرەختە قەدەغە کراوەش دەڵێن: ڕوەکی گەنم بوە و دەڵێن: مێوەی ترێ بووە، هەروەها شتی تریش دەڵێن بەڵام نە لە قورئان ونە لە فەرمودەدا هیچی دەربارە نەهاتووە، لەبەر ئەوە پێویست بە خۆ ماندوکردن ناکات بگەڕێین بە دوایدا.
- بانگ کردنی ئادەم بەناوی خۆی ولەنزیکەوە، بۆ ڕێزگرتن وخۆشەویستی ورشتنی ناز و نیعمەت بوو بەسەریدا، لە سوورەتی (الأ عراف)دا، دەستەواژەی: ﴿وَيَا آدَمُ﴾ی بەکارهێنا، چونکە خوای گەورە پاش ئەوەی گفتوگۆی کرد لەگەڵ ئیبلیس، دوری خستەوە و هەڕەشەی لێکرد و بەسوك سەیری کرد، ئینجا ئەویش ڕۆیشت. خوای گەورە فەرموی: ﴿قَالَ فَاهْبِطْ مِنْهَا فَمَا يَكُونُ لَكَ أَن تَتَكَبَّرَ فِيهَا فَاخْرُجْ إِنَّكَ مِنَ الصَّاغِرِينَ﴾(الاعراف:١٣).

هەروەها فەرموی: ﴿قَالَ اخْرُجْ مِنْهَا مَذْءُومًا مَّدْحُورًا لَّمَن تَبِعَكَ مِنْهُمْ لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنكُمْ أَجْمَعِينَ﴾(الأعراف:١٨).

واتە: (خوا فەرموی: لە بەهەشت دەرچۆرە دەرەوە بە سەر شۆڕی و ڕسوایی و دەرکراوی، سوێند بەخوا ئەو کەسەی شوێنت کەوت لەوان، ئەوە بێگومان دۆزەخ پڕ دەکەم لە ئێوە هەموو.) پاش ئەو هەڕەشەیە، خوای گەورە ڕوی کردە ئادەم (علیه السلام)و پێی فەرموو: ﴿وَيَا آدَمُ اسْكُنْ أَنتَ وَزَوْجُكَ الْجَنَّةَ﴾. خوای گەورە لە ئایەتەکەدا ووشەی ﴿اسْكُنْ﴾ی هێنا بۆ ئادەم (علیه السلام) و دواتریش فەرمووی: ﴿وَ كُلَا﴾ بۆ

ئادەم وحەواء هەردووکیان پێکەوە، چونکە ئادەم و حەواء، لە خواردندا یەکسانن، بە پێچەوانەی شوێنی نیشتەجێبوونەوە، چونکە حەواء شوێن ئادەم کەوتووە، گفتوگۆکە دەربارەی خواردنەکە پێکەوە بوو، گشتی بوو، ڕێزگرتن وناز ونیعمەت ومۆڵەت پێدانی تیابوو، بە یەکسانی و ڕاستەوخۆ و ئامادەکردنێك بوو، بۆ ئەوەی هەردووکیان خۆیان بە دوور بگرن لە نزیك کەوتنەوە لە درەختە قەدەغە کراوەکە.

## بەڕاستی بەهەشتە!!

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَائِكَةِ اسْجُدُوا لِآدَمَ فَسَجَدُوا إِلَّا إِبْلِيسَ أَبَى (١١٦) فَقُلْنَا يَا آدَمُ إِنَّ هَذَا عَدُوٌّ لَكَ وَلِزَوْجِكَ فَلَا يُخْرِجَنَّكُمَا مِنَ الْجَنَّةِ فَتَشْقَى﴾(طه/١١٦-١١٧).

واتە: (سەردەمێك بە فریشتەکانمان وت: سوژدە بەرن بۆ ئادەم، هەموو سوژدەیان برد جگە لە ئیبلیس کە سەرسەخت و یاخی بوو، جا وتمان ئەی ئادەم، بەڕاستی ئەم (ئیبلیسە) دوژمنی خۆت و هاوسەرەکەتە، ووریا بن لە بەهەشت بەدەرکردنتان نەدات، بەو هۆیەوە توشی ناخۆشی و نەگبەتی و دەربەدەری ببن، دڵنیایش بە تۆ لە بەهەشتدا نەبرسیت دەبێت نەڕوت و ڕەجاڵ دەبیت و نە تینویشت دەبێت و نەگەرمایش زۆرت بۆ دەهێنێت). دوای چەند سزا و ئازار خوا بیەوێت پێمان بچێژێت پشت بە خوا دەچینە ئەو بەهەشتە بێ ئەوەی ئیتر ترسی جەنگی شەیتانمان بێت تیایدا و بەدەرکردنمان بدات، دەگەڕێینەوە بۆ نیشتیمانی یەکەم جارمان دەچینە ئەو بەهەشتەی کە هەمو شتێك بمانەوێت ئامادەکراوە، ناز و نیعمەتی وای تێدایە کە تۆ لەم ژیانەدا هەر ئاگات لێی نییە و بە بیرتاندا نەهاتووە، پۆشتە و پەرداخن بە جوانترین پۆشاك، خوا یەکەم جار باوکە ئادەم و دایکە حەوای تیادا بە پۆشتە دانا، بەڵام بەداخەوەئەم ڕوت و بێ پۆشاکی ئافرەتە کە ئێستا باوە، ئەمە مۆدێلی وولاتە ڕۆژئاواییەکانە کە دوورن لە ڕەوشتی ئیسلامەوە خوا نیعمەتی چوونە بەهەشتی بەخشی بە باوکە ئادەم، بەڵام بە تەنها نا، بەڵکو لەگەڵ دایکە حەوادا، ئەمە مژدە دەبەخشێت بە ئوممەتی خوا، هەموو پیاوێکی خواناس لەگەڵ هاوسەرە خواناسەکەیدا لە بەهەشتدا پێکەوە دەبن، بۆیە جێگەی خۆیەتی پیاوان هەوڵی دڵسۆزانە بدەن لەگەڵ هاوسەرەکانیاندا پێکەوە ڕێگای بەهەشت

بگرنە بەر، پیاوان هاوسەرەکانیان بە نیعمەتێکی زۆرگەورەی خوا بزانن، چونکە ژیانی پیاوانی بێ ژن خۆش نییە.

هەندێك لە پیاوان هەن دەڵێن: ئایا هاوسەرێتی بۆ دنیا تەواو نییە ژیانیان پێکەوە بەرنە سەر، ئیتر بۆچی لە بەهەشتدا هەر پێکەوە بن؟ بەو پیاوانە دەڵێم: هەرگیز گومانی وامەکەن و مەزانن ژیانی بەهەشت بەبێ هاوسەرەکەی دنیا خۆشترە، بەڵکو ئەو ژیانی هاوسەری دنیایە بە خۆشەویستییەوە زۆر خۆش دەبێت لە بەهەشتدا وەك ژیان لەگەڵ ئافرەتانی تردا لە بەهەشتدا. هیچ سۆز و خۆشەویستییەکی دوو هاوسەر نییە خۆشتر لەوە دوو دووهاوسەرەکە بە خۆشەویستی خوا و گوێڕایەڵی خواوە ژیان بەسەربەرن.

## ڕونکردنەوەی ئەو ئایەتانەی کەلە سوورەتی: ( طه )دا هاتون دەربارەی نیشتەجێ بونی ( ئادەم ) و( حواء ) لە بەهەشتدا

خوای گەورە فەرموی: ﴿فَقُلْنَا يَا آدَمُ إِنَّ هَذَا عَدُوٌّ لَكَ وَلِزَوْجِكَ فَلَا يُخْرِجَنَّكُمَا مِنَ الْجَنَّةِ فَتَشْقَى(١١٧) إِنَّ لَكَ أَلَّا تَجُوعَ فِيهَا وَلَا تَعْرَى(١١٨) وَأَنَّكَ لَا تَظْمَأُ فِيهَا وَلَا تَضْحَى﴾(طه:١١٧-١١٩). پاش ئەوەی کە ئیبلیس سوجدە بردنی بۆ ئادەم (علیه السلام) ڕەتکردەوە و بەو کارە سەرپێچی فەرمانی خوای کرد، خوای گەورەیش لە ڕەحمەت و بەزەیی خۆی دەری کرد، و قامچی توڕەبونی خۆی پیاکێشا، پاشان خوای گەورە ڕوی کردە ئادەم (علیه السلام) و ئاگاداری کردەوە لە نەخشە و فێڵ و سەر لێتێکدانەکانی ئیبلیس و پێی فەرموو: (ئەی ئادەم بەراستی ئەم ئیبلسە دوژمنی تۆ و هاوسەرەکەیشتە)(طه:١١٧)، بەمە پێویست بوو لەسەر هەردووکیان کە ئاگادار بن، وەك خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا _کە ئەمە ماناکەیەتی_ فەرموی: (ئەی خەڵکینە دڵنیابن، بەڵێنی خوا ڕاست ودروستە (قیامەت بەرپادەکات ولە هەموکەس دەپرسێتەوە) کەوا بوو ژیانی ئەم دونیایە سەرتان لێ نەشێوێنێت وشەیتان نەتان خەڵەتێنێت بەناوی ڕەحم وبەزەی خواوە (کە گوایە هەرچی بکەن خوا بە بەزەییە و لێتان خۆش دەبێت (٥) چونکە بەڕاستی شەیتان دوژمنتانە، ئێوەیش بەدوژمنی خۆتانی دابنێن، بێگومان بانگی تاقم ودارو دەستەی خۆی دەکات بۆئەوەی ببنە نیشتەجێی دۆزەخ (٦))(فاطر:٥-٦).

﴿فَلَا يُخْرِجَنَّكُمَا مِنَ الْجَنَّةِ﴾ واتە: با شەیتان نەبێتە هۆکار بۆ دەرکردنتان لە بەهەشت، بە هۆی وەڵام دانەوەتان بۆ وەسوەسەکانی، چونکە ئەگینا: ﴿فَتَشْقَى﴾ توشی نارەحەتی دنیایی و ماندویی ژیان دەبن لە داواکردنی ژیانی خۆش.

خوای گەورە (الشقاء) نارەحەتییەکەی نیسبەت دایە پاڵ ئادەم، لەگەڵ ئەوەی کە دەرکردنەکەی دایە پاڵ هەردوکیان.

● (القرطبي) دەڵێت: (ئادەمی تایبەت کردبە باسی (شقاء) و نەیفەرمو: (فَتشقيا) بۆئەوەی تا ئێمە تێبگەین کە نەفەقەی خێزان لەسەر مێردەکەیەتی.[٢٤]

ئایەتی: ﴿إِنَّ لَكَ أَلَّا تَجُوعَ فِيهَا وَلَا تَعْرَى(١١٨) وَأَنَّكَ لَا تَظْمَأُ فِيهَا وَلَا تَضْحَى﴾(طه:١١٨-١١٩).

● گفتوگۆکە لێرەدا بەرامبەر ئادەمە (عليه‌السلام)، حەواء شوێنکەوتوی ئەوە، هەرچی بە ئادەم بگات، بەویش دەگات، واتە: بێگومان لە بەهەشتدا بە هەمیشەیی خواردن وجل وبەرگی پۆشتەکردنەوە وخۆداپۆشین هەیە، هەروەها تینویش نابیت، گەرمی خۆریش ئازارت نادات.

چونکە بەهەشت تیشکی خۆر و گەرمی تیا نییە، بەڵکو تەنها ڕوناکی ونوری تیایە، وسێبەری چڕ ودرێژ وبەردەوامی تیایە.

خوای گەورە لە سوورەتی (النساء)دا، -کە ئەمە ماناکەیەتی- فەرمویەتی: (ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە وکار وکردەوەی چاکە ئەنجام دەدەن، لە ئایندەیەکی نزیکدا دەیانخەینە ناو باخەکانی بەهەشتەوە کە چەندەها ڕوبار (بە ژێر درەختە کانیدا وبە بەردەم کۆشکەکانیدا) دەڕوات و لەوێدا ژیانی هەمیشەیی و بەردەوام دەبەنە سەر، هاوڕێ لەگەڵ چەندەها هاوسەری پاك وبێگەرد وخاوێن و پاکیزەدا، هەروەها دەیانخەینە ژێر سایەی سێبەری جوان و ڕازاوەی هەمیشەیی یەوە).

(زۆر ئایەتی تر هەن کە باسی ناز و ونیعمەتی بەهەشت و سێبەرەکانی دەکەن)

---

[٢٤] الجامع لأحكام القرآن للقرطبي.

## دابەزین...
## پەیمانی شەیتان بۆ دوژمنایەتی

دەمانەوێت بڕیاری دوژمنایەتی شەیتان بدەین، وەکو چۆن شەیتان بڕیاری دوژمنایەتی ئێمەی داوە ئەوە لە دوای ئەوە تا ڕۆژی قیامەت. خوای گەورە لەسەر زمانی ئیبلیسەوە فەرموویەتی: ﴿قَالَ أَرَأَيْتَكَ هَذَا الَّذِي كَرَّمْتَ عَلَيَّ لَئِنْ أَخَّرْتَنِ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ لَأَحْتَنِكَنَّ ذُرِّيَّتَهُ إِلَّا قَلِيلًا (٦٢) قَالَ اذْهَبْ فَمَنْ تَبِعَكَ مِنْهُمْ فَإِنَّ جَهَنَّمَ جَزَاؤُكُمْ جَزَاءً مَوْفُورًا (٦٣) وَاسْتَفْزِزْ مَنِ اسْتَطَعْتَ مِنْهُمْ بِصَوْتِكَ وَأَجْلِبْ عَلَيْهِمْ بِخَيْلِكَ وَرَجِلِكَ وَشَارِكْهُمْ فِي الْأَمْوَالِ وَالْأَوْلَادِ وَعِدْهُمْ وَمَا يَعِدُهُمُ الشَّيْطَانُ إِلَّا غُرُورًا﴾(الأسراء/٦٢-٦٤).

واتە: ((ئیبلیس بێ شەرمانە)وتی:پێم بڵێ ئا ئەمەیە کە ڕێزیت داوە بەسەر مندا؟! سوێند بە خوا ئەگەر دوام بخەیت تا ڕۆژی قیامەت ئەوە بێگومان هەموو نەوەکانی گومڕا و سەرگەردان دەکەم جگە لە کەمێکیان (کە دەستەڵاتم بەسەریاندا نییە). خوای پەروەردگار فەرمووی: بڕۆ ئەوەی شوێنی تۆ بکەوێت لەوان، ئەوە بێگومان دۆزەخ پاداشتی هەموانتانە، کە پاداشتێکی مسۆگەرە و جێگەی هەموتانی تێدا دەبێتەوە..، بڕۆ چیت لە دەست دێت درێخی مەکە، هەر کەس کە توانیت (لەو بەدبەختانە) بە بانگ کردن و هاندانیان بۆ تاوانکاری، دایانبڕە، بەهۆی لەشکری سوارە و پیادەی خۆتەوە هێرشیان بۆ بەرە و هاوبەشیان بکە لە ماڵ و سامان و منداڵ و نەوەیاندا، (بە سامانی حەرام و منداڵی زۆڵ...هتد)، ئەوەندەش بەڵێن و ئومێدیان پێ بدە، سەریان لێ بشێوێنە، هەر چەندە بەڵێن و هاندانی شەیتان جگە لە فریودان و فێڵ کردن و ساختە، شتێکی تر نییە). دەبینیت کە شەیتان بە هەموو سوپاکەیەوە چەندە ئامادەیە بۆ دوژمنایەتی ئادەمیزاد بە سوپای سوارە و پیادەو بە دەنگ و بە هەموو شتێك، ئەی تۆ ئەی ئادەمیزاد چیت ئامادە کرد لە هێز بۆ جەنگ لەگەڵ ئەو دوژمنە ئامادەیەتدا؟!

## تێگەیشتنێك لەگەڵ ئارەزوودا بگونجێت

هەندێك لە پیاوان هەن کاتێك باسی ناتەواوی ئافرەت دەکرێت لە دین و لە عەقڵدا، پێی خۆشە ئەوە بکات بە بیانویەك بۆ بە سووك تەماشاکردنی ئافرەت، تەنها لەبەر حەزێکی خۆی. لێکدانەوەی ڕاست و دروستی ناتەواوی ئافرەتان لە دین و عەقڵدا بە ئەندازەیە نەك چۆنێتی، بەم شێوەیە ئافرەت بەهۆی سوڕی مانگانەوە ئەو ماوەیە نوێژ و ڕۆژوویان لەسەر نییە، بەڵام پاشتر ڕۆژووەکە قەزا دەکەنەوە، بەڵام نوێژەکان قەزا ناکەنەوە، کەواتە ناتەواوی دینیان ئەو چەند ڕۆژە نوێژ نەکردنەیە، ئەگینا زۆر ئافرەت هەن ئاستی دینیان زۆر بەرزترە لەپیاوان. کەوابوو ناتەواوی ئافرەت لەدیندا لەم ڕوانگەیەوەیە. ناتەواوی ئافرەت لەڕووی عەقڵییەوە ئەوە نییە کە عەقڵیان لە پیاوان کەمتر بێت، بەڵام ئافرەتان سۆز وعاتیفەیان لەپیاوان زیاترە، بەو جۆرە نییە کە سۆز و عاتیفەکەیان زیاتر دەبێت لە عەقڵەکەیان، ئەمە کاری خوایە و بێ حیکمەت نییە.

## ئادەم و هاوسەرەکەی لە بەهەشتدا

پاش ئەوەی کە خوای گەورە ئیبلیسی لە بەهەشت دەرکرد لەبەر خۆ بەگەورەزانینی و ڕەتکردنەوەی سوژدە بردن بۆ باوکە ئادەم، ئینجا خوای گەورە ئادەم و حەوای لەناو بەهەشتدا نیشتەجێ کرد، و ڕێگەی پێدان کە لە هەموو بەرو بومێکی ناو بەهەشت بخۆن لەوەی کە خۆیان دەیانەوێت و حەزیان لێیەتی، تەنها لەبەری درەختێك نەبێت، کە خوای گەورە بۆی دیاریی کردبوون و لێی قەدەغە کردبوون، خوای گەورە فەرمووی: ﴿وَيَا آدَمُ اسْكُنْ أَنتَ وَزَوْجُكَ الْجَنَّةَ فَكُلَا مِنْ حَيْثُ شِئْتُمَا وَلَا تَقْرَبَا هَذِهِ الشَّجَرَةَ فَتَكُونَا مِنَ الظَّالِمِينَ﴾ (الأعراف/١٩). نەهی کردن لە نزیك کەوتنەوە لە شتێك، ئەوە بەهێزترە لە نەهی کردن لە شتەکە خۆی، کە ئەوە دەگەیەنێت کە خۆ بەدوور بگیرێت لە هەموو گومان وشوبهەیەك کە کەسی قەدەغە لێکراو تووشی هەڵنان و تێکەوتن بکات و نەتوانێت خۆی دەرباز بکات، ئەو کەسەیشی کەوتە ناو (شبهات) ئەو شتانەی کە گومان و دوو دڵییان تێدایە، ئەوە کەوتۆتە ناو حەرام و قەدەغەکراوەوە، وەك شوانێك کە گەلە مەڕەکەی لە

دەوری خەرمانێك بلەوەڕێنێت کە نزیك بێت بچنە ناوی، وەك لە فەرموودە پیرۆزەکەی پێغەمبەردا ﷺ هاتووە.[25]

ڕوونکردنەوەی ڕاست و دروست بۆ خواردن لە ڕووەکە قەدەغەکراوەکە:

ئەوەی لێکدانەوەی ڕاست و پەسەند بێت دەربارەی هۆکاری خواردن لە بەری درەختە قەدەغەکراوەکە لەلایەن ئادەم و حەواوە، کۆمەڵێك هۆکار بوون لەوانە: نەفسی ئادەم، و ئەوەی کە ئیبلیس پێی وتن، بە کورتی ڕوونیان دەکەینەوە:

یەکەم: لەبیرچونەوەی ئادەم: خوای گەورە فەرموویوتی: ﴿وَلَقَدْ عَهِدْنَا إِلَىٰ آدَمَ مِن قَبْلُ فَنَسِيَ وَلَمْ نَجِدْ لَهُ عَزْمًا﴾(طه/١١٥).

واتە: (سوێند بەخوا بیگومان ئێمە پێشتر پەیمانمان لە ئادەم وەرگرت (کە نزیکی درەختی قەدەغەکراو نەکەوێت) کەچی بیری چوو بە مەرجێك نەمانبیبنی پێشتر بڕیاری کردنی ئەو سەرپێچییە بدات). ئەگەر ئادەم بڕیارەکەی لە یاددا بمایە و بیپاراستایە، ئەوا شەیتان هەڵی نەدەخەڵەتاند و نەی دەتوانی سەری لێ تێك بدات.[26]

پێشەوا (الرازي) دەربارەی ووشەی (فَنَسِيَ) دەڵێت: دەربارەی لە بیرچوونەوەی ئادەم دوو لێکدانەوە و بۆچوون هەیە:

یەکەمیان: ئەوەیە کە پێچەوانەی لەیادبوونە، و گلەیی و گازندەی لێ کرا لەسەر ئەوەی کە نەیتوانی بیپارێزێت و خۆی ڕاگرێت تا ئەوە بوو لە بیرچوونەوە دروست بوو.

دووەمیان: مەبەست لە (النسیان) واتە: (الترك) واتە: جێی هێلاً و وازی لێ هێنا، واتە: وازی لەوە هێنا و جێی هێلاً کە ئاگادارکردنەوەی پێ درابوو لەسەر ئەوەی کە لە بەرووبوومی درەختەکە نەخوات: ﴿وَلَمْ نَجِدْ لَهُ عَزْمًا﴾ واتە: نەمانبینی پێشتر بڕیاری ئەو سەرپێچییە بدات.[27]

دووەم: ئەو بیرچوونەوەیەی کە تووشی ئادەم هات بەو مانایەی کە پێشەوایان (الرازي و القاسمي) باسیان کرد، بۆ ئەوە بوو تا بە قسەو داواکەی ئیبلیس هەڵخەڵەتا، ئەوەیش بە چەند هۆکارێك لەو ڕوویدا:

---

[25] -تفسیرالمنار/٨/٣٤٦

[26] -تفسیرالقاسمي ١١/١٩٧ بەدەست کاری یەوە.

[27] -تفسیرالرازي ٢٢/١٢٤ بەدەست کاری یەوە.

١-بەوەی کە (إبن حزم) باسی کردووە لە (تأويل) تەئویل کردن بۆ قەدەغەکردنی خوای گەورە بۆ ئادەم کە لەو درەختە نەخوات.

٢-بەوەی کە پێشەوا (إبن تيمية) باسی کردووە لە گومانی ئادەم بە ڕاستگۆیی ئیبلیس لە سوێندەکەیدا، چوونکە ئادەم وا گومانی بردبوو کە هەرکەس سوێندی بە خوای گەورەخوارد درۆزن نییە، ئەگەر ئەویش لە بەری درەختەکە بخوات ئەوا لە بەهەشت دەرناچێت و بەدڵنیایی ئەو کارەیش جێ بەجێ دەکات لەسەر ئەوەی کە لەبەری درەختەکەی خوارد ئەویش بە ئەنجامدانی تەوبە یان شتێك لەو بچێت و پاشان ڕزگاری ببێت.

٣-بەڕاستی ئیبلیس هەندێك شتی لەناو دەرونی ئادەمدا وروژاند لەو شتانەی کە لەسەری ڕاهاتبوو لە خۆشەویستی بەرزبوونەوە و گەیشتن بە پلە بەرزەکان، لەوانە پلەی فریشتەکان و حەز بە نەمری کە ئینسان بکەوێتە ناو ناز و نیعمەتەوە، خوای گەورە دەربارەی قسەکەی ئیبلیس بۆ ئادەم و هاوسەرەکەی فەرموویەتی: ﴿وَقَالَ مَا نَهَاكُمَا رَبُّكُمَا عَنْ هَذِهِ الشَّجَرَةِ إِلَّا أَنْ تَكُونَا مَلَكَيْنِ أَوْ تَكُونَا مِنَ الْخَالِدِينَ﴾(الأعراف/٢٠). ئیبلیس ئەم بانگەشەی هێنا و بڵاوی کردەوە و سوێندی لەسەر دەخوارد بە خوای گەورە. ﴿وَقَاسَمَهُمَا إِنِّي لَكُمَا لَمِنَ النَّاصِحِينَ﴾(الأعراف/٢١) واتە: (ئەوسا شەیتان زانی دەترسن و دوودڵن) سوێندی بۆ خواردن کە من بەڕاستی لە ئامۆژگارانم بۆ ئێوە و دڵسۆزتانم). هەموو ئەمانەیش ئاسانکاری بوون بۆ ئەوەی ئادەم بکەوێتە ناو لە بیرچوونەوە لەوەدا کە پەیمانی دابوو بەپەروەردگاری کە لە درەختەکە نەخوات.[٢٨]

## لە هۆکارە گشتییەکانی خۆپاراستن لە شەیتان:

١-باوەڕبوون بە خوا و پشت بەستن پێی.

٢-دەست هەڵگرتن لەتاوان وسەرپێچی.

٣-دنیا نەویستی و خۆ هەڵنەخەڵەتاندن و خۆتە فرەنەدان بەدنیاوە.

٤-پەنا گرتن بە خوای گەورە لەشەیتان.

---

[٢٨] -المستفاد من قصص القرآن.الدكتور عبدالكريم الزيدان، ١/٢٠-٢١).

٥- وتنی ووشەی جوان و بەسوود و هەوڵدان بە چاکترین و جوانترین شێوە پاڵ بەهەڵەو ناڕێکی ناحەزانەوە بنرێت.

٦- دەرخستنی نەخشەو داو و مەترسییەکانی شەیتان و کێشانیان بە تەرازووی ئیسلام.

٧-گرنگی و پێویستی بوونی هۆکارە گشتییەکانی خۆ پاراستنی بانگخوازان و دەستە و کۆمەڵەکانیان لە فێڵ و نەخشەکانی شەیتان.[٢٩]

[٢٩] - -المستفاد من قصص القرآن.الدكتور عبدالكريم الزيدان(١/٧٠).

## باسی سێیەم:
## وەسوەسەی شەیتان بۆ ( ئادەم ) و( حواء )ی هاوسەری:

**خوای گەورە ئادەم وحەوائی لە بەهەشتدا نیشتەجێ کرد ، و ڕێگەی پێدان کە لە بەرو بوومەکانی ناو بەهەشت بخۆن ولەزەت لەشتە پاك وخۆشەکانی وەربگرن، هەروەها نەهی لێکردن کە لە بەری درەختێك بخۆن، و ئاگاداری کردن لە وەسوەسەکانی شەیتانی بەنەفرەت کراو، کە ئەودەبێتە هۆکاری دەرکردنیان لەبەهەشت.**
**بەلأم شەیتان توانی سەر لە ئادەم وحەواء بشێوێنێت، بۆ ئەومەبەستەیش فێڵ وهۆکاری شەیتانی پیسی بەکارهێنا.**
**بێگومان قورئان ڕوداوەکانی ئەم پیلانە شەیتانی یەی لە چەند شوێنێکدا تۆمارکردووە. کەچەند دانەیەکیان باس دەکە ین:**

**١-خوای گە ورە لە سوورەتی (البقرة)دا فەرمووی:** ﴿فَأَزَلَّهُمَا الشَّيْطَانُ عَنْهَا فَأَخْرَجَهُمَا مِمَّا كَانَا فِيهِ وَقُلْنَا اهْبِطُوا بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ وَلَكُمْ فِي الْأَرْضِ مُسْتَقَرٌّ وَمَتَاعٌ إِلَى حِينٍ﴾ (البقرة:٣٦)

**٢-: لە سورە تی (الأعراف)دا فەرمووی:** ﴿فَوَسْوَسَ لَهُمَا الشَّيْطَانُ لِيُبْدِيَ لَهُمَا مَا وُورِيَ عَنْهُمَا مِن سَوْآتِهِمَا وَقَالَ مَا نَهَاكُمَا رَبُّكُمَا عَنْ هَذِهِ الشَّجَرَةِ إِلَّا أَن تَكُونَا مَلَكَيْنِ أَوْ تَكُونَا مِنَ الْخَالِدِينَ (٢٠) وَقَاسَمَهُمَا إِنِّي لَكُمَا لَمِنَ النَّاصِحِينَ (٢١) فَدَلَّاهُمَا بِغُرُورٍ فَلَمَّا ذَاقَا الشَّجَرَةَ بَدَتْ لَهُمَا سَوْآتُهُمَا وَطَفِقَا يَخْصِفَانِ عَلَيْهِمَا مِن وَرَقِ الْجَنَّةِ وَنَادَاهُمَا رَبُّهُمَا أَلَمْ أَنْهَكُمَا عَن تِلْكُمَا الشَّجَرَةِ وَأَقُل لَّكُمَا إِنَّ الشَّيْطَانَ لَكُمَا عَدُوٌّ مُّبِينٌ﴾ (الأعراف:٢٠-٢٢).

**٣- لە سوورەتی (طه)دا فە رمووی:** ﴿فَوَسْوَسَ إِلَيْهِ الشَّيْطَانُ قَالَ يَا آدَمُ هَلْ أَدُلُّكَ عَلَى شَجَرَةِ الْخُلْدِ وَمُلْكٍ لَّا يَبْلَى (١٢٠) فَأَكَلَا مِنْهَا فَبَدَتْ لَهُمَا سَوْآتُهُمَا وَطَفِقَا يَخْصِفَانِ عَلَيْهِمَا مِن وَرَقِ الْجَنَّةِ وَعَصَى آدَمُ رَبَّهُ فَغَوَى﴾ (طه: ١٢٠-١٢١).

**لەم ئایەتانەوە چۆنێتی ئەو وەسوەسە شەیتانییە ڕون دەکەینەوە کە چۆن ئادەم و حەوائی لە بەهەشت بەدەرکردن دا.**

یەکەم: خوای گەورە لە سوورەتی (البقرة)دا -کە ئەمە ماناکەی بوو- فەرمووی: (شەیتان (فرسەتی لێهێنان) و لە خشتەی بردن، (وای لێکردن لەبەر وبومی درەختە قەدەغە کراوەکە بخۆن) و لەو شوێنە خۆش وپڕناز ونیعمەتە بەدەرکردنی دان)(البقرة:٣٦). شەیتان لەڕێگەی وەسوەسەوە توشی سەرپێچی کردن.

دووەم: لە سوورەتی (الأعراف)دا، باسەکەی دەربارەی وەسوەسەی شەیتان بۆ ئادەم وحەواء، بەشێوەیەکی درێژتر دێت، -کەئەمە ماناکەیەتی- خوای گەورە فەرمووی: (شەیتان (ئەو سنورەی بۆ ئادەم وحەواء بەفرسەت زانی) ئینجا کەوتە فرێدانی وەسوەسە وخەتەرەو خەیاڵ بۆناو دڵ ودەرونییان، تا ئەو عەیب وعارەیان دەربخات کەشاراوە بوو لێیان (دوایی خۆی ئاشکراکرد) و پێی وتن: پەروەردگارتان ئەم درەختەی لێ قەدەغە نەکردون، تەنها لەبەرئەوەیە نەوەکو ببنە فریشتە، یاخود بۆئەوەیە نەوەکو لەنەمران بن!! (٢٠) (ئەوسا شەیتان زانی دەترسن ودوو دڵن) سوێندی بۆخواردن کەمن بەڕاستی لەئامۆژگاریکارانم بۆئێوە ودڵسۆزتانم! (٢١) ئیتر شەیتان بە فێڵ و پلان فریوی دان (بەرە ولای درەختەکەی بردن) جاکاتێك تامی بەروبومی درەختەکەیان چەشت، هەرچی عەیب وعاریان هەیە کەوتە دەرەوە، (ناچار بەپەلە) دەستیان دایە گەڵای درەختەکانی بەهەشت، عەیب وعاری خۆیان پێ دائەپۆشی وپەروەردگاریان بانگی کردن وفەرمووی:ئایامن قەدەغەی ئەو درختەم لێنەکردن وپێم نەوتن، کەبەڕاستی شەیتان بۆئێوە دوژمنێکی ئاشکرایە!؟)(الأعراف:٢٠-٢٢).

(القاسمي) دەڵێت: لە ئایەتەکەدا ئاگادارکردنەوەیەك هەیە لەسەر دەرخستنی (عورة) لە کارو تاوانە گەورەکانە وبێزراو وئابڕو بەرە، لەبەرئەوە ناونراوە (سوأة)، چونکە دەرخستنی دەبێتە هۆی خراپکردنی خاوەنەکەی.[٣٠]

- لە سوورەتی (الأعراف)دا، ئایەتەکە ڕونی کردەوە کە ئیبلیس وەسوەسەکەی ئاڕاستەی ئادەم وحەواء کرد.

لە سوورەتی (طه)دا، ئایەتەکە ڕونیکردەوە کە ئیبلیس وەسوەسەکەی ئاڕاستەی ئادەم (عليه السلام) کرد.

- لە ئایەتی یەکەمدا وەسوەسەکە بەشێوەی (قصر) و (خبري) هەواڵ دان هات، تا دانپیانان ودڵنیایی بگەیەنێت. بەڵام لەئایەتی دووەمدا، وەسوەسەکە بەشێوەی پرسیار

[٣٠] - محاسن التأويل للإ مام القاسمي

ت فەرمووی: ﴿هَلْ أَدُلُّكَ﴾ بۆی ڕوون کردنەوە، لەمەشدا فێڵ وسەر لێتێکدان هەبوو بۆیان. لە ئایەتی یەکەمدا فەرمووی: ﴿هذهِ الشجرةِ﴾ و لە دووەمدا فەرمووی: ﴿شجرةِ الخُلْدِ﴾ بە (إسم إشارة)ی نزیك ئاماژەی بۆکرد، تا لە دڵی ئادەم وحەوائی نزیك بخاتەوە وخۆشەویستی بکات لایان، ولە ئایەتی دووەمدا ﴿شجرةِ الخُلْدِ﴾ ووشەکەی (إضافة) کرد بۆ لای (خلد) واتە نەبڕاوە و بێ کۆتایی.

لە ئایەتی یەکەمدا (بوون بەخاوەنی بەهەشتی) پێش خست بەسەر(خُلد) هەتاهەتاییدا، بە (او) بە دوای یەکدا هێنانی، کە ئەمەیش جۆرا و جۆری و هەڵبژاردن وشاراوەیی دەگەیەنێت، و لەئایەتی دووەمدا: ﴿شجرةِ الخُلْدِ﴾ی بەسەر (الملك)دا پێش خست کە نافەوتێت و کۆتایی نایەت. وەسوەسەکە بەشێوەی دووبارە کراوە و جیاواز وشێوازی جۆرا وجۆر هات، ئەمەش سەرتێکدان بوو لەئادەم وحەواء وخستنیە گومان و دوودڵییەوە.

ئایەتی: ﴿وَقَاسَمَهُمَا إِنِّي لَكُمَا لَمِنَ النَّاصِحِينَ﴾(الأعراف:٢١). هەوڵدانە لە فێڵێکی تر لە فێڵەکانی شەیتانی بەنەفرەت کراو، کە سوێند خواردنێکی درۆ بوو، شەیتان پەنای برد بۆ ئەم فێڵ کردنە تا بەڕاست گۆی بزانن وباوەڕی پێ بکەن، چونکە ئادەم وحەواء وایان لێکدەدایەوە کە کەس بە درۆ سوێند بەخوا نەخوات. سوێندخواردن لە نێوان دوو لایەنی هاوبەش یان ناکۆکدا دەبێت یان مامەڵەیەکیان لەنێواندا بێت.

زانا (قتادة) دەڵێت: شەیتان سویندی بۆخواردن بەخوا، هەتا فێڵی لێکردن وهەڵی خەڵەتاندن، وتی: ﴿إِنِّي لَكُمَا لَمِنَ النَّاصِحِينَ﴾

واتە: ئیبلیس وتی بێگومان من پێش ئێوە دروست کراوم، و من زۆرشت دەزانم و لەحاڵی زۆرشت شارەزام لە چەکە و خراپەکان، کە ئێوە نایزانن، شوێن قسەی من بکەون، ڕێنمایتان دەکەم.[٣١]

---

[٣١]- مفاتیح الغیب للإمام الرازي.

# پێنج لە شەش

لە چیرۆکی ئادەم و ئیبلیسدا سەرنج بدە لە شەش ئایەتدا پێنج جار باسی ڕوتی تیادا کراوە، ئایا ئەوە بەڵگە نییە لەسەر ئەوەی کە ڕوت و قوتی چەندە مەترسیدارە؟.

خوای گەورە لە سوورەتی (الأعراف)دا فەرموویەتی: ﴿فَدَلَّاهُمَا بِغُرُورٍ فَلَمَّا ذَاقَا الشَّجَرَةَ بَدَتْ لَهُمَا سَوْآتُهُمَا وَطَفِقَا يَخْصِفَانِ عَلَيْهِمَا مِنْ وَرَقِ الْجَنَّةِ وَنَادَاهُمَا رَبُّهُمَا أَلَمْ أَنْهَكُمَا عَنْ تِلْكُمَا الشَّجَرَةِ وَأَقُلْ لَكُمَا إِنَّ الشَّيْطَانَ لَكُمَا عَدُوٌّ مُبِينٌ﴾(الأعراف/٢٢).

واتە: (ئیتر شەیتان بە فێڵ و پلان فریوی دان (بەرەو لای درەختەکەی بردن) جا کاتێك تامی بەرو بوومی درەختەکەیان چەشت، هەرچی عەیب وعاریان هەیە کەوتە دەرەوە (ناچار بەپەلە) دەستیان دایە گەڵای درەختەکانی بەهەشت عەیب وعاری خۆیانیان پێ دائەپۆشی پەروەردگاریان بانگی کردن و فەرمووی: ئایا من قەدەغەی ئەو درەختەم لێ نەکردن و پێم نەوتن، کە بەڕاستی شەیتان بۆ ئێوە دوژمنێکی ئاشکرایە؟!). هەر لە ئایەتی (٢٠)ی هەمان سوورەتدا فەرموویەتی: ﴿فَوَسْوَسَ لَهُمَا الشَّيْطَانُ لِيُبْدِيَ لَهُمَا مَا وُورِيَ عَنْهُمَا مِنْ سَوْآتِهِمَا وَقَالَ مَا نَهَاكُمَا رَبُّكُمَا عَنْ هَذِهِ الشَّجَرَةِ إِلَّا أَنْ تَكُونَا مَلَكَيْنِ أَوْ تَكُونَا مِنَ الْخَالِدِينَ﴾(الأعراف/٢٠).

واتە: (شەیتان (ئەو سنوورەی بۆ ئادەم و حەوا بە فرسەت زانی) و ئینجا کەوتە فرێدانی وەسوەسە و خەتەرە و خەیاڵ بۆ ناودڵ و دەرونیان، تا ئەو عەیب و عارەیان دەربخات کە شاراوە بوو لێیان (دوایی خۆی ئاشکرا کرد) و پێی وتن: پەروەردگارتان ئەم درەختەی لێ قەدەغە نەکردوون، تەنها لەبەر ئەوەیە نەوەکو ببنە فریشتە، یاخود بۆ ئەوەیە نەوەکو لە نەمران بن!!). لەهەمان سوورەت لەئایەتی (٢٦)دا فەرموویەتی: ﴿يَا بَنِي آدَمَ قَدْ أَنْزَلْنَا عَلَيْكُمْ لِبَاسًا يُوَارِي سَوْآتِكُمْ وَرِيشًا وَلِبَاسُ التَّقْوَى ذَلِكَ خَيْرٌ ذَلِكَ مِنْ آيَاتِ اللَّهِ لَعَلَّهُمْ يَذَّكَّرُونَ﴾(الأعراف/٢٦).

وا‌تە: (ئەی نەوەی ئادەم ئێمە بەڕاستی پۆشاکی لەبارمان بۆ فەراهەم هێناون، عەورەت و ئ ەوەی پێتان ناخۆشە دەربکەوێت دای دەپۆشێت، هەروەها جل و بەرگی جوانیش کە خۆتانی پێ برازێننەوە (بەلأم بیرتان نەچێت) کە پۆشاکی تەقوا و خواناسی چاکتر و خێردارتر و بەفەڕترە، ئەو پۆشاکە (ماددی ومەعنەوییانە) لە نیشانە و بەڵگەکانی خوای گەورەن بۆ ئەوەی یاداوەری وەبگرن و (یادی بەهەشت بکەن)).

## بۆ ئەوەی بۆ شیرێکی ڕژاو نەگرین

هەندێك دەڵێن: چەندین ئافرەتی داپۆشراو هەن بێ ڕەوشتن، چەندین نوێژکەر هەن، لە نوێژ نەکەرەکان زیاتر تاوان دەکەن، هەندێك حاجی هەن هەر بۆ ئەوە حەج دەکەن پێیان بوترێت: حاجی، و چەندین شتی تر وەکو بڵێین: سوود لە داپۆشین و نوێژ و حەجدا نییە. ئایا ئێمەی باوەڕدار دەبێت بە فڕ و فێڵی ئەمانە ئیتر واز لە پۆشاکی شەرعی و نوێژ و ڕۆژوو وحەج و گوێڕایەڵی فەرمانەکانی تر بهێنین، ئیتر کەس پۆشاکی شەرعی نەکات و بەرەڵایی و فەساد بلأو ببێتەوە، وکەسی بەحەیاو حورمەتیش لەماڵ ومنداڵی ئاسودە نەبێت. ئێمە دەمانەوێت جەستە وڕۆحمان داپۆشراو بێت، بایەخدان بەجەستە و ڕۆح پێویستە، بە ویتی ویتی ئەوانە نەخەڵەتێین، پارێزگاری لە خۆمان و کۆمەڵگامان بکەین، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿يَنزِعُ عَنْهُمَا لِبَاسَهُمَا لِيُرِيَهُمَا سَوْءَاتِهِمَا﴾(الأعراف/٢٧).

واتە: (ئەی نەوەی ئادەم شەیتان ئێوەش لەخشتە نەبات، لەکاتێکدا دەستی کرد بەداماڵینی پۆشاکەکانیان تا عەورەتیان (واتە ئادەم وحەوا) پیشانی یەکتربدات) لەسەر کەناری ئاوەکان کە ئافرەت بستێك پەڕۆ هەموو پۆشاکی لەشی بێت و بۆ زانکۆ و پەیمانگا پانتۆڵی تەسکی لە پێدا بێت، ئایا ئافرەتان ئاوابن، ئەوەیان دەوێت لە ئافرەتان، ئینجا ئەگەر کچێك خوانەخواستە تووشی بەدڕەفتارییەك هات، بۆ حاڵی خۆی دەگری وخۆی دەسوتێنێت و ئابڕوی خۆی و کەس وکاری دەچێت، کێ و چی ئەم کارەساتە گەورەیەی دروستکرد؟ بێگومان ڕوت وقوتی. لە ڕۆژی قیامەتیشدا شەیتان دەڵێت: لۆمەی من مەکەن لۆمەی خۆتان بکەن.

**باسی چوارەم:**
**( ئادەم ) و ( حواء ) لە بەری درەختەکەیان خوارد.**

**● ئیبلس لەو جەنگەدا کەهەڵی گیرساندبوو، چەکی لەناوبەر ومەترسیداری بەکارهێنا، شێوازی فێڵاوی جۆراوجۆر و ووشەی گومڕاکەر و دەستەواژەی بریقەدار ودروشمی درۆ وساختەی بەکارهێنا، جارێك پێی وتن بێگومان ئەوە درەختی نەمرییە وخواردن لێی دەبێتە هۆی دەسکەوتنی موڵکێکی نەبڕاوە، وجارێکی تر دەڵێت: بێگومان کەسێك لەم درەختە بخوات، بەرزدەبێتەوە بۆ ئاستی فریشتەکان یان دەچێتە ناودنیایەکی نەبڕاوەوە، لەم بەڵێن ودروشمە درۆیانەدا، شتانێك هەبون کە نەفسەکانیان دەوروژاند، هەروەها هۆکاری سوربونیان لەسەر کارەکە دەجولاند، پاڵنەربون بۆ حەزلێکردن و، وەلام دانەوە بۆکەوتنە ناو ئەو مەترسییەوە. بەڕاستی ئادەم وحەواء وەلامی ئەم هێرشە گومڕاکەرەی شەیتانیان دایەوە، بەهۆی وەسوەسەی شەیتانەوە لەدرەختەکە نزیك بوونەوە، ئینجا بەئەندازەیەکی کەم ودیاری کراو لێیان خواردو، پاشان بەرگەکانی بەریان کەوتە خوارەوە وجەستە وعەورەتیان دەرکەوت.**

**● خوای گەورە لە سوورەتی (الأعراف)دا فەرمووی:** ﴿فَدَلَّاهُمَا بِغُرُورٍ فَلَمَّا ذَاقَا الشَّجَرَةَ بَدَتْ لَهُمَا سَوْآتُهُمَا وَطَفِقَا يَخْصِفَانِ عَلَيْهِمَا مِن وَرَقِ الْجَنَّةِ وَنَادَاهُمَا رَبُّهُمَا أَلَمْ أَنْهَكُمَا عَن تِلْكُمَا الشَّجَرَةِ وَأَقُل لَّكُمَا إِنَّ الشَّيْطَانَ لَكُمَا عَدُوٌّ مُّبِينٌ﴾(الأعراف:٢٢).

**● لە سوورەتی (طه)دا خوای گەورە فەرمووی:** ﴿فَأَكَلَا مِنْهَا فَبَدَتْ لَهُمَا سَوْآتُهُمَا وَطَفِقَا يَخْصِفَانِ عَلَيْهِمَا مِن وَرَقِ الْجَنَّةِ وَعَصَىٰ آدَمُ رَبَّهُ فَغَوَىٰ﴾(طه:١٢١).

**● پێویستە هەڵوێست لە سەر ئایەتەکان بکەین وماناکەیان ڕون بکەینەوە:**

**لە سوورەتی (الأعراف)دا فەرمووی:** ﴿فَلَمَّا ذَاقَا الشَّجَرَةَ﴾ **و لە سوورەتی (طه)دا فەرمووی:** ﴿فَأَكَلَا مِنْهَا﴾ **ئاماژە بۆ ئەوە کرا، کە هەردووکیان شتێکی کەمیان لە بەری درەختەکە خوارد، بەئەندازەی ئەوەی ئینسان لەزەتی لێ وەرگرێت.**

● پێشەوا (الطبرسي) دەڵێت: ﴿...فَلَمَّا ذَاقَا﴾ واتە: دەستیان کرد بە خواردنی، و هەردوکیان شتێکی کەمیان لێ خوارد، لەبەرئەوەی ووشەی (ذَاقَا)ی بەکارهینا، وەك چەشتنی تامی خواردنەوەکە لە درەختەکە، ئەوەش بە ترسێکی زۆرەوە، چونکە چەشتن سەرەتای دەست پێکردنی خواردنە تا تامی خواردنەکە بکات ولێی شارەزابێت.[٣٢]

ئایەتی: ﴿ فَبَدَتْ لَهُمَا سَوْآتُهُمَا﴾ ئەمەش ئەنجامی خواردنەکەیان بوو لە درەختەکە، ئەو بەرگە نورانییە جوانەی کەدای پۆشیبون نەما وجەستە وعەورەتیان دەرکەوت، ئینجا لە گەڵای درەختەکانی بەهەشتیان وەك داپۆشەر بەکارهێنا ودەیان نوساند بەخۆیانەوە تا خۆیانی پێ پۆشتە و داپۆشراو بکەن وەك ئەوەی شتێکی دڕاو پینە بکەیت.

پاشان پەروەردگار بانگی کردن، چونکە زانا و شارەزا بوو بە حاڵیان وپێی فەرموون: ئایا نەهی ئەو درەختەم لێ نەکردن و پێم نەوتن کە بەڕاستی شەیتان دوژمنێکی سەرسەخت وئاشکرایە. خوای گەورە گلەیی لێ کردن لەسەر خواردنی بەری درەختەکە، ئەوە بۆ ئەوان چاکتر و جوانتر بوو کە ئاگادار بن و بە گوێی قسەی شەیتان نەکەن دوژمنایەتی شەیتان ڕون ودیارە، خوای گەورە ئامۆژگاری کرد بوون و پێی وتبوون کە شەیتان فێڵاوییە تا نەکەونە ناو ئەو داوانەی کە ئەو دەیچنێت.

---

[٣٢] - مجمع البيان للطبرسي.

## باسی پێنجەم:
## تەوبە کردنی (ئادەم) و(حواء):

● قورئانی پیرۆز دەربارەی تەوبە کردنی ئادەم وحەواء (علیهماالسلام) لە زۆر شوێندا، دواوە لەوانە: لە سوورەتی (البقرة)دا، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَتَلَقَّى آدَمُ مِن رَّبِّهِ كَلِمَاتٍ فَتَابَ عَلَيْهِ إِنَّهُ هُوَ التَّوَّابُ الرَّحِيمُ﴾(البقرة:٣٧).

لە سوورەتی (الأعراف)دا، دەفەرموویت: ﴿قَالَا رَبَّنَا ظَلَمْنَا أَنفُسَنَا وَإِن لَّمْ تَغْفِرْ لَنَا وَتَرْحَمْنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ الْخَاسِرِينَ﴾(الأعراف:٢٣).

لە سوورەتی (طه)دا، دەفەرموێت: ﴿فَأَكَلَا مِنْهَا فَبَدَتْ لَهُمَا سَوْآتُهُمَا وَطَفِقَا يَخْصِفَانِ عَلَيْهِمَا مِن وَرَقِ الْجَنَّةِ وَعَصَىٰ آدَمُ رَبَّهُ فَغَوَىٰ (١٢١) ثُمَّ اجْتَبَاهُ رَبُّهُ فَتَابَ عَلَيْهِ وَهَدَىٰ﴾(طه:١٢٢).

● لە سوورەتی (البقرة)دا خوای گەورە هەواڵی ئەوەی دا، کە ئادەمی ئاڕاستەکرد بۆ تەوبەکردن وگەڕانەوە، وفێری کرد کە چۆن تەوبە بکات، ڕێنمایی کردن بۆ تەوبە و ڕەحمەت، بەزەیی بوو لەلایەن خواوە، بێگومان خوای گەورە تەوبە وەردەگرێت لێخۆشبوە ولەوکەسانەی وەردەگرێت کە تەوبەدەکەن، بەبەزەیی یە و ڕەحم بەو بەندانەی دەکات کە دەگەڕێنەوە.

● ئەو ووشانەی کە ئادەم فێری بوو لە سوورەتی (الأعراف) داهاتووە: ﴿قَالَا رَبَّنَا ظَلَمْنَا أَنفُسَنَا وَإِن لَّمْ تَغْفِرْ لَنَا وَتَرْحَمْنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ الْخَاسِرِينَ﴾.

ئاماژە بۆئەوە کراوە کە ئادەم وحەواء هەردوکیان بەشداربوون لە ئەنجام دانی سەرپێچی کردنەکەدا، ودانیان نا بەهەڵە وتاوانی خۆیاندا، وداوای لێخۆشبوون وبەزەیی یان لە خوای گەورە کرد.

● بەڵام دەرباوەی ئایەتەکانی سوورەتی(طه) کە هاتن، ئاماژە دەکات بۆ ئەوەی کە ئادەم توشی سەرپێچی هات، لە کاتێکدا کە ئادەم وحەوائیش لەبەری درەختەکەیان خوارد، بەڵام ئادەم تایبەت کرا بە سەرپێچی لەگەڵ بەڵگەی ناو ئایەتەکەدا کە حەوائیش شەریکی بووە لەخواردنەکەدا، چونکە سەرەتای باسەکە دەربارەی ئادەم بووە و ئەو

باسکراوە، چونکە کاتێك بەڵێنەکەی لەبیرچویەوە، کەوتە ناو سەرپێچییەوە، خوای گەورە فەرموی: ﴿وَلَقَدْ عَهِدْنَا إِلَىٰ آدَمَ مِن قَبْلُ فَنَسِيَ وَلَمْ نَجِدْ لَهُ عَزْمًا﴾(طه:١١٥).

واتە ئەوەی کە فەرمانی پێکرابو وازی لێهێنا وجێیهێلا، یان لەبیری چویەوە، کە پێچەوانەی لەیادبونە، نەیتوانی نەفسی خۆی لەسەر کارەکە دامەزراو بکات، یان گوتراوە ئەوەی فەرمانی پێکرا، ئەو لەبەری نەکرد ونەیپاراست، یان ئارامی نەگرت لەسەر ئەوەی کە نەهی لێکرا بوو، یان عەزمی خۆڕاگری نەبو کە نەیخوات، بەڵکو خواردی بە هۆی لەبیرچونەوەوە.[٣٣]

بەپێی ناوەڕۆکی ئایەتەکە، کاتێك ئادەم پەیمان و بەڵێنەکەی لەبیر چویەوە، وتوشی سەرپێچی هات، کەوتە ناو سێ فەرمانەوە: (لەبیر چونەوە وسەرپێچی و ڕیگا لێتێکچون) بەرامبەر ئەم سێ شتە، خوای گەورە بەسێ شتی تر ڕێزی لێگرت فەرموی: ﴿ثُمَّ اجْتَبَاهُ رَبُّهُ فَتَابَ عَلَيْهِ وَهَدَىٰ﴾(طه:١٢٢).

واتە: (پاشان پەروەردگار هەڵیبژاردو (کردی بە پێغەمبەر) تەوبەی لێوەرگرت و هیدایەتی دا و ڕێنمونی کرد).

ئەمەش لەبەر ئەوەی دانی نا بە تاوانی خۆیدا تەوبەی کرد و گەڕیەوە بۆ لای پەروەردگار.[٣٤]

---

[٣٣] زاد المسير في علوم التفسير للأمام أبي الفرج عبد الرحمن بن الجوزي.

[٣٤] جامع لأحكام القرآن للقرطبي. بە دەسکاریەوە.

**باسی شەشەم:**

**دابەزاندنی ( ئادەم ) و( حواء ) بۆ سەر زەوی:**

**خوای گەورە تەوبەی لە ئادەم وحەوا وەرگرت ودایبەزاندن بۆ سەر زەوی، خوای گەورە لە سوورەتی (البقرة)دا فەرمووی:** ﴿فَأَزَلَّهُمَا الشَّيْطَانُ عَنْهَا فَأَخْرَجَهُمَا مِمَّا كَانَا فِيهِ وَقُلْنَا اهْبِطُوا بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ وَلَكُمْ فِي الْأَرْضِ مُسْتَقَرٌّ وَمَتَاعٌ إِلَى حِينٍ (٣٦) فَتَلَقَّى آدَمُ مِن رَّبِّهِ كَلِمَاتٍ فَتَابَ عَلَيْهِ إِنَّهُ هُوَ التَّوَّابُ الرَّحِيمُ (٣٧) قُلْنَا اهْبِطُوا مِنْهَا جَمِيعًا فَإِمَّا يَأْتِيَنَّكُم مِّنِّي هُدًى فَمَن تَبِعَ هُدَايَ فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ﴾(البقره:٣٦-٣٨).

**_ نهێنی دووبارە بونەوەی فەرمانی دابەزینەکە .**

**تێبینی ئەوە دەکرێت، کە لەم ئایەتانەدا فەرمان بەدابەزینەکە دوبارە کراوەتەوە، نهێنی ئەوەیش بریتییە لە: وتراوە: چونکە دابەزینی یەکەم لە بەهەشتەوە بۆ ئاسمانی دونیا بووە، ودابەزینی دووەم لەئاسمانی دونیاوە بۆ سەرزەوی بووە.**

**هەروەها وتراوە: بۆ دڵنیایی بووە. بەڵام یەکەمیان لاوازە، بەوەی ئەگەر وابوایە ئەوا باسکردنی:** ﴿وَلَكُمْ فِي الْأَرْضِ مُسْتَقَرٌّ وَمَتَاعٌ إِلَى حِينٍ﴾ **لە دوای دابەزینی دووەم لەپێشتر بوو، هەروەها ئایەتی:** ﴿اهْبِطُوا مِنْهَا جَمِيعًا﴾ **بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کەدابەزینی دوەمییش هەر لە بەهەشتەوە دەبوو.**

**وتراوە: کاتێك ئادەم وحەواء لەبەری درەختەکەیان خوارد و تەوبەیان کرد-پاش فەرمان کردن بە دابەزین- ئەوە کەوتە دڵیانەوە کە فەرمان بە دابەزین بەلاچونی هەڵخەڵەتاندنەکە بەرز دەبێتەوە و بۆ جاری دووەم دوبارە دەبێتەوە، تا بزانن کە بڕیاری خوا هەر باقییە و دەمێنێت، بۆ جێبەجێ بوونی بەڵێنی پێشو لەئایەتی:** ﴿ إِنِّي جَاعِلٌ فِي الْأَرْضِ خَلِيفَةً﴾(البقره:٣٠).[٣٥]

---

[٣٥] - غرائب القرآن وَ رغائب الفرقان للأمام النيسابوري.

(البیضاوي) دەڵێت: (...دابەزینەکە بۆدڵنیابون دوبارە کرایەوە، یان بۆ جیاوازی مەبەستەکە، یەکەمیان بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کەدابەزینیان بۆخانەی تاقی کردنەوە بووە، لەویش دەگەڕێنەوە بۆلای خوا وهەمیشەیی نابن، دووەم: هەستیانکرد کە ئەوان دابەزینەکەیان بۆ تەکلیف خستنە سەریان بووە، هەرکەس هیدایەت وەرگرێت ڕزگاری بووە، وهەرکەس گومڕابێت لەناوچووە، وتراوە: یەکەم لەبەهەشتەوە بۆئاسمانی دنیا بووە، دووەمیشیان لەئاسمانەوە بۆ سەرزەوی بووە.[٣٦]

لەئایەتی: ﴿مُسْتَقَرٌّ وَمَتَاعٌ إِلَى حِينٍ﴾ وشەی ﴿مُسْتَقَرٌّ﴾ واتە شوێنی نیشتەجێبوون وحەوانەوە، و (المَتاع) ئەو شتانەیە کەلەزەتیان لێ وەردەگیرێت ولەدونیادا سودیان لێ وەردە گیرێت بۆماوەی دیاریکراو، لەخواردن وخواردنەوە وهۆکاری گواستنەوە وشوێنی نیشتەجێ بوون وجل وبەرگ وژن هێنان وشوکردن وشتانی تر، کەهەموی دنیایی وکاتییە ودەبڕێتەوە، وئایەتی: ﴿إِلَى حِينٍ﴾ واتە: تاکاتێکی دیاری کراو زانراو بەکۆتایی تەمەن ئەویش کۆتای دێت.

● خوای گەورە بە فەرمانی دابەزین لەگەڵ کێدا دوواوە؟.

جارێك فەرمانەکە بۆ (مثنی) دوکەس هاتووە، وسێ جاریش بۆ (جمع) کۆمەڵێك هاتووە، زانایان ڕاو بۆچونی جیاواز یان لەسەر ئەمانە هەیە:

وتراوە: ئادەم وحەوا بون، کاتێك بە ئامرازی کۆ باسکراون لەجێی هەموو بەشەر بون بەو پێیەی کەئەوان بنەمای بەشەری بوون.

(الفراء)ئەوەی هەڵبژاردووە کە گفتوگۆکە بۆ منداڵ ونەوەکانیان بووە، کەهێشتا بەدی نەهاتبون، ولە(ابن عباس ومجاهد وزۆرێك لەپێشینەوە)، گفتوگۆکە بۆئادەم وحواء وئیبلیس بووە، وئیبلیس لەپێش ئەواندا ڕەخنەی گرت لەدەرکردنەکە.

پێشەوا (الزمخشري) دەڵێت: (..ئایەتی: ﴿اهبطوا﴾) گفتوگۆ بووە لە نێوان ئادەم وحەوا و ئیبلیس، وتراوە: لەگەڵ مارێکدا، بەڵام ڕاستتر ئەوەیە، بۆ ئادەم وحەوا بووە، و مەبەست ئەوان و نەوە و منداڵەکانیان بووە، چونکە ئەوان ئەصڵ وبنەمای ئینسانن،

---

[٣٦] – انوار التنزیل واسرار التأویل للإمام البیضاوي.

وەك ئەوەی لیّ کردن کە بریتی بن لە هەموو ئینسان، بەڵگەیش ئەم ئایەتەیە: ﴿قَالَ اهْبِطَا مِنْهَا جَمِيعًا بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ فَإِمَّا يَأْتِيَنَّكُم مِّنِّي هُدًى فَمَنِ اتَّبَعَ هُدَايَ فَلَا يَضِلُّ وَلَا يَشْقَى﴾(طه:١٢٣).

واتە: (خوای گەورە فەرمانی دا ووتی: ئیتر هەردوکتان لەبەهەشت دابەزن بەگشتی، هەندێکتان دەبنە دوژمنی هەندێکتان).[٣٧]

---

[٣٧] الكشاف للزمخشري.

**باسی حەوتەم:**

**کێ بەرپرسە لە خواردنی ڕووەکە قەدەغە کراوەکە؟**

ڕاستی ئەوەیە کە بەرپرسیاریەتییەکە هاوبەشە لە نێوان ئادەم وحەوادا، وەك لە ئایەتەکانی پێشودا هات باسمان کرد.

شەیتان وەسوەسەی بۆ دروست کردن، و پێکەوە هەڵی خەڵەتاندن پێکەوە لەبەری درەختەکەیان خوارد و جەستە و عەورەتیان دەرکەوت، و خوای گەورە گلەیی لێکردن لەسەر تاوانەکەیان، پاشان تەوبەیان کرد و گەڕانەوە بۆ لای خوا، و خوای گەورەش تەوبەیانی وەرگرت، و هەردوکیان بە یەکسانی دابەزین بۆ سەرزەوی.

وەك ئایەتەکان ڕونیان کردەوە بەرپرسیاریەتییەکە بەشداربوو لە نێوان هەردوکیاندا.

## باسی هەشتەم
## سود و گرنگییەکانی چیرۆکەکە:

١-پلە و پایەی هاوسەرداری لە ئیسلامدا.
٢-دوژمنایەتی شەیتان بۆ ئینسانەکان.
٣-شوێنەواری تاوان وگوناه و، پێویست بونی دەست پێشکەری بۆ تەوبە.

### ١- پلەو پایەی هاوسەرداری لە ئیسلامدا.

### گرنگی بنیات نانی خێزان:

(الزوجیە) جوتییەتی بنچینەیەکی گشتییە لە تێکڕای دروستکراوەکانی خوای گەورەدا.[٣٨]

هەر لە گەردیلە و ئەمیباوە بگرە هەتا هەموو جۆرەکانی ڕووەك و زیندەوەران و گیانلەبەران، خوای بەدیهێنەریش لە چەند شوێنێکی قورئاندا ئاماژەی بەو ڕاستییە کردووە.

بۆ نموونە: فەرموویەتی: ﴿سُبْحَانَ الَّذِي خَلَقَ الْأَزْوَاجَ كُلَّهَا مِمَّا تُنبِتُ الْأَرْضُ وَمِنْ أَنفُسِهِمْ وَمِمَّا لَا يَعْلَمُونَ﴾(یس/٣٦).

واتە: (پاك و بێگەردی بۆ ئەو زاتەی هەر هەموو دروستکراوەکانی بە جوت دروستکردووە لەوەی لە زەویدا دەڕوێت، لە خۆیشیان، لەو شتانەیش کە نایزانن) (لە سەردەمی عیلم و زانستیدا ڕوونبۆتەوە -کە هەمووبەدیهێنراوان- ماددی و مەعنەوی - جوتن).

لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿وَمِن كُلِّ شَيْءٍ خَلَقْنَا زَوْجَيْنِ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ﴾ (الذاریات/٤٩). ئینجا شتێکی ڕوون وئاشکرایە کە جوتبوون (التزاوج)ی نێر و مێ لە

---

٣٨-دیارە بێجگەلەدروستکراوەناماددی یەکانی وەك فریشتەکان

جیهانی ڕووەك و گیانلەبەران و مرۆڤیشدا تاکە ڕێگەی زۆربوون و بەردەوامی وەچە (نسل)یانە.

وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُمْ مِنْ نَفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَاءً﴾(النساء/١).(ماناکراوە) .

جا شەریعەتی دانای خوای کار بەجێ و زانایش فەرمانی بە موسڵمانان کردووە کە خێزان پێك بهێنن و پیاوانی زوگورتی و ئافرەتانی بێ مێردیش هاوسەرداری بکەن.

دەتوانین لەم چەند بڕگەیەدا ئاماژە بە گرنگی و بایەخی بنیاتنانی خێزان بکەین:

یەکەم: بێگومان هەریەك لە پیاو و ئافرەت بە پێی ئەو سروشتەی کە خوای گەورە لە سەری دروستی کردوون، غەریزەی جنسی و حەز و مەیل و ئارەزووی بەرامبەریان هەیە، جا خوای پەروەردگار ڕێ و ڕسمی خێزان پێکەوەنانی لە شەریعەتدا دیاری کردووە تاکو ئینسان بەو شێوەیە کە شایستەی ئادەمیزاد بێت ئەو غەریزەیەی خۆی تێر بکات.

دووەم: هەر کام لە پیاو و ژن خوای کاربەجێ سروشتیانی وا هەڵخستووە کە بە هۆی یەکترەوە هەست بە ئارامی و ئاسوودەیی دەکەن. وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَ لَكُمْ مِنْ أَنْفُسِكُمْ أَزْوَاجًا لِتَسْكُنُوا إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُمْ مَوَدَّةً وَرَحْمَةً إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ﴾(الروم/٢١)(ماناکراوە).

سێیەم: بە هۆی بنیاتنانی خێزانەوە وەك شەریعەت دایناوە، هەر کام لەژن و مێرد تایبەت دەبن بە یەکترەوە، بەڕەڵاییەك کە لە نێوان ئاژەڵاندا هەیە دروست نابێت، (نسل) وەچەی خەڵکیش تێکەڵ و پێکەڵ نابێت!

چوارەم: لە سێبەر و باوەشی خێزانی شەرعیدا منداڵانێکی حەڵاڵ و پاك پەیدا دەبن و لە باوەشی دایك و باوکێکی شەرعی و ناسراو و دیاردا پەروەردە دەبن و پێدەگەن، دیارە کۆرپە گەلێکیش کە بەشیری حەڵاڵ لە کۆشی دایکێکی بە حەیا و شەرمدا گۆش دەدرێن و بەخێو دەکرێن و منداڵانێك کە بە دڵنیاییەوە دەزانن کوڕ و کچی کێن و بەکێ و کێ بڵێن: باوکە و دایکە، لەگەڵ کۆرپەگەل و منداڵانێك کە بە زۆڵ و ناشەرعی پەیدا دەبن و...هتد، ئاسمان وڕێسمانیان لەیەك جیایە.

پێنجەم: هەروەها لە سۆنگەی بنیاتنانی خێزانەوە ئوممەت لە گەشە و زیادکردندا دەبێت و وەچە لەدوای وەچە وەك شەپۆلە یەك لە دوای یەکەکانی دەریا سەرزەمینی

ئیسلام ئاوەدان و قەرەباڵغ دەکەن، هەر بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ لە فەرموودەیەکدا -کە ئەمە ماناکەیەتی- فەرموویەتی: (ژنی وا بهێنن کە مێردی خۆی خۆش بوێت و منداڵی زۆربێن، چونکە لە ڕۆژی قیامەت لەگەڵ پێغەمبەراندا پێشبڕکێ دەکەم لە زۆری ئوممەتمدا).[٣٩]

**شەشەم**: لە ڕاستیدا هەرکام لە ئافرەت و پیاو بەبێ پێکەوەنانی خێزان، هیچ کامیان وەك پێویست کامڵ نابن و نە پیاوەتی (رجولة) نە ئافرەت و ژنایەتی (أنوثة) کامڵ دەبێت، بەتایبەت پاش بوونی منداڵ و بوونیان بە دایك و باوك، پەی بە گەلێك لایەنی ژیان و گوزەران دەبەن.

**حەوتەم**: هەروەها خێزانی شەرعی (الأسرة الشرعية) خشتی یەکەمی دروستبوونی کۆمەڵگایەکی ساغ و تەندروست و تۆکمەیە، پێش بنیاتنانی کۆمەڵێك خێزان و بنەماڵەی ساغ و تەندروست لە خەیاڵ پڵاو بەولاوە هیچی تر نییە.

**هەشتەم**: بە هۆی بنیاتنانی خێزانە شەرعییەکانەوە چەندان بنەماڵە و تیرە و عەشیرەت پێکەوە گرێ دەدرێن و دەهۆنرێنەوە، هەر بۆیە خوای کاربەجێ باسی خزمایەتی پشت (نسب)ی کردووە و فەرموویەتی: ﴿وَهُوَ الَّذِي خَلَقَ مِنَ الْمَاءِ بَشَرًا فَجَعَلَهُ نَسَبًا وَصِهْرًا وَكَانَ رَبُّكَ قَدِيرًا﴾(الفرقان/٥٤).

واتە: (هەر ئەو زاتەیە کە لە ئاوی (مەنی) بەشەر دروست دەکات (لەوەو دوایش زۆربەی پێکهاتەی لەشی هەر ئاوە) و کردویەتی بە هۆی خزمایەتی (لە ڕێگەی پیاوەوە کۆمەڵێك خزم دروست دەبێت هەروەها لە ڕێگەی ئافرەتەوە کۆمەڵێك) بێگومان پەروەردگاری تۆ بەردەوام دەستەڵاتی بێ سنورە (لە هەموو بوارێکدا).

**نۆیەم**: هەروەها ژنهێنان و شوکردن و پێکەوەنانی خێزان، گەورەترین ناز و نیعمەتی ماددی و جەستەیی بەهەشتە کە لایەنی جینسییە و ژیانی هاوسەرێتی پڕ کەیف و شادی و بێ دەردەسەری بە بیر ئینسان دەهێنێتەوە، وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿زُيِّنَ لِلنَّاسِ حُبُّ الشَّهَوَاتِ مِنَ النِّسَاءِ وَالْبَنِينَ وَالْقَنَاطِيرِ الْمُقَنطَرَةِ مِنَ الذَّهَبِ وَالْفِضَّةِ وَالْخَيْلِ الْمُسَوَّمَةِ وَالْأَنْعَامِ وَالْحَرْثِ ذَلِكَ مَتَاعُ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَاللَّهُ عِندَهُ حُسْنُ الْمَآبِ (١٤) قُلْ أَؤُنَبِّئُكُم بِخَيْرٍ مِّن

---

[٣٩] رواه أحمدعن أنس وصححه إبن حبان.

ذَلِكُمْ لِلَّذِينَ اتَّقَوْا عِندَ رَبِّهِمْ جَنَّاتٌ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا وَأَزْوَاجٌ مُّطَهَّرَةٌ وَرِضْوَانٌ مِّنَ اللَّهِ وَاللَّهُ بَصِيرٌ بِالْعِبَادِ﴾(آل عمران/١٤-١٥).

**واتە: (ئارەزووی ئافرەت و بوونی نەوەی نێرینە و خاوەنێتی ئاڵتوون و زێڕ و زیووی زۆر و زەبەندە و ئەسپی چاك و ڕەسەن و (هۆكانی هاتوچۆ) هەروەها ماڵات و زەوی و زاری كشتوكاڵ بۆ خەڵكی ڕازێنراوەتەوە، ئەوانە هەمووی نازو نیعمەتی ژیانی دونیان، خوایش (بۆ چاكان) شوێنی گەڕانەوەی ڕازاوە و خۆشی لای خۆی ئامادەكردووە، (كە بەهەشتە).**

**(ئەی محمد ﷺ بەو خەڵكە بڵێ: ئایا هەواڵی چاكتر لەو ناز و نیعمەتانەتان پێ ڕابگەیەنم؟! (ئەویش ئەمەیە كە): بۆ ئەوانەی پارێزگار و خواناسن، لای پەروەردگاریان باخەكانی بەهەشت ئامادەیە بۆیان كە:چەندەها ڕووبار بەژێر درەختەكانیدا و بەبەردەم كۆشكەكانیدا دەڕوات، هاوڕێ لەگەڵ ژیانی نەبڕاوە لەگەڵ هاوسەرانی پاكیزەدا و بەدەم هەستكردنی بەردەوام بە ڕەزامەندی پەروەردگاری ئازیز، بێگومان ئەو خوایە بینایە بە بەندەكانی). دیارە دەگونجێت گرنگی و بایەخی بنیاتنانی خێزان زۆر زیاتری لەسەر بنوسرێت، بەڵام ئەم بڕگانەی نوسیمان خاڵە سەرەكی وهێڵە گشتییەكانێتی.**

## پێناسەی هاوسەرێتی (تعريف الزوجية)

**لە قورئان وسووننەتدا دوو ووشە بۆ هاوسەرێتی و ژن ومێردایەتی بەكارهێنراون، كەبریتین لە (زواج) و (نكاح)، با سەرەتا سەرنجێكی چەمك و واتای ئەو دوو وشەیە لە ئەسڵی زماندا بدەین، پاشان پێناسەی هاوسەرێتی بكەین لە ڕوانگەی شەرعەوە: (راغب الأصبهاني) لە بارەی ووشەی (زواج)ەوە وتویەتی: (يقالُ لكل واحد مِن القرينين من الذكر و الانثى في الحيوانات المتزوجة: زوج، ولكل قرينين منها وفي غيرها زوج كالخف والنعل و لكل ما يقترن بآجر مماثلاً له أو مضاداً زوج..).[٤٠]**

**كەواتە..ووشەی (زوج) واتە: جوت، جا چ نێر ومێ بن، چ هاوكوف و وەك یەك بن، وەك جوتە نەعل و، چ دژ و پێچەوانە بن وەك:بەرز و نزم، تاریك و ڕووناك، و سارد وگەرم.**

[٤٠]- مفردات ألفاظ القرآن/ص/(٣٨٤-٣٨٥).

هەروەها شارەزایانی زمان وتوویانە:[٤١] بەهەر کام لە ژن و مێرد دەوترێت: (زوج) و هەندێك جاریش بە ژن دەوترێت: (زوجة)، کۆیەکەی بریتییە لە (زوجات)، بەڵام ووشەی (زوج) کۆیەکەی (أزواج)ە و ڕەوانترە، هەر بۆیە لە قورئاندا بۆ ژن هەر ووشەی (زوج) بەکارهاتووە، وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَقُلْنَا يَا آدَمُ اسْكُنْ أَنتَ وَزَوْجُكَ الْجَنَّةَ﴾(البقرة/٣٥).

لە بارەی ووشەی (نکاح)ەوە (الراغب الأصبهاني)وتوویەتی: (أصل النكاح للعقد ثم أستعير للجماع ومحال ان يكون في الاصل للجماع ثم أستعير للعقد لأن اسماء الجماع كلها كنايات لأستقباحهم ذكره كأستقباح تعاطيه ومحال ان يستعير من لا يقصد فحشاً اسم ما يستفظعونه لما يستحسنونه).[٤٢]

واتە: ووشەی (نکاح) لە ئەسڵ و بنەمادا بۆ مارەکردن بووە و دوایی بۆ جوت بوون خوازراوە، مەحاڵە کە لە ئەسڵ و بنەمادا بۆ (جماع) بوو بێت و پاشان بۆ مارەکردن خوازرابێتەوە، چونکە سەرجەم ناوەکانی جوتبوون کینایەن، لە سۆنگەی ئەوەوە وەك چۆن بە ناشیرینیان زانیوە بە ئاشکرا جیماع بکەن، بە ناقۆڵاشیان زانیوە باسی بکەن، ئینجا مەحاڵە کەسێك کە حەزناکات لێکدانەوە و ووشەی ناجۆر بەکاربهێنێت وشەیەك کە خەڵکی بە نادروستی دەزانن بۆ مەبەستێکی بخوازێت کە بەپەسەندی دەزانن (کەمارەکردنە). جا هەر چەندە زانایان لەبارەی ماناو مەبەستی ئەسڵی ووشەی (نکاح)ەوە ڕای جیاوازیان هەیە و هەندێکیان دەڵێن:لە ئەسڵ وبنەمادا بۆ جوت بوونە وپاشان بۆ مارەکردن خوازراوەتەوە، هەندێکیشیان پێیان وایە کە لە ئەسڵ و بنەمادا هەم جوت بوون و هەم مارەکردنیش دەگرێتەوە، بەڵام بەڕاستی قسەکەی (راغب) زۆر ڕاست و بەهێزترە و هەق هەر ئەوەیە کە ووشەی ناوبراو لە ئەسڵ و بنەمادا بۆ مارەکردنە و پاشان بۆ جوت بوونیش خوازراوەتەوە و بەکارهێنراوە. دیارە بە سەرنجدانی سەرجەم ئەو ئایەتانەیش کە ووشەکەیان تێدا بەکارهێنراوە و ئەو مەبەستەی وترا یەکجار ڕوون بێت و چەند و چوون هەڵنەگرێت.

بۆ نمونە: ﴿وَأَنكِحُوا الْأَيَامَى مِنكُمْ﴾(النور/٣٢)﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا نَكَحْتُمُ الْمُؤْمِنَاتِ ثُمَّ طَلَّقْتُمُوهُنَّ مِن قَبْلِ أَن تَمَسُّوهُنَّ فَمَا لَكُمْ عَلَيْهِنَّ مِنْ عِدَّةٍ تَعْتَدُّونَهَا﴾(الأحزاب/٤٩).

---

[٤١] -(المصباح المنير للفيومي)ص/٢٨٥و(لسان العرب/٢/٦١).
[٤٢] -(مفردات ألفاظ القرآن ص/٣٨٥).

﴿تَنكِحُوهُنَّ بِإِذْنِ أَهْلِهِنَّ﴾(النساء/٢٥). لەزاراوەی شەرعزانیشدا ووشەی (زواج ونكاح) بەچەند شێوەیەك پێناسە كراون، كە لە ناوەڕۆكیاندا هەر یەكن.[٤٣]
ئەم پێناسەیەش لە هەموویان كۆكەرەوەتر و ڕێكترە: (الزواج عقد يفيد شرعاً حل استمتاع كل من الزوجين بألآخر على وجه المشروع).[٤٤]
واتە: (هاوسەرێتی پەیمانێكە لەڕووی شەرعییەوە لەززەت لێوەرگرتنی هەركام لە ژن و مێرد لەیەكتر بە شێوەیەكی ڕەوا حەلاڵ دەكات).
دیارە ووشەی (نكاح)یش، هەر هەمان واتاو مەبەستی ووشەی (زواج)ی هەیە و وەك دوو وشەی هاو واتا (مترادف) وان لەزاراوەی شەرعدا، هەرچەندە لەڕووی زمانەوانییەوە مانایان تاڕادەیەك جیاوازە.

تێبینییەكی گرنگ:

(حواء) (عليهاالسلام) بە ناوی خۆیەوە لە قورئاندا باس نەكراوە، و بەڵكو لەهەمو شوێنەكاندا بەوشەی (زوج) ئاماژەی بۆكراوە، ئەمەش نهێنییەكە لەنهێنییەكانی لێكدانەوەی قورئان، كە بەڵگەیە لەسەر بەلاغە وزمانپاراوی وجواندەربڕین وبەڵگەی جوانهێنانەوە، تاكە پەیوەندی شەرعی كەپیاوێك وئافرەتێكی بێگانە پێكەوە كۆبكاتەوە بریتییە لە (زواج) هاوسەرداری، بەڕاستی خوای گەورە (حواء)ی بۆ ئادەم (عليه‌السلام) دروست كرد، تا لەگەڵیدا ئارام بگرێت وخوگری بێت ونیشتەجێ بن و بحەوێنەوە و لەزەت و خۆشی لەیەك وەرگرن و كاری زۆر بوون ونەوەخستنەوە لە نێوانیاندا ڕووبدات.
هاوسەرداری یەكێكە لە سوننەتە (فطري)یەكان، كە بەڵگە ونیشانەیەكی كەونی و ئینسانی و سونەتێكی پێغەمبەرە ﷺ
● بوونی بە سونەتێكی (فطري): لەبەر ئەوەیە چونكە ڕێك كەوتووە و گەنجاوە، و ئەو پەرژینەیە كە باوكە ئادەم وحەواء ی هاوسەری بە پەیوەندی هاوسەرێتی پێكەوە بەست، ئیسلام شتیكی هێنا كەلەگەڵ فیترەتی ساغدا بگونجێت، خوای گەورە لە سوورەتی(الروم)دا –كەئەمە ماناكەیەتی– فەرمووی: (ئەی ئینسان بەدڵێكی پاك وبێگەردەوە) ڕوو بكەرە بەرنامەی ئاینی خوا وئەملا وئەولا مەكە، خەڵكینە ئێوەش

[٤٣] -بڕوانە(نيل الأوطار) ج/٦/ص/١٠١و(الدرالمختار/٢/٤٢)و(نهايةالمحتاج) للرمكي ١٧٣/٦و(عقدالزواج واثاره) محمدأبوزهرة ص/٣٧و(شرح الأزهار/٢/١٩٦).
[٤٤] -بڕوانە(المفصل/٦/١١)..

پابەندی ئەو نەخشەیە بن کە خوا ئێوەی لەسەر دروستکردووە واتە: (قورئان کەتەلۆك ونەخشەی ژیانی ئادەمیزادەکانە لێی لامەدەن) هیچ جۆرە گۆڕانکارییەك لەهیچ نەخشە ودروستکراوێکی خوادا نییە، ئا ئەوەیە دینی ڕاست ودروست، بەڵام زۆربەی خەڵکی ئەم ڕاستیانە نازانن).(الروم:٣٠).

لە (ئەنەس)ەوە (خوای لێی ڕازی بێت) فەرمووی: (سێ پیاو هاتن بۆماڵی هاوسەرەکانی پێغەمبەر ﷺ پرسیاریان لەپەرستشەکانی پێغەمبەر کرد، کاتێك هەواڵیان پێدان وەك ئەوەی کەوتیان، پاشان وتیان: ئێمە لە کوێین لە چاو پێغەمبەردا ﷺ؟ بێگومان خوای گەورە لە گوناهی پێشین وپاشینی ئەو خۆشبوە، یەکێك لەپیاوەکان وتی: ئیتر من لەوەودوا هەموو شەو نوێژ دەکەم وهەرناخەوم، یەکێکی تریان وتی: من هەمیشە ڕۆژو دگرم و نایشکێنم، وئەوی تریان وتی: من خۆم لەئافرەت بەدور دەگرم وهەرگیز ژن ناهێنم، ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ هاتەوە وفەرموی: (ئێوە ئەوکەسانە بوون کەئەوەو ئەوەتان وت؟ بەڵام سوێند بەخوا من لەهەموتان زیاتر لەخوا ترسم وپەرستشم زۆرترە، بەڕۆژو دەبم ودەشی شکێنم، ونوێژیش دەکەم ودەیشخەوم، وژنیش دەهێنم، هەرکەس پشت لەسونەتی من بکات،لەمن نییە).[٤٥]

● بەوەی کە هاوسەرداری نیشانەیەکی کەونییە، وەك ئەوەیە کە خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿وَمِن كُلِّ شَيْءٍ خَلَقْنَا زَوْجَيْنِ﴾(الذاريات:٤٩).

واتە: (ئێمە لە هەموو شتێك جوتێکمان دروست کردووە).

لە ئایەتێکی تردا خوای گەورە فەرمویەتی –کەئەمە ماناکەیەتی–: (پاکی و بێگەردی بۆ ئەو زاتەی هەر هەموو بەدیهێنراوەکانی بە جوت دروستکردووە، لەوەی لەزەویدا دەروێت، لە خۆیشیان، لەو شتانەیش کە نایزانن (لە سەردەمی عیلم و زانستیدا) ڕونبۆتەوە: کە هەموو بەدیهێنراوان –ماددی ومەعنەوی– جوتن)(يس:٣٦).

● هەروەها بەوەی کە سوننەتێکی ئینسانییە، وەك ئەوەیە کەخوای گەورە فەرموویەتی –کەئەمە ماناکەیەتی–: (هەرئەو زاتەیە کەلەئاوی (مەنی)بەشەر دروست دەکات (لەوەو دوایش زۆربەی پێکهاتەی لەشی هەر ئاوە) وکردویەتی بەهۆی خزمایەتی (لەڕێگەی پیاوەوە کۆمەڵێك خزم دروست دەبێت، هەروەها لەڕێگەی ئافرەتەوە کۆمەڵێك)

---

[٤٥] – رواه البخاري في كتاب النكاح.

بەڕ ئومان پەروەردگاری تۆ بەردەوام دەستەڵاتی بێ سنورە (لە هەموو بوارێکدا))
(فرقان:٥٤).

لە ئایەتێکی تردا -کە ئەمە ماناکەیەتی- دەفەرموویت: (یەکێك لە نیشانە و بەڵگەکانی تری ئەوەیە: کە هەر لە خۆتان هاوسەری بۆدروستکردون، بۆئەوەی ئارام بگرن لەلایدا و لە نێوانتاندا خۆشەویستی وسۆز ومیهرەبانی فەراهەم هێناوە، بەراستی ئا لەو دیاردانەدا نیشانە و بەڵگە هەیە بۆ کەسانێك بیر دەکەنەوە و تێدەفکرن)(الروم:٢١).

● (الزاواج) هاوسەرداری نیشانەیەکی ئینسانییە، بەڵگەیە لەسەر قودرەت ودەستەڵات وحیکمەتی خوای گەورە.

(ابن كثير) لە تەفسیرەکەیدا دەڵێت: ﴿وَمِنْ آيَاتِهِ﴾ بەڵگەیە لەسەر گەورەیی وتەواوی توانای خوای گەورە: ﴿وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَاجًا لِّتَسْكُنُوا إِلَيْهَا﴾ ئەگەر خوای گەورە هەموو نەوەی ئادەمی بەنێرینە دروستبکردایە، ومێینەکانیشی لەڕەگەزێکی تر بێجگە لەڕەگەزی ئینسان دروستبکردایە، ئەم تێکەڵاوی وپێکەوە ژیانە لەنێوانیاندا ولەنێوان هاوسەرەکاندا بەدینەدەهات، بەڵکو جیابوونەوە ودورکەوتنەوە رویدەدا، ئەگەر ڕەگەزەکان جیاواز بوونایە. پاشان لە تەواوی ڕەحمەتی ئەو بە نەوەی ئادەم ئەوەیە لە ڕەگەزی خۆیان بۆی دروستکردووە وخۆشەویستی و سۆز و پێکەوە ژیانی لە نێوانیاندا بەدیهێناوە، پیاو ئافرەت بۆ خۆی کەمەندکێش دەکات، یان لەبەر خۆشەویستییەتی بۆی یان لەبەر ڕحمەت و بەزەییە بۆی بۆئەوەی منداڵێکی لێ ببێت، یان ئافرەتەکە پێویستی پێی دەبێت کەپیاوەکە نەفەقەی بکێشێت، یان لەبەر ڕاهاتنە لەنێوانیاندا وشتانی تریش.

بەراستی لەمانەدا کۆمەڵێك نیشانە بۆ کەسانێك هەیە کەتێفکرن.[٤٦]

● مامۆستا (سید قطب) خاوەنی (فی ظلال) دەڵێت: خەڵکی (مشاعر) هەستی خۆیان بەرامبەر ڕەگەزی بەرامبەر دەزانن، هەست وبیریان سەرقاڵ دەبێت بەو پەیوەندییەوە لەنێوان هەردو ڕگەزەکەدا، هەنگاوەکانیان دەجوڵێت و چالاکیان دەکەوێتە کار، ئەو هەستانەیش جیاوازن وجۆریان زۆرەو، ئاڕاستەن لە نێوان پیاو وئافرەتدا، بەڵام زۆرکەم دەستەڵات وقودرەتی خوایان بیردەکەوێتەوە، کە لە ڕەگەزی خۆیان هاوسەرانی بۆ دروست کردوون، نەفسی ئەوان ئەوهەست وسۆزانەی بەبارمتە وەرگرتووە وئەو

---

[٤٦] (تفسير القرآن العظيم للإمام إبن كثير).

پەیوەندییەی بووەتە هۆی ئارامی بۆ دەرونەکان وحەوانەوە بۆ جەستەو دڵ وجێگیربونی ژیان ومەعیشەت وخۆشی بۆ ڕۆحەکان وویژدان ودڵئارامی بۆ پیاوان وئافرەتان بەیەکسانی، لێکدانەوەی جوانی قورئانی هاوڕێ بە شێوەیەکی زۆر سەرنج ڕاکێش وێنەی ئەو پەیوەندییە دەکێشێت، وەك ئەوەی لە ناخ و قوڵایی دڵ و هەستەوە وێنەی بگرێت: ﴿لِّتَسْكُنُوا إِلَيْهَا﴾، ﴿وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً﴾، ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ﴾ هەست بە حیکمەتەکانی بەدیهێنەر دەکەن لەدروست کردنی هەردو ڕەگەزەکەدا، لەسەر شێوەیەك کە لەگەڵ ئەوی تردا ڕێك بکەوێت، وەڵامی هەموو پێویستییە فیتری وعەقڵی وجەستەییەکانی دەداتەوە، بە جۆرێك حەوانەوە و دڵئارامی وجێگیری لابەدی دێنێت، و لە کۆبونەوەیاندا ئارامی وئاسودەیی وخۆشەویستی وبەزەیی دەبینن چونکە پێکهاتەی نەفسی ودەماری وئەندامیان جێگای تێبینی یە، وەڵامی هەمووحەزەکانی ڕگەزەکەی تر دەداتەوە، پێکەوە ژیانیان و تێکەڵ بونیان لە کۆتاییدا بۆ بەدی هێنانی ژیانێکی نوێیەو لە نەوەی نوێدا ڕەنگ دەداتەوە...[٤٧]

(زواج) هاوسەرداری نیعمەتێکی خوایە بەسەر بەندەکانییەوە، خوای گەورە کاتێك لە نیعمەتەکانی دەدوێت، لە سوورەتی (النحل)دا –کە ئەمە ماناکەیەتی– دەفەرموێت: (خوا هەر لە خۆتان هاوسەرانی بۆ فەراهەم هێناون، هەر لە ڕێگەی هاوسەرانتانەوە) کوڕ و کوڕەزای پێ بەخشیون و لە هەموو ڕۆزییەکی چاك و پاك و بەسود بەهرەوەری کردون، (لەگەڵ ئەو ڕاستیانەدا) ئایا ئەوانەی هەر بڕوا بە شتی پووچ و ناحەقی دەکەن و لەبەرامبەر ناز ونیعمەتەکانی خواوە ئەوانە هەرناشوکور وسوپاس نەپەرێزی و بێ باوەر دەبن؟)(النحل:٧٢).

هاوسەرداری نیعمەتێکی خواییە، و لە تەواوی ئەم نیعمەتەش ئەوەیە کە باوەڕدار هاوسەرێکی چاکەکار و گوێڕایەڵی هەبێت، کە لەکاری دنیایی و قیامەتیدا یارمەتیدەری بێت، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (دنیا لەزەت و خۆشی و ڕابواردنە و باشترین خۆشی و لەزەتیش، ئافرەتێکی چاکەکارە هاوسەری ژیان بێت).[٤٨]

[٤٧]- في ظلال القرآن

[٤٨]- رواه مسلم في صحيحه.

پێغەمبەر ﷺ لە فەرمودەیەکی تردا، فەرمویەتی: (ئافرەت لەبەر چوارشت مارە دەکرێت: لەبەر ماڵەکەی و لەبەر بنەماڵە و ناوبانگی، و لەبەر جوانی و لەبەر دینەکەی، تۆ لە بەر دینەکەی هەڵی بژێرە، ئەوا دەستت بەخۆڵدا چووە).[٤٩]

هاوسەری چاکەکار لە گەورەترین چاکەکانی دونیایە و باشترین لەزەت و ڕابواردنیشە. خوای گەورە لە ئایەتێکدا -کەئەمە ماناکەیەتی- دەفەرموێت: (لە باوەڕداران هەیە دەڵێن: پەروەردگارا لە دنیادا خەیرو چاکەو ناز و نیعمەتمان پێ ببەخشەو، لە قیامەتیشدا لە ناز و نیعمەتەکانی بەهەشت بەهرەمەندمان بکە و، لە سزای ئاگری دۆزەخ بمان پارێزە.) (البقرە\٢٠١).

هەروەها یەکێك لەدوعاکانی بەندەکانی (الرحمن) کە لە سوورەتی (الفرقان)دا هاتووە – ئەمە ماناکەیەتی- دەفەرموێت: (بەندەکانی (الرحمن) ئەوانەن کەدەڵێن: پەروەردگارا لەهاوسەران ونەوەکانمان کەسانێکمان پێ ببەخشە کەببنە مایەی ڕوناکی دیدەمان وشادمانی دڵمان وبمانکە بەپێشەوا بۆپارێزکاران وخواناسان) (الفرقان:٧٤).

هەرگیز بینای چاوەکان و دیدەکان ڕوناك نابێت و حاڵی جەستە لە حەوانەوەدا نابێت، مەگەر کاتێك کە هاوسەرێکی چاکەکاری هەبێت، وچاکی بەندەکانی خوا و هاوسەرەکانیان بە یارمەتی خوا دەبێتە هۆی چاك بونی منداڵ و نەوەکانیان، و ئەگەر منداڵەکە چاك بێت و ژیانەکە خۆش و باش بێت، ئەوە یارمەتی دەر دەبێت لەسەر گوێ ڕایەڵی خوا و پێشبڕکێ بۆ کاری خەیر هەتا بڕوادار دەگاتە پلەی تەقوا لەخواترساوان و پێشکەوتنی ئاسان دەبێت ودەبێتە پێشەوای ئەوان.

*پلە و پایەی هاوسەرداری لە ئیسلامدا بریتییە لە یاسایەکی خوا و نیعمەتێکی خوایی وسونەتێکی فیتری و نیشانە و بەڵگەیەکی کەونی و ئینسانی و سونەتێکی پێغەمبەرﷺ.

خوای گەورە لە ئایەتێکدا _کە ئەمە ماناکەیەتی_ فەرمویەتی: (سوێند بە خوا بێگومان، پێش تۆ پێغەمبەرانی ترمان ڕەوانە کردووە هاوسەر و نەوەشمان پێداون) (الرعد\٣٨).

هاوسەرداری هۆکارە بۆ زۆربونی نەوەی موسوڵمانان، پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژی دواییدا ئومەتەکەی زۆرن وشانازیان پێوەدەکات. ئەوزۆربونە ڕێگایەکی شەرعی یە بۆپێکهاتنی خێزانی موسوڵمان، کەئەو خێزانەش بریتییە لەخانەیەکی زیندوو وخشتێکی چاك و

---

[٤٩]- رواه البخاري في صحيحه.

پارێزراو بۆپێکهێنانی کۆمەڵگایەکی موسوڵمان. هاوسەر گەوهەرێکی پارێزراو وبەنرخ وشاراوەیە، کەکۆمەڵگا لەوپێك دێت وڕێك دەخرێت.
کۆمەڵگای موسوڵمان، کۆمەڵگای سۆز وخۆشەویستی وپێکەوە ژیان وهاوکاری دادپەروەری وپاکی وپاك داوێنی ویەکسانی وبرایەتی وچاکە وتەقوا وبەزەیی نێوان یەکترو پەیوەندی بەیەکگەیشتن وپێکەوە ژیان وبەدەمەوەچونە.
لەبەرئەوە ئیسلام هاندەرە لەسەرکاری هاوسەرداری وبانگەواز دەکات بۆ ئاسانکاری لەوبوارەدا ودەستی یارمەتی بۆدرێژدەکات وبەربەستەکان لادەبات کەڕێگاکەی گرتووە، خوای گەورەلە سوورەتی (النور)دا _کەئەمە ماناکەیەتی_ فەرمویەتی: (ژن بدەن بە پیاوانی بێ ژن و، ئافرەتانی بێوەژن بدەن بەشوو، هەروەها ژن بدەن بەبەندە صاڵحەکانتان و، کەنیزەکەکانیشتان بدەن بەشوو ئەگەر هەژاریش بن، ئەوە خوا لەفەزڵ وبەخششی خۆی بەهرەوەرییان دەکات، خوای گەورەیش هەمیشە فراوانگیر وزانایە) (النور:٣٢).
دەست پێشکەری بۆکاری هاوسەرداری کارێکی خوازراوە و ئاسانکاریش لەو بوارەدا داواکراوە ویارمەتیدانیش لەسەری شتێکی پەسەندکراوە، وقورسکردنیشی شەڕو فەسادێکی گەورەیە.
پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: (ئەگەر کاتێك کەسێك هات بۆ لاتان بۆداخوازی ژن وئێوەیش لەدین وئەخلاقی ڕازی بوون، ژنی بدەنێ وبیکەنە هاوسەری، ئەگەر ئەو کارەتان نەکرد، ئەوە فیتنە وخراپەی زۆر لەسەر زەویدا بەرپادەبێت.).[٥٠]

ڕونکردنەوەیەکی گرنگ:

_تێبینی ئەو پەیوەندییە بکە لە نێوان فەرمودەکەو ئەم ئایەتەدا کەخوای گەورە فەرمویەتی: ﴿وَالَّذِينَ كَفَرُوا بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ إِلَّا تَفْعَلُوهُ تَكُن فِتْنَةٌ فِي الْأَرْضِ وَفَسَادٌ كَبِيرٌ﴾ (الانفال:٧٣).
واتە: (ئەوانەش کە بێباوەڕبوون، هەندێکیان پشتیوانی هەندێکی تریانن وپشتیوانی لە یەکتر دەکەن، خۆ ئەگەر ئێوەی ئیماندار کۆمەك بە یەکتر نەکەن وپشتی یەکتر نەگرن،

[٥٠]- رواه الترمذي.

ئەوە لەسەر زەویدا ناخۆشی و ناکۆکی وگوناه وتاوانی گەورە پێش دێت. (ئازار و ناخۆشی بۆ ئێوەی ئیماندار پێش دێت)).

فەساد و خراپە لە ئەنجامی بێ هاوسەری دیندار و بەئەخلاق پێك دێت: فەسادی ئەخلاقی وکۆمەلأیەتی و ناوخۆیی پەیدادەبێت، وفەساد لەئەنجامی پشتیوانی بۆدوژمنانی خوا پەیدادەبێت، کەفەسادی سیاسی یە، هەموو جۆرەفەسادێك زیانی زۆری لەسەر کۆمەڵگای موسڵمان هەیە.

لە ئایەتی: ﴿اسْكُنْ أَنتَ وَزَوْجُكَ الْجَنَّةَ﴾. واتە: ئەی ئادەم تۆ لە بەهەشتدا نیشتەجێ ببە و با هاوسەرەکەیشت لەگەڵتدا نیشتەجێ ببێت، لە ئایەتەکەدا ووشەی (اسكن) دوبارەبونەوەیە، تاکارەکە لەنێوان هەردولادا بەشداربێت، شوێنی نیشتەجێ بوونی ڕاستی بۆپیاو بەبێ بونی ئافرەت بەتەواوی جێ بەجێ نابێت، چونکە ئافرەت ئارامی وسەکینەت ودڵنیایی بۆ دەستەبەر دەکات، لێرەدا قورئان بە (حرف)ی (عطف) ئادەم وحەوائی کۆکردەوە پێکەوە، کەئاماژەیە بۆ پێکەوە ژیان ویەك ڕەگەزی وبەزەیی کە کۆیان دەکاتەوە، ئەو بەتەنها شوێنەکەی نابێتە شوێنی نیشتەجێ بوون، هەروەها ئافرەتەکەیش، بەڵکو بەیەکەوە جێ بەجێ دەبێت، خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿اسْكُنْ أَنتَ وَزَوْجُكَ الْجَنَّةَ﴾(البقرە:١٨٧).

واتە: (هاوسەران بەرگ وپۆشاکن بۆ ئێوە، و ئێوەش بەرگ و پۆشاکن بۆ هاوسەرانتان).

جل وبەرگ پارێزەر و داپۆشەر و جوانییە بۆ ئینسان، یەکێکە لە پێویستی وگرنگییە بنەڕتییەکان، کە هەمیشە مرۆڤ پێویستی پێیەتی، هەروەها مێردیش بە نیسبەت هاوسەرەکەوە داپۆشەر و پارێزەر وجوانی و لەزەت وڕابواردن وخۆشەویستی وبەزەییە هەروەها ژنیش بۆمێردەکەی بە هەمان شێوە.

لە ئایەتی: ﴿ فَقُلْنَا يَا آدَمُ إِنَّ هَذَا عَدُوٌّ لَّكَ وَلِزَوْجِكَ﴾(طه:١١٧). بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە دوژمنایەتی ئیبلیس بە یەکسانی بۆ هەردوکیان بوو، بۆ یەکێکیان نەبوو بەبێ ئەوی تریان، و پێویست بوو لەسەریان کە هەردووکیان هاوکاری بکەن بۆ ڕێگە گرتن لە شەیتانی نەفرەت لێکراو.

پێویستە هاوسەری باوەڕداریش لە هەموو کات وشوێنێکدا هاوکار بێت بۆ مێردەکەی لەسەر گوێ ڕایەڵی فەرمانی خواو پێویستە لەسەری کە مێردەکەی ڕازی بکات و دەستی

بگرێت بۆ گۆڕەپانی ڕەزامەندی، و هەروەها مێردی باوەڕداریش دەبێت هەر بەو جۆرە بێت لە ئایەتی: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَاءً﴾(النساء:١)دا دانپێدانان و بنەما دانانێکە بۆ یاسایەك کەهەموو بەشەری لێ دروستبووە، دەرچوونیش لەم یاسایە، شەریعەتی ئیسلامی حەکیم دێنێت بەدوای خۆیدا، کەلەگەڵ سروشتی هەموو بەشەردا دەگونجێت و ڕێك دەکەوێت، ولەگەڵ بارو دۆخیاندا دەگونجێت ولەگەڵ هەموو چاخ سەردەمێکیشدا یەکدەکەوێت وپەیوەندیەکانیش بەهێزدەکات وپاڵپشتی برایەتی نێوانیان دەکات، ئەصڵ وبنەماکان یەکن وئاڕاستەکان یەکن وئامانجەکە یەکە وبەرنامەکەش یەکە.

## ٢-دوژمنایەتی شەیتان بۆ ئینسان

*دوژمنایەتی شەیتان بۆ ئینسان دوژمنایەتیەکی کۆنە، لەوکاتەوە کەخوای گەورە ئادەم (علیه السلام)ی دروستکرد، وفەرمانی کرد بە فریشتەکان کە سوجدەی ڕێزگرتن بەرن بۆ ئادەم، بەڵام شەیتان ئەوەی ڕەت کردەوە، و هەڵگەڕانەوە و دوژمنایەتی و سەرپێچی خۆی ڕاگەیاند، لە ئەنجامی ئەوەشدا سزای بریتی بوو لە دەرکردن و بێبەش بوون لە ڕەحمەتی خوایی، و خوای گەورە لە بەهەشت دەریکرد و نەفرەتی لێکرد، و سەر شۆڕ و مل نەوی کرا و، کەوتە بەر سەرزەنشتی خوایی، وداوای کرد لە خوا کەمۆڵەتی بدات، ئەویش مۆڵەتی دا، خوای گەورە لە سوورەتی (ص)دا فەرموی: (خوا فەرموی: مادەم وایە دەرچۆ لەبەهەشت وبەجێی بهێڵە، چونکە تۆ ئیتر ڕەجم کراوو دورخراوەی لەڕەحمەتی من(٧٧)بەڕاستی لەعنەت و نەفرینی منت لەسەرە هەتاڕۆژی قیامەت (چونکە تۆ فەرمانی منت جێ بە جێ نەکرد)(٧٨)شەیتان وتی: پەروەردگارا دەی کەواتە مۆڵەتم بدە، تائەو ڕۆژەی کەنەوەکانی ئادەم زیندو دەکرێنەوە (٧٩) خوافەرموی: باشە تۆ لە مۆڵەتپێدراوانیت...(٨٠) تاڕۆژو کاتی دیاری کراو (٨١) ئینجا شەیتان وتی: سوێند بەدەستەڵاتی بێسنورت شەرت بێت، هەر هەموویان گومڕا وسەرگەردان بکەم (٨٢)جگە لەبەندە وعەبدە دڵسۆزەکانت کەهەڵبژاردەی خۆتن (دەسەڵاتی ئەوانم نییە)(ص:٧٧_٨٣).

*ئیبلیس بە وەسوەسە لە دژی ئادەم و حەواء و سەرلێتێکدانیان دەستی پێکرد، هەتا لەو درەختەیان خوارد کە نەهی لێکرا بوو، ولەم جەنگەدا زۆر چەکی مەترسیداری بەکارهێنا، لەوانە: هەڵنان وهەڵخەڵتاندن وسوێندخواردن، وبانگەشەی ئەوەیشی کرد کەئەو ئامۆژگارییان دەکات ولەکەسە دڵسۆزەکانەو شتانی تریش، تاهەڵی خەڵەتاندن وهەڵینان تالەدرەختە قەدەغەکراوەکەیان خوارد،ولەبەهە شت کرانەدەرەوە، بەردەوام ئیبلیس دەمێنێتەوە، و وەسوەسەو سەرلێشێواندنەکانی بۆ بەشەر تارۆژی قیامەت بەردەوام دەبێت، بەڕاستی خوای گەورە ئێمەی لێئاگادار کرد لەخۆی ودوژمنایەتیەکەی وهەوڵدانی بەردەوامی لەسەر تێکدانی بەشەرو گومڕاکردنی.

خوای گەورە لە سوورەتی (فاطر)دا _ کە ئەمە ماناکەیەتی _ فەرموویەتی: (ئەی خەڵکینە دڵنیا بن بەڵێنی خوا ڕاست ودروستە (قیامەت بەرپادەکات ولەهەمووکەس دەپرسێتەوە) کەوابوو ژیانی ئەم دونیایە سەرتان لێنەشێوێنت وشەیتان نەتانخەڵەتینێت بەناوی) ڕەحم وبەزەی خواوە (کە گوایە هەرچی بکەن خوا بەبەزەییە ولێتان خۆش دەبێت) (چونکەبەڕاستی شەیتان دوژمنتانە، ئێوەش بەدوژمنی خۆتانی بزانن، بێگومان بانگی تاقم ودار ودەستەی خۆی دەکات، بۆئەوەی ببنە نیشتەجێی دۆزەخ)(فاطر:٥-٦).

(ئایەتەکان لەم باسەدا زۆرن، ئەوەندەمان بەسە).

ئەمانە گفتوگۆیەکی هەڕەشە ئامێزو سەرزەنشت کردن بوو بۆ کافران لە بەشەر، ئەو کەسانەی کە پەند و عیبرەتیان لە چیرۆکی باوکە ئادەمیان وەرنەگرت، کاتێك بەهۆی سەرپێچی فەرمانی خواوە لەبەهەشت دەرکرا، دەبێت حاڵی کافران چی بێت کە شەیتانیان پەرستووە و ڕێگای ئەویان گرتووە، وازیان لە پەرستنی خوایەکی تاك و تەنها و بەدەسەلأت هێناوە!

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَا بَنِي آدَمَ لَا يَفْتِنَنَّكُمُ الشَّيْطَانُ كَمَا أَخْرَجَ أَبَوَيْكُم مِّنَ الْجَنَّةِ يَنزِعُ عَنْهُمَا لِبَاسَهُمَا لِيُرِيَهُمَا سَوْآتِهِمَا إِنَّهُ يَرَاكُمْ هُوَ وَقَبِيلُهُ مِنْ حَيْثُ لَا تَرَوْنَهُمْ إِنَّا جَعَلْنَا الشَّيَاطِينَ أَوْلِيَاءَ لِلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ﴾(الأعراف:٢٧).

تێبینی ئەوە بکە کە پەیوەندییەکی بەهێز لە نێوان ئەم ئایەتە وئایەتی پێشتری خۆیدا هەیە کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَا بَنِي آدَمَ قَدْ أَنزَلْنَا عَلَيْكُمْ لِبَاسًا يُوَارِي سَوْآتِكُمْ وَرِيشًا وَلِبَاسُ التَّقْوَى ذَلِكَ خَيْرٌ ذَلِكَ مِنْ آيَاتِ اللَّهِ لَعَلَّهُمْ يَذَّكَّرُونَ﴾(الأعراف:٢٦).

(اللباس) جل و بەرگ و داپۆشەر نیعمەتێکی خوای گەورەیە ناردویێتی تا ببێتە داپۆشەر و پارێزەر بۆ جەستە، وەك ئەوەی کە تەقوا و لەخواترسان بەرگ وداپۆشەری دڵ وپارێزەری نەفسە.

مامۆستا(سید قطب) لە کۆتایی قسەکانیدا دەربارەی چیرۆکی ئادەم وحەوا، کە لە سەرەتای سوورەتی (الأعراف)دا هاتبوو، دەڵێت: (...لە کۆتاییدا چیرۆکەکە و، ئەوەیشی بەدوایدا دێت _وەك لەمەو دوا دێت_ ئاماژە دەکات بۆ شتێکی دامەزراو و ڕەگ داکوتراو لە سروشتی ئینسان وفیترەتیدا، کە ئەویش بریتییە لە حەیا و شەرم لە خۆ ڕوت کردنەوە وخۆدەرخستنی جەستە و عەورەتیان: ﴿فَوَسْوَسَ لَهُمَا الشَّيْطَانُ لِيُبْدِيَ لَهُمَا مَا وُورِيَ عَنْهُمَا مِن سَوْآتِهِمَا وَقَالَ مَا نَهَاكُمَا رَبُّكُمَا عَنْ هَذِهِ الشَّجَرَةِ إِلَّا أَن تَكُونَا مَلَكَيْنِ أَوْ تَكُونَا مِنَ الْخَالِدِينَ﴾ (الأعراف:٢٠)، ﴿فَدَلَّاهُمَا بِغُرُورٍ فَلَمَّا ذَاقَا الشَّجَرَةَ بَدَتْ لَهُمَا سَوْآتُهُمَا وَطَفِقَا يَخْصِفَانِ عَلَيْهِمَا مِن وَرَقِ الْجَنَّةِ وَنَادَاهُمَا رَبُّهُمَا أَلَمْ أَنْهَكُمَا عَن تِلْكُمَا الشَّجَرَةِ وَأَقُل لَّكُمَا إِنَّ الشَّيْطَانَ لَكُمَا عَدُوٌّ مُّبِينٌ﴾(الأعراف:٢٢)، ﴿يَا بَنِي آدَمَ قَدْ أَنزَلْنَا عَلَيْكُمْ لِبَاسًا يُوَارِي سَوْآتِكُمْ وَرِيشًا وَلِبَاسُ التَّقْوَى ذَلِكَ خَيْرٌ ذَلِكَ مِنْ آيَاتِ اللَّهِ لَعَلَّهُمْ يَذَّكَّرُونَ (٢٦) يَا بَنِي آدَمَ لَا يَفْتِنَنَّكُمُ الشَّيْطَانُ كَمَا أَخْرَجَ أَبَوَيْكُم مِّنَ الْجَنَّةِ يَنزِعُ عَنْهُمَا لِبَاسَهُمَا لِيُرِيَهُمَا سَوْآتِهِمَا إِنَّهُ يَرَاكُمْ هُوَ وَقَبِيلُهُ مِنْ حَيْثُ لَا تَرَوْنَهُمْ إِنَّا جَعَلْنَا الشَّيَاطِينَ أَوْلِيَاءَ لِلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ﴾(الأعراف:٢٦_٢٧).

هەموو ئایەتەکان گرنگی ئەم مەسەلەیە دەگەیەنن، لەگەڵ قووڵی لەناو فیترەتی بەشەردا، جل وبەرگ وداپۆشەر جوانییە بۆ ئینسان وداپۆشەرە بۆ جەستە وعەورەتی، وەك ئەوەی کە تەقوا و لەخواترسان بەرگ و داپۆشەرە بۆ عەورەتی نەفس، و فیترەتی ساغ، ئەو دەرخستن و ڕوتی جەستە .و نەفس ڕەت دەکاتەوە، هاندەرە لەسەر داپۆشینی و پاراستنی.

ئەو کەسانەی کەهەوڵ دەدەن جەستەکان لە بەرگ و داپۆشەر ڕوت بکەنەوە و نەفسیان لە تەقوا دابڕن و شەرم وحەیا لە خوا و لە خەڵك نەمێنێ، ئەو کەسانەی کە زمان و قەڵەم و ئامێرەکانی ئاراستەکردن و ڕاگەیاندن هەموو بەکاردێنن لەپێناوی ئەم هەوڵەدا _لەچاخە جیاوازەکاندا و هەموو هۆکارێکی شەیتانی پیس بەکاردەهێنن_ ئەوانە ئەو کەسانەن کە دەیانەوێت ئینسان لە تایبەتمەندی ئینسانی و فیترەتی خۆی دابڕێ، کە بەو شتە جوانانەوە بۆتە ئینسان. ئەوانە ئەو کەسانەن کە دەیانەوێت ئیسلامەتی ئینسان بۆ دوژمنایەتی شەیتان بێت، و نایەوێت خۆیان لە جل وبەرگ دابڕنن وجەستە و عەورەتیان دەربکەوێت، کافران ئەو کەسانەن، دەیانەوێت نەخشەکانی (صهیونی) جولەکە جێبەجێ بکەن بۆ داشکاندنی ئینسانی و بڵاوکردنەوەی خراپە لەناویاندا، بۆ ئەوەی بەبێ بەرگری کردن ملکەچبن بۆ دەسەڵاتی جولەکە و هەموو بەرگریەکی ئینسانی لەدەست خۆیان بدەن !).[٥١]

●ئەوەی کە گونجاوە و دەست دەدات بریتییە لەوەی کە ئاگادار بین شەیتان شێوازو ئامرازی زۆرە و هۆکاری جۆراوجۆری هەیە و ڕێگای هەمە جۆر بۆ تێکدان و گومڕاکردنی ئینسان دەگرێتە بەر، لەگەڵ هەموو دەستەیەکدا شێوازی تایبەتی و گونجاو بەکار دێنێت، هەروەها توانای زۆرە کە بەرگی ناحەقی بکات بە بەری حەق و ڕاستیدا، زۆرێك لە شتانی داهێنراوی جوان و ڕازاوە کردووە، زۆر سەرپێچی ئاسانکردووە، وزۆر فیتنەو خراپەی ڕازاندوەتەوە، وزۆرێك لەگوێڕایەڵیەکانی لای خەڵکی قورسکردووە و ڕوی خەڵکی لێ وەرگێڕاوە، پەشیمانبونەوەی لای ئەو دواخستووە.

●شەیتان زاڵ دەبێت بەسەر ئینساندا هەر لەکاتی لەدایك بونیەوە تائەو کاتەی ڕۆح لەجەستەیدابێت.

پێغەمبەرﷺ لەفەرمودەیەکدا دەفەرموێت: (هیچ کەسێك لە ئێوە نیە مەگەر نزیك و هاوەڵێکی لە (جن) پەرییەکان هەیە، هاوەڵان وتیان: (ئەی پێغەمبەری خواﷺ تۆیش؟ فەرموی: (بەڵێ منیش، بەڵام خوای گەورە یارمەتی منی داوە لەسەری کە موسوڵمان بووە، تەنها بە خەیر و چاکە فەرمانم پێ دەکات).[٥٢]

---

[٥١]- (في ظلال القرآن /١٢٧٥/٣) بە دەست کاریەوە

[٥٢]- رواه مسلم في باب:صفة القيامة والجنّةوالنار

هەروەك چۆن قورئان ئاگاداری کردوین لەشەیتانی (جن) هەر بەو جۆرەیش ئاگادارمان دەکات لە شەیتانەکانی ئینسان، کە ئەوانیش زیان و مەترسیان لە شەیتانی (جن) کەمتر نین، خوای گەورە فەرمویەتی: _کە ئەمە ماناکەیەتی-: (هەر بەو شێوەیە (کێشمەکێشی ئیمانداران و خوانەناسان بەردەوامە) جا بۆ هەموو پێغەمبەرێك (بۆ ئیماندارانیش) دوژمنێکمان لە شەیتانەکانی ئادەمیزاد و پەری سازاندووە، کە بەردەوام قسەی زل و ڕازاوە دەدەن بەگوێی یەکدا و (خۆیان و خەڵکی) پێ سەرگەردان و گومڕا دەکەن، خۆ ئەگەر پەروەردگارت بیویستایە (نەیان دەتوانی) شتی وابکەن، دە وازیان لێبهێنە لەگەڵ ئەودرۆو دەلەسەیەی کەهەڵی دەبەستن (بۆ کوێ دەچن، لە دەست سزای خوا ڕزگارنابن)(١١٢) (هەروەها بەو قسە جوان و بریقەدارانە ئەیاندا بە گوێی یەکدا) بۆ ئەوەی ئەوانەی باوەڕیان بە قیامەت نییە دڵی بدەنێ و پێی ڕازی بن و بۆ ئەوەی ئەو تاوانە بکەن کە ئەوان بەرردەوام دەیکەن) (الأنعام:١١٢_١١٣).

*بێگومان پەیوەندی و هاوکاری لەنێوان هەردوو جۆری شەیتانەکاندا هەیە، لەسەر خراپە وئەنجام دانی تاوان ودوژمانەیەتی، ولەسەر درۆو بوهتان، ولەسەر سەرپێچی و لەسنور دەرچون.

*هەروەها ڕێککەوتون ودەستبەکارن لەپێناوی یەك ئامانجدا، کەئەویش دەست گرتنە بەسەرحەق و ئەهلی حەق و ڕاستیدا.

پێویستە لەسەرمان کە ئاگاداربین لێیان و پەنابگرین بە خوا لێیان.خوای گەورە فەرمویەتی: ((خۆت بسپێرە بە خواو) بڵێ: پەروەردگارا من پەنا دەگرم بە تۆ لە هەموو خەتەرە و خەیاڵ و وەسوەسەی شەیتانەکان(٩٧)پەنا دەگرم بە تۆ ئەی پەروەردگام کە شەیتانەکان بە دەورمدا کۆببنەوە و (سەرم لێ بشێوێنن)(٩٨)(المؤمنون:٩٧_٩٨).

## ٣-شوێنەواری تاوان و گوناە و، پێویست بوونی دەست پێشکەری بۆ تەوبە:

*لەو وانە گرنگ وبەسودانەی کە لە چیرۆکی ئادەم وحەواء وەردەگرێت بریتییە لە: مەترسی وسەرپێچی و داهاتوو ئەنجامەکەی، ئێمە پێویستە خۆمان لەسەرپێچی بپارێزین و هەرچۆنێك بێت بە بچوکی نەزانین. و سەیری بچووکی سەرپێچی و تاوانەکە نەکەین، بەڵکو سەیری ئەوە بکەین کە ئێمە سەرپێچیمان بەرامبەری کردوە چەند گەورەیە پێغەمبەرﷺ لە فەرموودەیەکدا دەفەرموێت: (بەندەی خوا کاتێك هەڵە و

تاوانێك ئەنجام دەدات، ئەوا خاڵێکی ڕەش لە دڵیدا دروست دەبێت، ئەگەر وازی لە گوناه هێنا و داوای لێخۆشبونی کرد و تەوبەی کرد، ئەوا دڵی پاك و سپی دەبێتەوە، و ئەگەر جارێکی تر گەڕایەوە سەر هەڵە و تاوانەکە، ئەوا زیاد دەبێت، هەتا زاڵ دەبێت بەسەر دڵیدا، ئەوە بریتییە لە (الران) پەردەیەکی ڕەش، کە خوای گەورە لەم ئایەتەدا باسی کردووە: ﴿كَلَّا بَلْ رَانَ عَلَى قُلُوبِهِم مَّا كَانُوا يَكْسِبُونَ﴾[٥٣](المطففين:١٤). تاوان و گوناه ئەگەر بچوك و کەمیش بێت، ئەوا زیان ومەترسی گەورەی هەیە لەسەر نەفس و کۆمەڵگا، و تاوان هۆکار بووە بۆ لەناوچونی زۆرێك لە نەتەوەکان، خوای گەورە لە سوورەتی (العنكبوت)دا -کە ئەمە ماناکەیەتی-دەفەرموێت: (ئێمە هەر یەکێك یان هەردەستەیەك لەوانەمان بەسزاو تاوانی خۆیان گەیاند، جاهەیان بو بەرد بارانمان کرد، هەیانبوو دەنگ وسەدای بەهێز لەناوی برد، هەیان بوو بەناخی زەویدا بردمانە خوارەوە، هەشیان بوو نوقمی دەریامان کرد، جا ئەوە نەبێت خواستەمی لێکردبن، بەڵکو خۆیان ستەمیان لەخۆیان کرد،)(العنكبوت:٤٠).

پێویستە بەندەکان دەست پێشکەری بکەن لەتەوبە کردندا بەدڵسۆزانە، پێش ئەوەی کاتیان لەدەست دەربچێت، خوای گەورە لە سوورەتی (التحريم)دا فەرمویەتی: (ئەی ئەو کەسانەی کە باوەڕتان هێناوە، ئێوە بە تەوبە و پەشیمانییەکی پوخت و دڵسۆزانەوە، ڕوو بکەنەوە خوا، نزیکە پەروەردگارتان لە هەڵە و گوناهەکانتان خۆش بێت و بتانخاتە باخەکانی بەهەشتەوە، کە چەندەها ڕووبار بەژێر درەخت و کۆشکەکانیدا دەڕوات، ڕۆژێك دێت خوا پێغەبەر و ئەوانەی لە خزمەتیدان خەجاڵەت و شەرمەزار ناکات، نوور و ڕوناکیان دەدرەوشێتەوە و دێت و دەچێت لەبەردەم ولای ڕاستیانەوە و دەڵێن: پەروەردگارە ئەم نوور و ڕووناکییەمان بۆ زیاد بکە و لێمان خۆش ببە). چونکە بەڕاستی تۆ دەسەڵاتت بەسەر هەموو شتێکدا هەیە)(التحريم:٨).

خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿وَتُوبُوا إِلَى اللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَ الْمُؤْمِنُونَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾(النور:٣١).

واتە: (تەوبە بکەن هەموتان بەگشتی ئەی باوەڕداران بەڵکو سەرفرازبن.)

---

[٥٣]- (رواه الترمذي في السنن، تفسير القرآن، باب تفسير سورة المطففين).

خوای گەورە دەربارەی تەوبەکەی ئادەم (علیه السلام)فەرمووی: ﴿فَتَلَقَّى آدَمُ مِن رَّبِّهِ كَلِمَاتٍ فَتَابَ عَلَيْهِ إِنَّهُ هُوَ التَّوَّابُ الرَّحِيمُ﴾(البقرە:٣٧).

واتە: (پاشان ئادەم لەلایەن پەروەردگارییەوە چەند ووشە و نزایەکی وەرگرت (بە دڵ و بەکوڵ پاڕایەوە، خوای میهرەبانیش) نزاکەی وەرگرت و لێی خۆش بوو، چونکە بەڕاستی تەنها ئەو زاتێکی ئێجگار میهرەبان و تەوبە وەرگرە)خوای گەورە دەربارەی ئەو ووشە و پاڕانەوەیە دواوە و فەرمویەتی: ﴿ قَالَا رَبَّنَا ظَلَمْنَا أَنفُسَنَا وَإِن لَّمْ تَغْفِرْ لَنَا وَتَرْحَمْنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ الْخَاسِرِينَ﴾(الأعراف:٢٣).

واتە: (ئادەم و حەوا هەردووکیان هەستیان بەهەڵەی خۆیان کردو) وتیان پەروەردگارە ئێمە ستەممان لە خۆمان کرد، خۆ ئەگەر لێمان خۆش نەبیت و بەزەییت پێماندا نەیەتەوە، ئەوا بەڕاستی ئێمە سوێند بە خوا لە خەسارەتمەند و زیانمەندانین).
خوای گەورە تەوبەکەی لێ وەرگرتن و لێیان خۆش بوو.
پێغەمبەرﷺ لە فەرمودەیەکدا فەرمویەتی: (هەر کەس تەوبە بکات پێش ئەوەی خۆر لە خۆرئاوەوە هەڵبێت، خوای گەورە تەوبەکەی لێ وەردەگرێت)[٥٤]
پێغەمبەرﷺ لە فەرمودەیەکی تردا دەفەرموێت: (بەڕاستی خوای گەورە لە شەودا دەستی ڕەحمەت و میهرەبانی دەکاتەوە و فراوانی دەکات، تا لە گوناهکارانی ڕۆژ خۆش ببێت، و بە ڕۆژیش دەستی ڕەحمەت ومیهرەبانی دەکاتەوە و فراوانی دەکات، تا لە گوناهکارانی شەو خۆش ببێت، ئەمە بەردەوام دەبێت تا خۆر لە خۆر ئاواوە هەڵد ێت).[٥٥]

مەرجی تەوبەیش بریتییە لەپەشیمانی لەو کردەوە خراپانەی کە ئەنجام دراون وخۆی لێ داماڵێت وئەومافەی لەخەڵکی داگیرکردوە بیگێڕێتەوە بۆ خاوەنەکانیان وداوای لێخۆشبون بکات وڕوبکاتە ئەنجامدانی کردەوە چاکەکان وهەوڵبدات لەسەر بەدەست هێنانیان، خوای گەورە لە سوورەتی (الفرقان)دا لە باسی سیفەتی بەندە چاکەکارەکاندا _کە ئەمە ماناکەیەتی_ دەفەرموێت: (هەروەها ئەوانەی هیچ جۆرە خوایەکی تر لەگەڵ خوادا ناپەرستن، کەسیش ناکوژن کە خوا کوشتنی حەرام کردبێت مەگەر بە حەق و

---

[٥٤]- (رواه مسلم في صحيحه، في باب التوبة).
[٥٥]- (رواه مسلم في صحيحه، في باب قبول التوبة في الذنوب وإن تكررت).

ڕەوا، هەروەها زینا ناکەن و نزیکی ناکەون، جا ئەوەی ئەو جۆرە خراپانە ئەنجام بدات، ئەوا توشی سزا و ئازار و ڕیسوایی دەبێت (٦٨) لە قیامەتیشدا سزا و ئازاری بۆچەند بەرامبەر دەکرێت و بە زەلیلی و خەجاڵەتی وشەرمەزارییەوە دەبێت ژیانی تێدا بەرێتە سەر (٦٩) مەگەر ئەو کەسەی تەوبە بکات و باوەڕ بهێنێت وکار و کردەوەی چاکە ئەنجامبدات، ئا ئەو جۆرە کەسانە خوای گەورە کار و کردەوە خراپەکانیشیان بۆ دەگۆڕێت بە چاکە، چونکە هەمیشە و بەردەوام خوا لێخۆشبوو میهرەبانە (بەرامبەر خەڵکی بەگشتی وئەو جۆرە کەسانە بەتایبەتی) (٧٠) جا ئەوەی کە تەوبە دەکات وکار و کردەوەی چاکە ئەنجامدەدات و بەتەمایە پەروەردگار تەوبەی لێ وەربگرێت، ئەوە بێگومان دەگەڕێتەوە بۆلای خوا بە تەوبەیەکی ڕاست ودروستەوە) (الفرقان:٦٨_٧١).

## با هەموو تاوانکارێك خۆی بپارێزێت

گوناه و تاوان نەخۆشی و بەڵای زۆر گەورە بە شوێن خۆیدا دەهێنێت، باسی هەندێکیان دەکەین:

**یەکەم:** ڕق لێبوونی خوای گەورە لەو خاوەن گوناهانە، خوای گەورە لە فەرموودەیەکی قودسیدا: -کە ئەمە ماناکەیەتی- فەرموویەتی: (هەر من خوام جگە لە من خوایەکی تر نییە، ئەگەر گوێڕایەڵیم کرا، ئەوا لەو کەسە ڕازی دەبم کە لێی ڕازی بووم، بەرەکەتی دەدەمێ کە تەواوبوونی نییە، ئەگەر نافەرمانیم کرا، ئەوا ڕقم دایەت لەو کەسە، ئەگەر ڕقم داهات نەفرەتی لێ دەکەم، ئەو نەفرەتە کار دەکاتە نەوەی حەوتەمی).[٥٦]

**دووەم:** ڕق لێبوونی باوەڕداران، (شێخ حەسەنی بەصری) (خوالێی ڕازی بێت) فەرموویەتی: ئێوە خۆتان بپارێزن لەوە کە خۆتان پێی نازانن دڵی باوەڕداران عاجزە لێتان، بەهۆی ئەو گوناهەوە ئەنجامی دەدەیت باوەڕداران ڕقیان لێتە.

**سێ یەم:** زیانی بۆ عیلم و زانستت هەیە:

پێشەوا (الشافعي) فەرموویەتی:

شكوتُ إلى وكيع سوء حِفظي        فأرشدني الى ترك المعاصي

وأخبرني بأن العلم نور        ونور الله لايهدي لِعاص

---

[٥٦]- رواه الأمام أحمد.

واتە: سکالأی خراپی زەین و تێنەکەیشتنم بردە لای مامۆستاکەم کە (وکیع) بوو، ئەویش وەلأمی دامەوە فەرمووی: زانست نووری خوایە، خواش نووری خۆی نابەخشێت بە کەسێك گوناه بکات.

**چوارەم:** کەم ڕزق وڕۆزی:

پێغەمبەر ﷺ لە فەرموودەیەکدا- کە ئەمە ماناکەیەتی -فەرموویەتی: (کەسێك گوناه بکات، ئەو گوناهە کار دەکاتە سەر ڕزق و ڕۆزی ئەو کەسە).[57]

**پێنجەم:** دوورکەوتنەوە لە خوا: بە هۆی گوناهی زۆرەوە.

**شەشەم:** دوورکەوتنەوە لەخەڵکی:

بەهۆی گوناهەوە، هەر لەخۆوە خەڵکی لەو کەسە دوور دەکەوێتەوە.

**حەوتەم:** تاریکی ڕووخسار: (عەبدوڵلأی کوڕی عباس)فەرموویەتی:

(گوناه و تاوان ڕوخسار ڕەش و ناشرین دەکات، دڵ تاریك دەکات، جەستە لاواز دەکات، ژیان تەنگە بەر دەکات، لە دڵەوە خەڵکی خۆشیان ناوێت.

**هەشتەم:** گوناه و تاوان ئەو کەسە لە گوێڕایەڵی خوا دوور دەخاتەوە:

هەموو تاوان و گوناهێك، تاوان وگوناهی تر بەشوێن خۆیدا دەهێنێت، ئیتر حەزی لەگوێڕایەڵی فەرمانەکان و پەرستشەکان نامێنێت،و دەبێت بە بەندەیەکی هیچ و بێ نرخ لای خوا. وەك فەرموویەتی: ﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ يَسْجُدُ لَهُ مَنْ فِي السَّمَاوَاتِ وَمَنْ فِي الْأَرْضِ وَالشَّمْسُ وَالْقَمَرُ وَالنُّجُومُ وَالْجِبَالُ وَالشَّجَرُ وَالدَّوَابُّ وَكَثِيرٌ مِنَ النَّاسِ وَكَثِيرٌ حَقَّ عَلَيْهِ الْعَذَابُ وَمَنْ يُهِنِ اللَّهُ فَمَا لَهُ مِنْ مُكْرِمٍ إِنَّ اللَّهَ يَفْعَلُ مَا يَشَاءُ﴾(الحج/١٨).

بەشی کۆتایی ئایەتەکە واتە: (ئەوەی خوای گەورە قەدر وڕێزی بشکێنێت و ڕیسوای بکات، ئەوە هیچ ڕێز لێنەرێکی نییە، بەڕاستی خوای گەورە ئەوەی بیەوێت دەیکات).

**نۆیەم:** دڵ زەلیل و ڕیسوا دەکات.

**دەیەم:** ئەو کەسە بێ نیازی نیعمەتەکانی خوا دەبێت.

**یانزەیەم:** زمانی دەگیرێت لە کاتێکی وا کە زۆر سەرقاڵ و نارەحەتە و پێویستی بەزمان هەیە وەك کاتی سەرەمەرگ زمانی کلیلی لێ دەدرێت و ناتوانێت ووشەی شەهادەت بڵێت بەهۆی گوناهەوە.

[57] - أخرجةالأمام أحمدفي مسنده حديث (٥/٢٧٧).

مامۆستای بانگخواز (عمرو خالد) دەڵێت: گەنجێك بۆی گێڕامەوە لە سەفەرێکدا لەناو فرۆکەدا بووین، پیاوێك لەناو فرۆکەکەدا بوو جانتایەکی پێ بوو، لە ناکاو کەوتە گیانەلاَ و سەرەمەرگەوە، گەنجەکە پێی وتم: زۆرم هەوڵدا بەڵکو شەهادەتی پێ بهێنم، بەڵام پیاوەکە توند جانتاکەی گرتبوو، هەر چەندە هەوڵم لەگەڵ دا هەر دەیوت: ناتوانم، بەڵام بۆشتی تر زمانی نەبەسترا بوو، هەر پرسیاری جانتاکەی دەکرد. خوای پەروەردگار فەرمویەتی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ﴾(آل عمران/١٠٢).

واتە: (ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە لەخوا بترسن و پارێزگار بن بەشێوەیەکی وا کە شایستەی ئەو زاتەیە و هەمیشە پابەندو دامەزراو بن لەسەر ئیسلامەتی، بۆ ئەوەی هەر کاتێك مردن بە ئیمان و ئیسلامەتی نەبێت نەمرن).

## پوختەی قسە لە چیرۆکەکەدا بریتییە لە:

لە چیرۆکی باوکە ئادەم ودایکە حەوائمان، پەند و ئامۆژگاری زۆری تیایە، کە پێویستە لێیان ورد ببینەوە و ڕابمێنین لێیان وسودیان لێ وەربگرین.

لەو پەند و ئامۆژگارییە گرنگانەش: مەترسی تاوان و شوێنەواری خراپی، پێویستی دەست پێشکەری بۆ تەوبە و ئەنجامدانی کردەوە چاکەکان پێش ئەوەی کات لەدەست بچێت، و ئاگادار بوون لە فرو‌فێڵ و نەخشە و داوەکانی شەیتان، کە دوژمنی هەموو بەشەرە، کەهەر ئەو بووە هۆکاری دەرکردنی ئادەم و حەواء لە بەهەشت، بە هۆی وەسوەسە و سەر لێشێواندنەکانییەوە، هەروەك چۆن دایکە حوا ء و باوکە ئادەمی لە بەهەشت دەرکرد، بێگومان ئەو بە هەرچی لە توانایدا بوو هەوڵی دەدا و لە هەموو جۆرە هۆکارێکی پیس و شێوازی هەڵخەڵەتێنەرانەی بەکار هێنا بۆ تێکدان و سەرلێشێواندن و گومڕاکردن، و هەوڵی بێ بەش کردنی ئێمەش دەدات لە بەهە شت.

## بەشی دووەم
## ئافرەت لە چیرۆکی نوح دا
## ( خێزانی نوح )

### باسی یەکەم:
### بانگەوازی نوح( علیه السلام ) و هەڵوێستی قەومەکەی بەرامبەر بانگەوازەکەی.

خوای گەورە نوح(علیه السلام)ی بۆ قەومەکەی ناردو تەمەنێکی دوورو درێژی لەناویاندا بەسەر بردو مایەوە، وبانگەوازی کردن بۆ پەرستشی خوا، خوای گەورە فەرمووی: ﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَى قَوْمِهِ فَلَبِثَ فِيهِمْ أَلْفَ سَنَةٍ إِلَّا خَمْسِينَ عَامًا فَأَخَذَهُمُ الطُّوفَانُ وَهُمْ ظَالِمُونَ﴾(العنكبوت:١٤).

لە سوورەتی (الأعراف)دا فەرمووی: ﴿لَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَى قَوْمِهِ فَقَالَ يَا قَوْمِ اعْبُدُوا اللَّهَ مَا لَكُمْ مِنْ إِلَهٍ غَيْرُهُ إِنِّي أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ﴾(الأعراف:٥٩).

ل ەسوورەتی (الشعراء)دا فەرمووی: ﴿كَذَّبَتْ قَوْمُ نُوحٍ الْمُرْسَلِينَ(١٠٥) إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ نُوحٌ أَلَا تَتَّقُونَ﴾ (الشعراء:١٠٥_١٠٦).

لە سوورەتی (النوح)دا فەرمووی: ﴿إِنَّا أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَى قَوْمِهِ أَنْ أَنْذِرْ قَوْمَكَ مِنْ قَبْلِ أَنْ يَأْتِيَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ (١) قَالَ يَا قَوْمِ إِنِّي لَكُمْ نَذِيرٌ مُبِينٌ (٢) أَنِ اعْبُدُوا اللَّهَ وَاتَّقُوهُ وَأَطِيعُونِ (٣) يَغْفِرْ لَكُمْ مِنْ ذُنُوبِكُمْ وَيُؤَخِّرْكُمْ إِلَى أَجَلٍ مُسَمًّى إِنَّ أَجَلَ اللَّهِ إِذَا جَاءَ لَا يُؤَخَّرُ لَوْ كُنْتُمْ تَعْلَمُونَ﴾(نوح:١_٤).

لەگەڵ ئەو ماوە درێژە کە نوح (علیه السلام) لەناو قەومەکەیدا بەسەری برد، بانگەوازی دەکردن بۆ پەرستنی خوای گەورە، و بەڵگە و نیشانەی ڕون و یەکلایی کەرەوەی بۆ هێنان و پێی گەیاندن، کە بەڵگە بوون لەسەر ڕاستی بانگەوازەکەی، وهەروەك چۆن بەڵگە بوون لەسەر بەتاڵکردنەوەی ئەو بیروباوەڕە خراپەی کەئەوان لەسەری بوون، بەڵام

نوح تەنها تووشی ئەوەدەهات کەباوەڕیان پێ نەدەکردو بانگەوازەکەیان بەدرۆ دەخستەوە وپشتیان لێ هەڵدەکردو گاڵتەیان پێ دەکردو کەللە ڕەقییان دەنواند وئازاریان دەداو دەیانچەوساندەوە خوای گەورە لە سوورەتی (الأعراف)دا _کە ئەمە ماناکەیەتی_ فەرمووی: (دەستەی دەستەلأتداری قەومەکەی نوح وتیان: بەڕاستی ئێمە تۆ لەنێو گومڕاییەکی ئاشکرادا دەبینین !!(٦٠) نوح (علیه السلام) وتی: (ئەی قەوم و هۆزم من هیچ گومڕاییەکم نییە، بەڵکو من پێغەمبەرێکم ولەلایەن پەروەردگاری جیهانیانەوە ڕەوانە کراوم..(٦١) پەیامەکانی پەروەردگارمتان پێ ڕادەگەیەنم، من دڵسۆزیتان لەگەڵ دەکەم، ئەوەی من دەیزانم دەربارەی گەورەیی وبالأدەستی خوا، ئێوەنایزانن (٦٢) ئایا ئێوە سەرسام بوون لەهاتنی بەرنامەو یادخەرەوەیەك لەلایەن پەروەردگارتانەوە بۆسەر پیاوێکی (ڕاستگۆ) لەخۆتان؟، تابێدارتان بکاتەوە و دینداری و خواناسی بکەن، بۆئەوەی سەرئەنجام ڕەحمتان پێ بکرێت.)(الأعراف:٦٠_٦٣).

هەروەها لە سوورەتی (نوح)دا _کە ئەمە ماناکەیەتی_ فەرموویەتی: (دوای سەدەها ساڵ نوح (علیه السلام) سکالأی کردو وتی: پەروەردگارا من بەشەو و بەڕۆژ بانگی قەوم و گەلەکەمم کرد (بۆ یەکخواناسی وپارێزگاری) (٥) کەچی بانگەوازەکەی من هیچی زیادنەکردن، تەنها ڕاکردن وهەڵکردنیان نەبێت (٦) بەڕاستی من هەمووجارێك کەبانگم دەکردن تالێیان خۆش ببیت، پەنجەیان دەخستە گوێچکەیانەوە تانەبیستن، جلەکانیان بەسەرخۆیاندا دەدا، وزۆرگەرم بوون لەسەر بێباوەڕی وخۆیان بەزل دەزانی ولوت بەرزبوون) (نوح:٥_٧).

*پیاوەکانی قەومی نوح کاتێك ئەجەل ومردنیان نزیك ببوایەتەوە، کوڕو نەوەکانی خۆیانیان کۆ دەکردەوە و ئامۆژگارییان دەکردن و پێیان دەوتن: ها ئاگاداربن لەم کابرایە کە تێك چووە _واتە مەبەستیان نوح(علیه السلام) بوو_ چونکە بەڕاستی من باوك وباپیرانم قسەیان بۆکردوم، کەخەڵکی لەسەردەستی ئەمدا لەناوچوون ولەناودەچن، پیاوی واهەبوو کەکوڕەکەی خۆی هەڵدەگرت یان دەستی دەگرت، هەتا دەیبردە لای نوح پێغەمبەر(علیه السلام) دەیوەستاند وئینجا دەیوت: ئەی کوڕی خۆم هائاگاداربە لەم پیاوە کەتێکچووەو شێت بووە، هەربەو جۆرە ئەم قسەو ئامۆژگاری یە درۆو ناپاکەیان جێ دەهێلأ بۆنەوەکانی دوای خۆیان، وکاری ئەوان بریتی بوو لەپەرستنی بەرد وبێگیان و وازیان لەپەرستنی خوایەکی تەنهاو بەدەسەلأت هێنابوو،

وئینکاری ئەوەیان دەکرد کەپێغەمبەر لەڕەگەزی بەشەربێت، وبەلأم ئینکاری ئەوەیان نەدەکرد کەبەردێك خوابێت وبیپەرستن.

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَقَالُوا لَا تَذَرُنَّ آلِهَتَكُمْ وَلَا تَذَرُنَّ وَدًّا وَلَا سُوَاعًا وَلَا يَغُوثَ وَيَعُوقَ وَنَسْرًا﴾(نوح:٢٣).

واتە (وتیان: خەڵکینە نەکەن واز لە خواکانتان بێنن!نەکەن وازلە (ود و سواع و یغوث و یعوق و نەسر) بهێنن).

ئیمامی (بوخاری) دەربارەی تەفسیری ئەم ئایەتە، فەرمودەیەکی گێڕاوەتەوە، دەفەرمووێت: (إبن عباس) فەرموی: (ئەم بتانەی کەناویان لە ئایەتەکەدا هات، بەناوی کۆمەڵێك پیاو چاکەوە ناونراون لە قەومەکەی نوح بوون، کاتێك ئەو پیاوچاکانە لەناو چوون، ئینجا شەیتان هات ودای بەگوێی قەومەکەدا، کە لە شوێنی کۆبونەوەو دانیشتنەکانیاندا پەیکەر وهەیکەلیان بۆدروست بکەن، کەبتیان تیا دادەنا، جا بەناوی ئەو پیاوچاکانەوە ناویان بنێن، ئینجا دروستیان کرد، ئینجا نەپەرستران هەتا ئەو پیاوچاکانە لەناوچوون، پاشان بیریان کردەوەو زانستی ڕاستییان لانەما وپێچرایەوەو، پەرستران، ئینجا(إبن عباس) فەرمووی: (ئینجا ئەوپەیکەرانە کرانە بت وپەرستران لەناو قەومەکەی نوح دا).[٥٨]

ئینجا ئەو قەومە ئینکاری نیشانەو بەڵگەکانی خوایان کرد، وئینکاری بەڵگە ئاشکراو دیارەکانیان کرد، ولەناو وون بوون وگومڕایی خۆیاندا مانەوەو سوربوون لەسەر بێباوەڕی، وهەڕەشەیان کرد لە نوح (علیه السلام) بە جۆرێك کە هەڕەشەکەیان دەربڕی ئەگەر دەست لە بانگەوازەکەی هەڵنەگرێت ئەوا بەردبارانی دەکەن. ﴿قَالُوا لَئِن لَّمْ تَنتَهِ يَا نُوحُ لَتَكُونَنَّ مِنَ الْمَرْجُومِينَ﴾ (الشعراء:١١٦).

هەروەها داوایان کرد کە بە پەلە و خێرا سزایان بۆ بهێنێت ئەگەر ڕاست دەکات.

خوای گەورە فەرمووی _کە ئەمە ماناکەیەتی_: (قەومەکەی نوح وتیان: ئەی نوح بەڕاستی زۆر لەسەری چوویت وزیاد لە پێویست بەربەرەکانی و شەڕە قسەت لەگەڵدا کردین، دەی ئەو سزایەمان بۆبهێنە کەهەڕەشەی پێ دەکەیت وهەمیشە باسی دەکەیت ودەمانترسێنێت پێی، ئەگەر تۆ لە ڕاستگۆیانیت) (هود:١٣٢).

---

[٥٨]- رواه البخاري في كتاب التفسير.

*** لێرەدا وەحی خوایی بۆ نوح (علیه السلام) دێت. کە کەشتییەك دروست بکات کە خۆی و باوەڕداران ڕزگار دەکات لەو تۆفان ولافاوەی کە بەرپادەبێت وهەموو سەرزەوی دادەپۆشێت و گشت کافران نوقمی دەریا دەکات و دەیان خنکێنێت.**

**خوای گەورە فەرمووی:** ﴿وَأُوحِيَ إِلَى نُوحٍ أَنَّهُ لَن يُؤْمِنَ مِن قَوْمِكَ إِلَّا مَن قَدْ آمَنَ فَلَا تَبْتَئِسْ بِمَا كَانُوا يَفْعَلُونَ(٣٦) وَاصْنَعِ الْفُلْكَ بِأَعْيُنِنَا وَوَحْيِنَا وَلَا تُخَاطِبْنِي فِي الَّذِينَ ظَلَمُوا إِنَّهُم مُّغْرَقُونَ (٣٧) وَيَصْنَعُ الْفُلْكَ وَكُلَّمَا مَرَّ عَلَيْهِ مَلَأٌ مِّن قَوْمِهِ سَخِرُوا مِنْهُ قَالَ إِن تَسْخَرُوا مِنَّا فَإِنَّا نَسْخَرُ مِنكُمْ كَمَا تَسْخَرُونَ (٣٨) فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ مَن يَأْتِيهِ عَذَابٌ يُخْزِيهِ وَيَحِلُّ عَلَيْهِ عَذَابٌ مُّقِيمٌ ٣٩) حَتَّى إِذَا جَاءَ أَمْرُنَا وَفَارَ التَّنُّورُ قُلْنَا احْمِلْ فِيهَا مِن كُلٍّ زَوْجَيْنِ اثْنَيْنِ وَأَهْلَكَ إِلَّا مَن سَبَقَ عَلَيْهِ الْقَوْلُ وَمَنْ آمَنَ وَمَا آمَنَ مَعَهُ إِلَّا قَلِيلٌ ٤٠) وَقَالَ ارْكَبُوا فِيهَا بِسْمِ اللَّهِ مَجْرَاهَا وَمُرْسَاهَا إِنَّ رَبِّي لَغَفُورٌ رَّحِيمٌ ٤١) وَهِيَ تَجْرِي بِهِمْ فِي مَوْجٍ كَالْجِبَالِ وَنَادَى نُوحٌ ابْنَهُ وَكَانَ فِي مَعْزِلٍ يَا بُنَيَّ ارْكَب مَّعَنَا وَلَا تَكُن مَّعَ الْكَافِرِينَ ٤٢) قَالَ سَآوِي إِلَى جَبَلٍ يَعْصِمُنِي مِنَ الْمَاءِ قَالَ لَا عَاصِمَ الْيَوْمَ مِنْ أَمْرِ اللَّهِ إِلَّا مَن رَّحِمَ وَحَالَ بَيْنَهُمَا الْمَوْجُ فَكَانَ مِنَ الْمُغْرَقِينَ ٤٣) وَقِيلَ يَا أَرْضُ ابْلَعِي مَاءَكِ وَيَا سَمَاءُ أَقْلِعِي وَغِيضَ الْمَاءُ وَقُضِيَ الْأَمْرُ وَاسْتَوَتْ عَلَى الْجُودِيِّ وَقِيلَ بُعْدًا لِّلْقَوْمِ الظَّالِمِينَ﴾(هود:٣٦_٤٤).

**واتە: ((سەرئەنجام)وەحی وپەیامی خوا ڕەوانەکرا بۆ نوح، کەچاك بزانە بەڕاستی هەرگیز کەسی تر بڕوا ناهێنێت لە قەومەکەت جگە لەوەی کەبەڕاستی بڕوای هێناوە، کە وابوو خەفەتبار مەبە بەو کردەوە ناشرین وناپەسەندانەی ئەنجامیان دەدا (٣٦) کەشتیەکەیش دروست بکە بەچاودێری وفەرمانی ئێمە (کاتی تۆفانەکە) تکامان لێ نەکەیت بۆ ئەوانەی لە سنوری ڕاستی دەرچوون وتاوانبارن، چونکە بەڕاستی ئەوانە بڕیاری خنکاندن و تیاچونیان بۆدراوە (٣٧) (نوح)یش دەستی کرد بەدروست کردنی کەشتی یەکە، هەر جارێك تاقمێك لە هۆزەکەی بەلایدا تێدەپەڕین، گاڵتەیان پێ دەکرد، (نوح) وتی: ئەگەر ئێستە ئێوە گاڵتە بە ئێمەدەکەن، (٣٨) جا لە داهاتودا دەزانن کێ سزایەکی بەردەوام وهەمیشەیی دەبێت (٣٩) (ئەم کێشەیە بەردەوام بوو) هەتا ئەو کاتەی بڕیارمان هات و فەرمان دەرچوو (بە لەناوبردنی بێباوەڕەکان) و لە تەنورە پڕ لە ئاگرەکەوە ئاو فوارەی کرد (کە ئەوە نیشانەی دەست پێکردنی تۆڵە خواییەکە بوو) ئینجا وتمان: ئەی نوح لەهەموو نێرەو مێیەك دوان هەڵبگرە لەکەشتیەکەدا وماڵ وخێزانت، جگەلەوانەی کەبڕیارمان لەسەرداوە تووشی تۆڵە ببن بەهۆی بێباوەڕیانەوە**

(شایەنی باسە) کەسیش بڕوای بەنوح نەکرد ولەگەڵیدا نەبوو، جگە لەکەسانێکی کەم نەبێت (٤٠) نوح وتی: سواربن و بڕۆنە ناو کەشتییەکەوە، بەناوی خواوەیە ڕۆیشتن و وەستان، بێگومان پەروەردگارم زۆر لێ خۆشبوە و زۆر بە بەزەییە (٤١) کەشتییەکەش دەیبردن بەناو شەپۆلی وەك چیادا، نوح بانگی کردە کوڕەکەی (ئەوەیان کە بێباوەڕ بوو) لە شوێنێکی چەپەکدا گیری خواردبوو، پێی وت: ڕۆڵەگیان، لەگەڵ ئێمەدا سواربە، ولەگەڵ بێباوەڕاندا مەبە (٤٢) کوڕەکەی وتی: ئەمڕۆ هیچ پەنادارێك نی یە لەتۆڵەو خەشمی خواکەس بپارێزێت مەگەر کەسێك خوا خۆی ڕە حمی پێ بکات، (دوای ئەم وت و وێژە) شەپۆلی ئاودای بە نێوانیاندا وجا چووە ڕیزی خنکاوەکانەوە (٤٣) پاشان فەرمان درا بەزەوی: ئاوەکەت با ڕۆبچێت بەناختدا، ئەی ئاسمان تۆیش، بابەس بێت وباران مەبارێنە، ئیتر ئاوەکە ڕۆچوو، فەرمانیش بەڕێك وتەواوی ئەنجامدرا، کەشتی یەکەیش لەسەر کێوی جودی (کەلەکوردستانی باکورە) وەستاو لەنگەری گرت و وترا: دەك دووری لەبەزەیی خوا و تیان چوون بۆبەرەی ستەمکاران.) (هود:٣٦_٤٤).

خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا _کە ئەمە ماناکەیەتی_ دەفەرموێت: ((دوای ٩٥٠ساڵ هەوڵ وکۆشش) هەر بەرنامەکەیان بەدرۆ زانی و بڕوایان پێ نەکرد، جا ئێمەش خۆی و ئەو ئیماندارانەی لەگەڵیدابوون لە کەشتیەکەدا ڕزگارمان کرن و ئەوانەی بڕوایان نەهێنا بە ئایەت و فەرمانەکانمان نوقمی زریانەکەمان کردن، چونکە بەڕاستی ئەوان گەلێکی کوێر و نابینا بوون(لە ئاستی ڕاستییەکاندا)) (الأعراف:٦٤).

ئایەتەکان زۆرن دەتوانیت سەیری (یونس:٧٣ ،الأنبیاء:٧٦-٧٧،الشعراء:١١٧-١٢٢،القمر:٩-١٧) بکەیت).

## باسی دووەم:
## هەڵوێستی ژنەکەی نوح (علیه السلام) بەرامبەر بانگەوازەکەی:

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ضَرَبَ اللَّهُ مَثَلًا لِّلَّذِينَ كَفَرُوا امْرَأَتَ نُوحٍ وَامْرَأَتَ لُوطٍ كَانَتَا تَحْتَ عَبْدَيْنِ مِنْ عِبَادِنَا صَالِحَيْنِ فَخَانَتَاهُمَا فَلَمْ يُغْنِيَا عَنْهُمَا مِنَ اللَّهِ شَيْئًا وَقِيلَ ادْخُلَا النَّارَ مَعَ الدَّاخِلِينَ﴾(التحريم:١٠)

واتە: (خوا نمونەی هێناوەتەوە بە ژنی نوح و ژنی لوط (بۆ ئەوانەی کە بێباوەڕ بوون) کە ئەو دوو ئافرەتە هاوسەری دوو بەندەی چاك و پاکی ئێمە بوون، کەچی خیانەتیان لێکردن (باوەڕیان پێیان نەبوو،غەیبەتیان دەکردن و گاڵتەیان پێ دەکردن..) ئیتر ئەو پێغەمبەرانە فریای هاوسەرەکانیان نەکەوتن و لە قیامەتدا بەو ژنانە دەوترێت: بچنە ناو ئاگری دۆزەخەوە لەگەڵ ئەوانەدا کە دەچنە ناوی).

خوای گەورە لەم ئایەتەدا هەڵوێستی ئەو ئافرەتانەی ڕوون کردەوە کە بێباوەڕ بوون و مێردەکانیان نەیانتوانی سودیان پێ بگەیەنن و وشەی (الخيانة) لە ئایەتەکەدا ئەوە دەگەیەنێت لە دیندا بووە، واتە کافر بوون، و مەبەستی لە(زینا)نییە.

*(ابن عباس) دەفەرموێت: خێزانی پێغەمبەران هەرگیز (بغي) نەبوون، واتە زیناو خراپەی ئەخلاقییان نەکردووە.[٥٩]

*ژنەکەی نوح باوەڕی نەهێنا بە مێردەکەی کە پێغەمبەر بوو، بەڵکو دەبوو ئەو یەکەم کەس بوایە لە باوەڕداران بە نوح، بە تایبەتی کە خێزانی بووە و زاناترین کەس بووە بە حاڵ و باری نوح و نزیکترین کەسیش بووە لێیەوە، بەڵام کوفر و بێ باوەڕی قەومەکەی کاریان لەویش کرد و وەك خۆیان گومڕا و سەرلێشێواویان کرد و چارەنوسیشی سەرشۆڕی و خەسارەتمەندی بوو، و ژنەکەی نوح لەگەڵ بێباوەڕاندا، بێباوەڕ بوو، لەگەڵ گاڵتەچییاندا گاڵتەی بە نوح کرد، و ئامۆژگاری و قسەی نوح هیچ سودێکی پێ نەگەیاند لای خواو چویە ناو ئاگری دۆزەخەوە.

* خاوەنی (الكشاف) دەڵێت: (خوای گەورە حاڵی کافرانی بە نمونە هێنایەوە _لەوەدا کە لەسەر کوفر و بێباوەڕییان ودوژمنایەتییان بەرامبەر باوەڕداران) بە هاوشێوەی ئەو

---

[٥٩]-(النكت والعيون للماوردي ٢٦٧/٤،وفتح القدير للشوكاني ٢٥٥/٥).

کافرانەی کە پەیوەندییان لە نێوان ئەواندا نەبوو سزا دەدرێت، بەبێ مانەوە و خاتر گرتن، ئەو پەیوەندییەی کە لە نێوانیاندا بوو لە پەیوەندی گۆشت و نەسەب و ڕەگەز و خزمایەتی، هیچ سودێکیان پێ ناگەیەنێت، چونکە دوژمنایەتی ئەوان بۆ ئەوان و کوفریشیان بە خوای گەورە و پێغەمبەرەکەیان، پەیوەندییەکانی پچڕی بوو، و لێکی ترازاندبوون، و ئەوانی لەلایەنی ئەوان زۆر دوور خستبویەوە، ئەگەر باوەڕدارێك لە پێغەمبەران پەیوەندی هەبێت بە کافرێکەوە، وەك حاڵی ژنەکەی نوح و ژنەکەی لوط، لەوەی کە دوو ڕوو و خیانەتکار بوون بەرامبەر دوو لە پێغەمبەران، و پێغەمبەرەکان نەیان توانی سودیان پێ بگەیەنن –بە هەر جۆرێك بێت– لە سزای خوایی بیان پارێزن، ئینجا لە کاتی مردن یان لە ڕۆژی قیامەتدا، پێیان دەوترێت: لەگەڵ هەموو ئەهلی ئاگردا، ئەوانەی کە پەیوەندییان لەگەڵ ئێوە و پێغەمبەرانیشدا نەبوو یان لەگەڵ ئەو کەسانەی کە چونەتە ئاگرەوە لە هاوەڵان و دەستەی خۆتان لە قەومەکەی نوح و لوط، ئێوەیش بچنە ناو ئاگرەوە.[٦٠]

## (أبو هريرة) و دایکی

(ابوهریرة) (خوای لێ ڕازی بێت)، زۆر بە پەرۆش بوو بۆ دایکی کە موسڵمان نەبوو بوو، چەندێك داوای ئیسلام بوونی لێ دەکرد بە گاڵتەجاری وەڵامی دەدایەوە...کام لە ئێمە دڵی دەسوتێت بۆ خوشکەکەی کە بێ حیجابە یان نوێژ ناکات، بڕوانە هەستی (ابوهریرة)... چووە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ هاواری بۆ برد، ئەی پێغەمبەر هەرچەندە داوا لە دایکم دەکەم ئیسلام ببێت، لێی دەبیستم شتی نادروست و نەشیاو دەربارەی تۆ دەڵێت بەڵکو دوعای خەیری بۆ بکەیت ئیسلام ببێت، کاتێك پێغەمبەر ﷺ بینی (ابوهریرة) هێندە بە پەرۆشە بۆ ئیسلام بوونی دایکی، دەستی بەرزکردەوە و فەرمووی: خوایە ڕێنمایی دایکی (ابو هريرة) بکە).[٦١]

(ابوهریرة) فەرمووی: چوومەوە بۆ ماڵەوە لە دەرگام دا دایکم وتی: (ابوهریره) بووەستە، تادێم دەرگات لێ دەکەمەوە، منیش لەدڵی خۆمەوە دەموت: هەر ئێستا وەکو جاران بە جنێودان و ووشەی ناشیرین دێت بەدەممەوە، کاتێکم زانی دایکم هات وتی: (أشهدأنْ لا

٦٠- (الكشاف/٤/٥٧١)بەدەستکارییەوە.

٦١ -(أخرجه مسلم برقم /٦٣٤٦)

الهَ الاَّ الله وأشهدُ أنَّ محمداً رسولَ الله) ئیسلام بوونی دایکی (ابوهريرة)بەر و بووم و سۆز و خۆشەویستی و ڕاستی بۆ خۆشەویستی خوا و دینی خوا بوو کە (ابوهريرة) هەیبو پاداشتی (ابوهريرة) درایەوە بە هاتنەدی ئاواتەکەی کە ئیسلام بوونی دایکی بوو. ئایا تۆش بەهەمان سۆز و هەمان خۆشەویستییەوە بەو جۆرە هەوڵ دەدەیت لەگەڵ براکەت، و خوشکەکەت، باوکت، دایکت؟ بەو جۆرە لە خوا بپاڕێرەوە کە ڕێنمایی ئەوان بکات، دڵنیا بە کە خوای گەورە دڵیان دەکاتەوە بۆ ئیسلام، چاوەکانت پێیان ڕۆشن دەبێتەوە:

﴿وَالَّذِينَ جَاهَدُوا فِينَا لَنَهْدِيَنَّهُمْ سُبُلَنَا وَإِنَّ اللَّهَ لَمَعَ الْمُحْسِنِينَ﴾(العنكبوت/٦٩).

واتە: (ئەوانەی لە پێناوی ئێمەدا و بۆ بەدەست هێنانی ڕەزامەندی ئێمە، هەوڵ و کۆششیان کردووە و خۆیان ماندوو کردووە، سوێند بەخوا بەڕاستی ئەوانە ڕێنموویی دەکەین بۆ هەموو ڕێگەیەکی چاك و دروستی خۆمان بێگومان خوای پەروەردگار هەمیشە لەگەڵ چاکەکارانە).

## شیرینی (إستغفار) داوای لێ خۆشبوون

پێغەمبەر (عليه السلام) باسی داوای لێخۆشبوون بۆ قەومەکەی دەکات، وەك خوای گەورەدەفەرموێت: ﴿يُرْسِلِ السَّمَاءَ عَلَيْكُمْ مِدْرَارًا (١١) وَيُمْدِدْكُمْ بِأَمْوَالٍ وَبَنِينَ وَيَجْعَلْ لَكُمْ جَنَّاتٍ وَيَجْعَلْ لَكُمْ أَنْهَارًا﴾(نوح/١١-١٢).

واتە: (داوای لێ خۆشبوون لە پەروەردگارتان بکەن، بارانتان بە لێزمە و خوڕەم بۆ دەبارێنێت، ماڵ و سامان و نەوەتان پێ دەبەخشێت، هاوڕێ لەگەڵ باخ و باخاتدا، ڕووبار و چەم و جۆگەتان بۆ بەدی دەهێنێت) وەك ئەوەی پێیان بڵێت: کە ئەمانە بەشە سەرەکییەکانی ژیانە خوا بۆی دابین کردوون، ئەوەی گرفتی هەژاری هەیە با داوای لێخۆشبوون بکات لەخوا، ئەوەی بێ منداڵە بەهەمان شێوەداوای لێخۆشبوون بکات، بێ بارانی بوو داوای لێخۆشبوون بکات، ئەگەر بەهەشتتان دەوێت داوای لێخۆشبوون بکەن.

## لە هەر جۆرە گیانلەبەرێك نێر و مێیەك

بۆچی نوح پێغەمبەر (علیه السلام) لە هەر جۆرە گیانداریێك نێر ومێیەکی کردە ناو کەشتییەکەوە؟

لەبەر ئەوە بوو چوونکە چی وا لە زەویدا لەگیانداران بەو تۆفان و لافاوە لەناودەچن، بۆ ئەوەی لەو جوتەوە سەر لەنوێ ئەو گیانلەبەر و زیندەوەرانە دروست ببنەو، خوای گەورە داوای کرد لە نوح هەموو باوەڕداران هەڵبگرێت و جێگەی کافران نەکاتەوە، و فەرمووی: سەرانی خێزانەکەت کە بڕوادارن هەڵیان بگرە، بەڵام ئەوانە نا کە بێباوەڕن، بۆیە بە تایبەت خوای گەورە ناوی کەس و کارەکەی برد، تا بزانن خێزان تایبەتمەندی هەیە. بۆیە ئامۆژکاریمان بۆ کچان ئەوەیە بۆ هاوسەرگیری پیاوی دیندار هەڵبژێرن، تا پێکەوە کەشتی ڕزگاری بۆ خۆیان و نەوەکانیان دروست بکەن، بەس چاویان لەماڵ وجوانی پلەی کۆمەڵایەتی نەبێت، هەمان داواکاری و ئامۆژگاریمان بۆکوڕان ئەوەیە، کاتێك کاری هاوسەرداریيان ئەنجامدا با کچی دینداری نوێژخوێن بکەنە هاوسەری خۆیان. ئەو کوڕ و کچانەی کە بۆ هاوسەرگیری حیساب بۆدینداری ناکەن و لەسەر ئەو بنەمایە هاوسەرداری ناکەن، بەڕاستی ئەوانە ماڵێك دروست دەکەن خوا نەبێت کەس نازانێت پاشەڕۆژیان چۆن دەبێت، و خانوەکەیان کەی دەڕوخێت.

## فەرمانی خوا بۆ نوح و شوێنکەوتوانی

خوای گەورە فەرمانی کرد بە پێغەمبەر نوح (علیەالسلام) شوێنکەوتوانی بخاتە ناو کەشتییەکەوە مەگەر ئەوانە نەبێت کە لەگەڵ گەلە کافرەکاندان، باوك و دایکی باوەڕدار بوون بانگی کردن بۆ ناو کەشتی یەکە، چوار کوڕی هەبوو سیانیان باوەڕدار و چوارەمیان کافر بوو، بۆی نییە کوڕە کافرەکەی و ژنە کافرەکەی بخاتە ناو کەشتییەکەوە. ئەمە تاقی کردنەوەیەکی چەند قورس و گرانە کە ڕووبە ڕووی نوح (علیەالسلام) بوەتەوە...ڕوو بەڕووی گەلێکی کافر بوویەوە لە دەرەوەی ماڵەکەی، ئەی چیبکات لەگەڵ کوڕ و خێزانەکەی لە ناو ماڵەکیدا.

ڕای گەورە فەرمووی: ﴿ضَرَبَ اللَّهُ مَثَلًا لِّلَّذِينَ كَفَرُوا امْرَأَتَ نُوحٍ وَامْرَأَتَ لُوطٍ كَانَتَا تَحْتَ عَبْدَيْنِ مِنْ عِبَادِنَا صَالِحَيْنِ فَخَانَتَاهُمَا فَلَمْ يُغْنِيَا عَنْهُمَا مِنَ اللَّهِ شَيْئًا وَقِيلَ ادْخُلَا النَّارَ مَعَ الدَّاخِلِينَ﴾(التحريم/١٠).

**واتە: (خوای گەورە نموونەی هێناوەتەوە بە ژنی نوح و ژنی لوگ بۆ ئەوانەی کە بێ باوەڕبوون، کە ئەو دوو ئافرەتە هاوسەری دوو بەندەی چاك و پاکی ئێمە بوون، کەچی خیانەتیان لێ کردن (باوەڕیان پێیان نەبوو، غەیبەتیان دەکردن، گاڵتەیان پێ دەکردن...) ئیتر ئەو پێغەمبەرانە فریای هاوسەرەکانیان نەکەوتن، لە قیامەتدا بەو ژنانە دەوترێت بچنە ناو ئاگری دۆزەخەوە لەگەڵ ئەوانەدا کە دەچنە ناوی). ووشەی خیانەت لەم ئایەتەدا، خیانەتی عەقیدە و باوەڕە نەك خیانەتی شەرەف و ئابڕوو ناموس، خوای گەورە ئەو دوو ژنە بە نموونە باس دەکات بە خیانەتی عەقیدە و بیر وباوەڕ، ئەو دوو ژنە لەسەر عەقیدەی مێردەکانیان نەبوون، کە پێغەمبەری خوا بوون، ئەم دوو پێغەمبەرە، ئەم دوو ژنە کافرەیان تەڵاق نەدا، ئەوە وانەیەکی گرنگە کە پێمان دەڵێت: تەڵاق دانی ژن کارێکی ئاسان نییە، ڕەوا نییە بە شتێکی ئاسان دابنرێت، و پیاوان گاڵتەیان بەتەڵاق بێت... هەر چەندە تاقیکردنەوەکەی نوح (علیه السلام) زۆر قورس و گران بوو بەڵام تیایدا سەرکەوتوو بوو تەڵاق حەڵاڵێکی نەویستراوە گێڕاویانەتەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ فەرموویەتی: (شەیتان نەوەکانی بڵاو دەکاتەوە، بۆ ئەنجامدانی کاری شەیتانی خۆیان، هەر یەکەیان هاتنەوە لای ئیبلیسی گەورەیان و هەواڵی کاری ئەو ڕۆژەیان ڕاگەیاند. یەکێکیان ووتی: من کاری زینام بە کەسێك ئەنجامدا، ئیبلیس ووتی: هیچت نەکردووە، چونکە تەوبە دەکات و لەسەری دەسڕێتەوە. یەکێکی تریان ووتی: من فلان کەسم وا لێکرد جنێو بدات. ئیبلیس وتی: هیچت نەکردووە، تەوبە دەکات و لەسەری دەسڕێتەوە. یەکێکی تریان ووتی: من فلان وفلانم بەشەڕدا، ئیبلیس ووتی: هیچت نەکردووە، ئاشت دەبنەوە. یەکێکی تریان ووتی: فلان پیاو و فلان ژنم بەشەڕ داو ژنەکەی تەڵاقدا، ئیبلیس وتی: ئافەرین تۆ کارێکی باشت ئەنجامداوە. چۆن پیاوان بە ئاسانی و بە ووشەیەکی ئاسان ژنەکانیان تەڵاق دەدەن، پیاو ئەو پیاوەیە چەندین هەوڵ بخاتە گەڕ بۆ پارێزگاری ماڵەکەی و خێزان ومنداڵەکانی، ئەوە بەڵگەی پیاوەتی نییەکە ووشەی تەڵاق بە سوعبەت یان بەڕاست بەکار بهێنێت. پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:**

(أبغضُ الحلال عندالله الطلاق).

**واتە: (بێزراوترین شتی حەڵاڵ لای خوا بریتییە لە تەڵاق).**

## باسی سێیەم:
## وانە گرنگ و بەسودەکانی چیرۆکەکە:

١- (التوحيد) یەکخواناسیی، بنەمای بانگەوازی هەموو پێغەمبەران (علیهم السلام) بووە، لە ئادەم (علیه السلام)ەوە هەتا محمد پێغەمبەر ﷺ، خوای گەورە فەرموویەتی:
﴿وَمَا أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ مِن رَّسُولٍ إِلَّا نُوحِي إِلَيْهِ أَنَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا أَنَا فَاعْبُدُونِ﴾(الانبياء:٢٥).
واتە: (ئێمە پێش تۆ هیچ پێغەمبەرێکمان ڕەوانە نەکردووە کە وەحیمان بۆ نەنارد بێت، بەوەی کە بێگومان هیچ خوایەك نییە جگە لە من و هەر دەبێت من بپەرستن).
لە ئایەتێکی تردا -کە ئەمە ماناکەیەتی- دەفەرموێت: (پەروەردگار خۆی فریشتەکان بەڕەحمەت و ژیانەوە (کە وەحی ئاسمانییە) دەنێرێت بۆ هەرکەس بیەوێت لە بەندەکانی(کە پێغەمبەرانن) فەرمانیان پێ دەدات کە: خەڵکی بێدار بکەنەوە لەوەی کە بەڕاستی جگە لە من خوایەکی تر نییە، لەبەر ئەوە لەخەشم و قینم خۆتان بپارێزن (چونکە لەو کەسانە خۆش نابم کە غەیری من دەپەرستن)(النحل:٢).
٢.نوح پێغەمبەر (علیه السلام)جوانترین و ناوازەترین نمونەی لەخۆڕاگری و دامەزراوەیی لەسەر حەق و ڕاستی و حیکمەت لەبانگەوازەکەیدا بۆ لای خواو متمانەو دڵنیایی بەپەیمانی خوایی هێنایەوە، ئەو خوایەی کەهەرگیز بەڵێنەکانی دواناکەوێت وبێگومان نوح(علیه السلام)(٩٥٠) ساڵ لەناو قەومەکەیدا مایەوە و بانگەوازی دەکردن بۆ لای خوا بە حیکمەت و پەند و ئامۆژگاری جوان و دروست و بەشێوازی جوان گفتوگۆ و مناقەشەی لەگەڵدا دەکردن، بەڵام تەنها دورکەوتنەوەو کەللە ڕەقی و ڕتکردنەوە و ئینکاری و کوێری و خۆبەگەورە زانین و ئازاردان و چەوساندنەوە لەوان وەشایەوە بەرامبەر نوح(علیه السلام) بەڵام (نوح)بەئارامگرتن و دامەزراوی و خۆڕاگری و مانەوە بەرەنگاریان بوویەوە.
٣.هەروەها لەم چیرۆکە ئەوەیشی لێ وەردەگیرێت کە: کافران لەسەر کوفر و بێ باوەڕییان سزا وەردەگرن، و کەسانی باوەڕداری نزیك و خزمیان سودیان پێ ناگەیەنن، هەروەك چۆن باوەڕدار لەسەر ئیمانەکەی پاداشت وەردەگرێت و کەسە نزیکەکانی لە کافران ناتوانن زیانی پێ بگەیەنن.

**وای گەورە لە سوورەتی (التحريم)دا فەرمووی:** ﴿ضَرَبَ اللَّهُ مَثَلًا لِّلَّذِينَ كَفَرُوا امْرَأَتَ نُوحٍ وَامْرَأَتَ لُوطٍ كَانَتَا تَحْتَ عَبْدَيْنِ مِنْ عِبَادِنَا صَالِحَيْنِ فَخَانَتَاهُمَا فَلَمْ يُغْنِيَا عَنْهُمَا مِنَ اللَّهِ شَيْئًا وَقِيلَ ادْخُلَا النَّارَ مَعَ الدَّاخِلِينَ﴾ (التحريم:١٠)**(پێشتر ماناکرا).**

**هەروەها فەرموویەتی:** ﴿لَن تَنفَعَكُمْ أَرْحَامُكُمْ وَلَا أَوْلَادُكُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ يَفْصِلُ بَيْنَكُمْ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ﴾ (الممتحنة:٣).

**واتە: (خزمان و ڕۆڵەکانتان هەرگیز فریاتان ناکەون، چونکە لەڕۆژی قیامەتدا لە یەکتان جیادەکاتەوە، بەڕاستی خوا بینایە بەو کارو کردەوەی کە دەیکەن).**

**لە (ابي هريرة)ەوە ﷺ دەڵێت: (پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێك ئایەتی:** ﴿وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ الْأَقْرَبِينَ﴾ **دابەزی، هەستایە سەر پێ و فەرمووی: (ئەی کۆمەڵ و دەستەی قورەیش – یان وشەیەك لەو جۆرە– خۆتان بکڕنەوە، من لای خوای گەورە هیچ سودێکتان پێناگەیەنم، ئەی (فاطمة) ی کچی محمد، هەرچیت دەوێت لەماڵ و سامانم لێمی داوا بکە، لای خوا هیچ سودێکت پێ ناگەیەنم).**[٦٢]

***ژنەکەی نوح لەگەڵ ئەوەی کە نزیکترین کەس بوو لە نوحەوە و لە هەموو کەس زیاتر شارەزا بوو بە حاڵی و ڕاستی بەرنامەکەی، بەڵام باوەڕی نەهێنا پێی و ئەوەی هەڵبژارد کە قەومەکەی لەسەری بوون لە بێباوەڕی و گومڕایی،بەرامبەر ئەو پەیامەی کە هاوسەرەکەی هێنای، کەپەیامی ئیمان و هیدایەت بوو، نزیکی سودی پێنەگەیاند و هەروەها تکاکردنیشی سودی بۆی نابێت، چونکە کافران تکایان نییە، خوای گەورە دەربارەی حاڵی کافرانی ڕۆژی قیامەت فەرموویەتی:** ﴿فَمَا تَنفَعُهُمْ شَفَاعَةُ الشَّافِعِينَ﴾ (المدثر:٤٨). **واتە (کەواتە ئیتر تکای تکاکاران سودیان پێ ناگەیەنێت).**

**لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت:** ﴿مَا لِلظَّالِمِينَ مِنْ حَمِيمٍ وَلَا شَفِيعٍ يُطَاعُ﴾ (غافر:١٨).

**واتە: (هیچ دڵسۆز و پشتیوانێك بۆ ستەمکاران نییە، کەس تکاکارو خەمخۆریان نییە، تا قسەکەی ڕەواجی هەبێت و تکای لێ وەربگیرێت). تکا نییە بۆ کافرو بێ بڕوا کە لە ئاگری دۆزەخ ڕزگاری بکات کە هەمیشەیی دەبێت تیایدا.**

---

[٦٢]-رواه البخاري في صحيحه في كتاب التفسير.

**بەشی سێیەم:**

## (سارة) و (هاجر) (علیهما السلام): هاوسەرەکانی ئیبراهیم پێغەمبەر (علیه السلام)

*** پێشەکی:**

**کورتەیەك دەربارەی ئیبراهیم پێغەمبەر (علیه السلام)، دەربارەی شوێنی لەدایکبوونی و گەورەبوونی و گەشەکردنی و بانگەوازەکەی و ناڕەحەتییەکانی و کۆچ کردنی،حەزمان کرد و بە باشمان زانی کە باسی ئیبراهیم (علیه السلام) بکەین، تا سود و گرنگی بابەتەکە تەواو بەجێ بگات.**

**ئیبراهیم (علیه السلام) خۆشەویست و نزیکی خوا بووە، و باوکی پێغەمبەرانیش بووە، لە شاری (بابل) لە عێراق لەدایك بووەو هەر لەوێ گەورە بووەو پێگەیشتووە،هەروەها قەومەکەی لەو کاتەو هەر لەوێ بتیان پەرستووەو خوایان نەپەرستووە، و بەدەستی خۆیان بتەکانیان دادەتاشی و دروستیان دەکرد، ئیبراهیم (علیه السلام) هەر بە بچوکی و منداڵی دڵنیابوو کە ئەم بتانە، نەزیان دەگەیەنن و نە سود دەبەخشن، تەنها دارو بەردو بێ گیانی بێ دەنگ و کەڕن و ناتوانن قسەبکەن و ببیستن و ببینن، ودڵنیا بوو کەئەم بونەوەرە خوایەکی هەیە، کە بەدیهێنەر و ڕزق دەر و بە تواناو ژیانبەخش و مرێنەرە و بە هەموو سیفاتێکی تەواو جوان و بەرز و باڵا باسکراوە.**

**بەم جۆرە بە تاقیکردنەوەی فڕێدانی بۆ ناو ئاگر تاقی کرایەوە، ئەوەش کاتێك پشتی لەقەومەکەی هەڵکردو مناقەشەی لەگەڵ کردن و بەڵگە ڕوون و ئاشکراکانی بۆ هێنان، کەبەڵگە بوون لەسەر بیروباوەڕی خراپ و پوچی خۆیان و هەستا بەشکاندنی بتەکان و ئەنجامی ئەوەش بریتی بوو لەوەی کەقەومەکەی کۆبوونەوەو ئاگرێکی زۆر گەورەیان کردەوەو ئەویان فڕێدایە ناوی و پاشان خوای گەورە ڕزگاری کرد.**

**خوای گەورە لە سوورەتی (الأنبیاء)دا فەرمووی:** ﴿وَلَقَدْ آتَيْنَا إِبْرَاهِيمَ رُشْدَهُ مِن قَبْلُ وَكُنَّا بِهِ
عَالِمِينَ (٥١) إِذْ قَالَ لِأَبِيهِ وَقَوْمِهِ مَا هَذِهِ التَّمَاثِيلُ الَّتِي أَنتُمْ لَهَا عَاكِفُونَ (٥٢) قَالُوا وَجَدْنَا آبَاءَنَا لَهَا عَابِدِينَ (٥٣) قَالَ
لَقَدْ كُنتُمْ أَنتُمْ وَآبَاؤُكُمْ فِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ (٥٤) قَالُوا أَجِئْتَنَا بِالْحَقِّ أَمْ أَنتَ مِنَ اللَّاعِبِينَ (٥٥) قَالَ بَل
رَّبُّكُمْ رَبُّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ الَّذِي فَطَرَهُنَّ وَأَنَا عَلَى ذَلِكُم مِّنَ الشَّاهِدِينَ (٥٦) وَتَاللَّهِ لَأَكِيدَنَّ

أَصْنَامَكُم بَعْدَ أَن تُوَلُّوا مُدْبِرِينَ (٥٧) فَجَعَلَهُمْ جُذَاذًا إِلَّا كَبِيرًا لَّهُمْ لَعَلَّهُمْ إِلَيْهِ يَرْجِعُونَ (٥٨) قَالُوا مَن فَعَلَ
هَٰذَا بِآلِهَتِنَا إِنَّهُ لَمِنَ الظَّالِمِينَ (٥٩) قَالُوا سَمِعْنَا فَتًى يَذْكُرُهُمْ يُقَالُ لَهُ إِبْرَاهِيمُ (٦٠) قَالُوا فَأْتُوا بِهِ عَلَىٰ أَعْيُنِ النَّاسِ
لَعَلَّهُمْ يَشْهَدُونَ (٦١) قَالُوا أَأَنتَ فَعَلْتَ هَٰذَا بِآلِهَتِنَا يَا إِبْرَاهِيمُ (٦٢) قَالَ بَلْ فَعَلَهُ كَبِيرُهُمْ هَٰذَا فَاسْأَلُوهُمْ إِن
كَانُوا يَنطِقُونَ (٦٣) فَرَجَعُوا إِلَىٰ أَنفُسِهِمْ فَقَالُوا إِنَّكُمْ أَنتُمُ الظَّالِمُونَ (٦٤) ثُمَّ نُكِسُوا عَلَىٰ رُءُوسِهِمْ
لَقَدْ عَلِمْتَ مَا هَٰؤُلَاءِ يَنطِقُونَ (٦٥) قَالَ أَفَتَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللَّهِ مَا لَا يَنفَعُكُمْ شَيْئًا وَلَا يَضُرُّكُمْ (٦٦) أُفٍّ
لَّكُمْ وَلِمَا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللَّهِ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ٦٧) قَالُوا حَرِّقُوهُ وَانصُرُوا آلِهَتَكُمْ إِن كُنتُمْ فَاعِلِينَ (٦٨) قُلْنَا
يَا نَارُ كُونِي بَرْدًا وَسَلَامًا عَلَىٰ إِبْرَاهِيمَ ٦٩) وَأَرَادُوا بِهِ كَيْدًا فَجَعَلْنَاهُمُ الْأَخْسَرِينَ (٧٠) وَنَجَّيْنَاهُ وَلُوطًا
إِلَى الْأَرْضِ الَّتِي بَارَكْنَا فِيهَا لِلْعَالَمِينَ﴾(الأنبياء:٥١-٧١).

**واتە: (سوێند بەخوا بەڕاستی ئێمە ژیری و هۆشمەندیمان پێشتر بە ئیبراهیم بەخشی، ئێمە چاك ئەومان دەناسی(٥١). کاتێك بەباوك و قەومەکەی دەوت: ئەم بتانە چییە؟! ئێوە هەمیشە بەدەوریدا دێن و دەیانپەرستن! (٥٢). لەوەڵامدا (تەنها بەڵگەیان ئەوەبوو کە)وتیان: ئێمە باوك و باپیرانمان بینیوە ئەمانەیان پەرستووە (٥٣). ئیبراهیم وتی: بەڕستی ئێوەو باوك و باپیرانی ئێوە لەگومراییەکی ئاشکرادابوون (٥٤). خەڵکەکە ووتیان: بەڕاست تۆ حەقیقەتت بۆ ئێمە هێناوە یان گاڵتە دەکەیت؟! (٥٥). ئیبراهیم وتی: (من گاڵتە ناکەم)بەڵکو دەمەوێت تێتان بگەیەنم، کەپەروەردگارتان پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوی یەو کە بەدیهێناون و من لەسەر ئەو بیروباوەڕە لەشایەت و بەئاگایانم (٥٦). ئینجا ئیبراهیم لەبەر خۆیەوە سوێندی خواردو وتی: بەخوا نەخشەیەك دەکێشم و داوێك دەنێمەوە بۆ بتەکانتان دوای ئەوەی ئێوە بەجێتان هێشتن و پشتتان هەڵکرد (٥٧). ئینجا هەموو بتەکانی وورد و خاش کرد جگەلە گەورەکەیان، بەڵکو گەڕانەوە، (پرسیار بکەن) و ئیبراهیم ڕاستییان بۆ ڕوون بکاتەوە (٥٨). بت پەرستان (کە هاتنەوە بینییان بتەکانیان وردو خاش کراوە) وتیان:ئەوەی ئەمەی کردووە بە خواکانمان، بەڕاستی ئەوە لە ستەمکارانە!! (٥٩). هەندێکیان وتیان: بیستومانە لاوێك بە خراپە باسیان دەکات، پێی دەڵێن ئیبراهیم (٦٠). وتیان: کە وابوو بیهێنن بەبەر چاوی خەڵکەوە (موحاسەبەی بکەین و لێی بکۆڵینەوە) با ئەوانیش ئاگادار بن و ببینن (٦١). (ئیتر چوون ئیبراهیمیان هێناو لێیان پرسی) وتیان: باشە ئەی ئیبراهیم، ئایا تۆ**

ئەمەت کردووە بە خواکانمان؟! (٦٢). ئیبراهیم وتی: (بۆچی لەمن دەپرسن خۆ بتە گەورەکە ساغ و سەلیمە) نەخێر، هەرکاری ئەو بتە زلەیە، دە لێی بپرسن، ئەگەر قسە دەکەن و تێ دەگەن!! (٦٣). (کەمێك داچڵەکان و) لە دڵی خۆیاندا لێکیان دەدایەوە، سەر ئەنجام وتیان بە خۆیان: بەڕاستی ئێوە هەمیشە ستەمکارن (ئیبراهیم ڕاست دەکات، ئەمانە ناتوانن بەرگری لەخۆیان بکەن، چۆن دەتوانن بەرگری لە ئێمە بکەن) (٦٤). پاشان بە سەرشۆڕی پاشگەز کرانەوە بۆ بیروباوەڕە کۆنەکەیان و وتیان: بێگومان تۆ زانیوتە کە ئەوانە قسە ناکەن و تێناگەن! (زۆرزان و کاربەدەستانیان چەواشەیان کردنەوە) (٦٥). ئیبراهیم ووتی: باشە، ئاخر چۆن شتێك دەپەرستن لەجیاتی خوا، کە ناتوانێت هیچ جۆرە قازانج یان زیانێکتان پێ بگەیەنێت؟ (تەنانەت ئەوەتا نەیانتوانی بەرگری لەخۆیشیان بکەن) (٦٦). ئۆف لە دەستان و لەو شتانەش کە لەجیاتی خوا دەیپەرستن، جا ئایا ئەوە تێناگەن و بیرو هۆشتان ناخەنەکار؟!(٦٧). هەندێکیان وتیان: ئیبراهیم بسوتێنن و پشتیوانی لە خواکانتان بکەن، ئەگەر ئێوە شتێکتان بۆ دەکرێت.(٦٨). (خوای گەورە دەفەرموێت، ئێمەش فەرمانمان دەرکرد و) وتمان: ئەی ئاگر ساردو سەلامەت بە لەسەر ئیبراهیم (هەرچەندە ئاگر سوتێنەرە باڵام بە فەرمانی خوا توانای سوتاندنی نەماو ئەگەر پەروەردگار فەرمانی بەسەلامەتی نەدایە حەزرەتی ئیبراهیم لەناو ئاگرەکەدا سەرمای دەبوو).(٦٩). ئەوانە ویستیان پیلان بگێڕن دژی ئیبراهیم ئینجا ئێمەش ئەوانمان بە ڕەنجە ڕۆ ترین کەس گێڕا.(٧٠) ئێمە ئەویش و — لوط—ی برازایشیمان ڕزگار کرد و ناردمانن بۆ (وڵاتی شام) ئەو سەرزەمینەی کە بەرەکەتمان بەسەردا ڕژاندووە بۆ هەموو خەڵکی. (٧١))

(هەروەها لە ئایەتەکانی (العنکبوت:١٦–٢٧،و الصافات:٨٣–٩٨ باسی ئیبراهیم (علیه السلام) کراوە، دەتوانیت لە تەفسیرەکانیدا سودی زیاتری لێ وەرگریت).

ئیبراهیم (علیه السلام) لە شاری (بابل)ەوە کۆچی کرد بۆ وولاتی شام، پاشان لەوێشەوە کۆچی کرد بۆ میسرو لەم کۆچەدا (سارة) خانی هاوسەری هاوەڵی کرد[٦٣].

[٦٣]-(إبن كثير)دەڵێت: {وتەی بەناوبانگ ئەوەیە کە (سارە) کچی هارانی مامێتی کە (حران)نیسبەت دەدرێتە پاڵ ئەو} قصص الأنبياء ص/١٤٤.

(حران) شارێکی سەربە وولاتی شامە لەسەر ڕێگای (الموصل) و(حرانیون) نیسبەت دەدرێتە پاڵ ئەوێ،لەسەردەمی(عمری کوڕی خطاب) و لەسەردەمی (عياض بن غنم)ڕزگارکرا: (معجم البلدان/٢/٢٣٥و٢٣٦).

و [illegible]اوە: ئیبراهیم (علیه السلام) لە وولاتی شامەوە کۆچی کرد بۆ میسر، ئەمە کاتێك کە ب[illegible]بارانی و وشکە سالی و گرانی و نارەحەتی ژیان هەموو وولاتی شامی گرتبویەوە[٦٤]، کۆچی کرد بۆ میسر و لەگەلْ (سارة) خانی هاوسەریدا بوو، کە لەوپەڕی جوانی و شۆخ و شەنگیدا بوو، کاتێك پاشای میسر بە جوانییەکەی زانی لە ڕێگای هەندێك لە بەردەستەکانییەوە ویستی خۆی پێ بگەیەنێت و دەستی پیا بگات، بەلام خوای گەورە نێوانی ئەو و ئەو ئاواتەی دوورخستەوە، ئەمە باسەکەی بەدرێژی لە سوونەتی پێغەمبەرداﷺ هاتووە، ئێمەیش ڕوونی دەکەینەوە:

هەردوو پێشەوایان (بخاری و موسلیم) لە (صەحیح)ە کانیاندا گێڕاویانەتەوە: کە لە (ابي هريرة)ەوە ﷺ پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: (ئیبراهیم پێغەمبەر (علیه السلام) قەت درۆی نەکردوە تەنها سێ درۆ نەبێت، دوانیان لەبەر خوا: یەکەمیان وتی: من نەخۆشم (صافات:٨٩) و دوهەمیان وتی: ئەمە گەورەی بتەکان کردوویەتی (الأنبياء:٦٣) سێهەمیشیان لەبەر (سارة)ی هاوسەری بوو، چونکە جارێك ئیبراهیم (علیه السلام) (سارة)یشی لەگەلْ بوو، چووە شوێنێك پاشایەکی ستەمکاری لێ بوو، (سارة)یش جوانترین کەس بوو،

ئیبراهیم (علیه السلام) پێی وت: ئەم ستەمکارە گەر بزانێت تۆ ژنی منیت تۆم لێ داگیر دەکات، ئەگەر پرسیاری لێ کردیت هەوالی بدەرێ کە تۆ خوشکی منیت، چونکە تۆ خوشکمیت لە ئیسلامدا، من لەسەر ڕووی زەمیندا موسولمانێکی تر نازانم جگە لەخۆم و خۆت، کاتێك گەیشتە ئەو خاکە، هەندێك لەدەست و پێوەندی ئەو ستەمکارە (سارة)یان بینی، و چوونە لای پاشاو پێیان وت: ئافرەتێك هاتۆتە ئەم خاکەی تۆ شیاو نییە بە کەسی تر جگە لە تۆ ،ناردی بەدوایداو هێنایان، ئیبراهیم (علیه السلام) هەستا بۆ نوێژ و پاڕانەوە، لە کاتێکدا (سارة) چووە لای ستەمکارەکە، کە خۆی نەگرت دەستی بۆ درێژکرد، دەستی گرمۆلە بوو، پێی وت: بپاڕێرەوە دەستم بەر بێت، زیانم بۆت نابێت، پاڕایەوە) دەستی بەر بوو (دەستی درێژکردەوە، ئەم جارە توند تر لە جارەکەی پێشوو گرمۆلە بوو، پێی وت: لە خوا بپاڕێرەوە دەستم بەردات، زیانم بۆت نابێت، پاڕایەوە) دیسان (گەڕایەوە توندتر لە هەردوو جارەکەی پێشوو گرمۆلە بوو، وتی: بۆم بپاڕێرەوە خوا لەنێوانماندا بێت،

---

[٦٤]- (قصص الأنبياء/محمد احمد جاد المولى ص/٣٥ و سەیری (قصص الأنبياء واحداثها وعبرها)ی(الأستاذمحمد الفقي ص/٧٨ بکە).

زیانت پێ ناگەیەنم، پاڕایەوە و دەستی بەر بوو، بانگی کرد لەو کەسەی هێنا بووی پێی ووت: تۆ شەیتانت بۆ من هێناوە مرۆڤت بۆ نەهێناوم، لەخاکی من دەری بکەو (هاجر)یشی بدەرێ، دەڵێت: دەرچوو ڕۆیشت، کاتێك ئیبراهیم (علیە السلام) بینی نوێژەکەی تەواو کردو وتی: (مَهیَم) واتە: چی ڕوویدا لێت؟ وتی: خەیرە، خوا دەستی ئەو تاوانکارەی گرت و خزمەتکارێکیشی پێ بەخشیم)) (ابي هريرة) وتی: ئەو خزمەتکارە دایکی ئێوەیە، ئەی کوڕانی ئاوی ئاسمان).[٦٥]

بەڕاستی خوای گەورە (سارة)ی پاراست و لەدەستی ئەو پاشا ستەمکارەی دوورخستەوەو دەستی خراپەی پیا نەگەیشت، بەڵکو لێی ترسا و قەدرو گەورەیی ئەوی بۆ دەرکەوت، و هاجەریش بەخشرا بە (سارة)، پاشان ئیبراهیم (علیە السلام) گەڕایەوەو (سارة)یش منداڵی نەدەبوو، (سارة) وای بەباش زانی و هاتە پێش چاو کە (هاجر) ببەخشێت بە ئیبراهیم (علیە السلام) لەبەر حەز و تەماعی لە منداڵبووندا لێی، تا بەڵکو کوڕێکی لێی ببێت لە ئیبراهیم، تا بەڵکو نەوەکانی بەردەوام بن لەدوای خۆی لە پێغەمبەرایەتی و چاکەکاریدا.

بەڕاستی خوای گەورە ڕێزێکی زۆر گەورەی لە ئیبراهیم(علیە السلام) گرت و ئیسماعیلی لە هاجەر پێ بەخشی،لەمەودوا باسی مژدەدان بە لەدایك بوونی ئیسحاق (علیە السلام) دەکەین و هەڵوێستی ئیبراهیم و (سارة)ی خێزانیشی دەخەینە ڕوو لەم مژدە پێدانەدا،دواتریش دەربارەی (هاجر) دەدوێین.

## قۆناغەکانی پەیدابوونی خۆشەویستی

**-قۆناغی یەکەم: پەیوەندی دڵ:**

یەکەم پلە لە پلەکانی خۆشەویستی، دروستبوونی خۆشەویستی لە دڵی پیاوان و ژنان بە خۆشەویستەکەیەوە، ئەمە بە بیرلێکردنەوە لەو خۆشەویستە دەست پێ دەکات، ئەویش بە شەونخونی و بیرکردنەوە، کچان بیر لە کوڕان دەکەنەوە کوڕانیش بیر لە کچان دەکەنەوە، ڕەنگە ئێوەیش گاڵتەتان بەم وتەیە بێت، ئەمە بەڕاستی و کرداری ڕوودەدات،

---

[٦٥]-(رواه البخاري في صحيحه في كتاب(احاديث الأنبياء) (ورواه مسلم في صحيحه في كتاب (فضائل/من باب فضل إبراهيم الخليل (عليه السلام).

بەڵام ڕەنگە ئەمە لەگەڵ خوای گەورەدا بە تەواوی ڕوونەدات، ئایا تۆ شەوێك شەو نخونیت کردووە تەنها بیر لە خوای گەورە بکەیتەوە؟

ئایا تۆ ڕۆژێك بیرت کردۆتەوە چۆن خوای گەورە لە خۆت ڕازی بکەیت؟ ناچار دەبین کە خۆشەویستی بۆ خوا و لەلایەکی تر خۆشەویستی کوڕان و کچانی گەنج پێکەوە ببەستین، چونکە نموونەیەکی لەمە زیاتر ڕوونمان لا نییە. کارەکە بەوە دەست پێ دەکات کە دەمێنێتەوە و بیر دەکاتەوە و ڕادەمێنێت و دادەنیشێت بەتەنها و خۆی دەبینێتەوە کە دەکەوێتە زەردەخەنەوە، ئایا جارێکی تر ئەوە ڕوودەدات کە یەکێك لە ئێوە دانیشتبێت بە تەنها و زەردەخەنە بکات لە پێناو بەهەشتدا؟ ئایا کەسێك بیری لەو ڕۆژە کردۆتەوە کە بەخزمەت پێغەمبەر ﷺ دەگات و پێغەمبەری خۆش ویستووە و پێغەمبەریش ئەوی خۆش دەوێت و بەدیداری شاد ئەبێت و لە خۆشی ئەو دیدارە زەردەخەنە بیگرێت؟ یان لەترسی ڕۆژی قیامەت و سزای سەختی قیامەت و ئاگری دۆزەخ خەوی لێ زڕابێت و بەم بیرکردنەوەیە دەست بکات بە گریان؟.

**قۆناغی دووەم: ئارەزووی دڵ:**

قۆناغی دووەم لە خۆشەویستی، ئارەزووی دڵە، ئارەزووی دڵ لە پابەندبوونی دڵ بە خۆشەویست زیاترە. بریتییە لە: بەرامبەری بکە لە نێوان خواستی خۆت و خواستی خۆشەویستەکەتدا، خواستی خۆشەویستەکەت لە سەرو خواستی خۆتەوە بێت، یەکێکت خۆش ویست بەم ئەندازەیە تێ دەکۆشیت بۆ بەجێهێنانی خواستی ئەو کەسە، با ئەوە پێچەوانەی خواستی خۆیشت بێت. کوڕێك کچێکی خۆش دەوێت و خواستی ئەو کچە داواکارییە کە خواستی کوڕەکە پێچەوانەیەتی بەڵام جێ بەجێی ئەکات، یان بە پێچەوانەوە کچێك بۆ کوڕێك، بێ ئەدەبی نەبێت بەم نموونەیە، ئایا کێ خواست و داواکەی دەخاتە پێش خواست و داواکەی نەفسی خۆی، دڵ و نەفس ئارەزووی تاوان دەکات، بەڵام خوای گەورە ئارەزووی وازهێنان لەو تاوانەیە، ئەگەر وازی لێ هێنا ئەوە داخوازی خۆشەویستەکەی کە خوای گەورەیە خستۆتە پێش داخوازی نەفسی. برایان وخوشکان تا نزیکی بەرەبەیان بەلای فلیمی جۆراوجۆری تەلەفیزیۆنەوە دادەنیشیت، تازە بۆ نوێژی بەیانی خەوت گەرم بووە و هەڵناسیت، بەوە دڵخۆشی خۆت دەدەیتەوە کە دەڵێیت: خوا لێبوردەیە، خوا بەبەزەییە، بانگەشەی خۆشەویستی خوایش دەکەیت، ئایا خوای گەورە بەو کارەڕازییە؟ بەڵام ئەو کچەی خۆشت دەوێت، ئەگەر پێت بڵێت:

کاتژمێر ئەوەندە پاش نیوەی شەو، پاش ڕۆیشتنی دوو بەش لەشەو کە هەموو خێزان نووستوون و ئاگادار نین بە تەلەفۆن یان بە مۆبایل قسەت لەگەڵ دەکەم بەئاگابە، ئایا بۆی بەئاگا نابیت؟ هەرچەندە خواستی خۆیشی ئەوە بوو بخەوتایە...دەبا هەموو گەنجێکی کوڕ و کچان کە گیرۆدەن بەم خۆشەویستییە بیر بکەنەوە خوای بەئاگا ئاگای لێیانە، باوك و دایك و گشت خێزان خەوتون بەڵام خوای گەورە ناخەوێت و لە هیچ بێ ئاگا نییە، ئایا ئەمە خۆشەویستییە بۆ خوا بۆ کەسێکی خۆشەویستت خەو لە چاوانت بتۆرێنیت، بەڵام بۆ خۆشەویستی خوا، بۆ نوێژی بەیانی هەڵنەستیت؟.

**قۆناغی سێیەم: ( صبابە ) دارشتنی خۆشەویستی:**

ئەمە قۆناغی سێیەمە لە خۆشەویستی، قۆناغێکە هەر کەس تێی کەوت، ناتوانێت بەرگری لەدڵی خۆی بکات، وەك ئاوێك کە لە بەرزاییەوە بڕژێتە خوارەوە ناگەڕێتە دواوە، خۆشەویستی ئەم قۆناغەیش ئاوایە، هەرچی گەیشتە ئەم قۆناغە بۆی ڕاناگیرێت، بەختەوەر ئەو کەسەیە کە خۆشەویستی بۆ خوا دەگاتە ئەم قۆناغە، کە ئیتر خۆشەویستی بۆ خوا وای لێ بێت، بڵێت: من خاوەنی دڵم نیم بەڵکو خاوەنەکەی خوایە.

**قۆناغی چوارەم: ( غرام ) شەیدا بوونی دڵ:**

قۆناغی خۆشەویستی گەیشتە پلەی شەیدابوونی دڵ، قۆناغێکە دەستەڵات نامێنێت بۆ پچڕاندنی ئەو خۆشەویستییە، بۆیە قورئان دەربارەی ئەو جۆرە خۆشەویستییە فەرموویەتی: ﴿وَالَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا اصْرِفْ عَنَّا عَذَابَ جَهَنَّمَ إِنَّ عَذَابَهَا كَانَ غَرَامًا﴾(الفرقان/٦٥).

واتە: (بەندەکانی خوای (الرحمن) ئەو کەسانەن کە دەڵێن: پەروەردگار لە سزای ئاگری دۆزەخ بە دوورمان بکەو پەنامان بدە، چونکە سزا و ئازاری لە کۆڵ نابێتەوە و بەردەوامە (بۆ ئەو کەسەی کە خوا نەناس و یاخییە). مەبەست لە (غرام) چییە؟ هەر کەس چووە ناودۆزەخ سزاکەی ئەنوسێت بە لەشی ئەو کەسەوە هەرگیز لێی جیا نابێتەوە و ئاگر تێکەڵ بە هەموو جەستەی دەبێت، خوای گەورە بە جۆرێك ووشەکەی لە قورئاندا هێناوە وەك ئەوەی پێت بڵێت: وا نەزانیت کە هەر بۆ خۆشەویستی نێوان دووکەس بەکار دەهێنرێت، ئاگادار بە (غرام) هەیە زۆر ناخۆشە وەك گیرۆدە بوون بە ئاگری دۆزەخ، ئەگەر ئاگر گەیشتە ئەو قۆناغە، ئیتر لە جەستە جیا نابێتەوە: ﴿إِنَّ عَذَابَهَا كَانَ

غَرَامًا﴾(الفرقان/٦٥). هەر کەس دووچاری ئەو جۆرە خۆشەویستییە بوو، لاواز دەبێت و خواردنی کەم دەکات وای لیٚ دێت چەند ڕۆژنان نەخوات، ئایا ئێمە کەسمان خۆشەویستیمان بۆ خوای گەورە گەیشتۆتە ئەو پلەیە؟ زۆر کەمە کەسێك بۆ ئەوە شەوبێداربێت لەبەرامبەر خوای گەورەدا و ڕۆژەکەیشی کەم بخوات، بۆ ئەوەی بتوانێت شەو بێدار بێت بۆ گوێڕایەڵی و خواپەرستی، بەڵام هەیە چەند ڕۆژ نانی بۆ ناخورێت لە بێتاقەتی ئەوە کە ئەگات بەو کەسەی خۆشی دەوێت.

**قۆناغی پێنجەم :لە قۆناغەکانی خۆشەویستی پێی دەڵێن: ( شغف ) پەڕەی دڵ دەبڕێت:**
خۆشەویستی لەم قۆناغەدا زۆر توندتر دەبێت لە قۆناغەکانی پێشوو، مەبەست لەم قۆناغە ئەوەیە کە خۆشەویستی ئەچێتە ناو ناخ و کرۆکی دڵەوە، خوای گەورە لەبارەی ئەم جۆرە خۆشەویستییەوە دەفەرموێت: ﴿وَقَالَ نِسْوَةٌ فِي الْمَدِينَةِ امْرَأَتُ الْعَزِيزِ تُرَاوِدُ فَتَاهَا عَنْ نَفْسِهِ قَدْ شَغَفَهَا حُبًّا إِنَّا لَنَرَاهَا فِي ضَلَالٍ مُبِينٍ﴾(یوسف/٣٠)
واتە: (پاشان ژنانێك لە ئافرەتانی ناو شار ئەم دەنگ و باسەیان بیست بۆیە وتیشیان: سەیرە! ژنەکەی عەزیزی میسر دەیەوێت بە نەرم ونیانی سەرنجی لاوەکەی خۆی ڕابکێشێت بۆ لای خۆی، بەڕاستی ئەویندارییەکەی بۆی هەموو پەڕەکانی دڵی داگیر کردووە، بێگومان ئێمە ئەو ژنە لەناو سەرگەردانیەکی ئاشکرادا دەبینین.)
ئەم جۆرە خۆشەویستییە زۆر ترسناکە و سەر ئەکێشێت بۆ کاری ناڕەوا و ئابڕوو چوون و دواتر مانەوە بە شەرمەزاری دونیای ناو کۆمەڵ و شەرمەزاری بەردەمی خوای گەورە لە قیامەت.

**باسی یەکەم:**

**مژدەدان بە لەدایك بوونی ئیسحاق ( علیه السلام ) و هەڵوێستی ئیبراهیم ( علیه السلام ) و ( سارە )ی هاوسەری**

قورئانی پیرۆز ئەم ڕووداوە گەورەی لەژیانی ئیبراهیم (علیه السلام) و (سارة)ی هاوسەری بۆ تۆمار کردوین، لەمەدا بەڵگەیەکی ڕوون لەسەر گرنگی و گەورەیی ڕووداوەکە هەیە،و ئاماژەیەکی ڕون و جوان هەیە بۆ ڕێزگرتنی خوا لە ئیبراهیم (علیه السلام) و (سارة)ی هاوسەری و ئیسحاق (علیه السلام).

خوای گەورە لە سوورەتی (هود)دا دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ جَاءَتْ رُسُلُنَا إِبْرَاهِيمَ بِالْبُشْرَى قَالُوا سَلَامًا قَالَ سَلَامٌ فَمَا لَبِثَ أَن جَاءَ بِعِجْلٍ حَنِيذٍ (٦٩) فَلَمَّا رَأَى أَيْدِيَهُمْ لَا تَصِلُ إِلَيْهِ نَكِرَهُمْ وَأَوْجَسَ مِنْهُمْ خِيفَةً قَالُوا لَا تَخَفْ إِنَّا أُرْسِلْنَا إِلَى قَوْمِ لُوطٍ (٧٠) وَامْرَأَتُهُ قَائِمَةٌ فَضَحِكَتْ فَبَشَّرْنَاهَا بِإِسْحَاقَ وَمِن وَرَاءِ إِسْحَاقَ يَعْقُوبَ (٧١) قَالَتْ يَا وَيْلَتَى أَأَلِدُ وَأَنَا عَجُوزٌ وَهَذَا بَعْلِي شَيْخًا إِنَّ هَذَا لَشَيْءٌ عَجِيبٌ (٧٢) قَالُوا أَتَعْجَبِينَ مِنْ أَمْرِ اللَّهِ رَحْمَتُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ عَلَيْكُمْ أَهْلَ الْبَيْتِ إِنَّهُ حَمِيدٌ مَّجِيدٌ﴾(هود:٧٣:٦٩). واتە: (سوێند بەخوا بێگومان وەفدێکی ڕەوانە کراوی ئێمە (لە فریشتە) هاتنە لای ئیبراهیم بە مژدەوە (مژدەی بوونی منداڵێك) و وتیان: سڵاوی خوات لێ بێت، ئەمیش وتی: سڵاوی خوا لە ئێوەش، دوای بەخێرهاتنیان ڕۆیشت و جا زۆری پێ نەچوو گەڕایەوە بەگۆشتی گوێرەکەیەکی برژاوەوە.(٦٩). جا کاتێك (ئیبراهیم) بینی دەستی بۆ نابەن، کارەکەیانی بە نائاسایی داناو لەدڵی خۆیدا لێیان ترسا، ئەوانیش هەستیان پێکردو وتیان: مەترسە، بەڕاستی ئێمە نێردراوین بۆ لای قەومەکەی لوط.(٧٠). لەو کاتەدا خێزانەکەی وەستا بوو، یەکسەر پێکەنی، جا (خوای گەورە فەرمووی): ئێمەش مژدەمان دایە کە ئیسحاقت پێ دەبەخشین و لە دوای ئەویش یەعقوب، لە نەوەی ئیسحاق دێتە دنیاوە.(٧١).خێزانی ئیبراهیم وتی: وەی ڕۆ (شەرمەزار خۆم)! چۆن منداڵم دەبێت من پیرم و ئەمەش مێردەکەمە، پیر و بەساڵا چووە، بەڕاستی ئەمە شتێکی سەر سوڕهێنەرە! (٧٢) فریشتەکان ووتیان: ئایا سەرسام دەبیت لە فەرمان و کاری خوا؟؟ ڕەحمەت و

ڕەکەتی خواتان لەسەر بێت ئەی خێزانی ئەم ماڵە پیرۆزە، (بێگومان خوای گەورە کاری وا دەکات) و چونکە هەمیشە ئەو زاتە سوپاسکراوە و خاوەنی بەرزی و دەسەڵاتیشە.(٧٣)) (هود:٦٩-٧٣).

بۆ زانیاری زیاتر دەتوانی سەیری تەفسیری ئایەتەکانی (الحجر:٥١-٥٦)و (الذاریات:٢٤-٣٠) بکەیت). إن شاء الله بەدرێژتر ماناو ڕاڤەی ئایەتەکان ڕون دەکەینەوە:

## یەکەم: هاتنی فریشتەکان بۆ لای ئیبراهیم (علیه السلام)

شێوەیان لەسەر شێوەی جوانترین بەشەر بوو، فریشتە بەڕێزەکان هاتن بۆ لای ئیبراهیم(علیه السلام) و لەپێشدا سلاویان کرد بەجوانترین شێوە.

خوای گەورە لەم ئایەتەی سوورەتی (هود)دا دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ جَاءَتْ رُسُلُنَا إِبْرَاهِيمَ بِالْبُشْرَى قَالُوا سَلَامًا قَالَ سَلَامٌ﴾ (هود:٦٩).

و لە سوورەتی (الحجر)دا فەرمووی: ﴿ وَنَبِّئْهُمْ عَن ضَيْفِ إِبْرَاهِيمَ (٥١) . إِذْ دَخَلُوا عَلَيْهِ فَقَالُوا سَلَامًا قَالَ إِنَّا مِنكُمْ وَجِلُونَ﴾ (الحجر:٥١-٥٢).

هەروەها لە سوورەتی (الذاریات)دا فەرمووی: ﴿ هَلْ أَتَاكَ حَدِيثُ ضَيْفِ إِبْرَاهِيمَ الْمُكْرَمِينَ ٢٤. إِذْ دَخَلُوا عَلَيْهِ فَقَالُوا سَلَامًا قَالَ سَلَامٌ قَوْمٌ مُّنكَرُونَ ﴾ (الذاریات:٢٤-٢٥). لەم ئایەتانەدا خوای گەورە هەواڵی دابەزینی فریشتەکانی دا، لە شێوەی بەشەردا و هاتنیان بۆ لای ئیبراهیم (علیه السلام) بە مژدەوە. (البشری) مژدە، بریتییە لە هەواڵێکی بلاو و مەبەستدار، لێرەدا مژدەدانە بە لەدایك بوونی ئیسحاق (علیه السلام).

*** سلاوێکی موبارەك و جوان:**

فریشتەکان بەشێوە سلاوێکی جوان و پیرۆز لە لایەن خواوە سلاویان کرد لە ئیبراهیم (علیه السلام): ﴿قَالُوا سَلَامًا﴾. واتە: سەلامت لێ دەکەین لە لایەن خۆمانەوە یان سەلاممان لێکردیت ﴿قَالَ سَلَامٌ﴾ واتە: سەلامیش لەسەر خۆتان.

*زانا (الآلوسي) دەڵێت: (ئیبراهیم (علیه السلام) جوانتر لە سڵاوەکەی خۆیان، سڵاوی لێکردن، چونکە بە (جملة إسمي) بەڵگەیە لەسەر بەردەوامی و دامەزراوی کە بەهێزترە)[٦٦].

لە سوورەتی (الذاریات)دا: ﴿قَالَ سَلَامٌ قَوْمٌ مُّنكَرُونَ﴾ (الذاریات:٢٥):

*زانا (الزمخشري دەڵێت: (ئیبراهیم (علیه السلام) هەرچەندە نەشی ناسین وەڵامی سەلامەکەیانی دایەوە کە سڵاوی ئیسلامیانە بوو، یان نەیناسین یان لەڕەگەز و شێوەی بەشەر نەبوون کە ئەو ناسیبوونی، یان لە حاڵ و شێوەی خەڵکی ،یان پرسیار بوو لێی کردن، وەك ئەوەی وتبێتی: خۆتان کێن؟[٦٧]

*زانا (إبن کثیر) وتویەتی: (بێگومان ئیبراهیم (علیه السلام) نەیناسین، چونکە لە پڕدا هاتنە لای لە شێوەی چەند گەنجێکی ڕوخسار جواندا و زۆر لێیان ترسا، لەبەر ئەوە نەیناسین)[٦٨].

## دووەم: ڕێزگرتن لە میوان

ئیبراهیم (علیه السلام) بەڕێزەوە وەڵامی سڵاوی فریشتەکانی دایەوە، لەمەدا ئاماژە کراوە بۆ ئەدەبی گرنگ و جوان لە ئەدەبەکانی میوانداری، ئەویش جوان پێشوازیکردنە لە میوان.

خێرا دەستپێشکەری کرد بۆ ئامادەکردنی خواردن بۆ میوانەکانی، بەبێ ئەوەی پرسیار لە حاڵیان بکات، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ڕێز و پیاوەتی ئیبراهیم(علیه السلام)، خوای گەورە فەرمووی: ﴿ فَمَا لَبِثَ أَن جَآءَ بِعِجْلٍ حَنِيذٍ﴾ (هود:٦٩)، هەروەها لەشوێنێکی تردا بە ﴿بِعِجْلٍ سَمِينٍ﴾ (الذاریات:٢٦).

لێکدانەوە بە: ﴿ فَمَا لَبِثَ أَن جَآءَ . .﴾ بەڵگەیە لەسەر خێرایی دەستپێشکەری یەکەی ئیبراهیم (علیه السلام) بۆ ئامادەکردنی خواردنەکە بۆ میوانە بەڕێزەکانی، ئەوەش، کاتێکی کەمی پێ دەچێت، سەرەڕای ئەوەی کە ئەو خواردنەی ئەو ئامادەی دەکات و پێشکەشی دەکات، گوێرەکەیەکی قەڵەوی برژاو بوو لەسەر بەردی گەرم و سورکراوە، کە

٦٦-(روح المعاني للآلوسي ٩٤/١٢).

٦٧-(الکشاف للزمخشري ٤١٠/٤).

٦٨-تفسیر إبن کثیر(٢٣٥/٤).

گۆشتێکی بەتام و لەزەتی هەبوو، ئەمە بەڵگەی تیایە لەسەر ڕێزگرتنی ئیبراهیم (علیه السلام) لە میوانەکانی و پێشوازییە گەرمەکەی کە باشترین شتی کە لای بوو پێشکەشی کردن.

●ئایەتی: ﴿فَرَاغَ إِلَىٰ أَهْلِهِ..﴾ بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە چوو بۆ لای خێزانەکەی بە شاراوەیی و نهێنی، تا میوانەکانی هەستی پێ نەکەن.

●ئایەتی: ﴿فَقَرَّبَهُ إِلَيْهِمْ﴾ بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە خواردنەکە پێشکەش دەکات لەدوای ئامادەکردنی و تەواو پێگەیشتنی بەبێ دواکەوتن و خاو و خلیچکی، و نزیك کردنەوەی خواردن و دانانی لەبەردەم میواندا، ئەوە لە نیشانەو ئادابی جوانی میوانداری یە.

●هەروەها لە ڕێزەکانی و جوانی ئەدەبی لەگەڵ میواندا ،ئەوە بوو کە خواردنەکەی لێ نزیك خستنەوە ،واتە خستیە بەردەستیانەوە، تەنها بەوە وازی نەهێنا، بەڵکو بە زمانێکی نەرم و وشەی جوان فەرمووی لێکردن بۆ خواردنی: ﴿قَالَ أَلَا تَأْكُلُونَ﴾.

●لەوەدا کە خۆی هەڵسابوو بە خزمەتکردنی میوانەکان ،ئەوە بەڵگە بووە لەسەر پێشوازی جوانی بۆیان.

●لە ئایەتی: ﴿ فَلَمَّا رَأَىٰ أَيْدِيَهُمْ لَا تَصِلُ إِلَيْهِ نَكِرَهُمْ وَأَوْجَسَ مِنْهُمْ خِيفَةً﴾ ئاماژەیە بۆ ئەدەبێکی گرنگ لە ئادابی میوانداری، کەبریتی یە لە بەسەرکردنەوەی حاڵی میوان بە وتەی جوان و نەرم و نیانی، هەتا خاوەن ماڵ بزانێت ئایا میوانەکەی نان دەخوات یان نایخوات؟ ئایا پێویستیان بە خواردنی زیادە هەیە یان پێویستیان نی یە؟

ئەمانە کۆمەڵێك بوون لە ئەدەبی جوانی میوانداری، پێغەمبەران (علیه السلام) پێشەوا و پێشەنگی جوان بوون بۆ ئێمە ،و دینی پاکی ئیسلام هانمان دەدات لەسەر ئەم ئەخلاق و ڕەوشتە جوانانە، و پێویستە ئێمە بگەڕێینەوە بۆ بابەتەکانی ،ئەویش لەدەرس و وانە گرنگەکانی چیرۆکەکەدا.

## سێیەم: ترسانی ئیبراهیم (علیه السلام) لە میوانەکانی و پاشان زانینی حاڵیان

ئیبراهیم (علیه السلام) خواردنەکەی پێشکەشی میوانەکان کرد، بەڵام ئەوان دەستیان بۆ خواردنەکە درێژ نەکرد، چونکە ئەوان فریشتە بوون، و خواردن و خواردنەوە ناخۆن،

و ئیبراهیم (علیه السلام) نەیزانی کە ئەوان فریشتەن: ﴿ فَلَمَّا رَأَىٰ أَيْدِيَهُمْ لَا تَصِلُ إِلَيْهِ نَكِرَهُمْ﴾: ئەم شێوازەی لە میواندا نەبینی بوو، بەڵکو حاڵەتی تری لە میواندا بینیبوو، بێگومان میوان خواردن ڕەت ناکاتەوە مەگەر لەبەر عەیبێك لە خواردنەکەدا، یان مەبەستێکی خراپ، لە دەرونی خۆیدا ترسی لێ نیشت لێیان: ﴿ وَأَوْجَسَ مِنْهُمْ خِيفَةً﴾.

(الوجس): دەنگێکی شاراوەیە، بەو شتە دەوترێت لە حاڵەتی ترس بەسەر نەفسدا دێت، بەڕاستی ئیبراهیم (علیه السلام) دانی نا بەوەدا بۆ فریشتەکان کە ترس و دڵەڕاوکێ لە دەرونیدا دروستبوو، و چاو دەگێڕێت، ئینجا وتی: ﴿قَالَ إِنَّا مِنكُمْ وَجِلُونَ﴾(الحجر:٥٢).

کاتێك بەو شێوەیە ئیبراهیمیان بینی، دەست پێشکەرییان کرد لە ترسەکەی هێمن و ئارامی بکەنەوەو دڵنیای کەنەوە، ئینجا ڕاستی خۆیانیان بۆ ئیبراهیم (علیه السلام) دەرخست و ئەو کارە گرنگەی کە هاتوون بۆی بۆیان ڕوون کردەوە، کە بریتی بوو لە: لەناو بردنی قەومی لوط (علیه السلام) کە دوایان ببڕن، پاش ئەوەی کە لەسەر کوفر و بێباوەڕی مانەوە و سور بوون لەسەر لادان و لە سنور دەرچوون و سەرپێچی، هەروەها بۆ ئەوەش هاتون تا مژدە بدەن بە ئیبراهیم (علیه السلام) و هاوسەرەکەی کە (سارة)یە، بە لەدایکبوونی (ئیسحاق) و لەویش (یەعقوب).

## چوارەم: مژدەدان بە لەدایکبونی ئیسحاق، و هەڵوێستی ئیبراهیم ( علیه السلام ) و ( سارە )ی خێزانی

قورئانی پیرۆز هەڵوێستیانی دەربارەی ئەو مژدەیە تۆمار کردووە.

●دەربارەی ئیبراهیم (علیه السلام) وەك قورئانی پیرۆز لە سوورەتی (الحجر)دا ،هەواڵی ئەو مژدەیەی فریشتەکانی دا بە ئیبراهیم و هەڵوێستی ئەوان بەرامبەر ئەو مژدە دانە، لە ڕوانگەی ئەو گفتو گۆیەی کە لە نێوان ئیبراهیم و فریشتەکاندا ڕویدا.

خوای گەورە فەرمووی: ﴿ وَنَبِّئْهُمْ عَن ضَيْفِ إِبْرَاهِيمَ {٥١} إِذْ دَخَلُوا عَلَيْهِ فَقَالُوا سَلَامًا قَالَ إِنَّا مِنكُمْ وَجِلُونَ {٥٢} قَالُوا لَا تَوْجَلْ إِنَّا نُبَشِّرُكَ بِغُلَامٍ عَلِيمٍ {٥٣} قَالَ أَبَشَّرْتُمُونِي عَلَىٰ أَن مَّسَّنِيَ الْكِبَرُ

فَبِمَ تُبَشِّرُونَ {٥٤} قَالُواْ بَشَّرْنَاكَ بِالْحَقِّ فَلاَ تَكُن مِّنَ الْقَانِطِينَ {٥٥} قَالَ وَمَن يَقْنَطُ مِن رَّحْمَةِ رَبِّهِ إِلاَّ الضَّآلُّونَ {٥٦} ﴾(الحجر: ٥١-٥٦).

**-لەم ئایەتانەدا ئەوە ڕون کراوەتەوە کە لە نێوان ئیبراهیم و فریشتەکاندا ڕویدا، بەو جۆرەی کە مژدەی لەدایکبونی ئیسحاقیان پێ دا، ئەوەش کاتێك هاتن لە شێوەی بەشەردا بوون و ئەویش خواردنی بۆ ئامادە کردن و لێی نزیککردنەوە، بەڵام نەیانخوارد و لێیان ترساو ترسەکەی بۆ ئاشکرا کردن: ﴿ قَالُوا لَا تَوْجَلْ إِنَّا نُبَشِّرُكَ بِغُلَامٍ عَلِيمٍ﴾ بێگومان تۆ لە (سارة) کوڕێکت دەبێت، کە پلەو پایەیەکی بەرزی دەبێت لە عیلم و زانستدا.**

**ئیبراهیم (علیه السلام) ئەو مژدەیەی بیست و سەری سوڕما بە فریشتە بەڕێزەکانی ووت بە سەرسوڕمانەوە: ﴿ قَالَ أَبَشَّرْتُمُونِي عَلَى أَن مَّسَّنِيَ الْكِبَرُ﴾.**

**واتە: لەگەڵ ئەو تەمەنە گەورەی کە تووشی من هاتووە، بەڕاستی فەرمانێکی سەیرە و مرۆڤ دەهەژێنێت: ﴿فَبِمَ تُبَشِّرُونَ﴾ ئایا بە چ فەرمانێکی سەیر مژدەم دەدەنی؟ ئەم مژدەیە چۆن جێ بەجێ دەبێت لەگەڵ گەورەیی تەمەنی من و نەزۆکی خێزانەکەمدا؟.**

**﴿قَالُوا بَشَّرْنَاكَ بِالْحَقِّ فَلَا تَكُن مِّنَ الْقَانِطِينَ﴾ واتە: مژدە دانەکەی ئێمە لەگەڵ حەق و ڕاستیدا یەك کەوتووە و لێی جینابێتەوەو ئێمە نوێنەری حەق و ڕاستین و تەنها بۆ حەق و ڕاستی دادەبەزین: ﴿ مِّنَ الْقَانِطِينَ﴾ تۆ نائومێد مەبە لە نەبوونی منداڵ لەو تەمەنەدا ،کە خێزانەکەیشت نەزۆکە و منداڵی نابێت، چونکە ئەم مژدەیە بەخششی خواو ڕێزی ئەوە بۆ ئێوە، خوا بەسەر هەموو شتێکدا بەتوانایە: ﴿إِنَّمَا أَمْرُهُ إِذَا أَرَادَ شَيْئًا أَنْ يَقُولَ لَهُ كُن فَيَكُونُ﴾(یس:٨٢)، ﴿ أَلَا لَهُ الْخَلْقُ وَالْأَمْرُ تَبَارَكَ اللَّهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ﴾(الاعراف:٥٤) لە ئایەتەکەی سوورەتی (الحجر)دا: ئیبراهیم (علیه السلام) بۆی ڕوون کردنەوە کە ئەو نائومێد نییە لە ڕەحمەتی خوا، چونکە ئەو بەدڵنیایی دەزانێت کە ڕەحم و بەزەیی خوا فراوانە و نزیکە لە چاکەکارانەوەو بەخششەکانی خوا فراوان و ماوە درێژن، و توانای خوا سنوری نی یە و بەربەستی لەبەردەمدا نییە، خوای گەورە هەموو نهێنییەکانی ئەم بونەوەرەی بەدیهێناوە، و بەتوانایشە کە ئەو نهێنییانە ببڕێت و لەعادەتی ئاسایی دەریکات، کەبەڵگەیە لەسەر تەواوی قودرەتی و ویستی تەواوو لەڕادەبەدەری. پێغەمبەران (علیهم السلام) لەهەموو کەس چاکتر خوایان ناسیوە.**

●زانا (الصابوني) دەڵێت: ﴿ قَالُوا بَشَّرْنَاكَ بِالْحَقِّ فَلَا تَكُن مِّنَ الْقَانِطِينَ﴾ واتە: مژدەمان پێدا بە حەقێکی جێگیر و فەرمانێکی جێبەجێکراو، بەدووری مەگرە و نائومێد مەبە لە ڕەحمەتی خوا، چونکە هیچ شتێك لەدەست خوا دەرناچێت و دەستەوسانی ناکات،﴿ قَالَ وَمَن يَقْنَطُ مِن رَّحْمَةِ رَبِّهِ إِلَّا الضَّالُّونَ﴾ ئەو کەسانەن کە ڕێگەی ڕاستیان هەڵە کردووە و قودرەت و توانای خوایان نەناسیوە ،و مەبەستی ئیبراهیم(علیه السلام) کە نەفی نائومێدی کرد لەخۆی لەسەر جوانترین و بەهێزترین شێوە،واتە لای من نائومێد بوون لە ڕەحمەتی خوا نییە).

بەڕاستی ئیبراهیم (علیه السلام) سەری سوڕما لەم مژدەیە، و پرسیار دەکرێت لە چۆنێتی ڕوودانەکەی کە ئەو پیاوێکی گەورەو بەتەمەن بوو، و خێزانەکەیشی پیر و نەزۆك بوو.

دەربارەی هەڵوێستی (سارە)یش لە سوورەتی (هود) و (الذاريات)دا باسەکەی هاتووە ڕوونی دەکەینەوە:

یەکەم: ئەوەی لە سوورەتی (هود)دا هاتووە: خوای گەورە فەرمووی: ﴿وَلَقَدْ جَاءَتْ رُسُلُنَا إِبْرَاهِيمَ بِالْبُشْرَىٰ قَالُوا سَلَامًا قَالَ سَلَامٌ فَمَا لَبِثَ أَن جَاءَ بِعِجْلٍ حَنِيذٍ (٦٩) فَلَمَّا رَأَىٰ أَيْدِيَهُمْ لَا تَصِلُ إِلَيْهِ نَكِرَهُمْ وَأَوْجَسَ مِنْهُمْ خِيفَةً قَالُوا لَا تَخَفْ إِنَّا أُرْسِلْنَا إِلَىٰ قَوْمِ لُوطٍ (٧٠) وَامْرَأَتُهُ قَائِمَةٌ فَضَحِكَتْ فَبَشَّرْنَاهَا بِإِسْحَاقَ وَمِن وَرَاءِ إِسْحَاقَ يَعْقُوبَ (٧١) قَالَتْ يَا وَيْلَتَىٰ أَأَلِدُ وَأَنَا عَجُوزٌ وَهَٰذَا بَعْلِي شَيْخًا إِنَّ هَٰذَا لَشَيْءٌ عَجِيبٌ (٧٢) قَالُوا أَتَعْجَبِينَ مِنْ أَمْرِ اللَّهِ رَحْمَتُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ عَلَيْكُمْ أَهْلَ الْبَيْتِ إِنَّهُ حَمِيدٌ مَّجِيدٌ (٧٣)﴾(هود:٦٩ -٧٣).

ئایەتی: ﴿ وَامْرَأَتُهُ قَائِمَةٌ﴾ ڕوونکردنەوەیەك بوو لە لایەن خواوە بۆ حاڵی (سارە)، کاتێك مژدەکەی پێ گەیشت کە لە پشتی پەردەیەك لەماڵەکەیدا ڕاوەستا بوو، بۆ ئەوەی خزمەتی میوانەکانی بکات.

وتراوە: بەڵکو ڕاوەستا بوو ڕاستەوخۆ خزمەتی دەکردن، پیر بوو، تەمەنی لە نەوەد ساڵاندا بوو، ئیبراهیم (علیه السلام) لێی نەدەترسا کە توشی فیتنە ببێت.

بەڵام ئەوەی قسەی دروست و لە پێشترە: ئەو لە پشتی پەردەکەوە ڕاوەستابوو، بۆ خزمەتی ئەوان و، ئیبراهیم (علیه السلام) لەگەڵ میوانەکاندا بوو، خزمەتی دەکردن، ڕووکاری ئایەتەکان ئەوە دەگەیەنێت.

خوای گەورە فەرمووی: ﴿ فَمَا لَبِثَ أَن جَآءَ... مِنْهُمْ خِيفَةً.. ﴾ لەگەڵ ئایەتی: ﴿فَرَاغَ إِلَىٰٓ أَهْلِهِۦ... أَلَا تَأْكُلُونَ﴾ ئیبراهیم(علیه السلام) هەستا بوو بە خزمەتکردنی میوانەکان و خێزانەکەیشی لە پشتی پەردەکەوە بوو بۆ خزمەتیان ،کاتێك گوێی لە مژدەکە بوو لە فریشتەکانەوە ،لە پشتی پەردەکەوە هاتە دەرەوە و بەرەو ڕوویان هات.خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَأَقْبَلَتِ ٱمْرَأَتُهُۥ فِى صَرَّةٍ... ﴾.

## ڕاستی پێکەنینەکەی و هۆکارەکەی

●ڕاو بۆچونی جیاواز لەسەر پێکەنینەکەی هەیە، وتراوە: ئەوە پێکەنینێکی زانراو بووە، ئەمە قسەی زۆرینەیە، جیاوازیشیان لە هۆکارەکەیدا هەیە، وتراوە: پێی خۆش بوو کاتێك لە فریشتەکانەوە بیستی و هەواڵسان دایە ئیبراهیم(علیه السلام) بە ڕزگار بوونی (لوط)و باوەڕداران و لەناوچوونی کافران و بێ باوەڕان کە پشتیان لە بانگەوازی خوایی هەڵکردبوو.

●زانا (إبن كثير) وتویەتی: ﴿ فَضَحِكَتْ ﴾ بە لەناوچوونی کافران ،لەبەر زۆری خراپەو فەسادیان و بێ باوەڕیان و کەللە ڕەقیان، لەبەر ئەوە ڕێگە پێدراوە مژدە بدرێت بە لەدایك بوونی کوڕ لەدوای نائومێد بوون)[٦٩] ،(زۆر بۆچوونی لەسەر هاتووە ،ئێمە ئەوەندەمان بەسە).

●ئەمانە بەڵگە بوون لەسەر بەهێزی ئیمانی (سارة) و خۆشەویستی و پشتیوانی بۆ ئیمان و ئەهلی ئیمان ڕق و دوورە پەرێزی لە کوفرو ئەهلی کوفر، و لە سێبەری ئەم هەستە ئیمانی یەدا مژدەی بۆ هات بەلەدایك بوونی کوڕێکی (صالح) و چاکەکار، تا خۆشی و بەختەوەرییەکەی تەواو بکات ،و ئەو مژدەی بۆ هات کە لە پلەو پایەیەکی بەرێزدا بوو، وەك هاتنی مژدەکە بۆ (زەکەریا) (علیه السلام) بە کوڕێك پاش چاوەڕوانی

[٦٩]- تفسير القرآن العظيم لإبن كثير/٢/٤٥٢) بە دەستکارییەوە.

بۆ ماوەیەکی زۆر، مژدەی بۆ هات کاتێك لەناو میحرابدا نوێژی دەکرد، وەك ئەوەی کە نوێژ بەرزترینی پەرستشەکانە: پشتیوانی دۆستانی خواو دژایەتی دوژمنانی خوا، لە گەورەترین هۆکارەکانن بۆ نزیك بوونەوە لە خوا، و هاتنی فریشتەکاندا بە مژدەوە، گەورەترین ڕێزگرتن بوو لە (سارة).

(سارة) خان کاتێك توشی سەرسوڕمان هات وتی: ﴿يَا وَيْلَتَى أَأَلِدُ وَأَنَا عَجُوزٌ وَهَذَا بَعْلِي شَيْخًا إِنَّ هَذَا لَشَيْءٌ عَجِيبٌ﴾ وتراوە: کاتێك مژدەی پێدرا تەمەنی لە نەوەد ساڵاندا بوو و تەمەنی ئیبراهیمی هاوسەریشی نزیکەی سەد ساڵان بوو.[٧٠] (سارة) خان دوعای لەناوچوونی لەسەر نەفسی خۆی نەکرد، بەڵکو وشەیەکی دەربڕی کە ئافرەتان لەسەری ڕاهاتوون و زۆر جار بە زمانیاندا دێت ، کاتێك کە ڕوداوێکی کتوپڕ و سەرسوڕهێنەر ڕوویان تێ بکات، ئەو سەری سوڕما لە بوونی کوڕێك ، کە خۆی لەو تەمەنەدا بوو چونکە لە عادەت و دەستوری ئاسایی دەرچوبوو، و غەریب و نەخوازراو بوو.[٧١] ﴿إِنَّ هَذَا لَشَيْءٌ عَجِيبٌ﴾ بەڕاستی ئەمە کارێکی سەیرە کە لە دوو کەسی پیر و بەتەمەن منداڵێك لەدایك ببێت ،دووره لەوەی کە خوا داینابوه.[٧٢]

● (الرازي) وتویەتی: بێگومان ئەو سەری سوڕما بە پێی عادەت نەك بەپێی توانا، چونکە ئەگەر پیاوی موسوڵمان کەسێکی ڕاستگۆ هەواڵی پێبدات، کە خوای گەورە دەتوانێت ئەو شاخانە بگۆڕێت بۆ ئاڵتونی پاڵاوتە و ساغ بێگومان توشی سەرسوڕمان دێت، بەپێی تێڕوانینی بۆ عادەت نەك لەبەر ئەوەی کە ئەو ئینکاری دەسەڵات و قودرەتی خوابکات لەسەر ئەنجامدانی ئەو کارە.[٧٣]

﴿قَالُوا أَتَعْجَبِينَ مِنْ أَمْرِ اللَّهِ رَحْمَتُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ عَلَيْكُمْ أَهْلَ الْبَيْتِ إِنَّهُ حَمِيدٌ مَجِيدٌ﴾، فریشتە بەڕێزەکان بە (سارة) خانیان ووت: ئایا تۆ سەرت دەسوڕمێ لەم فەرمانە لە عادەت دەرچووە؟ و تۆ لەناو ماڵ و خانەوادەی پێغەمبەرایەتیدایت، هەروەها لەشوێنی دابەزینی وەحیدایت، وبەهیوای ڕەحمەت و بەرەکەت و دەرو لێکردنەوەو ڕوودانی کاری لەعادەت دەرچوویت؟ دەبێت چۆن سەرت بسوڕمێ لەمە؟

---

[٧٠]-جامع البيان للطبري/١٥/٣٩٨ بتحقيق احمد شاكر.

[٧١]-الجامع لأحكام القران للقرطبي ٦٩/٩.

[٧٢]- الكشاف للزمخشري ٤١١/٢.

[٧٣]-مفاتيح الغيب ٢٨/١٨.

● (الزمخشري) دەڵێت: {فریشتەکان بە غەریبیان دانا و ئینکاری ئەوەیان کرد کە (سارة) تووشی سەرسوڕمان هاتووە، چونکە ئەو لە شوێنێکدایە کە پڕ لە نیشانەو بەڵگەی خوایی و شوێنی هاتنە خوارەوەی موعجیزە و کارە لەعادەت دەرچووەکانە، بەڵکو پێویست بوو شکۆدار و شکۆمەند بووایەو وەك سەرجەمی ئەو ئافرەتانە بوایە کە لە غەیری ماڵ و شوێنی پێغەمبەراندا گەشەیان کردووە، و (سبحان الله) و (الله اکبر)ی بکردایە لەبری ئەو سەرسوڕمانە، بۆ ئەوانەش فریشتەکان ئاماژەیان کرد بۆ (صلوات)ی خوا لەسەریان، وەك فەرموویان: ﴿رَحْمَتُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ عَلَيْكُمْ أَهْلَ الْبَيْتِ﴾ وایان ویست کە ئەم مژدەدانەو نموونەی ئەمەش لەو شتانەن کە پەروەردگاری بەرز و بالاّ ڕێزی ئێوەی پێدەگرێت و تایبەتی دەکات بە ئێوە ئەی خاوەنی ئەو ماڵە بەڕێزە ئەمە شوێنی سەرسوڕمان نەبوو....بێگومان نموونەی ئەم جۆرە بەزەیی و ڕەحمەت و بەرەکەتە لەلایەن خواوە زۆرن بۆ ئێوە.[74]

﴿إِنَّهُ حَمِيدٌ مَّجِيدٌ﴾ خوای گەورە سوپاسکراوە بەوەی کە سیفاتە بەرزو بالاّکانی باسیان کردووە و ئەو بەردەوام سوپاسکراوە.

● (ابو حامد الغزالي) دەڵێت: (ئەو بەسوپاس و ستایشی خۆی لەسەر نەفسی خۆی سوپاس کراوە یەکەم جار، وە بەسوپاس و ستایش کردنی بەندەکانیشی لەسەری بۆ هەمیشە سوپاسکراوە).[75]

﴿مَّجِيدٌ﴾: بەخشندەیی و ڕێزی زۆر فراوانە، زۆر دەبەخشێت زۆر بە هەیبەت و بەڕێزە، پلەی بەرز و بڵندە.

● (الزمخشري) دەڵێت: ﴿مَّجِيدٌ﴾ واتە: چاکەی زۆرە بۆ بەندەکانی.[76]

دووەم: ئەوەی کە لە سوورەتی (الذاريات)دا هاتووە: خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَأَقْبَلَتِ امْرَأَتُهُ فِي صَرَّةٍ فَصَكَّتْ وَجْهَهَا . . . الْحَكِيمُ الْعَلِيمُ﴾ (الذاريات:٢٩-٣٠).

---

[74] -الكشاف ٤١١/٢ بە دەستكارييەوە

[75] المقتصد الأسنى في شرح اسماء الله الحسنى ص/١١٥

[76] الكشاف/ ٤١١/٢

لەم ئایەتەدا هەڵوێستی (سارە) خان زیاتر ڕونکراوەتەوە لە مژدە دانەکەدا: ﴿فَأَقْبَلَتِ امْرَأَتُهُ فِي صَرَّةٍ﴾ واتە: (سارە) خان قریوەیەکی کرد و دەنگی لێ بەرز بۆوە و دەستی بە ناستەم دا بەڕوومەتی خۆیدا (وەکو داب و نەریتی ئافرەتان لەکاتی سەرسامیدا).

● (الزمخشري) دەڵێت: (بە ناولەپی دەستی زلەیەکی دا لەخۆی ، وتراوە: بەلێواری پەنجەکانی کێشای بە ناوچاوانی خۆیدا ، وەك کاری کەسێکی سەرسام).[٧٧]

﴿وَقَالَتْ عَجُوزٌ عَقِيمٌ﴾من چۆن کوڕم دەبێت کە پیر و نەزۆکم؟ ﴿قَالُوا كَذَٰلِكِ قَالَ رَبُّكِ إِنَّهُ هُوَ الْحَكِيمُ الْعَلِيمُ﴾ بێگومان ئێمە لەلایەن خواوە هەواڵت پێ دەدەین و خوای گەورە بەتوانایە بەسەر هەموو شتێکدا، و ئەو کارەکان بەڕێوە دەبات و ڕێکی دەخات بە حیکمەت و دانایی خۆی و زانایە بە حاڵی خەڵکی و ئەوەیش کە بۆ ژیانی دونیا و گەڕانەوەیان چاکە.

●مژدەکە جێ بەجێ بوو، و (سارە) خان ئیسحاقی (علیه السلام) بوو، گەشەدەکات و گەورە دەبێت لەو ماڵە پاك و چاکەدا و لەو کەش و هەوا ئیمانی یەداو پاشان ژن دەهێنێت و خوای گەورە یەعقوب (علیه السلام)یان پێ دەبەخشێت، بەو جۆرە ئایەت و نیشانەکانی خوایی دەدرەوشێنەوە، کە بەڵگەن لەسەر گەورەیی قودرەت و فراوانی ڕەحمەت و ڕێزگرتنی لە پێغەمبەران و خۆشەویستانی.

## غیرەتگیری (سارة) سارا خاتوون

کاتێك خوای گەورە ئیسماعیلی بە (هاجرە) خانم بەخشی بە ئیبراهیم (علیه السلام) زۆر شادومان بوو بەو منداڵە کە خوای گەورە لەتەمەنی پیریدا پێی بەخشی بوو. ئەوەی کە چاوەڕوان دەکرا لە هەویەکەی (سارە) خانمەوە ڕویدا، (سارة) خاتوون غیرەتی هاتە جۆش، هەرچەندە خۆیشی ڕێگەی بە ئیبراهیم (علیه السلام) دابوو بۆمارەکردنی، بەڵام غیرەتی هەویە لەگەڵ ژنی دووەم تازەدا دروستبوو، (هاجرة) خاتوون دەیزانی (سارة) خاتوون هێندەی غیرەتی بەهەوێ بوونی جۆشاوە، کاتێك ئیبراهیم بهاتایە بۆ لای شوێن پێیەکانی دەسڕیەوە، بۆ ئەوەی (سارة) خاتوون بە چوونەکەی ئیبراهیم (علیەالسلام)

---

[٧٧] الکشاف /٤/ ٤٠٢.

نەزانێت بۆلای، (سارە) خاتوون داوای کرد لە ئیبراهیم نابێت لەگەڵ (هاجرە) خاتوون پێکەوە بن، ئەبێت (هاجرة) بەرێتە شوێنێك لێوەی دوور بێت، ئیبراهیم (علیه السلام) لەبەر خۆشەویستی بۆ (سارة) بیری ئەکردەوە (هاجرة) و (إسماعیل) لە (سارة) دوور بخاتەوە. با پیاوان بزانن ئەم غیرەتی هەوێ بوونە شتێکە تێکەڵی جەستەی هەموو ژنێك دەبێت، ئەگەر ژنێك ئەم غیرەتەی تیا نەبێت، ئەوا سروشتی ژنانەی ناتەواوە. پیاوانی واهەن ئازاری ژن دەدەن لەسەر دەربڕینی ئەم غیرەتە ژنانەیە. ئەوە هەڵەیە، بەڵکو دەبێت رازییان بکات، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (ئافرەت لە لارترین پەراسوو دروستبووە، ئەگەر بتەوێت ڕاستی بکەیتەوە، ئەشکێت، باشترین چارەسەر ئەوەیە ئامۆژگارییان بە چاکە بکەن..).[٧٨]

[٧٨] -أخرجه مسلم برقم/٢٦٣١

**باسی دووەم:**

**( هاجرە ) خان:**

**هاوسەری ئیبراهیم و دایکی ئیسماعیل ( علیه السلام ).**

پێشتر باسمانکرد کە پاشای میسر (هاجر)ی بەخشی بە (سارة)خان، (سارة)یش (هاجر)ی بەخشی بە ئیبراهیم و ئەویش خواستی و لەتەمەنی گەورەییدا ئیسماعیل (علیه السلام)ی لێ بوو، پاشان خوای گەورە فەرمانی کرد بە ئیبراهیم (علیه السلام) کە بە (هاجر) و (إسماعیل)ەوە کۆچ بکات بۆ (البلد الحرام)، ئەمجا ئەویش لەگەڵ هەردوکیان کۆچی کرد و ڕۆیشتن و لەوێ داینان و جێی هێشتن، کاتێك ئیبراهیم (علیه السلام) ویستی بەجێیان بهێڵێت، (هاجر) پێی وت: ئەی ئیبراهیم لای کێ جێمان دەهێڵیت، ئایا خوا فەرمانی ئەمەی پێکردویت؟ فەرمووی: بەڵێ، (هاجر) وتی: کەواتە لەناو ناچین و نافەوتێین ،پاشان گەڕایەوە، ئەمجا ئیبراهیم (علیه السلام) دەرچوو ڕۆیشت تا گەیشتە پێچێك کە نەدەبینرا، ڕووی کردە (البیت) پاشان بەم کۆمەڵە وشەیە لە خوای گەورە پاڕایەوەو فەرمووی: ﴿رَّبَّنَا إِنِّي أَسْكَنتُ مِن ذُرِّيَّتِي بِوَادٍ غَيْرِ ذِي زَرْعٍ عِندَ بَيْتِكَ الْمُحَرَّمِ رَبَّنَا لِيُقِيمُوا الصَّلَاةَ فَاجْعَلْ أَفْئِدَةً مِّنَ النَّاسِ تَهْوِي إِلَيْهِمْ وَارْزُقْهُم مِّنَ الثَّمَرَاتِ لَعَلَّهُمْ يَشْكُرُونَ﴾ (إبراهیم:٣٧).

واتە: (پەروەردگارا بەڕاستی من هەندێك لە وەچەو خێزانم لە دۆڵێکی وشکی بێ کشتوکاڵدا نیشتەجێ کردووە ،لەپاڵ ماڵە پیرۆزەکەتدا، لەپاڵ (بیت الحرام)دا، پەروەردگارا بۆیە لێرە نیشتەجێم کردن، تا بەچاکی نوێژو خواپەرستی ئەنجام بدەن، جا داواکارم دڵی هەندێك لەو خەڵکە کەمەندکێش بکەیت بۆ لایان و لە ڕزق و ڕۆزی جۆراو جۆر بەهرەمەندیان بکەیت، بۆ ئەوەی سوپاسگوزاری بکەن).

لەم دوعایەدا ئیبراهیم (علیه السلام) ڕووی کردە پەروەردگاری و پاڕایەوە، ئەوەی کە لە ناخیدا بوو ڕونی کردەوەو دەری بڕی.

(إبن عطية) دەڵێت: (ئیبراهیم (علیه السلام) لە مانەوەیان لەو شوێنەدا باسی ئاوی نەکرد، لەگەڵ ئەو حاڵەی هەیانبوو، چونکە دەیزانی کە خوای گەورە ئیسماعیل و دایکی زایە ناکات و نافەوتێن، و بەڕاستی خوای گەورە ئاویشیان بۆ دەنێرێت).[79]

ئیبراهیم ئەو شوێنەی بە ﴿عِندَ بَيْتِكَ الْمُحَرَّمِ﴾ ناو برد، چونکە کەس ناتوانێت دەست درێژی بکاتە سەر، و دەوروبەریشی کراوەتە حەرەمێك بۆ پاراستنی ئەو شوێنە، یان بەردەوام قەدەغە کراوە لە دەسەڵاتی هەموو زۆردار و ستەمکارێك، و پارێزراوە و ڕێزو حورمەتی گەورەیەو سوکایەتی پێکردنی قەدەغەیە[80].

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا وَيَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ اللَّهِ وَالْمَسْجِدِ الْحَرَامِ الَّذِي جَعَلْنَاهُ لِلنَّاسِ سَوَاءً الْعَاكِفُ فِيهِ وَالْبَادِ وَمَن يُرِدْ فِيهِ بِإِلْحَادٍ بِظُلْمٍ نُّذِقْهُ مِنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ﴾ (الحج:٢٥) واتە: (جا ئەوەی بیەوێت بە هۆی یاخیبوون و لادانەوە ستەم بکات، ئەوە سزایەکی بە ئازاری پێ دەچێژین).

ئیبراهیم (علیه السلام) لەناو هەموو پەرستشەکاندا نوێژی باسکرد و تایبەت کرد، ئەوەش لەبەر گەورەیی پلە و پایەکەی کە کۆڵەکە و ڕاگیرکەری دینە، و پایەیەکی بەهێز و دامەزراوە لە بنەماکانی پەرستشدا.

﴿فَاجْعَلْ أَفْئِدَةً مِّنَ النَّاسِ تَهْوِي إِلَيْهِمْ﴾، (إبن عباس) فەرموویەتی: (ئەگەر بیوتایە: (افئدة الناس)ئەوا فارس و ڕۆم و هەموو خەڵکی لە هەموو لایەکەوە لای کۆدەبویەوەو دەورەیان دەدا، بەڵام فەرمووی: ﴿أَفْئِدَةً مِّنَ النَّاسِ﴾ واتە: هەندێك لە خەڵکی کە باوەڕداری چاکەکارن، کە بەندە دنیا نەویستەکانن.[81]

گومانی تیا نییە خوای گەورە وەڵامی دوعاکەی ئیبراهیم (علیه السلام)ی دایەوە ،ئەو شوێنەی کردە شوێنێکی پارێزراو و ئەمین، و بەرو بوم و ناز و نیعمەتی لە هەمولایەکەوە بۆ دەهات پاشان ڕێزداری کرد بەوەی کە لەهەموو جۆرە بەرو بومێکی تیا بوو لە گوندەکانی دەوروبەریدا و کرابە بەپیتترین خاك، کە زۆرترین بەرو بومی

[79] - المحرر الوجيز لإبن عطية /٣/ ٣٤١

[80] – (الكشاف للزمخشري ٢ /٥٥٨)

[81] – (قبس من نور القران الكريم للصابوني ٦/٣٩)

هەبوو، لە هەموو ولآتانی ڕۆژهەلآت و ڕۆژئاواوە ئەو ناوچەیە بەسەیر دەبینراو دەهاتە پێش چاو، و میوەی هەموو وەرزەکانی تیا دەست دەکەوت لە هەموو کاتێکدا).[82]

خوای گەورە لە سوورەتی (إبراهیم)دا -کە ئەمە ماناکەیەتی- فەرمووی: (بەیاد بێنە) کاتێك ئیبراهیم (علیه السلام) نزای کردو وتی:پەروەردگارا باڵی هێمنی و ئاسایش بکێشە بەسەر ئەم شار و وولآتەدا و خۆم و نەوەکانیشم بپارێزە لەوەی کە بتەکان بپەرستن (٣٥). پەروەردگارا بەڕاستی ئەو بتانە زۆر کەسیان گومڕا کردو، زۆر خەڵکیان سەر لێشێواو کرد، جا ئەوەی شوێنی من ەبکەوێت و بەگوێی من بکات، ئەوە بێگومان لە پەیڕەوانی منە ،ئەوەش کە لێم یاخی دەبێت، ئەوە بێگومان تۆ زۆر لێخۆشبو و میهرەبانیت) (إبراهیم ٣٥—٣٦).

ئایەتی ژمارە (٣٧) مان پێشتر مانا کرد.

پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿رَبَّنَا إِنَّكَ تَعْلَمُ مَا نُخْفِي وَمَا نُعْلِنُ وَمَا يَخْفَى عَلَى اللَّهِ مِن شَيْءٍ فِي الْأَرْضِ وَلَا فِي السَّمَاءِ (٣٨) الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي وَهَبَ لِي عَلَى الْكِبَرِ إِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَاقَ إِنَّ رَبِّي لَسَمِيعُ الدُّعَاءِ (٣٩) رَبِّ اجْعَلْنِي مُقِيمَ الصَّلَاةِ وَمِن ذُرِّيَّتِي رَبَّنَا وَتَقَبَّلْ دُعَاءِ (٤٠) رَبَّنَا اغْفِرْ لِي وَلِوَالِدَيَّ وَلِلْمُؤْمِنِينَ يَوْمَ يَقُومُ الْحِسَابُ﴾ (ابراهيم:٣٨-٤١).

واتە: (پەروەردگارا، بەڕاستی تۆ دەزانیت چی دەشارینەوە و چی ئاشکرا دەکەین (لە کار و کردەوەمان) و هیچ شتێك لە زەوی و لە ئاسماندا لە خوای گەورە پەنهان نابێت. (٣٨) سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی کە لە تەمەنی پیریدا ئیسماعیل و ئیسحاقی پێ بەخشیم، بەڕاستی پەروەردگارم بیسەری دوعا و نزایە.(٣٩) پەروەردگارا، خۆم و نەوەکانم بگێڕە لەو کەسانەی کە ئەنجامدەری نوێژ بین بەچاکی، پەروەردگارا، دوعاو نزام گیرا بکە. (٤٠) پەروەردگارا، لەخۆم و دایك و باوکم و ئیمانداران خۆش ببە، لەو ڕۆژەدا کە لێپرسینەوە بەرپا دەبێت.).

---

[82]-(الکشاف للزمخشري، ٥٥٩/٢ —٥٦٠)

## دەبێت چاو لە (هاجرە) خاتوون بکەین

برایان و خوشکان چی فێربوون لە چیرۆکی (ماجرة)ەوە؟ بۆچی لە بەجێهێنانی حەج وعمرەدا چاو لە هاجەرە بکەین لە هاتوچۆکردنی نێوان (صفا و مروة)دا؟ کەس بیری لەمە کردۆتەوە؟ بۆچی (صفا ومروة) ڕوکنێکی حەج وعەمرەن؟ لەبەر سێ شت چاو لە هاجرە خاتوون دەکەین:

**یەکەم:** چونکە هاجەرە نەیئەزانی چی ئەکات و بۆچی ئەیکات و بۆچی هاتۆتە ئەو شوێنە، تەنها خۆی بەخوای گەورە تەسلیم کرد، مادەم خوای گەورە فەرمانی پێداوە ملکەچە و ناپرسێت بۆچی؟ من و تۆیش کە بۆ حەج و عەمرە ئەچینە ئەو شوێنەو چی ئەنجام ئەدەین بۆتەسلیم بوون بێت بە فەرمانی خوا بیر لە هاجەرە خاتوون دەکەینەوە، کە ئیبراهیم (علیە السلام) بە تەنها لەگەڵ کۆرپەکەی بەجێی هێڵان و ئیبراهیم وەڵامی نەدایەوە بۆ بەجێمان ئەهێڵیت؟ ئینجا هاجەرە فەرمووی: خوا زایەمان ناکات. نازانین بۆچی (صفا ومروة) ئەکەین لەوە زیاتر تەسلیم بونە بەخوا، مەبەستی سەرەکی هەموو پەرستنێکی خوا، خۆ تەسلیم کردنەبەخوا.

**دووەم:** ئەم شارستانێتییە قوڵەی موسڵمانان لەچی و لە کوێوە سەری هەڵداوە؟ ئەگەڕێتەوە بۆ هاجەرە و ئیبراهیم و ئیسماعیل، شارستانێتی پێغەمبەرانە نەك ڕۆژئاوا. ئێمە وەك موسڵمانان نابێت شوێنکەوتەی ڕۆژئاوا بین لە خواردن و خواردنەوە و پۆشاك و گۆرانی و مۆسیقای بێگانە. بۆچی خوای گەورە داوامان لێ دەکات شوێنکەوتەی هاجەرە خاتوون بین؟ چونکەهاجەرە دایکە گەورەمانە و ئیبراهیم باوکە گەورەمانە.

**سێ یەم:** شوێنکەوتن و چاولێکردنمان بۆدایکە هاجەرە لە هاتوچۆی نێوان (صفا ومروة) حەوت جار لە چەند ساتێکدا و بەپێی پەتی و سەری ڕوت و بەرگێکی چڵکنەوە (ئافرەتان دەبێت سەریان داپۆشراوبێت). ﴿ولِلّهِ المَثَلُ الأعلى﴾ وەك چۆن کوڕێك باوکی توڕە کردبێت، بچێتە بەردەرگاکەی باوکی چەند جارێك داوای لێ بکات بابە گیان هەڵە بووم دەرگام لێ بکەرەوە و ئەم جارەیش سۆزی باوکایەتیم پێ ڕەوا ببینە، ئەم بەندەیش هەر چەندە دەگاتە سەر تەپۆڵکەی (صفا ومروة) ئەدات لەدەرگای خوای بو سۆز وبەزەیی و دەڵێت: پەروەردگارم بەندەیەکی یاخی و تاوانکارم دان بەتاوانی خۆمدا دەنێم بۆ خاتری

خوایەتیت دەرگام لێ بکەرەوە و سۆز و بەزەییت داباریێنە بەسەرمدا و لە تاوانەکانم ببورە.

## بە هەر نیازێك ئاوی زەمزەم بخۆیتەوە بۆی دەبێت

وەرن با بچینەسەر باسی ئاوی زەمزەم، زەمزەم ئاوی ئەو بیرەیە کە خوای گەورە خستییە ڕوو بە باڵی فریشتەی خۆی جوبرەئیل لای قاچی ئیسماعیلی شیرە خۆرەدا. زەمزەم گرنگی زۆر تیادایە لەوانە تایبەت دوو گرنگی:

یەکەم: نیشانەیەکە لە نیشانەکانی خوا، بیر بکەرەوە چەند ساڵە ئاوی زەمزەم پەیدا بووە؟ چەندە ئاوی لێ هەڵگۆزراوە بۆ خواردنەوە، بۆ خۆشۆردن، بۆ بردنی بۆ هەموو وڵاتان، ئایا بۆچی تەواو نەبوو؟ ئایا ئاوێك بەباڵی فریشتەیەکی وەکو جوبرەئیل پەیدا بوبێت، لای قاچی منداڵێکدا کە ئەبێتە پێغەمبەری خوا و باوکی پێغەمبەری ئاخر زەمان، سەرنج بدەن شارستانێتی ئێمەی موسڵمان هی پێغەمبەرانە.

دووەم: ئامۆژگاری موسڵمانانە کە لە ئاوی زەمزەم دەخۆنەوە. پێغەمبەر ﷺ بینی (عبدالرحمن ی کوڕی عوف) ئاوی زەمزەمی دەخواردەوە، ئەویش فەرمووی: ئەی چۆن و چەندە بخۆمەوە؟ فەرمووی: ئەوەندە بخۆرەوە تاسکت هەڵئەئاوسێت، فەرمووی: ئاوی زەمزەم بۆ موسڵمانان پارێزەرە، واتە: لە زیادە خواردنەوەی کەس توشی ناڕەحەتی نابێت، تاقی بکەرەوە ئەگەر تینویشت نەبێت چەند پەرداخی لێ بخۆیتەوەسەغڵەت و ناڕەحەت نابیت. بۆیە ئەبینین زۆرکەس بەبێ ئەوەی تینووی ببێت چەند پەرداخی لێ ئەخواتەوە. پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (ئاوی زەمزەم بەنیازی چی بخورێتەوە بە یارمەتی خوا نیازەکەی سەرئەگرێت.)[٨٣].

دەی تۆیش بە نیازی دڵنیایی یەوە لەو ئاوە بخۆرەوە، بەڵام بەمەرجی ئەوە لەو بەڵێنەی کە لە فەرموودەکەدا هەیە دڵنیایی بێت. پێشەوا(الترمذي)کە یەکێکە لە پێشەوایانی فەرموودەکە، ئەفەرمووێت:شەوێك لە حەرەمدا بووم، زۆر قەرەباڵغ بوو، (مین) زۆری بۆهێنام، ڕێگەی دەرچوونم نەبوو بەو هۆیەوە تووشی ئازاری زۆر هاتم، لەدڵی خۆمدا وتم: سوێند بەخوا، ئەم ئازارەی من بە هیچ لاناچێت، بە خواردنەوەی ئاوی زەمزەم

[٨٣] - ذكره العجلوني في (كشف الخفا) ١/٥٣٠/

نەبێت، لە ئاوی زەمزەمم بەو نیازە خواردمەوە، زۆر زۆرم لێ خواردەوە تا سك هەڵئاوسا، سوێند بە خوا ئازارم نەما.

**باسی سێیەم:**
**سود و وانە گرنگەکانی چیرۆکەکە:**

**یەکەم: سەر بڕاوەکە (ئیسماعیل)(علیه السلام)بوو:**

**ڕاست ئەوە بووە کە سەربڕاوەکە (ئیسماعیل) (علیه السلام) بووە نەك (ئیسحاق)، وەك هەندێك لە خاوەن کتێبەکان لێکیان داوەتەوە.**
**بەڵگەکان لەسەر ئەوە زۆرن و لێرەدا باسیان دەکەین:**

**یەکەم: لە قورئانی پیرۆزدا:**

**خوای گەورە لە سوورەتی (الصافات)دا فەرموویەتی:** ﴿وَقَالَ إِنِّي ذَاهِبٌ إِلَى رَبِّي سَيَهْدِينِ
(٩٩)رَبِّ هَبْ لِي مِنَ الصَّالِحِينَ (١٠٠)فَبَشَّرْنَاهُ بِغُلَامٍ حَلِيمٍ (١٠١)فَلَمَّا بَلَغَ مَعَهُ السَّعْيَ قَالَ يَا بُنَيَّ إِنِّي أَرَى فِي
الْمَنَامِ أَنِّي أَذْبَحُكَ فَانظُرْ مَاذَا تَرَى قَالَ يَا أَبَتِ افْعَلْ مَا تُؤْمَرُ سَتَجِدُنِي إِن شَاءَ اللَّهُ مِنَ الصَّابِرِينَ (١٠٢)فَلَمَّا أَسْلَمَا
وَتَلَّهُ لِلْجَبِينِ (١٠٣)وَنَادَيْنَاهُ أَن يَا إِبْرَاهِيمُ (١٠٤)قَدْ صَدَّقْتَ الرُّؤْيَا إِنَّا كَذَلِكَ نَجْزِي الْمُحْسِنِينَ (١٠٥)إِنَّ هَذَا
لَهُوَ الْبَلَاءُ الْمُبِينُ (١٠٦)وَفَدَيْنَاهُ بِذِبْحٍ عَظِيمٍ (١٠٧)وَتَرَكْنَا عَلَيْهِ فِي الْآخِرِينَ (١٠٨)سَلَامٌ عَلَى إِبْرَاهِيمَ
١٠٩)كَذَلِكَ نَجْزِي الْمُحْسِنِينَ (١١٠)إِنَّهُ مِنْ عِبَادِنَا الْمُؤْمِنِينَ (١١١)وَبَشَّرْنَاهُ بِإِسْحَاقَ نَبِيًّا مِّنَ
الصَّالِحِينَ﴾(الصافات:٩٩-١١٢).

*** لەم ئایەتانەدا ئەوە هاتووە کە باسی ئەو کوڕە ژیر وخۆڕاگرەی کردووە کە مژدەی درابوو بە ئیبراهیم (علیه السلام)کە ئیسماعیل(علیه السلام)بوو.**

*** (ابو السعود) دەربارەی ئایەتی:** ﴿رَبِّ هَبْ لِي مِنَ الصَّالِحِينَ (١٠٠)فَبَشَّرْنَاهُ بِغُلَامٍ حَلِيمٍ﴾(الصافات:١٠٠-١٠١). **دەڵێت: (لەم ئایەتانەدا سێ مژدە باسکراوە: مژدەیەك کە**

کوڕە، مژدەیەك کە دەگاتە تەمەنی پێ گەیشتن، مژدەیەك کە زۆر ئارم گرە، چ ئارام گرتنێك لەوە گەورەترە کە باوك پێی بڵێت سەرت دەبڕم ﴿قَالَ يَا بُنَيَّ إِنِّي أَرَى فِي الْمَنَامِ أَنِّي أَذْبَحُكَ فَانظُرْ مَاذَا تَرَى﴾؟

واتە: (ئەی کوڕی شیرینم بێگومان من دەمبینی لە خەونمدا کە تۆ سەردەبڕم،جا تۆش بڕوانە و بزانە چۆنی دەبینیت؟) ئیسماعیل (علیه السلام) بە ئارم گرتن و لەسەر خۆییەوە وەڵامی باوکی دایەوە و فەرمووی: ﴿قَالَ يَا أَبَتِ افْعَلْ مَا تُؤْمَرُ سَتَجِدُنِي إِن شَاءَ اللَّهُ مِنَ الصَّابِرِينَ﴾.

واتە: (وتی: ئەی باوکی بەڕێزوو خۆشەویستم ئەوەی فەرمانت پێ کراوە جێبەجێی بکە، دەبینیت ﴿إِن شَاءَ اللَّهُ﴾ من لە ئارامگران دەبم.).

*لەسەر گوێڕایەڵی فەرمانی خوا ئارامی گرت ونەفسی پاکی خۆی دایە دەست فەرمانەکە، بەڕاستی بەوەفابوو لەگەڵ ئەو بەڵێنەدا کەدابوی، خوای گەورە لە قورئاندا بە (ئارمگر) باسی کرد،هەروەها بە پەیمان بردنە سەر باسی کردووە: ﴿وَإِسْمَاعِيلَ وَإِدْرِيسَ وَذَا الْكِفْلِ كُلٌّ مِّنَ الصَّابِرِينَ﴾(الأنبياء:٨٥).

لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿وَاذْكُرْ فِي الْكِتَابِ إِسْمَاعِيلَ إِنَّهُ كَانَ صَادِقَ الْوَعْدِ وَكَانَ رَسُولًا نَّبِيًّا﴾(مريم:٥٤).

*پاش ئەوەی ئایەتەکانی سوورەتی (الصافات) دەربارەی ئیسماعیل دووان، کە سەربڕاوەکەیە، پاش ئەوە باسی مژدە دانی بە ئیسحاق کرد، ئەوەی دڵنیا کردەوە کە سەربڕاوەکە ئیسماعیل بووە، نەك ئیسحاق، چونکە باسی مژدە دانەکەی ئیسحاقی پاش باسی سەربڕاوەکە کرد.

*وەك ئەوەی تاقی کردنەوەی سەربڕین لەسەر کوڕێکی (بچوك و تەنها) گەورە ترو قورسترە لەسەر نەفس لەتاقی کردنەوە بە کوڕی دووەم.

چونکە ئیبراهیم (علیه السلام) کاتێك لەو تەمەنە گەورەیەدا کوڕی پێ بەخشرا، پەیوەستی کرد بەنەفسی خۆیەوە، بویە ڕوناکی و بینایی چاوەکانی، بێگومان تاقی کردنەوە بەسەربڕینی ئەو کوڕە زۆر قورس و گەورەیە، لەکاتێکدا کە بێگومان ئەو وەڵامی داوەکەی خوای گەورەی دایەوە، دەستی کرد بە جێ بەجێ کردنی، بەڵام خوای

گەورە کوڕەکەی لە سەربڕین و قوربانی بۆ ڕزگارکرد و، لەباتی ئەو بەرانێکی گەورەی بۆنارد...پاش ئەوەش بە بەخشینی ئیسحاق (علیه السلام) ڕێزداری کرد.

*هەروەها لەو بەڵگانەی کە دەری بڕیوە و بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە سەربڕاوەکە ئیسماعیل بوو:

ئایەتێکە لە سوورەتی (هود)دا، لە چیرۆکی مژدەدان بە لەدایک بوونی ئیسحاق: ﴿وَامْرَأَتُهُ قَائِمَةٌ فَضَحِكَتْ فَبَشَّرْنَاهَا بِإِسْحَاقَ وَمِنْ وَرَاءِ إِسْحَاقَ يَعْقُوبَ﴾(هود:٧١).

ئیبراهیم (علیه السلام) و (سارة) خانی هاوسەری لە فریشتە بەڕێزکانەوە زانیان کە لە داهاتوودا ئیسحاقیان دەبێت و پاشان گەورە دەبێت و دەژی و ژن دێنێت و کوڕێکی دەبێت کە (یعقوب)ە (علیه السلام) ئەگەر فەرمانەکە بەو جۆرەبوو، و ئیبراهیم زانی کە کوڕەکەی دەژی ئیتر چۆن فەرمانی پێ دەدرێت بە سەربڕین.

## دووەم: بەڵگە لە فەرمووده و سوننەتی پێغەمبەردا ﷺ کە سەربڕاوەکە (ئیسماعیل)ە:

ئیمامی (أحمد) لە (مسند)ەکەیدا و (أبو داود) لە (السنن)ە کەیدا لە (صفیة‌ی کچی شیبة)ەوە گێڕاویانەتەوە دەڵێن: ئافرەتێك لە (بني سليم) هەواڵیان پێداین کە هەموو خەڵکی لای ئێمە منداڵیان بووە، ئینجا وتی: پێغەمبەر ﷺ ناردی بە شوێن (عثمانی کوڕی طلحة)دا ئینجا جارێك وتی: من پرسیارم کرد لە عثمان: پێغەمبەری خوا ﷺ بۆچی بانگی کردیت؟ فەرمووی: پێغەمبەر ﷺ پێی وتم: (بەڕاستی من دوو شاخی بەرانم بینی کاتێك چومە ناو (بیت)ەوە، لە بیرم چوییەوە کە فەرمانت پێ بکەم دایان پۆشیت تا خەڵکی نەیان بینن، جا بچۆ دایان پۆشە، چونکە بەڕاستی ناگونجێت لەناو (بیت)دا شتێك هەبێت، نوێژ خوێنان سەرقاڵ بکات).[٨٤]

(إبن کثیر) دەڵێت: (سفیان وتی: بەردەوام هەردوو شاخی بەرانەکە بە (بیت)دا هەڵواسرابوون، هەتا ئەو کاتەی (بیت)سوتا، ئەوانیش سوتان).

---

[٨٤]- رواه (الأمام احمد) في مسنده، و (أبو داود) في السنن.

هەروەها لە (إبن عباس) گێردراوەتەوە: کە سەری بەرانەکە بەردەوام لای شوێنی ئاوەڕۆکەی (کعبە)ەوە هەڵواسرابوو.ئەمە بەتەنها بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە سەربڕاوەکە ئیسماعیلە، چونکە ئەو لە مککە نیشتەجێ بوو، بەڵام بۆ ئیسحاق نازانین کە لەکاتی بچوکیدا، چوەتە ئەوێ یان نا، خوا زاناترە.[٨٥]

-(ابن قیم) دەڵێت: (...گومانی تیا نییە کە سەربڕاوەکە لە مەککەدا بووە، لەبەرئەوە کراوەتە شوێنی قوربانی کردن لەکاتی سەربڕین و شوێنی نزیکبونەوە لەخوا، هەروەك چۆن کراوە بە شوێنی ڕاکردنی نێوان (صفا) و (مروە) و ڕەجم کردنی شەیتان، وەك یادەوەریەك بۆ ئیسماعیل و دایکی، و بەرز ڕاگرتنی زیکر و یادی خوا و زانراوە کە ئیسماعیل و دایکی ئەو دوو کەسە بوون کە لە مەککەدا بوون، ئیسحاقیان لەگەڵدا نەبوو، لەمەوە شوێنی سەربڕینەکە و کاتەکەی پەیوەندی دارە بە (بیت الحرام)ەوە،کە ئیبراهیم و ئیسماعیل (علیهما السلام) هاوبەش بوون لە دروستکردنیدا، و سەربڕینی قوربانیش لە مەککە دەبێتە نیشانەی تەواو بوونی حەجەکە، کە لەسەر دەستی ئیبراهیم (علیه السلام) تەواو بوو لەگەڵ ئیسماعیلی کوڕی، لەڕوی کات و شوێنیشەوە، ئەگەر سەربڕینەکە لە شام بوایە -وەك خاوەن کتێبەکان لێکیان داوەتەوە - ئەوەی لەوانی وەرگرتبێت وتویانە لە شام بووە نەك مەککە.).[٨٦]

*هەر خۆی دەڵێت: سەربڕاوەکە ئیسماعیل بووە بەپێی قسە و بۆچونی ڕاست و تەواو لای زانایانی هاوەڵان و شوێنکەوتوان و دوای ئەوانیش، ئەمە بۆچونێکی بەناوبانگە، لای عەرەب پێش هاتنی پێغەمبەرﷺ بەڕێگای گێرانەوەی نەوە لەدوای نەوە بەشێوەی ڕاست هاتووە.

## دووەم: کۆمەڵێك وانەی گرنگ لە چیرۆکەکەدا:

### ڕێزگرتن لە میوان:

*ڕێزگرتن لە میوان:لە ئەخلاق و ڕەوشتە بەرزوو پیرۆزەکانە، کە ئیسلام هانی مرۆڤی لەسەرداون و بەپەسەند و جوان باسی کردوە، ڕێزگرتنی میوان لە سیفەتی پێغەمبەران

---

٨٥- قصص الأنبیاء لأبن کثیر ص /.١٥٩

٨٦- (زاد المعاد في هدي خیر العباد للأمام إبن قیم /١٦/١).

**و پیاوچاکانە، بەڕاستی ئیبراهیم (علیه السلام) جوانترین و ناوازە ترین نمونەی لە ڕێزگرتنی میواندا هێنایەوە و پێشکەشی کرد، بەوە گەیشتە ئەوپەڕی پلەی ڕێزوو بەخشندەیی.**

*** پێویستە موسوڵمان بەو ئەخلاق و ڕەوشە بەڕێزانە خۆی برازێنێتەوەو پابەند بێت بەو ڕێنمایی و بنەما بەهێز و پتەوەوە، کە خەیرێکی گشتی تیایە، خوای گەورە لە وەسفی چاکەکاراندا دەفەرموێت:** ﴿وَيُطْعِمُونَ الطَّعَامَ عَلَى حُبِّهِ مِسْكِينًا وَيَتِيمًا وَأَسِيرًا (٨) إِنَّمَا نُطْعِمُكُمْ لِوَجْهِ اللَّهِ لَا نُرِيدُ مِنكُمْ جَزَاءً وَلَا شُكُورًا (٩) إِنَّا نَخَافُ مِن رَّبِّنَا يَوْمًا عَبُوسًا قَمْطَرِيرًا (١٠) فَوَقَاهُمُ اللَّهُ شَرَّ ذَٰلِكَ الْيَوْمِ وَلَقَّاهُمْ نَضْرَةً وَسُرُورًا (١١) وَجَزَاهُم بِمَا صَبَرُوا جَنَّةً وَحَرِيرًا﴾(الإنسان:٨-١٢).

**واتە: (هەروەها نان و خۆراك دەبەخشن، ئەگەر چی خۆشەویستیش بێت لایان، بە هەژار و هەتیوو دیلەکان.(٨) دەڵێن: بێگومان ئێمە ئەم خۆراکەتان هەر لەبەر خواو بۆ بەدەستهێنانی ڕەزامەندی ئەو پێدەبەخشین، نە پاداشتمان لێتان دەوێت نە سوپاس.(٩) هەروەها دەڵێن: ئەم کارە بۆیە دەکەین چونکە لە ڕۆژێکی تاڵ و گرژو ڕەش و تاریك دەترسین، کە پەروەردگارمان پێشی دەهێنێت.(١٠) جا خوای گەورەش لە شەڕو ناخۆشی و نەهامەتی ئەو ڕۆژە پاراستنی و ڕووی گەش و شادمانی پێبەخشین.(١١) لە پاداشتی خۆگری و ئارامگریاندا بەهەشت و ئاوریشمی پێبەخشین.)**

**لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت:** ﴿لَن تَنَالُوا الْبِرَّ حَتَّىٰ تُنفِقُوا مِمَّا تُحِبُّونَ وَمَا تُنفِقُوا مِن شَيْءٍ فَإِنَّ اللَّهَ بِهِ عَلِيمٌ﴾(ال عمران:٩٢).

**واتە: (ئێوە هەرگیز ناگەنە پلەی چاکیی و چاکەکاری هەتا لەو شتانەی کە خۆشتان دەوێت نەبەخشن، هەر شتێکیش ببەخشن ئەوە خوا ئاگاو زانایە پێی (لێی ون نابێت و بێ پاداشت نابێت).).**

**خوای گەورە لە باسی پشتیوانەکاندا -کە ئەمە ماناکەیەتی -دەفەرموێت: (ئەوانەی کە پێشتر ماڵ و شوێنی خۆیان ئامادە کرد بۆ پێشوازیی لە کۆچبەران و دڵ و دەروونی خۆیان ڕازاندەوە بەئیمان، ئەوانەشیان خۆش دەوێت کە کۆچیان کردووە بۆ لایان و لە دڵ و دەرونیاندا جێی هیچ جۆرە حەسوودی و بەخیلیەك نابێتەوە (لەسەر ئەوەی کە بەشی کۆچبەران دراوە و بەشی ئەوان نەدراوە)، حەز بە بەخشینی دەستکەوتەکان بەوان دەکەن، فەزڵی ئەوان دەدەن بەسەر خۆیاندا هەرچەندە هەژارو نەداریشن، جا**

ئەوەی خۆی لە نەفسی ڕەزیلی بپارێزێت و زاڵ بێت بەسەریدا، ئا ئەوانە هەر سەرفرازن.).

(ابو هریرە) دەڵێت: پیاوێك هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ عەرزی کرد: برسیەتی ناڕەحەتی کردووم، پێغەمبەر ﷺ هەواڵی نارد بۆلای یەکێك لە خێزانەکانی، وتی: سوێندبێت بەو کەسەی تۆی بە حەق ڕەوانە کردووە جگە لە ئاو هیچی ترم لانییە پاشان ناردی بۆلای یەکێکی تریان ئەویش هەمان وتەی دووبارە کردەوە، هەتا هەر هەموویان، هەر ئەمایان ووت: نەخێر سوێندبێت بەو کەسەی تۆی بەحەق ڕەوانە کردووە جگە لە ئاو هیچی ترم لا نیە، ئینجا فەرمووی: (ڕەحمەتی خوا لەو کەسە بێت ئەمشەو میوانداری ئەم پیاوە دەکات) پیاوێك لە یارمەتیدەران هەستاو وتی:من، ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، پیاوەکەی بردەوە ماڵی خۆیی و بە خێزانەکەی وت: ئایە شتێکت لا هەیە؟ وتی: نەخێر جگە لە خۆراکی منداڵە ووردەکان، وتی:خەریکیان بکە بە شتێکەوە، هەر کە میوانەکەمان هاتە ژوورەوە، چراکە زۆر کز بکە، وا دەربخە کە ئێمە خەریکی خواردنین، هەر کە ئەو کەوتە خواردن هەستە و چراکە بکوژێنەرەوە، وتی: خۆیان دانیشتن و میوانەکە نانی خوارد، کەڕۆژ بویەوە هات بۆلای پێغەمبەر ﷺ ئەویش فەرمووی: (خوای گەورە ئەو کارەی پەسەند کردن و ڕازی بوو لە کردەوەی ئەمشەوتان).[٨٧]

(نمونەی ترمان لە فەرموودە دا زۆرن، بەڵام لێرەدا ئەوەندە بەسە).

## سێ یەم: شێوەی ئافرەت لەم چیرۆکەدا

*(سارة) خان نمونەیەکی جوان لە ئافرەتانی باوەڕ دار بە پەروەردگاری، متمانەی بە بەڵێنەکانی خوا هەبوو، و بە بڕیارەکانی ڕازی بوو، هەروەها نمونەیەکی بەرزوو ناوازەو پاك بوو لە ئافرەتانی پاك وپاکداوێن و بەڕێزو بەخشندە، چاکە کارو گوێڕایەڵ بوو بۆ مێردەکەی، چاکە کاربوو لەگەڵی، ئەو دەیزانی کە ڕێزوو هەیبەتی پیاوەکەی چەند بوو.هەرچی لە توانایدابوو دەیکردوو بەخەرجی دەدا لە پێناوی ڕێگای بەختەوەری و ڕەزامەندیدا.نمونەیەك بوو لە ئافرەتانی باوەڕدار، کە دۆستانی خوای خۆش دەویست و

---

٨٧- رواه بخاري و مسلم.

ڕقی لە دوژمنانی خوابوو، خۆشحاڵ و دڵخۆش دەبوو بەڕزگاربوونی باوەڕداران، و لەناو چوونی کافران و لەسنور دەرچون ولەخوا یاخی بوان.

لەمەدا وانەیەکی گرنگ بۆ ئافرەتانی موسوڵمان هەیە، کەدەبێت پەیوەندی توندو پتەویان بە بانگەوازی خواوە هەبێت.وە یەکێك بن لە سەربازەکانی، و گرنگی بدەن بە کار و باری موسوڵمانان و هەست بە حاڵ و گوزەرانیان بکەن.

(نعمانی کوڕی بەشیر) (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (نمونەی ئیمانداران لە خۆشەویستی بۆ یەکتر و هاوسۆزی وبەزەیی یەکدا وەك یەك جەستە وان ئەگەر ئەندامێك ئازارێکی هەبوو، ئەوا دەناڵێنێ لەتاو بێ خەوی و گەرمەتا).[88]

*خاتو (هاجر) خانیش (خوا لێی ڕازی بێت) نمونەیەکی جوان و پاك و ناوازە بوو لەو ئافرەتە باوەڕدارانەی کە متمانەیان بە بەڵێنی خوایی بەهێز بوو، وڕازی بوو بە بڕیاری خوا، ئافرەتێك بوو گوێڕایەڵی فەرمانی مێردەکەی دەکردوو لەسەر گوێڕایەڵی فەرمانەکانی خوا یارمەتی دەدا، ئەمەش بەجوانی ڕەنگی دایەوە، کاتێك لەگەڵ ئیبراهیم (علیه السلام) ئیسماعیل پێکەوە ڕۆیشتن بۆ (البلد الحرام) و گەڕانەوەی ئیبراهیم بۆ شام و جێهێشتنی ئەوان لە مەککە، ئەو کاتە شوێنێکی ووشك بوو بێ سەوزایی و ئاو بوو، (هاجر) ئەم چەند ووشە ناسك و نەرم و جوانەی پێ وت: (تۆ ئێمە بۆ کێ و لای کێ جێ دەهێڵیت ئەی ئیبراهیم، ئایا خوای گەورە فەرمانی ئەم کارەی پێ کردوویت؟ فەرمووی: بەڵێ.ئینجا (هاجر) ووتی: کەواتە خوای گەورە هەرگیز زایەمان ناکات).

هەروەها نمونەیەکی جوان بوو لە هاوسەرانی چاکە کار، کە بەڕاستی نمونەیەکی جوان و ناوەزە بوو لە دایکی بەڕەحم و بەسۆز و بەزەیی ئەمەش زۆر بەجوانی و ڕونی دەرکەوت کاتێك کە ئیبراهیم (علیه السلام) جێی هێشت کە لەگەڵ ئیسماعیلدا بوو، کە منداڵێکی بچوکی شیرە خۆرە بوو، لەشوێنێکی ووشك وبێ سەوزیدا جێی هێشتن، کە زۆریان تینو بوو، ئیسماعیل زۆر تینوی بوو هەتا دەست و قاچی بە زەوییەکەدا دەکێشا، ئینجا (هاجر)یش لەتاو ناڕەحەتی دەرچوو دەگەڕاو چاوی دەگێڕا، دەستی کرد بە ڕاکردن لەنێوان هەردوو بەرزایی (صافا) و (مروة)دا، بەدوای ئاودا دەگەڕا، هەتا ڕاکردنەکە ماندوو هیلاکی کردو کاری خۆی سپارد بەخوا، و هەستی بە کۆمەکی خوایی کرد، ئینجا ئاو لە سەرچاوەی زەمزەم بەقەدەر و ویستی خوای گەورە هاتە دەرەوە، زۆر دڵخۆش بوو بە فەزڵ و دەرو کردنەوی خوا، و دەم و چاوی بە بەزەیی خوای گەورە

[88]-رواه مسلم في (كتاب البر والصلة).

گەشایەوە، ئینجا لەو ئاوە ئاویدا بە کوڕە بچوکەکەی تێر ئاو بوو، بوژایەوە هەروەها خۆیشی لێی خواردەوە پاش ئەوەی کە لە حاڵی منداڵە بچوکەکە دڵنیا بوو.

تا ئێستاش بەردەوام حاجیان و زیارەت کەرانی ماڵی خوا لە ئاوی زەمزەم دەخۆنەوە – کە سەرچاوەیەکی پاك و ڕەوان و خاوێن وبێ خەوشە– و بەدەوری (صفا) و (مروە) و لە نێوانیدا ڕاکردن دەکەن، و یادی ئیبراهیم دەکەنەوە وهەمیشە ئەو دیمەنە ڕونەیان دێتەوە پێش چاو، بەڕاستی ئەوە چیرۆکی سەرسوڕ هێنەرە کە بەڵگەیە لەسەر قودرەت و دەسەڵاتی خوا و کە ڕەحم و بەزەیی بێ سنوری هەروەها بە نمونەیەکی ڕون و جوانیش دەژمێردرێت و نمویەکی جوانیشە بۆ ئەو سۆزوو عەتیفە هەژێنەرە دایکایەتییە، کە سەرچاوەیەکی خاوێن و بێ خەوشە، دایك سەرچاوە سۆزوو خۆشەویستیە و پەنای ئارامی و مێرگی بەخشینە.

## بەشی چوارەم
## ئافرەت لە چیرۆکی ( لوط ) پێغەمبەردا( علیه السلام )
## ژنەکەی لوط ( علیه السلام ) و کچەکانی

● **پێشەکی:**

**لوط (علیه السلام) یەکێکە لە پێغەمبەران، کە خوای گەورە ناردونی بۆ هیدایەت دانی خەڵکی و بەرەو چاکە بردنیان، لەسەردەمی ئیبراهیم (علیه السلام)دا ژیاوە، زۆرێك لە زانایانی تەفسیر و مێژوو نوسان وای بۆچوون کە برازای ئیبراهیم (علیه السلام)بووە بێگومان لوط (علیه السلام)باوەڕی بە بانگەوازەکەی ئیبراهیم (علیه السلام) هێنا و لە گەڵیشیدا لە (بابل)ەوە کۆچی کرد بۆ (فلسطین).[89]**

**خوای گەورە فەرمویەتی:** ﴿فَآمَنَ لَهُ لُوطٌ وَقَالَ إِنِّي مُهَاجِرٌ إِلَى رَبِّي إِنَّهُ هُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ﴾(العنكبوت:٢٦).

**لوط (علیه السلام) لەگەڵ ئیبراهیمدا (علیه السلام) کۆچیان کرد بۆ شام، کە خاکێکی موبارەك وپیرۆزوو بەفەڕ بوو.**

**(الزمخشري) دەڵێت: (لە عێرق دەرچوون و ڕزگاریان بوو چون بۆ شام، کە بەرەکەتی شام دەگات بە هەموو جیهان: زۆربەی پێغەمبەران لەوێ نێردراون و بە هەموو جیهاندا بلاو بوەتەوە، شەریعەت و شوێنەوارە دینیەکانیان کە بەرەکەت و ڕاستی بووە، وتراوە: خوای گەورە بەرەکەتی تێخستووە بەزۆری ئاو و ڕوەك و بەرو بومی بەپیتی خاکەکەی و ژیانی خۆش بۆ هەژاران و دەوڵەمەندان و، گێڕراوەتەوە کە ئیبراهیم (علیه السلام) چویە (فلسطین) و لوط (علیه السلام) چویە (المؤتفكة) کە نێوانیان بەپێ ڕۆیشتن، شەو ڕۆژێك دەبێت).[90]**

**لوط (علیه السلام) لە هاوەڵی (ئیبراهیم)ی مامیدا مایەوە، هەتا لە شاری (سدوم) لە (اردن) جێگیر بوو، خوای گەورە بە پێغەمبەرایەتی ناردی بۆ خەڵکی ئەو شارە.**

---

[89]- (جامع البيان للطبري)٧/١٥٩.

[90]- (الكشاف /٣/١٢٦).

**باسی یەکەم:**

**بانگەوازی لوط پێغەمبەر (علیه السلام):**

**خوای گەورە لوط پێغەمبەر (علیه السلام)ی بۆ قەومەکەی نارد، تا بانگەوازیان بکات بۆ سەر عەقیدە و بیرو باوەڕی ڕاست، کە یەکتاپەرستی و یەك خواناسی بوو، و ئەو شتەش کە پەیوەندی داربوون لە شەریعەت و حوکمەکان و ئەخلاق و بەها بالاّو بەرزوو بەرێزەکان.**

**خوای گەورە لە سوورەتی (الشعراء)دا دەفەرموێت:** ﴿كَذَّبَتْ قَوْمُ لُوطٍ الْمُرْسَلِينَ (١٦٠) إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ لُوطٌ أَلَا تَتَّقُونَ (١٦١) إِنِّي لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ (١٦٢) فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ (١٦٣) وَمَا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَى رَبِّ الْعَالَمِينَ (١٦٤) أَتَأْتُونَ الذُّكْرَانَ مِنَ الْعَالَمِينَ (١٦٥) وَتَذَرُونَ مَا خَلَقَ لَكُمْ رَبُّكُمْ مِنْ أَزْوَاجِكُمْ بَلْ أَنْتُمْ قَوْمٌ عَادُونَ (١٦٦)﴾ (الشعراء: ١٦٠ – ١٦٦).

***لوط (علیه السلام) هانی دان بۆ تەقواو لەخوا ترسان، کە کۆکراوەی هەموو خەیرو چاکەکانە، بۆی ڕونکردنەوە کە ئەو لەلایەن خواوە نێردراوە، لە بانگەوازەکەیدا کەسێکی ئەمین و دەست پاك وڕاستگۆیە و فێڵ ناکات و زیادە ڕەوی و کەم ڕەویش ناکات لەوەدا کە پێی سپێردراوە بیگەیەنێت، دڵنیایە لە قسەکان، و دڵنیایە لە کارەکانی و نهێنی و ئاشکراکان دەپارێزێت:** ﴿إِنِّي لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ (١٦٢) فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ﴾ (الشعراء: ١٦٢ – ١٦٣).

**واتە: (کاتێك کە من پێغەمبەرێکی ئەمینم، ئەوا پێویستە لەسەرتان کە تەقوای خوا بکەن و گوێڕایەڵی منیش بکەن لەو شتانەدا کە لەلایەن خواوە بۆم هێناون):** ﴿وَمَا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَى رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾ **من چاوەڕێی کرێ و پاداشت لە ئێوە ناکەم لەسەر گەیاندنی بانگەوازەکەم چونکە بەڕاستی کرێ و پاداشتی من لەسەر ئەو کەسەیە کەمنی بە پێغەمبەر نارد، کە پەروەردگاری هەموو جیهانەکانە.**

﴿أَتَأْتُونَ الذُّكْرَانَ مِنَ الْعَالَمِينَ (١٦٥) وَتَذَرُونَ مَا خَلَقَ لَكُمْ رَبُّكُمْ مِنْ أَزْوَاجِكُمْ بَلْ أَنْتُمْ قَوْمٌ عَادُونَ﴾.

ئەو کارە ناشرین و ناپەسەندەی کە هەیان بوو، ئەم ئینکاری کردوو بێزراوی کرد، کە کارێکی سوك و ئابڕووبەر بوو، و پێچەوانەی فیترەتی ساغ و سروشتی ڕاست و ڕێك بوو کە پیشە و عادەتێك بوو تەنها ئەو قەومە پێی هەڵدەستان، لەناو هەموو قەومەکانی جیهاندا، و ئەوان یەکەم، و یەکەم کەس بوون کە ئەو کارەیان داهێنا، و بەو کارە لە سنوری خراپە بڵاوەکانیش کە زانرابوون لە فەساد و ستەم و گومڕایی حەڵاڵ کردنی حەرام تێپەڕیان کردبوو.

خوای گەورە لە سوورەتی (الأعراف)دا دەفەرموێ: ﴿وَلُوطًا إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِ أَتَأْتُونَ الْفَاحِشَةَ مَا سَبَقَكُم بِهَا مِنْ أَحَدٍ مِّنَ الْعَالَمِينَ (٨٠)إِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ الرِّجَالَ شَهْوَةً مِّن دُونِ النِّسَاءِ بَلْ أَنتُمْ قَوْمٌ مُّسْرِفُونَ﴾(الأعراف:٨٠ – ٨١).

کارە لەسنور دەرچوو ئابڕو بەرەکەیانی بێزراو کردو ئینکاری کرد کە هیچ قەوم و نەتەوەیەك لەوەو پێش پێی هەڵنەسابوون، ئەمە بەڵگە بوو لەسەر زیادە ڕەیان و مانەوەیان لەو خراپە و سنور دەرچونەدا.

مامۆستا (سید قطب) خاوەنی (في ظلال) دەڵێت: (ئەو زیادە ڕەویەی کە قەومەکەی لوط ئەنجامیان دەدا، زیادە ڕەوی بوو لە تێپەڕاندنی مەنهەجی خوادا کە لە فیترەتی ساغ و ڕاستدا ڕەنگی دابوییەوە، زیادەڕەوی بوو لەو وزەو توانایەدا کە خوای گەورە بەوانی بەخشی بوو، تا ڕۆڵی ژیانی پێ ببینن درێژ بکەنەوەو بەردەوامی بکەن وگەشە بەژیانی بدەن، لەکاتێکدا کە ئەوان ئاوی لەشی خۆیانیان لە شوێنێکی غەیری شوێنی بەرهەم هێنانی منداڵدا دەڕشت وبلاو دەکردەوە، کەتەنها بریتی بوو لە ئارەزوو شەهوەتی (شاذ) لە سنور دەرچوو، چونکە خوای گەورە لەزەت و شەهوەت و ئارەزوی فیتری ڕاستی داناوە بۆ جێ بەجێ کردنی سوننەتی خوایی. ئەگەر کاتێك نەفسەکە لەزەتەکەی لە لادان لەو سوننەتەدا بینییەوە، بێگومان ئەوە لە سنور دەرچوون وناباوە، کەواتە لادان و فسادی فیتریشە، پێش ئەوەی کە فەسادی ئەخلاق و ڕەوشت بێت.... لە ڕاستیدا هیچ جیاوازییەك نییە، ئەخلاقی ئیسلامی ئەخلاقێکی فیتری یە، بەبێ لادان وفەسادە پێکهاتەی ئەندامی ڕەگەزی مێینە _ وەك پێکهاتەی نەفسی ئەو پێکهاتەیەیە کە لەزەتی فیتری ڕاست بۆ نێرینە جێ بە جێ دەکات لەو بەیەك گەیشتنەدا، کە تەنها تێرکردنی شەهوەت وئارەزوو نییە، بەڵکو وەرگرتنی لەزەت و ڕابواردنێکی خۆش و دروستە کە هاوبەشە لەگەڵ ڕەحمەت و بەزەیی و نیعمەتی خواییدا، لەکاتێکدا کە

هەستاوە بە جێبەجێ کردنی سوننەت و ویستی خوایی بۆ درێژەدان بە ژیان، هاوڕێیە لەگەڵ لەزەتێکدا کە هاوسەنگە لەگەڵ نارەحەتی تەکلیفەکەدا! بەڵام پێکهاتەی ئەندامی ڕەگەزی نێرینە –بەنیسبەت نێرینەوە– ناگونجێت بۆ فیترەتی ساغ و تەندروست ئەو لەزەتە جێبەجێ ببێت، بەڵکو هەست دەکات بە ئەنجامدانی پیسی و قێزەونی، ئەوا ئاڕاستەکەی قەدەغە کردووە بەرەو فیترەتی ساغ بچێت).[٩١]

خوای گەورە لە سوورەتی (النمل)دا –کە ئەمە ماناکەیەتی– دەفەرموێت: ((لوط پێغەمبەریش) کاتی خۆی بە قەومەکەی وت: باشە ئێوە ئەوکارە نابەجێ وتاوان و گوناهە ئەنجام دەدەن؟!، لەکاتێکدا ئێوە چاوتان هەیە و دەزانن (چۆن شەرمەزار و خەجاڵەت و ڕیسوا نابن).(٥٤) ئایا ڕەوایە کە ئارەزووی خۆتان لەگەڵ پیاواندا ئەنجام بدەن لە جیاتی ژنان؟! نەخێر ئێوە ژیر نین، بەڵکو ئێوە گەلێکن سەرەنجامی ئەم ئیشە خراپە نازانن.).(النمل:٥٤-٥٥).

*هەروەها لە سوورەتی (العنکبوت)دا –کە ئەمە ماناکەیەتی– فەرموویەتی: (یادی (لوط) یش بکە کاتێك بە قەومەکەی ووت: ئێوە بەڕاستی تاوانێکی گەورە دەکەن، ئێوە گوناهێکی ناشیرین ئەنجام دەدەن، هیچ کەس بەر لە ئێوە بەکاری وا هەڵنەساوە!!! (٢٨) ئایە ئێوە بە ڕاستتانە نێربازی دەکەن و ڕێگا بەخەڵکی دەگرن و لە یانەکەتاندا کاری نابەجێ و ناشیرین و نادروست ئەنجام دەدەن؟! کەچی وەڵامی قەومی (بەدخوو) تەنها ئەوەبوو کە وتیان: ئادەی کوا سزاو تۆڵەی خوا، ئەگەر تۆ ڕاست دەکەیت؟! بۆمان بیهێنە؟)(العنکبوت:٢٨-٢٩).

---

[٩١] – (في ظلال القرآن)(١٣١٥/٣) بە دەسکاریەوە.

**باسی دووەم:**
**هەڵوێستی قەومی لوط (علیه‌السلام) بەرامبەر بانگەوازەکەی:**

لوط (علیه السلام) بانگەوازی کرد بۆ پەرستشی خواو پابەند بوون بەو شتانەوە کە فەرمانی پێکراوە و خۆ پاراستن لەو کارانەی کە نەهی لێ کراوە و، وئاگاداریشی کردنەوە لە سزا و خەشمی خوایی و سزای بە ئازاری، بەڵام بە بێ باوەڕی و ئیمان نەهێنان بەرنگاری ئەو بانگەوازە پیرۆزە بوونەوەو پشتیان هەڵکردوو گەڵتە جاڕییان نایەوە و دەستیان دایە چەوساندنەوە و دوژمنایەتی و هەڕەشە کردن.
خوای گەورە لە سوورەتی (الأعراف)دا -کە ئەمە ماناکەیەتی- فەرمووی: (وەڵامی قەومە نالەبارەکەی تەنها ئەوەبوو کە وتیان: ئەوانە شار بەدەرکەن چونکە ئەوانە کەسانێکن خۆیان پاك ڕادەگرن (داوێن پاکن و وەك ئێمە ناکەن)!!) (الأعراف:٨٢).
هەروەها لە سوورەتی (الشعراء)دا -کە ئەمە ماناکەیەتی- دەفەرموێت: (تاوانباران وتیان: ئەی لوط، ئەگەر کۆڵ نەدەیت لە دەربەدەر کراوان دەبیت.)(الشعراء:١٦٧).
هەموو ئایەتەکان هەڵوێستی قەومەکەی لوط مان بۆ ڕوون دەکەنەوە بەرامبەر بانگەوازەکەی، بێگومان باوەڕیان نەهێناو پشتیان هەڵکرد و پەلەیان کرد لە دابەزینی سزای خودا، و هەڕەشەیانکرد کە دەری دەکەن لە شارەکەیان، چونکە ئەوان پاك و پاك داوێنن، وەك ئەوەی پاکی و پاك داوێنی ستەم و لادان و تاوان بێت.
* بەڕاستی لوط (علیه السلام) بۆ ماوەیەکی درێژو دیاری کراو لەناو قەومەکەیدا مایەوە، هەر بانگەوازی دەکردن بۆسەر عەقیدە و بیرو باوەڕی ڕاست و ئەخلاقی جوان و شەریعەتی بەهێز و دامەزراوو کە لەلایەن خوایگەورەوە هێنابووی. بەڵام گوێکانیان کەڕبوو و چاوەکانیان کوێربوو بوو بەرامبەر حەق و ڕاستی. وبە کەللە ڕەقی و ئینکاری و سوربوون لەسەر بێباوەڕی و مانەوە لەناو خراپە و گومڕاییدا، بەرەنگاری بەڵگە ڕۆشن و بەڵگە یەکلایی کەرەوەکانیان دەکرد، هەتا لوط لە باوەڕ هێنانیان نائومێد بکەن، ئینجا لوط (علیه السلام) ڕووی کردە خوای گەورەو پاڕایەوە کە خۆی و باوەڕ داران ڕزگار بکات.
ئەوان لە وەڵامدا -کە ئەمە ماناکەیەتی- وتیان: (ئایە ئێوە بەڕاستتانە نێربازی دەکەن و ڕێگا بەخەڵکی دەگرن و لە یانەکەتاندا کاری نابەجێ و ناشیرین و نادروست ئەنجام

دەدەن؟! کەچی وەڵامی قەومی (بەدخوو) تەنها ئەوەبوو کە وتیان: ئادەی کوا سزاو تۆڵەی خوا، ئەگەر تۆ ڕاست دەکەیت؟! بۆمان بیهێنەوە؟ (٢٩) (لوط دوعای لێکردن) ووتی: پەروەردگارە، سەرکەوتنم پێ ببەخشە بەسەر ئەم قەومەی کە تۆوی خراپە دەچێنن)(العنکبوت:٢٩-٣٠).

لە سوورەتی (الشعراء)دا -کە ئەمە ماناکەیەتی- دەفەرموێت: (تاوانباران وتیان: ئەی لوط، ئەگەر کۆڵ نەدەیت لە دەربەدەر کراوان دەبیت. (١٦٨) لوط وتی: بەڕاستی من بێزارم لە کارو کردەوەتان و نەفرەتی لێدەکەم و بێدەنگ نابم. (١٦٩)ئەوسا کە نائومێد بوو لێیان، نزای کردو وتی: پەروەردگارا خۆم و ماڵ و خێزانم ڕزگار بکە لەو کاروکردەوانەی ئەمانە دەیکەن.) (الشعراء:١٦٧-١٦٩).

**باسی سێ یەم:**

**خیانەتی هاوسەرەکەی:**

خوای گەورە لە سوورەتی (التحريم)دا فەرمووی: ﴿ضَرَبَ اللَّهُ مَثَلًا لِّلَّذِينَ كَفَرُوا امْرَأَتَ نُوحٍ وَامْرَأَتَ لُوطٍ كَانَتَا تَحْتَ عَبْدَيْنِ مِنْ عِبَادِنَا صَالِحَيْنِ فَخَانَتَاهُمَا فَلَمْ يُغْنِيَا عَنْهُمَا مِنَ اللَّهِ شَيْئًا وَقِيلَ ادْخُلَا النَّارَ مَعَ الدَّاخِلِينَ﴾(التحريم: ١٠).

خیانەت و ناپاکی لێرەدا بریتی بوو لە خیانەتی کوفر و بێ بڕوایی نەك خیانەتی زینا وداوێن پیسی، لە دیندا بوو نەك لە شەرەفدا.

(إبن كثير) دەڵێت: ﴿فَخَانَتَاهُمَا﴾ واتە لە ئیماندا خیانەتیان کرد، لە کاری ئیماندا وەلامی پێغەمبەرانی هاوسەریان نەدایەوە و پەیامەکەیان بەڕاست دانەنا، پێغەمبەرانیش نەیانتوانی بیان پارێزن بەڵکو بە هەردوو ئافرەتەکە وترا: لەگەڵ ئەو کەسانەی کە لە ئاگردان ئێوەش بچنە ناو ئاگرەوە، بێگومان هاوسەرانی پێغەمبەر پارێزراون لەوەی کە بکەونە ناو فاحیشە و زینا و خراپەی لەو جۆرانەوە، ئەوەش لەبەر پێغەمبەران، (إبن عباس)دەفەرمووێت: خیانەتەکەیان بریتی بوو لەوەی کە ئەوان لەسەر غەیری دینی ئەوان بوون، ژنەکەی نوح دەچوو نهێنی یەکانی نوحی ئاشکرا دەکرد، ئەگەر کەسێك باوەڕی بە نوح (عليه السلام) بهێنایە، ئەو دەچوو هەواڵی دەدا بە کافران و زۆرداران، بەلام ژنەکەی لوط کەسێك بە میوانی بهاتایە بۆلای لوط، هەواڵی دەدا بە خەڵکی شارەکە، لەو کەسانەی کە خراپەیان دەکرد، (الضحاك) دەڵێت: (إبن عباس) فەرموویەتی: (ژنی پێغەمبەران هەرگیز داوێن پیسی و زینایان نەکردووە، بەڵکو خیانەتەکەیان لە دیندا بووە).[٩٢]

ژنەکەی لوط باوەڕی بە مێردەکەی نەهێنا، کە دەبوو ئەو یەکەم کەس بوایە لە لە باوەڕداران بە لوط، و یارمەتیدەری بوایە لەسەر بانگەوازەکەی، چونکە ئەو لە هەموو کەس شارەزاتربوو بە حاڵی و نزیك بوو لێی، بەلام ئەوەی هەڵبژارد کە قەومەکەی

---

[٩٢]- (تفسير القرآن العظيم لإبن كثير /٤/٣٩٣)بە دەسكاریەوە.

لەسەری بون، کە بریتی بوو لە کوفر و گومڕایی، کە عاقیبەتی خەسارەتمەندی و سەرشۆڕییە.
(القشيري) لە (اللطائف الأشارات)دا دەڵێت: چاونەترسی لەسەر هەڵخزان و عاقیبەتی خراپی، ئەگەر پاش ماوەیەکی تریش بێت، سوود بە ئینسان ناگەیەنێت با پەیوەندیشی بە پێغەمبەران و پیاوچاکانیشەوە هەبێت، ئەگەر کاتێك ئەو کەسانە لە حوکم و بڕیاردا لەناو دەستەی خراپە کاردا بن.[٩٣]
خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿فَأَنجَيْنَاهُ وَأَهْلَهُ إِلَّا امْرَأَتَهُ﴾(الأعراف /٨٣).
واتە: (ئێمەیش لوط و خانەوادەکەیمان ڕزگارکرد جگە لە هاوسەرەکەی). کاتێك ووشەی ﴿أنجيناه﴾مان بیست، ئەوا ڕزگار بوونەکە لەسەریەك فەرمان دەبێت، بەلاّم ﴿أنجيناه﴾ واتە: لەچەند شتێکدا، واتە لە چەند مەترسی یەك، چونکە خوای گەورە ڕزگارکەرە، ئیتر مەترسییەکان هەرچەندە بن، خوای گەورە فەرمووی: ﴿وأهله﴾ ووشەی (اهل) لێرەدا یان کەس و کار بووە بۆ لوط (عليه السلام)، یان لە دیندار و شوێن کەوتوان بووە، ئایەتەکە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە خوای گەورە کەس و کاری ماڵەکەی لوگو شوێنکەوتوانی ڕزگارکرد، کە ئەهلی هەموو پێغەمبەران بوون. کەواتە ژنەکەی لوط نەچووە ناو ڕزگاربووان...بۆچی؟چونکە لە تیاچووان بوو، ووشەی (غبَر) بە چەند مانایەك دێت، واتە: (أقام) مایەوە و نیشتەجێ بوو، (مضي) تێپەڕی، لەبەر ئەوە دەوترێت: (هذا الشيء غبرت ايامهَ)واتە: (شتێك بوو ڕۆژگاری تێپەڕی.). ئایا ووشەکە لەم ئایەتەدا: ﴿كَانَتْ مِنَ الْغَابِرِينَ﴾(الأعراف/٨٣). کام مانایان دەگەیەنێت؟ دەڵێین: ئەم دوو واتایە بەیەك دەگەنەوە، لەبەرئەوەی لەگەڵ لوگ دەرنەچوو لە شوێنی خۆی مایەوە، لەو شوێنەدا مایەوە کە سزای بەسەردا دەبارێت.
خوای گەورە لەم ئایەتەدا درێژەی تیاچوونی ژنەکەی (لوط)ی بۆباس نەکردین، بەلاّم واتاکەی ئەوەمان بۆ دڵنیا دەکاتەوە کە سەرپێچی بەرنامەکەی کردووە و باوەڕیشی پێ نەهێناوە، بەلاّم لە ئایەتێکی تردا درێژەی باسی فەرمووە: ﴿ضَرَبَ اللَّهُ مَثَلًا لِّلَّذِينَ كَفَرُوا امْرَأَتَ نُوحٍ وَامْرَأَتَ لُوطٍ كَانَتَا تَحْتَ عَبْدَيْنِ مِنْ عِبَادِنَا صَالِحَيْنِ فَخَانَتَاهُمَا فَلَمْ يُغْنِيَا عَنْهُمَا مِنَ اللَّهِ شَيْئًا وَقِيلَ

[٩٣]- (الطائف الأشارات للقشري /٣/١٤٩).

ادْخُلَا النَّارَ مَعَ الدَّاخِلِينَ﴾ (التحريم/١٠). لەم نموونەیەدا کە خوای گەورە هێنایەوە مەبەست ئەوە نییە کە بفەرمووێت: ژنەکەی لوگ داوێن پیس بووە، بەڵکو خوای گەورە دەیەوێت ئاگادارمان بکاتەوە کە پێغەمبەرەکە لەگەڵ ئەوەی لە لایەن خواوە نێردراوە ناتوانێت ئیمان فەرزبکات، تەنانەت بەسەر خێزانەکەیشیدا چونکە خوای گەورە ئازادی باوەڕ هێنان و باوەڕ نەهێنانی بۆ ئینسان دەستەبەر کردووە، بۆ ئەوەی لێپرسینەوە لە ڕۆژی قیامەتدا دادپەروەرانە بێت، لەبەر ئەوە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ضَرَبَ اللَّهُ مَثَلًا لِلَّذِينَ كَفَرُوا﴾(التحريم/١٠) واتە: بۆ ئەو کەسانەی کە فەرمانی خوایان ڕەتکردەوە، کە باوەڕ ناهێنن پێی، چونکە خوای گەورە ئازادی داوە بە هەریەکەمان کە بە ئازادانە هەڵبژێرین، ئازادیشی داوە بە خێزانی لوگ کە بەویستی خۆی باوەڕ یان کوفر هەڵبژێرێت. پێویست ناکات کەس وا بیر بکاتەوە کە خێزانەکەی لوگ خۆ بەگەورەزان و زاڵ بووە بەسەر لوگدا، چونکە خوای گەورە لە ئایەتەکەدا نەفی ئەوەی کردووە، وەك دەفەرمووێت: ﴿كَانَتَا تَحْتَ عَبْدَيْنِ﴾(التحريم/١٠). کەواتە فەرمانی پیاوی بەسەرەوە بووە، لوط گوێڕایەڵی فەرمانەکانی ژنەکەی نەبوو، بەڵکو ژنەکەی ملکەچی بۆ فەرمانەکانی لوگ هەبوو.

## باسی چوارەم:
## ڕزگاربوونی (لوط) و کەس و کار و شوێنکەوتوانی بێجگە لە خێزانەکەی

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَأَنجَيْنَاهُ وَأَهْلَهُ إِلَّا امْرَأَتَهُ كَانَتْ مِنَ الْغَابِرِينَ﴾(الأعراف/٨٣). وشەی (أنجينا) یەکەم جار ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە سزایەك ڕوودەدات، ئەو سزایەش لەو شوێنە ڕوودەدات کە قەومەکەی لوگی لێیە، ڕزگاربوونیش بە توانا و ویستی لوگ یان باوەڕداران نییە، بەڵکو بە تواناو دەستەڵاتی خوای گەورەیە. تەنها خوایە کە لەم سزایە ڕزگاریان دەکات، لە بەرامبەر ئەوە خوای گەورە فەرمووی: ﴿فَأَنجَيْنَاهُ﴾ خوای گەورە فەرمانەکەی دایە پاڵ خۆی، چونکە خوای گەورەیە لوگ و کەس و کارەکەی لەو سزایە ڕزگار دەکات. قەومەکەی لوط وتیان: ﴿أَخْرِجُوهُم مِّن قَرْيَتِكُمْ إِنَّهُمْ أُنَاسٌ يَتَطَهَّرُونَ﴾(الأعراف/٨٢). ویست و ئیرادەی خوای گەورە هات و چوون یەك بوو لەگەڵ ئەوەی قەومەکەی لوط داوایان کردبوو. خوای گەورە لوط و باوەڕدارانی لە شارەکە دوورخستەوە، بۆ ئەوەی لە سزاکە ڕزگاریان بکات، ئەوەی کە قەومەکەی لوط لێکیان دابوویەوە خەیر و چاکە بوو بۆیان لە دەرچوونی لوط و شوێنکەوتوانی لەو شوێنەی شەڕ و خراپە بوو بۆیان، لەبەر ئەوەی بە دەرچوونی لوط و شوێنکەوتوانی یەکسەر سزاکە بەسەر قەومە خراپەکارەکەدا داباری. خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿قَالُوا إِنَّا أُرْسِلْنَا إِلَىٰ قَوْمٍ مُّجْرِمِينَ (٥٨) إِلَّا آلَ لُوطٍ إِنَّا لَمُنَجُّوهُمْ أَجْمَعِينَ﴾(الحجر/٥٨-٥٩) قەومی ستەمکار و تاوانباران قەومەکەی لوط بوون، ئەوانەی دوژمنایەتیان کرد و باوەڕیان پێ نەهێنا، ئەوانە بوون کە سەرپێچی و کاری ناشیرین و ناباویان دەکرد، ئایا کەس و کارەکەی لوط ئەوانە بوون کە زامنی قەومی تاوانبارانیان دەکرد؟

دەزانین لە ئایەتەکەدا (إستثناء) جیاکردنەوەکە لەدوای (إلاّ) دێت کە جیای دەکاتەوە لە پێشتری خۆی، کەس و کارەکەی لوط لە قەومی تاوانباران نەبوون، کەواتە (إستثناء) جیاکردنەوەکە لە قەومی لوطدا نەبوو، بەڵکو لە تاوانکارەکان بوو، چونکە قەومەکە زۆریان خراپە کاربوون. ناوی (قوم لوط) بڕا بەسەر ئەو قەومەدا. فریشتەکان وتیان: ئێمە بۆ کەس و کارەکەی لوط نەنێردراوین کاتێك ئێوە دەنێردرێن بۆ ڕزگار کردنیان، ئەوە بۆ

ڕزگارکردن و لەناوبردنیشە، چونکە لە ڕاستیدا بۆ لەناو بردنی قەومەکەی لوط هاتبوون کە تاوانکاربوون. پاشان فەرمووی: ﴿إِنَّا لَمُنَجُّوهُمْ أَجْمَعِينَ﴾ واتە: کەس وکارەکەی لوط.﴿إِلَّا امْرَأَتَهُ﴾. کەواتە...خێزانەکەی لوط هەرگیز ڕزگاری نابێت، بەڵکو دەچێتە دەستەی تاوانکارانەوە. لەبەر ئەوە وتیان ئەگەر چەند (إستثناء)ێك بەدوای یەکتردا بێت بەسەر (المستثني منه) لێ جیاکراوەدا، ئەوا (المستثني)ی یەکەم لە(المستثني منه) وەردەگیرێت و (المستثني)ی دووەم لە (المستثني)ی یەکەم وەردەگیریت وسێیەم لەدووەم وەردەگیرێت. لێرەدا ئایەتەکە دەفەرموویت: ﴿إِلَّا آلَ لُوطٍ﴾لە کەس و کارەکەی لوط تەنها خێزانەکەی جیاکرایەوە کە چوویە ناو قەومی تاوانکارانەوە: ﴿قَدَّرْنَا إِنَّهَا لَمِنَ الْغَابِرِينَ﴾(الحجر/٦٠). ئایا پێغەمبەران بوون بڕیاریاندا یان خوای گەورە بڕیاری دا؟ دەڵێین: ڕاستە ئەگەر کارەکە بدرێتە پاڵ ئەو کەسەی کە فەرمانەکەی داوە، ئەو کەسەیش کە هەواڵەکەی پێدراوە، ئەو کەسەیش ڕاستە و خۆ ڕووبەڕووی کراوەتەوە، خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿اللَّهُ يَتَوَفَّى الْأَنفُسَ حِينَ مَوْتِهَا﴾(الزمر/٤٢). لە ئایەتێکی تردا دەفەرموویت: ﴿قُلْ يَتَوَفَّاكُم مَّلَكُ الْمَوْتِ الَّذِي وُكِّلَ بِكُمْ﴾(السجدة/١١). جارێك کارەکە دەدرێتە پاڵ خاوەن فەرمانەکە کە خوای گەورەیە، جارێك دەدرێتە پاڵ ئەو کەسەی کە هەواڵەکە دەیگرێتەوە، جارێك دەدرێتە پاڵ ئەو کەسەی کە فەرمانەکە دەیگرێتەوە، ئایەتی: ﴿قَدَّرْنَا إِنَّهَا لَمِنَ الْغَابِرِينَ﴾ کاتێك ووشەی (غابر) دەبیستیت، وا دەزانیت کە کاتەکە بەسەر چووە و ڕابووردووە، بەڵام لێرەدا (غابر) واتە: (باق) مایەوە یان لەوانەیە کە پێچەوانەی هەیە، واتای ﴿لَمِنَ الْغَابِرِينَ﴾. واتە: لەوانەی کە مایەوە نە دەردەچێت و نە ڕزگاریشی دەبێت، چونکە ئەوەی کە ڕزگاری دەبێت ئەوانەن کە لە شارەکە دەچنە دەرەوە، ئەوەی کە تووشی دێت ئەوانەن کە لەناودەچن. لە شوێنێکی تردا قورئان ئاماژەی کردووە بۆ ئەو ئافرەتە پیرەی کە خوای گەورە لەگەڵ سەرپێچی کارانی بێ باوەڕدا لە قەومەکەی لوط لەناوی بردن وەك دەفەرموویت: ﴿رَبِّ نَجِّنِي وَأَهْلِي مِمَّا يَعْمَلُونَ (١٦٩) فَنَجَّيْنَاهُ وَأَهْلَهُ أَجْمَعِينَ (١٧٠) إِلَّا عَجُوزًا فِي الْغَابِرِينَ﴾(الشعراء/١٦٩-١٧١).

ووشەی (العجوز) واتە پیر کە تەمەنی زۆرە دەزانین تێپەڕیوە، و (الغابرین) واتە: لەناوچووان، وەك ئەوەی خوای گەورە هەواڵ بدات بە پێغەمبەرەکەی لوط بەوەی کە ئەم

ژنە بە کەسی ئەو ناژمێردرێت و خیانەتی لە پەیامی پێغەمبەرایەتی کردووە، بێگومان لەگەڵ سەرپێچی کارانی گوناهکاردا لەناو دەچێت لەماڵەکەی خۆیدا دەمێنێتەوە و ناچێتە دەر لەگەڵ تۆدا و ئەوانەی کە شوێن تۆ کەوتوون، تووشی ئەوە دێت کە لەناوچووان تووشی هاتوون.

## فریشتەکان لە ماڵی (لوط)دا

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَلَمَّا جَاءَتْ رُسُلُنَا لُوطًا سِيءَ بِهِمْ وَضَاقَ بِهِمْ ذَرْعًا وَقَالَ هَذَا يَوْمٌ عَصِيبٌ﴾ (هود/٧٧). واتە: (کاتێك وەفدی فریشتەکانی ئێمە هاتە لای لوط، نارەحەت بوو پێیان، زۆر دڵتەنگ بوو (چونکە لە شێوەی چەند لاوێکی پێکەوتودا هاتبوون، لە دڵی خۆیدا) ووتی: ئەمە ڕۆژێکی سەختە (منی تێکەوتووم). لوط هەستی بە بێدەستەلاتی کرد، چونکە فریشتەکان لەسەر شێوەی بەشەر هاتن، دەیزانی کە قەومەکەی چی دەکات، لەبەر ئەوە کاتێك ژنەکەی لوط بینی چەند کەسێك لە شێوەی بەشەردا هاتن، چووە سەربانی ماڵەکە و ئاگرێکی داگیرساند بۆ ئەوەی دوکەڵێکی چڕ و پڕ بکات کە ئاماژە بکات بۆ قەومەکەی کە میوان گەیشتۆتە ئەوێ و ئەوانیش دیاردەکەیان لاجووان بوو،کە ماف خۆیانە ئەو کارە ناپەسەندە بکەن بە کەس و کارەکەی لوط کە بە پیاوانیان دەکرد، کاتێك قەومەکە گەیشتن بە لوط، لوط وتی: ﴿هَذَا يَوْمٌ عَصِيبٌ﴾ ڕۆژگارێکی سەخت و نارەحەتە کە ئینسان سەری دەبەستێتەوە لە ڕۆژێکدا کە بەدەست ماندوو بوون و هیلاکی زۆرەوە دەناڵێنێت و نارەحەتە. خەڵکی شارەکە زانیان کە لای لوط (علیه السلام) چەند پیاوێك هەیە شێوەیان زۆر جوانە، لەبەر ئەوە قەومەکە کاتیان بە فیڕۆ نەدا، وەك قورئان بۆمان دەگێڕێتەوە.

﴿وَجَاءَهُ قَوْمُهُ يُهْرَعُونَ﴾(هود/٧٨). واتە: قەومەکە زۆر بە خێرایی هاتن وەك بروسکە دەردەچوون، ئینسان کاتێك لەسەر تاوان کردن ڕادێت بە ئاسانی دەیکات و خێرا هەنگاوی بۆ دەنێت. لوط (علیه السلام) دەیزانی قەومەکەی نیەتیان چییە دەیویست لە

میوانەکانی دووریان بخاتەوە کە بە خێرایی ڕۆیشتن: ﴿قَالَ يَا قَوْمِ هَٰؤُلَاءِ بَنَاتِي هُنَّ أَطْهَرُ لَكُمْ فَاتَّقُوا اللَّهَ وَلَا تُخْزُونِ فِي ضَيْفِي أَلَيْسَ مِنكُمْ رَجُلٌ رَّشِيدٌ﴾(هود/٧٨).

واتە: (کاتێك لوط ئەم دیمەنە ناشیرینەی بینی) وتی: ئەی خزمەکانم، ئا ئەوانە کچەکانمن ئەوان پاك و خاوێنن بۆ ئێوە(وەرن لەناو هۆزدا کێتان بەدڵە بە شێوەیەکی شەرعی و ڕەوا لێتان مارەبکەم) جا لە خوا بترسن و شەرمەزارم مەکەن لەناو میوانەکانمدا ئایا پیاوێکی ژیر و مەردتان تێدا نییە (کە لە کاری ناڕەوای ئاوا جڵەوگیری بکات؟)! ئایا لوط پێشنیاری کچەکانی خۆیی دەکرد بۆ ئەوان؟ چ ڕێگرێك هەبوو؟ ئافرەت شیاو بوو بۆ کاری هاوسەرداری لەگەڵ پیاواندا بەڵام ئەوانە کافر بوون و لوطیش پێغەمبەری خوا بوو، ئایا دەگونجێت پیاوێك کچەکەی خۆی لە کەسێکی بێباوەڕ مارە بکات؟دەڵێین:بەڵێ، پێغەمبەری خوا ﷺ ڕوقیەی کچی مارە کرد لە کوڕەکەی (ابی لهب)ی مامی، چونکە لەو کاتەدا بڕیاری حەرامکردن لەسەری دانەبەزی بوو.

لوط فەرمووی: ئەمانە کچی منن، ئایا مەبەستی لەو کچانە بوو کە لەپشتی خۆی دەرچووبوون، یان کچانی قەومەکەی بوون؟ یان کچی باوەڕداران بوو بێت؟ لوط تەنها خۆی و دوو کچی باوەڕیان بە پەیامەکەی کردبوو، کەواتە مەبەست کچەکانی خۆی نەبوو، چونکە ئەو دوو کچە بەشی ئەو ژمارە زۆرەی نەدەکرد لێیان مارە ببڕێت، چونکە لوط (علیه السلام) هەوڵی دەدا قەومەکەی ڕێنمایی بکات و هەڵیان بنێت بۆ پێکهێنانی خێزان. لەبەر ئەوە ووشەی (بناتي) واتە: کچانی شارەکە، واتە: خواستنی ئەو کچانە پاکترە لەو کارەی ئێوە دەیکەن کە نێربازییە لەگەڵ پیاواندا. خێزانداری بڕیاری خوایە و نێربازی لەگەڵ پیاواندا تاوانێکی زۆر گەورەیە. بەڵام قەومەکەی وتیان: ﴿قَالُوا لَقَدْ عَلِمْتَ مَا لَنَا فِي بَنَاتِكَ مِنْ حَقٍّ وَإِنَّكَ لَتَعْلَمُ مَا نُرِيدُ﴾ (هود/٧٩). واتە: (ئەوانیش بێشەرمانە وتیان: سوێند بە خوا بەڕاستی تۆ دەزانیت ئێمە هیچ هەقێکمان نییە بە کچانی تۆوە، بێگومان تۆیش دەزانیت ئێمە چیمان دەوێت.). بەڵام میوانەکانتمان دەوێت کە پیاون و ڕوخساریان جوانە بۆ ئەوەی نێربازییان لەگەڵدا بکەین. لوط (علیه السلام) هەستی بە ناڕەحەتییەکی زۆر توند کرد، قورئان بۆمان دەگێڕێتەوە فەرمووی: ﴿قَالَ لَوْ أَنَّ لِي بِكُمْ قُوَّةً أَوْ آوِي إِلَىٰ رُكْنٍ شَدِيدٍ﴾(هود/٨٠).

واتە: (لوط وتی: خۆزگە بەڕاستی هێزێکم دەبوو لە خۆتان (بۆ بەرامبەری ناپاکەکانتان) یان پەنایەکی بەهێزم دەست دەکەوت و دەڕۆیشتم بۆی (تا تۆڵەتان لێ بکەمەوە و تەمێتان بکەم).

فریشتەکان ڕاستییەکەیان بۆ لوگ ئاشکرا کرد کە ئەوان میوان نین و بۆمیوانداری نەهاتوون، بەڵکو نوێنەرن و لەلایەن خواوە نێردراون، خەڵکی شارەکە هیچیان لێ ناکەن و دەستیان ناگات بەواندا، بەڵکو تەنانەت دەستیان بە لوطیش ناگات لەبەر ئەوە فریشتەکان وتیان: ﴿قَالُوا يَا لُوطُ إِنَّا رُسُلُ رَبِّكَ لَن يَصِلُوا إِلَيْكَ فَأَسْرِ بِأَهْلِكَ بِقِطْعٍ مِّنَ اللَّيْلِ وَلَا يَلْتَفِتْ مِنكُمْ أَحَدٌ إِلَّا امْرَأَتَكَ إِنَّهُ مُصِيبُهَا مَا أَصَابَهُمْ إِنَّ مَوْعِدَهُمُ الصُّبْحُ أَلَيْسَ الصُّبْحُ بِقَرِيبٍ﴾(هود/٨١).

واتە: (میوانەکان وتیان: ئەی لوط بەڕاستی ئێمە فریشتەی نێردراوی پەروەردگاری تۆین، ئەو تاوانکارانە هەرگیز ناگەنە لات(ناتوانن دەستدرێژی بکەنە سەر ئێمە) جا تۆ خاو و خێزانت لە بەشێکی شەودا دەربکە و کەس لە ئێوە لا نەکاتەوە و ئاوڕ نەداتەوە، جگە لە هاوسەرەکەت (کە لاسارە و بەگوێت ناکات) چونکە بەڕاستی ئەو سزایەی کە تاوانبارانی گرتۆتەوە، ئەویش دەگرێتەوە، بەڕاستی کاتی سزاکەشیان لە بەرەبەیاندایە، ئایا بەرەبەیانی ئەمشەو نزیك نییە؟!).

**یەکەم: فریشتەکان لە میوانی لوط دا:**

* سزا لەسەر قەومی لوط بڕیار دراو، فریشتە بەڕێزەکانیش لە شێوەی بەشەردا هاتن، هەروەك هاتن بۆلای ئیبراهیم (علیه السلام) وا گومانی برد کە ئەمانە بەشەرین، وەك هەروایش کەوتە گومانی ئیبراهیم(علیه السلام).لوط، لێیان ترسا لەوەی کە قەومەکەی دەست درێژی بۆسەر شەرەف و ناموسیان بکەن و ئازاریان بدەن، ئەگەر لەبەر مافی میوانداری و ئادابی جوان نەبوایە، داوای لێکردن کە ئەو شاروو شوێنە جێ بهێڵن هەر لەو کاتەدا، بەڵام شەرمی کرد لە ڕوو بەڕوو بونەوەیان بەهۆی ڕۆژێکی تاڵ و ناڕەحەتەوە.

خوای گەورە فەرمووی: ﴿وَلَمَّا جَاءَتْ رُسُلُنَا لُوطًا سِيءَ بِهِمْ وَضَاقَ بِهِمْ ذَرْعًا وَقَالَ هَٰذَا يَوْمٌ عَصِيبٌ﴾(هود:٧٧).

واتە: (کاتێکیش وەفدی فریشتەکانی ئێمە هاتنە لای لوط، ناڕەحەت بوو پێیان، زۆر دڵتەنگ بوو (چونکە لە شێوەی چەند لاوێکی پێکەوتوودا هاتبوون، لەدڵی خۆیدا) وتی: ئەمە ڕۆژێکی سەختە (منی تێکەوتووم).).

(إبن کثیر) دەڵێت: فریشتەکان داوای میوانداریان کرد لە لوط، لەکاتی خۆر ئاوابووندا بوو، ئەویش ترسا ئەگەر میوانداریەکەیان بۆ ڕێك نەخات، کەسانێکی تر بیکەن بە میوانی خۆیان، وای دانان کە مرۆڤن.

(إبن عباس)دەڵێت: تاقی کردنەوەی زۆر قورس و ناڕەحەت بوو، ئەوەش بەجۆرێك بوو کە نەیدەزانی ئایە شەو بەسەر دەبەن بەبێ ترس و دڵەڕاوکێ، وەك ئەوەی کە بینیبوی قەومەکەی خراپەیان بە کەسانی تردەکرد، ئەوان مەرجیان لەسەر دانا کە میوانداری کەسی تر نەکات.[٩٤]

**دووەم: هەڵوێستی قەومەکەی لوط بەرامبەر بە میوانەکانی:**

خوای گەورە فەرمووی –کە ئەمە ماناکەیەتی–: (هۆزەکەشی بەبیستنی هاتنی ئەم میوانانە، بەپەلەو بێ شەرمانە کشان بۆ لای، پێشتریش کردارە خراپەکانیان دەکرد، (کاتێك لوط ئەم دیمەنە ناشیرینەی بینی) وتی: ئەی خزمەکانم ئائەوانە کچەکانمن و ئەوان پاك و خاوێنن بۆ ئێوە (وەرن لەناو هۆزدا کێتان بە دڵە بەشێوەیەکی شەرعی و ڕەوا لێتان مارە بکەم) جا لە خوا بترسن و شەرمەزارم مەکەن لەناو میوانەکانمدا، ئایا پیاوێکی ژیرو مەردتان تێدا نیە (کە لە کاری ناڕەوای ئاوا جڵەوگیری بکات)؟! (٧٨) ئەوانیش بێ شەرمانە وتیان: سوێند بەخوا بەڕاستی تۆ دەزانیت ئێمە هیچ حەقێکمان نیە بەکچەکانی تۆوە، بێگومان تۆش دەزانیت ئێمە چیمان دەوێت! (٧٩) لوط وتی: خۆزگە بەڕاستی هێزێکم دەبوو لە خۆتان (بۆ بەرامبەری ناپاکەکانتان) یان پەنایەکی بەهێزم دەست دەکەوێت و دەڕۆیشتم بۆی (تا تۆڵەتان لێ بکەمەوە و تەمێتان بکەم).)(هود:٧٨–٨٠).

[٩٤]– (قصص الأنبیاء لأبن کثیر)بە دەسکاریەوە.

## سێ یەم: گفتگۆی نێوان لوط (علیه السلام) و قەومەکەی:

-﴿قَالَ يَا قَوْمِ هَؤُلَاءِ بَنَاتِي هُنَّ أَطْهَرُ لَكُمْ﴾.

لوط (علیه السلام) هەستی بەو مەبەستە ناڵەبارو پیسەی قەومەکەی کرد لەپێناویدا هاتبوون بۆ لای ماڵەکەی ئەو، زانیشی کە ئەوان سورن و هەر دەیانەوێت ئەوکارە بەدە ئەنجام بدەن، ئینجا پێی وتن: (ئەی قەومەکەم ئەمانە کچەکانی منن و ئەوان پاك و خاوێنن بۆ ئێوە) بۆ ئەوەی بەڕێگەیەکی شەرعی و دروست بیانخوازن و بیکاتە هاوسەریان و بەشێوەی حەڵاڵ و دروست لەگەڵیاندا بژین، و ئەو عادەتە پیس و ناپەسەنەدیان جێ بهێڵن، کاتێك کە هەندێك لەو پیاوانە لەگەڵ ئەو کچانەدا هاوسەرداری بکەن، ئەوا ئیتر کارەکە بۆ هەموو قەومەکە ئاسان دەبێت و ئەوانیش پەنا دەبەن بۆ ئەو زەواجە دروست و حەلاڵە و لە نێربازی و فاحیشەی بەد دوور دەکەونەوە.
لوط (علیه السلام) ویستی بە ئاگایان بهێنێتەوە و هۆکاری فیتری لە دەرونیاندا بچێنێت تا ئەکاتەی ماوە و لەدەست نەچووە و گیانی پاك وڕێز و پیاوەتیان تیا زیندو بکاتەوە کە وێرانەبوو، بە تەقوا و لەخوا ترسان کە کۆکراوەی هەموو خەیر و چاکەکانە و بنەمای هەموو خەیر و چاکەیەکە، کە ئەویش خۆپاراستنە لە هەموو خراپەیەك.
کچەکانی خۆی ئیختیار کرد، کە بیکاتە هاوسەریان، بەڵام ئەوان ڕەتیان کردەوە و فاحیشە و بەدکارییان بەسەر حەڵاڵ و پاکدا هەڵبژارد، هەروەها چەپەڵی و قیزەونی و لە سنور دەرچوون و لادانیان بەسەر پاکی و پاك داوێنیدا هەڵبژارد، پاشان بە لوطیان وت:
﴿قَالُوا لَقَدْ عَلِمْتَ مَا لَنَا فِي بَنَاتِكَ مِنْ حَقٍّ وَإِنَّكَ لَتَعْلَمُ مَا نُرِيدُ﴾.

واتە: (بەڕاستی تۆ باش دەزانیت کە ئێمە هیچ حەقێکمان ناوێت مەبەستی نیە لە کچەکانتدا، بە دڵنیاییش دەزانیت کە ئێمە چیمان دەوێت مەبەستمان چییە).
(الألوسی) دەڵێت: ئەوە دەگەیەنێت کە قەومەکە وتیان:ئێمە نامانەوێت کچەکانی تۆ مارە بکەین، چونکە ئەی لوط تۆ وای نابینیت کە ئافرەتانی موسوڵمان لە ئێمە مارە بکەیت....،وتراوە ئەوانە نەفی ئەوەیان کرد کە لە کچەکانیدا حەقی هەبێت چونکە ئەوان داخوازی ئەو کچانەیان بۆکرا ڕەتیان کردەوە، و سوننەتی ئەوانیش وابووە، هەرکەسێك داخوازی کچێك ڕەت بکاتەوە بۆ هەمیشە حەرام دەبێت بۆی، وتراویشە: ئەوان کاتێك

وەك (مذهب) نێریازیان بۆ خۆیان هەڵبژارد، ئەوە بووە حەق و ڕاستی لای ئەوان، ئیتر مارە کردنی ڕەگەزی مێینە (باطل)و بێ مانا دەرچوو لای ئەوان ئەوەی وتیان.[٩٥]

پرسیار: ئایا لوط(علیه السلام) چۆن کچەکانی خۆی هەڵبژارد کە ببکاتە هاوسەری پیاوانی ئەو قەومە کە کافر و خراپە کار بوون؟ئایا ئەمە ڕاستە؟

وەڵام: چونکە بانگی کردن تا بە ڕێگەی شەرعی مارەیان بکەن و بیانخوازن بە هاوسەری خۆیان، بەڵام بەمەرجێك کە بەرە و ئیمان هەنگاو بنێن، (ئەمە بۆچوونی (الزجاج) بووە) ئەمە لەسەر ئەوە بنیات نراوە کە مارە بڕینی ئافرەتانی موسوڵمان لە کافران ڕێگە پێدراو نەبووە لەو کاتەدا. وتراویشە:لە شەریعەتی ئەواندا ڕێگە پێدراوو بووە، پاشان لە سەرەتای ئاینی ئیسلامدا حەرامکراوە.[٩٦]

*(الشیخ عبد الوهاب النجار) دەڵێت: (لوط (علیه السلام) بە شێوەیەکی (غیر مؤکد) بەبێ دڵنیاکردنەوە ئەو کارەی (عرض) پێشنیار کرد کە کچەکانی ئیختیار کرد بۆ هاوسەری ئەوان، بەڵکو بەوهۆیەوە شەرم بکەن خەجاڵەتی دایان بگرێت کە ئیتر ئەوکارە ئەنجام نەدەن وەك ئەوەی تۆ بە کەسێك بڵێیت لە کەسێکی تربدات و خۆیشت ڕێگەی لێدەگریت: وازی لێ بهێنە وەرە لەمن بدە، تۆ ئەو قسەیە دەکەیت و دڵنیایت کە لەتۆ نادات ئەگەر زانیوتە کەبەڕاستی لێت دەدات، ئەو قسەیەت نەدەکرد.).[٩٧]

* هەندێك لە زانایانی تەفسیر وای بۆچون، کە لوط (علیه السلام) مەبەستی کچەکانی: ئافرەتەکانی قەومەکەی بوو بەگشتی.

لەسەر ئەم بابەتە ڕا و بۆچوون و لێکدانەوەی زۆر کراون، بەڵام ئێمە ئەوەندەمان بەباش زانی.

﴿قَالَ لَوْ أَنَّ لِي بِكُمْ قُوَّةً أَوْ آوِي إِلَىٰ رُكْنٍ شَدِيدٍ﴾.

پێغەمبەر لوط (علیه السلام) لەم هەڵوێستە نارەحەتەدا چی کرد؟ قسەی حەق و شیرینی ئیمان؟ بۆچی ڕێگایەکی نەبینییەوە بۆناو ئەو دڵە ڕەق و عەقڵ و نەفسە فەرماندەر بەخراپانە؟ لوط (علیه السلام) چۆن میوانەکانی لەهێرشی ئەوکەسە خراپەکار و مەبەست پیسانە بپارێزێت؟.

---

[٩٥]- (روح المعاني للالوسي ١٠٧/١٢).

[٩٦]- (قصص الأنبياء للأستاذ الدكتور:ابو النور الحديد ص/٢٩٩) بە دەسکاریەوە.

[٩٧]- قصص الأنبياء لعبد الوهاب النجار ص/١٥٠ بەدەسکاریەوە.

چۆن پارێزگاری لە كەرامەتیان بكات و لە قەومەكەی بیانپارێزێت كە ڕێزو پیاوەتیان لەدەست داوە و لەناو ئارەزوو بازی و بەدكاریدا ڕۆچون و نوقم بوون؟

لە كوێوە دەستی بەهێزێك بگات كە پارێزگاری پێ بكات و ئەوانی پێ دوور بخاتەوە كە ڕێگەیان پێ دەگرن! ئەوان لەپشتی دەرگاوە بوون و كۆمەڵیان كردبوو لەسەر ماڵەكەی و دەیانویست بیشكێنن.

نەیانزانی بوو كە ئەم میوانانەی لەو كەسانەن كەبەشتێك هاوكاری دەكەن كە ڕێگای زۆری هەیە، بێگومان ئەوان بۆئەوە هاتوون تا پارێزگاری لەو بكەن و جۆرەها سزای سەخت و سەرشۆڕی تووشی قەومەكەی بكەن!

بێگومان لوط (علیه السلام) هەرچی لەتوانایدا بوو لەهێزو دەسەڵات بەكاری هێنا بۆ دوور خستنەوەی قەومی خراپەكاری، لە ئامانجە پیس و بەدەكەی لایدان، و تەنها ئەوەندەش لەدەسەڵاتیدا بوو كەداوای لێبوردن و پۆزش بۆ میوانەكانی بهێنێتەوە و بەڕێزەوە پێیان بڵێت: ﴿لَوْ أَنَّ لِي بِكُمْ قُوَّةً أَوْ آوِي إِلَىٰ رُكْنٍ شَدِيدٍ﴾.

* لەم كاتە ناڕەحەتەدا فریشتەكان كە میوانەكانی بوون، ڕاستی خۆیان ئاشكرا كرد، و ئەوكارە گرنگەی بۆی هاتبوون باسیان كرد.

زانا (القشيري) دەڵێت: كاتێك كارەكە لەسەر لوط (علیه السلام) تەسك و ناڕەحەت بوویەوە، خوای گەورە ناڕەحەتی یەكەی لەسەر لابرد، و فریشتەكانی پێ ناساندن.[٩٨]

﴿قَالُوا يَا لُوطُ إِنَّا رُسُلُ رَبِّكَ لَن يَصِلُوا إِلَيْكَ﴾.

واتە: (وتیان:ئەی لوط بەڕاستی ئێمە نێردراو فریشتەی پەروەردگارتین، هەرگیز قەومەكەت دەستیان پیاتا ناگات)مژدەیان پێداو دڵنیایان كردەوە: ﴿فَأَسْرِ بِأَهْلِكَ بِقِطْعٍ مِّنَ اللَّيْلِ﴾.

واتە: لە بەشێكی شەودا لەگەڵ كەس و كارەكەت دەرچۆ و بڕۆ، كەبەشی كۆتایی شەوبوو.

﴿وَلَا يَلْتَفِتْ مِنكُمْ أَحَدٌ إِلَّا امْرَأَتَكَ﴾ با كەس لە ئێوە ئاوڕ نەداتەوە بۆ دوای خۆی سزا ببینێت كە سزایەك ترسێنەرە و توشی بێباوەڕان دەبێت، وتراوە: ئاوڕ مەدەرەوە تا دڵت

---

٩٨- (لطائف الأشارات للقشيري ٣/١٤٩).

پابەند نەبێت بەو شار و شوێنەوە، ڕەنگە دڵی وای بۆ پێشنیار کردبێت کەبگەڕێتەوە و تیایدا بمێنێتەوە و لەگەڵ کافراندا لەناوبچێت.
وتراوە: بۆ ئەوە بووە کە بە خێرایی بڕۆن، چونکە ئەگەر کەسێك زۆر ئاوڕبداتەوە، ناتوانێت بە خێرایی بڕوات.
خوای گەورە لە سوورەتی (الحجر)دا فەرمویەتی: ﴿فَأَسْرِ بِأَهْلِكَ بِقِطْعٍ مِّنَ اللَّيْلِ وَاتَّبِعْ أَدْبَارَهُمْ وَلَا يَلْتَفِتْ مِنكُمْ أَحَدٌ وَامْضُوا حَيْثُ تُؤْمَرُونَ﴾(الحجر:٦٥).
واتە: (بەشێکی شەو بمێنێت خۆت و خانەوادەت دەرچن و تۆ دوایان بکەوە، با هیچ کامتان ئاوڕ نەداتەوە، بڕۆن بەرەو ئەو شوێنەی کە فەرمانتان پێ دەدرێت.)

**چوارەم: ڕونکردنەوەیەك:**

* (إبن حزم الظاهري) دەڵێت: (ئەوە گوناه و تاوان نەبوو لەسەر لوط (علیه السلام) کە داوای هێزێك بکات لە خەڵکی، چونکە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَلَوْلَا دَفْعُ اللَّهِ النَّاسَ بَعْضَهُم بِبَعْضٍ لَّهُدِّمَتْ صَوَامِعُ وَبِيَعٌ وَصَلَوَاتٌ وَمَسَاجِدُ يُذْكَرُ فِيهَا اسْمُ اللَّهِ كَثِيرًا وَلَيَنصُرَنَّ اللَّهُ مَن يَنصُرُهُ إِنَّ اللَّهَ لَقَوِيٌّ عَزِيزٌ﴾(الحج:٤٠).
واتە: (خۆ ئەگەر خوا خەڵکی نەدا بەیەکداو حەق دژی بەتاڵ نەوەستێت، هەرچی شوێنی خواپەرستی جوولەکە و گاور هەیە لە خەڵوەتگە و کڵێساو کەنیسە، هەروەها مزگەوتانیش کەناوی خوای زۆر تێدا دەبرێت، هەمووی کاول دەکرێت، سوێند بێت بێگومان خوا ئەو کەسە سەردەخات کە پشتگیری ئاین و بەرنامەکەی دەکات و هەوڵی سەرخستنی دەدات، بەڕاستی خوا زۆر بەهێز و باڵادەستە.).
پێغەمبەر ﷺ هەواڵی داوە کە لوط (علیه السلام) پەنای برد بۆ ئەو هێز و پەناگە بەهێزە، واتە: بۆلای فریشتە بەڕێزەکان، کە خوای گەورە ناردبونی بۆ پارێزگاری لەو وپشتیوانی کردنی، بەڵام لوط (علیه السلام) بەوەی نەزانیبوو، هەرکەس باوەڕی وابێت کە لوط باوەڕی وابوە کەلەلایەن خواوە پەناگەیەکی نییە، بێگومان ئەوکەسە کافربووە

گەر کوفرێکی لەو جۆرە پاڵ بداتە پاڵ پێغەمبەران. هەروەها گومانێکی بێ مانا و بێ ڕخیشە.[٩٩]

**پێنجەم: ڕزگاربوونی لوط (علیه السلام) و کچەکانی و لەناوچونی ژنەکەی:**

فریشتە بەڕێزەکان خۆیان ئاشکرا کردو خۆیان ناساند بە لوط (علیه السلام) و کارە گرنگەکەی خۆیانیان بۆ باسکرد، کەبۆی هاتبوون، ئینجا بە لوطیان وت وەك قورئانی پیرۆز لە سوورەتی (هود)دا هەواڵی داوە: ﴿قَالُوا يَا لُوطُ إِنَّا رُسُلُ رَبِّكَ لَن يَصِلُوا إِلَيْكَ فَأَسْرِ بِأَهْلِكَ بِقِطْعٍ مِّنَ اللَّيْلِ وَلَا يَلْتَفِتْ مِنكُمْ أَحَدٌ إِلَّا امْرَأَتَكَ إِنَّهُ مُصِيبُهَا مَا أَصَابَهُمْ إِنَّ مَوْعِدَهُمُ الصُّبْحُ أَلَيْسَ الصُّبْحُ بِقَرِيبٍ﴾(هود:٨١).

واتە: (میوانەکان وتیان: ئەی لوط بەڕاستی ئێمە فریشتەی نێرراوی پەروەردگاری تۆین، ئەو تاوانبارانە هەرگیز ناگەنە لات (تابتوانن دەستدرێژی بکەنە سەر ئێمە) و جا تۆ خاوو خێزانت لەبەشێکی شەودا دەربکەو کەس لە ئێوە لانەکاتەوە و ئاوڕ نەداتەوە، جگە هاوسەرەکەت (کە لاسارەو بەگوێت ناکات) چونکە بەڕاستی ئەو سزایەی کە تاوانبارانی گرتۆتەوە ئەویش دەگرێتەوە، بەڕاستی کاتی سزاکەشیان لە بەرەبەیاندایە، ئایا بەرەبەیانی ئەمشەو نزیك نیە؟!مژدەیاندا بەڕزگاربوونی خۆی وئەو باوەڕدارانەی لە گەلێیدابوون لە کەس وکاری خۆی ولەناوچونی قەمەکەشی کە بێ باوەڕبوون پێی وپشتیان لێی هەڵکرد. ﴿فَنَجَّيْنَاهُ وَأَهْلَهُ أَجْمَعِينَ (١٧٠) إِلَّا عَجُوزًا فِي الْغَابِرِينَ﴾(الشعراء ١٧٠-١٧١).

واتە: (جا ئێمەش نزامان گیرا کرد و خۆی و ماڵ و خێزانیمان هەمووی ڕزگار کرد...(١٧٠)جگە لە پیرەژنێك (کە هاوسەری بوو) لە تیا چووەکان بوو (چونکە باوەڕی بە پەیامەکەی نەبوو).

هەروەها لە سوورەتی (الذاریات)دا -کە ئەمە ماناکەیەتی- خوای گەورە فەرمووی: (جا هەرچی لەو ناوچەیەدابوو لەئیمانداران دەرمان کردن وڕزگارمان کردن. ..(٣٥) لەماڵە موسوڵمانێکیش زیاترمان بەدی نەکرد).(الذاریات:٣٥-٣٦).

ئەو ماڵەیش بریتی بوو لەماڵی لوط.

---

[٩٩]- (الفصل في الملل والنحل لأبن حزم ٩/٤).

زانا (مجاهد) دەڵێت: لوط و کچەکانی، بە ئیماندارو ئیسلام باسکران، لەبەر بونی باوەڕی ڕاست لە دڵ و دەرونی شاراوەیاندا و پەیوەندی و پابەند بوونی ئاشکرایان.

**شەشەم: لەناو چوونی قەومی لوط و ڕونکردنەوەی شێوازی سزاکان کە تووشیان هات:**

قورئان باسی زۆر سزای کردووە کە توشی قەومەکەی لوط (علیه السلام) هاتوون، بەڕاستی خوای گەورە چاوی کوێرکردن کاتێك ویستیان لوط لای میوانەکانی ناڕەحەت بکەن و بیانەوێت ئابڕوی بەرن، هەروەها شارەکەیان سەرو ژێر کرد، واتە سەقفەکانی بۆ ژێرەوە و بناغە و تەختی خوارەوەیشی بۆ سەرەوە، هەروەها بەردی ئاگرین و سورکراوەی وەك باران بەسەردا باراندن، هەروەها دەنگێکی گەورەی توش هێنان کە هەموویان لەناو چوون.

خوای گەورە لە سوورەتی (القمر)دا فەرمویەتی: ﴿وَلَقَدْ رَاوَدُوهُ عَن ضَيْفِهِ فَطَمَسْنَا أَعْيُنَهُمْ فَذُوقُوا عَذَابِي وَنُذُرِ (٣٧) وَلَقَدْ صَبَّحَهُم بُكْرَةً عَذَابٌ مُّسْتَقِرٌّ (٣٨) فَذُوقُوا عَذَابِي وَنُذُرِ﴾.

واتە: (ئەو خەڵکە بەد ڕەوشتە چاویان بڕیبووە میوانەکانی و (دەیانویست دەستدرێژیان بکەنەسەر)، ئێمەش چاومان کوێرکردن، بیناییمان لێسەندنەوە، دەبچێژن سزا و سەرەنجامی هوشیارکردنەوەی من. بێگومان سەر لەبەیانیەکی زوو سزای توندو بەئێش چوار دەوری گرتن و دایگرتن دە بچێژن سزاو سەرەنجامی هوشیارکردنەوەی من (ئەی بەدڕەشت و ناپوختەکان)).

* دەربارەی سەر و ژێرکردنی شارەکەیشیان، خوای گەورە فەرمووی: ﴿فَلَمَّا جَاءَ أَمْرُنَا جَعَلْنَا عَالِيَهَا سَافِلَهَا﴾(هود:٨٢).

(إبن حجر) دەڵێت: (خوای گەورە لەسەر دەستی (جبریل)دا لەناوی بردن، پاش ئەوەی کە لوط (علیه السلام) لە شارەکەی دەرچووە دەرەوە، شارەکەی سەرو ژێرکرد و ژنەکەیشی لەگەڵ قەومە تاوانبارەکەدا مابویەوە و دواکەوت، یان لەگەڵ لوط دەرچووبوو، ئینجا سزاکە توشی ئەویش هات، و (جبریل) شارەکەی هەڵگێڕ و داگێڕ

کرد بەلێواری باڵەکانی و خۆی و شوێنەکەیشی بویە دەریاچەیەکی بۆگەن، کە ئاوەکەی سودی بۆ هیچ شتێکی دەور و بەری خۆی نی یە).[100]

* لە ئایەتێکی تردا خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَالْمُؤْتَفِكَةَ أَهْوَى (٥٣) فَغَشَّاهَا مَا غَشَّى﴾(النجم:٥٣-٥٤).

واتە: (هەر ئەو زاتە تاوانباران و شەروالْ پیسانیشی ژێرەو ژوورکرد..(٥٣)ئینجا ئەو دێهاتانەی داپۆشی ئەوەی کەدای پۆشی. (بەبەرد باران)).

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَجَاءَ فِرْعَوْنُ وَمَنْ قَبْلَهُ وَالْمُؤْتَفِكَاتُ بِالْخَاطِئَةِ (٩) فَعَصَوْا رَسُولَ رَبِّهِمْ فَأَخَذَهُمْ أَخْذَةً رَابِيَةً﴾(الحاقة:٩-١٠).

واتە: (فیرعەون و ئەوانەی پێش ئەویش و دانیشتوانی دێهاتە ژێرەو ژوور بووەکان، بە تاوان و خراپەوە هاتن. هەر یەکێك لەوانە سەرپێچی و سەرکەشییان نواند بەرامبەر پێغەمبەری پەروەردگاریان ئەوسا گرتنی بە گرتنێکی سەخت.).

* لە ئایەتێکی تردا -کە ئەمە ماناکەیەتی- دەفەرموێت: (بەڕاستی ئێمە دابەزێنەری سزاو بەڵای ئاسمانین بەسەر خەڵکی ئەم شارەدا بەهۆی ئەوەی کە دەردەچوون لە فەرمانی خوا.)(العنكبوت:٣٤).

لە سوورەتی (هود)دا -کە ئەمە ماناکەیەتی- دەفەرموێت: (جا کاتێك فەرمانی ئێمە بۆ تیاچوونیان هات، شارۆچکەکەیانمان ژێرە و ژوور کرد و بە قوڕی سوورەوە کراوی وەك بەرد، چین لەسەر چین بەرد بارانمان کردن.(٨٢) هەموو ئەو بەردانە دیاری کراو بوون، لە لایەن پەروەردگارتەوە (کە بدات بەسەر تەوقە سەری کێدا). ئەم کارەسات و ئەم بەرد بارانەش وەنەبێت زۆر دوور بێت لە ستەمکارانەوە (لە هەموو سەردەمێکدا، کاتێك ڕۆدەچن لە تاوانکاریدا).)(هود:٨٢-٨٣).

* هەروەها لە سوورەتی (القمر)دا -کەئەمە ماناکەیەتی- دەفەرموێت: (بێگومان ئێمە ئەوانیشمان بەرد باران کرد (هەروەها ژێرەو ژووریش کران)، جگە لە لوط و خاوو خێزانی ئیمانداری کەلەبەرەبەیاندا ڕزگارمان کردن)(القمر:٣٤)

* پێشەوا (إبن القيم) دەفەرموێت: (خوای گەورە جۆرەها سزای بۆ کۆ کردنەوە، لە لەناو بردن و هەڵگێڕ و داگێڕ کردنی شارەکەیان و ڕۆچون و بەرد باران کردن لە ئاسمانەوە،

---

[100]- (فتح الباري ٦/٤٧٨).

ئینجا تووشی سەرشۆڕی و شکست هاتن کە هیچ ئومەتێك بەو شێوەیە تووش نەهاتبو غەیری ئەوان، ئەوەش لەبەر گەورەیی خراپە و فەسادەکەیان کە زەوی دەجولاند...).[١٠١]

ئەم قەومە بەدکارە، پاکی و پاك داوێنیان بە تاوان و ستەم دادەنا، کە خاوەنەکەی شیاوی ئەوەبوو توشی سزا دەرکردن ببێت: ﴿أَخْرِجُوا آلَ لُوطٍ مِّن قَرْيَتِكُمْ إِنَّهُمْ أُنَاسٌ يَتَطَهَّرُونَ﴾.

بەڵام ئارەزوو بازی و لادان ئەوە حەق بووە بۆ خۆیان و بەڕەوایان داناوە کە بە ئاشکرا بیکەن و شانازی پێوە بکەن و بە ئاشکرا داوایان دەکرد و ڕەواجیان پێ دەدا: ﴿قَالُوا لَقَدْ عَلِمْتَ مَا لَنَا فِي بَنَاتِكَ مِنْ حَقٍّ وَإِنَّكَ لَتَعْلَمُ مَا نُرِيدُ﴾ (هود:٧٩).

*هەروەها ئەم قەومە پەلەی دابەزینی سزایان بوو، کە پێویست بوو داوای هیدایەت و ڕزگاربوون بکەن، وەك خوای گەورە فەرموی: ﴿فَمَا كَانَ جَوَابَ قَوْمِهِ إِلَّا أَن قَالُوا ائْتِنَا بِعَذَابِ اللَّهِ إِن كُنتَ مِنَ الصَّادِقِينَ﴾(العنكبوت:٢٩).

حاڵی ئەوان وەك حاڵی قوڕەیش وابوو لەوەدا کەپەلە یان دەکرد بەخێرایی و لەماوەیەکی زۆردا سزایان بۆبێت، وەك قورئان ئاماژەی پێداوە: ﴿وَإِذْ قَالُوا اللَّهُمَّ إِن كَانَ هَٰذَا هُوَ الْحَقَّ مِنْ عِندِكَ فَأَمْطِرْ عَلَيْنَا حِجَارَةً مِّنَ السَّمَاءِ أَوِ ائْتِنَا بِعَذَابٍ أَلِيمٍ﴾(الأنفال:٣٢).

ئەوە جوان و لەپێشتر بوو بۆکافرانی قوڕەیش بیانوتایە: ئەی خودایە، ئەگەر ئەوە حەق وڕاستی یە لەلایەن تۆوە، ئێمەیش هیدایەتبدە بۆلای وخۆشەویستمان بکە بۆی و دامەزراومان بکە لەسەری.

لەدیاردەی هەڵگەڕانەوەی هاوسەنگی یەکان لای قەومی لوط، ئەوەبوو کەئەوان واجبی میوانداریان خراپ لێکدایەوە و کاری ناشرینیان مەبەست بوو، کەپێویست بوو خۆیان لەوکارە ناشرینە بپارێزن، بە لوط یان وت: ﴿أَوَلَمْ نَنْهَكَ عَنِ الْعَالَمِينَ﴾ئەوان ڕەچاوی مافی میوان داریان نەکرد وڕێزی میوانەکانیشیان نەگرت، بەڵکو بەپەلەو هەڵەداوان بەرەو ماڵی لوط (علیه السلام) چوون، و ویستیان کاری ناشیرین بەرامبەر میوانەکانی ئەنجام بدەن، بەهۆی ئەم کارە خراپ وبەدەوە، کەبەڵگەبوو لەسەر تێکچونی هاوسەنگیان

[١٠١]- الجواب الكافي لمن سأل عن الدواء الشافي /لأبن قيم الجوزيه ص /٢٥١.

وتێکەڵ و پێکەڵ بوونی چەمك و تێگەیشتنەکان، شیاوی سزادان هاتن، کاتێك شارەکەیان سەرو ژێرکرا و بەردباران کران و دەنگێکی گەورە گرتنی.

بەڕاستی کۆمەڵێك سزای ترسناك و بەئازار توشی قەومی لوط هات، بەهۆی بێباوەڕی و لەسنور دەرچونیانەوە، ئەوەش وانەو پەندی گرنگی تیابوو بۆکەسانێك کەپەندی لێ وەربگرن، پاش ئەوەی کەسزاکەیان تووش هات، خوای گەورە دەربارەیان فەرموی: ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّلْمُتَوَسِّمِينَ (٧٥) وَإِنَّهَا لَبِسَبِيلٍ مُّقِيمٍ (٧٦) إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً لِّلْمُؤْمِنِينَ﴾(الحجر:٧٥-٧٧).

﴿وَإِنَّكُمْ لَتَمُرُّونَ عَلَيْهِم مُّصْبِحِينَ(١٣٧) وَبِاللَّيْلِ أَفَلَا تَعْقِلُونَ﴾(الصافات:١٣٧-١٣٨).

﴿فَلَمَّا جَاءَ أَمْرُنَا جَعَلْنَا عَالِيَهَا سَافِلَهَا وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهَا حِجَارَةً مِّن سِجِّيلٍ مَّنضُودٍ(٨٢) مُّسَوَّمَةً عِندَ رَبِّكَ وَمَا هِيَ مِنَ الظَّالِمِينَ بِبَعِيدٍ﴾(هود:٨٢-٨٣).

**باسی پێنجەم:**
**سوود و وانەکانی چیرۆکەکە.**

**یەکەم: ناپەسەندی و بێزراوی کاری نێربازی.**

*نێربازی جۆرێکە لە فاحیشە و داوێن پیسییە گەورەکان، و لە هەمویان ناشرینترە، و دەردێکی ترسناك وکوشندەیە وشەڕی سەخت بەدوای خۆیدا دەهێنێت، وستەمێکی گەورەیە، وئەنجامەکەیشی ترسناك و ئازاراوییە کەبریتییە لەسنور دەرچوون و لادان، ناباوی و بەدڕەفتاری و زیادەڕەوی و گومڕایی، پیاوان سەرشۆڕو سەرکز دەکات، چونکە پیاوەتیان تیادەکوژێت و ڕێزو هەیبەتیان تیاناهێڵێت، بەئەنجام دانی ئەو کارە دەبنە کەسانێکی پیس و بەدڕەفتارو چاولێکەر لەسەرشۆڕو بچوکبووەوەکان وبێنرخەکان، هەمیشە لەحاڵەتی دودڵی و ناهاوسەنگی و هەڵچون و گرژیدا دەژین.
*هەروەها نێربازی دەبێتە هۆکاری خراپکەر بۆئافرەتانیش، ئەویش کاتێك پیاوان لەوان دووردەکەونەوە، وئافرەتانیش پەنا دەبەن بۆداوێن پیسی و زیناکردن بۆتێرکردنی ئارەزوەکانیان هەروەها پەنا دەبەنە بەر کاری (السحاق) جوت بونی ئافرەت لەگەڵ ئافرەتدا. وەك ئەوەی کەئافرەتانی قەومی لوط دەیان کرد، کاتێك کەپیاوەکانیان سەرقاڵ بوون بەنێربازی یەوە.
*هەروەها نێربازی تاوان وخیانەتێکی گەورەیە لەسەر فیترەتی ساغ و تێکدەر و خراپکەری گەنجەکان، کاتێك لەژن هێنان دوردەکەونەوە کەحەڵاڵە، ولەناو ئەو فاحیشەو کارە بەدەدا نوقم دەبن، هەروەها دەبێتە هۆی کەم بونەوەی بەرهەمهێنانی نەوە، چونکە لە هاوسەری حەڵاڵ دور کەوتونەتەوە، لەبەرئەوە پایەکانی خێزان هەرەس دەهێنێت و پەیوەندیەکانی کۆمەڵگا دەپچڕێت وشارستانیەت هەرەس دێنێت و دەڕمێت، نێربازی هۆکارێکی گەورەیە لەهۆکارەکانی فەسادو خراپە، وهۆکارێکی قورسیشە بۆڕوخانی نەفس و کۆمەڵگا، وهۆکاریشە بۆبڵاوبونەوەی زۆرێك لەنەخۆشیە لەناوبەر و درێژخایەنەکان وەك (الزهري) و (السيلان) و(الهربس) وگەڕی و ئەسپێ تێدان ومایەسیری و ئایدز.

هەموو ئەو نەخۆشیە جنسی یانە سزای خوایین بۆداوێن پیس و نێربازان، کەسنوری خوایان تێ پەڕاندوەو سنورە حەڵاڵەکانیان شکاندووە.

## بڵاو بونەوەی نێربازیی لەکۆمەڵگا ڕۆژئاواییەکاندا

* ئەوەی جێگای ئەسەفە نێربازی بە شێوەیەکی فراوان لەکۆمەڵگا ڕۆژ ئاواییەکاندا بڵاو بۆتەوە لەگەڵ بوونی ژمارەی زۆری فەسادو خراپە، لەو کۆمەڵگایانەدا دەستور و یاساو بڕیاری واهەیە کەڕێگە دەدات بەو کارەبەدانەو خەڵکی لەسەر هاندەدات، بەشێوەیەك کەلەنێوان پێگەیشتوەکاندا بڵاوە و کەس زۆری لەسەرنییە بیانکات.
لە (دائرة المعارف)ی بەریتانیدا هاتووە:بێگومان(کاری جنسی وناباو)لەبازنەی سڕی و نهێنی چۆتە دەرەوە، بۆبواری ئاشکراو بەرچاو ونادی وشوێنی تایبەتی بۆکراوەتەوە – وەك یانەی بێ جل وبەرگان –و باخچەی تایبەت – هەروەها شوێنی ڕاهێنان لەسەر ئەوکارە، پۆلیسیش ئەو شوێنانە دەزانن و پارێزگاری لێ دەکەن وچاودێریان دەکەن.
*لە ڕۆژئاوا هەزاران ڕێکخراو هەن کە چاودێری ئەوکەسە ناباوانە دەکەن لەڕوی جنسییەوە وداوای مافی زیادەیان بۆدەکەن، کەبوەتە هێزو کیانێك کەس گاڵتەو سوکایەتی پێ ناکات. وکراوەتە کارتێکی سەرکەوتووە بۆبردنەوەی ئەنجامی هەڵبژاردنە گشتی و سەرۆکایەتیەکان، بینیومانە کە گەورە سیاسی و سەرکردەکان لەگەڵ ئەو کەسانەدا گفتو گۆدەکەن وکۆمەڵێك بەڵێنی زۆریان پێ دەدەن ئەگەر لەهەڵبژاردنەکاندا بۆپارێزگاری ئەوان بوەستن وکاربکەن، ئەگەر کاتێك ئەوکەسە سیاسی و سەرکردانە مەبەستەکانیان هاتەدی و دەستکەوت وکورسی دەسەڵاتیان بردەوە ئیتر بەپەلە دەچن بەدەم جێ بە جێ کردنی ئەو بەڵێنانەوە کەپێیان داون لەدابەزینان بۆکەسە لەسنور دەرچوو وبەدڕەفتارەکان، ئەگەر بڕوانین بۆنمونە بۆهەڵمەتی هەڵبژاردنەکانی ئەمریکا، دەبینین کە ئەو کەسانەی خۆیان کاندید کردووە پاکی خۆیان باس دەکەن و پێشبڕکێ دەکەن لەسەر بەدەستهێنانی دەنگی ئەوکەسە بەدخوانە، بەڵکو ڕێژەیەکی زۆر لەو بەدخوانە شوێنی هەستیارو بەرزبۆخۆی لەحوکمەتە ڕۆژئاواییەکاندا دیاری دەکات، بەڵکو لەناوسوپایشدا، ولە ئەمریکاو ئەوروپا کەنیسەی تایبەت هەیە بۆئەو بەدخوانە، کەڕێگە دەدات بەمارەبڕینی پیاولەپیاو، وژنیش بۆی هەیە ژن لەخۆی مارەبکات، بەڵکوهەندێك زانکۆ لە نەتەوە یەکگرتووەکان دیاری و بەخشینێکی بۆ ئەو کەسە

بەدخوانە تایبەت کردووە، لەو زانکۆیانە: زانکۆی(سیر جۆرج ولیافر) هیچ قوتابیەك بۆی نییەکە (منحة) بەخششی ئەوزانکۆیە وەرگرێت، مەگەر کاتێك کەئەوە چەسپابێت ئەوقوتابییە بەدرەفتارو بەدخوە لەڕوی جنسی یەوە.

*لەیەکێك لە و گۆڤارانەی کە لە (إنگلترا) دەردەچێت وتایبەتە بەنێربازەکان، دەبینین کەهێرشی یەك لەدوای یەك بۆسەر هەڵوێستی کەنیسە لەوکەسە بەدخوانەدەکرێت، یەکێك لەگەورە کاردیناڵەکان هەستابەڕەتدانەوەی ئەو هێرشانە، وتی: بێگومان کەنیسەی پرۆتستانتی ئەو شوێنەیە کە لە حاڵەتی کرانەوەو فراوانبوندایە پاش ماوەیەکی نزیك کەنیسەکە دەناسێنرێت بەکەسە بەدخوەکان، ئەو وەك خۆی بەکارێکی ئاسایی دەبینی ولەتێڕوانینی ئەودا هیچ ڕێگرێك نی یە کە کەسێکی (شاز) ناباو وبەدخو ببێتە (قسیس).

لە کۆبونەوەی مەجلیسی کەنیسەی ئینجیلدا، مەجلیسەکە بەزۆرینەی دەنگ لەسەر ڕێگەپێدان بە (شذوذ الجنسي) بەدرەفتاری جنسی ڕێك کەوتن، بەڵام بەمەرجی ڕودانی لەنێوان کەسانی پێگەیشتوو هەڵبژێردراودا، گەورەی (ئەسقەفی کانتربری) کە- گەورەترین وبەرزترین پلەی هەیە- ئەوکەسەیە کەپێشەوایەتی هەڵمەتی ئەو کارەدەکات، کەئامانجی ڕەواجدانە بەکاری (شذوذ الجنسي)، وتی: (هەست بەناڕەحەتی و دوودڵی دەکەم، لەکەسێك کەبەهۆی ستەمی یاساوە تووشی(شذوذالجنسي) دەبێت، لەکاتێکدا کەهەر کەسێکی تر بیەوێت خێزانەکەی بڕوخێنێت وداگیر بکات بەبێ سزا بکەوێت بەسەریدا.).

ئێمەیش دەڵێین: چ (منطق) ێکە ئەمە، چ دادپەروەریەکە ئەمە کە (اسقف)ێکی گەورە هەوڵی بۆبدات !!

ئەم قسەیەی واتە: پێویستە ڕێگەبدرێت بەهەموو ستەمێك، وهیچ سزایەکی لەسەر ئیمزانەکرێت هەرکەس ئەنجامی بدات، وزۆرێك لەوکەسانە هەن کەدەتوانن بەتاوانەکانیانەوە خۆیان ڕزگاربکەن!!

یەکێك لەسەرژمێریەکان باسیان کردووە کەڕێژەیەکی زۆر لە (قسیس)ەکان لەئینگلتەرا (شذوذ الجنسي) یان هەیە.

ڕۆژنامەی (Daily Miror و Daily Mail) باسیان کردووە کە (٤٠٪) لە (رهبان) ڕاهیبەکان مومارەسەی کاری (شذوذ الجنسي) بەدرەفتاری دەکەن (٨٠٪) یشیان، داوێن پیس و زیناکەرن.

کۆی هەموو وتەکانی پێشوو: زینا و داوێن پیسی ونێربازی لەناو کۆمەڵگاکانی ڕۆژئاوادا بڵاوبۆتەوە، وەك بڵاوبونەوەی ئاگر بەناو پوش وپەڵاشدا، ئەوەش تەنها بەهۆی دورکەوتنەوەیان و گومڕاییان بەرامبەر حەق و خۆشگوزەرانی و زیادەڕەوییانەوە، هەروەها دەستیان گرتووە بەسەر پێشکەوتنە زانستییەکاندا کە بەدەست هاتوون لەگەڵ ماددە و دەوڵەمەندی و فاحیشە و خراپەکاری لە تێرکردنی ئارەزووەکانیان وکاری قێزەونیان.

**دووەم: سزای نێربازی لە شەریعەتی ئیسلامدا:**

زانایانی شەرع ڕاوبۆچونی جیاوازیان هەیە لەسزادانی نێربازەکاندا، ئەوان لەسەر سێ بۆچونن:

**بۆچونی یەکەم:**

کە لە (مذهب)ی (ئیمامی مالیك وأحمد و ئیمامی شافیعی وەرگیراوە کە: سزای کەسی نێرباز بریتییە لە لە کوشتنی، ئەگەر بکەر بێت یان کار لەسەر کراو بێت، ژنی هەبێت یان نەیهێنا بێت، زۆرینەی هاوەڵان لەسەرئەم بۆچونە بوون.[١٠٢]

-خاوەنانی ئەم بۆچوونە بەڵگەی زۆریان هێناوەتەوە، ئێمە تەنها یەك دانەیان باس دەکەین:

لە(إبن عباس)ەوە (خوالێی ڕازی بێت) دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (هەرکەستان بینی کاری قەومی (لوط)ی کرد، ئەوا بکەرەکەو کارلەسەر کراوەکەیش بکوژن).[١٠٣]

**بۆچونی دووەم:**

نێربازی حوکمی زینای هەیە، ئەو کەسەی کە ژنی نەهێنا بێت داری حەدی لێ دەدرێت وئەو کەسەیشی ژنی هێنابێت بەردباران دەکرێت، ئیتر بکەر بوبێت یان کارلەسەرکراو، ئەمەیش بۆچوونی (مذهب) ڕێڕەوی (الشافعي)یە.

-فەرموودەیەك بە بەڵگە دەهێنینەوە:

---

١٠٢- المغني لأبن قدامة، والمنتقى على الموطأ.

١٠٣- رواهُ الترمذي وأبو داود و إبن ماجة والبغوي والأجري.

لە (ابوموسى ى الأ شعري) یەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (ئەگەر پیاوێك لەگەڵ پیاوێك جوت بوو ئەوا هەردووکیان زینایان ئەنجام داوە،وئەگەر ئافرەتێك لەگەڵ ئافرەتێك جوت بوو، ئەواهەردووکیان زینایان ئەنجام داوە). [104]

**بۆچونی سێ هەم:**

کە بۆچونی حەنەفییەکانە، ئەو کەسانەی کەوتویانە لەنێربازیدا لۆمەو سەرزەنشت کردن هەیە. لەکاتێکدا کەنێربازی کردن وەك زینا نی یە، نێربازی لەنێوان پیاو پیاودا دەبێت، بەڵام زینا بریتی یە لەناوێك بۆخۆئاڵاندنی پیاو بەئافرەتدا کەحەڵاڵ نی یە بۆی، ونەفس حەزلەزینا دەکات ومەیلی ئەنجامدانی دەکات، بەڵام نێربازی سروشتی ساغ فیترەتی پاك ورێك ڕەتی دەکاتەوەو سەرزەنشت وبێزرازی دەکات، زینا گەورەترین زیان دەدات لەخستنەوەی نەوەی بەرهەمی فەسادو خراپە.

*ئەوەی لەم مەسئەلەیەدا لەپێشە بریتی یە لە: کەسی نێرباز ژنی هێنابێت یان نەیهێنابێت دەکوژرێت، ئیتر بکەربێت یان کار لەسەرکراو، ئەمە بۆچوونی(مذهب)ی ئیمامی مالیك و أحمدو وتەی (الشافعي)بوو، کەپێشتر باسمان کرد.

**سێ یەم: تەواوکەرێك لە ڕونکردنەوەی حوکمی (سحاق) و (جوت بوون لەگەڵ ئاژەڵاندا) و (جوت بوون لەگەڵ ئافرەتی بێ نوێژ) و (جوت بون لەگەڵ ئافرەت لە پشتەوە):**

**١-حوکمی( سحاق ) جوتبونی ئافرەت لەگەڵ ئافرەت:**

بریتی یە لە جوتبونی ئافرەت لەگەڵ ئافرەت بۆ وەرگرتنی شەهوەت وئارەزووبازی کەپێی دەوترێت (السحق) و (التدليك) بە پێی شەرع حەرامە بۆگشت کەس. خوای گەورە فەرمویەنی: ﴿وَالَّذِينَ هُمْ لِفُرُوجِهِمْ حَافِظُونَ(٥) إِلَّا عَلَى أَزْوَاجِهِمْ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُمْ فَإِنَّهُمْ غَيْرُ مَلُومِينَ(٦) فَمَنِ ابْتَغَى وَرَاءَ ذَلِكَ فَأُولَئِكَ هُمُ الْعَادُونَ﴾(المؤمنون:٥-٧).

واتە: (باوەڕداران سەر فراز دەبن، ئەوانەی کە پارێزی داوێنی خۆیانن، جگە لەگەڵ هاوسەر و کەنیزەکەکانیاندا نەبێت، کە ئەوە جێگەی لۆمە و سەرزەنشت نیە، (لە بارو

---

[104] – رواه البيهقي والطبراني.

دۆخی ئاساییدا بەهۆی جەنگەوە ئافرەتانی موسڵمان دەکەونە دەست دوژمنانەوە دەستدرێژی بێسنور دەکرێتە سەریان، دورنیە ئافرەتانی دوژمن نەکەوێتە دەست ئیمانداران، ئەوکاتە یەك کەس دەبێتە هاوسەری و بەڕێزەوە ڕفتاری لەگەڵ دەکات) جا ئەوەی جگە لەو سنورە دیاریکراوە ڕێگە و ڕێبازی تربگرێتە بەر ئەوجۆرە کەسانە بەیاخی و لەسنور دەرچوو دەژمێردرێن).

لە فەرموودەیەکدا هاتووە دەفەرموێت: (باهیچ پیاوێك سەیری عەورەتی هیچ پیاوێك نەکات، وهیچ ئافرەتێك سەیری عەورەتی هیچ ئافرەتێك نەکات، وباهیچ پیاوێك لەگەڵ پیاوێکی تردا خۆیان بەیەك بەرگدا نەئالێنن، وهیچ ئافرەتێك لەگەڵ هیچ ئافرەتێکی تردا یەك بەرگ نەئالێنن بەخۆیاندا).[١٠٥]

مامۆستا (عبدالقادر عودة)دەڵێت: دەقی تەواو لەسەر حەرامکردنی (السحاق) هاتووە –کە فەرمودەکە بوو– چونکە جۆ ئالاندنی ئافرەت بە ئافرەتدا، ئەوە هیچ گومانی تیانییە کە حەرامە بەلاّم حەدی نییە، بەڵکو سزاکەی بریتیە لە لۆمەو سەرزەنشت کردن، ئەوە سەرپێچیەو سزای نییە، و حوکمی زینای لەسەر وەرناگیرێت، چونکە زینای ڕاستەوخۆ بە (إیلاج)دەبێت بەلاّم (سحاق) بە (إیلاج) جیّ بەجیّ نابێت.[١٠٦]

٢- حوکمی جوتبوون لەگەڵ ئاژەلاّندا:

ئەمەش کارێکی ئابڕو بەرانەو بێزراو و لۆمەکراوە و بەپێی شەرع حەرامە لەبەرئەوەی ئایەتەکە زۆرشت دەگرێتەوە: ﴿فَمَنِ ٱبۡتَغَىٰ وَرَآءَ ذَٰلِكَ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡعَادُونَ﴾ (المؤمنون:٧) (ماناکرا).

زانایانی شەرع لەسەرئەوە یەك دەنگن کە سزاکەی بریتیە لە لۆمەکردنو سەرزەنشت، بەوەی کە حاکم و دادوەر دەیبینێت، قەدەغەکەرو توندو توڕەیە لەسەری. بەلاّم ئەوەی کە لە فەرمودەکەی ئیمامی أحمد و أبوداود و الترمذي و کەسانی تر ڕیوایەتیان کردووە لە (إبن عباس)ەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (هەرکەس لەگەڵ ئاژەڵێك جوت ببێت،

---

[١٠٥]– رواه مسلم في صحيحه عن أبي سعيد الخدري /كتاب الحيض

[١٠٦] – التشريع الجنائي في الأسلام مقارناً بالقانون الوضعي ٢/٣٨٦

ئەوا بیکوژن‌و ئاژەڵەکەیش بکوژن لەگەڵ)[١٠٧] ئەمە فەرمودەیەکی لاوازە، پێچەوانەیە لەگەڵ ئەوەی کەبەڕاستی لە(إبن عباس) وەرگیراوە، کە فەرمویەتی: (هەرکەس لەگەڵ ئاژەڵێکدا جوت بوو، ئەوە سزای حەدی لەسەر نییە).[١٠٨]

**٣- جوتبون لەگەڵ ئافرەت لەکاتی ( حیض ) بێ نوێژیدا :**

حەرامە کەپیاو لەگەڵ هاوسەرەکەی خۆی جوت بێت لەکاتی (حیض) بێنوێژیدا. خوای گەورە –کە ئەمە مانەاکەیەتی– دەفەرموێت: ئەی پێغەمبەر ﷺ پرسیارت لێ دەکەن دەربارەی (عادەی مانگانەی ئافرەت) پێیان بڵێ: ئەوە ئازارو و زەرەرە، کەوابوو خۆتان بەدوور بگرن لە هاوسەرەکانتان کەلەو حاڵەتا بن ونزیکیان مەکەون، تاپاك دەبنەوە، جاکاتێك پاك‌و خاوێن بونەوەو خۆیان شت، بچنە لایان بەو شێوەیەی کەخوا فەرمانی داوە، بەڕاستی خوا تەوبەکاران‌و پاکانی خۆش دەوێت(ئەوانەی ڕواڵەت‌و ناوەڕۆکیان پاکە). (البقره:٢٢٢).

هۆکاری دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە بریتیەلە: لە (انس) (خوای لێڕازیبێت) گێڕراوەتەوە، وتی: یەهودو جولەکە ئەگەر کاتێك ژنەکانیان بچوایەتە عادەی مانگانەو بێنوێژی، نانیان لەگەڵ نەدەخواردن‌و لەگەڵیان نەدەخەوتن‌و، لەیەك ماڵدا پێکەوە لەگەڵیان کۆنەدەبونەوەو دانەدەنیشتن، هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ دەربارەی ئەمە پرسیاریان لە پێغەمبەر ﷺ کرد، ئینجا خوای گەورەش ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الْمَحِيضِ قُلْ هُوَ أَذًى فَاعْتَزِلُوا النِّسَاءَ فِي الْمَحِيضِ وَلَا تَقْرَبُوهُنَّ حَتَّى يَطْهُرْنَ فَإِذَا تَطَهَّرْنَ فَأْتُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ أَمَرَكُمُ اللَّهُ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ التَّوَّابِينَ وَيُحِبُّ الْمُتَطَهِّرِينَ﴾(البقرة:٢٢٢).

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی تەنها (النکاح) واتە (جوتبوون) نەبێت، هەمووشتێکیان لەگەڵدا بکەن.[١٠٩]

زانایانی شەرع ڕا و بۆچونی جیاوازیان هەیە لەوەدا، کەپێویستە پیاوان لەکاتی بێنوێژی خێزانەکانیان خۆیان لێ بەدوور بگرن، وتراوە بریتییە لەخۆ بەدوورگرتن

---

[١٠٧] – روه أحمد في مسنده، حديث رقم (٢٤٢٠) تحقيق: أحمد شاكر وأبوداود حديث رقم(٤٤٤٠). والترمذي حديث (١٤٥٥) والبيهقي في السنن (٢٣٣/٨) وإبن ماجه (١٨٧/٢).

[١٠٨] – رواه أبوداود في السنن(٤٤٤١) والترمذي(١٤٥٥).

[١٠٩] – أخرجه مسلم في صحيحه. كتاب/الحيض.

لەنێوان ناوك‌و ئەژنۆ، وتراوە: تەنها شوێنی دروستبوونی ئازارەکە، واتە (فرج) عەورەت، بەلأم ئەوەی کەبەقسەی لەپێش‌و دروست لەم مەسەلەیەدا وەردەگیرێت بریتیە لە: ڕابواردردنی دروست‌و لەزەت وەرگرتن بەهەموو شتێك بەلأم تەنها (جماع) جوت بوون نەبێت.

بەپێی ئایەتە پیرۆزەکە، ڕێگە پێدراو نیە پیاو لەگەڵ خێزانەکەی (جماع) بکات هەتا لەخوێنی عادەی مانگانە پاك دەبێتەوەو خۆی دەشوات (ئەمە بۆچونی زۆرینەی زانایانە).

٤- حەرامە جوتبوون لەگەڵ ئافرەتاندا لە پشتەوەیان.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿نِسَآؤُكُمْ حَرْثٌ لَّكُمْ فَأْتُوا۟ حَرْثَكُمْ أَنَّىٰ شِئْتُمْ وَقَدِّمُوا۟ لِأَنفُسِكُمْ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّكُم مُّلَٰقُوهُ وَبَشِّرِ ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾ (البقرە:٢٢٣).

واتە: (ژنی هاوسەرانتان کێڵگەن بۆتان وشوێنی چاندنی وەچەن، جا بەهەر شێوەیەك دەتانەوێت تۆو بوەشێننە ناو کێڵگەکەتانەوە (بەهیوای بەرهەم)و بۆخۆتان دەستپێشخەری بکەن (سەرەتا هاوسەری چاك‌و خواناس هەڵبژێرن، ولەوەو دوایش دوعاو نزاو خواپەرستی بەردەوام فەرامۆش مەکەن).

لە خوا بترسن خۆتان لەخراپە بپارێزن و دڵنیابن کەبەدیداری خوا شاد دەبنەوە و ئەم مژدەیەش بدەنە ئیمانداران).

پرسیار: بۆچی جوت بون لەکاتی عادەی مانگانەو لەپشتەوە لەگەڵ ئافرەتانی هاوسەر حەرامن؟

وەلأم: شەرعی خوا ئەوانەی حەرام کردووە چونکە زەرەرو زیان و ئازاری لێ دەکەوێتەوە، وەك ئایەتە قورئانیەکە ئاماژەی پێدا.

ئەوەش ڕوون کراوەتەوە کە: جوت بوون لەگەڵ هاوسەرەکان لەکاتی عادەی مانگانەدا، دەبێتە هۆی ڕودانی (إلتهاب) لە (المهبل)دا، وەك دەبێتە هوی ڕودانی (إلتهاب) لەناو ڕەحمدا بەهۆی سەرکەوتنی میکروب لە (المهبل)ەوە بۆناو ڕەحم لەڕێگای ملی بۆریەکەوە، هەروەها دەبێتە هوی خوێن بەربوون، کەئەوەش دەبێتە هۆی (نەزیف).

ئەمانەش بەهۆی (إلتهاب)ەکەوە بەرەوزیاد بون دەچن و ئازار پەیدا دەکەن لەناوچەی

حەوزدا هەروەها کەسی توش بوو هەست بەقورسی ئەو شوێنە دەکات، و پلەی گەرمی لەش بەرزدەکاتەوە، هەروەها هەندێك جار دەبێتە هۆی نەزۆك بوون. هەروەها بەنیسبەت پیاوانیشەوە، تووشی(إلتهاب)ی بۆری میزو هەموو ئەندامەکانی تۆو ڕژێن و زۆربوون دەبێت، وەبەناڕەحەتی میزو پیسایی بۆدەکرێت، هەروەها زۆرێکی تر لە ناتەندروستی و لەش قورسی و ماندوو بوون.

هەروەها جوت بوون لەکاتی عادەی مانگانەدا، دەبێتە هۆی دوورکەوتنەوەو دوورە پەرێزی ژن ومێرد، چونکە دیمەنی خوینی عادەی مانگانەو بۆنی ناخۆشی، شتانێکی بێزراون و سروشتی ئاسایی لێی بێزارەو دوورەپەرێز دەبێت و لێی هەڵدێت، ونەفس توشی گرژبوون و موچڕکە پیاهاتن دەکات، هەروەها ئافرەت لەکاتی عادەدا لەڕووی ئەندامی و نەفسیەوە ئامادە نیە بۆئەم بەیەکگەیشتنە جنسییە.

بەڵام دەربارەی جوت بوون لەگەڵ هاوسەرەکان لەپشتەوە، ئەمەش کارێکە نەفسەکان لێی هەڵدێن و دوورەپەرێز دەبن و عەقڵی ساغیش ڕەتی دەکاتەوە، چونکە پێچەوانەی سروشتی ساغ و ڕێکە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿نِسَاؤُكُمْ حَرْثٌ لَّكُمْ﴾. واتە شوێنی تۆو وەشاندنە، ئاماژەیە بۆئەوەی کەشوێنی جوت بوون کێڵگەکەیە، کە (فرج) پێشی ئافرەتە، چونکە شوێنی هاتنە دەری کۆرپەیە، هەروەك شوێنی چاندنیشە، وەك زەوی کەشوێنی کشتوکاڵ چاندنە. ئافرەت وەك زەوی کشتوکاڵی وایە، و (نطفة) وەك تۆوی چاندن و وەشاندن وایە، ومنداڵیش وەك ڕووەك و بەرهەمەکەیە ﴿فَأْتُوا حَرْثَكُمْ أَنَّى شِئْتُمْ﴾ واتە: چۆنتان ویست بۆئێوە ڕێگە دراوە کەلەزەت لەهاوسەرانتان وەرگرن، و لەگەڵیاندا لەشوێنی چاندنەوە و ڕووبەڕوو لەگەڵیاندا جوت بن.

هەروەها لەزیانەکانی لەدواوە جوت بوون لەگەڵ ئافرەتاندا دەبێتە هۆی تێکدان و عەیبدارکردنی کوم و ناڕێککردنی لەدروستبونی ناهاوسەنگی لەکاتی دانیشتن و چونە سەرئاودا، چونکە بەشی ناوپۆشی کۆم دادەبەزێنێت بەشێوەی خۆ نەویستانە، هەروەها دەبێتە هۆی دروستبونی گرفتی دەرونی بۆ پیاوان و ئافرەتان و دوور کەوتنەوەو کەنارگیریان لەیەکتری و ڕق بونیان لەیەکتری، هەروەها لادان لەشوێنی چاندنی تۆو هەروەها ئارەزوە جنسیەکان تێر ناکات نەبۆ پیاو نەبۆ ئافرەت، هەروەها دەرگای زینا کردن دەکاتەوە و دەبێتە هۆی گوێزانەوەی نەخۆشیە جنسیەکان کە پێشتر ئاماژەمان بۆ کرد، و ئافرەت لەمافی سروشتی و فیتری خۆی بێ بەش دەبێت لەوەرگرتنی لەزەتی

نسی ڕێك و پێك و ڕێگە پێدراو. هەروەها جوت بون لەپشتەوە، مەبەستی خوازراو بەدەست ناهێنێت چونکە مرۆڤ بۆ ئەو کارە بەد و قێزەون و حەرام و پیسە دروستنەکراوە.

هەروەها لەو زیانانەی کەلێی دەکەوێتەوە:

دەبێتە هۆی ڕەش داگیرسان و تاریکی ڕووخسار و دڵ و تێکچونی سروشتی ئینسان و سەرشۆڕکردن و کاریگەری لەسەر عەقڵ و ژێری دەبێت و دەبێتە هۆی لەدەستدانی هەست وسۆزو نەمانی شەرم و نەمانی نازو نیعمەت و تووشهاتنی بەڵاو نەهامەتی و هێنانی نەفرەت و ئەم کارە خاوەنەکەی تووشی پیسی وپۆخڵی و ناشرینی و بێهێزی جنسی و ڕەق بونی دڵ و دەرون و نەمانی بەزەیی دەکات، ورق و دووژمنایەتی تیا دەچێنێت و تووشی غەفڵەت و لەبیر چونەوەو چەق بەستوویی و پشت هەڵکردن و ئینکاری دەکات.[١١٠]

**سێیەم: سودوو وانە گرنگەکانی چیرۆکی لوط (علیه السلام):**

لە چیرۆکی لوط (علیه السلام)دا وەك لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە، ژمارەیەکی زۆر وانە و سودی گرنگی تیایە، لێرەدا هەندێکیان باس دەکەین:

١-(توحید): یەك خوا ناسی، بنەمای بانگەوازی گشتی پێغەمبەرانە (علیهم السلام)، هەر لە ئادەمەوە (علیه السلام) هەتا پێغەمبەری خۆمان ﷺ. خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ مِن رَّسُولٍ إِلَّا نُوحِي إِلَيْهِ أَنَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا أَنَا فَاعْبُدُونِ﴾ (الأنبياء:٢٥).

لوط پێغەمبەر(علیه السلام) بانگەوازەکەی بەباسکردنی عەقیدەی ڕاست و پاك و پوخت دەستی پێ کرد، کەعەقیدەی یەکخواناسی بوو وە خوای گەورە فەرمووی: ﴿كَذَّبَتْ قَوْمُ لُوطٍ الْمُرْسَلِينَ (١٦٠) إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ لُوطٌ أَلَا تَتَّقُونَ (١٦١) إِنِّي لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ (١٦٢) فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ (١٦٣) وَمَا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾ (الشعراء:١٦٠-١٦٤).

[١١٠]-مع الطب في القران الكريم. د\عبدالحميد دياب. د\احمد قرقوز ص\٧٤. والتبيان فيما يحتاجه الزوجان للشيخ جاسم مهلهل ص\١٠٧ بەکورتی ودەستکاریەوە.

سەرەتا بە عەقیدە و بیروباوەڕ دەستی پێ کرد، پێش ئەوەی کارە بەدو ناپەسەندەکانیان لێ قەدەغە بکات و ئینکاریان بکات، چونکە ڕێگا بۆ چاکسازیخوازو چاکسازی کۆمەڵایەتی و ئابوری و سیاسی، دەبێت هەر لەچاکسازی عەقیدەو بیرو باوەڕەوە دەست پێ بکات و پەرستشەکان پاك بکرێنەوەو بەدڵسۆزی ئەنجام بدرێن، ئەگەر پەرستشی چاك و ڕاست کراو لەدڵ ودەروونی باوەڕداراندا ڕەگی داکوتاو ئەو بەندایەتیە بەدڵسۆزی بۆ پەروەردگار ئەنجام درا، ئەوا ئیتر ڕێگا بۆ چاکسازی و گۆڕان ئاسان و ئامادە ساز دەبێت، وبەبێ بوونی عەقیدەو بیروباوەڕی ڕاست ودروست، هیچ هەوڵدانێك بۆ چاکسازی و گۆڕان کاری بەرهەمدارو سەرکەوتوو نابێت.

عەقیدەو بیروباوەڕ قەلایەکی بەهێزو پارێزەرەو بنەمایەکی بەهێزو چرای ڕوناکی ڕێگایە بۆ بانگخوازان و چاکسازان،

٢- لوط پێغەمبەر(علیه السلام) جوانترین و ناوازەترین نمونەی لەئارامی وخۆڕاگری و دامەزراوی لەسەر حەق هێنایەوە، حیکمەت لە کاری بانگەواز بۆ لای خوا و متمانە بوون بە خوا و دڵنیایی تەواو بە بەڵێنەکانی خوا، کەهیچ کات دواناکەوێت، وەك ئەوەی کە جوانترین و ناوازەترین نمونەی لەڕێزگرتنی میوان و چاودێری کردنی مافەکانیان و پێشوازی کردنیان هێنایەوە، کە لە حاڵێتێکی زۆر قورس وناڕەحەتدا بوو.

بەلام توانی میوانداریان بکات لەگەڵ ئەوەی کە قەومەکەی نەهی و قەدەغەی ئەوەیان کرد کە میوانداری غەریب و نەناس بکات و لەسزای ئەوەیش ئاگاداریان کردەوە: ﴿قَالُوا أَوَلَمْ نَنْهَكَ عَنِ الْعَالَمِينَ﴾(الحجر:٧٠).

کاتێك قەومەکەی بەپەلە چوون بۆلای ماڵی لوط (علیه السلام) و دەیانویست خراپە بکەن بەرامبەر میوانەکانی، بەلام لوط(علیه السلام)پارێزگاری دەکردو خەڵکەکەی دووردەخستەوە لێیان، و بەهەموو هەستێك کۆمەکی و هاوکاری دەکرد کەلەتوانیدا بوو، هەتا کار گەیشتە ئەوەی کە کچەکانی پێشنیار کرد بیکاتە هاوسەری هەندێکیان، تادەست درێژی نەکەنە سەر میوانەکانی، ئەمەیش وانەیەکی گرنگی تیابوو لەڕێزگرتنی میوان، پێغەمبەران (علیهم السلام) پێشەنگ و سەرمەشقی ئێمە بوون.

٣- هەڵوێستی لوط (علیه السلام) بەرامبەر قەومەکەی کاتێك بەپەلە هاتن بۆلای ماڵەکەی ویستیان دەست درێژی بکەنە سەر میوانەکان، ئەو بەهەموو توانای هەوڵیدا قەدەغەیان

ـات و ڕێگای ئەوکارەی لێ گرتن، تاحاڵی ناڕەحەت بوو ئینجا ئاوڕی دایەوە بەلای ـیوانەکانیدا وبەداوای لێبوردنەوە پێی وتن: ﴿قَالَ لَوْ أَنَّ لِي بِكُمْ قُوَّةً أَوْ آوِي إِلَى رُكْنٍ شَدِيدٍ﴾ (هود:٨٠).

لەم هەڵوێستەدا ئاماژەکراوە بۆ گرنگی هێز لەسەرخستنی حەق وبلاوکردنەوەی بانگەوازداو ڕووبەڕوو بونەوە بەڕووی ناحەقاندا. هەمیشە دەبێت هێزێك هەبێت حەق بپارێزێت، لەبەرئەوە تێکۆشان لەپێناوی خوادا، بۆگرتنی دەسەلات بووە بەسەر دەسەلاتی نەفامیدا، کە بێئەوەی خۆی بگۆڕێت و حەق بدۆزێتەوە دەگۆڕێت و بەزۆر خەڵکی ڕادەکێشێت بۆپەرستنی غەیری خواو هەمیشە لەکەمیندایە بۆ موسڵمانان، کەواتە دەبێت جیهاد و تێکۆشان هەبێت بۆلابردن وڕامالینی ئەو دەسەلات و دەستوورە ستەمکارە، هەتاڕێگاکە گونجاوو ئامادە سازبێت بۆ بانگەوازی خواو ڕێگای خۆی بدۆزێتەوە بۆناو خاوەنی دڵە ڕاستەکان و نەفسە بەشەوقەکان و عەقڵە تینوەکان بۆدینی خوا، کەدینی حەق و ڕێنماییە.

٤- هەروەها لەم چیرۆکە ئەوە وەردەگیرێت کەکافران لەسەر کوفرەکەیان سزادەدرێن و نزیکی و خزمایەتیان سودیان پێ ناگەیەنێت لەئەهلی ئیمان، نەلەنەسەب و نەلەژن وژن خوازیەوە. هەروەك ئەوەی کەباوەڕدار لەسەر باوەڕەکەی پاداشت وەردەگرێت و هیچ شتێکی لەنزیکانی لەکافران زیانی پێناگەیەنێت، بەڵگەیش ئایەتی: ﴿ضَرَبَ اللَّهُ مَثَلًا لِلَّذِينَ كَفَرُوا امْرَأَتَ نُوحٍ وَامْرَأَتَ لُوطٍ كَانَتَا تَحْتَ عَبْدَيْنِ مِنْ عِبَادِنَا صَالِحَيْنِ فَخَانَتَاهُمَا فَلَمْ يُغْنِيَا عَنْهُمَا مِنَ اللَّهِ شَيْئًا وَقِيلَ ادْخُلَا النَّارَ مَعَ الدَّاخِلِينَ﴾ (التحريم:١٠).

هەروەها ئایەتی: ﴿وَأَنْ لَيْسَ لِلْإِنْسَانِ إِلَّا مَا سَعَى (٣٩) وَأَنَّ سَعْيَهُ سَوْفَ يُرَى (٤٠) ثُمَّ يُجْزَاهُ الْجَزَاءَ الْأَوْفَى (٤١) وَأَنَّ إِلَى رَبِّكَ الْمُنْتَهَى﴾ (النجم:٣٩-٤٢).

هەروەها ئایەتەکانی ﴿يَوْمَ لَا يَنْفَعُ مَالٌ وَلَا بَنُونَ (٨٨) إِلَّا مَنْ أَتَى اللَّهَ بِقَلْبٍ سَلِيمٍ﴾ (الشعراء :٨٨-٨٩). و ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمْ وَاخْشَوْا يَوْمًا لَا يَجْزِي وَالِدٌ عَنْ وَلَدِهِ وَلَا مَوْلُودٌ هُوَ جَازٍ عَنْ وَالِدِهِ شَيْئًا إِنَّ وَعْدَ اللَّهِ حَقٌّ فَلَا تَغُرَّنَّكُمُ الْحَيَاةُ الدُّنْيَا وَلَا يَغُرَّنَّكُمْ بِاللَّهِ الْغَرُورُ﴾ (لقمان:٣٣). و ﴿لَنْ تَنْفَعَكُمْ أَرْحَامُكُمْ وَلَا أَوْلَادُكُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ يَفْصِلُ بَيْنَكُمْ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ﴾ (الممتحنة:٣).

خوای گەورە لوط (علیه السلام)و کەسوکارەکەی ڕزگار کرد بێجگە لەژنەکەی، ئەو تیاچوو، ئافرەتێکی پیری بێ مێشك بوو، لەسەر کوفرو بێ باوەڕی پیر بووبوو، لاواز بووبوو. بێگومان کاتێك مرۆڤ گەورەو بەتەمەن دەبێت و عەقڵ و ژیری پێ دەگات بیرو هۆشی پاك دەبێتەوەو شارەزایی زیاد دەکات، بەڵام ژنەکەی لوط، ئەو ئافرەتە پیرە بەپێچەوانەی ئەمەوە بوو، ڕووداوەکانی شەوان هیچی لەو زیاد نەکرد وکوێرانە هەنگاوی دەناو لەبێئاگایی و گومڕاییدا دەژیا.

# بەشی پێنجەم

## چیرۆکی یوسف ( علیه السلام ) لەگەڵ ژنەکەی عەزیزی میسردا

### پێشەکی:

چیرۆکی یوسف (علیه السلام) لەگەڵ ژنەکەی عەزیزدا، بەشێکە لەچیرۆکی یوسف (علیه السلام) کە خوای گەورە لە سوورەتێکدا هێناویەتی کەسوورەتی (یوسف)ە، هەر بەناوی (یوسف)یشەوە ناونراوە، وەك ڕێزێك بۆ (یوسف) (علیه السلام) کە پێغەمبەری خوایە، یوسفی ڕاستگۆی کوڕی پێغەمبەری خوا(یعقوب)ی کوڕی پێغەمبەری خوا (إسحاق)ی کوڕی (إبراهیم)ی باوکی پێغەمبەران (علیهم السلام) بە پێی فەرمودەی پێغەمبەر(ﷺ) (بەڕێزی کوڕی بەڕێزی کوڕی بەڕێزی کوڕی بەڕێزە).[111] لقێکە لەلقی درەختە پاکەکەی پێغەمبەران (علیهم السلام) کەبەئادەم (علیه السلام) دەست پێ دەکات و بە محمد(ﷺ) کۆتایی پێ دێت. خوای گەورە لەسەرەتای سوورەتی یوسف دا دەفەرموێت: ﴿تِلْكَ آيَاتُ الْكِتَابِ الْمُبِينِ﴾ (یوسف:١).

ئاماژەیە بۆ قورئانی پیرۆز کە کتێبێکی ڕوون و ئاشکرایە و هیچ ئاڵۆزی و پێچ و پەنای تیانیە وڕاستیەکان دەردەخات کارەکان ڕوون دەکاتەوە،لەناو ئەوشتانەدا کەڕوونی کردوەتەوە ودەری خستووە، بریتییە لە چیرۆکی یوسف (علیه السلام) ﴿إِنَّا أَنزَلْنَاهُ قُرْآنًا عَرَبِيًّا لَّعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ﴾(یوسف:٢).

زمانی عەرەبی زمانێکی ڕەسەنە و دەوڵەمەندە بەووشەو پێکهاتەو شێوازو لێکدانەوەی زۆر، بەڕاستی خوای گەورە بەوزمانە قورئانی دابەزاندووە تازیاتر ڕەسەن ودەوڵەمەند وبڵاوبێت، خوای گەورە بەزمانی عەرەبی دایبەزاندووە تاخەڵکی لەماناکەی تێبگەن. کە عەقڵەکان ڕوناك دەکاتەوە ودڵەکان ڕۆشن وچراخان دەکات وسنگەکان گوشادو وکراوە دەکات﴿نَحْنُ نَقُصُّ عَلَيْكَ أَحْسَنَ الْقَصَصِ بِمَا أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ هَٰذَا الْقُرْآنَ وَإِن كُنتَ مِن قَبْلِهِ لَمِنَ الْغَافِلِينَ﴾ (یوسف\٣).

---

[111] -(رواه البخاري في صحيحه \في كتاب\احاديث الأنبياء).

چیرۆکە قورئانیەکان جوانترین چیرۆکن، چونکە چیرۆکی ڕاستن ولەواقیعدا ڕوویان داوە، ئامانجدارن، و لەسەر ئەوە (أحسن القصص)ن، کەوروشەکانیان جوانەو شێوازەکانیان ناوازەو بەرزن و مەبەستەکانیان مەبەستی بالأو ڕونن، و ماناکانیان ووردن، چونکە لەلایەن باشترین بڕیاردەرەوە دابەزێنراوە. خوای گەورە فەرمویەتی:کەئەمە ماناکەیەتی(خوا جوانترین و پیرۆزترین فەرمایشتی ناردووەتە خوارەوە، کەئەم قوروانەیە (لەجوانی داڕشتندا) بابەتەکانی لەیەك دەچن، هەندێك باسیشی بەشێوازی جیاواز تیا دووبارە بوەتەوە، جاکارکردی ئەم قورئانە ئەوەیە کە: تەزوودەهێنێت بەگیان و پێستی ئەوکەسانەدا کەترسی پەروەردگاریان لەدڵ و دەروونددا هەیە،پاشان گیان وپێست و دڵیان نەرم وئامادەو چالاك دەبێت بۆیادی خواو خواپەرستی، ئائەوە هیدایەت وڕێنمویی خوایە،کەهەرکەس شایستەبێت هیدایەت وڕێنمویی دەکات بۆئەو پلەو پایە بەرزانە، ئەوەش کەڕێبازی خوا ون بکات کەس نیە ڕێنمویی بکات)(الزمر\٢٣).

شایانی باسە کە لێرەدا ئاماژە بکەین بۆ: لەقورئاندا شتێك نیە جیاوازو بەڕێزترو ڕێزدار تربێت لەشتێکی تر،وهیچ چیرۆکێکیش لەچیرۆکێکی تر جوانتروچاك ترنیە، بەڵکو هەرچیرۆکێك شێوازی خۆیی وڕێگای خۆی ودەربڕین ومەبەستی خۆیی هەیە. قورئان ووتەو دەربڕینی خوایە، لەجوان دەربڕین و هێزو پێزو ناوازەییدا یەك پلەی هەیە، بۆهەمووکات وشوێنێك دەشێت، چیرۆکی یوسف(علیه السلام) لەجوانترینی چیرۆکەکانە، چونکە بەشێکە لەچیرۆکە قورئانیەکان، هەروەها ژمارەیەکی زۆر پەندو ئامۆژگاری و وانەی بەسودوو گرنگی تیایە، وبابەت ومەبەستەکانی زۆرێك لەشتەکانی چارەسەرکردووە ﴿وَإِن كُنتَ مِن قَبْلِهِ لَمِنَ الْغَافِلِينَ﴾.

واتە: ئەی محمد(ﷺ) تۆ دەربارەی چیرۆکی یوسف (علیه السلام) لە بێئاگایان بویت، کاتێك کە لەڕێگەی (وەحی)یەوە هێشتا بۆت نەهاتبوو، بەلأم خوای گەورە فێری کردیت کە تۆ نەتزانیبوو. خوای گەورە دەفەرموێت: -کە ئەمە ماناکەیەتی- (خوای گەورە قورئان ودانایی بۆدابەزاندوویت و فێری ئەوشتانەی کردوویت، کە جاران (پێشتر) نەتدەزانی، بەردەوامیش فەزڵ و ڕێزی خوا لەسەرتۆ ئەی محمد(ﷺ) زۆر فراوان وئاشکراو دیارە)(النساء:١١٣).

**لەم چیرۆکەو هەروەها لەچیرۆکەکانی تریشدا نیشانەی ڕوون وبەڵگەی یەکلایی کەرەوە، لەسەر پێغەمبەرایەتی محمد(ﷺ) زۆرن، چونکە ئەم هەواڵە نەزانراوە، تەنها لەڕێگەی وەحیەوە نەبێت.**

﴿إِذْ قَالَ يُوسُفُ لِأَبِيهِ يَا أَبَتِ إِنِّي رَأَيْتُ أَحَدَ عَشَرَ كَوْكَبًا وَالشَّمْسَ وَالْقَمَرَ رَأَيْتُهُمْ لِي سَاجِدِينَ﴾(يوسف\٤). **چیرۆکی یوسف بە خەونێك دەست پێ دەکات کە یوسف( علیه السلام) بینیویەتی و بۆباوکی گێڕاوەتەوە. بە بەرچاو ڕوونی پێغەمبەران وڕەحمەتی باوکایەتی و خۆشەویستی و ترسی لەسەر کوڕەکانی، یەعقوب (علیه السلام) وەڵامی یوسفی کوڕی دەداتەوە و دەڵێت:** ﴿قَالَ يَا بُنَيَّ لَا تَقْصُصْ رُؤْيَاكَ عَلَى إِخْوَتِكَ فَيَكِيدُوا لَكَ كَيْدًا إِنَّ الشَّيْطَانَ لِلْإِنسَانِ عَدُوٌّ مُّبِينٌ (٥) وَكَذَلِكَ يَجْتَبِيكَ رَبُّكَ وَيُعَلِّمُكَ مِن تَأْوِيلِ الْأَحَادِيثِ وَيُتِمُّ نِعْمَتَهُ عَلَيْكَ وَعَلَى آلِ يَعْقُوبَ كَمَا أَتَمَّهَا عَلَى أَبَوَيْكَ مِن قَبْلُ إِبْرَاهِيمَ وَإِسْحَاقَ إِنَّ رَبَّكَ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾(يوسف:٥-٦).

**لێرەدا ئاماژە دەکەین بۆ بەلاغەت و جوان دەربڕینی قورئان لەناوازەیی دەست پێ کردنی چیرۆکەکە، کەزۆر بەجوانی لەگەڵ کۆتاییەکەیدا ڕێك دەکەوێت و دەگونجێت، کەچیرۆکەکە بەبینینی خەونێك دەست پێ دەکات، ولەکۆتایشدا هاتنەدی خەونەکە جێ بەجێ دەبێت، ئەمەش بەویست وقودرەت و زانست وحیکمەت وڕەحمەتی خوا. خوای گەورە دەفەرموێت:** ﴿فَلَمَّا دَخَلُوا عَلَى يُوسُفَ آوَى إِلَيْهِ أَبَوَيْهِ وَقَالَ ادْخُلُوا مِصْرَ إِن شَاءَ اللَّهُ آمِنِينَ (٩٩) وَرَفَعَ أَبَوَيْهِ عَلَى الْعَرْشِ وَخَرُّوا لَهُ سُجَّدًا وَقَالَ يَا أَبَتِ هَذَا تَأْوِيلُ رُؤْيَايَ مِن قَبْلُ قَدْ جَعَلَهَا رَبِّي حَقًّا وَقَدْ أَحْسَنَ بِي إِذْ أَخْرَجَنِي مِنَ السِّجْنِ وَجَاءَ بِكُم مِّنَ الْبَدْوِ مِن بَعْدِ أَن نَّزَغَ الشَّيْطَانُ بَيْنِي وَبَيْنَ إِخْوَتِي إِنَّ رَبِّي لَطِيفٌ لِّمَا يَشَاءُ إِنَّهُ هُوَ الْعَلِيمُ الْحَكِيمُ (١٠٠) رَبِّ قَدْ آتَيْتَنِي مِنَ الْمُلْكِ وَعَلَّمْتَنِي مِن تَأْوِيلِ الْأَحَادِيثِ فَاطِرَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ أَنتَ وَلِيِّي فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ تَوَفَّنِي مُسْلِمًا وَأَلْحِقْنِي بِالصَّالِحِينَ﴾(يوسف\٩٩-١٠١).

## باسی یەکەم:
## یوسف (علیه السلام) لەماڵی عەزیزی میسردا:

یوسف (علیه السلام) بەسەر ژمارەیەکی زۆر لەنارەحەتیدا تێپەڕی، لەوانە: فێڵ ونەخشەی براکانی وحەسودی بردنیان پێی و ئەوەی لەبەرهەمی ئەو حەسودیەوە کەوتەوە، هەموو لەپێناو ئەوەدا ڕزگاریان بێت لەدەستی، هەستان فڕێیان دایە ناوبیرەوە،هەروەهادوایئەوە بەنارەحەتییەکی تردا تێپەڕی، کە بەندکردنی بوو، بەجۆرێك کەکرایە کاڵاو بازرگانی پێوەکرا، پاشان چووە ماڵەکەی عەزیزەوە. ئەمەش ڕێزێك بوو بۆئەو سەرەڕای ئەوهەوڵەی درا بۆ لەخشتەبردنی، پاشان نارەحەتی زیندان کردن، پاش ئەوەش خوای گەورە دەرووی خێری لێ کردەوەوخستیەناو خۆشیەوە، کاتێك لەزیندان دەرچوو، پاش ئەوەی کەگشت کەس(هەمووخەڵکی) زانییان یوسف پاك وبێتاوانە، وپاشان بوو بە وەزیر، تا کەشتی میسربەئەمانەت وشارەزاییەوە بگرێتە دەست، ولەساڵانی بێ بارانیەوە بیگوێزێتەوە بۆساڵانی پڕبارانی وپڕ لەخێرو بەرەکەت و نازو نیعمەت،پاشان نازو نیعمەتەکان لەسەر یوسف تەواو دەبن و بەپایان دەگەن،و پاش ئەوەیش بەکەسوکارو خۆشەویستانی دەگاتەوە وشاددەبێتەوە.

### لە ماڵەکەی عەزیزی میسردا

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿وَقَالَ الَّذِي اشْتَرَاهُ مِن مِّصْرَ لِامْرَأَتِهِ أَكْرِمِي مَثْوَاهُ عَسَى أَن يَنفَعَنَا أَوْ نَتَّخِذَهُ وَلَدًا وَكَذَلِكَ مَكَّنَّا لِيُوسُفَ فِي الْأَرْضِ وَلِنُعَلِّمَهُ مِن تَأْوِيلِ الْأَحَادِيثِ وَاللَّهُ غَالِبٌ عَلَى أَمْرِهِ وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ (٢١) وَلَمَّا بَلَغَ أَشُدَّهُ آتَيْنَاهُ حُكْمًا وَعِلْمًا وَكَذَلِكَ نَجْزِي الْمُحْسِنِينَ﴾(یوسف:٢١-٢٢).

یوسف لە دوای بیرەکە گوێزرایەوە بۆ ماڵی عەزیزی میسر، پاش ئەوەی کە بەناو نارەحەتیدا تێپەڕی، لە نارەحەتییەکەوە گوێزرایەوە بۆ نارەحەتییەکی تر، لەنارەحەتی و تەنگەبەری دڵی براکانیەوە وستەمیان بۆ تەنگەبەری ناوبیرو تاریکیەکەی و لەوێشەوە بۆ تەنگەبەری کردن بەبەندەیی تا کرا بەبەندە و عەزیزی میسر کڕی بۆخۆی.

عەزیزی میسر لەو کاتەدا کێ بوو؟

وتراوە: بەرپرسی پۆلیس بووە یان وتراوە کاربەدەستی سەر گەنجینەکانی میسر بووە(وەزیری کشتوکاڵ و ئابوری وبازرگانی ودارایی وخۆراك) زانایان جیاوازیان لەناویدا هەیە، وتویانە ناوی(قطفیر) یان (إطفیر)بووە،پاشایش ناوی (الریان بن الولید)بووە، ولەعەمالیقەکان بووە، لەژیانیدا باوەڕی هێنابە یوسف ومرد،پاش ئەو (قابوس بن مصعب) کاری گرتە دەست، ویوسف بانگەوازی کرد بۆموسڵمان بوون، بەڵام ڕەتی کردەوە، (الزمخشري) لە (الکشاف)دا ئەمەی باس کردووە.[١١٢]

(زانایانی تەفسیر زۆر شتی ڕاجیاوازیان لەسەر وتوە، ئێمەدرێژەی پێ نادەین).

دکتۆر (سید جبل) (خوالێی ڕازی بێت) دەڵێت: (...زانایانی تەفسیر زۆرشتیان باسکردووە دەربارەی ناوی عەزیز وژنەکەی و ناوی پاشای گەورەی میسر، کەهەموویان تەنها قسەو بۆچونن و هیچ (سند)ێك نیە لەسەر ئەمە کەپشتی پێ ببەسترێت، نەلە قورئان نەلە سوننەتدا).[١١٣]

لە قسەکانی عەزیزو ژنەکەیەوە ئەوەمان بۆدەردەکەوێت لەچیرۆکەکەدا کەئەوان بێبەشن لەمنداڵ، ئەمەیش بەو واتایەی کەعەزیز نەزۆکە، ئەمە بەڵگەی لەسەر نیە، وەتەنها خوای گەورەیش ڕاستی مەبەستەکە دەزانێت، عەزیز یوسفی کڕی وخەیرو چاکەی لێ چاوەڕوان دەکرد، فەرمانی کرد بەژنەکەی، کەلەگەڵیدا چاکەکار بێت وڕێزی بگرێت خوای گەورە فەرموی: ﴿وَقَالَ الَّذِي اشْتَرَاهُ مِن مِّصْرَ لِامْرَأَتِهِ أَكْرِمِي مَثْوَاهُ عَسَىٰ أَن يَنفَعَنَا أَوْ نَتَّخِذَهُ وَلَدًا وَكَذَٰلِكَ مَكَّنَّا لِيُوسُفَ فِي الْأَرْضِ وَلِنُعَلِّمَهُ مِن تَأْوِيلِ الْأَحَادِيثِ وَاللَّهُ غَالِبٌ عَلَىٰ أَمْرِهِ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ﴾ (یوسف\٢١).

(المثوی) شوێنی مانەوە و نیشتەجێ بوون بوو، ﴿أَكْرِمِي مَثْوَاهُ﴾، واتە: (ڕێزی لێ بگرە و شوێنی مانەوەی باشی بۆ ئامادە بکە و کاروبارەکانی بۆجێ بەجێ بکەو گرنگی پێ بدە.

لە تەفسیری (المنار)دا دەڵێت: (ئەم پاشا گەورەیە زۆرباش شارەزا بوو لەیوسف و پێشنیاری جوانی بۆکردو ڕاست دەرچوو،کاتێك کەئامۆژگاری ژنەکەی کرد کەڕێزی لێ

---

[١١٢]-(الكشاف للزمخشري، ٢\٥٤٣).

[١١٣]-تفسير سورة يوسف تاليف الدكتور السيد احمد خليل جبل ص\٥٦.

بگرێت وشوێنی باشی بۆئامادەبکات، لەئامۆژگار یەکەیدا ڕێزگرتن وبەجوانی مامەڵەکردن هەبوو بەهەموو ئەو شتانەی کەپەیوەندیداربوون بەمانەوە وشوێنی یوسفەوە، بەجۆرێك کەئەندامێك بێت لەخۆیان نەك وەك بەندەو خزمەتکار تەماشای بکرێت).[١١٤]

﴿عَسَىٰ أَن يَنفَعَنَا أَوْ نَتَّخِذَهُ وَلَدًا﴾(یوسف\٢١).

نهێنی گرنگی پێ دانەکەی بەم کوڕە ڕوون کردەوە، کەچاوەڕێی چاکەو خەیری لێ دەکات، وەك قورئان هەواڵی داوە وتی: ﴿عَسَىٰ أَن يَنفَعَنَا﴾ بەڵکو لەداهاتوودا هەستێت بەجێ بەجێ کردنی هەندێك لەکارە تایبەتیەکانمان، یان کاری دەوڵەت بەگشتی. ﴿أَوْ نَتَّخِذَهُ وَلَدًا﴾ یان دەیکەین بە کوڕی خۆمان تا ببێتە بینایی چاوەکانمان ودڵ ودەرونمانی پێ ڕووناك ببێتەوە و ببێتە قەرەبوو بۆ ئەوەی کە ئێمە لێی بێبەش بوین ﴿وَكَذَٰلِكَ مَكَّنَّا لِيُوسُفَ فِي الْأَرْضِ﴾(یوسف:٢١). وەك ئەوەی کەنانونیعمەتمان ڕشت بەسەریوسفدا بەڕزگاربوون لەبیرەکەو دڵی عەزیزمان نەرم کرد لەسەری (لەسەر زەویدا جێگیرو دامەزراومان کرد).

دکتۆر (عبدالحمید طهمان) دەڵێت: (بەپێی عادەت و دەستوور وایە، کەبەندە سوکایەتی پێ دەکرێت و ڕێزی لێ ناگیرێت، بەڵام خوای گەورە ئەوەی بۆ یوسف (علیه السلام) فەراهەم کرد کەڕێزی لێ بگیرێت وسەربەرزبێت و لەبەرزترین ماڵی میسردا بێت، ئەمەیش بەڵگە بوو لەسەر گرنگی پێ دان وچاودێری خوایی بۆ یوسف، کەلەناڕەحەتی وغەریبی وبەندکراویدا بوو، لەکەس وکاری بێ بەش بوو، خوای گەورە شوێنێکی بەڕێزانەی بۆفەراهەم کرد لەخاکی میسردا، هەتا عەزیزی میسر –کە پیاوی دووەم بوولەدەسەڵاتی میسردا– فەرمانی کرد بەژنەکەی بەدەر لەهەموو بەردەستەکانی گرنگی بەیوسف بدات و ڕێزی بگرێت و شوێنی بۆئامادەبکات).[١١٥]

﴿وَلِنُعَلِّمَهُ مِن تَأْوِيلِ الْأَحَادِيثِ وَاللَّهُ غَالِبٌ عَلَىٰ أَمْرِهِ﴾(یوسف\٢١).

---

[١١٤]-(تفسیر المنار ٢٢٥-٢٢٦)بەکورتی ودەستکاریەوە.

[١١٥]-(الوحی والنبوة والعلم فی سورة یوسف ص\٤٠).

واتە: (فێری لێکدانەوەی خەونەکانی دەکەین، کەزانستێکە لەلایەن خواوەیە، هەموو کەس شارەزای نابێت تەنها کەسانێکی تایبەت نەبێت لەزانایانی دڵسۆز، کەخاوەنی ژیری و عەقڵی ڕووناك و نەفسی پاك و دڵی ساغ و بەرچاوڕوون بن، بەڕاستی خوای گەورە ڕێزی لەبەندەو پێغەمبەر یوسف (علیه السلام) گرت، بەفێرکردنی ئەم زانستە.

﴿وَاللَّهُ غَالِبٌ عَلَى أَمْرِهِ﴾ هیچ شتێك لەموڵك ودەسەڵاتی خوادا ڕونادات مەگەر خۆی بیەوێت، خوای گەورە بەتواناو بەدەسەڵاتە بەسەر هەموو شتێکدا، خوای گەورە دەفورموێت: ﴿فَسُبْحَانَ الَّذِي بِيَدِهِ مَلَكُوتُ كُلِّ شَيْءٍ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ﴾(یس\٨٢).

واتە: (هەر کاتێك فەرمانی خوا دەرچوو، ویستی شتێك جێ بەجێ بکات و بیهێنێتەدی، پێی دەڵێت: ببە، ئەویش دەست بەجێ بێ دواکەوتن پێشدێت و ئەنجام دەدرێت و دروست دەبێت).

خوای گەورە زاڵ وبەدەسەڵاتە بەسەر کاروباری یوسفدا، چاودێری دەکات ودەیپارێزێت بەعیلم وبەزەیی خۆیی و گرنگی پێ دانی، بێگومان براکانی یوسف شەڕێکیان حەشاردابوو، و دەیانویست کەلەدەست یوسفی برایان ڕزگاریان ببێت، وبێبەشی بکەن لەباوکی، وباوکیشی لەو بێبەش بکەن، بەڵام خوای گەورە خێری بۆ یوسف ویست، پاراستی و ڕێزی لێ گرت وفێری زانستی کردو لەسەرزەوی میسردا جێگیری کرد گشت کەسوکارەکەی بۆکۆکردەوە﴿وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ﴾ بەڕاستی زۆرینەی خەڵکی بەم ڕاستیانە نازانن، نازانن کەخوایگەورە چەند بەڕێك وپێکی کارەکانی جێ بەجێ دەکات، نازانن کەسوننەتەکانی خوا هەمیشەییە و فەرمانی بەجێیەو کارەکانی هەردەبێت بەپایان بکات.﴿وَلَمَّا بَلَغَ أَشُدَّهُ آتَيْنَاهُ حُكْمًا وَعِلْمًا وَكَذَٰلِكَ نَجْزِي الْمُحْسِنِينَ﴾(یوسف\٢٢).

واتە: یوسف (علیه السلام) گەیشتە کاتی بەهێزبوونی جەستەیی (إبن كثير)دەڵێت﴿وَلَمَّا بَلَغَ أَشُدَّهُ﴾ واتە:عەقڵی تەواو پێگەیشت پێکهاتەی جەستەیشی تەواو بوو.

ئایەتی: ﴿آتَيْنَاهُ حُكْمًا وَعِلْمًا﴾ ووشەی(الحكم) بریتیە لەزانستێکی بەسود کەکردەوەی لەگەڵ بێت، بریتیە لە تێگەیشتن و توانای وەرگرتن وقودرەت وتوانا بەسەرکارەکاندا و ڕوو بەڕوو بونەوەی نارەحەتیەکان هەروەها بریتیە لەجیاکردنەوە لەنێوان خەڵکیدا و ڕێکخستنی کاروبارەکانیان، هەروەها بریتیە لەپێغەمبەراتی و بەرهەمەکانی. زانایانی

تەفسیر ڕاوبۆچونی جیاوازیان لە مەبەستی ووشەی (الحکم) هەیە، ئێمە تەنها ڕا و بۆچونی (إبن کثیر) دەنوسین، کە دەڵێت: (واتە پێغەمبەرایەتی، بەو هۆیەوە خۆشەویست بوو لەناو ئەو خەڵکانەدا کەلەگەڵیاندا بوو).[116]

﴿وَكَذَٰلِكَ نَجْزِي الْمُحْسِنِينَ﴾. واتە: بەوشێوەیە پاداشتی چاکەکاران دەدینەوە بەپێی چاکەکانیان.

(الأحسان) پلەیەکی بەرزە لەپلەکانی ئیمان، لەفەرمودەکەی (جبریل)دا کاتێك پرسیاری کرد لەپێغەمبەر (ﷺ) دەربارەی (الأحسان) لەوەلأمدا فەرمووی (واتە: وا خوای گەورە بپەرستیت کەدەیبینیت، خۆ ئەگەر تۆ ئەوت نەبینی بێگومان ئەوتۆدەبینێت)[117] لەئایەتی﴿وَلَمَّا بَلَغَ أَشُدَّهُ آتَيْنَاهُ حُكْمًا وَعِلْمًا وَكَذَٰلِكَ نَجْزِي الْمُحْسِنِينَ﴾دا خوای گەورە بۆمان ڕوون دەکاتەوە کە (الحکم)و(العلم) دوونیعمەتی خواییین، خوای گەورە کەسانێکی پێ تایبەتمەند دەکات کەخۆی بیەوێت و (الأحسان) کلیلی هەموو خەیرو دەروازەیەکە، ئەم ئایەتە پێش ئایەتی باسی لەخشتەبردنەکە هات، بۆئەوەی هەموتۆمەتێك لەیوسف بەدووربگرێت، تابەپاکی ڕایگرێت لەهەموو شتێك کەشیاو نیە بەپلەو پایەی ئەو، کەهاتنی ئەم ئایەتە بوو، ئاماژەبوو بۆئەوەی کەئەم سیفەتانە پاك وجوانن، تەنها خەیرو چاکە بلأودەکەنەوە.

---

[116]-تفسیر القران العظیم(٢\٤٧٣).

[117]-رواه البخاری في صحیحه، رواه مسلم في صحیحه.

**باسی دووەم:**

**هەوڵی لەخشتەبردنی ژنەکەی عەزیز بۆ یوسف (علیه السلام) وپاراستنی یوسف:**

**ڕونکردنەوەی مانای (المراودة) لەخشتەبردن و چۆن بوو؟ و هەڵویستی یوسفی ڕاستگۆ بەرامبەری:**

**خوای گەورە لە سوورەتی (یوسف)دا دەفەرموێت:** ﴿وَرَاوَدَتْهُ الَّتِي هُوَ فِي بَيْتِهَا عَن نَّفْسِهِ وَغَلَّقَتِ الْأَبْوَابَ وَقَالَتْ هَيْتَ لَكَ قَالَ مَعَاذَ اللَّهِ إِنَّهُ رَبِّي أَحْسَنَ مَثْوَايَ إِنَّهُ لَا يُفْلِحُ الظَّالِمُونَ (٢٣) وَلَقَدْ هَمَّتْ بِهِ وَهَمَّ بِهَا لَوْلَا أَن رَّأَىٰ بُرْهَانَ رَبِّهِ كَذَٰلِكَ لِنَصْرِفَ عَنْهُ السُّوءَ وَالْفَحْشَاءَ إِنَّهُ مِنْ عِبَادِنَا الْمُخْلَصِينَ (٢٤) وَاسْتَبَقَا الْبَابَ وَقَدَّتْ قَمِيصَهُ مِن دُبُرٍ وَأَلْفَيَا سَيِّدَهَا لَدَى الْبَابِ قَالَتْ مَا جَزَاءُ مَنْ أَرَادَ بِأَهْلِكَ سُوءًا إِلَّا أَن يُسْجَنَ أَوْ عَذَابٌ أَلِيمٌ (٢٥) قَالَ هِيَ رَاوَدَتْنِي عَن نَّفْسِي وَشَهِدَ شَاهِدٌ مِّنْ أَهْلِهَا إِن كَانَ قَمِيصُهُ قُدَّ مِن قُبُلٍ فَصَدَقَتْ وَهُوَ مِنَ الْكَاذِبِينَ (٢٦) وَإِن كَانَ قَمِيصُهُ قُدَّ مِن دُبُرٍ فَكَذَبَتْ وَهُوَ مِنَ الصَّادِقِينَ (٢٧) فَلَمَّا رَأَىٰ قَمِيصَهُ قُدَّ مِن دُبُرٍ قَالَ إِنَّهُ مِن كَيْدِكُنَّ إِنَّ كَيْدَكُنَّ عَظِيمٌ (٢٨) يُوسُفُ أَعْرِضْ عَنْ هَٰذَا وَاسْتَغْفِرِي لِذَنبِكِ إِنَّكِ كُنتِ مِنَ الْخَاطِئِينَ﴾(یوسف\٢٣-٢٩).

**ئایەتە پیرۆزەکان ئەوەمان بۆ ڕوون دەکەنەوە کەچی لە ژنەکەی عەزیزەوە ڕوویدا، کە بەهۆی جوانی یوسفەوە توشی فیتنە هاتبوو، و بە هەموو ڕێگایەك هەوڵیدا کە مەیلی یوسف بەلای خۆیدا ڕابکێشێت وتووشی فیتنەی بکات، هەروەها هەڵویستی یوسفی ڕاستگۆمان بۆ ڕوون دەکاتەوە بەرامبەر ئەو هەوڵی لەخشتەبردنە، و وێنەی ئەو دیمەنەمان بۆ دەکێشێت، کەبەڵگەیە لەسەر ناوازەیی شێوازی داڕشتنی قورئان و جوانی شێوازی جوان دەربڕین و لێکدانەوەکەی.**

**دێینە سەر ڕونکردنەوەی مانا و ڕاڤەی ئایەتەکان، ئایەتی:** ﴿وَرَاوَدَتْهُ الَّتِي هُوَ فِي بَيْتِهَا عَن نَّفْسِهِ﴾ **ووشەی (الرود) لە (المفردات)ی (الراغب الأصبهانی)دا، واتە داواکردنی شتێك بەنەرم ونیانی. ....(المراودة) تۆ شتێك بکەیت لەگەڵ غەیری خۆتدا کە بە پێچەوانەی ویستی ئەوەوە بێت، تۆ شتێکت دەوێ ئەو نایەوێت، وئەوشتێکی دەوێت کەتۆ**

ناتەوێت. (المراودة) بریتیە لەداواكردنی كارێك بەنەرم و نیانی وشێوازی هەڵخەڵەتاندن، وكەسەكە زۆر هاتوو چۆ بكات ڕوو لەو كەسە بكات كەدەیەوێت لەخشتەی بەرێت وهەڵی خەڵەتێنێت، وپشتیشی لێ هەڵبكات، و(راودها عن نفسها) واتەدوای لێ كرد لەگەڵیدا بەیەك بگات وكاری ناشەرعی ئەنجام بدات.

(إبن عطیة) لە تەفسیرەكەیدا دەڵێت: (المراودة واتە: الملاطفة) دواكردنی شتێك بۆ مەبەستێك بە نەرم ونیانی وسۆزو عاتیفەوە، وزۆر ئەم ووشەیە لەماناداا لەنێوان پیاوان و ئافرەتاندا بەكاردێت.[118]

كاتێك لە ئایەتی: ﴿وَرَاوَدَتْهُ الَّتِي هُوَ فِي بَيْتِهَا عَن نَّفْسِهِ وَغَلَّقَتِ الْأَبْوَابَ وَقَالَتْ هَيْتَ لَكَ﴾ ورد دەبینەوە، ئەوەی بۆمان دەردەكەوێت بریتییە لە: ئافرەتەكە – ژنەكەی عەزیزی میسر – هەستا بە كۆمەڵێك هەوڵدانی زۆر و پەنای برد بۆ فڕ و فێڵی جۆرا و جۆر، بۆ هەڵخەڵەتاندنی یوسف (علیه السلام) تا بیخاتە ناو ئەو داو و نەخشانەوە كە خۆی كێشا بووی، لەو هەوڵانەیش بریتی بوون لە: بۆ نمونە- دەرخستنی جوانی خۆی وهەندێ هەڵس و كەوتی سەرنج ڕاكێش وبەنەرم ونیانی قسەكردن و خستنە ژێر سۆز و عاتیفە و نەنجە و لار كردن لە رۆیشتندا وشتانی تریش، كەئەمانەش غەریزەو ئارەزووە شاراوەكان دەوروژێنێت ودەجوڵێنێت، دەبێت ئەم قۆناغە ماوەیەكی زۆری خایاندبێت وئافرەتەكە شەوق وحەزی زۆربوبێت وگڕی سەندبێت، لەسور حەز بوبێت وسووربوبیت وەنگاوی نابێت ودەست پێشخەر بوبێت، بەڵام یوسف(علیه السلام) خۆی بەپاك و دوور نەتاوان ڕاگرت، وخۆپارێزو ئارامگر بوو دامەزراو و خۆڕاگربوو لەبەردەم شەپۆلەكانی فیتنەو ناڕەحەتیدا، لێرەدا نهێنی لێكدانەوەی قورئانمان بۆ دەردەكەوێت (المراودة) لەسەر وەزنی (المفاعلة)یە، ئەم (صیغة) شێوازە (مبالغة) زۆر دووبارە بونەوە دەگەیەنێت لە كارەكەدا. هەوڵی لەخشتە بردنەكەی ژنەكەی عەزیز بۆ یوسف بەهۆی جوانییەكەی یوسفەوە بوو.﴿وَغَلَّقَتِ الْأَبْوَابَ وَقَالَتْ هَيْتَ لَكَ﴾ بێگومان ئافرەتەكە هەموو هۆكارێكی ئامادە بۆكردنی بەكارهێنا، هیچ ڕێگایەك لەبەردەمیدا نەمایەوە تابیگەیەنێتە ئەنجامدانی كارەخراپ و پیسەكەی تەنهائەوە نەبێت كەدانی پیاناو دەری بڕی، ئینجا هەستا بەداخستنی هەموو دەرگاكان، وبانگی یوسفی كرد بۆلای خۆی و وتی: ئێستا من خۆم بۆتۆ ئامادەكردووە، وەرە بۆئەنجام دانی ئەوكارەی من داوای دەكەم، قورئان

---

[118] -المحرر الوجیز٣\٢٢٣.

وشەی: ﴿وَغَلَّقَتِ﴾ی بەکارهێنا، کەبەڵگەیە لەسەر (مبالغة) واتە: باش و زۆر بەڕێك و پێکی وقایم هەموو دەرگاکانی داخست، یان لەبەر ژمارەی زۆری دەرگاکانی، ئەم کارەیش ئەوە دەگەیەنێت کەزۆر سوور بووە لەسەر ئەنجامدانی ئەوکارە فاحیشەیە و ئینجا ئاوڕی دایەوە بەلای یوسفدا، بۆئەوەی سەیری ئەو کارە بکات کەخۆی دەیەوێت، بەڵام یوسف (علیه السلام) ڕوی لێ وەرگێڕاو ئاوڕی نەدایەوە بەلایدا. دەرگاکانی بەشێوەیەکی واداخست، تا لەگەڵ یوسفدا بمێنێتەوە و دووربێت لەچاوی کەسانێك کەتەماشایان بکات، هەموو دەرگاکانی داخست تەنها دەرگایەك نەبێت، کەئەو دەرگایەبوو، کەدەرگای ئەو کەسە بوو کەهیچ شتێکی لەزەوی ولەئاسمانەکاندا لێ ناشاردرێتەوە.

زانای تەفسیر (القشیری)لە (اللطائف)دا دەفەرموێت: (کاتێك دەرگاکانی ماڵەکەی لەسەر داخست، خوای گەورە دەرگای(عصمة) خۆپاراستنی لێ کردەوە، زیانی بۆی نەبوو داخستنی پاش ئەوەی ڕێزلێگیراو بوو بەودەرگایەی خوای گەورە کردیەوە).[١١٩]

کاتێك ئافرەتەکە خۆی بۆ یوسف ئامادەکردو داوای کارە پیسەکەی لێ کرد، وەڵامی یوسف (علیه السلام)بریتی بوو لە: ﴿قَالَ مَعَاذَ اللَّهِ إِنَّهُ رَبِّي أَحْسَنَ مَثْوَايَ إِنَّهُ لَا يُفْلِحُ الظَّالِمُونَ﴾

ووشەی:﴿معاذ الله﴾ واتە: من خۆم دەپارێزم وپەنادەگرم بەخوا لەوکارەی کەئێوە منی بۆبانگ دەکەن، چونکە پاراستن وهیدایەت لەلایەن خوای گەورەوەیە ﴿إنه ربي﴾ پەروەدگارم منی بەدیهێناوە و گەشەی پێ داوم ئەدەبی داوم و چاودێری کردووم و چاکەی زۆرە بەسەرمەوە و پلەو پایەی منی بەرز کردووەتەوە، هەرگیز سەرپێچی ناکەم.

وتراویشە ﴿إنه ربي﴾مەبەستی عەزیزە، واتە ئەو گەورەی منەو سەرپەرشتی منی کردووە، ئەمە بەپێی لێکدانەوەیان چونکە یوسف (علیه السلام) لە ڕاستیدا ئازاد بووە، کەسی ئازاد بەفرۆشتن و کڕین نابێتە بەندە.

هەروەها وتراویشە: ﴿إنه ربي﴾مەبەست عەزیزە کە پەروەردەی کردوە و چاودێری کردووە، و ﴿أحسن مثواي﴾ واتە: ڕێزی لەمن گرت لەماڵەکەی خۆیداو شوێنی باشی بۆئامادەکرم، منیش ئیهانەی ناکەم وخیانەت لەشەرەفی ناکەم. چۆن دەبێت پاداشتی

---

[١١٩] -(لطائف الأشارات للقشیری) (١٧٧\٣).

چاکەکردن بەخراپە بداتەوەو سپەڵەبێت بەرامبەر ئەو ناز و نیعمەت و ڕێزلێگرتنە و خراپەو کاری ناشرین بەرامبەریان ئەنجام بدات، کەببێتە هۆی عەیبە و سەرشۆڕی.؟
﴿إِنَّهُ لَا يُفْلِحُ الظَّالِمُونَ﴾ بێگومان ستەمکاران سەرفرازو ئاسودەنابن، ئەوانیش ئەوکەسانەن کەمافی کەسانی تردەبەن بۆخۆیان وپەیمان دەشکێنن، وخیانەت لەئەمانەت دەکەن و ڕێزو پیرۆزیەکان دەشکێنن و سنورە قەدەغەکراوەکان دەبڕن.

## تەفسیری ( الهم ) و مانای ( البرهان )

خوای گەورە دەفەرمویێت: ﴿ وَلَقَدْ هَمَّتْ بِهِ وَهَمَّ بِهَا لَوْلَا أَن رَّأَىٰ بُرْهَانَ رَبِّهِ كَذَٰلِكَ لِنَصْرِفَ عَنْهُ السُّوءَ وَالْفَحْشَاءَ إِنَّهُ مِنْ عِبَادِنَا الْمُخْلَصِينَ﴾(یوسف\٢٤).

بەیەك گەیشتنی ئایەتە پیرۆزەکان دەربارەی پارێزراوی و پاکی یوسف (علیه السلام) دەدوێت، باسی دامەزراوی دەکات لەبەردەم ئەو هەموو هۆکاری سەرلێشێواندن و بەربەرەکانییەدا، ئەویش کاتێك وەڵامی حەزو ئارەزوەکانی ژنەکەی عەزیزی نەدایەوە لەگەڵ ئەوەی کەزۆری کردو بەردەوام بوولەسەر خۆدەرخستن و پیشاندانی جوانیەکانی جەستەی، ویوسفی بانگ دەکرد بۆئەنجامدانی کاری ناپەسەند وحەرام، هەموو دەرگاکانی لێ داخست و هەموو هۆکارەکانی بۆئامادە وسازش کرد وجوانترین بەرگی لەبەرکردبوو وبەجوانترین هۆکاری ڕازاندنەوە خۆی ڕازاندبویەوە.
لێرەدا زانراوەکە (هَم)ی ئافرەتەکە بە یوسف بۆ ئەنجامدانی (فاحیشە) زینا بوو. بەڵام دەربارەی (هَم)ی یوسف زانایانی تەفسیر ڕا و بۆچونی جیاوازی زۆریان هەیە:هەیانە نەفی ئەوە دەکات کەیوسف (علیه السلام) (هَم)ی کردبێت، وهەیانە دەڵێت: لەگەڵ (عصمة) پارێزراویدا نەفی ئەوەناکات کەیوسف (علیه السلام) (هَم)ی کردووە، هەشیانە لە تەفسیرەکەیدا پشتی بەڕاو بۆچونی (إسرائیلیات) بەستووە، کەبەڕاستی ئەمانە تانەو تەشەر دەدەن لەڕێزو گەورەیی و پارێزراویی پێغەمبەران (علیهم السلام)، بانگەشەی ئەوەیان کرووە کەیوسف (علیه السلام) حەزی کردووەو ویستوویەتی کە تێکەڵ بێت لەگەڵ ژنەکەدا، بەڵام (البرهان) بەڵگەی ڕوناك ونیشانەی ڕوون و بەهێزە کە بویە هۆکاری پاراستنی.

**بینی:**

ەم باسەدا قسەی نادروست ونەشیاو زۆر وتراوە کەشیاو نین بەرێزی پێغەمبەران وپێغەمبەر یوسف (علیه السلام) کەهەموویان (إسرائیلیات)ن، ئێمە ئەو قسانە ناهێنین تاخوێنەر پرسیاری زۆری بۆدروست نەبێت و نەکەوێتە ئاڵۆزی و بیرکردنەوەی نادروستەوە.[120]

ئەوزانا بەرێزانەی کە نەفی ڕوودانی (هَم) دەکەن لەیوسف (علیه السلام) وتویانە: لە ئایەتە پیرۆزەکەدا (تقدیم و تأخیر) هاتووە.

ئایەتەکە دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ هَمَّتْ بِهِ وَهَمَّ بِهَا لَوْلَا أَن رَّأَى بُرْهَانَ رَبِّهِ﴾ بە جۆرێك کە (جواب)ی (لولا)ی (الشرطیة) پێش بکەوێت، واتە بەم جۆرە: (لَوْلَا أَن رَّأَى بُرْهَانَ رَبِّهِ لَهَمَّ بِها)، بەڵام (برهان)ی بینی وئەم (هَم)ەی دەرنەبڕی هەروەها وتراویشە: لە وتەکەدا: (حذف)لابراوێك هەیە کە بریتییە لە(جواب)ی (لولا)، لێکدانەوەکەی پێشتر ڕونی کردەوە، و لێکدانەوەی ئایەتەکە: ﴿وَهَمَّ بِهَا لَوْلَا أَن رَّأَى بُرْهَانَ رَبِّهِ﴾ لەسەر ئەمە، ئایەتی: ﴿وهمَّ بها﴾ بەڵگەی (جواب)ەکەیە (بەڵام (جواب)ەکە خۆی (محذوف)لابراوە، وەك باسمان کرد.

هەندێك لە زانایانی تەفسیر ئاراستە و لێکدانەوەیەکی تریان هەیە لەئایەتی﴿وهمَّ بها﴾ کە یوسف (علیه السلام) (هم)ی کردووە، بەڵام وەك(هَم) ی کەسێکی بەڕۆژوو بۆ خواردنەوەی ئاو، ئەمە جۆرێکی (هَم)ە کەخاوەنەکەی لەسەری سزانادرێت و ناپەسەند نابێت، بەڵکو تەنها هاتنی (خطورة)یەکە بەحاڵی نەفسی ئەو کەسەداو مەبەستی نیە کارەکە ئەنجام بدات. لە(إبن عباس)ەوە (رضي الله عنه) پێغەمبەر (ﷺ) کە لە پەروەردگارەوە دەیگێڕێتەوە، دەفەرموێت: (بێگومان خوای گەورە چاکەکان وخراپەکانی دیاری کردووەو نوسیویەتی، پاشان ڕوونی کردۆتەوە، کەهەرکەس ویستی چاکەیەك ئەنجام بدات و ئەنجامی نەداو نەیکرد، ئەوا خوای گەورە چاکەیەکی تەواوی بۆ دەنوسێت، و ئەگەر ویستی بیکات پاشان کردی و ئەنجامیدا، ئەوا خوای گەورە دەچاکەی بۆ دەنوسێت، هەتا حەوت سەد قات و زیاتریش، وهەرکەس ویستی خراپەیەك ئەنجام بدات، بەڵام ئەنجامی نەداو نەیکرد، ئەوا خوای گەورە چاکەیەکی تەواوی بۆدەنوسێت،

---

[120] -ڕونکردنەوەی وەرگێڕ.

بەڵام ئەگەر ویستی وکردی وئەنجامیدا، ئەواخوای گەورە تەنها یەك خراپەی لەسەر دەنوسێت). [١٢١]

(دکتور أبو جبل) مانای (البرهان) ڕون دەکاتەوەو دەڵێت: ئەو (برهان)ە بەڵگەو نیشانەیە، بریتی بوو لەو شتەی کەخوای گەورە خستیە ناودڵی یوسفەوە (علیه السلام) لەزانست وشارەزابوون بەخەیرو چاکەو شەڕو خراپەو پاداشی هەریەکەیان لەژیانی مرۆڤدا لەدنیاو قیامەتدا...ئەو (برهان)ە مەیلی سروشتی و کەسێتی خۆی ملکەچ بوو بۆ هێزی ڕۆحی بەشێوەیەکی تەواو هیچ شوێنەوارێکی کرداری خراپی لێ نەکەوتەوە، وبەو هۆیەوە خوای گەورە لە (فاحیشە) وخراپ ڕوی وەرگێڕا، چونکە یەکێك بوو لەبەندە (مخلص) و پاك ودڵسۆزەکان. [١٢٢]

(الدکتور محمد بکر إسماعیل) لە(قصص القران)ە کەیدا دەڵێت: لەئایەتی:﴿وَلَقَدْ هَمَّتْ بِهِ وَهَمَّ بِهَا﴾دا، زۆر قسە وتراوە بەڵام لە هەموویان لە پێشتر بریتی یە لە: (ئافرەتەکە (هَم)ی کرد وویستی لە یوسف بدات یان کاری خراپە (فاحیشە)ی پێ ئەنجام بدات، ئەویش بەزۆر، بەڵام (هَم) ویستی یوسف (علیه السلام) بریتی بوو لەلێدانی یان هەڵهاتنی، (هَم) ویستی ئافرەتەکە بۆچونە پێشەوەو هەنگاونان بوو بەرەو خراپە ، بەڵام (هَم) ویستی یوسف (علیه السلام) بۆ خۆ دوور گرتن و هەڵهاتن بوو، وئەو (برهان)ەی کە یوسف بینی، ڕوناکییەکی عەقڵی بوو، وای لێ کرد ڕاکردن وهەڵهاتن هەڵبژێرێت، چونکە داهاتووی ئەوە پارێزراو و سەلامەتە). [١٢٣] بەپێی ئەم بۆچوونە، تەفسیرو لێکدانەوەی (البرهان) بریتی یە لە: بێگومان ئەو زانی ئەگەر لێی بدات وتوندو تیژی بنوێنێت ئەوا دواتر نەفسی خۆی دەخاتە بەر مەترسیەوە، چونکە ژنەکە دەڵێت:لێی داوم،تۆڵەی لێ کردوومەتەوەو زۆری لێ داوم لەسەر ئەنجامدانی (فاحیشە)زیناو خراپە، وژنەکەش کراسەکەی لەڕووی پێشەوە دەگرت ودەیدڕاندوو دەبویە بەڵگە لەسەر ڕاستی قسەکانی ژنەکە، بەڵام یوسف (علیه السلام) ئەوکارەی نەکرد بەڵکو بڕیاری دا لەوشەێنە هەڵبێت ورابکات.

---

[١٢١]-رواه مسلم و بخاری فی صحیحهما عن إبن عباس

[١٢٢]-تەفسیری سوورەتی یوسف (ص\٨٠) بەدەستکارییەوە.

[١٢٣]-قصص القران أ.د.محمد بکر إسماعیل(ص\١٢٤-١٢٥) بەدەستکارییەوە.

پێغەمبەران (علیهم السلام) پاك وپارێزراون لە گوناهە گەورە و بچوکەکانیش، شەرەف و ڕێزی ئەوان پارێزراو بووەو لەکەدار نەبووە، ئەگەر یوسف (علیه السلام) پارێزراو و خۆ پاکڕاگرو پاك داوێن نەبوایە، ئەواخوای گەورە بەو مەدح وستایشە پاك وبەرزو جوانە باسی نەدەکرد، وئەو هەموو نازو نیعمەتە بێ ئەندازەیەی پێ نەدەبەخشی...

یوسف (علیه السلام) سەرقاڵنەبوە بەئافرەتەوەو تەنانەت بۆساتێکیش بیری لەوەنەکردوەتەوە، چونکە بیرکردنەوەو سەرقاڵبوونی ئەو هەمیشە لەگوێڕایەڵی خواو بۆڕەزامەندی ئەو بووە.

## شوێنەکانی فریودان و لە خشتە بردن

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَرَاوَدَتْهُ الَّتِي هُوَ فِي بَيْتِهَا عَن نَّفْسِهِ وَغَلَّقَتِ الْأَبْوَابَ وَقَالَتْ هَيْتَ لَكَ قَالَ مَعَاذَ اللَّهِ إِنَّهُ رَبِّي أَحْسَنَ مَثْوَايَ إِنَّهُ لَا يُفْلِحُ الظَّالِمُونَ﴾(یوسف/٢٣).

واتە: (جا ئەو ئافرەتەی کە یوسف (علیه السلام) لە ماڵیدا بوو، هەوڵیدا یوسف لە خشتە ببات و دڵی ڕابکێشێت بۆلای خۆی، هەموو دەرگاکانیشی داخست وتی: وەرە پێشەوە و خۆت ئامادە بکە، یوسف وتی:پەنا دەگرم بە خوا کاری واناکەم، چونکە پەروەردگارم دەروی لێ کردومەتەوە، هەروەها مێردەکەیشت چاك ڕەفتار بووە لەگەڵمدا (چۆن خیانەتی لێ دەکەم)و چونکە من دڵنیام ستەمکاران سەرفراز نابن).ئەم ئایەتە دەست پێکەرە بۆ هەموو ئەو شتانە کە هۆکاری فریودان و لە خشتەبردنن کە ژنەکەی عەزیز ویستی تاوانی پێ ئەنجام بدات ئەگەر سەرنج بدەین لە ئایەتەکە و باروذۆخەکە، یانزە هۆکاری ئاسانکاری ئەنجامدانی ئەم تاوانە لە ئارادابوو، یوسف(علیه السلام) ڕووبەڕووی ئەم هۆکارانە بووەتەوە و خۆی گرتووە لەو تاوانە و خۆی دەربازکردووە.

یەکەم: یوسف گەنج بووە لەتەمەنی سی ساڵیدا بووە.

دووەم: بەندە بووە نەیئەزانی ئایا ژن دەهێنێت یان نا.

سێیەم: لە ڕووی ڕوخسار و جەستەوە زۆر تەواو بووە و ئارەزووی جنسی تەواوی هەبووە.

چوارەم: ئەوەی لەبەندە چاوپۆشی دەکرێت لەئازاد چاوپۆشی ناکرێت.

پێنجەم: ئەگەر بشزانرایە عقوبەکەی وەك ئازاد نەبوو کەمتربوو.

شەشەم: کەسێکی دڵسۆزی نەبوو هەتا ئامۆژکاری کردبێت بۆ خۆپاراستن لە کاری لەو جۆرە.

حەوتەم: لە وولاتێکدا بوو خواناسی تیا نەبووە جگە لە خۆی.

هەشتەم: ژنەکەی عەزیز زۆر جوان بووە.

نۆیەم: خاوەن دەستەلات بووە، ئەو ژنە هەرچی بکردایە بۆی دەپۆشرا نە لە کەس ئەترسا و نە لەکەس شەرمی دەکرد.

دەیەم: ماوەیەکی زۆرە یوسف (علیه السلام)لە ماڵی عەزیزدایە، بیست و هەشت ساڵە، ئەو هەموو ساڵانە ژنەکەی عەزیز عاشقی یوسف بووە و بیری لیٚ کردۆتەوە.

یانزەیەم: هیچ مەترسییەك لە ئارادا نییە کە لێی بترسن.

زۆر جار کەسانێك هەن ئەیانەوێت کاری لەو جۆرە ئەنجام بدەن بەلاٚم ترسی دوای تاوانەکەیانە کە رێگە ئەگرێت لێیان. ژنەکەی عەزیز بیٚ شەرم و ترس بە ئاشکرا داوا لە یوسف دەکات و پێی دەڵێت: ﴿هَيْتَ لَكَ﴾ وا من ئامادەم، تۆیش ئامادە بە، بەلاٚم یوسف بەم شێوەیە وەلاٚمی دەداتەوە، دەفەرمووێت: ﴿قَالَ مَعَاذَ اللَّهِ﴾ واتە: پەنا ئەگرم بە خوا کە ئەم تاوانە ئەنجام نەدەم...

ئەم دینە چەندە شیرینە، یوسف دەرونێکی چەندە خاوێنی هەبووە: ﴿إِنَّهُ رَبِّي أَحْسَنَ مَثْوَايَ إِنَّهُ لَا يُفْلِحُ الظَّالِمُونَ﴾(یوسف/٢٣). یوسف ویستی بەو هەڵوێستە مەردانەیەی کار بکاتە سەر ژنەکەی عەزیز، کە تۆیش ماف عەزیزت لەسەرە خیانەتی لیٚ مەکە، ئەگەر تۆ وەفات بۆ مێردەکەت نەبێت ئەوە من وەفام بۆ گەورەکەم هەیە و هەرگیز خیانەتی لیٚ ناکەم سەرنج بدەن لەو وەفایە لەناو ئەو هەموو گێژاوی فەساد و بەدرەوشتییەدا، کە وەفای چەندە بووە بۆ ئەو پیاوە کە بیست و هەشت ساڵە وا لە ماڵەکەیدا و رێزی لیٚ گرتووە، یوسف گیرۆدە بوو بەو تاقیکردنەوە گەورەیە خوایش یارمەتیدا و پاراستی. هەر کەس پشت بە خوا ببەستێت، خوایش پشتی ئەگرێت، دەی تۆیش بڵیٚ: پەروەردگار لە ژیانمدا نیازم رازی کردنی تۆیە، تۆ بۆ خوا بە، خوایش بۆ تۆ دەبێت و سەرکەوتوت دەکات. ﴿وَاسْتَبَقَا الْبَابَ وَقَدَّتْ قَمِيصَهُ مِن دُبُرٍ﴾(یوسف/٢٥). واتە: (یوسف و ژنەکەی عەزیز بەرە و دەرگاکە رایان کرد (یوسف بۆ دەربازکردنی خۆی و ژنەکەیش بۆ گرتنی یوسف و بۆ ناچارکردنی بۆ

ئەو مەبەستەی کە ئەیەوێت)ژنەکەی عەزیز لە دواوە کراسەکەی یوسفی گرتبوو و ڕایکێشا تا کراسەکەی لە دواوە دڕاند).

ئەگێڕنەوە ئەڵێن: ژنەکەی عەزیز بە یوسفی وت: ڕوخسارت چەندە جوانە، یوسف فەرمووی: خوا لە ناو سکی دایکمدا نەخشەی ڕوخسارمی وا جوان کردووە. ژنەکە وتی:ئای قژت چەندە جوانە. فەرمووی: یەکەم شت کە لە ناو گۆڕدا هەڵئەوەرێت مووەکانە.سەرنج بدەن، چۆن بەو هەموو جوانییە خۆی لێ نەگۆڕا، وتی: ئەی یوسف، چاوت چەندە جوانە. یوسف فەرمووی: تەماشای گوناهی پێ ناکەم، بۆ ئەوەی لە قیامەتدا تەماشای خوای پێ بکەم، سەرنج بدەن چەندە خەمی قیامەتی خواردووە. ئەی ئەوانەی کە چاویان داناخەن بۆ تەماشاکردنی ئەو هەموو ڕوت وقوتانە لە کەناڵەکانەوە لەسەر شەقامەکان لە ناو بازاڕ: بترسن لەوە، ئەو چاوانە لە قیامەتدا خوای گەورە دەبینێت. ژنەکە وتی:ئەی یوسف، من ئەمەوێت لێت نزیك ببمەوە، تۆ لێم دوور ئەکەویتەوە، یوسف وەڵامی دایەوە:نزیك بوونەوەم لەتۆ، دوورکەوتنەوەیە لەخوا، ونزیك بوونەوەم لەخوا بە دوور کەوتنەوە لە تۆدەبێت.

## شایەتی هەموان بە پاکی و بێ تاوانی یوسف ( علیە السلام )

بێگومان لەچەند لایەنێکەوە پاکی وبێتاوانی یوسف جێگیر بوو، بەڕاستی ئافرەتەکە شایەتی بۆدا، کەزۆ ئافرەتەکانی تریش شایەتیان بۆداو پیاوێکیش لە کەسوکاری ژنەکەی عەزیز شایەتی بۆداو، پاشای گەورەی دەوڵەتیش شایەتی بۆدا، ژنەکەی عەزیز شایەتی بۆپاکی وبێ تاوانی یوسف(علیە السلام)دا کاتێك کە وتی- وەك قورئان هەواڵی داوە-: ﴿قَالَتْ فَذَٰلِكُنَّ الَّذِي لُمْتُنَّنِي فِيهِ وَلَقَدْ رَاوَدتُّهُ عَن نَّفْسِهِ فَاسْتَعْصَمَ وَلَئِن لَّمْ يَفْعَلْ مَا آمُرُهُ لَيُسْجَنَنَّ وَلَيَكُونًا مِّنَ الصَّاغِرِينَ﴾(یوسف\٣٢). واتە: (ئینجا ژنەکە وتی: ئەوە ئەو کەسەیە کە ئێوە لۆمەو سەرزەنشتی منتان دەکرد لەبارەیەوە، سوێند بەخوا بێگومان من هەوڵم دا لەخشتەی بەرم، کەچی ئەو هەر خۆی گرت و پاك و خوێنی ویست، سوێند بەخوا ئەگەر ئەوەی من فەرمانی پێ دەدەم نەیکات، ئەوەبەڕاستی بەند دەکرێت زەلیل دەبێت وبەکەم تەماشادەکرێت). لەئایەتێکی تریشدا بەقسەی خۆی شایەتی بۆ یوسف(علیە

السلام)دەدات– وەك قورئان دەفەرموێت: ﴿الْآنَ حَصْحَصَ الْحَقُّ أَنَا رَاوَدتُّهُ عَن نَّفْسِهِ وَإِنَّهُ لَمِنَ الصَّادِقِينَ﴾(یوسف\٥١).

واتە: (ژنەکەی عەزیزی میسر وتی: ئا ئێستا ئیتر ڕاستی ڕوون وئاشکرا بوو (دان بەڕاستیدا دەنێم) خەتای من بوو دەمویست لەخشتەی بەرم و بەڕاستی یوسف یەکێکە لەڕاستگۆیان). شایەتەکەیش کاتێك بەڵگە ڕوون وئاشکراکانی لەسەر پاکی وبێ تاوانی یوسف(علیه السلام)بینی وتی: ﴿إِنَّهُ مِن كَيْدِكُنَّ إِنَّ كَيْدَكُنَّ عَظِيمٌ (٢٨) يُوسُفُ أَعْرِضْ عَنْ هَٰذَا وَاسْتَغْفِرِي لِذَنبِكِ إِنَّكِ كُنتِ مِنَ الْخَاطِئِينَ﴾(یوسف\٢٨-٢٩).

واتە: (بەڕاستی ئەمە پلان وتەخشەی خۆتانە ئەی ئافرەتان، بێگومان فێڵ و تەڵەکەو نەخشەو پلانی ئێوە زۆر گەورەیە (لەم جۆرە شتانەدا)، ئینجا ڕووی کردە یوسف(علیه السلام) وتی: ئەی یوسف ئەم باسە فەرامۆش بکەو گوێی مەدەرێ، وتۆیش داوای لێخۆشبون ولێ بوردن بکە لەهەڵەو تاوانەکەت، چونکە بەڕاستی تۆ لەگوناهباران وبەهەڵەچواندایت).(ئەمەیان قسەی شایەتەکە بوو یان قسەی عەزیز بوو). ئافرەتەکانیش شایەتیان داو هەموویان وتیان: ﴿قُلْنَ حَاشَ لِلَّهِ مَا عَلِمْنَا عَلَيْهِ مِن سُوءٍ﴾(یوسف\٥١).

واتە: (پەنا بەخوا (ئێمە بوختانی بۆبکەین) ئێمە هیچ جۆرە هەڵەو ناشرینیەکمان لێ نەدیوەونەزانیوە).

بەڵام پاشای گەورەی دەوڵەت —وەك قورئان هەواڵی پێ داوین وتی: ﴿أَسْتَخْلِصْهُ لِنَفْسِي فَلَمَّا كَلَّمَهُ قَالَ إِنَّكَ الْيَوْمَ لَدَيْنَا مَكِينٌ أَمِينٌ﴾(یوسف\٥٤).

واتە: (ئادەی بچن یوسفم بۆبهێنن (ئەو لاوە پاکە ژیرە زانایە) تایبەتی دەکەم بۆ خۆم تالەنزیکانی من بێت، جاکاتێك هێنایان وپاشا قسەی لەگەڵ کرد، وتی:ئەمڕۆ ئیتر بەڕاستی تۆلای ئێمە خاوەنی پلەو جێگەی متمانەو باوەڕیت). ئایەتی: ﴿كَذَٰلِكَ لِنَصْرِفَ عَنْهُ السُّوءَ وَالْفَحْشَاءَ إِنَّهُ مِنْ عِبَادِنَا الْمُخْلَصِينَ﴾(یوسف\٢٤). خوای گەورە ئاماژە دەکات بۆ بەزەیی و لوتف و پاراستنی خۆی بۆ یوسف (علیه السلام) وفەرموی: کە بەو جۆرە

بەڵگە و نیشانە ڕوونەکەمان پیشانی یوسف دا، بۆئەوە بوو کە لە خراپەو تاوانی گەورەو بچوك بیپارێزین.

(الرمخشری)دەڵێت: ﴿لِنَصْرِفَ عَنْهُ السُّوءَ﴾واتە: بیپارێزین لەخیانەت کردن لەعەزیز و ﴿الفحشاء﴾ بیپارێزین لەزیناکردن.....ڕەنگە ﴿السُّوء﴾ پێشەکی بێت بۆ ﴿الفحشاء﴾ لە سەیر کردن وماچ کردن ودەست لەمل کردن وشتانی تر).[١٢٤]

﴿إِنَّهُ مِنْ عِبَادِنَا الْمُخْلَصِينَ﴾ ئەو کەسانەن کەدڵەکانیان پاك وپاڵفتە کردۆتەوەو دڵسۆزن بۆ خوا، تەنها خوا مەبەستیانە، وتەنها بیر لە گوێڕایەڵی خوا دەکەنەوە و بە شتانێکەوە سەرقاڵ نابن کەڕازی نەبێت.

دەربڕین بەشێوەی (جملة الأسمیة) دامەزراوی ودڵنیایی دەگەیەنێت، یوسف (علیه السلام) یەکێك بوو لە بەندە دڵسۆزەکانی خوا.

## پێشبڕکێ بۆ لای دەرگاکە و هەوڵی دڕاندنی کراسەکە

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَاسْتَبَقَا الْبَابَ وَقَدَّتْ قَمِيصَهُ مِن دُبُرٍ وَأَلْفَيَا سَيِّدَهَا لَدَى الْبَابِ قَالَتْ مَا جَزَاءُ مَنْ أَرَادَ بِأَهْلِكَ سُوءًا إِلَّا أَن يُسْجَنَ أَوْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾(یوسف:٢٥).

تا ئێرەیش ئایەتە قورئانییەکان لە باسی هەوڵی لە خشتەبردنی ژنەکەی عەزیز بۆ یوسف دەدوێن، و ئەو ڕووداو هەڵوێستانەیش ڕون دەکاتەوە کە لەئەنجامی ئەوەوە کەوتونەتەوە، ژنەکەی عەزیزی میسر بەردەوامە لەسەر هەوڵی لەخشتەبردن و خۆی وون کردوە لەو پێناوەدا و لە گومڕاییدایە، و خۆی داوەتە دەست هەواو ئارەزوەکانی و خۆی لەپشت ئارەزوەکانی یەوە مەڵاس داوە، و یوسف (علیه السلام) پابەندە بە حەق و ڕاستی و پشتی بەخوا بەستوە و لەسەر ڕێگای پاکی و ڕاستی و داوێن پاکی دامەزراوییە.

ئایەتی: ﴿وَاسْتَبَقَا الْبَابَ وَقَدَّتْ قَمِيصَهُ مِن دُبُرٍ﴾ هەواڵی ئەوە دەدات کەڕوو داوەکان بەرەو پێش چوون، بەجۆرێك کە یوسف (علیه السلام) مەبەستی بوو دەرگاکە بکاتەوە، بەرەو

[١٢٤]-(الکشاف للزمخشری /٢/٤٥٨)بە دەسکاریەوە.

دەرگاکە ڕایکرد، ئینجا ژنەکەی عەزیزیش بەرەو دەرگاکە ڕایکرد، و بەڵام پێی نەگەیشت تا ئەو کاتەی دەستی لەپشتەوە لەکراسەکە گیربوو گرتی، لێرەدا پرسیارێك دروست دەبێت بۆمان، ئەویش ئایا چۆن قورئان لێرەدا بە: ﴿وَاسْتَبَقَا الْبَابَ﴾دەستەواژەکەی لێك دایەوە؟ و جاری پێشتریش فەرمووی: ﴿وَغَلَّقَتِ الْأَبْوَابَ﴾؟ وەڵام: دەڵێین (ل) (اللام) لە ووشەی (الباب) لێرەدا (لام الجنس)ە، کە هەموو دەرگا داخراوەکان دەگرێتەوە، کە یوسف مەبەستی بووە و دەرگا بە دەرگا هەموویانی کردۆتەوە، وە ئافرەتەکەش بەدوایەوە بوە و ویستویەتی بیگرێتەوە (واتە: پێشبڕکێیان دەکرد، یوسف بۆ کردنەوەی دەرگاکە و ڕاکردنی، ژنەکەش بۆ ئەوەی ڕێگە لەیوسف بگرێت و نەهێڵێت لە دەرگاکەوە دەربچێت).

وتراوە: ژورەکە، کۆمەڵێك دەرگا و دەروازەی زۆری تیابوە، ژنەکە هەستا بە داخستنی هەموویان، تاکەس هەستی پێ نەکات و چاوی لێی نەبێت، بەڵام یوسف(علیه السلام) لە نزیکترین دەرگاوە هەڵهات ڕایکرد، ئینجا ژنەکە پێی گەیشت تا نەهێڵێت بڕواتە دەرەوە.

﴿وَقَدَّتْ قَمِيصَهُ مِن دُبُرٍ﴾ (القد) واتە: بڕین یان دڕاندن، کە زۆر جار بۆ دڕاندن لەباری درێژی بەکاردێت، کە ئەوەش لەدیوی پشتەوەی کراسەکەبوو، واتە: ژنەکە کراسەکەی یوسفی لەدیوی پشتەوە دڕاند بەهۆی ئەوەی کە حەزی کرد ڕایکێشێت بۆلای خۆی و نەهێڵێت ڕابکات. ژنەکەی عەزیز دەست پێشکەری دەکات لەتۆمەتبارکردنی یوسف (علیه السلام)دا –بەدرۆ و بوهتان –کاتێك لەپڕلای دەرگاکەدا گەیشت بەعەزیزی مێردی. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَأَلْفَيَا سَيِّدَهَا لَدَى الْبَابِ قَالَتْ مَا جَزَاءُ مَنْ أَرَادَ بِأَهْلِكَ سُوءًا إِلَّا أَن يُسْجَنَ أَوْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾(یوسف\٢٥). کاتێك لە پێشبڕێکەدا بۆلای کۆتا دەرگا کە یوسف بیکاتەوە و ئینجا لەوێدا ژنەکەی عەزیز دەستی لەکراسەکەی گیر کرد و لەپشتەوە دڕاندی، لەبەردەمی دەرگاکەدا هەردووکیان عەزیزیان بینی، کاتی هاتنەوەی عەزیز لەو کاتەدا چاوەڕوان کراو نەبوو. ووشەی ﴿سَيِّدَهَا﴾ واتە مێردی ژنەکە، بەو ووشەیە لێکدراوەتەوە، چونکە خاوەنی دەسەڵات و لێهاتوییە، بەسەر خێزانەکەیدا، وئەو تەنها کەسە کە لەزەت وڕابواردن لەو ژنە دەبینێت ومافی کەسی تری تیا نییە لەزەت وڕبواردنی خۆی تیا ببینێت. خوای گەورە نەیفەرموو: (سیدُهما)، چونکە لە ڕاستیدا

عەزیز هیچ دەسەڵاتێکی بەسەر یوسفدا نەبوو،چونکە کەسی ئازاد بەفرۆشتن نابێتە بەندە و ژێردەستە، و یوسف پێغەمبەری خوایە (علیه السلام): بەڕێزی کوڕی بەڕێزی کوڕی بەڕێزی کوڕی بەڕێزە. بێگومان یوسف (علیه السلام) لە عەزیزو خێزانەکەیشی بەڕێزترو پلەو پایەدارتر بووە.

ئینجا ژنەکەی عەزیز وتی -کە ئەمە ماناکەیەتی-: (باشە ئاخۆ سزای ئەو کەسە چییە کە ویستبێتی خراپە لەگەڵ خێزانەکەتدا بکات، جگە لەوەی بەند بکرێت یان سزایەکی بەئێش وبەئازار بدرێت؟)(یوسف\٢٥).

ژنەکە خۆی لەجێگەی شکاتکارو قازی ودادوەر دانا بڕیاری دەرکرد بەسەر یوسفدا، کە تۆڵەی لێ بکاتەوە، چونکە وەلآمی داواکەی نەداوەتەوە، هەروەها ئەو کارەی کرد بۆ ئەوەی دەستپێشکەری بکات بۆ پارێزگاری کردن لەخۆی، وەك وتراوە: (الهجوم خير وسيلة للدفاع) واتە: (هێرش کردن باشترین هۆکارە بۆبەرگری لەخۆت).

پێشەوا (النیسابوری) دەڵێت: (... ژنەکەی عەزیز دوو مەبەستی بەیەکەوە کۆکردەوە، بەپاك ڕاگرتن ونیشاندانی خۆی لای مێردەکەیدا لەهەموو گومانێك، تورەبوونی لە یوسف(علیە السلام) و ترساندنی، ئەمەش لە تەماعی ئەوەی کە بەهۆی ترس و زۆرلێکردنەوە بێتەوە بۆلای، چونکە بەقسەی خۆش و گوێڕایەڵی نەهات بۆلای، پاشان لەبەر خۆشەویستی بۆ یوسف چاودێری ئەو خۆشەویستییەی کرد، لەپێشدا باسی زیندان کردنی کرد، پاشان سزادان، چونکە کەسێك کەسێکی تری خۆش بوێت، حەز بەئازاردانی ناکات هەرچەند بۆی بکرێت، هەروەها ناوی یوسفی نەهێنا، بەڵکو مەبەستی ئەوبوو کە وتی:ویستویەتی خراپەی بەرامبەر بکات، بەڵکو مەبەستی هەموو کەسێك بوە ئینجا بە یوسفەوە، و لە ئایەتی ﴿إلا ليسجن﴾ ئەوە دەگەیەنێت کە زیندانیی هەمیشەیی نییە، وەك ئەوەی فیرعەون بە موسای وت ﴿لأجعلنك من المسجونين﴾.[١٢٥]

[١٢٥]-غرائب القران /١٢/٩٩، بە دەست کاریەوە.

## یوسف ( علیه السلام ) پاریزگاری لە خۆی دەکات

لەم کات و شوێنەدا یوسف (علیه السلام) پێویستی بەوە هەبوو کە ڕاستی و پاکی و بێتاوانی خۆی دەربخات و باس بکات، بەرامبەر ئەوەی کە ژنەکەی عەزیز دەری بڕی و باسی کرد، کە تەنها ستەم و بوهتان بوو، ئینجا یوسف (علیه السلام) فەرمووی: ﴿هِيَ رَاوَدَتْنِي عَن نَّفْسِي﴾.

تێبینی ئەوە دەکرێت، ئاماژەدانەکە بە (ضمير الغيبة) بوو بەبێ باس یان ناوهێنانی، لەوەشداچاودێری و ڕەچاوی ئەدەبی جوان کراوە، و ئاماژەیە بەوەی کە یوسف پشتی لێ هەڵکردوە، هەروەها تێبینی ئەوەش دەکرێت، لە وەڵامەکەی یوسفدا بۆ پارێزگاری کردن لەخۆی بە کورتی بووە، و درێژەی پێ نەداوە، بەوەندە کۆتایی پێ هێناو بەسی بوو کە پاکی خۆی دەربڕێت و ئیدانەی کاری ژنەکە بکات، چونکە حەق و ڕاستی ڕوونە و هیچ تەم و مژێکی پێوە نی یە و زوو دەردەکەوێت، بەڵام بەتاڵ و ناحەقی تەم و مژاوییە، لێکدانەوەو دەربڕینی حەق و دەرخستنی کارێکی ئاسانە، بەڵام پارێزگاری کردن لە بەتاڵ و ناحەقی، پێویستی بەتێکدان و تێکەڵ و پێکەڵ کردن و تەم ومژاوی کردن هەیە، هەروەها تەکلیف و درۆ و هەڵ خەڵەتاندن و سەرلێشێواندن وشاردنەوەو پێچ وپەنای تیایە.

## شایەتەکە مەسەلەکە یەکلایی دەکاتەوە، و هەڵوێستی عەزیز...

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَشَهِدَ شَاهِدٌ مِّنْ أَهْلِهَا إِن كَانَ قَمِيصُهُ قُدَّ مِن قُبُلٍ فَصَدَقَتْ وَهُوَ مِنَ الْكَاذِبِينَ(٢٦) وَإِن كَانَ قَمِيصُهُ قُدَّ مِن دُبُرٍ فَكَذَبَتْ وَهُوَ مِنَ الصَّادِقِينَ(٢٧) فَلَمَّا رَأَىٰ قَمِيصَهُ قُدَّ مِن دُبُرٍ قَالَ إِنَّهُ مِن كَيْدِكُنَّ إِنَّ كَيْدَكُنَّ عَظِيمٌ (٢٨) يُوسُفُ أَعْرِضْ عَنْ هَٰذَا وَاسْتَغْفِرِي لِذَنبِكِ إِنَّكِ كُنتِ مِنَ الْخَاطِئِينَ﴾ (يوسف٢٦-٢٩).

ڕا و بۆچونی جیاواز هاتوون لەسەر ئەوەی کە شایەتەکە کێ بووە.

وتراوە: پیاوێك بووە لە کەس وکاری ژنەکە.
وتراوە: منداڵێك بووە لەناو بێشکەدا،خوای گەورە هێناویەتییە قسە. خاوەنانی ئەم بۆچونە فەرمودەیەکیان کردووە بەبەڵگەی قسەکانیان، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (کەس لە بێشکەدا قسەی نەکردووە بێجگە لەسێ کەس نەبێت، ئەوانیش: (عیسای کوڕی مەریەم، شایەتەکەی یوسف، (صاحب الجريج)، کوڕی قژ داهێنەری کچەکەی فیرعەون).[١٢٦] بەلاَم زانا (الألباني)ئەم فەرمودەیەی بەلاواز داناوە.
هەروەها (إبن جرير)بە سەنەدێك لە پیاوانی (ثقات)خاوەن متمانەوە گێڕاویەتیەوە لە (إبن عباس)ەوە (خوالێیان ڕازی بێت) کە شایەتەکە پیاوێکی ڕیشن بووە.[١٢٧]
(ابوحيان)لە (بحر المحيط)دا دەڵێت: (هاتنی بەو شێوەیەی کە دەفەرموێت﴿مِّنْ أَهْلِهَا﴾ واتە: کەس و کاری ئافرەتەکە بەهێزتر دەبێت بۆ بەڵگە هێنانەوە لەسەر مەسەلەکە و زیاتر جێی متمانەیە بۆ یوسف وزیاتر تۆمەتەکانیش نەفی دەکات ودووریان دەخاتەوە.[١٢٨]ئەوەی کە بۆ ئێمە دەردەکەوێت ئەوەیە کەشایەتەکە لەگەڵ عەزیزدا بووە لەوکاتەدا، و ڕەنگە بانگیشی کردبێت بۆلێکۆڵینەوە لە مەسەلەکە لەبەر شارەزایی ونزیکی لەخێزانەکەیەوە کە ئێمەیش بەیەکەم و لەپێش دامانناوە. خوازاناترە.
بێگومان بۆشایەتەکەو بۆعەزیزیش دەرکەوت: کە کراسەکە لەپشتەوە دڕابوو، بەوەش پاکی وبێتاوانی یوسفی ڕاستگۆ دەرکەوت وژنەکەش درۆی کرد لەوەدا کە بانگەشەی بۆکردوو ئەوەجێگیر بوو کەهەوڵی لەخشتەبردنی یوسفی داوە.﴿ فَلَمَّا رَأَىٰ قَمِيصَهُۥ قُدَّ مِن دُبُرٍ﴾ کاتێك شایەتەکە ئەوەی بینی، بە ئافرەتەکەی ووت: ﴿ إِنَّهُۥ مِن كَيْدِكُنَّ إِنَّ كَيْدَكُنَّ عَظِيمٌ﴾.

فێڵ ونەخشە دانان تەنها پیشەی ژنەکەی عەزیز نەبوو، بەڵکو لەزۆرێك لەئافرەتاندا هەیە، پێچەوانەی شتانێك دەردەخەن کە شتانێکی تر دەشارنەوە لەهەست وسۆزی سەرنج ڕاکێش، ئەوە ژنەکەی عەزیزی میسر خۆشەویستی ومەبەستی ناو دڵی خۆی شاردبویەوە کاتێك لەلای دەرگاکەدا مێردەکەی خۆی بینی، خۆی بەپاکی ودادوەرانە پیشاندا، پاکی وپارێزراوی خۆی پیشاندا،وای دەرخست کە یوسف هەوڵی لەخشتە

[١٢٦]-رواه الحاكم في المستدرك، كتاب التأريخ باب ذكر عيسى إبن مريم ٢\٥٩٥.
[١٢٧]-جامع البيان للطبري\١٢\١٩٦.
[١٢٨]-البحر المحيط لإبي حيان الأندلوسي ٥\٢٦٧.

بردنی ئەوی داوە، ئینجا دڵی یوسف بەجۆرێك هەڵچوو کە ویستی بەرێگایەك تۆڵە لە یوسف (علیه السلام) بکاتەوە، کە ژنەکەی پێی ڕازی بێت: ﴿قَالَتْ مَا جَزَاءُ مَنْ أَرَادَ بِأَهْلِكَ سُوءًا إِلَّا أَن يُسْجَنَ أَوْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾. ئافرەتەکە خۆی بەپاك داناو یوسفی تۆمەتبار کردوو بڕیاری بەسەردا دا، ودڵی مێردەکەیشی پڕکرد لەڕق وقین، هەموو ئەمانەش تەنها لەیەك دەربڕین ودەستەواژەدا کە بەڵگە بوو لەسەر زیرەکی وخێرا دەربڕین وزمانپاراوی.

ئافرەت مەیلی پیاوان دەخاتە ژێر هەست وسۆزی خۆی وبەلای خۆیدا ڕای دەکێشێت ودەیەوێت بیخاتە ناو پلان ونەخشەکانی خۆیەوە، بە هەموو سەرنجی دڵی ئاڕاستە دەکات بۆلای خۆی و هەمو مەبەست ودەسەلأتی خۆی بەسەردا دەسەپێنێت وجوانی وشۆخ وشەنگی ونازی خۆی پێ دەفرۆشێت.

خاوەنی (تفسیر المیزان) دەڵێت: (نیسبەت دانی نەخشەو پیلانەکە بۆلای کۆمەڵێك لەئافرەتان لەگەڵ ئەوەشدا کەتەنها ئیشی ژنەکەی عەزیز بوو، بەڵگە بووە لەسەر ئەوەی کە لەوەوە دەرچووە، و کە ئەو یەکێکە لەئافرەتان، فێڵ ونەخشەی ئافرەتان شتێکە زانراوەو ئینکاری ناکرێت، لەبەر ئەوە بە گەورە باسی کردوو وتی: ﴿إِنَّهُ مِن كَيْدِكُنَّ إِنَّ كَيْدَكُنَّ عَظِيمٌ﴾. [129]

پاشان شایەتەکە ڕوو دەکاتە یوسف وقسەی خۆی دەکات -وەك قورئان هەواڵی داوە- دەڵێت: ﴿يُوسُفُ أَعْرِضْ عَنْ هَٰذَا﴾ واتە: ئەم ڕوداوە داپۆشە و باسی مەکە بۆ هیچ کەسێك، وبانگ کردنی یوسف بەناوی خۆیەوە بەبێ هێنانی (یاء النداء) ئامڕازی بانگ کردن ئەوە دەگەیەنێت کەنەرم ونیانی و سۆزو خەم خۆری بۆ یوسف دەربڕیوە، وڕێزی لێ گرتووە.

هەروەها عزیز ئاوڕ دەداتەوە بەلای ژنەکەیدا و قسەی لەگەڵ دەکات وسەرزەنزشتی دەکات و تورە دەبێت و بە شێوەی سزادان و تاوانبارکردنی لەگەڵی دەدوێت -وەك قورئان هەواڵی داوە- دەڵێت: ﴿وَاسْتَغْفِرِي لِذَنبِكِ إِنَّكِ كُنتِ مِنَ الْخَاطِئِينَ﴾.

زانای تەفسیر (الألوسی)دەڵێت: (دەوترێت ئەو قەومە لەگەڵ ئەوەی کەبت پەرست بون، وشتانێکیان درروست دەکردو دایان دەنا، وباوەڕیشیان وابوو شتە خراپ و

[129] -تفسیر المیزان ١٢\١٤٣.

ناپەسەندەکان عاقیبەت و داهاتووی خراپیان دەبێت لای خوا، ئەگەر خوا لێیان خۆش نەبێت نە بەڵگە لەسەر ئەوە هێنراوەتەوە کە بتیان دروست دەکردو دایان دەناو دەیان پەرست، چونکە یوسف بە هاوەڵانی ناو زیندانی دەفەرموێت: ﴿يَا صَاحِبَيِ السِّجْنِ أَأَرْبَابٌ مُّتَفَرِّقُونَ خَيْرٌ أَمِ اللَّهُ الْوَاحِدُ الْقَهَّارُ﴾(یوسف\٣٩).[١٣٠] ئەنجامدانی زینا و داوێن پیسی، لە ناشرینترین و قێزەونترینی تاوانەکانە و لە تاوانە گەورەکانیشە، کە شەرع و بڕیاری عەقڵ و عادەت و سروشت حەرامی کردووە، لەگەڵ ئەوەی کە ئەوان لەسەردینێکی ڕاستیش نەبوون، وایان دەبینی کەداوێن پیسی لەبێزراوترینی تاوانە گەورەکانە.

دەگونجێت هەردوو ئایەتەکە: ﴿فَلَمَّا رَأَى قَمِيصَهُ قُدَّ مِن دُبُرٍ قَالَ إِنَّهُ مِن كَيْدِكُنَّ إِنَّ كَيْدَكُنَّ عَظِيمٌ (٢٨) يُوسُفُ أَعْرِضْ عَنْ هَذَا وَاسْتَغْفِرِي لِذَنبِكِ إِنَّكِ كُنتِ مِنَ الْخَاطِئِينَ﴾(یوسف ٢٨-٢٩). لە قسەی عەزیز بێت، دانی نابێت بەپاکی وبێتاوانی یوسفدا، پاش ئەوەی کەبەڵگەکان پاکی یوسفیان دەرخست ودرۆی ژنەکەیش دەرکەوت وئەوهەوڵی لەخشتەبردنی یوسفی دابوو، فەرمانی کرد بە یوسف (علیه السلام) کەئەم مەسەلەیە بشارێتەوە تاکەس پێی نەزانێت و لەناو خەڵکیدا بلاوی بکاتەوە، فەرمانی کرد بەئافرەتەکە کەئیتر دەست لەکاری خراپە هەڵگرێت وداوای لێخۆشبوون لەپەروەدگاری بکات لەتاوانەکانی.

بەڵام ئەوەی لەپێشترە ئەمانە قسەی شایەتەکە بووە، و ناوەڕۆکی ئایەتەکانیش بەڵگەن لەسەر ئەوە.

ئەوەشمان بۆ دەردەکەوێت کە عەزیز غیرەی کەم بووە لەسەر خێزانەکەی بەبەڵگەی ئەوەی کەسزایەکی توندی ژنەکەی نەدا، وزۆر ناڕەحەت وسەرزەنشتی نەکرد، بەڵکو هەوڵیدا کەبگەڕێتەوە سەر ڕاستی، ئەوەش دەردەکەوێت کە ئافرەتەکە هەیمەنەو دەسەڵاتێکی وای هەبووە بەسەر یوسفدا کەزۆری خۆشدەویست وتاقەت وتوانای ئەوەی نەبوە کە لێی جیاببێتەوە، ویوسف توانای نەبوو بەسەریدا کەتوند و تیژی بەسەردا دەرببڕێت، لەگەڵ ئەوەی کە عەزیز سوور بوو لەسەر ئەوەی کەڕووداوەکان شاراوەبێت، تاکاریگەری بۆسەر پلەوپایەی نەبێت و کەسایەتی لەکەدار نەکات،بەڵام ئەم هەواڵە بلاوبویەوە، هەتا قسەو گفتوگۆ و باسی ئافرەتان لەشارەکەدا بووبەو باسە.

---

[١٣٠]-روح المعاني للألوسي ١٢\٢٢٤.

## باسی سێیەم:
## قسەی ئافرەتانی شارەکە دەربارەی کاری لە خشتەبردنی ژنەکەی عەزیز بۆ یوسف، و هەڵوێستی ژنەکەی عەزیز دەربارەیان

### قسەی ئافرەتەکان

خوای گەورە دەفەرمویێت: ﴿وَقَالَ نِسْوَةٌ فِي الْمَدِينَةِ امْرَأَتُ الْعَزِيزِ تُرَاوِدُ فَتَاهَا عَن نَّفْسِهِ قَدْ شَغَفَهَا حُبًّا إِنَّا لَنَرَاهَا فِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ﴾(یوسف ٣٠\). دەنگ و باسی هەولَی لە خشتەبردنەکە بەناو شاردا بلاَو بویەوە و بوو بەقسە و باسی ئافرەتان، ئافرەتەکانی شارەکە هەناسەیان سواربوو بوو، هەروەها لۆمەو سەرزەنشتی ژنەکەی عەزیزیان دەکرد یان قسەیان پیێ دەوت، لەبەرئەوەی کەئابڕوی شاراوەی خۆی دەرخست و هەولَەکەی بەفیڕۆچوو، لەسەر گەردانیدا بوو.

لە ئایەتی: ﴿وَقَالَ نِسْوَةٌ فِي الْمَدِينَةِ﴾دا ووشەی: ﴿نِسْوَةٌ﴾، (جمع قلة)یە بۆ (نساء) و (مفرد)ی لە جۆری خۆی نییە، بەڵکو لەماناد‌ا هەیەتی کە(إمراة)یە، هەروەها (قال)ی لەپێشەوە هێنا، بەبیێ(تاء)ی (تأنيث)، چونکە بە (مؤنث)کردنی (غير حقيقي) یە، وەك (اللمة والفرقة)، دەگونجێت (تاء)ی پێوە بنوسێت و، دەشگونجێت لابرێت.[١٣١]

ئەوەی کە ئێمە بۆمان دەرکەوتووە و(خوای گەورە زاناترە):بێگومان هەواڵەکە لەناو کۆشکەکەوە لەڕێگەی بەردەست وکارەکەر و ژنی ئەوخزمەتکارانەوە بلاَوبویەوە کەلەوێ کاریان دەکرد، ئەوهەواڵە لەناو ئافرەتانی شارەکە ڕەواجی پەیدا کرد، وشتێکی ئاساییشە کەئەو چینە خەڵکە خۆشگوزەرانە سەرقاڵ بن بەهەواڵێکی لەو جۆرەوە، لەگێڕانەوە و باسی ئەم کارەدا لەزەت و خۆشیان دەبینی، و بەردەوامیش لۆمە و سەرزەنشتی ژنەکەی عەزیزیان دەکرد وقسەیان پیێ دەوت. هەروەها نهێنی دەربڕین بە ﴿إمرأت العزيز﴾ بەبیێ باسکردنی ناوێکی ئاشکراو دیاریکراو بۆ شاردنەوە و بەبچوك

---

[١٣١]-الكشاف الزمخشري ٤٩٢\٢ وحاشية الجمل ٤٤٩\٢ و روح المعاني للالوسي\٢٢٥\١٢.

سەیرکردنێتی، لەگەڵ ئەوەی کەژنی عەزیزی میسرە، کەلەدوای پاشای گەورەی دەوڵەت ئەو گەورەترین پۆستی هەبوو، هەروەها ووشەی (العزیز) لە (العز)ەوە هاتووە، واتە هێزو توندی ورقی زاڵی وبەدەسەلآتی وڕێز،بەلآم ژنەکەی نەیتوانی ڕێز لەپلەو پایەی ئەو مێردەی بگرێت، بەڵێن وپەیمانەکەشی نەپاراست، وڕێزوشەرەف وناز و نیعمەتەکانیشی نەپاراست و ماڵەکەیشی کردە شوێنی داڕوخان ونزم بونەوە و پەڵەیەکی بەسەر شانی عەزیزەوە جێهێشت.

لە تەفسیری (المنار)دا هاتووە: ﴿امْرَأَتُ الْعَزِيزِ تُرَاوِدُ فَتَاهَا عَن نَّفْسِهِ قَدْ شَغَفَهَا حُبًّا﴾. ئەمە هەواڵێکە گێڕانەوەی، پێویستی بە سەرسوڕمان و ئینکاری کردن هەیە، لەچەند ڕوویەکەوە:

١-ئەوەی کەدەربارەی قسەی دەکەن، ژنەکەی عەزیزی میسرە.

٢- نەفسی خۆی بەکەم پیشان دەدات وخۆی بەکەم وبچوك دەردەخات، بەوەی کەویستی پیاوێك لەخشتەبەرێت، هەروەها ئەوە کاری کەسانێکی تریشە لەنمونەی خۆی،کە ویستویەتی مەیلی پیاوێك بەلای خۆیدا ڕابکێشێت، نەك بەلای کەسێکی تردا.

٣- ئەوکەسەی کە ئەو ویستی مەیلی ڕابکێشێت و لەخشتەی بەرێت کوڕێکی گەنج بوو کە بەندەو خزمەت کاری خۆیان بوو.

٤- پاش ئەوەی کە کارەکەی ئاشکرا بوو، دەرکەوت ومێردەکەی زانی، وبەنەرم ونیانی مامەڵەی لەگەڵدا دەکرد، فەرمانی پێ کرد(إستغفار) داوای لێخۆشبون بکات، بەلآم ئەوهەر بەردەوام بوو لەسەر تاوان وگوناهەکەی خۆی و بەردەوام بوو لەسەرکاری لەخشتەبردن، کە ئەویش لەووشەی (تُراوِدُ)دا دەردەکەوێت، کە (فعل مضارع)ە و بەڵگەیە لەسەر نوێ بونەوەو بەردەوامی).[١٣٢]

﴿قَدْ شَغَفَهَا حُبًّا﴾، واتە: خۆشەویستی یوسف گەیشتبوە پەردەی ناوەوەی دڵی، وتراوە: گەیشتوەتە ناوەڕاستی دڵ، هەردووکیان لەیەکەوە نزیکن.[١٣٣]

﴿إِنَّا لَنَرَاهَا فِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ﴾ (یوسف:٣٠).

---

١٣٢-(تفسیر المنار ٢٤٠/١٢)بە دەسکاریەوە.

١٣٣-(المفردات للراغب الأصبهاني ص٢٦٣ مادة ش غ ف.

ئەم ئافرەتە بەرگی حەیا و پاك داوێنی لە خۆی داماڵی بوو، و لە لوتکە و قەڵای ڕێزو سەربەرزییەوە کەوتبوە نزمی، و لە خۆشەویستی کوڕە لاوەکەیدا زۆر ڕۆچو بوو، و خۆی دابوویە دەست هەوا و ئارەزوەکانی.

خاوەنی تەفسیری (الکشاف) دەڵێت: ﴿إِنَّا لَنَرَاهَا فِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ﴾. واتە: بەسەر هەڵەدا چوو بوو، و لە ڕێگای ڕاستی دوور کەوتبو وەوە.

## هەڵوێستی ژنەکەی عەزیز

خوای گەورە لە سوورەتی (یوسف)دا دەفەرموێت: ﴿ فَلَمَّا سَمِعَتْ بِمَكْرِهِنَّ أَرْسَلَتْ إِلَيْهِنَّ وَأَعْتَدَتْ لَهُنَّ مُتَّكَأً وَآتَتْ كُلَّ وَاحِدَةٍ مِّنْهُنَّ سِكِّينًا وَقَالَتِ اخْرُجْ عَلَيْهِنَّ فَلَمَّا رَأَيْنَهُ أَكْبَرْنَهُ وَقَطَّعْنَ أَيْدِيَهُنَّ وَقُلْنَ حَاشَ لِلَّهِ مَا هَذَا بَشَرًا إِنْ هَذَا إِلَّا مَلَكٌ كَرِيمٌ (٣١) قَالَتْ فَذَلِكُنَّ الَّذِي لُمْتُنَّنِي فِيهِ وَلَقَدْ رَاوَدْتُهُ عَن نَّفْسِهِ فَاسْتَعْصَمَ وَلَئِن لَّمْ يَفْعَلْ مَا آمُرُهُ لَيُسْجَنَنَّ وَلَيَكُونًا مِّنَ الصَّاغِرِينَ﴾(يوسف:٣١_٣٢).

ژنەکەی عەزیز بەوەی زانی کەچی لەناو کۆڕو کۆبونەوەکانی ئافرەتاندا ڕوو دەدات و چ باسێك هەیە، دەربارەی خۆی، خوای گەورە بە (مکر) ناوی هێناوە، چونکە فێڵ و نەخشە دانان و هەڵخەڵەتاندن و نیەتی خراپ و پیس و ناپەسەندی تیایە.

زانا(ابن القیم)لە (إغاثة اللهفان)دا دەڵێت: (قسەو باسی ئافرەتەکان چەند ڕوویەکی هەبوو لە دەربڕینی ئەو (مکر) فێڵ و نەخشە دانانەدا، وتیان: (امرأة العزیز)واتە ژنەکەی عەزیز –بە نازناو نەك بەناوی خۆیەوە– کە ناپەسەندی کارەکەی دڵنیا دەکاتەوە، لەبەرئەوەی کە خاوەنی مێردە، و ڕوودانی کاری (فاحشە) داوێن پیسی لەودا ناشرینترە تا کەسێك کە مێردی نەبێت، هەروەها مێردەکەی ئەو عەزیزی میسرە، کە ئەو نەیتوانیوە ڕێز لەو پلەوپایەی بگرێت، و ئەو کارە کاری مەیل ڕاکێشان و لە خشتەبردن بوە کە ئەو داواکاری بوە، لە کەسێکدا کە بەندەو لاوی خۆیان بوە لەناو ماڵ و ژێر دەسەڵاتی خۆیاندا بووە، هەروەها خۆشەویستییەکەی بۆی گەیشتبویە بەرزترین ئاست کەپەڕەکانی دڵی بڕیبوو، بەڵام ئەم لاوە گەنجە کە یوسف(علیه السلام)ە، دەست وداوێن پاکەو خۆی بەپاك ڕاگرتووە و کەسێکی بەوەفاو بەشەرمە و، بەڵام ژنەکەی عەزیز

پێچەوانەی ئەمانەوەیە، بێگومان کاری هەوڵدانی بۆ لەخشتەبردنی هەربەردەوامەو زەدەبێتەوە).[١٣٤] زانا (ابوالسعود) دەڵێت: (ناونانی ئەم کارە بە (مکر) لەبەر ئەوە بوو شاراوە و نهێنی بوو لە ئافرەتەکانی تر، وەك فێڵ و نەخشەی کەسێکی فێڵباز، وتراوە ئەو بە نهێنی شاردییەوە لێیان، بەڵام ئەوان بۆیان ئاشکرا کرد، وتراویشە بێگومان ئەوان ئەو قسەیەیان وت تا لەو ڕێگایەوە بگەنە بینینی یوسف.[١٣٥] هەر وایش بوو.

## فێڵێك بە فێڵێکی تر

خوای گەورە فەرموی: ﴿فَلَمَّا سَمِعَتْ بِمَكْرِهِنَّ أَرْسَلَتْ إِلَيْهِنَّ﴾کاتێك ژنەکەی عەزیزی میسر توانج و پلارەکەی ئەوانی بیست ناردی بەشوێنیاندا کەبێن بۆلای خۆی.

زانا (الخازن) دەڵێت (ئەو ئافرەتانە چل ئافرەتی ناوداری شارەکە بوون، کە توانج و پلاریان گرتبویە ژنەکەی عەزیز و ناویان زڕاندبوو).[١٣٦]

زانا(الزمخشری) دەڵێت: (وتراوە: چل ئافرەتی بانگ کرد، پێنجیان ئەوانە بوون کە باسکران).[١٣٧]

واتە: ئافرەتی ئەو پیاوانەی کە بەردەست وخزمەتکاری ماڵی عەزیز بوون، وهەواڵی لەخشتە بردنەکەیان بڵاوکردەوە و تا هەواڵەکە گەیشت بە ئافرەتی پیاوانی گەورەو ناودار.

زانا (الطباطبائی) دەڵێت: (بێگومان ئەو ناردی بەشوێنیاندا تا یوسفیان پیشان بدات وتووشی تاقیکردنەوەیان بکات بەوەی کە خۆی تووشی هاتبوو، ودەست لە لۆمە و سەرزەنشتکردنی هەڵبگرن و عوزری لێ قبوڵبکەن لە خۆشەویستییەکەی بۆ یوسف).[١٣٨]

بەڵام ئەو بەرامبەر توانج وپلارەکانی ئەوان کە تەنها قسە بوو، بەنەخشەو فێڵێکی کرداری داوی بۆ نانەوە، کە بەڵگە بووە لەسەر زیرەکی وگەورەیی کاری بیرکردنەوەی لەو نەخشە دانانەدا.

---

[١٣٤]-إغاثة اللهفان من مكائد الشيطان |٢\٨٨) بەدەستکاریەوە.

[١٣٥]-(إرشاد العقل السليم ٤\٢٧١)و(روح المعاني ١٢| ٢٢٧).

[١٣٦]-تفسير الخازن ٣\٢٧٩.

[١٣٧]-الكشاف ٢\٤٦٣ وإرشاد العقل السليم ٤\٢٧١.

[١٣٨]-الميزان في تفسير القران ١٢\١٤٨.

﴿وَأَعْتَدَتْ لَهُنَّ مُتَّكَأً﴾. واتە: جێگەیەکی خۆشی بۆ ئامادەکردن کە لێی دانیشن، هەروەها وتراویشە میوەی نارنجی بۆ ئامادەکردن، یان خواردنێکی هەمە جۆر، یان جێگایەکی وا بووە کە دابنیشن و پشتی دانرابێت بۆئەوەی پشتی پێوە بدەنەوە و لەسەر لادانیشن، ﴿وَآتَتْ كُلَّ وَاحِدَةٍ مِّنْهُنَّ سِكِّينًا﴾. واتە: هەریەکەیان چەقۆیەکی داپێیان، بەڵگە بووە لەسەر بوونی شتێك کە پێویستی بەچەقۆ بووە کەپێی لەت بکرێت لەمیوە و شتی تر، هەروەها لەمەشدا ئاماژە بۆ ئەوە کراوە کە ژیانێکی خۆش وخۆش گوزەرانیان هەبووە لە چینی دەوڵەمەند بوون وزۆرێك لەناز و نیعمەتیان هەبووە.

## دەرچونی یوسف بەلای ئافرەتەکاندا و کاریگەری لەسەریان

لە کاتێکدا ئافرەتەکان سەرقاڵبوون بەو دەعوەت و خواردنەوە و لە باسی خۆیان و خۆشی دەربڕیندا بوون و لەناو ئەو هەموو کەل و پەلە ڕازاوەیەدا بوون: ئا لەو کاتەدا ژنەکەی عەزیز فەرمان دەکات بە یوسف، کە بێتە دەرو بەلایاندا بڕوات وتی: ﴿وَقَالَتِ اخْرُجْ عَلَيْهِنَّ﴾، واتە: (ئادەی وەرە دەرەوە بۆلایان با(بتبینن)). لە ڕاستیدا یوسف بەم کارەی نەزانی و هەستی پێ نەکرد و نەیزانی پلانێکە لەسەر ئەو، کەژنەکەی عەزیزی میسر بۆ ئەو ئافرەتانەی ڕێکخستبوو کە سەرقاڵبوون بەوشتانەوەی کەبەدەستیانەوە بوو، ئینجا یوسف (علیه السلام) هاتەدەرەوە بۆلایان، بەوپەڕی جوانی ولێهاتویی وهەیبەتەوە، بێگومان چاوەکانی ئاوانی فڕاندو لە بینینی خستن هەروەك چۆن هەورەبروسکە بینایی چاوەکان ناهێڵێت، وهۆش وعەقڵیان لای خۆیان نەما، ودەستی خۆیانیان بە چەقۆکان بڕی، تا ببێتە بەڵگەیەکی یەکلایی کەرەوە لەسەر جوانی وسەلاری و ناوازەیی یوسف (علیه السلام) و ببێتە بەڵگە لەسەر زۆر سەرسام بوونی ئافرەتەکان ولەهۆش چونیان بەرامبەر یوسف.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَلَمَّا رَأَيْنَهُ أَكْبَرْنَهُ وَقَطَّعْنَ أَيْدِيَهُنَّ وَقُلْنَ حَاشَ لِلَّهِ مَا هَذَا بَشَرًا إِنْ هَذَا إِلَّا مَلَكٌ كَرِيمٌ﴾(یوسف\٣١). واتە: (جاکاتێك بینیان بەگەورەو گرنگیان زانی و (الله اکبر)یان بۆ کرد، بەبێ ئاگایی دەستی خۆیان بڕی و، وتیشیان: پاکی وبێگەردی ودووری لەهەموو

ن ەواوییەك شایستەی خوایە کە ئەمەی دروستکردووە! ئەمە بەشەر نیە، تەنها ـ یشتەیەکی جوان وبەرێزە و هیچی تر نییە.

ئیمامی (مسلم) لە (صحیح)ەکەیدا ڕیوایەتی کردووە لە فەرمودەی (الأسراء)دا، کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەلای یوسف (علیه السلام)دا تێپەڕ بوو، کە لە ئاسمانی سێیەمدا بوو، فەرمووی کاتێك بینیم بێگومان نیوەی جوانی پێ درابوو.[١٣٩] بێگومان کاریگەری جوانی یوسف (علیه السلام) لەسەر دڵ و دەرونیان خۆشەویستی بەجێهێلاً، ولەسەر زمانیشیان ستایش ومەدح وسەنای دەربڕی، ولەسەر دەستیشیان خوێن وبرینی جێهێلا. ئافرەتەکان هەستیان بەئازار نەکرد کەدەستیان بڕی چونکە سەرقاڵ بوون بەسەیر کردنی یوسفەوە(علیه السلام) کاتێك هۆشیان هاتەوە بەبەرخۆیاندا لەدوای بێئاگاییەکەیان شوێنەوارەکەیان بەدەستی خۆیانەوە بینی کەخوێن و بڕاوی بوو، ئافرەتەکان تووشی سەرسوڕمانێکی گەورە و سەیر هاتن و خوای گەورەیان بەدوورگرت لەهەموو کەموو کورتی وناتەواوی وبێ دەسەلاتیەك هەروەها نەفی بەشەر بوونی یوسفیان کرد لەو جوانیەی کەتیایدا بینیان، کەشتی لەو شێوەیە لەبەشەردا نەبووە، و وایان دەربڕی کە یوسف فریشتە بێت لەسەر ئەو کاریگەریەی کە لەسەر نەفسیان جێی هێلاً لەجوانی ڕووخسار و شێوەی فریشتە، هەروەها شێوەی ناشرینی شەیتانیشی لای نەفسیان بێزراو کرد.

## دانپیانان...سوور بوون...هەڕەشەکردن

ژنەکەی عەزیزی میسر لەبەردەم ئافرەتەکاندا دان بەوەدا دەنێت کە ویستی یوسف لە خشتە بەرێت وسوورە لەسەر ئەو هەڵوێستەی هەڕەشە لەیوسف (علیه السلام)دەکات. خوایگەورە دەفەرموێت: ﴿قَالَتْ فَذَٰلِكُنَّ الَّذِي لُمْتُنَّنِي فِيهِ وَلَقَدْ رَاوَدتُّهُ عَن نَّفْسِهِ فَاسْتَعْصَمَ وَلَئِن لَّمْ يَفْعَلْ مَا آمُرُهُ لَيُسْجَنَنَّ وَلَيَكُونًا مِّنَ الصَّاغِرِينَ﴾(یوسف\٣٢). ژنەکەی عەزیز ئەوەی بینی کە لە ئافرەتەکان ڕوویدا، وبەهەموو فەخر و شانازی ولە خۆبایی بونێکەوە وتی: ﴿فَذَٰلِكُنَّ الَّذِي لُمْتُنَّنِي فِيهِ﴾ بێگومان ئێوەش تووشی سەرسوڕمان هاتن وەك من توشی هاتبووم، ئیتر

[١٣٩]-رواه الإمام مسلم فی صحیحه عن انس \کتاالأیمان.

چۆن وبۆچی لۆمەی منی تیادەکەن کەخۆشتان شەیدای یوسف بوون؟ کاتێك ئەوەی لەوان ڕویدا کە ڕویدا لە سەرسوڕمان ولەهۆش خۆ چوون بێگومان کاریگەریەکەی لەسەر دەستیان دەرکەوت لە بریندارکردن وخوێن لێهاتن، خۆشەویستی چووە دڵیانەوە و چاوەکانیان لە بینین کەوت، کاتێك ئەوانە لە ئێوە ڕویدا لە یەکەم بینیندا، دەبێت حاڵی ئێمە چۆن بوبێت کەیەك ماڵ کۆی کردوینەتەوە؟ و لەژێر سێبەری یەك سەقفدا بوین؟ دەبێت حاڵی من چۆن بێت کەلەبەر چاو دەستی مندا گەورە بووە و گەشەی کردووە و بەرهەم داربووە؟. ﴿وَلَقَدْ رَاوَدتُّهُ عَن نَّفْسِهِ فَاسْتَعْصَمَ﴾ ژنەکە دانی نا بەڕاستی کارەکەدا کە لەبەردەم مێردەکەیدا ئینکاری لێ کردبوو، و شایەتی بۆ یوسف (علیه السلام)دا بوو کە پارێزراو و داوێن پاکەو ئەوە جێگیر بوو، بەجۆرێك کە ڕونیکردەوە ودانی پیانا کەئەوهەوڵی داوە لەخشتەی بەرێت ﴿فأستعصم﴾ واتە: یوسف داوای پاکی و پارێزراوی کردو پەنای بۆ ئەو لایەنە بردو بەتوندی دەستی پێوەگرت، وەك ئەوەی ئافرەتەکە بیەوێت بەم قسەیە سکاڵای خۆی بکات لای ئافرەتەکان. پاشان ژنەکەی عەزیز ئاور دەداتەوە بەلای یوسف (علیه السلام)دا هەڕەشەی خۆی دەردەبڕێت، وەك قورئان هەواڵی پێداوین دەڵێت: ﴿ وَلَئِن لَّمْ يَفْعَلْ مَا آمُرُهُ لَيُسْجَنَنَّ وَلَيَكُونًا مِّنَ الصَّاغِرِينَ﴾(یوسف/٣٢).

واتە: (سوێند بەخوا، ئەگەر ئەوەی من فەرمانی پێ دەدەم نەیکات، ئەو بەڕاستی بەند دەکرێت و،زەلیل دەبێت و، بەکەم تەماشادەکرێت). لێرەدا یوسف (علیه السلام) ڕوو دەکاتە خوای گەورە و داوای پاراستنی لێ دەکات لەم کۆمەڵگا فاسید و خراپەی کەلە هاوسەنگی لایانداوە وچەمکەکانیان تێکەڵ و پێکەڵ کردووە ودەنگ وسەدای ناپەسەندی لەهەموو ناوچەیەکدا بەرزبۆتەوە، ویوسف (علیه السلام) شوێنێکی دەست ناکەوێت لەناو ئەم کۆمەڵگایەدا خۆی تیاپەنابدات تەنها زیندان نەبێت لەگەڵ ئەوەشدا کەشوێنێکی ناڕەحەتە. ئەوە باشترە تالەناو ئەو کەش و هەوا پیسەدا بمێنێتەوە.

## باسی چوارەم:
## زیندان ڕێگای ڕزگار بوونە:

﴿قَالَ رَبِّ السِّجْنُ أَحَبُّ إِلَيَّ مِمَّا يَدْعُونَنِي إِلَيْهِ وَإِلَّا تَصْرِفْ عَنِّي كَيْدَهُنَّ أَصْبُ إِلَيْهِنَّ وَأَكُن مِّنَ الْجَاهِلِينَ﴾(يوسف\٣٣).

زیندا لەگەڵ ئەوەی ناڕەحەتی و سەرشۆڕی و بێ بەش بون لەکەس وکارو و هاوڕێیان و دۆستانی تیایە، هەروەها توشی ناڕەحەتی زیندانییەکانی تر دێت، و بەهۆی کەم خۆراکییەوە توشی ناڕەحەتی و تاقیکردنەوە دێت، و خواردنەوە و شوێنی خەوی باشی دەست ناکەوێت لەگەڵ زۆری ئازارو و بەربەستەکان و مێروە زیان بەخش و پڕ لە ئازارەکان، و هەست کردن بەتەنهایی و ترس و غەریبی و بێ بەش بون لە هاوڕێیان و دۆستان و تێکەڵ بەو کەسانەی کە دژو پێچەوانەی تۆن، لەگەڵ هەموو ئەمانەدا بەڵام یوسف(علیە السلام)بەشوێنێکی باش و پەسەندو ڕێزداری دەزانێت بۆ خۆی و ئەو ڕێگایە بۆ ڕزگاربوونی خۆی لەدەست ئافرەتانی خراپەکار و فیتناوی هەڵدەبژێرێت کە ئەوان لەناو لەززەت و خۆشگوزەرانیدا گەورەبوون و بەرهەم هاتوون، و پەروەردەکراوی ناو کۆشك و تەلارە بەتاڵەکانن و بێبەش بوون لە ئەخلاق و بەها بەرزەکان.

*زانا (ابن الكثير) دەڵێت: ﴿قَالَ رَبِّ السِّجْنُ أَحَبُّ إِلَيَّ مِمَّا يَدْعُونَنِي إِلَيْهِ وَإِلَّا تَصْرِفْ عَنِّي كَيْدَهُنَّ أَصْبُ إِلَيْهِنَّ وَأَكُن مِّنَ الْجَاهِلِينَ﴾.

واتە: ئەی خوایە ئەگەر تۆ منت داوەتە دەست خۆم، من لە نەفسی خۆمدا هیچ دەسەڵاتێکم نییە تەنها بێ دەسەڵاتی و لاوازی نەبێت، و ناتوانم هیچ سودێك بەخۆم بگەیەنم و هیچ زیانێکیش لەخۆم دوور بخەمەوە مەگەر خوا خۆی بیەوێت، من لاوازم بێجگە لەوەی کە خوای گەورە هێزی پێداوم و پاراستوومی، و بەهێزو ویستی خۆی دەوری منی داوە).[١٤٠]

خاوەنی (في الظلال) دەڵێت: (ئەمە بانگەوازی ئینسانێکە کە شارەزایە و دەزانێت بە بەشەریەتی خۆی، کە تووشی لەخۆبایی بون نابێت بەوەی کە پارێزراو بووە، خوای

[١٤٠]-قصص الأنبياء لابن كثير ص/٢٣٨.

گەورە زیاتر کۆمەکی دەکات و یارمەتی دەدات لەسەر ئەوەی کە تووشی فیتنە و خەیاڵی کەسە گومڕاکان نەبێت).[١٤١]

**بەرامبەر ئەم ئایەتە پیرۆزە دوو هەڵوێست ڕوون دەکەینەوە:**

**یەکەم: ووشەی﴿أحبُ إليَّ﴾واتەی چی؟ ئایا چونە ناو زیندان یان وەڵام دانەوەی داواکاری ئافرەتەکان، دووکارن خۆشەویست بن لای یوسف (علیه السلام)وەك ئەوەی کە (فعل)ی (تفضیل)بەڵگەی لەسەر بدات؟.**

**دووەم: ئایا پرسیاکردن بێت لە مەسەلەی کاری لە خشتەبردن و مەیل ڕاکێشان، ئایا لەهەموو ئافرەتەکاندا ڕوویدا، وەك ئەوەی کە ئایەتەکە دەڵێت ﴿مما تدعونني إليه﴾؟**

**زانایانی تەفسیر بەم شێوازەی خوارەوە وەڵامی هەڵوێستی یەکەم دەدەنەوە کە بەکورتی ڕوونی دەکەینەوە:**

**زانا (الزمخشري) دەڵێت: ئەگەر وتت: چوونە ناو زیندا بە ناڕەحەتی خۆشترە لە لەززەت و ڕابواردن؟ ئەوە وتوتە خۆشترە لای، و کاریگەریشی لای ئەو تێڕوانینە بۆ جوان ئارامگرتن لەسەر هەڵگرتنی ناڕەحەتیەکانی لەبەر خوا و ناپەسەندی و خراپی سەرپێچییەکانی، بۆسەر ئەنجام و داهاتووی ئەم دووانە، تێڕوانین ناکرێت بۆ حەزی نەفس و ڕق لێبونی).[١٤٢]**

**(القرطبي)دەڵێت: (چونی ناو زیندان ﴿أحب إلي﴾ واتە: لام سوکتر و ئاسانترە لەوەی کە بکەومە ناو سەرپێچییەوە، نەك لەبەر ئەوەی کە چوونە ناو زیندان خۆشتر بێت لەسەر ئەوەی لێکۆڵینەوەی تیا دەکرێت).[١٤٣]**

*** بەو جۆرە یوسف (علیه السلام) ڕوو دەکاتە پەروەردگاری و داوای لێ دەکات کە لەسەر ڕێگای پاکی وپارێزراوی دامەزراوی بکات و هەست بکات کە ڕێگای ڕزگاربون لەبەر دەمییەوەیە کە زیندانە، هەڵی دەبژێرێت لەگەڵ ئەوەی کە ناڕەحەتی و ناخۆشی تیایە، ئەگەر لەوەڵامدانەوەی داوای ئافرەتەکاندا لەززەت و ڕابواردنی براوە هەبێت، بێگومان چونە ناو زیندان لەبەر گوێڕایەڵی خوا ئەوا کارێکە لەززەت و خۆشی تیایە و**

---

[١٤١]-في ظلال القرآن ١٩٨٥/٤. بە دەستکارییەوە.

[١٤٢]-الكشاف /٤٦٧/٢ و النيسابوري في غرائب القرآن ١٠٤/١٢.

[١٤٣]-الجامع لأحكام القرآن للقرطبي ١٤٨/٩.

دەمێنێتەوە بۆ کەسانێك کە خاوەنی دڵنیایی و دڵ ئارامین، کە بەشوێن بەختەوەری و ڕەزامەندیدا دەگەڕێن تا لە گوێڕایەڵی خوادا دەستی بکەوێت.
زانایانی تەفسیر بەم جۆرە وەڵامی هەڵوێستی دووەم دەدەنەوە، بەکورتی ڕوونی دەکەینەوە:

* زانا(الزمخشري) دەڵێت: (یوسف وتی: ﴿رب السجن أحب إلي مما تدعونني إليه﴾ بانگ کردنی بۆلای کاری خراپەی دایە پاڵ هەموو ئافرەتەکان، چوونکە هەموویان دڵسۆزی خۆیان بۆ دەربڕی و خۆیان بۆ ڕازاندەوە و ئامادە بوون خۆیان پێشکەش بە یوسف (علیه السلام)بکەن، هەموویان بە یوسف یان وت: ها یوسف نەکەیت، ئاگات لەخۆت بێت خۆت نەخەیتە زیندانەوە و خۆت ژێردەست و بچووك نیشان نەدەیت).[١٤٤]

* زانا(الماوردي) وتویەتی: لێکدانەوەکە دوو ڕوو دەگرێتەوە:

**یەکەمیان**: یوسف مەبەستی ژنەکەی عەزیزی میسر بوو کە بانگی کردبوو بۆ ئەنجامدانی فاحیشەو داوێن پیسی، بەڵام یوسف خستییە پاڵ ئەوان و بەگشتی ناوی هێنان، یان ئەوەتا مەبەستی بەگەورە ڕاگرتنی کارەکە بوو لەژنەکەدا، یان ئەوەتا مەبەستی بووە کەلای بدات لە دەربڕینەوە بۆ داپۆشین و شاردنەوەی.

**دوووەمیان**: بەو کارە مەبەستی کۆمەڵی ئافرەتەکان بووە، کە دەستیان بڕیبوو، کاتێك یوسفیان بینی و بە جوانیان دانا، و هەوڵیان دا مەیلی دڵی بەلای خۆیاندا ڕابکێشن[١٤٥].

* خاوەنی (في ظلال)دەڵێت: یوسف نەیوت: (ما تدعونني إليه) چونکە هەموو ئافرەتەکان بەشداربون لە بانگ کردنەکەدا، ئیتر بەقسە بووبێت یان بە جووڵە یان بە ئاووڕ دانەوەیەك... لەو کاتەدا یوسف داوای یارمەتی و هاوکاری لە پەروەردگاری دەکات بەهانایەوە بچێت و لە هەڵمەتی ئەوان لایبدات و ڕزگاری بکات، تا نەکەوێتە داوی ئەوانەوە، لەترسی ئەوەی نەبا بۆساتێك لاواز ببێت لەبەردەم فێڵ و نەخشەکانی ئەواندا و بکەوێتە ناو ئەوەی کەلێی دەترسێت لەخۆی، و لەخوا دەپاڕێتەوە ڕزگاری بکات)[١٤٦].

---

[١٤٤]-الكشاف ٤٦٧/٢ بە دەستکاریەوە.
[١٤٥]-النكت و العيون للماوردي ٣٠٣/٢ بەدەستکاریەوە.
[١٤٦]-في ظلال القرآن ١٩٨٥/٤ بەدەستکاریەوە.

* ئەوەی ئێمە بۆی دەچین و دەیبینین، کە بەڕاستی کاری سەرنج ڕاکێشان و هەوڵی لە خشتەبردنەکە ڕویدا لە لایەن ئافرەتەکانەوە، لەوەدا لە بۆچونی ڕواڵەتی ئایەتەکەوە بۆمان دەردەکەوێت: ﴿مما تدعونني إليه﴾ و ﴿ماخطبكن إذراودتن يوسف عن نفسه﴾ ئەمانە بەڵگەن لەسەر ئەوەی کارەکە لە هەموویانەوە بووە.

بۆ مەیل ڕاکێشان و لەخشتە بردن، یان ئەوەتا بەقسە بوە یان بەسەیرکردن یان بە ئاماژەدان.

ئایەتی: ﴿وَإِلَّا تَصْرِفْ عَنِّي كَيْدَهُنَّ أَصْبُ إِلَيْهِنَّ وَأَكُن مِّنَ الْجَاهِلِينَ﴾ واتە: خۆ ئەگەر لەفێڵ و تەڵەکەی ئەوان ڕزگارم نەکەیت و لە پیلان و نەخشەکانیان ڕزگارم نەکەیت و لام نەدەیت، لەوانەیە منیش مەیلم بۆ دروست ببێت و ئارەزویان بکەم و پاشان بچمە ڕیزی نەفام و گوناهبارانەوە).

﴿فَاسْتَجَابَ لَهُ رَبُّهُ فَصَرَفَ عَنْهُ كَيْدَهُنَّ إِنَّهُ هُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ﴾.

خوای گەورە وەڵامی دوعاو پاڕانەوەکەی دایەوە لەسەر جوانترین شێوە، وپاراستی لەفێڵ و نەخشەی ئافرەتەکان و ئافرەتەکانیشی لەو دوور خستەوە کە دەستیان پیا نەگات، و یوسفی لەسەر ڕێگای (عصمة) پارێزراوی و پاکی دامەزراو کرد.

﴿إِنَّهُ هُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ﴾. بێگومان خوای گەورە بیسەری دوعاو پاڕانەوەکان و هەموو شتێکە، و زانایشە و وەڵامی دوعا خەیرو چاکەکان دەداتەوە و زانایە بەحاڵی بەندەکان و ئەوەی کە دڵی ئەوانی لەسەرە، بەڕاستی خوای گەورە دوعای یوسف(علیه السلام) ی بیست و وەڵامی دایەوە، ئەویش بەهۆی زانستی خواوە بە بوونی ڕاستگۆیی یوسف (علیه السلام) و دڵسۆزییەکەیەوە.

﴿ثُمَّ بَدَا لَهُم مِّن بَعْدِ مَا رَأَوُا الْآيَاتِ لَيَسْجُنُنَّهُ حَتَّىٰ حِينٍ﴾(یوسف:٣٥).

واتە: (پاشان کە بەڵگەی زۆریان بینی لەسەر پاکی یوسف(علیه السلام) بۆیان دەرکەوت و وایان بەچاك زانی بۆ ماوەیەك هەر بەندی بکەن).

دەبێت ئەمە چ (منطق) و دەربڕینێك بێت؟ و چ ئارەزو و هاوسەنگییەك بێت؟ بەڕاستی ئەمە دەربڕینی ستەمکارانە و تەرازووی لادەرانەیە، خستیانە بری ئەوەی کە سزای تاوانبار بدەن و پاداشتی کەسی پاك و چاکەکار بدەنەوە، دەبینین کە تەرازوەکە هەڵ

دەگەڕێتەوە و سەرەو ژێر بوو، بۆ ئەوەی کە سزای کەسێکی پاك و بێتاوان بدەن، و کەسی تاوانکاریش واز لێدێنن!

* بێگومان ژنەکەی عەزیز لەم کارەیدا سەرکەوتنی بەدەست هێنا، کە فەرمانیدا یوسف (علیه السلام) بخاتە زیندانەوە، و هەروەها پێشتر براکانی یوسفیش سەرکەوتنیان بەدەست هێنا، کە یوسفیان فڕێدایە ناو تاریکایی بیرەکەوە، بەڵام بەپێی حەق و ڕاستی دەوترێت، کە ژنەکەی عەزیز توانی هەڕەشەکەی جێ بەجێ بکات بەهۆی دەستەڵات و لایەنگرانی و سۆز و نازدەربڕین بەسەر مێردەکەیدا، بەڵام بۆ هەڕەشەی دووەمی کە بریتی بوو لە: ﴿وَلَيَكُونًا مِّنَ الصَّاغِرِينَ﴾ نەیتوانی و مەبەستی ناپەسەندی زۆر دوور کەوتەوە، بێگومان کەسێك خوا سەربەز و ڕێزداری کردبێت، هیچ دروستکراوێك ناتوانێت سەر شۆڕی بکات، سەربەرزی ڕاستەقینە لەئیمانەوەیە بەخوا و گوێڕایەڵی فەرمانەکانی.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِذَا جَاءَكَ الْمُنَافِقُونَ قَالُوا نَشْهَدُ إِنَّكَ لَرَسُولُ اللَّهِ وَاللَّهُ يَعْلَمُ إِنَّكَ لَرَسُولُهُ وَاللَّهُ يَشْهَدُ إِنَّ الْمُنَافِقِينَ لَكَاذِبُونَ﴾(المنافقون ١).

واتە: (دووڕووەکان نازانن کەعیززەت ودەسەلاٌت وپایەداری هەر شایستەی خواو پێغەمبەرەکەی وئیماندارانە). لەئایەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿مَن كَانَ يُرِيدُ الْعِزَّةَ فَلِلَّهِ الْعِزَّةُ جَمِيعًا إِلَيْهِ يَصْعَدُ الْكَلِمُ الطَّيِّبُ وَالْعَمَلُ الصَّالِحُ يَرْفَعُهُ وَالَّذِينَ يَمْكُرُونَ السَّيِّئَاتِ لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌ وَمَكْرُ أُولَٰئِكَ هُوَ يَبُورُ﴾(فاطر١٠).

واتە: (ئەوەی سەربەرزی و پایە بڵندی دەوێت، با بزانێت هەموو سەربەرزی وپایە بڵندیەك هەر بۆ خوایە گوفتاری چاك وجوان وبەجێ بۆلای ئەو زاتە بەرز دەبێتەوە).

لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿ وَمَن يُهِنِ اللَّهُ فَمَا لَهُ مِن مُّكْرِمٍ إِنَّ اللَّهَ يَفْعَلُ مَا يَشَاءُ﴾(الحج١٨).

واتە: (جا ئەوەی خوا قەدر و ڕێزی بشکێنێت و ڕیسوای بکات، ئەوە هیچ ڕێز لێنەرێکی نیە، بەڕاستی خوا ئەوەی بیەوێت دەیکات). بەڕاستی یوسف (علیه السلام) لەسەر ناڕەحەتیەکانی ناو زیندان ئارامی گرت، وەك پێشتر لەبەردەم کاری هەوڵدان بۆ

لەخشتەبردنی ئارامی گرت، ودڵنیا بوو کەخوای گەورە دەرووی لێ دەکاتەوە، وەهەر ویستی خوا زاڵە و سەر دەکەوێت: ﴿وَاللَّهُ غَالِبٌ عَلَى أَمْرِهِ وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ﴾ بێگومان لەگەڵ ئارامگرتن ودڵنیاییدا، سەرکەوتنی بۆ دەستەبەر دەبێت ودادەمەزرێت.

## يوسف (عليه السلام) له زيندانذا

يوسف (عليه السلام) دەچێتە زیندانەوە و دەیکاتە کۆڕی زیکر و بیرکردنەوە و میحرابی پەرستش و گۆڕەپانی زانست وبانگەواز و هەر لەوێ دەگات بە دوو بەردەستی پاشا، کە ئاوگێڕ و نان دروستکەری پاشا بوون، و هەریەکەیان لە ناو زیندانەکەدا خەونێك دەبینن، وداوا لەیوسف دەکەن بۆیان شی بکاتەوە: ﴿وَدَخَلَ مَعَهُ السِّجْنَ فَتَيَانِ قَالَ أَحَدُهُمَا إِنِّي أَرَانِي أَعْصِرُ خَمْرًا وَقَالَ الْآخَرُ إِنِّي أَرَانِي أَحْمِلُ فَوْقَ رَأْسِي خُبْزًا تَأْكُلُ الطَّيْرُ مِنْهُ نَبِّئْنَا بِتَأْوِيلِهِ إِنَّا نَرَاكَ مِنَ الْمُحْسِنِينَ﴾(يوسف/٣٦). یوسف (علیه السلام) خەونەکانیان بۆ لێکدەداتەوە پاش ئەوەی کە بانگەوازی کردوون بۆ خوا پەرستی خوایەکی تاك وتەنها و بەدەسەلآت.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قَالَ لَا يَأْتِيكُمَا طَعَامٌ تُرْزَقَانِهِ إِلَّا نَبَّأْتُكُمَا بِتَأْوِيلِهِ قَبْلَ أَنْ يَأْتِيَكُمَا ذَلِكُمَا مِمَّا عَلَّمَنِي رَبِّي إِنِّي تَرَكْتُ مِلَّةَ قَوْمٍ لَا يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَهُمْ بِالْآخِرَةِ هُمْ كَافِرُونَ (٣٧) وَاتَّبَعْتُ مِلَّةَ آبَائِي إِبْرَاهِيمَ وَإِسْحَاقَ وَيَعْقُوبَ مَا كَانَ لَنَا أَنْ نُشْرِكَ بِاللَّهِ مِنْ شَيْءٍ ذَلِكَ مِنْ فَضْلِ اللَّهِ عَلَيْنَا وَعَلَى النَّاسِ وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَشْكُرُونَ (٣٨) يَا صَاحِبَيِ السِّجْنِ أَأَرْبَابٌ مُتَفَرِّقُونَ خَيْرٌ أَمِ اللَّهُ الْوَاحِدُ الْقَهَّارُ (٣٩) مَا تَعْبُدُونَ مِنْ دُونِهِ إِلَّا أَسْمَاءً سَمَّيْتُمُوهَا أَنْتُمْ وَآبَاؤُكُمْ مَا أَنْزَلَ اللَّهُ بِهَا مِنْ سُلْطَانٍ إِنِ الْحُكْمُ إِلَّا لِلَّهِ أَمَرَ أَلَّا تَعْبُدُوا إِلَّا إِيَّاهُ ذَلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ (٤٠) يَا صَاحِبَيِ السِّجْنِ أَمَّا أَحَدُكُمَا فَيَسْقِي رَبَّهُ خَمْرًا وَأَمَّا الْآخَرُ فَيُصْلَبُ فَتَأْكُلُ الطَّيْرُ مِنْ رَأْسِهِ قُضِيَ الْأَمْرُ الَّذِي فِيهِ تَسْتَفْتِيَانِ﴾(يوسف/٣٧-

٤١). بیروباوەڕی ڕاستی بۆ ڕونكردنە و، بە شێوەیەك كە وەریبگرن و قەناتیان پێ بكات و بە شێوازێكی زۆر ڕوون، خەونەكانی بۆ شیكردنەوە بە شێوەیەكی ڕاست و دروست، داوای لەئاو گێڕەكە كرد كە باسی یوسف بگەیەنێت بەپاشای گەورە، كاتێك لەزیندان ڕزگاری بوو گەیشتەوە بە پاشا.

خوای گەورە لە سوورەتی یوسفدا دەفەرموێت: ﴿وَقَالَ لِلَّذِي ظَنَّ أَنَّهُ نَاجٍ مِّنْهُمَا اذْكُرْنِي عِندَ رَبِّكَ فَأَنسَاهُ الشَّيْطَانُ ذِكْرَ رَبِّهِ فَلَبِثَ فِي السِّجْنِ بِضْعَ سِنِينَ﴾(یوسف\٤٢).

واتە: (ئینجا یوسف بەو كەسەیانی وت -كەوای دەزانی ڕزگاری دەبێت و دەبێتە ساقی پاشا-: باسم بكە لای پاشات، كە بێتاوان من بەند كراوم) بەڵام شەیتان بیری كابرای بردەوە كەلەلای پاشای باسی یوسف بكات، ئیتر چەند ساڵێك (یوسفی بێتاوان) لەبەندیخانەدا مایەوە). یوسف (علیە السلام) چەند ساڵێك لەزینداندا دەمێنێتەوە، ئینجا پاشای گەورەی دەوڵەت خەونێك دەبینێت، كەسێكی دەست ناكەوێت خەونەكەی بۆ شی بكاتەوە.

خوای گەورە لە سوورەتی یوسفدا دەفەرموێت: ﴿وَقَالَ الْمَلِكُ إِنِّي أَرَىٰ سَبْعَ بَقَرَاتٍ سِمَانٍ يَأْكُلُهُنَّ سَبْعٌ عِجَافٌ وَسَبْعَ سُنبُلَاتٍ خُضْرٍ وَأُخَرَ يَابِسَاتٍ يَا أَيُّهَا الْمَلَأُ أَفْتُونِي فِي رُؤْيَايَ إِن كُنتُمْ لِلرُّؤْيَا تَعْبُرُونَ (٤٣) قَالُوا أَضْغَاثُ أَحْلَامٍ وَمَا نَحْنُ بِتَأْوِيلِ الْأَحْلَامِ بِعَالِمِينَ﴾(یوسف \٤٣-٤٤).

واتە: (شەوێك پاشا خەونێكی سەیری بینی و، لە كۆبونەوەكەیدا) وتی:بەڕاستی من لەخەونمدا بینیم كەحەوت مانگای قەڵەو لەلایەن حەوت مانگای لەڕو لاوازەوە خوران، و حەوت گوڵە گەنمی سەوز و جوان و حەوتی وشكیشم بینی، ئەی زاناو شارەزایان ئەم خەونەم بۆ لێكبدەنەوە، ئەگەر خەون لێك دەدەنەوە. ...، ئەوانیش وتیان: ئەم خەونە بێسەر و بنە و هیچ نیە ئێمە لە لێكدانەوەی خەونی بێسەر و بن شارەزا نین).

(الساقی) ئاو گێڕەكە لێرەدا یوسفی بیر دەكەوێتەوە، كە خەونەكەی لە زیندان بۆئەو لێكدابوییەوە، وەك ئەو ڕونی كردەوە هەر بە وجۆرە ڕویدا، ئینجا ساقی داوای مۆڵەتی لە پاشای كردوو، وتی دەچم بۆ لای یوسف لە زیندان و داوای لێ دەكەم خەونەكە لێك

بداتەوە، ئینجا یوسف (علیه السلام) خەونەکەی بۆ لێکدەداتەوە و نەخشە و پلانێکی ئابوری بۆ دادەڕێژێت بۆ ڕوو بەڕوو بونەوە لەگەڵ ساڵانی کەم بارانی وگرانی و وشکە ساڵیدا، کە میسرو هەندێك وولاتی تری دراوسێی چاوەڕێیان دەکرد، پاشان لێکدانەوەی خەونەکە و نەخشە و پلانەکە دەگات بەپاشا سەرسام دەبێت بە یوسف (علیه السلام) وفەرمان دەدات کە لەزیندان دەربهێنرێت و لە کۆشکەکەی ئەو ئامادەی بکەن کەپاشا چاوپێکەوتنی لەگەڵدا بکات، بەڵام یوسف (علیه السلام) ئەوەی ڕەت کردەوە کە لەزیندان دەربچێت مەگەر کاتێك کەچاو بخشێنرێتەوە بەو مەسەلەیەدا کە ئەوی لەسەر زیندانی کراوە، هەروەها لێکۆڵینەوەی مەسەلەکە بکرێت، کە چەند ساڵێکی بەسەردا تێپەریوە، چونکە مافەکان لە ڕوانگەی شەرعەوە بەکات تێپەڕاندن لە کۆڵ ناکەون، وهەتا خەڵکی هەموویان بزانن کە ئەو بەستەم وناحەقی خراوەتە زیندانەوە.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَقَالَ الْمَلِكُ ائْتُونِي بِهِ فَلَمَّا جَاءَهُ الرَّسُولُ قَالَ ارْجِعْ إِلَى رَبِّكَ فَاسْأَلْهُ مَا بَالُ النِّسْوَةِ اللَّاتِي قَطَّعْنَ أَيْدِيَهُنَّ إِنَّ رَبِّي بِكَيْدِهِنَّ عَلِيمٌ﴾(یوسف/٥٠).

واتە: (ساقی گەڕایەوە بۆلای پاشاو لێکدانەوەکەی یوسفی بۆ باس کرد، زۆری بەدڵ بوو، بۆیە پاشایش وتی: ئادەی بچن بۆم بهێنن، جا کاتێك ڕەوانەکراوەکەی پاشا گەشتە لای یوسف، وتی: پاشا داوات دەکات، یوسف وتی: بگەڕێوە بۆلای پاشاو جا پێی بڵێ: هۆی چی بوو ئەو ئافرەتانە کاتی خۆی دەستی خۆیان بڕی و بریندداریان کرد (ئایا من هیچ تاوانێکم لەوەدا هەیە؟!) بەڕاستی هەر پەروەردگارم بە ئاگایە لەفێڵ و تەڵەکەو پلانیان).

## شایەتی ئافرەتەکان و دانپیانانی ژنەکەی عەزیز بە ڕاستییەکاندا و دەرچونی یوسف (علیه السلام) لە زیندان

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَقَالَ الْمَلِكُ ائْتُونِي بِهِ فَلَمَّا جَاءَهُ الرَّسُولُ قَالَ ارْجِعْ إِلَى رَبِّكَ فَاسْأَلْهُ مَا بَالُ النِّسْوَةِ اللَّاتِي قَطَّعْنَ أَيْدِيَهُنَّ إِنَّ رَبِّي بِكَيْدِهِنَّ عَلِيمٌ (٥٠) قَالَ مَا خَطْبُكُنَّ إِذْ رَاوَدْتُنَّ يُوسُفَ عَنْ نَفْسِهِ قُلْنَ حَاشَ لِلَّهِ مَا عَلِمْنَا عَلَيْهِ مِنْ سُوءٍ قَالَتِ امْرَأَتُ الْعَزِيزِ الْآنَ حَصْحَصَ الْحَقُّ أَنَا رَاوَدْتُهُ عَنْ نَفْسِهِ وَإِنَّهُ لَمِنَ الصَّادِقِينَ (٥١) ذَلِكَ لِيَعْلَمَ أَنِّي لَمْ أَخُنْهُ بِالْغَيْبِ وَأَنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي كَيْدَ الْخَائِنِينَ (٥٢) وَمَا أُبَرِّئُ نَفْسِي إِنَّ النَّفْسَ لَأَمَّارَةٌ بِالسُّوءِ إِلَّا مَا رَحِمَ رَبِّي إِنَّ رَبِّي غَفُورٌ رَحِيمٌ﴾(یوسف:٥٠-٥٣).

ئینجا نوێنەری پاشا هات بۆ زیندان بۆ لای یوسف تا مژدەی پێ بدات کە پاشا سەرسام بوو پێی و فەرمانی داوە کە لەزیندان ڕزگاری بکات، خوای گەورە فەرمووی: ﴿بِهِ فَلَمَّا جَاءَهُ الرَّسُولُ قَالَ ارْجِعْ إِلَى رَبِّكَ﴾. کاتێك نوێنەرەکەی پاشا هاتە لای یوسف، یوسف (علیه السلام) پێی وت: بگەڕێرەوە بۆ لای گەورەکەت کە پاشایە، پرسیاری لێ بکە بڵێ: ئەو کارە گرنگەو گەورەی ئافرەتەکان چی بوو، وا دەستی خۆیان لەسەر بڕی؟

زانا (الصابوني) دەڵێت: یوسف (علیه السلام) ڕەچاوی ئەدەبێکی جوانی کرد، قسەکەی لەوەدا کورت کردەوە کە نوێنەرەکەی پاشا پرسیار لە پاشا بکات دەربارەی ڕووداوەکە تا قسەکەی ئەوە نەگرێتەوە کە لەشێوازی فەرمانکردندا بێت بەسەر پاشادا، چونکە پاشایان فەرمان دەردەکەن نەك فەرمانیان بەسەردا بکرێت، بەڕاستی ئەمە شێوازێکی بەرزو بالأو ناوازەیەو پاشا دەجوڵێنێت و بەگەڕدەخات بەدوای گەڕان و لێکۆڵینەوەدا، هەر بەو جۆرەیش ڕوویدا، کاتێك ئەوەی پێگەیشتەوە کە یوسف (علیه السلام) لەزیندان دەرناچێت، هەتا پاشاو بەردەستەکان ئاگادارنەبن بەسەر ڕاستییەکاندا و گرنگی بە کار و بارەکانی نەدەن).[١٤٧]

---

[١٤٧]-(نور القرآن الکریم للصابوني ٥/١٦١).

یوسف (علیه السلام) داوای لێکۆڵینەوەی لە مەسەلەکە کردو هەروەها بەو لاپەڕانەدا کە لە بیرچووبونەوە، و هەر لەزیندانیشدایە. و پەلە ناکات دەربچێت، هەتا هەموو خەڵك بەپاکی و بێ تاوانی نەزانن.

ئەمەش بەڵگەیە لەسەر جوان ئارامگرتنی و، هێزی بەرگە گرتنی.

دەربارەی ئەم مانایە پێغەمبەر(ﷺ)دەفەرموێت: (...ئەگەر من بوومایە لەزینداندا بمامایەتەوە بەو شێوەی یوسفی تیا مایەوە و پاشان بانگ خوازێك بهاتایە بۆلام بانگم بکات بۆ ڕزگاربوون، یەکسەر وەڵامم دەدایەوە).[١٤٨]

یوسف (علیه السلام) دانی نەنا بە باسکردنی ژنەکەی عەزیزدا، ئەوەیش لەبەر ئەدەبی جوان و خۆ بەپاك ڕاگرتن، بەرامبەر ئەم ئەدەبە جوانە، ژنەکەی عەزیز دانی نا بەو کارەدا کە ئەنجامی دابوو، و شایەتی بۆ یوسف دا، بە پاکی و پاك داوێنی، ئینجا وەك قورئان هەواڵی داوە، وتی: ﴿الْآنَ حَصْحَصَ الْحَقُّ﴾. واتە: بەڕوونی دەرکەوت، ﴿أَنَا رَاوَدْتُهُ عَنْ نَفْسِهِ﴾ واتە: ژنەکەی عەزیز وتی: من هەوڵم داوە کە یوسف لەخشتە ببەم. ﴿وَإِنَّهُ لَمِنَ الصَّادِقِينَ﴾ بێگومان کەسێکی ڕاستگۆ بووە لەگەڵ پەروەردگاریدا، و لەگەڵ نەفسی خۆیدا و لەگەڵ عەزیزیشدا، و ڕاستگۆیی بنەمای ئەخلاقی جوان و سەرچاوەی هەموو چاکەیەکە.

﴿ذَٰلِكَ لِيَعْلَمَ أَنِّي لَمْ أَخُنْهُ بِالْغَيْبِ وَأَنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي كَيْدَ الْخَائِنِينَ (٥٢) وَمَا أُبَرِّئُ نَفْسِي إِنَّ النَّفْسَ لَأَمَّارَةٌ بِالسُّوءِ إِلَّا مَا رَحِمَ رَبِّي إِنَّ رَبِّي غَفُورٌ رَحِيمٌ﴾(یوسف\٥٢-٥٣). ئایا دەبێت دەربڕینی ئەم دوو ئایەتە، تەواوکەری قسەی ژنەکەی عەزیز بێت، یان لە قسەی یوسف(علیه السلام) بێت؟.

ئەوەی ئێمە بۆی دەچین و (خوازاناترە): ئەم دەربڕینە تەواوکەری قسەی ژنەکەیە، وەك ئەوەی کە لە ڕووکاری ئایەتەکەو ناوەڕۆکی باسەکەوە لێی تێدەگەین، ژنەکە بەڕاستی دانی نا بەو کارەدا کە ئەنجامی دابوو، و یوسفی بەپاك وپاك داوێن وبێ تاوان باسکرد، تا یوسف بزانێت کە ئەو بەنهێنی وشاراوە خیانەتی لێ نەکردووە، ودرۆی لەسەر نەکردووە و بەخراپە باسی نەکردووە کاتێك بە نهێنی باسی کردووە، بەڵکو دانی ناوە بەڕاستیەکاندا.

---

[١٤٨]-رواه البخاري في صحيحه عن إبي هريرة، كتاب احاديث الأنبياء.

وتراوە: ویستی کە خیانەت لە مێردەکەی نەکات بە ئەنجامدانی زیناو داوێن پیسی، چونکە حەزەکەی جێ بەجێ نەبوو، بەڵکو ویستی مەیلی یوسف بەلای خۆیدا رابکێشێت، و یوسف (علیه السلام) وەڵامی داواکەی نەدایەوە.

﴿وَمَا أُبَرِّئُ نَفْسِي﴾ ئەمەیش لە تەواوکەری قسەی ئافرەتەکەیە کە دانی ناوە بە تۆمەتەکەدا ﴿إِنَّ النَّفْسَ لَأَمَّارَةٌ بِالسُّوءِ﴾بێگومان ڕێنمایی و پاراستن لەلایەن خواوەیە: ﴿إِنَّ رَبِّي غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ خوای گەورە لێخۆشبو و میهرەبانە بۆ کەسانێك تەوبە بکەن و بگەڕێنەوە.

وتراویشە: ئایەتی ﴿ذَٰلِكَ لِيَعْلَمَ أَنِّي لَمْ أَخُنْهُ بِالْغَيْبِ وَأَنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي كَيْدَ الْخَائِنِينَ (٥٢) وَمَا أُبَرِّئُ نَفْسِي إِنَّ النَّفْسَ لَأَمَّارَةٌ بِالسُّوءِ إِلَّا مَا رَحِمَ رَبِّي إِنَّ رَبِّي غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾. لە قسە و دەربڕینی یوسف (علیه السلام)ە، واتە: داوام کرد کە لێکۆڵینەوە لە مەسەلەکەدا بکرێت تا پاکی و بێتاوانیم دەربکەوێت و عەزیز بزانێت کە من خیانەت و ناپاکیم بەرامبەر ژنەکەی نەکردووە، یان دەستم گرت و پابەند بووم بە خۆپاراستن وپاك داوێنی، تا عەزیز بزانێت کە من خیانەتم لەشەرەف و ناموسی ئەو نەکردووە. ئەگەر ئایەتی: ﴿وَمَا أُبَرِّئُ نَفْسِي إِنَّ النَّفْسَ لَأَمَّارَةٌ بِالسُّوءِ إِلَّا مَا رَحِمَ رَبِّي إِنَّ رَبِّي غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾. لە تەواوکەری قسەکانی یوسف (علیه السلام) بێت – بەپێی ئەم بۆچونە –ئەم دەربڕینە ملکەچی بوو لە یوسفەوە،تاخۆی بەپاك و بێتاوان دانەنێت و بەخۆی سەرسام بێت، و بۆ خەڵکی ڕوون ببێتەوە و دەرکەوێت کە ئەمانەتپارێزی ئەو و پاکی وپاك داوێنی، فەزڵ و نیعمەتێکی گەورەیە لەلایەن خواوە، وهیدایەت و ڕەحمەت وچاودێری و پاراستنی خوایە بۆ ئەو.

* بەڵام ئەوەی کە ئێمە بۆی دەچین.کە قسەی ژنەکەی عەزیز بێت و ڕواڵەتی ئایەتەکان و ناوەڕۆکەکەیش وای دەردەخات، ئەو دەربڕینەیش گونجاو و جوانە لەگەڵ حاڵی ئافرەتەکەدا، و یوسف لەو کاتەدا لە لێکۆڵینەوەکەدا ئامادە نەبووە، چونکە لە زینداندا بوو، و هێشتا دەرنەچو وبوو.

## دامەزراویی و پایەدارکردنی یوسف (علیه السلام)

یوسف (علیه السلام) بەناو کۆمەڵێکی زۆر لەناڕەحەتی وئازاردا تێپەڕی کەبریتی بوون لەفێڵ و نەخشەی براکانی و فڕێدانی بۆ ناو بیر و بەبەندەکردنی و فرۆشتنی لە بازاڕدا و هەوڵی مەیل کێشکردن ولە خشتەبردنی، کە لە قورسترین و ناڕەحەتترینی فیتنە و مەترسیەکان بوو، پاشان زیندانی کردنی کە ئەویش قورس و ناڕەحەتە. پاش ئەوەی خۆڕاگرو دامەزراو بوو بەرامبەر هەموو ئەم ناڕەحەتیانە، خوای گەورە ڕێز لە بەندە و پێغەمبەری خۆی یوسف (علیه السلام) دەگرێت ولەسەر زەویدا پایەداری دەکات، پاشای گەورە هەڵی دەبژێرێت وپەسەندی دەکات، کە کلیل بەدەستی گەنجینەکانی سەر زەوی بێت لەو کاتەدا، کاتێك بینی کەسێکی ئەمانەت پارێزو داوێن پاك و ڕاستگۆ و زانایە، (بێگومان هەرکەس لە مەسەلەی شەرەف و ئابڕودا ئەمین و پاك و پارێزراو بێت، ئەوە لە پێشترە کە لە سەر ماڵ و سامان و گەنجینەکانی سەرزەوی ئەمین بێت)[١٤٩].

خوای گەورە فەرمووی: ﴿وَقَالَ الْمَلِكُ ائْتُونِي بِهِ أَسْتَخْلِصْهُ لِنَفْسِي فَلَمَّا كَلَّمَهُ قَالَ إِنَّكَ الْيَوْمَ لَدَيْنَا مَكِينٌ أَمِينٌ (٥٤) قَالَ اجْعَلْنِي عَلَى خَزَائِنِ الْأَرْضِ إِنِّي حَفِيظٌ عَلِيمٌ (٥٥) وَكَذَلِكَ مَكَّنَّا لِيُوسُفَ فِي الْأَرْضِ يَتَبَوَّأُ مِنْهَا حَيْثُ يَشَاءُ نُصِيبُ بِرَحْمَتِنَا مَنْ نَشَاءُ وَلَا نُضِيعُ أَجْرَ الْمُحْسِنِينَ (٥٦) وَلَأَجْرُ الْآخِرَةِ خَيْرٌ لِلَّذِينَ آمَنُوا وَكَانُوا يَتَّقُونَ﴾(یوسف:٥٧).

واتە: ئینجا پاشاکە ڕاستی یەکانی بە تەواوی بۆ دەرکەوت، ئەوەندەی تر یوسفی لا بەڕێزو بەنرخ بوو، بۆیە) فەرمانیدا و وتی:ئادەی بچن بۆم بهێنن (ئەو لاوە پاك و ژیرو زانایە) تایبەتی دەکەم بەخۆم و لەنزیکانی من بێت، جا کاتێك(هێنایان) و پاشا قسەی لەگەڵ کرد، وتی: ئەمڕۆ ئیتر بە ڕاستی تۆ لای ئێمە خاوەنی پلە و جێگەی متمانە و

---

[١٤٩] – التذوق الجمالي لسورة يوسف. محمد علي ابو حمدة ص/٨٤.

د ەڕیت، یوسف وتی: پێم باشە، بمکەیت بە لێپرسراو بەسەر گەنجینەکان و سامانی سەرزەوی ئەم وڵاتە (میسر) بەڕاستی من پارێزکارێکی زانام (لەخۆم ڕا دەبینم شت بپارێزم و زانایشم کە چۆن دەیپارێزم.

(خوا دەفەرموێت) ئا بەو شێوەیە دەسەڵاتمان دا بە یوسف (علیه السلام) و جێگیر و پایەدارمان کرد لە خاکی میسردا، هەر پلەوپایەیەکی دەویست لەو وڵاتەدا، دەستی دەکەوت و بۆی ساز دەبوو، هەر کەسێك هەر دەستەیەك بمانەوێت بەهرەوەری دەکەین لە ڕەحمەت و بەخششەکانمان و پاداشتی چاکەکاران بەزایە نادەین، بێگومان پاداشتی ئەو جیهان (لە بەهەشتی بەریندا) چاکترە بۆ ئەوانەی کەئیمان و باوەڕیان هێناوە و خۆیان دەپاراست).

## کۆبونەوەی کەس و کار و نزیکان بۆ یوسف ( علیه السلام )

یوسف (علیه السلام) بە سوپاسگوزاری لەسەر نیعمەتەکان پێشوازی لە بەخششەکانی خوا کرد..ئینجا براکانی هاتن بۆ لای، یوسف ئەوانی ناسی یەوە، بەڵام براکان یوسفیان نەناسی یەوە، بێگومان ئەو لەتوانایدا بوو تۆڵەیان لێ بکاتەوە، بەڵام لەگەڵیاندا دادوەرانە مامەڵەی کردوو نەرم ونیان وبە بەزەیی بوو بەرامبەریان، وداوای لێ کردن ئەو برایەشیان بێنن کە لای باوکیان جێیان هێشت بوو، ئینجا لەجاری داهاتوودا ئەویشیان ئامادەکرد، ئینجا یوسف (علیه السلام) توانی بەهۆی نەخشە دانانێکی شەرعی وڕێگە پێدراوەوە لای خۆی گلی بداتەوەو لای ئەوبێت. ... ڕوداوەکان بەسەر یوسف وبراکانیدا تێدەپەڕین، هەتا براکان ڕاستیەکەیان بۆ دەردەکەوێت، ئینجا یوسف (علیه السلام) هەواڵیان پێ دەدات کە ئەوە یوسفە، ئەو یوسفەی کە حەسوودییان پێ برد، ئەو یوسفەی کە لەگەڵ خۆیان بردیان هەتا کراسەکەیان لەبەری داکەند و خۆیان بەڕوتی فڕێیادایە ناو بیرەکەوە، پاشان درۆیەکیان دروست کردوو بۆ باوکیان گێڕایەوە، کە گورگەکە یوسفی خواردووە، لە کاتێکدا کە گورگەکە لەخوێنی یوسف بەریی و بێ تاوان

و بیّ ئاگا بووە! ئینجا یوسف (علیه السلام) هەواڵی خۆی دەدات پێیان، دەفەرموێت: ﴿قَالَ هَلْ عَلِمْتُم مَّا فَعَلْتُم بِيُوسُفَ وَأَخِيهِ إِذْ أَنتُمْ جَاهِلُونَ (٨٩) قَالُوا أَإِنَّكَ لَأَنتَ يُوسُفُ قَالَ أَنَا يُوسُفُ وَهَذَا أَخِي قَدْ مَنَّ اللَّهُ عَلَيْنَا إِنَّهُ مَن يَتَّقِ وَيَصْبِرْ فَإِنَّ اللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجْرَ الْمُحْسِنِينَ (٩٠) قَالُوا تَاللَّهِ لَقَدْ آثَرَكَ اللَّهُ عَلَيْنَا وَإِن كُنَّا لَخَاطِئِينَ (٩١) قَالَ لَا تَثْرِيبَ عَلَيْكُمُ الْيَوْمَ يَغْفِرُ اللَّهُ لَكُمْ وَهُوَ أَرْحَمُ الرَّاحِمِينَ﴾(یوسف\٨٩-٩٢).

واتە: ((ئینجا یوسف زانی کاتی ئەوە هاتووە کە خۆی بناسێنێت، بۆیە،وتی: ئایا زانیتان وبیرتانە چیتان کرد بەیوسف وبە براکەی، کاتێك ئێوە نەفام بوون وترسی خواتان لەدڵدا نەبوو!، (هەموو بە سەرسوڕمانەوە چاویان ئەبڵەق بوو، وسەرنجیان داو)وتیان:ئایا بەڕاست بۆچی تۆ یوسفیت؟! وتی: بەڵێ، من یوسفم و ئەمەش (بنیامین)ی برامە، بەڕاستی خوای میهرەبان ڕێزی لێ ناوین و بەهرەمەندی کردووین، بێگومان ئەوەی خۆپارێز بێت لەگوناه و خۆگر بێت، (لەبەرامبەر پێشهاتەکانەوە، خوای گەورە دەروی لێ دەکاتەوە) ئەوە بەڕاستی خوا پاداشتی چاکەکاران و چاکەخوازان بەزایە نادات، ئینجا براکانی وتیان: سوێندمان بەخوا بەڕاستی خوای گەورە ڕێزی تۆی داوە بەسەر ئێمەدا، ئێمە بەڕاستی کاتی خۆی بەهەڵەدا چو بووین وگوناهبارین، یوسف (علیه السلام) ووتی: خەمتان نەبێت،ئەمڕۆ ئیتر هیچ سەرزەنشتێکتان لەسەر نییە، خوا لێتان خۆش بێت، بێگومان ئەو زاتە لەهەموو میهرەبانان میهرەبانترە)).

پاشان ڕووداوەکان بەیەك دەگەن وبەردەوام دەبن و، کەس وکارو نزیکان بۆ یوسف ئامادە دەبن و هەموو کۆدەبنەوە بە باوك و براکانەوە، پاش ماوەیەکی زۆر دوور ودرێژ کە لەیەك دابڕا بوون، ویوسف بەکەس وکارەکەی خۆی شاد دەبێتەوە لەخاکی میسردا.

خوای گەورە لە سوورەتی یوسفدا دەفەرموێت: ﴿فَلَمَّا دَخَلُوا عَلَى يُوسُفَ آوَى إِلَيْهِ أَبَوَيْهِ وَقَالَ ادْخُلُوا مِصْرَ إِن شَاءَ اللَّهُ آمِنِينَ (٩٩) وَرَفَعَ أَبَوَيْهِ عَلَى الْعَرْشِ وَخَرُّوا لَهُ سُجَّدًا وَقَالَ يَا أَبَتِ هَذَا تَأْوِيلُ رُؤْيَايَ مِن قَبْلُ قَدْ

- يَا رَبِّي حَقًّا وَقَدْ أَحْسَنَ بِي إِذْ أَخْرَجَنِي مِنَ السِّجْنِ وَجَاءَ بِكُم مِّنَ الْبَدْوِ مِن بَعْدِ أَن نَّزَغَ الشَّيْطَانُ بَيْنِي وَبَيْنَ إِخْوَتِي إِنَّ رَبِّي لَطِيفٌ لِّمَا يَشَاءُ إِنَّهُ هُوَ الْعَلِيمُ الْحَكِيمُ﴾(يوسف٩٩-١٠٠).

واتە: ((ئینجا کەهەموویان گەیشتنە میسر، چوونە لای یوسف (علیه السلام)، باوك و دایکی هێنایە لای خۆی و (ڕێزی زۆری بۆدەربڕین، ئاخۆ چەندە دڵخۆش وکامەران بوبن، دوای ئەوماوە دوور ودرێژە بە کوڕی جوان کردار و خواناسیان شادبووبن، ئێستایش پاشای میسرە) وپێی ووتن: (إن شاء الله) ئەگەر خوا ویستی لەسەر بێت بە یەکجاری وەرن بۆ میسر و بەوپەڕی شادی وئارامی وکامەرانی نیشتەجیٚ بن، ئینجا دایك وباوکی بەرزکردەوە بۆ سەرتەختی پاشایەتی وحوکمڕانی خۆی، هەمووان کڕنوشیان بۆبرد (دیارە کە ئەوسا دروست بووە و نیشانەی ڕێزو پێزانین بووە) یوسف کەئەمەی دی وتی: باوکی بەڕێزم ئەمە لێکدانەوەی خەونەکەی ئەوسامە کە بە منداڵی بینیم، ئەوەتا بێگومان پەروەدگارم هێنایە دی و بەڕاست دەرچوو، بەڕاستی ئەو زاتە چاکەی لەگەڵدا کردم وبەسۆز بوو بۆم، کاتێك لەزیندان ڕزگاری کردم، ئەوەتا ئێوەی لە بیابانەوە هێناوە (بەیەك شادی کردینەوە) دوای ئەوەی شەیتان نێوانی من وبراکانمی تێکدا بوو،بەڕاستی پەروەردگارم بەسۆزو بە لوتفە بۆ هەرشتێك کەدەیەوێت (پەلەی نیە و بەشێنەیی ڕێگای بۆخۆش دەکات) بێگومان ئەوزاتە زانایە (بەنهێنی وئاشکرای دروستکراوانی) ودانایە (بەنەخشەی وورد، هەرچی بیەوێت ئەنجامی دەدات)).

بەپێی ڕواڵەتی دەقە قورئانیەکە کە ئەوە دەگەیەنێت کەدایکی یوسف(علیه السلام) لەژیاندا ماوەو هاتووەتە میسر لەگەڵ یعقوبی مێردیدا تا بە یوسف بگاتەوە، ئەوەش لە ﴿أَبَوَيْهِ﴾دا دەردەکەوێت.

زانا (محمد بن أسحاق) و (إبن جرير الطبري) دەڵێن: دایکی و باوکی مابوون و لە ژیاندا بوون، و (إبن جرير) دەڵێت: هیچ بەڵگەیەك نییە لەسەر مردنی دایکی، و بەپێی دیوی

ئاشکرای ئایەتە قورئانی یەکان زیندوو بوو، و (إبن کثیر) دەڵێت: ئەوەی (إبن جریر) پشتی پێ بەستبوو، ئەوە تێڕوانینە، کە ناوەڕۆك بەڵگەی لەسەر دەدات. [150]

کڕنوش بردن بۆ یوسف (علیه السلام)ئەوە سەلام و سڵاوکردن و ڕێزگرتن بووە، نەك سوجدەی پەرستش و بە گەورە دانان، ئەوە ڕێگە پێدراو بوە، بەڵام لە ئیسلامدا تەنها (السلام) سەلامکردن ڕێگە پێدراوبوە، کە بریتی بوە لە: ﴿تَحِيَّةً مِّنْ عِندِ اللَّهِ مُبَارَكَةً طَيِّبَةً﴾(النور:٦١).

واتە: (سەلام لەیەکتر بکەن، سەلامێك لەلایەن خوای گەورەوە، کە پڕە لەبەرەکەت و فەڕو جوانی و پاکی).

پاش تەواوکردنی ئەم ناز و نیعمەتە خوایی و بێ ئەندازەیە، ئینجا یوسف(علیه السلام) ڕوو دەکاتە پەروەردگاری تا خوای گەورە کۆتاییەکی باشی پێ ببەخشێت، و داوای لێ دەکات سەرفرازی بکات لە قیامەتدا وەك خوای گەورە لە دنیادا حاڵی چاك کرد و کەس وکارو نزیکانی بۆ کۆکردەوە، ئیجا دەڵێت:وەك قورئان هەواڵی داوە: ﴿رَبِّ قَدْ آتَيْتَنِي مِنَ الْمُلْكِ وَعَلَّمْتَنِي مِن تَأْوِيلِ الْأَحَادِيثِ فَاطِرَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ أَنتَ وَلِيِّي فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ تَوَفَّنِي مُسْلِمًا وَأَلْحِقْنِي بِالصَّالِحِينَ﴾(یوسف:١٠١).

واتە: ((ئینجا یوسف پێغەمبەر(علیه السلام) چووە کەنارێکەوە دەستەکانی هەڵبڕی و نزای کردوو وتی: (پەروەردگارا بەڕاستی تۆ پاشایەتیت پێ بەخشیم و لە لێکدانەوەی خەون شارەزات کردم، ئەی بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەوی، تۆ پشت و پەنا و یارو یاوەری منیت لە دنیاو قیامەتدا، داواکارم کە بەمسوڵمانی بمرێنیت و بمخەیتە ڕیزی پاکانەوە و بمگەیەنیت بەکاروانی چاکان).

---

[150] - (جامع البیان للطبري ٦٧/١٣ و تاریخ الطبري ٢١٨/١ و تفسیر إبن کثیر ٤٩١/٢).

**باسی پێنجەم:**

**ئەو وانە گرنگانەی پەیوەندییان بە چیرۆکی یوسف (علیه السلام) و ژنەکەی عەزیزەوە هەیە:**

**لە چیرۆکی یوسف (علیه السلام) لەگەڵ ژنەکەی عەزیزدا، زۆرێك لە وانە و پەندی گرنگی تیایە، هەندێکیان باس دەکەین و ڕوون دەکەینەوە:**

## بنەمای پەروەردەی بەهێزو دامەزراو

* لە ئایەتی: ﴿وَلَمَّا بَلَغَ أَشُدَّهُ آتَيْنَاهُ حُكْمًا وَعِلْمًا وَكَذَلِكَ نَجْزِي الْمُحْسِنِينَ﴾دا، بنەماو پایەکانی پەورەردەی بەهێزو دامەزراو باس کراوە، کە هاوسەنگی تەواو و پێکەوە ژیانی ڕۆح و جەستەیی جێ بەجێ دەکات، لە ئایەتی: ﴿وَلَمَّا بَلَغَ أَشُدَّهُ﴾ ئاماژە کراوە بۆ گشەکردنی تەواوی یوسف و ڕێك و تەواو پێگەیشتنی جەستەی، لە ئایەتی: ﴿آتَيْنَاهُ حُكْمًا وَعِلْمًا وَكَذَلِكَ نَجْزِي الْمُحْسِنِينَ﴾ ئاماژە کراوە بۆ هێزی ڕۆحی، کە پڕە لە زانست و حیکمەت و چاکە، زانستی بەسوود و عەقڵی هاوسەنگ و بەرچاو ڕوونی و کاریگەری، و هەست کردنی هۆشیارانە و دڵی ساغ و نەفسی پاك و ئارام و پڕ لە دڵنیایی و ڕازی بوون بە نیعمەتی خوا، هەموو ئەمانەش لەبەرهەمی پێغەمبەرایەتی لەو وەرگیراون.
لەمەدا وانەو پەندی گرنگ و گەورەی تیایە بۆ پەروەرشیاران: کە پەورەردەی جەستەیی و عەقڵی و ڕۆحی بە یەکەوە کۆبکەنەوە، تا ببێتە پەروەردەیەکی تەواو و بەرهەم دار.

## چەند پەند و ڕوونکردنەوەیەك لە چیرۆکەکەدا

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿لَقَدْ كَانَ فِي قَصَصِهِمْ عِبْرَةٌ لِأُولِي الْأَلْبَابِ﴾(یوسف/١١١).
بە ڕاستی خوای گەورە ئارەزووی جنسی دروستکردووە و دایناوە و کردوویەتی بە

حیکمەت و هۆکارێك بۆ هێشتنەوەی جۆر و پاراستنی نەوە و وەچە لە چوارچێوەی حەڵاڵ و دروستدا کە (هاوسەرگیری)یە و هاندەر بووە لەسەری و هۆکارێکە بۆ خۆپاراستن لە حەرام و ناپاکی (خیانەت و زینا و فاحیشە)خوای گەورە ئەمانەی قەدەغە کردوە و ئاگاداری لەسەر داون، و ئارەزووی کردووە بە یەکێك لەتاقی کردنەوەکان لەکاتی تەکلیفی پەرستشەکاندا بۆ ئینسانی ژیر و پێگەیشتوو، کە: کارە چاکەکان ئەنجام بدات و خۆی لە قەدەغەکراوەکان بپارێزێت، خوای گەورە ـ لە ڕەحمەت و بەزەیی بە بەندەکان و یارمەتی و هاوکاری بۆیان ـ کردویەتی بە مایەی سوود لە دنیا و لە قیامەتیشدا لەوانە:

١–پێکهێنانی خێزانی ساغ و تەندروست، کە خشت و بەردی یەکەم و بنەڕەتییە لە دروستکردنی کۆمەڵگای ئینسانی تەندروستدا.

٢–پارێزگارییە لە تەندروستی دەروونی و جەستەیی بۆتاك و کۆمەڵ و کۆمەڵگا.

٣–پارێزگارییە بۆ گشت مافەکانی هەمو لایەك بە نێرینە و مێینە و باوکان و نەوەکانیان.

٤–ڕێگرییە لە ستەمکردن و دوژمنایەتی لە لایەنێکەوە بۆ سەر لایەنێکی تر بە شێوەی ڕاستە و خۆ یان ناڕاستە و خۆ.

## چەند لایەنێك لە پەند و سوودەکان لە چیرۆکی یوسفدا کە وەك نمونەیەکی بەرز هەڵبژێردراوە لە تەمەنی تەکلیف و پەرستشدا لە زاڵ بوونی بەسەر ئارەزووی جنسی و پاراستنیدا

١–هەڵبژاردنی یوسف (علیه السلام) کە پێغەمبەر بوو: خوای گەورە پێغەمبەرانی کردووە بە نمونە و پێشەنگی بەرز و باڵا و جوان ڕەفتار بۆ گشت خەڵکی، لەوەی کە خوای گەورە سیفەتی جوان و زانستی پێ بەخشیون و بە توانای کردوون بۆ کارێك کە ئەهلی ئەو کارە بن و چاك ئەنجامی بدەن، کاتێك خوای گەورە تاقیان دەکاتەوە تایبەت مەندیان دەکات بەو ناڕەحەتییە سەخت و گەورانە، بۆ ئەوەیە بیانکاتە کۆمەڵێك وانەی کرداری و جێ بەجێ کاری زیندوو بۆ گشت خەڵکی، ئادەم لە (فەرمان ونەهی)دا، ئەیوب لە (ئارامگرتندا)، و سولەیمان لە (دەستەڵات و پاشایەتی گەورە و تێگەیشتن و زانست و

حیکمەتدا)و ئیبراهیم لە (دڵ ساغی و دڵسۆزی و ڕووکردنە خوا و تەسلیم بوونی ڕەهادا) و محمد ﷺ (لە گشت گیری و هەموو سیفاتە چاك و گەورەکان).

٢-هەڵبژاردنی یوسف کە گەنجێکی بەهێز و بە توانا بوو: بە جۆرێك کە ئارەزووی لەوپەڕی هێز و پێگەیشتوییدا بوو، و هەڵچوونی بەهێز بوو، کە هێشتا کامڵ وهاوسەنگ نەبوو، هەروەها ئەو جوانییە زۆرەی کە پێی بەخشرا بوو یارمەتیدەری بوو.

٣-یوسفێکی پیاو:کە نێرینەیە و ناترسێت لە داهاتوی سك پڕ بوون ومنداڵ بوون.

٤-یوسفێك کە کوڕە و هێشتا ژنی نەهێناوە، کە ڕێگایەکی تری نییە بۆ بەتاڵ کردنەوەی ئارەزووەکانی.

٥-یوسفێکی غەریب: کە لە پەیوەندییە خێزانی و داب و نەریتەکان و چاولێکەرییە کۆمەڵایەتییەکان ئازادە کە دەگونجێت کاریگەری بکرێتە سەر بڕیارەکانی.

٦-یوسفێکی بە بەندە کراو: کە ندەیەکی گەنجی ژێر فەرمان خراوە بۆ گەورەکەی کە موڵکی ئەوە و گوێڕایەڵی کردنی پێویستە و خاوەنەکەیشی زۆری خۆش دەوێت(کە ژنەکەی عەزیزە).

٧-یوسفێکی پارێزراو: لە ئابڕوو چوون و ئاشکراکردن.

٨-یوسفێکی بانگ کراو:بە هەموو شێوازێکی بانگ کردن لە هێز و تەفرەدان و ڕاکێش کردن.

**بەڵگە و نیشانەی پەروەردگاری یوسفی پاراست**

لە خواترسان و تەقوا و چاودێری ئاشکرا و ڕوونی خوایی لەسەر بنەما ئیمانییەکان و بڕیارە شەرعییەکان (زانست بە دین و قیەم و بەها و شوێن کەوتنیان) جیاکەرەوەی بڕیاردەر بوو بۆ یوسفی ڕاستگۆ لە بەرامبەر ئەم شەپۆلە ڕامالەرەوە. ئەگەر لەم چیرۆکەدا نمونەکە (موسی) (علیه السلام) بوایە لە باتی یوسف (علیه السلام)، بەڕاستی دەوترا: بێگومان موسی پیاوێکی پێگەیشتو و کامڵ و دامەزراو بووە لە ڕووی عەقڵ و ژیرییەوە لەوەی کە تووشی هەڵخلیسکان بێت. ئەگەر کچێك لە باتی ژنەکەی عەزیز بکرایەتە نموونە، ئەوا بەڕاستی دەوترا: ترساوە لەسکپڕبوون و منداڵ بوون و ئابڕوچوون و شکاندنی کچێتی و پاشهاتەکانی دوای کارەکە لەسەردەرونی لەو کاتە و لە داهاتوودا.

بەکورتی: سیفاتە پاڵنەرەکان بۆ ئەنجامدانی کارەکە لە یوسفدا کۆبووبوونەوە. بەڵام بەڵگە و نیشانەی پەروەردگاری بە تەنها وەك کێوێکی خۆڕاگر و بەهێز لە ناوەڕاستی

بیابانێکی چۆڵدا دروست بوو، تا ببێتە جیاکەرەوە و پارێزەرێکی گەورە. بەڕاستی ئەوەیش سیفاتی تەواوی خوای گەورە بوو، و خوای گەورە ڕاست و تەواوی فەرمووە کاتێك لە سەرەتای سوورەتەکەوە فەرموویەتی: ﴿نَحْنُ نَقُصُّ عَلَيْكَ أَحْسَنَ الْقَصَصِ﴾ ولەکۆتایی فەرموویەتی: ﴿لَقَدْ كَانَ فِي قَصَصِهِمْ عِبْرَةٌ لِأُولِي الْأَلْبَابِ﴾.[151]

## پەروەردە قەڵایەکی پارێزەرە

لە باسکردنی ئایەتی ﴿وَلَمَّا بَلَغَ أَشُدَّهُ آتَيْنَاهُ حُكْمًا وَعِلْمًا وَكَذَلِكَ نَجْزِي الْمُحْسِنِينَ﴾ پێش باسکردنی فیتنەی لەخشتەبردن کە تووشی یوسف کراو خوا پاراستی، لەمەدا ئاماژەی ڕوون هەیە بۆ پەندو وانەیەکی جوان لە وانەی پەروەردەیی، کە قەڵایەکی بەهێزو پارێزەرە بۆ خاوەنەکەی، و ناڕەحەتییەکانی پێ دەبڕێت و لەبەردەم ناڕەحەتی و تاقیکردنەوەکاندا خۆ ڕاگر دەبێت.

## حەرامی تێکەڵاو بوون و مانەوە لەگەڵ ئافرەتی بێگانەدا و شوێنەوارە خراپەکانیان

لە ئایەتی: ﴿وَرَاوَدَتْهُ الَّتِي هُوَ فِي بَيْتِهَا عَنْ نَفْسِهِ وَغَلَّقَتِ الْأَبْوَابَ وَقَالَتْ هَيْتَ لَكَ﴾ هەست بە مەترسی تێکەڵاوبوون و مانەوە لەگەڵ ئافرەتی بێگانە و نامەحرەم دەکەین، کە هەردوکیان هۆکاری ڕاکێشانن بۆ ناو فاحیشەو زینا و داوێن پیسی.

بێگومان ئیسلام زینا و داوێن پیسی حەرام کردووە، هەروەها هەموو هەنگاو و پێشەکییەکانیشی حەرام کردووە، لە تێڕوانینی حەرام و تێکەڵاو بوون و مانەوە و خۆ دەرخستن و شتی تر لەو هۆکارانەی کە دەبنە هۆی ڕوودانی زینا و داوێن پیسی.

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَلَا تَقْرَبُوا الزِّنَا إِنَّهُ كَانَ فَاحِشَةً وَسَاءَ سَبِيلًا﴾(الأسراء:٣٢).

---

[151] - يوسفُ أيها الصديق .د .محمدعاطف السقا .ص/١٤٠-١٤٢

واتە: (نزیکی کاری ناپەسەندی زینا مەبنەوە، بێگومان فاحیشە و تاوان و کارێکی خراپ و ڕێگایەکی بەد و خراپە).

هەروەها خوای گەورە لە سوورەتی (نور) دا – کە ئەمە ماناکەیەتی – دەفەرموێت: (ئەی ئەوانەی ئیمان و باوەڕتان هێناوە شوێنی هەنگا و نەخشە و پلانەکانی شەیتان مەکەون، هەرکەس شوێنی هەنگاو و نەخشە و پلانی شەیتان بکەوێت، زەرەر دەکات، چونکە بەڕاستی شەیتان هەمیشە فەرمان بە کردەوەی خراپ و گوناهو تاوان و ناشیرینی دەکات، ئەگەر فەزڵ و میهرەبانی خوا نەبوایە لەسەرتان، ئەوە هەگیز کەستان پاك و پوختەو پزگار نەدەبوون (لەدەست بوختانچییەکان، یاخود بە تەوبە پاك نەدەبونەوە) بەڵام خوا هەرکەسێکی بوێت و شایستە بێت، پاك و پوختەی دەکات و لە گوناهەکانی دەبورێت، خوایش هەمیشە بیسەر و زانایە (بە تەوبە و پەشیمانیاتان و نیەتی دڵ و دەرونتان)(نور:٢١).

## پشت بەستن بە خواو پاراستنی ڕێزەکان و پارێزگاری لە نازو نیعمەتەکان

کاتێك ئافرەتەکە ویستی یوسف (علیه السلام) لەخشتە بەرێت و هەموو دەرگاکانی لێ داخست و بانگی کرد بۆلای خۆی، یوسف (علیه السلام) لە وەڵامدا وتی: ﴿قَالَ مَعَاذَ اللَّهِ إِنَّهُ رَبِّي أَحْسَنَ مَثْوَايَ إِنَّهُ لَا يُفْلِحُ الظَّالِمُونَ﴾.

ئاماژەیە بۆ پێویست بوونی پەناگرتن بە خواو پشت بەستن پێی لەفیتنە و تاوان، و توانی سنورەکان بپارێزێت و نەچێتە ناو حەرامەوە، و ڕەچاوی ئەو عەهدو پەیمانە بکات کە لەسەری بوو، و سوپاسگوزاری ئەو نازو نیعمەتانە بکات کە لەسەری بوو، هەروەها لە ﴿إِنَّهُ لَا يُفْلِحُ الظَّالِمُونَ﴾ دا، ئاماژەکراوە بۆ بەد و خراپی سەرپێچی و تاوان و چارەنوسی خراپ لە دنیا و لە قیامەتدا.

## هەرکەس بەرچاو ڕوون بێت لە داهاتوو پەشیمان نابێت

ئایەتی: ﴿لَوْلَا أَن رَّأَىٰ بُرْهَانَ رَبِّهِ﴾ ئاماژەیە کە هەرکەس بەرچاو ڕوون بێت لەداهاتوو، ئەوە ئەمین دەبێت لە پەشیمان بوونەوە، و پێویستە مرۆڤ لە داهاتووی کارەکانی بڕوانێت و هەمیشە بیربکاتەوە کە دەگەڕێتەوە بۆلای خوای گەورە و لەبەردەم خوای گەورەدا ڕادەوەستێت.

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿إِلَى اللَّهِ مَرْجِعُكُمْ جَمِيعًا فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾(المائدة:١٠٥).

واتە: (ئێوە هەموتان گەڕانەوەتان بۆلای خوایە و هەواڵی ئەو کارانەتان پێ دەدرێت کە ئەنجامتان داوە).

با ئینسان بڕوانێت بۆ سەر ئەنجامی سەرپێچی و تاوان و بزانێت لەززەتەکەی چییە و چەندە، کە دەبڕێتەوە و کۆتایی دێت، لەگەڵ ئەوەشدا کە سزای خوایی تووش دەبێت، وبا کەسێکی خۆشەویست و عاشق بڕوانێت لە خۆشەویستی و عەشقەکەی، کە بۆ کەسانێکی خراپ بووە. ئینجا لە هەڕەتی گەنجی و هێزەوە چووە بۆ پیری و لاوازی و تێکچوونی پێست و دیمەن، و لە ژیانەوە بۆ مردن، ولەماڵ و خانە و شوێنی نیشتەجێ بوونەوە بۆ ناو گۆڕ، و لەسەر تەپاوتلی ناو جێگە و لێفەو دۆشەکی نەرمەوە بۆ ڕاکشان لەسەر خۆڵ و خاك.

## پلەو ئاستی دڵسۆزی و بەرهەمەکانی

لە ئایەتی: ﴿كَذَٰلِكَ لِنَصْرِفَ عَنْهُ السُّوءَ وَالْفَحْشَاءَ إِنَّهُ مِنْ عِبَادِنَا الْمُخْلَصِينَ﴾دا ڕوون کراوەتەوە کە پاراستن و پارێزراوی و هیدایەت لەلایەن خواوەیە، و هەروەها پلە و ئاستی دڵسۆزی و

ئیخلاصیش ڕوون کراوەتەوە و بەرهەمەکانی جوانن، و ئەو دڵەی کە بە دڵسۆزی ڕووناك کراوەتەوە و شوێنێکی تیا نەماوەتەوە بۆ تاریکی و تاوان و خراپە و فاحیشە، بێگومان ئەوە دڵێکە پابەندە بەخواوە، و تەنها بەخوای گەورەوە سەرقاڵ دەبێت، دڵێکە هەمە بچووك و نزم بیّ نرخەکان ناناسێت و گرنگی نادات بە دیاردە دنیایی یەکان.

## بڕیاردان بە بڕیاری عەقڵی

لە ئایەتی: ﴿وَشَهِدَ شَاهِدٌ مِّنْ أَهْلِهَا إِن كَانَ قَمِيصُهُ قُدَّ مِن قُبُلٍ فَصَدَقَتْ وَهُوَ مِنَ الْكَاذِبِينَ (٢٦) وَإِن كَانَ قَمِيصُهُ قُدَّ مِن دُبُرٍ فَكَذَبَتْ وَهُوَ مِنَ الصَّادِقِينَ (٢٧) فَلَمَّا رَأَى قَمِيصَهُ قُدَّ مِن دُبُرٍ قَالَ إِنَّهُ مِن كَيْدِكُنَّ إِنَّ كَيْدَكُنَّ عَظِيمٌ﴾(یوسف:٢٦ – ٢٨). لە هەردوو ئایەتەکەدا ئاماژە بۆ گرنگی شایەت و شایەتی دان و مەزەندەی عەقڵی لە بڕیارداندا و ناسین و زانینی مەسەلە گوماناوی و شاراوەکان کراوە، زانینی تاوان و تاوانکار، وەك ئەمڕۆ دەبینین و دەبیستین.

## پەسەندی و ڕێزی داوێن پاکی

لە چیرۆکی یوسف (علیه السلام) لەگەڵ ژنەکەی عەزیز و ئافرەتەکاندا، و دامەزراوی یوسف لەبەردەم ئەو هەموو هۆکاری گومڕاکردن و خراپەکاری یەدا و هەوڵ دان بۆ لەخشتەبردن. و پاشان یوسف (علیه السلام) زیندانی بۆ خۆی هەڵبژارد بەسەر ئەوەدا کەوەڵامی داوای ئافرەتەکان بداتەوە، لەگەڵ ناڕەحەتی و ناخۆشی ناو زیندان، و لەگەڵ ئەوەی لە وەڵام دانەوە و بە دەمەچوونی خراپەدا ڕابواردن و لەزەت وەرگرتن هەیە.
لەسەر ئەو هەڵوێستە بەڕێزە جوانانەی کە یوسف لەسەری دەمەزراو بوو وانەی زۆری لە پاکی و داوێن پاکی تیایە.

پاکی و داوێن پاکی ئەخلاقێکی جوان و بەڕێزانەیە و بەرنامەیەکی بەهێزو دامەزراوە، دەگونجێت هەموو مسوڵمانێك بەشێوازێکی ڕێك و تەندروستانە بیگرێتەبەر و دەستی پێوە بگرێت.

خاوەنی (لسان العرب) دەڵێت: (ووشەی (العفة) واتە: دەست هەڵگرتن لە شتێك کە حەلاڵ نییە، (عف عن المحارم و الأطماع الدنية) واتە: دەستی لە حەرامەکان و تەماعە نزم و بێ نرخەکان گرتەوە.

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿وَلْيَسْتَعْفِفِ الَّذِينَ لَا يَجِدُونَ نِكَاحًا حَتَّىٰ يُغْنِيَهُمُ اللَّهُ﴾(النور: ٣٣).

واتە: (دەبا ئەوانەی هاوسەریان دەست ناکەوێت، هەوڵ بدەن داوێنی خۆیان پاك ڕاگرن، هەتا خوا لە فەزڵی خۆی دەوڵەمەند و بێ نیازیان دەکات).

پێغەمبەر (ﷺ) لە دوعایەکدا دەفەرموێت: (اللهم إني أسألك الهدى و التقى و العفاف و الغنى).[١٥٢] واتە: (خوایە من داوای هیدایەت و تەقوا و پاك داوێنی و دەوڵەمەندیت لێ دەکەم). پێغەمبەر (ﷺ) لە فەرمودەیەکی تردا کە ئەمە ماناکەیەتی دەفەرموێت: (حەوت کەس هەن خوای گەورە دەیانخاتە ژێر سێبەری ڕەحمەتی خۆی لە ڕۆژێکدا کەهیچ سێبەرێك نییە بێجگە لەو سێبەرە: پێشەوایەکی دادپەروەر، گەنجێك لە پەرستشی خوادا گەورە بووبێت، پیاوێك دڵی بەسترابێت بە مزگەوتەوە، دوو پیاو لەبەر خوا یەکتریان خۆش بوێت، لەبر خوا پێکەوە بن و کۆببنەوە، ئەگەر جیابونەوە لەبەر خوا جیاببنەوە، و پیاوێك ئافرتێکی خاوەن پلە و پایە و جوان داواکاری داوێن پیسی لێ بکات، ئەو بڵێت: بێگومان لە خوا دەترسم، و پیاوێك خەیرێك بکات و بیشارێتەوە تا دەستی چەپی نەزانێت دەستی ڕاستی چی بەخشیوە، و پیاوێك تەنها لەبەر خاتری خوا یادی خوابکات و فرمێسك بەچاوەکانیدا بێتە خوارەوە).[١٥٣]

---

[١٥٢] –رواه مسلم في صحيحه عن عبدالله بن مسعود في كتاب الأدعية.

[١٥٣] –رواه البخاري في صحيحه عن ابي هريرة، كتاب الأذان. و رواه مسلم في صحيحه عن ابي هريرة كتاب الزكاة.

بە بۆنەی ئەو هەڵوێستە گەورە و بەرزەی یوسفەوە(علیه السلام)پێمان جوانە کە چەند هەڵوێستێکی تر پێشکەشی خوێنەرانی بەڕێز بکەین، لەداوێن پاکی و پاکی نەفس و دەروون، کە بەم هەڵوێستە دەست پێدەکەین:

لە (عبدالله کوڕی عمر) ەوە (خوا لێی ڕازی بێت)، ئەویش لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: (لە کاتێکدا سێ کەس کۆچ بەر بوون بەڕێگایەکدا دەڕۆیشتن، باران لێی داکردن و ناچاری کردن بەوەی کە پەنا بەرنە بەر ئەشکەوتێك لە شاخێکدا، کەچی بەردێك لە شاخەکەوە بەردەبێتەوە و دەمی ئەشکەوتەکەیان لێ دەگرێت، لەناو خۆیاندا بەیەکتری دەڵێن: تێفکرن بزانن، کارێکی چاکتان لەبەر خوا ئەنجام داوە لەمەوبەر، بانگی خوای گەورەی پێ بکەن، سا بەڵکو خوا دەرومان لێ بکاتەوە، یەکێکیان وتی: (خوایە خۆت ئەزانیت) کە باوك و دایکێکی پیرو بەساڵاچووم هەبوو لەگەڵ ژنەکەمدا، هەروەك چەند منداڵێکی بچوکم هەبوو، شوانیم بۆ ئەکردن، کاتێك ئێواران ئەهاتمەوە بۆلایان کە شیرەکەم ئەدۆشی، پێش ئەوەی کە بیدەم بە منداڵەکانم بەوانم نۆش ئەکرد، ڕۆژێکیان ئێوارە درەنگ هاتمەوە، ئەویش بەهۆی دوور کەوتنەوەم بۆ گەلاوەراندن بۆ ئاژەڵەکانم، نەگەڕامەوە تا درەنگ کەوتم، کاتێك گەڕامەوە دەبینم هەردووکیان نوستوون، منیش ئاژەڵەکانم دەدۆشی، هەروەك لەوەو پێش دەم دۆشی، بەکاسە شیرەکەوە بەسەر سەریانەوە ڕاوەستام، حەزم نەئەکرد لەخەو خەبەریان بکەمەوە، حەزیشم نەئەکرد پێش ئەوان بیدەم بە منداڵەکان، لەگەڵ ئەوەیشدا منداڵەکان هەر زاق و زوقیان بوو لەبرسا لەبەرپێما، ئەمە حاڵی من و مناڵەکانم بوو تا کات گەیشتە بەیانی، جا ئەگەر من ئەمەم لەبەرخاتری ڕەزامەندی تۆ ئەنجامداوە، دەرومان لێ بکەرەوە بەڕادەیەك ئاسمانی لێوە دیاربێت، خوا کەلێنێکی بۆ کردنەوە، ئاسمانیان لێوە بینی، یەکێکی تریان وتی:خوایە، خۆت ئەزانیت کەمن کچێکی ئامۆزام هەبوو، زۆرم خۆش ئەویست، زیاد لەهەموو کەسێك کە ئافرەتی خۆش بووێت، داوام لێکرد کە بێ شەرعیم لەگەڵدا بکات، بەڵام ڕازی نەبوو هەتا (سەد) دیناری نەدەمێ، منیش ماندووبوم هەتا (سەد) دینارم کۆکردەوە و بۆم هێنا و، کەوتمە نێوام هەردوو قاچی یەوە (واتە: ویستم کارەکە ئەنجام بدەم) وتی:

ئەی بەندەی خوا لەخوا بترسەو مۆری کچێنیم مەشکێنە بەحەقی خۆی نەبێت، منیش وازم لێ هێنا، جا ئەگەر من ئەمەم لەبەر خاتری تۆ ئەنجام داوە، کەلێنێکی ترمان بۆ بکەرەوە (ئیتر بەردەکە جولا) و کەلێنێکی تریان بۆ کرایەوە، ئەوی تریان وتی: خوایە خۆت ئاگاداریت کەمن کرێکارێکم گرتبوو بە حەوت (مەن)، کاتێك ئیشەکەی تەواوکرد، وتی:حەقەکەمم بدەرێ، منیش حەوت مەنەکەم داپێی و ڕازی نەبوو، منیش بەردەوام هەر بۆم تۆو دەکرد تا چەند سەرگا و شوانێکم بۆ لێگرت بۆیان، لەدواییدا هاتەوە بۆلام و وتی: لە خوا بترسە حەقم مەخۆ، وتم: بڕۆ هەموو ئەو گاگەلانە بە شوانەکانیشەوە هی تۆن، وتی: لە خوا بترسە و گاڵتەم پێ مەکە، وتم: من گاڵتەت پێ ناکەم، بڕۆ ئەو گاگەلانە بەرە بۆ خۆت بە شوانەکانیشەوە، ئیتر بردی و ڕۆیشت، جا خوایە ئەگەر من ئەمەم لەبەر خاتری ڕەزامەندی تۆ کردووە، ئەو دەروەی کەماوە بۆمان بکەرەوە، ئیتر ئەو دەروەشی لێکردنەوە).[154]

نموونەیەکی تر: (إبن الجوزي) لە کتێبی (ذم الهوی) دا دەڵێت: (ابو محمد ی کوڕی عبدالله ی کوڕی علی المقرئ) وتی: (ابو سعید ابي عمامة) وتی: پیاوێك ئافرەتێکی خۆش دەویست، و ئافرەتەکەیش ئەوی خۆش دەویست، ئینجا بەیکەوە کۆبوونەوە، ئافرەتەکە ویستی لەخشتەی بەرێت، ئینجا پیاوەکە وتی: بێگومان ئەجەلی من بەدەست خۆم نییە و ئەجەلی تۆش بەدەست خۆت نییە، ڕەنگیشە ئەجەلمان نزیك بێت و بە سەرپێچی و تاوانەوە بگەڕێینەوە بۆلای خوا، ئافرەتەکە وتی: ڕاست دەکەیت، ئینجا هەردووکیان تەوبەیان کرد و حاڵیان باش بوو.[155]

هەر خۆی لە گێڕانەوەیەکی تردا کە لە (شێخ) ەوە گێڕاویەتی یەوە، ئەویش لە (بني عبدالقیس)وتی: بیستومە دەڵێن: پیاوێك مەبەستی لە ئافرەتێك بوو کە خراپەی لەگەڵدا بکات، ئافرەتەکە پێی وت: بێگومان تۆ گوێت لە فەرمودە بوە و قورئانت خوێندوە و تۆ زاناتریت، پیاوەکە پێی وت: هەموو دەرگاکانی ماڵەکە دابخە، ئینجا هەموو دەرگاکانی داخست، ئینجا پیاوەکە لێی نزیك بوویەوە، ئافرەتەکە وتی: دەرگایەك ماوەتەوە دام

[154]–رواه البخاري في البيوع ومسلم في الدعاء.

[155]–ذم الهوی ص ٢٦٨.

نەخستووە، پیاوەکە وتی چ دەرگایەکت وت؟ وتی:ئەو دەرگایەی لەنێوان تۆو خوادایە.[156]

جارێك پیاوێك لەگەڵ ئافرەتێکی جواندا بە تەنها دەمێنێتەوە پیاوە مەیلی ڕادەکێشێت و دەیەوێت لەخشتەی بەرێت، ئافرەتەکە پێی دەڵێت ئایا شەرم ناکەیت لە کەسێك بمان بینێت؟ پیاوەکە وتی: خۆ کەسمان لەگەڵدا نییە و کەسیش نامان بینێت تەنها ئەستێرەکان نەبێت!! ئافرەتەکە پێی وت: ئەی بەدیهێنەری ئەستێرەکان لەکوێ یە؟.
واتە: خوای گەورە کە دەیان سوڕێنێت.

## ناپەسەندی هەوا و ئارەزوو

هەواو ئارەزوو زاڵ بوون بەسەر ژنەکەی عزیزدا و بوو بە ئەسیری هەواو ئارەزووەکانی و لەززەت وەرگرتن لێیان، خۆشەویستی دەسەڵاتی گرت بەسەر دڵ و دەروونیدا، تا پەردەی دڵیشی گرتەوە و، عەقڵیشی داگیرکرد، بەڵام یوسف (علیه السلام) ئەو پێغەمبەرێکی پارێزراوو بوو، کە خاوەنی عەقڵێکی ڕووناك بوو بەڕوناکی پێغەمبەرایەتی، و هیچ هەواو ئارەزوویەك دسەڵاتی بەسەریدا نەبوو، بێگومان خوای گەورە لەکتێبە پیرۆزەکەیدا ئاگاداری کردووین لە سەرئەنجامی شوێن کەوتنی هەواو ئارەزووەکان، و ئەو کەسانەی ئاگادارکردووە و ترساندووە کە هەواو ئارەزوو جڵەوی دڵیانی گرتووە.

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿أَفَرَأَيْتَ مَنِ اتَّخَذَ إِلَٰهَهُ هَوَاهُ وَأَضَلَّهُ اللَّهُ عَلَىٰ عِلْمٍ وَخَتَمَ عَلَىٰ سَمْعِهِ وَقَلْبِهِ وَجَعَلَ عَلَىٰ بَصَرِهِ غِشَاوَةً فَمَن يَهْدِيهِ مِن بَعْدِ اللَّهِ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ﴾(الجاثية:٢٣).

واتە: (هەواڵم بدەرێ ئایا ئەو کەسەی کە ویست و ئارەزووی خۆی کردووەتە خوای خۆی؟! بەهۆی ئەوەوە خوایش گومڕای کردووە، کە زانیویەتی شایانی ئەوەیە، لە ئەنجامی بەد هەڵوێستی خۆیدا و مۆری ناوە بە دەزگای بیستن و دڵ و دەروونیدا، و

---

[156] -(ذم الهوى ص /٢٧٤).

پەردەشی هێناوە بەسەر چاو و دەزگای بینینیدا، جا ئیتر کێ هەیە جگە لەخوا هیدایەت و ڕێنموویی بکات، ئایا بیرناکەنەوە و ئامۆژگاری وەرناگرن؟

(إبن الجوزي) لە کتێبی (ذم الهوی)دا، دەڵێت: (بێگومان خوای گەورە پێچەوانەی (الهوی) ئارەزووی، پەسەند کردووە، فەرموویەتی: ﴿وَأَمَّا مَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِ وَنَهَى النَّفْسَ عَنِ الْهَوَى (٤٠) فَإِنَّ الْجَنَّةَ هِيَ الْمَأْوَى﴾(النازعات:٤٠ _ ٤١).

واتە: (بەڵام ئەوەی لە پایەو و شکۆی پەروەردگاری ترسابێت و حسابی بۆ کردبێت و جڵەوی نەفسی گرتبێتەوە لە هەموو هەواو هەوەس و ئارەزوویەکی نا دروست...، بێگومان هەر بەهەشت جێگەی مانەوەو حەوانەوەیەتی).

زانایانی تەفسیر وتویانە: ئەوە قەدەغەکردنی نەفسە لەو شتانەی خوای گەورە حەرامی کردون. (مقاتل) دەڵێت: ئەوە پیاوێکە مەبەستی ئەنجامدانی سەرپێچی یە، پاشان بیر لە شوێنەکەی دەکاتەوە لە لێپرسینەوەدا و وازی لێ دێنێت).[157]

هەروەها (إبن الجوزي) دەفەرموێت: (إبن عباس) (خوا لێی ڕازی بێت) وتوویەتی: خوای گەورە لەهەر شوێنێکی کتێبەکەیدا باسی (هوی) ئارەزووی کردبێت، بە ناپەسەندی داناوە، (الشعبي) دەڵێت: بێگومان ناوی ناوە (الهوی) چونکە خاوەنەکەی نزم دەکاتەوە و دەیخاتە شوێنی نزمەوە).[158]

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (سێ شت هەن ڕزگارکەرن و سێ شتیش هەن لەناوبەرن، ڕزگارکەرەکان بریتین لە: تەقوای خوای گەورە لە شوێنی نهێنی و ئاشکرادا، و قسەیەك بەحەق بکرێت لە ڕەزامەندیدا بێت و لە توڕە بونیشدابێت، و مام ناوەندی بوون لە دەوڵەمەندی و هەژاریدا، لەناوبەرەکانیش بریتین لە:شوێن کەوتنی هەواو ئارەزوو، و ڕەزیلی و بەخیلییەك گوێڕایەڵی لەسەرکرابێت، و ئینسانێك سەرسام بێت بە نەفسی خۆی).[159]

---

[157]-ذم الهوی لإبن جوزي ص /١٦.

[158]-هەمان سەرچاوەی پێشوو ل (١٢/١٢).

[159]-(اخرجه البزار في مسنده عن انس بن مالك) رواه الألباني في سلسلة الأحاديث الصحيحة برقم(١٠٨٢).

## جۆری نەفسەکان

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَمَا أُبَرِّئُ نَفْسِي إِنَّ النَّفْسَ لَأَمَّارَةٌ بِالسُّوءِ إِلَّا مَا رَحِمَ رَبِّي إِنَّ رَبِّي غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾(يوسف:٥٣).

*پێشتر وامان بەنزیك و لە پێشتر دانا کە ئەم ئایەتە لە تەواوکەری قسەکانی ژنەکەی عەزیزی میسر بێت، کە دانی نا بە پاکی و بێتاوانی یوسف (علیه السلام)دا، و دانیشی نا بەوەدا کە ئەم هەوڵی داوە یوسف لەخشتە بەرێت، بێگومان قورئانی پیرۆز دەربارەی نەفسی ئینسان دواوە، و تایبەت مەندی و حاڵەت و خوو شێوازەکانی باس کردووە، جۆرێکی نەفس هەیە پێی دەوترێت: (النفس االلوامة) کە لۆمە و سەرزەنشت و لێپرسینەوەی خاوەنەکەی دەکات.

خوای گەورە لە سوورەتی (القيامة) دا فەرموویەتی: ﴿لَا أُقْسِمُ بِيَوْمِ الْقِيَامَةِ (١) وَلَا أُقْسِمُ بِالنَّفْسِ اللَّوَّامَةِ﴾(القيامة: ١ _ ٢).

واتە: (سوێند دەخۆم بە ڕۆژی قیامەت، سوێند دەخۆم بە وویژدانی زیندوو و نەفسی ڕەخنەگر، کە لۆمەی خۆی دەکات). ئەمە سوێندێك بوو لەلایەن خوای گەورەوە، و ڕێزو پایەدارکردنی تیابوو بۆ ئەو نەفسەی کە لۆمەو سەرزەنشتی خاوەنەکەی دەکات لەسەر کەم و کورتی نواندن لە گوێڕایەڵی فەرمانەکانی خوادا، کاتێك بیەوێت سەرپێچی بکات یان بکەوێتە ناوی لۆمەی دەکات.

ئەم جۆرە نەفسە پلەی دووەمە لە نەفسەکان، باوەڕدار هەمیشە هەوڵ دەدات کە نەفسی خۆی چاك بکات و بە پاك ڕایبگرێت، بە ئەنجامدانی پەرستش و گوێڕایەڵییەکان و لە سەرپێچی یەکان دوور بکەوێتەوە، و هەمیشە موحاسەبەی نەفسی خۆی دەکات.

خوای گەور فەرموویەتی: ﴿وَالسَّمَاءِ وَمَا بَنَاهَا (٥) وَالْأَرْضِ وَمَا طَحَاهَا (٦) وَنَفْسٍ وَمَا سَوَّاهَا﴾(الشمس:٥-٧).

واتە: (سوێند بە دەروون و ئەو زاتەی کە بەڕێك و پێکی بەدیهێناوە، جا توانای خراپەو چاکەو خوا نەناسی و خواناسی تیا دابین کردووە، (سوێند بەهەمەوو ئەوانە) بەڕاستی ئەو کەسە سەرفرازە، کە نەفسی پاك و پوختە کردووە و ئیمان و ترسی خوای تیادا ڕواندوە، بێگومان نائومێد بو ئەو کەسەی نەفسی خۆی ناپوخت کرد و ئالودەی گوناە و تاوان و خراپەی کرد).

هەروەها نەفسی (المطمئنة)یش هەیە، کە نەفسی باوەڕداری پاکەو بە پاکی ڕایگرتووە، ئەو لەخوا ڕازی یە و، خوایش لەو نەفسە ڕازی یە، کە دڵ ئارام و دڵنیایە لە گوێڕایەڵی فەرمانەکانی خوادا و لە پەنایدا ئارامی گرتووە.

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿يَا أَيَّتُهَا النَّفْسُ الْمُطْمَئِنَّةُ (٢٧) ارْجِعِي إِلَى رَبِّكِ رَاضِيَةً مَّرْضِيَّةً (٢٨) فَادْخُلِي فِي عِبَادِي (٢٩) وَادْخُلِي جَنَّتِي﴾(الفجر:٢٧ – ٣٠).

واتە: (شایانی باسە بە ئیمانداری سەرفراز لە سەرەمەرگدا دەوترێت). ئەی خاوەنی دڵ ودەروونی پڕ لە ئارامی (ئەی ئادەمیزادی ژیرو هۆشمەند کە لەتەمەنی کۆتایی دنیادا پەروەردگارت ناسی و بەجوانی دەت پەرست. ....)، بگەڕێرەوە بۆلای پەروەردگارت کەتۆ لەو ڕازیت و ئەویش لە تۆ ڕازی یە، دە بچۆرە ڕیزی بەندە چاکە نازدار و بەڕێزەکانمەوە).

هەروەها نەفسی (الأمارة بالسوء) هەیە، کە ئەو نەفسەیە تاوان و سەرپێچییەکان بۆ خاوەنەکەی جوان دەکات و دەیرازێنێتەوە و بانگی دەکات بۆ ئەنجامدانی و لەسەری دایدەمەزرێنێت، و لە گوێڕایەڵی فەرمانەکانی خوا دوری دەخاتەوە، و قورسی دەکات لەسەری، و تەوبە و پەشیمانی بۆ دوادەخات بۆ کاتی دوور.

خوای گەورە دەربارەی فەرموویەتی: ﴿وَمَا أُبَرِّئُ نَفْسِي إِنَّ النَّفْسَ لَأَمَّارَةٌ بِالسُّوءِ إِلَّا مَا رَحِمَ رَبِّي إِنَّ رَبِّي غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾.

یەکێك لە پیاوچاکان دەڵێت: نەفس بەهێزترینی دوژمنەکانتە کە لە جەستەی خۆیدایە، واتە نەفسی فەرماندەر بە خراپە، کە خاوەنەکەی بانگ دەکات بۆ سەرپێچی و لادان

د- وێڕایەڵی. پێویستە باوەڕدار هەوڵ بدات نەفسی خۆی پاك و خاوێن بكات، و هەوڵ بدات پلەی بەرز بێت و هەمیشە سەرقاڵی بكات بە چاكە و گوێڕایەڵی فەرمانەكانی خواوە، وەك وتراوە: (نەفس ئەگەر سەرقاڵی نەكەیت بە ئەنجامدانی چاكە و گوێڕایەڵی یەوە ئەوا سەرقاڵت دەكات بە ناحەقی و سەرپێچی یەوە).

ئەی خودایە تەقواو پاكی ببەخشیت بە نەفسەكانمان و تۆ باشترین كەسیت كە نەفسەكان پاك بكەیتەوە، و تۆ سەرپەرشتیاریت بۆیان.

## تێڕوانین دەربارەی غیرە

غیرە برتییە لە پەرۆش بوون و لوت بەرزبوون و توڕەبوون و بە چاو مۆڕ كردنەوە سەیركردنی بەرامبەر، وتراوە بریتییە لە: هەڵچوون و توڕەیی لەسەر بەڕێزترین پیرۆزی و ڕێزلێگیراو، ئەمە زۆر تر لە ئافرەتاندا ڕەچاو دەكرێت، وتراوە: پیاوەكە غیرەی كرد لە كەس وكارەكەی خۆی، و ژنەكە غیرەی لە مێردەكەی خۆی كرد.[160]

زانا (الراغب الأصبهاني)دەڵێت: (خوای گەورە ئەم هێزەی بەدیهێناوە –هێزی غیرە– لەمرۆڤدا، وەك هۆكارێك بۆپاراستنی ئاو، وپاراستنی مرۆڤ، لەبەرئەوە وتراوە: هەمووئوممەتێك، غیرە لەپیاوەكانیدا دانراوە وداوێن پاكیش لەئافرەتەكانیدا دانراوە، هەندێك جار ئەمە بەكاردێت بۆ پاراستنی هەموو ئەو شتانەی كە پێویستە بپارێزرێت لەبواری سێ سیاسەتدا: سیاسەتی پیاو لەگەڵ نەفسی خۆی وسیاسەتی لەگەڵ ئەهل وماڵ و كەس و كاری وسیاسەتی شارەكەی وئەو شوێن وناوچەی تیایەتی، هەروەها وتراوە: غیرە تەنها هی پیاو نیە بەرامبەر ژنەكەی، بەڵكو لە هەموو شتێكدایە كە پەیوەند و تایبەتە بەپیاوەكەوە....).[161] غیرەی پیاو لەسەر ئەهلەكەی كارێكە پێویستە هەبێت، هەروەها غیرە سنور و(ضوابط)ی هەیە، كە غیرەیەكی هاوسەنگ بێت، غیرەیەك

---

[160]-لسان العرب ٥/ ٣٣٢٦ مادة غ – ي – ر.

[161]-الذريعة إلى مكارم الشريعة، ص\٢٤٧.

بێت کە خاوەنەکەی نەخاتە ناو گومان و شك و تاریکی و وەهمەوە، چونکە (اصل) لەمامەڵەدا، بریتی یە لەگومانی باش و متمانە بە کەسانی تر، ئەگەر پێچەوانەی ئەوە دەرنەکەوت، ئایا کەم بوون ئەو ماڵانەی کە ڕووخان و وێران بوون، و ئایا ئەو ئەسیرانە کەم بوون کە تێکشکان و لێکجیابونەوە بەهۆی وەهم و گومانەوە، کەهیچ بنەماو ڕستی وتەندروستیەکی نەبووە.

خوای گەورە لە گومانی خراپ ئاگادارمان دەکاتەوە و دەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اجْتَنِبُوا كَثِيرًا مِّنَ الظَّنِّ إِنَّ بَعْضَ الظَّنِّ إِثْمٌ وَلَا تَجَسَّسُوا وَلَا يَغْتَب بَّعْضُكُم بَعْضًا أَيُحِبُّ أَحَدُكُمْ أَن يَأْكُلَ لَحْمَ أَخِيهِ مَيْتًا فَكَرِهْتُمُوهُ وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ تَوَّابٌ رَّحِيمٌ﴾(الحجرات\١٢).

واتە: (ئەی ئەوکەسانەی باوەڕتان هێناوە، خۆتان زۆر بپارێزن لەگومانی خراپ، لە ڕاستیدا هەندێك لەو گومانانە گوناه و تاوانن، (بۆیە حەق وایە لەهەموو گومانێك خۆمان بپارێزین) بە شوێن کەم و کوڕی وعەیب وعاری یەکتردا مەگەڕێن و سیخوری مەکەن...).

ڕاستی ودروستی لە ژیانی هاوسەرێتیدا، ئەوەیە کە لەسەر بنەمای بەهێز لە خۆشەویستی وڕێزو بەزەیی و ڕەحمەت ودڵسۆزی و نیەتی ڕاست و ساغ و متمانە گۆڕینەوە لە نێوان هەردوو لادا بێت، ئەگەر جیاوازیەك لەنێوانیاندا دەرنەکەوت. کاتێك وورد دەبینەوە لە هەڵوێستی عەزیز بەرامبەر ژنەکەی، کە ویستی یوسف (علیه السلام) لەخشتە بەرێت، یوسف (علیه السلام) داوای پاکی وپاك هەڵبژاردنی کرد، لەگەڵ ئەوەشدا سزای نەداو کارەکەی یەکلایی نەکردەوە و کارەکەی وەك خۆی چۆن بوو جێ هێشت، سەرەڕای بڵاوبونەوەی هەواڵەکە بەناو شاردا و بەناو ئافرەتەکاندا و کۆبونەوەیان لەماڵی عەزیز دا و بەدەمەوەچوونیان بەدەم بانگهێشتەکەی ژنەکەی عەزیزەوە، و بینینی یوسف وسەرسام بونیان پێی، ونەوەش لە دەرکەوتنی خوێنی برینەدا لەسەر دەستیان دەرکەوت و ئەوانیش لەگەڵ هەوا و ئارەزوەکانی ژنەکەی عەزیزدا یەك کەوتن، ئەوان کاتێك لۆمەو سەرزەنشتی ئەویان کرد، ئێستا چوونە ڕیزی

ئەو و ڕازی بوون و دەیانویست یوسف بانگ بکەن بۆ لای خۆیان، و ژنەکەی عەزیز هەڕەشەی لە یوسف کرد بە زیندانی کردنی یان بە بچوك تەماشاکردنی و نزم کردنەوەی پلە و پایەی، ئەگەر وەڵامی بانگەوازەکەی نەداتەوە و حەزەکەی جێ بەجێ نەکات. سەرەڕای هەمووئەم ڕووداوانە و ئەم قسە هەڕەشاویانە کە لە ماڵی عەزیزدا ڕویاندا، نەمانبینی عەزیز هەڵوێستێکی یەکلایی کەرەوە و بڕیارێکی چارەنوس سازی هەبێت، کە بەڵگە بێت لەسەر بەهێزی وخۆڕاگری و غیرەکردنی عەزیز، بەڵکو ئەوە دەبینین کە یوسف (علیه السلام) بەستەم ودوژمنایەتی بێ بنەما زیندانی دەکرێت. لەگەڵ پاکی و بێ تاوانی و ئەمانەتپارێزی و وەفا و پاکی یوسفدا، ئەگەر غیرە شوێنێکی هەبوایە لە دڵی عەزیزدا و بەناو خوێنیدا بسوڕایە، ئەوا لاواز و بێ دەسەڵات نەدەبو لە بەرامبەر ژنەکەیدا کە خیانەتی لێ کرد، بەڵام ئەوەمان لە یوسفدا بینی، کە هەڵوێستی یەکلایی کەرەوە بوو کەتوانی ناموس وشەرەفی خۆی پێ بپارێزێت و زیادی بکات و پارێزگاری لە کەرامەت و پیاوەتی و لێهاتوویی خۆی بکات. بەڵام هەڵوێستی عەزیز نزم ولاواز و پوکاوە بوو، بەڵگە بوو لەسەر لاوازی غیرەتی و کەمی پیاوەتی و جوامێری، هەروەها بەڵگەیش بوو بۆ خۆشەویستی زۆری بۆ ژنەکەی، و نەیئەتوانی لێی جیاببێتەوە و دەست بەرداری ببێت، و عەزیز لەبەردەم جوانی وشۆخ وشەنگی و نازو کەیفی ژنەکەیدا چۆکی دادابوو، و ڕوخابوو، ئایا کەم بوون ئەو کەسانەی کە هەواو ئارەزوو زاڵ بوو بوو بەسەر پلە وپایە و دەسەڵاتیاندا هەتا لاواز و بچوکی کردنەوە، و خۆیان دابویە دەست ئارەزووەکانیان، ئایا ئەو عەزیز و سەربەرزانە کەم بوون کە ملکەچ و زەلیلی دەست خۆشەویستی بوون، ئایا ئەو کەسە پاشاو دەسەڵاتدارانە کەم بوون کە بوونەوە بە بەندە و ژێردەستە و دیل ودەست بەستراو کران؟).

## فێڵ و نەخشەی ئافرەتان

ووشەی (الكيد) واتە: نەخشە و پلان دانان، یان بە بەتاڵ و ناحەق، یان بەحەق وڕاستی، کە جۆرێکە لە فێڵ، کە دەگونجێت و دەشێت ناپەسەند بێت و دەگونجێت ودەشێت پەسەند و شیاو بێت، لەگەڵ ئەوەشدا کە زۆر جار بۆ خراپە و ناپەسەند بەکاردێت.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَلَمَّا رَأَى قَمِيصَهُ قُدَّ مِن دُبُرٍ قَالَ إِنَّهُ مِن كَيْدِكُنَّ إِنَّ كَيْدَكُنَّ عَظِيمٌ﴾(يوسف\٢٨). لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿وَقَالَ نِسْوَةٌ فِي الْمَدِينَةِ امْرَأَتُ الْعَزِيزِ تُرَاوِدُ فَتَاهَا عَن نَّفْسِهِ قَدْ شَغَفَهَا حُبًّا إِنَّا لَنَرَاهَا فِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ﴾(يوسف\٣١). هەروەها ئایەتی: ﴿قَالَ رَبِّ السِّجْنُ أَحَبُّ إِلَيَّ مِمَّا يَدْعُونَنِي إِلَيْهِ وَإِلَّا تَصْرِفْ عَنِّي كَيْدَهُنَّ أَصْبُ إِلَيْهِنَّ وَأَكُن مِّنَ الْجَاهِلِينَ﴾(يوسف\٣٣)، و ئایەتی: ﴿وَقَالَ الْمَلِكُ ائْتُونِي بِهِ فَلَمَّا جَاءَهُ الرَّسُولُ قَالَ ارْجِعْ إِلَىٰ رَبِّكَ فَاسْأَلْهُ مَا بَالُ النِّسْوَةِ اللَّاتِي قَطَّعْنَ أَيْدِيَهُنَّ إِنَّ رَبِّي بِكَيْدِهِنَّ عَلِيمٌ﴾(يوسف\٥٠) و: ﴿ذَٰلِكَ لِيَعْلَمَ أَنِّي لَمْ أَخُنْهُ بِالْغَيْبِ وَأَنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي كَيْدَ الْخَائِنِينَ﴾(يوسف\٥٢)، هەروەها ئایەتی: ﴿فَبَدَأَ بِأَوْعِيَتِهِمْ قَبْلَ وِعَاءِ أَخِيهِ ثُمَّ اسْتَخْرَجَهَا مِن وِعَاءِ أَخِيهِ كَذَٰلِكَ كِدْنَا لِيُوسُفَ مَا كَانَ لِيَأْخُذَ أَخَاهُ فِي دِينِ الْمَلِكِ إِلَّا أَن يَشَاءَ اللَّهُ نَرْفَعُ دَرَجَاتٍ مَّن نَّشَاءُ وَفَوْقَ كُلِّ ذِي عِلْمٍ عَلِيمٌ﴾ (يوسف\٧٦).

بێگومان یوسف(عليه السلام) توشی زۆرێك لەو نەخشە و فێڵ وپلانانە هات، لەوانە:فێڵی براکانی، کاتێك خستیانە ناو بیرەکەوە، هەروەها فێڵ ونەخشەی ژنەکەی عەزیز کە ویستی مەیلی بەلای خۆیدا ڕابکێشێت ولەو پێناوەیشدا هۆکار و ڕێگای زۆری بەکارهێنا و گرتەبەر، و خۆیشی لای مێردەکەیدا واپیشاندا کە پاك و پاك داوێن و بێ تاوانە و تۆمەتەکەی دا بەسەر یوسفدا لە کاتێکدا کەبێتاوان وپاك داوێن بوو، بێگومان ژنێکی ناپاك وخیانەتکار و لەخشتەبەر بوو، ڕواڵەتی پێچەوانەی ناوەڕۆك

وناخی بوو، چونکە شایەتەکە کاتێك کارەکەی بۆ دەرکەوت و ڕوون بویەوە پێی وت: ﴿إِنَّهُ مِن كَيْدِكُنَّ إِنَّ كَيْدَكُنَّ عَظِيمٌ﴾ هەروەها لەچیرۆکەکەدا باسی نەخشەو فێڵی تر کراوە: نەخشەی ئافرەتەکان و توانج وپلاریان لەژنەکەی عەزیز، کاتێك نهێنیەکەیان بلاّوکردەوە و ئابڕوویان شکاند و هەواڵی کارەکەیان بەناو هەموو شاردا بلاّوکردەوە.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَقَالَ نِسْوَةٌ فِي الْمَدِينَةِ امْرَأَتُ الْعَزِيزِ تُرَاوِدُ فَتَاهَا عَن نَّفْسِهِ قَدْ شَغَفَهَا حُبًّا إِنَّا لَنَرَاهَا فِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ﴾(یوسف\٣٠). قسەی ئافرەتانی شارەکە دەربارەی ژنەکەی عەزیز ئەوە نەبوو کەڕقیان لە فاحیشەو خراپە بێت و ئینکاری ئەو کاری لە خشتەبردنە ناپەسەندە بکەن، سووربن و پێخۆشحاڵبن بەداوێن پاکی و ڕێزو جوانیەکان، بەڵکو هۆکاری پاڵنەری ئەم قسەکردنە بریتی بوو لە قسە وتنیان بە ژنەکەی عەزیز کە خاوەنی پلەو پایە و جوانی وغیرە بوو، لەهەمان کاتدا خراپەکار بوو،بەوە ناویان زڕاند کە هەوڵی داوە لاوەکەی خۆی لە خشتە بەرێت، هەروەك ئافرەتەکان ویستیان لەپشت ئەم کارەوە بگەنە ئەوەی کە یوسف (علیه السلام) ببینن، کە گەنجێکی ڕوخسار جوان و قەشەنگ بوو، ئینجا بەو کارە ئەوەیان دەرخست کە پێچەوانەی ئەوە بوو دەیانشاردەوە، هەروەها قسەکانیان و بلاّو کردنەوەی هەواڵ و دەنگ و باسەکە لەوانەوە جۆرێك بوو لە (کید) نەخشەو فێڵ. هەروەها کاتێك ژنەکەی عەزیز ئافرەتەکانی بانگ هێشت کرد و خواردن ومیوەی بۆدانان، مەبەستی ئەوە نەبوو کەتەنها بۆ دەعوەت و خواردن و ڕێزگرتن بێت و لە خۆشەویستیدا ئەم کارەی بۆ کردبن، بەڵکو یوسفی بانگ کرد بە نەخشەو پلانێك کاتێك چاویان پێ کەوت،هەموو دەستی خۆیانیان بڕی وخوێنی پیا هاتەخوار و هەستیان بە ئازارەکەیشی نەکرد، کە ئەمەیش پلانێك بوو زۆر گەورەو وورد، کە ئەو ژنە دایانابوو بۆ ئافرەتەکان، کە هەموویان کەوتنە داوی خۆشەویستی یوسف و لەو هەڵوێستەی کە پێشتر هەیانبوو هەڵگەڕانەوە وپەشیمان بوونەوە و تووشی سەرسامی هاتن بە بینینی یوسف.

## فەزڵ و گەورەیی ئارامگرتن

لە چیرۆکەکەدا زۆر پەند و ئامۆژگاری هەبوو، لەوانە فەزڵ و گەورەیی ئارامگرتن و سەرەنجامی جوانی لە دنیاو قیامەتدا، بێگومان یوسف (علیه السلام) خۆی بە ئارامگرتن ڕازاندبویەوە و بە هۆیەوە گەیشت بە پاداشت و بەختەوەری لە هەردوو دنیادا، ئارام گرتنیش جۆری زۆرن، لەوانە: ئارامگرتن لەسەر بەلاو ناڕەحەتییەکان و ئارامگرتن بەمانای دامەزراوی نەفس و ڕاهێنانی لەسەر پەرستشەکان، لەگەڵ ئەوەی کە بەڕواڵەت ناڕەحەتیان تیایە، و ئارامگرتن لەسەر دەست هەڵگرتن لەحەرام وقەدەغە کراوەکان و جڵەوگرتنی نەفس لێیان، ئەگەر ئیسراحەت و لەزەت و خۆشیشیان تیا بێت. بێگومان یوسف (علیه السلام) هەموو جۆرەکانی ئارامگرتنی پێکەوە کۆکردەوە و خۆی پێ ڕازاندەوە.

## فیتنە و بەلای ئافرەتان

لە گەورەترینی ئەو فیتنانەی کە تووشی پیاوان دەبن، فیتنە و بەلای ئافرەتانە.

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿ زُيِّنَ لِلنَّاسِ حُبُّ الشَّهَوَاتِ مِنَ النِّسَاءِ وَالْبَنِينَ وَالْقَنَاطِيرِ الْمُقَنْطَرَةِ مِنَ الذَّهَبِ وَالْفِضَّةِ وَالْخَيْلِ الْمُسَوَّمَةِ وَالْأَنْعَامِ وَالْحَرْثِ ذَٰلِكَ مَتَاعُ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَاللَّهُ عِندَهُ حُسْنُ الْمَآبِ ﴾(ال عمران\١٤).

واتە: (ئارەزوی ئافرەت وبونی نەوەی نێرینە و خاوەنێتی ئاڵتون و زێڕ و زیوی زۆر و زەبەندە و ئەسپی چاك و ڕەسەن و(هۆکانی هاتوچۆ)هەروەها ماڵات و زەوی و زاری کشتوکاڵی بۆخەڵکی ڕازێنراوەتەوە، ئەوانە هەمووی نازو نیعمەتی ژیانی دونیان، خوایش (بۆچاکان) شوێنی گەڕانەوەی ڕازاوە و خۆشی لای خۆی ئامادەکردووە (کە بەهەشتە).

(ئوسامەی کوڕی زەید) گێڕاویەتیەوە کە لە پێغەمبەر (ﷺ) گێڕاویانەتەوە، فەرمویەتی: (پاش مەرگی خۆم لەنێو خەڵکدا هیچ فیتنەیەکم جێ نەهێشتووە وەك ئاژاوە و فیتنەی ژنان خراپ و زیانبەخش بێت بۆپیاوان).[١٦٢]

(ابوسعید الخدری) دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (لەڕاستیدا دونیا سەوز و شیرینە خوایش ئێوەی کردوەتە جێنشین تیایدا، تەماشا دەکات داخۆ چی دەکەن، خۆتان لەدونیا بپارێزن وخۆیشتان لەژنان بپارێزن، چونکە لەڕاستیدا، یەکەمین فیتنەی (نەوەی ئیسرائیل) بەهۆی ئافرەتەوە بوو.[١٦٣]

دامەزراویش لەبەرامبەر فیتنەکانی ئافرەتان بەداوێن پاکی وپاکی دەبێت، هەروەها سەرقاڵبوون بە پەرستش و گوێڕایەڵی خواوە، و پابەند بوون پێوەی و پەناگرتن بە خوا لە فیتنە و بەڵای ئافرەتان لەهەموو جۆری فیتنەکاندا، ئەوەی کە دەرکەوتووە و ئەوەیشی کەنادیارە.

## چیرۆکە قورئانییەکان جوانترین چیرۆکن

* ئافرەتان لە زۆرێك لەو چیرۆکانەی کە بەشەر دایان دەڕێژێت دەوری بنەڕەتیان بووە، بێگومان ئەوانە هۆکارێك بوون بۆ دڵخۆشکردنی خوێنەر و وروژاندنی هەست وسۆز و جوڵاندنی غەریزە و ئارەزوە کانیان، ئەگەر تەرکیزی نوسەری چیرۆکەکان نەبێت لەسەر ئافرەت و درێژەدان وهەڵوێستە کردنیان لەکاتی باسکردنی جوانیەکان ودەرخستنی فیتنەکانی ئافرەتاندا، ئەوا چیرۆکەکانیان ڕەواجی نەئەبوو لای ئەوکەسە دڵ تینو عەقڵ بەتاڵ و خاوەن تێڕوانینانەی کەبەردەوام هەوڵی گەڕانیانە بە دوای لەزەت و وروژاندن و تێرکردنی ئارەزوەکانیندا.

---

[١٦٢] -رواە البخاری ومسلم فی صحیحهما.

[١٦٣] -رواە مسلم فی صحیحە عن ابی سعید الخدری.

* زۆرێك لەو چیرۆکانە دەبینین کە مرۆڤ دایان دەڕێژێت، بە بەیەك گەیشتنی گەنجێك و کچێکی هاوتەمەنی خۆی دەست پێ دەکات، یەکتر ناسین لەنێوانیاندا ڕوودەدات پاشان خووگری یەك دەبن پاشان خۆشەویستی وحەز لەیەك کردن، و بە بەیەك گەیشتن و کۆبونەوەیان چیرۆکەکە کۆتایی دێت، پاش هەوڵدانێکی درێژ و ماندووبون لە ڕێگای خۆشەویستیدا.

* لە ڕۆچوون لەناو ئەم وورووژاندن و لەزەت وەرگرتنەدا مانا جوان و مەبەستە چاکەکان لەپشت چیرۆك و گێڕانەوەکانەوە وون دەبن، چونکە هەمیشە نووسەر تەرکیز دەکاتە سەر لەزەت وەرگرتن و وورووژاندنی ئەمە بە نیسبەت زۆرێك لەو کارانەوە کە بەشەر دەیان نوسێت، کە نەخۆشی و دەرد و بەڵاو ناڕەحەتی لەناو کۆمەڵگادا زیاد دەکات، قوڕەکە زیاتر تەڕ دەکاتەوە.

* بەڵام دەربارەی چیرۆکە قورئانییەکان، ئەوانە چیرۆکی ڕاستی و ڕووداوی واقعین، تایبەتمەندی و جیاکەرەوە و نیشانەی ئاشکرای خۆی هەیە و بە ڕوونی دیارن، بێگومان لە نێوان سەرچاوەی ڕەببانی و ئامانجی بەرزو ڕاستی شێواز و دەربریندا کۆبونەتەوە.

* مامۆستا (عبدالکریم الخطب) دەربارەی ئەمە قسەیەکی جوانی هەیە، دەفەرمویت: (...کاتێك ئافرەت دەورێکی ئاشکرای هەبوو لە چیرۆکی یوسف (علیە السلام)دا، هەروەها دەورەکەیشی بەشێوازێك بوو لە چیرۆکەکەدا کە پیاو حەزی بەلایدا دەچوو، و ئەو هۆکارانەی کە بۆ فێڵ بە کاری دەهێنا و ئەو شێوازانەی کە بۆ گومڕاکردن و سەرلێتێکدان بەکاری دەهێنا، پیاو حەزی بەباس و گێڕانەوەیان دەکرد، بێگومان دەورەکەی لە چیرۆکەکەدا تەنها بۆ ئەوە نەهێنرابوو کە بۆشاییەك پڕبکاتەوە، یان لە کەش و هەوای ناخۆش و ناڕەحەتدا شتێك بێت قسەی لەسەر بکرێت یان چالاکی و (نشاط)ی کەسێك نوێ بکاتەوە کە پێی دەکات. .... بەڵکو ڕووداوێکی هاتوو بوو لە ڕوداوەکان لەنێوان ململانێی خەیر و شەڕدا، و قورئان بەڕاستی باسی کردووە و گێڕاویەتی یەوە و لەو پەڕی جوانیدا و بە ناوازەیی هێناویەتی، و جوانی و ڕوونی داوە بەچیرۆکە قورئانییەکان، کە مرۆڤ هەست بەجوانی و خۆشییان دەکات وەك چۆن

خواپەرستێك هەست بە خۆشی دەكات كاتێك لەناو میحرابدا خواپەرستی و نوێژ دەكات و بەكوڵ لەخوا دەپاڕێتەوە، بێگومان جوانییەكان و ڕاستییەكان بەهۆی هەستكردنی ئینسانەوە بەرزدەبنەوە و هەست پێكردنی بۆیان زیاد دەبێت. ..ئافرەت لەچیرۆكە قورئانییەكاندا بۆ مەبەستێك ناهێنرێت بێجگە لە پەندو ئامۆژگاری وەرگرتن، و شوێنێك لە چیرۆكەكەدا وەرناگرێت بێجگە لەوەی كە وانەو دەرسی گرنگی تیا بێت بۆ بانگەواز كردن بۆلای خەیر و دادپەروەری و چاكە، و دووركەوتنەوە لە شەڕ و هەڵهاتن لێی و دووركەوتنەوەیش لە خراپە و دوژمنایەتی.[١٦٤]

---

[١٦٤]-(قصتا آدم و یوسف(علیهما السلام) للأستاذ عبدالكریم الخطیب ص /٤٧ _ ٤٨. بە دەستكارییەوە.

## بەشی شەشەم

## ئافرەت لە چیرۆکی ئەیوب پێغەمبەردا (علیه السلام)

### پێشەکی:

ئەیوب (علیه السلام) یەکێکە لە پێغەمبەرە بەڕێزەکانی خوا، کە نەسەبی دەگەڕێتەوە سەر پێغەمبەر ئیبراهیم (علیه السلام)، لە ناوچەیەك لە ناوچەکانی دیمەشق نیشتەجێ بووە، خوای گەورە لە سوورەتی (الأنعام) دا دەفەرموێت: ﴿وَوَهَبْنَا لَهُ إِسْحَاقَ وَيَعْقُوبَ كُلًّا هَدَيْنَا وَنُوحًا هَدَيْنَا مِن قَبْلُ وَمِن ذُرِّيَّتِهِ دَاوُودَ وَسُلَيْمَانَ وَأَيُّوبَ وَيُوسُفَ وَمُوسَى وَهَارُونَ وَكَذَلِكَ نَجْزِي الْمُحْسِنِينَ﴾(الأنعام:٨٤).

واتە ((لەوە و دوا) ئیسحاق و یەعقوبمان پێ بەخشی، هەریەك لەوانمان ڕێنموویی کرد بوو لە نەوەکانی تری ئیبراهیم داود و سولەیمان و ئەیوب و موسا و هارون (هاتنە دنیاوە و بونە ڕابەرو چاوساغ بۆ خەڵکی) ئا بەو شێوەیە پاداشتی چاکەخوازان دەدەینەوە(نەوەی چاك و پاك وخواناسیان پێ دەبەخشین).

**باسی یەکەم:**

**تـاقیکردنەوەی ئەیوب (علیه السلام)**

**خوای گەورە تاقیکردنەوەیەکی گەورەی لە ماڵ و منداڵ و جەستەیدا تووشی ئەیوب (علیه السلام) کرد، بەڵام ئەو بە شەپۆلێك ئارامگرتنی جوان و سەنگینییەو پێشوازی لێکرد، ئارامی گرت لەسەر نەمانی ماڵ و سامان و لەدەستدانی نەوە و منداڵ و نەخۆشی قورس و ناڕەحەت، کە ماوەیەکی زۆر پێوەی مایەوە.**

**خوای گەورە لە سوورەتی (الأنبیاء)دا فەرمویەتی:** ﴿وَأَيُّوبَ إِذْ نَادَىٰ رَبَّهُ أَنِّي مَسَّنِيَ الضُّرُّ وَأَنتَ أَرْحَمُ الرَّاحِمِينَ (٨٣) فَاسْتَجَبْنَا لَهُ فَكَشَفْنَا مَا بِهِ مِن ضُرٍّ وَآتَيْنَاهُ أَهْلَهُ وَمِثْلَهُم مَّعَهُمْ رَحْمَةً مِّنْ عِندِنَا وَذِكْرَىٰ لِلْعَابِدِينَ﴾(الانبیاء:٨٣-٨٤).

**واتە: (یادی ئەیوبیش بکە، کاتێك هانا و هاواری بۆ پەروەردگاری کرد (دوای ئەوەی ماوەیەکی دوور و درێژ نەخۆش کەوتبوو، جگە لەوە پێشتریش ماڵ و سامان و منداڵەکانی تیاچووبون) وتی: پەروەردگارا بەڕاستی، من ئازارو ناخۆشیم تووش بووە، و تۆیش لە هەموو کەس میهرەبانتر و لە هەمووو کەس دلۆڤانتریت، جا ئێمەیش نزامان گیراکرد و بە هاوارییەوە چوین، و هەموو ناخۆشی و نەخۆشییەکمان لە کۆڵ کردەوە، هەموو ماڵ و منداڵیمان پێ بەخشییەوە و ئەوەندەی تریش لە گەڵیدا (دەکرێت خوای گەورە هەر هەمان ماڵ و منداڵی پێشووی بۆ زیندوو کردبێتەوە، یاخود نەوەی نوێی پێبەخشی بێت)، ئەوە ڕەحمەتێکی تایبەتی بوو لەلایەن ئێمەوە، یاداوەریشە بۆ بەندە خواپەرستەکان (کە ئەگەر نزایان کرد، خوای میهرەبان بە هاناو هاواری ئەوانیشەوە دەچێت).**

**خوای گەورە لە سوورەتی (ص)دا -کە ئەمە ماناکەیەتی- فەرمویەتی: (ئەی پێغەمبەر (ﷺ) سەرگوزەشتەی بەندەی ئێمە _ ئەیوب _ یان بۆباس بکە، کاتێك بانگی لە**

پەروەردگاری کرد و وتی: بێگومان شەیتان تووشی نەخۆشی و ئازاری کردووم (٤١) ئێمەیش دوعاو نزامان گیرا کرد و وتمان: هەستە بەپێی خۆت ڕابکە، ئەوە ئاوێکی ساردە بۆ خۆشتن و خواردنەوە (٤٢). ئەوسا هەموو کەس و کاریمان پێ بەخشی و ئەوەندەی تریش، ئەوە ڕەحمەت و میهرەبانی تایبەتی بوو لەلایەن ئێمەوە، یاداوەریشە بۆ هەموو خاوەن بیرو هۆشەکان (٤٣) (ئەیوب (علیه السلام)، جارێك لە خێزانەکەی دڵی ئێشا، سوێندی خوارد، کە ئەگەر چاك بویەوە چەند دارێکی لێبدات، خوای میهرەبانیش وەك ڕێزێك، بۆ ئەو ئافرەتە وەفادارە فەرمانی پێدا): چەپکێك لاسکی ناسك بگرێت بەدەستەوە (بەقەد ئەو ژمارەیەی کە بڕیاریدابوو، و بیماڵێت بە هاوسەرەکەیدا و فەرمووی): سوێندەکەیشت مەشکێنە ئێمە بینیمان بەڕاستی خۆگرو ئارامگر بوو، بەندەیەکی چاك و ڕێك و پێك بوو، بێگومان ئەو تەوبە کارەو هەمیشە دڵی لای پەروەردگارە (٤٤).

* تاقیکردنەوە و تووشهاتن بە بەڵاو ناڕەحەتی سوننەتێکی خوایی یە بۆ بەندەکانی.

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿وَلَنَبْلُوَنَّكُمْ حَتَّىٰ نَعْلَمَ الْمُجَاهِدِينَ مِنكُمْ وَالصَّابِرِينَ وَنَبْلُوَ أَخْبَارَكُمْ﴾(محمد: ٣١).

واتە: (سوێند بەخوا ئێمە دەتانخەینە بەر تاقیکردنەوە، تا لەجیهانی واقیعدا تێکۆشەر و خۆڕاگرتنتان دەربکەوێت، و ئاشکرابێت بۆمان، بۆ ئەوەش هەواڵی چالاکیی ئێوەمان بێتە دەست).

* تاقیکردنەوە و ناڕەحەتی توش هاتنی پێغەمبەران (علیهم السلام) بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی پلەو پایەیان بووە، تا ببنە پێشەنگی ئەو کەسانەی تووشی تاقیکردنەوە و ناڕەحەتی هاتوون لە ئارامگرتن و ڕازیبون و دڵنیاییدا.

ئیمامی (الترمذي) لە (سنن)ەکەی و ئیمامی (أحمد) لە (مسند)ەکەی و (ابن ماجة) لە (سنن)ەکەیدا لە (سعدی کوڕی أبی وقاص) گێڕاوایانەتەوە، وتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)! چ کەسێك تووشی تاقی کردنەوەی ناڕەحەت دەبێت؟ فەرمووی: ((پێغەمبەران، پاشان ئەو کەسانەی پلەیان لەدوای ئەوانە، وئەوانەی پلەیان لەدوای

ئەوانە. پیاو بەپێی دینەکەی تاقی دەکرێتەوە، ئەگەر دینەکەی بەهێز بێت، ئەوا تاقیکردنەوەی ئەوکەسە قورس دەبێت، ئەگەر لەدینەکەیدا نەرم ونیانی هەبوو، ئەوا بەپێی دینەکەی تاقیدەکرێتەوە، بەردەوام بەڵاو تاقیکردنەوە و ناڕەحەتی تووشی بەندە دەبێت تائەو کاتەی لێی جیادەبێتەوە و، وبەسەرزەویدا دەڕوات، هیچ گوناهێکی پێوە نەماوە).[١٦٥]

پێشەوا (الطبرسي) دەڵێت: ئەهلی (التحقیق) وتویانە: ناگونجێت کەنەخۆشیەکەی بەجۆرێك بوبێت، کەخەڵکی بە بێزراوی دانێن، چونکە لەو حاڵەتەدا هەڵدێن و لێی دوورە پەرێز دەبن، بەڵام نەخۆشی و هەژاری و لەدەستدانی ئەهل و کەسو کار، ئەگونجێت تاقیکردنەوە بن بۆ ئەو).[١٦٦]

* زانا (الشنقیطي) لە (أضواء البیان)دا دەڵێت: (ئەو ئازار و ناڕەحەتی ونەخۆشیەی کە توشی أیوب (علیە السلام) هات و، لە خوای گەورە پاڕایەوە کە لەسەری لابەرێت (شیفای بدات)، ئەوە تاقیکردنەوەیەك بوو لەجەستەیدا توشی هات ومالّ و منداڵ وکەس و کار و ماڵ وسامانی لەدەست چوو، کاتێك خوای گەورە ویستی ئازارو نەخۆشی وناڕەحەتیەکەی لەسەر لابەرێت، فەرمانی پێ کرد کە بەقاچی خۆی ڕابکات، ئەویش ڕایکرد، ئینجا خوای گەورە سەرچاوەیەکی ئاوی بۆ هەڵقوڵاند کەخۆی لێ شۆرد هەرچی نەخۆشی وناتەواوی بەڕووکاری جەستەیەوە بوو لاچوو، و لەئاوەکەی خواردەوە، و هەرچی نەخۆشی ناوسکیشی هەیە، بەو هۆیەوە پاك بویەوە و نەما).[١٦٧]

---

[١٦٥]-رواه الترمذي في السنن ك\ الزهد والأمام احمد في المسند وابن ماجة في السنن ك\ الفتن.

[١٦٦]-مجمع البیان ٧\٩٤.

[١٦٧]-اضواء البیان ٤\٦٩٧ ط السعودیة سنة ١٤٠٣.

**باسی دووەم:**

**ئەیوب (علیه السلام) داوای چاکبونەوە دەکات**

ئەیوب (علیه السلام) بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ بە نەخۆشی و ناڕەحەتییەکەوە مایەوە، پاشان رووی کردە خوا و پاڕایەوە، وەك لەئایەتەکەدا هاتبوو فەرمووی: ﴿وَأَيُّوبَ إِذْ نَادَىٰ رَبَّهُ أَنِّي مَسَّنِيَ الضُّرُّ وَأَنتَ أَرْحَمُ الرَّاحِمِينَ﴾(الانبیاء\٣٨).

* خاوەنی تەفسیری (في ظلال) دەڵێت: (ئەیوب لێرەدا زیاد لەپێویست باسی ماڵی خۆی ناکات لەدوعاکەیدا، دەڵێت: ﴿أَنِّي مَسَّنِيَ الضُّرُّ﴾ و لەباسی پەروەدگاریدا دەفەرموێت: ﴿وَأَنتَ أَرْحَمُ الرَّاحِمِينَ﴾ پاشان دوعا ناکات کە حاڵی بگۆڕدرێت، بەڵکو لەسەر ناڕەحەتییەکەی ئارامگر دەبێت هیچ شتێك پێشنیار ناکات لای پەروردگاری، بەڵکو ئەدەبی جوان دەنوێنێت وشەرم لەپەروەردگاری دەکات، ئەمە نمونەیەکە لەبەندەی خۆڕاگر و ئارامگر، بەهۆی بەلاو ناڕەحەتیەکەوە دڵی تەنگ و ناڕەحەت نابێت، بەهۆی ئازارەکەوە تووشی تلانەوەو ئەم دیو و ئەو دیو نەهات، کە خەڵکی لە هەموو سەردەمێکدا نمونەی پێ دەهێننەوە، بەڵکو ناڕەحەت دەبێت ئەگەر داوا بکات لەسەری لابچێت، هەمووی دەداتە دەست خوای گەورە، دڵنیایە کە خوای گەورە ئاگادرە بە حاڵی و پێویست ناکات ئەم داوای هیچی لێ بکات).[١٦٨]

لە سوورەتی (ص)دا خوای گەورە دەربارەی دوعاکەی ئەیوب (علیه السلام) دەفەرموێت: ﴿وَاذْكُرْ عَبْدَنَا أَيُّوبَ إِذْ نَادَىٰ رَبَّهُ أَنِّي مَسَّنِيَ الشَّيْطَانُ بِنُصْبٍ وَعَذَابٍ﴾ (ص\٤١).

ووشەی (النصب) بریتی بوو لەو ئازار و ناڕەحەتیەی کە لە جەستەیدا بوو، تووشی ماندووبون و ناڕەحەتی هاتبوو بە هۆیەوە، (والعذاب)ئەو ناڕەحەتیە بوو کە لە فەوتانی ماڵ و سامان و منداڵدا توشی هاتبوو دەگونجێت ئەوەش بگرێتەوە کە لە جەستەیدا

---

[١٦٨]-الظلال ٤\٢٣٩٢.

ب ە لەئازار و نەخۆشی و ناڕەحەتی وماندوویی،(الضُّر)گشتگیر ترە بۆ هەموو ئەو ستانەی کە ئەوی پێ تاقیکرابویەوە.

ئەیوب (علیه السلام) ئەدەبێکی جوانی نواند لەگەڵ خوادا کە وتی من بەهۆی شەیتانەوە تووشی ناڕەحەتی و ئازار هاتووم.

(القاضي ابن العربي) دەڵێت: (...کارەکان هەموویان بە خەیر و شەڕیانەوە، خوای گەورە دروستی کردوون...بەڵام نابێت شەڕەکە نیسبەت بدرێتە پاڵ خوای گەورە، لە کاتێکدا ئەوە مەوجودە کە خۆی دروستی کردووە، ئەمەیش وەکو ئەدەبێکی جوان لەگەڵ خوادا، پێغەمبەر(ﷺ) لەدوعایەکیدا فەرموی: (....هەموو خەیرو چاکەیەك لەدەستی خۆتدایەو بەدەستی خۆتەو، بەڵام شەڕو خراپە لەتۆوە نیە....).[١٦٩]

زانا (الزمخشري) دەڵێت: (...وتراوە: ئەیوب مەبەستی ئەوە بوو کە لە نەخۆشیەکەیدا شەیتان وەسوەسەی بۆ دروستکرد لە گەورەیی ئەو بەڵا و ناڕەحەتیەی کە بۆ سەری دابەزیوە و دەیویست سەری لێ تێکبدات کەلای ناڕەحەت وناخۆش بێت، ئینجا پەنای بۆ خوای گەورە برد کە ئەوەندەی بەسە خوای گەورە بەڵا و ناڕەحەتیەکەی لەسەر لابەرێت یان یارمەتی بدات لەسەر لاچونی بەهۆی ئارامگری جوانیەوە).[١٧٠]

---

[١٦٩] - جزء من الحديث الذي رواه مسلم في صحيحه عن علي ابن طالب.

[١٧٠] -الكشاف ٩٧\٤ بەدەستکاریەوە.

**باسی سێیەم:**

**وەڵامدانەوەی خوای گەورە بۆ ئەیوب (علیه السلام) و لابردنی ئازار و ناڕەحەتییەکە لەسەری:**

خوای گەورە لە سوورەتی (الأنبیاء)دا فەرموی ﴿فَاسْتَجَبْنَا لَهُ فَكَشَفْنَا مَا بِهِ مِن ضُرٍّ وَآتَيْنَاهُ أَهْلَهُ وَمِثْلَهُم مَّعَهُمْ رَحْمَةً مِّنْ عِندِنَا وَذِكْرَىٰ لِلْعَابِدِينَ﴾(الأنبیاء\٨٤). (**پێشتر ماناکرا**).

لە سوورەتی (ص)دا خوای گەورە فەرموی: ﴿ارْكُضْ بِرِجْلِكَ هَٰذَا مُغْتَسَلٌ بَارِدٌ وَشَرَابٌ﴾ خوای گەورە فەرمانی کرد بە ئەیوب(علیه السلام) کەبەقاچەکانی بکێشێت بەزەویدا تا سەرچاوەیەکی ئاوی لێ هەڵقوڵێت وخۆی لێ بشوات و ئینجا لێشی بخواتەوە. کاتێك خۆی لێ شۆرد، نەخۆشی سەر ڕووی جەستەی لاچوو، و کاتێك لێی خواردەوە نەخۆشی ناوسکیشی لاچوو.

پاش ئەوەی خوای گەورە لە نەخۆشیەکەی شیفای بۆ نارد، ئینجا کەس و کارەکەیشی پێ بەخشیەوە و ئەوندەی تریشی پێ بەخشی، کە ئەوەیش ڕەحمەت و بەزەیی و چاکەیەك بوو بۆ ئەیوب (علیه السلام)، و لەمەدا پەند و وانەی گرنگ و ئامۆژگاری بۆ کەسانی ژیر و بیر ڕوناك و خاوەن دڵە بەرچاو ڕوونەکان هەیە. خوای گەورە لە سوورەتی (ص)دا فەرموی: ﴿وَوَهَبْنَا لَهُ أَهْلَهُ وَمِثْلَهُم مَّعَهُمْ رَحْمَةً مِّنَّا وَذِكْرَىٰ لِأُولِي الْأَلْبَابِ﴾.

وەك پێشتر باسمان کرد، ئەیوب (علیه السلام) سوێندێکی خوارد کە ئەگەر لە نەخۆشیەکەی چاك بویەوە سەد دار لەژنەکەی بدات، بۆ ئەوەی سوێندەکەی نەشکێت، خوای گەورە فەرمانی پێ کرد کە سەد توولێ لە گیای نەرم وناسك بگرێت بە دەستی و بیکێشێت بە ژنەکەیدا، بەمە سوێندەکەی جێ بەجێ دەبێت، کەنەرمی نواندن بوو لەگەڵیدا، چونکە هاوسەرێکی چاك و خۆڕاگر و ئارامگر و لەخواترس و بەوەفا بوو، کە هاوەڵی مێردەکەیی کرد لە نەخۆشیەکەیدا و پشتیوان وهاوکارو یارمەتیدەرێکی باش بوو بۆی. خوای گەورە دەربارەی فەرمووی: ﴿وَخُذْ بِيَدِكَ ضِغْثًا فَاضْرِب بِّهِ وَلَا تَحْنَثْ إِنَّا وَجَدْنَاهُ صَابِرًا نِّعْمَ الْعَبْدُ إِنَّهُ أَوَّابٌ﴾. (**ماناکرا**).

## بـسی چوارەم:
## وانە گرنگ و بەسودەکانی چیرۆکەکە:

خوای گەورە لە سوورەتی (ص)دا فەرموی: ﴿وَخُذْ بِيَدِكَ ضِغْثًا فَاضْرِب بِّهِ وَلَا تَحْنَثْ إِنَّا وَجَدْنَاهُ صَابِرًا نِّعْمَ الْعَبْدُ إِنَّهُ أَوَّابٌ﴾ ئەم ئایەتە پیرۆزە ئەوە دەگەیەنێت کە ئەیوب (علیه السلام) سوێندی خوارد لەسەر خێزانەکەی کەسەد داری لێ بدات، ئەگەر خوای گەورە شیفای بۆ نارد و چاك بویەوە، ئینجا خوای گەورە مۆڵەتی پێدا کە چەپکێك گیای نەرم و ناسك بگرێت بە دەستیەوە و پیابکێشێت بە هێواشی تا سوێندەکەی نەخات و بەجێی بگەیەنێت.

هەندێك کەس پرسیار دەکەن ودەڵێن: ئایا ڕێگە دەدرێت مێرد لەژنەکەی خۆی بدات؟ هەروەها حوکمی (حیلة) فڕوفێڵ لە شەریعەتی ئیسلامیدا چیە؟ ئایا ئەو مۆڵەتەی کەدرا بە ئەیوب (علیه السلام)، شەریعەتی ئێمەیش پێویستی بەو جۆرە نموونەیە دەبێت؟

بۆ وەڵامی ئەم پرسیارانە، بە پشتیوانی خوا دەڵێین: بێگومان ئەیوب (علیه السلام) ئەو سوێندەی لەکاتی نەخۆشەکەیدا خوارد کە ئەگەر خوای گەورە شیفای دا، لەژنەکەی بدات، ئەوەیش لەڕۆژێکدا بوو کە ئەیوب(علیه السلام) لێی تووڕە بوو.

زانا (ابو السعود) دەڵێت: (ژنەکەی چوو بۆ جێ بەجێ کردنی کارێك، بەهێواشی دەڕۆیشت و خاوی نواند، ئینجا ئەیوب(علیه السلام) سوێندی خوارد ئەگەر چاك بویەوە، سەد داری لێ بدات، ئینجا خوای گەورە فەرمانی پێ کرد بە بەستنی چەپکێك گیا بەیەکەوە، بەوە لێی بدات وسوێندەکەی نەشکێنێت، بێگومان خوای گەورە ئەم مۆڵەتەی پێ دا، وەك ڕەحمەت و بەزەیی و چاکەیەك بەو لەبەرئەوەی ژنەکەی جوان خزمەتی کردووەو لێی ڕازی بووە).[171]

هەروەها لەشەریعەتی خۆیشماندا ڕێگە دراوە کە مێرد لەژنەکەی خۆی بدات بۆ ئەدەب دادان بێت ئەگەر هات و ژنە یاخی و بەلەسە و لە سنور دەرچوو بوو لە فەرمانی

---

[171]- إرشاد العقل السليم ٤/٤٤٤ بە دەسکاریەوە.

مێردەکەی و ئەوەیش سوودی پێ نەگەیاندبێت کە ئامۆژگاری کردووە و جێگەی لێ جیا کردۆتەوە، لەو کاتەدا دەتوانێت بۆ ئەدەب دادانی پەنا بەرێت بۆ لێدانی نەك بۆ تۆڵە کردنەوە بێت.

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿وَاللاَّتِي تَخَافُونَ نُشُوزَهُنَّ فَعِظُوهُنَّ وَاهْجُرُوهُنَّ فِي الْمَضَاجِعِ وَاضْرِبُوهُنَّ فَإِنْ أَطَعْنَكُمْ فَلاَ تَبْغُواْ عَلَيْهِنَّ سَبِيلاً إِنَّ اللّهَ كَانَ عَلِيّاً كَبِيراً﴾.(النساء:٣٤).

واتە: (ئەو ئافرەتانەی کە ئێوە دەترسن سەرکەشی و سەرپێچی بکەن، سەرەتا ئامۆژگارییان بکەن (ئەگەر سودی نەبوو) لەناو جێدا پشتیان تێبکەن، (ئەگەر ئەوەش سودی نەبوو) لێیان بدەن (بەمەرجێك لێدانەکە لەدەم و چاو نەبێت و ئاسەوار بەجێ نەهێڵێت)، ئەگەر بەم هۆیانە لەلادان و یاخی بوون وازیان هێنا، ئەوە ئیتر ستەمیان لێ مەکەن و ڕێگەی تر مەگرنە بەر (بۆئازار دانیان) بێگومان خوا بەرزو بڵند و گەورەیە، (ئەگەر ستەمیان لێ بکەن تۆڵەتان لێ دەسێنێت).

پێویستە مێرد لەوەدا پەلە نەکات پەنا بەرێت بۆ لێدان، بەڵکو پێویستە ئارام بگرێت لەسەر هاوسەرەکەی و چاو لەکەم و کورییەکانی بپۆشێت و هەوڵی لەگەڵ دووبارەبکاتەوە کە چاك ببێت بە ئامۆژگاری کردن یان پشت تێ کردن لە جێگەی خەودا، ئەگەر ئارامی لەبەر برا و خۆی پێ نەگیرا و وایهاتە پێش چاو کە ڕەنگە لێدان ببێتە هۆکاری چاککردنی وچارەسەری، باپەنا بەرێت بۆ لێدانەکە وەك چارەسەر نەك وەك تۆڵە لێکردنەوە، چونکە هەندێك لەئافرەتان تەنها لێدان سودیان پێ دەگەیەنێت.

بەڵام دەربارەی ئەو لێدانە نابێت کاریگەر بێت، واتە توند بێت، وەك لە فەرمودەیەکی درێژی پێغەمبەردا (ﷺ) هاتووە دەفەرموێت: (... لەخوا بترسن بەرامبەر بە ئافرەتان، چونکە ئەوان سپاردەی خوان لای ئێوە، بە ووشەی خوا حەڵاڵتان کردوون، مافی ئێوە لەسەر ئەوان ئەوەیە کەسێك نەهێننەماڵتان کە پێتان ناخۆش بێت، ئەگەر ئەمەیان کرد، ئەوە بەلێدانێکی سوك تەمێیان بکەن، مافی ئەوانیش لەسەر ئێوە ئەوەیە کە ڕۆزی و پۆشاکیان دادپەروەرانە بۆ دابین بکەن. ..).[١٧٢]

پێویستە مێرد خۆی بپارێزێت لەلێدان لە دەم و چاوی و سکی و ئەو شوێنانەیش کە مەترسی زیان لێکەوتنیان هەیە لە (صحيح) ی (بوخاري) دا هاتووە لە (عائشة) (خوا

---

[١٧٢] - رواه مسلم في صحيحه عن جابر بن عبدللة، كتاب الحج / باب حجة النبي (صلى الله عليه وسلم).

لێی ڕازی بێت) فەرمووی: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (ئایا کەسێك لەئێوە شەرم ناکات کە لە ژنەکەی بدات وەك لێدانی لە بەندە و کۆیلە کە لەسەرەتای ڕۆژدا لێی دەدات و لە کۆتایی ڕۆژدا لەگەڵیدا کۆدەبێتەوە و دەخەوێت!).[173]

لە (معاویە) ی کوڕی (حیدة القشیری)یەوە، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) مافی هەریەك لە ژنەکانی ئێمە چییە لەسەری؟ فەرموی: (خواردنی بداتێ کاتێك خۆی خواردنی خوارد، بەرگی بۆ بکات کاتێك بۆ خۆی بەرگی کرد، و لە دەم وچاو و ڕوخساری نەدات و ناشرینی نەکات، و پشتیشی تێ نەکات تەنها لە ماڵەکەی خۆیدا نەبێت).[174]

دەگونجێت کە لەبەردەم هیچ کەسێکدا لێی نەدات، ئیتر ئەو کەسە لە نزیکانی خۆی بێت یان کەسێکی غەریب بێت، و خۆی بپارێزێت کە لەبەردەم منداڵاندا لێی بدات، چوونکە ئەو لێدانە لە بەرچاوی ئەوان شوێنەواری خراپی دەبێت لەسەر هەست و سۆزیان، و کەسیش نازانێت کە ئەم لە خێزانەکەی دەدات، چونکە دەبێتە هۆی شکاندنی ڕێز و کەرامەتی و دەبێتە هۆی برینداركردنی ئافرەت و زۆر ناڕەحەت بونی، لەگەڵ ئەوەشدا دەبێتە هۆی دەرخستنی نهێنی نێوان هاوسەران و شکاندنی پەیوەندی نێوانیان.

## حوکمی ( الحیلة الشرعیة ) فڕ و فێڵ لە شەریعەتی ئیسلامدا

(الحیلة) فڕ و فێڵ، شتێکە بەنهێنی و شاراوەیی ئەنجام دەدرێت، زۆرترین کاتیش لەشتی خراپ و ناپەسەندا بەکاردێت. خاوەنی (المصباح) دەڵێت: (الحیلة: بریتییە لەبیرتیژی لەدانانی کارێکدا کە پێچەوانە کردنەوە و گۆڕینی فکر و بۆچونی تیایە هەتا ئەو شتە وەردەگرێت کەمەبەستیەتی).[175]

هەموو ڕێگایەکیش شتی (عبث)ی تێ دەکەوێت کە پێچەوانەی شەرعە، لەفەوتاندنی ئەرك و واجبەکان و حەڵاڵ کردنی حەرامەکان و گۆڕینی حەق بە بەتاڵ و بە

---

[173] - رواه البخاري في صحيحه كتاب النكاح.

[174] - رواه ابو داود في السنن كتاب النكاح.

[175] - المصباح المنير مادة ح ول ٧٣\١ بەدەستکارییەوە.

پێچەوانەشەوە هەموو ئەمانە قەدەغەن و خاوەنەکەیشی بەخراپ باس دەکرێت و دەبێت بە بەڵگە بەسەریەوە.[١٧٦]

نمونەیەك لەسەر (الحیلة)ی شەرعی. خوای گەورە لە چیرۆکی ئەیوب (علیه السلام)دا فەرموی: ﴿وَخُذْ بِيَدِكَ ضِغْثًا فَاضْرِب بِّهِ وَلَا تَحْنَثْ إِنَّا وَجَدْنَاهُ صَابِرًا نِّعْمَ الْعَبْدُ إِنَّهُ أَوَّابٌ﴾.

(الجصاص) لە کتێبی (احکام القران) دا دەڵێت: (لەم ئایەتەدا، بەڵگە لەسەر ئەوە هەیە رێگە پێدراوە کە (الحیلة) بەکاربهێنرێت، بۆ گەیشتن بەو شتەی کە ئەنجامدانی رێگەپێدراوە، وناڕەحەتیەکی پێ لابرێت لەسەر نەفسی خۆی وکەسانی تریش، چونکە خوای گەورە فەرمانی کرد بە ئەیوب (علیه السلام) کە لە ژنەکەی خۆی بدات بە چەپکێك گیای بەستراو لەو سوێندەی خواردبوی ڕزگاری بێت و لەسەری نەمێنێت، و بە هۆیەوە توشی زیانی زۆرتر نەبێت).[١٧٧]

ئایا ئەو مۆڵەتەی درا بە ئەیوب (علیه السلام) شەریعەتی ئێمە پێویستی بەو جۆرە نمونەیە هەیە؟

وەڵام: نەخێر، شەریعەتی ئێمە پێویستی بەو جۆرە نمونەیە نیە لە بوارەکانی ئیماندا، ئەگەر سوێند لەسەر خورا و عوزری هەبێت، ئەوە تاوانی نییە، یان لاواز بێت و بەرگەی لێدان نەگرێت، چونکە لەشەریعەتی ئێمەدا (کفارة) بریتی خستن هەیە،

بەڵکو ئەو مۆڵەت پێدانە لەبواری (حدود) سزاکاندا بەڕێو دەچێت، بۆکەسێك کاتێك واجب دەبێت لەسەری سزا بدرێت، بەڵام لاوازە و بەرگەی ئەو لێدانە ناگرێت و ئەو کەسانەیش کە واچاوەڕێ ناکرێت نەخۆشیەکانیان چاك ببێتەوە، وەك ئەوەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کردی لەگەڵ ئەو کەسە لاوازەی کەزینای کردبوو، بەڵام ئەگەر عوزرەکە واچاوەڕێ کرا کە لادەچێت، ئەوا سزاکە دوادەخرێت بۆکاتی لاچونی عوزرەکە.

هەروەها لەوانە گرنگەکانی چیرۆکەکە: ئارامگرتن لەسەر تاقیکردنەوە و ناڕحەتی و داوای کۆمەکی لەخوا کردن لەسەر لابردنی، بێگومان تەنها کەس کە ناڕەحەتی لادەبات،

---

[١٧٦] - الحیل في الشریعة الأسلامیة د.محمد عبدالوهاب بحیري ص ٢٣\.

[١٧٧] - احکام القرآن للجصاص ٣\٣٨٤.

هەر خوای گەورەیە. پشت بەستن بەخواو داوای کۆمەکی لەو ئەوە رەت ناکاتەوە کەهۆکار بگیرێتە بەر. پێویستە ئەو کەسەی کە تووشی ئازار و نارەحەتی هاتووە، کەزۆر دوعاو پاڕانەوە بکات و داوا لەخوای گەورە بکات ئەوشتەی لەسەر لابەرێت کەبۆی دابەزاندووە، ئەگەر نەخۆش بوو پێویستە بە دوای چارەسەر ودەرماندا بڕوات و داوا لەخوای گەورە بکات کەشیفای بۆ بنێرێت و چاکی بکاتەوە.

ئیمامی (مسلم) لە (صحیح)ەکەیدا بە سەنەدێك لە (جابری کوڕی عبدالله) وە، ڕیوایەتی کردووە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (هەموو دەردێك دەرمانی خۆی هەیە، کاتێك دەرمانەکە بەکارهێنرا و بەر دەردەکە کەوت، ئەوا بەفەرمانی خوای گەورە چاك دەبێتەوە).[۱۷۸]

تاقی کردنەوە هۆکارێکە بۆپاك کردنەوەی دڵ و کەفارەتی ئەو گوناهانەی ئەنجامدراون، ئاگادار کردنەوەیە بۆ کەسانێك کە بێئاگا بوون و ترساندنە بۆکەسانێك کەزیادەڕۆیی دەکەن تا دەگەڕێنەوە بۆلای پەروەردگاریان وتەوبە دەکەن، پێویستە کەسێك کەتوشی نەخۆشی زیادو درێژخایەن بووە بزانێت کەنەخۆشیەکەی ئاگادار کەرەوەیەکە بۆی تا تەوبە بکات و بگەڕێتەوە و دەست لەسەرپێچی وتاوان هەڵبگرێت و نەگەڕێتەوە سەریان بە هەتاهەتایی.

تا وەك ئەوکەسەی لێ نەیەت کەشاعیرێك دەربارەی دەڵێت:

تتوب عن الذنوب إذا مَرِضْتَ    وتَرْجَـعُ للذنوبِ إذا شفيتَ
فـكم مـن مَـرَّةٍ نجـاك منهـا    وكم كشفَ البلا لما أبتليت
أما تخشى بأن تأتيَ المنايـا    وأنت على الخطايا قد بقيت

---

[۱۷۸] - رواه مسلم في صحيحه كتاب السلام باب لِكُلِ داءٍ دواء واستحباب التداوي.

# بەشی حەوتەم

## ئافرەت لە چیرۆکی موسادا ( علیه السلام )

### پێشەکی :

قورئان بەدرێژی دەربارەی موسا (علیه السلام) دواوە دەربارەی(ژیان وپەیامەکەی و بانگەوازەکەی) لەناو دەربڕینە قورئانیەکاندا هەڵوێستی گەورە و گرنگی ئافرەتان لەژیانی موسادا (علیه السلام) ڕونکراوەتەوە، کە دەربارەی دایکی موسا (علیه السلام) و (آسیەی کچی مزاحم) ی (ژنی فیرعەون) و خوشکەکە ی موساو دووکچەکەی شاری مەدیەن– کچی پیاوە بەتەمەنەکە –دەدوێت.

• باس و چیرۆکی موسا(علیه السلام) لەزۆرێك لە سوورەتەکاندا هاتووە، لەکۆمەڵێك بەسەرهات و مەبەستی گەورە و گرنگ پێك هاتوون، کە هەموویان لەگەڵ مەبەستەکانی قورئانی پیرۆزدا یەك دەکەون و دەگونجێن بەشێوەیەکی گشتی، لەگەڵ شێوازی هەر سوورەتێکدا ئامانج وشێوەی تایبەتی خۆی وەردەگرێت.

الدکتور (محمد بکر اسماعیل) لە کتێبی (قصص القرآن)دا دەڵێت: (چیرۆکی موسا (علیه السلام) درێژترین چیرۆکە لە قورئاندا، ژمارەیەکی زۆر پەند و ئامۆژگاری تیایە، کە ە چیرۆکەکانی تردا لەوشێوەیە نی یە، بە جۆرێك کە هەر چیرۆکێك لە چیرۆکێکی تر جیاواز دەبێت، بەوەی کە تەرکیز دەکاتە سەر لایەنێك لە لایەنەکانی هیدایەت و ئاراستەکردن، لەگەڵ ئەوەشدا کە هەموویان ڕوو دەکەنەوە یەك مەبەستی سەرەکی، کە دەرخستنی ململانێی نێوان خەیر و شەڕە، و لەسەر بەرنامەیەکی پەورەردەیی تێر و تەواو پێك دێت، هەموو چیرۆکێك یاسا و دەستورێکی تیا دەدانرێت، یان کۆمەڵە یاسایەك، کە خوای گەورە خەسڵەتەکانی ئیمانی لە ژێردا ڕێك دەخات، ئەوەی کە خۆی بیەوێت).[١٧٩]

---

[١٧٩]- قصص القرآن، ا. د محمد بكر إسماعبل ص/١٧٩.

**باسی یەکەم:**
**قورئان دەربارەی دایکی موسا و ژنەکەی فیرعەون و خوشکەکەی موسا (علیه السلام) دەدوێت:**

**• مژدەی خوا بۆ دایکی موسا (علیه السلام)**

**خوای گەورە فەرمویەتی:** ﴿وَأَوْحَيْنَا إِلَى أُمِّ مُوسَى أَنْ أَرْضِعِيهِ فَإِذَا خِفْتِ عَلَيْهِ فَأَلْقِيهِ فِي الْيَمِّ وَلَا تَخَافِي وَلَا تَحْزَنِي إِنَّا رَادُّوهُ إِلَيْكِ وَجَاعِلُوهُ مِنَ الْمُرْسَلِينَ﴾(قصص:٧).

**ئەم ئایەتە پیرۆزە، ئایەتی حەوتەمە لە سوورەتی (القصص) پێش ئەوەی کە دەست بکەین بە تەفسیر و ماناکردنی ئایەتەکە، ئەوەمان بە پێویست زانی کە ئایەتەکانی پێشتر بۆ خوێنەرانی بەڕێز ڕون بکەینەوە کە سوورەتەکە بەو ئایەتانە دەستی پێکردوە و سود و گرنگی گەورەیان تیایە و کۆمەڵێك ڕودا و بەسەرهات دەردەخەن.**

**سوورەتە پیرۆزەکە بە** ﴿طسم﴾ **دەستی پێکردووە.**

**ئەم حەرفانە نهێنییەکن لە نهێنییەکانی قورئانی پیرۆز، کە خوای گەورە خۆی زانایە بە بەکارهێنان و دانانیان.**

**لە ئایەتی دووەمدا، خوای گورە دەفەرموێت:** ﴿تِلْكَ آيَاتُ الْكِتَابِ الْمُبِينِ﴾(القصص:٢). **ئاماژە بۆ ئەوە کراوە کە ئایەتەکانی قورئان پلەیکی بەرز و گەورە و گرنگیان هەیە و قوردرەت و گەورەیی و دەستەڵاتی خوای گەورە بەڕوونی دەردەخەن. خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت:** ﴿إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ﴾(الحجر:٩). **واتە: (بە ڕاستی هەر ئێمە قورئانمان دابەزاندوە، و بێگومان هەر ئێمەش پارێزگاری دەکەین و (نایەڵین دەستی خیانەتکار هیچ جۆرە دەستێکی تێ بخات و هەموو هەوڵێك بۆ دەستکاری کردنی نەزۆکە)).**

زۆر ئایەتی ترمان هەن کە باس لە قورئانی پیرۆز دەکەن لەوانە: (ئایەتەکانی (النساء:٨٢، فصلت:٤٢، النحل:٨٩) کە دەتوانیت لە کتێبەکانی تەفسیردا سودی لێ ببینیت).

خوای گەورە قورئانی بە (المبین) ڕونکەرەوە و بە دیارخەر باسکردوە، کتێبی ڕوونە و هەموو شتێك ڕوون دەکاتەوە و بەدیار دەخات حەق و ناحەق لەیەك جیادەکاتەوە، ئەوەی کە چاکە و خەیرە بۆ خەڵکی ڕونی کردۆتەوە بۆ ژیانی دونیا و بۆ قیامەتیشیان لە عەقیدە و شەریعەت و ئەخلاق و چیرۆك و پەند و وتەی جوان و بەنرخ.

لە ئایەتی سێهەمدا خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿نَتْلُوا عَلَيْكَ مِن نَّبَإِ مُوسَى وَفِرْعَوْنَ بِالْحَقِّ لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ﴾(القصص:٣).

واتە: ئێمە هەندێك لە هەواڵ و بەسەرهاتی گرنگی ڕاست و نەگۆڕی موسا و فیرعەون دەخوێنینەوە بەسەرتدا، بۆ ئەوەی سود بگەیەنین بە گەلێك کە بڕوا دەهێنن (تا ببێتە پەند و ئامۆژگاری).

ئەوەیش هەواڵدانە دەربارەی چیرۆکی موسا لەگەڵ فیرعەوندا: ﴿إِنَّ فِرْعَوْنَ عَلَا فِي الْأَرْضِ وَجَعَلَ أَهْلَهَا شِيَعًا يَسْتَضْعِفُ طَائِفَةً مِّنْهُمْ يُذَبِّحُ أَبْنَاءَهُمْ وَيَسْتَحْيِي نِسَاءَهُمْ إِنَّهُ كَانَ مِنَ الْمُفْسِدِينَ﴾(القصص:٤)

واتە: (بێگومان فیرعەون زاڵ و دڕندە بوو لە وڵاتەکەیدا، خەڵکەکەی پارچە پارچە کرد (جیاوازی خستە نێوانیانەوە)، دەستەیەکیانی دەچەوساندەوە و لاوازی دەکردن، منداڵە نێرینەکانی سەردەبڕین، کچان و ئافرەتانی (بە زەلیلی دەهێشتەوە) بەڕاستی ئەو ستەمکارە یەکێك بوو لەوانەی تۆوی خراپەی دەچاند).

ئەوەی کە هۆکار و پاڵنەر بوو لەسەر فیرعەون کە ئەو کارە پیس و دوور لەمرۆڤایەتییە ئەنجام بدات، (ابن کثیر) دەربارەی دەڵێت:_ (نەوەی ئیسرائیل دیراسە و لێکۆڵینەوەی ئەوەیان لە نێوان خۆیاندا دەکرد، کە لە ئیبراهیم (علیه السلام)ەوە پێیان گەیشتبوو، کە بێگومان کەسێك لە نەوەکانی ئەو پەیدا دەبێت و کوڕ دەبێت، کە پاشا و دەستەڵاتداری میسر لە سەردەستی ئەودا لەناودەچێت، ئەمە بویە مژدەیەك و لەناو نەوەی ئیسرائیلدا دەنگی دایەوە، قبطی یەکان ئەمەیان لەنێوان خۆیاندا باس دەکرد، هەتا دەنگ و باسەکە

لەکەسە نزیکەکانی فیرعەونەوە دەگەیشت بە فیرعەون، ئینجا لەو کاتەدا فیرعەون فەرمانی کرد بە کوشتنی کوڕانی نەوەی ئیسرائیل، نەبادا کە ئەو کوڕە لەناو ئەواندا بێت، بەلاّم ئەم کارو نەخشەیە سود بەفیرعەون ناگەیەنێت)[180].

خوای گەورە فەرموی: ﴿ وَنُرِيدُ أَن نَّمُنَّ عَلَى الَّذِينَ اسْتُضْعِفُوا فِي الْأَرْضِ وَنَجْعَلَهُمْ أَئِمَّةً وَنَجْعَلَهُمُ الْوَارِثِينَ(٥) وَنُمَكِّنَ لَهُمْ فِي الْأَرْضِ وَنُرِيَ فِرْعَوْنَ وَهَامَانَ وَجُنُودَهُمَا مِنْهُم مَّا كَانُوا يَحْذَرُونَ﴾(قصص:٥، ٦).

لەم دوو ئایەتە پیرۆزەدا، سوننەتێك لەسوننەتەکانی خوای گەورە ڕونکراوەتەوە لەدروستکراوەکانیدا کە باوەڕداران دامەزراو و سەقامگیر دەکات، کافران و لەسنور دەرچووان لەناودەبات.

خوای گەورە ویستی نەوەی ئیسرائیل ڕزگاری ببێت لەدەست فیرعەون، کە لە لادان و سنور دەرچوندا گەیشتبویە پلەی کۆتایی، نەوەی ئیسرائیلی چەوساندبویەوە و سەرشۆڕی کردبوون و بە ئاگر و ئاسن مامەڵەی لەگەڵدا دەکردن، و قەدەری خوای گەورەش وابوو کە موسا (علیه السلام) لەناو کۆشك و تەلارەکەی پەروەردە ببێت، ئەو فیرعەونەی کەهەزاران منداڵی بێ تاوانی کوشت وای دەزانی ئەو کەسەیە کەمەبەستی بووە.

خاوەنی (في ظلال) دەڵێت: (ئەم سوورەتە مەککی یە، کاتێك دابەزی موسڵمانان لەمەککەدا کەم و لاواز بوون، هاوەڵدانەران زۆر بوون و خاوەنی هێزو دەسەلاّت و ناوو شۆرەت بوون، ئەم سوورەتە دابەزی کە تەرازوی حەقیقەت بۆ هێزو بەهاکان دابنێت، ودابەزی و دانی بەوەدا نا کە تەنها یەك هێزی حەقیقی لەم بونەرەدا هەیە، کە هێزی خوایە تەنها یەك بەهایش هەیە، کە بەهای ئیمانییە، هەرکەس هێزی خوای گەورەی لەگەڵدابێت ئەوا هیچ ترسێکی نابێت، ئەگەر هیچ هێز و پشتیوانێکیشی نەبێت، و هەرکەس هێزی خوای گورەی لەسەربێت، ئەوە پاراستن و دڵنیایی بۆ ئەو کەسە نییە، ئەگەر هەموو هێزێکیشی لەپشت بێت، و هەرکەس بەهای ئیمانی هەبێت، ئەوە هەموو

[180] - قصص الأنبياء لأبن كثير ص٢٩٣ بەکورتی بە دەسکاریەوە.

خەیرێك بۆ ئەوە، و هەرکەس ئەو بەهایەی لەدەست چووبێت، هیچ شتێك سودی پێناگەیەنێت)[181].

بێگومان فیرعەون لە سنور دەرچوو، و لایدا و بەهێز و بە دەسەلاتەکەی لەخۆی بایی بوو، کەسێکی ستەمکار بوو، و لەخراپترین جۆر سزای تووشی نەوەی ئیسرائیل کرد و پێی چەشتن، و دەی چەوساندنەوە و لێی دەکوشتن. بەلام ویستی خوای گەورە وابوو کە موسا(علیه السلام)لەدایك ببێت لەم جەوە چاوەڕوانکراوەدا.

لەکاتێکدا لەدایك بوو کە ستەم و دوژمنایەتی پەرەی سەندبوو، و مردن بەدواییدا دەگەڕا و هەمیشە لە کەمین و بۆسەدا بوو بۆی، دایکی بەهۆی ئەوەوە ترس و ئازاری منداڵ بوون و جەستەی خۆی لەبیر چویەوە کە بینی کوڕە، و یەکسەر زانی کە لەدەستی ئەوان پارێزراو نابێت و ناتوانێت لەدەستی ئەوان ڕزگاری بکات، هەمیشە دەستیان لەخوێن هەڵکێشرابوو بۆ خوێنی منداڵە بێتاوانەکان، کە کاتێك دەهاتنە دنیا یەکسەر بەرەو مردن ڕەوانە دەکران، ترس و بیم باڵی کێشابوو بەسەر دڵی دایکی موسادا، بەلام لەم کاتەدا بە پەیامێك لە لایەن بەدەسەلاتترین پاشای بەهێزەوە مژدەی پێ دەدرێت کە چاوەکانی پێ دەگەشایەوە و نەفسەکانی پێ ئاسودە دەبوو دڵ و دەرونی پێ دەکرایەوە.

خوای گەورە فەرمووی: ﴿وَأَوْحَيْنَا إِلَىٰ أُمِّ مُوسَىٰ أَنْ أَرْضِعِيهِ فَإِذَا خِفْتِ عَلَيْهِ فَأَلْقِيهِ فِي الْيَمِّ وَلَا تَخَافِي وَلَا تَحْزَنِي إِنَّا رَادُّوهُ إِلَيْكِ وَجَاعِلُوهُ مِنَ الْمُرْسَلِينَ﴾(القصص:٧).

خوای گەورە لەلایەن خۆیەوە ئیلهامی بۆ دایکی موسا (علیه السلام) نارد، یان لە خەودا پێی وت، یان بە فریشتەدا بۆی نارد کەشیری بداتێ، و تا ئەتوانێت بیشارێتەوە، ئەگەر نزیکە بکەوێتە دەست هاوکارەکانی فیرعەون، فڕێی بداتە ناو ڕوباری نیلەوە، ئینجا لێی مەترسە و لەترسا مەبە و خەفەت مەخۆ و دڵ ناڕەحەت مەبە، دەترسا لەوەی کە بیکوژن، چونکە کاتێك دەگریا و دەنگی بەرز دەکردەوە دەترسا کە دراوسێکانی دەنگەکەی ببیستن و هەواڵی لێ بدەن، هەروەها لەوە دەترسا کە لە دەریاکەدا نوقم ببێت و لەدەست

[181]- في ظلال القرآن ٥/٢٦٧٣-٢٦٧٤.

بچێت یان بکەوێتە دەست یەکێك لەو کەسە نزیکانەی فیرعەون کە هەر کوڕێکیان دەست بکەوتایە دەیانکوشت.

ئینجا خوای گەورە مژدەیەکی گەورەی دا بەدایکی موسا (علیه السلام) بەوەی کە دەیگەڕێنێتەوە بۆ ئامێزی و دەبێتە هەڵگری پەیامی خوایی، کە ئەوەش گەورەترین ڕێزگرتن و تەکلیفە بۆ موسا.

بێگومان ئەو ئایەتە پیرۆزە زۆرێك لەهۆکاری بەلاغی بەهێزی تیایە، چونکە دوو هەواڵ و دوو فەرمان و دوو نەهی و دوو مژدەی تیابوو، هەروەها دەربڕینەکە لەسەر شێوەی (جملة إسمي) هات، کە دڵنیایی و دامەزراوی دەگەیەنێت.

لە سوورەتی (طـــه)دا، خوای گەورە باسی ئەو نیعمەتانە دەکات کە بەخشی بەموسا (علیه السلام)، دەفەرموێت: ﴿ وَلَقَدْ مَنَنَّا عَلَيْكَ مَرَّةً أُخْرَى(٣٧) إِذْ أَوْحَيْنَا إِلَى أُمِّكَ مَا يُوحَى(٣٨) أَنِ اقْذِفِيهِ فِي التَّابُوتِ فَاقْذِفِيهِ فِي الْيَمِّ فَلْيُلْقِهِ الْيَمُّ بِالسَّاحِلِ يَأْخُذْهُ عَدُوٌّ لِي وَعَدُوٌّ لَهُ وَأَلْقَيْتُ عَلَيْكَ مَحَبَّةً مِنِّي وَلِتُصْنَعَ عَلَى عَيْنِي﴾ (طه: ٣٧-٣٩).

ئەم ئایەتە پیرۆزانە تەواوکەری ئایەتەکانی سوورەتی (القصص)ن و ڕونکردنەوەن بۆ ئەوان، کە فەرمانی خوای تیایە بۆ دایکی موسا هات، کە لەناو سندوقێك دایبنێت، و بیخاتە ناو دەریاکەوە، پاشان دەچێ بۆناو کۆشك و تەلاری فیرعەون، بەڕاستی دایکی موسا خۆی دایە دەست خوای گەورە و فەرمانەکەی جێ بەجێ کرد، و منداڵەکەی لەناو سندوقەکەدا دانا _ کە موسا بوو _ پاش ئەوە کەشیری پێ دابوو، و سندوقەکەیشی خستە ناو دەریاکەوە و بەئاوەکەدا ڕۆیشت هەتا گەیشتە کەنار و ڕووی کردە شوقە و تەلارەکانی فیرعەون، (بەڕاستی ئەمە سات و کاتێکی سەیر بوو کە کوڕەکەی خۆی فڕێدایە ناو ئاوی نیلەوە، بەبێ ئەوەی ترس و خەفەتی هەبێت لەسەری، ئەوەش تەنها لەبەر ئەوە بوو کە خوای گەورە دڵنیا و دڵ ئارامی کرد و بەڵێن و مژدەی پێدابوو، ئەویش دڵنیا و پشت قایم بو بە بەڵێنی خوایی، و پشتی بەستبوو بەخوای گەورە بە حەق و ڕاستی، هەرکەس پشت بەخوای گەورە ببەستێت ئەوەی بەسە).[١٨٢]

---

[١٨٢]- القصص القرآني للأستاذ عماد زهير ص ٢٤٦.

بەڵام فیرعەون ئەو کەسە بوو، کە هەزاران منداڵی نێرینەی بێتاوانی کوشت، کە تەنها مەبەستی موسا بووە و ئەوی ویستوە، بەڵام ئەو لە کۆشکەکەی خۆیدا پێشوازی لە موسا دەکات، تا لە ئامێزی خۆیاندا پەروەردەی بکەن، فیرعەون وەڵامی حەز و داواکاری ژنەکەی خۆی (آسیة) ی کچی (مزاحم)ی دایەوە، کە موسای زۆر خۆشویست، بێگومان ئەوە قەدەر و ویستی خوایە و جیٚ بەجیٚ دەبێت و حەق و ڕاستە و هەر دەبێت بەو جۆرە بێت کە خوای گەورە ویستویەتی، بێگومان ئەوە قەدەر و ویستی خوایە کە سنوری نییە، چاودێری خوایی و گرنگی پێدانی ئەو بوو، بە موسا(علیه السلام) و خوای گەورە ئامادەی دەکات بۆ کارێکی گەورە و گرنگ، خوای گەورە ڕاست و جوانی فەرمووە، کە دەفەرموێت: ﴿وَلِتُصۡنَعَ عَلَىٰ عَيۡنِيٓ﴾(طه:٣٩) و ﴿وَٱصۡطَنَعۡتُكَ لِنَفۡسِي﴾(طه:٤١) و ﴿فَٱللَّهُ خَيۡرٌ حَٰفِظٗاۖ وَهُوَ أَرۡحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ﴾ (یوسف:٦٤).

## موسا لە کۆشك و تەلای فیرعەوندا

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿فَٱلۡتَقَطَهُۥٓ ءَالُ فِرۡعَوۡنَ لِيَكُونَ لَهُمۡ عَدُوّٗا وَحَزَنًاۗ إِنَّ فِرۡعَوۡنَ وَهَٰمَٰنَ وَجُنُودَهُمَا كَانُواْ خَٰطِـِٔينَ﴾(القصص:٨).

وشەی (الألتقاط) بریتییە لە: دەستکەوتنی شتێك بەبێ مەبەست و داواکاری، لە داڕشتەکانی (اللقطة، اللقيط) واتە: دۆزراوە.

﴿لِيَكُونَ لَهُمۡ عَدُوّٗا وَحَزَنًا﴾ واتە: (تا سەر ئەنجام ببێتە دوژمن و خەفەت بۆیان).

﴿إِنَّ فِرۡعَوۡنَ وَهَٰمَٰنَ وَجُنُودَهُمَا كَانُواْ خَٰطِـِٔينَ﴾ چەوسانەوەی بەردەوام و هەڵە و سور بونیان لەسەری و لادانیان لەحەق و پشت هەڵکردنیان، لە کۆمەڵی ئەو هەڵانە بوون، هەروەها کوشتنی منداڵی بێتاوان بە مەستی دەستکەوتنی موسا بوو، بەڵام کاتێك موسا(علیه السلام) هاتە بەردەستیان، نەیانکوشت، بە شێوەیەك هات بۆلایان کە چاوەڕوانیان نەکردبوو، هیچ (حذر) ێك سودی پیٚ نەگەیاندن.

زانا (إبن كثير) دەڵێت:_ (ئەوان لەوەدا هەڵەبوون کە ڕاستیان لێ تێکچوو، و پێچەوانەیان کردەوە، و ئەو سزایەیان شایستە بوو، کە داخ و حەسرەتی لەسەر هەڵکێشن).[١٨٣]

زانا (الزمخشري) دەڵێت: ﴿كَانُوا خَاطِئِينَ﴾ ئەوان لە هەموو شتێکدا هەڵە بوون، هەڵەکەیان تەنها لەوەدا نەبوو کە دوژمنەکەی خۆیانیان پەروەردە دەکرد، یان تاوانکار و ستەمکاربن و خوا بەوە سزایان بدات کە بەدەستی خۆیان دوژمنی خۆیان پێ پەروەردە بکات و ببێتە هۆکارێك کە لەناوچونیان لەسەر دستی ئەودا بێت).[١٨٤]
لەم ئایەتەدا ئاماژە بۆئەوە کراوە کە قودرەت و دەستەڵاتی خوا و نەخشەدانانی و ویستی لەسەر هەموو قودرەت و توانایەکەوەیە و خوای گەورە گرنگی دەدات بە پێغەمبەران و چاودێرییان دەکات.

## لەگەڵ ( آسية ) ی کچی ( مزاحم ) ژنەکەی فیرعەوندا. ..

سندوقەکە برا بۆ ژنەکەی فیرعەون، خۆی سەرپەرشتی کردنەوەی سندوقەکەی کرد، کاتێك سندوقەکەی کردەوە، سەری سوڕما لەو جوانییەی کە لەموسادا بینی، و خوای گەورە خۆشی موسای خستە دڵییەوە و دڵی پابەند بوو بۆی.
زانا(ابن كثير) وتویەتی: (زانایانی تەفسیر باسیان کردووە کە کەسە نزیکەکانی فیرعەون لەناو سندوقێکی داخراودا لەناو ئاوی دەریاکەدا دۆزیانەوە، و زاتیان نەکرد سندوقەکە بکەنەوە، هەتا بردیان لەبەردەستی ژنەکەی فیرعەوندا دایاننا، کاتێك دەرگای سندوقەکەی کردەوە و پەردەکەی لەسەرلابرد، دەم و چاوێکی بینی کە دەدرەوشایەوە بە ڕوناکی و نوری پێغەمبەرایەتی،. ....کاتێك بینی و باش تێی ڕوانی، زۆر زۆری خۆش ویست، کاتێك فیرعەون هات وتی: ئەمە چی یە؟! فەرمانی کرد کە سەرببڕرێت، ژنەکە داوای کرد کە بیبەخشێت بەو و پارێزگاری لێکرد و وتی: ﴿قُرَّتُ عَيْنٍ لِي وَلَكَ﴾.[١٨٥]

---

[١٨٣]- قصص الأنبياء لأبن كثير ص/٢٩٦.
[١٨٤]- الكشاف ٣/٣٩٤ بە دەستکاریەوە.
[١٨٥]- قصص الأنبياء لإبن كثير ص/٢٩٦ بە کورتی و دەستکاریەوە.

واتە: (ژنەکەی فیرعەون وتی: هیوادارم ببێتە مایەی خۆشحاڵی وبەرچاوڕونی بۆ منیش و بۆ تۆیش). خۆشحاڵی دەبێتە هۆی دروستبونی فرمێسکی سارد، بەڵام خەفەت دەبێتە هۆی فرمێسکی گەرم.

﴿لَا تَقْتُلُوهُ﴾ واتە: مەیکوژن، بەشێوەی (جمع) دەری بڕی چونکە ئەو کەسانەی بەشداری کوشتنیان دەکرد زۆربوون، و وتراویشە: بۆیە بە شێوازی (جمع) دەری بڕی، بۆ گەورە دانان و بەگەورە تەماشاکردنی موسا بوو، تا فیرعەون وەڵامی حەز و داواکەی بداتەوە.[186]

﴿عَسَى أَنْ يَنْفَعَنَا أَوْ نَتَّخِذَهُ وَلَدًا﴾ وتی: بەڵکو سودی بۆمان ببێت یان بیکەین بە کوڕی خۆمان﴿وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ﴾ بێگومان ئەوان هەست ناکەن و نازانن کە ئەمە ئەو کوڕە داواکراوەیە، کە ئەوان لەسەر دەستیدا لەناو دەچن.

بێگومان خوای گەورە بەهۆی موساوە سودی گەیاند بە ژنەکەی فیرعەون، و هیدایەتی دا بۆ ئیمان و باوەڕ، و یەکێك بوو لە تەواوترین ئافرەتەکان، و بو بە ناوازەترین نموونە لەسەر خۆ ڕاگری و مانەوە.

خوای گەورە لە سوورەتی (التحریم)دا فەرموی: ﴿وَضَرَبَ اللَّهُ مَثَلًا لِلَّذِينَ آمَنُوا امْرَأَتَ فِرْعَوْنَ إِذْ قَالَتْ رَبِّ ابْنِ لِي عِنْدَكَ بَيْتًا فِي الْجَنَّةِ وَنَجِّنِي مِنْ فِرْعَوْنَ وَعَمَلِهِ وَنَجِّنِي مِنَ الْقَوْمِ الظَّالِمِينَ﴾(التحریم: ١١).

واتە: (هەروەها خوا نمونەی هێناوەتەوە بە هاوسەرەکەی فیرعەون بۆ ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە، کاتێك وتی: پەروەردگارا لەلای خۆت لە بەهەشتداماڵێکم بۆ دروست بکە (تا بەردەوام بە دیدارت شادببم) و لەدەست فیرعەون و کار و کردەوەی ڕزگارم بکە و لەدەست ئەم قەومە ستەمکارەش دەربازم بکە).

خوای گەورە نمونەی ئافرەتێکی ئارامگر و چاکەکاری پێ هێنایەوە، کە خۆڕاگر و دامەزراو بوو لەسەر حەق و ڕاستی لەگەڵ خراپی ژینگەکەیش و هەموو ئەو خراپانەی تر کە لە دەوری بوو، ئەو بەوە لەخۆی بایی نەبوو کە ژنە پاشا و دەستەڵاتدارە، و ئەوەش ڕوی پێ وەرنەگێڕا لەئیمان و باوەڕ بەخوا.

---

[186] - إرشاد العقل السليم لأبي السعود ٤/٢٢٦.

تێك بەڵگە و نیشانە ڕوون وئاشکراکانی بینی باوەڕی بەخوا هێنا و پەیام و بەرنامەکەی موسایشی بەڕاست و تەواو زانی و تەبەڕا و خۆ بە دوور گری کرد لە فیرعەون و کار و کردەوەکانی و داوای کرد لەخوای گەورە کەماڵێکی لە بەهەشتدا لای خۆی بۆ دروست بکات، لەپێشدا داوای نزیکی لەخواوە کرد، ئینجا دروستکردنی ماڵەکە.

داوای کرد کە لەڕەحمەت و بەزەیی خوا نزیك بێت و لەسزای دوژمنەکانی دووربێت، یان ویستی دەرەجەی لەبەهەشتدا بەرزبێت، و بەهەشتەکەی لەو بەهەشتانە بێت کە لە عەرشی خواوە نزیك بێت کە (جنّة المأوى)یە.

زانا (القرطبي) دەڵێت: (..ئاسیای ژنەی فیرعەون باوەڕی هێنا بە موسا. (أبو العالية) دەڵێت: فیرعەون بە ئیمانهێنانی ژنەکەی زانی، ئینجا چووە دەرەوە بۆ ناو کەسەکانی دەور و بەری خۆی و پێی وتن: ئێوە چی دەزانن دەربارەی (آسية)ی کچی (مزاحم)؟ هەموو وتیان: خەیر. ئینجا پێی ووتن: بێگومان ئەوخوایەکی تر جگە لەمن دەپەرستێت، ئینجا پێیان وت: بیکوژە، ئینجا چەند مێخێکی بۆ داکوتا و دەست و قاچی پێوە بەستەوە، ژنەکە ووتی: ﴿قَالَتْ رَبِّ ابْنِ لِي عِندَكَ بَيْتاً فِي الْجَنَّةِ﴾ فیرعەون لەم کاتەدا ئاگای لێ بوو، ئینجا ژنەکە پێکەنی کاتێك ماڵەکەی خۆی لە بەهەشتدا بینی، ئینجا فیرعەون پێی وتن:ئایا ئێوە سەرسام نابن بە شێت بوون و تێکچونی ئەم ئافرەتە؟! ئێمە بەڕاستی سزامان داوە، کەچی ئەو پێدەکەنێت، ڕۆحی کێشرا. (سەلمانی فارسی) دەڵێت: (عثمان النهدي) ووتی: بە تیشکی خۆر و گەرمییەکەی سزا درا، کاتێك گەرمی خۆرەکە ئازاری دەدا، فریشتەکان بەباڵیان سێبەریان بۆ دەکرد، و وتراوە: هەردوو دەستی و هەردوو قاچی بە بزمار داکوتا بەزەویدا لەبەر خۆر و دەستاڕێکی گەورەی خستە سەرپشتی، ئینجا خوای گەورە بەرزی کردەوە هەتا شوێنەکەی خۆی لەبەهەشتدا بینی، وتراوە ماڵەکەی لە گەوهەر بووە).[١٨٧]

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: (لە پیاواندا زۆرێکی تەواو کامڵ هەن بەڵام لە ئافرەتاندا تەواو کامڵ نین تەنها (آسية)ی ژنی فیرعەون و (مريم ی کچی عمران) نەبێت، و فەزڵی

---

[١٨٧]- (الجامع لأحكام القرآن للقرطبي) ٢٠٣/١٨ بەدەستکارییەوە.

عائیشەیشی بەسەر ئافرەتاندا وەك فەزڵی (ثرید) خواردنی تێوشراو وایە بەسەر هەموو خواردنەکاندا).[188]

## ژنەکەی فیرعەون

ژنەکەی فیرعەون لەو ئافرەتانە بووە کە تەواو بوون، ئەویش بە پێی دەقی فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ)، فەرموویەتی: (زۆر کەس لە پیاوان پیاوی تەواویان لێ دەرچوە و بوون بە پیاوی یەکی یەکی کەڵەمێرد، بەڵام لە ژنان هەر مەریەمی کچی عیمران و ئاسیەی ژنی فیرعەون ئافرەتی تەواویان لێ دەرچوە و باو و فەزڵ و گەورەیی عائیشە لە چاو ژنانی تردا وەك فەزڵ و گەورەیی تریت وایە لەچاو خواردەمەنییەکانی تردا).[189] لە کاتێکدا کە ئەو چەند ئافرەتە تەواون، بۆچی ناوی ژنەکەی فیرعەون هات؟. چونکە بەم شێوازە نموونەی هێنراوەتەوە: ﴿وَضَرَبَ اللَّهُ مَثَلًا لِلَّذِينَ آمَنُوا امْرَأَتَ فِرْعَوْنَ إِذْ قَالَتْ رَبِّ ابْنِ لِي عِنْدَكَ بَيْتًا فِي الْجَنَّةِ وَنَجِّنِي مِنْ فِرْعَوْنَ وَعَمَلِهِ وَنَجِّنِي مِنَ الْقَوْمِ الظَّالِمِينَ﴾(التحريم/١١). هەندێك لە زانایان ئەوەیان لێ وەرگرتووە کە لەسەر ئافرەتی باوەڕدار پێویستە ئارامگربێت لەسەر مێردی کەم و کورت یان مێردی سەرپێچیکار یان مێردی لادەر. واتە ئەو ئافرەتەکەی کە دەڵێت: من ئەو مێردەم ناوێت، ئەوە بەڕاستی پەیڕەوی ئاسیای ژنی فیرعەونی نەکردووە.

## گەڕانەوە بۆ لای دایکی موسا (علیه السلام)

﴿وَأَصْبَحَ فُؤَادُ أُمِّ مُوسَى فَارِغًا﴾.

زانایانی تەفسیر چەند تەفسیرێکیان بۆ ئەم ئایەتە کردووە لەوانە: هەندێك جار دڵی ئینسان پڕ دەبێت لە هەم و غەمێکی زۆر، هەندێك جار وای لێ دێت گرنگی زۆر بە

---

[188] - رواه البخاري في صحيحه عن ابي موسى الأشعري الكتاب الأنبياء

[189] - صحيح البخاري عن ابي موسا. بەکورتی وکەمێك دەستکاری یەوە.

ه ‌ اڵەکەی دەدات یان هاوسەرە نەخۆشەکەی، یان ئەوکەسەی کە لە سەفەردا هاوڕێیەتی و سەوشت و کەل وپەلانەی کە لە بازرگانیدا ماونەتەوە و نەفرۆشراون، کەواتە.... کۆمەڵێك هەم و غەمی تێدایە، هەندێك کات گرفتێکی مەترسیدار ڕووی تێ دەکات، ئیتر ئەو هەموو خەم و غەمەی پێشووی لەبیردەباتەوە، ئیتر دڵی بەتاڵ دەبێتەوە لە هەموو ئەو شتانە و تەنها ئەو بابەتە تازەی تیا دەمێنێت. واتە، بەڕاستی ئینسان لە حاڵەتی ئاساییدا هەم و غەمێکی زۆری هەیە، هەندێك جار لە ڕووی تەندروستییەوە قەلەق و ڕاڕایی بێزاری دەکات، لەڕووی منداڵەکانییەوە لەوە دەترسێت کە سەرکەوتوو نەبن، و لەلایەنی هاوسەرەکەیەوە ڕەنگە هەست بەوە بکات کە ڕازی نییە لێی، لەڕووی کاروکاسبییەوە پێت دەڵێت: بازاڕ کز و داخراوە. بەڵام پەنا بە خوا ئەگەر تووشی نەخۆشییەکی مەترسیدار ببێت و شیکاری نەخۆشییەکەی بۆ بکرێت، ئەوا هەم و غەمی خێزان و کوڕ و کار و کەسابەت و هەموو شتەکانی تری لەبیردەباتەوە، و دڵی ئەم ئینسانە لەو هەم و غەمانە بەتاڵ دەبێتەوە. پەنا ئەگرین بە خوای گەورە لەم جۆرە هەم وغەمە.

مانای دووەم: لەم ئایەتەدا دەردەکەوێت کە دەربارەی دایکی موسایە: ﴿وَأَوْحَيْنَا إِلَى أُمِّ مُوسَى أَنْ أَرْضِعِيهِ فَإِذَا خِفْتِ عَلَيْهِ﴾(القصص/٧). لە کوشتنی دەترسا...﴿فَأَلْقِيهِ فِي الْيَمِّ وَلَا تَخَافِي وَلَا تَحْزَنِي﴾(القصص/٧). مەترسە و خەفەت مەخۆ، کاتێك خوای گەورە وەحی کرد بۆ دایکی موسا کە نەترسێت و خەفەت نەخوات، کەواتە ڕێگرێك نییە کە دڵی بەتاڵ بێتەوە لە ترس و خەفەت، ئەمەیش مانایەکی تری بوو، بەڵام بەڕاستی دڵی بەتاڵ بوویەوە لە هەم وغەم وخەفەت.

مانای سێیەم: کاتێك دایکی موسا منداڵەکەی هەڵدایە ناو دەریاکەوە شڵەژان و شپرزەیی بۆهات، خەفەت و هەم و غەم ڕووی تێ کرد، ترسا نوقمی دەریاکە ببێت، ترسا بکوژرێت و نەمێنێت ...هتد ... دڵی لە عەقڵ و ژیری بەتاڵ بوویەوە، ئارامی تیا نەما، هەم و غەم و ترس و خەفەتێکی زۆر ڕووی تێ کرد.[١٩٠]

[١٩٠] - تفسیرالنابلسي: محمد راتب النابلسي .

# قسەیەکی (أصمعی) شاعیر

(اصمعی)ـ عبدالملك کوڕی قریب ـ خاوەنی (اصمعیات) بە گێڕەرەوەی بەسەرهات و سەرگوزشتە و قسەی نەستەق و خۆش دادەنرێت، لە زاری پیاوان و ژنانی دورگەی عەرەبییەوە بەسەرهات وقسەی نەستەقی بیستووە و پاراستوویەتی. لە یەکێك لەو بەسەرهاتە خۆشانەدا ئەم ئاخاوتنەی نێوان خۆی و کیژۆڵەیەکی دەوارنشینی عەرەب دەگێڕێتەوە، کە کاتێك خۆی لەبەردەم یەکێك لە دەوارەکاندا گوێی لەو کیژۆڵە بچووکە بووە ئەم دوو دێڕە شیعرەی بە دەنگێکی بەرز وتووە:

أستغفرُ اللهَ لذنبي كله قبّلت انسانا بغير حله

مثل الغزال ناعما في دله فأنتصفَ الليل ولم أصله

(اصمعی) پێی گوتووە: بەڕاستی من زۆر سەرسامم پێت (ماشآءالله) چەندە زمانپاراو و ڕەوانبێژیت!! بەڵام کیژۆڵەکە پێی دەڵێت: جا ئایا تۆ بڵێیت ئەم شیعرانەی من لە ئاست فەرمایشتەکەی خوادا هیچ ڕەوانبێژییەکی تێدا بێت کە فەرموویەتی: ﴿وَأَوْحَيْنَا إِلَى أُمِّ مُوسَى أَنْ أَرْضِعِيهِ فَإِذَا خِفْتِ عَلَيْهِ فَأَلْقِيهِ فِي الْيَمِّ وَلَا تَخَافِي وَلَا تَحْزَنِي إِنَّا رَادُّوهُ إِلَيْكِ وَجَاعِلُوهُ مِنَ الْمُرْسَلِينَ﴾(القصص/٧). کە هەر لەم ئایەتەدا دوو هەواڵ و دوو فەرمان و دوو نەهی و دوو مژدەی کۆکردۆتەوە؟!! ئایا لە ئاست ئەم ئایەتەدا من چ جوانکاری و ڕوانبێژییەکم لەو شیعرە پیشانداوە؟![١٩١]

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَأَصْبَحَ فُؤَادُ أُمِّ مُوسَى فَارِغًا إِن كَادَتْ لَتُبْدِي بِهِ لَوْلَا أَن رَّبَطْنَا عَلَى قَلْبِهَا لِتَكُونَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ﴾(القصص:١٠).

حاڵی دایکی موسا چۆن بوو پاش ئەوەی کە منداڵە کوڕەکە ی لەناو سندوقێکدا دانا و خستی یە ناو نیلەوە، تا ئاوی ڕووبارەکە موسا (علیه السلام) ببات بەرەو ئاراستەی

---

[١٩١] - تفسیرالقرطبي ٢٥٢/١٣ بەکورتی.

کۆشکەکەی فیرعەون. دەبێت حاڵی چۆن بووبێت کە لەمنداڵە بچوکەکەی جیا بوویەوە و باوەشی گەرمی دایکی جیٚ هێشت و لە سۆز و خۆشەویستی ئەو بێبەش بوو، فڕێیدایە ناو دەریاکەوە تا بچێت بۆ لای فیرعەونی ستەمکار و یاخی بوو.

دەبێت ئەم ساتە وەختانە چەند قورس و ناڕەحەت بوو بێت لەسەر دایکی موسا، و دەبێت ئەو تاقیکردنەوەیە چەند قورس و گران و ناڕەحەت بووبێت، ئەگەر بەها و نرخی ئیمانی نەبوایە، ئەوا سۆز و عاتیفە زاڵ دەبوو بەسەر عەقڵیدا، و ئەو کاتە ئەو ئاوات و خواستەی ئەو و خۆدانە دەست فەرمانی خوا لە نێوانیاندا دووردەکەوتەوە.

﴿وَأَصْبَحَ فُؤَادُ أُمِّ مُوسَىٰ فَارِغًا﴾(ئینجا دایکی موسا هەستی بە بێتاقەتی و بۆشاییەکی زۆر کرد لەدڵ و دەرونی خۆیدا).

بێگومان دڵ و دەرونی لە هەموو کاروبارێکی دنیایی بەتاڵ بوویەوە و هیچی تیانەما تەنها موسای تیا ما هەر بیری لەو دەکردەوە و گرنگی بەحاڵی ئەو دەدا و تەنها ئەو مەبەست و ئاواتی بوو.

وتراوە: دڵی لە خەفەت و ترس بەتاڵ بوویەوە، لەبەرئەوەی زۆر دڵنیابوو بە بەڵێن و وەعدی خوا.

وتراوە: دڵی بەتاڵ بوویەوە لەو وەحی و ئیلهامەی خوا بۆی ناردبوو لەبەرئەوەی سەرقاڵ بوو بە جگەرگۆشەکەیەوە، کە بەرهەمی دڵ و بینایی چاوەکانی و شوێنی دەربڕینی خۆشی و شادمانی ئەو بوو.

بەڵام ئەو بۆچوونەی کەزیاتر لە ڕاستی یەوە نزیك بێت: دڵی دایکی موسا لەهەموو شتێك لە کاروباری دنیایی بەتاڵ بوویەوە، ئەو تەنها و تەنها بیری لە موسا (علیه السلام) دەکردەوە، تەنها گرنگی بە چارەنوسی ئەو دەدا و کە موسا چاوەڕێی دەکرد.

﴿وَأَصْبَحَ فُؤَادُ أُمِّ مُوسَىٰ فَارِغًا إِن كَادَتْ لَتُبْدِي بِهِ لَوْلَا أَن رَّبَطْنَا عَلَىٰ قَلْبِهَا لِتَكُونَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ﴾(القصص:١٠).

واتە: (بەڕاستی خەریك بوو ڕازەکەی ناو دڵی خۆی ئاشکرا بکات، ئەگەر ئێمە دڵیمان دامەزراو نەکردایە، تا لەو کەسانە بێت کە بڕوایان بە بەڵێنی خوا هەیە).

خاوەنی (روح البیان) دەڵێت: ﴿إِن كَادَتْ لَتُبْدِي﴾ ئەو لەلاوازی بەشەری نزیك بوو بویەوە و هەڵچون و نا هاوسەنگی ڕووی تێکرد ﴿لَتُبْدِي بِهِ﴾ واتە: کارەکە ئاشکرا بکات ﴿لَوْلَا أَن رَّبَطْنَا عَلَىٰ قَلْبِهَا﴾ بە ئارامگرتن و دامەزراوی.

بێگومان دایکی موسا کەوتە نێوان دوو حاڵەتەوە: حاڵەتی گرنگی دان بە کاروباری منداڵەکەی و سەرقاڵ بوونی پێوەی و شەوق و تێڕوانینی بۆی، ئەمەیش سروشتی دایکایەتی یە.

هەروەها حاڵەتی دڵنیایی و دڵ ئارامی بە بەڵێنی خوا، دڵنیایی و دامەزراەی، ئەمەیش حاڵی باوەڕدارە، حاڵەتی یەکەم بەستراوە بە حاڵەتی دووەمەوە واتە: سۆز و عاتیفە بەستراوە بە ئیمانەوە.

## خوشکەکەی موسا، شوێن موسا ( علیه السلام ) دەکەوێت

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿وَقَالَتْ لِأُخْتِهِ قُصِّيهِ فَبَصُرَتْ بِهِ عَن جُنُبٍ وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ﴾(القصص:١١).

دایکی موسا داوای لە خوشکەکەی موسا(علیه السلام) کرد، کە هەواڵی موسا بزانێت و شوێنی بکەوێت، کاتێك موسا لەناو سندوقەکەدا بوو، ئەویش شوێنی کەوت هەتا گەیشتە کەنار، کە دەکەوتە بەردەم کۆشك و تەلارەکانی فیرعەونەوە، وەك ئەوەی کە ئەو دوای کەوتبوو، بینی کە هەڵیانگرتبوو دەیانگێڕا بەسەر ئافرەتە شیردەرەکاندا، ئەم کچەی خوشکی موسا ئەم کارەی بە جۆرێك کرد، کە ئاوڕی نەئەدایەوە بۆلای.

(قتادة) دەڵێت: ﴿فَبَصُرَتۡ بِهِۦ عَن جُنُبٍ﴾ وا سەیری دەکرد کە مەبەستی ئەوە بێت نەیەوێت.[١٩٢] (مجاهد) دەڵێت: لە دورەوە سەیری دەکرد.[١٩٣]

## حەرامکردنی ئافرەتە شیردەرەکان لەسەر موسا (علیه‌السلام)

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَحَرَّمۡنَا عَلَيۡهِ ٱلۡمَرَاضِعَ مِن قَبۡلُ فَقَالَتۡ هَلۡ أَدُلُّكُمۡ عَلَىٰٓ أَهۡلِ بَيۡتٍ يَكۡفُلُونَهُۥ لَكُمۡ وَهُمۡ لَهُۥ نَٰصِحُونَ﴾ (القصص:١٢).

واتە: (ئێمە پێشتر هەرچی ئافرەتی شیردەرە لەومان حەرامکرد،(خوشکەکەی بەمەی زانی، حەکیمانە لە کۆشکەکە نزیك بۆوە) وتی: ئایا ناونیشانی ماڵێکتان پێ بڵێم، کە ئەو منداڵەتان بۆ بەخێو بکەن، دڵسۆز و میهرەبانیش بن بۆی؟).

ئەو حەرامکردنە بە پێی بڕیاری خوا بوو نەك شەرع حەرامی کات و ڕێگەی نەدات.

موسا(علیه السلام) مەمکی هیچ ئافرەتێکی نەگرت، هەموو سەریان لێی سوڕما، و ناردیان بۆ بازاڕ، تا بەڵکو کەسێکیان دەسکەوێت کە موسا مەمکی بمژێت، لەم کاتەدا کە ئەوان تیا مابوون، خوشکەکە ی ڕووی کردە کۆشکەکە و بەنەرم و نیانی و حەکیمی و زیرەکانە پێی وتن: ئایا من هەواڵی کەسێکتان بدەمێ کە دەستەبەری بکات و دڵسۆز و میهرەبان بێت بۆی؟

(إبن عباس) وتویەتی: (کاتێك خوشکەکەی ئەو قسەیەی کرد، پێیان وت: تۆ چوزانیت ئەوان دڵسۆز و میهرەبانن بۆی؟ وتی: حەز دەکەن دڵی پاشا خۆش بکەن و سودی پێ بگەیەنن).[١٩٤]

---

[١٩٢]- تفسير القرآن لابن كثير ٣٨١/٣.

[١٩٣]- هەمان سەرچاوە ٣٨١/٣.

[١٩٤]- قصص الأنبياء لابن كثير ص/٢٩٧.

## حیکمەت لە نەخواردنی شیری دایەنەکان

گەر لە ئاست ئەم نەخشەو کارە ڕێك و پێکە دانایانەی خوادا هەڵوێستە بکەین و هەوڵی زانینی هەندێك حیکمەت لە نەخواردنی شیری دایەنەکان بدەین ئەوا چەند حیکمەتێك دەردەکەوێت:

١-بێگومان ئەم شیر نەخواردنەی موسا,کار و پلانی خوایی بووە، تاکو بگەڕێتەوە بۆ لای دایکی.

٢-ئەگەر موسا شیری هەر دایەنێکی لە کۆشکی فیرعەوندا بخواردایە، ئەوا لە سۆز و ئامێزی گەرم و باش بەخێوکردنی دایکی بێبەش دەبوو، وەك ئاشکرایە دایکی منداڵ هەر خۆی سورتر و بە پەروشترە بۆ منداڵەکەی، تەنانەت ئەگەر دایەنی شیردەر هەرچەندە بۆی دڵسۆز بێت

٣-ئەگەر پێشتر (بەر لەوەی موسای منداڵ مەمکی دایەنەکانی دی نەگرێت)دایکی خۆی بچوایە بۆ ئەو شوێنە، وەك دایەنێك خۆی بۆ تەرخان بکردایە، ئەوا بە تاوانبار دادەنرا و چەندین گومانی لێ دەکرا و پەیوەندی ڕاستەقینەیشی بەو منداڵەوە دەزانرا، چونکە هەڵپە و جۆش و خرۆشی دایك بۆ منداڵکەی لە چاودێرێکی بینا و چاوتیژ ناشاردرێتەوە، ئەمەیش لە خۆشویستنی زۆری و چۆنێتی لەباوەش کردن و هەڵگرتنی و شیرپێدانیدا دەردەکەوێت.

٤-ئەم شیر نەخواردنەی موسا و(ڕەتکردنەوەی مەمکی هەموو دایەنەکانی، ئەو هۆکارەیە کە خوای گەورە پیلانی فیرعەون و گەلەکەی پێ پوچەڵ کردۆتەوە و سەری لێ تێکداون، ئەمەیش بەو ڕەنگەی وای لێ کردن خۆیان بەوپەڕی سوور بوون و بایەخەوە بە دوای هەر دایەنێکدا بگەڕێن، تا موسا مەمکی یەکێکیان پەسەند دەکات، ئیتر لەو ساتەیشدا هیچ گومانێك لە دایکی ناکرێت کاتێك مەمکی دایکی دەگرێتە دەم و ڕەتی ناکاتەوە و ئەوانیش بیر لە چۆنێتی پەیوەندی نێوان منداڵەکە و ژنە شیرپێدەرەکە ناکەنەوە، هەر نایشپرسن ئاخۆ دایکێتی یان نا؟ وەك ئەوەی خوا بە فیرعەونی ڕاگەیاندبێت کە(تۆ دەتەوێت منداڵە شیرە خۆرەکە لە باوەشی دایکی دەربهێنیت و ئێمەیش دەمانەوێت کە تۆ خۆت و کۆمەڵەکەیشت بیگەڕێننەوە بۆ باوەشی دایکی و هەر دایکیشی بکەن بە دایەن و لەسەر حیسابی خۆتان ڕایبگرن و کرێی خۆی لە بەرامبەر شیر پێدانیدا پێ

بدەن.... ئیدی هیچ شتێکی تر لە ئارادا نابێت تەنها خواستی ئێمە نەبێت، ئێوەیش تەنها خواست و ئیرادەی ئێمە جێ بەجێ دەکەن.[١٩٥]

## تێبینی و ڕوونکردنەوە

پەیوەندییەکی بنەڕەتی لە نێوان گەورەمان موسا(علیه السلام) و (ئاو)دا هەیە، بە تایبەتی ئاوی دەریاکە زیاتر لەچەند شوێنێك ئاماژەی بۆ کراوە لە قورئاندا، لەوانە:

یەکەم: کاتێك خوای گەورە (وحی) سروشی نارد بۆ دایکی: خوای گەورە فەرمووی: ﴿وَأَوْحَيْنَا إِلَى أُمِّ مُوسَى أَنْ أَرْضِعِيهِ فَإِذَا خِفْتِ عَلَيْهِ فَأَلْقِيهِ فِي الْيَمِّ وَلَا تَخَافِي وَلَا تَحْزَنِي إِنَّا رَادُّوهُ إِلَيْكِ وَجَاعِلُوهُ مِنَ الْمُرْسَلِينَ﴾(القصص/٧).

دووەم: کاتێك موسا بە گەنجە لاوەکەی هاوڕێی فەرموو: ﴿وَإِذْ قَالَ مُوسَى لِفَتَاهُ لَا أَبْرَحُ حَتَّى أَبْلُغَ مَجْمَعَ الْبَحْرَيْنِ أَوْ أَمْضِيَ حُقُبًا (٦٠) فَلَمَّا بَلَغَا مَجْمَعَ بَيْنِهِمَا نَسِيَا حُوتَهُمَا فَاتَّخَذَ سَبِيلَهُ فِي الْبَحْرِ سَرَبًا(٦١)فَلَمَّا جَاوَزَا قَالَ لِفَتَاهُ آتِنَا غَدَاءَنَا لَقَدْ لَقِينَا مِنْ سَفَرِنَا هَذَا نَصَبًا (٦٢) قَالَ أَرَأَيْتَ إِذْ أَوَيْنَا إِلَى الصَّخْرَةِ فَإِنِّي نَسِيتُ الْحُوتَ وَمَا أَنْسَانِيهُ إِلَّا الشَّيْطَانُ أَنْ أَذْكُرَهُ وَاتَّخَذَ سَبِيلَهُ فِي الْبَحْرِ عَجَبًا﴾(الكهف/٦٠-٦٣).

سێیەم: کاتێك هاوەڵی بەندە چاکەکارەکەی کرد: ﴿فَانْطَلَقَا حَتَّى إِذَا رَكِبَا فِي السَّفِينَةِ خَرَقَهَا قَالَ أَخَرَقْتَهَا لِتُغْرِقَ أَهْلَهَا لَقَدْ جِئْتَ شَيْئًا إِمْرًا﴾(الكهف/٧١).

هەروەها ئایەتی: ﴿أَمَّا السَّفِينَةُ فَكَانَتْ لِمَسَاكِينَ يَعْمَلُونَ فِي الْبَحْرِ فَأَرَدْتُ أَنْ أَعِيبَهَا وَكَانَ وَرَاءَهُمْ مَلِكٌ يَأْخُذُ كُلَّ سَفِينَةٍ غَصْبًا﴾(الكهف/٧٩).

چوارەم: کاتی دەرچوون لە (مصر): ﴿وَقَالَ مُوسَى رَبَّنَا إِنَّكَ آتَيْتَ فِرْعَوْنَ وَمَلَأَهُ زِينَةً وَأَمْوَالًا فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا رَبَّنَا لِيُضِلُّوا عَنْ سَبِيلِكَ رَبَّنَا اطْمِسْ عَلَى أَمْوَالِهِمْ وَاشْدُدْ عَلَى قُلُوبِهِمْ فَلَا يُؤْمِنُوا حَتَّى يَرَوُا الْعَذَابَ الْأَلِيمَ (٨٨) قَالَ قَدْ أُجِيبَتْ دَعْوَتُكُمَا فَاسْتَقِيمَا وَلَا تَتَّبِعَانِّ سَبِيلَ الَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ (٨٩) وَجَاوَزْنَا بِبَنِي إِسْرَائِيلَ الْبَحْرَ

[١٩٥] - مع قصص السابقين في القرآن . الدكتور:صلاح عبدالفتاح الخالدي و.كاوه هاوڕاز

فَأَتْبَعَهُمْ فِرْعَوْنُ وَجُنُودُهُ بَغْيًا وَعَدْوًا حَتَّى إِذَا أَدْرَكَهُ الْغَرَقُ قَالَ آمَنتُ أَنَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا الَّذِي آمَنَتْ بِهِ بَنُو إِسْرَائِيلَ
وَأَنَا مِنَ الْمُسْلِمِينَ (٩٠) آلْآنَ وَقَدْ عَصَيْتَ قَبْلُ وَكُنتَ مِنَ الْمُفْسِدِينَ (٩١) فَالْيَوْمَ نُنَجِّيكَ بِبَدَنِكَ لِتَكُونَ لِمَنْ
خَلْفَكَ آيَةً وَإِنَّ كَثِيرًا مِّنَ النَّاسِ عَنْ آيَاتِنَا لَغَافِلُونَ﴾(یونس/٨٨-٩٢).

**ئەمە یەکەم ئاماژەی ڕوون و ئاشکرا بوو لە مێژوودا بۆ دروستکردن و بنیاتنانی مۆزەخانەکان.**

**هەر بە کرداری ئەمڕۆ تەرمی فیرعەون لە مۆزەخانەی میسرییە لە قاهیرە.**

**هەروەها لەم چەند شوێنەی تریشدا پەیوەندی موسا لەگەڵ ئاودا بە ڕوونی دیارە: خوای گەورە فەرموویەتی:** ﴿وَلَقَدْ أَوْحَيْنَا إِلَىٰ مُوسَىٰ أَنْ أَسْرِ بِعِبَادِي فَاضْرِبْ لَهُمْ طَرِيقًا فِي الْبَحْرِ يَبَسًا لَّا تَخَافُ دَرَكًا وَلَا تَخْشَىٰ (٧٧) فَأَتْبَعَهُمْ فِرْعَوْنُ بِجُنُودِهِ فَغَشِيَهُم مِّنَ الْيَمِّ مَا غَشِيَهُمْ﴾(طه/٧٧-٧٨).

**هەروەها لەم ئایەتەیشدا:** ﴿فَلَمَّا تَرَاءَى الْجَمْعَانِ قَالَ أَصْحَابُ مُوسَىٰ إِنَّا لَمُدْرَكُونَ (٦١) قَالَ كَلَّا إِنَّ مَعِيَ رَبِّي سَيَهْدِينِ (٦٢) فَأَوْحَيْنَا إِلَىٰ مُوسَىٰ أَنِ اضْرِب بِّعَصَاكَ الْبَحْرَ فَانفَلَقَ فَكَانَ كُلُّ فِرْقٍ كَالطَّوْدِ الْعَظِيمِ﴾(الشعراء/٦١-٦٣). **ئەگەر بە بیرکردنەوەیەکی قووڵ و ورد بیبینەوە، وەڵامێکی سەرسوڕهێنەرمان بۆ ئەم ئاماژانە دەست دەکەوێت، کە بریتییە لە: ئەو ئایەتانەی کە دەربارەی موسا هاتوون نزیکەی دوولەسەر سێی ئایەتەکانی پێغەمبەرانی تر پێك دەهێنێت، (واتە لە پێغەمبەر نوحەوە هەتا عیسا پێغەمبەر) و ئەندازەشیان بە نیسبەت ئایەتە تایبەتەکانی خۆی و پەیوەندییان بە دەریاوە، بریتییە لە ئەندازەی ڕووبەری فراوانی ئاوی دەریاکان بە نیسبەت ڕووبەری ووشکانی زەوییەوە لە هەموو گۆی زەویدا، واتە:بە نزیکەی دوو لەسێ بۆ یەك لەسێ!!! لەلایەنی جوگرافیشەوە: ڕووبەری گشتی گۆی زەوی دەگاتە (١٩٧) ملیۆن میلی چوارگۆشە، لەو ڕووبەرە (١٤١) ملیۆن میلی چوارگۆشە واتە بە ئەندازەی (٧١٪)ی دەریاکان دای دەپۆشێت، لە کاتێکدا کە ئەو ڕووبەرەی دەمێنێتەوە ئەندازەکەی (٥٦) ملیۆن میلی چوارگۆشەیە کە ڕووبەری ووشکانییە لەسەر زەویدا، کە دەکاتە (٢٩٪)ی گۆی گشتی بە نیسبەت ڕووبەری گشتی گۆی زەوییەوە. کەواتە مافی خۆمانە بپرسین: دەبێت پلە و پایەی گەورەمان (محمد) (ﷺ) کۆتای پێغەمبەران چەند بێت؟. ئەم پلە و پایەی گەورەمان پێغەمبەر (ﷺ) لە ڕووداوی (إسراء و معراج)دا لێمان نزیك دەبێتەوە کە لەسەرو هەموو پلەی**

پێغەمبەرانەوەیە: ﴿فَكَانَ قَابَ قَوْسَيْنِ أَوْ أَدْنَى﴾(النجم/٩). لە ئامادە بوونی لای پەروەردگاری پێغەمبەری بەڕێز و خۆشەویستمان بەم پلە و پایە گەورەیەوە سەرکەوت بۆ بەرزایی ئاسمانەکان پاش ئەوەی کە بە ئیمام پێشنوێژی بۆ پێغەمبەران کرد لە(بیت المقدس). بەڕاستی گەورەترین ڕێز بۆ خۆی و ئوممەتەکەی هەتا ڕۆژی قیامەت بوونی قورئانی دابەزیوە بۆ سەری و دینی کۆتا پێغەمبەر لای خوای گەورە پەسەند و وەرگیراوە.[١٩٦]

## موسا ( علیه السلام ) دەگەڕێتەوە بۆ لای دایکی

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَرَدَدْنَاهُ إِلَى أُمِّهِ كَيْ تَقَرَّ عَيْنُهَا وَلَا تَحْزَنَ وَلِتَعْلَمَ أَنَّ وَعْدَ اللَّهِ حَقٌّ وَلَكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ﴾ (القصص:١٣).

واتە: (بەو شێوەیە گێڕامانەوە بۆلای دایکی، تا دڵنیا و دڵ ئارام بێت و چاوی بەدیتنی ئاسودە ببێت، ئیتر خەفەت نەخوات لای ڕوون بێت کە بەڵێنی خوا حەق و ڕاستە، بەڵام زۆربەی (ئەو خەڵکە) نازانن و هەستی پێ ناکەن).

لە سوورەتی (طه) دا دەفەروێت: ﴿إِذْ تَمْشِي أُخْتُكَ فَتَقُولُ هَلْ أَدُلُّكُمْ عَلَى مَنْ يَكْفُلُهُ فَرَجَعْنَاكَ إِلَى أُمِّكَ كَيْ تَقَرَّ عَيْنُهَا وَلَا تَحْزَنَ وَقَتَلْتَ نَفْسًا فَنَجَّيْنَاكَ مِنَ الْغَمِّ وَفَتَنَّاكَ فُتُونًا فَلَبِثْتَ سِنِينَ فِي أَهْلِ مَدْيَنَ ثُمَّ جِئْتَ عَلَى قَدَرٍ يَا مُوسَى﴾(طه:٤٠).

واتە: (خوای گەورە بە موسا(علیه السلام) دەفەرموێت: (لەبیرت نەچێت) کاتێك خوشکەکەت دەڕۆیشت و چاودێری تۆی دەکرد (لەنزیکی کۆشکی فیرعەونەوە بینی گیریان خواردوە بەدەستەوە) وتی: باشە ئایا کەسێکتان پێ بڵێم تا بۆتان بەخێوبکات، ئەوسا تۆمان گەڕاندەوە، بۆلای دایکت تا چاوی ڕوون بێت و خەفەت نەخوات. ..).

---

[١٩٦] - (فن السيناريو في قصص القرآن .الدكتور:جمال شاكر البدري ص/١٧٥-١٧٧).

موسا گەڕایەوە بۆلای دایکی خۆی، بەگەڕانەوەی مژدە خوای یەکە جیٚ بەجیٚ بوو، پاشان موسا گەورە بوو گەشەو نمای کرد و کەوتە ژێر چاودێری خوایی، خوای گەورە گرنگی زۆری بە موسادا و ئامادەی کرد بۆ گەورەترین و گرنگترین کار، کاری پەیامداری کە خوای گەورە ئامادەی کرد بۆ ئەو کارە و سازانی کە بتوانێت هەڵی بگرێت و بیگەیەنێت، ئینجا فەرمووی: ﴿وَلَمَّا بَلَغَ أَشُدَّهُ وَاسْتَوَىٰ آتَيْنَاهُ حُكْمًا وَعِلْمًا وَكَذَٰلِكَ نَجْزِي الْمُحْسِنِينَ﴾(القصص:١٤).

واتە: (دوای چەند ساڵ) کاتێك تەمەنی گەیشتە ئەو پەڕی هێز و توانایی، ئێمەیش حیکمەت و دانایی و زانابیمان پیٚ بەخشی، هەر بەو شێوەیە پاداشتی چاکەکاران دەدەینەوە).

بەمەش مژدەی دووەمی خوایی بۆ دایکی موسا جیٚ بەجیٚ بوو﴿وَجَاعِلُوهُ مِنَ الْمُرْسَلِينَ﴾ کاتێك موسا لەڕێگای مەدیەنەوە دەگەڕایەوە بۆ میسر، خوای گەورە وەحی و سروشی بۆنارد، بەڵام بۆچی موسا چوو بۆ مەدیەن؟ (إنشاء الله) لەمەودوا باسی دەکەین.

## باسی دووەم:

## موسا و دوو کچی پیاوە بەتەمەنەکە:

**پێشەکی:**

یەکەم: ئەو پیاو چاکەی مەدیەن کێ بوو؟

دووەم: بۆچی موسا لە میسر دەرچوو بەرەو مەدیەن؟

دووکچی پیاوە بەتەمەنەکە_ لەمەدیەندا_ دەور و کاریگەری گرنگ و گەورەیان هەبوو لە ژیانی موسادا(علیه السلام) هەروەك دایکی و خوشکەکەی و (آسیة) کچی (مزاحم) دەوری گرنگ و کاریگەریان هەبوو، بێگومان موسا یەکێك لەو دوو کچە دەکاتە هاوسەری خۆی لە مەدیەن پاشان لە گەڵیدا دەگەڕێتەوە بۆ میسر.

یەکەم: ئەو پیاو چاکەی مەدیەن کێ بوو؟

زانایانی تەفسیر ڕا و بۆچوونی جیاوازیان هەیە لە دیاریکردنی ئەو پیاو چاکەدا، کە موسا یەکێك لە کچەکانی خواست و کردیە هاوسەری ژیانی خۆی، لە زانایان هەیانە دەڵێن: شوعەیب پێغەمبەر(علیه السلام)، هەندێکی تر دەڵێن برازای ئەو بوو پێی وتراوە (یثرون)، هەیان بووە هەڵوێستی لەسەر مەسەلەکە کردووە و هیچی دەرنەبڕیوە کە شوعەیب بێت یان کەسێکی تر.

زانا (إبن کثیر)لە تەفسیرەکەیدا دەڵێت: ئەوەی کە زۆر بەناوبانگە لەناو زانایانی تەفسیردا، کە شوعەیب پێغەمبەرە (علیه السلام) و نێردراوە بۆ خەڵکی شاری مەدیەن.

زانایانی تریش دەڵێن: ئەو پیاوە برازای شوعەیب بووە، پیاوێکی باوەڕدار بووە لە قەومەکەی شوعەیب، هەندێکی تر دەڵێن: شوعەیب پێش سەردەمی موسا بووە بە ماوەیەکی زۆر درێژ، چونکە بە قەومەکە ی وتووە: ﴿وَمَا قَوْمُ لُوطٍ مِّنكُم بِبَعِيدٍ﴾(هود:٨٩)

و لەناو چوونی قەومی لوط لە زەمان و سەردەمی ئیبراهیمدا بووە (علیە السلام)و لەنێوانی ئیبراهیم و موسایشدا ماوەیەکی درێژ هەبووە کە لە(٤٠٠) ساڵ زیاتربووە، چەند کەسێك ئەمەیان باس کردووە، نەوتراوە شوعەیب ماوەیکی درێژ ژیابێت، ئەگەر ئەو بوایە دەبوو قورئان لێرەدا و لە دەقێکدا ناوی بهێنایە (أبو عبیدة) و (عبدالله) کوڕی (مسعود) دەڵێن: (یثرون) بورە، برازای شوعەیب بووە، و (إبن عباس) یش هەمان شت دەڵێت، پاشان وتی: ئەوەی کە ڕاستە ئەمە تەنها لەڕێگەی هەواڵەوە دەزانرێت و زانراوە، هەواڵیش نابێتە بەڵگە لەم کارەدا.[١٩٧]

بەڵام ئەوەی ئێمە لەم مەسەلەیەدا دەیبینین و بۆی دەچین: ئەوەیە کە شوعەیب (علیە السلام) نەبووە، چونکە نێوانی موسا و شوعەیب ماوەیەکی درێژ بووە کە لە(٤٠٠) ساڵ کەمترنییە، ئەگەر شوعەیب بوایە خوای گەورە دەقێکی لە قورئاندا لەسەر دەهێنا، لە فەرمودە ڕاستەکانیشدا نەهاتووە کە ئەو کەسە شوعەیب پێغەمبەر(علیە السلام) بووبێت.

دووەم: بۆچی موسا(علیە السلام)لەمیسر دەرچوو؟

حیکمەتێکی خوایی:

خوای گەورە گرنگی تەواوی داوە بە بەندە و پێغەمبەری خۆی موسا(علیە السلام) هەر لەکاتی لەدایك بونییەوە، بەڵکو پێش ئەوەش کە لەدایك بووبێت، خوای گەورە پێغەمبەرەکەی خۆی دەپارێزێت لە بێشکەدا کە فیرعەون نەتوانێت زیانی پێ بگەیەنێت، و خوای گەورە ویستی وابوو کە موسا لەناو کۆشك و باڵەخانەی فیرعەوندا پەروەردە بکرێت و گەورە ببێت، هەروەك ویستی وابوو کە چەند ساڵێك لەناو خەڵکی مەدیەندا بمێنێتەوە، بەمەیش موسا(علیە السلام) لە دوو شوێن و ژینگەی جیاوازدا ژیان بەسەر دەبات هەر شوێنێکیش سروشت و تایبەتمەندی تایبەتی خۆی هەیە، لەمەیشدا شوێنەوارێکی کاریگەر و گرنگ هەیە لە ئامادەکردن و سازاندنی موسادا بۆ هەڵگرتنی پەیامی خوایی، خوای گەورە لە سوورەتی (طە)دا دەفەرموێت: ﴿ وَلَقَدْ مَنَنَّا

---

[١٩٧] - تفسیر القرآن العظیم لإبن کثیر ٣٨٤/٣ بە دەستکاری یەوە.

عَلَيْكَ مَرَّةً أُخْرَى(٣٧) إِذْ أَوْحَيْنَا إِلَى أُمِّكَ مَا يُوحَى(٣٨) أَنِ اقْذِفِيهِ فِي التَّابُوتِ فَاقْذِفِيهِ فِي الْيَمِّ فَلْيُلْقِهِ الْيَمُّ بِالسَّاحِلِ يَأْخُذْهُ عَدُوٌّ لِي وَعَدُوٌّ لَهُ وَأَلْقَيْتُ عَلَيْكَ مَحَبَّةً مِنِّي وَلِتُصْنَعَ عَلَى عَيْنِي(٣٩) إِذْ تَمْشِي أُخْتُكَ فَتَقُولُ هَلْ أَدُلُّكُمْ عَلَى مَنْ يَكْفُلُهُ فَرَجَعْنَاكَ إِلَى أُمِّكَ كَيْ تَقَرَّ عَيْنُهَا وَلَا تَحْزَنَ وَقَتَلْتَ نَفْساً فَنَجَّيْنَاكَ مِنَ الْغَمِّ وَفَتَنَّاكَ فُتُوناً فَلَبِثْتَ سِنِينَ فِي أَهْلِ مَدْيَنَ ثُمَّ جِئْتَ عَلَى قَدَرٍ يَا مُوسَى (٤٠) وَاصْطَنَعْتُكَ لِنَفْسِي﴾(طه:٢٧-٤١).

**لە سوورەتی (الشعراء)دا دەفەرموێت:** ﴿قَالَ أَلَمْ نُرَبِّكَ فِينَا وَلِيداً وَلَبِثْتَ فِينَا مِنْ عُمُرِكَ سِنِينَ (١٨) وَفَعَلْتَ فَعْلَتَكَ الَّتِي فَعَلْتَ وَأَنْتَ مِنَ الْكَافِرِينَ (١٩) قَالَ فَعَلْتُهَا إِذاً وَأَنَا مِنَ الضَّالِّينَ (٢٠) فَفَرَرْتُ مِنْكُمْ لَمَّا خِفْتُكُمْ فَوَهَبَ لِي رَبِّي حُكْماً وَجَعَلَنِي مِنَ الْمُرْسَلِينَ﴾(الشعراء ١٨-٢١).

**لە سوورەتی (القصص)دا دەفەرموێت:** ﴿وَلَمَّا بَلَغَ أَشُدَّهُ وَاسْتَوَى آتَيْنَاهُ حُكْماً وَعِلْماً وَكَذَلِكَ نَجْزِي الْمُحْسِنِينَ(١٤) وَدَخَلَ الْمَدِينَةَ عَلَى حِينِ غَفْلَةٍ مِنْ أَهْلِهَا فَوَجَدَ فِيهَا رَجُلَيْنِ يَقْتَتِلَانِ هَذَا مِنْ شِيعَتِهِ وَهَذَا مِنْ عَدُوِّهِ فَاسْتَغَاثَهُ الَّذِي مِنْ شِيعَتِهِ عَلَى الَّذِي مِنْ عَدُوِّهِ فَوَكَزَهُ مُوسَى فَقَضَى عَلَيْهِ قَالَ هَذَا مِنْ عَمَلِ الشَّيْطَانِ إِنَّهُ عَدُوٌّ مُضِلٌّ مُبِينٌ(١٥) قَالَ رَبِّ إِنِّي ظَلَمْتُ نَفْسِي فَاغْفِرْ لِي فَغَفَرَ لَهُ إِنَّهُ هُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ (١٦) قَالَ رَبِّ بِمَا أَنْعَمْتَ عَلَيَّ فَلَنْ أَكُونَ ظَهِيراً لِلْمُجْرِمِينَ(١٧) فَأَصْبَحَ فِي الْمَدِينَةِ خَائِفاً يَتَرَقَّبُ فَإِذَا الَّذِي اسْتَنْصَرَهُ بِالْأَمْسِ يَسْتَصْرِخُهُ قَالَ لَهُ مُوسَى إِنَّكَ لَغَوِيٌّ مُبِينٌ(١٨) فَلَمَّا أَنْ أَرَادَ أَنْ يَبْطِشَ بِالَّذِي هُوَ عَدُوٌّ لَهُمَا قَالَ يَا مُوسَى أَتُرِيدُ أَنْ تَقْتُلَنِي كَمَا قَتَلْتَ نَفْساً بِالْأَمْسِ إِنْ تُرِيدُ إِلَّا أَنْ تَكُونَ جَبَّاراً فِي الْأَرْضِ وَمَا تُرِيدُ أَنْ تَكُونَ مِنَ الْمُصْلِحِينَ(١٩) وَجَاءَ رَجُلٌ مِنْ أَقْصَى الْمَدِينَةِ يَسْعَى قَالَ يَا مُوسَى إِنَّ الْمَلَأَ يَأْتَمِرُونَ بِكَ لِيَقْتُلُوكَ فَاخْرُجْ إِنِّي لَكَ مِنَ النَّاصِحِينَ(٢٠) فَخَرَجَ مِنْهَا خَائِفاً يَتَرَقَّبُ قَالَ رَبِّ نَجِّنِي مِنَ الْقَوْمِ الظَّالِمِينَ(٢١) وَلَمَّا تَوَجَّهَ تِلْقَاءَ مَدْيَنَ قَالَ عَسَى رَبِّي أَنْ يَهْدِيَنِي سَوَاءَ السَّبِيلِ﴾(القصص: ١٤-٢٢).

## موسا ( علیه السلام ) ( قبطي )یەك دەکوژێت

موسا(علیه السلام) لەکاتی غەفڵەتی خەڵکی شاردا_ کە کاتی خەوی چێشتەنگاو بوو _ خۆی کرد بە شەقام و بازاڕدا، بینی دوو پیاو شەڕ دەکەن، یەکێکیان لە تایەفە و قەوم و دەستە و تاقمی خۆیەتی و، ئەویشیان لە دەستەو تاقم وتایەفەی دوژمنەکەیەتی (سەربازی فیرعەون)، ئەوەی خزمی خۆی بوو موسای بینی، هاواری لێکرد کە فریای بکەوێت، و زاڵی بکات بەسەر دوژمنەکەیدا موسایش بەپەلە چوو بەدەمیەوە، بۆکزێکی ماڵی بەکابرای(قبطي)دا و کوشتی، موسا پەشیمان بۆوە لەبەر خۆیەوە وتی:_ ئەم کارە شەیتان پێی کردم (من نەم ویست بیکوژم) بەڕاستی شەیتان دوژمنێکی گومڕاکەری ئاشکرایە).

پێویست بوو موسا سەرەتا ئامۆژگاری کابرا(قبطي) یەکەی بکردایە و ئاگاداری بکردایە کە شەڕ نەکات، بەڵام بۆکزێکی پیا کێشا (بۆ ئەوەنا بیکوژێت) ئیتر بەو بۆکزە کابرامرد.

موسا(علیه السلام) بەو بۆکزە مەبەستی لابردنی ستەمێك بوو کە بینیبوی.

لە فەرمودەیەکدا (سالم کوڕی عبدالله) دەڵێت (ئیبن عمر) (خوا لێی ڕازی بێت) ووتی: ئەی عێراقییەکان چەند پرسیا لەشتی بچووك و سادە دەکەن، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا لە هەموو کەس زیاتر گوناهی گەورە ئەنجام دەدەن؟ گوێم لە (عبدالله) ی کوڕی (عومەر) بوو دەیوت: لە پێغەمبەر (ﷺ) م بیستووە دەیفەرموو: بێگومان فیتنە ئالێرەوە دێت _ بەدەستی ئاماژەی کرد بۆ خۆرهەڵات_ لەوەێوە هەردوو شاخی شەیتان هەڵ دێت))، ئێوەیش لەناو خۆتاندا هەندێکتان لە گەردنی هەندێکتان دەدەن، حەزرەتی موسا(علیه السلام) ئەو زەلامەی کە کوشت لە دەست و پێوەندی فیرعەون، بەهەڵە کوشتی، کەچی خوای بالادەست پێی فەرموو: (زەلامێکت کوشت کەچی ئێمە لەدەست خەم و خەفەت تۆمان ڕزگارکرد، تۆمان توشی جۆرەها تاقی کردنەوەی سەخت کرد)(طه:٤٠).[١٩٨]

---

[١٩٨] - رواه مسلم في كتاب الفتن باب الأول.

ـسا(علیه السلام) وای لێکدایەوە کە بەو کارە ستەمێکی ئەنجام داوە.

بەڵام ئەوەی کە لە سوورەتی (الشعراء) دا هاتووە، ڕوونکردنەوەی ئەو گفتوگۆیە بوو کە لەنێوان موسا و فیرعەوندا ڕوویدا.

فیرعەون پێی وت _کە ئەمە ماناکەیەتی _: (کاتێك موسا و هارون پەیامی خوایان گەیاند، فیرعەون بە موسای وت: (ئەمە پاداشتی پیاوەتی یە) ئایا ئێمە بەمنداڵی بەخێومان نەکردیت؟ چەندەها ساڵی تەمەنت لەناوماندا نەبردە سەر؟. .. (١٨) ئەوەیش کە کردت (مەبەستی کوشتنی قبطي يەکەیە)دیارە کەتۆ لە ڕیزی ئەو کەسانەدایت کە ناشوکرن و پاداشتی پیاوەتی نازانن. ..)﴿فَأَصْبَحَ فِي الْمَدِينَةِ خَائِفاً يَتَرَقَّبُ فَإِذَا الَّذِي اسْتَنصَرَهُ بِالْأَمْسِ يَسْتَصْرِخُهُ قَالَ لَهُ مُوسَى إِنَّكَ لَغَوِيٌّ مُّبِينٌ(١٨) فَلَمَّا أَنْ أَرَادَ أَن يَبْطِشَ بِالَّذِي هُوَ عَدُوٌّ لَّهُمَا قَالَ يَا مُوسَى أَتُرِيدُ أَن تَقْتُلَنِي كَمَا قَتَلْتَ نَفْساً بِالْأَمْسِ إِن تُرِيدُ إِلَّا أَن تَكُونَ جَبَّاراً فِي الْأَرْضِ وَمَا تُرِيدُ أَن تَكُونَ مِنَ الْمُصْلِحِينَ﴾(الشعراء: ١٨-١٩).

ئینجا موسا پێی وت _کە ئەمە ماناکەیەتی _ (موسا وتی: _ ئەو کاتە ئەوەم کرد لەنەزانەکان بووم (نەمدەزانی بەوە دەمرێت)﴿وَجَاء رَجُلٌ مِّنْ أَقْصَى الْمَدِينَةِ يَسْعَى قَالَ يَا مُوسَى إِنَّ الْمَلَأَ يَأْتَمِرُونَ بِكَ لِيَقْتُلُوكَ فَاخْرُجْ إِنِّي لَكَ مِنَ النَّاصِحِينَ﴾ (الشعراء:٢٠).

بە ڕاستی موسا (علیه السلام) ڕویکردە پەروەردگاری لەدوای ئەم تاقیکردنەوەیە و داوای تەوبە و گەڕانەوەی کرد و خوای گەورەیش لێی خۆش بوو.

ئینجا موسا دڵ ئارام و دڵنیا دەبێت کە خوای گەورە وەڵامی دوعاکەی داوەتەوە، پاشان خوای گەورە لەسەر زمانی موساوە دەفەرموێت: ﴿قَالَ رَبِّ بِمَا أَنْعَمْتَ عَلَيَّ فَلَنْ أَكُونَ ظَهِيراً لِّلْمُجْرِمِينَ﴾(القصص:١٧).

واتە: موسا(علیه السلام) هەستی کرد، پەروەردگاری نزاکەی گیرا کردووە بۆیە ووتی: پەروەردگارا مادام ئاوا ناز و نیعمەتی لێخۆشبونت بەسەردا ڕژاندم، من ئیتر هەرگیز نابمە پشتیوان بۆ تاوانکاران).

ئیتر موسا بڕیاریدا کەلەناو ڕیزی ستەمکاراندا نەمێنێت و پشتیوانیان لێ نەکات، کە پاك بونەوەیە لەتاوان بە هەموو جۆرەکانییەوە، ئەوەیش نیعمەتێکی گەورە بوو کە خوای گەورە دوعا و نزاکەی لێ قبولْ کرد د، هەروەها نیعمەتی هێز و حیکمەت و زانستی پێ بەخشی).[١٩٩]

## ترس...چاوگێڕان...وونبون...هەڵهاتن

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿فَأَصْبَحَ فِي الْمَدِينَةِ خَائِفًا يَتَرَقَّبُ فَإِذَا الَّذِي اسْتَنصَرَهُ بِالْأَمْسِ يَسْتَصْرِخُهُ قَالَ لَهُ مُوسَىٰ إِنَّكَ لَغَوِيٌّ مُّبِينٌ﴾(القصص:١٨).

کاتێك موسا(علیه السلام) بەناو یەکێك لە شەقامەکانی ئەو شارەدا دەڕۆیشت ﴿خَائِفًا يَتَرَقَّبُ﴾ چاوی بەو کەسە ئیسرائیلییە کەوت کە ڕۆژی پێشتر داوای کۆمەکی و یارمەتی لێکردبوو﴿فَإِذَا الَّذِي اسْتَنصَرَهُ بِالْأَمْسِ يَسْتَصْرِخُهُ﴾ واتە: داوای کۆمەکی و فریاکەوتنی لێدەکات، کە پشتیوانی لێ بکات بەسەر کەسێکی (قبطي)تردا، کاتێك موسا چاوی بەم هەڵوێستە کەوت، ئەوەی بیرکەوتەوە کە ڕۆژی پێشتر ڕویدا بوو، ئینجا بە کابرا ئیسرائیلییەکەی ووت: ﴿ إِنَّكَ لَغَوِيٌّ مُّبِينٌ﴾ واتە: (بەڕاستی تۆ کابرایەکی شەڕەنگێز و گێچەڵگێڕی ئاشکرایت). بێگومان تۆ بویتە هۆکار بۆ کوشتنی کەسێکی (قبطي) هەر ڕۆژێك لەمەوپێش، ئیستایش دەتەوێت من پشتیوانیت بکەم ئەمڕۆ لە(قبطي) یەکی تر بدەم و بیکوژم، وەك هاوڕێیەکەی کە دوێنێ مرد!!

﴿فَلَمَّا أَنْ أَرَادَ أَن يَبْطِشَ بِالَّذِي هُوَ عَدُوٌّ لَّهُمَا قَالَ يَا مُوسَىٰ أَتُرِيدُ أَن تَقْتُلَنِي كَمَا قَتَلْتَ نَفْسًا بِالْأَمْسِ إِن تُرِيدُ إِلَّا أَن تَكُونَ جَبَّارًا فِي الْأَرْضِ وَمَا تُرِيدُ أَن تَكُونَ مِنَ الْمُصْلِحِينَ﴾(القصص:١٩).

---

[١٩٩] - في ظلال القرآن ٥/ ٢٦٨٢ بە دەستکاریەوە.

و ه: (کاتێك موسا(علیه السلام) هێرشی بکاتە سەر ئەوەی کە دوژمنی هەردوکیانە (واتە: قبطي یەکە)، کابرا وتی: ئەی موسا دەتەوێت منیش بکوژێت، وەك ئەو کەسەی کە دوێنێ کوشتت، دیارە تۆ هەر دەتەوێت ببیتە زۆردار لە زەویدا، ناتەوێت بچیتە ریزی ئەو کەسانەوە کە چاکەکارن).

## پیاوەتی و لێهاتویی

فیرعەون زانی کە موسا بووە ئەو کەسە (قبطي)یەی کوشتوە، ئینجا ناردی بەدوایدا کە بگیرێت، ئا لێرەدا کەسێکی پیاوچاك بەپەلە بەرەو موسا (علیه السلام) دێت، تا لە سزا و هەڕەشەی فیرعەون ئاگاداری بکات و پێی بڵێت کە ئەو شارە جێ بهێڵێت و بڕوات.

خوای گەورە فەرموی: ﴿وَجَاءَ رَجُلٌ مِنْ أَقْصَى الْمَدِينَةِ يَسْعَى قَالَ يَا مُوسَى إِنَّ الْمَلَأَ يَأْتَمِرُونَ بِكَ لِيَقْتُلُوكَ فَاخْرُجْ إِنِّي لَكَ مِنَ النَّاصِحِينَ(٢٠) فَخَرَجَ مِنْهَا خَائِفًا يَتَرَقَّبُ قَالَ رَبِّ نَجِّنِي مِنَ الْقَوْمِ الظَّالِمِينَ(٢١) وَلَمَّا تَوَجَّهَ تِلْقَاءَ مَدْيَنَ قَالَ عَسَى رَبِّي أَنْ يَهْدِيَنِي سَوَاءَ السَّبِيلِ﴾(القصص:٢٠-٢٢).

واتە: (دوای ماوەیەك) لەو پەڕی شارەوە پیاوێکی (ئیماندار کە لەخزمانی فیرعەون بوو) بە پەلە هات و وتی: موسا (فریای خۆت بکەوە) بەڕاستی دار و دەستەی فیرعەون دانیشتون ونەخشە دەکێشن تا بتکوژن، تا زووە دەرچۆ و ئێرە بەجێبهێڵە، بێگومان من لە دڵسۆزانم بۆتۆ (٢٠) موسا لەشار دەچوو بەترس و بیمەوە، هەر سەیری ئەملاولای خۆی دەکرد، لەبەر خۆیەوە دەیوت: پەروەردگارا لەدەست قەومی ستەمکار ڕزگارم بکە (٢١) کاتێك ڕوویکردە شاری مەدیەن (دووبارە ڕوویکردە پەروەردگاری و) وتی: ئومێدەوارم کە پەروەردگارم ڕێنموییم بکات بۆ شوێن و جێگەیەکی ڕاست و دروست (دوور لەکێشە و ناخۆشی)).

ئەم پیاوە چاکەکارە هات بەڕاستی جوانترین و ناوازەترین نموونەی لە پیاوەتی و لێهاتوویی و شەهامەت هێنایەوە.

(إبن عطية) دەڵێت: موسا ئەو ڕێگایەی نەدەزانی و کەسیشی لەگەڵدا نەبوو، بە نەشارەزایی خۆی و متمانە و پشتیوانی خوا ڕێگای گرتە بەر و پشتی بەخوا بەست و وتی: ﴿عَسَىٰ رَبِّي أَن يَهْدِيَنِي سَوَاءَ السَّبِيلِ﴾لەمەدا بەڵگە لەسەر ئەوە هەیە کە خوای گەورەی جوان ناسیوە.

## موسا ( عليه السلام ) لە مەدیەندا

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿ وَلَمَّا وَرَدَ مَاءَ مَدْيَنَ وَجَدَ عَلَيْهِ أُمَّةً مِّنَ النَّاسِ يَسْقُونَ وَوَجَدَ مِن دُونِهِمُ امْرَأَتَيْنِ تَذُودَانِ قَالَ مَا خَطْبُكُمَا قَالَتَا لَا نَسْقِي حَتَّىٰ يُصْدِرَ الرِّعَاءُ وَأَبُونَا شَيْخٌ كَبِيرٌ﴾(القصص:٢٣).

پاش گەشت و ڕۆشتنێکی دوور و درێژ کە موسا بەقاچەکانی ئەنجامیدا نزیکەی هەشت ڕۆژی پێچوو. ئینجا موسا(عليه السلام) گەیشتە شاری (مەدیەن) کە لەوپەڕی هیلاکی و ماندویەتیدا بوو و زۆریشی برسی بوو بوو، کاتێك گەیشتە سەر ئاوەکەی مەدیەن، کە بیرێك بوو ئاویان لێ دەردەهێنا، کۆمەڵێك خەڵکی لەسەر ئەو بیرە ئاوە بینی کە کۆمەڵیان کردبوو لەدەوری ئاوەکە، لە هەموو جۆرە خەڵکێکی تیابوو، ئاویان بۆ خۆیان و ئاژەڵەکانیان لەبیرەکە دەردەهێنا.

﴿وَوَجَدَ مِن دُونِهِمُ امْرَأَتَيْنِ تَذُودَانِ﴾. هەروەها دوو ئافرەتیشی بینی کە بەریان لە ماڵاتەکەیان گرتبوو تا نەیەنە سەر ئاوەکە و ماڵاتەکەیان تێکەڵاوی ماڵاتی قەومەکە نەبێت.

## پیاوەتی.. و هێز. .. و دڵسۆزی بۆ کار

﴿قَالَ مَا خَطْبُكُمَا﴾؟

(الخطب) کارێکی گەورەو گرنگە، واتە: ئێوە کارتان چییە و بۆچی لێرە وەستاون؟

بێگومان موسا ئەوەی لەبیرچوییەوە کەچەندێك ماندو ناڕەحەت و برسی و هیلاکە، لێرەشدا هەموو غەمی بۆئەو دوو ئافرەتە بوو کە هاتوون بۆ کارێکی قورس وگران ! مەڕکانیان بەر گرتووە تا تێکەڵ نەبن لەگەڵ قەومەکە و قەرەباڵغیەکەدا! موسا(علیه السلام)یەکسەر زانی کەئەم دوو ئافرەتە، پێویستیان بە یارمەتیدان و بەدەمەوە چوون هەیە، ئینجا هەستا چوو بۆلایان، وپرسیاری لێ کردن، ئێوە کارتان چیەو بۆچی هاتوون و وەستاون؟ ئەوانیش وەلامیان دایەوە و وتیان: ﴿قَالَتَا لَا نَسْقِي حَتَّى يُصْدِرَ الرِّعَاءُ وَأَبُونَا شَيْخٌ كَبِيرٌ﴾(القصص\٢٣).

وەلامێکی کورت بوو بەلام زۆر بەهێزو پڕمانا بوو و باسی حاڵی خۆیان کرد لەگەڵ حاڵی باوکیان. واتە: (ئێمە ناتوانین مالاتەکەمان ئاو بدەین هەتا شوانەکان نەڕۆن و چۆڵی نەکەن باوکیشمان پیرەمێردێکی بەسالاچووە). بەڕاستی ئەو کارە شیاوی ئەوان نیە کە تێکەلاوی ئەو خەڵکە زۆرە بن و ناگونجێت و هەروەها باوکیشیان ئەو توانایەی نییە کە خۆی بێت مالاتەکە ئاو بدات چونکە بەتەمەنە و لەڕووی جەستەیی یەوە لاواز و بێهێزە لەبەر ئەوە پێویستی کردووە کە ئەو دوو کچەی بنێرێت. ﴿فَسَقَى لَهُمَا ثُمَّ تَوَلَّى إِلَى الظِّلِّ فَقَالَ رَبِّ إِنِّي لِمَا أَنزَلْتَ إِلَيَّ مِنْ خَيْرٍ فَقِيرٌ﴾(القصص\٢٤). واتە: (موسا (علیه السلام) مەردانە شوانەکانی بڕداو مالاتەکەیانی ئاودا و بەڕێی کردن، دوایی پشتی تێ کردن و چووە ژێر سێبەرەکە و نزای کردو وتی: پەروەردگارا بەڕاستی تۆ خێر و بێری زۆرت بەسەردا ڕژاندووم، بەلام هێشتا هەژارم و ئاتاجی بەخششی زیاترم).

زانا (ابن کثیر) دەڵێت: (زانایانی تەفسیر وتویانە: کاتێك شوانەکان لەئاودانی مالاتەکەیان تەواوبوون، بەردێکی گەورەیان خستە سەر دەمی بیرەکە، ئینجا ئەم دوو ئافرەتە هاتن بەر لەمەڕو مالاتەکەی خۆیان دەگرن تا تێکەلاوی مالاتی خەڵکی تر نەبن، لەوکاتەدا موسا (علیه السلام) هات و بەتەنها ئەو بەردەی لابرد، پاشان ئاوی بۆ دەرهێنان و بەشی ئاودانی مالاتەکەیشی بۆدەرهێنان، پاشان بەردەکەی خستەوە جێگەی خۆی وەك پێشتر کەچۆن بوو.(امیر المؤمنین) عمری کوڕی خطاب (خوالێی ڕازی

بێت) دەڵێت: (ئەوبەردە بە دە کەس نەبوایە لانەدەبرا، موسا تەنها یەك بەتڵی بۆ دەرهێنان کە بەشی کردن).[٢٠٠]

بەپێی ڕواڵەتی ئایەتەکان بیرەکە سەری بەتاڵ بووە، و موسا (علیه السلام) پیاوەکانی لەسەر دوورخستەوە تا ماڵاتەکەی بۆئەوان ئاودا، بێگومان هێز و قوەتی موسا لەو کاری ئاودانەدا دەرکەوت، ئەویش لەماوەیەکی کەمدا، لەگەڵ ئەوەی کە زۆر ماند و برسی بوو. پاش تەواوکردنی کارەکە موسا بۆ ئیسراحەت و حەوانەوە لایدایە ژێر سێبەری دارێك، ئەوە دەگەیەنێت کە زۆر ماندو بوە و کاتەکەیش گەرم بووە.

خاوەنی (في ظلال) دەڵێت: (لەم شوێنەدا وتەو دەربڕینێکی جوان هەیە، وەك دەڵێت: (ئەو پەنای برد بۆ سێبەرێکی ماددی کە گیانی عارەقاوی و تەڕبوو، هەروەها پەنای برد بۆ سێبەرێکی فراوانتر و درێژکراوەتر، کە سێبەری خوای گەورە و میهرەبان بوو، کەسێبەری بۆ دڵ و ڕۆحی کردبوو. ﴿رَبِّ إِنِّي لِمَا أَنزَلْتَ إِلَيَّ مِنْ خَيْرٍ فَقِيرٌ﴾ پەروەردگار ئێستا من لە کۆچدام، پەروەردگارا من هەژارم، پەروەردگارا من لاواز و تەنهام. ....لەم دەربڕینانەوە شتێك دەبیستین: ئەویش نەرم و نیانی ئەم دڵ ودەرونە و پەنابردن بۆ پەنایەکی ئەمین و ئارام پەناگەیەکی بەهێز و سێبەرێکی درێژ و فراوان، پاڕانەوەیەکی نزیك وچپەیەکی نەرم و پەیوەندیەکی قوڵ دەبیستین﴿رَبِّ إِنِّي لِمَا أَنزَلْتَ إِلَيَّ مِنْ خَيْرٍ فَقِيرٌ﴾.[٢٠١]

نەفسەکان هەموویان هەژارن وپێویستییان بە خوا هەیە لە هەموو حاڵێکدا. خوای گورە دەفەرموویێت: ﴿وَاللَّهُ الْغَنِيُّ وَأَنتُمُ الْفُقَرَاءُ﴾(محمد\٣٨). واتە: (خوای گەورە دەوڵەمەندەو ئێوە هەژارن).

هەندێك لەزانایانی تەفسیر وتویانە: موسا(علیه السلام) بەم دوعایە باسی حاڵی خۆی ئاشکرا کرد لەبەردەم هەردوو کچەکەدا تا بەحاڵی بزانن).[٢٠٢]

بەڵام ڕاستتر ئەوەبوو کە موسا(علیه السلام) بەو دوعایە ڕووی کردە خوای گەورە کە بە نهێنی لە خوای گەورە پاڕایەوە ودڵسۆزی تیا دەربڕی و تکای وابوو دوعاکەی وەرگیراو

---

[٢٠٠] - قصص الأنبياء لابن كثير ص ٣٠٢.

[٢٠١] - في ظلال القرآن ٥\٢٦٨٦ بەدەستکاریەوە.

[٢٠٢] - قصص الأنبياء ص ٣٠٢\.

بێت، خوای گەورە مەدحی بەندەی خۆی زەکەریا دەکات و دەفەرموێت: ﴿ذِكْرُ رَحْمَةِ رَبِّكَ عَبْدَهُ زَكَرِيَّا (٢) إِذْ نَادَى رَبَّهُ نِدَاءً خَفِيًّا﴾(مريم:٢-٣).

واتە: (ئەی پێغەمبەر (ﷺ) ئەم باسە، باسی ڕەحمەتی پەروەردگارتە دەربارەی بەندی خۆی زەکەریا، کاتێك لە(پەرستگای خۆیدا) هاناو هاواری برد بۆپەروەردگاری بەنهێنی).

## سوپاسی چاکەکردن...و بانگهێشتی بەڕێزانە.....و شێوازێك لە نایابترینی شێوازەکانی شەرم و حەیا

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَجَاءَتْهُ إِحْدَاهُمَا تَمْشِي عَلَى اسْتِحْيَاءٍ قَالَتْ إِنَّ أَبِي يَدْعُوكَ لِيَجْزِيَكَ أَجْرَ مَا سَقَيْتَ لَنَا فَلَمَّا جَاءَهُ وَقَصَّ عَلَيْهِ الْقَصَصَ قَالَ لَا تَخَفْ نَجَوْتَ مِنَ الْقَوْمِ الظَّالِمِينَ﴾(القصص\٢٥).

موسا (علیه السلام) بۆ ماوەیەکی کەم لەژێر سێبەری دارەکەدا مایەوە بیری لەنیعمەتەکانی خوای گەورە دەکردەوە بەسەر خۆیەوە، بەکوڵ لەخوای گەورە دەپاڕایەو کە دەروی خێری لێ بکاتەوە، لە کاتێکدا کەئەو لەو حاڵەتەدا بوو، یەکێك لە دوو ئافرەتە گەنجەکە دێتەوە بۆلای موسا، داوای لێ دەکات کە وەڵامی بانگخوازیەکەی بداتەوە، تا لەسەر ئەو کارە خەیرەی پاداشتی خۆی وەربگرێت لەسەر ئەو کارە خەیرو چاکەیە، ئەوەش کاتێك بوو کە هەردوو ئافرەتەکە بەپەلە گەڕانەوە بۆلای باوکیان، هەمیشە عادەتیان وابوو کە بە هێواشی دەچوون بۆ ئاودانی ماڵاتەکەیان، ئینجا ئەوەیان بۆ باسکرد کە لەو پیاوەدا بینیان، کە مەڕو ماڵاتەکەی بۆ ئاودابوون، ئینجا باوکیان فەرمانی کرد بە یەکێك لە کچەکانی کە موسای بۆبانگ بکات. ﴿فَجَاءَتْهُ إِحْدَاهُمَا تَمْشِي عَلَى اسْتِحْيَاءٍ﴾ واتە: ئافرەتەکە زۆر بەشەرم وحەیاوە دەڕۆیشت بەڕێگادا. بەڕاستی گەورەترینی جۆری شەرم و حەیا بووە. ئەم ئافرەتە هات بۆ لای موسا (علیه السلام) کە

بەحەیاو شەرمەوە دەڕۆشت تەنها هەنگاوێکیش بەم لاو لادا لای نەدەدا، هەروەك چۆن لە ڕۆیشتنەکەیدا بەشەرم و حەیا بوو، هەر بەو شێوەیەش لە قسەکردندا بەشەرم وحەیا بوو. یان بە مانایەکی تر: وەك ئەوەی ڕۆیشتنەکەی لەسەر شێوەیەکی گەورەی شەرم وحەیا بوو بێگومان قسەکردن و دەربڕینەکەیشی بەڵگە بوو لەسەر زمانپاراوی وشێوازی جوانی لە قسەکردندا، کاتێك لە دەستەواژەیەکی کورتدا بەوپەڕی بەهێزی وتی: ﴿إِنَّ أَبِي يَدْعُوكَ لِيَجْزِيَكَ أَجْرَ مَا سَقَيْتَ لَنَا﴾.

(ابن کثیر) دەربارەی ئەم ئایەتە دەڵێت:واتە: تا پاداشت و خەڵاتت بکات لەسەر ئەوەی کە مالاتەکەت بۆ ئاوداوین، بە شێوازێکی ڕەها داوای لێ نەکرد، تا وەهمی گومانی لێ نەکات).[203]

موسا (علیه السلام) وەڵامی بانگهێشتەکەی پیاوەچاکەکە دەداتەوە.
موسا (علیه السلام) وەڵامی بانگ کردنەکەی دایەوە.
موسا (علیه السلام) لەگەڵ ئەم ئافرەتە بە حەیا و شەرمەدا ڕۆیشت بۆ لای باوکی، لە (ابن عباس)ەوە (خوالێی ڕازی بێت) ڕیوایەت کراوە، فەرمویەتی: موسا لە سەرەتادا وتی: تۆ وەرە دوای منەوە، بە ڕاستی من پیاوێکی عیبرانیم، سەیری پشتی ئافرەتان ناکەم و ڕێگاکەم پیشان بدە بەلای ڕاست و بەلای چەپدا.[204]

## شنەبایەکی بۆنخۆش

﴿فَلَمَّا جَاءَهُ وَقَصَّ عَلَيْهِ الْقَصَصَ قَالَ لَا تَخَفْ نَجَوْتَ مِنَ الْقَوْمِ الظَّالِمِينَ﴾. موسا لەگەڵ کچەکەدا ڕۆیشت، چوو بەدەم بانگهێشت کردنەکەوە کە باوکی کچەکە ناردبوی بەدوایدا، کە نیشانەی چاکی موسا لەسەر کچەکانی دەرکەوت، ئەوەش لە ئەدەب وشەرم و حەیاو چاکەدا بوو، ئافرەتەکەیش زمانپاراو بوو بە جوانی قسەکەی بۆ موسا ڕونکردەوە و پێی گەیاند.

[203] - تفسیر ابن کثیر ٣\٣٨٤ بەدەستکارییەوە.

[204] - قصص الأنبیاء لابن کثیر ص٣٠٢ وتفسیر القرطبي ١٣\٢٧١ والکشاف ٣\٤٠٣ ومفاتیح الغیب٢٤\٢٤١.

بێگومان خاوەن ماڵ بە جوانی پێشوازی لە میوانەکەی کرد و ڕێزی لێ گرت، موسایش لەو ماڵەدا هەستی بە ئارامی و ئاسایش و حەوانەوە و دڵ ئارامی و بەختەوەری و سەکینەت کرد، ئینجا چیرۆکەکەی لە سەرەتاوە تا ئەو شوێنە بۆ گێڕایەوە کە گەیشتوەتە مەدیەن و لەدەست فیرعەون هەڵهاتووە، ئینجا پیاوە دانا و چاکەکارەکە بە موسای وت: ﴿لَا تَخَفْ نَجَوْتَ مِنَ الْقَوْمِ الظَّالِمِينَ﴾.

واتە: ئەی موسا دەرونی خۆت پاك کەرەوە و بێخەم بە، ئێستا تۆ لەشوێنێکی ئەمین وئارامدایت و ڕزگارت بووە لەدەست فیرعەون و دارو دەستە یاخی و لەسنور دەرچووەکەی (إبن کثیر) دەربارەی ئەم ئایەتە دەڵێت: وتی:تۆ لە دەستەلاٌتی فیرعەون دەرچوویت و ئێستا لە دەوڵەت و شاری ئەواندا نەماویت).[٢٠٥]

﴿قَالَتْ إِحْدَاهُمَا يَا أَبَتِ اسْتَأْجِرْهُ إِنَّ خَيْرَ مَنِ اسْتَأْجَرْتَ الْقَوِيُّ الْأَمِينُ﴾(القصص:٢٦).

یەکێك لە کچەکان داوای کرد لە باوکی کە موسا بەکرێ بگرێت بۆ کارکردن و باسی گرنگترین سیفەتی کرد کە لەموسادا بوو﴿إِنَّ خَيْرَ مَنِ اسْتَأْجَرْتَ الْقَوِيُّ الْأَمِينُ﴾. واتە: (چونکە بەڕاستی چاکترین کەسێك کە تۆ بیگریت بە کرێ، ئەم پیاوە بەهێز و ئەمین و دەست پاك و دەرون پاکەیە).

زانا (الرازی) دەڵێت: (... کچەکە موسای بە بەهێز باسکرد ئەویش لەو کاتەدا کە بینی مالاٌتەکەی بۆ ئاودان، هەروەها بە ئەمین و دەست پاك، لەوەدا کە گێڕامانەوە چاوی پاراستبوو لە ڕۆیشتندا و لەو کاتەدا قسەی لەگەڵ هەردوو کچەکەدا کرد، کە کارەکەیان چی یە و، چوو بۆ یارمەتیدانیان و ئەو کاتەیش کە لەپێش ئافرەتەکەوە دەڕۆیشت بۆلای باوکی.[٢٠٦]

[٢٠٥]- قصص الأنبياء لابن كثير ص/٣٠٢.

[٢٠٦]- مفاتيح الغيب ٢٤\٢٤٢.

پێشتر باسمان کرد کە پیرەکە سەری دانەپۆشرابوو، لەوەدا ڕونمان کردەوە کە هێزی موسا (علیه السلام) لەوەدا دەرکەوت کە مالاتەکەی لەماوەیەکی کەمدا بۆ ئاودان، لەگەڵ ئەوەی کە هیلاك و ماندوو برسی بوو.

پیاو چاکەکە پێشنیاری ژنهێنانی خستە بەردەم موسا (علیه السلام)کە یەکێك لەکچەکانی خۆی لێ مارە بکات.

خوای گەورە فەرمووی: ﴿قَالَ إِنِّي أُرِيدُ أَنْ أُنكِحَكَ إِحْدَى ابْنَتَيَّ هَاتَيْنِ عَلَى أَن تَأْجُرَنِي ثَمَانِيَ حِجَجٍ فَإِنْ أَتْمَمْتَ عَشْرًا فَمِنْ عِندِكَ وَمَا أُرِيدُ أَنْ أَشُقَّ عَلَيْكَ سَتَجِدُنِي إِن شَاءَ اللَّهُ مِنَ الصَّالِحِينَ(٢٧) قَالَ ذَٰلِكَ بَيْنِي وَبَيْنَكَ أَيَّمَا الْأَجَلَيْنِ قَضَيْتُ فَلَا عُدْوَانَ عَلَيَّ وَاللَّهُ عَلَى مَا نَقُولُ وَكِيلٌ﴾(القصص:٢٧-٢٨).

واتە: (باوکی کچەکان پێشنیارەکەی پێ باش بوو بۆیە وتی: من پێم چاکە بتکەم بەکوڕی خۆم(بە زاوای خۆم) یەکێك لەم دووکچەت لێ مارە بکەم، بەمەرجی ئەوەی هەشت ساڵ لای من کار بکەیت، خۆ ئەگەر دەساڵیشت بردە سەر ئەوە چاکەی خۆتە، منیش نامەوێت بێزارت بکەم و زۆرت بۆ بهێنم، دەمبینیت ئەگەر خوا بیەوێت لەچاکان دەبم، موسا(علیه السلام)پێشنیارەکەی لاپەسەند بوو، بۆیە وتی: ئەم پەیمانە لەنێوان من وتۆدایە، من پێی ڕازیم، بەلام هەرکام لەوماوانەم بۆ تەواوکرا، باستەمم لێ نەکرێت و ئازاد بم، خوای گەورەش شایەت و ئاگایە بەوەی کە دەیڵێین و بڕیاری لەسەر دەدەین).

بەڕاستی ئەم پیاو چاکە باوکێکی دڵسۆز بوو بۆکچەکانی. وکەسێك بوو خاوەنی شارەزایی و زانایی بوو بە کار و بارەکانی دنیا و پێشنیاری هاوسەرداری کرد بۆموسا و ئیختیاریشی دایە دەست خۆی، کامیانی بەدڵە بۆخۆیی هەڵبژێرێت.

وتراوە: بچوکەکەیانی خواست، وتراویشە: گەورەکەیانی خواست، بەلام ئەوەی ئێمە بە گونجاوی دەبینین-خوازاناترە – ئەوەیانی کردە هاوسەری کە هاتبوو بۆ لای موسا و بانگهێشتی کرد بۆ لای باوکی و داوای لە باوکی کرد کە بەکرێی بگرێت. ئایەتی: ﴿عَلَى أَن تَأْجُرَنِي ثَمَانِيَ حِجَجٍ فَإِنْ أَتْمَمْتَ عَشْرًا فَمِنْ عِندِكَ وَمَا أُرِيدُ أَنْ أَشُقَّ عَلَيْكَ سَتَجِدُنِي إِن شَاءَ اللَّهُ مِنَ الصَّالِحِينَ﴾(القصص:٢٧).

ئەم پیاوە پێشنیاری ژنهێنانی خستە بەردەم موسا بەرامبەر کارکردنی هەشت ساڵ یان دەساڵ (وەك ئەوەی کەژنهێنان و مارە بڕینەکە ئەسڵ بوو بێت لە داواکاریەکەدا بەبێ بەکرێ گرتن، ئەمەش هەست کردنی باوکێکە بە گرنگی دانی بە موسا(علیە السلام) و مەبەستی خەیر بووە بۆی).[٢٠٧]

بێگومان نەرمی نواندن و لێبوردەیی و ئسانکاری لەنیشانەو سیفەتی پیاوچاکانە. بەڵێنی دا بەموسا کەئاسانکاری بۆ بکات و زۆری لێ نەکات لەسەر کارکردن، کەبەکرێی گرتبوو بۆ لەوەڕاندنی مەڕو ماڵات، ئەو کارێك ناکات کە کەسە کارگران و ئیش قورسەکان دەیکات، ڕەچاوی کاتی کارکردنی کرد، موسایش پێشنیاری ئەوەی کرد کە کەسێکی چاکەکار دەبێت و بەجوانی مامەڵەیان لەگەڵدا دەکات و چاك دەبێت بۆیان و نەرم ونیان دەبێت، ڕەنگە موسا ئەوەی دەربڕیبێت کە بە شێوەیەکی گشتی و لە هەموو بوارێکدا چاکەکار بێت.[٢٠٨]

## موسا ( علیه السلام ) ئەم پێشنیارەی قبوڵکرد و یەکێك لە کچەکانی خواست

خوای گەورە فەرمووی: ﴿ قَالَ ذَٰلِكَ بَيْنِي وَبَيْنَكَ أَيَّمَا الْأَجَلَيْنِ قَضَيْتُ فَلَا عُدْوَانَ عَلَيَّ وَاللَّهُ عَلَىٰ مَا نَقُولُ وَكِيلٌ ﴾(القصص:٢٨).

(قَالَ ذَٰلِكَ) ئاماژە بوو بۆ ئەو بەڵێنەی کە پیاوچاکەکە ی شاری مەدیەن بە موسای وت. ئینجا موسا وتی: ئەوەی کەتۆ پێشنیارت کرد و بەڵێنت پێدام بائەوە لەنێوانماندا بێت و لێی دەرناچین، جامن هەرکام لەهەشت ساڵەکە یان دەساڵەکە بەرمەسەر بۆتۆ، من

---

[٢٠٧] - القصص القرآني عمادزهير ص\٢٢٧ بەدەستکاریەوە.

[٢٠٨] - الكشاف للزمخشري ٣\٤٠٥ بەکورتی.

تاوانم لەسەر نابێت و ناچار و نارەحەت ناکرێم.[٢٠٩] ﴿وَاللَّهُ عَلَىٰ مَا نَقُولُ وَكِيلٌ﴾. خوای گەورە وەکیل و ئاگادار و چاودێرە.

ئینجا موسا(علیه السلام) یەکێك لەکچەکانی خواست.

ماوەی بەکرێ گرتنەکەیش لەسەر خێرو چاکە بەڕێوە چوو، موسا (علیه السلام) کەسێکی بەهێزو ئەمین و بەوەفا بوو بەرامبەر وەعد و بەڵێن، و پیاوچاکەکە ی شای مەدیەنیش پیاوێکی نەرم ونیان و بەڕەحم و بەخشندە و بەڕێز بوو، پەیمانی خۆی بردەسەر.

## گەڕانەوەی موسا ( علیه السلام ) لەگەڵ هاوسەرەکەیدا بۆ میسر و کارێکی کوت و پڕ لە ڕێگاکەیاندا

موسا (علیه السلام) بیری کەس و کار و نیشتمانەکەی دەکرد، ئینجا بڕیاری دا کە لە مەدیەن کۆچ بکات پاش ئەوەی کەماوەی کارەکەی تەواو کرد کە دەساڵ دەبوو، ئینجا هەواڵی دا بە خێزانەکەی کە ئەو مەبەستی ئەو کارەی هەیە، ئەویش وەڵامی دایەوە و گوێڕایەڵی فەرمانەکەی کرد، ئینجا کچەکە داوای مۆڵەت خواستنی کرد لە باوکی، ئینجا ئەویش مۆڵەتی بە هەردوکیان دا و دوعای خەیرو بەرەکەتی بۆ کردن، پاشان موساو هاوسەرەکەی خۆیان ئامادەکرد بۆ سەفەری گەڕانەوەیان بۆ میسر. .... پاش ماڵئاوایی و خواحافیزی گەرم لەپیاو چاکەکەی مەدیەن و ئەهل و کەس و کاری بەگشتی، موسا ڕووی کردەوە نیشتمانەکەی خۆی کەدەمێك بوو بیری دەکرد و حەزی بەگەڕانەوەی دەکرد و زۆر بیری دایك و خوشکەکەی وهارونی برایی وگشت کەس و کارەکەی تری دەکرد.

ئینجا موسا دەرچوو گەڕایەوە بەرەو ئەو نیشتمانەی کە بە ناچاری لێی هەڵهاتبوو لەترسی سزای دەست فیرعەون ودار و دەستەکەی.

دوای ئەوەی کەنمونەیەکی جوانی لە پیاوەتی و وەفا پێشکەش کرد و ماوەکە ی تەواوکرد، گەڕایەوە.

[٢٠٩] - صفوة التفاسير ٤٣٢\٢ طبعة دار الصابوني الطبعة السابعة.

**خوای گەورە لە سوورەتی (القصص)دا دەفەرموێت:** ﴿فَلَمَّا قَضَى مُوسَى الْأَجَلَ وَسَارَ بِأَهْلِهِ آنَسَ مِن جَانِبِ الطُّورِ نَاراً قَالَ لِأَهْلِهِ امْكُثُوا إِنِّي آنَسْتُ نَاراً لَّعَلِّي آتِيكُم مِّنْهَا بِخَبَرٍ أَوْ جَذْوَةٍ مِّنَ النَّارِ لَعَلَّكُمْ تَصْطَلُونَ﴾(القصص\٢٩).

**لە سوورەتی (طه)دا دەفەرمویت:** ﴿وَهَلْ أَتَاكَ حَدِيثُ مُوسَى(٩) إِذْ رَأَى نَاراً فَقَالَ لِأَهْلِهِ امْكُثُوا إِنِّي آنَسْتُ نَاراً لَّعَلِّي آتِيكُم مِّنْهَا بِقَبَسٍ أَوْ أَجِدُ عَلَى النَّارِ هُدًى﴾(طه\٩-١٠).

**لە سوورەتی (النمل) دا دەفەرموێت:** ﴿إِذْ قَالَ مُوسَى لِأَهْلِهِ إِنِّي آنَسْتُ نَاراً سَآتِيكُم مِّنْهَا بِخَبَرٍ أَوْ آتِيكُم بِشِهَابٍ قَبَسٍ لَّعَلَّكُمْ تَصْطَلُونَ﴾(النمل\٧).

**موسی لەگەڵ خێزانەکەیدا لە مەدیەنەوە بەرەو میسر دەرچوون، کاتی زستانیش بوو کەش و هەوا سارد بوو، و شەویش تاریک و نوتەك بوو، و لە ڕێگاکەیش شارەزا و سەردەرچوو نەبوون.**

**لەم حاڵەتە قورس و نارەحەتەدا، موسا (علیە السلام) لە دوورەوە ئاگرێك دەبینێت، و دڵی پێی خۆش دەبێت، و داوا لە خێزانەکەی دەکات کە لە شوێنی خۆیاندا بمێننەوە، تا بەڵکو ئەو پریشکێکیان لەو ئاگرە بۆبهێنێت، و تاریکیەکەی پیّ ڕوناك بکەنەوە، یان پشکۆیەکی ئاگری داگیرساویان بۆ بهینێت، ئاگری پیّ بکەنەوە و خۆیانی پیّ ووشك و گەرم بکەنەوە، یان لای ئاگرەکە کەسێکی دەست بکەوێت کە هەواڵی لیّ وەربگرێت و دەربارەی ڕێگای مەبەست ڕێنمایی لیّ وەربگرێت. یان بچێت هەواڵی ئەو ئاگرە بزانێت بۆچی ئەو ناوەی ڕوناك کردوەتەوە و شوێنێکی چۆڵیشە؟ بەڵام کاتێك هات هەواڵێکی زۆر گەورەی دەست کەوت، کە ئەویش بریتی بوو لەوەی کە پەروەردگاری هەموو جیهان قسەو گفتوگۆی لەگەڵ کرد و گەورەترین وبەڕێزترین تەکلیفیشی خستە سەر شانی.**

**لە سوورەتی (طه)دا خوای گەورە فەرمووی:** ﴿لَّعَلِّي آتِيكُم مِّنْهَا بِقَبَسٍ أَوْ أَجِدُ عَلَى النَّارِ هُدًى﴾

**واتە: کەسێکم دەست بکەوێت کە هیدایەت و ڕێنموییم بکات، بەڵام هەر بەڕاستی هیدایەتی حەقیقی وەرگرت، کاتێك پەروەردگار قسەی لەگەڵدا کرد موسا (علیە السلام) لەدەربڕینەکەیدا ووشەی(لعل) ی بەکارهێنا، تانەوەکو بگەڕێتەوە و شتێکی دڵنیا کەری دەست نەکەوێت کە وەفای پیّ بکات، لەمەیشدا وانە و دەرسێکی گەورە و گرنگ هەیە**

بۆ دۆستانی کار و بارەکان و کاربەدەستان و دایکان و باوکان و هاوسەران وکەسانی تریش، کە نەگەڕێنەوە تا ئەومەبەستەی کە بۆی چوون جیٚ بە جێی بکەن، تا بتوانن وەفا بە کارەکەیان بکەن ئینجا بگەڕێنەوە.

هەروەها دەربڕین بە ﴿سَآتِيكُم﴾بە (سین) ی(تسویف) ئەمە دیاریکردنی بڕیارێك بوو لە موساوە بۆ کەس و کارەکە ی کە دێتەوە بۆ لایان ئەگەر درەنگیشی پیٚ بچێت و ماوەکەیش دووربێت.[210]

هەروەها کاتێك وتی﴿سَآتِيكُم﴾بەکۆ باسی کردن واتە هاوسەرەکە ی تەنها نەبوو، بەڵکو کەسی ترسشی لەگەڵدا بووە لەبەرئەوە دەربڕینەکە بە(جمع) کۆ زۆر گونجاو و لەبار بووە.[211]

ئێمەیش دەڵێین: نە لە قورئان نە لە سوننەتدا شتێك دەربارەی ئەوە نەهاتووە کە بەڵگەبێت لەسەر ئەوەی منداڵی لەگەڵدا بوبێت یان خزمەتکار یان لەحاڵەتی منداڵ بوندا بوبێت، ئەوەیش بەدوور ناگیرێت کە منداڵی لەگەڵدا بوبێت یان لەحاڵەتی منداڵ بوندا بوبێت –خوا زاناترە–.

بەڵام ئەوەی ئێمە دەیبینین لە نهێنی ئەوەدا کەبە(جمع) قسەی لەگەڵ کردن، ئەوەیە کە زانا (الطبرسي) بۆی چووە کە دەڵێت: ئەوە بۆدڵخۆش کردنی ئەو بووە تا ئارام بێت و نەترسێت لەو شوێنە تاریك وچۆڵەدا) هەروەها ڕێزگرتنیش بووە و بە گەورە تەماشا کردنی بووە، ئەمەیش پەیوەندی جوانی دەردەخات لەگەڵ هاوسەرەکەیدا.

هەروەها ئایەتەکە ووشەی (أو) ی تیا بەکارهێنراوە، بۆ ئەوە بووە، ئەگەر هەردوو کارەکەی بەیەکەوە دەست نەکەوت بەڵکو یەکێکیانی دەست بکەوێت، و لە متمانە و دڵنیاییدا بوو کەخوای گەورە دەروی لیٚ دەکاتەوە و ئاسانکاری بۆدەکات.

---

[210] - الكشاف ٣\٣٤٩ ومفاتيح الغيب ٢٤\١٨٩.

[211] - الميزان للطباطبائي ١٦\ ٣١-٣٢.

## وەحی و سروشی خوایی بۆ موسا ( علیه السلام )

**خوای گەورە لە سوورەتی (طه)دا دەفەرمویت:** ﴿ وَهَلْ أَتَاكَ حَدِيثُ مُوسَى(٩)إِذْ رَأَى نَارًا فَقَالَ لِأَهْلِهِ امْكُثُوا إِنِّي آنَسْتُ نَارًا لَعَلِّي آتِيكُم مِّنْهَا بِقَبَسٍ أَوْ أَجِدُ عَلَى النَّارِ هُدًى(١٠) فَلَمَّا أَتَاهَا نُودِيَ يَا مُوسَى (١١) إِنِّي أَنَا رَبُّكَ فَاخْلَعْ نَعْلَيْكَ إِنَّكَ بِالْوَادِ الْمُقَدَّسِ طُوًى(١٢) وَأَنَا اخْتَرْتُكَ فَاسْتَمِعْ لِمَا يُوحَى(١٣) إِنَّنِي أَنَا اللَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنَا فَاعْبُدْنِي وَأَقِمِ الصَّلَاةَ لِذِكْرِي﴾(طه ٩-١٤).

**واتە: (ئەی پێغەمبەر (ﷺ) ئایا هەواڵی بەسەرهاتی موسات پێ گەیشتوە؟ کاتێك ئاگرێکی بینی (لە گەڕانەوەیدا بۆ میسر، لە شوێنێکی سارد دا، لە بیابانی سینادا) بە خێزانەکەی وت: ئێوە لێرە بن، بەڕاستی من ئاگرێکم بەدی کردووە، (بابڕۆم) بەڵکو سەلکە بزوتکێکتان بۆ بهێنم، یان کەسێکم دەست بکەوێت ڕێنموییم بکات، جا کاتێك نزیکی ئاگرەکە بوویەوە، بانگی لێکرا: ئەی موسا، دڵنیابە من پەروەردگاری تۆم، کەواتە پێڵاوەکانت دابکەنە، چونکە بێگومان تۆ لە دۆڵی پیرۆزی _طوی_ دایت، منیش هەڵمبژاردویت (بۆ ڕابەرایەتی و پێغەمبەرایەتی) جا گوێ بگرە بۆ ئەو شتانەی لە ڕێگەی وەحی و نیگاوە پێت ڕادەگەیەنرێت، بەڕاستی هەر من (الله)م، من خوام هیچ خوایەك نی یە جگە لەمن، کەواتە هەرمن بپەرستە و نوێژەکانیشت بەچاکی ئەنجام بدە، تا هەمیشە منت لەیاد بێت، بێگومان ڕۆژی قیامەت بەڕێوەیە و هەر دێت، نزیکە بیشارمەوە، بۆ ئەوەی هەموو کەسێك بە گوێرەی کار و کردەوە و هەوڵ و کۆششی پاداشت بدرێتەوە).**

**بەڕاستی خوای گەورە قسەی لەگەڵ موسا (علیه السلام) کردو وەحی و نیگای بۆ نارد و پەیامی پێغەمبەرایەتیشی پێ دا و بە موعجیزە و نیشانە و بەڵگەی بەهێز پشتیوانی لێکرد، کە ببنە بەڵگە لەسەر ڕاستی بانگەوازەکەی، و بەڵگەکانیشی بەهێزبن، ئینجا موسا(علیه السلام) گەڕایەوە بۆ لای هاوسەرەکە ی پاش ئەوەی کە خوای گەورە ڕێزداری کردبوو بە هەڵگرتنی پەیام و هەر دەبێت باسی ئەوەیشی بۆ هاوسەرەکەی**

کردبێت، ئەوەی کە بینیبووی و بیستبووی، دڵی گەشاوە و گوشاد بوو و چاوەکانی بە بینایی و بەختەوەری شاد بوو و دڵیشی دڵنیا و دڵئارام بوو، و یەکەم کەسیش بوو کە باوەڕی بە موسا (علیه السلام) هێنا، ئیتر نازانین کار و بارەکانیان دوای ئەوە چی بەسەرهات، ڕەنگە بووبێتە پشتیوان و یارمەتیدەرێك بۆ هەڵگرتنی ئەو پەیامە، و هاوکاری موسا بوو بێت بۆ ئەوەی بتوانێت بە ئاسانی بە خەڵکی بگەیەنێت، بێگومان خوای گەورە موسای جیاکردەوە و هەڵبژارد و ئامادەی کرد بۆ هەڵگرتنی ئەو پەیامە و گەیاندنی، کە بەجوانترین شێوە بیگەیەنێت، خوای گەورە فەرمووی: ﴿وَلِتُصْنَعَ عَلَى عَيْنِي﴾(طه:٣٩).

لە ئایەتێکی تردا فەرمووی: ﴿إِذْ تَمْشِي أُخْتُكَ فَتَقُولُ هَلْ أَدُلُّكُمْ عَلَى مَن يَكْفُلُهُ فَرَجَعْنَاكَ إِلَى أُمِّكَ كَيْ تَقَرَّ عَيْنُهَا وَلَا تَحْزَنَ وَقَتَلْتَ نَفْسًا فَنَجَّيْنَاكَ مِنَ الْغَمِّ وَفَتَنَّاكَ فُتُونًا فَلَبِثْتَ سِنِينَ فِي أَهْلِ مَدْيَنَ ثُمَّ جِئْتَ عَلَى قَدَرٍ يَا مُوسَى(٤٠) وَاصْطَنَعْتُكَ لِنَفْسِي﴾(طه:٤٠-٤١). لە ئایەتێکی تردا فەرمووی: ﴿اللَّهُ أَعْلَمُ حَيْثُ يَجْعَلُ رِسَالَتَهُ﴾(الأنعام:١٢٤). بێگومان ئەمە قۆناغێکی تازە بوو لەژیانی موسا (علیه السلام) کە خوای گەورە ئامادە و سازی کردبوو، پاش چەند قۆناغ و ئاستێکی پێشتر لەچەند بواردا.

هەروەها قۆناغێکی نوێش بوو لە ژیانی هاوسەرێتی موسادا، کە هاوسەری ژیانی لەماڵی پیاو چاکێك هەڵبژارد، لەسەر بنەمای دینداری، بەڕاستی باشترین هاوسەری هەڵبژاردووە. ..کە ئەمەیش دایکانی باوەڕدارانمان بیر دەخاتەوە کە چۆن بە هەڵوێست و پشتیوان بوو لە گەیاندنی بانگەواز و پشتیوانی کردنی پێغەمبەردا (ﷺ).

## باسی سێیەم:

## وانە گرنگ و بەسودەکانی چیرۆکەکە:

### یەکەم: شێوەی ئافرەت لە چیرۆکی موسادا (علیه السلام)

ئافرەتان لە چیرۆکی موسادا ڕۆڵێکی گرنگ و ناوازەیان هەبوو، و دەوری جوانیان بینیوە.

دایکی موسا نموونەیەکی بەرز و جوانی لە دایکایەتی هێنایەوە و زۆر بەسۆز و ڕەحم و بەزەیی بوو، و زۆر ڕاستگۆ بوو، سۆز و عاتیفەی ئەو لەگەڵ ئیماندا یەکیان گرتبوو، و پابەند بوو بە دڵنیایی و متمانەی بەهێز و دامەزراوو بوو، و پابەند بوو بە فەرمانی خوای گەورەوە.

زۆر موسای خۆش دەویست و دەیش ترسا تووشی مەترسی و لەناچوون ببێت، خستییە ناو سندوقێك و پاشان خستییە ناو دەریاکەوە و خۆی دایە دەست فەرمانی خوای گەورە و دڵنیابوو بە بەڵێن و پەیمانی خوا.

هەروەها خوشکەکەی موسا (علیه السلام) نموونەی جوانی لە کچان پێشکەش کرد، و گوێڕایەڵ بوو بۆ فەرمانی دایکی و زۆر بەڕێز و بەسۆز بوو بۆ براکەی و زۆری خۆش دەویست، هەروەها زۆر زیرەك و وریا و کارناس و بوێر بوو، و بەتوانا بوو کە ڕوو بەڕوی هەڵوێستی قورس و نارەحەت ببێتەوە، ئەوەش بەهۆی ئیمان و دامەزراوی و حیکمەت و خێرایی و لێهاتویی یەوە، ئەوەش کاتێك دەردەکەوێت کە شوێن براکەی کەوت و بە شوێنیدا چاوی دەگێڕا تا لێی وون نەبێت، زۆر ئاگاداری بوو، و لەگەڵ ئالی فیرعەوندا دەدوێت و بەجوانی چارەسەری گرفتەکە دیاری دەکات.

(آسیة کچی مزاحم) کە ژنەکەی فیرعەون بوو، گەورە ئافرەت و ناسراوی میسر بوو، نموونەیەکی جوانی لە ئافرەتی باوەڕدار و چاکەکار پێشکەش کرد لەو ژینگە فاسید و

خراپەدا، لەگەڵ ئەو هەموو دەستەڵات و خۆشگوزەرانییەدا تووشی چەندەها جۆری ئازار و ناڕەحەتی کرا، زۆر خۆڕاگر و دامەزراو بوو، بە جوانی و پلەوپایەی خۆی لەخۆی بایی نەدەبوو، خۆی لە هەموو ناز و نیعمەتە دنیایی یەکان داڕنی و ڕوویکردە ڕەزامەندی خوایی.

ئەو ئافرەتە بوو کە پلە و پایە و ناوی بە ئاستێکی بەرز بەرز بویەوە، کە ناوی چوویە پاڵ ناوی خاتوو مەریەمی کچی عیمران و خەدیجە ی کچی خوەیلید و فاطمەی کچی محمد (ﷺ).

بەهۆی جوانی و شۆخ و شەنگی و ناز و سۆزو دەستەڵاتەوە نەگەیشتە ئەم پلە و پایەیە، بەڵکو بە ئیمان و کردەوە ی چاکە و دامەزراو ی لەسەر حەق و ڕاستی گەیشتە ئەم پلە و پایە بەرزە.

هەروەها دوو کچی پیاوچاکەکەی مەدیەن، بەڕاستی نمونوی جوانیان لە ئەخلاق و ڕەوشتی بەرز و شەرم و حەیا پێشکەش کرد، کە ئەوەیش لە شەرم و حەیا و کەسایەتییەکەیاندا دەردەکەوێت و زۆر بەڕێز و بەشکۆ بوون بۆ باوکیان، و چاکەکار بوون بۆ باوکیان، هەروەها چەندەها ئەخلاقی تری جوانیان بووە، کە ئەوەش بەرهەمی خێزانێکی چاك و ژینگەیەکی پاك بووە، و موسا(علیه السلام) یەکێکیان بۆ خۆی دەخوازێت و دەبێتە نمونەیەکی جوان لەهاوسەر، چاکەکار و گوێڕایەڵ دەبێت بۆ مێردەکەی، هاوکار و پشتیوانی دەبێت لە هەموو کاروبارێکدا.

## دووەم: پەند و وانەی گرنگ لە عەقیدە و بیروباوەڕدا

### قەدەری خوا:

لەم ئایەتەدا قەدەری خوایی جوان دەردەکەوێت: ﴿فَٱلۡتَقَطَهُۥٓ ءَالُ فِرۡعَوۡنَ لِيَكُونَ لَهُمۡ عَدُوّٗا وَحَزَنًاۗ إِنَّ فِرۡعَوۡنَ وَهَٰمَٰنَ وَجُنُودَهُمَا كَانُواْ خَٰطِـِٔينَ﴾(القصص:٨).

زانا (إبن كثير) لە تەفسیرەکەیدا دەڵێت: (لە عومەری کوڕی عبدالعزیز (خوا لێی ڕازی بێت) ڕیوایەت کراوە، کە نامەیەکی بۆ کۆمەڵێك لە قەومی (قدري) نووسی، کە بێباوەڕ

.ون بە کتێبی خوا و زانستیان کەم بوو بە کتێبە پێشووەکان:. .... موسا لە زانستی خوادا لە پێشتر بۆ فیرعەون دوژمن و جێگای خەفەت بووە.

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿وَنُرِيَ فِرْعَوْنَ وَهَامَانَ وَجُنُودَهُمَا مِنْهُم مَّا كَانُوا يَحْذَرُونَ﴾، ئێوە وتتان: ئەگەر فیرعەو بیویستایە دەبویە دۆست و پشتیوان بۆ موسا، بەلاَم خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿لِيَكُونَ لَهُمْ عَدُوًّا وَحَزَنًا﴾.[٢١٢]

## دڵنیابوون لە پەیمانی خوا

لە هەڵوێستێکی دایکی موسادا (علیه السلام) وانەی گرنگ هەیە لە دڵنیایی بە بەڵێنی خوا وپشت بەستن بەخوا و داوای کۆمەکی و یارمەتی لەخوای گەورە و یارمەتی لەخوای گەورە لەهەموو حاڵەتێکدا، دڵنیایی بەرهەمێکە لە بەرهەمەکانی ئیمان و پلەیەك لە پلەکانی ئیحسان، دڵنیایی لە دڵێکدا دانامەزرێت کە سەکینە ی بۆ غەیری خوا تیابێت، ئەگەر دڵەکە بوویە جێگای سەکینەی خوایی، ئەوا پڕدەبێت لە یەقین و دڵنیایی.

کاتێك دایکی موسا منداڵەکەی خستە ناو سندوقەکەو، ئەویشی خستە نا دەریاکەوە، تەواو دڵنیابوو بە بەڵێن و پەیمانی خوایی، و منداڵەکەی سەلامەت بوو بە قودرەتی خوایی و گرنگی پێدانی ئەو.

## پەنابردن بۆ خوای گەورە

لە ئایەتی: ﴿فَخَرَجَ مِنْهَا خَائِفًا يَتَرَقَّبُ قَالَ رَبِّ نَجِّنِي مِنَ الْقَوْمِ الظَّالِمِينَ(٢١) وَلَمَّا تَوَجَّهَ تِلْقَاءَ مَدْيَنَ قَالَ عَسَى رَبِّي أَن يَهْدِيَنِي سَوَاءَ السَّبِيلِ﴾(القصص:٢١-٢٢). ئاماژە بۆ ئەوە کراوە کە پێویستە ڕوبکرێتە خوا

---

[٢١٢]- (تفسير القرآن العظيم لإبن كثير) ٣/٣٨١.

و داوای کۆمەکی و یارمەتی لێ بکرێت، و داوای هیدایەت و ڕێنمایی لەو بکرێت، بەڕاستی هەر خوا ڕێنمویی کارە بۆ ڕێگای ڕاست و دروست.

## سێیەم: دەرس و وانە فیقهی یەکان

١_ مافی منداڵ لەشیر پێدانی دایکایەتی:

لە ئایەتی: ﴿وَأَوْحَيْنَا إِلَى أُمِّ مُوسَى أَنْ أَرْضِعِيهِ فَإِذَا خِفْتِ عَلَيْهِ فَأَلْقِيهِ فِي الْيَمِّ وَلَا تَخَافِي وَلَا تَحْزَنِي إِنَّا رَادُّوهُ إِلَيْكِ وَجَاعِلُوهُ مِنَ الْمُرْسَلِينَ﴾(القصص:٧).

هەروەها ئایەتی: ﴿وَحَرَّمْنَا عَلَيْهِ الْمَرَاضِعَ مِن قَبْلُ فَقَالَتْ هَلْ أَدُلُّكُمْ عَلَى أَهْلِ بَيْتٍ يَكْفُلُونَهُ لَكُمْ وَهُمْ لَهُ نَاصِحُونَ(١٢) فَرَدَدْنَاهُ إِلَى أُمِّهِ كَيْ تَقَرَّ عَيْنُهَا وَلَا تَحْزَنَ وَلِتَعْلَمَ أَنَّ وَعْدَ اللَّهِ حَقٌّ وَلَكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ﴾(القصص:١٢-١٣). ئاماژەیە بۆ گرنگی شیر پێدانی دایک کە یەکسەر دوای لەدایک بوون دەست پێ دەکات و بەردەوام دەبێت تا دوو (حول) تەواو دەکات و منداڵەکە خۆی دەگرێت.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَالْوَالِدَاتُ يُرْضِعْنَ أَوْلَادَهُنَّ حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِ لِمَنْ أَرَادَ أَن يُتِمَّ الرَّضَاعَةَ وَعَلَى الْمَوْلُودِ لَهُ رِزْقُهُنَّ وَكِسْوَتُهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ لَا تُكَلَّفُ نَفْسٌ إِلَّا وُسْعَهَا لَا تُضَارَّ وَالِدَةٌ بِوَلَدِهَا وَلَا مَوْلُودٌ لَّهُ بِوَلَدِهِ وَعَلَى الْوَارِثِ مِثْلُ ذَلِكَ فَإِنْ أَرَادَا فِصَالًا عَن تَرَاضٍ مِّنْهُمَا وَتَشَاوُرٍ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا وَإِنْ أَرَدتُّمْ أَن تَسْتَرْضِعُوا أَوْلَادَكُمْ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ إِذَا سَلَّمْتُم مَّا آتَيْتُم بِالْمَعْرُوفِ وَاتَّقُوا اللَّهَ وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ﴾(البقرة:٢٣٣).

واتە: (دایکان (تەڵاق دراوبن یان نەء) دووساڵی تەواو با شیر بە منداڵەکانیان بدەن، بۆ هەر کەسە کە دەیەوێت شیری تەوا بدات و پێویستە لەسەر ئەو کەسەی خاوەنی

منداڵەکەیە (واتە باوکی یان بەخێوکەری) ڕزق و ڕۆزی و پۆشاك بە شێوەیەکی جوان و پەسەندی ئایین ئامادەبکات، ئەرك لەسەر هیچ کەس دانانرێت جگە لەتوانای خۆی، نابێت هیچ دایکێك زیانی پێ بگەیەنرێت بەهۆی منداڵەکەیەوە، هەروەها باوکیشی نابێت زیانی پێ بگەیەنرێت بەهۆی منداڵەکەیەوە و لەسەر میراتگری منداڵەکەیشە وێنەی ئەو مافانەی کە باسکران، خۆ ئەگەر دایك و باوك هەرکاتێك بە ڕەزامەندی و پرس و ڕای هەردولایان ویستیان منداڵەکەیان لەشیر بڕنەوە، ئەوە قەیناکات و هیچ گەناهیان لەسەر نییە لەو بارەیەوە، خۆ ئەگەر ویستتان دایەن بۆ شیرپێدانی منداڵەکانتان بگرن، ئەوەیش قەیناکان، و هیچ گوناهتان لەسەر نی یە، بەمەرجێك ماف و کرێیان بەجوانی و شایستە پێبدەن، لەخوا بترسن و پارێزکاربن و چاك بزانن بەڕاستی خوا زۆر بینایە بەو کار وکردەوانەی کە ئەنجامی دەدەن).

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَحَمْلُهُ وَفِصَالُهُ ثَلَاثُونَ شَهْرًا﴾. کەمترین ماوەی سکپڕی ڕوون دەکاتەوە کە شەش مانگە لەگەڵ ماوەی شیرپێدان کە دوو ساڵی تەواوە، کۆی هەردووکیان (٣٠) سی مانگ دەکات.

## سوود و گرنگییەکانی شیرپێدانی دایك

١- ڕۆژ بە ڕۆژ شیری مەمکی دایکان گۆڕانکاری بەسەردا دێت و لە ڕۆژێکەوە بۆ ڕۆژێکی تر جیاوازە کە لەگەڵ گەشەی منداڵەکەدا گونجاو و لەبارە، کە ئەو سیفەتە لەشیری بەرهەم هاتودا نییە، مەمکی دایکان لە سەرەتادا (ژەك) دەردەدات، کە پرۆتینی زۆر و ماددەی گرنگ و بە سودی خۆراکی تیایە، کە ئەمانە لە شیری بەرهەم هاتودانین، هەروەها شیری دایك چەوری کەمە و ڕێژەی دیاریکراو و هاوسەنگە و ڕێژەی شەکری گونجاو و دیاریکراوە و لەگەڵ پێداویستی منداڵەکەدا زۆر گونجاوە.

٢- شیری دایك کۆئەندامی بەرگری لەش بەهێزدەکات لای منداڵان و هەروەها بە ئاسان هەرس دەبێت و خێرایشە هەروەها (معقم) پاك و پاڵێورا و و بێ مەترسییە، لە کاتێکدا کە شیری بەرهەم هاتوو زوو پیس و میکرۆباوی دەبێت.

٣- پلەی گەرمی شیری دایك زۆر گەنجاوە بۆ منداڵەکە.

٤- شیرپێدانی دایك تەکیلف ناخاتە سەر بواری ئابوری، بەلاّم شیری بەرهەم هاتوو تەکلیف دەبات، و باری نەفەقە قورس دەکات.

٥- شیردانی دایك بۆ منداڵ بە نیسبەت دایکانەوە: دەبێتە هۆی چونەوە یەکی ڕەحم و وەرگرتنەوەی دۆخی خۆی بە هۆی ئەوەی کە منداڵەکە گۆی مەمکی دایکی دەمژێت: ئەمەش دەبێتە هۆی کەمی خوێنی ڕۆیشتوو لە ڕەحمدا.

٦- ئافرەتی شیردەر کەمتر تووشی نەخۆشی شێرپەنجە (سرطان)ی مەمك دەبن تا ئافرەتانێك کەشیر نادەن.

٧- شیردان زیاتر کرانەوە و گەشانەوە وڕاحەتی نەفسی بە ئافرەت دەدات و سۆزی دایکایەتی تێردەکات، کاتێك منداڵەکەی دەخاتە کۆشی و باوەشی پیادەکات و دەینێت بە سنگی یەوە و خۆشەویستی خۆی بۆ دەردەبڕێت.

٨- لێکۆڵینەوە نوێکان ئەوەیان سەلماندوە (کە دەبێت منداڵەکە زۆر نزیکی دایك بێت یەکسەر دوای لەدایك بوونی ڕاستەخۆ، ئەوەش لەبەر گرنگی ئەو ساتە وەختە لە پەیوەندی نێوان دایك و منداڵەکەدا، نزیکی جەستەیی لەنێوان دواندا دەگونجێت ببێتە هۆی گۆڕینەوەی پەیوەندی نێوان دایك و منداڵ).[٢١٣]

٩- هەروەها لێرەدا هەل بۆ دایکەکە ڕێك دەکەوێت بۆ بینینی منداڵەکەی و دەست لێدانی لەدوای لەدایك بوونی ڕاستەوخۆ، ئەو لە پێویستترین کاتدایە لەهەست و دەست لێدانی منداڵەکەیدا لەبەرئەوەی کە ئەبێت ئاگاداری زیاتر بکرێت پێش بیرکردنەوە لەوەی کە منداڵەکە جیابکرێتەوە لە دایکی، دوای لەدایك بوونی.

## وانەیەکی گرنگ لە پەروەردە

لە گەڕانەوەی موسادا (علیه السلام) بۆ ئامێزی دایکی وانەیەکی گرنگ لە پەروەردەکردن هەیە، بێگومان خوای گەورە ویستی موسا لە ئامێز و باوەشی دایکی خۆیدا پەروەردە ببێت، کە دایکێکی چاکەکار و ئەمین بوو بۆ کوڕەکەی خۆی، موسا گەڕایەوە بۆلای تا ئەو لای خۆی بە پەروەردەیەکی ئیمانی و ڕاست و دروست پەروەردەی بکات.

---

٢١٣- الأمومة، نمو العلاقة بين الطفل و الأم د. فايز قنطار ص/٧٢ _ ٧٣.

ئەگەر خوای گەورە شیری ئافرەتە شیردەرەکانی لەسەر موسا حەرام و قەدەغە نەکردایە، ئەوا یەکێك لەو ئافرەتانە سەر پەرشتی بەخێوکردنی موسایان دەکرد، یان ئافرەتێك لە دەرەوەی کۆشك و تەلارەکانی فیرعەون، بەڵام خوای گەورە قەدەرەکەی وا کێشا بوو کە موسا(علیه السلام) بگەڕێتەوە بۆلای دایکی، کە بەنمونەی دایکێکی پاك و چاك و باوەڕدار و دڵنیا و بەڕێز و پەروەردەکەر دەژمێردرا.

بەڕاستی ئێمە لێرەدا دەمانەوێت خوێنەرانی بەڕێز و خۆشەویست لەو ئافرەتە خراپەکارانە ئاگادار بکەینەوە، کە کەسانێکی نامسوڵمانن و لە ڕۆژئاوا و ئەوپەڕی ئەوروپا و ئەمریکاوە دێن بۆ وولاتی مسوڵمانان، سەرپەرشتی کاری گەورە و گرنگ دەکەن لە پەروەردە کردنی نەوەی مسوڵماناندا.

بەڕاستی زۆر سەیرە، ئێمە چۆن دڵمان دێت منداڵەکانی خۆمان دەدەینە دەست عەقڵی ئەو ئافرەتە بێ باوەڕانە؟!

دەبێت لەسەر چ بنەما و بەرنامەیەك پەروەردەی منداڵەکانی ئێمە بکەن؟!

دەبێت ئێمە چی چاوەڕێ بکەین لەو منداڵانە، کە ئەمڕۆ منداڵن و سبەینێ دەبنە گەنج و پێگەیشتوو، و دەبنە پیاوانی دواڕۆژ؟

دەبێ ئێمە چاوەڕوانی چییان لێ بکەین کە ئەوان لەباوەش و ئامێزی ئافرەتێکی بێگانەدا پەروەردە دەبن؟ و لەسەر بەرنامەیەکی نا ئیسلامی پەروەردە دەبن؟

## لە مافەکانی ئافرەتی شیردەر

وەك شەریعەت بەپێویستی داناوە نەفەقە و خەرجی ئافرەتان لەسەر مێردەکانیانە، ئیتر ئەو ئافرەتە سکی هەبێت یان شیربدات، یان ئەگەر سکی نەبوو، و شیردەریش نەبوو، ئەوا نەفەقەو خەرجی مافێکی شەرعیە لەسەر مێردەکەی بۆ ئەو، هەروەها ئافرەتی تەڵاقدراو ی سك پڕیش، وەك یەکە ئیتر ئەگەر لەماوەی (طلاق الرجعي) یان (طلاق البائن)یشدا بێت ئەوا ئەو ئافرەتە هەر حەقی بەسەرمێردەکەیەوە هەیە، خوای گەورە

فەرمویەتی: ﴿أَسْكِنُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ سَكَنتُم مِّن وُجْدِكُمْ وَلَا تُضَارُّوهُنَّ لِتُضَيِّقُوا عَلَيْهِنَّ وَإِن كُنَّ أُولَاتِ حَمْلٍ فَأَنفِقُوا عَلَيْهِنَّ حَتَّىٰ يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ فَإِنْ أَرْضَعْنَ لَكُمْ فَآتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ وَأْتَمِرُوا بَيْنَكُم بِمَعْرُوفٍ وَإِن تَعَاسَرْتُمْ فَسَتُرْضِعُ لَهُ أُخْرَىٰ﴾(الطلاق:٦).

واتە: (ئەو ئافرەتانە ی کە تەلاٌقێك یان دوانیان ماوە، بە گوێرەی توانایان جێگە و ڕێگەیان بۆدابین بکەن لای خۆتان، نەکەن ئازاریان بدەن و تەنگەتاویان بکەن و زۆریان بۆبهێنن خۆ ئەگەر سکیان هەبوو (ئەگەر سێ تەلاٌقیش درابوون)هەر بەخێویان بکەن و مەسرەفیان بکێشن هەتا سکەکەیان دادەنێن، خۆ ئەگەر منداڵەکەیان بەشیر گۆشکردوو بەخێویان کرد، ئەوە حەقی خۆیان بدەنێ، دەکرێت بە شێوەیەکی جوان و چاك ڕاوێژ لەناو یەکدا بکەن بۆ بەخێوکردنی منداڵەکە، خۆ ئەگەر پێك نەهاتن و ناکۆك بوون، ئەوە دەکرێت ئافرەتێکی تر منداڵەکەی بۆ بەخێو بکات و شیری پێبدات).

## شیر پێدانی منداڵ تەنها واجبی دایك نییە، لەچەند حاڵەتێکی دیاریکراودا نەبێت

زرینەی زانایانی (فیقە) لەسەرئەوە کۆکن کەشیر پێدانی منداڵ تەنها واجبی دایك نیە، بەڵکو ئەوە (مندوب) ڕێگەپێدراوە، واجبیش نابێت لەسەر دایك مەگەر کاتێك باوك کرێی شیر پێدانەکەی لەسەر قورس و زۆر و نارەحەت بێت، کە ئافرەتێکی شیردەری تری بۆ بگرێت، یان منداڵەکە عادەتی وایە کتەنها مەمکی دایکی خۆی دەگرێت، یان باوکەکە دیار نەبێت و کرێی جێ نەهێشتبێت بۆ بەکرێ گرتنی شیر پێدەرەکە، ئەوا ئەو کاتە واجب دەبێت لەسەر دایکەکە، کەشیر بەمنداڵەکە بدات تانەمرێت.[٢١٤]

## کاری ئافرەت

---

[٢١٤]- الفقه الأسلامي و ادلتە ٧\٦٩٩.

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿ وَلَمَّا وَرَدَ مَاءَ مَدْيَنَ وَجَدَ عَلَيْهِ أُمَّةً مِّنَ النَّاسِ يَسْقُونَ وَوَجَدَ مِن دُونِهِمُ امْرَأَتَيْنِ تَذُودَانِ قَالَ مَا خَطْبُكُمَا قَالَتَا لَا نَسْقِي حَتَّى يُصْدِرَ الرِّعَاءُ وَأَبُونَا شَيْخٌ كَبِيرٌ(٢٣) فَسَقَى لَهُمَا ثُمَّ تَوَلَّى إِلَى الظِّلِّ فَقَالَ رَبِّ إِنِّي لِمَا أَنزَلْتَ إِلَيَّ مِنْ خَيْرٍ فَقِيرٌ(٢٤) فَجَاءَتْهُ إِحْدَاهُمَا تَمْشِي عَلَى اسْتِحْيَاءٍ قَالَتْ إِنَّ أَبِي يَدْعُوكَ لِيَجْزِيَكَ أَجْرَ مَا سَقَيْتَ لَنَا فَلَمَّا جَاءَهُ وَقَصَّ عَلَيْهِ الْقَصَصَ قَالَ لَا تَخَفْ نَجَوْتَ مِنَ الْقَوْمِ الظَّالِمِينَ(٢٥) قَالَتْ إِحْدَاهُمَا يَا أَبَتِ اسْتَأْجِرْهُ إِنَّ خَيْرَ مَنِ اسْتَأْجَرْتَ الْقَوِيُّ الْأَمِينُ﴾(القصص:٢٣-٢٦).

ئەم ئایەتە پیرۆزانە لە باسێك دەدوێن، کەزۆرێك لەکەسانی خاوەن بیر و لێکۆڵەری سەرقاڵ کردووە بە کارو باری ئافرەتانەوە کە ئەویش: کاری ئافرەتانە.

ئیسلام لەبابەتی کارکردنی ئافرەتاندا سیاسەت ودەستور و یاسایەکی ناوازە و رێك وپێك و بەرنامەیەکی دادوەرانە و تێرو تەواوی هەیە، ئەسڵ لەتەرازوی شەرعدا ئەوەیە کەپیاوان لەماڵ دەرچن بۆ کارکردن و ئەرکی نەفەقە و خەرجی بخەنە سەرشانی خۆیان بۆ ماڵەکەی خۆیان، ئەوا لێرەدا کارکردن لەسەر پیاوان واجب و پێویست دەبێت، تا بتوانێت نەفەقە و خەرجی بۆخۆی و ئەوکەسانەی لەسەر ئەمن دابین بکات.

لە فەرمودەیەکدا لە (ابن عمر) (خوا لێی ڕازی بێت) دەڵێت: لە پێغەمبەر(ﷺ)م بیست، کە دەیفەرمو: (ئێوە هەموتان چاودێرن و هەموتان بەرپرسیارن لەوەی کەلە بەردەستاندایە، پێشەوا چاودێرە و بەرپرسە لەو شتانەی کە سەرپەرشتی دەکات، پیاو چاودێرە بەسەر ئەهل و کەس و کاریەوە و بەرپرسە لەوەی کەئەو سەرپەرشتی دەکات، ئافرەت چاودێر و بەرپرسە لەماڵی مێردەکەی و بەرپرسیشە لەوەی کە ئەو چاودێری دەکات، خزمەتکار چاودێر و بەرپرسە لەماڵی گەورەکەیی و بەرپرسیشە لەوەی کە ئەو چاودێری دەکات و سەرپەرشتی دەکات...).[٢١٥]

کاری ئافرەت ڕاست و حەقیقییە و ئەو پەیامەی پێ سپێردراوە کە لەماڵدا کار بکات و بەرپرسە لەوماڵەدا، ئەمە بەرنامەی ئیسلامە کە زۆر لەبار و گونجاوە لەگەڵ فیترەتی

---

[٢١٥] - رواه البخاري في صحيحه عن ابن عمر – كتاب الجمعة– .

ئینساندا و هەروەها لەگەڵ سروشتی پیاوو ئافرەتیشدا گونجاوە، خوای گەورە لە سوورەتی (طه)دا فەرمویەتی: ﴿فَقُلْنَا يَا آدَمُ إِنَّ هَذَا عَدُوٌّ لَّكَ وَلِزَوْجِكَ فَلَا يُخْرِجَنَّكُمَا مِنَ الْجَنَّةِ فَتَشْقَى(١١٧) إِنَّ لَكَ أَلَّا تَجُوعَ فِيهَا وَلَا تَعْرَى(١١٨) وَأَنَّكَ لَا تَظْمَأُ فِيهَا وَلَا تَضْحَى﴾(طه:١١٧-١١٩).

خوای گەورە ڕونی کردەوە کە دوژمنایەتی ئیبلیس تەنها بۆ ئادەم (علیه السلام) نەبوو، بەڵکو(حواء)یشی گرتەوە، کە دوژمنایەتی هەبوو بۆ هەردووکیان و نەوەکانیشیان.

خوای گەورە ووتەی خۆی ئاڕاستەی هەردووکیان کرد: ﴿فَلَا يُخْرِجَنَّكُمَا مِنَ الْجَنَّةِ﴾.

چونکە بەرپرسیارێتی هاوبەش بوو لەنێوان ئادەم و حەوائیشدا، وتەی ﴿فَتَشْقَى﴾ دەربڕین بوو بەتەنها بۆ ئادەم (علیه السلام)، چونکە ئەو هەوڵ بۆ ژیان و کارکردنی دەرەوە دەدات، دەبێت ئەو بچێت بەدەم داواکاریەکانەوە لە جل وبەرگ و شوێن و خواردن وخواردنەوە ئەمانە ئەرك و واجبی پیاوانن، لەسەر ئافرەتان واجب نابێت مەگەر لەحاڵەتی پێویستدا.

## مەرج و پێویستییەکان بۆ کارکردنی ئافرەت

ئیسلام قەدەغەی ئەوە ناکات کە ئافرەت کاربکات و لەماڵ بچێتە دەرەوە، بەڵام مەرج و (ضوابط)ی بۆ داناوە، کە لەگەڵ سروشتی ئافرەتدا بگونجێت و لەگەڵ بەرەژەوەندی کۆمەڵگایشدا یەك بکەوێت. ئەو مەرجانە بریتین لە:

١- دەبێت گەورە و سەرپەرشتیارەکەی ڕازی بێت و ڕێگەی بدات: ئافرەت نەچێتە دەرەوە مەگەر بەمۆڵەت وەرگرتن لەگەورە و سەرپەرشتیارەکەی کە بەرپرسە لەو، ئەسڵ ئەوەیە کە ئافرەت لەماڵدا بمێنێتەوە مەگەر تەنها بۆ پێویستی، خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿وَقَرْنَ فِي بُيُوتِكُنَّ وَلَا تَبَرَّجْنَ تَبَرُّجَ الْجَاهِلِيَّةِ الْأُولَى﴾(الأحزاب\٣٣).

٢- لەفیتنەو ئاژاوە ئەمین بێت: لە شێوازەکانی فیتنەو ئاژاوە بریتییە لە تێکەڵاوبوون و خۆڕازاندنەوە و مانەوە بە تەنها لەگەڵ پیاواندا لەم لاو ئەولاو هەموو ئەو شێوازانە کە دەبنە هۆی هەڵگیرساندنی ئاگری فیتنە، ئیسلا هەموویانی حەرام کردووە.

٣- کاری ئافرەتەکە بە جۆرێك نەبێت کە لە کار و گرنگی خۆی لایبدات وەك هاوسەر و دایکایەتی.

٤- کارەکە لەگەڵ ڕەگەزە مێینەییەکەیدا پێچەوانە نەبێت، واتە: کاری قورس و گران نەبێت کە پێویستی بە هێز و توانای زۆر هەیە وکارەکە قورس و گرانە، ونابێت لەو کارانە بێت کە ڕێگە پێدراو نیە بۆ ئەو وەك دادوەری و سەرپەرشتی کاروباری گشتی و شتانی تر، لەو کارانەی کە لەگەڵ سروشتی ئافرەتدا ناگونجێت و لەگەڵ تواناو لێهاتووییەکانیدا ناگونجێت.

٥- دەبێت کاری ئافرەتەکە کارێکی چاك بێت و بەرهەمدار و بەسود بێت بۆ کۆمەڵگە، لەوکارانە نەبێت کە گومڕاکەر و خراپن وەك: سەما و خۆبادان و گۆرانی و دراما و خۆدەرخستن و شتانی تر لەو کارانەی کە دەبنە هۆی خراپە و لادان.

## نمونەی جوان و پاك و ناوازە لە ئافرەتانی ئیشکەر

کاتێك وورد دەبینەوە لە چیرۆکی موسا (علیه السلام) لەگەڵ دوو کچەکەی شاری مەدیەن، دەبینین کەئەو دوو ئافرەتە زۆر ناچار بوون لەسەر چوونە دەرەوە بۆ کارکردن، ئەوەش لەبەر نەبونی کەسێك کە بەو کارە هەستێت و شوێنی ئەوان بگرێتەوە.

و بینیمان ئافرەتەکان سوور بوون لەسەر ئەوەی کە پابەند بن بە ئەخلاق و ڕەوشتە بەرز و جوانەکانەوە، کە لە دووری هەموو خەڵکەکەوە وەستابوون تاتووشی فیتنە نەبن، هەروەها لە گفتوگۆکەیاندا لەگەڵ موسادا (علیه السلام) کە بەڵگە بوو لەسەر ڕەوشتی جوانیان و ئەدەبی بەرزیان، چونکە لە ئەسڵێکی پاك و چاك هاتبوون، ئەوان بەریان لە ماڵاتەکەیان گرتبوو نەیاندەهێلا تێکەڵ بە خەڵکەکە بن، موسایش سەری سوڕما لەم کارەیان کەئەوان پێی هەستاون کە کارەکە قورسە و ئەوانیش دوو ئافرەتی لاوازن،

وسەری سوڕما لەئەدەبیان، کە بەڵگە بوو لە سەر ئەوەی لە ماڵێکی چاکەوە دەرچوون. ئافرەتەکان بە ئەندازەی پرسیارەکە وەڵامی موسایان دایەوە، وەڵامێکی سادە و ڕێگەپێدراو بوو، تێبنی ئەوە دەکرێت کە موسا (علیه السلام) لەپێشدا پرسیاری کرد لەحاڵیان. وەك تێبینی دەکرێت کە گفتوگۆکە تەنها چەند ووشەیەك بوە و زۆری پێ نەچووە، کە ئەوەندە بەس بووە و بەشی پێویست بووە. ئینجا موسا هات کارەکەی بۆ جێ بەجێ کردن کە بریتی بوو لە ئاودانی ماڵاتەکەیان، پاشان چوو بۆ سێبەری دارێك بێ ئەوەی بگەڕێتەوە بۆ لایان و چاوەڕێ بکات سوپاس و ستایشی بکەن: ﴿فَسَقَىٰ لَهُمَا ثُمَّ تَوَلَّىٰ إِلَى الظِّلِّ فَقَالَ رَبِّ إِنِّي لِمَا أَنزَلْتَ إِلَيَّ مِنْ خَيْرٍ فَقِيرٌ﴾. پیتی (فاء) بەڵگەیە لەسەر خێرا ئەنجامدانی کارەکە، هەروەها دوای کارەکە چووە ژێر سێبەری دارەکە دیار بوو کە زۆر ماندوو بوو هەروەها چاوەڕێی کرێ و پاداشتیشی لێ نەکردن، بەڵکو لە خوای گەورەی چاوەڕێ کرد، کارەکە تەنها لەبەر خوا بووە، ئەگەر کاتێك کارێك لەبەر خوا ئەنجام بدرێت کەواتە دەبێت ئەو کەسەی ئەنجامی داوە ئاگای لە چاودێری خوای گەورە بو بێت لە کارەکەدا، ئەگەر کارێك بەو جۆرە بوو ئەوە کارێکی چاك و وەرگیراوە.

بێگومان ئەرکی کۆمەڵگایە کە هاوکاری ئافرەت بکات، ئەوانەی کە ناچار دەبن بۆ کارکردن لەماڵ دەچنە دەرەوە، کۆمەڵگای موسڵمانان کۆمەڵگایەکی پڕ لەخۆشەویستی و ڕەحمەت و بەزەیی یە، کۆمەڵگای پێکەوە ژیان و تێکەڵاوی و هاوکاری و بەدەمەوە چوون و دەستەبەری یە، کۆمەڵگای پیاوەتی و لێهاتوویی وسەربەرزی و کەرامەت و ڕێزە.

لە دیاردە خراپەکان ئەوەیە، لەکۆمەڵگا پێشکەوتووەکاندا دەبینیت و دەبیستیت کە هەندێك لە پیاوان پیاوەتی ولێهاتوویی و شەهامەتی خۆیانیان لەدەست داوە، وخێزانەکانیان ناچارکردووە و زۆریان لێ کردوون لەسەر کارکردن هەروەها کچ و خوشکەکانیشیان کە بچنە دەر لەماڵ بۆ کارکردن، لەگەڵ ئەوەی کە ئەوان حەز دەکەن لە ماڵەوە بمێننەوە، کە لەهەمان کاتدا پیاوان توانای ئەوەیان هەیە کە نەفەقە و خەرجییان بکێشن، ئەمانەش تەنها بە هۆی تەماع و چاوبرسێتی ونەبونی پیاوەتی و لێهاتووییەوە پەیدا دەبێت.

## کۆمەڵێك گوفتە و دەنگی گوماناوی و بێ نرخ

ئەمڕۆ ئەو کەسانە دەبینین کە ئافرەتان پاڵ دەنێن و دەیانخەنە ناو بازاڕەکانەوە بۆ کاکردن کە تێکەڵاوی و کارکردنیان لەگەڵ پیاواندا تێکەڵ دەبێت، لە هەموو جۆرەکاندا پێشبڕکێی یەکتری دەکەن، وخۆڕازاندنەوە و پێکەوە مانەوەیش لەولاوە بوەستێت. لەم کارانەدا گومڕایی ولادان و بەڵاوخراپەی جۆراوجۆر دەکەوێتەوە.

کەسانێك دەبینین بەناوی ئازادی ڕەهاوە بانگەشە بۆ ئەم کارە دەکەن  بە ناوی یەکسانی لە نێوان ژن وپیاواندا، بێگومان ئەو کەسە بانگخوازانە ئەوەیان لە بیرچۆتەوە و بێ ئاگاو نەزان بوون بەرامبەری کە سروشتی ئافرەت و تواناو لێهاتووییەکانی و کار و فەرمانی ئەو لەژیاندا چیەو چی دەخوازێت؟

کە کاری سەرەکی و بنەڕەتی ئەوان هاوسەری و دایکایەتی یە.

زۆربەی هۆکارە بینراو و بیستراو و خوێندراوەکانی ڕاگەیاندن پڕ بوون لەم بانگەشە و بانگەوازانە و ئەو دەنگانەی تیا بەرز بوەتەوە. کە بانگەواز دەکەن بۆ دەررچونی ئافرەتان و یەکسان کردنی تەواویان لەگەڵ پیاواندا لەهەموو شتێکدا.  لەگەڵ ئەوەی کە هەر لەفیترەتدا چەندەها جیاوازی تاکایەتیان هەیە.

## نمونەیەك لەوبانگەشانە:

(رفاعة الطهطاوي) دەڵێت: (بە ڕاستی دەست بەتاڵی ئافرەتان لە ئیش و کار زمانیان سەرقاڵ دەکات بە وتنی قسەی بەتاڵ و بێ ماناوە و دڵیشیان بە هەواو ئارەزو  و وتنی قسەی بێ ماناو درۆ، و کارکردن ئافرەت دەپارێزێت لە هەرشتێك کە گونجاو نەبێت و لە فەزیلە و ڕێز نزیکی دەخاتەوە).[٢١٦]

[٢١٦] - الأسلام والحضارة الغربية ص٣٧  تأليف د.محمدمحمدحسين  مؤسسة الرسالة بيروت ط٥ سنة ١٤٠٢هـ -ئێمەش دەڵێین: نازانین چ فەزیلەو ڕێزێك هەیە کەئەو هەوڵی بۆدەدات و کاری بۆدەکات ! نازانین پاراستن لەکوێدایە بۆ ئافرەت کاتێك بۆ کارکردن بچێتە دەرەوە و خۆی برازێنێتەوە و جلی نەشیاو و تەنك و کورت تەسك لەبەربکات و تێکەڵاوی  پیاوان

(نبوية موسى) دوای ئەوەی کە دڵنیای کردەوە ئینسان وەك حەیوان و ئاژەڵانە،:دەڵێت جیاوازی نیە لەنێوان نێرە و مێیەی هیچ ئاژەڵێکدا، گەماڵە سەگ وەك سەگی دەڵ وەهایە، هەروەها پشیلە و مشك جیاوازیان لە هیچ شتێکدا نییە، تەنها زۆربونەکە نەبێت.[٢١٧]

ئێمەیش دەڵێین: لێکچواندنی ئینسان بە ئاژەڵان پێچەوانەی ڕاستی و حەقیقەتە، ئینسان سروشتی خۆی هەیە و سیفەت و ئامانجی خۆی هەیە، هەروەها ئاژەڵانیش سورشت و سیفەت و گرنگی خۆیانیان هەیە لەژیاندا، ئینکاری کردنی جیاوازی لەنێوان سروشتی پیاو و ئافرەت و ووزە و تواناکانیاندا لە هەریەکەیان لە کار و گرنگی خۆیاندا، ئەوە ئینکاری کردنی هەموو جیاوازی یەکانە: ئینکاری ڕاستییە نەگۆڕ و دامەزراوەکانە لە دین و زانستدا.

## چەند ووشەیەکی ڕاست و ڕوون دەربارەی کاری ئافرەت

(عباس محمود العقاد) دەڵێت: (..بێجگە لەوەی کە ئێمە بە بێ دوو دڵی دەتوانین تێ بگەین کە کۆمەڵگای نموونەیی ئەو کۆمەڵگایە نییە کە ئافرەت ناچار بکات لەسەر کارکردن و هەوڵدان بۆ پەیداکردنی خۆراك بۆ منداڵەکانی، وەك ئەوە دیارە لە زۆرێك لە دەوڵەتە ڕۆژئاواییەکاندا، کاتێك کە پیاو بەرپرسیارێتی لەسەر شانی خۆی لادەبات بەرامبە خێزانەکە و ئافرەت ناچار دەکات بۆ کارکردن لە ڕێگای بەدەستهێنانی مەعیشەتی ژیاندا بۆ منداڵەکانیان..).

---

بکات، دەبێت لەمەدا چ پاراستنێك بۆ ئافرەتان هەبێت ! دەبێت(الطهطاوي) چ کارێکی مەبەست بوبێت؟ ئایا ئافرەت لەماڵەوە بێکارە؟ ئەی بەرپرسیارێتی بەرامبەر ماڵ وبۆماڵ لەکوێدایە؟ چۆن سەرپەرشتی منداڵەکانی بکات؟ ئایا ئافرەت لەماڵ دەرچێت و کاربکات پاشان چاك دەبێت وپاك دەبێتەوە؟

[٢١٧] - بەپێی ئەم قسەی زۆر نەزان بووە بەرامبەر ڕاستی و واقیع و نەشارەزا بوە بە جیهانی ئاژەڵان سەرەڕای جیهانی مرۆڤەکان بێگومان جیاوازی زۆر هەن لەپێکهاتە و هەڵس و کەوتیاندا، هەروەها لە نێوان نێرە و مێیە کانیشدا، لە هەموو جۆرەکانیاندا.

مامۆستا (أبو الأعلی المودودي) دەڵێت: (ئافرەت لە کۆمەڵگای مسوڵماندا کابانیماڵە، ئەوەش شەریعەت بۆی دیاریکردووە، لە کاتێکدا لەسەر پیاوەکە پێویستە کە ماڵ و سامان پەیدا بکات و نەفەقە و خەرجی بکێشێت، پێویستە ئافرەتەکە لەو سامان و ماڵە کاری ماڵ بەڕێوە بەرێت و خەرجی بکات، چونکە (ئەو چاودێر و بەرپرسە بەسەر ماڵی مێردەکەیەوە و بەرپرسیاریشە لێی کەچۆن دەیپارێزێت و خەرجی دەکات) و ئیسلام مۆڵەت دەدات بە ئافرەت کە لەماڵ دەرچێت، ئەگەر پیاو نەبوو یان نەیتوانی، یان مەعاش و نرخی داراییەکە کەم و لاواز بوو، یاخود پیاوەکە نەخۆش یان بێ توانا و بێ دەستەڵات بوو، لەم حاڵەتەدا ڕێگە دراوە کە ئافرەت لەماڵ دەربچێت بۆ کارکردن.

مامۆستا (البهي الخولي) دەڵێت: (بێگومان دینی ئیسلام حەرامی ناکات کە ئافرەت کاربکات بەڵام ئەوەی لەسەر حەرام دەکات کە مەیدان و شوێنی سروشتی و شیاوی خۆی چۆڵ بکات بەبێ عوزر و بیانویەك، کە مەیدان و شوێنێکە کەس ناتوانێت بێجگە لە ئافرەت پڕی بکاتەوە، کاتێك ئافرەتەکە بچێتە شوێنێك کەپیاو بەتوانا و لێهاتویی خۆی ئاوەدانی بکاتەوە، بەجۆرێکە کە ئافرەتی پێویست نییە...).

فەیلەسوفی ئابووریناس (جول سموکن) دەڵێت: پێویستە ئافرەت بە ئافرەتی خۆی بمێنێتەوە، بێگومان ئەو بەو سیفەتەوە دەتوانێت بەختەوەری خۆی بەدەست بهێنێت و بیبەخشێت بە کەسانی تر، با حاڵی ئافرەتان چاك بکەین بەڵام نەیانگۆڕین و خۆمان لەوە بپارێزین کە بیگۆڕین بۆ حاڵی پیاوان).[٢١٨]

تیزێکی دکتۆرا داوا دەکات ئافرەتان بگەڕێنەوە ناوماڵ، لە بەشێکیدا دەڵێت: بەشی ئافرەتان لەکارە گشتی یەکاندا دەبێتە هۆی بێ ئاگابوون لەکاری سەرەکی ئافرەتی خۆیان کە سەرپەرشتی ماڵ و پەروەردەی منداڵە).[٢١٩]

## پوختەی قسە لە کاری ئافرەتاندا

ئەسڵ و شیاو وایە کە ئافرەت لەماڵدا بمێنێتەوە، تەنها بۆ پێویستی دەچێتە دەر، و کاری بنەڕەتی و سەرەکی ئافرەت سەرپەرشتی ماڵە.

[٢١٨] - المراة بين الفقه و القانون للدكتور مصطفى السباعي ص/١٧٦.

[٢١٩] - جريدة الأخبار ١٩٨٤/٤/١٧ نقلاً عن كتاب لاتظلموا المراة د. كامل الفقي و الرسالة الدكتوراه: أميمة فؤاد مهنى.

کاری ئافرەت لە دەرەوەی ماڵ ڕێگە پێدراوە، بە مەرجێك سەرپەرشتیاری ڕێگەی بدات و لەسەری ڕێك بکەوێت و لە فیتنە و ئاژاوە ئەمین بێت، و کارەکەیش لە سروشت و فیترەتی ئافرەت دەرنەچێت، و لاینەدات لە کار و پیشەی سەرەکی خۆی، و کارەکە کارێکی شیاو و چاك بێت و بەسود بێت بۆ کۆمەڵگا، وەك کاری مامۆستایی و پزیشکی و سستەری ئافرەتان و کار و باری ژیان، دەبێت لەو کرارانە نەبێت کەپێچەوانەی شەرعن وەك: ئەکتەری دراما و گۆرانی بێژ و ڕەقس و سەماکردن و خۆبادان و خۆ ڕوت کردنەوە و خۆ دەرخستن، یان کارەکە ی وا پێویست بکات کە سەفەر بکات بۆ شارێکی تر بەبێ کەسی مەحرەم و نزیکی، یان بمێنێتەوە لە کارەکەیدا یان تێکەلأوی بکات لەگەڵ پیاواندا یان داوای خۆڕازاندنەوە و خۆدەرخستن یان شتی تر بکات.

ڕێگە پێدراوە کە سەرپەرشتیاری کچان کچی خۆی بۆ هاوسەر پێشنیاربکات بۆ پیاوی چاکەکار.

پیاوچاکەکەی شاری مەدیەن پێشنیاری کچەکەی خۆی کرد بۆ موسا (علیه السلام) تا بیکاتە هاوسەری، ئەمەیش کارێکی جوان و پەسەندە و دەست پێشکەری یەکی بەرێزانە بوو، و ئیسلام دانی بەم کارەدا ناوە.

**نموونەیەك بە فەرمودە دەهێنینەوە.**

(سهل کوڕی سەعدی ساعدی) (خوا لێی ڕازی بێت) دەڵێت: ژنێك هاتە خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، هاتووم خۆمت پێشکەش بکەم، پێغەمبەری خوا (ﷺ) سەیری کردوو باش وورد بوەوە، پاشان سەری داخست، کە ژنەکە بینی پێغەمبەر (ﷺ) شتێکی لەبارەیەوە نەفەرمو، دانیشت، یەکێك لەهاوەڵانی هەستا و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەگەر تۆ داخوازی نیت بۆمنی مارە بکە، فەرمووی: ((ئایا هیچت هەیە بیکەیت بە مارە یی؟)) وتی: نەبەخوا ئەی پێغەمبەر. فەرموی: ((برۆماڵەوە بزانە هیچت دەست دەکەوێت))؟ ڕۆیشت وهاتەوە، وتی: نە بەخوا هیچم دەست نەکەوت، پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: ((هەوڵبدە با ئەڵقەیەکی ئاسنیش بێت)) کابرا چوو هاتەوە، وتی: نەبەخوا ئەی پێغەمبەر، ئەڵقەیەکی ئاسنیشم دەست نەکەوت، بەڵام ئەو پۆشاکە کەمە هەر باشە (نیوەی بۆئەو)، سهیل وتی: ئەو پیاوە پۆشاکی تری نیە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: ((چی دەکەیت لەو تەنها پۆشاکەت؟ تۆ لەبەری بکەیت هیچ بۆئەو نابێت،

ڕیش لەبەری بکات هیچی بۆتۆ نابێت)) کابرا دانیشت، دنیشتنەکەی درێژەی کێشا، ئینجا هەستا، پێغەمبەری خوا بینی کابرا ڕۆیشت،فەرمانیدا بانگ کرایەوە، کەهاتەوە پێی فەرموو: ((چەندە قورئانت لەبەرە؟)) وتی: فلآنە سوورەت و فلآنە سوورەت ژمارەی کردن فەرموی: ((لەبەر دەیانخوێنیت؟)) وتی: بەڵێ، فەرموی: ((برۆ ئەوە لێم مارە کردیت، بەو ئەندازە قورئانەی لەبەرتە)).[٢٢٠]

لەم فەرمودە پیرۆزەدا بەڵگە لەسەر ئەوە هەیە کەئافرەت خۆی پێشنیار بکات بۆ پیاوچاك، ئەمەیش لەڕێزو کەسایەتی ئافرەت کەم ناکاتەوە بەڵکو ڕێز و قەدری بەرز دەکاتەوە.

**لێهاتوویی لەکاری هاوسەرداریدا**

پێشەوا(أبوبكر بن العربي) دەڵێت: (لێهاتوویی لەکاری هاوسەرداریدا ڕەچاو کراوە، وزانایان ڕاوبۆچونی جیاوازیان هەیە ئایا لەدین و ماڵ و حەسەبدایە، یان لەهەندێکی ئەمانەدا؟ بەڵکو ڕاست و دروست ئەوەیە کەمارەبڕین ڕێگە پێدراوە لەبواری دیندا. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ﴾.

واتە: (بەڕێزترینتان لای خوا، لەخواترسترینتانە).

موسا هات بۆ لای پیاو چاکەکەی مەدیەن غەریب و دەرکراوو ترساو و تەنها بوو، نەماڵی پێ بوو نە کەل و پەل، لەگەڵ ئەمەیشدا پیاو چاکەکە یەکێك لە کچەکانی خۆی لێ مارە بڕی، کاتێك بۆی دەرکەوت کە دینەکەی ڕاست و دروستە و سەیری حاڵی کرد. زانی کەپشتی لە هەموو شتێکی خراپ کردووە).[٢٢١]

ئەوە ڕاستە، کە بنەمای چاکە و ڕێزگرتن لە نێوان خەڵکیدا تەقوای خوایە، چونکە تەقوای خوا، کۆکراوەی هەموو خەیرو چاکەیەکە، خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿ فَإِذَا بَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَأَمْسِكُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ أَوْ فَارِقُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ وَأَشْهِدُوا ذَوَيْ عَدْلٍ مِّنكُمْ وَأَقِيمُوا الشَّهَادَةَ لِلَّهِ

---

[٢٢٠] - رواه البخاري ومسلم في صحيحهما.

[٢٢١] - أحكام القرآن لابن العربي ١٤٦٦\٣ بەدەستکاریەوە.

﴿ذَلِكُمْ يُوعَظُ بِهِ مَن كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَمَن يَتَّقِ اللَّهَ يَجْعَل لَّهُ مَخْرَجًا(٢) وَيَرْزُقْهُ مِنْ حَيْثُ لَا يَحْتَسِبُ وَمَن يَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ فَهُوَ حَسْبُهُ إِنَّ اللَّهَ بَالِغُ أَمْرِهِ قَدْ جَعَلَ اللَّهُ لِكُلِّ شَيْءٍ قَدْرًا﴾ (الطلاق: ٢-٣).

واتە (ئەوەی لەخوا بترسێت و پارێزکار بێت، ئەوە خوا دەروی لێ دەکاتەوە..، لەشوێنێکەوە رزق و ڕۆزی پێ دەبەخشێت کەحیسابی بۆنەکردبێت و خۆی پێی نازانێت، جائەوەی پشت بەخوابەستێت، ئەو زاتەی بەسە). دەگونجێت و پێویستە هەموو موسڵمانێك بەجوانی کاری هەڵبژاردن و دیاریکردن ئەنجام بدات، تاهاوسەرداریەکەی ڕێك و پێك و موبارەك و پیرۆز بێت.

خوای گەورە لە سوورەتی(النور)دا دەفەرموێت: ﴿وَأَنكِحُوا الْأَيَامَى مِنكُمْ وَالصَّالِحِينَ مِنْ عِبَادِكُمْ وَإِمَائِكُمْ إِن يَكُونُوا فُقَرَاءَ يُغْنِهِمُ اللَّهُ مِن فَضْلِهِ وَاللَّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ﴾(النور:٣٢).

واتە: (ژن بدەن بەپیاوانی بێ ژن و ئافرەتانی بێوەژن بدەن بەشوو، هەروەها ژن بدەن بە بەندە صالحەکانتان، کەنیزەکەکانیشتان بدەن بە شوو، ئەگەر هەژاریش بن، ئەوە خوا لە فەزڵ و بەخششی خۆی بەهرەوەریان دەکات، خوای گەورەیش هەمیشە فراوانگیرو زانایە).

پێغەمبەر (ﷺ) لە فەرمودەیەکدا دەفەرموێت: (ئەگەر کەسێك هاتە لاتان و ئێوەیش لە دین و ئەخلاقی ڕازی بوون ئەوا کچی خۆتانی لێ مارە بکەن، ئەگەر نەتانکرد، ئەوا فیتنە و ئاژاوە و فەسادی زۆر و فراوان لەسەر زەویدا پەیدا دەبێت).[٢٢٢]

لە فەرمودەیەکی تردا (ابو هريرة) (خوا لێی ڕازی بێت) دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (لەبەر چوار مەبەست ئافرەت دەخوازرێت، یان بۆ ماڵ و سامانەکەی، یان لەبەر بنەماڵەکەی، یان لەبەر جوانی یەکەی، یان لەبەر دینداری یەکەی، جا تۆ ئافرەتی دیندار بهێنە، تا دەست پڕ بەرەکەت بیت).[٢٢٣]

[٢٢٢] - رواه الترمذي في السنن \كتاب النكاح.

[٢٢٣] - رواه البخاري و مسلم في صحيحهما.

مێژووی ئیسلامی بە درێژایی تێپەڕبوونی، پڕە لە هەڵوێستی جوان و ناوازە و نموونەی کرداری جوان و دروست بۆ مەنهەج و بەرنامەی ئیسلامی پیرۆز، بۆ هەڵبژاردنی هاوسەر لەسەر بنەما ی دین و ئەخلاقی جوان و دروست، بەلأم ئێمە زۆر سەرمان سوڕدەمێنێت، کە لە زۆرێك لە گەنجانی دەبیستین دەچن و لە دەرگای خەڵکی دەدەن بۆ داخوازی وخوازبێنی کچان و ژمارەیەکی زۆر پرسیار دەکەن، پرسیار لەکەس و کاری کچەکە و ئایا دەوڵەمەندن هەژارن، بنەماڵەیان کێیەو ناودارن بیٚ ناون شێخن یان مسکێنن، بەلأم غافڵ و بێئاگان لەپرسیارکردن لەدین و ئەخلاقی جوان ئەدەب و هەڵس و کەوتی دروست. پرسیار دەکەن ئایا چەندێك پارەی خەوتووی لەبانکەکاندا هەیە، ئایا لە ملیۆنەرەکانە یان خوارتر، بەلأم گویٚ بەوە نادەن بزانن نرخ و بەهای ئەو لای پاشای بونەوەر چەندە، پرسیار دەکەن لەوەی کە چی لەگیرفاندایە بەلأم پرسیارناکەن لەوەی کە چی لەدڵدایە.

## سەرپەرشتی ئافرەت لەکاتی بەشوو داندا

بە بۆنەی ئەو ئایەتەی چیرۆکی موسا لەگەڵ پیاوچاکەکەی مەدیەن: ﴿ قَالَ إِنِّي أُرِيدُ أَنْ أُنكِحَكَ إِحْدَى ابْنَتَيَّ هَاتَيْنِ عَلَى أَن تَأْجُرَنِي ثَمَانِيَ حِجَجٍ فَإِنْ أَتْمَمْتَ عَشْرًا فَمِنْ عِندِكَ وَمَا أُرِيدُ أَنْ أَشُقَّ عَلَيْكَ سَتَجِدُنِي إِن شَاءَ اللَّهُ مِنَ الصَّالِحِينَ﴾ (القصص: ٢٧).

زۆرینەی زانایانی فیقهی (مالیکی و شافیعی و حنبلی) بۆ ئەوە چوون، کە ئافرەت نابێت خۆی بکات بە سەرپەرشت بۆ بە شوودانی خۆی، چونکە بەو جۆرە کاری هاوسەرگیرییەکە دانامەزرێت، لە کاتێکدا کە سەرپەرشتی کردنی ئافرەت لەلایەن گەورەکەیەوە مەرجە بۆ ڕاست دامەزراندنی ئەو (عقد) کاری بە شودانە، ئەو کەسەیش کە (عقد)ەکە دەبەستێت، ئەوە (ولي) سەرپەرشتیاری ئافرەتەکەیە.[٢٢٤]

---

[٢٢٤] - احكام القرآن لإبن العربي ١٤٧٦/٣.

**بەڵام (أبو حنيفة) و (أبو يوسف) وای دەبینن، کە ئافرەتی ژیر و پێگەیشتوو، ئەوا مافی خۆی دەبێت لەبەشداری(عقد)ەکەدا بۆخۆی، ئیتر کچ بێت یان بێوەژن، کاتێك خۆی بەشودا بەمێردەکەی، ئەوەی بەسە و لێهاتویی خۆی بووە و مارەیی یەکەیش لەسەری ڕێك کەوتوون کە(مهر المثل) ە، یان زیادە، ئەوا شوکردنەکە دامەزراو و ڕاست و جێ بەجێ بووە.**

**زۆرینەی زانایان بەڵگەیان لەسەر مەرج دانانی (ولي) گەورە و سەرپەرشت هێناوەتەوە، هەندێك لەو بەڵگانە باس دەکەین:**

**١- ئایەتی:** ﴿وَلَا تَنكِحُوا الْمُشْرِكَاتِ حَتَّىٰ يُؤْمِنَّ وَلَأَمَةٌ مُّؤْمِنَةٌ خَيْرٌ مِّن مُّشْرِكَةٍ وَلَوْ أَعْجَبَتْكُمْ﴾(البقرە:٢٢١).

**واتە: (ژن مارە مەبڕن لەپیاوانی موشریك و خوانەناس، هەتا ئیمان و باوەڕدەهێنن، بەڕاستی بەندەیەکی ئیماندار چاکترە لە موشریك و خوا نەناسێك، هەرچەندە سەرسامی کردبن (قەد و قیافەت و پلە و سامانەکەی)).**

**زانا (القرطبي) دەڵێت: لەم ئایەتەدا بەڵگە هەیە کە مارەبڕینەکە بەبێ سەرپەرشت دانامەزرێت).**[٢٢٥]

**٢- ئایەتی:** ﴿وَأَنكِحُوا الْأَيَامَىٰ مِنكُمْ وَالصَّالِحِينَ مِنْ عِبَادِكُمْ وَإِمَائِكُمْ إِن يَكُونُوا فُقَرَاءَ يُغْنِهِمُ اللَّهُ مِن فَضْلِهِ وَاللَّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ﴾(النور:٣٢). **(پێشتر مانا کرا).**

**لێرەدا خوای گەورە ڕووی کردۆتە سەرپەرشتان، و ئایەتەکە مەرجی (ولي) داناوە.**

**٣- ئایەتی:** ﴿وَإِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاءَ فَبَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَلَا تَعْضُلُوهُنَّ أَن يَنكِحْنَ أَزْوَاجَهُنَّ إِذَا تَرَاضَوْا بَيْنَهُم بِالْمَعْرُوفِ﴾(البقرة:٢٣٢).

**واتە: (هەروەها ئەگەر ژنتان تەڵاقدا و گەیشتنە کۆتایی عادەی مانگانەیان، ئێوە (ئەی کەس و کاری ژن) مەبنە کۆسپ لە ڕێگەیاندا ئەگەر ویستیان شو بکەنەوە بە**

---

[٢٢٥] - الجامع لأحكام القرآن ٣/٧٢.

هاوسەرەکانیان (یاخود ویستیان شویەکی تر بکەن)کاتێك ئەوان لەنێوان خۆیاندا ڕەزامەندییان نواند بەشێوەیەکی جوان).

٤- پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: (لا نِكاحَ إلاَّ بِولي)[٢٢٦].

واتە: مارەبڕین بەبێ سەرپەرشتی کەس وکار دروست و ڕاست و دامەزراو نییە.

لەمانەوە بۆمان دەردەکەوێت کە ئەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) جێگیر بووە، لە سوننەت و کردار و وتەی دا لەکاتێکدا کە دایکانی ئیماندارانی خواستووە، بێگومان ئەو داخوازی(عائشة) ی لە (أبی بکر) کرد[٢٢٧]. و (حفصة)ی خوازبێنی کرد لە باوکی کە(عمر) بوو[٢٢٨]. لەگەڵ ئەوەشدا کە پێغەمبەر (ﷺ) باشتر و نزیکتر بووە بۆ باوەڕداران تەنانەت بۆ نەفسی خۆیشیان، کاتێك داخوازی (أم سلمة)ی کرد، (أم سلمة) خۆی پێشکەش نەکرد یەکسەر. بەڵکو فەرمانی خۆی دایە دەست کوڕەکەی، کەپێی وت: هەستە من بدە بە پێغەمبەری خوا (ﷺ)، ئەویش دایکی خۆی دا بە پێغەمبەری خوا (ﷺ).

حەنەفییەکانیش لە مەزهەبی خۆیاندا بەم جۆرە بەڵگەیان هێناوەتەوە:

١- ئایەتی: ﴿فَإِن طَلَّقَهَا فَلَا تَحِلُّ لَهُ مِن بَعْدُ حَتَّىٰ تَنكِحَ زَوْجًا غَيْرَهُ﴾(البقرە: ٢٣٠).

واتە: (خۆ ئەگەر (بۆجاری سێیەم، پیاو ژنەکەی خۆی) تەلاقدا، ئەوە ئیتر جارێکی تر بۆی حەلاڵ نابێت، مەگەر دوای ئەوەی شویەکی تر بکات و (هاوسەری دووەمی بەشێوەی ئاسایی تەلاقی بدات یان بمرێت) ئەوە بۆیان هەیە بگەڕێنەوە بۆلای یەکتر و (ژیانی ژن و مێردایەتی دەست پێ بکەنەوە)) بەجۆرێك کە فەرمانی شوکردنەکە دراوەتە پاڵ ئافرەتەکە.

ئێمەیش دەڵێین: لێکدانەوە و دەربڕین بەووشەی ﴿تَنكِحَ﴾ بۆ ئەوەیە کە ئافرەتەکە لایەنێکە لە (عقد)ەکە، نەك خۆی بداتەوە بەشو بەبێ گەورە و سەرپەرشت.

---

٢٢٦- رواه أبوداود في السنن عن ابي موسى الأشعري سنن ابي داود كتاب النكاح، باب \في الولي حديث(٢٠٨٥).

٢٢٧- صحيح البخاري كتاب النكاح.

٢٢٨- صحيح البخاري كتاب النكاح.

٢- بەڵگە بەم فەرمودەیە دەهێنینەوە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: (بێوەژن حەقتر و نزیکترە بە نەفسی خۆی تا وەلی و سەرپەرشتەکەی بەلاّم کچ دەبێت داوای لیّ بکرێت و ڕاوێژی لەگەڵ بکرێت، ئەگەر بێدەنگ بوو، ئەوە ڕازی بووە).[٢٢٩]

پێشەوا (النووي) لە ڕونکردنەوەی ئەم فەرمودەیەدا دەڵێت: (بزانە دەربڕینی ووشەکانی فەرمودەکە ﴿أحق﴾ لێرەدا بۆ بەشداری کردنە، واتە بێوەژنەکە لە نەفسی خۆیدا مافی شوکردنەوەی هەیە، و هەروەها گەورە و سەرپەرشتیارەکەیشی مافی هەیە، بەلاّم حەقی خۆی دڵنیاترە لە حەقی (ولي)یەکەی، چونکە ئەگەر ویستی هاوسەربکات بەلێهاتوویی خۆی و بەلاّم ڕێگەی لێگیرا و قەدەغەکرا، ئەوە ئەو زۆری لیّ نەکراوە، ئەگەر ویستیشی مێرد بکاتەوە بە لێهاتوویی خۆی، و (ولي)یەکەی ڕێگەی لێگرت و قەدەغەی کرد، ئەوە زۆری لێکراوە، و ئەگەر سوور بوو کە (قاضي) دادوەر بیدات بەشوو ئەوە بەڵگەیە لەسەر دڵنیاکردنەوەی حەقەکەی و کارەکە گونجاو وهاوسەنگ دەردەچێت).[٢٣٠]

بەلاّم بۆچوونی ڕاست و گونجاو لەم مەسەلەیەدا: بۆچونی زۆرینەی زانایانی (فیقە)، ئەو بەڵگانەیشی هێنایانەوە لەسەری شایەتی ڕاستی بۆچوونەکانیانە.

## حیکمەت لە بەمەرج دانانی ( الولي ) ومافی ئافرەت لە هەڵبژاردنی هاوبەشی ژیانی

بە مەرج دانانی (ولي) سەرپەرشت، چاکترە بۆ ئافرەتان و گونجاوتریشە لەگەڵ سروشتیان و فیترەتیاندا و متمانەدار ترە، تا کاری عادەتی و خۆشەویستی لەنێوان تاکەکانی خێزاندا.

(شیخ محمد ابو زهرة) دەڵێت: ((عقد) بڕیاری مارەبڕین و بەشوودان لەبەر کاری مەترسیداری و تەواوی ئەو کارە، نابێت ئافرەت سەرپەرشتیاری بکات، و عادەتی خەڵکیش لەسەر ئەوە دەڕوات، و بەرژەوەندی لەوەدا ڕەچاوکراوە و هەیە، چونکە کاری (زواج) مەترسی گەورەی تیایە، و پیاوان سندوقی داخراون ئافرەتان ناتوانن بە حەقی

---

٢٢٩- رواه مسلم في صحيحه عن ابن عباس كتاب النكاح.

٢٣٠- صحيح مسلم بشرح النووي ٢٠٤/٩.

او بیانناسن، چونکە ئافرەتان پابەندن بە بۆچوون وتێگەیشتنی خۆیانەوە و لەژێر کاریگەری هەست و سۆز و عاتیفەی نێوان خۆیاندان، ئەو هەست و سۆزە زاڵ دەبێت بەسەریاندا لەگەڵ هەواو ئارەزوودا و بە شێوەیەکی ڕاستگۆیانە ناڕوانن بۆ کارەکە و هۆشیار و بەئاگانین، لەبەرئەوە بەرژەوەندییەکە لەوەدایە کە (ولي) لەگەڵ ئافرەتەکەدا بەشداری بکات لە هەڵبژاردنی هاوسەرەکەیدا، چوونکە ئەو دەگەڕێت و دەکۆڵێتەوە و ناڕوانێت بۆ شێوە و ڕوخسار، چونکە بڕیارەکە مەترسیدارە و بەخراپە دەگەڕێتەوە سەر(ولي) یەکەی، چونکە هاوسەرداری دوو خێزانی نوێ بەیەکەوە دەبەستێت، کابرای(ولي) بەهۆی بەشودانی خراپ و نادروستەوە تووشی ئازاردێت، و بەهۆی بەشودانی بەڕێزانەوە ڕێزدار دەبێت، پەیمان و بڕیاری بەشودان و ژنهێنان وەك بڕیار و مامەڵەی ماڵ و دارایی و شت و مەك نییە، چونکە مەترسییەکەی وەك مەترسی ئەم نییە، چونکە ڕزگاربوون لە شوێنەوارەکانی مامەڵە ئاسانە و کار ناکاتە سەر ژیان و ئاراستەکانی، هەروەها شوێنی ئارەزوو نی یە، کە فکرەو بۆچونی تیا تێك بچێت، وەك کاری پەیوەندی نێوان ژن وپیاو نیە).[٢٣١]

مامۆستا (حسین محمد یوسف) لەکتێبی (آداب العقد والزفاف في الأسلام)دا دەڵێت (ئیسلام ڕازی نەبووە ئافرەت خۆی بە تەنها سەرپەرشتی کاری (زواج) بەشودانی خۆی بکات ڕاستوخۆ، دەبێت ئافرەت لەو شوێنانە بە دوور بخرێت کەناڕەحەتی دەکات، وڕێزی پارێزراوبێت، حەیا و ئابڕویشی لەکەدار نەکرێت، بەو شێوەیە بمێنێتەوە کە ئیسلام دەیەوێت، وەك گەوهەرێکی شاراوەو پارێزراوە، بەنرخە و بێهاوتایە، کەس نابێت پێی بگات بەبێ بڕیاری شەرعی، چونکە ئەو لای خوا و خەڵکیش ڕێزی هەیەو کەرامەتدارە لەپێناو ئەوەدا ئیسلام بەمەرجی داناوە، کە(ولی) سەرپەرشتی هەبێت، تاشوێنی بگرێتەوە بۆ کاری زەواج و خۆی بداتە بەر ئەو کارە و، بەپایەیەك لەپایەکانی (عقد) بڕیارەکە ژمێردراوە یان مەرجێکە لەمەرجەکانی ڕاستی و تەواوی بڕیارەکە، ئامانجدارە لەوەدا ئەگەر (ولی)یەکەی دڵسۆز و ئەمین بێت بۆ ئافرەتەکە، و ئەوە مەبەستی ڕاستی خۆی دەرخستووە و گەیاندویەتی، ئەوکارەی ویستووە کە ئیسلام بۆی داناوە و باش تەقدیری کردووە).[٢٣٢]

---

[٢٣١] - الأحکام الشخصیة لأبي زهرة ص\١٢٩ بەدەستکاریەوە.

[٢٣٢] - آداب العقد والزفاف في الأسلام (ص\٧٠-٧١) بەدەستکاریەوە.

هەروەها دەڵێت: (هەڵوێستی (ولی) سەرپەرشت لە ئافرەتدا، هەڵوێستێکی خەبیرانە و ئەمینانەیە کە هەموو شتێك بۆ ئافرەتەکە ڕوون دەکاتەوە کە لە کارەکاندا نادیار و شاراوەیە، تاجوانی و ڕواڵەت هەڵی نەخەڵەتێنێت کە ناوەڕۆکەکەی بۆش و بەتاڵە یان هەست وسۆز و هەواو ئارەزو بەکێشی بکات، هەروەها هەتا ئەو هەوڵی بەدوادا گەڕان و ناڕەحەتی و باش دیاریکردنە ببینێت بەرامبەر ئەو کەسانەی کە دێن بۆ داخوازی ئافرەتەکە یان حەزیان بەمارە بڕینی هەیە).[٢٣٣]

## ئازادی هەڵبژاردن

بێگومان ئیسلام ئەوەی بۆ ئافرەتان دەستەبەر کردووە، کە بەحەز و ئازادی خۆیان کەسێك بۆ هاوبەشی ژیانیان هەڵبژێرن، ئەوە مافی باوك نییە، کە کچەکەی بدات بەشوو بە کەسێك، کە کچەکە حەزی لێی نییە، یان باوکەکە لەسەر شووکردن زۆری لێ بکات یان ناچاری بکات بۆکەسانێك کەحەزی لێی نییە، ئەوکاتە (زواج) بەشوودانەکە بەتاڵە و دانەمەزراوە، یان ئەوەتا دەبێت باوکەکە داوای لێ بکات و کچەکە ڕازی بێت.

(أبی هریرة) (خوالێی ڕازی بێت) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (بێوەژن مارە ناکرێت هەتا قسەی لەدەم وەرنەگیرێت، کچیش مارە ناکرێت هەتا مۆڵەتی لێ وەرنەگیرێت)، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ): مۆڵەت وەرگرتن لەکچ چۆنە؟ فەرموی: ((ئەوەیە کەبێدەنگ بێت)).[٢٣٤]

لە (خنساء کچی خدام)ی (الأنصاري)ەوە: باوکی دای بەشوو کە بێوەژن بوو، ئەوەی پێناخۆش بوو، ئینجا هات بۆ لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەویش شوکردنەکەی بۆ هەڵوەشاندەوە).[٢٣٥]

(بەڵگەکان زۆرن لەسەر ئەمە، بەڵام لێرەدا ئەوەندەمان بەسە).

---

[٢٣٣] - هەمان سەرچاوە (ل٧٠-٧١).

[٢٣٤] - رواه البخاري ومسلم في صحيحهما. كتاب النكاح.

[٢٣٥] - رواه البخاري في كتاب النكاح.

هەروەها نابێت باوك زۆر لە کچەکەی بکات لەسەر شووکردن و ناڕەحەتی بکات بۆ کەسانێك کە کچەکەی حەز ناکات، هەروەها حەقی ئەوەیشی نییە کە نێوانی کچەکە ی و نێوان حەز و ئاواتەکانی لەیەك دوور بخاتەوە لەشوو کردنیدا، ئەگەر کچەکە خۆی حەزی دەکرد، ئەگەر گونجاو و لێهاتوو لەبار بوو.

پوختەی قسەکان بریتین لە: بێگومان ئیسلام حەق و مافی هەڵبژاردن و دیاریکردنی ئازادانەی داوە بە ئافرەتکە هاوبەش بۆ ژیانی خۆی هەڵبژێرێت، و شەرعیش مەرجی سەرپەرشتی کردنی لەسەر داناوە بۆ شوکردنەکەی، بۆپاراستن و چاودێری ئەو لەسەر بەرژەوەندی و رێزگرتن و رێزدارکردنی، بۆ دڵنیاکردنەوە و بەمتمانە کارکردن بۆ پەیوەندی دامەزرندنی هاوسەرێتی یەکەی، بۆ ئەوەی پەیوەندی بەهێز و خۆشەویستانە بێت لەخێزاندا.

## رێگە پێدراوە کە پیشە و کاری بەسود لەجیاتی مارەیی ئافرەت بدرێت

هەندێك لەزانایانی (فیقە) بەم ئایەتە بەڵگەیان هێناوەتەوە خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿قَالَ إِنِّي أُرِيدُ أَنْ أُنكِحَكَ إِحْدَى ابْنَتَيَّ هَاتَيْنِ عَلَى أَن تَأْجُرَنِي ثَمَانِيَ حِجَجٍ. . . . .﴾ کە رێگە دراوە لە جیاتی مارەیی کارێکی سود بەخش بکرێت و لەحەقی مارەیی بدرێت بە ئافرەتەکە، وەك شارەزایی لەبەرگ دورین و کاری بیناسازی و فێرکردنی قورئان و....هتد.

لەسوننەتی پێغەمبەردا بەڵگە بەم جۆرە هێنراوەتەوە، وەك لە فەرمودەکەی پێغەمبەردا باسمان کرد، کاتێك ئافرەتەکە هات بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) خۆی پێشکەش کرد، بەڵام پێغەمبەر (ﷺ) حەزی لێی نەبوو، لە هاوەڵێکی تری بەرێزی مارەکرد لەسەرئەو ئەندازە قورئانەی کە لەبەری بوو. هەروەها لە شوانێتییەکەی موسا (علیه السلام) بۆ مەڕو ماڵاتەکەیان، ئیتر کچەکان لەو کارە بەخشران کە کارێکی قورس و گران بوو، کە ناچار بوو بوون، ئەوەش لەبەر نەبوونی کەسێك بوو، کە بەو کارە هەستێت.[٢٣٦]

---

[٢٣٦] - احکام القرآن لابن العربي ١٣\١٤٧٠ و احکام القرآن للقرطبي ١٢\٢٧٢.

### چوارەم:

### کۆمەڵێك لە ئەخلاق و ئەدەبە جوانەکان کە لە چیرۆکەکە وەردەگیرێت:

لەم چیرۆکەدا کۆمەڵێك لە ئەخلاق و ڕەوشتی جوان هەیە. بەکورتی ڕونیان دەکەینەوە.

● **دڵسۆزی:**

لە ئایەتی: ﴿وَجَاءَ رَجُلٌ مِّنْ أَقْصَى الْمَدِينَةِ يَسْعَى قَالَ يَا مُوسَى إِنَّ الْمَلَأَ يَأْتَمِرُونَ بِكَ لِيَقْتُلُوكَ فَاخْرُجْ إِنِّي لَكَ مِنَ النَّاصِحِينَ﴾. هەڵوێستێکی گەورە و ئەخلاقێکی جوان هەیە، کە پیاوەتی و لێهاتوویی ئەو پیاوە دڵسۆزە دەگەیەنێت کەهات و ئامۆژگاری موسا(علیە السلام)ی کرد، بێگومان ئازایانە و جەریئانە هات و هەموو بەرپرسیارێتییەکی خستبوە سەرشانی خۆی خێرا دەهات و لەوپەڕی شارەوە بوو، تەنها پیاوەتی و دڵسۆزی پاڵی نابوو، دڵسۆزی ئەم پیاوە لێرەدا بۆ موسا (علیە السلام) وانەیەکی گرنگ و گەورە بوو، بۆ هەموو موسڵمانێکی دڵسۆز و ئەمین.

لە (جابری کوڕی عبداللە)وە (خوا لێی ڕازی بێت) وتی: ((بەیعەتم دا بە پێغەمبەر (ﷺ) لەسەر نوێژکردن و زەکات دان و دڵسۆزی بۆ هەموو موسڵمانێك)).[٢٣٧]

● **پیاوەتی و چاکەیەك:**

لە ئایەتی: ﴿وَلَمَّا وَرَدَ مَاءَ مَدْيَنَ وَجَدَ عَلَيْهِ أُمَّةً مِّنَ النَّاسِ يَسْقُونَ وَوَجَدَ مِن دُونِهِمُ امْرَأتَيْنِ تَذُودَانِ قَالَ مَا خَطْبُكُمَا قَالَتَا لَا نَسْقِي حَتَّى يُصْدِرَ الرِّعَاءُ وَأَبُونَا شَيْخٌ كَبِيرٌ (٢٣) فَسَقَى لَهُمَا ثُمَّ تَوَلَّى إِلَى الظِّلِّ فَقَالَ رَبِّ إِنِّي لِمَا أَنزَلْتَ إِلَيَّ مِنْ خَيْرٍ فَقِيرٌ (٢٤) فَجَاءَتْهُ إِحْدَاهُمَا تَمْشِي عَلَى اسْتِحْيَاءٍ قَالَتْ إِنَّ أَبِي يَدْعُوكَ لِيَجْزِيَكَ أَجْرَ

---

[٢٣٧] - رواه البخاري ومسلم في صحيحهما في كتاب الأيمان.

مَا سَقَيْتَ لَنَا فَلَمَّا جَاءَهُ وَقَصَّ عَلَيْهِ الْقَصَصَ قَالَ لَا تَخَفْ نَجَوْتَ مِنَ الْقَوْمِ الظَّالِمِينَ(٢٥) قَالَتْ إِحْدَاهُمَا يَا أَبَتِ اسْتَأْجِرْهُ إِنَّ خَيْرَ مَنِ اسْتَأْجَرْتَ الْقَوِيُّ الْأَمِينُ﴾ (القصص\٢٣-٢٦).

**ئاماژە کراوە بۆ پیاوەتی و چاکەو لێهاتوویی موسا (علیه السلام) و سوربونی لەسەرچاکە و پیاوەتی نواندن.**

**چاکەو پیاوەتی و بەدەمەوە چوونی لێقەوماوان و چاکەکردن لەگەڵ خەڵکیدان لە ئەخلاق و ڕەوشتە جوان و پەسەندەکانن کە ئیسلام بانگەوازیان بۆدەکات.**

**خوای گەورە فەرمویەتی:** ﴿وَأَنفِقُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَلَا تُلْقُوا بِأَيْدِيكُمْ إِلَى التَّهْلُكَةِ وَأَحْسِنُوا إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ﴾ (البقرة\١٩٥).

**واتە: (چاکە و خەیری زۆر بکەن، بێگومان خوای گەورە چاکەکارانی خۆش دەوێت).**

**هەروەها فەرمویەتی:** ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا ارْكَعُوا وَاسْجُدُوا وَاعْبُدُوا رَبَّكُمْ وَافْعَلُوا الْخَيْرَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾(الحج\٧٧).

**واتە: (ئەی ئەو کەسانەی ئیمان و باوەڕتان هێناوە ڕکوع و سوجدە بەرن (نوێژەکانتان بەجوانی ئەنجام بدەن) پەروەردگارتان بپەرستن لەهەموو بارودۆخێکدا و تا دەتوانن چاکە و چاکەکاری ئەنجام بدەن، بۆئەوەی سەرفرازو سەرکەوتوو بن....).**

**(ابي ذر) (خوا لێی ڕازی بێت) دەڵێت: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) چاکترین کار کامەیە؟ فەرمووی: ((باوەڕ بەخوا و جیهاد لەپێناویدا)) دەڵێت: وتم: چاکترین ئازاد کردن کامەیە؟ {ئازادکردنی کۆیلە} فەرموی: ((گرانترینیان و بە بەهاترینیان لای خاوەنەکەیان)) دەڵێت: وتم: ئەگەر نەمکرد؟ فەرمووی: ((یارمەتی پیشە کارێك بدەیت، یان یارمەتی کەسێك بدەیت کەپیشە باش نازانێت یان هیچ پیشەیەکی نیە)) دەڵێت: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێت چۆنە ئەگەر بێتوانا بووم لە هەندێك کار؟فەرمووی: ((شەڕ و خراپەت لەخەڵکی لابدە، ئەوەش خێرێکە لە تۆوە بۆخۆت)).[٢٣٨]**

---

[٢٣٨] - (رواه البخاري في كتاب العتق) و(مسلم في كتاب الأيمان).

لە (ابي هريرة)وە (خوالێی ڕازی بێت) وتی: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (هەموو جومگەیەك لە مرۆڤدا خێر و چاکەیەکی لەسەرە، هەموو ڕۆژێك کە خۆری تیا هەڵدێت، فەرموی دادپەروەری و ئاشتەوایی بخەرە نێوان دوو کەسەوە، ئەوە خەیر و چاکەیە، یارمەتیدانی پیاوێك بۆ بارکردنی بارەکەی بۆسەر پشتی وڵاغەکەی، یان خۆی سەری بکەوێت، ئەوەش هەر خەیر و چاکەیە، فەرموی: وتنی ووشەیەکی جوان و چاك ئەویش هەر خەیر و چاکەیە، هەموو هەنگاونانێك بۆ نوێژ، ئەویش هەر خەیر و چاکەیە، و لابردنی ئازار و ناڕەحەتی لەسەر ڕێگا، ئەویش هەر خەیر و چاکەیە).[٢٣٩]

## • سوپاسگوزاری بەرامبەر چاکە:

لەسەر ئەوەی پیاو چاکەکەی مەدیەن سوور بوو لەسەر خەڵات کردنی موسا (علیه السلام) لە ئەنجامدانی کارەکەی بۆیان، ئاماژە بۆ ئەخلاقی جوان و پەسەند و بەڕێزانە کراوە، کە ئەوەش پاداشتی چاکەیە بەرامبەر چاکە، و سوپاس و شوکرانە بژێری یە بەرامبەر چاکە.

لە (إبن عمر) ەوە، (خوا لێی ڕازی بێت) وتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: ((هەرکەس داوای پەناگرتن بەخوا لە خوا بکات، خوای گەورە پەنای دەدات، و هەرکەس داوا لە خوا بکات، ئەوا پێی دەبەخشێت، هەر کەش چاکەیەکی بۆ هێنان یان توشی کردن پاداشتی بدەنێ، ئەگەر نەتان توانی ئەوا دوعای خەیر و چاکەی بۆ بکەن تا ئەو بزانێت کە پاداشت و خەڵات کراوە).[٢٤٠]

## •ڕەوشتی شەرمداری:

(الحیاء) شەرم، بریتییە لە گرتنەوەی نەفس لە شتە پیس و بێزراوەکان، و گرتنەوەی نەفس لە لادان و زیادە ڕەوی لەماف خاوەن مافدا.[٢٤١]

---

[٢٣٩] - (رواه البخاري في كتاب العتق) و(مسلم في كتاب الأيمان).

[٢٤٠] - رواه أبوداود في السنن كتاب الزكاة و النسائي في الزكاة و البخاري في الأدب المفرد و اورده الباني في صحيح سنن النسائي برقم(٢٤٠٧).

[٢٤١] - بصائر ذوي التمييز ٢/٥١٥.

لە ئایەتی﴿فَجَاءَتْهُ إِحْدَاهُمَا تَمْشِي عَلَى اسْتِحْيَاءٍ﴾ لێکدانەوەیەکی ناسك و جوان و ناوازە و وێناکردنێکی وورد و باسێکی بێ وێنە کراوە بۆ ئەو حاڵەتە ی کە کچەکە ی لەسەر بووە لەکاتی ڕۆیشتندا بە حەیا و شەرم و شکۆوە، لەم لێکدانەوە قورئانییە جوانەدا، ئاماژە کراوە بۆ کارێك کە پێویست و گونجاوە کە کچان و ئافرەتانی موسڵمانی لەسەربن لە حەیا و شەرم وشکۆدا. حەیا و شەرم بەشێکە لە ئیمان وجوانییە بۆ کەسێك کە خۆی پێ ڕازاندبێتەوە.

پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (ئیمان ئەوەندە و شەست یان ئەوەندە و حەفتا بەشە، بەڕێزترین و گەورەترینیان وتنی (لا إله إلا الله) یە، وخوارترینیشیان لابردنی ئازار و ناڕەحەتی یە لەسەر ڕێگای خەڵکیدا، (حیاء) شەرم و حەیائیش بەشێکە لە ئیمان).[٢٤٢]

(أبو سعيد الخدري) (خوا لێی ڕازی بێت) دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) (خوا لێی ڕازی بێت) لە گەورە کچی ناو پەردە زیاتر شەرمی دەکرد و، ئەگەر شتێکی لا ناخۆش بوایە لە ڕومەتیا دەمانزانی).[٢٤٣]

ئیمامی بوخاری لە (صحيح)ەکەیدا ڕیوایەتی کردوە لە (أبي مسعود عقبة) (خوا لێی ڕازی بێت) وتی: (خوا لێی ڕازی بێت) فەرمویەتی: بێگومان ئەوەی کە خەڵکی لە قسە و ووتەی پێغەمبەرانی پێشوو سەرەتاوە دەستی کەوتووە بریتی بووە لەوەی کە فەرمویانە: ئەگەر شەرمت نەکرد، ئەوا بۆ خۆت هەرچیت پێ خۆشە ئەنجامی بدە).[٢٤٤]

حەیاء وشەرم هەمووی خەیر و چاکەیە، هەروەها جوانیشە بۆ خاوەنەکەی و بەشێکیشە لە بەشەکانی ئیمان.

پێویستە لێرەدا هەڵوێستەیەك بکەین، ئێمە لە باسی حەیا و شەرم قسە دەکەین کە لەڕونترین و ناوازەترین شێوەدا بۆ ئێمە دەردەکەوێت و خۆی لەو پەڕی ڕازاوەییدا نیشانی ئێمە دەدات، ئێمە بیردەکەینەوە و ڕادەمێنین لە ئایەتە قورئانییەکان کە دەربارەی دوو کچەکەی پیاو چاکەکە دەدوان، کە دوو نموونەی جوان بوون لە حەیاو

[٢٤٢] - رواه البخاري عن أبي هريرة في كتاب الأيمان. ومسلم في الأيمان.

[٢٤٣] - رواه البخاري في كتاب المناقب و مسلم في كتاب الفضائل.

[٢٤٤] - رواه البخاري كتاب الأدب.

شەرمدا، و نموونەی جوانیان لە پاکی و داوێن پاکی و زمانپاراوی و کورتبڕی و زیرەکیدا هێنایەوە، بەڵام کاتێك بیر لە زۆرێك لە ئافرەتانی ئەم سەردەمە دەکەینەوە کە بەرگی پۆشتەیی و شەرمیان لەبەر خۆیان نەهێشتووە و ئابڕوی خۆیان سوك کردوە و شکاندوە و بەشێك لە عەورەتی حەرامی خۆیان کە پێویستە داپۆشراو بێت، دەرخستووە، بەجل و بەرگێکەوە دەچنە دەرەوە کە وەك ڕوتن و بەشێك لە جەستەیان داپۆشراوە و بەشێکی بێ بەرگە و لەنجە ولار دەکەن و سەرنجی خەڵکی بەلای خۆیاندا ڕادەکێشن.

ئافرەت لەماڵی خۆی دەچێتە دەر و سەر و قژی دا نەپۆشراوە و قۆڵ و باڵی بە دەرەوەیە و ڕوتە، و لاق و ڕانی دەردەکەوێت وەك ئەوەی بەناو ئاودا بڕوات و تەڕ نەبێت یان لەناو مێرگ و گۆلاودا بێت، ئەمە سەرەڕای جل و بەرگی تەسك کە وێنەی ئەندامەکانی جەستەی دەکێشێت و ئەندامە هەستیار و ئارەزو ڕاکێشەکانی دەردەخات و مووی جەستەی دەردەکەوێت بەبێ ئەوەی ڕەچاوی هەستی پیاوان بکات، و بەبێ ئەوەی گوێ بداتە هەستی ئەوان، ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە ئافرەتەکە بۆخۆی بێ هەست و شعورە.

تۆ بە بیرکردنەوەی خۆت بەراوردێك لەگەڵ ئەم نموونە و دوو کچەکەی پیاو چاکەکەی مەدیەندا بکە، کاتێك باوکیان ناردنی بۆ کاری ئاودان و پاشان یەکێکیانی نارد بە دوای موسا(علیه السلام)دا کە بانگی بکات بۆلای باوکی، خوای گەورە دەربارەی فەرمووی: ﴿فَجَاءَتْهُ إِحْدَاهُمَا تَمْشِي عَلَى اسْتِحْيَاءٍ قَالَتْ إِنَّ أَبِي يَدْعُوكَ لِيَجْزِيَكَ أَجْرَ مَا سَقَيْتَ لَنَا﴾. وەك ئەوەی (حیاء) فراوان و درێژ کراوە بوو بێت لە دەرگای ماڵی کچەکەوە بۆ لای ئەو درختەی کەسێبەری کردبوو، و موسا پێغەمبەری لەژێردا بوو.

## • بەهێزی و ئەمینی و ئەمانەت پارێزی:

لەم ئایەتەدا دەردەکەوێت: ﴿ قَالَتْ إِحْدَاهُمَا يَا أَبَتِ اسْتَأْجِرْهُ إِنَّ خَيْرَ مَنِ اسْتَأْجَرْتَ الْقَوِيُّ الْأَمِينُ﴾(القصص:٢٦). ئاماژەکراوە بۆ بەهێزی و ئەمینی بەتایبەتی لەو کارەدا کە موسا

(علیه السلام) خۆی بۆ هەڵبژارد و هەستا پێی. پێشتریش یوسف(علیه السلام) بە پاشای گەورەی میسری وت: ﴿قَالَ اجْعَلْنِي عَلَى خَزَآئِنِ الأَرْضِ إِنِّي حَفِيظٌ عَلِيمٌ﴾ (یوسف:٥٥). لەم ئایەتانەوە بۆمان دەردەکەوێت کە ئەمینی و دەست پاکی لەهەموو کارێکدا پێویست و داواکراوە، دەبێت کاربەدەست ئەمین بێت، هەروەها دەوروبەرەکەیشی. پێغەمبەر (ﷺ) لە فەرمودەیەکدا دەفەرموێت: (کاتێك ئەمانەت وونکرا چاوەڕێی قیامەت بکەن، وترا: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ): ونکردنی ئەمانەت چۆنە و کەی دەبێت؟ فەرمووی: کاتێك کارێك درا بە کەسێك کە ئەهلی ئەو کار نەبوو).[٢٤٥]

## گەورەیی پەروەردەکردنی کچان و چاکەکردن لەگەڵیان

بێگومان دوو کچەکە لە پلەیەکی زۆر بەرزدا بوون لە ئەخلاقە جوانەکاندا، ئەوەیش لە حەیا و شەرم و شکۆیاندا دەرکەوت، هەروەها لە بەلاغەت و جوان مامەڵەکردنیان و ئەخلاقی بەرز و جوانیان، کە بەڵگە بوون لەسەر جوان پەروەردەکردنیان، پێشتر خوشکەکە ی موسا نموونەی جوانی ئەخلاقی بەرزی پێشکەش کرد، ئەوەش لە گوێڕایەڵی کردنی فەرمانی دایکیدا و چاکە کردنی بەرامبەر براکەی و هەڵگرتنی ناڕەحەتی و مەترسییەکان لەکاتی شوێنکەوتنی.

کچانی مسوڵمان ئەگەر لە ماڵێکی چاك بن و پەروەردەی چاك کرابن و لە ژینگەیەکی پاك و چاکدا بوو بن و بە پێی بەرنامەی ئیسلام و ڕێنماییە جوان و دروست و حەکیمانەکانی کاربکەن: ئەوا بێگومان پاش ئەوانە دەبنە هاوسەرانێکی باش و چاکەکار و دایەنێکی پاك و دڵسۆز، پەروەردەی کچان کارێکی جوان و بەرپرسیارێتییەکی گرنگە و کارێکی خەیر و چاکەیە، پێویستە باوکان و دایکان گرنگی پیٚ بدەن.

(عائیشە)ی هاوسەری پێغەمبەر (ﷺ) دەڵێت: ئافرەتێك هات بۆ لام و دوو کچی لەگەڵدا بوو، داوای یارمەتی لێکردم، منیش هیچم لانەبوو تەنها یەك دەنکە خورما نەبێت، دەنکە

---

[٢٤٥]- رواه البخاري في صحيحه عن ابي هريرة.

خورماکەم دایە و، ئەویش کردی بە دوو لەتەوە، دابەشی کرد لەنێوان هەردوو کچەکەیدا و، خۆی هیچی لێ نەخوارد، پاشان هەستا و لەگەڵ دووکچەکەیدا ڕۆشتە دەرەوە، کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) گەڕایەوە، ئەو بەسەرهاتەم بۆ گێڕایەوە، ئەویش فەرمووی: ((ئەگەر کەسێك خوا تاقی بکاتەوە کچی پێ دەبەخشێت، ئەویش بەچاکی ڕەفتاری لەگەڵدا بکات، ئەوا ئەو کچانە دەبنە بەربەست بۆی لە ئاگری دۆزەخ)).[٢٤٦]

• لەمانەی پێشەوە بۆمان دەردەکەوێت و ڕوون دەبێتەوە کە: پەروەردەکردنی کچان و چاکەکردن لەگەڵیان کارێکی چاك و بەڕێزانەیە، شایانی باسە لێرەدا کە ئاماژە بکەین بۆ ئەوە کە کچ نیعمەتێکی خوایی یە، هەروەك کوڕیش نیعمەتی خوایە، خوای گەورە بەخشندە و میهرەبانە، وەدەرو کەرەوە و زانایە و بەدیهێنەر و ڕزق دەر و پاشا و دەستەڵاتدار و نەخشەدانەرە.

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿لِلَّهِ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ يَخْلُقُ مَا يَشَاءُ يَهَبُ لِمَنْ يَشَاءُ إِنَاثًا وَيَهَبُ لِمَن يَشَاءُ الذُّكُورَ(٤٩) أَوْ يُزَوِّجُهُمْ ذُكْرَانًا وَإِنَاثًا وَيَجْعَلُ مَن يَشَاءُ عَقِيمًا إِنَّهُ عَلِيمٌ قَدِيرٌ﴾(الشورى:٤٩-٥٠).

واتە: (هەر بۆ خوایە خاوەندارێتی ئاسمانەکان و زەوی، هەرچی بوێت دروستی دەکات، بەهەرکەس کە بیەوێت تەنها کچ دەبەخشێت، و بەهەر کەس کە بیەوێت تەنها کوڕ دەبەخشێت. یاخود لەهەردوو جۆر، بەهەندێك خێزان دەبەخشێت لە کوڕ وکچ، هەیشە ویستی خوا وایە هیچی نەداتێ و نەزۆك بێت، بەڕاستی ئەو زاتە زاناو بەدەستەڵاتە).

## زیندەبەچاڵ کردنی کچان لەسەردەمی نەفامیدا

کچ بەخششێکی خوایی یە، هەروەك کوڕ بەخششە، کچ مافی ژیانی هەیە و دەبێت ڕێز لێگیراو بێت، لەبەر ئەوە ئیسلام ئەو جەریمە و تاوانەی سەردەمی نەفامی حەرام و ئیدانە کردووە، کە زیندەبەچاڵکردنی کچان بووە، بە زیندویی کردونیان بەژێر گڵ و خاکەوە، لەبەر ئەوەی پێیان عەیب و شەرم بووە کە کچیان هەبێت، ئەوە کارێکی بەتاڵ و ناپەسەند و نەشیاو بووە.

---

[٢٤٦] - رواه المسلم في كتاب البر و الصلة.

. ای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُم بِالْأُنثَىٰ ظَلَّ وَجْهُهُ مُسْوَدًّا وَهُوَ كَظِيمٌ (٥٨) يَتَوَارَىٰ مِنَ الْقَوْمِ مِن سُوءِ مَا بُشِّرَ بِهِ أَيُمْسِكُهُ عَلَىٰ هُونٍ أَمْ يَدُسُّهُ فِي التُّرَابِ أَلَا سَاءَ مَا يَحْكُمُونَ﴾(النحل:٥٨-٥٩).

واتە: (خۆ ئەگەر مژدەی بوونی کچ بدرێت بە یەکێك لەو نەفامانە، ڕوی گرژ و تاڵ دەبێت و ڕەش دادەگیرسێت، و سینەی پڕ دەبێت لەخەم وپەژارە، لەداخ و خەفەتی ئەو مژدە ناخۆشە خۆی دەشارێتەوە لە خەڵکی و تەنها (بیردەکاتەوە): ئایا بیهێڵێتەوە و بە زەلیلی و سوکی و بێ نرخی، یاخود زیندەبەچاڵی بکات و بیخاتە توێی خاکەوە، ئاگادارین!؟ ئای کە چەندە خراپە ئەو بڕیارەی کە دەیدەن!).

ئافرەتانی سەردەمی منداڵی ئەگەر بیانزانیایە کاتی منداڵ بونیان نزیك بۆتەوە، چاڵێکی هەڵدەکەند و دەچوو لە کەناری چاڵەکەدا دادەنیشت، ئەگەر کوڕی بوایە ئەوا ئاشکرای دەکرد و خۆشی وشادمانی دەردەبڕی بۆ ئەهل و کەس و کارەکەی، و ئەگەر کچیشی ببوایە ئەوا پرسی بەباوکی کچەکە دەکرد کەبیداتەوە، ئەگەرنا ئەوا زیندەبەچاڵ دەکرا و فڕێدەدرایە ناو چاڵەکەوە و خۆڵی دەکرا بەسەردا کە هەر زیندوو بوو.

## وەفا بە عەهد و پەیمان

لە وەفاداری موسا (علیه السلام) بەرامبەر ئەو عەهد و پەیمانەی کە دابووی ماوەی کارکردنەکە تەوابکات، پەندو وانەی گەورە وگرنگی تێدایە لە وەفاداری بەرامبەر پەیمان بردنەسەر، پەیمان بردنەسەر ئەخلاقێکی جوان و پیرۆزە لە ئەخلاقە ئیمانی یەکانی باوەڕدار، خوای گەورەلە باسیاندا دەفەرمووێت: ﴿وَالْمُوفُونَ بِعَهْدِهِمْ إِذَا عَاهَدُوا﴾(البقرة:١٧٧).

واتە: (وەفا بە پەیمانەکانیانەوە دەکەن کاتێك پەیمانیاندا) هەروەها دەفەرموێت: ﴿الَّذِينَ يُوفُونَ بِعَهْدِ اللَّهِ وَلَا يَنقُضُونَ الْمِيثَاقَ﴾(الرعد:٢٠). واتە: (ئەو کەسانەی کەوەفا بە بەڵێنی خوایی دەکەن و پەیمان ناشکێنن).

(عقبـەی كـوڕی عـامر)(خوالێی ڕازی بێـت) فەرموویـەتی: ((لەپێشـترین مـەرجێك كـە پێویسـت بێـت وەفـای پـێ بكرێـت، ئـەو مەرجانەیـە كـە سـەرجێی پـێ حـەلاڵ دەكرێت))(وەك:مارەیی و نەفەقە و ڕەوشت چاكی لەگەڵ هاوسەرو.....هتد).[٢٤٧]

[٢٤٧] - رواه البخاري ومسلم في كتاب النكاح.

## بەشی هەشتەم

## چیرۆکی سولە یمان ( علیه السلام ) لەگەڵ ( بلقیس ) پاشای ( سبأ )

**لەم بەشەدا :**

ئێمە لەگەڵ پێغەمبەرێکدا دەبین کە پاشاو پێغەمبەر و دەسەڵاتدار بووە، نوری پێغەمبەرایەتی و دەسەڵاتی پاشایەتی پێکەوە کۆکردۆتەوە، پاشا بووە بۆ مەملەکەتێکی فراوان و سنورەکانی فراوان و زۆر ناوچەی گرتبوویەوە، لەگەڵ ئەوەشدا مەملەکەتێکی بەهێز و پتەو و دامەزراو بووە، و پارێزراو بووە، بەزانست و ئیمان و نور بەڵگەی بەهێز و ڕەوشت و دادپەروەری و چاکەکاری و کردەوە و تێکۆشان و ژمارەی زۆری سەربازی بەهێز و لێهاتوو.

پاشایەك بووە هیمەت بەرز و پایەدار و خۆڕاگر بووە و پێغەمبەر بووە و بەرچاو ڕوون و دڵسۆزو نیەت ساغ بووە، کە پێغەمبەر سلیمان کوڕی داود پێغەمبەربووە(علیهما السلام)، خوای گەورە خەیری دنیاو قیامەتی پێکەوە بۆ کۆکردبونەوە، هەروەك چۆن پەری و ئینسان و باڵندەو گیانلەبەرانی لەدەور کۆکردبویەوە و هەموو هەڵدەسان بەخزمەتی ئەو.

لە مەملەکەت دەسەڵاتی سولەیماندا (علیە السلام) دەوری زانست و ئیمان و چاکەکاری و خۆشەویستی و بەزەیی و ڕێنمایی وحیکمەت و پێکەوە ژیان و هاوکاری و دەستەبەری و بەدەمەوە چوون، بەڕونی دیاربوو، کەش وهەوایەکی لەبار و سازگار هەبوو کە پڕبوو لە ئازادی، هەروەها ئەو شوێن و سەردەمە خاکێکی چاك و پاك و بە بەرهەمی هەبوو، بەهرە و زیرەکی و لێهاتوویی و ژیری هیمەت بەرزی تیایدا گەشەی کردبوو هەموو تاکێك لە مەملکەتەکەدا هەستی بەنرخ و بەهای خۆی دەکرد، و هەموو تاکێك بە کاری خۆی هەڵدەسا و دەیزانی چی لێ خوازراوە، تەنانەت مێرولەیش لەشیو و شوێنەکەی خۆیدا پەپوسولەیمانەیش لەشوێن و کارەکەی خۆیدا، ڕۆڵێکی گەورەی هەبووە، قورئانی پیرۆز هەموویانی تۆمارکردوە ئایەت لەدوای ئایەت باسەکەی ڕوون دەرخستووە.

لەم بەشەدا باسی کاری گرنگ و گەورەی(هدهد) ڕون دەکەینەوە هەروەها ئەو پاشا ئافرەتەی کە پێشەوایەتی قەومەکەی کرد بۆ ئیمان و باوەڕ و ڕێگای ڕاست.

## ڕونکردنەوەی چیرۆکەکە وەك لە قورئاندا هاتووە

**پێشەکی:**

**پێش دەستپێکردنی چیرۆکی سولەیمان (علیه السلام) لەگەڵ (بلقیس) ی پاشای (سبأ).**

• لە ناز و نیعمەتی خوا لەسەر بەندە و پێغەمبەری خۆی سولەیمان (علیه السلام):

تەنها لەم شوێنەدا_ لە سوورەتی النمل _دا باسی (بلقیس) ی پاشای (سبأ) کراوە، ئەویش لەناو باسی ئەو ناز و نیعمەتە فراوانەی کە خوای گەورە بە سولەیمان (علیه السلام)ی بەخشیبوو، لەوانە: پێغەمبەرایەتی، کە گەورەترین بەخششی خوایی بوە و جوانترین و بەڕێزترین نیعمەتیش بووە، هەروەها لەو نیعمەتانە، نیعمەتی پاشایەتی، و زانست و حیکمەت و هێز و بازو زانینی قسە و دەربڕینی باڵندەکان، هەروەها لەو نیعمەتانە: سوپای بەهێز و سەرسامکەر، کە ئینسان و پەری و باڵندەی تێدابووە، لەگەڵ ئەوەی کە جیاوازی و دوری زۆریش لەنێوانیاندا هەبووە، بەڵام خوای گەورە کۆی کردبونەوە و ڕێکی خستبون. لەژێر یەك سەرکردە و پێشەوا و دەستەڵاتداردا، بەپێی سیاسەتێکی ڕێك و ڕاست، لەوپەڕی ووردی و کارناسی و پابەندبوندا، هەمویان خۆیان خستبویە ژێر فەرمانی سولەیمان و گوێڕایەڵ و فەرمانبەرداری ئەو بوون.

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿وَحُشِرَ لِسُلَيْمَانَ جُنُودُهُ مِنَ الْجِنِّ وَالْإِنسِ وَالطَّيْرِ فَهُمْ يُوزَعُونَ﴾(النمل:١٧).

**تێپەڕبوونی کاروانێکی سەیرو دیمەنێکی کاریگەرو ترسێنەر بەسەر شیوی مێرولەدا.**

کاروان و دەستەیەکی سەیر، بە دیمەنێکی ترسێنەرەوە کە سولەیمان (علیه السلام) پێشەوایەتی دەکات،و پەری و ئینسان پێشی کەوتبون و باڵندەکان سێبەریان بۆ کردبوو، بەسەر شیوی مێرولەدا تێپەڕی، لەوێدا مێرولەیەك دەردەکەوێت و دەست پێشکەری دەکات، تا دەستە و تاقمەکەی خۆی ئاگادار بکات و فەرمانیان پێبکات

بچنەوە ناو کون و شارەکی خۆیان، تا سولەیمان (علیه السلام) بە سەربازەکانییەوە بەسەریاندا نەڕوات و نەیان شێلێت، بەبێ ئەوەی هەست بەخۆیان بکەن، پێغەمبەر سولەیمان (علیه السلام) دەنگی مێرولەکە دەبیستێت، کە لەگەڵ دەستە وتاقمەکەی خۆیدا قسەی دەکرد، و ئاگاداری دەکردنەوە و ڕێنمایی پێ دەدان کە خۆیان لە سولەیمان (علیه السلام) و سەربازەکانی بپارێزن و ئاگادار بن لێیان، ئینجا لەم کاتەدا سولەیمان (علیه السلام) دڵنیایی و ئیمان و سوپاسگوزاری زیاد دەبێت، وهەست بە ناز و نیعمەتە فراوانەکەی خوا دەکات، خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿حَتَّىٰ إِذَا أَتَوْا عَلَىٰ وَادِ النَّمْلِ قَالَتْ نَمْلَةٌ يَا أَيُّهَا النَّمْلُ ادْخُلُوا مَسَاكِنَكُمْ لَا يَحْطِمَنَّكُمْ سُلَيْمَانُ وَجُنُودُهُ وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ(١٨) فَتَبَسَّمَ ضَاحِكًا مِّن قَوْلِهَا وَقَالَ رَبِّ أَوْزِعْنِي أَنْ أَشْكُرَ نِعْمَتَكَ الَّتِي أَنْعَمْتَ عَلَيَّ وَعَلَىٰ وَالِدَيَّ وَأَنْ أَعْمَلَ صَالِحًا تَرْضَاهُ وَأَدْخِلْنِي بِرَحْمَتِكَ فِي عِبَادِكَ الصَّالِحِينَ﴾(النمل:١٨-١٩).

واتە (سولەیمان (علیه السلام) و سەربازەکانی ڕۆیشتن هەتا گەیشتنە دۆڵی مێرولە، مێرولەیەك هاواری کردو وتی:ئەهای مێرولەکان بچنە ماڵ و کون و کەلەبەرکانتانەوە، نەوەکو سولەیمان و سەربازەکانی بتان شێلن، لە کاتێکدا هەستتان پێ ناکەن، سولەیمان (علیه السلام) (کە گوێی لە هاواری مێرولەکە بوو)، زەردەخەنە گرتی و پێکەنی بە هاوار و قسەکەی، بۆیە وتی: پەروەردگارا، یارمەتیم بدە، دڵ و دەروون و ڕۆح و گیانم کۆبکەرەوە، تا سوپاسگوزاری ناز و نیعمەتەکانت ببم، کە بەسەر من و دایکم و باوکمدا ڕژاندوتە، هەروەها کۆمەکیم بکە تا کار و کردەوەی چاکە ئەنجام بدەم کە تۆ پێی ڕازی بیت وبەڕەحمەت و میهرەبانی خۆت، بمخەرە ڕیزی بەندە چاکەکانتەوە).

## بەسەرکردنەوەی باڵندەکان و دیارنەبوونی پەپوسولەیمانە

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَتَفَقَّدَ الطَّيْرَ فَقَالَ مَا لِيَ لَا أَرَى الْهُدْهُدَ أَمْ كَانَ مِنَ الْغَائِبِينَ (٢٠) لَأُعَذِّبَنَّهُ عَذَابًا شَدِيدًا أَوْ لَأَذْبَحَنَّهُ أَوْ لَيَأْتِيَنِّي بِسُلْطَانٍ مُبِينٍ﴾(النمل:٢٠-٢١). ئایەتە پیرۆزەکان بەوە دەست پێدەکات کە سولەیمان (علیه السلام) باڵندەکان بەسەر دەکاتەوە، دەبینێت پەپوسولەیمانە دیار نییە، کە دەورێکی گەورە و گرنگی هەیە لە ڕوداوەکانی ناو چیرۆکەکەدا، سولەیمان(علیه السلام)خۆی بەم کارە هەڵسا، تابزانێت دەستەی باڵندە و سەربازەکانی هەموو تەواو و لەشوێنی خۆیانن، ئەو باڵندانە هەندێك جار سێبەریان بۆ سەر سولەیمان دروست دەکرد و هەمیشە هاوەڵی ئەویان دەکرد لە گەڕان و کارکردنندا کە دیمەنێکی جوانی هەبووە و کارەکەیش گرنگی و گەرەیی خۆی هەبووە.

زانایان ڕا و بۆچونی جیاوازیان هەیە، لەسەر ئەو کارەی سولەیمان (علیه السلام) کە باڵندەکانی بەسەر کردۆتەوە، وتراوە: بە باڵەکانیان سێبەریان بۆ سولەیمان (علیه السلام) دەکرد، تا گەرمی و تیشکی خۆرەکە ئازاری نەدات، لەو کاتەدا شوێنی پەپوسولەیمانەکە بەتاڵ بوو، تیشکی خۆرەکە بەر سولەیمان کەوت، ئیتر بەو هۆیەوە زانی کە دیار نییە، (إبن عباس) (خوا لێی ڕازی بێت) دەڵێت: پەپوسولەیمانەکە چاوساغی سولەیمان (علیه السلام) بوو بۆ دۆزینەوەی ئاو، شوێنی ئاوەکەی دەزانی و لەژێر زەویدا دەیبینی، وەك لەناو شوشەدا دەبینرێت، و دەیزانی نزیکی یەکەی چەندە و بە دەنووك زەوی یەکەی هەڵدەکەند، پاشان شەیتانەکانی دەهێنا و هەڵیان دەکەند و لەماوەیەکی کەمدا ئاوەکەیان دەردەهێنا.[٢٤٨]

• دەڵێن: دەگونجێت زانینی پەپوسولەیمانەکە بە بوونی ئاو لە ژێر زەویدا، تایبەتمەندی ئەو بوو بێت، کە موعجیزەی سولەیمان(علیه السلام) بووە، کە لە یەکێك لە

---

[٢٤٨]- تفسير الماوردي ٢١٨/٣ و الطبرسي ٣٤٠/٣ و تفسير الرازي ١٨٩/٢٤.

سەربازەکانیدا ئەوتایبەتمەندییە سەیرە ببینێت، وەك لە پەپوسولەیمانەکەدا جۆرێك لە حیکمەت و هەستکردنی بینی، کە لە غەیری پەپوسولەیمانەکەدا ئەو تایبەتمەندییە نەبوو.

هەروەها دەڵێین: مانگە دەستکردەکان دەتوانن شتانی ژێر زەوی بدۆزنەوە و کەشف بکەن لەئاو و کانزا و شتانی تریش، چونکە ئەو شتانەی کە لەسەر ڕوی زەوین و ئەو شتانەیشی کە لەژێر زەویدان، تیشکی گەرمی دەردەکەن کە تیشکی خوار سورە، و پلەی ئەو تیشکانەیش جیاوازن، ئەویش بە پێی جیاوازی پلەی گەرمی ئەو شتانە، و مانگە دەستکردەکان، هەندێك ئامێری هەستیاریان پێوەیە، کە جیاوازی دەکات لە نێوان جیاوازی هەموو جۆرە تیشکەکاندا، کە لەو شتانەی سەر زەوی یان ژێر زەوی دەردەچن، هەروەك مانگە دەستکردەکان (کۆمپیوتەر)یان تیایە، هەموو ئەو داتا و زانیاریانە ڕوون دەکاتەوە و ڕێك دەخات، کە ئەو ئامێرە هستیارانە پێی دەدەن، پاشان ئەو ئەنجامە کۆکراوانە دەنێرێتەوە بۆ سەر زەوی لە ڕێگای ئامێری ناردنەوە، ئینجا زاناکان نەخشەی شوێنی ئاوەکانیان دەست دەکەوێت، هەروەها نەخشەی هەموو کانزا و سامانە سروشتی یەکانی تریش.

کاتێك پێغەمبەر سولەیمان (علیه السلام) سەربازەکانی بەسەر کردەوە بۆ ئەوە بوو کە ماڵیان بزانێت و ئەگەر کەم و کورتی هەبوو، چارەسەری بکات، لە کارەکەیدا دەرکەوت کەهەواڵی دیار نەبوونی پەپووسولەیمانەکە ی پرسی، کە ئەمەش گرنگی دانبوو پێی، هەروەها ووریایی و لێهاتویی ئەم سەرکردە بەهیمەت و زیرەکە دەردەخات، کە چۆن تەنها سەربازێکیش پشت گوێ ناخات، کە بە تەنها بۆ ئەو کارەیش نەبوو کە تایبەت بووبێت بە پەپووسولەیمانەکە، وەك هەندێك لە زانایانی تەفسیر بۆچونیان وابووە، ﴿فَقَالَ مَا لِيَ لَا أَرَى الْهُدْهُدَ أَمْ كَانَ مِنَ الْغَائِبِينَ﴾. وەك ئەوەیە کە کاتێك سلێمان (علیه السلام) باڵندەکانی بەسەر کردۆتەوە، پەپوسەلەیمانکەی نەبینیوە لەشوێنی خۆیدا، و پرسیاری کردووە و داوای کردوە، کە بەڵکو لەوێ بوو بێت و لەشوێنێکی تردا بوو بێت لەگەڵ

سەربازەکاندا، کاتێك زانی کەدیار نییە، پاشان ووتی: ﴿أَمْ كَانَ مِنَ الْغَائِبِينَ﴾ (أم) لێرەدا (منقطعة)یە واتە (بلْ).[٢٤٩]

ووشەی (الهد هد) ناسراو و تایبەت ودیار بووە.

وەك ئەوەی کە ئێمە دەبینین –خوا زاناترە– کە ئەم پەپوسولەیمانەیە تایبەتمەندی جیاوازی هەبووە بەسەر هەموو پەپوسولەیمانەکانی تردا، کە لەمەودوا زیرەکی و لێهاتووییەکەی دەردەکەوێت، کە چەند دانا و شارەزا و ئەمین و باوەڕدار و جێگای متمانە و بەعیزەت بووە، بۆ دینەکە و زۆر دڵسۆز و خەمخۆر و گوێ ڕایەڵ و بەرچاو ڕوو بووە بۆ سولەیمان (علیه السلام) کە پێغەمبەر و پاشاو سەرکردە بووە.

*بوونی پەپوسولەیمانەکە بەم جۆرە سەیرە، موعجیزە بووە بۆ سلیمان (علیه السلام) وشایەتی بۆ ڕاستی بانگەوازەکەی داوە، هەروەها نیعمەت و بەخششێك بووە لە خواوە بۆ سلیمان (علیه السلام)، هەر بۆ ئەم مانایە خاوەنی (الظلال) ئاماژەی کردووە و ڕونی کردۆتەوە ئەم پەپوسلێمانەیە هەست کردنێکی وای پێ بەخشراوە. کە پەپوسلێمانەکانی تر و باڵندەکانیش نەیان بووە، بەڵکو ئەو هاوتای کەسە ژیر و زیرەك و لە خوا ترسەکان بووە لە خەڵکی.[٢٥٠]

ڕونکردنەوەیەك: باڵندەکان لەو دروست کراوانەن کە تەسبیحاتی خوا دەکەن.

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ يُسَبِّحُ لَهُ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَالطَّيْرُ صَافَّاتٍ كُلٌّ قَدْ عَلِمَ صَلَاتَهُ وَتَسْبِيحَهُ وَاللَّهُ عَلِيمٌ بِمَا يَفْعَلُونَ﴾ (النور:٤١).

واتە: (ئایا نەت بینیوە کە بەڕاستی هەرچی و هەر کەس لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە، تەسبیحات و ستایشی خوا دەکەن، هەروەها باڵندەکانیش لە کاتێکدا پۆل پۆل بە (ئاسماندا) دەفڕن، هەر هەموویان ستایش و پەرستش و تەسبیحاتی خۆیان زانیوە، خوایش هەمیشە زانایە، بەوەی کە دەیکەن).

حاڵی پەپوسلێمانەکە وەك حاڵی ئەو مێرووڵەیە بوو کە لەگەڵ دەستە و هاوەڵەکانی خۆیدا دوا و ئاگاداری کردنەوە و فەرمانی پێکردن وداوای لێکردن کە خۆیان بپارێزن و بچنە ناو کون و شارەکانیانەوە، و داوای لێ کردن کە لە سولەیمان (علیه السلام)

---

٢٤٩– الكشاف للزمخشري ٣/٣٥٨ ومفاتيح الغيب للرازي ١٤/١٨٩ وروح البيان للبروسوي ٦/٣٣٦.

٢٥٠– في ظلال القرآن ٥/٢٦٣٦.

وسەربازەکان ئاگادار بن،خوای گەورە فەرمووی: ﴿حَتَّىٰ إِذَا أَتَوْا عَلَىٰ وَادِ النَّمْلِ قَالَتْ نَمْلَةٌ يَا أَيُّهَا النَّمْلُ ادْخُلُوا مَسَاكِنَكُمْ لَا يَحْطِمَنَّكُمْ سُلَيْمَانُ وَجُنُودُهُ وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ﴾(النمل:١٨).

زانین و شارەزابوونی سلیمان (علیه السلام) لە قسەی باڵندەکان بە هەوڵ وتێکۆشانی خۆی نەبووە، بەڵکو موعجیزەیەك بووە لە موعجیزەکانی و، جۆرێك بووە لەعادەت دەرچوو بووە و هاوشێوەی نەبووە. واتە لەگەڵ یاسا و نهێنییەکانی بونەوەردا پێچەوانە بووە.

خوای گەورە بۆ هەموو نەتەوەکان زمانی قسە کردنی داهێناوە و پێی بەخشیون، کە بە هۆیەوە لە یەکتری تێدەگەن، هەروەها خوای گەورە زمانی تێگەشتن و گفتوگۆی لە نێوان باڵندە و ئاژەڵان ومێرووەکاندا بەدیهێناوە.

﴿لَأُعَذِّبَنَّهُ عَذَابًا شَدِيدًا أَوْ لَأَذْبَحَنَّهُ أَوْ لَيَأْتِيَنِّي بِسُلْطَانٍ مُبِينٍ﴾(النمل:٢١).

کاتێك پەپوسولەیمانەکە بەبێ داوای مۆڵەت دیار نەمابوو، سولەیمان (علیه السلام) بە سزادانێکی توند و قورس هەڕەشەی لێکرد، یان سەربڕین ئەگەر عوزر و بیانوویەکی وای نەبێت کە تکای بۆبکات.

*جۆری ئەم سزا توووند و قورسە:_

زانایان بۆچونی جیاوازیان بووە لەسەر ئەو سزایە، وتراوە: بریتی بووە لەوەی کە پەڕەکانی هەڵکێشێت، وتراوە (قطران)ی دەکات بەسەردا تا نەتوانێت جارێکی تر بفڕێت یان وتراوە:لەگەڵ ئەو باڵندانەدا سجنی دەکات کە لە دژی خۆیین، کە ئەمە لە قورسترین جۆری سزا بووە.

وتراوە: دەیکات بە خزمەتکاری باڵندە نزیکەکان، لەو باڵندانەی جیا دەکاتەوە کە ئەو خوگریانە و لە گەڵیاندا هەڵدەکات، کە هەموویان سزای قورس و نارەحەت بوون، بێگومان سلیمان(علیه السلام) بە سزای توووند یان سەربڕین هەڕەشەی لێکرد. لە پێشدا باسی سزادانەکەی کرد ئینجا باسی سەربڕینەکەی کرد، بۆ هەڵبژاردن بوو چونکە سەربڕینەکەی قورستر بووە و دەبێتە هۆی مردنی، وتراوە مردن لە هەموو شت قورسترە، وهەموو شت بێجگە لەو ئاسانە.[٢٥١]

﴿أَوْ لَيَأْتِيَنِّي بِسُلْطَانٍ مُبِينٍ﴾. واتە: (یان دەبێت بە بەڵگەیەکی ئاشکراوە بێت بۆلام).

[٢٥١]- روح المعاني للألوسي ١٩/ ١٨٤ بتكورتى.

**واتە: بەڵگەیەکی یەکلایی کەرەوە بهێنێت کە عوزرەکەی ئەو ڕون بکاتەوە و دەربخات کە بۆچی دیارنەبووە.**

**هاتنەوەی پەپوسولەیمانەکە بۆ لای سلێمان(علیه السلام)خوای گەورە فەرمووویەتی:**

﴿فَمَكَثَ غَيْرَ بَعِيدٍ فَقَالَ أَحَطتُ بِمَا لَمْ تُحِطْ بِهِ وَجِئْتُكَ مِن سَبَإٍ بِنَبَإٍ يَقِينٍ﴾ (النمل:٢٢).

**﴿فَمَكَثَ غَيْرَ بَعِيدٍ﴾ دیار نەمانی پەپوسولەیمانەکە لەسولەیمان (علیه السلام) درێژی نەخایاند، بەڵکو کاتێکی کەمی پێ چووە.**

**(الزمخشري) دەڵێت: (واتە: کاتێکی دوری پێ نەچوو، وەك ئەوی کە کاتێکی نزیك و زوو هاتەوە، هەروەها مانەوەکەی بە کەمی ماوەکە باسکرد، تا بەڵگە بێت لەسەر خێرایی وترس لە سولەیمان (علیه السلام)، و بۆ ئەوەی بزانێت کە چۆن باڵندەکان بۆ ئەو ژێر بارخراوان وبۆی ڕوون بێتەوە کە چ موعجیزەیەکی گەورەی لەسەر پێغەمبەرایەتییەکەی پێ دراوە و بەڵگەی گەورەیە لەسەر دەسەڵات و قودرەتی خوا).[٢٥٢]**

**﴿فَقَالَ أَحَطتُ بِمَا لَمْ تُحِطْ بِهِ﴾ واتە: ئەوەی من زانیومە، تۆ پێت نەزانیوە، لەگەڵ ئەوەی کە خوای گەورە زانست وحیکمەتی پێداوە. پاش ئەوە فەرمووی: ﴿وَجِئْتُكَ مِن سَبَإٍ بِنَبَإٍ يَقِينٍ﴾.**

**واتە: (من لە وولاتی سەبەئەوە هەواڵێکی ڕاست ودروستم بۆ هێناویت).**

**زانا (الزمخشري) دەڵێت: (ئەگەر وترا چۆن کار و باری مەملەکەتی سەبەء لە سولەیمان (علیه السلام) شاراوە بووە، لەگەڵ ئەوەی کە سولەیمان (علیه السلام) زانستێکی فراوانی بووە و دەستەڵاتەکەیشی فراوان بووە؟ وەڵام: بێگومان خوای گەورە بۆ بەرژەوەندییەك ئەوەی شاردبوویەوە، هەروەك چۆن شوێنی یوسف (علیه السلام)ی لە یەعقوب (علیه السلام) شاردبوویەوە، ئەم کارەیشی لەسولەیمان (علیه السلام) شاردەوە، کە لە ڕێزی ئەو کەم ناکاتەوە، بەڵکو ئەوەمان بۆ دەردەخات، کە بەشەر هەرچەندە زانستی پێ بدرێت، بێگومان زانستەکەیان کەم و لاواز و کورتە، بە بەراورد لەگەڵ زانستی بێ ئەندازەی خوای گەورەدا، کە زانستی تەواوە و دەرك بە هەموو شت دەکات کە سنور و ئەندازەی نییە، پاك وبێگەردی بۆ ئەو خوایە ی کە ڕەحمەت و زانستی فراوان وبێسنورە.**

---

[٢٥٢]- الكشاف للزمخشري ٣/٣٥٩

## باسی مەملەکەتی سەبەو و ڕوونکردنەوەی گومڕایی وخراپەی بیر و باوەڕیان

خوای گەورە دەفەرمویت: ﴿ إِنِّي وَجَدتُّ امْرَأَةً تَمْلِكُهُمْ وَأُوتِيَتْ مِن كُلِّ شَيْءٍ وَلَهَا عَرْشٌ عَظِيمٌ(٢٣) وَجَدتُّهَا وَقَوْمَهَا يَسْجُدُونَ لِلشَّمْسِ مِن دُونِ اللَّهِ وَزَيَّنَ لَهُمُ الشَّيْطَانُ أَعْمَالَهُمْ فَصَدَّهُمْ عَنِ السَّبِيلِ فَهُمْ لَا يَهْتَدُونَ(٢٤) أَلَّا يَسْجُدُوا لِلَّهِ الَّذِي يُخْرِجُ الْخَبْءَ فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَيَعْلَمُ مَا تُخْفُونَ وَمَا تُعْلِنُونَ(٢٥) اللَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ رَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ ﴾ (النمل:٢٣_٢٦).

ئەم ئافرەتە، بەلقیسی کچی شراحیل ی کوڕی مالکی کوڕی (ریان)ە، لەنەوەی (یعرب بن قحطان)، وتراوەك لە نەوەی (تبع الحمیری) یە، وتراوە باوکی ناوی (السرح بن الهداهد)ە.[٢٥٣]

زانایانی تەفسیر زۆر شتیان دەربارەی دایك و باوکی (بلقیس) ووتووە. بە کورتی دوو بۆچونیان دەهێنین:

زانا (القرطبی) دەڵێت: (الماوردی) وتویەتی: وا وتراوە کە دایکی بەڵقیس پەری بووە. کە ئەوەیش عەقڵ ڕەتی دەکاتەوە کە ئەو دوو ڕەگەزە یەك بکەون و هاوکۆك بن بە یەکەوە، وسروشتیشیان جیاوازە، وهەستیشیان جیاوازە، چونکە ئادەم (جسمانی) جەستەییە، و خاوەن لاشەو پەیکەرە بەڵام پەری ڕۆحانییە، و خوای گەورە ئادەمی لە خاك و(صلصال) دروستکردووە، و پەرییەکانی لە ئاگری هەڵگیرساو دروستکردووە، ئەوە کارێکی بەدور گیراوە کە زۆربوون لە نێوان ئەم دوو ڕەگەزەدا ڕوو بدات.[٢٥٤]

عەقڵ لەو کارەدا ڕێك ناکەوێت کە هەواڵی لەسەر هاتووە، ئەگەر بڕوانینە ئەسڵ و بنەڕەتی دروستکردنی ئینسان درووستکراوە زیندووەکان، دەبینین ئاوە، لەسەر ئەوەی کە ڕونکراوەتەوە. خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿وَشَارِكْهُمْ فِي الْأَمْوَالِ وَالْأَوْلَادِ﴾(الأسرء:٦٤).

واتە: (هاوبەشیان بکە لەماڵ وساما ن ونەوەیاندا،بەسامانی حەرام ومندا ڵی زۆڵ...هتد.).

---

[٢٥٣]- غرر التبیان في مَن لم یسم في القرآن لبدردین إبن جماعة ص٣٨١.

[٢٥٤]- النکت والعیون للماوردي ٣/٢٢٩.

لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿ فِيهِنَّ قَاصِرَاتُ الطَّرْفِ لَمْ يَطْمِثْهُنَّ إِنسٌ قَبْلَهُمْ وَلَا جَانٌّ﴾(الرحمن:٥٦).

واتە: (لە بەهەشتدا حۆری تیادایە، کە تەماشای هاوسەرەکانیان دەکەن، پێش ئەوان دەستی کەسیان لێ نەکەوتووە، نە لەگرۆی ئادەمی ونە لەپەری.) بێگومان زانا (القرطبي) بەم دوو ئایەتە ی پێشەوە بەڵگەی هێناوەتەوە، کە دەکرێت ڕێگە پێدرابێت مارەبڕین و بە یەکگەیشتن بۆ هاوسەربوون لە نێوان پەری ومرۆڤدا ڕوو بدات.[٢٥٥]

زانا (الدكتور عمر سليمان الأشقر) لە کتێبی (عالم الجنّ و الشيطان)دا دەڵێت: (بەردەوام ئێمە دەبیستین کە فلان کەس پەرییەکی کردۆتە هاوسەری خۆی، یان ئافرەتێك کەسێك لە پەری هاتۆتە خوازبێنی کردنی.زانا (السيوطي) هەندێك (اخبار و آثار)ی باسکردووە، کە ئەوە دەگەیەنێت ژن و ژنخوازی لە نێوان ئینسان وپەرییەکاندا بوویێت. هەروەها زانا (إبن تيمية) دەڵێت: (هەندێك جار ئینسان و پەری ژنخوازی بەیەکەوە دەکەن ومنداڵیشیان دەبێت، کە ئەمەش زۆر زانراوە).[٢٥٦]

لەسەر ئەوەش کەوا دانراوە کە بگونجێت ئەو کارە ڕوبدات. بە لام زۆرێك لە زانایان ئەو کارەیان بە(إكراه)داناوە و ناپەسەندیان کردووە، وەك زانایان (الحسن وقتادة والحاكم بن قتيبة وإسحاق بن راهوية وعقبة بن الأصم وإمام مالك.).[٢٥٧]

دەستەیەك لە زانایان بۆ ئەوە چوون و ڕایان وایە کەئەم کارە قەدەغە بێت، لەمەزهەبی خۆشیاندا بەوە بەڵگەیان هێناوەتەوە کە خوای گەورە ناز و نیعمەتی زۆری ڕشتووە بە سەر ئینساندا، کە هاوسەرانی لە خۆیان بۆ دروست کردون ولە ڕەگەزی خۆیان.

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَاجًا لِّتَسْكُنُوا إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ﴾(الروم:٢١).

واتە: (یەکێك لە نیشانە و بەڵگەکانی خوا ئەوەیە، کە هەر لە خۆتان هاوسەری بۆ دروست کردون، بۆ ئەوەی ئارامبگرن لەلایدا و لە نێوانتاندا خۆشەویستی وسۆز و میهرەبانی فەراهەم هێناوە، بەڕاستی ئا لەو دیاردانەدا نیشانەو بەڵگە هەیە بۆ کەسانێك بیر دەکەنەوە و تێدەفکرن).

[٢٥٥]- الجامع لأحكام القرآن للقرطبي ٢٨٩/١٠، ١٨٣/١٣.

[٢٥٦]- مجموع الفتاوى ٣٩/١٩ وكتاب الجن لأبن تيمية ص٣٥.

[٢٥٧]- الأ شباه والنظائر لأبن نجيم ص٣٢٦-٣٢٨.

﴿وَهُوَ الَّذِي خَلَقَ مِنَ الْمَاءِ بَشَرًا فَجَعَلَهُ نَسَبًا وَصِهْرًا وَكَانَ رَبُّكَ قَدِيرًا﴾(الفرقان:٥٤).

واتە: (هەرئەو زاتەیە کەلە ئاوی (مەنی)بەشەر دروست دەکات، (لەوەو دوایش زۆربەی پێکهاتەی لەشی هەر ئاوە) و کردویەتی بە هۆی خزمایەتی، (لە ڕێگەی پیاوەوە کۆمەڵێك خزم دروست دەبێت، هەروەها لەڕێگەی ئافرەتەوە کۆمەڵێك) بێگومان پەروەردگاری تۆ بەردەوام دەستەڵاتی بێ سنورە (لەهەمو بوارێکدا).

ئەگەر وای دانێین ژن و ژنخوازی لە نێوانیاندا ڕوو بدات، ئەوا ئامانج تیادا جێ بەجێ نابێت.[٢٥٨]

*ئەوەی ئێمە لەو مەسەلەیەدا دەیبینین و- خوازاناترە – کە ژن وژنخوازی دەگونجێت هەندیك جار لە نێوان ئینسان وپەریدا ڕوویدات،و عەقڵیش ڕەتی ناکاتەوە، چونکە پەری خۆی دەخاتە شێوەی بەشەرەوە، بەڵام ئەم کارە (شاز)ە لەڕیزپەڕەکاندایە، و پێچەوانەی ئەو فیترەتەیە کە خوای گەورە ئینسانی لەسەر ڕاهێناوە. ئەگەر ڕویدا ئەوا ڕاستەو خۆ و بە ڕەها نابێتە هۆی زۆر بوون ونەوە خستنەوە، ئەوەش کە دەربارە ی بەلقیس هاتووە کە دایکی پەری بووە، کارێکە هیچ بەڵگەی (صحیح) ڕاستی لەسەر نییە. و ژێریش دانی پیا نانێت. و زۆر بوونیش ناگونجێت لەنێوانیاندا ڕوویدات.-خوای گەورە زاناترە.

*دەربارەی قسەی پەپووسولەیمانەکە، وەك خوای گەورە هەواڵی داوە: ﴿إِنِّي وَجَدتُّ امْرَأَةً تَمْلِكُهُمْ﴾. بەڵگەیە لەسەر جوان دەربڕین و زمان پاراوی، وتی: من بینیم ئافرەتێك فەرمانڕوایی شاری سەبەئی دەکرد، وەك ئەوەی بیەوێت بەم قسەیە سەرسوڕمان و سەرسامی خۆی دەربڕیت بەرامبەر قەومی (سبأ)کە خۆیان هەڵیان بژاردبوو فەرمانڕەواییان بکات، کەوا باشتر و لە پێشتر بوو، پیاوێکیان بە پاشا و فەرمانڕەوا بۆخۆیان هەڵبژاردایە، نەك جڵەوی خۆیان بدەنە دەست ئافرەتێك، کە سۆز و عاتیفەی زۆرە و هەواو ئارەزو زاڵە بەسەریدا، بێگومان ئافرەت وا دروست کراوە کە سۆز و عاتیفە بەسەر عەقڵیدا زاڵە.

﴿وَأُوتِيَتْ مِن كُلِّ شَيْءٍ﴾.

واتە: (لە هەموو جۆرە دەستەڵات و ناز و نیعمەتێکی پێ بەخشرا بوو) واتە لە شتە دنیایی وجوان وڕازاوەکان، کە پاشاکان پێویستیان بووە.

[٢٥٨]- عالم الجن والشياطين للأستاذ الدكتور عمر سليمان الأشقر ص١٧.

زانا(الزمخشری) دەڵێت: (ئەگەر وتت: چۆن خوای گەورە فەرمووی: ﴿وَأُوتِيَتۡ مِن كُلِّ شَيۡءٍ﴾. لەگەڵ ئەوەی کە سلیمان (علیه السلام) فەرمووی: ﴿وَأُوتِينَا مِن كُلِّ شَيۡءٍ﴾. وەك ئەوەی کە یەکسانی لە نێوانیاندا بێت؟ دەڵێت لە نێوانیاندا جیاوازی ڕوون و ئاشکرا هەیە، چونکە سولەیمان(علیه السلام) بەدوای ئەوەدا باسی موعجیزەی خوای گەورەی کرد، کە خوای گەورە فێری زمان وتێگەیشتنی باڵندەکانی کردووە، یەکەمیش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە پێغەمبەرایەتی پێ بەخشراوە لەگەڵ حیکمەت وهۆکارەکانی دین، پاشان پاشایەتی و هۆکارەکانی دونیا، و پەپووسولەیمانەکە بە شێوەیەك باسی ئەوپاشا ئافرەتەی کرد کە تەنها هۆکارە دنیایی یەکانی پێ بەخشرا بوو کە لەگەڵ حاڵی خۆیاندا گونجاو وشیاو بووە).[٢٥٩]

﴿وَلَهَا عَرۡشٌ عَظِيمٞ﴾. واتە: (تەختێکی پاشایەتی گەورەشی هەیە).

(إبن كثير) دەڵێت: (تەختی پاشایەتی هەبوو، کە بە جۆرەها بابەتی ڕازاندنەوە ڕازێندرابوویەوە کە لە زێڕ و بابەتی گران بەها پێك هاتبون).[٢٦٠]

هەروەها دەڵێت: (زانایانی مێژو وتوویانە: ئەو تەختی پاشایەتییە لە ناو کۆشك تەلارێکی گەورە و پتەودا بوو، وبەرز دروستکرا بوو، و ڕێك و پێك بوو، وسێ سەد وشەست دەروازەی تیا بوو لە ڕۆژهەڵاتی و ئەوەندەی تریش لە خۆرئاوای، و بیناکە بە جۆرێك دانرا بوو کە هەموو ڕۆژێك لەخۆر هەڵاتەوە خۆری تێ بێت و کاتێکیش خۆر ئاوا دەبێت تیشکی خۆری تێ بچێت، و سوجدەیان بۆ خۆر دەبرد لە بەیانیان و ئێواراندا، لەبەر ئەوە لەدوای ئەوە دەفەرموێت: ﴿وَجَدتُّهَا وَقَوۡمَهَا يَسۡجُدُونَ لِلشَّمۡسِ مِن دُونِ ٱللَّهِ﴾.[٢٦١]

واتە: (بینیم کە بەلقیس خۆی و قەومەکەی سوژدە بۆ خۆر دەبەن لە جیاتی خوا).

ئەگەر وترا، پەپوسولەیمانەکە چۆن یەکسانی خستە نێوان عەرشەکەی بەلقیس وعەرشی خوای گەورە، بەوەی کە بە (عظيم) گەورە باسی کرد؟.

دەڵێین: لە نێوان ئەم دوو باسکردنەدا دووری وجیاوازی زۆر هەن، کە عەرشەکەی بەلقیس گەورە بوو بە نیسبەت عەرشی نەوەی پاشاو کەسەکانی ترەوە. بەڵام عەرشی

[٢٥٩]- الكاشف للزمخشري ٣٦١/٣، بەدەسکاریەوە.
[٢٦٠]- قصص الأنبياء لأبن كثير ص٤٩٥، بەدەسکاریەوە.
[٢٦١]- تفسير القرآن العظيم لأبن كثير، ٣٦٠/٣، ٣٦١ بەکورتی.

خوای گەورە، ئەوە هەر بە ڕەها و لەئەندازە بەدەر گەورەیە، بە نیسبەت هەموو دروستکراوەکانەوە، کە شتێك نییە لەو گەورەتر و یەکسان بێت پێی یان لێی بچێت.[٢٦٢]

*پاشان پەپوسولەیمانەکە ئاماژەی کرد بۆ گومڕایی و خراپی بیر و باوەڕیان کاتێك کە خۆریان دەپەرست لە جیاتی خوای گەورە وازیان لە خواپەرستی و پەرستش هێنا بوو، لە کاتێکدا کە خوا بە دیهێنەریان بوو، و خوریش دروستکراوێکە و بەفەرمانی خوا ڕام کراوە، خوای گەورە دەربارەی قسەی پەپوسولەیمانەکە دەفەرموێت: ﴿ وَجَدتُّهَا وَقَوْمَهَا يَسْجُدُونَ لِلشَّمْسِ مِن دُونِ اللَّهِ﴾ لەگەڵ ئەوەی کە خۆر دروستکراوی خوایە، و خۆریش لەگەڵ گەورەیی ونرخ وبەهای خۆیدا بۆ ژیانمان بچوکترە بە نیسبەت ئەستێرە و گەلە ئەستێرەکانی غەیری خۆیەوە، کە هەیانە هەزاران جار لەخۆر گەورەترە. وملیۆنەها مەجەڕە هەن، کە خۆری وەهای تێدایە لە خۆرەکەی خۆمان گەورە ترە، کاتێك زانست پێشدەکەوێت، لێکۆڵینەوەکان گەلەئەستێرەی نوێ دەدۆزنەوە، خۆر لە ناو موڵك ودەسەڵاتی خوادایە وەك دەنکێك لم ی وورد وایە لە ناو بیاباندا.

*هەروەها خۆر نیعمەتێکی خوایە بۆسەر بەشەر کە سەرچاوەی ڕوناکی وگەرمی و ووزەیە، هەروەها چەندین سودی تریشی هەیە، ڕام کراوە و بە فەرمانی خوای گەورە بەڕێوە دەچێت، بە پێی یاسا و دەستورێکی وورد و ڕێك و پێك و بۆحیکمەتی کاری خوا و مەبەست وئامانجێك کە خوا خۆی دەیزانێت. خوای گەورە فەرموویەتی:.﴿ وَالشَّمْسُ تَجْرِي لِمُسْتَقَرٍّ لَّهَا ذَٰلِكَ تَقْدِيرُ الْعَزِيزِ الْعَلِيمِ(٣٨) وَالْقَمَرَ قَدَّرْنَاهُ مَنَازِلَ حَتَّىٰ عَادَ كَالْعُرْجُونِ الْقَدِيمِ(٣٩) لَا الشَّمْسُ يَنبَغِي لَهَا أَن تُدْرِكَ الْقَمَرَ وَلَا اللَّيْلُ سَابِقُ النَّهَارِ وَكُلٌّ فِي فَلَكٍ يَسْبَحُونَ﴾ (یس:٣٨_٤٠) واتە: (خۆریش لە گەردش و سوڕانەوەی خۆیدا بەردەوامە، و بەرەو سرەوت دەچێت) یاخود بەدەوری چەقی خۆیدا دەسوڕێتەوە، بێگومان ئەوە توانای زاتێکی باڵادەست وزانا دەردەخات (کەهەمو شتێکی بە ڕێك و پێکی دروست کردووە).

هەروەها کات و شوێنی هەڵهاتنی مانگیشمان دیاری کردووە.(هەرشەوێك لە کاتێکی دیاری کراو و شوێنێکی دیاریکراودا هەڵدێت، ڕادەی ئەو ڕووناکییەش کە دەکەوێتە سەری جیاوازە، هەتا(سەرئەنجام هەموو مانگێك لە ڕواڵەتدا) وەك چیلکەیەکی ووشکی باریك دەنوێنێت. نە خۆر بۆی هەیە بە مانگ بگات (لەهێڵ وڕێڕەوی خۆی دەربچێت) نە

[٢٦٢]- تفسير القرطبي ١٣/١٨٤ وحاشية الجمل ٣/٣٠٩ والتفسير الكبير للرازي ١٢/١٩٠

شەویش پێش ڕۆژ دەکەوێت، بەڵکو هەر یەکەیان لە خولگەی تایبەتی خۆیدا مەلەدەکەن و بەئاسانی دەسوڕێنەوە.).

هەروەها خوای گەورە لە سوورەتی (فصلت)دا کە ئەمە ماناکەیەتی دەفەرموێت: (لە نیشانە و بەڵگەکانی دەسەڵاتی پەروەردگار شەو و ڕۆژ وخۆر و مانگە، هەرگیز نەکەن سوژدە بۆ خۆر یان مانگ بەرن، بەڵکو سوژدە بۆ ئەو خوایە ببەن کە دروستی کردوون، ئەگەر ئێوە خۆتان بە بەندەی ڕاستەقینەی ئەو دەزانن و هەر ئەو دەپەرستن)(فصلت: ٣٧).

*پەپوسولەیمانەکە ڕونی کردەوە کە ئەم پەرستشەی قەومی (سبأ) بەتاڵ و بێمانایە و لادانە لە ڕێگای ڕاستی وحەق و گومڕایی یە، لە وەسوەسەی شەیتانەوە سەرچاوەی گرتووە خوای گەورە هەواڵ دەدات و دەفەرموێت: ﴿وَزَيَّنَ لَهُمُ الشَّيْطَانُ أَعْمَالَهُمْ فَصَدَّهُمْ عَنِ السَّبِيلِ فَهُمْ لَا يَهْتَدُونَ﴾(النمل:٢٤). ئیبلیسی نەفرەت لێکراو ئەم کار و کردەوانەی بۆ ئەوان جوان و ڕازاوە کردبوو، ئەوانیش بە هۆیەوە سەر لێشێواو و گومڕا بوو بوون، وایان گومان بردبوو کە لەسەر ڕێگای ڕاست و هیدایەتن.

*زانا (القرطبي) دەڵێت: ﴿فَصَدَّهُمْ عَنِ السَّبِيلِ﴾. واتە لەڕێگای (توحید) یەکخواناسی لایدابوون. بەمە ڕوونی کردەوە کە ئەوە ڕێگای (توحید) یەکخواناسی نەبووە، و ڕێگایەك نەبووە کە سود و خەیری تیاجێ بەجێ ببێت: ﴿فَهُمْ لَا يَهْتَدُونَ﴾ ئەوان هیدایەت وەرناگرن بۆلای خوا و ڕێگای خواناسی.[٢٦٣]

﴿أَلَّا يَسْجُدُوا لِلَّهِ الَّذِي يُخْرِجُ الْخَبْءَ فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَيَعْلَمُ مَا تُخْفُونَ وَمَا تُعْلِنُونَ(٢٥) اللَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ رَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ﴾(النمل:٢٥-٢٦). پاش ئەوەی کە پەپوسولەیمانەکە فەساد و بیرو باوەڕیانی ڕوون کردەوە، پاشان دینی ڕاستی دەرخست وبیرو باوەڕی ڕاست ودرووست وتێگەیشتنی ساغی ڕوونکردەوە کەپەرستنی خوایە بەتاك و تەنها، کەخوایەکی بەدیهێنەر و ڕزق دەرە، تەنهاخوی دەسەڵاتدار و حوکمڕانە، و پەروەردگار و پەرستراو بێجگە لەو نییە. ئەمانە لە تەواوکەری قسەی پەپوسولەیمانەکە بوو بۆ سولەیمان (علیه السلام)ی کرد، گەورەیی و دەسەڵاتی خوای گەورەی ڕونکردەوە کە زانستی بێ

---

[٢٦٣]- الجامع لأحكام القرآن للقرطبي ١٨٥/١٣ بەدەسکاریەوە.

ئـ دازەی بە هەمو شتێك هەیە و هیچ لەو وون نابێت. هەروەها لە بەڵگە و نیشانەکان
. سەر زانست ودەسەلاتی خوای گەورە: شتە شاراوە و داپۆشراوەکان دەردەخات لە ئاسمانەکان و زەویدا، کە لە غەیری خۆی شاراوەن. واتە: خوای گەورە غەیب وشاراوە و نهێنی ئاسمانەکان و زەوی دەزانێت. ئەو پەپوسولەیمانەی کە خۆراکی خۆی بە دەنوکەکەی دەدۆزێتەوە لە زەویدا، بەڵگە لەسەر دەسەلات و قودرەتی خوای گەورە دەهێنێتەوە، کە خوای گەورە هەموو شتە غەیب و شاراوەکان لە ئاسمانەکان و زەویدا دەردێنێت و دەردەخات، و زانستی بە هەموو شاراوە و نهێنی و ئاشکرایەك هەیە، ئەم کارەی پەپوسولەیمانەکە لە سرووشتی خۆی بووە، کەپێی هەڵدەسا.

﴿اللَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ رَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ﴾. (الله) خوایە کە تاك و تەنهایە و هەر خۆی شیاوی خوایەتی یە، و خاوەنی هەمو شتێکە و هەموی موڵکی خۆیەتی و هەموو سەربەرزی و عیزە تێك هەر بۆ خۆیەتی ئەو هەمیشە زیندووە و نامرێت.

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿قُلِ اللَّهُمَّ مَالِكَ الْمُلْكِ تُؤْتِي الْمُلْكَ مَن تَشَاءُ وَتَنزِعُ الْمُلْكَ مِمَّن تَشَاءُ وَتُعِزُّ مَن تَشَاءُ وَتُذِلُّ مَن تَشَاءُ بِيَدِكَ الْخَيْرُ إِنَّكَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ (آل عمران:٢٦).

واتە: (ئەی پێغەمبەر (ﷺ) بڵێ: (خوایە تۆ خاوەنی هەموو شتێکیت، دەسەلات دەبەخشیت بەهەر کەسێك بتەوێت و دەسەلات وەردەگریتەوە لە هەر کەسێك بتەوێت، هەرکەسێك بتەوێت بالا دەستی دەکەیت، هەر کەسێکیش بتەوێت زەلیل و بێدەستەلات و ژێر دەستی دەکەیت، هەرچی خەیر هەیە هەر بە دەستی تۆیە، بێگومان تۆ دەسەلات داریت بەسەر هەموو شتێکدا.).

باسی عەرشی خوای گەورەی کرد بە (عظیم) گەورە، چونکە گەورەترینی هەموو شتەکانە، وهەموو شتێك بە نیسبەت ئەوەوە بچوك و کەمن، ئاسمانەکان و زەوی ئەوەشی کە لە نێوانیاندایە، هەموویان لە دروستکراوەکانی خوای گەورەن، و هەموویان بە نیسبەت عەرشەوە بچوکن، وەك دەنکە زیخێکی بچوك وان لەناو بیابانێکی پڕ لە لم و زیخدا. ئەو بوونەوەرە فراوانەی کە ئێمەی تیا دەژین پڕە لە ملیۆنەها خۆر کە لە خۆرەکەی خۆمان گەورەترەن و ڕوناکی و گەرمیشیان زیاترە، لەگەڵ ئەوەشدا قەومی (سبأ) خۆریان پەرستوە لەجیاتی خوای گەورە. لێرەدا لە باسکردنی عەرشی خوادا ئاماژە بۆبچووکی وکەم نرخی عەرشەکەی بەلقیس کراوە.

## پەپوسولیمانەکە نوێنەری سولەیمانە ( علیه السلام )

﴿قَالَ سَنَنظُرُ أَصَدَقْتَ أَمْ كُنتَ مِنَ الْكَاذِبِينَ(٢٧) اذْهَب بِّكِتَابِي هَٰذَا فَأَلْقِهْ إِلَيْهِمْ ثُمَّ تَوَلَّ عَنْهُمْ فَانظُرْ مَاذَا يَرْجِعُونَ﴾(النمل:٢٧-٢٨). ئینجا پێغەمبەر سلیمان(علیه السلام) بە تەواوی گوێی لە قسەکانی پەپوسولەیمانەکە گرت و سەرسام بوو بە دانایی و زمانپاراوی و دەربڕینەکەی، و داوای لێکرد کە ڕاستگۆ ودڵسۆز و بەغیرەت بێت لە حەقدا، بەڵام سولەیمانیش (علیه السلام) پەلەی نەکرد لەکارەکەدا و هەروەها پەلەی نەکرد لە بڕیارداندا. بەڵکو بە شێوازی دادوەرانە و شارەزایانە مامەڵەی لەگەڵدا کرد، ویستی کە لەم کارەدا دامەزراو بێت، و هەڵوێستە لەسەر ڕاستی و دروستی قسەکانی پەپوسولەیمانەکە بکات.

- وەك قورئان هەواڵی داوە، فەرمووی: ﴿قَالَ سَنَنظُرُ أَصَدَقْتَ أَمْ كُنتَ مِنَ الْكَاذِبِينَ﴾(النمل:٢٧). واتە: (سولەیمان (علیه السلام) بە پەپوسولەیمانەکەی وت: ئێمە لەمەو دوا لەو گوفتارەی تۆ دەکۆڵینەوە، تا بزانین ڕاست دەکەیت یان لە ڕیزی درۆزناندایت؟).

هەروەها ئەوەیش دەگەیەنێت کە لە لێپێچینەوەکەیدا هەڕەشەی کرد لە پەپوسولەیمانەکە، ئەگەر ڕاستگۆ بوو لە هەواڵەکەیدا دەربارەی قەومی (سەبەء) ئەوا ڕزگاری دەبێت، ئەگەر درۆزنیش دەرچووئەوا حاڵی وەك حاڵی درۆزنان دەبێت و لە دەستە و تاقمی ئەوان دەبێت، ئەوا لەم حاڵەتەدا سزاکەی بۆ چەندبارە دەکرێتەوە، سزای دیارنەمانەکەی واتە (غائب) بوونەکەی و سزای درۆکەیشی.

﴿اذْهَب بِّكِتَابِي هَٰذَا فَأَلْقِهْ إِلَيْهِمْ ثُمَّ تَوَلَّ عَنْهُمْ فَانظُرْ مَاذَا يَرْجِعُونَ﴾(النمل:٢٨).

واتە: ((ئینجا سولەیمان (علیه السلام) نامەیەکی نوسی ودای بە پەپوسولەیمانەکە فەرمانی پێدا) کە بڕۆ ئەم نامەیە ببە و(لە شوێنێکی بەرچاودا، بۆیان فڕێبدە و پاشان (لەپەنایەکدا)خۆت حەشار بدەو بزانە دەڵێن چی و چ باس وخواسێك دەکەن؟). ئینجا ئەویش نامەکەی برد و فڕێیدایە ناویان.

## هەڵوێستی بەلقیس بەرامبەر نامەکەی سولەیمان( علیه السلام )

﴿قَالَتْ يَا أَيُّهَا الْمَلَأُ إِنِّي أُلْقِيَ إِلَيَّ كِتَابٌ كَرِيمٌ(٢٩) إِنَّهُ مِن سُلَيْمَانَ وَإِنَّهُ بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ(٣٠) أَلَّا تَعْلُوا عَلَيَّ وَأْتُونِي مُسْلِمِينَ(٣١) قَالَتْ يَا أَيُّهَا الْمَلَأُ أَفْتُونِي فِي أَمْرِي مَا كُنتُ قَاطِعَةً أَمْراً حَتَّى تَشْهَدُونِ(٣٢) قَالُوا نَحْنُ أُوْلُوا قُوَّةٍ وَأُولُوا بَأْسٍ شَدِيدٍ وَالْأَمْرُ إِلَيْكِ فَانظُرِي مَاذَا تَأْمُرِينَ(٣٣) قَالَتْ إِنَّ الْمُلُوكَ إِذَا دَخَلُوا قَرْيَةً أَفْسَدُوهَا وَجَعَلُوا أَعِزَّةَ أَهْلِهَا أَذِلَّةً وَكَذَلِكَ يَفْعَلُونَ(٣٤) وَإِنِّي مُرْسِلَةٌ إِلَيْهِم بِهَدِيَّةٍ فَنَاظِرَةٌ بِمَ يَرْجِعُ الْمُرْسَلُونَ﴾(النمل:٢٩-٣٥). ئەوە بوو پەپوسولەیمانەکە نامەکەی بە قاچی یان بە دەنوکی هەڵگرت وفڕی بیبیات بۆ مەملەکەتی (سەبەء) و چووە ناو کۆشك و تەلارەکەی بەلقیس ونامەکەی فڕیدا بۆ ناویان. ئینجا بەلقیس سەری سوڕما لە کارەکە و دەستی کرد بە خوێندنەوەی پاشان گەڕایەوە بۆ ناو دەستە و تاقمەکەی خۆی تا ڕاوێژیان پێ بکات.

## باسی نامەکە

﴿قَالَتْ يَا أَيُّهَا الْمَلَأُ إِنِّي أُلْقِيَ إِلَيَّ كِتَابٌ كَرِيمٌ﴾ بەلقیس نامەکەی بەڕێزدار باسکرد، چونکە ئەوەی کە لەناویدا بوو ڕێزدار و بەڕێزانە بوو. و لەلایەن پاشایەکی بەڕێزەوە هاتبو، وتراوە: نامەکە بە ڕێز بووە چونکە مۆرکرا بوو، مۆر کردنی نامەیش لە بەر تەواوی و جوانی و ڕێزێتی. هەروەها هاتووە کە دەڵێت: پێغەمبەر نامەی بۆ (عجم) دەنوسی و مۆری دەکرد. چونکە نامەیەکیان وەرنەدەگرت ئەگەر مۆرکراو نەبوایە، لەبەر ئەوە مستیلەیەکی بۆ خۆی دروستکرد کە مۆریشی پێ دەکرد.
وتراوە: نامەکە بە بەڕێز باسکرا، چوونکە نامە بەرەکە باڵندە بوو، ئینجا بەلقیس زانی کە هەر کەسێك باڵندەی بۆ ڕام و ژێر بارخرا بێت دەبێت کار و بارەکەی گەورە بێت و خاوەن پلەو پایە و دەسەڵات بێت.[٢٦٤]

---

[٢٦٤]- تفسير إبن كثير ٣٦١/٣ ولطائف الأشارات للقشيري ٣٥/٥.

(البروسوی) دەڵێت: (کاتێك نامەکە بوو بە هۆی هیدایەتدانی بەلقیس، دەرکەوت کە نامەیەکی ڕێزدار بوو و نیشانەی ڕێزداری پێوە بوو، چونکە بەو هۆیەوە بویە هۆکاری هیدایەتدانی، هەندێك وتویانە: لەبەر ئەوەی بەلقیس ڕێزی لە نامەکە گرت، خوای گەورە هیدایەتی پێ بەخشی هەتا باوەڕی هێنا، وەك جادووگەرەکان، کاتێك وتیان: ئەی موسا یان ئەوەتا تۆ شتەکانت فرێبدە یان ئێمە لەپێشدا فرێی دەدەین. بەڕاستی ئەوان ڕەچاوی ئەدەبی جوانیان کرد، خوای گەورەش ئیمانی خستە دڵەکانیانەوە، و کاتێك (کیسری)ی پاشای فارس نامەکەی پێغەمبەری (ﷺ) دڕاند و لەت کرد، خوای گەورەیش موڵك ودەسەڵاتەکەی ئەوی تەفر و تونا کرد و لەناوی برد، ئەوەش سزای کافر بوون ولوت بەرزی وکەللەڕەقییەکەی بوو.[٢٦٥]

ئەوەی ئێمە دەیبینین ڕێزداری نامەکە دەگێڕێتەوە بۆ هەموو کارەکان، چونکە ناوەرۆکەکەی و مەبەستەکەی ڕێزدار بوو، ڕێزدار بوو لە ووشەو دەربڕین و شێوازدا، وەك(إبن کثیر) دەڵێت: (ئەم نامەیە لەو پەڕی بەلاغە و جوان دەربڕیندا بوو، وکورتبڕ بوو، چونکە بە کورتترین دەربڕین جوانترین مانای دەدا).[٢٦٦]

ئەم نامەیە بەڕێز بوو، چونکە لەلایەن پاشایەکی بەڕێزەوە بوو، و بەڕێکاو شێوازێکی سەیر گەیشتبوو بە بەلقیس، کە بەڵگە بوو لە فراوانی دەستەڵاتی پاشاکە و گەورەیی و بەهێزی دەستەڵاتەکەی.

## ناوەرۆکی نامەکە

﴿إِنَّهُ مِن سُلَيْمَانَ وَإِنَّهُ بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ (٣٠) أَلَّا تَعْلُوا عَلَيَّ وَأْتُونِي مُسْلِمِينَ﴾(النمل:٣٠-٣١). کاتێك بەلقیس نامەکەی خوێندەوە وناوەرۆك و مەبەستەکەی زانی، ئینجا قەومەکەی و دەور و بەرەکەی کۆکردەوە، تا بۆیان بخوێنێتەوە و داوای ڕاوێژ و بڕیاردانیان لێ بکات لەم کارەدا، نامەکە بە باسی ناوی خاوەن نامەکە دەستی پێ کردبوو کە ناردبووی، پاشان ناوەڕۆکی نامەکەی باسکرد، وەك کاتێك بەلقیس وتی: ﴿إِنِّي أُلْقِيَ إِلَيَّ كِتَابٌ كَرِيمٌ﴾ پێی وتراوەکێیە؟ و ناوەرۆکەکەی چییە؟ ئینجا وتی: ﴿إِنَّهُ مِن سُلَيْمَانَ﴾ واتە: لە

---
[٢٦٥]- روح البيان للبروسي ٦/٣٤٢.
[٢٦٦]- تفسير إبن كثير ٣/٣٦١.

سولەیمانەوە نێردراوە، واتە ئەو ناردوویەتی و: ﴿وَإِنَّهُ بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ﴾ واتە: ئەمەش ناوەڕۆکە کەی بوو.[٢٦٧]

*لەسەر ئەم بۆچونە ناوی سولەیمان (علیه السلام) لە ناوەڕۆکی نامەکە نەبوو، بەڵکو ناونیشانی نامەکە بوو، چونکە ئەونامەکەی ناردبوو بەناوی خۆیەوە، وتراویشە: لە ناوەڕۆکی نامەکە بووە، بەڵام بەسەر ﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ﴾دا پێشکەوت کە باسی خوای گەورە و ناوی گەورە و پیرۆزی ئەوە.

پێشەوا (زین دین محمد بن أبی بکر الرازی) لە کتێبی (غرائب آي التنزیل)دا، دەڵێت: (ئەگەر وترا: چۆن ڕێگە پێدراوە بۆ سولەیمان (علیه السلام) کەناوی خۆی بەسەر ناوی خوای گەورەدا پێش بخات لەنامەکەدا، کە تیایدا نوسیبووی: ﴿إِنَّهُ مِن سُلَيْمَانَ وَإِنَّهُ بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ﴾؟ دەڵێن: چونکە سولەیمان (علیه السلام) زانیبوی کە بەلقیس خوای گەورە ناناسێت، و سولەیمان دەناسێت، ئینجا سولەیمان ترسا کە سوکایەتی بە ناوەکە بکات، کاتێك کە یەکەم ناوە و دەکەوێتە بەرچاوی، ئیتر ناوی خۆی کرد بەسەرەتا بۆ پارێز گاری لە سوکایەتی کردن بەناوی خوا، وتراوە ناوی سولەیمان (علیه السلام) ناونیشانی نامەکە بووە، ئینجا ناوی خوای گەورە لەسەرەتای دەست پێکردن و ناوەرۆکەکەی بووە.[٢٦٨]

﴿أَلَّا تَعْلُوا عَلَيَّ وَأْتُونِي مُسْلِمِينَ﴾. سولەیمان (علیه السلام) نەهی لێکردن و ئاگاداری کردنەوە لە خۆ بە گەورە گرتن و لوت بەرزی و پشت هەڵکردن لە حەق، خۆ بە گەورەزانین هۆکارە بۆ بێبەش بوون لە ئیمان، و نزیکی خراپە و یاخیبوون و لادانیشە و ڕێگای لەناوچوون وخەسارەت مەندییە.

هەروەها سولەیمان (علیه السلام) نەهی لە قەومی (سبأ)یش کرد لەوەی کە پشت هەڵکەن لە بەرنامەکەی خوا و بەڵگە و نیشانەکانی، و بانگەوازی کردن بۆ ئیسلام، فەرمووی: ﴿وَأْتُونِي مُسْلِمِينَ﴾ واتە: گوێڕایەڵ بن و خۆیان بۆ فەرمانی خوا یەکلایی بکەنەوە.

---

[٢٦٧]- الكشاف للزمخشري ٣/٣٦٣ ومجمع البيان للطبرسي ٣٤٣/٧.

[٢٦٨]- غرائب آي التنزيل ٣٥٢/٤-٣٥٣ هدية مجلة الازهر عدد جمادي الاولى سنة ١٤١٠هجري.

پێشەوا (الرازی) دەڵێت: (ئەم نامەیە هەموو مەبەستی تەواوی تیابوو، چونکە لە دروسکراوی خوا داواکراوە زانست و کرداری هەبێت، و زانستیش بەسەر کرداردا پێش کەوتووە، ئایەتی: ﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ﴾ دان دەنێت بە بەدیهێنەری هەموو شتەکاندا، کە خوای گەورەیە، هەروەها ئەوەش دەچەسپێنێت کە زاناو بە توانا و هەمیشە زیند و بەدەسەلات و فەرماندەر و کاربەجێ و بەڕەحم و بەزەیی یە، هەروەها ﴿أَلَّا تَعْلُوا عَلَيَّ﴾ ئەمەش نەهی کردنە لە گوێڕایەڵی نەفس و هەواو ئارەزو و خۆ بەگەورە زانین، ئەوە چەسپاو وجێگیر بوو کە ئەم نامەیە لەگەڵ کورتبڕیدا هەمووشتێکی لە بارەی کار و باری دین و دنیاوە تیا بوو، ئەگەر وترا نەهیکردن لە خۆ بە گەورەزانین و فەرمانکردن بە خۆ یەکلایی کردنەوە پێش گەیاندنی بەڵگەکان لەسەر ئەوەی کە سولەیمان پێغەمبەر بێت، ئەوا حەق و پێویستە ئەوەی لێ وەربگرێت کەخۆی لە (تقلید) چاولێکەری ڕزگار کردووە، پەنا بە خوا ئەگەر ئەو کارە (تقلید) چاولێکەری بوو بێت، چونکە نامەبەرەکەی سولەیمان (علیه السلام) بۆ لای بەلقیس بریتی بوو لە پەپووسولەیمانە. ونامەی پەپوسولەیمانەکەیش موعجیزە بوو، موعجیزەیش بەڵگەیە لەسەر کەسی دروستکار و بەدیهێنەر و سیفەتەکانی، هەروەها بەڵگەیشە لەسەر ئەو کەسەی کە بانگەوازەکەی کردووە واتە سلیمان، لە کاتێکدا کە ئەو نامەیە بوویە بەڵگەی تەواو لەسەر یەك خواناسی و پێغەمبەرایەتی، گومانی تێدا نییە کە لە نامەکەدا بەڵگەی تر باس نەکراوە).[٢٦٩]

## بەلقیس داوای ڕاوێژ لە قەومەکەی دەکات، لەگەڵ ئەو گفتوگۆیەی لەنێوانیاندا ڕویدا

لەچیرۆکی سولەیمان (علیه السلام) لەگەڵ بەلقسدا، نامەکەی سولەیمان گەیشت بە بەلقیس وئەویش قەومەکەی کۆکردەوە تا ڕاوێژیان پێ بکات.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قَالَتْ يَا أَيُّهَا الْمَلَأُ إِنِّي أُلْقِيَ إِلَيَّ كِتَابٌ كَرِيمٌ(٢٩) إِنَّهُ مِن سُلَيْمَانَ وَإِنَّهُ بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ(٣٠) أَلَّا تَعْلُوا عَلَيَّ وَأْتُونِي مُسْلِمِينَ(٣١) قَالَتْ يَا أَيُّهَا الْمَلَأُ أَفْتُونِي فِي أَمْرِي مَا كُنتُ

[٢٦٩]- مفاتیح الغیب للرازی ٢٤/١٩٤-١٩٥.

قَاطِعَةً أَمْراً حَتَّى تَشْهَدُونِ(٣٢) قَالُوا نَحْنُ أُوْلُوا قُوَّةٍ وَأُوْلُوا بَأْسٍ شَدِيدٍ وَالْأَمْرُ إِلَيْكِ فَانظُرِي مَاذَا تَأْمُرِينَ(٣٣) قَالَتْ إِنَّ الْمُلُوكَ إِذَا دَخَلُوا قَرْيَةً أَفْسَدُوهَا وَجَعَلُوا أَعِزَّةَ أَهْلِهَا أَذِلَّةً وَكَذَلِكَ يَفْعَلُونَ(٣٤) وَإِنِّي مُرْسِلَةٌ إِلَيْهِم بِهَدِيَّةٍ فَنَاظِرَةٌ بِمَ يَرْجِعُ الْمُرْسَلُونَ﴾(النمل:٢٩-٣٥). **بەلقیس داوای لە قەومەکەی کرد کە ڕاوبۆچونی خۆیان دەربخەن و قسەی خۆیان بکەن ولەم کارەدا دڵسۆزی خۆیان بنوێنن.** ﴿قَالَتْ يَا أَيُّهَا الْمَلَأُ أَفْتُونِي فِي أَمْرِي﴾ **ووشەی** (فتوى) **بۆ کارێکە ئاڵۆز بێت و پێویستی بە بڕیاردان بێت و وتراوە داوای فتوام لێ کرد، ئەویش فتوای بۆدام بەوە.**

**خوای گەورە فەرموویەتی:** ﴿وَيَسْتَفْتُونَكَ فِي النِّسَاءِ قُلِ اللَّهُ يُفْتِيكُمْ فِيهِنَّ﴾.(النساء:١٢٧).

**واتە: (ئەی ممحد** (ﷺ) **پرسیارت لێ دەکەن دەربارەی ئەوەی کە پێویستە پیاوان ئەنجامی بدەن بەرامبەر بەژنان).**

﴿ماكنتُ قاطِعَةً أمراً حتى تشهدونَ﴾. **واتە: خۆ هێشتا من هیچ بڕیارێکم نەداوە یان فەرمانێکم دەرنەکردووە کە ئێوە ئاگادار و ئامادە نەبووبن. بەپێی ئەم دەر بڕینە زۆر پێویستی بە دانایی و حیکمەت و هێز و توانای ئەوان بووە.**

**پێشەوا (النیسابوری) دەڵێت:** (**بەم کارە ویستی هەست و سۆزیان ڕابکێشێت، و دەرونیان پاك بکاتەوە وئاگاداری ڕاوبۆچونەکان بێت.**).

## بەلقیس و موعجیزەیەکی گەورە

**خوای گەورە فەرموویەتی:** ﴿وَتَفَقَّدَ الطَّيْرَ فَقَالَ مَا لِيَ لَا أَرَى الْهُدْهُدَ أَمْ كَانَ مِنَ الْغَائِبِينَ(٢٠) لَأُعَذِّبَنَّهُ عَذَاباً شَدِيداً أَوْ لَأَذْبَحَنَّهُ أَوْ لَيَأْتِيَنِّي بِسُلْطَانٍ مُّبِينٍ(٢١) فَمَكَثَ غَيْرَ بَعِيدٍ فَقَالَ أَحَطتُ بِمَا لَمْ تُحِطْ بِهِ وَجِئْتُكَ مِن سَبَإٍ بِنَبَإٍ يَقِينٍ﴾(النمل/٢٠-٢١). **باڵندەکان لە خزمەتی سولەیماندا بوون یەکێك لەوانە پەپوسولەیمانە بوو، ڕاسپێردارا بوو بۆ گەڕان و دۆزینەوەی ئاو، ئەمەیش تایبەتمەندییەك بوو خوای گەورە بەوی بەخشیبوو، بەسەر زەویدا دەفڕی و دەسوڕایەوە و ئاوی ژێرزەوی دەبینی و شوێنەکەی پێ دەوتن، ئەوانیش هەڵیان دەکەند و ئاویان لێ دەردەهێنا، و سولەیمان پێویستی بە ئاو بوو بۆ نوێژ و لە شوێنێکی وشکانیدا بوو،**

داوای کرد لە پەپووسولەیمانە بگەڕێت بە شوێن ئاودا، ئەویش دەستی نەکەوت، ئەویش بە هۆی دواکەوتنییەوە هەڕەشەی لێ کرد بە تایبەت ئەگەر بەڵگەی نەبێت. پاش ئەو ماوەی دیار نەبوو گەڕایەوە کە ئەوەی بینی بووی بۆ سولەیمانی بگێڕێتەوە.

سولەیمان ووتی: چیت بینیوە؟ وتی: ﴿إِنِّي وَجَدتُّ امْرَأَةً تَمْلِكُهُمْ وَأُوتِيَتْ مِن كُلِّ شَيْءٍ وَلَهَا عَرْشٌ عَظِيمٌ﴾(النمل/٢٣). هەواڵێکی گەورە و گرنگی دەربارەی ووڵاتی یەمەن هێنابوویەوە و ڕاستگۆیانە گێڕایەوە و زانیاری زۆری تێدا بوو، کە بەلقیس پاشایانە و خەڵکەکە گوێڕایەڵی ئەو دەکەن و هەموو شتێکی لە هێز و سەرباز و دەستەلآت لا هەیە، بەڵگەی ئەمانەیش بریتییە لە بوونی (عرش) تەختێکی پاشایەتی گەورە، کە بە جۆرەها شتی بەنرخ و گرانبەها ڕازێنراوەتەوە، ئەمەیش نیشانەی دامەزراوی دەوڵەتی بەهێز و شارستانیەتە، بەڵام ئەوەی کە نابار و نەشیاوە ئەوەیە کە خەڵکی ئەو ووڵاتە خۆر دەپەرستن و خواپەرست نین ئەمەیش پەپووسولەیمانەکەی زۆر نیگەران و دڵتەنگ کردووە، بەپەلە و هەناسەبڕکێ گەڕایەوە تا هەموو ئەم هەواڵانە بدات بە سولەیمان.

سولەیمان تووڕەبونەکەی نیشتەوە و هەڵوێستی گۆڕا و وتی: چۆن ئەوان لە مەنهەج و بەرنامەی حەق و ڕاستی ڕویان وەرگێڕاوە و خوا ناپەرستن و خۆر دەپەرستن و شەیتان زاڵ بووە بەسەر دەرونیاندا و عەقڵ و تێگەیشتنیانی داپۆشیوە و ئەوان پێویست بوو بە عەقڵ و بیرکردنەوەیان لەم بوونەوەرە و ئەو شتانەی کە تیایەتی بگەیشتنایەتە خواپەرستی ڕاستەقینە، کاتێك خوا لە ئاسمان و زەویدا ڕزقی شاراوە و دیاری بەوان داوە و بارانیان بۆ دەبارێنێت و لە زەویدا ڕوەك و سەوزایی و بەرو بومیان بۆ دەردێنێت و گەنجینە شاراوەکانیان بۆدەردەخات، دەبوو خواناس و خواپەرست بونایە. بەڵام خۆر پەرستن نەفامی و نەزانی و گومڕاییە. دوای بیستنی قسەکانی پەپووسولەیمانە ویستی لێکۆڵینەوە لە ڕاستی و ناڕاستی قسەکانی بکات: ﴿اذْهَب بِّكِتَابِي هَٰذَا فَأَلْقِهْ إِلَيْهِمْ ثُمَّ تَوَلَّ عَنْهُمْ فَانظُرْ مَاذَا يَرْجِعُونَ﴾(النمل/٢٨). نامەیەکی نارد بۆ بەلقیس کە تیایدا نوسرا بوو: ﴿إِنَّهُ مِن سُلَيْمَانَ وَإِنَّهُ بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ (٣٠) أَلَّا تَعْلُوا عَلَيَّ وَأْتُونِي مُسْلِمِينَ﴾(النمل/٣٠-٣١). بەڕاستی بەلقیس زانی ئەوەی کە پێی گەیشتووە نوسراوێکی ڕێزدارە و لە پاشایەکی پایەدار و بەهێزەوە. بەلقیس پاش خوێندنەوەی نامە نوسراوەکە ڕاوێژی کرد بە بەردەستەکانی کە چ بڕیارێك بدەن، ئەوانیش پێشنیاری هێز و سوپا و ئازایەتی و نەترسان و چوونە

ناو جەنگیان کرد، ئەوان ئامادەن و ئەوە تایبەتمەندی ئەوانە. بەڵام قسە و بڕیاری جیاکەرەوە لە دەست بەلقیس خۆیدایە و ئەوان سەرپێچی ناکەن، ئەویش نەیویست سوپاکەی بەرەو جەنگێکی چارەنوس نادیار ببات، چونکە نازانێت هێزی بەرامبەرەکەی چۆنە و چەندە و لە ڕووخان و تیاچوون دەترسێت، لەبەر ئەوەپەنای برد بۆ پەیوەندی دبلۆماسی، دیارییەکی بەنرخی بۆ سولەیمان نارد و بە ڕاوێژکارەکانی وت:ئەگەر پاشا بێت ئەوا سەرسام دەبێت بە دیارییەکە و وەری دەگرێت و لە شەڕی پارێزراو دەبین و ئەگەر پێغەمبەریش بێت، هەرگیز وەری ناگرێت و هیچیش لە ئێمە قبوڵ ناکات تەسلیم بوون و شوێن کەوتنی دینەکەی نەبێت. بەڵام سولەیمان زۆر بە توندی ڕەدی کردەوە و هەڕەشەی خۆی دەربڕی وەفدەکە گەڕانەوە بۆ لای بەلقیس و هەواڵی سولەیمان و پێغەمبەرایەتیان بۆ گێڕایەوە. کاتێك بەلقیس گەیشتە لای سولەیمان بەمەبەستی تەسلیم بوون و موسڵمان بوون، سولەیمان عەرشەکەی هێنابوو و گۆڕانکاری تیادا کردبوو، ویستی بەلقیسی پێ تاقی بکاتەوە و بزانێت زیرەکی چەندە؟ ﴿فَلَمَّا جَاءَتْ قِيلَ أَهَكَذَا عَرْشُكِ قَالَتْ كَأَنَّهُ هُوَ وَأُوتِينَا الْعِلْمَ مِنْ قَبْلِهَا وَكُنَّا مُسْلِمِينَ﴾(النمل/٤٢).

بۆ ئەوەی سولەیمان ببینێت ئایا بە لقیس سەرکەوتوو دەبێت لە تاقیکردنەوەکەدا و عەقڵ و زیرەکی بەکار دێنێت؟خۆ ئەگەر وا نەبێت ئەوا نەیتوانیوە پاشایەکی گوێڕایەڵ بووبێت لە ناو قەومەکەیدا. لەو کاتەوە کە نامەکەی سولەیمانی پێ گەیشتبوو وەك کەسێکی ژیر و دانا هەڵس وکەوتی دەکرد، بەڵام دەبێت ئەو کاری چی بووبێت بە خۆر پەرستی، ئایا دەبێت کەسێك بیرکردنەوەی بەرز بێت و ڕۆحی گەورە و عەقڵی کراوە بێت، ئەو کارەبکات؟! ﴿وَصَدَّهَا مَا كَانَتْ تَعْبُدُ مِنْ دُونِ اللَّهِ إِنَّهَا كَانَتْ مِنْ قَوْمٍ كَافِرِينَ﴾(النمل /٤٣). بەلقیس بیر و باوەڕەکەی پێشووی نەما بوو کە خۆر پەرستی بوو بەڵکو بەرەو هیدایەتی موسڵمان بوون هاتبوو، چونکە لە ژینگەیەکی کافر نشیندا لە دایك بووبوو. بەڵام ئەمڕۆ نور و ڕووناکی و بەڵگەی حەق و ڕاستی و موعجیزەی ئاشکرای بینی کە ئەوانەیش بە هێزێکی لە ڕادەبەدەر جێ بەجێ دەبن لەلایەن خوای دروستکار و بەدیهێنەرەوە، لەبەر ئەوە ئیمانی قبوڵ کرد و وازی لە هەموو ئەو شتانە هێنا کە پێشتر دەیپەرستن و ئیسلامبوونی خۆیی ڕاگەیاند: ﴿قِيلَ لَهَا ادْخُلِي الصَّرْحَ فَلَمَّا رَأَتْهُ حَسِبَتْهُ لُجَّةً وَكَشَفَتْ عَنْ سَاقَيْهَا قَالَ إِنَّهُ صَرْحٌ مُمَرَّدٌ مِنْ قَوَارِيرَ قَالَتْ رَبِّ إِنِّي ظَلَمْتُ نَفْسِي وَأَسْلَمْتُ مَعَ سُلَيْمَانَ لِلَّهِ رَبِّ

﴿الْعَالَمِينَ﴾(النمل/٤٤). بەڕاستی ئەو شوێنە بینایەکی زۆر سەیری تێدابوو، لەسەرەتا و پێشەوەی شووشە هەبوو بەسەر ئاوەوە کە ماسی مەلەی تیا دەکرد، ئەو هەستی بە شووشەکە نەکرد، کاتێك قاچی دانا لەسەرشووشەکە جلەکانی بەرەو سەرەوە بەرزکردەوە بۆ ئەوەی قاچەکانی تەڕنەبێت، خێرا سولەیمان چاوەکانی نوقاند و فەرمووی: ﴿إِنَّهُ صَرْحٌ مُمَرَّدٌ مِنْ قَوَارِيرَ﴾. واتە لە تەڕبوون مەترسە، ئەوە ڕوکارێکی ڕوونی وەك شووشەیە و لە شووشە ساف ولوس ترە و ڕوونترە، ئەوەیش کارێکی زۆرسەرسوڕهێنەربوو بۆبەلقیس، لە تاو ئەو حاڵەتەی نەیزانی لەگەڵ پێغەمبەرێکی گەورەی خوادایە، دانی نا بەهەڵەی ڕابردووی خۆیدا و ئیسلام بوونی خۆی ڕاگەیاند: ﴿قَالَتْ رَبِّ إِنِّي ظَلَمْتُ نَفْسِي وَأَسْلَمْتُ مَعَ سُلَيْمَانَ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾(النمل/٤٤). ئەمەیش ئەوپەڕی دان نانە بە هەڵە و بێباوەڕی کە ئەوی لەسەربووە. چەند ساڵ لەگەڵ قەومەکەیدا لەگومڕاییدا بوون، وایان دەزانی لەسەرحەق و ڕاستی بوون.

## ڕەگەزەکانی هێز و بازوو

﴿قَالُوا نَحْنُ أُولُو قُوَّةٍ وَأُولُو بَأْسٍ شَدِيدٍ وَالْأَمْرُ إِلَيْكِ فَانظُرِي مَاذَا تَأْمُرِينَ﴾ (النمل:٣٣).

قەومەکەی ئەوەیان بۆ بەلقیس باسکرد کە خاوەنی هێز و بازو و پێداویستی جەنگن لەسەر ئەوەشەوە کە لەوپەڕی ئامادەباشیدان وئەوان لەگەڵ ئەوەشدا بەهێزن و ژمارەیان زۆرە، خاوەنی جورئەت و چاونەترسی و هەنگاو بەرەو پێش نان و ئارامگری ودامەزراوین. و فەرمانی کۆتاییشی دایە دەست پاشا بەلقیس خۆی، لەمەدا ئاماژە کراوە بۆ یەکدەنگی ودەربڕینی ئەوان وەك یەك. چونکە هێز بەبێ بونی یەککگرتن وپێکەوە بوون، نرخ و بەهای نیە و یەککگرتن و پێکەوە بونیش بەبێ بوونی هێزو بازو، ئەویش هیچ کێش وبەهایەکی نییە، کەواتە هەر دەبێت هێز و پێکەوە بوون بەیەکەوە هەبن تا سەرکەوتن وبردنەوە بەدەست بێت.

(شێخ سعید حوی) دەڵێت: (ئەوان لە هێزدا مەبەستیان لە هێزی جەستە بوو لەگەڵ ئەو ئامێر و ئامراز وکەل و پەلانەی هەیانبوو، هەروەها دەستەڵاتی توند و تیژ و توانای

فریاکەوتن وناڕەحەتی لەجەنگدا) ﴿وَالْأَمْرُ إِلَيْكِ﴾. واتە: (فەرمانەکە دراوەتە دەست خۆت، ئێمە گوێڕایەڵی فەرمانی تۆین) تۆ خۆت فەرمانمان پێ بکە ئێمەیش گوێڕایەڵت دەبین و سەرپێچیت ناکەین، و وەك ئەوەی کە ئاماژەی جەنگ و کوشتاریان کردبێت، یان مەبەستیان ئەوە بووە: ئێمە ڕۆڵە و کوڕی جەنگ کردنین نەك ڕۆڵە و کوڕی ڕاو بۆچوون و ڕاوێژ لێ وەرگرتن، وتۆیش خاوەنی ڕاو بۆچون و نەخشە دانانیت.[٢٧٠]

مامۆستا (سید قطب) دەڵێت:. (لێرەدا (ئافرەت) لەپشتی (پاشایەتی)یەوە دەردەکەوێت، ئەو ئافرەتەی کە ڕقی لە جەنگ و وێرانکارییە، ئەو کەسەیە کە چەکی فر و فێڵ دەردێنێت و نەرم و نیانی بەکار دێنێت پێش چەکی هێز و بازو توندی نواندن، و خۆی ئامادە دەکات لە ڕوو بەڕوو بوونەوەیدا بۆ پیاو) بەبێ دوژمنایەتی و ناکۆکی).[٢٧١]

## دیاریی وەك بەرتیل

﴿قَالَتْ إِنَّ الْمُلُوكَ إِذَا دَخَلُوا قَرْيَةً . . . يَرْجِعُ الْمُرْسَلُونَ﴾﴿النمل:٣٤-٣٥﴾. بێگومان بەلقیس لە قسە و دەربڕینی قەومەکەیەوە هەستی بەوە کرد کە قەومەکەی سورن لەسەر جەنگ کردن و مەیلیان بەلایدایە، بەڵام ئەویش نایەوێت کە سوپایەك بەناو شوێنێکدا بەرێت و داهاتووی باش و پەسەند نەبێت، بەتایبەتیش لەگەڵ سولەیماندا، کە سەرباز و سوپایەکی بەهێز و بێئەندازە و بێشوماری هەیە و جۆرەها چەکی هەمە چەشنیان هەیە، باڵندەکانیش سەر بازی ئەون، چۆن ئەم بە سوپاکەی خۆیەوە ململانێ لەگەڵ ئەواندا بکات و بیانخاتە ناو جەنگێکەوە کە گونجاو و لەبار نییە بۆ ئەوان. بەلقیس دڵنیا بوو کە ئەگەر جەنگ بکات ئەوا سولەیمان سزای ڕوخان و سەرشۆڕکردنیان پێ دەچێژێت، و پاشان خۆشییەکەی لێ دەگۆڕێت بۆ ناخۆشی و ماتەمینی، و سەربەرزییەکەیان بۆ سەرشۆڕی و سەرکزی. ئیتر چۆن خۆی و قەومەکەی ڕابکێشێت بۆ مەترسی و ئازارەکانی ناو جەنگ؟

بێگومان پەنای برد بۆ چەکێکی تر، کە بیرو هۆش و فیترەت و سروشتی مێینەیی خۆی لە گەڵیدا دەگونجا. کە ئەویش چەکی (إغراء) تەماع خستنە بەرچاو بوو، کە بۆ فێڵ

---

[٢٧٠]-الاساس في التفسير للشيخ سعيد حوى ٧\٤٠١١-٤٠١٢.

[٢٧١]-في ظلال القران\ج٥\٢٤٦٠ .

وخەڵەتاندن بوو، ئافرەت زۆر بەهێز و سەرکەوتوو نییە لە زۆربەی کاتەکاندا و ناتوانێت بڕیاری یەکلایی کەرەوە دەربکات، ومەبەستەکانی چارەنوس ساز نین، بەڵکو مەیلی بەلای فڕ و فێڵ و پێچ وپەنا و پەیمان بەستندایە، ئەگەر ماوەکەیشی زۆری پێ بچێت. بێگومان هەنگاوی نا بۆ کارێك کە ئامانجێکی لە پشتەوە بوو کە ترس و دڵە ڕاوکێ بخاتە ناو دڵی قەومەکەیەوە لەوەی کە ڕووبەڕووی جەنگ و کۆتایی ئازاراوییان بکات. ئینجا بەوە کۆتای پێهێنا کە دیاری یەکی بەنرخ بۆ سولەیمان (علیه السلام) بنێرێت. ﴿وإني مرسلة إليهم بهدية فناظرة بم يرجع المرسلون﴾. بێگومان ئەم کارەی بە عەمدی و ئارەزوی خۆی کرد تا مەیلی ڕابکێشێت، وتراوە: بۆیە ئەم کارەی کرد تا لە ڕێگەیەوە بزانێت ئەگەر پێغەمبەری پاشا بێت ئەوە لەلایەن خوای گەورەوە پشتیوانی لێ کراوە، ئیترچۆن بتوانێت ڕوو بە ڕووی کەسێك بێتەوە کە بەهێزە و لەلایەن خواوە پشتیوانی لێ دەکرێت، و ئەگەر پاشا بوو بە تەنها و پێغەمبەر نەبوو، ئەوا ماڵ و دیاری بەسە بۆ ئەو و بێدەنگی دەکات و ئەگەر دیارییەکەش سودی نەبوو بۆی ئەوە تەنها یەك هەڵبژاردن لە بەردەمیدا دەمێنێتەوە کە جەنگ کردنە و لەم حاڵەتەدا ئەو بەرامبەر یەکێك لە پاشاکانی دنیا دەوەستێت و تەنها هێز و بازو تووند وتیژی سوپاکەی یەکلایی دەکاتەوە.

ئەوەی کە ئێمە دەیبینین بریتییە لە: بێگومان بەلقیس دیاریەکی بەنرخ و گەورەی بۆ سولەیمان (علیه السلام) نارد، کە خوای گەورە خۆی دەزانێت دیارییەکە چی بوو ونرخی چەند بووە.

## هەڵوێستی سولەیمان (علیه السلام) بەرامبەر ئەم دیاریی بەرتیلە

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿فَلَمَّا جَاءَ سُلَيْمَانَ قَالَ أَتُمِدُّونَنِ بِمَالٍ فَمَا آتَانِيَ اللَّهُ خَيْرٌ مِمَّا آتَاكُمْ بَلْ أَنْتُمْ بِهَدِيَّتِكُمْ تَفْرَحُونَ (٣٦) ارْجِعْ إِلَيْهِمْ فَلَنَأْتِيَنَّهُمْ بِجُنُودٍ لَا قِبَلَ لَهُمْ بِهَا وَلَنُخْرِجَنَّهُمْ مِنْهَا أَذِلَّةً وَهُمْ صَاغِرُونَ﴾(النمل:٣٦-٣٧). نوێنەری بەلقیس گەیشتە لای سولەیمان (علیه السلام) کە دیاریەکی بەنرخ و بێ هاوتایان پێ بوو،کاتێك سولەیمان (علیه السلام) بەمەی زانی، زۆر بە تووندی تووڕە بوو خۆی پێنەگیرا، وەك قورئان هەواڵی داوە. فەرمووی: ﴿قَالَ

أَتُمِدُّونَنِ بِمَالٍ فَمَا آتَانِيَ اللَّهُ خَيْرٌ مِّمَّا آتَاكُم﴾واتە: ئەوەی کە خوای گەورە بەمنی بەخشیوە لە پێغەمبەرایەتی و زانست و حیکمەت وپاشایەتی، چاکتر و خەیرترە لەو مەتاع ودیاری و کەل وپەلە کەم و شتە دنیایی وبڕاوەی کە ئێوە بۆمنتان هێناوە، من پێویستیم بەدیاری و هەدیەی ئێوە نییە، وهیچ کێش وبەهایەکیشی لای من نییە.

*خاوەنی (الکشاف) دەڵێت: (واتە: بێگومان ئەوەی لای منە خەیر و چاکترە لەوەی کە لای ئێوەیە، ئەوەیش چونکە خوای گەورە دینی بەمن داوە، کە بەخت وشانسێکی زۆر گەورەی تیایە و دەوڵەمەندی و فراوانییە، وئەوەندەشی لە دنیا پێ داوم کە لەوە زیاترم ناوێت و زۆرە، ئیتر چۆن کەسێکی وەك من ڕازی دەبێت بەوەی کە دەست درێژ بکات بۆ ماڵ وسامان؟).[٢٧٢]

﴿بَلْ أَنتُم بِهَدِيَّتِكُمْ تَفْرَحُونَ﴾(النمل:٣٦).

واتە: (نەخێر، من بەو دیارییە دڵشاد نابم، بەڵکو ئێوەن بە دیارییەکانتان دڵشاد دەبن).

﴿ارْجِعْ إِلَيْهِمْ فَلَنَأْتِيَنَّهُم بِجُنُودٍ لَّا قِبَلَ لَهُم بِهَا وَلَنُخْرِجَنَّهُم مِّنْهَا أَذِلَّةً وَهُمْ صَاغِرُونَ﴾(النمل:٣٧).

سولەیمان (علیه السلام) فەرمانی کرد بە نوێنەرەکە کە بەدیاری و بەرتیلەکەیەوە بگەڕێتەوە بۆ لای قەومەکەی، و هەڕەشەیەکی باشیشی لێ کردن، لە کاتێکدا کە نوێنەرەکە یەك کەس بوو بەڵام سولەیمان (علیه السلام) بەشێوازی (جمع) کۆ پێی وتن، چونکە قسە لەگەڵ نوێنەری قەومێك وەك قسەکردنە لەگەڵ هەموو قەومەکە. هەمیشە زۆر جار یەك کەس نامە هەڵدە گرێت.[٢٧٣]

ئایەنی ﴿فلنأتينهم بجنود لا قبل لهم بها﴾ واتە: (سوێند بەخوا دەبێت بە سەربازانێکەوە بچینە سەریان کەنەیان دیبێت ونەتوانن بەرگری بکەن).﴿ولنخرجنهم منها أذلة﴾. واتە: (دەبێت دەریان بکەین لە وڵاتیان، لە کاتێکدا ئەوان زەلیل و ڕیسوا و شکاون).

---

[٢٧٢]- الکشاف للزمخشري |٣|٣٦٦ بە دەستکارییەوە.

[٢٧٣]-روح البیان للبروسوي |٦|٣٤٦ بەکورتی و بە دەستکارییەوە.

## عەرشەکەی بەلقیس لەبەردەم سولەیماندا (علیه السلام)

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ قَالَ يَا أَيُّهَا الْمَلَأُ أَيُّكُمْ يَأْتِينِي بِعَرْشِهَا قَبْلَ أَنْ يَأْتُونِي مُسْلِمِينَ (٣٨) قَالَ عِفْرِيتٌ مِنَ الْجِنِّ أَنَا آتِيكَ بِهِ قَبْلَ أَنْ تَقُومَ مِنْ مَقَامِكَ وَإِنِّي عَلَيْهِ لَقَوِيٌّ أَمِينٌ (٣٩) قَالَ الَّذِي عِنْدَهُ عِلْمٌ مِنَ الْكِتَابِ أَنَا آتِيكَ بِهِ قَبْلَ أَنْ يَرْتَدَّ إِلَيْكَ طَرْفُكَ فَلَمَّا رَآهُ مُسْتَقِرًّا عِنْدَهُ قَالَ هَذَا مِنْ فَضْلِ رَبِّي لِيَبْلُوَنِي أَأَشْكُرُ أَمْ أَكْفُرُ وَمَنْ شَكَرَ فَإِنَّمَا يَشْكُرُ لِنَفْسِهِ وَمَنْ كَفَرَ فَإِنَّ رَبِّي غَنِيٌّ كَرِيمٌ ﴾ (النمل:٣٨-٤٠). کاتێك سولەیمان (علیه السلام) دیاریەکەی ڕەت کردەوە بۆ بەلقیس، و لەگەڵ نوێنەری وەفدەکەشیدا هەڕەشە و ئاگادارکردنەوەیەکی توندی نارد و پێ ڕاگەیاندن، ئینجا بەلقیس هەستی کرد کە ئێستا ئەو بەرامبەری پاشایەکی پێغەمبەرە، وناتوانێت ڕوو بە ڕووی ببێتەوە، ئێستا تەنها ئەوە لەبەردەم ئەودا ماوەتەوە کە کەل و پەل و کۆچ و بار ڕێك بکات بۆ ڕۆیشتن بەرەو لای سولەیمان و تەسلیمی ببێت و پشتیوانی لەو بکات و خۆی بە لایەنگری ئەو دابنێت. بێگومان سولەیمان (علیه السلام) هەواڵی هاتنی بەلقیسی پێ گەیشت، و ویستی کەنیشانەیەکی سەیر و سەرسوڕهێنەری نیشان بدات، کە بەڵگە بن لەسەر پشتیوانی خوای گەورە لە سولەیمان، و تا بەلقیس بزانێت بانگەواز و کارەکەی سولەیمان حەق و ڕاستە و خۆی تەسلیمی خوای گەورەی هەموو جیهانەکان بکات.

خوای گەورە فەرمووی: ﴿قَالَ يَا أَيُّهَا الْمَلَأُ أَيُّكُمْ يَأْتِينِي بِعَرْشِهَا قَبْلَ أَنْ يَأْتُونِي مُسْلِمِينَ﴾(النمل:٣٨).

سولەیمان (علیه السلام) داوای لەقەومەکەی کرد کە یەکێکیان عەرشەکەی بەلقیسی لەوڵاتی سەبەئەوە بە شێوەیەکی سەیر و لە عادەت بەدەر بۆ بهێنێت، تا سەرنجی بەلقیسی پێ ڕابکێشێت و بەهۆیەوە بانگەوازی بکات بۆ لای ئیمان و باوەڕ هێنان. وتراوە: سولەیمان (علیه السلام) سەرسام بوو بە گەورەیی عەرشەکەی بەڵقیس و جوانی وناوازەیی یەکەی، ویستی دەستی بەسەردا بگرێت پێش ئەوەی کە بەلقیس موسڵمان ببێت، ئینجا ئیسلام بوونەکەی دەیپارێزێت. زانا (قَتادة) دەڵێت: ئەمە بۆچون و لێکدانەوەیەك بوو کە شیاو نەبوو سولەیمان (علیه السلام) بیکات کە ئەو پاشا و

پێغەمبەرە (علیه السلام). ئیتر ئەو چۆن تەماعی لە عەرشەکەی بەلقیسدا دەبێت کە هەدیە و دیارییەکەی ڕەت کردەوە و بۆ ناردەوە و هەڕەشەو توندیشی لەگەڵدا دەربڕی. وتراوە: سولەیمان (علیه السلام) ویستی عەقڵ و ژیری بەلقیس تاقی بکاتەوە. لەبەرئەوە فەرمووی: ﴿نَكِّرُوا لَهَا عَرْشَهَا نَنظُرْ أَتَهْتَدِي أَمْ تَكُونُ مِنَ الَّذِينَ لَا يَهْتَدُونَ﴾(النمل:٤١). وتراوە: بەلقیس لەوە ترسا لەسولەیمان (علیه السلام) مارەی بکات لە یەکێك لە پەرییەکان کە بەردەوام لە خزمەتی سولەیماندا بوون و بۆ ئەو ڕام کرا بوون، ئینجا بە سولەیمانیان وت: بەڕاستی لە عەقڵی بەلقیسدا گرفت هەیە، ئینجا سولەیمان ویستی تاقی بکاتەوە.[٢٧٤]

*ئەوەی ئێمە لەم مەسەئەلەیەدا دەیبینین، سولەیمان داوای هێنانی عەرشەکەی کرد تا ببێتە فەرمانێکی لەعادەت دەرچو وسەرسامکەر، تا بە هۆیەوە بەلقیس هەست بکات کە سولەیمان (علیه السلام) لە لایەن خواوە پشتیوانی کراوە، و گۆڕینی عەرشەکەیش لەبەردەم بەلقیسدا بۆ تاقیکردنەوە و دەرخستنی ئاستی زیرەکی بەلقیس بێت، هەروەها بانگەوازیش بێت بۆ ووردبوونەوە لە تێڕوانین و بەکارهێنانی بیرکردنەوە.

## سولەیمان (علیه السلام) پێشنیاری خستە بەردەم پەرییەکان

سولەیمان (علیه السلام) پێشنیاری خستە بەردەم ئەو کەسانەی کە لە مەجلیسەکە و شوێنەکەی ئەودا بوون. کێ دەتوانێت لە خێراترین کاتدا عەرشەکەی بەلقیسم بۆ بهێنێت؟ یەکێك لە زەبەلاحە پەرییەکان کەپێی دەوترا: (عفریت) هەستا وەك قورئان هەواڵی داوە. ووتی: ﴿أَنَا آتِيكَ بِهِ قَبْلَ أَن تَقُومَ مِن مَّقَامِكَ وَإِنِّي عَلَيْهِ لَقَوِيٌّ أَمِينٌ﴾(النمل:٣٩).

واتە: (من بۆت دەهێنم پێش ئەوەی دەوام تەواو بێت و لەجێی خۆت هەستیت، بەڕاستی من بۆ ئەم کارە خۆم بە بەهێز و ئەمین دەزانم).

---

[٢٧٤]-الجامع لأحكام القران للقرطبي ١٣|٢٠٢-٢٠٣.

## هەڵوێستی سولەیمان (علیه السلام) بەرامبەر ئەم کارە سەرسەرهێنەرە

سولەیمان (علیه السلام) گرنگی نەدا بە کاری ئەم پەرییە، چونکە ویستی یەکێکی دەست کەوێت کە لەو خێراتر بۆی بهێنێت، وتراوە: (عیفریتەکە قسەکەی خۆی لەسەر هێنانی عەرشەکە بە پێی هێز و توانای خۆی بنیات نابوو، ئەوەش بریتی بوو لە خۆدەرخستن و فەخرو شانازی کردن بە هێز و تواناوە لەوەدا کە سولەیمان پێشنیاری کرد لەسەریان). [٢٧٥]

## ئەوەی زانستی لە کیتاب لابوو ووتی: من دەیهێنم، و سولەیمان (علیه السلام) قبوڵی کرد

﴿قَالَ الَّذِي عِندَهُ عِلْمٌ مِّنَ الْكِتَابِ أَنَا آتِيكَ بِهِ قَبْلَ أَن يَرْتَدَّ إِلَيْكَ طَرْفُكَ﴾(النمل:٤٠). ئەوەی ئەم قسەیەی کرد، یەکێك بوو لە پیاوچاکان کە لە نزیکانی سولەیمان بوو، و زانا و لەخوا ترس وپارێزکار بوو، وخواپەرست و تێکۆشەر بوو لەپەرستشدا،خوای گەورە رێزی لێ گرتبوون، وناوە جوانەکانی خۆی و (إسم الأعظم)ی فێر کرد بوو، کە ئەگەر داواو پاڕانەوەیان پێ بکرێت وەڵام دەدرێتەوە، و هێنانی عەرش لەسەر ئەم شێوەیە رێز گرتن و پاڵپشتی کردنە بۆ سولەیمان (علیه السلام) و رێز گرتنە لە پیاوچاکان و دەچێتە ریزی موعجیزەی پێغەمبەرانەوە (علیه السلام) زانا (القشيري) دەڵێت: رێز و پلە و پایەی پیاوچاکان پابەندە بە موعجیزەی پێغەمبەرانەوە (علیه السلام) ئەگەر پێغەمبەرێك لە پەیامی پێغەمبەرایەتییەکەیدا ڕاستگۆ و باوەڕپێکراو نەبوایە، ئەوا رێز و کەرامەت لەسەر دەستی یەکێك لەو کەسانەی کە باوەڕیان پێهێناوە دەرنەدەکەوت کەلەناو ئومەتەکەیدا بوون. [٢٧٦]

---

[٢٧٥] -لطائف الاشارات للقشيري ٥|٣٩ بە دەستکارییەوە.

[٢٧٦] - لطائف الاشارات للقشيري ٥|٣٩.

*بێشەوا (إبن تيمية) دەفەرموێت: ڕێز و کەرامەتی پیاوچاکان، بێگومان بەهۆی بەرەکەتی شوێنکەوتنی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەدەستهاتووە، کەئەوەش لەڕاستیدا دەچێتە ناو موعجیزە کانی پێغەمبەرەوە (ﷺ).

*هەروەها لە هێنانی عەرشەکەدا لەسەر دەستی ئەو کەسەی زانستی لە کیتاب پێ بەخشرابوو، ئەوە ئاماژەیە بۆ پلە و پایەی زانست و گەورەییە کەی.

*بێگومان ئەنجامدانی ئەم کارە لەسەر دەستی یەکێك لە شوێنکەوتوانی سولەیمان (عليه السلام) خوای گەرە خۆی ڕێکی خستوە و مۆڵەتی داوە کە بکرێت لەبەر سولەیمان (عليه السلام) و بە داوای ئەو بوو. و ڕێزگرتنێك بووە بۆ ئەو پیاوە و لەڕاستیشدا موعجیزە بوو بۆ سولەیمان پێغەمبەر (عليه السلام) لەمەوە کاتێك ئەم کارە لەعادەت دەرچووە ڕوویدا و سولەیمان (عليه السلام) بینی عەرشەکە لەلایدا دانراوە فەرمووی: ﴿قَالَ هَٰذَا مِن فَضْلِ رَبِّي لِيَبْلُوَنِي أَأَشْكُرُ أَمْ أَكْفُرُ ۖ وَمَن شَكَرَ فَإِنَّمَا يَشْكُرُ لِنَفْسِهِ ۖ وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ رَبِّي غَنِيٌّ كَرِيمٌ﴾(النمل:٤٠).

ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە سولەیمان (عليه السلام) زانی ئەمە موعجیزەیەکی گەورەیە و نیعمەتێکە و خوا پێی بەخشیوە.[٢٧٧] و شوکری خوای لەسەر کرد.

## هێنانی عەرشەکە بە خێرایی بۆ بەردەمی سولە یمان ( عليه السلام )

﴿قَالَ الَّذِي عِندَهُ عِلْمٌ مِّنَ الْكِتَابِ أَنَا آتِيكَ بِهِ قَبْلَ أَن يَرْتَدَّ إِلَيْكَ طَرْفُكَ﴾(النمل:٤٠). واتە: (ئەو پیاو چاك وشوێنکەوتوەی سولەیمان (عليه السلام) وتی: من بۆت دەهێنم لەچاو تروکانێکدا (دەستی کرد بە نزا و پاڕانەوە وداوای لەخواکرد) ئینجا کوت و پڕ سولەیمان(عليه السلام) بینی، تەختی پاشایەتی لەلایدا دانراوە).

زانا (إبن كثير) فەرموویەتی: واتە: چاوت بەرز کەرەوە، ئینجا بە ئەندازەی بینینی چاوت سەیر بکەو بڕوانە، بێگومان تۆ چاوت دانەگرتوە و، وعەرشەکەت لەلا ئامادە بووە.

*زانا (الزمخشري) دەڵێت: دەگونجێت ئەمە ئەزمونێك بێت و کورتکردنەوە لەماوەی هێنانەکەیدا، وەك ئەوەی تۆ بە هاوڕێیەکی خۆت دەڵێیت: ئەو کارەت لە ماوەیەکی زۆر

---

[٢٧٧] -المعجزة والاعجاز في سورة النمل (عبدالحميد طهماز ص|٧٢).

کەمدا بۆ ئەنجام دەدەم لەچاوترووکانێکدا یان ئاوڕ بدەرەوە سەیرم کەرەوە، و لە شتێك لەوانە بچێت، کە مەبەستت بەخێرایی ئەنجامدانێتی.[٢٧٨]

*بەڵام دەربارەی چۆنێتی هێنان و هاتنی عەرشەکە لەو ماوە کورتەدا و بەو شێوە سەر سوڕهێنەرە لەڕادەبەدەرە زانایان چەند بۆچونێکیان هەیە لەوانە:

*پێشەوا (الماوردي) لە تەفسیرەکەیدا دەڵێت: (عەرشەکە لەیەمەن بوو، سولەیمانیش لەشام بووە، وتراوە: خوای گەورە زەوی بۆ جوڵاند و خستییە گەڕ هەتا عەرشەکەی بۆ هێنایە بەردەمی).[٢٧٩]

*هەروەها پێشەوا(الطبرسي) دەڵێت: (زانایان لەمەدا چەند لایەنێکیان باسکردووە).

یەکەم / فریشتەکان بەفەرمان و ویستی خوا هەڵیان گرت و هێنایان.

دووەم / (با) هەڵی گرت و هێنای.

سێیەم/ خوای گەورە چەند جوڵەیەکی یەك لەدوای یەکی تیا دروست کرد.

چوارەم / شوێنەکەی لەزەویدا هەڵدڕی و هەڵکەند وەك نەفەق پیایدا هێنای بۆلای سولەیمان و لەوێ دەری هێنا.

پێنجەم / زەووی بۆ هاتەوە یەك.

شەشەم / خوای گەورە لەشوێنەکەی خۆی کردی بە نەبوو، پاشان لەمەجلیسەکەی سولەیمان (علیه السلام) هێنایەوە بوون..).[٢٨٠]

*مامۆستا (عبد الو هاب النجار) دەڵێت: (ئەو ڕێگایەی کە عەرشەکەی پێ هات لەسەر دەستی ئەو کەسەدا کە زانستی کیتابی لابو، ئەوە کارێك بووە کە زانست هێشتا کەشفی نەکردووە و نەیدۆزیوە تەوە.[٢٨١]

*مامۆستا (عبد الکریم الخطیب) دەربارەی گرنگی زانست و چۆنێتی هێنانی عەرشەکە دەڵێت: (لەم ڕوداوەدا گەورەیی و بەرزی زانست دەدرەو شێتەوە، و ئەوەی کە ئەهلی زانست پێی دەگات لە پلەبەرز و باڵاکان، کە هەموو هێزێك لەبەردەمیدا ملکەچ دەبێت و هەموو دەستەڵاتێك سەرنەوی دەبێت بۆی:ئەگەر هات و ئەم زانستە لەبەرهەمهاتووەکانی حەق و ڕستی بێت، و بە دڵ و دەرونێکی ساغ و تەندروست و پاکدا بڕوات. ..و

---

[٢٧٨] -الکشاف للزمخشري.٣|٣٦٨.

[٢٧٩] -النکت والعیون للماوردي ٣|٢٧٧.

[٢٨٠] -مجمع البیان للطبرسي ٧|٣٤٩ بە دەستکارییەوە.

[٢٨١] -قصص الانبیاء لعبدالوهاب النجار ص|٣٩٦ بە کورتی.

ئەوکەسانەی زۆرێك لەزانست وەردەگرن، عەرشەکەی بەلقیس لە مەملەکەتی سەبەئەوە بۆ شام لەچاوتروکانێکدا گوێزرابێتەوە، وئەو کەسانەشی کە هەڵوێست لەبەردەم ئەم هەواڵە قورئانییەدا دەکەن یان گومان دروستدەکەن یان بەپێی تێروانینی خۆیان بۆ ئایەتە عیلمییەکان تۆمەت دروست دەکەن و ئەوەی لە موعجیزەکان بەدیهاتووە لە جیهانی ماددەدا، کە بریتییە لە گوێزانەوەی وێنەی گیراو لەسەر رووی مانگەوە بۆسەر زەوی لەماوەیەکی زۆر کوت و پڕدا لەسەر (شاشەی تەلەفیزۆن)، ئەگەر ئەوە دەسەلاتی ماددی بێت بەسەر ماددەدا، ئایا دەبێت ئینکاری ئەوە بکرێت کە دەستەلاتی زانستی ڕۆحی بەسەر دەستەڵاتی ماددیدا چەندجارەبێت؟ بێگومان زانستی بواری ماددی تەنها ئامارەیەکی کزو کەمە، لەچاو ئامارەکانی زانستی ڕۆحیدا، ئەوە تەنها تیشکێکی کەم و کزە لە ڕوناکییە بەر فراوان و بێ ئەندازە درەوشاوەکەی زانستی ڕۆحی. بەڵام ئەمە چۆن تەواو دەبێت؟ دەگونجێت تێروانین لەڕوناکی زانستی ماددیدا بکرێت.[٢٨٢]

*ئەوەی ئێمە لەم مەسئەلەیەدا دەیبینین: گوێزانەوەی عەرشەکە بەم خێراییە، کارێکی لەسنور دەرچوو لە عادەت بەدەر بووە، ناچێتە ژێر یاسا و سوننەتە کەونییەکانەوە، و لەژێر یاسا سروشتییەکانیشدا جێگەی نابێتەوە، لەبەر ئەوە ناگونجێت لێکۆڵینەوەی تیابکرێت و بەشێوەی زانستی شی بکرێتەوە و تاقیکاری لەسەر بکرێت. کاری زانست لێرەدا نزیکخستنەوەی ئەم کارەیە لە زیهن و بیرکردنەوە وە، و زانستی نوێ گەیشتووە بە زۆرێك لەوشتانەی کە دۆزراونەوە و داهێنراون، وەك پێشکەوتنە بەدەستهاتووەکان لە زانستی پەیوەندی کردندا وەك (تەلدارو بێ تەل وموبایل و ئەنتەرنێت) و ئامێرە کۆمپیوتەری و فڕۆکەی تیژڕەو کە خێراییان لەدەنگ زیاترە و موشەکی کیشوەربڕو کەشتی ئاسمانی. ئەگەر زانستی نوێ بەفەزڵ و ویست وتوانای خوای گەورە گەیشتبێت بەمە، ئەوە بێگومان هێنانی عەرشەکە بەم شێوە سەرسوڕهێنەرە لەعادەت دەرچووە، دیاردەیەکە لە دیاردەکانی دەسەلات و قودرەتی ڕەهای خوای گەورە و نیعمەتێکیشە خوای گەورە خۆی ڕشتویەتی بەسەر سولەیمان پێغەمبەردا (علیه السلام) و لەسەر دەستی یەکێك لەپیاو چاکان، ئەنجامیدا و ڕێز و گەورەیی پیاوچاکان موعجیزەیە بۆ پێغەمبەر، وەك پێشتر باسمانکرد.

ئێمە باوەڕمان بەڕیزی پیاو چاکان هەیە وەك ئەوەی کە هەیە، داوای شیکردنەوە و لێکۆ ڵینەوە ی ناکەین، بەڵکو زانستی ئەو کارە دەدەینە دەست خوا و بەوی دەسپێرین.

---

[٢٨٢] -التفسير القرآني للقرآن|للاستاذ عبد الكريم الخطيب ١٩|٤٥٥.

## سولەیمان (علیه السلام) و سوپاسگوزاری نیعمەتەکان

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿فَلَمَّا رَآهُ مُسْتَقِرًّا عِندَهُ قَالَ هَٰذَا مِن فَضْلِ رَبِّي لِيَبْلُوَنِي أَأَشْكُرُ أَمْ أَكْفُرُ وَمَن شَكَرَ فَإِنَّمَا يَشْكُرُ لِنَفْسِهِ وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ رَبِّي غَنِيٌّ كَرِيمٌ﴾(النمل: ٤٠).

*سولەیمان (علیه السلام) دان دەنێت بە فەزڵ و گەورەیی خوادا بەسەر خویەوە، وسوپاسی خوا دەکات و زیاتر گوێڕایەڵی فەرمانەکانی خوا دەکات و زیاتر لە خوا نزیك دەبێتەوە و زیاتر خوای گەورە دەناسێت: ﴿قَالَ هَٰذَا مِن فَضْلِ رَبِّي﴾. ئەوە ناز و نیعمەت ڕشتن بوو لەلایەن خوای گەورەوە، لە گەورەیی و ڕێزی خواوە بوو، کە تەنها خوای گەورە شیاوی ئەو ڕێز و فەزڵ و گەورەیی یەیە ﴿لِيَبْلُوَنِي أَأَشْكُرُ أَمْ أَكْفُرُ﴾. واتە: (خوای گەورە بۆ ئەوە تاقیم دەکاتەوە تا بزانێت کە ئایا سوپاسگوزار دەبم یان ناشوکرو بەد نمەك؟) چونکە ناز و نیعمەت تاقی کردنەوەیە لەلایەن خواوە. ئەگەر باوەڕدار بێت، ناز و نیعمەتی بەسەردا دەڕژێت، بەڵام ناشوکر و بەدنمەك پشت لەخاوەنی ناز و نیعمەتەکانی دەکات و بەربەست لەڕێگای خاوەن نیعمەتدا دروست دەکات. وهەمیشە بە ناز و نیعمەتەکانەوە سەرقاڵ دەبێت، و بەخراپی بەکاریان دێنێت و بێباوەڕی و ناشوکری و کەللەڕەقی زیاد دەکات: ﴿وَمَن شَكَرَ فَإِنَّمَا يَشْكُرُ لِنَفْسِهِ﴾. واتە: بە جۆرێکە کە سوپاس گوزاری لەدنیادا سودی پێدەگەیەنێت، بەزیاد بوونی نیعمەت و بەرەکەت و، لە قیامەتیشدا بە چونی بۆ شوێنی چاك و پاداشتی زۆر و نەبڕاوە.

﴿وَمَن كَفَرَ رَبِّي غَنِيٌّ كَرِيمٌ﴾ خوای گەورە دەوڵەمەند و بێ نیاز و خاوەنی بەخششە، کوفری بێ باوەڕان زیانی پێ ناگەیەنێت و هیچ شتێك لە موڵکی ئەو کەم ناکاتەوە.

*زانا (الطبرسي) دەربارەی کۆتایی ئایەتەکە دەڵێت: خوای گەرە بێ پێویستە لە سوپاسگوزاری بەندەکانی و، بەڵکو بەندەکان پێویستیان بە خوای گەورە هەیە لەو ئەجر و پاداشتانەدا خوای گەورە دەیانداتەوە.[٢٨٣]

[٢٨٣] - مجمع البيان للطبرسي ٧|٣٥٠ بە دەستکارییەوە.

*لە فەرموودەیەکی قودسیدا هاتووە: لە (أبو زر)ە وە (خوا لێی ڕازی بێت)، لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) لە خوای پەروەردگارەوە کە فەرموویەتی: ئەی بەندەکانم! من ستەمم لەسەر خۆم حەرام کردوە و لەنێوان ئێوەشدا حەرامم کردوە، ستەم لە یەکتر مەکەن، ئەی بەندەکانم! هەموتان گومڕان، مەگەر ئەوانەتان نەبێت کە من ڕێنموییم کردون، داوای ڕێنموییم لیٚ بکەن، ڕێنموییتان دەکەم، ئەی بەندەکانم! هەموتان برسین مەگەر ئەوەتان نەبێت کەمن خواردنم پێداون، داوای خواردنم لیٚ بکەن، خۆراکتان دەدەمێ، ئەی بەندەکانم! هەموتان ڕوتن، مەگەر ئەوانەتان نەبێت کە من پۆشتەم کردون، داوای پۆشاکم لیٚ بکەن، پۆشتەتان دەکەم، ئەی بەندەکانم! ئێوە شەو و ڕۆژ هەڵەدەکەن ومنیش لە هەموو تاوان و هەڵەکانتان خۆش دەبم، داوای لێخۆشبونم لیٚ بکەن ئەی بەندەکانم ، ئێوە بەڕستی ناتوانن بگەن بەو ئاستەی کە زەرەر لەمن بدەن، هەروەها ناتوانن بگەن بەو ئاستەی کە سودم پێ ببەخشن، ئەی بەندەکانم ! ئەگەر سەرەتا تا کۆتاییتان بە مرۆڤ و جنۆکەتانەوە دڵیان وەك دڵی لەخواترسترین کەستان بێت، ئەوە هیچ لە موڵکی من زیاد ناکات، ئەی بەندەکانم! ئەگەر کۆتاییتان بە مرۆڤ و جنۆکەتانەوە دڵتان وەك دڵی خراپترین کەستان بێت، ئەوە هیچ لە موڵکی من کەم ناکات، ئەی بەندەکانم !سەرەتا و کۆتاییتان بە مرۆڤ و جنۆکەتانەوە تێکڕا لە گۆڕەپانێکدا بوەستن و داوام لیٚ بکەن، هەموو مرۆڤێك ئەوەی کەداوای دەکات پێی ببەخشم، ئەوە هیچ لەوەی من کەم ناکات، مەگەر ئەوەندەی دەرزییەك لە ئاوی دەریا کەم دەکاتەوە، ئەی بەندەکانم! بە ڕاستی ئەمە کردەوەکانی خۆتانە و من بۆتانی دەژمێرم وتۆماری دەکەم وپاشان پاداشتتان دەدەمەوە، هەر کەسێك چاکەی دەست کەوت، سوپاسی خوای گەورە بکات، و هەر کەسێکیش شتێکی تری دەستکەوت، ئەوە با تەنها سەرزەنشتی خۆی بکات. (سەعید) دەڵێت: (أبو إدریس الخولانی) ئەگەر ئەم فەرموودەی بگێڕایەتەوە بە چۆکەوە دادەنیشت.[٢٨٤]

خوای گەورە لە کتێبە پیرۆزەکەیدا دەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ أَنتُمُ الْفُقَرَاءُ إِلَى اللَّهِ وَاللَّهُ هُوَ الْغَنِيُّ الْحَمِيدُ (١٥) إِن يَشَأْ يُذْهِبْكُمْ وَيَأْتِ بِخَلْقٍ جَدِيدٍ (١٦) وَمَا ذَٰلِكَ عَلَى اللَّهِ بِعَزِيزٍ﴾(فاطر:١٥-١٧).

واتە: (ئەی خەڵکینە، ئێوە هەژار و نەدارن و هەمیشە موحتاجی خوان (لە هەموو کات و شوێنێکدا و بۆ هەمووشتێك) هەر تەنها خوایە کە بێنیازە و شایەنی سوپاسە. ئەگەر

---

[٢٨٤] –رواه مسلم في كتاب البر والصلة والآداب|باب:تحريم الظلم.

بیەوێت ئێوە لەناو دەبات و کەسانی تر سەر لە نوێ دێنێتە کایەوە. ئەمەش بۆ خوا زۆر کارێکی ئاسانە (ئەنجامدانی هیچی پێ ناچێت).

## هاتنی بەلقیس بۆلای سولەیمان (علیه السلام) و گۆڕانکاری لە عەرشەکەیدا

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿قَالَ نَكِّرُوا لَهَا عَرْشَهَا نَنظُرْ أَتَهْتَدِي أَمْ تَكُونُ مِنَ الَّذِينَ لَا يَهْتَدُونَ (٤١) فَلَمَّا جَاءَتْ قِيلَ أَهَكَذَا عَرْشُكِ قَالَتْ كَأَنَّهُ هُوَ وَأُوتِينَا الْعِلْمَ مِن قَبْلِهَا وَكُنَّا مُسْلِمِينَ (٤٢) وَصَدَّهَا مَا كَانَت تَّعْبُدُ مِن دُونِ اللَّهِ إِنَّهَا كَانَتْ مِن قَوْمٍ كَافِرِينَ﴾(النمل:٤١-٤٣). گۆڕانکاری لە عەرشەکەیدا: بریتی بوو لە گۆڕنکاری لە هەندێك بەش و لایەن وشێوەی عەرشەکەدا، بە جۆرێك کە سەر لە بەلقیس تێکبدەن ونەزانێت: ئایا ئەمە عەرشەکەی ئەوە یان نا؟

*زانا (الطبرسي) دەڵێت: (گۆڕنکاری بریتییە لە گۆڕینی شتێك لە حاڵێکەوە بۆ حاڵێکی تر کە خاوەنەکەی کاتێك دەیبینێت نەیناسێتەوە).[٢٨٥]

*گۆڕانکاری بریتی بوو لە: وتراوە:. ئەوە بووە کە هەموو نقێم و بابەتی ڕازاندنەوەکانی لێ کرایەوە. وتراوە: گۆڕینی ڕەنگەکانی بووە، وەك ئەوەی سور کرابێت بە سەوز و بە پێچەوانەیشەوە، وتراوە: یان ئەوەتا شتی بۆ زیاد کراوە یان لێی کەم کراوەتەوە. یان هەردووکیان بە یەکەوە بووە، یان بەوەی کە سەرەوەی کراوە بە خوارەوە و پشتی کراوە بە پێشەوەی.[٢٨٦]

*دەربارەی هۆکاری گۆڕینەکەیش، وتراوە:. تا کارەکە لە بەلقیس تێکبدات و بزانێت ئاستی زیرەکی چەندە، ﴿نَنظُرْ أَتَهْتَدِي أَوْ تَكُونُ مِنَ الَّذِينَ لَا يَهْتَدُونَ﴾ زانا (الزمخشري) دەڵێت: ﴿نَنظُرْ أَتَهْتَدِي﴾. واتە: (سەرنج دەدەین بزانین ئایا دوای گۆڕنکاری عەرشەکەی دەناسێتەوە. یان بۆ وەڵامێکی ڕاست و دروست هیدایەت دەدرێت ئەگەر پرسیاری لێ بکرێت لە دین وئیمان بە پێغەمبەرایەتی سولەیمان (علیه السلام) کاتێك کە ئەو

---

٢٨٥- مجمع البيان للطبرسي ٧|٢٤٨.

٢٨٦-النكت والعيون للماوي ٣|٢٢٧ وتفسير القرآن العظيم لأبن كثير ٣|٣٦٤.

موعجیزە گەورە و ڕون و ئاشکرایە ی بینی لە هێنانی عەرشەکەی، کە ئەو جێی هێڵا بوو و دەرگاکانی داخستبوو، و چاودێر و پاسەوانی بە دیارەوە دانابوو).[٢٨٧]

دەڵێت: کاتێك بەلقیس عەرشەکەی بینی گۆڕابو، و عەقڵی بەکارهێنا لەم کارەدا و دەری بڕی کە لەو دەچێت، کاتێك بینی کە نزیکە لەوەی کە ئەو لە کۆشك و تەلارەکەی خۆی جێی هێشتبوو و دەرگای لەسەر داخستبوو و دابویە دەست چاودێرەکانی، کە سەربازی ئازا و زیرەك بوون، لەگەڵ ئەوەیشی کە گۆڕانکاری تیا کرابوو، کاتێك بەووردی تێی ڕوانی، گەیشتە ئەوەی کە ئەم عەرشە گۆڕانکاری تیاکراوە و عەرشەکەی خۆیەتی، ئەمەیش بانگەوازێك بوو بۆ بەلقیس کە تێفکرێت و بەووردی تێڕوانین بکات لە کار و باری دینەکەیدا، ئەگەر بیر لە کارو باری خۆی بکاتەوە، ئەوا دەگاتە ئەوەی کە ئەو لەسەر بەتاڵ و ناحەقییە لەوەدا کە خۆر دەپەرستێت و دەگاتە ئەوەی کە سولەیمان(علیه السلام) لەسەر حەق و ڕاستییە لەوەدا کە خوای گەورە و باڵادەست دەپەرستێت. ﴿فَلَمَّا جَاءَتْ قِيلَ أَهَكَذَا عَرْشُكِ قَالَتْ كَأَنَّهُ هُوَ وَأُوتِينَا الْعِلْمَ مِن قَبْلِهَا وَكُنَّا مُسْلِمِينَ﴾.(النمل:٤٢).

*کاتێك بەلقیس هات و کۆمەڵێك لە دەستەو قەومەکەی لەگەڵدابوو، گەیشتە لای سولەیمان (علیه السلام) ئینجا عەرشەکەی خۆی نیشاندا و گۆڕیبوی: بەلقیس کەوتە ناو سەرسامی و تیاڕامانەوە و دوودڵ بوو، چونکە هەندێك نیشانەی تیایە کە ئەوە دەسەلمێنێت عەرشەکەی ئەوە، و ئەگەر ئەویشە: ئەوا نهێنی ئەو گۆڕانکاری یە چییە کە لە هەندێك لە بەشەکانیدا ڕویداوە؟ وکێ هێناویێتی کە لە شوێنێکی پارێزراو و بەهێز و دامەزراودا بووە؟ و چۆن بەو شێوە خێرا لە ڕادەبەدەرە گەیشتە ئێرە؟ ﴿فلما جاءت قِيلَ أَهَكَذَا عَرْشُكِ﴾ واتە: (جا کاتێك بەلقیس گەیشت،پێی وترا: تەختی پاشایەتی تۆ ئاوایە؟!. پاش تێڕامان و وورد بونەوە و بیرکردنەوە، وەلامێکی دایەوە کە بەڵگە بوو لەسەر زیرەکی و وورییایی: ﴿قَالَتْ كَأَنَّهُ هُوَ﴾ واتە: (بلقیس وتی: هەردەڵێی ئەوە و لەو دەچێت)نەی وت خۆیەتی، بەلام گومانی زۆری خستە سەر کە لەو دەچێت، چونکە دەگونجێت عەرشەکەی ئەو بێت لەگەڵ بونی شك وگومان لەوەدا کە عەرشەکەی ئەو بێت و دەگونجێت عەرشێکی تریش بێت).[٢٨٨]

---

٢٨٧-الكشاف للزمخشري ٣|٣٦٩ و روح المعاني للآلوسي ١٩|٢٠٦.

٢٨٨ -المعجزة والاعجاز في سورة النمل للأستاذ عبد الحميد طهماز ص|٧٣.

پێشەوا (الطبرسي) دەلێت: بەلقیس بە تەواوی دانی پیانەنا کە عەرشەکەی خۆی بێت وئینکاریشی نەکرد، ئەوەش بەلگە بوو لەسەر تەواوی عەقلی، کە نەیوت: نەخێر، لە کاتێکدا کە لە کورسی پاشایەتییەکەی خۆی دەچوو، چونکە چەند شتێکی تیا بینی کە دەیناسییەوە. ونەیشی وت: بەلێ، لە کاتێکدا کە بینی گۆڕنکاری تیاکرا بوو، چونکە ئەو لەماڵ وشوێنەکەی خۆی جێی هێشتبوو، وهێنان و هەلگرتنیشی لەو ماوە دورەوە بۆ ئێرە لە توانای بەشەردا نییە. بەلکو وتی: ﴿كَأَنَّهُ هُوَ﴾ شوبهاندی بەوەی خۆی، پێی وترا: بێگومان ئەمە عەرشەکەی خۆتە، داخستنی دەرگاکان سودی بەتۆ نەگەیاندووە.[289]

﴿وَأُوتِينَا الْعِلْمَ مِن قَبْلِهَا وَكُنَّا مُسْلِمِينَ﴾(النمل:٤٢).

*وتراوە: ئەم ڕستە قورئانییە لە تەواوکەری قسەکانی بەلقیسە، هەروەها وتراویشە لە قسەکانی سولەیمانە (علیەالسلام). ئەگەر وامان دانا کە قسەی بەلقیسە، واتە:بێگومان بەلقیس زانی کە ئەوە عەرشەکەی خۆیەتی، وەك زانیبووی کە سلیمان (علیەالسلام) پێغەمبەرە، پێش زانینی بەهێنانی عەرشەکەی بۆ ئەوێ و بەو شێوە لە ڕادەبەدەر و لەیاسا دەرچووە، و زانی کە سولەیمان (علیەالسلام) پێغەمبەر لە ئەنجامی ئەو نامەیەوە کە بۆی ناردبوو، و پەیوسولەیمانەکە هەلی گرتبوو، کە لە ناوەڕۆکەکەیدا هاتبوو، بانگەوازێکی ڕاستی تێدا بوو تەنها بۆ خوا پەرستی و هەروەها زانی کە سولەیمان پێغەمبەرە، بە هۆی ئەوەی کە هەدیەو دیارییەکەی بۆ ڕەتکردەوە و وەری نەگرت، هەروەك زانیبووی کە سولەیمان (علیە السلام) پێغەمبەرە، بەهۆی ئەوەی کەوەفدەکە بۆیان گێڕایەوە و بینیبوویان وبیستبوویان، عیلم وزانست بە تەنها نابێتە هۆکار و بەس نییە بۆ ئیمان هێنان و کارەکە هەر بەوە تەواو ببێت، بەلکو دەبێت هەر عیلم و زانستێك ڕەزامەندی و قبوڵ کردن و مل کەچی و یەکلایی بوونەوەو خۆ تەسلیم کردنی لەگەلدا بێت، ئەم کارانەیش لە بەلقیسدا کۆ نەبوو بوونەوە هێشتا، نهێنی ئەو کارانەیش لەم ئایەتەدا دەردەکەوێت ﴿وَصَدَّهَا مَا كَانَت تَّعْبُدُ مِن دُونِ اللَّهِ إِنَّهَا كَانَتْ مِن قَوْمٍ كَافِرِينَ﴾(النمل:٤٣). واتە: (ئەوشتانەی کە بەلقیس دەیپەرست لە جیاتی خوا، بەڕاستی ئەو کاتی خۆی لە ڕیزی قەومێکی بێباوەڕ و خوانەناسدا بوو).

---

[289] - مجمع البیان للطبرسي ٧| ٣٥٠ بە کورتی.

*ئەگەر وامان دانا کەئایەتی: ﴿وَأُوتِينَا الْعِلْمَ مِن قَبْلِهَا وَكُنَّا مُسْلِمِينَ﴾ لەقسەو دەربڕینی سولەیمان (علیه السلام) بێت. واتە:ئێمە بە قودرەت و ویست و تاك و تەنهایی خوا زانستمان پێدرا بوو پێش ئەوەی کە پاشا بەلقیس ئەم کارانە بزانێت، لەمەدا دەردەکەوێت کە سولەیمان (علیه السلام) دانی ناوە بە ناز و نیعمەتەکانی پەروەردگاردا بەسەر خۆی و شوێنکەوتوانیدا کە هیدایەتی داون بۆ ئیمان.

ئەوەی ئێمە لێرەدا لەپێشی دادەنێین لە ئایەتی: ﴿ وَأُوتِينَا الْعِلْمَ مِن قَبْلِهَا وَكُنَّا مُسْلِمِينَ﴾دا کە لە تەواوکەری قسەکانی بەلقیس بێت کاتێك عەرشەکەی بینی وتی: ﴿كَأَنَّهُ هُوَ﴾ زانی کە هێنانی عەرشەکە لەسەر ئەم شێوازە لەیاسا دەرچووە کاری سولەیمان پێغەمبەرە (علیه السلام) و شایەتی دەدات و دڵنیای دەکاتەوە زانی پێغەمبەرە، پێش ئەوەی بێت بۆلای و خۆی یەکلای بکاتەوە وموسوڵمان بوونی دەربڕێت، وپێش بینینی ئەم نیشانە و بەڵگە سەر سوڕهێنەرەیش.

## چوونی بەلقیس بۆ ناو کۆشکەکە و موسوڵمان بوونی

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿قِيلَ لَهَا ادْخُلِي الصَّرْحَ فَلَمَّا رَأَتْهُ حَسِبَتْهُ لُجَّةً وَكَشَفَتْ عَن سَاقَيْهَا قَالَ إِنَّهُ صَرْحٌ مُّمَرَّدٌ مِّن قَوَارِيرَ قَالَتْ رَبِّ إِنِّي ظَلَمْتُ نَفْسِي وَأَسْلَمْتُ مَعَ سُلَيْمَانَ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾(النمل:٤٤).

(الصَرْح) بریتی بوو لە کۆشکێك لە شووشە، سولەیمان (علیه السلام) فەرمانیدابوو کە درووست بکرێت، و کۆشك و تەلارێکی بەهێز و پتەوبوو، وناو بەژێریدا دەڕۆیشت. تا گەورەیی دەسەڵاتەکەی خۆی پیشان بدات، کاتێك بەلقیس ئەو شتانەی بینی کە خوای گەورە بە سولەیمانی بەخشیبوو، و جوانی و ناوازەیی ئەوەی بۆ دەرکەوت و جوان ڕوانی بۆ کارەکانی، خۆی دایە دەست فەرمانی خوا و یەکلای بوویەوە، و زانی کەسولەیمان (علیه السلام) پێغەمبەرێکی بەڕێز و پاشایەکی گەورەیە، ئینجا بەلقیس خۆی تەسلیمی خوا کرد و موسڵمان بوو، وتی: ﴿رَبِّ إِنِّي ظَلَمْتُ نَفْسِي﴾.

واتە: ئەی پەروەردگارم بەڕاستی من ستەمم لە نەفسی خۆم کردبوو، واتە لە پێشتر کە لە سەر بێباوەڕی بوو و هاوەڵدانەر بوو، و خۆی و قەومەکەی خۆریان دەپەرست لەباتی

ئەوەی کە خوای گەورە بپەرستن. ﴿وَأَسْلَمْتُ مَعَ سُلَيْمَانَ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾(النمل:٤٤). واتە: بوویە شوێنکەوتووی دینی سولەیمان (علیه السلام) لەوەدا کە بوویە خواپەرست و دەستی لەهاوەڵ پەرستی هەڵگرت. ڕووی کردە خوایەك کە تەنهایە و هاوەڵ و شەریکی نییە و هەموو شتێکی دروستکردووە و بەتوانایە بەسەر هەمووشتێکدا).[٢٩٠]

*لە قسەکەی بەلقیسدا وەك قورئان هەواڵی دا: ﴿رَبِّ إِنِّي ظَلَمْتُ نَفْسِي وَأَسْلَمْتُ مَعَ سُلَيْمَانَ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾(النمل:٤٤). دانی نا بە باوەڕ هێنانی خۆیدا و کە پەیڕەوی سولەیمان(علیه السلام) بکات.

*ئیسلام دینی خوایە بۆ موسوڵمانان و باوەڕداران کەخوای گەورە خۆی پێی ڕازی بووە، و بانگەوازی هەموو پێغەمبەرانە، هەر لە ئادەمەوە تا کۆتا پێغەمبەر (علیه السلام).

*لەناو ئیسلامدا جیاوازییەکان دەتوێنەوە، ئیسلام دینی پێکەوە بوون و یەکسانییە، و دینی پێکەوە ژیان و هاوسۆزییە، و دینی خۆشەویستی و بەزەیی یە، دینی دادپەروەری و لێبوردەییە، موسوڵمانان هەموویان هەرچەندە ڕەگەزیان و ڕەنگ و زمانیان جیاواز بێت و هەرچەندە نیشتیمانیان لەیەکتر دور بێت، هەمویان یەك ئومەتن و خاوەنی یەك دڵن.

خوای گەورە ڕاستی فەرمووە کاتێك فەرموویەتی: ﴿ يَا أَيُّهَا الرُّسُلُ كُلُوا مِنَ الطَّيِّبَاتِ وَاعْمَلُوا صَالِحًا إِنِّي بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ (٥١) وَإِنَّ هَذِهِ أُمَّتُكُمْ أُمَّةً وَاحِدَةً وَأَنَا رَبُّكُمْ فَاتَّقُونِ﴾(المؤمنون:٥١_٥٢).

واتە: (ئینجا وتمان: ئەی گرۆی پێغەمبەران (علیهم السلام) بخۆن لە ڕزق و ڕۆزییە حەلاڵ و پاك چاکەکان، و کار و کردەوەی چاکیش ئەنجام بدەن، بەڕاستی من زانام بە هەموو ئەو کار و کردەوانەی کە دەیکەن. هەر ئەمەشە دین وئاین و بەرنامەی تاك وتەنهای ئێوە (بەرنامەی یەکخواناسی) ومن پەروەردگارتانم، پارێزکار بن، وخۆتان لە نافەرمانی من بپارێزن).

[٢٩٠] –تفسیر ابن کثیر ٣/٣٦٦ بە کورتی و بە دەستکارییەوە.

## ئایا سولەیمان (علیه السلام) بەلقیسی کردە هاوسەری خۆی؟

زانایانی تەفسیر لەم مەسەلەیەدا ڕا و بۆچونی جیاوازیان هەیە. هەندێکیان دەڵێن کردی بە هاوسەری خۆی وهەندێکی تریان دەڵێن نەیکردە هاوسەری خۆی، بەڵکو کردی بە هاوسەری پاشای (الهمدان). و هەندێك لەزانایان هەڵوێستەیان لەسەر ئەم مەسەلەیە کردووە.

*لە هەموو بۆچونەکان باشتر و لە پێشتر ئەوەیە کە هەڵوێستە لەسەر ئەم مەسەلەیە بکەین، چونکە دەقێکی ڕاست و دروستی لەسەر نەهاتووە، و کارەکە بدەینەوە دەست خوای گەورە. و هەر خۆی زانستی بەو کارە هەیە.

## باسی دووەم:
## کۆمەڵێك وانە و پەندی گرنگ لەچیرۆکەکەدا:

### ١-باسێکی گرنگ و بەسوود دەربارەی (الشوری) ڕاوێژکردن

بەلقیس ژمارەیەکی زۆری لە قەومەکەی کۆ کردەوە تا ڕاوێژیان پێ بکات دەربارەی نامەکەی کە لە سولەیمانەوە (علیه السلام) پێی گەیشتبوو.

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿قَالَتْ يَا أَيُّهَا الْمَلَأُ أَفْتُونِي فِي أَمْرِي مَا كُنتُ قَاطِعَةً أَمْرًا حَتَّى تَشْهَدُونِ﴾(النمل:٣٢). لەم هەڵوێستەدا ئاماژە کراوە بۆ گرنگی و سودی (الشوری) ڕاوێژ کردن هەر بەم بۆنەیەوە لەپلەو پایەی (شوری) ڕاوێژ کردن لەئیسلامدا دەدوێین.

*لە ئیسلامدا ڕاوێژ کردن پلەو پایەو شوێنی خۆی هەیە. یەکێکە لە بنەما گرنگەکانی ئیسلام، هەروەها یەکێکە لە مەبەست و ئامانجەکانی، هەروەها چەند بوارێکی هەیە لەو بوارانەدا کە دەقی نە لە کیتاب، نە لەسوننەدا لەسەر نەهاتوە، بەڵام ئەوەی کە ئایەت و دەقی دەربارە هاتووە، بواری ڕاوێژ و ئیجتیهادی تیانییە، چوونکە لەگەڵ بوونی (دەق) ئیجتیهاد ناکرێت.

خوای گەورە لە کتێبە پیرۆزەکەیدا فەرمووی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تُقَدِّمُوا بَيْنَ يَدَيِ اللَّهِ وَرَسُولِهِ وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾(الحجرات:١). ناگونجێت قسە و ڕا و بۆچوون و فەرمانی خۆمان بەسەر فەرمان و وتەی خوای گەورە و پێغەمبەردا (ﷺ) پێش بخەین.

*باوەڕداری ڕاستگۆ: ئەو کەسەیە، گوێڕایەڵی فەرمانەکانی خوا و پێغەمبەر (ﷺ) دەکات و خۆیشی لەو کارانە دەپارێزێت کە خوا و پێغەمبەر (ﷺ) نەهییان لێ کردووە، ئەم کارەیش لە ئیمان و تەسلیم بوون و ڕەزامەندییەوە دەکات.

*کۆمەڵگای موسڵمان: کۆمەڵگای ئارامی و خۆشەویستی و بەزەیی و چاکە و خەیر و تەقوا و هاوکاری و دەستەبەری و پێکەوەبوون و ڕاوێژ کردن و دڵسۆزییە بۆیەکتری.

*کاربەدەستی باوەڕدار، ڕاوێژ بە کەسانی خاوەن زانست و شارەزایی دەکات، لە فەرمودەیەکدا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (الدِّين النَّصِيحَةُ).[٢٩١] واتە: دین دڵسوزی و ئامۆژگارییە، دەگونجێت و پێویستە کە کاربەدەستی موسوڵمان کەسێك لە ئوممەت و گەلەکەی هەڵبژێرێت کە زاناترین و ڕەوشتبەرزترین ودڵسۆزترین کەس بێت، بە ڕاوێژ پێکردنیان باشترین ئامانج بەدەست بێت و کارەکە دڵسۆزانە و چاك دەربچێت و خەیر و چاکەی بۆ بەندەکان تیا بێت.

ڕاوێژکردن گرنگی و پێویستییەکی گەورەیە، کە دەبێت هەر ببێت، لە قورئان و سوننەتی پێغەمبەردا(ﷺ)ئەوە هاتووە کە بۆمان ڕوون دەکاتەوە کە ڕاوێژکردن چەند گرنگ و پێویستە لە چوارچێوەی کۆمەڵگای موسوڵماندا.

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَبِمَا رَحْمَةٍ مِنَ اللَّهِ لِنْتَ لَهُمْ وَلَوْ كُنْتَ فَظًّا غَلِيظَ الْقَلْبِ لَانْفَضُّوا مِنْ حَوْلِكَ فَاعْفُ عَنْهُمْ وَاسْتَغْفِرْ لَهُمْ وَشَاوِرْهُمْ فِي الْأَمْرِ فَإِذَا عَزَمْتَ فَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُتَوَكِّلِينَ﴾(آل عمران:١٥٩). واتە: (کەوا بوو ئەی محمد (ﷺ) بە هۆی ڕەحمەتی خواوەیە تۆ نەرم و هێمن بوویت لەگەڵیاندا، خۆ ئەگەر توڕە و قسە ڕەق و بێبەزەیی بوویتایە، ئەوە هەموو لە دەورت بڵاوەیان دەکرد کەواتە چاوپۆشییان لێ بکە و لێیان ببورە و داوای لێخۆشبونیان بۆ بکە، لە کار و پێشهاتدا پرس و ڕایان پێ بکە (دوای مەشۆرەت وپرس وڕا) ئەگەر بڕیارت دا(کارێك ئەنجام بدەیت، ئەنجامی بدە و) پشت بە خوا ببەستە، چونکە بەڕاستی خوا ئەوانەی خۆش دەوێت، کە پشتی پێ دەبەستن).

[٢٩١]- رواه مسلم في كتاب الايمان.

لە ژیاننامەی پێغەمبەردا (ﷺ) هەڵوێستی زۆر دەربارەی ڕاوێژکردن هەیە. لە جەنگی بەدردا، پێغەمبەر (ﷺ) داوای ڕاوێژکردنی کرد لە هاوەڵەکانی، کاتێك کە فەرمووی: ئەی خەڵکینە ئادەی ڕاوێژم بۆبکەن، بەو کارە مەبەستی لە (انصار) پشتیوانەکان بوو، کە لەسەر حەق و ڕاستی دامەزراو و جێگیر بوون و ڕاستگۆ و بەوەفا بوون لەو پەیمانانەدا کە دابویان، و پشتیوانیان لە بانگەوازی خوا کردبوو.

(الحباب) ی کوڕی (المنذر) فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئایا بە فەرمانی خوا لەم شوێنەدا دابەزیویت؟ ئایا کارەکە بریتییە لە جەنگ و ڕا و بۆچون و فێڵ کردن لە دوژمنان؟ ئینجا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: بەڵکو کارەکە بریتییە لە جەنگ و ڕا و بۆچون وەرگرتن و فێڵکردن لە دوژمن. ئینجا (حباب) ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بێگومان ئەمە شوێنێکی چاك نییە، خەڵکەکە هەڵسێنە و بیانبە بۆ نزیکترین سەرچاوەی ئاوەکە تا لەوێ لابدەین و پاشان لەوێ حەوزی ئاو دروست بکەین و پڕی بکەین لە ئاو، پاشان لەگەڵ قەومەکەدا بجەنگین، ئێمە ئاو دەخۆینەوە و ئەوان ئاو ناخۆنەوە، ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: بێگومان تۆ ئاماژەت بۆ بۆچونێکی باش کرد.[٢٩٢]

بێگومان پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕاوێژی کرد بە هەندێك لە هاوەڵە بەڕێزەکانی دەربارەی دیلەکانی جەنگی بەدر.

عمر(خوای لێ ڕازی بێت) ئاماژەی کرد بۆ کوشتنیان، و ابوبکر (خوای لێ ڕازی بێت) ئاماژەی بۆ ئەوە کرد کە (فدیة) یان لێ وەربگیرێت، ئەمانە پێش دابەزینی ئایەتی: ﴿مَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَكُونَ لَهُ أَسْرَى حَتَّى يُثْخِنَ فِي الْأَرْضِ﴾(الانفال:٦٧) بوو.

*هەروەها لە جەنگی (خندق)دا، پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕا و بۆچوونی (سلمان)ی وەرگرت لە هەڵکەندنی خەندەقەکەدا.

*لە پەیمانی (حدیبیة)دا، پێغەمبەر (ﷺ) پەیمانەکەی بەست، بەبێ ئەوەی بچێتە ناو شاری مەککەوە، ئەم کارەیش زۆر قورس و ناڕەحەت بوو لەسەر هاوەڵەکانی، کە دڵەکانیان لە چاوەڕوانی و حەزدا بوو کە بچن سەردانی (بیت) لە شاری مەککەی پیرۆز بکەن، و پەیمانی حودەیبیە حیکمەتی زۆر گەورە و گرنگی تیا دەردەکەوت. لەوانە فرسەتێکی گەورە بوو بۆ بڵاوکردنەوەی بانگەوازی ئیسلامی لە دەور و بەری دورگەی عەرەبیدا. پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی کرد بە هاوەڵە بەڕێزەکان کە هەستن و قوربانیەکانیان

---

[٢٩٢]—السيرة النبوية لأبن هشام ١|٦٥٢.

سەربڕن وئیحرام بشکێنن، بەڵام کەسیان دەست پێشکەرییان بۆ ئەم کارە نەکرد، سێ جار دووبارەی کردەوە، بەڵام کەس دەستپێشکەری بۆ نەکرد. ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) ئەمەی بۆ (أم سلمة) باس کرد، کە لەگەڵیدا بوو، ڕا و بۆچوونێکی جوانی دەربڕی. فەرمووی:ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەستە بچۆ بۆ ناو هاوەڵان و هیچ لەگەڵ کەسدا مەڵێ هەتا قوربانییەکەی خۆت سەردەبڕیت و سەرتاشەکەی خۆت بانگ بکە، سەرت بتاشێت. ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) چوویە دەر بۆ ناویان قسەی نەکرد تا کارەکەی کرد، قوربانی سەربڕی و سەری تاشی، کاتێك هاوەڵان ئەمەیان بینی، هەستان و قوربانیەکانیان سەربڕی و ئینجا هەندێکیان هەستان بە سەرچاککردنی هەندێکیان.[٢٩٣]

## ٢_ ڕونکردنەوەیەك دەربارەی کاربەدەست بوونی ئافرەت لەمافی گشتی و بڕیارداندا

زانایانی (شەرع و فیقە) ڕا و بۆچونیان وایە ئافرەت نابێت کار و باری موسوڵمانان بگرێتە دەست، بەڵگەیشیان لەسەر ئەمە بە فەرمودەیەکی پێغەمبەر(ﷺ) هێناوەتەوە کە ئیمامی بوخاری گێڕاویەتییەوە لە(ابی بکرة)ەوە (خوا لێی ڕازی بێت) وتی: کاتێك گەیشت بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە فارسەکان کچەکەی (کسری)یان، کردۆتە پاشا بۆ خۆیان، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی:_ (هەرگیز قەومێك سەرفراز نابن ئەگەر ئافرەت سەرگەورەیان بێت و کاری خۆیان بدەنە دەستی)[٢٩٤]

ڕێگە نادرێت و نەگونجاوە کە ئافرەت کاربەدەست و پێشەوای موسوڵمانان بێت.

زۆرینەی زانایانی (شەرع وفیقە) وای دەبینن: کە ئافرەت نابێت کاری دادوەری وبڕیاردان (القضاء) بگرێتە دەست، چونکە ئەم کارە لە ژێر کاری سەرپەرشتی و حوکمڕانی گشتیدایە، و بە حەرامیان داناوە کە ئافرەت (قاضية) دادوەر و بڕیاردەر بێت. ئەگەر بووو بە بڕیاردەر و کاربەدەست و بڕیاردەر، ئەوا بڕیارەکان ڕاست و دروست نابن، چونکە ئەو کەسەی کە دەستەبەری ئەوە بکات لە ئیسلامدا ببێتە(قاضي)دادوەر، مەرجی ئەوەی بۆ دانراوە کە ڕەگەزی نێرینە بێت. بۆئافرەت ڕێگە پێنەدراوە. (٢٩٥)

---

٢٩٣ -الروض الانف للسهيلي ٤|٣٧.

[٢٩٤]-رواه البخاري في صحيحه، كتاب الفتن.

[٢٩٥]-المغني لأبن قدامة الحنبلي ١١|٣٨٠

وەك ئەوەی کە (القضاء) بڕیاردان پێویستی بە هاوسەنگی و کامڵی عەقڵ و بیرتیژی و هێزی بیرکردنەوە و وەرگرتنی بڕیارەکان و ڕودەوەکان و زاڵ کردنی حەق بەسەر سۆز و عاتیفەدا هەیە. هەروەها خۆیەکلایی کردنەوە بۆ کارەکە و دەست بەرداربوون لە کارەکانی تر. بەلأم ئافرەت هەندێك شتی لە واقع و ڕاستی و بەڵگەکان لەدەست دەچێت، بەهۆی لەبیرچونەوەی کە لە سروشت و فیترەتییەوە هەڵدەدات، هەروەها لە ئەنجامی ئەو کارانەی توشی دێن، وەك عادەی مانگانە و سکپڕی و منداڵ بوون وشتانی تر کە پێی سپێردراوە. هەروەها ئافرەتان خاوەنی سۆز و عاتیفەی کاریگەرن هەست وسۆزداریان زاڵە بەسەر عەقڵیاندا و زۆر جار لە حەق و ڕاستی دور دەکەوێتەوە.

وەك ئەوەی کاتێك کاری (القضاء) دەبات بەڕێوە وسەرپەرشتی دەکات توشی فیتنە و لێ تێکچوون دێت ئەو دەبێت لە کاتژمێرەکانی کۆتایی شەودا دەربچێت بۆ لێکۆڵینەوە لە چۆنیەتی ئەنجام دانی تاوان، و پێویستی بەوە دەبێت کە تەنها بمێنێتەوە لەگەڵ کەسە تاوانبار و گومانلێکراوەکاندا لە هەندێك کاتدا، کە لەمەوە تووشی فیتنە دەبێت.

بە درێژای تێپەڕبوونی مێژووی ئیسلامی، ئەوە جێگیر نەبووە لەناو وولأتێك لە وولأتە ئیسلامیەکاندا کە شەرعی خوای تیا پەیڕەو کرابێت و ئافرەت حوکمڕانی و (القاضية) بووبێت.

*بەلأم (إبن جرير الطبري) لەوەوە کە لێی گێڕدراوەتەوە (إبن القاسم) لە (مالكی) و (إبن حزم الظاهري) ڕیگەیان داوە کە ئافرەت کاری (القضاء) بەڕێوە بەرێت.[٢٩٦]

لەلای (الطبری) و (إبن حزم) بە ڕەهایی لە هەموو بڕیارێکی (القضاء)دا ڕێگەی پێدراوە،ولای (إبن القاسم) لە کاروباریٚ دارایی ولەو کارانەدا پیاو تیایدا بەشدار نابێت،وەك لەدایك بوون و کەم وکوڕی ئافرەتان و کار وباری تایبەتی ئەواندا ڕێگە پێدراوە.

بەوە بەڵگەیان هێناوەتەوە کە: (إنَّ الأصلَ في الأشياء الإباحَة، مالم يقم دليل المنع). واتە: (ئەسڵ لە شتەکاندا ڕێگە پێدانە، کاتێك بەڵگەیەك نەبێت قەدەغەی بکات). هەر کەس کەسێکی گونجاو وچاك بوو،وگونجابوو ناکۆکی و گرفتەکان لێك جیا بکاتەوە، و ئەوە ڕێگە پێدراوە و ڕاست و لەبار و گونجاو دەبێت سەرپەرشتی کاری (القضاء) دادوەری بکات. ئافرەتی چاکەکار وبەتوانا بەسەر جیاکردنەوەی کێشە وگرفت وناکۆکیەکاندا، ئەوە گرفت و ڕێگر لەبەردەمیدا نابێت بۆئەو کارە. بە فەرموودەکەی

---

[٢٩٦]—المحلي لأبن حزم الظاهري ٩|٤٢٩.

پێغەمبەر (ﷺ) ڕەدی ئەمە دەکرێتەوە کە فەرمووی: (لن يُفْلِحَ قومٌ ولو امرهم امراة). واتە: (هەرگیز قەومێك سەرکەوتوو سەرفراز نابن ئەگەر ئافرەت فەرمان ڕەوایان بێت و فەرمانیان بەسەردا دەربکات). هەروەك ئەوەی کە ئافرەت لە بیر و بۆچونەوە ڕوی تێ دەکات وتوشی عادەی مانگانە وسکپڕی ولەدایك بونی منداڵ دێت.

زانایان بۆچونی زۆریان لەسەر کاربەدەست بونی ئافرەت وکاری دادوەری ئافرەتان وتووە. بەلاّم پوختەی قسان بریتییە لە: ڕێگە پێدراو نییە کە ئافرەتان کاری کاربەدەستی گشتی بواری (القضاء) دادوەری و بڕیاردان بگرنە دەست، ئەگەر بووە بڕیاردەر و دادوەر ئەوە کارەکەی وەك پێویست و خوازراو دروست و تەواو دەرناچێت، سەرەڕای ئەوەی کە تاوانبار دەبێت و تاوانی ئەو کەسەیشی کە ئەوی کردووە بە (قاضية) دادوەر، و کاری ئافرەت لە کاروباری گشتی یان دادوەری بڕیارداندا کارێکە لەگەڵ سروشتی مێینەدا ناگونجێت، و سۆز و عاتیفە بەسەریدا زاڵ دەبێت، و لە زۆرێك لە هەڵوێستەکاندا لاواز و بێدەسەلاّت دەبێت، و بە ڕواڵەت تێدەکەوێت وسەری لێ تێك دەچێت وناتوانێت لەگەڵ کار و گرنگییەکانی ژیانی خۆیدا ڕێبکات وبەردەوام بێت، وەك هاوسەر و دایك،چونکە بەڕێوەبردنی کاری گشتی دادوەری پێویستی بە کارکردنی بەردەوام وهەوڵدانی زۆر هەیە.

## ٣_ ڕونکردنەوەیەك دەربارەی سولەیمان ( عليه السلام ) کە دیارییەکەی ڕەتکردەوە

لەو دەرس و وانە گرنگانەی کە ئێمە لەچیرۆکی سولەیمان (علييه السلام)ەوە فێردەبین: وانەی دەست پاکی وئەمانەت پارێزییە لە حوکمڕانیدا، وخۆی لادا لە شانازی کردن بە دنیاو ئەو شتانەوە کە کۆتاییان دێت و خۆڕاگربوو لەبەردەم هەموو هۆکارەکاندا کە دەبنە سەرلێتێکدان وسەرلێشێواندن، کە کەسانی شوێنکەوتوی (باطل) بەتاڵ پەنای بۆ دەبەن، و سولەیمان (عليەالسلام) دەیتوانی کە دیارییەکە قبوڵ بکات و وەربگرێت وپێی ڕازی بێت، بەلاّم حەزو ئارەزووەکانی بەلقیس تێك دەشکێنێت و واز لە خۆی و کارو بارەکەی دەهێنێت،و واز لەخۆی و قەومەکەی دەهێنێت ولەناو سەرگەردانی وگومڕاییدا جێیان دەهێڵن. ودیارییەکە ڕەت دەکاتەوە وخۆی لەشتە دنیاییەکان لادەدات.

ی ای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فَلَمَّا جَاءَ سُلَيْمَانَ قَالَ أَتُمِدُّونَنِ بِمَالٍ فَمَا آتَانِيَ اللَّهُ خَيْرٌ مِّمَّا آتَاكُم بَلْ أَنتُم بِهَدِيَّتِكُمْ تَفْرَحُونَ﴾(النمل:٣٦). بێگومان بەلقیس بۆ ئەوە دیارییەکەی بۆ سولەیمان (علیه‌السلام) نارد کە مەیلی دڵی ڕابکێشێت ولەگەڵیدا بدوێت، وتراوە: بۆ ئەوە ئەو کارەی کرد کە لە ڕێگایەوە بزانێت ئەگەر پاشایەکی پێغەمبە ربێت، ئەوە لەلایەن خواوە پشتیوانی لێ کراوە، وئیتر چۆن ڕووبەڕووی کەسێك ببێتەوە کە هێزو عیزەت و پشتیوانی لەخواوە وەرگرتووە؟! و ئەگەر پاشا بێت وپێغەمبەر نەبێت، ئەوە بێگومان ماڵ وسامان ودارایی بۆئەو بەسەو دیارییەکەیش سەری لێ تێك دەدات و ڕوی پێ وەردەگێڕێت لەبانگەوازەکەی، و ئەگەر هەر سوربێت لەسەر هەڵوێستەکەی، ئەوا خیارێکی تر لەبەردەمیدا نامێنێت تەنها جەنگ نەبێت، ئەوە لەو حاڵەتەدا لە ڕووبەڕووبوونەوەی پاشایەکدا دەبێت کە پێغەمبەر نییە، پاشایەکە لەپاشاکانی دنیا، کە جەنگ نێوانیان یەکلایی دەکاتەوە، کە بەکارهێنانی هێزو بازووە.

*ئەگەر مەبەستی بێت بە دیارییەك ویژدانەکان بکڕێت ومافەکان وون بکات وزمانەکان بێدەنگ بکات لەقسەکردن و حەق دەربڕین، ئەوە بەرتیلێکی حەرامە. ئەگەر مەبەستی ئەوەیش نەبێت ئەوا بێگومان مەبەستی ئەوە بووە، کە بەهۆیەوە سۆزو خۆشەویستی بڵاوبکاتەوە، ونەفس ودەرونەکانی پێ پاك بکاتەوەو ڕق وناکۆکییەکان لابەرێت، ئەوا لەم کاتەدا کارێکی دروست وخوازراو بووە.

*بێگومان پێغەمبەری خۆمان (ﷺ) دیاری وهەدیەی وەردەگرت، بەڵام (صدقة) خەیر و بەخشینی وەرنەدەگرت، و لەحەقی ئەو دیارییەدا پاداشتی دەدایەوە، ومەبەستی بەم کارەیش بۆ کەمەندکێش کردنی دڵەکان وپاك کردنەوەی دەرونەکان بوو.

هەروەها لە (عائیشە)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت) ڕیوایەت کراوە، وتی: وتم ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، بێگومان من دوو دراوسێم هەن بۆ کامیان دیاری بنێرم؟ فەرمووی: (بۆ ئەوەیان کە دەرگاکەی زیاتر لێتەوە نزیکترە).[٢٩٧]

ئیمامی (بوخاری) لە (الأدب المفرد)دا ڕیوایەتی کردووە: لە (ابی هريرة)ەوە، (خوای لێ ڕازی بێت) لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرمووی: (دیاری بۆ یەکتری بنێرن خۆشەویست دەبن).[٢٩٨]

---

٢٩٧-رواه البخاري في صحيحه| كتاب الهبة.

٢٩٨-رواه البخاري في الادب المفرد عن ابي هريرة.

هەروەها لە (ابی هریرة)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت) وتی: (پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەگەر خواردنێکی بۆ بهاتایە پرسیاری لێ دەکرد ئایا ئەمە هەدیەیە یان (صدقة) بەخشینە، ئەگەر بوترایە: (صدقە) بەخشینە، ئەوا بە هاوەڵەکانی دەوت ئێوە لێی بخۆن، بەلاّم خۆی لێی نەدەخوارد). ئەگەر بووترایە (هدیة) دیارییە، ئەوا دەستی بۆ دەبرد و لەگەڵ هاوەڵاندا لێی دەخوارد).[٢٩٩]

ئەگەر دیاری و هەدیە بۆ مەبەستی کەمەندکێش کردنی دڵەکان وپاك کردنەوەی دەرونەکان بێت، ئەوا زۆر جوانە وەربگیرێت بێگومان پێغەمبەری خوا (ﷺ) دیارییەکەی (المقوقس)ی وەرگرت. کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) نامەیەکی بۆنارد وبانگی کرد بۆ ئیسلام، (المقوقس) زۆر بەجوانی وەلاّمی پێغەمبەری دایەوە و دیارییەکی بۆ نارد و پێغەمبەریش (ﷺ) وەریگرت، ئەگەر پێغەمبەر (ﷺ) هەدیەکەی ڕەت بکردایەوە، ئەوا بێگومان شوێنەوارێکی خراپی دەبوو لە دەرونی (المقوقس) وخەڵکی میسریشدا.[٣٠٠]

بێگومان ئەوە ڕێز و گەورەیی و سەربەرزی بوو بۆ خەڵکی میسر و بەهێزکردنی پردی سۆز وخۆشەویستی وبەزەیی بوو، وپێغەمبەر(ﷺ)باشترین ئامۆژگاری خەڵکی میسری کرد.

## ٤_ ڕون کردنەوەیەك دەربارەی ئایەتی: ﴿وَصَدَّهَا مَا كَانَت تَّعْبُدُ مِن دُونِ اللَّهِ إِنَّهَا كَانَتْ مِن قَوْمٍ كَافِرِينَ﴾

بەلقیس لە ئاستێکی بەرزدا بوو لە زیرەکی ولێهاتویی و ژیری و بیرتیژیدا بوو. لەگەڵ ئەوەشدا کەچی خۆری دەپەرست لەجیاتی خوای گەورە،بەڕاستی زۆرێك لەخەڵکی لەسەرلایەنێکی باش ولەبەختی باشدان وخاوەنی زانست وشارەزایی زۆرن،بەلاّم لەگەڵ ئەوانەیشدا باوەڕیان بە شتانی بێ مانا وپرو پوچ هەیە!!

*لێرەدا سەرنجی تێڕوانینی بانگخوازان بۆلای خوای گەرە ڕادەکێشین،کە گرنگی بدەن بەحاڵی ئەو کەسانەی کە بانگەوازیان دەکەن، ئەویش لە ڕوی دەرونی و نەفسی

٢٩٩- رواه البخاري في صحيحه| كتاب الهبة.

٣٠٠-رحيق المختوم لصفي الدين المباركفوري.

و کۆمەڵایەتی وشتانی تریشەوە، و بەشوێن هۆکارەکانی لادانی خەڵکیدا بگەڕێن، و لەگەڵیدا حەق و ڕاستییان بۆ ڕوون بکەنەوە.

*دەربارەی ئەم کارەی کە خەڵکی لە ڕێگەی ڕاست لادەدەن (إبن القيم) لە کتێبی (مفتاح دار السعادة)دا، کۆمەڵێك هۆکاری ڕوون کردۆتەوە، لەوانە هەندێکیان باس دەکەین:

* هۆکاری یەکەم: لاوازی هەست کردن بەحەق وڕاستی.[٣٠١]

* هۆکاری دووەم: نەبوونی کەسایەتی، هەندێك جار کەسێك دەبێت کەحەق وڕاستی بەتەواوی دەناسێت، بەڵام خاوەنی خۆ ئامادەکردن نییە بۆ وەرگرتنی حەق و هەوڵ نادات بۆ گۆڕانکاری وڕاستی یەکان ناڵێت، ئەوە لە دڵ ودەرونیدا نەخۆشی هەیە،نێوانی ئەو وشوێن کەوتنی حەق لێك دوورئەخاتەوە.

خوای گەورەفەرمویەتی: ﴿إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا سَوَاءٌ عَلَيْهِمْ أَأَنذَرْتَهُمْ أَمْ لَمْ تُنذِرْهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ(٦) خَتَمَ اللَّهُ عَلَى قُلُوبِهِمْ وَعَلَى سَمْعِهِمْ وَعَلَى أَبْصَارِهِمْ غِشَاوَةٌ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴾(البقرة:٦_٧).

واتە: (بەڕاستی ئەوانەی کە بیٚ باوەڕ بوون، ئاگاداریان بکەیت یان ئاگاداریان نەکەیت، یەکسانە بۆیان، ..باوەڕوئیمان ناهێنن. (چونکە) خوا مۆری ناوە بەسەر دڵ و گوێیاندا وپەردەی بەسەرچاویاندا هێناوە، (نەبیردەکەنەوە، نەئامادەن حەق ببیستن و،ڕاستییەکان نابینن) هەر بۆیە سزایەکی سەخت چاوەڕێیانە(ئەمانەیش دەستەیەکن لە بیٚ باوەڕان کە هەر خوا خۆی دەیان ناسێت).).

هەروەها لە ئایەتێکی تردا فەرمووی: ﴿ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ فَزَادَهُمُ اللَّهُ مَرَضًا وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ بِمَا كَانُوا يَكْذِبُونَ﴾(البقرة:١٠). واتە: (ئەوانە لە دەرونیاندا نەخۆشی بێباوەڕی و حەسودی و کینە هەیە، خوایش (بە سەرخستنی حەق و ئیمانداران)، ئەوەندەی تر دەردیان گران و کاریگەر دەکات، وسزایەکی سەختیش(لەدنیاوقیامەتدا)چاوەڕێیانە بەهۆی درۆ کردن و(دژایەتیان بۆئیسلام).).

نموونەی ئەو کەسانە وەك زەوییەکی ڕەق وایە، هەرچەند باران لێی بدات ڕاستە وخۆ سودی نییە بۆی.

---

[٣٠١] چونکە حەق وڕاستی بەشێوەیەکی ڕون وتەواو نەگەیشتووە بەوکەسە.نمونەیش لەسەرئەمە:کۆمەڵگە ڕۆژئاوەییەکان کەبێباوەڕن،کەبانگەواری ئیسلامیان پیٚ دەکات، بەڵام بەشێوەیەکی تێکدراو وناشرین کراو،ئەوەش لەبەر هۆکاری دەستەلاٌتی ڕاگەیاندنی ڕۆژئاوایی بیٚ نرخ وئامادە نەبوونی ڕاگەیاندنی ئیسلامی یان لاوازی،ئەوە یش لەبەر هۆکاری لاوازی موسڵمانان وکەم وکورتیان لەئەرکی بانگەوازی خواییدا.

* هۆکاری سێیەم: بوون یان بەربەستی حەسوودی و خۆ بە گەورە زانین یان هەردوکیان پێکەوە وەك ئەوەی کە لە ئیبلیسی بە نەفرەتکراو ڕوویداو وەك ئەوەی کەلە(أبوجهل)ڕویدا وئەوەی کەلە جولەکە ونمونەی ئەوان ڕویدا.

* هۆکاری چوارەم: بەربەستی سەرکردەیی و پاشایەتی وەك لە فیرعەندا بەدەست هات وبەدیکرا.

* هۆکاری پێنجەم:بەربەستی ئارەزوو خۆشەویستی بۆماڵ وسامان.

* هۆکاری شەشەم: خۆشەویستی کەس وکار ونزیکان وهاوڕێیان وهەڵبژاردنیان بەسەرحەقدا.

* هۆکاری حەوتەم: خۆشەویستی خاك ونیشتیمان و پابەندبوون پێوەی وهەڵبژاردنیان بەسەرحەق وڕاستیدا.

* هۆکاری هەشتەم: بەربەستی خۆگرتن بە شتێکەوە و ڕاهاتن لەسەر عورف وعادەت وتێکەڵ بون پێیان.

*هۆکاری نۆیەم: پابەند بون بە بەرنامەی باوك وباپیران وچاولێکەرییان و شوێنکەوتنی کوێرانەیان، وهەڵبژاردنی ئەوەی کە ئەوانی لەسەرن لە گومڕایی و نەزانی بەسەرحەق وڕێنمایی وهیدایەتدا.[٣٠٢]

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿أَمْ آتَيْنَاهُمْ كِتَابًا مِنْ قَبْلِهِ فَهُمْ بِهِ مُسْتَمْسِكُونَ(٢١) بَلْ قَالُوا إِنَّا وَجَدْنَا آبَاءَنَا عَلَى أُمَّةٍ وَإِنَّا عَلَى آثَارِهِمْ مُهْتَدُونَ(٢٢) وَكَذَلِكَ مَا أَرْسَلْنَا مِنْ قَبْلِكَ فِي قَرْيَةٍ مِنْ نَذِيرٍ إِلَّا قَالَ مُتْرَفُوهَا إِنَّا وَجَدْنَا آبَاءَنَا عَلَى أُمَّةٍ وَإِنَّا عَلَى آثَارِهِمْ مُقْتَدُونَ﴾(الزخرف:٢١_٢٣).

واتە: (ئایا ئەو خوا نەناسانە پێش ئەم قورئانە کتێبێکی ترمان بۆناردوون! تاپابەندبن وپەیڕەوی بکەن؟ ئەوانە هیچی وانییە، بەڵکو هەر تەنها ئەوەیە کە دەیانوت: بەڕاستی ئێمە باوك وباپیرانی خۆمان لەسەر ئایین و بەرنامەیەکی ئاوا دیووە، بێگومان ئێمەیش بە شوێن ڕێبازی ئەواندا هەنگاو هەڵدەگرین و ڕێنموویيمان وەرگرتووە. هەر بەو شێوەیە هیچ پێغەمبەرێکمان نەناردووە بۆهیچ شارێك، کە خۆشگوزەرانەکان نەیان وتبێت:_ئێمە باوك وباپیرانی خۆمان بینیوە، پابەندی بیر وباوەڕێك بوون، بێگومان ئێمەیش چاولەوان دەکەین وپەیڕەوی ئەوان دەکەین).

---

٣٠٢-مفتاح دار السعادة لأبن قيم ص|١٠٤-١٠٥ بە دەستکارییەوە.

خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿ وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ اتَّبِعُوا مَا أَنزَلَ اللَّهُ قَالُوا بَلْ نَتَّبِعُ مَا أَلْفَيْنَا عَلَيْهِ آبَاءَنَا أَوَلَوْ كَانَ آبَاؤُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ شَيْئًا وَلَا يَهْتَدُونَ ﴾(البقرە: ١٧٠).

واتە: (ئەگەر بەو خەڵکە نەزانانە بوترێت شوێنی ئەو بەرنامەیە بکەون، کەلەلایەن خواوە ڕەوانەکراوە، دەڵێن:نەخێر، هەر شوێنی ئەوە دەکەوین کە باوك وباپیرانمان پێوەی ئالودە بوون ولەسەری ڕاهاتون، ئایا ئەگەر باوك وباپیرانیشیان تێنەگەیشتو و هیچ نەزان و نەشارەزا بن و ڕێنمونیش وەرنەگرن (هەر شوێنیان دەکەون!؟).

هەروەها لەو هۆکارانە کە نێوانی خەڵك وشوێنکەوتنیان بۆ حەق دور دەخاتەوە، بریتییە لە: ترسان لە یاخی بوان وخۆ بە گەورەزان ولوتبەرزان وسزاکانیان، کەواتە لێرەدا هەردەبێت هێزێك هەبێت حەق وڕاستی بپارێزێت وشوێن کەوتوانیشی بپارێزێت لە هەموو بەشە جیاوازەکانی سەرزەویدا.

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿ وَقَاتِلُوهُمْ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ الدِّينُ كُلُّهُ لِلَّهِ فَإِنِ انتَهَوْا فَإِنَّ اللَّهَ بِمَا يَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴾(الأنفال:٣٩).

واتە (ئەی ئیمانداران) ئێوەیش بجەنگن دژ بە کافر و خوانەناسان، تا فیتنە و ئاشوب و ئازاردانی موسوڵمان نەمێنێت، و (ئەو خەڵکە سەربەست بن لە هەڵبژاردنی بەرنامە وئاییندا) تا دین وفەرمانبەرداری هەر هەموی بۆ خوا بێت جا ئەگەر بێباوەڕان کۆڵ بدەن، ئەوە با بزانن بەڕاستی خوا بینایە بە هەمو ئەو کار و کردەوانەی کە دەیکەن.).

هەروەها لەو هۆکارانە ڕازاندنەوەی ئیبلیس و سەربازەکانی لە پەری و ئینسان بۆ کردەوە ناشرینەکان وجوان کردنی لەبەرچاوی خەڵکی تا نەفسە لاوازەکانی پێ هەڵخەڵەتێنن و قەناعەت بەعەقڵیان بکەن کەشوێنیان بکەون وخۆیان تەسلیمی هەواو ئارەزوەکانیان بکەن وپێی ڕازی بین مەیل بکەن بەلایدا و شوێنی بکەون، خوای گەورە هەواڵی قسەکەی پەپوسلەیمانەی پێداین وفەرموی: ﴿ وَجَدتُّهَا وَقَوْمَهَا يَسْجُدُونَ لِلشَّمْسِ مِن دُونِ اللَّهِ وَزَيَّنَ لَهُمُ الشَّيْطَانُ أَعْمَالَهُمْ فَصَدَّهُمْ عَنِ السَّبِيلِ فَهُمْ لَا يَهْتَدُونَ ﴾(النمل:٢٤).(پێشتر ماناکرا).

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَا لِكُلِّ نَبِيٍّ عَدُوًّا شَيَاطِينَ الْإِنسِ وَالْجِنِّ يُوحِي بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ زُخْرُفَ الْقَوْلِ غُرُورًا وَلَوْ شَاءَ رَبُّكَ مَا فَعَلُوهُ فَذَرْهُمْ وَمَا يَفْتَرُونَ (١١٢) وَلِتَصْغَىٰ إِلَيْهِ أَفْئِدَةُ الَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِالْآخِرَةِ وَلِيَرْضَوْهُ وَلِيَقْتَرِفُوا مَا هُم مُّقْتَرِفُونَ ﴾(الأنعام:١١٢-١١٣).

واتە: (هەر بەو شێوەیە (کێشمە کێشی ئیمان داران وخوانەناسان بەردەوامە). جا بۆ هەمو پێغەمبەرێك (بۆئیماندارانیش) دوژمنێکمان لە شەیتانەکانی ئادەمیزاد وپەری سازاندووە، کە بەردەوام قسەی زل و ڕازاوە دەدەن بە گوێی یەکدا و(خۆیان وخەڵکی) پێ سەرگەردان وگومڕا دەکەن، خۆ ئەگەر پەروەردگارتان بیویستایە (نەیاندەتوانی) شتی وابکەن، دە وازیان لێ بهێنە لەگەڵ ئەو درۆ و دەلەسەیەی کە هەڵی دەبەستن (بۆکوێ دەچن، لەدەست سزای خوای ڕزگار نابن). (هەروەها بەو قسە جوان و بریقەدارانە ئەیاندا بە گوێی یەکدا) بۆ ئەوەی ئەوانەی باوەڕیان بەقیامەت نییە دڵی بدەنێ و پێی ڕازی بن و بۆ ئەوەی ئەوتاوانە بکەن کە ئەوان بەردەوام دەیکەن)

وتەیەکی جوانی ئیمامی (الغزالی) هەیە سەرمان دەسوڕمێنێت و دەمان خاتە هەڵوێستەوە کە دەڵێت: (زۆربەی نەزانییەکان بێگومان لەدڵی عەوام و نەزانەکاندا ڕەگی داکوتاوە، ئەویش بە هۆی نەزانی شوێن کەوتوانی حەقەوە، وحەق وڕاستیان دەرخستووە بۆ تەحەدی کردن و سەرشۆڕکردن و بەچاوی کەم تێڕوانین سەیری لاوازەکانیان کردووە کە ئەوانەیش بوەتە هۆی دروست بونی دوژمنایەتی ودژایەتی وسەرپێچی کردنی یەکتری هەروەها ڕەگ داکوتانی بیر و باوەڕی بەتاڵ). [٣٠٣]

## ٥-چەند وانەیەکی گرنگ لە سەرکردایەتی وحوکمڕانیدا

* لە چیرۆکی سولەێمان (علیه‌السلام) لەگەڵ بەلقیسی پاشای سەبەئدا، چەند وانەیەکی گرنگ لە سەرکردایەتی کردن وحوکم ڕانی وەردەگرین، وەك لە خوارەوە ڕونی دەکەینەوە: پێویستە بەردەستەکان و سەربازو کەسانی خزمەتکار بەسەر بکرێنەوە و بڕوانرێت بۆ ئیش وکار وحاڵ وباریان وهەواڵیان بزانرێت، و بەباشی سەرکردایەتیان بکرێت وبەجوانی حوکمڕانی بکرێن وبەشێوازێکی تەواو ڕێك وپێك بکرێن و لە ژێر سایەی یاسادا ڕێك بخرێن ودامەزراو وگوێڕایەڵ بکرێن. وسزای کەم تەرخەمەکان ودواکەوتو وسەرپێچی کاران بدرێت و لێکۆڵینەوەیان لەگەڵ بکرێت وچاوپۆشی لەعوزری دروستیان بکرێت ولێیان قبوڵ بکرێت، ئەگەر ڕاستگۆ بوون وجێگەی قەناعەت بوون.

---

٣٠٣-الاعتصام بالكتاب والسنة للشاطبي ٢|٢٠٣ ط دار المعرفة. بە دەستکارییەوە.

* هەروەها لەخێرا هاتنەوەی پەپوسولەیمانەکەدا پاش ئەوەی لە کاروبارەکەی تەواوبوو، کە لەلایەن سولەیمانەوە (علیەالسلام) پێی ڕانەسپێردرابوو، بەلأم خۆی دەست پێشکەری بۆ کردبوو، ئەوە بەڵگەیە لەسەر ڕێك وپێکی پەپوسولەیمانە و پابەند بوون، و لەخۆ ڕابینین بۆکاری چاکسازی وبانگەوان، هەروەها لە قسەکەیدا وتی: ﴿أحطْتُ بِمَا لَمْ تُحِطْ بِهِ﴾ ئاماژەیە بۆ پلەوپایەی زانست وگەورەیی وبەدەستهێنانی، وبێگومان زانست وزانیاری دەریایەکی فراوان وبێ کەنارە، وبەردەوامە وهەرگیز نابڕێت وکۆتایی نایەت، ئەگەر خوای گەورە هەرکەسێك لە چەند شتێك ئاگادارو شارەزا بکات، ئەوا بێگومان چەند شتێکی تری لێ شاردۆتەوە، ئا لێرەدا زانیاری وشارەزایی پەپوسولەیمانە بەشتێك کە سولەیمان ئاگای لێی نەبوو، لەگەڵ لاوازی پەپوسولەیمانەکە و گەورەیی و هێز و زانستی سولەیمان (علیەالسلام) لە پلە و پایەی پێغەمبەر سولەیمان(علییە السلام)کەم ناکاتەوە، هەروەها لە توانایشی کەم ناکاتەوە، بێگومان ئەو کەسەی زانیاری بەهەموو شتانێك هەیە ئەوە هەر خوای گەورەیە، کە هیچ شتێك لەو شاراوە نییە. خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِنَّ اللَّهَ لَا يَخْفَىٰ عَلَيْهِ شَيْءٌ فِي الْأَرْضِ وَلَا فِي السَّمَاءِ﴾(آل عمران:٥).

واتە: (بێگومان هیچ شتێك لەخوا وون نابێت نە لەزەوی و نەلەئاسماندا).

لە ئایەتێکی تردا دەفەرمووێت: ﴿اللَّهُ الَّذِي خَلَقَ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ وَمِنَ الْأَرْضِ مِثْلَهُنَّ يَتَنَزَّلُ الْأَمْرُ بَيْنَهُنَّ لِتَعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ وَأَنَّ اللَّهَ قَدْ أَحَاطَ بِكُلِّ شَيْءٍ عِلْمًا﴾ (الطلاق:١٢).

واتە: (خوا ئەو زاتەیە کە حەوت چین ئاسمانی دروست کردووە، وفەرمانی خوا لەنێوانیاندا دادەبەزێت، هەروەها بەوێنەی ئەوان فەرمانی خوا بۆ زەویش دادەبەزێت وجێبەجێ دەکرێت، بۆ ئەوەی بزانن کە بەڕاستی خوا دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە، بێگومان خوا بەزانست وزانیاری خۆی گەمارۆی هەمووشتێکی داوە).

هەروەها لەچیرۆکی موسا لەگەڵ (خضر)دا، خوای گەورە (خضر)ی لە چەند کارێك ئاگادارو شارەزا کرد کەموسا(علیەالسلام) نەیدەزانی. موسا وا گومانی برد کە خۆی زاناترین کەسە لەسەر زەویدا، خوای گەورە شارەزاو ئاگاداری کرد کە کەسێك لە شوێنێکدا هەیە لەو زاناترە، خوای گەورە وەحی بۆ نارد: کە من بەندەیەکم هەیە لەلای شوێنی بەیەکگەیشتنی دوو دەریاکە و ئەی موسا لە تۆ زاناترە...، لە چیرۆکەکەدا، کاتێك موسا (علیەالسلام) گەیشت بە (خضر) پاش گەشتێکی دوورو درێژ وماندووبوون

-بۆدەستکەوتنی زانست_ ئینجا موسا (علیەالسلام) (خضر)ی بینی، خۆی بە بەرگێك داپۆشی بوو، کە چمکی جلەکەی خستوبویە ژێر قاچی وبەشەکەی تریشی لەسەرەوە خستبویە ژێر سەری، ئینجا موسا(علیە السلام)سەلامی لیٚ کرد، ئینجا (خضر) دەم و چاوی خۆی دەرخست و وتی: ئایا لەم خاکەدا کە منی تێدام سەلام کردن هەیە؟ تۆ کێیت؟ وتی: من موسام. وتی:موسای پێغەمبەری نەوەی ئیسرائیل؟ وتی: بەڵێ، وتی: ئیش وکارت چییە؟ فەرمووی: هاتووم بۆلای تۆ لەوەم فێر بکەیت کە فێربوویت وڕێنموییم بکەیت. وتی:ئەی موسا، بێگومان من زانستێکم لایە ناگونجێت ودەست نادات بۆ تۆ کە فێری ببیت، وبێگومان تۆیش زانستێکت هەیە، ناگونجێت و دەست نادات کە من فێری ببم، ئینجا باڵندەیەك بە دەنوکی لە ئاوی دەریاکەی هەڵگرت، ئینجا وتی: سوێند بەخوا زانستی من وزانستی تۆیش لە چاو زانستی خوادا هیچ نییە مەگەر بە هێندەی ئەوەی کە باڵندەکە بە دەنوکی لە دەریاکەی هەڵگرت....).[٣٠٤]

بێگومان زانست کۆتای نییە، زانا هەرچەندە ڕۆبچێت لە زانستدا وبگات بە پلەی بەرز، ئەوا بێگومان لە ئاستی داواکاری ئەودا ڕاناوەستێت بێگومان خوای گەورە فەرمانی کرد بە پێغەمبەر (ﷺ) کەتوێشوی زانستی زیاتر بخات وزیاتر وەرگرێت.

خوای گەورە فەرموی: ﴿وَقُل رَّبِّ زِدْنِي عِلْمًا﴾(طه:١١٤). واتە: (بڵێ: پەروەردگارم زانستم زیاتر بکەیت).

* هەروەها لە وت و وێژی نێوان سولەیمان (علیەالسلام) وپەپوودا، وگوێگرتنی بۆ قسەکانی پەپوو، ئەمە وەردەگرین کە بریتی یەلە: لەسەر کاربەدەستان وسەرکردەکان ودادوەران پێویستە گرنگی بەکەسی خاوەن ماف بدەن کە پارێزگاری لەخۆی بکات، وئازادی ڕادەربڕینی پێ بدەن. بەبێ بونی ئازادی ئەوە ڕونادات کە ئەمن وئاسایش وئارامی بەرقەراربێت، هەروەها پێشکەوتن وشارستانیش بەدەست نایەت.

* لە قسەکانی پەپوسولەیمانەوە بۆمان دەردەکەوێت کە ئیمانی بەهێز بووە وحەزی زۆر بووە و زۆردڵسۆز بووە بۆحەق و زۆر لایەنگر وخەمخۆری سولەیمان (علیەالسلام) بووە، وزۆر بەهێز بووە لە ڕونکردنەوەی مەسەلەکەدا، و زۆر زمانپاراو و ڕەوانبێژ بووە، ئەوەیش لە دەربڕین و ڕوونکردنەوەی کارەکەیدا زۆر بەجوانی دەرکەوت ومەسەلەکەی شیکردەوە و زۆر بەجوانی بە دوایدا گەڕانی کرد و کۆتایی پێهێنا.

---

[٣٠٤] أخرجە البخاري في صحيحە عن عبدالله بن عباس، رقم|٤٧٢٥| كتاب التفسير.

* هەروەها لە قسەکەی سولەیمانندا(علیه السلام) دوای ئەوەی گوێی لە پەپوگرت وتی: ﴿قَالَ سَنَنظُرُ أَصَدَقْتَ أَمْ كُنتَ مِنَ الْكَاذِبِينَ﴾ ئاماژە بوو بۆ پێداگری و لێکۆڵینەوە لە هەواڵ.

* هەروەها لە نامە ناردنەکەی سولەیمان (علیه السلام) بە پەپودا بۆ پاشای سەبەء، ئەوە دەگەیەنێت کە دەستپێشکەری و پێشبڕکێی کردووە بۆ خەیر و ووزە و تواناکانی دابەش کردووە، و سودی لە توانای ڕێگەپێدراو وەرگرتووە لە بڵاوکردنەوەی بانگەوازدا.

* هەروەها هەڵگرتن وبردنی نامەکە لە لایەن پەپوسولەیمانەوە و پابەندبوونی و گوێڕاگرتنی بۆ فەرمانەکانی سولەیمان (علیه السلام) لەمەیشدا ئەوە دەردەکەوێت کە بیستن وگوێڕایەڵی پێویستە بۆ فەرمانڕەوا و سەرکردەی موسڵمان، ودەبێت داواکارییەکان ڕوون بن و لە توانادابن و ئەو کەسەی داوای لێ کراوە بتوانێت جێ بەجێی بکات.

* لە ناوەڕۆکی نامەکەدا: ﴿إِنَّهُ مِن سُلَيْمَانَ وَإِنَّهُ بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ (٣٠) أَلَّا تَعْلُوا عَلَيَّ وَأْتُونِي مُسْلِمِينَ﴾(النمل:٣٠-٣١). لەمەدا ئاماژە بۆ گرنگی و ڕێزداری ناوەڕۆکی نامەکە و ڕەوانبێژی لەگەڵ کورتبڕی ووشەکانی کراوە، بەڵام مانای گەورە و جوانی تیا بوو و مەبەستەکانی بەرز و بڵند بوون، لەمەدا وانەی گرنگ بۆ سەرکردە و کاربەدەستان هەیە کە ڕەچاوی ئەم کارانە بکەن لە نامە و نوسراو و وتەکانیاندا.

* هەروەها لە ڕاوێژکردنی بەلقیس بە بەردەستەکانی لە قەومەکەی، ئاماژەیە بۆ گرنگی کاری ڕاوێژکردن لە دەسەڵاتدا و کردنی بە پایەیەکی گرنگ لە پایەکانی دادپەروەری وئازادی، وشێوازێکی خوازراو ودروست بۆ ئاڵوگۆڕکردنی بیر و بۆچوونەکان وتێکەڵکردنی فکرە و بۆچوونەکان و گەیشتن بە باشترین بڕیار.

* هەروەها لە قسەکەی قەومی سەبەءدا بۆ پاشا بەلقیس: ﴿قَالُوا نَحْنُ أُولُو قُوَّةٍ وَأُولُو بَأْسٍ شَدِيدٍ وَالْأَمْرُ إِلَيْكِ فَانظُرِي مَاذَا تَأْمُرِينَ﴾ (النمل:٣٣).

لەم قسەیەدا ئاماژە بۆ ئەوە کراوە لە ڕەگەزەکانی هێز و بازو بۆ هەر نەتەوە و ئومەتێك و هەر سوپایەك بریتییە لە هێزی ئامادە و پێداویستی و ئامادەکاری و هێز وبازو و لێهاتووی ویەکریزی ولایەنگری سەرکردە و پێشەوا.

* هەروەها لە ناردنی دیارییەك لە لایەن بەلقیسەوە بۆ سولەیمان (علیه‌السلام) ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە مەیلی بەلای چەکی هەڵخەڵەتاندن و چەند و چۆن کردندا بووە لەجیاتی بەکارهێنانی هێز و ڕووبەڕوو بوونەوە وبەرگری کردن، ئەوەش نیشانەی لاوازی ئافرەتان وفێڵ ونەخشەکانیانە.

* لەوەدا کەسولەیمان (علیه السلام) دیارییەکەی ڕەتکردەوە، ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە پێویستە کاربەدەست دەست وداوێن پاك بێت وسەربەرز و بەڕێز بێت ودنیا نەویست بێت، و دامەزراو بێت لەبەردەم هۆکارەکانی هەڵخەڵەتاندن و چەند و چوون کردندا.

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَلَمَّا جَاءَ سُلَيْمَانَ قَالَ أَتُمِدُّونَنِ بِمَالٍ فَمَا آتَانِيَ اللَّهُ خَيْرٌ مِمَّا آتَاكُمْ بَلْ أَنْتُمْ بِهَدِيَّتِكُمْ تَفْرَحُونَ﴾ (النمل:٣٦).

لەزەت و خۆشی دنیایی هەرچەندە زۆریش بێت هەر کەمە، و هەرچەندە گەورە بێت هەر کەمنرخ وبێ نرخە، و هەرچەندە ماوەکەی درێژبێت، کۆتایی دێت ودەبڕێتەوە ونامێنێت، و ئەهلی بێباوەڕی هەمیشە سەرقاڵن بە ناز و نیعمەتی دنیاییەوە و بە باق و بریقەکەی تێدەکەون و بە جوانی ڕازاوەیی یەکەی سەرسام دەبن.

هەروەها لە قسەکەی سولەیمان (علیه السلام) بۆ گەورەی وەفدەکەی بەلقیس: ﴿ارْجِعْ إِلَيْهِمْ فَلَنَأْتِيَنَّهُمْ بِجُنُودٍ لَا قِبَلَ لَهُمْ بِهَا وَلَنُخْرِجَنَّهُمْ مِنْهَا أَذِلَّةً وَهُمْ صَاغِرُونَ﴾(النمل:٣٧). وانەی گرنگی تیایە کە دەگونجێت و دەست دەدات، کاربەستی موسڵمان لەسەری بڕوات: ئەویش لە بوونی هێز و بازو لە حەق و ڕاستیدا و توندی لەگەڵ دوژمنانی خوادا، و خۆڕاگری ودامەزراوی لەبەردەم بەرگری وهۆکاری هەڵخەڵەتاندنیان و هەڕەشەکانیان وسەرجەم فێڵ و نەخشە و پیلانەکانیان.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَا يَزَالُونَ يُقَاتِلُونَكُمْ حَتَّى يَرُدُّوكُمْ عَنْ دِينِكُمْ إِنِ اسْتَطَاعُوا﴾(البقرە:٢١٧).

واتە: (بەردەوام دژتان دەجەنگن، هەتا واتان لێ بکەن لە دین و ئاینتان پاشگەز ببنەوە، ئەگەر بۆیان بکرێت).

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا يُنْفِقُونَ أَمْوَالَهُمْ لِيَصُدُّوا عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ فَسَيُنْفِقُونَهَا ثُمَّ تَكُونُ عَلَيْهِمْ حَسْرَةً ثُمَّ يُغْلَبُونَ وَالَّذِينَ كَفَرُوا إِلَى جَهَنَّمَ يُحْشَرُونَ﴾(الانفال:٣٦).

واتە: (بێگومان ئەوانەی بێباوەڕن، ماڵ وسامانی خۆیان بەو مەبەستە خەرج دەکەن! پاشان دەبێتە پەشیمانی وداخ و حەسرەت لەسەریان، لە دواییدا شکست دەهێنن، بێگومان ئەوانەیش کە بێباوەڕ بوون، بۆ دۆزەخ کۆ دەکرێنەوە و ڕاپێچ دەکرێن).

ناگونجێت و دەست نادات کە کاربەدەست و سەرکردەکانمان لەم ڕاستیانە غافڵ وبێئاگابن، ئەوە پێغەمبەر سولەیمان (علیه‌السلام) ڕووبەڕوی نەخشەو فێڵەکانیان دەبێتەوە بە هێز و بازو و هەڕەشە، چونکە ناگونجێت بوارێك جێ بهێڵێت بۆ دوژمنانی خوا تاماڵ وسامان ودارایيان ببەخشن لە پێناوی بڵاوکردنەوەی کوفر و گومڕایی وبڵاوکردنەوەی ناشەرعی، پاشان ئێمەیش بە دەستی خاڵی و نوقاو بوەستین.

وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿لَا إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ﴾ (البقرة:٢٥٦).

واتە: (لە دیندا زۆر لێکرن نییە) هەر بەو جۆرە بۆ کەسیش ناگونجێت و دەست نادات کە بەربەست لەڕێگەی خوادا دابنێت و دژایەتی بانگەوازی خوا بکات و شێوەی ئیسلام ناشرین بکات و بیشێوێنێت و موسوڵمانان بچەوسێنێتەوە.

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿وَقَاتِلُوهُمْ حَتَّى لَا تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ الدِّينُ كُلُّهُ لِلَّهِ﴾(الأنفال:٣٩).

واتە: (ئەی ئیمانداران) ئێوەیش بجەنگن دژ بە کافر و خوانەناسان تا فیتنە و ئاشوب و ئازاردانی موسوڵمان نەمێنێت (و ئەو خەڵکە سەربەست بن لە هەڵبژاردنی بەرنامە و ئاییندا)تادین و فەرمانبەرداری هەر هەموی بۆ خوا بێت.).

* جیهاد و تێکۆشان لە ڕێگەی خودا، ئامانجی لابردنی بەربەست وناڕەحەتییەکانە کە دەیگۆڕێت بێ ئەوەی بانگەوازی خوا بگات بە خەڵکی و دەرگای بەڕودا دەکرێتەوە، دژایەتی ئەو ڕێکخراوانە دەکات کە موسڵمانان دەچەوسێننەوە و بەربەست لە ڕێگەی خوادا دادەنێن.

## ٦_ ڕونکردنەوەیەك دەربارەی تاقیکردنەوە

* لە قسەکەی سولەیمان (علیه‌السلام)دا، کاتێك عەرشەکەی بەلقیسی بینی کەلای ئامادە کرابوو، و دانرا بوو، ئەویش بە قودرەتی خوا و، نیعمەتێکی گەورە بوو بۆ سلێمان (علیه‌السلام) فەرمووی: ﴿فَلَمَّا رَآهُ مُسْتَقِرًّا عِندَهُ قَالَ هَذَا مِن فَضْلِ رَبِّي لِيَبْلُوَنِي أَأَشْكُرُ أَمْ أَكْفُرُ

وَمَنْ شَكَرَ فَإِنَّمَا يَشْكُرُ لِنَفْسِهِ وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ رَبِّي غَنِيٌّ كَرِيمٌ﴾(النمل:٤٠). لە هەڵوێستی سولەیمان (علیەالسلام)ی حەکیم و دانادا ئاماژە بۆ ئەوە کراوە کە (الأبتلاء) تاقی کردنەوە هەروەك چۆن بەشەڕ و ناڕەحەتی دەبێت، هەر بەو جۆرەیش بە خەیر و خۆشی دەبێت.

خوای گەورە لە سوورەتی (الأنبیاء)دا فەرموویەتی: ﴿ كُلُّ نَفْسٍ ذَائِقَةُ الْمَوْتِ وَنَبْلُوكُم بِالشَّرِّ وَالْخَيْرِ فِتْنَةً وَإِلَيْنَا تُرْجَعُونَ﴾(الأنبیاء:٣٥).

واتە: (هەموو کەسێك دەبێت مردن بچێژێت وشەرابی مەرگ بنۆشێت، بێگومان ئێمە ئێوە تاقی دەکەینەوە بە شەڕ و ناخۆشی و بەڵا و بە خێر و خۆشی و دارایی و توانایی، سەر ئەنجام هەر بۆ لای ئێمە دەهێنرێنەوە (تاپاداشتتان بدەینەوە.) پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: (من سەرم دەسوڕمێت لە کاری باوەڕدار، بێگومان کارەکانی هەمووی خەیرە، ئەمەیش بۆ هیچ کەس نییە تەنها بۆ باوەڕدارە، ئەگەر خۆشی توش بێت، ئەوا سوپاسگوزاری خوادەکات. ئەگەر ناخۆشی و ناڕەحەتی توشی بێت، ئەوا ئارام دەگرێت، ئەوەیش خەیر و چاکەیە بۆی).[٣٠٥]

* پێشەوا (الراغب) دەڵێت: (...بێگومان تاقیکردنەوەی خوا بۆ بەندەکانی، جارێك بە خۆشی دەبێت تا سوپاسگوزاری خوا بکەن، و جارێکیش بە ناخۆشی و ناڕەحەتی دەبێت تا ئارام بگرن، دەبێتە ناڕەحەتی و ناڕەحەتیش هەموی تاقیکردنەوەیە، ناڕەحەتی پێویستی بە ئارامگرتن و سوپاسگوزاری هەیە، هەستان بە ئارامگرتن ئاسانترە لە هەستان بەسوپاسگوزاری، ناڕەحەتی و میحنەت بۆتە گەورەترینی هەردو تاقیکردنەوەکە. هەر لەم تێڕوانینەوە (عمری کوڕی خطاب) (خوای لێ ڕازی بێت) فەرمویەتی: ئێمە بە ناڕەحەتی تاقیکراینەوە، ئاراممان گرت، بە خۆشی تاقی کراینەوە بەڵام ئاراممان نەگرت.[٣٠٦]

---

[٣٠٥]-رواه مسلم في صحيحه عن صهيب بن سنان الرومي |كتاب الزهد، باب في احاديث متفرقة.

[٣٠٦]-المفردات للراغب ص|٦١ مادة: ب ل ي.

## کۆمەڵێك ڕونکردنەوەی هەمەجۆر لە چیرۆکەکەدا

**یەکەم: لەسەیر و سەمەرەکانی مێرووله:**

بە بۆنەی بەشێك لە بابەتی ناو چیرۆکەکە، لەسەر مێرووله، کە حەزرەتی سولەیمان (علیەالسلام)ی ڕاوەستاند و گوێی لە قسەکانیان ڕاگرت و زیاتر سوپاسگوزاری خوای کرد، بەم بۆنەیەوە هەڵوێستەیەك لەسەر جیهانی مێروولەکان دەکەین.

بەڕاستی جیهانێکی سەیر و ناوازەیە، مێروله ئەندازیارێکی شارەزا و لێهاتووە لە بیناکردن ودروست کردنی ماڵ وشاری خۆیدا و شارەزایە لە نەخشە داناندا و زانایشە لە هۆکار و ئامرازەکانی گەنجینە کردنی خۆراك وپێداویستییەکانیدا و جوتیارێکی زیرەکیشە لە چاندن ودورینەوە و خەزنکردنی بەرهەمدا، هەروەها شوانێکی باشیشە!!

بە کورتی ئەمانە ڕووندەکەینەوە:

ماڵی مێروله: لە چەند چینێك پێك دێت، هەر چینێك ژمارەیەکی زۆر ژوری تیایە، هەروەها شوێنی حەوانەوەی تیایە تا مێروله ئیشکەرەکان ئیسراحەتی تیا بکەن، هەروەها گەنجینەی تیایە بۆ هەڵگرتن و پاراستنی خواردەمەنی، هەروەها شوێنی خواردنی تیایە بۆ ژەمە خۆراکییەکان، هەروەها مۆڵگەی سەربازی و سەنگەری تیایە بۆ ڕوو بەرو بوونەوە لەکاتی مەترسیدا و خۆ ئامادەکردن بۆ جەنگ و ڕووبەرو بونەوە لەگەڵ مێرولەی تردا یان لەگەڵ دووژمنێك مەترسیان لەسەر دروست بکەن یان هەڕەشە لە مەملەکەتی مێروولەکان بکەن، لەگەڵ ئەمانەیشدا گۆڕستانی تیایە بۆ ناشتنی مێرووله مردو و لەناوچوەکان، هەروەها شوێنی تایبەت بۆ شای مێرولان و شوێنی دانانی گەرا و گرنگی دان بە پەروەردەکردنی مێرووله ورد و بچوکەکان، هەروەها شوێنی خۆپاراستن لەو مێروە زیانبەخشانەی کە ڕویان تێدەکەن، هەروەها مێروولەکان هەڵدەستن بە چاندنی جۆرەها کەرو و ڕووەك، پاشان بەرهەمی دەهێنن و کۆی دەکەنەوە. لە وولاتی ئەفەریقا جۆرێك مێرووله بینراوە پرد دروست دەکەن بۆ پەرینەوە لە بەربەستە ئاوییەکان مێرولەکان هۆکاری زانستی پێشکەوتوو بەکاردێنن لە زەخیرە خستن و هەڵگرتنی خۆراك، بە جۆرێك لە خۆراك و دەنکی تۆوەکان دوو لەت دەکەن تا چەکەرە نەکات و بڕوێت و بفەوتێت، تۆوی هەندێك ڕووەك چوارلەت دەکات، چونکە بە

دوولەتکراوی دەڕوێتەوە. ئەگەر خواردن و تۆوەکان تەڕببن یان شێیان بەر بکەوێت، ئەوا مێروولەکان دەیانخەنە بەر خۆر تا ووشك ببنەوە و خراپ نەبن!

یەکێك لە زاناکان هەستا بە دیراسە و لێکۆڵینەوە لە جیهانی مێروولەکان بۆ ماوەی چەند سالێك، ڕۆژێکیان بینی، مێروولەیەك لە کارەکەیدا کە هەڵکەندنی زەوی بوو لە چاو قەبارەی لەشی بچووکی خۆیدا، و بە بەراورد لەگەڵ ئیشی ئینساندا و قەبارەی گەورەی لەشی ئینسانەکە، بینی و بۆی دەرکەوت کە کاری مێروولەکە یەکسانە بە هەڵکەندنی شوێنێك لەلایەن مرۆڤەوە کە بە ئەندازەی دوو کەنداو بێت، کە درێژی هەریەکەیان(٧٢)پێ بێت و قوڵیەکەی (٥) پێ، لەگەڵ بیناکردنی چوار دیوار لە قووڕ، کە بەرزی هەر یەکەیان دوو پێ بێت و ئەستووریشی (١٥) ئینچ بێت!

زانایەك دەستی کرد بە ڕامان و لێکۆڵینەوە لە ژیانی هەنێك لە مێروولەکان، تێبینی ئەوەی کرد، ئەگەر مێروولەیەك خواردنێك یان مێروویەکی دەست بەکەوێت هەوڵ دەدات بیبات بۆ شارەکەی خۆی، ئەگەر نەیتوانی ئەوا دەچێت هەندێك لە هاوڕێ مێروولەکانی بانگ دەکات، تا هاوکاری بکەن و بە یەکەوە بیبەن، پاشان لەوێ شوێنیکی گونجاوی بۆ دیاری دەکەن کە داینێن تیایدا، پاشان یەکێك لە مێروولەکان دەگەڕێتەوە تا خواردنی تر بدۆزێتەوەو هاوڕێکانی بانگ بکاتەوە و جارێکی تر بە هەرەوەزی کارەکە بکەن. کاتێك شارەکەیان پڕ دەبێت و جێگە نامێنێت، ئەوا مێرولەکان خواردنەکە دەگوێزنەوە بۆ شوێنی تر، پاشان مێرولە تەنهاکە دەگەڕێتەوە بۆ شارەکەی خۆی کەسیان نابینێت، پاشان دەگەڕێتەوە بۆ گەڕان بەدوای خواردندا و دەستی دەکەوێت پاشان دەگەڕێتەوە تا مێرولەکان بانگ بکات بەڵام ئەوان چوون خۆراکەکە بۆ شوێنێکی تر بگوێزنەوە تا مێروولەکە نەیاندۆزێتەوە، ئەوە چەند جارێك دووبارە دەبێتەوە، تا مێروولەکان وا گوومان دەبەن کە مێرولە تەنهاکە درۆی لەگەڵ کردوون، ئینجا هەڵدەستن دادگایی بکەن و پاشان بڕیاری کوشتنی دەدەن و لە ت و پەتی دەکەن. بێگومان سزای درۆ کردن لە جیهانی مێروولەکاندا بریتیە لە مردن.

**دووەم: لە سەیر و سەمەرەی باڵندەکان (بە بۆنەی باسی پەپوسولە یمانەوە).**

ژەمە خۆراکێکی زیادە لەگڵی خاك:

لەناو دارستانەکانی (غینیا)دا، دوو زانای (بایولۆجی) لە ئیش و کاریاندا هەستان بە لێکۆڵینەوەیەك دەربارەی باڵندەی (ببغاء) تێروانینی خۆیان خستە سەر (ببغاء)ەکان، بینیان کە پاش تەواوبوونیان لەو ژەمە خواردنەی کە لە تۆو و بەری هەندێك ڕووەك پێك

هاتووە، هەڵدەستن بە خواردنی ژەمە خۆراکێکی تر لە گڵی خاك، هەوڵیاندا هۆکاری ئەمە بزانن، ئایا ئەو گڵە دەبێت نیسبەتێکی لە کانزا و ماددەی خۆراکی گرنگ تیا بێت کە لە خواردنی ئەواندا نەبێت؟!

نەخێر. بە ڵکو خۆراکی ئەوان چاکە و دەوڵەمەندە بە ماددەی خۆراکی.

ئایا دەبێت گڵ یارمەتی سیقەتۆرەی ئەو باڵندانە بدات لە هەرسکردنی خۆراکەکەدا؟.

نەخێر. بەڵکو (ببغاء)ەکان خاوەنی دەنووکی تیژن و، توانای لەت کردنی خۆراکەکانیان هەیە، و ئەو گەڵیش نەرمە و یارمەتی ووردکردن و هاڕینی ئەو خۆراکانە نادات کەواتە، نهێنی ئەم کارە لەچی دایە؟

نهێنییەکە ئەوەیە کە خۆراکی (ببغاء)ەکان، پێك دێت لە تۆوی هەندێك ڕووەك و گژووگیای ووشکانی کە دەوڵەمەندن بە ماددەی خۆراکی کانزاکان، هەروەها ئەم خۆراکانە نیسبەتێك ماددەی ژەهراوی بکوژیان تیایە کە لەناوبەرن. هەروەها دەنکی گڵەکان ئەو بەشە ژوهراویانە وەردەگرن و ڕادەکێشن (وەك پاك کردنەوەی) ئینجا ناهێڵێت ڕیخۆڵەی (ببغاء)ەکان ئەو ماددە ژەهراوییە هەڵمژێت و زیانی پێ ناگەیەنێت، پاشان ژەهرەکە دەنیشێت هەتا لە لەشی باڵندەکە دەچێتە دەرەوە. جاکێ ئەو (ببغاء)انەی هیدایەت داو ڕێنمویی کرد بۆ ئەو کارە؟بێگومان خوای پەروەردگاری جیهانیان:﴿الَّذِي أَعْطَى كُلَّ شَيْءٍ خَلْقَهُ ثُمَّ هَدَى﴾ (طة:٥٠).

واتە: (خوا ئەو زاتەیە کە هەموو شتێکی بەتایبەتی و ڕێك و پێکی دروست کردووە، پاشان ڕێنمویی کردووە تا بەچاکی دەوری خۆی ببینێت و (لە خزمەتی ئادەمیزاد دا بێت). بەڕاستی لە جیهانی باڵندەکاندا شتی سەیر و سەمەرە زۆر هەن کە بوار نیە هەموویان باسبکەین.

لە قسەی پەپووسولەیمانەکەدا وەك قورئاتی پیرۆز هەواڵی پێداین، کاتێك کە چاوی بە قەومی (سەبەء) کەوت خۆریان دەپەرست، ئینکاری کردن و کارەکەی بە خراپ باس کردن و لەوەدا ئاماژەیەکی گرنگ و گەورە هەبوو بۆ گومڕایی سەرلێشێواوی ئەو قەومە و کەمی و بچوکی ئەو خۆرەی کە دەیانپەرست لە جیاتی خوای گەورە. ئەوە تەنها گەردێکی بچووك بوو لە بوونەوەرێکی فراوان و سنور نادیار، لە چاو ئەو کەونەی کە بە ملیۆنەها خۆری تیایە و ملیارەها کەشکەشانی تیا دەسورێتەوە، ئەمانە هەموو لە ئاسمانی دنیادان، خۆریش بە یەکێك لەو ئەستێرانە دەژمێردرێت کە سەر بەکۆمەڵەی ناسراوی (درب التبانة)ن، کەلە نزیکەی (٤٠٠) ملیار ئەستێرە پێك دێت لە هەموو

جۆرێك، هەموو پێکەوە بە شێوەیەکی ڕێك و پێك لەسەر تەوەرەی خۆیان دەجولێنن و سوڕ دەخۆن، دانیشتوانی سەر زەوی تەنها خۆریان لەو کۆمەڵەیە ناسیوە پێوانی دووری نێوان ئەم ئەستێرە و هەسارانە بە مەتر و کیلۆمەتر کارێکە ئاسان نیە و ناگەنجێت، هەروەك چۆن ناگونجێت نێوان دوو شار یان دوو وولات بە (سم، ملم) و پێوانەی کوورت بپێورێت، بەڵکو زانایان ئەو ماوە دوورانەیان بە ساڵی ڕووناکی پێواوە و دیاری کردووە. زانستی بەشەری گەیشتۆتە زۆر پێشکەوتن و دۆزینەوەی زۆری ئەنجامداوە، ڕۆژانە ئێمە دەبیستین، باسی زۆرێك لە دۆزینەوە نوێ یەکان دەکرێت لە گەردووندا، دەبێت لە ئاسمانەکانی تردا چ دەنگ و باس و شتانێکی سەیر و سەمەرە هەبن، کە لەم ئاسمانە بینراوە فراوانترن، دەبێت کورسی و عەرشەکەی خوای گەورە چۆن بێت و چەند گەورە بێت؟

کورسی خوای گەورە قەبارەیەکی گەورەی بێ ئەندازەی هەیە لەبەردەم عەرشی(رب العالمین)دا. خوای گەورە دەربارەی فەرموویەتی: ﴿وَسِعَ كُرْسِيُّهُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ﴾(البقرة:٢٥٥).

واتە: (فەرمانڕوایی و دەسەڵات و زانینی ئەو زاتە هەموو ئاسمانەکان و زەوی گرتۆتەوە). کاتێك کارەکە بەم شێوەیە بێت ، ئیتر بۆچی قەومی (سەبەء) خۆریان پەرست کە وەك گەردێکە لەچاو ئەم بونەوە فراوانەدا؟.

بۆچی لەباتی خوا پەرستویانە لەگەڵ ئەوەی کە خۆر شتێکی بچووك و کەم و وون بووە لە بوونەوەردا لە چاو ئەستێرە وهەسارەکانی تردا؟

## بەسەرکردنەوەی بەردەست و سەربازان و ئاگادار بوون لەحاڵیان وهەواڵ پرسینیان

لە هەڵوێستی سولەیمان (علیه السلام) لەگەڵ بەردەستەکانی و بەسەرکردنەوەیان و هەواڵ پرسین لە حاڵ و کاریان و هەواڵ پرسین و داواکردنی پەپوسولەیمانەکە، کە دیارنەبوو، لەمانەدا وانەو پەندی گرنگ و گەورە هەن بۆ کاربەدەستان کە بەردەستەکانیان بە سەر بکەنەوە و هەواڵیان بزانن. لە سەردەمی (عمری کوڕی خطاب) (خوا لێی ڕازی بێت) جارێکیان لە گەڕانێکیدا چەند شوێنێکی بەسەر دەکردەوە لە پڕ

ێی لە دەنگی ئافرەتێك بوو چەند دێڕە شیعرێکی دەوتەوە، ئینجا عمر (خوای لێ ڕازی ێت) نزیك بوویەوە لە دەنگەکە، دەیوت:

تطاول هذا الليل واسود جانبه وآلمني الا حبيب الاعبه
فوالله لولا الله لا شيء غيره لزلزل من هذا السرير جانبه
مخافة ربي والحياء يردني واكرم بعلي أن تنال مراكبه.

لەمەوە عمر (خوای لێی ڕازی بێت) ئیتر زانی کە مێردی ئەو ژنە لە ماڵ نییە، چوو بۆ لای کەس و کارەکەی و پرسیاری لێ کردن: ئایا ئافرەت تا چەندێك دەتوانێت ئارام بگرێت لەسەر مێردەکەی وتیان: تا چوار مانگ، ئەویش وەك ڕاستی لەم ئایەتەی خوای گەورەدا: ﴿لِّلَّذِينَ يُؤْلُونَ مِن نِّسَائِهِمْ تَرَبُّصُ أَرْبَعَةِ أَشْهُرٍ فَإِن فَاءُوا فَإِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ (٢٢٦) وَإِنْ عَزَمُوا الطَّلَاقَ فَإِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾(البقرة:٢٢٦-٢٢٧).

واتە: (بۆ ئەوانەی کە سوێند دەخۆن نزیکی هاوسەریان نەکەون، بۆیان هەیە تا چوار مانگ چاوەڕوانی بکەن (دەبێت لەو ماوەیەدا بڕیاری یەکجاری بدەن)، خۆ ئەگەر ئاشت بوونەوەو، ڕێك کەوتن، ئەوە خوا لێخۆشبوو میهرەبانە، خۆ ئەگەر سووربوون لەسەر تەڵاق دانیان، ئەوە بەڕاستی خوا بیسەری (بڕیاریانە) و زانایە بە(نیەتیان).) ئیتر ئیمامی عمر (خوای لێ ڕازی بێت) بڕیاریدا کە نابێت پیاوان زیاتر لە چوار مانگ لە خێزانەکانیان دوابکەون.

ئەرك و واجبی موسڵمان ئەوەیە کە برای موسڵمان خۆی بەسەر بکاتەوە حاڵی بزانێت بۆ ئەمەیش (عطاء) دەڵێت:دوای سێ شت براکانتان بەسەر بکەنەوە:

ئەگەر نەخۆش بوون سەردانیان بکەن و ئەگەر سەرقاڵ بوون هاوکارییان بکەن و یارمەتیان بدەن، ئەگەر بیریان چوویەوە،یادیان بخەنەوە.

**باسی سێیەم:**

**ڕونکردنەوەیەك دەربارەی تەفسیری ئایەتی:** ﴿وَلَقَدْ فَتَنَّا سُلَيْمَانَ وَأَلْقَيْنَا عَلَى كُرْسِيِّهِ جَسَدًا ثُمَّ أَنَابَ﴾(ص:٣٤).

لە هەندێك لە تەفسیرەکاندا هاتووە، کە سلیمان (علیه السلام) ڕۆژێکیان ڕۆیشت خۆی بشوات، مستیلەکەی دایە دەست یەکێك لە خێزانەکانی کە پێی دەوترا (جرادة)، ئینجا شەیتان لەسەر شێوەی سولەیمان هات و پێی وت: مستیلەکەم بدەرێ، ئەویش دای پێی، کاتێك کردیە دەستی، جنۆکە و ئینسان و شەیتانەکان لێی نزیك بوونەوە، ئینجا کاتێك سولەیمان لە شوێنی خۆشۆردنەکە هاتە دەرەوە بە ژنەکەی وت: مستیلەکەم بدەرێ وتی: بێگومان من مستیلەکەم دابە سولەیمان، وتی: من سلیمانم! وتی:درۆت کرد،تۆ سولەیمان نیت، کەس نایەت پێی بڵێت: من سلیمانم مەگەر بەدرۆی خستۆتەوە و گاڵتەی پێ کرددوە، هەتا منداڵان کۆبوونەتەوەو بەرد بارانیان کردووە، کاتێك ئەوەی بینی، زانی کە ئەوە لە فەرمانی خواوەیە، و شەیتان هەستا لەنێوان خەڵکیدا بریار بدات، کاتێك خوای گەورە ویستی دەسەڵات بگێرێتەوە بۆ سلیمان، خوای گەورە ئەوەی خستە دڵی خەڵکی یەوە، کە ئینکاری ئەو شەیتانە بکەن، ئینجا ناردیان بەدوای ژنەکانی سولەیمان (علیه السلام) دا،پێیان وتن: ئایا شتێك هەیە دەربارەی سلیمان؟ وتیان بەڵێ، بێگومان ئەو دێتە لامان و سەرجێگەییمان لەگەڵ دەکات و ئێمە لە عادەی مانگانەداین، بەڵام پێش ئەوە نایەتە لامان ! کاتێك شەیتان بۆی دەرکەوت کە بیری خستەوە و کارەکەی ئاشکرا دەبێت، ئینجا بە مستیلەکەوە ناردی بۆلای دەریایەك و فرێی دایە ناوی ئینجا ماسییەك گرتیەوە و قوتی دا، و سلیمان (علیه السلام) لەسەر کەناری دەریاکە کاری دەکرد بەکرێ، ئینجا پیاوێك هات ماسی کڕی، ئەو ماسییەی تیابوو کە مستیلەکە لەناو سکیدا بوو، ئینجا سەلەیمان (علیه السلام) بانگی کردو پێی ووت: ئەو ماسییەم بۆ هەڵگرە، پاشان بۆی دەرچوو بۆ ماڵیان، کاتێك پیاوەکە گەیشتە لای دەرگاکەی ماڵیان، ئەو ماسییەی دا بە سولەیمان (علیه السلام) وەری گرت و سکی هەڵدری، مستیلەکە لە بۆشایی سکیدا بوو دەری هێناو کردیەوە دەستی، کاتێك کردیە دەستی، ئینسان و پەری و شەیتانەکان لێی نزیك بوونەوە،و گەڕایەوە سەر حاڵی خۆی ئینجا شەیتان ڕای کرد و هەڵهات تا گەیشتە دورگەیەکی دەریاکە، ئینجا سولەیمان

یە السلام) ناردی دەستگیر بکرێت، ئینجا هێنرا بۆ لای و پاشان کۆڵەکەیەکیان ...ۆرکرد و هەڵکەند و شەیتانیان خستە ناوی و دواتر بە چاکی دایان خست بە مس و فڕێیان دایە ناو دەریاکەوە).[٣٠٧]

لە هەندێك لە ڕیوایەتەکاندا هاتووە کە شەیتان دەسەڵاتی نەبووە بەسەر خێزانەکانی سولەیماندا (علیه السلام) چونکە خوای گەورە پاراستوونی و شەیتان نزیکیان نەکەوتووە.[٣٠٨]

ئەم گێڕانەوانە کەم و کوڕ و ناچونیەکن، بنەمایان نییە لە ڕوانگەی ڕاستیەوە، ئیتر چۆن شەیتان خۆی دەخاتە سەر شێوەی سولەیمان(علیه السلام)و مەبەستەکانی خۆی جێ بەجێ دەکات. ئایا پاشایەتی و پێغەمبەرایەتی و دەسەلاْت و هێزەکەی سولەیمان (علیه السلام) لە مستیلەکەیدابووە؟

زانا (قاضی عیاض) دەڵێت: (ئەوە ڕاست نییە کە هەواڵ گێڕەوەکان نەقڵی دەکەن و دەیهێنن کە شەیتان خۆی خستبێتە سەر شێوەی سولەیمان (علیه السلام) و دەست بگرێت بەسەر موڵکەکەیدا و کاری پێوە بکات لەناو ئوممەتەکەیدا بەزۆر، چونکە شەیتان دەسەڵاتی بەسەر ئەوجۆرە کەسانەدا نییە و پێغەمبەران لەوە پارێزراون.[٣٠٩]

(الدکتور أبو شهبة) دەڵێت: ئەم گێڕانەوانە هەمووی درۆ و هەڵبەستروە، هەندێکیان لە هەندێکیان دوورترن و، هەندێك کەس بەوە توشهاتوون و تێوە گلاون کە باسی دەسەڵاتگرتنی شەیتان بەسەر سولەیماندا بکەن و خێزانەکانی تێوە بگلێنن، هەتا ئەگەر هەندێك کەس ئەم درۆو هەڵبەستراوانەیان بە ڕاست زانیبێت و قبوڵیان کرد بێت، بێگومان هەندێك کەسیش هەن کە ڕەتیان کردۆتەوە و ئینکارییان کرد و ئەو کەسانەی ئەمەیان کردووە بە قسەی کەسانێکی ساویلکە و سادەیان داناوە، و ئەو کەسانەی ئەمەیان کردووە بێئاگا بوون لە ڕاستییەکان، ئەمە تاوانێکی ڕوون و ئاشکرایە.

هەروەها دەڵێت: ڕاستییەکەی ئەوەیە کە چیرۆکەکە بە شێوازێکی شاش و ناچوون یەك داڕێژراوە، شێوازی دروستکردنی پێوە دیارە و عەقلی ساغ و بەڵگە ڕاستەکان ڕەتی دەکەنەوە، ئەگەر ڕێگە پێدراو بوایە شەیتان خۆی بخاتە سەر شێوەی سولەیمان

[٣٠٧] _ الاسرائیلیات والموضوعات کتب ص\٢٧٠ التفسیر لأبی شبهة -٢٧١ بە کەمێك دەستکارییەوە.

[٣٠٨] -الدر المنثور ٥\٣٠٩-٣١١.

[٣٠٩] - الشفاء ٢-١٦٢.

پێغەمبەر (علیە السلام) ئیتر چ متمانەیەك بە شەریعەت دەما لە دوای ئەوە؟ و چۆن خوای گەورە شەیتان زاڵ دەكات بەسەر خێزانەكانی سولەیمان (علیە السلام)دا، كە ئەو بەرێزترە لای خوای گەورە تا شەیتان؟ و چ پاشایەك و چ پێغەمبەریك كار و فەرمانی خۆی دەخاتە سەر مستیلەیەك و لە سەر ئەوی ڕادەگرێت كە لەگەڵ بوونی خۆی بەردەوام دەبێت و بەنەمانی خۆی لەناو بچێت، لە مێژووی مرۆڤایەتیدا شتێكمان لەو جۆرە نەبینیوە.

ئەگەر مستیلەكەی سولەیمان (علیە السلام) لەو پلە و ئاستەدا بێت، ئیتر چۆن خوای گەورە بێ ئاگا دەبێت لەسەر كارەكانی لە كتێبە بە نرخەكەدا كە شایەتە بەسەر كتێبە پێشووەكاندا؟ وچۆن خێزانەكەی سولەیمان (جرادة) ئینكاری سلیمان دەكات، كە ئەو لە هەموو كەس زیاتر سولەیمان (علیە السلام) دەناسێت؟

ڕاستی ئەوەیە كە داڕشتنی چیرۆكەكە شاش و واشە و لەبەردەم ڕەخنە گرتن دا خۆ ڕاگرنابێت و شوێنەواری درۆ و هەڵبەستن و دروست كراوی پێوە دیارە.[٣١٠]

لەو لایەنە سەیرانە ی كە لە تەفسیرەكاندا دەربارەی ئایەتی: ﴿وَلَقَدْ فَتَنَّا سُلَيْمَانَ﴾ هاتووە، ئیمامی (الرازی) هێناویەتی دەڵێت: بێگومان سولەیمان (علیە السلام) تووشی نەخۆشییەكی قورس هات و تاقیكرایەوە، زۆر لاوازی كرد، هەتا بەهۆی توندی نەخۆشییەكەیەوە وەك جەستەیەكی بێ ڕۆحی لێ هات، پاشان گەڕایەوە بۆ حاڵەتی تەندروستی ئاسایی خۆی.[٣١١]

ئەم شێوازەش بەڵگەی یەكلایی كەرەوەی لەسەر نییە و لەگەڵ تێگەیشتن لەدەقە قورئانی یەكاندا ناگونجێت.

تەفسیری ڕاست و تەواو ودروست بۆ ئایەتی: ﴿وَلَقَدْ فَتَنَّا سُلَيْمَانَ﴾ بریتییە لە:

ڕاستی لە تەفسیری ئەم دوو ئایەتەدا: ئەو فەرموودەیەیە كە لە هەردوو كتێبە (صحیح)ەكەدا (مسلم و بوخاری) هێناویانە لە (بوخاری)دا لە (ابوهریرة)ەوە (خوا لێی ڕازی بێت) لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرموویەتی: (سولەیمانی كوڕی داود) (علیە السلام) وتی: سوێند بێت دەبێت ئەمشەو بەسەر حەفتا خێزانەكەمدا بسوڕێمەوە

---

[٣١٠] - الأسرائيليات والموضوعات في كتب التفسير ص:٢٧٣-٢٧٤.

[٣١١] - مفاتيح الغيب للرازي:٢٦-٢٠٩.

(سەرجێگەیی یان لەگەڵ بکەم) هەریەکەیان بە سوارچاك و ئازایەك سکی پڕ ببێت و لە پێناوی خوای گەورەدا بجەنگێت و جیهاد بکات، ئینجا هاوەڵەکەی پێی وت: بڵێ: (إن شأء الله) بەڵام نەیوت یان لە بیری چوو، خێزانەکانی سکیان نەکرد تەنها یەکێکیان نەبێت، ناتەواو و لەتە منداڵێك بوو، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئەگەر سولەیمان (علیه السلام) بیوتایە: (إن شأء الله) ئەوا گشتیان دەبوون و لە ڕێگەی خوادا دەجەنگان.[٣١٢]

[٣١٢] - رواه البخاري في صحيحه واللفظ له عن أبي هريرة كتاب الأنبياء

## بەشی نۆیەم

## ووتەو باسی قورئان دەربارەی مەریەم ( علیها السلام )

**پێشەکی و دەستپێك:**

چیرۆکی مەریەم (علیها السلام) لە زۆر سوورەت و بۆنە و موناسەبەدا هاتووە دووبارە بۆتەوە، لەوانە:

*لە سوورەتی (آل عمران)دا، لەگەڵ باسی عیسادا (علیه السلام) باسی ئەویش هاتووە، ڕونکراوەتەوە کە عیسا (علیه السلام) ئادەمیزاد و پێغەمبەرە و خوای گەورە بەقودرەت و ویستی خۆی بە بێ باوك هێناویەتییە دنیاوە، وەك چۆن ئادەمی بەبێ (دایك وباوك) دروست کرد، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ مَثَلَ عِيسَىٰ عِندَ اللَّهِ كَمَثَلِ آدَمَ خَلَقَهُ مِن تُرَابٍ ثُمَّ قَالَ لَهُ كُن فَيَكُونُ﴾ (آل عمران:٥٩).

* عیسا (علیه السلام) لقێکی پاك و خاوێنە لە درەختێکی پاك و خاوێن و موبارەك و بەرەکەتدار، کە دایکی (مەریەم) (علیها السلام) باشترین ئافرەتی جیهان بووە، خوای گەورە هەڵی بژاردووە و پاك ڕایگرتووە و جیای کردۆتەوەو نازو نیعمەتی زۆری پێداوە،و بە شێوازێکی دیارو ئاشکرا ڕێزی لێ گرتووە و دایکی مەریەمیش ئافرەتێکی چاك و ڕاستگۆ بووە، و بە وەفاو لەخوا ترس بووە، سکەکەی خۆی نەزر کرد بۆ خوای گەورە تا ئازاد و خزمەتکاربێت، و خوای گەورەیش نەزرەکەی لێ قبووڵ کرد. باوکیشی عمران بوو، پێشەوا و خواناسی و زانا و دنیا نەویست و خاوەنی پلە و پایە و ناو و شۆرەتی بەرز و بڵند بوو، و جێگەی لەناو دڵی خەڵکیدا داگیرکردبوو، و دیاربوو، وتێکەڵی بەندە خواناس و دڵسۆزەکان بوو کە پێشبرکێ و منافەسەی یەکتریان دەکرد لەسەر کەفالەت کردنی مەریەم، تا لە خوای گەورە نزیك ببنەوە و وەفا و خواناسی و چاکە بنوێنن لای مامۆستا و پێشەواکەیان کە عمران (علیه السلام) بوو، مرد بەڵام بەبێ ئەوەی چاوەکانی جوان و درەوشاوە و شاد ببێت بە بینینی کچەکەی. هەروەها

سوورەتەکەیش بەناوی ئەو پیاوە بەڕێزەوە ناونرا (آل عمران) ئەوەش لەبەر پاکی بن و بنەچە و ڕەگەزی و لەبەرخاتری منداڵە چاکەکارو پاکەکانی.

هەروەها بەشێك و لایەنێکی تر لە ژیانی (مەریەم) (علیها السلام) لە سوورەتی (مریم)دا هاتووە کە هەرناوی خۆی هەڵگرتووە، وەك ڕێزو شکۆ داری بۆی، کە باسی هاتنی (جبریل) (علیه السلام) دەکات بۆلای مەریەم لە شێوەی ئادەمیزاد دا، کەکاتێك ئەو لەکاتی بێدەنگی و تەنهاییدا بوو بۆ کاری خواپەرستی تایبەتی خۆی.ئینجا پەنای گرت بە خوای گەورە لێی، ئینجا (جبریل)یش هەواڵی کار و هاتنەکەی خۆی پێ وت، کە خوای گەورە ڕایسپاردبوو، و ئەویش لەو پێناوەدا هاتبوو، زۆر سەری سوڕما لەو مژدەیە و وەڵامی (جبریل)یش لەسەر تێگەشتنی مەریەم لەسەر شێوەی (تعجب) سەر سوڕمان بوو.فوویەکی کرد بە مەریەمداو سکی بە عیسا (علیه السلام) پڕبوو، و ماوەی سکپڕی و کاتی لەدایك بوون و ئازاری منداڵ بوونەکەی، کاتێکی قورس و ناڕەحەت و گران بوو کە مەریەمی پێدا تێپەڕ بوو، و ئاواتی خواست کە بمرێت لەتاو ناڕەحەتی ئەو کاتەی کە پێیدا تێپەربوو، و لە دایکبوونی عیسا (علیه السلام) و لەگەڵ ئەوەی کە هاوەڵی ئەوە بوو لە ڕەحم و بەزەیی و دەروکردنەوەی خوایی و بەدەمەوە هاتن و هاتنەوەی مەریەم بۆ ناو قەومەکەی و کوڕەیەکی بەباوەشەوەیە، و هەڵوێستی قەومەکە بەرامبەر ئەم کارە، ئینجا لەم کاتەدا کە عیسا(علیه السلام) لەناو بێشکەدا دانرا،دەستی کرد بە قسەکردن.

هەروەها لە سوورەتی (الأنبیاء)دا باسی هاتووە لەگەڵ عیسای کوڕیدا کە پێغەمبەری خوایە، ئەویش لەناو باسی نازو نیعمەتی خوایی و ڕەحمەت و بەزەیی بە پێغەمبەرانی و ئەو کەسانەی کە خۆی هەڵی بژاردوون.خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ وَالَّتِي أَحْصَنَتْ فَرْجَهَا فَنَفَخْنَا فِيهَا مِن رُّوحِنَا وَجَعَلْنَاهَا وَابْنَهَا آيَةً لِّلْعَالَمِينَ﴾ (الأنبیاء:٩١).

خاوەنی (فی ظلال) دەڵێت: (لەم ئایەتەدا باسی ناوی مەریەم نەکراوە، چونکە مەبەست لە زنجیرەی پێغەمبەرانە، و عیساش (علیه السلام) کوڕی مەریەم بووە. وەك بەدواداهاتن و شوێن کەوتنی ناوی ئەو باسی هاتووە، بەڵکو باسی سیفەت و ڕەوشتی کراوە کە

پەیوەندیدارە بە لەدایك بوونی کۆرپەکەیەوە: ﴿والَّتِي أَحْصَنَتْ فَرْجَهَا﴾ واتە: داوێنی خۆی پاك ڕاگرت و پاراستی لەهەموو جۆرە (مباشرة)یەك، ووشەی (الاحصان) هەمیشە بەکاردێت بۆ ناونان لە (الزواج) شوکردن و ژنهێنان، بە دوای یەکدان، چونکە کاری (الزواج) قەڵاو پارێزەرە بۆ کەوتنە ناو (فاحشة) و خراپەو داوێن پیسی. بەڵام لێرەدا لەمانایەکی جوان و ڕەسەندا باسدەکرێت، کە بریتییە لە پاراستن و پاك ڕاگرتنی بنەڕەتی لە هەموو جۆرە (مباشرة)یەك واتە – زواج– یان ناشەرعی، وەك – فاحشە – بەڕاستی ئەمەیش بۆ پاکڕاگرتنی مەریەمە لە هەموو تۆمەتێك و هەموو وتەیەك کە ڕووبەڕووی دەکرێتەوە لە لایەنی جولەکەکانەوە.[٣١٣]

هەروەها لە سوورەتی (المؤمنون)یشدا باسی خۆی و عیسای کوڕی (علیهما السلام) هاتووە، ئەویش لەناو باسکردنی ڕەحمەت و بەزەیی خوا بە پێغەمبەرانی و گرنگی دانی پێیان و پاراستی بۆیان. خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ وَجَعَلْنَا ابْنَ مَرْيَمَ وَأُمَّهُ آيَةً وَآوَيْنَاهُمَا إِلَى رَبْوَةٍ ذَاتِ قَرَارٍ وَمَعِينٍ﴾ (المؤمنون:٥٠).

هەروەها باسیشی لە سوورەتی (التحریم)دا هاتووە، لەگەڵ باسی (اسیه ی کچی مزاحم) وەك نمونەیەکی پاك و چاك و جوان و ناوازە، شێوەیەکی پرشنگدار و درەوشاوە بۆ ئافرەتانی چاکەکار و ڕاستگۆ و باوەڕدار و دامەزراو و لە خواترس و پاك و خاوێن، پاش ئەوەی کە خوای گەورە نموونەی لە ئافرەتانی بێ باوەڕ هێنایەوە.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ ضَرَبَ اللَّهُ مَثَلًا لِلَّذِينَ كَفَرُوا امْرَأَتَ نُوحٍ وَامْرَأَتَ لُوطٍ كَانَتَا تَحْتَ عَبْدَيْنِ مِنْ عِبَادِنَا صَالِحَيْنِ فَخَانَتَاهُمَا فَلَمْ يُغْنِيَا عَنْهُمَا مِنَ اللَّهِ شَيْئًا وَقِيلَ ادْخُلَا النَّارَ مَعَ الدَّاخِلِينَ (١٠) وَضَرَبَ اللَّهُ مَثَلًا لِلَّذِينَ آمَنُوا امْرَأَتَ فِرْعَوْنَ إِذْ قَالَتْ رَبِّ ابْنِ لِي عِنْدَكَ بَيْتًا فِي الْجَنَّةِ وَنَجِّنِي مِنْ فِرْعَوْنَ وَعَمَلِهِ وَنَجِّنِي مِنَ

---

[٣١٣]– في ظلال القرآن ٤/٢٣٩٥.

الْقَوْمِ الظَّالِمِينَ (١١) وَمَرْيَمَ ابْنَتَ عِمْرَانَ الَّتِي أَحْصَنَتْ فَرْجَهَا فَنَفَخْنَا فِيهِ مِنْ رُوحِنَا وَصَدَّقَتْ بِكَلِمَاتِ رَبِّهَا وَكُتُبِهِ وَكَانَتْ مِنَ الْقَانِتِينَ﴾(التحريم:١٠-١٢).

**تێبینییەکی گرنگ: وەك تێروانین لەبەر ئەوەی کە ئەندازەیەکی زۆر لەچیرۆکی مەریەم (علیها السلام) لە سوورەتەکانی (آل عمران و مریم) داهاتووە، ئەم دوو سوورەتە دەکەینە تەوەرەی سەرەکی بۆ باسکردن لەم چیرۆکە.**

**باسی یەکەم:**
**نەسەبی پاکی:**

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِنَّ اللَّهَ اصْطَفَىٰ آدَمَ وَنُوحًا وَآلَ إِبْرَاهِيمَ وَآلَ عِمْرَانَ عَلَى الْعَالَمِينَ(٣٣) ذُرِّيَّةً بَعْضُهَا مِن بَعْضٍ وَاللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾ (آل عمران:٣٣-٣٤).

ئەم دوو ئایەتە پیرۆزە پێشەکی و دەست پێکن بۆ باسی چیرۆکی مەریەم (علیها السلام) و کوڕەکەی کە پێغەمبەری خوا عیسایە (علیه السلام)، ڕونکراوەتەوە کە ئادەمیزاد و پێغەمبەر بووە و خوای گەورە لە دایك بیێ باوك دروستی کردووە، وەك چۆن ئادەمی بەبێ دایك و باوك دروستکردووە.

لەمەدا وەڵامێکی چاك بۆ (نصاری) مەسیحی یەکان هەیە، کە درۆ و بوهتانیان ڕێکخستوە دەربارەی عیسا (علیه السلام) کە ووتویانە عیسا خوایە و کوڕی خوایە — پەنا بە خوا- ئەم دوو ئایەتە پیرۆزە، بەشێکن لەو ئایەتانەی کە بۆ وەڵامدانەوەی مەسیحییەکان دابەزیون. جارێکیان دەستەیەك لە پیاوانی (نصاری) مەسیحی نەجران، هاتن بۆ لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە شاری مەدینە، پێغەمبەریش(ﷺ) بە جوانی پێشوازی لێ کردن و ڕێزی لێ گرتن و گفتوگۆیەك لە نێوانیاندا ئەنجامدرا، پێغەمبەر (ﷺ) چەند نیشانەو بەڵگەیەکی ئاشکرای بۆ ڕوون کردنەوە و بەڵگەو قسەکانی ئەوانی پێ بەتاڵ کردەوە و ڕوونی کردەوە کە بیرو باوەڕی ئەوان خراپە، خوای گەورەیش بەو بۆنەیەوە سەرەتای سوورەتی (آل عمران)دابەزاند. ئیمامی بوخاری لە (صحیح)ەکەیدا ڕایوایەتی کردووە: (حوزەیفەی یەمانی)(خوا لێی ی ڕازی بێت) فەرمووی: عاقیب و سەیید کە هەریەکەیان لە ڕوویەکەوە دەمڕاستی وولاتی نەجران بوون،عاقیب ناوی (عبدالمسیح) بوو سەییدیش ناوی (ئەیهەم)بوو، هاتن بۆ خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) چونە ناو مزگەوتەوە، ڕوەو خۆرهەڵات نوێژی خۆیان کرد، دواتر ڕۆشتنەوە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) سلاویان لێ کرد، ئەویش وەڵامی سلاوەکەی دانەوە، بانگەوازی کردن بۆ ئیسلام بوون، ڕازی نەبوون کە ئیسلام بن،دوایی بووبە گفتوگۆ و دەمەقاڵی، پێغەمبەر (ﷺ) چەند ئایەتێکی بۆ خوێندنەوە، دوایی داوای لێ کردن کە موباهەلەیان لەگەڵدا بکات،

(موباهەلە) بریتییە لە: (هەردوولا داوا لە خوا بکەن و بڵێن: هەر کەس بە حەق ڕازی نابێت و لەم لا یەنەوە درۆ دەکات نەفرەت و لەعنەتی خوا لەوکەسە ستەمکارە بێت.).
ئەوانیش بەمە ڕازی بوون و ویستیان موباهەلە و مولاعەنە لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) بکەن، بەڵام دوایی یەکێکیان بەوی تریانی وت:نەکەیت شتی وابکەیت، سابەو خودایە ئەگەر ڕاست بێت ئەو پێغەمبەر بێت و موباهەلەی لەگەڵ بکەین، نەخۆمان و نە نەتەوە و وەچەمان لە پاش خۆمان قەت خەیر نایەتە ڕێمان و سەرکەوتوو نابێت، دوایی بە پێغەمبەریان وت:پێویست بە شەڕ و نەفرەت ناکات، دەمانەوێت بەئاشتی لەگەڵتدا ڕێك بکەوین، ئێمە موسوڵمان نابین، بەڵام سەرانەت دەدەینێ، چیمان لێ داوا بکەیت دەیدەین پێت، بۆ جێ بەجێ کردنی ئەم پەیمان و ڕێك کەوتنە، پیاوێکی دەست پاکی ئەمینمان لەگەڵدا بنێرە، توخوا نائەمینمان بۆ مەنێرە، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: (بۆ ئەم مەبەستە پیاوێکی زۆر ئەمین و نیاز پاکتان لەگەڵدا دەنێرم)،جا زۆر لە هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) هەریەکەیان لەلای خۆیەوە، خۆی بۆ ئەم پلە بەرزە دەست نیشان کرد، حەزی دەکرد کە ئەو کەسە ئەمینە خۆی بێت.
پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی:ئەی (ابوعبیدەی کوری جراح) هەستە. کە(ابوعبیدە) هەڵسا،پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (ئەمە ئەمینداری ئەم ئوممەتەی ئێمەیە!) و ئەوی نارد لەگەڵیاندا، لە ڕیوایەتێکدا هاتووە: (هەموو ئوممەتێك ئەمیندارێکی هەیە، ئەمینداری ئێمەیش کە ئوممەتی ئیسلامین، (ابوعبیدەی کوری جەڕاحە).[٣١٤]
بەئاشکرا وا دەرکەوت: کاتێك ئەوان ئینکاری بەڵگە ڕوون و ئاشکرانانیان کرد، کە پێغەمبەر (ﷺ) بۆی ڕوون کردنەوە، ئینجا ئایەتی موباهەلە دابەزی، هەندێکیان مەبەستیان ئەوە بوو کە موباهەلە بکەن، بەلام ئەوان ڕاستی موباهەلەکەیان نەدەزانی، ئەنجامەکەیشی سەرشۆڕی و شەرمەزاری دەبێت لەسەر درۆکردن، ئینجا (عاقیب) پێی ووتن، ئەی کۆمەڵی (نصاری) بێگومان ئێوە زانیتان کە محمد پێغەمبەرێکی نێردراوە، و بەڕاستی بە وتەیەکی جیاکەرەوەوە هاتووە بۆ ناوتان لە هەواڵی هاوەڵەکەتان و بە ڕاستی ئێوە زانیوتانە کە هیچ قەومێك نەبوو کە نەفرەت لە پێغەمیەرێك بکات گەورەکانیان ماونەتەوەو بچوکیان لێ نەبووە، بێگومان ئەگەر ئێوە ئەو کارە بکەن ئەوە دەبێتە لە ڕەگ دەرکێشانتان، ئەگەر ئێوە ڕەتتان کردوتەوە بێجگە لە خۆگریتان بە دینەکەتانەوەو مانەوەتان لەسەرئەو قسانەی خۆتان کە لەسەری بوون لە هاوەڵەکەتاندا،

---

[٣١٤] –رواه البخاري في صحيحه عن حذيفة |كتاب المغازي ، باب:قصة اهل نجران.

ئەوا بەڵێن و پەیمان بدەن بەو پیاوە و بگەڕێنەوە بۆ وڵاتی خۆتان، ئینجا هاتنە لای پێغەمبەر (ﷺ) و وتیان: ئەی (أبا القاسم) ئێمە وامان بۆ دەرکەوت کە نەفرەتت لێ نەکەین و واز لە تۆ بێنن لەسەر دینی خۆت و ئێمەیش بگەڕێینەوە سەر دینی خۆمان، بەڵام پیاوێك لەگەڵماندا بنێرە لە هاوەڵانی خۆت، کە خۆت پێی ڕازی بیت بۆمان، بڕیار لە نێوانماندا بدات لەو شتانەدا کە جیاوازیمان تیایدا هەیە لە ماڵ و سامانماندا، ئێمە ڕازین بە تۆ، ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) (أبا عبیده ی الجراح)ی لەگەڵ ناردن، کەسێکی بەهێز و ئەمین بوو.[٣١٥]

بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە چیرۆکی مەریەم (علیها السلام) لە ناو باسی چیرۆکی عیسادا (علیه السلام) هاتووە، و ڕونکراوەتەوە کە ئادەمیزاد و پێغمبەرە، خوای گەورە گرنویەتی بە نیشانەیەکی سەیرو جوان و ناوازە. کەبەڵگەیە لەسەر قودرەت و دەسەڵاتی ڕەهاو بێسنوری خوای گەورە،لە هەموو ئەمانەیشدا وەڵامی تیایە بۆ گومڕایی یەکاتی (نصاری) و زیادەڕەویان لە کار و بارەکانی (المسیح)دا و بێگومان پێغەمبەر (ﷺ) لەسە ڕێنمایی و بەرچاو ڕونی بووە، و وەفدەکەی (نصاری)بە دڵنیایی زانیان کە موباهەلەکە بەنیسبەت ئەوانەوە واتە لەناو چوون و سزا...

* خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿إن الله أصطفى﴾ ووشەی ﴿أصطفى﴾ واتە: هەڵی بژارد و جیای کردەوە. پێغەمبەران (علیهم السلام) هەڵبژێردراو و پوختەی خەڵکین. خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَإِنَّهُمْ عِندَنَا لَمِنَ الْمُصْطَفَيْنَ الْأَخْيَارِ﴾(ص:٤٧).

واتە (بەڕاستی ئەوانە لای ئێمە لەو کەسانەن کە هەڵمان بژاردون و پەسەندمان کردوون).

* **هەڵبژاردنی پێغەمبەرانیش (علیهم السلام) لە دوو ڕووەوە دەبێت:**

یەکەم: پاڵفتە و خاوێن بکرێنەوە تابنە کەسانێکی شیاو و ئامادەکراو بۆ پلەی پێغەمبەرایەتی کە بەتوانا بن لەسەر هەڵگرتنی بەرنامەکە و گەیاندنی.

دووەم:هەڵبژاردنەکە:هەڵبژاردن و جیاکردنەوەیە، کە خوای گەورە هەڵی بژاردوون بۆ هەڵگرتنی پەیامەکە و گەیاندنی بانگەوازەکە، لێرەدا هەڵبژاردنەکە فەزڵ و نیعمەت و هیدایەت و ڕەحمەت و تەوفیق و پاراستنی خوایی یە بۆ بەندەکانی: ﴿ءَادَمَ وَنُوحًا وَآلَ

---

[٣١٥] تفسیر القران العظیم لأبن کثیر ١|٣٦٨-٣٦٩ و اسباب النزول للواحدي ص|٦٧-٦٨ وسیرة ابن هشام ٢|١٦٥.

إبراهيم وآل عمران على العالمين﴾. خوای گەورە هەڵی بژاردوون و پاکی کردونەتەوەو جیای کردوونەتەوە و تایبەتمەندی پێ بەخشیون و پلەی بەرزی بە هەموویان داوە، و تایبەتمەندی کردوون بە پلە و مەقامی بەرز.

هەڵبژاردنی ئادەم (علیه السلام) لەلایەن خواوە لەوەدا بووە کە خوا خۆی دروستی کردووە بەدەستی قودرەتی خۆی ڕۆحی کردوە بەبەردا و فریشتەکان سوجدەی ڕێزگرتنیان بۆ بردووە، و کردی بە بنەمای بەشەریەت و باوکی بەشەر و لەناو بەهەشتدا نیشتەجێ کرد، کاتێك کەوتە ناو سەرپێچی یەوە تەوبەی کرد و گەڕایەوە بۆ لای خوا، خوای گەورەیش تەوبەی لێ وەرگرت و هەڵی بژارد: ﴿ثُمَّ اجْتَبَاهُ رَبُّهُ فَتَابَ عَلَيْهِ وَهَدَىٰ﴾(طة:١٢٢).

لەسەر زەویدا نیشتەجێی کرد لەگەڵ منداڵ و نەوەکانیدا، هەروەها خوای گەورە، گەورەمان نوحیشی (علیه السلام) هەڵبژارد بە پێغەمبەرایەتی و هەڵگرتنی پەیامی خوایی، و ئیبراهیمشی (علیه السلام) هەڵبژارد و ڕێزیگرت بەپەیامی خوایی و لە ئاگری دنیایی ڕزگاری کرد و نەیهێشت بسوتێت ومنداڵ ونەوەی چاکەکاری پێ بەخشی (آل عمران)ی هەڵبژارد، کە لەنەوەو ئالی ئیبراهیم بوون، بەڵام تایبەتمەندکران بەباسی تایبەت پاش باسی گشتی، وەك ڕێز و شکۆداری، چونکە ئایەتەکانی دواتر دەچنە سەرباسی ئەوان بەدرێژی، هەندێك لەزانایانی تەفسیر وا باسیان کردوە کە (عمران) باوکی (موساو هارون) (علیه السلام) بووە، وئەم هەڵبژاردنەیش لێرەدا بۆ موساو هارون بووە پێغەمبەرایەتی و کیتاب و سەرخستن بەسەر فیرعەون و سەربازەکانی دا. بەڵام ڕاستییەکە ئەوەیە کە (عمران)ی باس کراو لێرەدا باوکی مەریەمە (علیها السلام) چونکە ئایەتەکان بەڵگە لەسەر ئەوە دەدەن، کەلە ڕەچەڵەکی داودە و ڕەچەڵەکی دەگەڕێتەوە سەر ئیبراهیم (علیه السلام).[٣١٦]

زانا (إبن كثير) دەڵێت: عیمران پیاو چاکێك بووە، خێزانێکی چاکە کاریشی هەبووە و پاك وخاوێن وچاك و لەخوا ترس و وەفادارو گوێ ڕایەڵ بووە بۆ مێردەکەیی و گوێڕایەڵ بووە بۆ فەرمانی پەروەردگاری، هەروەها لە بەرهەمی ئەم زەواجە موبارەکە، خوای گەورە ڕێزی لێ گرتن بەوەی کە مەریەم (علیها السلام)ی پێ بەخشین.

---

[٣١٦] -جامع البيان للطبري ٦|٣٢٨.

هەروەها (إبن کثیر) دەڵێت: (خوای گەورە هەواڵ دەدات کە بێگومان ئەم خانەوادەی هەڵبژاردووە بەسەر هەموو خەڵکی سەر زەوی دا).[٣١٧]

خاوەنی (محاسن التأویل) دەڵێت: ﴿علی العالمین﴾، واتە: خوای گەورە هەڵیبژارد بەسەر (عالم) جیهانی کاتی خۆیاندا،واتە هەریەکەیانی هەڵبژارد بەسەر جیهانی کات و زەمانی خۆیاندا.[٣١٨]

ئێمەیش دەڵێین:بێگومان خوای گەورە پێغەمبەرانی بەسەر هەموو دروست کراوەکاندا هەڵبژاردووە، و هەر پێغەمبەرێکی بەسەر جیهانی کاتی خۆیدا هەڵبژاردووە و هەندێکی لە پێغەمبەران بەسەر هەندێکی تریاندا ڕێزدار و پایەدارتر کردووە. وەك فەرموویەتی: ﴿تِلْكَ الرُّسُلُ فَضَّلْنَا بَعْضَهُمْ عَلَى بَعْضٍ﴾(البقرة:٢٥٣).

واتە: (ئەو پێغەمبەرانەی (باسکران) ڕێزی هەندێکیانمان داوە بەسەر هەندێکی تریاندا). و پێغەمبەری خوای (ﷺ) بەسەر هەموو دروسکراوەکان و سەرجەم ئادەمیزاد و هەموو پێغەمبەراندا (علیه السلام) هەڵبژاردووە، کە بەڕێزترین درەست کراوە و خۆشەویستی خوایە. و کۆتایی زنجیرەی پێغەمبەرانە و ڕەحمەت و بەزەیی و میهرەبانیشە بۆ گشت جیهان، و خاوەنی پلەو پایەی ستایشکراو و حەوزی کەوسەر و شەفاعەتی گەورەی ڕۆژی قیامەتە. خوای گەورە ڕاستی فەرمووە کاتێك بە پێغەمبەرە بەڕێزەکەی دەفەرموێت: ﴿وَأَنزَلَ اللَّهُ عَلَيْكَ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَعَلَّمَكَ مَا لَمْ تَكُن تَعْلَمُ وَكَانَ فَضْلُ اللَّهِ عَلَيْكَ عَظِيمًا﴾(النساء:١١٣).

واتە: (ئەی پێغەمبەر، خوای گەورە قورئان و دانایی بۆ دابەزاندویت و فێری ئەو شتانەی کردویت کە جاران نەتدەزانی، بەردەوامیش فەزڵ و ڕێزی خوا لەسەر تۆ(ئەی محمد (ﷺ) زۆر فراون و ئاشکرا و دیارە و(نایەڵێت تووشی هەڵە ببیت).

[٣١٧] –تفسیر القران العظیم لأبن کثیر ١|٢٥٨.

٣١٨ –محاسن التأویل للقاسمي ٤|٨٥.

●لە قورئانی پیرۆزدا ئایەتی زۆری تر هەن کە باسی گەورەیی و پلەو پایەی پێغەمبەر (ﷺ) دەکەن.

● هەروەها فەرموودەی زۆر هەن کە پلە و پایەی پێغەمبەر و فەزڵی خوای گەورە بەسەریەوە ڕوون دەکەنەوە، خوای گەورە ڕێزداری کردووە، لەو فەرموودانە:

١- (جابیری کوڕی عبدالله) (خوای لێی ڕازی بێت) فەرمووی: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: داستان و نمونەی من و داستان و نمونەی پێغەمبەرانی پێش من، وەك داستان و نموونەی پیاوێك وایە،خانوویەك بنیات بنێت و دروست بکات لەهەموو لایەنێکەوە، زۆر بەجوانی دروستی بکات و، بیڕازێنێتەوە تەنها شوێنی تاقە یەك خشت نەبێت، کەلە گۆشەیەکدا چۆڵ بێت، دەستە دەستە خەڵك بەناویدا بسوڕێنەوەو بڵێن چەند جوانە!. خۆزگە ئەم خشتەیش دادەنرا و شوێنەکەی ئاوا چۆڵ نەدەبوو) فەرمووی:دەی من ئەو خشتەم و ئەو شوێنە چۆڵەم پێ پڕ کردۆتەوە، ئیتر لە پاش من پێغەمبەر نایەت).[٣١٩]

٢- ئیمامی (مسلم) لە (صحیح)ە کەیدا، لە (وائلة ی کوڕی الاسقع)ەوە گێڕاویەتی یەوە، وتی: گوێم لە پێغەمبەر (ﷺ) بوو، دەیفەرموو: (بێگومان خوای گەورە (کنانة)ی لە نەوەی ئیسماعیل هەڵبژارد، و قورەیشیشی لە (کنانة) هەڵبژارد، و لە قورەیشیش (بنی هاشم)ی هەڵبژارد، منیشی لەنەوەی (بنی هاشم) هەلبژارد.).[٣٢٠]

﴿ذُرِّيَّةً بَعْضُهَا مِن بَعْضٍ وَاللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾ ووشەی (ذریة) واتە نەوە و وەچە، لە (ذرا) وەرگیراوە، واتە خوای گەورە دروستی کردون و زۆری کردون، (عرب) بە جۆرێکی تریش مانایان کردووە وتویانە:واتە بڵاوی کردنەوەو جیای کردنەوە، وەك خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿فَأَصْبَحَ هَشِيمًا تَذْرُوهُ﴾ (الكهف:٤٥). واتە: (لەدوای ماوەیەکی کەم (هەموو ئەو ڕوەك و گژو گیایە) دەبێتە پوش و پەلاشێکی وورد و خاش، ڕەشەبا بەم لاو بەو لادا بڵاوی دەکاتەوە). هەروەها مەبەست بە (الذریة) واتە (الأبناء) منداڵ و نەوە، ئەمە بە تایبەت، هەروەها بە (الآباء) باوك و باپیرانیش دەوترێت، وەك لەم ئایەتەدا هاتووە ﴿وَآيَةٌ لَّهُمْ أَنَّا حَمَلْنَا ذُرِّيَّتَهُمْ فِي الْفُلْكِ الْمَشْحُونِ﴾(يس:٤١).

---

٣١٩ -رواه البخاري في صحيحه. كتاب المناقب باب خاتم النبيين.

٣٢٠ -رواه مسلم في صحيحه، كتاب الفضائل.

واتە: بەڵگەو نیشانەیەکی تر لە هێز و دەسەلأتمان بۆیان، ئەوەیە کە بەڕاستی ئێمە نەوەکانیانمان لە کەشتیەکەدا هەڵگرت (مەبەست کەشتی _نوح_ە، کە بە باپیرە گەورەی دووهەمی ئادەمیزاد دەدرێتە قەڵەم).

بەکارهێنانی ووشەکە لەباتی (الآباء) بۆ (مجاز)ە ئایەتی ﴿ذُرِّيَّةً بعضها مَن بعض﴾ واتە: لە پشتیوانی کردنی یەکتری و هاوکاری و دۆستایەتی و چاکەو خواناسیدا، وەك خوای گەورە دەربارەی باوەڕداران لە سوورەتی (التوبة)دا دەفەرموێت: ﴿وَالْمُؤْمِنُونَ وَالْمُؤْمِنَاتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ يَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَيُقِيمُونَ الصَّلَاةَ وَيُؤْتُونَ الزَّكَاةَ وَيُطِيعُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ أُولَٰئِكَ سَيَرْحَمُهُمُ اللَّهُ إِنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾ (التوبة:٧١).

واتە: (ئیمانداران لە پیاوان و لە ئافرەتان، هەندێکیان خۆشەویست و پشتگی رو هاوکاری یەکترن (کە ئەمەیش سیفەتیانە) فەرمان بە چاکە دەدەن و قەدەغە لە خراپە دەکەن و نوێژەکانیان بە چاکی ئەنجام دەدەن و زەکاتی ماڵیشیان دەبەخشن و گوێڕایەڵ و فەرمانبەرداری خوا و پێغەمبەرەکەی دەکەن، ئا ئەوانە لە ئایندەدا خوا ڕەحمیان پێ دەکات و سۆزی دەبێت بۆیان، بەڕاستی خوا باڵا دەست و دانایە). ﴿والله سميعٌ عليم﴾.

خوای گەورە ﴿سميع﴾ بیسەری قسەو وتەی بەندەکانیەتی ﴿عليم﴾ زانا و بە ئاگاو شارەزایە بە ویژدان و کردەوەکانیان، لە دروستکراوەکانی خۆی کەسانێك هەڵدەبژێرێت، کە دەزانێت بەردەوامی و دامەزراویان هەبێت لە وتەو کردارياندا، هەموو وتەيەك دەبيستێت و وەلأمی هەموو داوا و دوعايەکی خەير و چاکە دەداتەوە کە بە دڵسۆزی و تکای قبوڵ بوونەوە بکرێت، و بينايە بەماڵی بەندەکانی و ئاگادارە بەشاراوەی ناو دڵەکانيان.

لەم دوو ئایەتە پیرۆزەی پێشودا. وەلأمی بۆ (یهود و نصاری) جولەکە و مەسیحی یەکان تیایە. وای لێکدەدەنەوە کە کوڕو نەوەی خوا _پەنا بە خوا _ و خۆشە و یستی خوا و هەڵبژ ێردراوی ناو دروستکراوەکانی خوابن، لەگەڵ ئەوەی کە بیر و باوەڕیان خراپ و ئەخلأق و هەڵس و کەوتیان ناپەسەند و دوژمنایەتی هەق وڕاستی دەکەن و پێچەوانەی ئەوە کاردەکەن کە پێغەمبەران (عيله السلام) هێناويانە.

هەروەها ئەم دوو ئایەتەدا، ئاراستەکردن و ڕێنمایی تیایە بۆ واجب بوونی شوێنکەوتنی پێغەمبەران و پەیڕەوی کردنیان و ڕۆیشتن لە ڕێگە و ڕێبازیانەوە، و چاکەو سەرفرازی تیایە بۆیان.

**باسی دووەم:**

**لەگەڵ دایکی مەریەم (علیها السلام)دا:**

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِذْ قَالَتِ امْرَأَتُ عِمْرَانَ رَبِّ إِنِّي نَذَرْتُ لَكَ مَا فِي بَطْنِي مُحَرَّرًا فَتَقَبَّلْ مِنِّي إِنَّكَ أَنتَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ (٣٥) فَلَمَّا وَضَعَتْهَا قَالَتْ رَبِّ إِنِّي وَضَعْتُهَا أُنثَىٰ وَاللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا وَضَعَتْ وَلَيْسَ الذَّكَرُ كَالْأُنثَىٰ وَإِنِّي سَمَّيْتُهَا مَرْيَمَ وَإِنِّي أُعِيذُهَا بِكَ وَذُرِّيَّتَهَا مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ (٣٦) فَتَقَبَّلَهَا رَبُّهَا بِقَبُولٍ حَسَنٍ وَأَنبَتَهَا نَبَاتًا حَسَنًا﴾(ال عمران:٣٥-٣٧). **چیرۆکی مەریەم (علیها السلام) لەماڵێکی چاکدا دەست پێ دەکات، کە ماڵی (عمران) ی باوکیەتی، کە پێشەوا و لە خواترس و پاك بووە خوای گەورە بە هاوسەرێکی پاك و چاك ڕێزداری کردووە، لە بەرهەمی ئەم هاوسەرداریە پاك و چاکە، بەرهەم و نەوەیەکی پاك پەیدابو: کە (مریم) بوو، پەروەدەکراوی ماڵێکی پاك و پاك داوێن بوو.** ﴿إِذْ قَالَتِ امْرَأَتُ عِمْرَانَ رَبِّ إِنِّي نَذَرْتُ لَكَ مَا فِي بَطْنِي مُحَرَّرًا﴾ **خێزانی (عمران) (علیها السلام) زۆر لە خوای گەورە دەپاڕایەوە کە منداڵێکی نێرینەی پێ ببەخشێت، تا چاوەکانی پێ گەش و ڕووناك ببێتەوە، نەفس و دەروونی پێ ڕووناك ببێت، کاتێك سکەکەی کەوتە جوڵە کردن، ئەوەی لەناو سکیدا بوو بڕیاریدا نەزری بکات لەبەر خاتری خوا بۆ پەرستش و خزمەتی ماڵی پیرۆز. لە (مجاهد) ڕیوایەت کراوە (المحرر) واتە ئەوەی کە تەنها و تەنها بۆ خوا بێت و هیچی تێکەڵ نەبوو بێت لە کارو مەبەستی دنیایی و هیچ سەرقاڵی نەکات لەپەرستشی خوای گەورە).[٣٢١]**

﴿فَتَقَبَّلْ مِنِّي إِنَّكَ أَنتَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ﴾ **ئینجا خێزانی عمران داوای لە خوای گەورە کرد کە نەزرەکەی لێ وەربگرێت و قبوڵ بکات و نەزر کراوەکەیشی بەجوانی لێ قبوڵ بکات. ووشەی (التقبل) بریتییە لە وەگرتنی شتێك لەسەر شێوەیەك کە پاداشت بگەیەنێت، لەو**

---

[٣٢١] -الجامع لأحکام القرآن للقرطبي ٤|٦٦ بە دەستکارییەوە.

شتانە: وەرگرتنی هەدیە ودیاری. خوای گەورە یەش کارێك قبوڵ ناکات مەگەر پاك و دڵسۆزانە و لەبەر خاتری خوا ئەنجام بدرێت و بەپێی دەستور و شەریعەتە جوانەکەی خۆی بێت. خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِنَّمَا يَتَقَبَّلُ اللَّهُ مِنَ الْمُتَّقِينَ﴾(المائدة:٢٧).

واتە: (خوای گەورە تەنها لە پارێزکاران چاکە وەردەگرێت) لە ئایەتێکی تردا دە فەرموویت: ﴿إِلَيْهِ يَصْعَدُ الْكَلِمُ الطَّيِّبُ وَالْعَمَلُ الصَّالِحُ يَرْفَعُهُ﴾(الفاطر:١٠).

واتە:. (گوفتاری چاك و جوان و بەجێ بۆ لای ئەو زاتە بەرز دەبێتەوە، کار و کردەوەی چاکیش گوفتاری شیرین بەرز دەکاتەوە.). ﴿إِنَّكَ أَنتَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ﴾ خوای گەورە بیسەری هەموو وتە و قسەیەکە، دوعا چاك و دروستەکانیش وەڵام دەداتەوە و زانایە بە هەموو مەبەست و کارێك.

## • خێزانی عمران کچی دەبێت و ناو دەنرێت (مریم) و خوای گەورە خۆی و نەوەکانی لە شەیتان دەپارێزێت

خوای گەورە فەرمووی: ﴿فَلَمَّا وَضَعَتْهَا قَالَتْ رَبِّ إِنِّي وَضَعْتُهَا أُنثَىٰ وَاللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا وَضَعَتْ وَلَيْسَ الذَّكَرُ كَالْأُنثَىٰ وَإِنِّي سَمَّيْتُهَا مَرْيَمَ وَإِنِّي أُعِيذُهَا بِكَ وَذُرِّيَّتَهَا مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ﴾(ال عمران:٣٦).

﴿فَلَمَّا وَضَعَتْهَا قَالَتْ رَبِّ إِنِّي وَضَعْتُهَا أُنثَىٰ﴾. خوای گەورە وەڵامی دوعاکەی خێزانی عمرانی دایەوە، ئەو ئافرەتە خۆڕاگر و ئارامگر و ڕاستگۆیە بوو، کە ڕووی کردە پەروەردگاری و بە دوعای بە کوڵ و تکارکردن لێی دەپاڕایەوە کە کوڕێکی چاکە کاری پێ ببەخشێت، خوای گەورە وەڵامی دایەوە (داواکەی پێ بەخشی، ئینجا هەستی کرد کۆرپەیەك لەناو ڕەحمیدا دەجوڵێت، ئەو درەختە ڕوا، ئینجا دنیا لە چاوەکانیدا ڕووناکی دەدایەوە و ڕۆچوو بوو و مێردەکەشی لەوپەڕی کەیف و خۆشیدا بوو..).[٣٢٢]

کوڕان و نێرینە بینایی چاوان و بەرهەمی دڵانن و گەشانەوەی دەرونن و ڕێحانەی دڵ و جگەر گۆشەن. بەڵام خۆشیەکەی درێژەی نەخایەند و منداڵەکەیشی هێشتا تەواو نەهاتبوویە بەرهەم، عمرانی مێردی مرد، خۆشیەکەی گۆڕا بۆ خەفەت (ئاوات و خۆزگەی

[٣٢٢] -سیدات نساء العالمین، سیرتهن وفضائلهن للشیخ موسی الاسود.

ئەوەی دەخواست کە مێردەکەی بمایەتەوە، ناز و نیعمەتی بە جگەرگۆشەکەی بە سەردا بڕژێت و ببیبنێت، بەڵام بڕیاری خوایی بەجێ گەیشت و گەڕانەوەی نەبوو).[٣٢٣]

حوکم و بڕیاری خوای گەورە دواناکەوێت. بەڵام ژنەکەی عمران ئەم کارانەی بە ئارام گرتنێکی جوان و ئیمان و دڵنیایی پێشوازی کرد.

ڕۆژان تێپەرین و کاتی لە دایك بوونەکە هاتە پێش، ژنەکەی عمران منداڵەکەی بوو، بەڵام کچ بوو، کاتێك بەمەی زانی داوای لێبوردنی لە پەروەردگاری کرد، چونکە ئەو تکای وابوو کەلە دایك بووەکە نێرینە بێت، تا بیبەخشێت بە خوا و بە خزمەتی (بيت المقدس) ماڵی پیرۆز، وەك نەزری کردبوو، و ڕەگەزی مێینە بۆ ئەو کارە گەورە و گرنگە بەکارنایەت، وەك عادەتی ئەو سەردەمە وابوو، ژنەکەی عمران ڕووی کردە خوا و وتی: ﴿رَبِّ إِنِّي وَضَعْتُهَا أُنثَىٰ﴾.

واتە: (کاتێك منداڵەکەی بوو(بە دڵ شکاوی یەوە) وتی:پەروەردگارا، خۆمن کچم بوو).

زانا (إبن كثير) دەڵێت: (ئەوان لەو زەمان و کاتەدا کوڕیان نەزر دەکرد بۆ خزمەتی (بيت المقدس).[٣٢٤]

﴿وَاللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا وَضَعَتْ﴾. واتە: (بێگومان خوا خۆی چاك دەزانێت کەچی بووە.).

زانای تەفسیر (الرازي) دەربارەی ئەم ئایەتە دەڵێت: بەم جۆرەیش دەخوێندرێتەوە: (وَضَعْتِ) واتە وەك خوای گەورە بە مەریەم بڵێت: بێگومان تۆ نرخ و ڕێزی ئەم منداڵە پێ بەخشراوەت نازانێت، ئەوە خوای گەورە خۆی دەزانێت چییە و چۆن دەبێت بەڕاستی نیشانەی گەورە و سەیری تیایە.).[٣٢٥]

هەروەها دوو خوێندنەوەیشی بۆ کراوە، یەکەمیان کە گوایە لە تەواوکەری قسەکانی مەریەم بێت کە وتی،و داوای لێبوردنی لە پەروەردگاری کرد، لەبەرئەوەی نەیتوانی وەفا بە نەزرەکەی بکات، یان بۆیە وتی، تا دڵدانەوەی نەفسی خۆی پێ بکات، بۆ ڕونکردنەوی ئەوەی کە خوای گەورە لەو کارەدا حیکمەتی خۆی هەیە و خۆی دەزانێت، و خوا خۆی کار و باری دروستکراوەکانی ڕێك دەخات و بەرێوە دەبات، بە پێی توانا و

٣٢٣-قصص القران محمد احمد جاد المولى ورفاقه ص|٢٤٥ بە دەستکارییەوە.

٣٢٤ -قصص الانبياء لأبن كثير ص|٥٤٩.

٣٢٥ -مفاتيح الغيب للامام الرازي ٨|٢٦ بە دەستکارییەوە.

ویست و زانست و حیکمەتی خۆی. ڕەنگە ئەم مێینەیە لای خوای گەورە لە کوڕ (نێرینە) چاکتر بێت، چونکە ئەوەی کە پەروەردگار بە بەندەکانی خۆی دەکات، چاکترە لەوەی کە بەندەکە خۆی دەیەوێت وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَعَسَىٰ أَن تَكْرَهُوا شَيْئًا وَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ وَعَسَىٰ أَن تُحِبُّوا شَيْئًا وَهُوَ شَرٌّ لَّكُمْ وَاللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ﴾(البقرە:٢١٦).

واتە: (لەوانەیە شتێکتان لا ناخۆش بێت کەچی خەیر لەوەدا بێت، هەروەها لەوانەیە شتێکتان پێ خۆشبێت، کەچی شەڕ لەوەدا ببێت، بێگومان هەر خوا خۆی دەزانێت (خێرلە چیدایە) ئێوە نازانن). لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿وَمَا تَشَاءُونَ إِلَّا أَن يَشَاءَ اللَّهُ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمًا﴾(الانسان:٣٠).

واتە: (دڵنیابن ئێوە هیچ کارێکتان پێ ناکرێت و هیچتان پێ ئەنجام نادرێت، مەگەر خوا ویستی لەسەر بێت، بێگومان ئەو خوایە زانا و دانایە، دەزانێت کێ شایستەی هیدایەتە و دانایشە لە هیدایەتدانی بەندە چاکەکاندا.). بێگومان خوای گەورە بە ویستی خۆی کاری بەنەدکان جێ بەجێ دەکات، هیچ شتێك لە دەسەڵاتی خوای گەورەدا ڕوونادات مەگەر خۆی ویستبێتی، ویستی خۆی پەیوەندیدارە بە زانست و حیکمەت و غیرەت و توانا و بەزەیی و ڕەحمەتی خۆیەوە.

دەگونجێت خوێندنەوەکە بە جۆرێکی تریش ئاراستی بکرێت کە بێگومان دایکی مریەم زانستی کارەکەی دایەوە دەستی خوای گەورە و فەرمووی ﴿وَاللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا وَضَعَتْ﴾ چونکە کاتێك وتی﴿إِنِّي وَضَعْتُهَا أُنثَىٰ﴾ ترسا لەوەی کە گومانی وابێت، خوای گەورە تاقی بکاتەوە، بەو وتەو دەربڕینە گومانەکەی لەسەر خۆی لابرد).[٣٢٦]

چونکە وتەکەی: ﴿إِنِّي وَضَعْتُهَا أُنثَىٰ﴾. بۆ داوای لێ بووردن بوو، نەك بۆ ڕاگەیاندن و ئاشکراکردنی، هیچ شتێك لە خوای گەورە ناشاردرێتەوە بێگومان ئاڵۆزی و گرفت ڕووبەڕووی ئەم شێوازە خوێندنەوەیە بۆتەوە بەوەی کە ئەگەر هەواڵێك بێت لە دایکی

---

٣٢٦ -القصص القرآني عماد زهير حافظ.ص ٢٩٨-٢٩٩.

مەریەمەوە و لە تەواوی قسەکانی ئەو بێت، ئەوا لە پێشتر بوو بڵێت: (رب إني وَضَعْتُهَا أُنثَى،وانت َاعْلَمُ بِمَا وَضَعَتْ). بۆ وەڵامی ئەم گرفتە ئاڵۆزیەش، دەگونجێت ڕستەکە بەم شێوەیە بێت: ﴿وَاللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا وَضَعَتْ﴾ ئاوڕدانەوە لە قسەو دەربڕینەکەوە بۆ شێوازی نادیار، و ئاوڕدانەوەیش وێنەیەکی جوان و ناوازەیە لە وێنەکانی ڕەوابێژی و جوان دەربڕین.

دووەمیان: لەسەر خوێندنەوەی دووەم: (وَضَعْتِ) ئەوە ڕستەیەکی ڕەخنەیی یە، کە گەورەیی کاری لە دایکبووەکە دەگەیەنێت و ڕونکردنەوە بۆ پلەو پایەی بەرزی و ڕێزی زۆری کە گەورەی ئافرەتانی جیهانە، خوای گەورە هەڵی بژاردووە و پاك ڕایگرتووە و جیای کردۆتەوە و تایبەتی کردووەو نازو نیعمەتی بەسەردا ڕشتووە، و خۆی و کوڕەکەی کردووە بە نیشانەو بەڵگە بۆ هەموو جیهان. ڕستەکەیشی لە فەرموودە و دەربڕینی خوایە، نەك لە تەواوکەری قسەکانی خێزانی (عمران).

﴿وَلَيْسَ الذَّكَرُ كَالْأُنثَى﴾. واتە: ئەو منداڵە نێرینەی کە تۆ داوات دەکردو مەبەستت بوو، و نەزرت کرد وەك ئەوە نەبوو کە مێینەت بوو(کچت بوو)، ئەگەر نێرینە بووایە دەتتوانی وەفای نەزرەکەتی پێ بکەیت کە ببێتە خزمەتکاری مزگەوت. بەڵام مێینە توانای ئەوەی نییە بەوکارە هەڵسێت کە نێرینە دەتوانێت بیکات و ئەنجامی بدات، هەروەها ئەو حاڵەت و مەرجانەیشی تیا نییە کە لە نێرینەدا هەیە، چونکە ئەو ناتوانێت بەردەوامی هەبێت لەناو مزگەوتدا، لەبەر ئەوەی تووشی عادەی مانگانە و سکپڕی و منداڵ بوون دێت.

زانا (إبن كثير) لە تەفسیرەکەیدا دەڵێت: ﴿وَلَيْسَ الذَّكَرُ كَالْأُنثَى﴾. واتە: (لە هێزو لێهاتووییدا بۆ پەرستش و خزمەتکردنی مزگەوتی (الآقصى)).[327]

هەروەها پێشەوا (الرازي) لە تەفسیرەکەیدا دەڵێت: خوای گەورە لە گێرانەوەیدا بۆ دایکی مەریەم فەرمووی: ﴿وَلَيْسَ الذَّكَرُ كَالْأُنثَى﴾ دوو بۆ چونی تێدایە:

---

[327] –تفسير ابن كثير، ١|٣٥٩.

* (یەکەم) : بێگومان مەبەستی دایکی مەریەم ئەوە بووە کە کوڕ چاکترە لە کچ، هۆکاری ئەم چاکییەشی لە چەند ڕوویەکەوەیە: یەکەم: بێگومان شەریعەتی ئەوان ڕێگەی دەدا بە ئازادکردنی کوڕ بۆ کاری خزمەتکاری مزگەوت، ئەمە بۆ کچ نەبوو.

دووەم: کوڕ دەتوانێت ودروستە بۆ مانەوە و بەردەوامی لەسەر خزمەتکردنی شوێنی پەرستن ، ئەمە لە کچدا نادروست و ڕێگە پێنەدراوە، چونکە تووشی عادەی مانگانەو هەموو دیاردەکانی تری ئافرەتان دەێت.

سێیەم: کوڕ لەبەر بەهێزی و خۆڕاگری دەگونجێت بۆ کاری خزمەتکاری بەڵام کچ ناگونجێت، چونکە لاوازە و هێزی ئەو خزمەتکارییەی نییە.

چوارەم: نێرینە ڕووبەڕی عەیب و کەم کوڕی نایەت و توشی نابێت ئەگەر تێکەڵاوی خەڵکیش بکات، بەڵام لە مێینەدا ئەو جۆرە نییە. ئەمانە چەند ڕوویەك و چەند لایەنێك بوون کە ئەوە دەگەیەنن کوڕ فەزڵ و لێهاتوویی بەسەر کچ (مێینە) دا هەیە.

* (دووەم): مەبەست لەم قسە و دەربڕینە، لەپێش دانانی ئەم مێینە بووە بەسەر نێرینەدا، وەك ئەوەی دایکی مەریەم وتبێتی: مەبەستی داواکاری من بۆ نێرینە بووە، بەڵام مێینەم پێ بەخشراوە، ئەو نێرینەیە نەبوو کە دەم ویست و داوام دەکرد، بەڵکو مێینەبوو، یان نێرینەکە وەك مێینە نییە، کە خوای گەورە بەخشی بەمن. ئەم قسەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەم ئافرەتە ماوەیەکی زۆری بەسەر بردووە لە خواناسیدا، زانا بووە بەوەی کە پەروەردگاری هەر کارێك بکات بە بەندەکانی خەیر و چاکەیە، لەوەی کە خۆیان بۆ خۆیانیان دەوێت).[328]

* هەروەها ڕوویەکی تریش بۆ ماناو لێکدانەوەی دەستەواژەکە هەیە، کەبریتییە لە ﴿وَلَيْسَ الذَّكَرُ كَالْأُنثَىٰ﴾ ڕستەیەکی ڕەخنەیی یە و نەبەستراوە بە وتەکەی دایکی مەریەمەوە، بەڵکو وتەی خوای گەورەیە، مەبەستیش پێی گەورە دانانی کاری ئەو لە دایك بوویە و لابردنی ئەو لێکدانەوەی خێزانی عمران بوو، کە ئەو منداڵە نێرینەیەی داوای کردبوو لە مێینە چاکتر بووە، چونکە بە توانا دەبێت لەسەر بەجێ گەیاندنی

---

٣٢٨ -تفسير الرازي ٨|٢٦-٢٧.

وەفاکردن بە نەزرەکەی، ئەم منداڵە مێینەیە پلە و پایەی لای خوای گەورە بەرزترە لە زۆرێك لە پیاوان، بێگومان خوای گەورە خۆی هەڵیبژاردووە و پاکی کردۆتەوە و هەڵی بژاردووە بەسەر ئافرەتانی جیهاندا، خۆی و کوڕەکەی کردۆتە دوو نیشانەی ڕوون و گەورە و لە چیرۆکێکی ناوەزەدا کۆی کردونەتەوە.

## ناونانی بە مەریەم

﴿وَإِنِّي سَمَّيْتُهَا مَرْيَمَ﴾.

**دوو تێبینی دەربارەی ئەم لێکدانەوەیە:**

- تێبینی یەکەم: بێگومان ژنەکەی عمران خۆی بە تەنها بڕیاری ناوی (مریم)ی دا، ئەمەیش لەبەر ئەوەی کە مێردەکەی وەفاتی کردبوو، کاتێك ئەم سکی بە (مریم) پڕبوو.

●پێشەوا (الآلوسی) دەڵێت: (خۆی سەر بەخۆ بوو لە ناونانیدا، چونکە باوکی مەریەم مردبوو و خۆیشی سکی بەمەریەم پڕبوو، پێش خستنی کاری ناونانەکە و نیسبەت دانی بۆ لای خۆی بۆ تایبەتمەندی بوو، واتە ناونانەکەی لە منەوە بوو، و باوکی بەشداری تیادا نەکردووە).[٣٢٩]

- تێبینی دووەم: بێگومان دایکی مەریەم ئەم کارەی بۆیە کرد تا لە خوای گەورە نزیك بێتەوە، ناوی (مریم) (علیها السلام) لە زمانی ئەواندا واتە: (العابدة) و (الخادمة) واتە: (خواپەرست) و (خزمەتکار)، ناویشی پەیوەندی بە ناولێنراوەکەوە هەیە، ئەو تکای وایە کە لەناوەکەی بەشێك وەرگرێت و بەختی باش بێت و وەك ناوەکە بێت.

●پێشەوا (القاسمي) دەڵێت: (زانایانی تەفسیر وتویانە لە زمانی ئەواندا(مریم) واتە: (العابدة) خواپەرست، بەم ناوە ناوی نا تکا و داوا و گەشبینی وابو کە کارەکانی هاوڕێك بن لەگەڵ ناوەکەیدا.[٣٣٠]

---

[٣٢٩] –تفسیر الآلوسي ٣/١٣٦.

[٣٣٠] –محاسن التأویل للامام القاسمي ٤/٩١.

• زانا (إبن حجر) دەڵێت: (بە زمانی (سریانی)، (مریم) واتە (الخادم) خزمەتکار).[٣٣١]

لەم ناوانەدا ئاماژە کراوە بۆ خۆڕاگری دایکی و داننان و جێ بەجێ کردنی نەزرەکەی، و تکای لای خوای گەورە وا بووە کە وەرگیراو بێت.

•خاوەنی (روح البیان) دەڵێت: ﴿وَإِنِّي سَمَّيْتُهَا مَرْيَمَ﴾ لە وتەکانی (حنة) دایکی مەریەم بووە، بەسەر ئەم وتەیەدا هێنای: ﴿إِنِّي وَضَعْتُهَا﴾ واتە: بێگومان من ناوم نا مەریەم، مەبەستیشی لەوەی کە ئەم ناونانەی لای خوای گەورە ئاشکرا کرد، بۆ ئەوە بوو کە لە خوای گەورە نزیك بێتەوە، و داوای لێی بکات بیپارێزێت، بێگومان (مریم) لە زمانی ئەواندا واتە (العابدة) خوا پەرست و خزماتکار، و ئەوەشی ئاشکرا کرد کە لە نیەتی ئەودانەگەڕاوەتەوە، و ئەوەی ئەو بوویەتی کە مێینەیە، خۆ ئەگەر بۆ ئەوەیش دروست نەکرابێت گونجاو بێت بۆ خزمەتی (بیت المقدس) بەڵکو ببێتە خوا پەرست تیایدا....).[٣٣٢]

## پاراستنی خوایی بۆ مەریەم و نەوەکانی لە شەیتانی نەفرەتکراو

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِنِّي أُعِيذُهَا بِكَ وَذُرِّيَّتَهَا مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ﴾.

• تا ئێرەیش بەردەوام باسەکە پەیوەندیدارە بە دوعا و پاڕانەوەکانی خێزانی عمران لە پەروەردگاری و دوعای بە کوڵ و بە دڵ دەکات کە لە دایکبووەکەی وەرگیراو و قبوڵ بکات و پیرۆز و بەرەکەتداری بکات، لەشەیتانی نەفرەتکراو بیپارێزێت، بێگومان خوای گەورە باشترین پارێزەرە و لەهەموو کەس بەبەزەیی ترە و باشترین بڕیاردەریشە.

• لەم دوعاو پاڕانەوەیەدا کە خێزانی عمران ئاراستەی پەروەردگاری کرد، ئاماژەبووە بۆ سوربوون و تکاکردنی لەسەرئەوەی کە خوای گەورە کچەکەی بۆ بپارێزێت و چاودێری

---

[٣٣١]- فتح الباري لابن حجر ٦|٥٤١.

٣٣٢ –روح البیان ٢|٢٧ بە دەستکارییەوە.

بکات، تا پێ دەگات و گەورە دەبێت و منداڵی دەبێت، خوای گەورەش وەڵامی دوعاکەی دایەوە.

• لە (أبی هریرة)ەوە (خوای لێی ڕازی بێت) کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (هەر منداڵێك لە دایك دەبێت، شەیتان تێوەی دەژەنێت و ئەویش دەقیڕێنێت لەو تێوەژەندنەی شەیتان، جگە لە کوڕەکەی مەریەم و دایکی، دوایی (أبو هریرة) (خوای لێی ڕازی بێت) ووتی: ئەگەر حەز دەکەن ئەم ئایەتە بخوێننەوە: ﴿وَإِنِّي أُعِيذُهَا بِكَ وَذُرِّيَّتَهَا مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ﴾. واتە: (من مەریەم و وەچەکەی پەنا دەدەم بەزاتی تۆ لە خراپەی شەیتانی نەفرین لێکراو).[٣٣٣]

•ڕوونکردنەوەیەك:

نهێنی دووبارە بوونەوەی (إنيّ) لێرەدا بۆ (تأکید) دڵنیا کردنەوەیە و بۆ گۆڕینی هەواڵ پێدراو، چونکە بێگومان وا هەست بە قسەکەی دایکی مەریەم دەکرێت کە ناڕەحەت و ناخۆشی حاڵ بووە کاتێك لەباتی کوڕ، کچی بوو، ئەمەی لە قسەکەیدا دووبارە و دڵنیا کردەوە، ئەوەی ئاشکرا کرد کە ڕازی بوو بە قەدەری خوای گەورە، و لەبەر ئەوەیش دواتر دەستی کرد بە دوعا و پاڕانەوە بۆی، کە بەڵگە بووە لەسەر ڕازی بوون و خۆشەویستی بۆی.[٣٣٤] لە ئایەتەکاندا سێ (فعل) کردار بە (صیغة)ی (ماضي) ڕابردوو هاتن کەبریتی بوون لە (نذرت) (وَضَعَتْها) و (سَمَّيْتُهَا) کە بەڵگەن لەسەر جێ بە جێ بوون و دامەزراوی لەدەربڕینەکەدا، ئەوە دەگەیەنێت کە وەفای بە نەزرەکەی کردووە بەبێ دوودڵی و پەشیمان بونەوە، هەروەها لە ﴿وَإِنِّي أُعِيذُهَا﴾دا، بەڵگە هەیە لەسەر نوێبوونەوە و بەردەوامی بەهۆی سود وەرگرتن لە لێکدانەوە بە (فعل) ی (مضارع)، چونکە داوای پەنادان و پەناگرتن بە خوای گەورە لە هەموو کاتێکدا پێو یست و خوازراوە.[٣٣٥]

---

[٣٣٣] -رواه البخاري في احاديث الانبياء ورواه مسلم في كتاب الفضائل.

٣٣٤ -تفسير الالوسي ٣|١٣٦.

[٣٣٥] -التحرير والتنوير للطاهر بن عاشور ٣|٢٤٣.

## خوای گەورە مەریەمی وەرگرت و زۆر بە جوانی پەروەردەی کرد

**خوای گەورە فەرمووی: ﴿فَتَقَبَّلَهَا رَبُّهَا بِقَبُولٍ حَسَنٍ وَأَنبَتَهَا نَبَاتًا حَسَنًا﴾ پاش ئەو پاڕانەوە ڕستگۆیانە و دوعا دڵسۆزانەی خێزانی عمران، کە داوای کرد لە پەروەردگاری نەزرەکەی لێ قبوڵ بکات و بەرەکەتدرا و پیرۆزی بکات و خۆی و نەوەکانی لە شەیتان بپارێزێت، خوای گەورە وەڵامی ئەو دوعایەی دایەوە و مەبەست و تکاکەی بۆ جێبەجێ کرد، وەڵام دانەوە و بەدەمەوە هاتنی خوا و بەخشینی ئەو کۆرپەیە لە لایەن خۆیەوە کە ئەو منداڵە بەختەوەرە چاوەڕێی دەکرد هەر بەو جۆرە بووە کاتێك خوای گەورە وەری گرت و زۆر بەجوانی پەروەردەی کرد و پێی گەیاند تا گەشەی کرد و گەورە بوو بەرهەمداربوو بە ووشەیەك لە لایەن خواوە و خوای گەورە نەوەیەکی پێ بەخشی کە عیسای بەندە و پێغەمبەری خوا بوو، کە خوای گەورە خۆی و دایکی کردە نیشانەی دیار بۆ هەموو جیهان.**

**خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَتَقَبَّلَهَا رَبُّهَا بِقَبُولٍ حَسَنٍ﴾ حەرفی (ف) لێرەدا بۆ (تعقیب) بەدوادا هاتنە، تا ئەوە ڕونبکاتەوە کە خوای گەورە زۆر بەخێرایی وەڵامی دوعاکەی داوەتەوە و زوو جێ بەجێ ی کردووە، بێگومان خوای گەورە لە باوەڕدارەوە نزیکە و وەڵامی دوعاو داواکاریەکانی دەداتەوە. خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌ أُجِيبُ دَعْوَةَ الدَّاعِ إِذَا دَعَانِ فَلْيَسْتَجِيبُوا لِي وَلْيُؤْمِنُوا بِي لَعَلَّهُمْ يَرْشُدُونَ﴾(البقرە:١٨٦).**

**واتە: (ئەی محمد (ﷺ)، ئەگەر بەندەکانم پرسیارت لێ بکەن دەربارەم، ئەوە من نزیکم لێیانەوە، بەهاناو هاواری دوعا گۆیانەوە دەچم، هەر کاتێك لێم بپاڕێنەوەو نزا بکەن، دەبا ئەوانیش بەدەم بانگەوازی منەوە بێن و باوەڕی دامەزراو بە من بهێنن، بۆ ئەوەی ڕێگای هۆشیاری و ئاگایی بگرنە بەر (بۆ بەدەستهێنانی سەربەرزی و سەرفرازی هەردوو جیهان).**

**• زانا (الشیخ المراغی) دەڵێت: (خوای گەورە مەریەمی لە دایکی وەرگرت و ڕازی بوو کە ئازاد بێت بۆ بەندایەتی و پەرستشی خوا و خزمەتکردنی ماڵە پیرۆزەکەی لەگەڵ**

بچوکی و مێینەییدا، ئازاد کردنیش تەنها بۆ کوڕ دەبێت کە توانای هەبێت خزمەتکاری (بیت المقدس) بکات.).[٣٣٦]

• پێشەوا (الرازی) دەڵێت: ﴿فَتَقَبَّلَهَا رَبُّهَا بِقَبُولٍ حَسَنٍ﴾. نەیفەرموو: (بتقبلٍ حسنٍ)، چونکە (القبول)و (التقبل) هەردووکیان لەیەك نزیکن، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَاللَّهُ أَنْبَتَكُمْ مِنَ الْأَرْضِ نَبَاتًا﴾(نوح:١٧).

واتە: (هەر خوا خۆی ئێوەی لە خاکی زەوی بەدیهێناوە و پێی گەیاندوون).

وشەی (القبول) (مصدر) چاوگی قسەکەیان بوو (قبل فلان الشیءُ قبولاً) کاتێك ڕازی بێت پێی.[٣٣٧]

﴿وَأَنْبَتَهَا نَبَاتًا حَسَنًا﴾ لەگەڵ ئەوەی کە لەلایەن خواوە زۆر بەجوانی وەرگیرا، بێگومان خوای گەورە ڕێزیشی لێ گرت و نازو نیعمەتی ڕشت بەسەریدا بەوەی کە بەجوانی پەروەردەی کرد.

زانا (إبن کثیر) دەڵێت: کردی بە شێوەیەکی جوان و دیمەنی سەرنج ڕاکێشی پێدا.[٣٣٨]

زانا (الزمخشري) دەڵێت (...﴿وَأَنْبَتَهَا نَبَاتًا حَسَنًا﴾ مەجازە لە باتی پەرووەردە کردنێکی جوان کە گونجاو بووبێت بۆی لەگشت بوارەکاندا چاك بووبێت.).[٣٣٩]

* پێشەوا (الآلوسی) دەڵێت: (واتە پەروەردگار بە شێوەیەکی زۆر جوان لەپەرستش و گوێڕایەڵی خۆیدا پەروەردەی کرد).[٣٤٠]

پێویستە هەڵوێستە بکەین لەسەر ڕوکاری ئایەتەکە ﴿وَأَنْبَتَهَا نَبَاتًا حَسَنًا﴾ کە جوان گەشەکردنی ئەو و سەلامەتی و تەواوی پێکهاتەی سروشتی دەگەیەنێت، ئەگەر لەوەدا شتێك هەبوایە لە عادەت دەرچوو بوایە لەگەشەی فیتری بەشەردا، ئەوا بێگومان لە پێشتر و گونجاوتر بوو لێرەدا باسی بکرایە.

---

٣٣٦-تفسیر المراغي١|١٤٥ .

٣٣٧ -مفاتیح الغیب للامام الرازي٨|٢٨.

٣٣٨- تفسیر ابن کثیر ١|٣٥٩.

٣٣٩ -الکشاف للزمخشري١|٢٥٨ بە دەستکارییەوە.

٣٤٠ -روح المعاني ٣|١٣٩.

**باسی سێیەم:**

**زەکەریا( علیه السلام ) کەفالەتی ( مریم ) ( علیها السلام ) دەکات:**

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَكَفَّلَهَا زَكَرِيَّا كُلَّمَا دَخَلَ عَلَيْهَا زَكَرِيَّا الْمِحْرَابَ وَجَدَ عِندَهَا رِزْقًا قَالَ يَا مَرْيَمُ أَنَّى لَكِ هَذَا قَالَتْ هُوَ مِنْ عِندِ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ يَرْزُقُ مَن يَشَاءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ﴾ (ال عمران: ٣٧).

پاش ئەوەی کە خوای گەورە مەریەمی قبولْ و وەرگیراو کرد، و بەجوانی پەروەردەی کرد و پێ ی گەیاند، و کەسێکی بۆ دیاری کرد کە هەستێت بە کارو بارەکانی و سەرپەرشتی بکات و گرنگی پێبدات و بە چاکی و جوانی سەرپەرشتی پەروەردە و کەفالەت کردنی بکات، خوای گەورە زەکەریا پێغەمبەری(علیه السلام) بۆ دیاری کرد، کە کەفالەتی بکات، ئەمەیش نیعمەت و بەزەیی یەك بوو لە خواوە بەسەر مەریەمدا ڕژا.

خوای گەورە فەرمووی: ﴿وَكَفَّلَهَا زَكَرِيَّا﴾.

-بەلاّم چۆن کاری ئەم کەفالەت کردنە تەواو بوو بەپایان گەیشت؟.

بێگومان کارەکە بە تەوفیق و فەرمانی خوایی تەواو بوو، پاش ئەوە زانا جولەکە و پیاوانی ڕوهبان ناکۆکی و کێشە کەوتە نێوانیان لەسەر کەفالەت کردنی مەریەم، هەر یەکەیان تکای وابوو و داوای وابوو کە خۆی هەستێت بە کەفالەت کردن و سەرپەرشتی کردنی و ئەو ڕێزە بۆ ئەو بێت و بەشی باش و بەختی هەبێت لەو کار و پلە بەرزەدا. مەریەم (علیها السلام) کچی پێشەوا و زانا عمران(علیه السلام) بوو، کە پیاو چاکێك بوو بەلاّم پێش ئەوەی چاوی بە بینینی کچەکەی بکەوێت مرد. هەریەکە لەو پیاوانە سوور بون و حەزیان بەوە دەکرد کە ئەو ڕێزە بۆ خۆی بێت و، وەفایەك بێت بەرامبەر مامۆستاکەیان کە پەروەردەکار و چاکەکار و پێشەوایان بوو، هەموویان پێش برکێ و مونافەسەی یەکتریان دەکرد، هەتا گەیشتە ئاستی ململانێ و ناکۆکی و کێشە و دەمەقاڵە لەسەر کەفالەت کردنی مەریەم (علیها السلام).

خوای گەورە فەرمووی: ﴿ذَلِكَ مِنْ أَنبَاءِ الْغَيْبِ نُوحِيهِ إِلَيْكَ وَمَا كُنتَ لَدَيْهِمْ إِذْ يُلْقُونَ أَقْلَامَهُمْ أَيُّهُمْ يَكْفُلُ مَرْيَمَ وَمَا كُنتَ لَدَيْهِمْ إِذْ يَخْتَصِمُونَ﴾(ال عمران: ٤٤). بێگومان هەریەکەیان زۆر سوور

بوون لەسەر کەفالەت کردنی مەریەم، کاتێك هەموویان لەسەر وشەیەك کۆنەبوونەوە و ڕێك نەکەوتن لەسەر ڕاو بۆ چونێك، هەریەکەیان دەیویست ئەو ڕێزو گەورەیی یە بۆ خۆی هەڵبژێرێت، بەلأم ئەوە چاکترو جوانتر بوو کە هەموویان دەستیان لە کاری کەفالەت کردنە هەڵبگرتایەو جێیان بهێشتایە بۆ پێغەمبەر زکریا (علیه السلام) بەلأم کاتێك موناقەشە و دەماقاڵەیان درێژەی کێشا دەربارەی ئەو کەسەی کە مەریەم کەفالەت دەکات لەسەر ئەوە ڕێك کەوتن کە (قرعة) ی بۆ بکەن، هەرکەس لە کاری (قرعة)کەدا بردیەوە و بۆی دەرچوو، بێگومان ئەو کەسە کەفالەت کردنەکەی بردۆتەوە.

خوای گەورە فەرمووی: ﴿وَمَا كُنتَ لَدَيْهِمْ إِذْ يُلْقُونَ أَقْلَامَهُمْ أَيُّهُمْ يَكْفُلُ مَرْيَمَ﴾.

* ئیمامی (بوخاری) لە (إبن عباس)ەوە (خوا لێیان ڕازی بێت) ڕیوایەتی کردووە: لە تەفسیری ئایەتی: ﴿وَمَا كُنتَ لَدَيْهِمْ إِذ يلقونَ أقلامهم﴾ دەڵێت: (قرعة)کەیان کرد، هەموو قەڵەمەکانیان فڕێ دا بۆ ناو ئاوێك، قەڵەمەکەی زەکەریا سەر ئاوەکە کەوت و ئینجا کەفالەت کردنەکە بۆ زەکەریا دەرچوو.[٣٤١]

پێشەوا (ابن الحجر) دەڵێت: قەڵەمەکەی زەکەریا سەر ئاوەکە کەوت و نوقم نەبو. لەگێرانەوەیەکی تردا هاتووە: کە بێگومان ئەوان (قرعة)یان کرد بۆ کەفالەت کردنی (مریم) کە کامیان کەفالەتی بکەن، هەر یەکەیان قەڵەمێکیان دەرهێنا، کاتێك گشت قەڵەمەکانیان هەڵدا بۆ ناو ئاوەکە، قەڵەمە کانیان کەوتە ژ ێر ئاوەکە و قەڵەمەکەی زەکەریاش بەرز بوویەوە بۆسەر ئاوەکە ئیتر ئەو کەفالەتی مەریەمی کرد).[٣٤٢]

ئێمەیش دەڵێین: وەك یەك بووە،ئەگەر قەڵەمەکەی زەکەریا ڕۆیشتبێت و پێش قەڵەمەکانی ئەوان کەوتبێت،یان قەڵەمەکانی ئەوان ڕۆیشت بێت و قەڵەمەکەی ئەو مابێتەوە و بەسەر ئاوەکەوە جێگیر بوو بێت یان سەر ئاوەکە کەو تبێت و بەسەر ئاوەکەوە مەلەی کردبێت و قەڵەمەکانی ئەوانیش نوقم بووبێت یان بەپێچە وانەوە، ئیتر کاری (قرعة) کردنەوە لەسەر حاڵ و بارێك بوو بێت،گرنگ ئەوە بووە کە زەکەریا بردویەتییەوە و کاری سەرپەرشتی و کەفالەتەکە بۆ ئەو بووە. بێگومان خوای گەورە ڕێزی لە مەریەم (علیها السلام) گرت بەوەی کە زەکەریا (علیه السلام) ی بۆ دەست نیشان کرد کە کەفالەتی بکات، ئیتر زەکەریاش ڕووی کردە کاری کەفالەتەکە و بۆ

---

[٣٤١] –رواه البخاري في صحيحه|كتاب الشهادات، باب القرعة في المشكلات.

٣٤٢ –فتح الباري ٥|٣٤٧ بە کورتی.

ئەوەی بەو کارە پیرۆزە زیاتر لە خوای گەورە نزیك ببێتەوە، ئەمەیش وەفا و پێزانین و چاکە و خەیرێکی گەورە و فراوان بوو. زەکەریا (علیه السلام) هەرچەند خۆی ڕووی کردە کارەکە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا خوای گەورە هیدایەتی دا و کار ئاسانی بۆ کرد.

## ڕێزگرتنێکی گەورە لە مەریەم (علیها السلام)

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿كُلَّمَا دَخَلَ عَلَيْهَا زَكَرِيَّا الْمِحْرَابَ وَجَدَ عِنْدَهَا رِزْقًا قَالَ يَا مَرْيَمُ أَنَّى لَكِ هَذَا قَالَتْ هُوَ مِنْ عِنْدِ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ يَرْزُقُ مَنْ يَشَاءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ﴾ (آل عمران:٣٧).

زەکەریا پێغەمبەر (علیه السلام) هەستا بەکاری کەفالەت کردنی مەریەم، و خوای گەورە (بیت المقدس)ی کردە شوێنی مریم (علیها السلام) کە بەڕێزترین شوێن بوو.کە ئەویش محرابەکەی بوو.

خاوەنی (الکشاف) دەڵێت: (وتراوە: زەکەریا (علیه السلام) میحرابێکی بۆ دروست کرد لە مزگەوتەکەدا، واتە ژورێك، بە پەیژە یان قادرمە بۆی سەردەکەوت، وتراوە (محراب) بەڕێزترین شوێنی دانیشتن و بەشی پێشەوەیەتی، وەك ئەوەی کە مەریەم لە بەڕێزترین شوێنی (بیت المقدس)دا دانرابێت. وتراوە: مزگەوتەکانیان ناو دەنرا (المحاریب) و ڕیوایەت کراوە کە کەس نەدەچووە لای مەریەم تەنها زەکریا (علیه السلام) نەبێت، و کاتێك لای مەریەم(علیها السلام) دەربچوایە، حەوت دەرگای لەسەر دادەخست).[٣٤٣]

* خاوەنی (المفردات) دەڵێت: (میحرابی مزگەوت، دەڵێن بەوە ناونراوە، چونکە شوێنی(حرب) و جەنگە لەگەڵ شەیتان و ئارەزووەکاندا، هەروەها وتراوە: بەوە ناونراوە لەبەرئەوەی کە مافی ئینسانە لەو شوێنەدا (حربي) جەنگاوەری بێت لەوەی کە سەرقاڵ بێت بەشتە دنیایی یەکانەوە، هەروەها ئەسڵ و بنەڕەتی ئەوەیە کە محرابی (بیت) بەشی پێشەوەیەتی، پاشان کراوە بە مزگەوت و بەشی پێشەوەی ئەو ناوەی وەرگرتووە، وتراوە: بەڵکو میحراب ئەسڵ و بنەڕەتی لە مزگەوتدایە، و ناوێکە تایبەت کراوە بەبەشی پێشەوەی مەجلیسەکە، بەبەشی پێشەوەی (بیت) ماڵ دەوترێت (محراب) وەك هاوشێوەیەك بە (محراب) ی مزگەوت، وەك ئەوەی ئەمە ڕاستتر بێت...).[٣٤٤]

---

[٣٤٣] -الکشاف للزمخشري١|٣٥٨.

[٣٤٤] -المفردات للراغب مادة ح ر ب ص:١١٢ .

* خاوەنی (المصباح المنیر) دەڵێت: (...وتراوە میحرابی شوێنی نوێژ کردن لە (المحاربة) وەرگیراوە، چونکە نوێژ خوێن لەو شوێنەدا لەگەڵ شەیتان و نەفسی خۆیدا دەجەنگێت).[345]

واتە: هەڵدەستێت بە چاکسازی کردنی نەفسی خۆی و پەروەردەکردن و پاك کردنەوەی. زەکەریا (علیه السلام) ئەو شوێنەی بۆ هەڵبژارد و دەستنیشانی کرد، کە بەرزترین و باشترین و بەرێزترین شوێنی مزگەوتەکە بوو. هەموو شوێنێك لە مزگەوتدا رێز و گەورەیی و پیرۆزی و فەزڵی خۆی هەیە، ئەو شوێنەی بۆ هەڵبژارد وەك رێزێك بۆ مەریەم (علیها السلام) ﴿كُلَّمَا دَخَلَ عَلَيْهَا زَكَرِيَّا الْمِحْرَابَ وَجَدَ عِندَهَا رِزْقًا﴾.

واتە: (هەر کاتێك زکریا دەچوو بۆ سەردانی مەریەم لە شوێنی خواپەرستی یەکەیدا، دەیبینی رزق و رۆزی و ناز و نیعمەتی جۆرا و جۆری لایە). زەکەریا ئەمانەی بۆ ئەو نەهێنابوو، هەروەها لەو میوە و رزق و رۆزییەی ئەو کات و وەرزە دیاریکراوە نەبووە، زەکەریا دەیزانی کە کەسی تر جگە لەو نەدەهاتە لای، تەنها ئەو هەڵسابوو بەکاری کەفالەت کردنەکەی، هەتا ئەو کارە زەکەریای هەژاندبوو، و تووشی سەرسامی کردبوو.

* زانا (إبن کثیر) دەڵێت: {(مجاهد و عکرمة و سعید بن جبیر والضحاك و قتادة و کەسانی تر) وتویانە: زەکەریا لەوەرزی زستاندا میوەی هاوینەو، لەوەرزی هاویندا میوەی وەرزی زستانەی لەلای مەریەم (علیها السلام) دەبینی}.[346]

دەڵێت: رزق و رۆزی خۆراکی جەستەو رۆحیش دەگرێتەوە، کە خواردن و خواردنەوە و شتانی تریش لە پێویستییەکانی ژیان دەگرێتەوە، لە هەموو ئەو شتانەی کە سوود بە ئینسان دەگەیەنن و دەستی دەکەوێت، هەروەك چۆن خۆراکی رۆح زانست و شتی تریش دەگرێتەوە.

* ئەو رزق و رۆزی یەی کە لەلای مەریەم (علیها السلام) بوو لە هەموو جۆرە میوەیەکی تێدابوو کە هی وەرزی خۆیشی نەبوو لەبەرئەوە بەشێوەی (نکرة) هات،کە زۆری و هەمە جۆری دەگەیەنێت، رزق و رۆزیەکی هەست پێکراو و هەروەها مەعنەویش بوو.

* هەروەها ئەو رزق و رۆزی یەی لە زنجیرەی (کرامات) رێزگرتنەکان بوو، کە خوای گەورە ئاشکرا و دیاری خستبوون بۆ مەریەم (علیها السلام)، بۆ ئامادەکردنی بوو بۆ

---

[345] المصباح المنیر للفیومي ٢|١٠ مادة ح ر ب.

[346] -تفسیر ابن کثیر ١|٣٦٠.

ڕێکی سەیرو گرنگ کە خۆی چاوەڕێی دەکرد، کە دروستکردنی عیسا (علیه السلام) بوو، بەبێ باوك.

## هەڵوێستی زەکەریا ( علیه السلام ) لەم ڕێزگرتنەدا

﴿قَالَ يَا مَرْيَمُ أَنَّى لَكِ هَذَا قَالَتْ هُوَ مِنْ عِنْدِ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ يَرْزُقُ مَنْ يَشَاءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ﴾(آل عمران:٣٧).
زەکەریا (علیه السلام) بە سەرسوڕمانەوە پرسیاری کرد لە مەریەم (علیها السلام) دەربارەی ئەوەی ئەوەی کە لای ئەو ڕویداوە، پرسیاری کردوو وتی: ﴿أَنَّى لَكِ هَذَا﴾؟ ئەم شتانەت لەکوێ بوو، یان لە کوێوە هات؟ وچۆن گەیشت بە تۆ و بێجگە لە من کەسی نایەتە لای تۆ؟
﴿قَالَتْ هُوَ مِنْ عِنْدِ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ يَرْزُقُ مَنْ يَشَاءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ﴾ بەخششەکانی خوا زۆر و بەردەوامن، و سنوریان بۆ دانانرێت، و بەربەستیشیان لەبەردەمدا نییە، و فەزڵ و میهرەبانی خوایش زۆر گەورەیە و گەنجینەکانیشی پڕن.
خاوەنی (روح البیان) دەڵێت: ﴿إِنَّ اللَّهَ يَرْزُقُ مَنْ يَشَاءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ﴾.
واتە: بەبێ دیاریکردن لەبەر زۆرییەکەی، یان بەبێ ژماردن و لێپرسینەوەی، یان بەجۆرێکە چاوەڕوانی نەبووە و حسابی بۆ نەکردووە. وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَيَرْزُقْهُ مِنْ حَيْثُ لَا يَحْتَسِبُ﴾(الطلاق:٣).[٣٤٧] بێگومان خوای گەورە بە بەندەکانی بە جۆرێك دەبەخشێت کە چاوەڕوانی نەکردووە و حسابی بۆ نەکردووە، واتە بەبێ دیاریکردن و نەخشە دانان و بیرکردنەوە لێی. لە فەرموودەیەکی قودسیدا هاتووە: (دەستی ڕاستی (بەخشندەیی) خوا پڕە، هیچ شتێك کەمی ناکاتەوە، پڕە و بەشەو و ڕۆژ بە خورەم لێی دەڕژێت، ئایا بینیوتانە لەو ڕۆژەوەی کە زەوی و ئاسمانەکانی دروست کردووە چی بەخشیوە، بێگومان هیچ لە دەستی ڕاستی (بەخشندەیی) ئەو کەمی نەکردووە).[٣٤٨]
لە فەرموودەیەکی تردا هاتووە: (...ئەی بەندەکانم، ئەگەر سەرەتاو کۆتاییتان بە مرۆڤ و جنۆکەتانەوە، تێکڕا لە گۆرەپانێکدا بوەستن و داوام لێ بکەن، هەموو مرۆڤێك ئەوەی کە

[٣٤٧] -روح البیان ٢|٢٩.
[٣٤٨] -رواه مسلم في صحيحه عن ابي هريرة |كتاب الزكاة.

داوای دەکات پێی ببەخشم، ئەوە هیچ لەوەی کە لەلای منە کەم ناکات، مەگەر ئەوەندەی کە دەرزییەك لە ئاوی دەریا کەمی دەکاتەوە).[٣٤٩]

## زەکەریا ( علیه السلام ) ڕوو دەکاتە خوا و دەپاڕێتەوە کە کوڕێکی چاکەکاری پێ ببەخشێت

خوای گەورە لە سوورەتی (آل عمران)دا دەفەرموێت: ﴿هُنَالِكَ دَعَا زَكَرِيَّا رَبَّهُ قَالَ رَبِّ هَبْ لِي مِن لَّدُنكَ ذُرِّيَّةً طَيِّبَةً إِنَّكَ سَمِيعُ الدُّعَاءِ﴾(آل عمران:٣٨).

زەکەریا (علیه السلام) مێردی خوشکی مەریەم (علیها السلام) بوو، و یەکێك بوو لە پێغەمبەرانی نەوەی ئیسرائیل (علیهم السلام)، نەسەب و ڕەچەڵەکی دەگەڕێتەوە سەر سولەیمان (علیه السلام) لەوێشەوە بۆ سەر ئیبراهیم (علیه السلام) کە لە بنەچەیەکی پاك و بەڕێز بووە. خێزانەکەی زەکەریایش (علیه السلام) ئافرەتێکی چاکەکار و ئارامگربوو، خوای گەورە بە نەزۆکی تاقی کردەوە، ئەویش کاری خۆی دایە دەست خوا و ڕازی بوو بە قەدەر و بڕیاری خوا، و لەگەڵ هاوسەرەکەی خۆیدا دەژیا بەژیانێکی جوان و چاك و هێمنانە و لەسەر خۆیی. بێگومان خوای گەورە سەناو ستایشی زەکەریا و هاوسەرەکەی لە قورئاندا کردووە لەگەڵ (یەحیا)ی کوڕیاندا. فەرموویەتی: ﴿وَزَكَرِيَّا إِذْ نَادَىٰ رَبَّهُ رَبِّ لَا تَذَرْنِي فَرْدًا وَأَنتَ خَيْرُ الْوَارِثِينَ(٨٩) فَاسْتَجَبْنَا لَهُ وَوَهَبْنَا لَهُ يَحْيَىٰ وَأَصْلَحْنَا لَهُ زَوْجَهُ إِنَّهُمْ كَانُوا يُسَارِعُونَ فِي الْخَيْرَاتِ وَيَدْعُونَنَا رَغَبًا وَرَهَبًا وَكَانُوا لَنَا خَاشِعِينَ﴾(الانبیاء:٨٩-٩٠).

واتە: (یادی زەکەریا بکەرەوە کاتێك هاناو هاواری بۆ پەروەردگاری بردو وتی:پەروەردگارا من بە تەنهایی مەهێڵەرەوە (نەوەیەکی چاك و پاکم پێ ببەخشە) تۆیش چاکترین زاتێکی لەپاش من و هەموو مردویەك دەمێنیتەوە، ئینجا ئێمە نزاکەیمان گیرا کردو (یحیی) مان پێ بەخشی، و چونکە بەراستی ئەوانە چالاك و گورج و گۆڵ بوون لەئەنجامدانی هەموو خەیر و چاکەیەکدا نزای بە کوڵیان دەکرد، بە

[٣٤٩] –رواه مسلم في صحيحه من حديث ابي ذر جندب بن جنادة، كتاب البر والصلة، باب تحريم الظلم.

ئومێدی ڕەحمەت و بەهەشتی ئێمە، و لە دۆزەخ و خەشمی ئێمە دەترسان و ئەوان هەمیشە گەردن کەچ بوون بۆ ئێمە).

بێگومان خوای گەورە ڕێزی لە زەکەریا (علیه السلام) گرت. بەهۆی ئەوەی کە ڕێزی لە مەریەمی بێ باوك و نازدار گرتبوو، و ئەو ڕێزگرتنەیش لە مەریەم، هۆکارێکی ڕاستەوخۆ بوو لەوەدا کە زەکەریا ڕووی کردە خوای گەورە و دەستی کرد بە دوعاو پاڕانەوە کە خوای گەورە منداڵێکی پاك و چاکی پێ ببەخشێت.

﴿هُنَالِكَ دَعَا زَكَرِيَّا رَبَّهُ﴾. واتە: هەر لەو کات و شوێنەدا زەکەریا ئەو ڕێزە گەورەیە دەبینێت و ئەو نیشانە سەر سورهێنەرەی بەرچاو دەکەوێت لە میحرابەکەدا کەشوێنی پەرستش و گوێڕایەڵی بوو و شوێنی بەزەیی و بەرەکەت و دەورو لێکردنەوە و بەدەمەوە چوونی خوایی بوو. ئینجا زەکەریا ڕوو دەکاتە خوای گەورە و دەست دەکات بە دوعاو پاڕانەوە کە خوای گەورە منداڵێکی چاکی پێ ببەخشێت.

زانای تەفسیر (إبن کثیر) دەڵێت: (.. هەندێك وتویانە زەکەریا (علیه السلام) ووتی: ئەی ئەو کەسەی ڕزق و ڕۆزی و بەرو وبوم دەبەخشیت بە مەریەم بەبێ کاتی دیاری کراو و وەرزی خۆی، منداڵێکیش بە من ببەخشە کە هەرچەندە کات و وەرزی خۆی نییە) ﴿قَالَ رَبِّ هَبْ لِي مِن لَّدُنكَ ذُرِّيَّةً طَيِّبَةً﴾. لەو کات و شوێنەی کە ڕێز و کەرامەتەکانی بە سەرمەریەمەوە بینی، کە بەڵگە بوون لەسەر چاکەکاری و نزیکی لە خواوە، ئەویش ئاواتی دەخواست کە منداڵێکی ببێت و بینایی چاوەکانی پێ ڕوون و گەش ببێتەوە و دڵ و دەرونی پێ کراوە و فراون ببێت.

داواکارییەکە بە ووشەی (الهبة) هات {چونکە ئەم ووشەیە تەنها چاکەی (ڕوت و بێ تێکەڵ بوون بەشتی تر) دەگرێتەوە لە بەرامبەری هیچ شتێکەوە نییە کە دەگونجێت، باوکەکە هیچی تیا خەرج نەکات، لەبەر گەورەیی تەمەنی، بۆ دایکەکەیش چونکە نەزۆك بوو منداڵی نەدەبوو}.[٢٥٠]

﴿مِن لَّدُنكَ﴾ دەربڕین و لێکدانەوە بە ﴿لَّدُنكَ﴾ بەبێ دەربڕین بە شێوازی (مِن عِندِك) چونکە بە دەست هێنانی منداڵ و دەست کەوتنی بەپێی عورف و عادەت هۆکاری تایبەتی خۆی هەیە، کاتێك داوای منداڵی کرد لەگەڵ لەدەستدانی ئەو هۆکارانەدا، ئەمە

---

[٢٥٠] -روح المعاني للالوسي ٣|١٤٤.

واتە: ئەی خودای من من لە تۆم دەوێت کە لەم مەسەلەیەدا هۆکارەکان لابەرێت، و تەنها و تەنها بە توانای خۆت ئەو منداڵەم پێ ببەخشیت بەبێ هۆکار.[٣٥١]

کوڕ بەخشش و دیارییە لەلایەن خواوە، و بەخشینی کوڕ لەگەڵ کۆبوونەوەی هەموو بەربەستەکان لەگەورەیی تەمەن و نەزۆکی و لە عادەت دەرچوون، ئەمانە دیمەنێك بوون لە گەورەیی دەستەڵات و قودرەتی خوای گەورە و جوانی کارو ویست و ئیرادەکانی. لەبەرئەوە تەفسیرکردنی بە (لدن) ئەوە تایبەت ترە لە (عند) چونکە بەخشینی کوڕ بە زەکەریا لەگەڵ گەورەیی تەمەنی و نەزۆکی هاوسەرەکەی ئەوە بەخشین و تایبەتمەندی بوو لەلایەن خواوە بۆ ئەو و خوای گەورەیش بە توانایە بەسەر هەموو شتێکدا.

﴿ذرية طيبة﴾ ئەوە گونجاوی شتەکە بوو بۆ خاوەنەکەی، لەبەرئەوە دەیەوێت کە چاك و پاکە. شارو وولاتی پاك ئەو شوێنەیە کە گونجاوە بۆ ژیانی دانیشتوانەکەی لە رووی بوونی ئاو و هەوا و رزق و رۆزی فراوان و شتانی تر لەو شێوەیە، خوای گەورە فەرموویەتی ﴿وَالْبَلَدُ الطَّيِّبُ يَخْرُجُ نَبَاتُهُ بِإِذْنِ رَبِّهِ﴾(الاعراف: ٨٥).

واتە: (وولاتی بە پیت و چاك و ئاوەدان، دار و درەخت و رووەکی تیادا دەروێت بە فەرمانی پەروەردگاری).

هەروەها لە چیرۆکی (سبأ)دا دەفەرموێت: ﴿كُلُوا مِن رِّزْقِ رَبِّكُمْ وَاشْكُرُوا لَهُ بَلْدَةٌ طَيِّبَةٌ وَرَبٌّ غَفُورٌ﴾(سبا:١٥). (بخۆن لە رزق و رۆزی پەروەردگارتان و سوپاس گوزاری بن، وولاتێکی خۆش و ئاوەدان، پەروەدگارێکی لێخۆشبوو لێبووردە...). ژیانی خۆشی و ئاوەدان بریتییە لەوەی کە هەندێك بەشی لەگەڵ هەندێکی تردا گونجاو بێت و دڵی تیا دامەزرێت، و لەوانەیش خۆشی و پاکی و ئاوەدانی: بۆن و بەرامەی خۆش و منداڵ و نەوەی چاك کە چاکە کاربێت بۆ باوکی خۆی، کە لە رووی سیفات و کردارەوە گونجاوبێت، جێگای تکاو ئاواتەکانی باوك و دایکی بێت.

کاتێك زەکەریا (علیه السلام) لە خوای گەورە پاڕایەوە کوڕێکی پێ ببەخشێت، خوای گەورەیش وەڵامی دوعاکەی دایەوە و، وەك ئەوەی کە خۆی داوای کردبوو پێی بەخشی، و یەحیای پێ بەخشی کە زۆر لە عیسا (علیه السلام) دەچوو. خەڵکی هەموو یەکڕان

---

[٣٥١] -مفاتيح الغيب للرازي ٨|٣٣.

بوون دەربارەی ئەوەی کەلای عیساو مەریەمی دایکی بوو لەتەواوی ڕێز و کەرامات.....).[٣٥٢]

﴿إِنَّكَ سَمِيعُ الدُّعَاءِ﴾ واتە خوای گەورە دوعاکان دەبیستێت و وەری دەگرێت و وەلامیشیان دەداتەوە. بەڕاستی قورئانی پیرۆز دەربارەی دوعاکەی زەکەریا (علیه السلام) دواوە لە چەند شوێنێکی تردا، کە سودی زیاتری تیا دەبینین باسی بکەین و ڕوونی بکەینەوە.

## دوعاکەی زەکەریا ( علیه السلام ) لە سوورەتی ( مریم )دا

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿كهيعص (١) ذِكْرُ رَحْمَتِ رَبِّكَ عَبْدَهُ زَكَرِيَّا (٢) إِذْ نَادَى رَبَّهُ نِدَاءً خَفِيًّا﴾ (مریم:٣-١).

ئایەتەکانی سوورەتەکە بە ﴿كهيعص﴾ دەست پێ دەکات کە چەند پیتێکی جیا جیان، و هەندێك لە سوورەتەکانی قورئان بەو پیتانە دەست پێ دەکات. ئێمە زانست و ڕوونکردنەوەی ئەم پیتانە بۆ خوای گەورە خۆی جێ بهێڵین.

﴿ذِكْرُ رَحْمَتِ رَبِّكَ عَبْدَهُ زَكَرِيَّا﴾.

ئەم ئایەتە پیرۆزە یادخستنەوەیە بۆ پێغەمبەر (ﷺ) بە ڕەحمەت و بەزەیی خوای گەورە بە بەندەو پێغەمبەری خۆی زەکەریا (علیه السلام).

ڕوونکردنەوە: {ئەم ئایەتە پیرۆزە: ﴿ذِكْرُ رَحْمَتِ رَبِّكَ عَبْدَهُ زَكَرِيَّا﴾. ڕەگەزی بنەڕەتی بابەتەکانی سوورەتی (مریم) لە خۆ دەگرێت کە بریتین لە (الرب -العبد- رحمة- الرب للعبد - وحاجة العبد للرب -وكمال الرب في غناه). واتە: (پەروەردگار- بەندە- بەزەیی پەروەردگار بەبەندەکانی - پێویستی بەندە بە پەروەردگاری -تەواوی پەروەردگار کە دەوڵەمەندە و پێویستی بە هیچ نییە). هەروەها پەروەردگار بەڕەحم و بەزەیی یەو چاکەی زۆرە بەسەر بەندەکانییەوە. دەبینین ئایەتەکانی سوورەتەکە تەرکیز دەکەنە سەر ناوی پیرۆز و جوانی (الرحمن) کە ئەوپەڕی چاکەو ڕەحم و بەزەیی دەگەیەنێت، بەندەیش لەم ناوەوە تەواوی ملکەچی و پەرستشی پەروەردگاری وەردەگرێت، و

[٣٥٢] -المیزان للطباطبائي ٣|١٧٥ بە دەستکارییەوە.

پێغەمبەران (علیهم السلام) زۆرترین کەس بوون کە پەرستشی خوایان کردووە و ملکەچی فەرمانەکانی بوون، ئەوان نمونەی ئینسانی تەواو و کاملْ بوون لە کاملی بەشەربووندا کە تایبەتمەندبوون بەو سیفەتانە و پەرستشیان ئەنجامداوە بۆ خوای گەورە).[٣٥٣]

﴿إِذْ نَادَىٰ رَبَّهُ نِدَاءً خَفِيًّا﴾(مریم:٣). بە نهێنی و شاراوەیی لە پەروەردگاری پاڕایەوە، ئەوەیش زانراوە کە شاردنەوەی دوعا یان ئاشکرا کردنی لای خوای گەورە وەك یەك وایە، چونکە خوای گەورە ﴿يَعْلَمُ السِّرَّ وَأَخْفَى﴾(طه:٧).

واتە: خوای گەورە هەموو نهێنی و شاراوەیەك دەزانێت)، بێگومان خوای گەورە گوێی لە دەنگی مێرولەیەکی ڕەشە لەسەر بەردێکی ساف و لوس لە شەوی تاریکدا، ئەو نزیك و وەڵامدەرەوەی دوعاکانە.

دوعاکردن بە نهێنی تایبەتمەندی خۆی هەیە چەنکە چاکترە لە ڕووی ملکەچی و خشوع و دڵسۆزییەوە، و نزیك تریشە بۆ وەڵام دانەوە، (قتادة) دەڵێت: بێگومان خوای گەورە ئاگای لە دڵی خواناسانە، و دەنگی نهێنیان دەبیستێت.[٣٥٤]

وتراوە: بەنهێنی کردنی دوعا بۆئەوەی نەبادا خەڵکی گاڵتەی پێ بکات و بڵێن: ئێوە سەیری ئەو پیاوە پیرە لەناو چووە بکەن کەداوای کوڕ دەکات![٣٥٥]

بەڵام ئەوەی کەلە پێشترو دروست ترە ئەوەیە کە بێگومان ئەو دوعاکەی بەنهێنی کرد تا چاکترو بەهێزتر بێت لەڕووی (إخلاص) دڵسۆزیەوە و نزیکتربێت بۆ قبولْ بوون.

لە فەرموودەیەکدا هاتووە: (ابو موسی الا شعری) (خوای لێی ڕازی بێت) دەڵێت: لە خزمەت پێغەمبەردا (ﷺ) بووین، لە سەفەرێکدا خەڵکی بەدەنگی بەرزەوە (الله الاکبر) یان دەکرد. پێغەمبەر یش (ﷺ) فەرمووی: (خەڵکینە لەسەرخۆ بن، خۆ ئێوە بانگی کەسێك ناکەن کە کەڕو نادیار بێت، ئێوە بانگی کەسێك دەکەن کە بیسەرو نزیکەو هەمیشە لەگەڵتانە...).[٣٥٦]

---

٣٥٣ -التوحيد والتنزيه في سورة مريم تأليف عبدالحميد محمود طهماز ص|١١.

٣٥٤ -تفسير ابن كثير ٣|١٠ و تفسير الماوردي ٢|٥٧٨.

٣٥٥ - تفسير الماوردي ٢|٥٧٨.

٣٥٦ -رواه مسلم في صحيحه كتاب الذكر والدعاء و التوبة .

لَ رَبِّ إِنِّي وَهَنَ الْعَظْمُ مِنِّي وَاشْتَعَلَ الرَّأْسُ شَيْبًا﴾. ئەم ئایەتە پیرۆزە حاڵی زەکەریا (علیه السلام) ڕوون دەکاتەوە و دوعاکەیمان پێ دەڵێت: ﴿قَالَ رَبِّ إِنِّي وَهَنَ الْعَظْمُ مِنِّي﴾ واتە ئێسکەکانم لاواز بوون و هێزی جەستەم لاواز بووە (بێهێزی خۆی خستە پاڵ ئێسکەکانی چونکە کۆڵەکە و ڕاگیرکەری جەستەی بوون بێگومان تووشی لاوازی هاتبوون و پوکاوبونوە و بەهۆیەوە هێزی جەستەی زۆر دابەزیبوو.).[٣٥٧]

* (مامۆستا عبدالکریم الخطیب) لە تەفسیرەکەیدا دەڵێت: پوکانەوە یان لاواز بوونی ئێسکەکان، ڕەنگە ببێتە هۆکارێك کە ئینسان بە هۆیەوە بڕوخێت و پایەکانی جەستەی داکەون، پەیکەر و هەیکەلی ئینسان لەو ئێسکانە پێك هاتوون کە شێوەی ئەوی ڕاگرتووە و بەیەکەوەی بەستون، و ئایەتی: ﴿وَهَنَ الْعَظْمُ مِنِّي﴾. (جوانتر و بەهێزترە لە ڕونکردنەوەدا لەوەی کە بڵێت (الضعف) و نەمانی هێزی جەستەشی لە: (وهن عظمي) ئەوا وتەی یەکەمیان ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە ئەو ئێسك لەلاشەیدا نەماوە، بەڵکو ئێسکەکانی ڕۆیشتوون و وەك ئەوەی ئەو پێویستی پێیان نەمابێت، بەڵام وتەکەی تریان ئەوە دەگەیەنێت کە ئێسکەکانی ماون و خاوەنی ئێسکی جەستەی خۆیەتی...).[٣٥٨]

خوای گەورە لەم ئایەتەدا: ﴿وَاشْتَعَلَ الرَّأْسُ شَيْبًا﴾. قسەکەی حەزرەتی زەکەریامان (علیه السلام) بۆ دەگێڕێتەوە. واتە پیربووە و سەری سپی بووە کە ئەوە دەگەیەنێت تەمەنی گەورەیە. خاوەنی تەفسیری (الظلال) دەڵێت: (...دەربڕین و لێکدانەوە بەو شێوەیە کە جوان وێنەی کێشاوە کە پیری نیشانداوە کەقژی سەری وەك ئاگری ڕوناك هەڵگیرساوەو هەموو مووەکانی سەری وەك ئەو ئاگرە هەڵگیرساوە لێ کردووە و لەناو قژە سپیەکانی سەریدا مووی ڕەشی تیا نەماوەتەوە).[٣٥٩]

سپی بوون سەر دەگرێتەوە و دەتەنێتەوە هەروەك چۆن ئاگرو پۆشی ووشك دەگرێتەوە و ودەیتەنێتەوە لەمەوە دەردەکەوێت ئاماژە کراوە بۆ لاوازی و پێویستی بەڕەحم و بەزەیی خوا هەیە.

[٣٥٧]-روح المعاني للأمام الالوسي١٦|٥٩ .

[٣٥٨] -التفسير القرآني للقرآن ١٦|٧٢٣.

[٣٥٩] -في ظلال القران٤|٢٣٠٢.

﴿وَلَمْ أَكُن بِدُعَائِكَ رَبِّ شَقِيًّا﴾. واتە: بەلاّم من هەرگیز لە دوعاو پاڕانەوەم لە زاتی تۆ نائومێد نەبووم ئەی پەروەردگارم (دەستت نەناوە بەڕوومەوە).

خاوەنی تەفسیری (الظلال) دەڵێت: (زەکەریا (علیه السلام) دان دەنێت بەوەدا کە خوای گەورە لەسەر ئەوە ڕای هێناوە کە وەلاّمی دوعاکانی بداتەوە کاتێك داوای لێ کرد: و نائومێد نەبووە لە دوعاکانیدا لە پەروەردگاری لە کاتی گەنجێتی و هێزیدا، بەلاّم بەڕاستی ئێستا زیاتر پێویستی بەخوا هەیە لەم کاتی پیربوون و لاوازییەدا کە خوای گەورە وەلاّمی بداتەوە و نازو نیعمەت بڕێژێت بەسەریدا).[٣٦٠]

ئێمەیش دەڵێین: ئەمە ئەدەبێکی جوانی دوعاکردنە کەبەندە بە ستایشی خوای گەورە دەستی پێ بکات تا ئەوەی خۆی بەسیفەتی تەواو کامڵ باس بکات. بێگومان خوای گەورە لایەنی سەرەکییەو سوپاس وستایش کراوە و بەردەوام نازونیعمەت وڕێز بەسەریدا دەڕژێنێت و بۆی دیار دەخات.

پێویستە کەسێك کە دوعا و پاڕانەوە دەکات زۆر دڵنیابێت لەوەی کەخوای گەورە وەلاّمی دەداتەوە، و گومانی باشی بەخوا بێت و دڵنیابێت بەوەی کەلەلایەن خواوە دەبێت. لە فەرموودەیەکی (قودسی)دا هاتووە کە پێغەمبەر (ﷺ) لەپەروەردگارەوە بۆمان دەگێڕێتەوە، دەفەرموێت: (خوای گەورە دەفەرموێت: من لەگەڵ گومانی بەندەی خۆمم، من لەگەڵیدام کاتێك یادم دەکات، ئەگەر لە دەرون و نەفسی خۆیدا یادم بکات، ئەوا منیش لە دەرون و نەفسی خۆمدا یادی دەکەم، ئەگەر لەناو کۆڕ وکۆمەڵدا یادم بکات، ئەوا منیش یادی دەکەم لەناو کۆڕ و کۆمەڵێکدا لەوەی خۆی چاکتربن، ئەگەر یەك بست لەمن نزیك ببێتەوە، ئەوا من یەك باڵ لێی نزیك دەبمەوە، ئەگەر یەك باڵ لەمن نزیك ببێتەوە، ئەوا من یەك گەز لێی نزیك دەبمەوە، ئەگەر بەئاسایی بێت بۆلام، ئەوا من بەڕاکردن بەرەو ڕوی دەچم.[٣٦١]

لەسەر بەندە پێویستە کەگومانی باشی بەپەروەردگاری خۆی هەبێت و دڵنیابێت و متمانەی بەڕەحمەت و بەزەیی خوا بێت و، وچاوەڕوان بێت کە خوای گەورە داواکەی وەلاّم دەداتەوە.

---

[٣٦٠] - في ظلال القرآن٤| ٢٣٠٢ بە کەمێك دەستکارییەوە.

[٣٦١] -رواه مسلم و البخاري في صحيحهما عن ابي هريرة.

لە فەرمووودەیەکدا پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموویت: (ئێوە لەخوای گەورە بپاڕێنەوە و دوعاکانتان بەشیوەیەك بکەن کە دڵنیابن وەڵام دەدرێتەوە، و بزانن کە بێگومان خوای گەورە دوعا و داوای خاوەنی دڵی غافڵ و بێ ئاگا وەڵام ناداتەوە).[٣٦٢]

﴿وَإِنِّي خِفْتُ الْمَوَالِيَ مِن وَرَائِي وَكَانَتِ امْرَأَتِي عَاقِرًا فَهَبْ لِي مِن لَّدُنكَ وَلِيًّا﴾ (مريم:٥). زەکەریا (علیه السلام) هەواڵی هۆکاری داواکردنی کوڕەکە ڕوون دەکاتەوە کە ئێسکەکانی لاواز بوون و پیرو سەرسپی بووە، و دەڵێت: (بەڕستی من لەوە ترساوم کوخزم و خوێشان و عەشرەت دوای مردنم سەرگەردان بن، (چونکە کەسێکی وایان تیابەدی ناکەم کە شایستەی گەیاندنی پەیامەکەت بێت خۆت دەزانیت) خێزانەکەشم منداڵی نابێت، بۆیە داواکارم لە بەخششی خۆت بەهرەوەرم بکە و منداڵێکم پێببەخشیت، کەبتوانێت جێگەی من بگرێتەوە).

زانای تەفسیری (الرازي) دەڵێت: (زەکەریا (علیه السلام) لە هەواڵدانەکەیدا بە ووشەی (کانَ) دووا تێپەڕبوونی کاتەکە دەگەیەنێت، مەبەستی زەکەریاش لەم دەربڕینە، ئەوەی بە دوور دانا کە کوڕیان ببێت و هێنانی مەبەستەکە بە (فعل ماضي) واتە کرداری ڕابردوو، بەهێز تربووە).[٣٦٣] ئەوە دەگەیەنێت کە هاوسەرەکەی هەر لەتەمەنی گەنجییەوە نەزۆك بووە، دەبێت ئێستا حاڵی چۆن بێت کە گەیشتۆتە تەمەنی گەورە بوون ونائومێدی.!

﴿فَهَبْ لِي مِن لَّدُنكَ وَلِيًّا﴾ واتە کەسێکم پێ ببەخشە کە کار و بارەکانم لە دوای خۆم بۆ بەڕێوە بەرێت و لەسەر بەرنامەی من بڕوات ﴿يَرِثُنِي وَيَرِثُ مِنْ آلِ يَعْقُوبَ﴾ ببێتە میراتگری من و ئالی یەعقوب بەڵام لە ماڵ وسامان و داراییدا نا، بەڵکو میراتگری پێغەمبەرایەتی و حیکمەت و دانایی و شارەزایی و لەدیندا. پێغەمبەران (علیهم السلام) دینار و درهەم لەدوای خۆیان جێ ناهێڵێن، بەڵکو حیکمەت و هیدایەت و چاك سازی جێدەهێڵن،میرات یان لەماڵ وسامان ومولك وشتی دنیایدا دەبێت، یان لەزانست وحیکمەت، یان لەپێغەمبەرایەتی وچاکەکاریدا، ئەوە یەکەمیان بەدوور گیراوە، چونکە ئەوداوای کوڕی نەکردووە تاببێتە میراتگری ماڵ وسامانەکەی. چونکە پێغەمبەران ماڵ وسامان لەدوای خۆیان جێ ناهێڵن.

---

[٣٦٢] -رواه الطبراني في كتاب الدعاء عن ابي هريرة.

[٣٦٣] -مفاتيح الغيب للرازي٢١|٨٣.

هەروەها میراتی موڵك وپاشایەتیشی نەبووە، چونکە زەکەریا (علیه السلام) پاشا نەبووە، و ئەوەو بنەماڵە وئالی یەعقوبیش پاشا نەبوون و پاشایەتیان لەدوای خۆیان جێنەهێشتووە، ویەحیاش (علیه السلام) نەبووەتە پاشا.
لێرەدا میراتی ڕاستی وحەقیقی ئەوەیە کە لەباوکی وەری گرتووە، کە پێغەمبەرایەتی وچاکەکاری وزانست وحیکمەتە.
بەشی ئێمەیش لە میراتی پێغەمبەران(علیهم السلام)بریتی بووە لە زانست، چونکە زانست میراتی پێغەمبەران بووە.
*خاوەنی (المفردات) دەڵێت: (ئایەتی: ﴿...وَيَرِثُ مِنْ آلِ يَعْقُوبَ﴾ واتە: میراتی پێغەمبەرایەتی وزانست وڕێز بەبێ ماڵ وسامان. چونکە ماڵ وسامان نرخی نییە لای پێغەمبەران هەتا مونافەسەی لەسەر بکەن، بەڵکو زۆر کەم حسابیان بۆ ماڵ وسامان کرد و زۆرکەم بۆ خۆیانیان بەدەست هێناوە).[٣٦٤]
﴿وَاجْعَلْهُ رَبِّ رَضِيًّا﴾ واتە: (پەروەردگارا بیکە بە کەسێکی وا کە تۆیش و بەندە چاکەکانیشت لێی ڕازی بن، ئەوەندە چاکەکار و چاکەخواز ودیندار بێت).
خوای گەورە لە کۆتایی سوورەتی (مریم)دا دەفەرموویت: ﴿إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ سَيَجْعَلُ لَهُمُ الرَّحْمَنُ وُدًّا﴾(مريم:٩٦).
واتە: (بەڕاستی ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە و کارو کردەوە چاکەکانیان ئەنجامداوە، لە ئایندەدا خوای میهرەبان سۆز و خۆشەویستی و ڕێزی (تایبەتیان) بۆ ئامادە دەکات، (هەروەها لە لایەن فریشتەکان و ئیمانداران و نیشتەجێکانی بەهەشتەوە)). خۆشەویست و ڕێزدارن.
(ابوهريرة) (خوا لێی ڕازی بێت) دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (بەڕاستی خوای گەورە ئەگەر بەندەیەکی خۆش ویست) ئەوا بانگی جوبرەئیل(علیه‌السلام)دەکات وپێی دەفەرمووێت: بەڕاستی من فلانە کەسم خۆشدەوێت، دەی تۆیش خۆشت بوێت. دەفەرمووێت: ئیتر جوبرەئیلیش خۆشی دەوێت، پاشان لە ئاسماندا جاڕدەدات ودەڵێت:بەڕاستی خوای گەورە فلانەکەسی خۆش دەوێت، دەی ئێوەیش خۆشتان

[٣٦٤] —المفردات للراغب ص|٥١٩ مادة: و ر ث.

بوویت، ئیتر ئەوەی لە ئاسماندایە خۆشی دەویت، دوای ئەوە لە زەویدا پەسەند دەکریت).

ئەگەر خوای گەورە ڕقی لە بەندەیەك بوو، ئەوا جبریل (علیەالسلام) بانگ دەكات وپێی دەفەرموویت: بەڕاستی من ڕقم لە فلانە کەسە، دەی تۆیش ڕقت لێی بیت، ئیتر جبریل (علیەالسلام) ڕقی لێی دەبیتەوە، پاشان لە ئاسماندا جاڕدەدات ودەلیت: (بەڕاستی خوای گەورە ڕقی لە فلانە کەسە، دەی ئێوەیش ڕقتان لێی بیت، ئەوانیش ڕقیان لێی دەبیتەوە، دوای ئەوە ڕق وخۆش نەویستنی لەزەویدا بۆ دادەنریت).[٣٦٥]

*هەروەها لە سوورەتی (الأنبیاء)یشدا، باسی دوعاكەی زەكەریا (علیەالسلام) هاتووە، كە لەم ئایەتەدا خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَزَكَرِيَّا إِذْ نَادَىٰ رَبَّهُ رَبِّ لَا تَذَرْنِي فَرْدًا وَأَنتَ خَيْرُ الْوَارِثِينَ﴾(الأنبیاء:٨٩).

ڕونکردنەوەیەك:لەوسێ شوێنەدا کە قورئانی پیرۆز دەربارەی دوعاکەی زەکەریا (علیەالسلام) دوا، ناوەڕۆکی ئایەتەکان ئەوەیان ڕوون کردۆتەوە کە ڕەحمەت وبەزەیی خوا بۆ پێغەمبەران (علیهم السلام) بووە و ناز و نیعمەتی خوایان زۆر بەسەردا ڕژاوە، تێبینی ئەوەیش دەکەین کە ناوەڕۆکی دوعاکەی زەکەریا (علیه السلام) لەهەرسێ سوورەتەکەدا یەکە و یەك ئامانجیان هەیە، با هۆکارەکانیشی جیاواز بووبن، بێگومان جۆرا وجۆری و ڕاستی ئەودوعایە دەردەخات ومەبەستەکەی ڕوون دەکاتەوە، ودەشگونجێت دوعاکە لەلایەن زەکەریا (علیه السلام) ەوە دووبارە و چەندبارە کرابێتەوە، هەروەها دەشگونجێت کە تەنها یەك جار ئەو دوعایەی کردبێت، بەلام قورئانی پیرۆز ئەو دوعایەی لەسێ شوێنی سێ سوورەتدا تۆمارکردووە، ئەم شوێنانەیش ڕاستی ومەبەستی دوعاکەیان کۆکردۆتەوە، بە جۆرێك کە هەر شوێنێکیان مەبەستی خۆی دەگەیەنێت، و بەجۆرێك لە هەر هەرسێ شوێنەکەدا شێوەیەکی تەواو پێك بهێنێت، بۆ ڕاستی و مەبەستی دوعاکە، کە ئەمە بۆ خۆی شێوازێکە لە شێوازەکانی ئیعجازی قورئانی، کە وێنەی یەك مانا و واتا دەگەیەنێت بەلام لەچەند شێوەیەکدا هەروەك دژیەك و تێکەلّ بوون لە نێوانیاندا نییە، بەلکو هاومانایی و هاو واتایی کۆیان دەکاتەوە، تەواو پێکەوە بەندن.

---

[٣٦٥]-رواه مسلم في صحيحه عن ابي هريرة كتاب البر والصلة والاداب.

خوای گەورە ڕاست وجوانی فەرمووە: ﴿أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ الْقُرْآنَ وَلَوْ كَانَ مِنْ عِندِ غَيْرِ اللَّهِ لَوَجَدُوا فِيهِ اخْتِلَافًا كَثِيرًا﴾(النساء٨٢).

واتە: (ئەوە بۆچی ئەوان سەرنجی قورئان نادەن ولێکی نادەنەوە و لێی ورد نابنەوە؟ خۆ ئەگەر لەلایەن کەسێکی ترەوە بوایە جگە لەخوا، بێگومان دژایەتی وجیاوازیەکی زۆریان تێدا دەدۆزی یەوە).

*لە سوورەتی (الأنبیاء)دا خوای گەورە دەربارەی دوعاکەی زەکەریا (علیه السلام) فەرمووی: ﴿وَزَكَرِيَّا إِذْ نَادَىٰ رَبَّهُ رَبِّ لَا تَذَرْنِي فَرْدًا وَأَنتَ خَيْرُ الْوَارِثِينَ﴾(الأنبیاء:٨٩).

لەم شوێنەدا زەکەریا (علیه السلام) داوا لە خوای گەورە دەکات کە بە تەنها جێی نەهێڵێت بەبێ بەخشینی کوڕ پێی بەڵکو کورشی ببێت وببێتە میراتگری پێغەمبەرایەتی یەکەی و بە کارەکانی ئەو هەڵسێت لەدوای خۆی.

میراتگری ڕاستەقینە هەر خوایە، تەنها خۆی دەمێنێت و هەمووشت لەناو دەچێت.

خوای گەورە فەموویەتی: ﴿إِنَّا نَحْنُ نَرِثُ الْأَرْضَ وَمَنْ عَلَيْهَا وَإِلَيْنَا يُرْجَعُونَ﴾(مریم:٤٠).

واتە: (بەڕاستی سەرئەنجام هەر ئێمە دەیبەینەوە، خاوەن ومیراتگری سەرزەوی و هەموو ئەوانەی کە لەسەریەتی و بۆ لای ئێمەیش دەگەڕێنەوە).

*پێشەوا (الآلوسی) لەمانای ﴿وأنت خير الوارثين﴾دا، دەڵێت، ئەمە مەدح وسەنای تیایە بۆخوای گەورە بەوەی کەهەر خۆی باقییەوە میراتگری ڕاستەقینەی هەموو شتەکانە و ئاماژەیشە بۆ لەناوچوونی هەموو شتە زیندوەکان بێجگە لەخۆی، هەروەها لەمەیشدا بارانی ڕەحمەت داوا کراوە لەبەزەیی و لوتفی خوای گەورە).[٣٦٦]

[٣٦٦] –روح المعاني للالوسي ١٧|٨٧ بە دەستکارییەوە.

## وەڵامی خوا بۆ دوعاکەی زەکەریا ( علیه السلام ) و مژدەدانی فریشتەکان بەلەدایك بوونی ( یحیی )

١- خوای گەورە لە سوورەتی: (آل عمران) دادەفەرمووێت: ﴿فَنَادَتْهُ الْمَلَائِكَةُ وَهُوَ قَائِمٌ يُصَلِّي فِي الْمِحْرَابِ أَنَّ اللَّهَ يُبَشِّرُكَ بِيَحْيَى مُصَدِّقًا بِكَلِمَةٍ مِنَ اللَّهِ وَسَيِّدًا وَحَصُورًا وَنَبِيًّا مِنَ الصَّالِحِينَ﴾(آل عمران:٣٩).

٢- لە سوورەتی (مریم)دا، دەفەرمووێت: ﴿يَا زَكَرِيَّا إِنَّا نُبَشِّرُكَ بِغُلَامٍ اسْمُهُ يَحْيَى لَمْ نَجْعَلْ لَهُ مِنْ قَبْلُ سَمِيًّا﴾(مریم:٧).

٣- لە سوورەتی (الأنبیاء)دا دەفەرمووێت: ﴿فَاسْتَجَبْنَا لَهُ وَوَهَبْنَا لَهُ يَحْيَى وَأَصْلَحْنَا لَهُ زَوْجَهُ إِنَّهُمْ كَانُوا يُسَارِعُونَ فِي الْخَيْرَاتِ وَيَدْعُونَنَا رَغَبًا وَرَهَبًا وَكَانُوا لَنَا خَاشِعِينَ﴾ (الأنبیاء:٩٠).

١-لە شوێنی یەکەمدا لە سوورەتی (آل عمران)دا، خوای گەورە باسی ئەوە دەکات کە فریشتەکان بانگیان کرد لە زەکەریا(علیه السلام) کە ئەو لەناو میحرابەکەدا نوێژی دەکرد، ومژدەیان داپێی بە کوڕێك بەناوی (یحیی) کە گەورە و ڕێزدار و خۆپارێزە لە گوناهەکان و پێغەمبەرێکە لەچاکان.

﴿أَنَّ اللَّهَ يُبَشِّرُكَ بِيَحْيَى﴾ مژدە پێدراوەکە (یحیی) بوو، و ئەوە دەگەیەنێت کەخوای گەورە ئەو ناوە جوان و موبارەکەی بۆ هەڵبژاردووە.

لە سوورەتی (مریم)دا: ﴿يَا زَكَرِيَّا إِنَّا نُبَشِّرُكَ بِغُلَامٍ اسْمُهُ يَحْيَى لَمْ نَجْعَلْ لَهُ مِنْ قَبْلُ سَمِيًّا﴾(مریم:٧).

لەم ئایەتەدا ئاماژە بۆ ئەوە کراوە کە مژدە پێ دراوەکە (یحیی) (علیه السلام) بووە، دواتر لەدایك دەبێت وگەورە دەبێت تا دەبێتە کوڕێکی تەواو و لەئایەتی: ﴿لَمْ نَجْعَلْ لَهُ مِنْ قَبْلُ سَمِيًّا﴾ ئەوە دەگەیەنێت کەئەم ناوە پێش (یحیی) کەسی پێ ناونەنراوە، ئەوە ناوێکی تازە و نۆبەرەیە. وناوی تازە و نۆبەرەیش کاریگەری خۆی لە نەفسەکاندا دەبێت، هەڵبژاردنی ئەم ناوەیش بۆ(یحیی) (علیه السلام)نیعمەت وبەخششێکی خوایی بوو: ﴿وَوَهَبْنَا لَهُ يَحْيَى﴾ ناو لێنراو و ناوەکە بەخشش ونیعمەتی خوایی بوون.

* خاوەنی (التحرير و التنوير) دەڵێت: (ناوی (یحیی) ناوێکی نۆبەرە و تازە بوو، وناوی تازەیش ناوازە و تاکە و تایبەتمەندی خۆیی هەیە: هێزی ناسینی ناولێنراوەکە لەبەر کەمی هاوبەشەکانی تیایدا، چونکە نمونەی زۆرنابێت، هەروەها چاولێکەری خەڵکی لێی لەپاش خۆی، کاتێك منداڵەکانیان بەو ناوەوە ناودەنێن).[٣٦٧]

دایکان وباوکان پێشبڕکێی یەکتری دەکەن بۆدۆزینەوەی ناوی نوێ ونۆبەرە و خۆش.

دەربارەی نهێنی ناونانی بەم ناوەوە، وتراوە: چونکە خوای گەورە دڵی بە ئیمان وگوێڕایەڵی زیندوکردۆتەوە، ئیمان ژیانی دڵەکانە، و گوێڕایەڵیش توێشوەکەیەتی، وتراوە: چونکە خوای گەورە دڵی بە پێغەمبەرایەتی و پەیامی پێغەمبەرایەتی زیندو کردبویەوە، وتراوە: دین بەهۆی ئەوەوە زیندو بویەوە و بوژایەوە، و زەکەریاش (علیه السلام) تەنها لەبەر دین ولەپێناوی دیندا داوای کرد.[٣٦٨]

وتراوە: چونکە بەشەهیدی مرد، بەڵام لەڕاستیدا زیندوون لای پەروەردگاریان و ڕزق و ڕۆزییان هەیە.

**ڕونکردنەوەیەك دەربارەی ژیانی ڕاستەقینە :**

مامۆستا(عبدالكريم الخطيب) لە تەفسیرەکەیدا دەڵێت:(لە ناونانی ئەو بە (یحیی) ئاماژەیە بۆ ئەوەی کەیادی بەزیندویی دەمێنێتەوە وهەمیشەیی دەبێت لەم ژیانەدا، وژیانی لەدوای مردنیشی هەر زیندو دەمێنێتەوە وبەردەوام دەبێت، بەوەی کە لەسەر زمانی خەڵکی دەوترێتەوە ویاد دەکرێتەوە، ولەپلەی ستایشکراودا دەبێت).[٣٦٩]

ژیانی ڕاستەقینە لە باوەڕ بەخوا بوون وزانستی بەسود و کردەوەی چاکدایە، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ أَوَمَنْ كَانَ مَيْتًا فَأَحْيَيْنَاهُ وَجَعَلْنَا لَهُ نُورًا يَمْشِي بِهِ فِي النَّاسِ كَمَنْ مَثَلُهُ فِي الظُّلُمَاتِ لَيْسَ بِخَارِجٍ مِنْهَا كَذَلِكَ زُيِّنَ لِلْكَافِرِينَ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾(الأنعام:١٢٢).

واتە: (ئایا ئەو کەسەی کە مردوو بوو (بەهۆی بێ باوەڕی یەوە)، ئینجا (بەهۆی ئیمانەوە) زیندومان کردەوەو نوورو ڕوناکیەکمان بۆسازکرد لەژیانیدا (کە قورئانە) لەناو خەڵکیدا پێی دەڕوات و هەڵس و کەوتی پێ دەکات(هاندەریەتی بۆ هەموو چاکەیەك ودەیگێڕێتەوە لە هەموو خراپەیەك، ئایائەوکەسە) وەکو ئەوە وایە لەناو تاریکیەکاندا

[٣٦٧] التحرير والتنوير للطاهر بن عاشور ١٦|٩٦ بە دەستکارییەوە.
[٣٦٨] -التفسير القرآني لعبدالكريم الخطيب ١٦|٧٢٥-٧٢٦.
[٣٦٩] - التفسير القرآني لعبدالكريم الخطيب ١٦|٧٢٥-٧٢٦.

گیری خواردوە لێی دەرناچێت، هەروەها ئا بەو شێوەیەیە، کەدەبینرێت، ئەو کار و کردەوەی کە دەیکەن بۆیان ڕازێنراوەتەوە).

لە ئایەتێکی تردا دەفەرمووێت: ﴿مَنْ عَمِلَ صَالِحًا مِنْ ذَكَرٍ أَوْ أُنْثَى وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَنُحْيِيَنَّهُ حَيَاةً طَيِّبَةً وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَجْرَهُمْ بِأَحْسَنِ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾(النحل:٩٧).

واتە: (ئەوەی کارو کردەوەی چاکەی کردبێت، پیاو بێت یان ئافرەت لە کاتێکدا بڕوادار بێت، سوێند بە خوا بە ژیانێکی کامەران و ئاسوودە لە دنیادا دەیژێنین، لە قیامەتیشدا پاداشتیان بە جوانتر دەدەینەوە لەوەی کە ئەوان دەیانکرد.) مامۆستا (سید قطب) لە پێشەکی تەفسیرەکەیدا چەند ووشەیەکی جوان دەڵێت، منیش پێم جوانە و حەز دەکەم لێرەدا بۆ ئێوەی باس بکەم:

دەڵێت: (ژیان لەسێبەری قورئاندا نیعمەتە، نیعمەتێکە کەس نایزانێت وکەس نایناسێت چۆنە، تا نەیچێژێت، نیعمەتێکە تەمەن بەرزدەکاتەوە و بەرەکەتدار و پیرۆزی دەکات و پاکی دەکاتەوە، سوپاس وستایش بۆخوا. ....بەڕا ستی خوای گەورە منەتی کردوە بەسەر مندا بە ژیان لە سێبەری قورئاندا بۆ ماوەیەك لەکات، ناز و نیعمەتەکانیم چەشتووە کەهەرگیز لەژیانمدا شتی وام نەچەشتبوو، ئەو نیعمەتانەم چەشت کەتەمەن بەرز دەکەنەوە وپیرۆز و بەرەکەتداری دەکەن وپاکی دەکەنەوە...).[٣٧٠]

﴿مُصَدِّقًا بِكَلِمَةٍ مِنَ اللَّهِ﴾.

باوەڕدار بوو بەعیسا (علیه السلام) وتراوە (یحیی) (علیه السلام) یەکەم کەس بووە کە باوەڕی بەعیسا (علیه السلام) هێناوە و بەڕاستی زانیوە، بەعیسا وتراوە: ﴿كَلِمَةِ اللَّهِ﴾ چونکە بە وشەی خوای گەورە دروستبووە، کە بریتی بوو لە ئایەتی: ﴿كُنْ فَيَكُونُ﴾ ووتراوە: باوەڕدار بووە بە کیتابی خوا.

﴿وَسَيِّدًا﴾ وتراوە: بەڕێز بووە، ووتراوە:زۆر ئارامگر بووە، وتراویشە زۆر ئەخلاق و ڕەوشت جوان بووە، وتراوە خواناسی و لە خوا ترس و بەڕێز و پایەدار بووە، وتراوە شارەزا بووە لە زانستی شەرعی و زانایش بووە، و ڕازی بووە بە قەزا و بڕیاری خوایی،

---

[٣٧٠] في ظلال القران للاستاذ سيد قطب ١|١١.

و گوێڕایەڵ بووە، وپشتی بەخوا بەستووە، و هیمەتی بەرز و گەورە و بڵند بووە، و لە خەیر و چاکەدا لەسەروی قەومەکەیەوە بووە. [٢٧١]

پوختەی قسان دەربارەی ﴿وَسَيِّدًا﴾ واتە: بێگومان ئەو گەورە و سەرپەرشتی نەفسی خۆی بووە، بەوەی کە لەسەر گوێڕایەڵی فەرمانی خوا ڕایهێناوە و لە نافەرمانی و سەرپێچی دووری خستۆتەوە، و گەورە و پێشەوای قەومەکەی بووە بەوەی کە بە ئەخلاق و ڕەوشتە جوانەکان بیانڕازێنێتەوە، هەرکەس گەورەیی و سەرپەرشتیاری نەفسی خۆی بکات، ئەوا گەورەیی و سەرپەرشتیاری غەیری خۆیشی پێ دەکرێت.

﴿وَحَصُورًا﴾ واتە: پارێزەر بووە و نەچووە بەلای سەرپێچیدا و مەیلی بەلایدا نەبووە، واتە:بێگومان نەفسی خۆی گەمارۆ داوە وجڵەوگیری کردووە و لەحەزە دنیاییەکان قەدەغەی کردووە. [(٢٧٢)]

وتراوە: ئەوکەسە بووە کەنەدەچوو بەلای ئافرەتدا، نەك لەبەر لاوازی و نەتوانین، بەڵکو لەبەر دنیا نەویستی و سەرقاڵ بوونی بە فەرمانەکانی خوا و گوێڕایەڵی کردنی و نزیك بونەوەی لە خوا. [٢٧٣]

ووشەی ﴿حَصُورًا﴾ سیفەتێکی پەسەند و مەدح کراو بوو، نەك ناپەسەندو زەم کراو، ناوەڕۆکی ئایەتەکەیش بەڵگە لەسەر ئەوە دەدات، کاتێك فریشتەکان ئەو مژدەیەیان بۆ هێنا، بۆ ئەوە بوو کە خۆشی و شادومانی بخەنە سەر دڵ و دەرونی.

بە پێی بەڵگە ڕاست و دروستەکان، ئیمەش دەڵێین:بێ گومان (یحیی) (علیه السلام) توانای ئەوەی هەبووە کە بچێتە لای ئافرەت و کاری هاوسەرداری حەڵاڵ بەجێ بگەیەنێت، هیچ بێتواناییەك لای ئەو بونی نەبووە یان کەم و کوڕ نەبووە لەکاری ژن هێنان و هاوسەرداریدا، بەڵام پشتی لەو کارە هەڵکردوە و دنیا نەویستی هەڵبژاردوە وخۆی سەرقاڵ کردووە بە گوێڕایەڵی فەرمانەکانی خوا و گەیاندنی بانگەواز و بەرنامەکەی، ئەمەیش لە مافی ئەودا کارێکی پەسەند و جوان و مەدح کراو بووە، بێگومان خوای گەورە ئەم سیفەتەی وا لەناو باسی سیفەتە پەسەندەکاندا باسکردوە کە ڕێزداری کردون، کاتێك (یحیی) (علیه السلام) هاوسەری بۆ خۆی هەڵنەبژاردووە، ئەمە

[٢٧١] -النکت والعیون للامام الماوردي ١|٣١٣.

[٢٧٢] -تفسیر ابن کثیر ١|٣٦١ و روح البیان للبروسوي ٢|٣١.

[٢٧٣] - تفسیر ابن کثیر ١|٣٦١ و مفاتیح الغیب ٨|٣٦.

بەتمەندییەکی خۆی بووە، کە خوای گەورە ئەوی پێ تایبەت کرد بوو، کە لە حەق و فی ئەودا پەسەند و مەدح کراو بووە، چونکە خوای گەورە بەو کارە مەدحی ئەوی کردووە.

﴿ونبياً من الصالحين﴾. واتە: پێغەمبەرێکە لە چاکان. واتە لە ناو ئەواندا گەورە بووە و پێگەیشتووە چونکە لە پشتی ئەوان هاتووە و لە دەستە و تاقمی ئەوانە.

وتراوە: چاکە کارییەکە لەسەرو چاکەوە بووە. ودوعاو پاڕانەوەکەی سولەیمان پێغەمبەریش(علیه السلام) لەسەر ئەوە دامەزرا بوو، وەك خوای گەورە باسی کردووە و فەرموویەتی: ﴿ وَأَدْخِلْنِي بِرَحْمَتِكَ فِي عِبَادِكَ الصَّالِحِينَ﴾(النمل:١٩).[٣٧٤]

پێشەوا (الرازی) دەڵێت: (ئەگەر وترا: کاتێك پلەی پێغەمبەران (علیهم السلام) بەرزترە لە پلەی (الصلاح) چاکەکاری، ئیتر سودی ئەو پلەی چاکەکارییە چییە پاش ئەوەی کە بە پێغەمبەر وەسف کراوە؟ دەڵێین:بێ گومان پێغەمبەران (علیهم السلام) ئەندازەیەکی باشیان لە چاکەکاری هەیە، ئەگەر لای بەریت، ئەوا نەفی پێغەمبەرایەتیت کردووە، لەبەر ئەوە ئەو ئەندازەیە بە نیسبەت ئەوانەوە، شوێنی ئەرك و واجبەکان دەگرێتەوە بەنیسبەت لای ئێمەوە، پاشان پێغەمبەران ئەندازەیەکی زیاتریان هەیە لەو بەشداری کردنەدا ، کە پلەو پایەی ئەوان جیاوازە لە ڕوی زیاتر چاکەیانەوە، وهەرکەس بەشی لەوەدا زیاتر بێت، ئەوا ڕێز و پلە و پایەی زیاترە. خوا زاناترە).[٣٧٥]

مامۆستا (عبدالکریم الخطیب) لە کتێبەکەیدا (التفسیر القرآني للقرآن) دەڵێت: (....مانای ئەم (الصلاح) چاکەکارییە واتە: بێگومان چاکەکاری سیفەتێکی پێویستە بۆ ئەو پێش پێغەمبەرایەتی ولەگەڵ پێغەمبەرایەتیشدا، خۆ ئەگەر ئەو پێغەمبەریش نەبێت، ئەوا کەسێکی چاکەکار دەبێت لەچاکەکاران).[٣٧٦]

٢- لە شوێنی دووەمدا لە سوورەتی (مریم)دا، وەڵام لەلایەن خوای گەورەوە دێت: ﴿يَا زَكَرِيَّا إِنَّا نُبَشِّرُكَ بِغُلَامٍ اسْمُهُ يَحْيَى لَمْ نَجْعَل لَّهُ مِن قَبْلُ سَمِيًّا﴾ واتە: لە خەڵکی ئەو سەردەمەی کە (یحیی)ی تیا ژیاوە، هاوشێوە و لێکچوویەکی تری نەبووە لە(یحیی) بچێت، یان کەسێك نەبووە کە ناوی وەك ناوی (یحیی) بووبێت و لەو ناوەدا بەشداربوو بێت.

---

[٣٧٤] -روح المعاني للالوسي ٣|١٤٨ و روح البيان ٢|٣١.

[٣٧٥] -مفاتيح الغيب للامام الرازي ٨|٣٧.

[٣٧٦] التفسير القرآني للقرآن لعبدالكريم الخطيب ٣|٤٤٠.

زانا (الزمخشري) دەڵێت: (یحیی) هاوشێوەی نەبووە لەوەدا کە ئەم سەرپێچی نەکردووە و بەلایدا نەچووە، و هەرگیز گوێی نەداوە بە سەرپێچی کردن ومەیلی بەلایدا نەبووە، وبێگومان ئەو لەنێوان پیاوێکی پیرو بەتەمەن وئافرەتێکی نەزۆکدا لەدایك بووە، وکەسێکی پارێزراو و خۆپارێز بووە).[٢٧٧]

٣- لە شوێنی سێیەمدا لە سوورەتی (الأنبیاء)دا فەرمووی: ﴿فَاسْتَجَبْنَا لَهُ وَوَهَبْنَا لَهُ يَحْيَى وَأَصْلَحْنَا لَهُ زَوْجَهُ إِنَّهُمْ كَانُوا يُسَارِعُونَ فِي الْخَيْرَاتِ وَيَدْعُونَنَا رَغَبًا وَرَهَبًا وَكَانُوا لَنَا خَاشِعِينَ﴾(الأنبیاء:٩٠). بێگومان ئەم ئایەتە ئەوە دەگەیەنێت، کە خوای گەورە بەڕاستی وەڵامی دوعاو داواکاری یەکەی زەکەریا (علیه السلام)ی داوەتەوە، وخێزانەکەی بۆ چاك کرد کە ئامادە بێت بۆ سکپڕ بوون و منداڵ بوون، و خوای گەورە ستایشی زەکەریا و یەحیا و خێزانی زەکەریای کرد، وەك فەرمووی: ﴿كَانُوا يُسَارِعُونَ فِي الْخَيْرَاتِ﴾ واتە: دەست پێشکەری دەکەن بۆ ئەنجامدانی کاری خەیر و گوێڕایەڵی.

﴿يَدْعُونَنَا رَغَبًا وَرَهَبًا﴾. واتە: لە نێوان حەز و ترسدان، ئەمە حاڵی باوەڕدارە، وەك خوای گەورە فەرمووی: ﴿ أُولَٰئِكَ الَّذِينَ يَدْعُونَ يَبْتَغُونَ إِلَىٰ رَبِّهِمُ الْوَسِيلَةَ أَيُّهُمْ أَقْرَبُ وَيَرْجُونَ رَحْمَتَهُ وَيَخَافُونَ عَذَابَهُ إِنَّ عَذَابَ رَبِّكَ كَانَ مَحْذُورًا﴾ (الأسراء:٥٧).

واتە: (ئا ئەوانەی کە ئەوان هاناو هاواریان لێ دەکەن، کامیان لە خوا نزیکترە؟! لە کاتێکدا کە ئەوان خۆیان هاوار لە خوا دەکەن و داوای نزیك بوونەوە لە پەروەردگاریان دەخوازن و چاوەڕوانی ڕەحمەتی دەکەن، لە سزا و تۆڵەشی دەترسن، بەڕاستی سزای پەروەردگارت مەترسی لێکراوە).

﴿وكانوا لنا خاشعين﴾ هەمیشە گەردن کەچ بوون بۆ خوای گەورە.

[٢٧٧]-الكشاف للزمخشري ٣|٥ بە دەستکارییەوە.

## هەڵوێستی زەکەریا ( علیه السلام ) لەم مژدەیەدا

**خوای گەورە لە سوورەتی (آل عمران)دا دەفەرمووێت:** ﴿قَالَ رَبِّ أَنَّىٰ يَكُونُ لِي غُلَامٌ وَقَدْ بَلَغَنِيَ الْكِبَرُ وَامْرَأَتِي عَاقِرٌ ۖ قَالَ كَذَٰلِكَ اللَّهُ يَفْعَلُ مَا يَشَاءُ (٤٠) قَالَ رَبِّ اجْعَل لِّي آيَةً ۖ قَالَ آيَتُكَ أَلَّا تُكَلِّمَ النَّاسَ ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ إِلَّا رَمْزًا ۗ وَاذْكُر رَّبَّكَ كَثِيرًا وَسَبِّحْ بِالْعَشِيِّ وَالْإِبْكَارِ﴾(آل عمران: ٤٠-٤١).

**لە سوورەتی (مریم)دا دەفەرموێت:** ﴿قَالَ رَبِّ أَنَّىٰ يَكُونُ لِي غُلَامٌ وَكَانَتِ امْرَأَتِي عَاقِرًا وَقَدْ بَلَغْتُ مِنَ الْكِبَرِ عِتِيًّا (٨) قَالَ كَذَٰلِكَ قَالَ رَبُّكَ هُوَ عَلَيَّ هَيِّنٌ وَقَدْ خَلَقْتُكَ مِن قَبْلُ وَلَمْ تَكُ شَيْئًا (٩) قَالَ رَبِّ اجْعَل لِّي آيَةً ۚ قَالَ آيَتُكَ أَلَّا تُكَلِّمَ النَّاسَ ثَلَاثَ لَيَالٍ سَوِيًّا (١٠) فَخَرَجَ عَلَىٰ قَوْمِهِ مِنَ الْمِحْرَابِ فَأَوْحَىٰ إِلَيْهِمْ أَن سَبِّحُوا بُكْرَةً وَعَشِيًّا﴾(مریم:٨-١١).

**زەکەریا (علیه السلام) لە پەروەردگاری پاڕایەوە کە کوڕێکی پێ ببەخشێت، و خوای گەورەیش وەڵامی دوعاکەی دایەوە، وفریشتەکان هاتن ومژدەی ئەو منداڵەیان پێدا، کە پێغەمبەرایەتی و چاکەکاری بەمیرات وەربگرێت، وەڵامدانەوەکەی خوایش لەناکاو و پڕبوو بۆ زەکەریا(علیه السلام).**

**پاشان زەکەریا (علیه السلام) بە سەرسوڕمانەوە دەربارەی ئەم مژدەیە و بەسوپاسگوزاری بۆ خوای گەورە لەسەر ئەم نیعمەتو داواکردنی چۆنیەتی جێ بەجێ بوونی کارەکە وتی:** ﴿رَبِّ أَنَّىٰ يَكُونُ لِي غُلَامٌ وَقَدْ بَلَغَنِيَ الْكِبَرُ وَامْرَأَتِي عَاقِرٌ﴾.

**پێشەوا (الرازی) دەڵێت (الکِبَر) واتا گەورە و چوبێتە تەمەنەوە، (إبن عباس) دەفەرمووێت: ئەو ڕۆژەی زەکەریا (علیه السلام) مژدەی کوڕەکەی پێدرا تەمەنی (١٢٠) ساڵ بوو، و ژنەکەیشی تەمەنی (٩٨) ساڵ بوو.**[(٣٧٨)]

**خوا زاناترە بەتەمەنی خۆی و هاوسەرەکەی، بەڵام ئەوەی کە لێرەدا گرنگە، هەردووکیان گەیشتونەتە تەمەنێکی گەورە.**

---

[٣٧٨] -مفاتیح الغیب للرازي ٨/٣٩.

**خاوەنی (روح البیان) دەڵێت: ﴿وقد بلغني الكبر﴾ واتە: زەکەریا وتی: تووشی تەمەنی گەورەیی هاتووم وکاری تێ کردووم، ئەوەی لێ دەردەکەوێت کە تەمەنی گەورە خۆی لە خۆیدا نیشانەی مردنەو، داوای مردنی ئینسان دەکات و دەستی لێ هەڵناگرێت.)[٣٧٩]**

**پرسیارکردنی زەکەریا (علیه السلام) لە چۆنیەتی ڕوودانی ئەو مژدەیە، ئایا دەبێت بگەڕێتەوە بۆ سەردەمی گەنجی لەگەڵ هاوسەرەکەیدا؟ یان گەنجێتی بۆ دەگەڕێتەوە و ژنێکی تر دەکاتە هاوسەری خۆی و منداڵی لێی دەبێت؟.**

**لە سوورەتی (مریم)دا فەرمووی:** ﴿قَالَ رَبِّ أَنَّىٰ يَكُونُ لِي غُلَامٌ وَكَانَتِ امْرَأَتِي عَاقِرًا وَقَدْ بَلَغْتُ مِنَ الْكِبَرِ عِتِيًّا﴾(مريم:٨).

*** پێشەوا (الکرمانی) دەڵێت: لە سوورەتی (آل عمران)دا باسی تەمەن گەورەبوونەکەی زەکەریا (علیه السلام) لە پێشدا کرا، پاشتر باسی خێزانەکەی کرا، بەڵام لە سوورەتی (مریم)دا فەرمووی:** ﴿وَكَانَتِ امْرَأَتِي عَاقِرًا وَقَدْ بَلَغْتُ مِنَ الْكِبَرِ عِتِيًّا﴾. **باسی خێزانەکەی پێشکەوت، چونکە لە سوورەتی (مریم)دا لە پێشتر باسی گەورەبوونی کرا لەئایەتی:** ﴿وَهَنَ الْعَظْمُ مِنِّي﴾ **و باسی خێزانەکەی دواکەوت لە ئایەتی:** ﴿وَإِنِّي خِفْتُ الْمَوَالِيَ مِن وَرَائِي وَكَانَتِ امْرَأَتِي عَاقِرًا﴾. **پاشان باسەکەی دووبارە کرایەوە، وگەورە بوونی تەمەنی زەکەریا دواکەوت بۆئەوەی لەگەڵ** ﴿عِتِيًّا﴾**دا ڕێك بکەوێت...).[٣٨٠]**

**ئایەتی:** ﴿عِتِيًّا﴾ **واتە: کۆتایی گەورە بوون و تەمەن و ووشك بوونەوەیە بریتییە لەو تەمەنەی کەئێسك وجومگەکانی تیا ووشك دەبێتەوە، و حاڵەتێکە ئومێدی چاك بوونەوە و بەردەوامی ژیانی لێ ناکرێت.**

*** لێرەدا ئەوەمان لا گرنگە کە ئاماژە بکەین بۆ ئەوەی کە زانستی نوێ لەگەڵ ئەو هەموو پێشکەوتنە بە دەستهاتو و توانا گەورانەدا لەبواری پزیشکیدا بێگومان تا ئێستا چارەسەرێکیان بۆ دەردی پیری نەدۆزیوەتەوە و هەرگیزیش نایدۆزنەوە، و ئەوانەی کە دەچنە ساڵەوە و تەمەنیان گەورە دەبێت، هەر لە لاوازی و پوکانەوەدا دەبن و تووشی نەخۆشی دێن.**

---

[٣٧٩] روح البيان للبروسوي ٢|٣١ بە دەستکارییەوە.

[٣٨٠] البرهان في توجيه متشابه القرآن للامام الكرماني ص|٤٧.

## خوای گەورە کارەکان دەکات و هەرچی بویت ئەنجامی دەدات

١- خـوای گـەورە لـە سـوورەتی (آل عمـران)دا، دەفـەرموویت: ﴿قَالَ كَذَٰلِكَ اللَّهُ يَفْعَلُ مَا يَشَاءُ﴾(آل عمران: ٤٠).

٢- لە سوورەتی (مريم)دا دەفەرموویت: ﴿ قَالَ كَذَٰلِكَ قَالَ رَبُّكَ هُوَ عَلَيَّ هَيِّنٌ وَقَدْ خَلَقْتُكَ مِن قَبْلُ وَلَمْ تَكُ شَيْئًا﴾ (مريم:٩).

پێشەوا (الألوسي) لە تەفسیری ئایەتی: ﴿قَالَ كَذَٰلِكَ اللَّهُ يَفْعَلُ مَا يَشَاءُ﴾دا دەڵێت: واتە: (خوای گەورە هەرچیەکی بوێت دەیکات، خوای گەورە لە کارە سەیر و لە عادەت دەرچووەکان ئەنجام دەدات). وەك نمونەی ئەو کارەی کە بۆ زەکەریا پێغەمبەر (علیه السلام)ی ئەنجامدا، و کاری زۆر بە پێی عادەت و دەستوری زانراو و بینراو).[٣٨١]
دەربڕینەکە بە ناوی (الأسم الجلالة) هەیبەت و گەورەیی و ناوازەیی وجوانی دەگەیەنێت.
دەربڕین بە وەسفی(الرّبوية) لە سوورەتی (مريم)دا، بەڵگەیەکی بەهێز دەگەیەنێت (الرب) پەروەردگار، بەدی هێنەرێکی بەتوانایە، کار وباری دروستکراوەکانی ڕێك دەخات وگۆڕانکاری بەسەردا دێنێت، وەك ئەوەی کە زەکەریا بەندەی خۆیی لە نەبوونەوە بەدیهێناوە، وهەر خۆیشی بە توانایە لەسەر بەدیهێنانی کوڕ لەگەڵ گەورەبونی تەمەنی و نەزۆکی خێزانەکەیدا، هیچ شتێك خوای گەورە بێدەسەڵات وکەم توانا ناکات، وقەدەغەی هیچی لیٚ ناکات.توانای خوا توانایەکی ڕەهایە وسنوری نییە، وهیچ شتێك بەری لیٚ ناگرێت، ئەمەیش کارێکی وەهابوو کە زەکەریا (علیه السلام) سەری لێی دەسوڕما ولەبەردەمیدا سەرسام دەبوو دەشڵەژا، بەڵام فەرمانێکی سوك وئاسانە بەلای خواوە.

---
[٣٨١] -روح المعاني للألوسي ٣|١٥٠ بە دەستکارییەوە.

* پێشەوا (القرطبي) دەڵێت: (واتە: وەك چۆن خوای گەورە تۆی لە نەبونەوە بەدی هێناوە کە هیچت نەبووە و هیچ نەبوویت، بێگومان بەتوانایە کە (یحیی) (علیه السلام) دروست بکات وبیهێنێتە بوون).[٣٨٢]

## زەکەریا ( علیه السلام ) داوای نیشانە لە خوای گەورە دەکات

خوای گەورە لە سوورەتی (ال عمران)دا دەفەرموویێت: ﴿قَالَ رَبِّ اجْعَل لِّي آيَةً قَالَ آيَتُكَ أَلَّا تُكَلِّمَ النَّاسَ ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ إِلَّا رَمْزًا وَاذْكُر رَّبَّكَ كَثِيرًا وَسَبِّحْ بِالْعَشِيِّ وَالْإِبْكَارِ﴾(ال عمران:٤١).

لە سوورەتی (مریم)دا دەفەرموویێت: ﴿قَالَ رَبِّ اجْعَل لِّي آيَةً قَالَ آيَتُكَ أَلَّا تُكَلِّمَ النَّاسَ ثَلَاثَ لَيَالٍ سَوِيًّا (١٠) فَخَرَجَ عَلَىٰ قَوْمِهِ مِنَ الْمِحْرَابِ فَأَوْحَىٰ إِلَيْهِمْ أَن سَبِّحُوا بُكْرَةً وَعَشِيًّا﴾(مریم:١٠-١١).

زەکەریا پێغەمبەر (علیه السلام) داوای نیشانەیەکی کرد لەخوای گەورە، واتە: نیشانەیەکی وا بێت کە ئاماژە بکات بۆ کاتی ڕودانی سکپڕبوونی خێزانەکەی، تا دڵی بەو مژدە ونیشانەیە خۆش ببێت، و بەرامبەر ئەونازو نیعمەت وبەخششە سوپاس گوزاری خوای گەورە بکات.

## خوای گەورە نیشانەیەك بە زەکەریا ( علیه السلام ) دەبەخشێت

خوای گەورە لە سوورەتی (ال عمران)دا دەفەرموویێت: ﴿قَالَ آيَتُكَ أَلَّا تُكَلِّمَ النَّاسَ ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ إِلَّا رَمْزًا وَاذْكُر رَّبَّكَ كَثِيرًا وَسَبِّحْ بِالْعَشِيِّ وَالْإِبْكَارِ﴾ (ال عمران:٤١).

لە سوورەتی (مریم)دا دەفەرموویێت: ﴿قَالَ رَبِّ اجْعَل لِّي آيَةً قَالَ آيَتُكَ أَلَّا تُكَلِّمَ النَّاسَ ثَلَاثَ لَيَالٍ سَوِيًّا﴾ (مریم:١٠).

* خوای گەورە وەڵامی داواکەی زەکەریا (علیه السلام)ی دایەوە، ئەو نیشانەیەی پێ بەخشی تا ببێتە بەڵگە لەسەر سکپڕبوونی خێزانەکەی، نیشانەکەیش بریتی بوو لەوەی

---

[٣٨٢] الجامع لاحكام القران للقرطبي ١١|٨٤ بە دەستکارییەوە.

که قسەکردنی لێ قەدەغە کرا بۆ ماوەی سێ ڕۆژ بە شەوەکانییەوە، نابێت قسە بکات تەنها بە ئیشارەت و ئاماژەکردن نەبێت. لە سوورەتی (ال عمران) دا فەرمووی: ﴿قَالَ آيَتُكَ أَلَّا تُكَلِّمَ النَّاسَ ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ إِلَّا رَمْزًا﴾. واتە: تەنها بە ئیشارەت وئاماژە لە سوورەتی (مریم)دا فەرمووی: ﴿قَالَ آيَتُكَ أَلَّا تُكَلِّمَ النَّاسَ ثَلَاثَ لَيَالٍ سَوِيًّا﴾ واتە: بۆ ماوەی سێ شەوی تەواو یەك لە دوای یەك نابێت قسە بکات، وتراوە ﴿سَوِيًّا﴾ بۆ زەکەریا بووە، واتە: نابێت قسە بکەیت لەگەڵ ئەوەشدا کە لەشساغ و تەندروست و سەلامەتیت.

* زانا (الزمخشری) دەڵێت: (.....وتی نیشانەکەت ئەوەیە کەقسە کردنت لێ قەدەغە دەکرێت کە ناتوانیگ بیکەیت، لە کاتێکدا کە ئەندامەکانت ساغن و لەشساغ وڕێك وتەواویت، نە لاڵ بویت و نەزمانت دەگیرێت، لە سوورەتی (مریم)دا باس کردنی شەو،و لە سوورەتی (ال عمران)دا باسکردنی کاتی ڕۆژ بۆ قەدەغە کردن لە قسەکردن، ئەوە دەگەیەنێت کە قەدەغەکردنەکە بۆماوەی سێ شەو و سێ ڕۆژ بەردەوام دەبێت).[٣٨٣]

(البروسوی) دەڵێت: (...وتویانە: لەوشەوەدا کەدەگەڕێتەوە بۆ لای خێزانەکەی و لێی نزیك دەبێتەوە، منداڵەکە دەکەوێتە ناو ڕەحمییەوە، و کاتێك ڕۆژ بوویەوە قسەکردنی لێ قەدەغە دەکرێت).[٣٨٤]

بێگومان زەکەریا پێغەمبەر (علیه السلام) قسەکردنی لێ قەدەغەکرا، و لەوەیشدا حیکمەتێکی زۆر هەیە، چونکە بێدەمگ بوون سودی زۆری هەیە: لەوانە ئیسراحەتە بۆ نەفس و دەروون، و هێمن و هێواش کەرەوەیە بۆ حاڵی ئینسان وسکوننەت ودڵ ئارامییە بۆدڵ، وئازاد کردنی بیرکردنەوەیە، وپاڵفتەکردنی عەقڵ وژیرییە، لێرەدا زەکەریا (علیه السلام) لە قسە کردن قەدەغە کرا، کە تەواوی ناز و نیعمە تی خوای گەورەی بەسەرەوە بوو، و لەژێر چاودێری خوادا بوو.

*مامۆستا (عبدالکریم الخطیب) لە تەفسیرەکەیدا دەڵێت: (پرسیارێك لێرەدا دروست دەبێت: بۆچی ئەم نیشانەیە لەسەر ئەم شێوازە دەرکەوت و ڕویدا، کە دەبێت زەکەریا قسە نەکات وبێدەنگ بێت –ئیتر بەزۆر بێت یان بەویستی خۆی_[٣٨٥] بۆ ماوەی سێ

---

[٣٨٣]–الکشاف للزمخشري ٣|٧.

[٣٨٤]–روح البیان للبروسوي ٥|٣١٨.

[٣٨٥]–وەك مامۆستا (عبدالکریم الخطیب) دەڵێت، ئەگەر بە ویستی خۆی بوایە، ئەوا نیشانەکە جێ بەجێ نەدەبوو، چونکە خۆی بە سکپڕبونەکەی دەزانی.

ڕۆژ؟...بەڵام ئەوەی ئێمە دەیبینین –خوازانا ترە – بێگومان ئەو بێدەنگییەی کە خوای گەورە لەسەر زەکەریا (علیه السلام) فەرزی کرد و داینا ماوەکەی سێ ڕۆژ بوو، ئەویش ئەو دەوا و چارەسەرە بوو کە نەفسی پێ ئارام ببێتەوە کە لە حاڵەتی هەڵچوون وناهاوسەنگیدا بووە، بەهۆی ئەو هەواڵە سەیرەوە.....کە پزیشکێکی شارەزا و بە توانا بووە، کە کەسی تر وەك ئەو نرخی نەدەزانی لەو حاڵەتەدا، چونکە چارەسەرێکی چاکتر نەبوو بۆ هەموو نەفس لە بێدەنگی باشتربێت، ودڵی ئارام و دامەزراو بکاتەوە! خۆ ئەگەر ئەو بێدەنگ بونە سزایەك بوایە، ئەوا بێگومان ئەو ناز و نیعمەتەی تێکدەدا و دەیشێواند، کە خۆی لەخۆیدا یەکێك بوو لە نیشانەکانی خوای گەورە....

نیشانەکانی خوای گەورە بەرز و باڵان تا ئەوەی خراپەیان تێکەڵ ببێت ونیعمەتەکانیشی ڕوون وجوانن تا ئەوەی کە تێکبدرێن و بشێو ێنرێن.[٢٨٦]

قەدەغەکردنی وبەڕۆژوو بوونی لە قسە کردن نیعمەتێك بوو پێویستی بە سوپاسگوزاری هەبوو، بۆ ئەمەیش ئاڕاستە کردنی خوای گەورە هات بۆ زەکەریا (علیه السلام) ﴿وَاذْكُر رَّبَّكَ كَثِيرًا وَسَبِّحْ بِالْعَشِيِّ وَالْإِبْكَارِ﴾.

مامۆستا (عبدالكريم الخطيب) ڕون کردنەوە دەدات و دەڵێت: بێگومان کاتێك ئەندامی قسەکردن لەکار دەکەوێت، ئەوا ئینسان هۆکارەکانی تر لە دەست نادات بۆ تێگەیشتن ولێکدانەوە و ئاماژە کردن ودەربڕین کەبریتییە لە ئیشارەت و ئاماژەکردن، کە قەرەبووکردنی قسەدەربڕینە و لەباتی ئەوە: (ئەگەر ئەوە کار و حاڵی ئینسان بێت، کە لە بەکارهێنانی هۆکارە دیار و گونجاوەکان دەربچێت، و بە هۆکاری تر جێبەجێیان بکات، ئەوە ئەو جێبەجێی نەکردون، بێگومان ئەوە قودرەت و دەسەڵاتی خوایە _کە هەمیشە لەسەرو هۆکارەکانەوەیە، ئەوە ڕاستتر و لەپێشترە کە هۆکارەکان لەکار نەخات کە ئێمە دەیانبینین وهاوڕێی خاوەنی هۆکارەکانە! ئەگەر وا ڕاهاتبوو کە ژیانی ڕاستەقینە لە ژێر هەستەکانی ئێمەدا بێت کە نەزۆك منداڵی نەبێت، وپیاوێکی پیری بەساڵا چوویش چاوەڕێی ئەوەی لێ نەکرێت ببێتە باوك، ئەوا بێگومان قودرەت و دەسەڵاتی خوا–ئەگەر حیکمەتی خۆی کردە بڕیاردەر _ئەوا نەزۆك منداڵی دەبێت و پیاوی پیرو بەساڵاچویش دەبێتە باوکی کوڕ و کچ....﴿وَلِلَّهِ الْمَثَلُ الْأَعْلَىٰ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ﴾(النحل:٦٠).[٢٨٧]

[٢٨٦] التفسير القرآني للقرآن للاستاذ عبدالكريم الخطيب ٣|٤٤٣–٤٤٤ بە دەستکارییەوە.

[٢٨٧] - التفسير القرآني للقرآن ٣|٤٤٤.

* خاوەنی(في ظلال) دەڵێت: زەکەریا (علیه السلام) داوا لە پەروەردگاری دەکات کە نیشانەیەکی پێبدات تا ئارام بگرێت لەپەنایدا ﴿قَالَ رَبِّ اجْعَل لِّي آيَةً﴾...لێرەدا خوای گەورە ئاراستەی دەکات بۆ ڕێگای دڵنیایی و دڵئارامی ڕاستەقینە، لەوە دەری دەکات کە نەفسی لەسەری ڕاهاتووە......نیشانەکەی ئەوە بوو کە زمانی ببەسترێت لەقسەکردن بۆ ماوەی سێ ڕۆژ کاتێك ڕووبەڕوو دەبێتەوە لەگەڵ خەڵکیدا، وکاتێکیش لەگەڵ پەروەردگاریدا دەبێت ورووو دەکاتە ئەو، زمانی بکرێتەوە و زیکر و تەسبیحاتی ئەوی پێ بکات...﴿ قَالَ رَبِّ اجْعَل لِّي آيَةً قَالَ آيَتُكَ أَلَّا تُكَلِّمَ النَّاسَ ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ إِلَّا رَمْزًا وَاذْكُر رَّبَّكَ كَثِيرًا وَسَبِّحْ بِالْعَشِيِّ وَالْإِبْكَارِ﴾...لێرەدا سیاقی ئایەتەکە بێدەنگ دەبێت، دەزانین کە ئەوە ڕوویداوە، کاتێك زەکەریا (علیه السلام) شتێکی غەریب دەبینێت وهەستی پێ دەکات لەژیانی خۆی وژیانی کەسانی تردا. .زمانی هەر هەمان زمانی جارانە،بەڵام لە قسەکردن بەستراوە، وبۆ زیکر و پاڕانەوە و موناجاتی خوا کراوەیە و قسەدەکات، چ یاساو قانونێك دان دەنێت بەم دیاردەیەدا؟ بێگومان ئەوە قانون و دەستوری ڕەهای تەواوی دەسەڵاتی بەرزو باڵایە........بەبێ ئەو ناگونجێت ئەو دیاردە ناوازەیە شیبکرێتەوە، بەو جۆرە (یحیی) ی پێ بەخشی کاتێك بێگومان کە ئەو گەیشتبویە تەمەنی گەورەیی و خێزانەکەیشی نەزۆك بوو!).[٣٨٨]

## زەکەریا ( علیه السلام ) یادی خوا دەکات

خوای گەورە لە سوورەتی(ال عمران)دا دەفەرموێت: ﴿ وَاذْكُر رَّبَّكَ كَثِيرًا وَسَبِّحْ بِالْعَشِيِّ وَالْإِبْكَارِ﴾(ال عمران:٤١).

لە سوورەتی (مریم)دا دەفەرموێت: ﴿ فَخَرَجَ عَلَى قَوْمِهِ مِنَ الْمِحْرَابِ فَأَوْحَى إِلَيْهِمْ أَن سَبِّحُوا بُكْرَةً وَعَشِيًّا﴾(مریم:١١).

زەکەریا (علیه السلام) لەگەڵ ئەوەی کە قسەکردنی لێ قەدەغە کرا بوو، بەڵام زیکرو یادی خوای گەورەی دەکرد و بەردەوام بوو لەگەڵیدا، و فەرمانی دەکرد بە خەڵکی یادی خوا

[٣٨٨] في ظلال القرآن ١|٣٩٥.

بکەن کاتێك بە شێوەیەك ئاماژەی بۆ دەکردن کە تێبگەن، خوای گەورە ناز و نیعمەتی بێدەنگی دا بە زەکەریا (علیه السلام) هەروەك ئەوەی کەنازو نیعمەتی تەوفیق دانی پێ دا بۆ زیکر کردن ویادی خوا و زیکر و فیکری بە یەکەوە بۆ کۆبویەوە، زیکر لە بەرزترینی وتەکانە و لەباشترین شتەکانیشە کە پێی نزیك ببێتەوە لە خوای گەورە و لە گەورەترین کارەکانیشەو لە بەرزترین حاڵەتەکانیشە. زیکر و یادی خوای گەورە لە هەموو حاڵەتێکدا داوا کراو و خوازراوە، هەتا باوەڕدار لە پەیوەندی بەردەوامدا بێت لەگەڵ خوای گەورەدا. زەکەریا (علیه السلام) بەردەوام زیکری خوای دەکرد کە لە قسە کردنیش قەدەغەکرا بوو، وزیکرکردن لەئاسانترین پەرستشەکانە و گەورەترینیشیانە لەپاداشتدا.

لە فەرموودەیەکدا هاتووە: پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرمووێت: (دوو ووشە هەن، لەسەر زمان سوك دەوترێن وئاسانن، ولەلای خوای گەورەیش خۆشەویستن، بریتین لە(سبحانَ اللهِ وبِحَمْدِهِ سبحانَ اللهِ العظيم). [٣٨٩]

_ووشەی (العشي) واتە کاتی لاربونەوەی خۆر لە دوای نوێژی عەسر تا ئاوا بوون، ئەسڵ و بنەڕەتی ووشەکەیش تاریکی دەگەیەنێت، چونکە(العشي) لاواز بوونی چاو دەگەیەنێت، دوای لار بونەوەی خۆر لە دوای نوێژی عەسر ناونراوە بە(العشي) چونکە پەیوەندی دەکات بەکاتی تاریکیەوە.

بەڵام (الإبكار) لە دەرکەوتنی ڕوناکی (فجر) بەرەبەیانەوە تا کاتی چێشتەنگاوە، ئەسڵ و بنەماکەی بریتییە لە (التعجيل) واتە پەلەکردن، چونکە بەپەلە ڕوناکی دەردە کەوێت). [٣٩٠]

﴿فَخَرَجَ عَلَى قَوْمِهِ مِنَ الْمِحْرَابِ فَأَوْحَى إِلَيْهِمْ أَنْ سَبِّحُوا بُكْرَةً وَعَشِيًّا﴾(مريم:١١).

واتە: (ئەوسا دوای دڵنیابوون) لە پەرستگاکەی هاتە دەرەوە بۆ ناو قەومەکەی و ئاماژەی بۆ کردن (کە لە بەرامبەر ناز و نیعمەت و بەخششەکانی خواوە) بەیانیان و ئێواران تەسبیحات و ستایش بکەن.).

---

[٣٨٩]–رواه البخاري في صحيحه عن ابي هريرة كتاب الدعوات و رواه مسلم في صحيحه كتاب الذكر والدعاء.

[٣٩٠]–النكت والعيون للماوردي ١|٣١٥.

## ڕەوشتەکانی ( یحیی ) ( علیه السلام ) وەك لە سوورەتی ( مریم )دا هاتووە

**خوای گەورە لە سوورەتی (مریم)دا، دەفەرمویێت: ﴿يَا يَحْيَى خُذِ الْكِتَابَ بِقُوَّةٍ وَآتَيْنَاهُ الْحُكْمَ صَبِيًّا (١٢) وَحَنَانًا مِنْ لَدُنَّا وَزَكَاةً وَكَانَ تَقِيًّا (١٣) وَبَرًّا بِوَالِدَيْهِ وَلَمْ يَكُنْ جَبَّارًا عَصِيًّا (١٤) وَسَلَامٌ عَلَيْهِ يَوْمَ وُلِدَ وَيَوْمَ يَمُوتُ وَيَوْمَ يُبْعَثُ حَيًّا﴾(مريم:١٢-١٥). ئایەتی ﴿يَا يَحْيَى خُذِ الْكِتَابَ بِقُوَّةٍ﴾. واتە: (پاشان کە یەحیا گەورە بوو فەرمانمان پێدا) ئەی یەحیا کتێبی (تەورات) بەتوندی بگرەو پابەندی بە).**

**بێگومان ئەمە فەرمانێکی خوایی بوو بۆ یەحیا (علیه السلام) کە تەورات بگرێت بەتوندی و گرنگی پێ بدات وبیکاتە شوێنی وەرگرتن و دەستکەوتنی عیلم وزانست، و لێی تێبگات و کاری پێ بکات، وبانگەوازی خەڵکی بکات دەستی پێوە بگرن.﴿ وَآتَيْنَاهُ الْحُكْمَ صَبِيًّا﴾. واتە: (هەر لە تەمەنی نەوجەوانیدا، توانای جیاکردنەوەی ڕاست و ناڕاستمان پێبەخشی، بە دادوەرییەکی ڕێك و پێك کێشەی خەڵکەکەی چارەسەر دەکرد.) ﴿وَحَنَانًا مِنْ لَدُنَّا وَزَكَاةً وَكَانَ تَقِيًّا﴾ ﴿وَحَنَانًا﴾ واتە: دڵ ودەرونێکی پڕ لەسۆز و خۆشەویستی و پاك وخاوێنمان لەلایەن خۆمانەوە پێ بەخشی کە بە سۆز بێت بۆ دایك وباوکی و کەسانی تریش، کەسێکی چاکەکار بوو بۆ دایکی و باوکی و بەڕەحم بوو بۆ خەڵکی. ﴿وَزَكَاةً﴾ واتە: پاك و خاوێنی.**

**خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَنَفْسٍ وَمَا سَوَّاهَا (٧) فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَاهَا (٨) قَدْ أَفْلَحَ مَنْ زَكَّاهَا (٩) وَقَدْ خَابَ مَنْ دَسَّاهَا﴾(الشمس:٧-١٠).**

**واتە: (سوێند بە دەروون و ئەو زاتەی کە بە ڕێك و پێکی بەدیهێناوە، جا توانای خراپە و چاکە و خوانەناسی و خواناسی تێدا داین کردووە، (سوێند بەوانە هەموو) بەڕاستی ئەو کەسە سەرفرازە کە نەفسی پاك و پوختە کردووە و ئیمان و ترسی خوای تیادا ڕواندووە، بێگومان نائومێد بوو ئەو کەسەی نەفسی خۆی ناپوخت کرد و ئاڵودەی گوناه و تاوان و خراپەی کرد).**

﴿وَكَانَ تَقِيًّا﴾ واتە: گوێڕایەڵ بوو بۆ فەرمانەکانی خوای گەورە، هەموو فەرمانەکانی جێبەجێ دەکرد و خۆی لە قەدەغەکراوەکانی دەپاراست.

بەڕاستی خوای گەورە فەرمانی کردووە بە بەندە باوەڕدارەکان بە تەقوای خوا، و لە قورئانی پیرۆزیشدا لە زۆرشوێندا باسی تەقوای کردووە وهانی باوەڕدارانی لەسەر داوە، لەبەر گەورەیی وڕێزی باسی هەندێکیان دێنین، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ﴾(ال عمران:١٠٢). لە شوێنێکی تردا دەفەرموێت: ﴿وَمَن يَتَّقِ اللَّهَ يَجْعَل لَّهُ مَخْرَجًا(٢) وَيَرْزُقْهُ مِنْ حَيْثُ﴾ (الطلاق:٢-٣)، لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿وَتَزَوَّدُوا فَإِنَّ خَيْرَ الزَّادِ التَّقْوَى وَاتَّقُونِ يَا أُولِي الْأَلْبَابِ﴾ (البقرە:١٩٧).

﴿إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ﴾(الحجرات:١٣).

واتە: (بەڕاستی و بە دڵنیایی بەڕێزترینتان لای خوای گەورە بە تەقواترینتانە).

* هەروەها لە فەرمودەیەکی پێغەمبەریشدا (ﷺ) بەڵگەی زۆر هەن لەسەر تەقوا و لەخواترسان.

لە (أبي أمامة الباهلي) (خوالێی ڕازی بێت) ووتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بوو لە (حجة الوداع) حەجی ماڵ ئاواییدا، وتاری دەخوێندەوە، دەیفەرموو: (لە خوا بترسن و تەقوای خوا بکەن، و هەر پێنج نوێژەکەتان بکەن، و ڕۆژوی مانگی ڕەمەزان بگرن، و زەکاتی ماڵەکانتان دەربکەن، و گوێڕایەڵی فەرمانڕەواکانتان بکەن، ئەوا دەچنە بەهەشتی پەروەردگارتانەوە).[٣٩١]

﴿وَبَرًّا بِوَالِدَيْهِ وَلَمْ يَكُن جَبَّارًا عَصِيًّا﴾ واتە: (هەروەها چاك ڕەفتار و جوان ڕەفتار بوو لەگەڵ باوك و دایكیدا، وەنەبێت ئەو کەسێکی دڵڕەق و یاخی و نالەبار بوو بێت.). چاکەکردن لەگەڵ دایك و باوکدا لە گەورەترینی کردەوە چاکەکانە کە خوای گەورە فەرمانی پێ کردون لە قورئاندا، فەرموویەتی: ﴿وَاعْبُدُوا اللَّهَ وَلَا تُشْرِكُوا بِهِ شَيْئًا وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَانًا﴾(النساء٣٦). واتە: ((ئەی خەڵکینە) تەنها خوا بپەرستن و هیچ جۆرە شەریك و هاوەڵێکی بۆ بڕیار مەدەن و چاکەکاربن لەگەڵ دایك و باوکتان).

---

[٣٩١] -رواه الترمذي في سننه.

خوای گەورە بەندایەتی وپەرستشی بەندەکانی بەست بە چاکەکردن لەگەڵ دایك وباوك، بۆ ئەوەی گەورەیی چاکەکردن لەگەڵ دایکان وباوکان ڕون بکاتەوە، ونرخ و قەدری ئیمان ونزیکی لە خواوە بە پێی ئەندازەی چاکەکانی لەگەڵ دایك وباوکی ڕون بکاتەوە.
(عبدالله) ی کوڕی (مسعود) (خوا لێی ڕازی بێت) دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (ناچێتە بەهەشت ئەوەی بەقەد گەردێك خۆ بەزلزانینی تیا بێت) پیاوێك وتی: پیاوێك حەز دەکات جل و بەرگەکەی جوان بێت، نەعلەکانی جوان بێت؟ فەرمووی: (خوا جوانە و جوانی خۆش دەوێت، خۆ بەزلزانین بریتییە لە ڕەتکردنەوەی حەق و ڕاستی و بەسوك سەیر کردنی خەڵکی).[٣٩٢]
یەحیا (علیه السلام) زۆر ملکەچ و گوێڕایەڵی خوا بوو، و نەرم ونیان بوو لەگەڵ خەڵکیدا، وحەق و ڕاستی خۆش دەویست ﴿وَلَمْ يَكُن جَبَّارًا عَصِيًّا﴾ پێغەمبەرێکی پارێزراو بوو لە گوناهو خراپە، وگوێڕا یەڵی فەرمانی خوا بوو لە هەموو حاڵەتێکدا.
خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَسَلَامٌ عَلَيْهِ يَوْمَ وُلِدَ وَيَوْمَ يَمُوتُ وَيَوْمَ يُبْعَثُ حَيًّا﴾(مريم:١٥).
واتە: (درود و سەلامی خوای لەسەر بیت لەو ڕۆژەدا کە لە دایك بوو و لەو ڕۆژەدا کە وەفات دەکات، لەو ڕۆژەشدا کە هەڵدەستێت و زیندو دەبێتەوە).

## باسی چوارەم:

## گەڕانەوە بۆ سەر چیرۆکی مەریەم (عليها السلام)، خوای گەورە مەریەم هەڵدەبژێرێت:

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ وَإِذْ قَالَتِ الْمَلَائِكَةُ يَا مَرْيَمُ إِنَّ اللَّهَ اصْطَفَاكِ وَطَهَّرَكِ وَاصْطَفَاكِ عَلَىٰ نِسَاءِ الْعَالَمِينَ (٤٢) يَا مَرْيَمُ اقْنُتِي لِرَبِّكِ وَاسْجُدِي وَارْكَعِي مَعَ الرَّاكِعِينَ﴾(ال عمران:٤٢-٤٣).
باس وناوەڕۆکی ئایەتەکان بەردەوامن لەسەر باس کردنی نیعمەتەکانی خوای گەورە بە سەر ئال ونەوەی عیمرانەوە، کە چۆن خوای گەورە هەڵی بژاردن و ڕێزداری کردن، بە جۆرێك کە ناوەڕۆکی ئایەتەکان بە باسی خێزانەکەی عیمران دەستی پێکرد، و دوعای کرد خوای گەورەش وەڵامی دوعاکەی دایەوە، خوای گەورە نەزرەکەی لێ قبوڵ کرد،

[٣٩٢]-رواه مسلم في صحيحه. كتاب الايمان.

پاشان باسەکە چویە سەر باسکردنی (مریم) (علیها السلام) و چۆنێتی گەورە بوون وپێگەیشتنی کە لەژێر چاودێری خوای گەورەدا بوو، وئەو گرنگی پێ دەدا، و زەکەریا پێغەمبەر (علیه السلام) کەفالەتی کرد، کەئەمەیش یارمەتییەکی خوایی بوو بۆ مەریەم و زەکەریا، کە زەکەریا لە خوای گەورە پاڕایەوە بەوەی کە کوڕێکی پێ ببەخشێت پاش ئەوەی کە ڕێزێکی زۆری لە مەریەمدا بینی، خوای گەورەیش وەڵامی دوعاکەی دایەوە. و یەحیا (علیه السلام)ی پێ بەخشی، کە خوای گەورە چەند ڕەوشتێکی تیادا کۆکردبویەوە و پێی بەخشی بوو، پاشان بۆ دووەم جار باسەکە دەگەڕێتەوە سەر مەریەم (علیها السلام) و باسی هەڵبژاردنی.

پێشەوا (الآلوسي) دەڵێت: ﴿وَإِذْ قَالَتِ الْمَلَائِكَةُ يَا مَرْيَمُ إِنَّ اللَّهَ اصْطَفَاكِ﴾ ئەم باسەیش تەواوکارە بۆ ڕونکردنەوەی حوکمی هەڵبژاردنی (آل عمران) ئەوەی عمران و ڕووداني چیرۆکی یەحیا و زەکەریا (علیهما السلام) لە نێوانیاندا، ئەمەیش هەڵبژاردنەکە دڵنیا دەکاتەوە. [٣٩٣]

پێشەوا (القاسمی) دەڵێت: ﴿وَإِذْ قَالَتِ الْمَلَائِكَةُ يَا مَرْيَمُ﴾ دەستپێکردنە بۆ تەواوکردنی فەزڵ و گەورەی ئالی عیمران). [٣٩٤]

(إذ) بەدوادا هاتووی ئەم ئایەتەیە: ﴿إِذْ قَالَتِ امْرَأَتُ عِمْرَانَ رَبِّ إِنِّي نَذَرْتُ﴾ واتە: ئەی محمد (ﷺ) ئەوە بێنەرەوە یاد، کاتێك کە خێزانی عیمران (علیه السلام) وتی و ئەوە بێنەرەوە یاد کە فریشتەکان بە مەریەمیان وت و مژدەیان پێ گەیاند، لەم چیرۆکەدا پەند و ئامۆژگاری گرنگ هەیە کە پێویستە باوەڕدار باش بیهێنێتەوە یادی خۆی، و سودی لێ ببینێت، و بۆ خەڵکی باس بکات، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿لَقَدْ كَانَ فِي قَصَصِهِمْ عِبْرَةٌ لِأُولِي الْأَلْبَابِ مَا كَانَ حَدِيثًا يُفْتَرَى وَلَكِنْ تَصْدِيقَ الَّذِي بَيْنَ يَدَيْهِ وَتَفْصِيلَ كُلِّ شَيْءٍ وَهُدًى وَرَحْمَةً لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ﴾ (يوسف:١١١).

واتە: (سوێند بێت بە خوا بەڕاستی لەسەرگورشتە و بەسەرهاتی پێغەمبەراندا پەند و ئامۆژگاری هەیە بۆ کەسانی ژیر و هۆشمەند، وە نەبێت ئەم قورئانە قسەو باسێك بێت هەڵبەستراو بێت، بەڵکو بەڕاستدانەری ئەوەیە کە لە پێش خۆیەوە هاتووە (تەورات و

---

[٣٩٣]– روح المعاني للامام الآلوسي ٣/١٥٤.

[٣٩٤]– محاسن التأويل للإمام القاسمي ٤/٩٦ .

ئینجیل) و ڕونکەرەوە و جیاکردنەوەی هەموو شتێکی پێویستە لە ئایندا، و ڕێنمویی و ڕەحمەتیشە بۆ کەسانێك باوەڕ دەهێنن).

خوای گەورە فەرموویەی: ﴿وَإِذْ قَالَتِ الْمَلَائِكَةُ يَا مَرْيَمُ إِنَّ اللَّهَ اصْطَفَاكِ﴾.

پێشتر باسی ووشەی (الأصطفاء)مان کرد، ووتمان: واتە دەربارەی هەڵبژاردن و جیاکردنەوە و پاکڕاگرتنی مەریەم (علیها السلام) بوو، ئەوە بوو کە خوای گەورە هەڵی بژارد بۆ ئەو پلە و پایە بەرزە، کە لەناو ماڵێکی چاکەکاردا بەدیهێنا، و بەجوانی قبوڵی کرد و وەری گرت و زۆر بەجوانی پەروەردەی کرد، و زەکەریای بۆ کردە کەفالەتکار، و کەرامەت و ڕێزی زۆر لەسەر دەستی مەریەمدا ڕویاندا.

لە (قصص الانبیاء)ی (ابن کثیر)دا هاتووە دەڵێت: (﴿اصطفاك﴾ واتە: هەڵی بژاردیت و جیای کردیتەوە).[٢٩٥]

* پێشەوا (الرازی) باسی کردووە و دەڵێت: لە ڕاستیدا هەڵبژاردنەکەی مەریەم لە چەند ڕوویەکەوە بووە، لەوانە: بێگومان خوای گەورە وەریگرت و ئازادی کرد لەگەڵ ئەوەیشدا کە کچ بوو، و ئەم مانایە لە کەسانی تری هاو شێوەی ئەودا بەدی نەهات، هەروەها ڕێز وکەرامەتی زۆر ڕویدا بۆ ئەو، بە جۆرێك کە لەلایەن خواوە ڕزق و ڕۆزی بۆ دەهات، هەروەها خوای گەورە دەستبەتاڵی کرد بۆ پەرستشی خۆی و بەندایەتی کردنی، و لەم مانایەشدا بە شێوازەکانی ڕەحم وبەزەیی و هیدایەت و پارێزراوی تایبەت مەندی کرد، هەروەها خوای گەورە وای لێکرد کە بەگوێی خۆی قسەی فریشتەکانی بیست.[٢٩٦]

(الطهارة) پاك ڕاگرتن و پاك کردنەوەیش چوار ئاستی هەیە:

ئاستی یەکەم: پاك کردنەوەی ڕواڵەت و دەرەکی لە هەموو چڵك و چەپەڵی و زیادەیەك.

ئاستی دووەم: پاك کردنەوەی ئەندامەکان لە ئەنجامدانی تاوان و گوناه.

ئاستی سێ یەم: پاك کردنەوەی دڵ و دەرون لە ئەخلاق و ڕەوشتە ناپەسەندەکان.

ئاستی چوارەم:پاك کردنەوە و پاك ڕاگرتنی نهێنی بێجگە لەوەی کە دەربارەی خوای گەورەیە.کە ئەوانەیش پاکی پێغەمبەران و ڕاست گۆیان بووە.[٢٩٧]

*خاوەنی (روح البیان) دەڵێت: (واتە: خوای گەورە پاکی کردیتەوە لە کوفر و بێ باوەڕی و سەرپێچی و کردەوە ناپەسەندەکان و عادەت و کارە بینراوەکان و کەوتن لە

---

[٢٩٥]–قصص الانبیاء لابن کثیرص|٥٥٣.

[٢٩٦]–مفاتیح الغیب للامام الرازی٨|٤٣ بەدەستکارییەوە.

[٢٩٧]–احیاء علوم الدین للامام الغزالي ١|١٢٥.

پیاوان) و لە عادەی مانگانە و خوێنی دوای منداڵ بوون، وتویانە مەریەم (علیها السلام) تووشی عادەی مانگانە نەدەهات، هەروەها لە تۆمەت و درۆکانی یەهود و جولەکە پاراستی.[٣٩٨]

*(القاسمی) دەڵێت: (لە ڕەوشتە ناپەسەند وبینراوەکان پاکی کردەوە).[٣٩٩]

*بۆمان ڕون دەبێتەوە کە: مەبەست لەپاکردنەوەی مەریەم (علیها السلام) بریتی بوو لە پاککردنەوەی بە ئیمان و گوێڕایەڵی کردن لە کوفر و سەرپێچی، بە ئەخلاقی جوان و پەسەند لە ئەخلاقە ناپەسەند و بێزراو وخراپەکان، ودورە پەرێزی لەپیاوان ئیتر بەهەر جۆرێك بوبێت، وپاك ڕاگرتنی لەتۆمەت و درۆ و بوهتانەکانی جولەکە، کە خوای گەورە بەری وپاك ڕاگرتوی کردووە لەو بوهتان ودرۆیانەی ئەوان، و پاکیەکەشی لەسەر زمانی (المسیح) عیسا (علیه السلام) وترا کە لەناو بێشکەدا بوو. زۆرێك لەزانایانی تەفسیر باسی ئەوەیان کردووە کە بێگومان خوای گەورە مەریەمی (علیها السلام) لە عادەی مانگانە و خوێنی دوای منداڵ بوون پاك کردۆتەوە، ڕەنگە حیکمەتیشی لەمە بۆ ئەوە بوبێت کە گونجاو و لەباربوبێت بۆمانەوەی لەناو (بیت المقدس)دا بەبێ ڕێگری شەرعی، چونکە بۆ کەسێك کە عادەی مانگانەی هەبێت گونجاو نابێت لەناو مزگەوتدا بمێنێتەوە، هەروەها ڕێگە پێدراویش نییە کە لەو حاڵەتەدایە بچێتە ناو مزگەوت، عادەی مانگانە و خوێنی دوای منداڵ بوون عەیبە و کەم وکوڕی نین، بەڵکو ئەوە عادەتی ئافرەتانە، هیچ شتێك لە قەدر و ڕێزی ئەو کەم ناکاتەوە، بەڵکو لەگەڵ سروشتی ئەودا لەبار و گونجاوە، وپاك وخاوێنی مەریەم (علیها السلام) لەعادەی مانگانە، ئەوە ڕێزێك بوو لەمافی خۆیدا هەتا گونجاو و لەبار بێت کە هەستێت بە کارە گرنگەکانی ژیانی خۆی و لەناو مزگەوتدا بمێنێتەوە و لە (بیت المقدس)دا بێت، مەریەم (علیها السلام) کەسێکی پاك و داوێن پاك وبەڕێز و بە حەیاو بە شەرم و پارێزراو بوو، وخەڵکی لێی ڕازی بوون وخوایش لێی ڕازی بوو.

﴿وَاصْطَفَاكِ عَلَى نِسَاءِ الْعَالَمِينَ﴾.

هەڵبژاردنی بوو بەدوای هەڵبژاردنێکی تردا، هەڵبژاردنی دووەم ئەوە بوو کە خوای گەورە بەونیشانە گەورە و سەرسوڕهێنەرە گەورەیە ڕێزی لێگرت، کە عیسا (علیه

---

[٣٩٨]- روح البیان للبروسوي ٢|٣٢.

[٣٩٩]- محاسن التأویل للقاسمي ٤|٩٦.

ا ـلام)ی پێ بەخشی بە ویستی قودرەتی خۆی، بە بێ باوك تا ببێتە نیشانەیەك بۆ ـ ـموو جیهان.
خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَجَعَلْنَا ابْنَ مَرْيَمَ وَأُمَّهُ آيَةً وَآوَيْنَاهُمَا إِلَى رَبْوَةٍ ذَاتِ قَرَارٍ وَمَعِينٍ﴾ (المؤمنون:٥٠).

## دوو مەسەلەی پەیوەندیدار بە قسەی فریشتەکان لەگەڵ مەریەم و هەڵبژاردنەکەی

**مەسەلەی یەکەم:** ئایا مەریەم (علیها السلام) یەکێك بووە لەپێغەمبەران (علیهم السلام)؟
بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە بە پشتیوانی خوای گەورە دەڵێین: هەندێك لەخاوەن زانیاریەکان وای بۆ چون ولێکی دەدەنەوە مەریەم (علیها السلام) یەکێك بووە لە پێغەمبەران (علیهم السلام) چونکە بەڕاستی خوای گەورە وەحی بۆ ناردووە، هەر بەهەمان شێوەش بۆ دایکی ئیسحاق و دا یکی موسا، چونکە وەحییان بۆ کراوە.
ئەوانەی کە ئەمە لێکدەدەنەوە، پێشەوا (إبن حزم الظاهري الأندلسي) بووە، کە بەشێکی لە کتێبی (الفصل) بۆ ئەو باسە بەناوی (نبوءة النساء) تەرخان کردووە، بانگەشەی ئەوەی کردووە کە جێگیرە پێغەمبەرایەتی ئافرەتان و، وتوویەتی: (...لە قورئانی پیرۆزدا ئەوە هاتووە کە خوای گەورە فریشتەی ناردووە بۆ لای هەندێك لە ئافرەتان، و بە وەحی هەواڵی پێداون، و ئەمەیش ڕاستییەك بووە لە لایەن خوای گەورەوە، لەوانەیش مژدەدانی فریشتەکان بە دایکی ئیسحاق، خوای گەورە فەرمووی: ﴿وَامْرَأَتُهُ قَائِمَةٌ فَضَحِكَتْ فَبَشَّرْنَاهَا بِإِسْحَاقَ وَمِن وَرَاءِ إِسْحَاقَ يَعْقُوبَ﴾(هود:٧١).
واتە: (لەو کاتەدا خێزانەکەی إبراهیم (علیه السلام) وەستابوو، یەکسەر پێکەنی، جا (خوای گەورە فەرمووی): ئێمەش مژدەمان دایە کە ئیسحاقت پێدەبەخشین و لە دوای ئەویش یەعقوب، لە نەوەی ئیسحاق دێتە دنیاوە)
ئەمە قسە بوو لە فریشتەیەکەوە بۆ کەسێك کە پێغەمبەر نەبووە لە ڕوویەکەوە، هەروەها ئەوەشمان زانی کە خوای گەورە (جبریل)ی ناردووە بۆ لای مەریەم (علیها السلام) قسەی لەگەڵدا کرد وپێی وت: ﴿إِنَّمَا أَنَا رَسُولُ رَبِّكِ لِأَهَبَ لَكِ غُلَامًا زَكِيًّا﴾(مریم:١٩). واتە: (جوبرەئیل وتی: (مەترسە) دڵنیابە من تەنها نێردراوی پەروەردگاری تۆم، تا منداڵێکی

خاوێنت پیّ ببەخشم.)، ئەمە پێغەمبەرایەتی ڕاست بووە بە وەحی ڕاست و تەواو، و پەیامێك بووە لەلایەن خوای گەورەوە بۆ مەریەم (علیها السلام) هەروەها دایکی موساسش هەر بەو جۆرە خوای گەورە وەحی بۆ کرد کە موسا (علیه السلام) بخاتە ناو ئاوی دەریاکەوە، بێگومان لەدواتر بۆی دەگەڕێتەوە، و کارێکی گەورە و گرنگی دەبێت خوای گەورە فەرمووی: ﴿ وَأَوْحَيْنَا إِلَى أُمِّ مُوسَى أَنْ أَرْضِعِيهِ فَإِذَا خِفْتِ عَلَيْهِ فَأَلْقِيهِ فِي الْيَمِّ وَلَا تَخَافِي وَلَا تَحْزَنِي إِنَّا رَادُّوهُ إِلَيْكِ وَجَاعِلُوهُ مِنَ الْمُرْسَلِينَ﴾(القصص:٧).

واتە: (ئێمە دایکی موسامان ئاگادارکرد، کە شیری بداتیّ و (پێمان وت) جا کاتێك مەترسیت پەیدا کرد لەوەی کە پێی بزانرێت فڕێی بدەرە ڕووباری (نیلەوە) نە بترسە (لەوەی تووشی بەڵا ببێت) نە خەفەتیشی بۆ بخۆ، چونکە ئێمە بەڕاستی دەیگێڕینەوە بۆ لات و لەئایندەشدا دەیکەین بە یەکێك لە پێغەمبەرە پەیامدارەکان).[٤٠٠]

هەروەها لەو کەسانەی تر کە دەڵێن مەریەم (علیها السلام) پێغەمبەربوو، پێشەوا (القرطبي الأندلسي) لە تەفسیرەکەیدا دەڵێت: (ئەوە ڕاستە کە بە دڵنیایی مەریەم پێغەمبەرێکی ئافرەت بووە، چونکە خوای گەورە بە هۆی فریشتەیەکەوە وەحی بۆ کردووە وەك هەر چۆن وەحی بۆ سەرجەم پێغەمبەران(علیهم السلام) کردووە، بەڵام دەربارەی (آسیة) هیچ دەربارەی نەهاتووە، کە پێغەمبەر بوبێت، بەڵام دەربارەی ڕاستگۆیی و فەزڵ و ڕێزی ئەوە لە سوورەتی(التحریم)دا ڕون کراوەتەوە....).[٤٠١]

پێشەوا (القرطبي) هەرخۆی دەڵێت: بێگومان مەریەم (علیها السلام) گەورە و بەڕێزترین ئافرەت بووە بە ڕەها چونکە پێغەمبەرێکی ئافرەت بووە، و پێغەمبەریش لە خواناس لەپێشترە، ئەو لە هەموو ئافرەتان ڕێزدارتر بووە: لە پێشینان و لە پاشینان، لەپاش ئەویش ڕێزدارەکان بریتی بوون لە (فاطمە ئینجا خدیجةَ ئینجا آسیة).[٤٠٢]

هەروەها دەڵێت: (هەرکەس وتویەتی ئەو پێغەمبەر نییە، ئەوە وتوویەتی: بێگومان بینینی فریشتەکان لەلایەن مەریەمەوە، وەك بینینی جوبرەئیل (علیه السلام) بوو. لەلایەن هاوەڵانەوە لە شێوەی ئینسانێکدا، کاتێك پرسیاری دەربارەی ئیسلام و ئیمان

---

[٤٠٠]-الفصل في الملل والاهواء والنحل لابن حزم الظاهري ٥|١٧-١٨ به دەستکارییەوە.

[٤٠١]-الجامع لاحکام القرآن للقرطبي ٤|٨٣ به دەستکارییەوە.

[٤٠٢]-الجامع لاحکام القرآن للقرطبي ٤|٨٣.

کردن، هاوەڵان بەو کارە نەبونە پێغەمبەر، و یەکەمیان ئاشکراترە و زۆرینەش لەسەر ەوەن، وخوا زانا ترە). (٤٠٣)

بەڵام ڕاستی لەم مەسە لەیەدا: بێگومان مەریەم (علیها السلام) پێغەمبەر نەبووە، بەڵکو ڕاستگۆ بووە، بە پێی ئەم بەڵگانە:

١- ڕواڵەتی ئەم ئایەتە: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ إِلَّا رِجَالًا نُّوحِي إِلَيْهِمْ﴾(النحل:٤٣).

واتە: (ئێمە پێش تۆ ئەی محمد (ﷺ) جگە لە پیاوانی (ڕاستگۆ و چاك و پاك نەبێت) کەسی ترمان ڕەوانە نەکردووە و وەحیمان بۆ نەناردووە)). ئەمە بەڵگەیەکی یەکلایی کەرەوەیە کە پێغەمبەران تەنها لە پیاواندا بوون بەبێ ئافرەت.

٢- دەربارەی مەریەم ودایکی ئیسحاق و دایکی موسا لە قورئاندا بەڵگەی تەواو ودروست لەسەر پێغەمبەرایەتیان نەهاتووە کە خوای گەورە ڕایگەیاندبێت.

٣- قسەی فریشتەکان بۆ مەریەم (علیها السلام) بە بەڵگەی چەسپاو دانانرێت لەسەر پێغەمبەرایەتی، لە کاتێکدا کە پێغەمبەرایەتی بریتییە لە وەحی کردن لە لایەن خوای گەورەوە بۆ یەکێك لە پێغەمبەران بە شێوەیەکی تایبەت، و بەهۆی فریشتەوە، قسەکردنی جوبرەئیل لەگەڵ مەریەم بە پەیام یان پێغەمبەرایەتی نەبووە بە پێی تێگەیشتنی شەرعی بەڵکو بە فەرمانێکی خوایی بوە و مژدەیەك بووە لە لایەن خواوە، و قسەی فریشتەکان لەگەڵ دایکی ئیسحاقدا، تەنها مژدەیەك بووە بۆ ئەو، وحیکمەت بووە لە قسەکردنی ڕاستەوخۆدا کە بێگومان مژدەدان لە دەروندا بۆ خۆی گەورەیە، بە ئەندازەی ئەو شتەی کە مژدەی پێدراوە.

٤- ئیلهام وەك بۆ پێغەمبەران (علیهم السلام) ڕوو دەدات ئەوە بۆ هەندێك لە پیاو چاکانیش ڕودەدات، ئەمەیش دەبێتە ڕێزێك بۆ ئەوان و موعجیزە نییە، وخەونی ڕاست و چاك جۆرێکە لە وەحی ئیلهامی، و نەوتراوە هەرکەس خەونێکی ڕاست و چاکی بینی، ئیتر بەوە بوەتە پێغەمبەر.

٥- بێگومان (الوحی) بە مانای زمانەوانی واتە: گەیاندن بە ڕێگایەکی نهێنی و شاراوە، لە زۆر شوێنی قورئانی پیرۆزدا هاتووە و کەسیش نەیوتووە ئەوە پێغەمبەرایەتی بووە. خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ ثُمَّ اسْتَوَىٰ إِلَى السَّمَاءِ وَهِيَ دُخَانٌ فَقَالَ لَهَا وَلِلْأَرْضِ ائْتِيَا طَوْعًا أَوْ

---

٤٠٣- الجامع لاحكام القرآن للقرطبي ٤|٨٣ بە دەستکارییەوە.

كَرْهًا قَالَتَا أَتَيْنَا طَائِعِينَ (١١) فَقَضَاهُنَّ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ فِي يَوْمَيْنِ وَأَوْحَى فِي كُلِّ سَمَاءٍ أَمْرَهَا﴾ (فصلت:١١-١٢).

**لە ئایەتێکی تردا دەفەرمووێت:** ﴿وَأَوْحَى رَبُّكَ إِلَى النَّحْلِ أَنِ اتَّخِذِي مِنَ الْجِبَالِ بُيُوتًا وَمِنَ الشَّجَرِ وَمِمَّا يَعْرِشُونَ (٦٨) ثُمَّ كُلِي مِنْ كُلِّ الثَّمَرَاتِ فَاسْلُكِي سُبُلَ رَبِّكِ ذُلُلًا﴾ (النحل:٦٨-٦٩).

**تەنها کەسێکیش لە کەسانی ژێر نەیان وتووە زەوی و ئاسمانەکان و هەنگ پێغەمبەر بوون، لە کاتێکدا کە وەحی بە پێی تێگەیشتنی زمانەوانی فراوانترە لە مانا شەرعییەکەی، لە زمانەوانیدا (الوحي) بریتییە لە گەیاندن بە ڕێگای نهێنی و شاراوە، و لە شەرعیشدا بریتییە لە: (گەیاندن لە خواوە بۆ یەکێك لە پێغەمبەرانی بە پێی حوکمێکی شەرعی و بە شێوازێك لەو جۆرە، و بە هۆکار بێت یان بە بێ هۆکار).** [٤٠٤]

**نە لە قورئانی پیرۆزدا نە لە سوننەتی پێغەمبەردا (ﷺ) بە پێغە مبەرایەتی باسی نەهاتووە، بەڵکو بە شێوازی تر باسی هاتووە، کە چاکەکاری و پاکی و ڕستگۆی دەگەیەنێت.**

**خوای گەورە فەرموویەتی:** ﴿مَا الْمَسِيحُ ابْنُ مَرْيَمَ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِنْ قَبْلِهِ الرُّسُلُ وَأُمُّهُ صِدِّيقَةٌ كَانَا يَأْكُلَانِ الطَّعَامَ﴾(المائدة:٧٥).

**واتە: (مەسیحی کوڕی مەریەم هیچ شتێك نییە (نە خوایە و نە کوڕی خوایە) جگە پێغەمبەرێکی خوا نەبێت، بە ڕاستی پێش ئەو چەندەها پێغەمبەری تریش ڕابوردوون، دایکیشی ئافرەتێکی زۆر ڕاست و ڕاستگۆیە، هەردووکیان خواردنیان دەخوارد (وەکو هەموو ئینسانێك)).**

## ئایا خاتو مەریەم بەڕێز و گەورەترینی ئافرەتان بووە؟

**زانایان لە سەر ئەوە یەکدەنگن کە بێگومان مەریەم (علیها السلام) فەزڵ و پلە وپایەی بەرزی هەبووە لە لای خوای گەورە، وەك قورئان هەواڵی دەربارەی داوە، لە سوننەتی پێغەمبەریشدا هاتووە کە: بێگومان خوای گەورە هەڵی بژاردووە و پاکی کردۆتەوە و**

[٤٠٤]- في تعريف الوحي ومعانيه مدخل الى الدراسات القرآنية د.محمود بلتاجي ص|٨٧.

تایبەتمەندی کردوە و نازو نیعمەتی ڕشتووە بە سەریدا، و لە بەڕێزترین ئافرەتان بووە و ژیرترین و تەواوترینیان بووە.

هەندێك لە زانابان دەڵێن: مەریەم: بەڕێزترین و گەورەترین ئافرەتی سەردەمی خۆی بووە.

وهەندێکی تریشیان دەڵێن: بەڕێزترین و گەورەترین ئافرەتی هەموو جیهان بووە لە هەموو سەردەمێکدا.

بەڵگەکان زۆرن، بەڵام ئەوەی کە ئێمە هەڵی دەبژێرین بریتییە لە:

پێش ئەوەی کە بچینە سەر مەسەلەکە، پێویستە ئامارژە بکەین بۆ گەورەترین فەزڵی مەریەم وخدیجە و فاطمة و أسیة و عائیشة (خوایان لێ ڕازی بێت) ناوی مەریەم لە قورئاندا باسکراوە و ئاشکرا دیارە، وهەر لە قورئانی پیرۆزدا سوورەتێکی گەورە بە ناویەوە ناونراوە، بە سوورەتی (مریم)، لەمەیشدا ڕێز و گەورەیی وپلەو پایە بۆ ئەو هەیە، و فریشتەکان لەگەڵیدا دواون و قسەیان لەگەڵ کردووە، ئەمەیش ڕێز وگەورەیی بوو بۆ ئەو، خدیجە (خوالێی ڕازی بێت) ئەویش فەزڵ و پلە وپایەی خۆیی هەبووە، کە یەکەم دایکی باوەڕداران بووە، و یەکەم کەس بووە کە موسوڵمان بووە لە ئافرەتاند، وئەو کەسە بوو کە پشتیوانی پێغەمبەری (ﷺ) کرد و بە هەموو توانای خۆی بەرگری لێ دەکرد و یارمەتی دەدا و پشتی دەگرت، هەتا ئەو کاتە کە خەدیجە و (أبوطالب) ی مامی پێغەمبەری تیامرد،ناونراوە بە (عام الحزن) ساڵی خەفەتاوی. و (فاطمة) (خوالێی ڕازی بێت) کچی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بوو، وخەدیجەیش دایکی بوو، ومێردەکەشی (علی کوڕی أبی طالب) بوو، و پێغەمبەر زۆر خۆشی دەویست، هەروەها(علی) و(حسن وحسێن) ی زۆر خۆش دەویست، بێگومان پێغەمبەر (ﷺ) ئەوەی شاردەوە، کە یەکەم کەس دوای مردنی کێیە بەو دەگات، ئەویش زۆر ددڵخۆش بوو بەو مژدەیە، وسەروەری و سەربەرزی زۆری هەبوو، لێرەدا بواری باسکردنی نییە.

(أسیەی کچی مزاحم) ئەو ئافرەتە باوەڕدارە چاکەکارە بوو کە لە ماڵی فیرعەوندا بوو،باوەڕی هێناو لەسەر هەق وڕاستی دامەزراو بوو، ولە خوای گەورە پاڕایەوە کەلە دەست فیرعەون و کارو کردەوە کانی و قە ومی ستەم کاران ڕزگاری بکات.

هەریەکە لەو ئافرەتانە تایبەتمەندی خۆیانیان هەیە، وکە هەموویان بەڕێز بوون.

ئەوەی کە ئیمە لەم مەسەلەیەدا هەڵمان بژاردووە: بێگومان مەریەم (علیها السلام) باشترین ئافرەتی سەردەمی خۆی بووە،چونکە وشەی ﴿العالمین﴾ مانایەکی ڕەها

دەگەیەنێت، وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾، هەروەها جیهانی کاتێکی دیاریکراو دەگەیەنێت، وەك لەم ئایەتەدا هاتووە: ﴿يَا بَنِي إِسْرَائِيلَ اذْكُرُوا نِعْمَتِيَ الَّتِي أَنْعَمْتُ عَلَيْكُمْ وَأَنِّي فَضَّلْتُكُمْ عَلَى الْعَالَمِينَ﴾(البقرە:٤٧). ئەگەر ووشەی (العالمین) ڕەها بوایە، ئەوا هەڵبژاردنەکە لێرەدا هەڵبژاردنێکی تایبەت دەبوو، بەجۆرێك کە خوای گەورە هەڵی بژارد و بە نیشانەیەکی سەرسوڕهێنەر و موعجیزەیەکی ڕوون تایبەتی کرد، کە سکی بە عیسا (علیه السلام) پڕکرد، بەڵام بەبێ باوك، خوای گەورە فەرمووی: ﴿وَجَعَلْنَا ابْنَ مَرْيَمَ وَأُمَّهُ آيَةً﴾(المؤمنون:٥٠).

واتە: (ئێمە عیسای کوڕی مەریەم و دایکیمان کردە بەڵگەو نیشانەیەکی ڕوون).[٤٠٥]

## پێویستییەکانی هەڵبژاردن

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿يَا مَرْيَمُ اقْنُتِي لِرَبِّكِ وَاسْجُدِي وَارْكَعِي مَعَ الرَّاكِعِينَ﴾.

* ڕون کردنەوەی ئە م بۆنەیە، پاش ئەم پلە وپایە و دەرەجە بەرزە کە خوای گەورە ڕێزی مەریەمی پێ گرت: خوای گەورە بەهۆی فریشتەکانەوە فەرمانی نارد بۆ مەریەم، کە لە پەرستشدا تێبکۆشێت و سوپاسگوزاری خوا بکات لەسەر ئەو بەخشش ونیعمەتانە، و بەردەوام بێت لەسەر ڕێگای هیدایەت و چاکسازی.

پێشەوا (الرازی) دەڵێت: (...کاتێك خوای گەورە ڕوونی کردەوە کە مەریەم پێویستە تایبەت بکرێت بە بەخششی زیاتر لەلایەن خواوە، پەرستشی زیاتری لەسەر واجب کر،تا سوپاسگوزار بێت بۆ ئەو نیعمەتانە).[٤٠٦]

لە ئایەتی: ﴿يَا مَرْيَمُ اقْنُتِي لِرَبِّكِ﴾دا:

(القنوت) واتە زۆرمانەوە لەناو نوێژدا بەڕاوەستاوی، یان ڕاوەستانە لەناو نوێژدا، وتراویشە (القنوت) بریتییە لە پەرستش هەروەها وتراوە بریتییە لە (الاخلاص) دڵسۆزی.[٤٠٧]

---

٤٠٥ - تذكرة الحفاظ للذهبي ١\٢٦٩ و طبقات الحفاظ للسيوطي|١١٥.

٤٠٦ - مفاتيح الغيب للرازي ٨|٤٤ بە دەستكارییەوە.

پێشەوا (الراغب) دەڵێت: (القنوت) بریتییە لە پەرستش وگوێڕایەڵی پێویست لەگەڵ ملکەچیدا).[٤٠٨]

– دووبارە کردنەوەی بانگکردنەکە بە(یامریم) بۆ ئاگادار کردنەوە و بە ئاگاهێنانەوەیە، وئاماژەیشە بۆ گرنگی ئەو ستایشەی مەریەم (علیها السلام) کە کراوە.

– بانگ کردنەکە لێرەدا بەناوی(مریم) واتە (العابدة) خواپەرست، بۆ خۆی ڕێز و گەورەیی و کەرامەت دەگەیەنێت، واتە ئەی ئەو کەسەی کەناوت مەریەمە، پێویستە تێکۆشێت لە عیبادەت وپەرستشی خوای گەورەدا.

﴿وَاسْجُدِي وَارْكَعِي مَعَ الرَّاكِعِينَ﴾.

ئێمە پێشتر مانای (القنوت)مان بە گوێڕایەڵی وپەرستشی ڕەها هێنا، بەڵام سوجدەو ڕکوع بردن باسێکی تایبەتە پاش باسی گشتی، بۆ گرنگی وبایەخی زیاتر.

مانای (القنوت)مان بە(القیام) ڕاوەستان هێنا، ئەوا ڕکوع وسوجدە لە تەواوکردنی ئەرکەکانە چونکە نوێژ لەڕاوەستان و دانیشتن وڕکوع وسوجدە پێك هاتووە.

مانای (القنوت)مان بە (الإخلاص) دڵسۆزی و خشوع و ملکەچی هێنا، ئەوا ڕکوع وسوجدە لە کردارە دیارەکانن، بەڵام (الأخلاص) ملکەچی و خشوع لە کارە شاراوە ونادیارەکانن، و پەرستش تەواو نابێت مە گەر بەڕاگرتنی هەردوو حاڵەتی ئاشکرا و بینراو وشاراوە و نادیار.

لێرەدا مەریەم (علیها السلام) ئاڕاستە دەکرێت بۆ ئەوەی کە کارەکانی دڵ و کاری ئەندامەکان پێکەوە ببەستێت، هەتا دیارەکان یەکسان بن بە شاراوەکان، وبیر و باوەڕ لەگەڵ کرداردا ڕێك و هاوسەنگ ببێت.

ئایەتی: ﴿وَارْكَعِي مَعَ الرَّاكِعِينَ﴾. واتە: تۆیش لەناو دەستە و تاقمی ئەواندابە و لە ڕێگەی ئەوانەوە بڕۆ، کە ڕێگایەکی ڕاست و بەرنامەیەکی بەهێزە.

دەربڕینی ئایەتەکە بە ﴿وَارْكَعِي مَعَ الرَّاكِعِينَ﴾ هات، خوای گەورە نەیفەرموو: (مع الراكعات)، (چونکە ئەوجۆرە (جمع) کۆیەیە ی لە ئایەتەکەدا هات گشتگیر ترە، کە

---

[٤٠٧] –جامع البيان للطبري ٦|٤٠٤ .

[٤٠٨] –المفردات للراغب ص|٤١٣ مادة: ق ن ت .

پیاوان و ئافرەتانیش دەگرێتەوە لە سەر شێوازی زۆرینە، و بە بۆنەی سەرەتای ئایەتەکەوە، چونکە پەیڕەوی کردنی پیاوان لەپێشتر و گەورە ترە).[٤٠٩]

_ ئایەتە پیرۆزەکە کە فەرمانێك بوو، لەخوای گەورەوە بۆ مەریەم (علیها السلام) کە لە پەرستشەکاندا تێبکۆشێت و بەردەوام بێت لەسەر گوێڕایەڵی فەرمانەکانی خوا، وسوجدەی زۆر بەرێت و لەگەڵ ڕکوع بەراندا ڕکوع ببات، تا زیاتر لە خوای گەورە نزیك ببێتەوە.

نوێژ کردن پەیوەندییەکە لە نێوان بەندە و پەروەردگاریدا، وهیدایەت وڕەحمەتە، وشیفاو پارێزەرە، وفەزڵ و نیعمەتە لەلایەن خوای گەورەوە، ونزیکی و خۆشەویستییە، ونور وشیفای دڵانە، وبەرز بونەوەیە بۆ لای خواو بەرزبونەوەی پلەو پایە و سڕینەوەی هەڵەو گوناهەکانە. پێشەوا (الغزالي)دەڵێت: (نوێژ کۆڵەکەی دینە و ڕاگری یەقین و دڵنیاییەو لوتکەی نزیك بونەوەو بەڕێزترینی پەرستشە کانە).[٤١٠]

هەریەك لە ئەرکانەکانی نوێژ حیکمەتەکانی بەرزن و نهێنییەکانی بایەخدارن، نوێژ بریتییە لە ملکەچی وخشوع و ڕاوەستان و دانیشتن و ڕکوع و سوجدەبردن، لە فەرموودەیەکی پیرۆزی پێغەمبەردا (ﷺ) هاتووە، دەفەرموێت: (نزیکترین کاتی بەندە لە پەروەردگاری کاتی سوجدە بردنە لە نوێژدا، ودوعای زۆری تیادا بکەن).[٤١١] خوای گەورە زۆر جوانی فەرمووە: ﴿وَاسْجُدْ وَاقْتَرِب﴾(العلق:١٩).

واتە: (سوجدە ببەو لە خوا نزیك بەرەوە).

(معدان) ی کوڕی (طلحة اليحمري) دەڵێت: گەیشتم بە (ثوبان) ی کارگوزاری پێغەمبەری خوا (ﷺ)، ووتم: (کارێکم پێ بڵێ کەبیکەم و،بەوە خوا بمخاتە بەهەشتەوە، یان وتم: خۆشەویسترین کار لای خوا، (ثوبان) بێدەنگ بوو، ئینجا لێم پرسییەوە، وتی:لەو بارەیەوە لە پێغەمبەری خوام (ﷺ) پرسیوە، فەرموویەتی: سوجدەی زۆر ببە بۆ خوای گەورە، تۆ هەر سوجدەیەك دەبەیت بۆ خوا، ئەوە بەوە پلەیەك (بەرزت دەکاتەوە،وگوناهێکیشت لێ کەمدەکاتەوە)، (معدان) دەڵێت: دوایی گەیشتم بە (ابو درداء)هەمان پرسیارم لێکرد، ئەویش هەمان وەڵامی (ثوبان) ی دامەوە.

---

[٤٠٩] –روح المعاني للالوسي ٣|١٥٨.

[٤١٠] –احياء علوم الدين ١|١٤٥.

[٤١١] –رواه مسلم في صحيحه عن ابي هريرة:كتاب الصلاة.

## باسی پێنجەم:
## چەند لایەنێك لە ئیعجازی قورئان، هەواڵ لەحاڵی نەتەوە پێشوەکان دەدات:

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ذَٰلِكَ مِنْ أَنبَاءِ الْغَيْبِ نُوحِيهِ إِلَيْكَ وَمَا كُنتَ لَدَيْهِمْ إِذْ يُلْقُونَ أَقْلَامَهُمْ أَيُّهُمْ يَكْفُلُ مَرْيَمَ وَمَا كُنتَ لَدَيْهِمْ إِذْ يَخْتَصِمُونَ﴾(ال عمران:٤٤).

واتە: (ئەو شتانەی باسکران چەند هەواڵێك بوون لە غەیبەوە، ئێمە لەڕێگەی (وەحی) و سروشەوە بەتۆی دەگەیەنین، خۆ تۆ (ئەی محمد (ﷺ) لەوێ نەبوویت کاتێك پێنوسەکانیان هەڵئەدایە (ئاوەوە، پێنوسی کێ سەرکەوت و ئاو نەیبرد) ئەوەیان مەریەم پەروەردە بکات، تۆ لەوێش نەبوویت کاتێك کێشەیان هەبوو (لەسەر ئەوەی کێ بەخێوی بکات).

ئەمە ئاماژەیەك بوو کە پێشتر باسکرا وهەواڵی ئەوە ڕونکرایەوە کە خوای گەورە چۆن پێغەمبەرانی هەڵبژاردووە و هەواڵ و ڕونکردنەوەی خێزانی عیمران و کچەکەیشی بوو. هەروەها هەواڵی زەکەریا و یەحیا و کەسانی تر کە سوورەتەکە باسی کردون.

ووشەی (الأنباء) کۆی (نبأ)ە، هەواڵێکی زۆر گەورە و گرنگە.

هەواڵ دانی قورئان لەم کارانە بە شێوازێك لە شێوازەکان، ئەوە موعجیزەیەکی غەیبییە، بەڵگە لە سەر ڕاستی پێغەمبەری خوا (ﷺ) وجێگیری ودامەزراوی پەیامەکەی دەدات، موعجیزەیەك بوو،خوای گەورە تەحەددای ئینسان و پەرییەکانی پێ دەکات، و هەموو کەس بێتوانا و بێ دەستەڵاتن لەوەی کە نمونەی قورئان یان سوورەتێك یان ئایەتێك بهێنن .

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ قُل لَّئِنِ اجْتَمَعَتِ الْإِنسُ وَالْجِنُّ عَلَىٰ أَن يَأْتُوا بِمِثْلِ هَٰذَا الْقُرْآنِ لَا يَأْتُونَ بِمِثْلِهِ وَلَوْ كَانَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ ظَهِيرًا﴾(الأسراء:٨٨).

واتە: (ئەی محمد (ﷺ) پێیان بڵێ: سوێند بە خوا ئەگەر هەموو ئادەمیزاد و پەرییەکان کۆ ببنەوە و (هەوڵی بەردەوام بدەن تا) قورئانێکی وەکو ئەمە دانێن و بیهێننە (مەیدان) ناتوانن کاری وابکەن و ناتوانن لە وێنەی بهێنن، ئەگەر چی هەموو لایەکیان ببنە پشتگیر و یارمەتیدەری یەکتر).

خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا _کە ئەمە ماناکەیەتی _ دەفەرموویت: (بەڵکو(لەگەڵ ئەو هەموو بەڵگانەدا) ئەوانە دەڵێن: کە محمد (ﷺ) قورئانی هەڵبەستوە، بڵێ: دە ئێوەیش سوورەتێك وەك سوورەتەکانی دارێژن وبیهێنن، داوا بکەن لە هەر کەسێکی تر کە دەتوانێت، جگە لە خوا. (کەیارمەتیتان بدات) درێغی مەکەن ئەگەر ڕاستگۆن)(یونس:٣٨).
بێگومان هەموو لایەنەکان بێدەستەلات و بێتوانا بوون لەوەی کە نمونەی قورئان یان سوورەتێك لەو یان تەنها ئایەتێك بهێنن، و بەردەوام تەحەددی وموعجیزەکان هەر دەمێنێت هەتا هەڵسانی قیامەت.
پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموویت: (هیچ یەکێك لە پێغەمبەران نەبووە کە چەند موعجیزەیەك یان هاوشێوەی ئەوەی پێ نەبەخشرابێت، کە بەشەر باوەڕی لەسەر هێنابێت، و بەڵام ئەوەی کە بەمن دراوە، بریتییە لە: وەحی کە خوای گەورە پێی داوم، تکام وایە کە زۆرترین شوێنکەوتوم هەبێت).[٤١٢]
* لەناو شێوازەکانی ئیعجازی قورئاندا: هەواڵ لەحاڵی نەتەوە پێشوەکان دراوە، لەچیرۆکی مەریەم (علیهاالسلام) و زەکەریا و یەحیا (علیهما السلام) بەڵگە لەسەر ئەمە دەدەن.
زۆرێکمان لە ڕوداوە گرنگەکان لە ژیانی مەریەمدا نەزانیوە تەنها لە ڕێگەی قورئانەوە نەبێت، لەوانەیش: قورئان باسی سکپڕبونی دایکی بە مەریەم و نەزرکردنی بۆ پەرستش کردووە، زاناو پیاوە ناسراوەکانی ئەوسەردەمە پێشبڕکێیان کرد لەسەر کەفالەت کردنی،و کەفالەتەکەی زەکەریا (علیه السلام) بۆ ئەو و هەڵبژاردنی لە لایەن خواوە لەو کارە گەورە و گرنگ و نیعمەتە بەنرخانە بوو، کە ئێمە نەمان زانیبوو تەنها لە ڕێگەی قورئانەوە نەبێت.
﴿وَبَرًّا بِوَالِدَتِي وَلَمْ يَجْعَلْنِي جَبَّارًا شَقِيًّا﴾ (مریم:٣٢). بێگومان ئەوەی کە لەناو کتێبەکانی ئینجیلدا هاتووە دەربارەی کار و ژیانی عیسا (علیه السلام) ودایکی دژیەك و ناچونیەکن، و تێکدراون و لەڕاستییەوە دوورن و ئامانجیان نەپێکاوە، تەنانەت ئەو کەسانەیشی کە ئینجیلەکانیان وەرگێڕاوە و ڕون کردۆتەوە، توشی سەرسامی هاتوون و کەوتونەتە ناو هەڵەی گەورە و وتەی دژیەك و پێچەوانەوە، و چیرۆکی (یوسف

---
[٤١٢]—رواه البخاري في صحيحه عن ابي هريرة، كتاب:فضائل القرآن.

النجار)یوسفی دارتاش، چیرۆکێکی ناڕێك و شێوێنراوە و هەڵبەستراوە و درۆیە، و هیچ پەیوەندییەکی بە مەریەم(علیها السلام)ە وە نییە.

بێگومان ئەوەی کە لە قورئاندا هاتووە، ڕاست وتەواوە، چونکە قورئان زۆر بە جوانی و بەڕونی باسی مەریەم و(عیسی) (علیه السلام) وگەورە بوونی کردوە. قورئان کتێبی خوای گەورەیە کە بەڕاستی بۆسەر محمد (ﷺ) دابەزیوە، وخۆیشی هەر بەهەق وڕاستی هاتووە و لە خۆیەوە هیچی نەوتووە و تەنها وەحی و هەق وڕاستی دەربڕیوە، وقورئان لەپێشترە لە کتێبە پێشوەکان وگشتگیر و فراوانە و پارێزراوە لەوەی کە دەستکاری بکرێت وتێکبدرێت و گۆڕانکاری تیا بکرێت یان بگۆڕێت. خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ الْقَصَصُ الْحَقُّ وَمَا مِنْ إِلَٰهٍ إِلَّا اللَّهُ وَإِنَّ اللَّهَ لَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ﴾(ال عمران:٦٢). واتە: (بەڕاستی هەر ئەمەیە بەسەرهاتی ڕاست و دروست (دەربارەی عیسا و دایکی)، هیچ خوایەك نیە جگە لە (اللَّه)، بێگومان ئەو (اللَّه)یە هەر خۆی باڵادەست و دانایە.).

لە ئایەتێکی تردا دەفەرمووێت: ﴿إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ﴾(الحجر:٩).

واتە: (بەڕاستی هەر ئێمە قورئانمان دابەزاندوە و بێگومان هەر ئێمەش پارێزگاری دەکەین و (نایەڵین دەستی خیانەتکار هیچ جۆرە دەستێکی تێ بخات و هەموو هەوڵێك بۆ دەستکاری کردنی نەزۆکە).). ﴿أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ الْقُرْآنَ وَلَوْ كَانَ مِنْ عِندِ غَيْرِ اللَّهِ لَوَجَدُوا فِيهِ اخْتِلَافًا كَثِيرًا﴾(النساء:٨٢).

واتە: (ئەوە بۆ ئەوانە سەرنجی قورئان نادەن و لێکی نادەنەوە و لێی ورد نابنەوە؟ خۆ ئەگەر لە لایەن کەسێکی ترەوە بوایە جگە لە خوا بێگومان جیاوازی و دژایەتیەکی زۆریان تێدا دەدۆزیەوە).

جولەکە و بەناو مەسیحییەکان ڕاستییەکانیان تێکداوە و گۆڕیویانە و زۆریان لێی شاردۆتەوە، بەڵام قورئانی پیرۆز بە (قول الفصل)ەوە هات لەزۆر کار و بواردا، هات بۆ ئەوەی ئەو تاوان و ستەمانە ئاشکرا بکات وبەدیاریان بخات کە جولەکەو بەناو مەسیحی یەکانی تێ کەوتوون، کاتێك کە تەورات و ئینجیلیان تێکدا و، قورئان هات تا بە بەڵگەی یەکلاکەرەوە و نیشانە ڕوون و ئاشکراکان ڕاستییەکان دەردەخات، خوای گەورە

فەرمووی: ﴿يَا أَهْلَ الْكِتَابِ قَدْ جَاءَكُمْ رَسُولُنَا يُبَيِّنُ لَكُمْ كَثِيرًا مِمَّا كُنْتُمْ تُخْفُونَ مِنَ الْكِتَابِ وَيَعْفُو عَنْ كَثِيرٍ﴾(المائده:١٥).

واتە: (ئەی خاوەنانی کتێب: دڵنیابن کە پێغەمبەری ئێمە بۆ ئێوەش هاتووە تا زۆربەی ئەو شتانەی کە لای ئێوە ڕوون و ئاشکرا نین و دەیشارنەوە، لە کتێبی (تەورات و ئینجیلدا) بۆتان ڕوون و ئاشکرا بکات، هەروەها لە زۆرێك لەو شتانەی کە شاردوتانەتەوە چاوپۆشی دەکات).

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ هَذَا الْقُرْآنَ يَقُصُّ عَلَى بَنِي إِسْرَائِيلَ أَكْثَرَ الَّذِي هُمْ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ (٧٦)وَإِنَّهُ لَهُدًى وَرَحْمَةٌ لِلْمُؤْمِنِينَ﴾(النمل:٧٦-٧٧).

واتە: (بەڕاستی ئەم قورئانە زۆربەی زۆری ئەو شتانەی کە نەوەی ئیسرائیل جیاوازی و کێشەیان لەسەری هەیە باسی دەکات و لێی دەدوێت و ڕوونی دەکاتەوە هەروەها بەڕاستی ئەم قورئانە هۆی هیدایەت و ڕێنموویی و ڕەحمەت و میهرەبانیە بۆ ئیمانداران).

## باسی شەشەم:
## مۆژدەی فریشتەکان بۆ مەریەم (علیها السلام) بە عیسا (علیه السلام) و کۆمەڵێك لە ڕەوشتەکانی:

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِذْ قَالَتِ الْمَلَائِكَةُ يَا مَرْيَمُ إِنَّ اللَّهَ يُبَشِّرُكِ بِكَلِمَةٍ مِنْهُ اسْمُهُ الْمَسِيحُ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ وَجِيهًا فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ وَمِنَ الْمُقَرَّبِينَ (٤٥) وَيُكَلِّمُ النَّاسَ فِي الْمَهْدِ وَكَهْلًا وَمِنَ الصَّالِحِينَ﴾ (ال عمران:٤٥-٤٦).

* ڕونکردنەوەی بۆنەکە: پاش ئەوەی کە خوای گەورە مەریەمی (علیها السلام) هەڵبژارد و جیای کردەوە و بە پاکی ڕایگرت و باسی کرد و فەرمانی پێکرد کە تێکۆشەر بێت لە پەرستشەکاندا و بەردەوام بێت لەسەر گوێڕایەڵی، وئامۆژگاری کرد بەوەی کە (اخلاص)ی هەبێت وملکەچ وبەخشوع بێت بۆ خوای گەورە، بەو کارە مەریەم ئامادە بوو بۆ موعجیزەیەکی گەورە و نیشانەیەکی گرنگ، کە بریتی بوو لە سکپڕبوونی بە عیسا (علیه السلام) بە پێچەوانەی عادەت و باوەوە کە باوکی نەبووە هەروەك چۆن فریشتەکان مژدەیان بەوە پێدا کە ئەو هەڵبژێردراوە و پاك و خاوێنە، مژدەیەکی تریشی بەدوادا هات کەبریتی بوو لە: بێگومان خوای گەورە هەڵی بژاردوە بۆ ئەو کارە گەورە و گرنگە.

﴿إِذْ قَالَتِ الْمَلَائِكَةُ يَا مَرْيَمُ﴾.

ڕواڵەتی ئاشکرای ئایەتەکە وا دەگەیەنێت، ئەوانەی کە هاتوون مژدەکەیان داوە بە مەریەم (علیها السلام) دەستەیەك بوون لە فریشتە بەرێزەکان، و لە سوورەتی (مریم)دا باسکراوە کە (جبریل) هاتووە بۆلای: ﴿قَالَ إِنَّمَا أَنَا رَسُولُ رَبِّكِ لِأَهَبَ لَكِ غُلَامًا زَكِيًّا﴾(مريم:١٩).

ئایەتەکە وا دەگەیەنێت کە جوبرەئیل (علیه السلام) هات بۆلای مەریەم (علیها السلام) ومژدەی عیسا (علیه السلام) ی پێدا، و زۆرێك لە زانایانی تەفسیر وای بۆ چوون کە ئەوەی مژدەکەی بە مەریەم دا جوبرەئیل (علیه السلام) بوو.[٤١٣]

---

[٤١٣]-الكشاف للزمخشري ١\٣٠٥ و معالم التنزيل والمحرر الوجيز وزاد المسير و تفسير ابي سعود و مفاتيح الغيب .

پێشەوا (الرازی) دەڵێت: ئایەتی: ﴿إِذْ قَالَتِ الْمَلَائِكَةُ يَا مَرْيَمُ إِنَّ اللَّهَ يُبَشِّرُكِ﴾. ڕواڵەتی ئایەتەکە ﴿إِنَّ اللَّهَ يُبَشِّرُكِ﴾ کۆی فریشتەکان دەگەیەنێت، بەڵام ئەوەی کە دەنگی داوەتەوە ئەوەیە کە ئەوەی بانگی لێکرد جوبرەئیل (علیه السلام) بوو.).[٤١٤]

خاوەنی (روح البیان) دەڵێت: مەبەست بە (الملائکة) لێرەدا جوبرەئیلە، ئەوەیشی کە بە کۆ باسمان کرد پێشتر بۆگەورە دانان بوو.

*ئێمەیش دەڵێین: هیچ ڕێگرێك لە دوبارەبونەوەی مژدەکەدا نییە، لە پێشدا فریشتەکان هەموویان مژدەیان پێدابێت ولەسەرو هەموشیانەوە جوبرەئیل، و پاشان جوبرەئیل خۆی وەك بەشەر پیشان دابێت و مژدەکەی بۆ دوبارە کردبێتەوە و ئەویش جارێکی تر سەرسام بوبێت، و زیاتر دڵنیاو دڵ ئارام بوبێت.

﴿إِنَّ اللَّهَ يُبَشِّرُكِ بِكَلِمَةٍ مِنْهُ﴾(ال عمران:٤٥).

(المسیح) بە ﴿كلمة الله﴾ ووشەی خوا ناونرا، چونکە بە ووشەی خوای گەورە هاتە بوون کە (کن) بوو، وەك فەرمووی کاتێك کە مەریەم پرسیاری کرد: ﴿قَالَتْ رَبِّ أَنَّى يَكُونُ لِي وَلَدٌ وَلَمْ يَمْسَسْنِي بَشَرٌ قَالَ كَذَلِكِ اللَّهُ يَخْلُقُ مَا يَشَاءُ إِذَا قَضَى أَمْرًا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُ كُنْ فَيَكُونُ﴾(ال عمران:٤٧).

– خاوەنی (روح البیان) دەڵێت: ووشەی ﴿كلمة﴾ وەك ناونراوە لە عیسا (علیه السلام) بە شێوەیەکی ڕەها، چونکە هۆکاری دەرکەوتنی ڕودانی بریتی بوو لە ووشەیەك کە لە لایەن خواوە دەرچوو، کە بریتی بوو لە ﴿كن﴾ ببە، و ڕودانی هەموو دروستکراوێك، خۆ ئەگەر بەهۆی ئەم ووشە یەوە بوبێت، ئەوا هۆکارەکە زانراو بووە بۆ ڕودانی کارەکە، کە لەمافی عیسا (علیه السلام) نادریار بووە، دروست بوونی عیسا (علیه السلام) دراوەتە پاڵ ووشەیەك، وا لێکدراوەتەوە کە عیسا (علیه السلام) بریتی بێت لەو ﴿كلمة﴾ ووشەیە.[٤١٥]

---

[٤١٤]– مفاتیح الغیب للرازی ٨|٤٧ بە کورتی.

[٤١٥]–روح البیان للبروسوی ٢|٣٤ بە دەستکارییەوە.

* پێشەوا (الألوسي) دەڵێت: وا دەربڕاوە کە (المسیح) بە ﴿کلمة اللهِ﴾ ناونرا، چونکە بەبێ باوك دروست بووە، بە ووشەی (کُن) بە پێچەوانەی تاکەکانی نەوەی ئادەمەوە، کاریگەری ووشەکە لە مافی ئەودا ئاشکرا ترو تەواوترە.[٤١٦]

* ئەوەی کە نزیکە لەمەوە (المراغي) لە تەفسیرەکەیدا باسی کردووە: ﴿أسْمُهُ المسیحُ أبنُ مریَمَ﴾.

خوای گەورە مژدەی ناوەکەیشی پێدا وەك مژدەی ناو لێنراوەکەی پێدابوو، (المسیح) واتە: (المبارك) موبارەك وپیرۆز [٤١٧]

وتراوە ناونرا بە (المسیح) چونکە دەستی دەهێنا بەسەر چاوی کوێردا، بینایی بۆ دەگەڕایەوە، بە فەرمان و ویستی خوا، و کەڕو کەسانی بەڵەکاوی بەفەرمانی خوای گەورە چاکدەکردەوە، وتراوە: (المسیح) واتە: (الصدیق)، وتراوە: بەو ناوە ناونراوە، چونکە بە (زەیتی موبارەك) چەورکراوە، کە پێغەمبەرانی پێش خۆی بەکاریان دەهێنا، کە زەیتێکی بۆن خۆش بوو.

وتراوە: (المسیح) واتە خوای گەورە (مسح)ی کردووە، واتە بەجوانی و پیرۆزی و موبارەکی دروستی کردووە. [٤١٨]

وتراوە: چونکە جوبرەئیل لە کاتی لە دایك بونیدا بە باڵەکانی خۆی مەسحی کردووە، بۆ ئەوەی پارێزراو بێت لە شەیتانی بە نەفرەتکراو. [٤١٩]

لەبەر ئەوەی زۆر دەگەڕا و گەشتی دەکرد بەسەر زەویدا، وتراوە چونکە بنی پێی سوابوو، و چاڵاییەکەی نەمابوو. [٤٢٠]

وتراوە: چونکە دەستی دەهێنا بەسەر هەتیواندا بەتکای ڕەزامەندی خوای گەورە.

---

[٤١٦]–روح المعاني للالوسي ٣/١٦٠به دەستکارییەوە.

[٤١٧]–الکشاف للزمخشري ١/٣٦٣.

[٤١٨]–الجامع لاحکام القرآن للقرطبي ٤/٨٨-٨٩ بە دەستکارییەوە.

[٤١٩]–روح المعاني للالوسي ٣/١٦١.

[٤٢٠]–تفسير القرآن العظيم لابن کثیر ١/٣٦٣-٣٦٤.

ئەوەی كە پەسەند و وەرگیراوە لەم قسە و بۆچونانە بریتییە لە: بێگومان ناونراوە بە (المسیح) واتە: موبارەك وپیرۆز یان بە دەستی موبارەكی، دەستی دەهێنا بەسەر نەخۆشەكاندا و بە فەرمانی خوا شیفایان بۆ دەهات.

عیسا (علیه السلام) لەباتی (المسیح)ە، واتە (السید) گەورە، ووتراوە ناوەكەی لە (العیس) دارێژراوە و بەوە ناونراوە، چونكە ڕەنگی سپی و تێكەڵ بەسور بووە، بەڵام ئەوەی كەڕاستترە ناوەكە ناسراوە ودارێژراو نییە.

لە ئایەتی: ﴿عِيسَى ٱبْنُ مَرْيَمَ﴾دا، ئاماژە بۆ ئەوەكراوە كە عیسا (علیه السلام) بەبێ باوك لەدایكبووە، چونكە ئەگەر باوكی هەبوایە، ئەوا ناوی دەخرایە پاڵ ناوی لەباتی ئەوەی كەناوی دایكی دانراوە، لەمەیشدا وەڵامێكی بۆ گومڕایی مەسیحییەكان تیایە، وەك وایان لێكداوەتەوە، كە عیسا(علیه السلام) كوڕی خوا بێت یان خوابێت – پەنابەخوا – پاك وبێگەردی و بەرزی بۆ خوا لەوەی كەئەوان دەیڵێن.

﴿وَجِيهًا فِي ٱلدُّنْيَا وَٱلْآخِرَةِ﴾ واتە: پیاو ماقوڵ وپایە بەرزە لەم دنیایەدا.

دەڵێین: لێرەدا پرسیارێك دروست دەبێت: ئەگەر كاتێك (المسیح) لەم پلە وپایەو ڕێزەدا بێت لەناو شۆرەتی دنیاییدا ئیتر جولەكە و بێ باوەڕان چۆن دەبێت ئازاری بدەن و بیچەوسێننەوە؟

دەڵێین: لەكەداركردنی (المسیح) بەئازاردان وچەوساندنەوە هیچ لە ڕێز وپلەو پایەی ئەو كەم ناكاتەوە، وناوەكەیشی لەكەدار و شێوێنرا و ناكات، پێغەمبەران (علیهم السلام) بەڕێزترینی دروست كراوانی خوان، و لە هەموویان پایەدارتر و سەربەرز ترن، بێگومان كەوتونەتە بەر ئازار و چەوساندنەوەی خەڵكی، بەڵام بەوەیش هەر ڕێز و سەربەرزییان زیادی كردووە.

﴿وَمِنَ ٱلْمُقَرَّبِينَ﴾ واتە: لای خوای گەورە لەنزیكانن لەدنیاو لەقیامەتدا.

﴿وَيُكَلِّمُ ٱلنَّاسَ فِي ٱلْمَهْدِ وَكَهْلًا وَمِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ﴾(ال عمران:٤٦).

واتە: (جا عیسا لە بێشكەدا و بە گەورەییش قسە دەكات بۆ خەڵكی، لە پیاو چاكانیشە) قسەكردنەكە ی لەبێشكەدا، ئەو كاتە بوو كەخوای گەورە هێنایە قسەو دانی نا بەپاكی وبێتاوانی دایكیدا لەو تۆمەتانەی (الیهود) جولەكە بۆی ڕێكدەخست.

فەرمووی: ﴿فَأَشَارَتْ إِلَيْهِ قَالُوا كَيْفَ نُكَلِّمُ مَنْ كَانَ فِي الْمَهْدِ صَبِيًّا (٢٩) قَالَ إِنِّي عَبْدُ اللَّهِ آتَانِيَ الْكِتَابَ وَجَعَلَنِي نَبِيًّا (٣٠) وَجَعَلَنِي مُبَارَكًا أَيْنَ مَا كُنْتُ وَأَوْصَانِي بِالصَّلَاةِ وَالزَّكَاةِ مَا دُمْتُ حَيًّا (٣١) وَبَرًّا بِوَالِدَتِي وَلَمْ يَجْعَلْنِي جَبَّارًا شَقِيًّا (٣٢) وَالسَّلَامُ عَلَيَّ يَوْمَ وُلِدْتُ وَيَوْمَ أَمُوتُ وَيَوْمَ أُبْعَثُ حَيًّا﴾(مريم:٢٩-٣٣).

واتە: ((مەریەمیش هیچی نەگوت) بەڵکو ئاماژەی بۆ ڕۆڵەی نازداری کرد (تا لەو بپرسن)، هەموو (بە سەرسامیەوە) وتیان: چۆن قسە لەگەڵ منداڵی ناو بێشکەدا دەکرێت، (ئینجا منداڵی ساوا هاتە گفت و بەدەنگە ناسکەکەی) وتی: بەڕاستی من بەندەی خوام، کتێبی ئینجیلی پێ بەخشیووم و کردوومی بە پێغەمبەری خۆی، منی موبارەك و پیرۆزیش کردووە لە هەر کوێدا بم و ئامۆژگاری کردووم کە نوێژەکانم ئەنجام بدەم و لە زەکاتدانیش درێغی نەکەم هەتا لە ژیاندا هەم، (هەروەها فەرمانی پێداوم کە) چاك ڕەفتار بم لەگەڵ دایکمدا و نەیکردووم بە کەسێکی زۆردارو بەدرەفتار، سڵاوی پەروەردگارم لەسەرە ئەو ڕۆژەی کە لەدایك بووم و ئەو ڕۆژەش کە دەمرم، ئەو ڕۆژەش کە زیندو دەکرێمەوە).

بەڵام دەربارەی قسەکردنەکەی لە گەورەییدا: وتراوە: لێرەدا بەوە باسکراوە کە مژدە دراوە بە دایکی بەوەی کە دەگاتە تەمەنی گەورەیی و دەبێتە پیاو، وتراوە لەبەر ئەوەی کە زمان پاراو و ڕەوانبێژ بووە لە قسەکردندا لە کاتی ناو بێشکەدا و هەروەها لە گەورەییشدا بە یەکسانی، وتراوە: ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە ئەو لە داهاتودا بۆ ئاسمان بەرز دەکرێتەوە، پاشان دادەبەزێتەوەسەر زەوی، لە دنیا و ئاخیرەتدا قسە دەکات لەگەڵ خەڵکیدا. بێگومان عیسا (علیه السلام) گەیشتە تەمەنی گەورەبوون کاتێك مەسیحییەکان دەیان ووت: خوایە، ئەمە وەڵامیکە بۆ ئەوان کە بێگومان خوا بەم قۆناغ و گۆڕانکاریانەدا ناڕوات، و لەحاڵەتێکەوە ناچێتە حاڵێکی تر، بەڵام عیسا (المسیح) لە حاڵەتی منداڵیەوە دەچێت بۆحاڵەتی گەورە بوون. [٤٢١]

سوود و گرنگی قسەکردنەکە لە بێشەکەدا بریتی بوو لە: دانی نا بە پاکی و بێ تاوانی دایکیدا هەروەها بەندایەتی خۆی بۆ خوای گەورە ڕاگەیاند و وتی من پێغەمبەرم و

---

[٤٢١]- روح المعاني للالوسي ٣|١٦٣-١٦٤.

بەرەکەتدارم وچاکەکارم لەگەڵ دایکم  هەروەها نەفی ئەوەیشی کرد کە زۆردار و توندبێت، ئەو کەسێکی چاکە کار و بە بە زەیی و نەرم ونیان و خۆڕاگر و ئارامگربوو.
سود و گرنگی قسە کردنەکەی لە گەورەییدا بریتییە لە: ڕێنمونی خەڵکی دەکات بۆ ڕێگای چاکەکاری و دینداری لە کارو باری دین ودنیایدا.
بەڵام مەسیحییەکان ئینکاری ئەوەیان کردووە عیسا (علیه السلام) لە ناو بێشکەدا قسەی کردووە، چونکە ئەگەر دانیان پیابنایە ئەوا پابەند دەبون بەوەی کە بەندایەتی خوا بکەن، وەك عیسا دانی پیانا و دەری بڕی: ﴿قَالَ إِنِّي عَبْدُ اللَّهِ آتَانِيَ الْكِتَابَ وَجَعَلَنِي نَبِيًّا﴾.

## هەڵوێستی مەریەم ( علیها السلام ) لەم مژدەیەدا

خوای گەورە فەرمووی: ﴿قَالَتْ رَبِّ أَنَّى يَكُونُ لِي وَلَدٌ وَلَمْ يَمْسَسْنِي بَشَرٌ قَالَ كَذَلِكِ اللَّهُ يَخْلُقُ مَا يَشَاءُ إِذَا قَضَى أَمْرًا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُ كُنْ فَيَكُونُ﴾ (ال عمران:٤٧).
مەریەم (علیها السلام) بەسەر سوڕمانەوە دەربارەی ئەم مژدەیە و بەشێوازی پرسیارکردن دەربارەی چۆنێتی ڕودانی ئەوکارە وتی: ﴿رَبِّ أَنَّى يَكُونُ لِي وَلَدٌ وَلَمْ يَمْسَسْنِي بَشَرٌ﴾.
واتە: (پەروەردگارا جا چۆن من منداڵم دەبێت خۆ کەس نزیکم نەکەوتووە؟).
وەڵام لەلایەن خوای گەورە و بە تواناوە  هات و فەرمووی: ﴿كَذَلِكِ اللَّهُ يَخْلُقُ مَا يَشَاءُ إِذَا قَضَى أَمْرًا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُ كُنْ فَيَكُونُ﴾.
واتە: (ویست و فەرمانی خوا هەروایە و چی بوێت، دروستی دەکات، هەر کاتێك شتێکی بوێت تەنها پێی بڵێ ببە، دەستبەجێ دەبێت.).
کاتێك ئەم کارە ڕوو دەدات، سەرسامی وتێڕامان نامێنێت و دڵ ئارام دەبێتەوە، وئینسان بەخۆیدا دەچێتەوە و پرسیار دەکات، من چۆن سەرسام ببم لەم کارە فیترییە؟![٤٢٢]

[٤٢٢]-في ظلال القرآن ١|٣٩٨.

**باسی حەوتەم:**

**جوبرەئیل ( علیه السلام ) دێت و لە شێوەی بەشەردا خـۆی نیشـانی مەریـەم ( علیهـا السلام ) دەدات:**

خوای گەورە لە سوورەتی (مریم)دا دەفەرموویێت: ﴿وَاذْكُرْ فِي الْكِتَابِ مَرْيَمَ إِذِ انْتَبَذَتْ مِنْ أَهْلِهَا مَكَانًا شَرْقِيًّا (١٦) فَاتَّخَذَتْ مِنْ دُونِهِمْ حِجَابًا فَأَرْسَلْنَا إِلَيْهَا رُوحَنَا فَتَمَثَّلَ لَهَا بَشَرًا سَوِيًّا﴾ (مریم:١٦-١٧).

پاش ئەوەی خوای گەورە دەربارەی زەکەریا (علیه السلام) دوا، کە چۆن خوای گەورە منداڵێکی پێ بەخشی، لەگەڵ ئەوەی کە تەمەنی گەورە بوو، و خێزانەکەیشی نەزۆك بوو، ئینجا خوای گەورە دەربارەی دروستکردنی عیسا (علیه السلام) دەدوێت، بەبێ باوك.

پێشەوا (النیسابوری) دەڵێت: (لێرەوە سەرەتای دروستکردنی عیسا (علیه‌السلام) دەست پێ دەکات، هیچ گومان لەوەدا نییە کە دروست بوونی منداڵێك لە نێوان ژن وپیاوێکی پیر و بەتەمەندا نزیکترە لە عادەت و دەستورەوە تا ئەوەی منداڵێك بە بێ باوك دروست ببێت، لەبەر ئەمە چیرۆکی عیسام دواخست بەسەر چیرۆکی یەحیادا، تا لە خوارەوە بۆ سەرەوە سەرکەوین.) [٤٢٣]

**مەریەم ( علیها السلام ) لە کوێدا بوو، کاتێك جوبرەئیل لە شێوەی بەشەردا هات بۆ لای؟**

خوای گەورە فەرمووی: ﴿وَاذْكُرْ فِي الْكِتَابِ مَرْيَمَ﴾.

واتە: لە قورئانی پیرۆزدا باسی مەریەم بکە (ئەی محمد (ﷺ)) چونکە چیرۆکە قورئانییەکان لە شوێنی ئەو توێشووەن کە باوەڕدار خۆی پێ دەوڵەمەند دەکات و

[٤٢٣]-غرائب القرآن ورغائب الفرقان للنیسابوری.

وەریان دەگرێت لە ژیانیدا، و لە شوێنی ئەو نور و ڕوناکیەیە کە ڕێگای خوامان بۆ ڕوناك دەکاتەوە، باوەڕدار هەمیشە پێویستی بەو ڕوناکی وتوێشوە دەبێت، کەواتە دەبێت بەردەوام لە تێرامان و ورد بونەوەدا بێت، لە چیرۆکە قورئانییەکان، و پەندیان لێ وەربگرێت.

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَكُلًّا نَّقُصُّ عَلَيْكَ مِنْ أَنبَاءِ الرُّسُلِ مَا نُثَبِّتُ بِهِ فُؤَادَكَ وَجَاءَكَ فِي هَٰذِهِ الْحَقُّ وَمَوْعِظَةٌ وَذِكْرَىٰ لِلْمُؤْمِنِينَ﴾.(هود:١٢٠).

واتە: (ئەی محمد (ﷺ) هەموو ئەوانەشت بۆ دەگێڕینەوە لە چیرۆك و هەواڵی پێغەمبەران، بۆ ئەوەی کە دڵی تۆی پێ دابمەزرێنین و دڵنیات بکەین، دڵنیاش بە کە لەم هەواڵانەدا حەق و ڕاستیت بۆ هات و بۆت ڕوونکرایەوە، هەروەها ئامۆژگاری و بیرخستەوەی باشی تێدا بوو بۆ ئیمانداران.)

﴿إِذِ انتَبَذَتْ مِنْ أَهْلِهَا مَكَانًا شَرْقِيًّا﴾ (مريم:١٦) واتە: (کاتێك کەنارگیری کرد لە کەس و کاری و شوێنێکی لە ڕۆژهەڵاتی (بيت المقدس) هەڵبژارد (بۆ خواپەرستی).

زانایان ڕا و بۆچونی جیاوازیان هەیە لەسەر ئەو شوێنەی کە بۆی چووە بۆ. بەڵام ئەوەی کە وەردەگێڕرێت و گونجاوە چووە بۆ ئەوێ. بەڵام ئەوەی کەوەریدە گرێت وگونجاوە بوترێت بریتییە لە: شوێنەکە لەڕۆژهەڵاتی (بيت المقدس) بووە بێگومان مەریەم (عليهاالسلام) ڕوی کردە ئەو شوێنە تا لەوێدا بمێنێتەوە و خۆی سەرقاڵ بکات تەنها بە خوا پەرستییەوە، بێگومان لەوێ سود لە مانەوەکەی دەبینێت بۆ وەرزشی دەرونی و بەرز وپاك ڕاگرتنی لەلایەنی ڕۆحی و خۆی بۆ کارێکی گرنگ ئامادە دەکات و دڵ ودەرونی پاك و خاوێن دەکاتەوە و دەیەوێت زیاتر لە خوای گەورە نزیك بێتەوە.

چۆن هاتبونە لای زەکەریا (عليه السلام) کاتێك کە لە ناو میحرابەکەدا ڕاوەستابوو نوێژی دەکرد، کە بەرە کەت و بەزەیی و دەروی خوایی بە سەریدا دەڕژا.

﴿فَاتَّخَذَتْ مِن دُونِهِمْ حِجَابًا﴾ (مريم:١٧).

واتە: (ئینجا لە نێوان خۆی و ئەواندا پەردەیەکی ڕایەڵ کرد (تادوور لەخەڵکی بە سۆزەوە خواپەرستی بکات و) هیچ شتێك سەرقاڵی نەکات.

﴿فَأَرْسَلْنَا إِلَيْهَا رُوحَنَا﴾ (مريم:١٧). واتە: (ئێمەش جوبرەئیلی فریشتەمان نارد بۆ لای) تا مژدەی لەدایك بوونی عیسای (عليه السلام) پێ بدات.

(جبریل) بە (روح) ناونراوە، (چونکە دین بە هۆی ئەو و وەحی ئەوەوە زیندو دەبێتەوە).[٤٢٤] هەروەك چۆن جەستە بە ڕۆح زیندو دەبێت و زەوی بە ئاو زیندو دەبێتەوە.

خوای گەورە ناوی (روح)ی (إضافة) کرد بۆ لای ناوی خۆی: ﴿رُوحَنَا﴾ بۆ ڕێزگرتن و بە گەورە دانان، و ڕونکردنەوەی ئەوەی کە (جبریل) (علیه السلام) نوێنەری خوای گەورەیە ﴿فَتَمَثَّلَ لَهَا بَشَرًا سَوِيًّا﴾(مريم:١٧). واتە: (وەکو بەشەرێکی تەواو (خۆی خستە بەرچاوی).

فریشتەکان خۆیان لەسەر شێوازی جوان نیشان دەدەن، بێگومان جوبرەئیل لەسەر شێوەیەکی زۆر جوان هات بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) وپرسیاری ئیسلام و ئیمان و چاکە و نیشانەکانی قیامەتی لێکرد، پێغەمبەریش (ﷺ) وەلامی دایەوە، کاتێك جوبرەئیل ئەوێی جێهێلا، پێغەمبەر (ﷺ) بە هاوەڵە بەڕێزەکانی کە لەوێ ئەو دیمەنە جوانەیان بینی وت:ئایا زانیتان ئەوە کێ بوو؟ هەموو وتیان: خوا و پێغەمبەرەکەی زاناترن، ئەویش فەرمووی: ئەوە جوبرەئیل بوو، هاتبو کار و باری دینەکەتان فێر بکات.[٤٢٥]

فریشتەکان جەستەیان نورانی و ڕوناکییە، شێوازی جوان وەردەگرن.[٤٢٦]

بێگومان جوبرەئیل لە شێوەی بەشەردا خۆی پیشانی مەریەم (علیها السلام) دا، تا خۆگری ببێت و لێی نەترسێت و هەڵبێت، هەروەها بۆ ئەوەی لێی تێبگات، چونکە نەی دەتوانی بە شێوەی ڕاستەقینەی خۆی بیبینێت.

تێبینی: زۆر شتی ناشایستە و بێکەڵك دەربارەی شێوازی هاتنی جوبرەئیل وتراوە، کە هیچیان ڕاست نین و پێویست ناکات لێرەدا بیان نوسین چونکە جێی گرنگی و بایەخ نین، شیاوی ئەو دروست کراوە بەڕێزەی خوا نییە.

---

[٤٢٤] - روح المعاني للالوسي ١٦|٧٥.

[٤٢٥]- پێشتر ڕیوایەت کراوە.

[٤٢٦]-عقيدة المؤمن لابي بكر الجزائري.

## مەریەم ( علیها السلام ) پەنا دەگرێت بە خوا لەو کەسەی کە هات بۆ لای لە شوێنەکەی خۆیدا

خوای گەورە فەرمووی: ﴿قَالَتۡ إِنِّيٓ أَعُوذُ بِٱلرَّحۡمَٰنِ مِنكَ إِن كُنتَ تَقِيّٗا﴾ (مريم:١٨).

واتە: (مەریەم (علیها السلام) ووتی: بەڕاستی من پەنا دەگرم بە خوای میهرەبان لە تۆ ئەگەر کەسێکی بە تەقوا و لە خواترس بیت).

کاتێك ئەو کەسە نەناسە لەپڕ خۆی کرد بە شوێنی خواپەرستییەکەی مەریەمدا بەبێ مۆڵەت وەرگرتن ئەویش پەنای گرت بەخوای گەورە، ئەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە زۆر داوێنپاك و لەخواترس بووە، وزۆر شەرمی کردووە.

بێگومان خوای گەورە لەم حاڵەتەدا بەزەیی پێدا هاتەوە، چونکە ئافرەتە و لاوازە و لە خراپە بەدووری گرت، هەروەها ڕەحم وبەزەیی و تەقوایش لەدڵی ئەو پیاوە غەریبەدا زیند بوو، چونکە ئەگەر کەسێکی بەڕەحم بێت، دەبێت ڕەحمی پێ بکات لەبەر لاوازی وتەنهاییەکەی، وئەگەر لەخواترس بێت، دەبێت لێی دورکەوێتەوەو دەستی خراپەی بۆ نەبات.

ئیمامی بوخاری (خوالێی ڕازی بێت) لە (صحیح)ەکەیدا، لە (ابی وائل)ەوە ڕیوایەتی کردووە، کە فەرموویەتی: مەریەم (علیها السلام) زانی کە کەسی لەخواترس خاوەن عەقڵ ژیرییە، کاتێك فەرمووی: ﴿إِن كُنتَ تَقِيّٗا﴾. (٤٢٧)

## جوبرەئیل ( علیه السلام ) ڕاستی و کارە گرنگەکەی خۆی ئاشکرا دەکات

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿قَالَ إِنَّمَآ أَنَا۠ رَسُولُ رَبِّكِ لِأَهَبَ لَكِ غُلَٰمٗا زَكِيّٗا﴾(مريم:١٩).

ترس و دڵە ڕاوکێی لەسەر مەریەم لابرد، و خۆی ئاشکرا کرد فریشتەیەکە لە دەستەی فریشتەکانی خوای گەورە، و بەفەرمانی خوای گەورە هاتووە بۆ ئەوەی منداڵێکی پاك وخاوێنی پێ ببەخشێت.

---

[٤٢٧] -صحيح البخاري كتاب احاديث الانبياء.

(الألوسي) دەڵێت: ﴿إِنَّمَا أَنَا رَسُولُ رَبِّكِ لِأَهَبَ لَكِ﴾. واتە: بۆ ئەوەی من ببمە هۆکارێك بۆ بەخشینی منداڵەکە، ئەویش بەهۆی ئەوەی کە فوی کرد بەچمکی یان یەخەی بەرگەکەیدا، و دەشگونجێت گێڕانەوەی فەرموودەکەی خوا بێت، واتە: پەروەردگارت ئەوەی فەرمووە: کە ئەم فریشتەیەم ناردووە تا منداڵێك بە تۆ ببەخشم...).[٤٢٨]

## سەرسوڕمانی مەریەم (علیها السلام) لە مژدە دانەکە

﴿قَالَتْ أَنَّى يَكُونُ لِي غُلَامٌ وَلَمْ يَمْسَسْنِي بَشَرٌ وَلَمْ أَكُ بَغِيًّا﴾. مەریەم (علیها السلام) زانی ودڵنیا بوو کە بێگومان ئەم مژدەیە ڕاستە، و ئەو کەسەیشی لەبەردەمیدا ڕاوەستاوە فریشتەیە و لەلایەن خواوە نێردراوە، بەڵام سەرسام بوو، وپرسیاری کرد لە چۆنیەتی ڕودان و جێبەجێ بونی ئەو مژدەیە، چونکە عادەت و دەستور وایە کە لەدایك بوونی منداڵ نابێت هەتا سکپڕبوون ڕونەدات لەگەڵ بونی پیاودا، و سکپڕبوون یان ئەوەتا لە ڕێگای هاوسەرداری شەرعییەوە دەبێت، یان لەڕێگای ناشەرعییەوە، و ئەو کەسی لێ نزیك نەبۆتەوە بە هاوسەرداری، وحاشا ئەو کە کەسێکی خراپەکار بوو بێت.

ووشەی (البغي) واتە: خراپەکار و داوێن پیس کە لەگەڵ پیاواندا کاری داوێن پیسی بکات. بێگومان مەریەم پاك و پاکداوێن بووە و نزیکی پیاو نەکەوتووە، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَلَا تُكْرِهُوا فَتَيَاتِكُمْ عَلَى الْبِغَاءِ إِنْ أَرَدْنَ تَحَصُّنًا لِّتَبْتَغُوا عَرَضَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَمَن يُكْرِههُّنَّ فَإِنَّ اللَّهَ مِن بَعْدِ إِكْرَاهِهِنَّ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾(النور:٣٣).

واتە: (بە زۆر کەنیزەکەکانتان هانمەدەن بۆ داوێن پیسی، ئەگەر ئەوان پاك داوێنیان دەویست (دەبێت پیاوی ئازاد زیاتر پاکداوێنی مەبەست بێت)، بۆ ئەوەی لەو ڕێگە چەوتەوە ماڵ و سامانی ژیانی دنیا بەدەست بهێنن، جا ئەوەی بە زۆر ئەو گوناهەیان پێ بکات، ئەوە بەڕاستی خوا دوای ئەو زۆر بۆ هێنانەیان لێخۆش بوو میهرەبانە و چاوپۆشیان لێ دەکات).

٤٢٨-روح المعاني للالوسي ١٦|٧٧ بە دەستکارییەوە.

**-ڕونکردنەوەیەك:**

**خوای گەورە لە سوورەتی (ال عمران)دا فەرمووی:** ﴿قَالَتْ رَبِّ أَنَّىٰ يَكُونُ لِي وَلَدٌ وَلَمْ يَمْسَسْنِي بَشَرٌ﴾(ال عمران:٤٧).

**لە سوورەتی (مریم)دا فەرمووی:** ﴿قَالَتْ أَنَّىٰ يَكُونُ لِي غُلَامٌ وَلَمْ يَمْسَسْنِي بَشَرٌ وَلَمْ أَكُ بَغِيًّا﴾(مريم:٢٠).

**لە سوورەتی (ال عمران)دا ووشەی** ﴿وَلَد﴾ **و لە سەرەتی (مریم)دا ووشەی** ﴿غُلَام﴾ **هات، بۆچی؟**

**پێشەوا (الکرمانی) وەڵامی ئەم پرسیارە دەداتەوە و دەڵێت: (...چونکە لە سوورەتی (ال عمران)دا باسی(المسیح) پێشکەوت کە کوڕی مەریەم (علیها السلام) بوو:** ﴿إِذْ قَالَتِ الْمَلَائِكَةُ يَا مَرْيَمُ إِنَّ اللَّهَ يُبَشِّرُكِ بِكَلِمَةٍ مِّنْهُ اسْمُهُ الْمَسِيحُ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ﴾ (ال عمران:٤٥).

**بەڵام لە سوورەتی (مەریەم)دا باسی** ﴿غُلَام﴾ **منداڵەکە پێش کەوت:** ﴿لِأَهَبَ لَكِ غُلَامًا زَكِيًّا﴾(مريم:١٩).[٤٢٩]

*** لە سوورەتی (ال عمران)دا، فەرمووی:** ﴿وَلَمْ يَمْسَسْنِي بَشَرٌ﴾ **و لە سوورەتی (مریم)دا فەرمووی:** ﴿وَلَمْ يَمْسَسْنِي بَشَرٌ وَلَمْ أَكُ بَغِيًّا﴾ **ئەوەی کە لە سوورەتی (ال عمران)دا هات، لە ڕاستیدا هەموو ئەوانە دەگرێتەوە کە لە ڕێگەی (زواج) هاوسەرداری حەڵاڵ یان خراپە و داوێن پیسییەوە ڕودەدات، بەڵام بۆچی لە سوورەتی (مریم)دا** ﴿وَلَمْ أَكُ بَغِيًّا﴾ **هات؟ لەگەڵ ئەوەی کە ئایەتی:** ﴿وَلَمْ يَمْسَسْنِي بَشَرٌ﴾ **ئەوەیش دەگرێتەوە؟ دەڵێین: ئەوەی کە لە سوورەتی (مریم)دا هات، گونجاوە لەگەڵ ئەو باسەی کە سوورەتە پیرۆزەکە هێناویتی، لەوەی کە مەریەم (علیها السلام) عیسا بە باوەش هەڵدەگرێت و دەیهێنێتەوە بۆ ناو قەومەکەی، و ئەوانیش درۆ و بوهتانیان بۆ هەڵدەبەستن، و ئینجا عیسا (علیه السلام)**

[٤٢٩]-البرهان في توجيه متشابه القرآن للكرماني ص|٤٧ بە دەستکارییەوە.

خۆی دەست دەکات بە قسەکردن کاتێك کە لە ناو بێشکەدا بوو، ودان دەنێت بە پاکی وبێ تاوانی دایکیدا بەڵام ئەم باس و ڕونکردنەوەیە لە سوورەتی (آل عمران)دا نەهات.
* پێشەوا(الرازی) لە تەفسیرەکەیدا دەڵێت: (....وەڵامەکە لەچەند ڕوویەکەوە دەبێت: یەکەم: ووشەی (مسّ) مەبەست پێی (نکاح)ی حەلاڵە، واتە: (جوت بونی حەلاڵ لەگەڵ هاوسەردا) چونکە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَلَمْ يَمْسَسْنِي بَشَرٌ﴾ (البقرة:٢٣٧). بەلام (الزنا) زینا و داوێن پیسی وەك ئەوە نییە، بەڵکو پێی دەوترێت (فَجَرَ) یان شتێك لەو شێوازە بچێت کە شیاو و گونجاو نەبێت پێی.
دووەم: بێگومان دوبارە کردنەوەی بۆ گەورەیی کارەکە و حاڵی مەریەمە، وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿حَافِظُوا عَلَى الصَّلَوَاتِ وَالصَّلَاةِ الْوُسْطَى﴾ (البقرة:٢٣٨) هەروەها ئایەتی: ﴿وَمَلَائِكَتِهِ وَرُسُلِهِ وَجِبْرِيلَ وَمِيكَالَ﴾(البقرة:٩٨).

هەر بەو جۆرەیە لێرەدا، بێگومان ئەگەر شتێك لە ئافرەت بینرا و لە حاڵەتی هاوسەرداریدا نەبوو، ئەوا بە توندی و ڕەقی قسەی لەگەڵدا دەکرێت، ئەگەر بە کۆرپەکەیەوە گەڕایەوە ئەوا بە خراپەکار باسی دەکەن، لەبەر ئەوە دوای ئەوەی دەستی کرد بەقسە کردن، ئەوەیشی وت،چونکە ئەو لەو بوارەدا گەورە ترە.[٤٣٠]

## وەڵامەکەی جوبرەئیل بۆ مەریەم بە سەرسوڕمانەوە بوو

خوای گەورە فەرمووی: ﴿قَالَ كَذَلِكِ قَالَ رَبُّكِ هُوَ عَلَيَّ هَيِّنٌ وَلِنَجْعَلَهُ آيَةً لِلنَّاسِ وَرَحْمَةً مِنَّا وَكَانَ أَمْرًا مَقْضِيًّا﴾(مریم:٢١).

واتە: (جوبرەئیل ووتی: ئەو قسانەی تۆ ڕاست و دروستن، بەڵام ئەوە بڕیاری پەروەردگارە و دەفەرموێت: ئەوکارە لای من ئاسانە (کە بەبێ باوك ئەو منداڵە بهێنمە کایەوە)، بۆ ئەوەی بیکەمە نیشانە و موعجیزەیەك بۆ خەڵکی، هەروەها ڕەحمەتێکی تایبەتیش بێت لەلایەن ئێمەوە، ئیتر ئەو کارەش بڕیاری لەسەر دراوە و بڕاوەتەوە).

[٤٣٠]-مفاتیح الغیب للرازي ٢١\١٩٩-٢٠٠ بە دەستکارییەوە.

ئەم کارە نیشانەو بەڵگەیەکی گەورە و ڕوون بوون لەسەر قودرەت و دەسەڵاتی خوای گەورە.

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَجَعَلْنَا ابْنَ مَرْيَمَ وَأُمَّهُ آيَةً وَآوَيْنَاهُمَا إِلَى رَبْوَةٍ ذَاتِ قَرَارٍ وَمَعِينٍ﴾(المؤمنون: ٥٠). (پێشتر ماناکرا).

بێگومان ڕەحمەت و بەزەیی خوای گەورە گەیشت بە (مریم)، چونکە بویە دایکی پێغەمبەرێکی ناسراو و بەناوبانگ و ناودار و خاوەن پلەو پایە لە دنیاو لە قیامەتدا.

هەروەها ڕەحمەتیشە بۆ هەموو کەسێك کە باوەڕیان پێ هێناوە و باوەڕی پێ دەهێنن.

## باسی هەشتەم:

## فو دەکرێت بە مەریەمدا ( علیها السلام ) وسکی بە عیسا ( علیەالسلام ) پڕدەبێت:

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَحَمَلَتْهُ فَانْتَبَذَتْ بِهِ مَكَانًا قَصِيًّا﴾(مریم:٢٢).

پاش ئەوەی مەریەم (علیها السلام) ئارامی گرت لە پەنای فەرمانەکەی خودا و ڕازی بوو بە بڕیار و فەرمانی خوا، ودڵنیا بوو کە بێگومان ئەوە ویست و ئیرادە و حیکمەتی خوایە کە جوبرەئیل (علیه السلام) فوی پیا کرد و سکی بە عیسا (علیه السلام) پڕبوو.

بێگومان ئایەتە قورئانییەکان لە چەند سوورەتێکدا باسی(فوکردن بە مەریەم)یان کردووە، لەوانە لە سوورەتی (مریم)دا، باسی (روح القدس) جوبرە ئیل دەکات کە فوی کرد بە مەریەمدا، هەروەها ئەم باسە لە سوورەتی (الأنبیاء) و (التحریم)دا هاتووە، کە ئاماژەیە بۆ یەکدەنگی قورئان لەسەر باسەکە، هەریەك لە ئایەتەکان باسێکی تیایە کە لەگەڵ پێش خۆی و دوای خۆیدا دەگونجێت، وەهەریەك لە ئایەتەکان پەیوەندییان بە بابەتی سوورەتەکانی خۆیانەوە هەیە، هەروەها پەیوەندیشی بە ناوەڕۆکی هەموو قورئانی پیرۆزەوە هەیە.

کاتێك هەموو ئایەتە جیاجیاکان لە باسێکدا کۆدەکەینەوە، ئەوا خۆمان لەبەردەم باسێکی ڕێك و پێك و ناوازەدا دەبینینەوە، هەروەها پێکهاتەیەکی بەهێز و گونجاو و تێر و تەسەل لێ پێك دێت.

خوای گەورە جوانی فەرمووە: ﴿الر كِتَابٌ أُحْكِمَتْ آيَاتُهُ ثُمَّ فُصِّلَتْ مِن لَّدُنْ حَكِيمٍ خَبِيرٍ﴾(هود:١).

واتە: (﴿الر﴾ لەسەرەتای سوورەتی (البقرة) ڕاڤە کراوە. ئەمە کتێب و پەیامێکە (لەو پیتانە پێکهاتووە) کە ئایەت و یاساکانی بە شێوەیەکی ڕاست و دروست پێکەوە پەیوەست کراون و جۆشدراون، پاشان درێژەیان پێدراوە و ڕوون کراونەتەوە لەلایەن زاتێکەوە کە دانا و بەئاگا و لێزانە).

* خوای گەورە لە سوورەتی (الأنبياء)دا دەفەرموێت: ﴿وَالَّتِي أَحْصَنَتْ فَرْجَهَا فَنَفَخْنَا فِيهَا مِن رُّوحِنَا وَجَعَلْنَاهَا وَابْنَهَا آيَةً لِّلْعَالَمِينَ﴾(الأنبياء:٩١).

* لە سوورەتی (التحريم)دا دەفەرموێت: ﴿وَمَرْيَمَ ابْنَتَ عِمْرَانَ الَّتِي أَحْصَنَتْ فَرْجَهَا فَنَفَخْنَا فِيهِ مِن رُّوحِنَا وَصَدَّقَتْ بِكَلِمَاتِ رَبِّهَا وَكُتُبِهِ وَكَانَتْ مِنَ الْقَانِتِينَ﴾(التحريم:١٢).

ئایەتی یەکەم لەناو باسی ئەو ناز و نیعمەتانەی خوای گەورەدا هاتووە ڕەحمەت و بەزەیی یە بە پێغەمبەران (عليهم السلام) و نەوە و بنەماڵەیان، هەروەها ڕونکردنەوەی ئەوەی کە مەریەم (عليها السلام)ی لەسەربووە لە داوێنپاکی و پاکیزەیی، بێگومان خوای گەورە جوبرەئیل (عليه السلام)ی نارد بۆلای، و فویەکی پیاکرد تا سکی پڕبێت بە منداڵێك بە بێ باوك، تا خۆی وکوڕەکە ببنە نیشانەیەکی گەورەو ڕوون بۆ هەموو جیهان.

* هەروەها لە سوورەتی (التحريم)دا، کە ئەو سوورەتەیە هەندێك لەو کار و بارانە چارەسەر دەکات کە لە ماڵی پێغەمبەرایەتیدا ڕویان داوە، لە نێوان دایکانی ئیماندارانداا.

لەم سوورەتەدا خوای گەور ڕونی دەکاتەوە کە نزیکی و خزمایەتی و نەسەب سود بە نزیکایەتی دینی ناگەیەنێت، بەڵکو پەند وەرگرتن بە ئیمان و کردەوە چاکەکان دەبێت.

هەروەها لەم سوورەتەدا، نمونەی ئافرەتی خراپەکار لەگەڵ پیاوی چاکەکار هێنراوەتەوە، وەك خوای گەورە کە باسی هەڵوێستی خێزانی نوح (عليه السلام) و خێزانی لوط (عليه السلام) دەکات، کە هەردوکیان دوو هاوسەری کافر و بێ بڕوا بوون.

هەر وەك باسی نمونەی ئافرەتی چاکەکار دێت، خوای گەورە باسی خێزانی فیرعەون دەکات، پاشان باسی مەریەم ی کچی عیمران دەکات، وەك ئەوەی کە باوەڕی نوح و لوط و پلەو پایەیان لای خوا و نزیکیان لەم دوو ئافرەتە، هیچ سودێکیان پێ ناگەیەنێت و تکایان بۆ ناکات لای خوای گەورە، هەر بەو جۆرەیش، بێباوەڕی فیرعەون هیچ زیانێك بە خێزانەکەی ناگەیەنێت، چونکە خێزانێکی باوەڕدار و چاکەکار و خوا پەرستە، ڕاستگۆ و ئارامگر و خۆڕاگر بوو.

مەریەمی کچی عیمران (علیها السلام) لە ماڵی چاکەکاریدا گەورە بوو و گەشەی کرد، داوێن پاك و بەڕێز بوو خوای گەورە هەڵی بژارد، تا خۆی و کوڕەکەی ببنە نیشانەیەکی گرنگ بۆ هەموو جیهان.

## ڕونکردنەوەیەك دەربارەی هەردوو ئایەتەکە

لە سوورەتی (الأنبياء)دا فەرموی: ﴿فَنَفَخْنَا فِيهَا مِن رُّوحِنَا﴾.

لە سوورەتی (التحريم)دا فەرمووی: ﴿فَنَفَخْنَا فِيهِ مِن رُّوحِنَا﴾.

بە جۆرێك جارێك (ضمير غائب)ی نوساو بە (فِي)یەوە بە شێوەی (مؤنث) و جارێك بە شێوەی (مزکر) هات.

دەربارەی ئەمە پێشەوا (الزمخشري) دەڵێت: (مەریەم (علیها السلام) داوێنی خۆی جوان پاراست بە تەواوی لە حەلاڵ و لەحەرامیش، وەك فەرمووی: ﴿وَلَمْ يَمْسَسْنِي بَشَرٌ وَلَمْ أَكُ بَغِيًّا﴾، ئەگەر بڵێیت ڕوح کرا بەجەستەیدا، واتە: زیندوی کرد و ژیانی پێ بەخشی) خوای گەورە فەرمووی: ﴿فَإِذَا سَوَّيْتُهُ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِن رُّوحِي﴾(ص:٧٢).

واتە ك (جا کاتێك ئادەمم دروست کرد و لەو گیان و ڕۆحەی کە من خاوەنی ئەوم، فووم پێداکرد و گیان و ژیانم پێ بەخشی). ئەگەر ئەوە جێگیر بوو ئەوا ئایەتی: ﴿فَنَفَخْنَا فِيهِ مِن رُّوحِنَا﴾ بە ئاشکرا ئاڵۆزی و پەنهانییەك دەردەکەوێت، چونکە زیندو کردنی مەریەم (علیها السلام) دەگەیەنێت.

ئەگەر وتت: واتە: خوای گەورە فەرمووی: ڕۆحمان کرد بە بەری عیسادا لەناو سکی مەریەمدا واتە: ئەوا عیسامان زیندو کرد لەناو سکی مەریەمدا، هەر بەو جۆرە، کابرایەکی شمشاڵ ژەن بڵێت، من لە ماڵی فلان کەسدا فووم پیا دەکرد و لێم دەدا، واتە: فووم بە شمشاڵەکەدا کرد لەناو ماڵەکەی ئەودا.

ڕەنگە مەبەستەکە بەم جۆرەیش بێت: ئێمە لەلایەن جوبرەئیلەوە کە فریشتەی ڕاسپێردراوی خۆمانە فوومان کرد بە مەریەمدا، بێگومان ئەو فووی کرد بە یەخەکەی بەرگەکەی بەریدا، ئینجا لەوێوە فووەکە گەیشتە ناو سك و ڕەحمی. ئەگەر وتت، بۆچی خوای گەورە پێی نەفەرموون: -آيتين- وەك لەم ئایەتەدا فەرموویەتی: ﴿وَجَعَلْنَا اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ آيَتَيْنِ﴾(الاسراء:١٢). ئەوا دەڵێین: چونکە حاڵی مەریەم و عیسا هەردوکیان بە یەکەوە یەك نیشانە بوون، کە بریتی بوو لە لەدایکبوونی عیسا بەبێ باوك.[٤٣١]

پێشەوا (الكرماني) لە کتێبی (البرهان في توجيه مُتشابِهِ القرآن)دا دەربارەی ئایەتەکەی سوورەتی (الأنبياء): ﴿وَالَّتِي أَحْصَنَتْ فَرْجَهَا فَنَفَخْنَا فِيهَا﴾ و ئایەتەکەی سوورەتی (التحريم): ﴿فَنَفَخْنَا فِيهِ﴾ دەڵێت: چونکە مەبەست لە سوورەتی (الأنبياء)دا بریتی بوو لە باسی مەریەم (عليها السلام) و ئەوەی کە پەیوەندی بەوەوە هەیە، هەتا ئەو کاتەی کە کوڕەکەی دەرکەوت و هەردوکیان بە یەکەوە بوونە نیشانەیەك. ئەوەیش نابێت بەوە نەبێت کە فووی پیابکرێت، و سکی پڕببێت و خۆی ڕابگرێت، و بەردەوام بێت لەسەری تا کاتی لە دایکبوونی، لەبەرئەوە بە (مؤنث) تایبەت کرا، ئەوەی کە لە سوورەتی (التحريم)دا بوو، لەسەر ئەوە کورتکراوەتەوە کە عەورەتی خۆی پاراست، ڕاستگۆ و باوەڕدار بوو بەرامبەر ووشەکانی پەروەردگاری، وەك ئەوەی کە فووەکە بەر یەخەی کراوەی بەرگەکەی کەوتبێت کە (فرج الجيب)ی پێ دەوترێت و(مذكر)ە، یان شتێکی تر، لەبەر ئەوە بە (مذكر) تایبەتکراوە.[٤٣٢]

---

[٤٣١] – الكشاف الزمخشري ٣/١٣٣ بە دەستکاری یەوە.

[٤٣٢] – البرهان في توجيه مُتشابِهِ القرآن لما فية مِن الحجّة والبيان لتاج القراء محمود بن حمزة بن نصر الكرماني ص:١٤٣–١٤٤ بە دەستکارییەوە.

## تەمەنی مەریەم کاتێك سکی پڕبوو، ماوەی سکپڕبوونەکەی بە عیسا (علیەالسلام)، و مانای ﴿فَٱنتَبَذَتۡ بِهِۦ مَكَانٗا قَصِيّٗا﴾ و هاتنی ئازاری منداڵ بوون بۆی لای بنکی دار خورماکەدا، خۆزگە خواستنی بە مردن لەو کاتە ناڕەحەتەدا

خوای گەورە فەرمووی: ﴿فَحَمَلَتۡهُ فَٱنتَبَذَتۡ بِهِۦ مَكَانٗا قَصِيّٗا(٢٢) فَأَجَآءَهَا ٱلۡمَخَاضُ إِلَىٰ جِذۡعِ ٱلنَّخۡلَةِ قَالَتۡ يَٰلَيۡتَنِي مِتُّ قَبۡلَ هَٰذَا وَكُنتُ نَسۡيٗا مَّنسِيّٗا﴾(مريم:٢٢-٢٣).

یەکەم: تەمەنی مەریەم کاتێك سکی پڕبوو، سك پڕبوونی مەریەم بە عیسا (علیە السلام) و بەبێ باوك، کارێکی لە عادەت دەرچوو بوو، ئایا دەبێت ماوەی سك پڕبوونەکەی وەك عادەت بووبێت، یان دەبێت ئەویش کارێکی لە عادەت دەرچوو بوو بێت؟.

قورئان باسی ئەوەی نەکردووە مەریەم تەمەنی چەندێك بووە کاتێك سکی پڕبوو، هەروەها ماوەکەیشی چەندبووە. بەڵام لەگەڵ ئەمەدا زانایانی تەفسیر چەند بۆچوونێکیان هێناوە، ئەو تەمەن و ماوەی سکپڕییەیان پێ دیاری کردووە.

پێشەوا (الرازی) دەڵێت: (وتراوە: مەریەم سکی پڕبوو کاتێك تەمەنی سیانزە ساڵان بوو، وتراویشە: تەمەنی بیست ساڵان بووە، و دوو جار تووشی عادەی مانگانە هاتووە پێش ئەوەی سکی پڕببێت، بەڵام لە قورئاندا هیچ بەڵگەیەك لەسەر ئەمە نەهاتووە.).[٤٣٣]

(الشیخ المراغی) لە تەفسیرەکەیدا دەڵێت: (هەر بەو جۆرە هیچ پێویست ناکات کە تەمەنی دیاری بکرێت لەو کاتەدا، کە سود و گرنگی زۆری تیا نییە).[٤٣٤]

(شیخ عبدالوهاب النجّار) دەڵێت: (....ئەوەی من دەیڵێم: بێگومان مەریەم گەیشتە تەمەنی ئافرەت بوون، و ئەوەندە بەسە. و زانستی ئەوەی تری کە دەمێنێتەوە وازی لێدەهێنم بۆ خوای گەورە.).[٤٣٥]

بەڵام ئەوەی ئێمە لەم مەسەلەیەدا هەڵی دەبژێرین، بێگومان هیچ بەڵگەیەکی ڕاست لەسەر دیاری کردنی تەمەنی نەهاتووە، بەڵام ئەوەی کە ئاشکرایەو دەردەکەوێت،

---

[٤٣٣] -مفاتیح الغیب للإمام الرازي ٢١: ٢٠١.

[٤٣٤] -تفسیر المراغي: ١٦: ٤٤ بەدەستکاری یەوە.

[٤٣٥] -قصص الأنبیاء لعبد الوهاب النجار ص:٤٥٤.

مەریەم (علیها السلام) لە قۆناغ و تەمەنێکدا بووە کە گونجاو بووە بۆ سك پڕبوون و هۆکارەکانی بۆ سازدراوە، ئەمە لەگەڵ ئەوەی کە عەقڵ و ژیری تەواو بووە و بە جوانی هەستی کردووە و تێگەیشتنی بۆ کارەکان هەبووە دووەم: ماوەی سکپڕبوونەکەی: پێشەوا (الماوردی) لە تەفسیرەکەیدا دەڵێت: (ڕا و بۆچوونی جیاواز هەیە لەماوەی سکپڕییەکەیدا لەسەر چوار بۆچوون: یەکەم: ماوەکەی نۆ مانگ بووە، دووەم: شەش مانگ بووە، سێ یەم: تەنها یەك ڕۆژ بووە، چوارەم: هەشت مانگ بووە، ئەمە نیشانەی عیسا (علیه السلام) بوو، بێگومان لە دایك بوو لە هەشت مانگدا نەژیاوە[٤٣٦]).[٤٣٧]

ئەوەی کە قسە و بۆچوونی لەپێشتر بێت لەم مەسەلەیەدا، دەڵێین: سکپڕبوونەکەی مەریەم (علیها السلام) ئاسایی بووە وەك سەرجەمی ئافرەتانی تر، زۆرینەی سکپڕی لە مانگی نۆهەمدا لە دایك دەبێت، خۆ ئەگەر سکپڕی یەکەی ئەو پێچەوانەی عادەت بووبێت، ئەوا بێگومان کارێکی سەیر و لە عادەت دەرچوو بووە، و قورئان باسی دەکرد و دەیهێنا، هەروەك چۆن کاری تری باس کردووە و هێناوە کە لە مەریەمدا ڕوویانداوە.

سێیەم: مانای ﴿فَانتَبَذَتْ بِهِ مَكَانًا قَصِيًّا﴾. ﴿مَكَانًا قَصِيًّا﴾. واتە: شوێنێکی دوور لە قەومەکەی، تا دەستی خراپەیان پێی نەگات.

زانا (الطبرسي) دەڵێت: ﴿فَانتَبَذَتْ بِهِ مَكَانًا قَصِيًّا﴾ واتە: بە سکەکەیەوە خۆی کەنارگیر کرد بۆ شوێنێکی دوور، وتراوە: واتە، خۆی تەنها کرد بە سکەکەیەوە بۆ شوێنێکی دوور لە قەومەکەی لەبەرئەوەی شەرمی دەکرد لە کەس و کارەکەی، و دەترسا لەوەی کە بەخراپە تۆمەتباری بکەن.[٤٣٨]

بۆچوونی تەواو ئەوەیە، کە ئەو شوێنە پەناو دوورە، ڕۆژهەڵاتی (بیت لحم) بووە، کە (المسیح) (علیه السلام)ی لێ لە دایك بووە. لە فەرموودەیەکدا هاتووە، کە ئیمامی (النسائی) و (البیهقی) لە (دلائل النبوة)دا، لە (أنسی کوڕی مالك)ەوە، گێڕاویانەتەوە لە فەرموودەی (إسرا ءو معراج)دا کە پێغەمبەر تیایدا دەفەرموێت: (.....جبرئیل (علیه السلام) پێی فەرمووم: دابەزە و نوێژ بکە، ((منیش نوێژم کرد، ئینجا فەرمووی، ئایا

---

[٤٣٦] -لەلایەنی پزیشکییەوە، ئەوە ڕاست نی یە کە (الماوردی) لە تەفسیرەکەیدا باسی کردووە، کە منداڵ لە هەشت مانگیدا لە دایك ببێت ناژی، بێگومان من پرسیارم لەچەند پزیشکێکی خاوەن متمانە کردووە دەربارەی ئەمە، ئەوانیش وەڵامیان دامەوە، کە چەندین منداڵ هەن کە بە هەشت مانگی لە دایك بوون وژیاون.

[٤٣٧] -النکت والعیون الماوردي ٢: ٥٨٣ بەدەستکاری یەوە.

[٤٣٨] – مجمع البیان للطبرسی ٦: ٧٨٩.

دەزانیت لە کوێدا نوێژت کرد؟ تۆ لە (بیت لحم)دا نوێژت کرد، کە عیسا (علیه السلام) ی تیادا لە دایکبوو)[٤٣٩]. ئەوەی کە دەربارەی پەیوەندی نێوان (یوسف النجار) و مەریەم وتراوە هیچی ڕاست نییە، کە هەندێك لە کتێبەکانی تەفسیر باسیان کردووە، ئەوانە قسە و باسی (اسرائیلیات)ن و هیچ پەیوەندییەکیان بە چیرۆکی مەریەمەوە نییە، و هەرگیز مەریەم (علیها السلام) لەگەڵیدا نەماوەتەوە و گەشتی لەگەڵدا نەکردووە، و سەرپەرشتی کاروباری مەریەمی نەکردووە، و خزمەتی نەکردووە، مەریەم کەسێکی پاك و پاکداوێن و بەشەرم وشکۆ و بەڕێز بوو، هەرگیز پەیوەندی بە پیاوێکی غەریبەوە نەبووە.

چوارەم: هاتنی ئازاری منداڵ بوون بۆی لای بنکی دارخورماکەدا، و خۆزگە خواستنی بە مردن لەو نارەحەتییەی کە پیایدا تێپەڕ بوو.

خوای گەورە فەرمووی: ﴿فَأَجَاءَهَا الْمَخَاضُ إِلَى جِذْعِ النَّخْلَةِ قَالَتْ يَا لَيْتَنِي مِتُّ قَبْلَ هَذَا وَكُنتُ نَسْيًا مَّنسِيًّا﴾(مريم:٢٣). ﴿فَأَجَاءَهَا الْمَخَاضُ﴾. واتە: واتە ئازار و ژانی منداڵ بوون گرتی و ناچاری کرد و زۆری بۆ هێنا.

﴿إِلَى جِذْعِ النَّخْلَةِ﴾ بردی بۆ لای قەدی دار خورمایەك (بە ئازار و ناڵەوە) لەو شوێنەدا کە پەنای بۆ بردو، کەنارگیر بووخۆزگە بە مردن دەخوازێت لەو کاتە نارەحەتەدا. ﴿قَالَتْ يَا لَيْتَنِي مِتُّ قَبْلَ هَذَا وَكُنتُ نَسْيًا مَّنسِيًّا﴾ مەریەم (علیها السلام) ئاوات و خۆزگەی خواست کە پێش ئەم هەڵوێستە قورس ونارەحەتە بمردایە. و وەك شتێکی بێ نرخ فەرامۆش بکرایە و لە بیربچوایەتەوە. بەڵام ئایا چۆن ئەم خۆزگەیە دەخوازێت لەگەڵ ئەوەی کە ئەم مژدە ڕێزدارەی زانیووە؟

بۆ ئەم پرسیارە زانایانی تەفسیر چەند وەڵامێکیان هێناوە:

زانا (إبن کثیر) لە تەفسیرەکەیدا دەڵێت: (.......ئەم ئایەتە: ﴿ قَالَتْ يَا لَيْتَنِي مِتُّ قَبْلَ هَذَا وَكُنتُ نَسْيًا مَّنسِيًّا﴾ هەواڵێك بوو لە مەریەمەوە، بەڵگەی ئەوەی تیایە کە ڕێگە پێدراوە لە کاتی فتنەدا ئاوات بە مردن بخوازرێت، بێگومان مەریەم (علیها السلام) زانیبووی تووشی تاقیکردنەوەی قورس و نارەحەت دەبێت، بەهۆی ئەو لە دایك بوەوە، کە خەڵکی بەرگەی ئەوە ناگرن کارەکەی بە دروست و گونجاو بزانن و باوەڕیشی پێ ناکەن، کاتێك

---

[٤٣٩] –رواه النسائي في السنن كتاب الصلاة، و راوه البيهقي في دلائل النبوة ٢/٣٥٦.

لای ئەوان کەسێکی خوا پەرست بوو، دواتر گومانی خراپی پێ بەرن و شێوەیەکی خراپ نیشان بدات، وتی: ﴿يَا لَيْتَنِي مِتُّ قَبْلَ هَذَا﴾ واتە: پێش ئەم حاڵە ﴿وَكُنتُ نَسْيًا مَّنسِيًّا﴾ واتە: خۆزگە هەر دروست نەبومایە و نەبوومایە (إبن عباس) دەڵێت ئەوەی وت: لەبەرئەوەی شەرمی دەکرد لە خەڵکی).[٤٤٠]

پێشەوا (الزمخشري) دەڵێت: (مەریەم (عليها السلام) خۆزگەی خواست کە شتێکی کەم نرخ بوایە و کەس گوێی پێنەدایە، و لە بیرچوو بوایە، ئەوەیش لەبەر ئەو حاڵەتە کە تووشی هات لە شەرم کردنی خەڵکی لەسەر بڕیاری عادەتی بەشەری، نەك لەبەر ڕق بوون لە حوکمی خوا و قورسی تەکلیفەکە کاتێك بوهتانی بۆ ڕێك دەخەن، و لە کاتێکدا کە ئەو بە کەسێکی ڕابردو پاك و بێ گوناه ناسراوە، و بەوەی کە خوای گەورە تایبەتمەندی کردوە و ڕێزی لێ گرتووە. بەڕاستی ئەو هەڵوێست و حاڵەتەی ئەو مەترسیدار بوو، کەم کات خەڵکی لەسەر دامەزراو و جێگیر دەبێت، کە مەریەم وا ناسرابوو کار و بارەکەی گەورەیە و ناوبانگی فراوانە و خاوەن ڕێزە، کە حەقی خۆیەتی مەدحی بکرێت، و پێویستە بە گەورە تەماشا بکرێت، پاشان لای خەڵکی وا دەبینرێت کە تووشی عەیبە و خراپە هاتووە، ئەمەش لە نەزانی خەڵکەوە، یان ئەو خۆزگەی بە مردن خواست لە ترسی خەڵکی، نەبا بەهۆی ئەوەوە سەرپێچی فەرمانی خوا بکەن.).[٤٤١]

لە (حاشيه الجمل على الجلالين)دا هاتووە: (لە لایەنی دینەوە ئاوات و خۆزگەی بە مردن خواست، کاتێك ترسا لە خەڵکی گومانی خراپەی پێ بەرن لە دینەکەیدا، یان شەرمی لە خەڵکی کرد، شەرم کردنەکە مژدەی فریشتەکانی لە بیر بردەوە، کە مژدەی لە دایکبوونی عیسا (عليه السلام)یان پێدابوو، یان ئەوەتا ئەوەی ووت، بۆ ئەوەی تووشی ناڕەحەتی نەیەت لەسەر قسەی ئەو کەسانەی کە باسی ئەو دەکەن، خۆ ئەگەر نا ئەوا ئەو ڕازی بووە بە مژدەی فریشتەکان، ئەمەیش ئەو پرسیارە ڕەت ناکاتەوە: کە چۆن ئاواتی بە مردن خواست ئەوەی کە ئەیزانی کە بە ڕاستی خوای گەورە جوبرەئیلی نارد بۆ لای و بەڵێنی پێدا، بەوەی کە خۆی و کوڕەکەی بکاتە نیشانەیەك بۆ هەموو جیهان....).[٤٤٢]

---

٤٤٠ – تفسير القرآن العظيم لأبن كثير ٣: ١١٦–١١٧ بەدەستکاری یەوە.

٤٤١ –الكشاف للزمخشري ٣: ١١–١٢ بەدەستکاری یەوە.

٤٤٢ – حاشية الجمل على الجلالين٣: ٥٧–٥٨ بەدەستکاری یەوە.

**باسی نۆیەم:**

**لەدایك بوونی عیسا (علیه السلام) هاوەڵ لەگەڵ بەزەیی و دەروی خوایی:**

**خوای گەورە فەرمووی:** ﴿فَنَادَاهَا مِن تَحْتِهَا أَلَّا تَحْزَنِي قَدْ جَعَلَ رَبُّكِ تَحْتَكِ سَرِيًّا(٢٤) وَهُزِّي إِلَيْكِ بِجِذْعِ النَّخْلَةِ تُسَاقِطْ عَلَيْكِ رُطَبًا جَنِيًّا(٢٥)فَكُلِي وَاشْرَبِي وَقَرِّي عَيْنًا فَإِمَّا تَرَيِنَّ مِنَ الْبَشَرِ أَحَدًا فَقُولِي إِنِّي نَذَرْتُ لِلرَّحْمَٰنِ صَوْمًا فَلَنْ أُكَلِّمَ الْيَوْمَ إِنسِيًّا﴾(مريم:٢٤-٢٦).

**لەم حاڵەتە ئازاراوی یەی کە تووشی مەریەم (علیها السلام) هات لەم کاتە نارەحەتەدا، کە ئەویپیا تێپەڕ بوو، کە بە دەست ژانی منداڵ بوونەوە دەناڵێنێت و تەنهایە و دەترسێت لەوەی کە دەبێت دواتر قەومەکەی چۆن تێی بروانن و چی پیێ بڵێن، کاتێك ئەم منداڵەی پیێ دەبینن، ئەو لە ناو ئەو هەموو ئازارەدا نوقم بوە، کە ئازاری جەستەیی و نەفسین، لەم کاتەدا هەست بە ڕەحمەت و بەزەیی خوایی دەکات، خوای گەورەیش بە ڕەحمی خۆی ئەو نارەحەتی یەی بۆ دەگۆڕێت بۆ ڕەحەت و خۆشی، و تەنگی حاڵەتەکەی بۆ دەگۆڕێت بە فراوانی، و عیسا (علیه السلام) لە دایك دەبێت و دەست دەکات بە قسەکردن.** [٤٤٣] **و بە دایکی دەفەرمووێت:** ﴿فَنَادَاهَا مِن تَحْتِهَا أَلَّا تَحْزَنِي قَدْ جَعَلَ رَبُّكِ تَحْتَكِ سَرِيًّا﴾(مريم،٢٤). **هەندێك لە زانایانی تەفسیر وتویانە: ئەوەی کە بانگی لە مەریەم کرد جوبرەئیل بوون بەوەیش بەڵگەیان هێناوەتەوە کە عیسا (علیه السلام) قسەی نەکردووە تا ئەو کاتەی کە دایکی هێنایەوە بۆ ناو قەومەکەی، و جوبرەئیل لەو کاتەدا لەسەر بەشێکی زەوی بوو، کە شوێنەکەی نزم بوو، و مەریەم لەسەر شوێنێکی بەرز بوو، جوبرەئیل لە شوێنی خۆیەوە بانگی لێکرد وتی(جوبرەئیل لە شوێنە نزمەکەوە بانگی لە مەریەم کرد، خەفەت مەخۆ ئەوەتا پەروەردگارت بە بەردەمتا جۆگەلەیەکی جاری کردووە.).**

---

[٤٤٣] – مفاتيح الغيب للرازي ٢١: ٢٠٤.

(القاسمی) دەڵێت: ﴿فَنَادَاهَا مِن تَحْتِهَا﴾ واتە: لە شوێنە نزمەکەوە بانگی لێکرد کە لە خوار بەرزاییەکەوە بوو، کە ئەویش جوبرەئیل بوو).[444]

بەڵام ئەوەی ئێمە دەیبینین لەم مەسئەلەیەدا، ئەوەی کە بانگی لە مەریەم (علیها السلام) کرد، عیسا بوو، ئەویش لەبەر ئەم هۆکارانە: بێگومان کۆتا باسکراوە، و (ضمیر) راناوەکە دەگەڕێتەوە بۆ نزیکترین باسکراو لە دەربڕین و لە پلەیشدا، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَحَمَلَتْهُ فَانتَبَذَتْ بِهِ مَكَانًا قَصِيًّا (٢٢) فَأَجَاءَهَا الْمَخَاضُ إِلَىٰ جِذْعِ النَّخْلَةِ قَالَتْ يَا لَيْتَنِي مِتُّ قَبْلَ هَٰذَا وَكُنتُ نَسْيًا مَّنسِيًّا (٢٣) فَنَادَاهَا مِن تَحْتِهَا أَلَّا تَحْزَنِي قَدْ جَعَلَ رَبُّكِ تَحْتَكِ سَرِيًّا (٢٤) وَهُزِّي إِلَيْكِ بِجِذْعِ النَّخْلَةِ تُسَاقِطْ عَلَيْكِ رُطَبًا جَنِيًّا (٢٥) فَكُلِي وَاشْرَبِي وَقَرِّي عَيْنًا فَإِمَّا تَرَيِنَّ مِنَ الْبَشَرِ أَحَدًا فَقُولِي إِنِّي نَذَرْتُ لِلرَّحْمَٰنِ صَوْمًا فَلَنْ أُكَلِّمَ الْيَوْمَ إِنسِيًّا (٢٦) فَأَتَتْ بِهِ قَوْمَهَا تَحْمِلُهُ قَالُوا يَا مَرْيَمُ لَقَدْ جِئْتِ شَيْئًا فَرِيًّا (٢٧) يَا أُخْتَ هَارُونَ مَا كَانَ أَبُوكِ امْرَأَ سَوْءٍ وَمَا كَانَتْ أُمُّكِ بَغِيًّا (٢٨) فَأَشَارَتْ إِلَيْهِ﴾(مريم:٢٢-٢٩).

تێبینی ئەوە بکە کە (ضمیر) راناوەکان لە گشت ئایەتەکاندا دەگەڕێتەوە بۆ عیسا (علیەالسلام) کە بریتین لە: ﴿هُوَ عَلَيَّ هَيِّنٌ- وَلِنَجْعَلَهُ- فَحَمَلَتْهُ- فَانتَبَذَتْ- فناداها مِن تحتها- فأتت بهٖ قومها تَحمِلَهُ- فأشارت إليهِ- قالَ إني عبدُ اللهِ﴾.

خوای گەورە عیسا (علیە السلام)ی هێنایە قسەکردن بۆ ئەوەی دڵی دایکی پێ خۆش بکات و دڵی دامەزراو بێت، و ئاماژەیش بوو بۆ مەریەم کە چۆن لە بەردەم ئەودا بە تەنها هێناویەتیە قسەکردن پاشان لای قەومەکەیشدا دەیهێنێتە قسەکردن و دان دەنێت بە پاکی و بێ تاوانی مەریەمدا: ﴿فَأَشَارَتْ إِلَيْهِ قَالُوا كَيْفَ نُكَلِّمُ مَن كَانَ فِي الْمَهْدِ صَبِيًّا (٢٩) قَالَ إِنِّي عَبْدُ اللَّهِ آتَانِيَ الْكِتَابَ وَجَعَلَنِي نَبِيًّا﴾. بێگومان خوای گەورە ئەم نیشانە گەورەیەی هێنایە بوون لە بەردەمی مەریەمدا بە تەنها، دواتریش لەبەردەمی قەومەکەیدا هێنایە بوون و رروویدا، هەروەک چۆن خوای گەورە بە موعجیزە داردەستەکەی مووسای گۆڕی بۆ مارێکی زیندوو جوڵا و بە تەنها لەبەردەمی موسادا، پێش ئەوەی کە لە بەردەمی فیرعەون و دەسەڵاتەکەیدا بیهێنێتە روودان، بۆ ئەوەی موسای پێ دامەزراو بکات، ئەمە

[444] -محاسن التأويل للقاسمي ١١: ١١٨.

ئامادەکردنێك بوو بۆ ڕوو بەڕوو بوونەوە لەگەڵ ئەو هەڵوێستەدا – ئەوە دڵنیا کراوەتەوە کە ئەو کەسەی بانگی کرد عیسا (علیه السلام) بوو، بە پێی خوێندنەوەی (إبن کثیر و إبو عمر و إبن عامرو عاصم) لە گێڕانەوەی (شعبة) دا کە بە (فتحة) لەسەر (جیم) (إسم موصول)ە، و بە (فتحة) لەسەر (تا ﴾ لە (تحتها) دا.[٤٤٥]

لەم خوێندنەوەیەدا ئاماژە بۆ ئەوە کراوە کە ئەوەی لە خوار مەریەمەوە بووە یەك کەس بووە کە عیسا (علیه السلام) بووە.

پێشەوا (الرازی) دەڵێت: (ناگونجێت بۆ فریشتەیەك کە لە شوێنێکی نزمدا بێت و بانگ لە مەریەم بکات، کە ئەو لە حاڵەتی منداڵ بوون و دەرکەوتنی جەستەیدا بووە).[٤٤٦]

مامۆستا (عبدالکریم الخطیب) دەڵێت: (ئەوەی ئێمە وەریدەگرین: ئەو کەسەی کە بانگی لە مەریەم کرد نابێت فریشتە بێت، خۆ ئەگەر فریشتە بوایە ئەوا بێگومان لە شوێنێکی بەرزەوە بانگی لیٚ دەکرد، بەڵام ئەوەی بانگی کردووە لە شوێنێکی نزم ترەوە بووە. . خۆ ئەگەر ئەوە فریشتە بێت چۆن لای خوارەوە دێت و لای سەرەوە نایەت؟ کەواتە ئەوەی بانگی لیٚ کردووە لە خواریەوە بووە کە کۆرپەکەی خۆی بووە.!

لە قسەکردنی منداڵەکەی لەگەڵیدا لەم کاتەدا، ئەو ئەزموونەی بۆ دەردەخات و ڕوونی دەکاتەوە کە دێتەوە بۆ لای قەومەکەی. کاتێك قەومەکەی داوای لیٚ دەکەن قسە بکات، ئەویش قسە دەکات... خۆ ئەگەر عیسا (علیه السلام) پێشتر قسەی لەگەڵ دایکی نەکردایە و گوێی لێی نەبوایە، ئەوا بێگومان مەریەم جورئەتی ئەوەی نەدەکرد کە بێتەوە بۆ لای قەومەکەی بە منداڵێکی بچوکی شیرە خۆرەوە، پاشان بیکاتە تەحەدی و بانگی بکات گویٚ لە قسەکانی بگرن).[٤٤٧]

﴿قَدْ جَعَلَ رَبُّكِ تَحْتَكِ سَرِيًّا﴾. وتراوە: (السری): جۆگەیە، بەو ناوە ناونراوە چونکە ئاوەکەی بەبیٚ ڕاوەستان پیا دەڕوات. زانایانی تەفسیر هەموو لەسەر ئەم بۆچوونەن.[٤٤٨]

وتراوە: (السری) واتە: عیسا (علیه السلام) بووە، کە ئەو پیاوە دەگەیەنێت ڕێزدار و بە شکۆ و خاوەن پیاوەتی بێت کە لە (السرو) هاتووە واتە: ڕێزداری و پلە بەرزی.[٤٤٩]

---

[٤٤٥] –حجة القراءات لأبن زنجلة ص٤٤١.

[٤٤٦] مفاتیح الغیب للإمام الرازی ٢١: ٢٠٥.

[٤٤٧] – التفسیر القرآني للقرآن للأستاذ عبدالکریم الخطیب ٧٣١:١٦.

[٤٤٨]- جامع البیان للطبری ١٦–٥٤ و تفسیر القرآن العظیم لأبن کثیر ٣–١١٧.

[٤٤٩] – المفردات للراغب مادة س ر ي ص:٢٣١ والکشاف للزمخشري ٣: ١٢–١٣.

بەڵام قسەو بۆچوونی لە پێشتر لەم مەسەلەیەدا ئەوەیە کە (جدول) جۆگەی ئاو بوو، چونکە ئاوی پیا دەڕوات، ئایەتەکەیش بەڵگەی لەسەر دەدات: ﴿فَكُلِي وَاشْرَبِي وَقَرِّي عَيْنًا﴾ (اكل) بەڵگەیە لەسەر خواردن و (شرب) بەڵگەیە لەسەر خواردنەوە.

بێگومان خوای گەورە ئەم جۆگەو ڕووبارە بچوکەی لە ئاو بۆ ئەو بەدیهێنا و جاری کرد کە ڕێزێك بوو بۆی، و پشتیوانییەك بوو بۆ عیسا (علیه السلام) دڵخۆشکردنی دایکی بوو.

دەربارەی حیکمەتی پەیدابوون و ڕۆیشتنی ئەو ئاوە و کەوتنە خوارەوەی خورمای تەر و تازە، پێشەوا (الزمخشری) دەڵێت: ئەگەر وتت: خەفەت و بێتاقەتییەکەی مەریەم (علیها السلام) لەبەر نەبوونی خواردن و خواردنەوە نەبووە تا دڵی بەو سەرچاوەی ئاو و خورما تەڕو تازەیە خۆش ببێت؟ ئەوا دەڵێین: دڵی بەوە خۆش نەبوو کە ئەوانە خواردن و خواردنەوەن، بەڵکو دڵی بەوە خۆش بوو کە ئەوانە بۆ خۆیان موعجیزە بوون، کە خەڵکی وا مەریەم ببینن کەلە کەسانی پارێزراو و بێ گوناه و بێ تاوانە، دوورە لە گومانەوە، بێگومان نموونەی وەك مەریەم تۆمەتبار کراوە، کە خۆی گۆشەگیر و کەنارگیر کردووە، و کۆمەڵێك کاری لە دەرەوەی عادەت و باوەکان هەبووە کە خەڵکی لەگەڵ ڕانەهاتبوون و لەو خوەیان نەبووە. تا بۆ خەڵکەکە دەربکەوێت کە لە دایك بوونەکەی بەبێ بوونی مێرد بووە، ئەمە شتێکی داهێنراو نەبوو لە حاڵی ئەودا.)[٤٥٠]

﴿وَهُزِّي إِلَيْكِ بِجِذْعِ النَّخْلَةِ تُسَاقِطْ عَلَيْكِ رُطَبًا جَنِيًّا﴾(مریم:٢٥) نیعمەتێکی تر و دەروکردنەوەیەکی تری گەورە بۆ مەریەم (علیها السلام) ئەوە بوو کە ڕزق و ڕۆزی بۆ دەهات لە خورمای تەڕ و تازە، کە ئەو هەر لە شوێنی خۆیدا بوو، ئەوەیش بە قودرەت و ویست و لوتف و بەزەیی خوا.

ئایا ئەو دارخورمایە ووشك بووە پاشان سەوز بوەوە و دواتر بەری گرتووە، یان سەوز بوە و بێ بەر بووە و بەری گرتووە، یان بەردار بووە؟ بێگومان زانایان ڕا و بۆچوونی جیاوازیان لەسەری هەیە.

ئەوەی کە ئێمە بە بۆچوونی لەپێش و دروستی دەزانین لەم مەسەلەیەدا بریتییە لە: بێگومان ووشك بووە و پاشان سەوز بووەو ئینجا بەری گرتووە، لەمانەیشدا ڕێزگرتن

---

[٤٥٠] –الكشاف الزمخشري٣– ١٣.

بووە بۆ مەریەم (علیها السلام) و دڵی ئەوی خۆشکردووە و دەرخستنی قودرەت و دەستەلاتی خوای گەورە و ناوازەیی کارەکانی بووە.

زانا (إبن کثیر) لە (قصص الأنبیاء) دا دەڵێت: (وتراوە: قەدی دار خورماکە ووشك بووە، وتراوە: کە دار خورماکە بەردار بووە – خوا زاناترە–. دەگونجێت کە دار خورما بوو بێت بەڵام بەردار نەبوو بێت لەو کاتەدا، چونکە لە دایك بوونی عیسا (علیه السلام) لە وەرزی زستاندا بوو، ئەو کاتەیش کاتی بەرگرتنی خورما نییە، ئەوەیش لە ئایەتەکەوە وەردەگیرێت کە بە شێوازی نازو نیعمەت ڕشتی یە خوارەوە بەسەریدا، وەك فەرموویەتی: ﴿تُسَاقِطْ عَلَيْكِ رُطَبًا جَنِيًّا﴾ (مریم:٢٥).[451]

پێشەوا (بدرالدین بن جماعة) دەڵێت: ﴿وَهُزِّي إِلَيْكِ بِجِذْعِ النَّخْلَةِ تُسَاقِطْ عَلَيْكِ رُطَبًا جَنِيًّا﴾(مریم:٢٥). دارخورماکە ووشك بووە و...کاتی بەسەر چووە بۆ ئەوەی مەریەم (علیهاالسلام) پشتی پێوە بدات لە ناو ئازار و ژانی منداڵ بوونەکەی، ئینجا گەڵای دەرکردەوە و بەری گرتووە کە کاتی خۆی نەبووە.[452]

خوای گەورە فەرمووی: ﴿فَكُلِي وَاشْرَبِي وَقَرِّي عَيْنًا فَإِمَّا تَرَيِنَّ مِنَ الْبَشَرِ أَحَدًا فَقُولِي إِنِّي نَذَرْتُ لِلرَّحْمَنِ صَوْمًا فَلَنْ أُكَلِّمَ الْيَوْمَ إِنسِيًّا﴾(مریم:٢٦).

لە پێشدا باسی ئاوی کرد، پاشان خواردن: ﴿فَنَادَاهَا مِن تَحْتِهَا أَلَّا تَحْزَنِي قَدْ جَعَلَ رَبُّكِ تَحْتَكِ سَرِيًّا(٢٤) وَهُزِّي إِلَيْكِ بِجِذْعِ النَّخْلَةِ تُسَاقِطْ عَلَيْكِ رُطَبًا جَنِيًّا﴾(مریم:٢٤-٢٥). چونکە پێویستی بە ئاو زیاتر گرنگترە و گەورەترە تا پێویستی بە خواردن، چونکە ئینسان هەندێك کات دەتوانێت ئارامگربێت لەسەر برسێتی بەڵام لەسەر تونێتی ناتوانێت ئارامگربێت.

بەڵام باسی خواردنەکەی پێش خواردنەوەکە خست ﴿فَكُلِي وَاشْرَبِي﴾ چونکە خواردن هەمیشە دەبێت لە پێشدا بێت پاشان ئاو خواردنەوەی بە دوادا دێت.

پێشەوا (الرازی) دەڵێت (ئایەتەکە خواردنی پێش خواردنەوە خست، چونکە ئافرەتی تازە منداڵبوو زیاتر پێویستی بە خورمای تەڕ و تازەیە تا پێویستی بە ئاو، چونکە

---

[451]– قصص الأنبیاء لإبن کثیر ص:٥٦٥– ٥٦٦.

[452] –غرر التبیان في من لم یسم في القرآن لأبن جماعة ص:٣٢٩. بە دەستکارییەوە.

خوێنی زۆری لەبەر دەڕوات، پاشان فەرمووی ﴿وقري عينا﴾. لێرەدا پرسیارێك دروست دەبێت کە بریتییە لە: بێگومان زیانی ترس قورس و ناڕەحەتترە لە زیانی برسێتی و تینوێتی، بە دوو بەڵگە:

یەکەم: بێگومان ترس ئازاری ڕۆحە، بەڵام برسێتی ئازاری جەستەیە، و ئازاری ڕۆح بەهێزترە لە ئازاری جەستە.

دووەم: ئەگەر بەرخێك بهێنێت برسی بکەیت و خواردنێکی باشی بۆ دابنێیت و گورگێکی لە لادا ببەستیتەوە، بێگومان لە ترسدا دەم بۆ خواردنەکە نابات ئەگەر قاچیشی بشکێنیت، بەڵام کە برسی بوو خواردنەکە دەخوات، چونکە ئازاری ترسان قورس و ناڕەحەتترە لە ئازاری جەستە. ئەگەر ئەمە جێگیر بوو ئەوا دەڵێین: بۆچی خوای گەورە لە گێڕانەوەکەدا لابردنی ناڕەحەتی و ئازاری برسێتی و تینوێتی پێش خست بەسەر لابردنی ئازار و ناڕەحەتی و ترسدا؟ وەڵام: بێگومان ئەم ترسە کەم بوو، چونکە مژدەدانی جوبرەئیل (علیه السلام) پێش کەوت، ئیتر پێویستی بە یاد خستنەوە نەبوو بۆ جارێکی تر).[٤٥٣]

﴿وقري عينا﴾. واتە: خەمت نەبێت و دەروونی خۆمت ئاسودە بکە، هەموو ئەو شتانەی کە تۆ خەفەتبار و دڵگران دەکەن وەلایان بنێ ﴿فَإِمَّا تَرَيِنَّ مِنَ الْبَشَرِ أَحَدًا فَقُولِي إِنِّي نَذَرْتُ لِلرَّحْمَٰنِ صَوْمًا فَلَنْ أُكَلِّمَ الْيَوْمَ إِنسِيًّا﴾(مريم:٢٦).

واتە: (ئەگەر کەسێکت لە خەڵکی بینی و (پرسیاری لێ کردیت)ئەوە بە ئیشارەت تێی بگەیەنە، پێی بڵێ: بەڕاستی من بڕیارم داوە و نەزرم کردووە بەڕۆژوو بم بۆ خوای میهرەبانم، لەبەر ئەوە ئەمڕۆ من هەرگیز قسە لەگەڵ کەسدا ناکەم.) مەریەم (علیها السلام) فەرمانی دا بە ڕۆژوو بێت لەبەر دوو هۆکار: یەکەم: بێگومان قسەکردنی عیسا (علیه السلام) لە ناو بێشکەدا بەهێزتر و کاریگەرتر بوو لە لابردنی تۆمەتەکەدا لەسەری هەروەها ئەوەشی تێدایە کە کاردانە دەست کەسێکی بەرز و بەرێزتر لە پێشترە.

دووەم: بێدەنگ بوون لە قسەو مناقەشەی ئەو کەسانەی خراپەکارن پارێزراوترە بۆ شەرەف و نامووس.

---

[٤٥٣] – مفاتيح الغيب للرازي ٢١: ٢٠٦.

**باسی دەیەم:**

**هاتنەوەی مەریەم (علیها السلام) بە عیساوە بۆ ناو قەومەکەی و تۆمەتبارکردنی:**

خوای گەورە فەرموویی: ﴿فَأَتَتْ بِهِ قَوْمَهَا تَحْمِلُهُ قَالُوا يَا مَرْيَمُ لَقَدْ جِئْتِ شَيْئًا فَرِيًّا(٢٧) يَا أُخْتَ هَارُونَ مَا كَانَ أَبُوكِ امْرَأَ سَوْءٍ وَمَا كَانَتْ أُمُّكِ بَغِيًّا﴾ (مریم:٢٧-٢٨).

پێشەوا (القرطبی) دەڵێت: (کاتێك مەریەم (علیها السلام) بەڵگە و نیشانەکانی بینی دڵنیاو دڵئارام بوو، و زانی کە بێگومان خوای گەورە عوزرەکەی ئەو ڕوون دەکاتەوە، ئینجا منداڵەکەی هەڵگرت و لە شوێنە دوورەکەوە کە چوو بوو بۆی و کەنارگیر بوو، هێنایەوەو هاتەوە.[٤٥٤]

لە شوێنی یەکەمدا مەریەمی کچ دەبینین بە سکەکەیەوە خێرا هەنگاو دەنێت و لە قەومەکەی دوور دەکەوێتەوە لە ترسی دڵ و دەرون و عەقڵە نەخۆش و خراپەکانیان و لە شوێنی دووەمدا: پاش ئەوەی کە (المسیح) ی بوو، و چاوەکانی گەشایەوە و خەمی نەما ودڵنیا و دڵ ئارام بوو لێی و دڵ و دەرونی کرایەوە بەڕێزگرتنی خوایی کە ڕوویدا بۆ ئەو، و دڵی پڕ بوو لە دڵنیایی، و ترسەکەی بۆ گۆڕا بە ئارامی و ئاسایش، و خەفەتەکەی بۆ دڵخۆشی و، لاوازی یەکەی بۆ بەهێزی وسەربەرزی و بەرزبوونەوەو تەحەدی کردن و زاڵ بوون بەسەر ناحەقی و بە تاڵ و شوێنکەوتوانیدا، ئینجا هاتەوە بۆ لای قەومەکەی، دڵنیایی و ئومێد و هیوا و ئیمان پاڵی پێوە نابوو، و کۆرپە خۆشەویستەکەی هەڵگرتبوو، کە عیسا پێغەمبەری خوا (علیه السلام) بوو، هاتەوەو زمانحاڵی کەوتە دەربڕین دەربارەی نەفسی پاکی ڕێزداری، کە نەفسێکی ئارام و دڵ پڕ لە ئیمان بوو، و ڕازی بوو بە فەرمانی خوا و، خوایش لێی ڕازی بوو، و ئارام و لەسەر خۆ بوو بەو دیاریەی کە خوای گەورە پێی بەخشیبوو، هاتەوە و زمانحاڵی ئەو دەیوت:

فليتك تحلو والحياة مريرة ... وليتك ترضى والأنام غضابٌ

وليتَ الذي بيني وبينَكَ عامرٌ ... وبيني وبينَ العالمينَ خراب

إذا صَحَ مِنكَ الودُ فالكُلُّ هيّن ... وكُلُّ مافوقَ التراب تراب.

---

[٤٥٤] - الجامع لأحكام القرآن للقرطبي ١١: ٩٩.

بێگومان مەریەم (علیها السلام) بوو بە دایکی پێغەمبەرێك، لەگەڵ ئەوەیشدا بێگومان ئەو پێشینەی قەومەکەی خۆی دەزانی، کە بە ئینکاری و کەللە ڕەقی ڕووبەڕووی ئایەت و نیشانەکانی دەبوونەوە و حەسود بوون بەرامبەر نیعمەتەکان و ڕقیان لە دڵدا بوو، لەبەرئەوە کاتێك بینیان وەك قورئان دەیگێڕێتەوە: ﴿فَأَتَتْ بِهِ قَوْمَهَا تَحْمِلُهُ قَالُوا يَا مَرْيَمُ لَقَدْ جِئْتِ شَيْئًا فَرِيًّا﴾(مریم:٢٧).

واتە: (وتیان: ئەی مریم بەڕاستی کارێکی ناڵەبار و ئابڕو بەرت ئەنجامداوە).

﴿يَا أُخْتَ هَارُونَ مَا كَانَ أَبُوكِ امْرَأَ سَوْءٍ وَمَا كَانَتْ أُمُّكِ بَغِيًّا﴾(مریم:٢٨).

پاش ئەوەی کە قەومەکەی مەریەمیان تۆمەتبار کرد، درۆو بوهتانیان بەدەمەوە هەڵبەست، بەگەڵتە پێکردنەوە پێیان وت: (ئەی خوشکی هاروون (لەبەر تەقوا و خواناسی ئەو نازناوەیان پێدابوو) تۆ نە باوکت کەسێکی خراپ و (شەرواڵ پیس بووە) نە دایکیشت ئافرەتێکی داوێن پیس !!.) ئیتر چۆن ئەو کارە دەکەیت کە لە نەوە و نەسەبێکی پاك هاتوویت و پەروەردەکراوی تەقوا و چاکەکاریت.

زاناکان چەند بۆچوونێکیان دەربارەی ئایەتی: ﴿يَا أُخْتَ هَارُونَ﴾ هێناوە:

وتراوە: برایەکی باوکی هەبووە ناوی هاروون بووە، چاکەکار و لە خوا ترس بووە، ئەمیش خوشکی باوکی ئەو بووە.[٤٥٥]

وتراوە: نیسبەت دراوەتە پاڵ پیاو چاکێك لە زەمانی خۆیدا پێی وتراوە هاروون کە مەریەم لەو چووە، بەڵام خوشکی نەبووە، دەگێڕنەوە کاتێك مردووە، چل هەزار پیاو چاك شوێن تەرمەکەی کەوتون هەموویان ناویان هاروون بووە، لەبەر پیرۆزی ناوەکەی ئەو.[٤٥٦]

وتراوە: مەبەستیان هاروونی برای مووسا (علیه السلام) بووە، و مەریەم (علیها السلام) لە پشت و ڕەچەڵەکی ئەو هاتووە، (السدی) دەڵێت: مەریەم لە نەوەی هاروون بووە واتە: یەکێك بووە لەوان وەك دەوترێت (یا أخا العرب) ئەی برای عەرەب.[٤٥٧]

---

[٤٥٥] – غرائب القرآن ورغائب الفرقان للنسابوری ١٦: ٥١ والسراج المنیر للخطیب الشربینی ٢: ٤٢٣.

[٤٥٦] غرائب القرآن للنسابوری ١٦: ٥٢ ولباب التأویل للخازن ٤: ٢٤٤.

٤٥٧ –هەمان سەرچاوەو هەمان لاپەڕە.

(إبن كثير) دەڵێت: بە هاوشێوەی هاروونیان داناوە لە پەرستشەکاندا، وتیان: تۆ لە ماڵێکی پاك وخاوێن و ناسراو بە چاکەکار و پەرستش هاتوویت، و خواناس و دنیا نەویست بوویت، ئیتر چۆن ئەمە لە تۆ دەوەشێتەوە و دەردەچێت. [٤٥٨]

ئەوەی کە ڕاست و قسەی لەپێش بێت لەم مەسەلەیەدا: بێگومان ئەوان وتیان: ئەی خوشکی هاروون، شوبهاندیان بەو، بە هاروونی برای مووسا پێغەمبەر (علیهماالسلام)، ئەوان بە ناوی پێغەمبەران و پیاو چاکانەوە ناویان دەهێنا لەسەر شێوەی هاوشێوە کردن.

لە زمانەوانیشدا ڕێگە دەدرێت کە ناوی (الأخ) برا بنرێت لە هاوشێوە و لێکچو و یارمەتیدەر. خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَمَا نُرِيهِم مِّنْ آيَةٍ إِلَّا هِيَ أَكْبَرُ مِنْ أُخْتِهَا وَأَخَذْنَاهُم بِالْعَذَابِ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ﴾(الزخرف:٤٨).

واتە: (هیچ موعجیزەیەکمان نیشان نەداون کەلەویتر گەورەتر نەبوبێت).

هەروەها خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ الْمُبَذِّرِينَ كَانُوا إِخْوَانَ الشَّيَاطِينِ وَكَانَ الشَّيْطَانُ لِرَبِّهِ كَفُورًا﴾(الأسراء:٢٧).

واتە: (بەڕاستی ئەوانەی ماڵو سامانیان بەفیڕۆ دەدەن، لەڕێگەی خراپدا سەرفی دەکەن، ئەوانە هەمیشە وەك برای شەیتانەکان وان).

فەرموودەیەك لە (صحیح) ی (مسلم) دا هاتووە کە پشتیوانی ئەم بۆچوونە دەکات: (مغیرة) ی کوڕی (شعبة) (خوا لێی ڕازی بێت) دەڵێت: کاتێك هاتم بۆ (نجران) پرسیاریان لێ کردم و وتیان: (ئێوە دەخوێننەوە: ﴿يَا أُخْتَ هَارُونَ﴾(مريم:٢٨). مووسایش لە پێش عیسا (علیهما السلام)ەوەیە، بە ئەوەندە و ئەوەندە ساڵ، ئیتر چۆن دەبێت مەریەم خوشکی هاروون بێت کە ماوەیەکی زۆریان لە نێواندایە؟) کاتێك هاتمەوە خزمەتی پێغەمبەر،پرسیاری ئەوەم لێکرد، فەرمووی: (ئەوانبە ناوی پێغەمبەران و پیاوچاکانی پێش خۆیانەوە ناویان دەنا). [٤٥٩]

(المسیح) کاتێك لەناو بێشکەدا بوو قسە دەکات و دان دەنێت بە پاکی دایکیدا).

---

[٤٥٨] -تفسير القرآن العظيم الأبن كثير ٣: ١١٨-١١٩ بە دەستکاری یەوە.

[٤٥٩] -رواه مسلم في صحيحه، كتاب الآداب.

خوای گەورە فەرمووی: ﴿فَأَشَارَتْ إِلَيْهِ قَالُوا كَيْفَ نُكَلِّمُ مَن كَانَ فِي الْمَهْدِ صَبِيًّا(٢٩) قَالَ إِنِّي عَبْدُ اللَّهِ آتَانِيَ الْكِتَابَ وَجَعَلَنِي نَبِيًّا(٣٠) وَجَعَلَنِي مُبَارَكًا أَيْنَ مَا كُنتُ وَأَوْصَانِي بِالصَّلَاةِ وَالزَّكَاةِ مَا دُمْتُ حَيًّا(٣١) وَبَرًّا بِوَالِدَتِي وَلَمْ يَجْعَلْنِي جَبَّارًا شَقِيًّا(٣٢) وَالسَّلَامُ عَلَيَّ يَوْمَ وُلِدتُّ وَيَوْمَ أَمُوتُ وَيَوْمَ أُبْعَثُ حَيًّا﴾(مريم:٢٩-٣٣).

عیسا (علیه السلام) قسەی کرد کاتێك لە ناوبێشکەدا بوو، ئەوەیش بە قودرەت و دەسەڵاتی خوا، یەکەم دەربڕینی بریتی بوو لەوەی کە وتی: بەڕاستی من بەندەی خوام، لەمەیشدا وەڵامێکی گەورە و کاریگەر هەبوو، بۆ مەسیحییەکان وایان لێکدەدایەوە کە عیسا خوایە و کوڕی خوایە –پەنا بە خوا لەم بیروباوەڕییە – خوا بەرز و بڵند و باڵایە.

پێشەوا (الرازی) دەڵێت: (ئەوەی کە لەو کاتەدا زۆر پێویست بوو، بێگومان بریتی بوو لە لابردنی تۆمەت لەسەر مەریەم (علیها السلام)، پاشان بێگومان عیسا (علیه السلام) هیچی لەسەر ئەوە نەوت، بەڵکو لەسەر ئەوە قسەی کرد کە بەندایەتی خۆی جێگرو دامەزراو بکات، وەك ئەوەی بیەوێت تۆمەت لەسەر خوای گەورە لاببات لە پێشدا، تا تۆمەتەکە لەسەر دایکی لابەرێت، بۆ ئەمەیش یەکەم ووشەی کە دەری بڕی بۆ لابردنی ئەو تۆمەتە بوو، چونکە قسەکردن بۆ لابردنی تۆمەت لەسەر خوای گەورە سودی ئەوەی تیایە کە تۆمەتەکە لەسەر دایکی لابەرێت، چونکە بێگومان خوای گەورە ئافرەتی خراپ و داوێن پیس تایبەتمەند ناکات بەبەخشینی کوڕ لەو پلە بەرز و باڵایەو شوێن گەورەیەدا، بەڵام قسەکردن لەسەر لابردنی تۆمەت لەسەر خوای گەورە، لەبەرئەوە خۆ سەرقاڵکردن بە خواوە گرنگتر و لە پێشترە).[٤٦٠]

پێشەوا (الآلوسي) لە تەفسیری (روح المعاني)دا دەڵێت: (باسکردنی بەندایەتی کردن خۆی بۆ خوای گەورە لە پێشدا لەبەر ئەوە بوو، کە داننان بەوەدا لەسەر ئەوەی کە وترا بوو، ئەوە یەکەم پلەی ئەو کەسانەیە کە ڕێگەی خوایان گرتووە، هەروەها وەڵامێکیش بوو بۆ ئەو کەسانەی کە وایان دادەنا عیسا پەروەردگار بێت، و لە هەموو ئەوانەدا کە وتی، ئاگادارکردنەوە بوو بۆ ئەوەی پاکی دایکی بسەلمێنێت لەسەر ئەوەی بەڵگە بوو

---

[٤٦٠] – مفاتيح الغيب اللإمام الرازي: ٢١: ٢٠٩.

لەسەر هەڵبژاردنی دایکی، و خوای گەورە دوورە لەوەی کە منداڵی بەرهەمی زینا هەڵبژێریت، و مەریەم یەکێکە لە کەسانی موسڵمانی لای ئەوان).[٤٦١]

﴿قَالَ إِنِّي عَبْدُ اللَّهِ آتَانِيَ الْكِتَابَ وَجَعَلَنِي نَبِيًّا﴾(مريم: ٣٠). ﴿إني عبدالله﴾ عیسا (علیه السلام) یەکێك بوو لە بەندەکانی خوای گەورە، خوای گەورە نازو نیعمەتی بەسەردا ڕشتبوو، و کتێبی پێ بەخشی بوو، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِنْ هُوَ إِلَّا عَبْدٌ أَنْعَمْنَا عَلَيْهِ وَجَعَلْنَاهُ مَثَلًا لِبَنِي إِسْرَائِيلَ﴾(الزخرف:٥٩).

واتە: (ئەو عیسایە تەنها بەندەیەکی ئێمە بوو کەناز و نیعمەتی پێغەمبەرایەتیمان پێبەخشی و کردمانە نمونەیەکی چاك بۆ ئەوەی نەوەی ئیسرائیل شوێنی بکەون).

﴿آتانيَ الكتاب﴾ خوای گەورە ئینجیلی بۆ نارد.

خوای گەورە فەرمووی: ﴿ثُمَّ قَفَّيْنَا عَلَى آثَارِهِمْ بِرُسُلِنَا وَقَفَّيْنَا بِعِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ وَآتَيْنَاهُ الْإِنْجِيلَ وَجَعَلْنَا فِي قُلُوبِ الَّذِينَ اتَّبَعُوهُ رَأْفَةً وَرَحْمَةً وَرَهْبَانِيَّةً ابْتَدَعُوهَا مَا كَتَبْنَاهَا عَلَيْهِمْ إِلَّا ابْتِغَاءَ رِضْوَانِ اللَّهِ فَمَا رَعَوْهَا حَقَّ رِعَايَتِهَا فَآتَيْنَا الَّذِينَ آمَنُوا مِنْهُمْ أَجْرَهُمْ وَكَثِيرٌ مِنْهُمْ فَاسِقُونَ﴾ (الحديد:٢٧).

واتە: (لەوەودوا بەشوێن پێغەمبەراندا، پێغەمبەرانی ترمان ڕەوانەکرد، کۆتایی زنجیرەی ئیسحاقی کوڕی ئیبراهیممان هێنا بە عیسای کوڕی مریم، وئینجیلیشمان پێ بەخشی).

ئینجیل کتێبێکی تەواوکەر بوو بۆ تەورات، خوای گەورە هەواڵ دەدات دەربارەی قسەی عیسا (علیه السلام) بۆ قەومەکەی و دەفەرموێت: ﴿وَمُصَدِّقًا لِمَا بَيْنَ يَدَيَّ مِنَ التَّوْرَاةِ وَلِأُحِلَّ لَكُمْ بَعْضَ الَّذِي حُرِّمَ عَلَيْكُمْ وَجِئْتُكُمْ بِآيَةٍ مِنْ رَبِّكُمْ فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ(٥٠) إِنَّ اللَّهَ رَبِّي وَرَبُّكُمْ فَاعْبُدُوهُ هَذَا صِرَاطٌ مُسْتَقِيمٌ (٥١) فَلَمَّا أَحَسَّ عِيسَى مِنْهُمُ الْكُفْرَ قَالَ مَنْ أَنْصَارِي إِلَى اللَّهِ قَالَ الْحَوَارِيُّونَ نَحْنُ أَنْصَارُ اللَّهِ آمَنَّا بِاللَّهِ وَاشْهَدْ بِأَنَّا مُسْلِمُونَ﴾(آل عمران: ٥٠-٥٢).

واتە: (عیسا (علیه السلام) وتی: هەروەها بەڕاست دانانی ئەو تەوراتەم کە لەبەر دەستمدایە، هاتووم بۆ ئەوەی هەندێك لەو شتانەی لە سەرتان حەرامکراوە (بەفەرمانی خوا) حەڵاڵی بکەم وبەڵگەیشم بۆهێناون لەلایەن پەروەردگارتانەوە (لەسەر ڕاستی

---

[٤٦١]- روح المعاني ١٦: ٨٩ بە کورتی و دەستکارییەوە.

پێغەمبەرایەتیم) کەواتە لەخوا بترسن و فەرمانبەرداری من بن و بە قسەم بکەن. بەڕاستی هەر خوا پەروەردگاری منیش و ئێوەیشە، کەواتە تەنها ئەو بپەرستن و ملکەچی ئەوبن، ئەمەیە ڕێبازی ڕاست و دروست).

﴿وَجَعَلَنِي نبيا﴾ خوای گەورە کردی بە پێغەمبەر، پێغەمبەرایەتی پلە و پایەیەکی گەورەو بەرزە، بۆ کەس نابێت بێجگە لە کەسانی پاك و ڕێزدار و بۆ خوا گونجاو.
پێغەمبەرایەتی عیسا (علیه السلام) بەڵگە بوو لەسەر پاکی و بێتاوانی دایکی، چونکە پێغەمبەران (علیهم السلام) پاکترین کەسانن لە نەسەب و ڕەچەڵەکدا.
﴿وَجَعَلَنِي مُبَارَكًا أَيْنَ مَا كُنتُ وَأَوْصَانِي بِالصَّلَاةِ وَالزَّكَاةِ مَا دُمْتُ حَيًّا﴾(مريم:٣١). واتە منی موبارەك و پیرۆزیش کردووە لەهەرکوێدا بم وتراوە: کردومی بە مامۆستای خێر و چاکە، وتراوە (البركة) لە (بروك البعير) ەوە هاتووە، واتە: (چۆك دادانی ووشتر) واتە: دامەزراوی کردووم لەسەر دین، و خاوەنی خۆراگری و دڵنیاییم، وتراوە: (البركة) بریتییە لە زیادە نیعمەت و بەرزی و بڵندی، وەك ئەوەی وتبێتی، خوای گەورە لە هەموو شتێکدا زاڵ و سەرکەوتووی کردوم تا ئەوەی کە خوای گەورە ڕێزی لێ گرتووم کە بەرزم دەکاتەوە بۆ ئاسمان.[٤٦٢]
هەندێك لە زانایانی تەفسیر بۆچوونیان وایە کە عیسا (علیه السلام) ئینجیلی پێدرا و بوو بە پێغەمبەر کە هەر لە بێشکەدا بوو، بەڵگەشیان بەم ئایەتەدا هێناوەتەوە: ﴿قَالَ إِنِّي عَبْدُ اللَّهِ آتَانِيَ الْكِتَابَ وَجَعَلَنِي نَبِيًّا﴾. بەڵام ئەوەی لەم بابەتەدا ڕاست و دروستە، ئەمە بە لێکدانەوە و بۆ چوون دەگونجێت و دەبێت، و ئەوەی تەقدیرکراوە و ڕویداو لە زانستی خوادا بووە، ئەوە لە حوکم و بڕیاری واقیع و ڕاستیدا جێ بەجێ دەبێت، چونکە بە فەرمانی خوا ڕوو دەدات.

﴿وَأَوْصَانِي بِالصَّلَاةِ وَالزَّكَاةِ مَا دُمْتُ حَيًّا﴾(مريم:٣١). واتە: (ئامۆژگاری کردوم کە نوێژەکانم ئەنجام بدەم و لە زەکاتدانیشدا دریغی نەکەم، هەتا لە ژیاندا هەم.) کاتێك عیسا (علیه السلام) توانی هەستێت و ئەم ئەرکانانە ئەنجام بدات، چونکە نوێژ و زەکات دان دوای گەورە بوون و پێگەیشتن واجب دەبێت با لە پێشتریشدا ڕاست بێت ئەنجام بدرێت. لە فەرموودەیەکدا هاتووە دەفەرمووێت: (قەڵەم لەسەر سێ کەس هەڵگیراوە، لەسەر

[٤٦٢] -غرائب القرآن للنيسابوري ١٦: ٥٣ و مفاتيح الغيب للرازي ٢١: ٢١٤-٢١٥.

خەوتوو تا خەبەری دەبێتەوە، و لەسەر منداڵ تا پێدەگات و گەورە دەبێت، و لەسەر کەسی تێکچوو، تا هۆشی دێتەوە.[٤٦٣]

پێشەوا (الألوسي) دەڵێت: (...تۆ دەزانیت کە لە ڕواڵەتی ئاشکرادا، ماوەی باسکراو بریتی بووە لەماوەی ژیانی بە زیندویی لە ژیانی دونیادا، ئەمە لەسەر ئەوەی کە زانراوە، هەر بەو جۆرە ماوەی ژیانی لە ئاسماندا ناگرێتەوە).[٤٦٤]

لەمەدا ئاماژە بۆ ئەوە کراوە کە تەکلیفی شەرعی لەسەر بەندە لاناچێت هەتا زیندو بێت و لە ژیاندا مابێت و ژیر بێت، لەمەدا وەڵام بۆ هەندێك لە کەسانی شیعەو سۆفی و دەستە لادەرەکان هەیە کە دەڵێن: تەکلیف لادەچێت لەسەر بەندە لە کاتی گەیشتنی بە تەمەنێکی دیاریکراو، بەڵام ڕاستی ئەوەیە کە تەکلیف لەسەر کەسی داوا لێکراو لاناچێت تەنها بە مردن یان بە تێك چوون نەبێت.

﴿وَبَرًّا بِوَالِدَتِي﴾ واتە: خوای گەورە کردومی بە کەسێکی چاکەکار بۆ دایکم، بەبەزەیی بە دایکم، خوا چاکەی دایکمی دەوێت، لێرەدا ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە دایکی چاکەکار و پاك بووە لەو درۆو بوهتانەی کە جولەکە بۆیان هەڵدەبەست ﴿وَبَرًّا بِوَالِدَتِي وَلَمْ يَجْعَلْنِي جَبَّارًا شَقِيًّا﴾(مريم:٣٢).

واتە: (نەیکردووم بەکەسێکی زۆردار و بەدڕفتار) خوای گەورە نەیکردوم بە کەسێکی خۆ بەگەورەزان بەسەر حەق و ڕاستیدا، بەڵکو کردومی بە کەسێکی حەق ویست و بەبەزەیی و نەرم و نیان و بەڕێز و ملکەچ بۆ حەق، و گوێڕایەڵ بۆ فەرمانی خوا بەم سیفەتانەی کە عیسا(عليه السلام) خۆی پێ ڕازاندەوە، مافی خۆیەتی کە لە ژیانی دنیا و قیامەتدا بەختەوەر و خۆشگوزەران بێت، وشیاوی خۆیەتی کە سەلامی خوای لەسەر بێت لە دنیاو لە قیامەتدا.

﴿وَالسَّلَامُ عَلَيَّ يَوْمَ وُلِدْتُ وَيَوْمَ أَمُوتُ وَيَوْمَ أُبْعَثُ حَيًّا﴾(مريم:٣٣).

واتە: (سڵاوی پەروەردگارم لەسەرە ئەو ڕۆژەی کە لەدایك بووم و ئەو ڕۆژەیشی کەدەمرم، و ئەو ڕۆژەیشی کە زیندوو دەکرێمەوە).

---

[٤٦٣] –رواه الترمذي في السنن عن علي (رضي الله عنه) كتاب الحدود.

[٤٦٤] – روح المعاني للألوسي ١٦: ٩٠.

بەڕۆیشتن و تێپەڕبوونی بەم قۆناغانەدا، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كە بەدی هاتووە و مرۆڤێكە خوا دروستی كردووە، (خوا) ناگۆڕێت و ناچێتە قۆناغ و دۆخێكی ترەوە، و(خوا) پێویستی بە هیچ نابێت و موحتاجی كەس نییە.

بێگومان ئایەتە قورئانییەكان هەڵوێستی قەومەكەی عیسایان ڕوون كردۆتەوە دەربارەی ئەم بەڵگە و نیشانە ڕوون و یەكلاكەرەوە. ئایەتەكە ئاماژە دەكات بۆ ڕا جیاوازی جوولەكەو مەسیحییەكان لە ڕاستی عیسادا(علیه السلام)، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ذَٰلِكَ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ قَوْلَ الْحَقِّ الَّذِي فِيهِ يَمْتَرُونَ(٣٤)مَا كَانَ لِلَّهِ أَن يَتَّخِذَ مِن وَلَدٍ سُبْحَانَهُ إِذَا قَضَىٰ أَمْرًا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُ كُن فَيَكُونُ(٣٥)وَإِنَّ اللَّهَ رَبِّي وَرَبُّكُمْ فَاعْبُدُوهُ هَٰذَا صِرَاطٌ مُّسْتَقِيمٌ(٣٦)فَاخْتَلَفَ الْأَحْزَابُ مِن بَيْنِهِمْ فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ كَفَرُوا مِن مَّشْهَدِ يَوْمٍ عَظِيمٍ﴾(مريم:٣٤-٣٧).

واتە: (ئا ئەوەیە عیسای كوڕی مریم، هەر ئەوەیشە قسەی ڕاستو دروست دەربارەی، كە ئەوانە (واتە جولەكەكان) گومان بەدەوریدا دروست دەكەن (گاوران بەكوڕی خوا لەقەڵەمی دەدەن) بێگومان ناگونجێت بۆ خوای گەورە كەس بكاتە ڕۆڵەی خۆی (چونكە پێویستی پێی نییە) پاكیو بێگەردی شایستەی ئەوە، كاتێك هەرشتێك بڕیاربدات، ئەو بەڕاستی تەنها ئەوەندەی ئەوێت كەفەرمان بدات بڵێت: ببە، دەست بەجێ دەبێت، بەڕاستی هەر خوا پەروەردگاری منیشو پەروەردگاری ئێوەیشە، كەواتە بیپەرستن ئەمەیە ڕێبازی ڕاستو دروست (ڕێبازی دینداریو سەرفرازی هەردوو جیهان)، (لەگەڵ ئەو هەموو ڕاستیانەدا) ئینجا یەكسەر گرۆ و دەستەكان لەنێو خۆیاندا ڕا و بۆچونی جیاوازیان بۆ دروست بوو، هاوار و ئاه و ناڵە بۆ ئەوانەی كە بێباوەڕن و (بڕوا بەو ڕاستیانە ناكەن) كاتێك قیامەت بەرپا دەبێتو دیمەنی سامناك و بەسەرهاتی گەورە دەبینن(كە ئێستە بە دووری دەزانن)).

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿مَّا الْمَسِيحُ ابْنُ مَرْيَمَ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ الرُّسُلُ وَأُمُّهُ صِدِّيقَةٌ كَانَا يَأْكُلَانِ الطَّعَامَ انظُرْ كَيْفَ نُبَيِّنُ لَهُمُ الْآيَاتِ ثُمَّ انظُرْ أَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ﴾(المائدە:٧٥). واتە: (مەسیحی كوڕی مەریم هیچ شتێك نییە (نە خوایە و نە كوڕی خوایە) جگە پێغەمبەرێكی خوا نەبێت، بەڕاستی پێش ئەو چەندەها پێغەمبەری تریش ڕابووردوون، دایكیشی ئافرەتێكی زۆر ڕاست و ڕاستگۆیە، هەردووكیان خواردنیان دەخوارد (وەك هەموو ئینسانێك) سەیر بكە و سەرنج بدە (ئەی محمد (ﷺ) ئەی ئیمانداران) چۆن هەموو

فەرمان و بەڵگەیەکیان بۆ ڕون دەکەینەوە، لەوەودوا تەماشاکە چۆن ڕویان لە حەق وەردەچەرخێنرێت و لەڕاستی لادەدرێن!).

## باسی یانزەیەم:
## ئەو بڕیار و پەند و ئامۆژگارییانەی پەیوەندییان بە چیرۆکەکەوە هەیە:

### هۆکاری بۆماوە و ژینگە و کاریگەرییان لەسەر پەروەردە

بابەتەکە بە بۆنەی ئەم ئایەتەوەیە کە دەفەرموویت: ﴿إِنَّ اللَّهَ اصْطَفَى آدَمَ وَنُوحًا وَآلَ إِبْرَاهِيمَ وَآلَ عِمْرَانَ عَلَى الْعَالَمِينَ(٣٣) ذُرِّيَّةً بَعْضُهَا مِن بَعْضٍ وَاللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾.(ال عمران:٣٣-٣٤). بە هاوکاری و پشتیوانی خوای گەورە دەربارەی هۆکارەکانی بۆماوە و ژینگە و کاریگەرییان لەسەر پەروەردە دەدوێین. لە هۆکارە بنەڕەتی و سەرەکییەکانی پەروەردە بریتییە لە: هۆکاری بۆ ماوە و هۆکاری ژینگە، بەڕاستی قورئان ئاماژەی کردووە بۆ ئەم بابەتە و سوننەتی پێغەمبەریش (ﷺ) گرنگی پێداوە، و کاریگەرییەکانی لەسەر پێکهاتەی لەشی ئینسان لە ڕووی ئەخلاقی و ئەندامییەوە ڕوون کردۆتەوە.

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِنَّا خَلَقْنَا الْإِنسَانَ مِن نُّطْفَةٍ أَمْشَاجٍ نَّبْتَلِيهِ فَجَعَلْنَاهُ سَمِيعًا بَصِيرًا﴾(الأنسان:٢)

واتە: ئینسانمان لە ئاوی پیاو و ئافرەت دروستکردووە، (امشاج) کۆی (مشج)ە واتە: تێکەڵ چونکە کۆرپە لە ئەنجامی تێکەڵ بوونی پیاو و ئافرەت پێکەوە دروست دەبێت، سەرەتا قۆناغی (نطفة) پاشان قۆناغی (العلقة) ی بەدوادا دێت، پاشان قۆناغی (المضغة المخلقة و غير المخلقة).

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ثُمَّ خَلَقْنَا النُّطْفَةَ عَلَقَةً فَخَلَقْنَا الْعَلَقَةَ مُضْغَةً فَخَلَقْنَا الْمُضْغَةَ عِظَامًا فَكَسَوْنَا الْعِظَامَ لَحْمًا ثُمَّ أَنشَأْنَاهُ خَلْقًا آخَرَ فَتَبَارَكَ اللَّهُ أَحْسَنُ الْخَالِقِينَ﴾(المؤمنون:١٤).

واتە: (لەوەودوا نوتفەکەمان کردووە بەخۆهەڵواسەرێك (سەرە مێکوتەیەك) پاشان خۆهەڵواسراوەکەمان کردووە بەگۆشتپارەیەك، ئینجا (شێوازی) گۆشتپارەکەمان بە پەیکەری ئێسك گۆڕیەوە و بەگۆشت پەیکەری ئێسکەکەمان داپۆشی، ئەوسا لە شێوەیەکی تردا دەرمان هێناوە(کە شێوەی ئادەمیزادێکی ڕێك و پێکە و ڕۆحی پێ

بەخشراوە)، بەڕاستی خوای مەزن بەرز و پیرۆز و موبارەك و چاکترین بەدیهێنەر و چاکترین دروستکارە).

خوای گەورە لە سوورەتی (نوح)دا فەرمووییەتی: ﴿مَا لَكُمْ لَا تَرْجُونَ لِلَّهِ وَقَارًا(١٣)وَقَدْ خَلَقَكُمْ أَطْوَارًا﴾ (نوح:١٣-١٤).

واتە: (ئەوە چیتانە ئێوە قەدری خوا نازانن، بۆ ڕێزی بۆ دانانێن ولێی ناترسن، خۆ ئێوە پێشتر نەبوون، هەرخوا خۆی بەچەند قۆناغدا ئێوەی تێپەڕاند و دروستی کردن).

واتە لە چەندە قۆناغێکی یەك لە دوای یەکدا، خوای گەورە فەرمووی: ﴿خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ ثُمَّ جَعَلَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَأَنزَلَ لَكُم مِّنَ الْأَنْعَامِ ثَمَانِيَةَ أَزْوَاجٍ يَخْلُقُكُمْ فِي بُطُونِ أُمَّهَاتِكُمْ خَلْقًا مِّن بَعْدِ خَلْقٍ فِي ظُلُمَاتٍ ثَلَاثٍ ذَٰلِكُمُ اللَّهُ رَبُّكُمْ لَهُ الْمُلْكُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ فَأَنَّىٰ تُصْرَفُونَ﴾(الزمر:٦).

واتە: (... لەسکی دایکتاندا ئێوە دروست دەکات بە چەند قۆناغێك).

بێگومان هۆکاری بۆماوە فەرمانێکی هاوبەشە لە نێوان باوك و دایکیدا ئیمامی (مسلم) لە (صحیح)ە کەیدا، ڕیوایەتی کردووە: (ابو هریرة) (خوا لێی ڕازی بێت) دەڵێت: کابرایەکی دەشتەکی هاتە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) ووتی: ژنەکەم منداڵێکی ڕەش پێستی بووە، منیش حاشام لێکردووە کە منداڵی من بێت، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (ئایا تۆ گەلە ووشترت هەیە؟) وتی: بەڵێ، فەرمووی: (ڕەنگەکانیان چییە و چۆنە؟) کابرا وتی: سورن، فەرمووی: (ئایا ڕەنگ خۆڵەمێشیان تێدایە؟!) کابرا وتی: بەڵێ، پێغەمبەری خوا (ﷺ )فەرمووی: (بۆچی وایە؟!) کابرا وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەوانەیە لە ڕەچەڵەکی (باوانێکەوە) هاتبێت، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (لەوانەیە ئەمەیش لە ڕەچەڵەکی باوانێکەوە هاتبێت).[٤٦٥]

بێگومان پێغەمبەر (ﷺ) بە هۆکاری بۆ ماوەیی بڕیاری داوە، بەپێی ئەم فەرموودەیە: (محمد) کە- إبن سیرین-ە، دەڵێت: پرسیارم لە (انس ی کوڕی مالك) کرد، وامزانی کە ئەو لەو بارەیەوە زانیارییەکی پێیە، وتی (هیلالی کوڕی ئومییە) تۆمەتی زینای دایە پاڵ ژنەکەی لەگەڵ (شریك ی کوڕی سمحاء)دا، ئەم (شریك)ە، برای دایکی (براءة ی کوڕی مالك) بوو، هیلالیش یەکەم کەس بوو لە ئیسلامدا کە (لعان)ی کرد، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (چاوەڕوانی دانانی منداڵەکەی بن، کە لەدایك بوو سەیری بکەن، ئەگەر قژ

---

[٤٦٥] - رواه مسلم في صحيحه، كتاب اللّعان.

خاوێکی چاو سوربوو، ئەوە هی هیلالی کوڕی ئومەییە، بەڵام چاو ڕەشێکی قژ گرژ و بژو قاچ باریك بوو، ئەوە منداڵی (شریك ی کوڕی سمحا ﷺ)، (انس) دەڵێت: هەواڵم بۆ هات کە ژنەکە منداڵێکی چاو ڕەش و قژ گرژ و بژ و قاچ باریکی بووە.)[٤٦٦]

فەرموودەی تر لەم بارەیەوە زۆرن بەڵام لێرەدا بواری باسکردنیان نییە خوای گەورە جوانی فەرمووە: ﴿ذُرِّيَّةً بَعْضُهَا مِن بَعْضٍ وَاللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾(ال عمران:٣٤). واتە: (ئەوانە نەوەیەکن یەك ڕەچەڵەکن، هەندێکیان لەهەندێکی تریان بوون)خوا خۆی بیسەر و زانایە (چاك دەزانێت کە شایستەن بۆ ئەو کارە پیرۆزە).

﴿وَالْبَلَدُ الطَّيِّبُ يَخْرُجُ نَبَاتُهُ بِإِذْنِ رَبِّهِ وَالَّذِي خَبُثَ لَا يَخْرُجُ إِلَّا نَكِدًا كَذَلِكَ نُصَرِّفُ الْآيَاتِ لِقَوْمٍ يَشْكُرُونَ﴾(الأعراف:٥٨).

واتە: (وڵاتی بە پیت و چاك و ئاوەدان، دار و درەخت و ڕوەکی تێدا دەڕوێت بە فەرمانی پەروەردگاری، ئەوەیش کە زۆنگ و پیس و بێ کەڵك بێت، شتی بێ سودو بێ فەڕ نەبێت، هیچی لێ پەیدا نابێت).

خوای گەورە لە سوورەتی (ئیبراهیم)دا – کە ئەمە ماناکەیەتی– دەفەرموێت: (ئایە نەتان بینیوە چۆن خوا نمونە دەهێنێتەوە بە گوفتاری چاك و پاك، کەوەك درەختی چاك و بەردار وایە، ڕەگی توندی داکوتاوە لەزەویدا لق و پۆپەکانیشی بەئاسماندا بڵاو بونەتەوە، ئەو درەختە هەموو کات و دەمێك بەر وبومی(پاك و جوان و بێگەردی) دەبەخشێت بە وویستی پەروەردگاری، جا خوای پەروەردگار ئەم نمونانە دەهێنێتەوە بۆ خەڵکی، بەڵکو یادەوەری وەربگرن(لەڕاستیدا دین و بەرنامەی خودا درەختێکی ئاوا پیرۆزە، ڕەگ و ڕیشاڵی خەیر بەخشە، چونکە خاکی زەوی لەڕامالین دەپارێزێت و لق و پۆپی بەسودە، سێبەر دەکات، گەڵا و گوڵی بۆ داو و دەرمان و ماڵات، بەرو بوومی بۆ ئادەمیزاد، باڵندەکان بە ئاوازی خۆش لەسەری دەخوێنن و تەسبیحات دەکەن و دڵ خۆشمان دەکەن، ئۆکسجین دەبەخشێت...هتد))(ئیبراهیم:٢٤-٢٥).

هۆکارەکانی بۆ ماوەیی تەنها لە بوارەکانی جەستەیی و ئەندامیدا ڕاناوەستێت، بەڵکو تێدەپەڕێت لەوە بۆ ئەخلاق و سروشت، لەبەر ئەوە ئیسلام هاندەرە لەسەر حەز و

---

[٤٦٦] – رواه مسلم في صحيحه، كتاب اللّعان.

هەڵبژاردنی کەسانی چاك و گونجاو بۆ هاوسەرداری، چونکە ئەو ئافرەتە دەبێتە دایك و بەرپرس دەبێت لە پەروەردەکردنی نەوەکان.

(أبو الأسود الدؤلي) بە منداڵەکانی دەڵێت: بێگومان من چاکەم لەگەڵ ئێوە کرد بە بچوکی و بە گەورەیی و پێش ئەوەشی کە لە دایك ببن، وتیان: تۆ چۆن چاکەت لەگەڵمان کرد پێش ئەوەی کە لە دایك ببین؟ ئەویش وتی: دایکێکی باش و چاکم بۆ هەڵبژاردن.

فأولُ إحساني إليكم تخيري      لَماجِدة الأعراقِ بادَ عفافها.[٤٦٧]

دایکی چاکەکارو باوکی چاکەکار بنەمای منداڵی چاکن، هەورەها ژینگەیش کاریگەری گرنگی هەیە و دەوری کاریگەر دەبینێت لە پەروەردەدا، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: (هەر منداڵێك کە لە دایك دەبێت لە سەر فیترە و سروشتی پاك لە دایك دەبێت، پاشان دایك و باوکی یان دەیکەن بە جوولەکە یان مەسیحی یان مەجوس، هەروەك ئاژەڵێك کە بەچکەیەکی تێر و تەواوی دەبێت، پاشان (أبو هريرة) دەڵێت: ئەگەر دەتانەوێت ئەم ئایەتە بخوێنن- کە ئەمە ماناکەیەتی: (ئەو فیترەتە پاکەی خوا خەڵکی لەسەر دروستکردووە، دروستکراوەکانی خوا ناگۆڕێت، هەر ئەوەیە ئایینی تەواو، بەڵام زۆربەی خەڵکی نایزانن).[٤٦٨]

بەرپرسیارێتییەکی گەورە لەسەر شانی دایکان و باوکانە لە پەروەردەکردنی منداڵاندا، لە فەرموودەیەکدا هاتووە، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: (بەڕاستی خوای گەورە پرسیار لە هەموو بەرپرسێك دەکات دەربارەی ئەوەی کە سەرپەرشتی کردووە، پاراستبێتی یان وونی کردبێت و بایەخی پێ نەدابێت و لێپرسینەوەی پیاویش دەکات دەربارەی کەس و کاری ماڵەکەی)[٤٦٩] پێمان باشە ئەم چیرۆکە لێرەدا بگێڕینەوە، کە لە کتێبی (المستطرف مِن كُلِّ فن مستظرف)ی (أدب) وەرگیراوە، نوسەر دەڵێت: هەندێك کەس گێڕاویانەتەوە و وتویانە: چومە دەشت و بیابانێکەوە، لەو کاتەدا ئافرەتێکی پیری بە تەمەنم بینی، بەرخێکی کوژراوی لەبەردەمدا بوو، لە تەنیشتیشیەوە توتکە گورگێك هەبوو، ئافرەتەکە وتی: ئایا دەزانیت ئەمە چی یە؟، منیش وتم: نەخێر، وتی: ئەمە

---

[٤٦٧] -أدب الدنيا والدين للماوردي ص:١٩٥.

[٤٦٨] - رواه مسلم عن أبي هريرة في صحيحه كتاب القدر.

[٤٦٩] - رواه الطبراني في معجم الكبير عن إبن مسعود حديث (٨٨٥٥) وأورده الألباني في سلسلة الصحيحة ٤: ١٧٩ حديث (١٦٣٦).

توتکە گورگێکی بچوکە و گرتومانە و هێناومانە لە ماڵی خۆمان پەروەردەمان کردووە، کاتێك گەورە بووە، ئەوەی بەسەر بەرخەکەمدا هێناوە کە تۆ دەیبینیت!![470]

## کاریگەری ڕۆڵی ئافرەت لەسەر خێزان و کۆمەڵگا

سوورەتی (آل عمران) بە ناوی تێکڕای ئەندامانی خێزانەکەوە ناوبراوە، بەڵام کاتێك دەیخوێنینەوە ڕۆڵی ئافرەت زۆر بە ڕوونی دەبینین، هەر وەکو دەفەرموێت: ﴿إِذْ قَالَتِ امْرَأَتُ عِمْرَانَ رَبِّ إِنِّي نَذَرْتُ لَكَ مَا فِي بَطْنِي مُحَرَّرًا فَتَقَبَّلْ مِنِّي إِنَّكَ أَنتَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ﴾(ال عمران /٣٥).
باسی عیمران لە سوورەتەکەدا نەهاتووە، بەڵکو زیاتر جەخت کردنەوەکە لەسەرئافرەت بووە. ئەمە هەروەکو پەیامێك وایەکە ئەوهێمای دەستپێکردن وگۆڕانی بەدەستە.
مامۆستای بانگخواز (عمروخالد)دەڵێت: من لێرەدا وتەیەك تایبەت دەکەم بە ئافرەتان و سوێندیان پێ دەدەم، ئەگەر تۆ پێغەمبەری خوات (ﷺ) خۆش دەوێت، کوڕ و کچەکانتان بەو شێوەیە گەورە بکەن کە ئیسلام و موسڵمانان سەربەرز بکەن و، دەبێت هەردەم ئەوەتان لەیاد بێت کە سوورەتەکە بە ناوی خێزانێکەوە ناونراوە، لەبەرئەوەی هەموویان لەسەر ئامانجێك جێگیربوون و لە دەوری کۆبوونەتەوە بۆ بەدەستهێنانی کە نامە و پەیامی تێدایە بۆ هەموو تاکەکانی خێزان، تاکو لەپێناوی ئامانجەکەیان بژین، نەکەیت لە ڕێگای کەمتەرخەمی و کورت بینییەوە ئامانجەکانی خۆت لەبیر بکەیت و پاشەکشە بکەیت. هاوسەرەکەی دەستی کرد بە پاڕانەوە لە خوای گەورە تاکو منداڵی پێ ببەخشێت، لەناکاو شتێکی کوت و پڕ و سەیر ڕوویدا، دوعاکەی گیرابوو، منداڵەکە لەناوسکیدا دەستی بە جوڵان کرد، لەکاتێکدا کە تەمەنی لە منداڵ بوون لایدابوو، بەڵام کارەکە بەدەست کێیە؟کێ موڵکی ئاسمانەکان وزەوی بەدەستەوەیە؟ بێگومان خوای پاك و بێگەرد، هەموو ئەمانە لە نیەتی ئەو ئافرەتەوە سەرچاوەی گرتووە.
کاتێك خوای گەورە دوعاکەی گیرا کرد، ئەوەی لە سکیدا بوو پێشکەشی خوای گەورەی کرد بەو جۆرەی ئایەتەکە دەفەرموێت: ﴿إِنِّي نَذَرْتُ لَكَ مَا فِي بَطْنِي مُحَرَّرًا﴾(آل عمران/٣٥).
زۆربەی کات خەڵکی بۆ شتێکی دنیایی نەزر دەکەن، وەك ئەوەی کەسێك نەزرێك بکات

---

[470] المستطرف:١: ٣٠٢.

بە مەرجێك لە فلآنە کاردا سەربکەوێت، بەلاّم تا ئێستا نەزرکردنێکمان نەبینیوە کە لە پێناوی ئاییندا بێت هەر وەکو هاوسەرەکەی عیمران کردی، ئەگەر کوڕ بێت تەواوی ژیانی لە پێناوی خوای گەورە دەبێت، کە لە بنچینەدا داوای منداڵ بوونی نەکرد وەك پێویستییەکی خۆی، بەڵکو داوای لە خوای گەورە کرد کوڕیکی پێ ببەخشێت کە هەموو ژیانی لە پێناوی خوای گەورەدا بێت.

## ( پەیوەندی کردنی بەردەوام بە خوای گەورە و نزیکبوونەوە لێی )

لەڕێگای چیرۆکی ئالی عیمرانەوە پەیوەندی هاوسەر لەگەڵ خوای گەورە دەردەکەوێت کە لە پەیوەندییەکی بەردەوامدایە لەگەڵ خوای گەورە و بەردەوام نوێی دەکاتەوە، پەیوەندی کردن بە خوای گەورەوە دوو جۆرە:

١-دوعاکردن.

٢-پاڕانەوە و موناجات کردن.

(مناجات) پاڕانەوەی نهێنی: قسەکردن لەگەڵ خوای گەورە، دەتوانیت کاتێك ئۆتۆمبیل لێدەخوڕیت، موناجاتی خوا بکەیت و داوای لێ بکەیت، پەروەردگارا لەمن ڕازیت؟هەروەها بڵێیت: ئەگەر هەموو دونیا لە من توڕە بێت ڕازیبوونی تۆم بەسە، و داوای لێ بکەیت نەتداتە دەست نەفسی خۆت، خەمەکانی خۆت بگرێت، ئەمە بوو کە هاوسەرەکەی عیمران ئەنجامیدا، تێبینیتان کردووە کە چۆن لەگەڵ خوای گەورەدا دەدوێت؟ وەك ئەوەی خووی بەو موناجاتە بەردەوامەوە گرتبێت لەکاتە جیاوازەکاندا: ﴿إِذْ قَالَتِ امْرَأَتُ عِمْرَانَ رَبِّ إِنِّي نَذَرْتُ لَكَ مَا فِي بَطْنِي مُحَرَّرًا فَتَقَبَّلْ مِنِّي إِنَّكَ أَنتَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ (٣٥) فَلَمَّا وَضَعَتْهَا قَالَتْ رَبِّ إِنِّي وَضَعْتُهَا أُنثَى وَاللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا وَضَعَتْ وَلَيْسَ الذَّكَرُ كَالْأُنثَى وَإِنِّي سَمَّيْتُهَا مَرْيَمَ وَإِنِّي أُعِيذُهَا بِكَ وَذُرِّيَّتَهَا مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ﴾(آل عمران/٣٥-٣٦).

پاشان وەلاّمەکەی دێت: ﴿فَتَقَبَّلَهَا رَبُّهَا بِقَبُولٍ حَسَنٍ وَأَنبَتَهَا نَبَاتًا حَسَنًا وَكَفَّلَهَا زَكَرِيَّا﴾(آل عمران/٣٧).

ئایا تۆیش دەتوانیت پەیوەندیت لەگەڵ پەروەردگارت بەم شێوەیە بێت؟ ئەگەر وات کرد ئەوە هەست بە خۆشییەك دەکەیت لە دڵتا کە پێشتر نەبووە، هەروەها هەست بەناوە

جوانەکانی خوا ﴿الحكيم﴾ دانا و ﴿الوَدود﴾ نەرم ونیان دەکەیت، چونکە عیسا (علیه السلام) و مەریەم بەرهەمی نیەت و نەزرکردنی دایکێکە، هەروەها دوعا و پاڕانەوەی دایکێکە، ئامانجی خێزانێکە.

## ئازادی ئافرەت لە ئیسلامدا

ئەم باسەیش بەبۆنەی ئەم ئایەتەوە کە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿إِذْ قَالَتِ امْرَأَةُ عِمْرَانَ رَبِّ إِنِّي نَذَرْتُ لَكَ مَا فِي بَطْنِي مُحَرَّرًا فَتَقَبَّلْ مِنِّي إِنَّكَ أَنتَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ﴾ (ال عمران:٣٥).

واتە: (بەیاد بێنە کاتێك هاوسەری عیمران وتی: پەروەردگار بەڕاستی من بڕیارمداوەو نەزرم کردووە، ئەومندالەی لەسکمدایە ئازاد کراو بێت لە هەموو ئەرك و ئیش و کارێك(تا هەر لەخزمەتی بیت المقدس دا بێت).

پێمان جوانە هەلوێستەیەك بکەین لەبەردەم ئازادی لە ئیسلامدا چەمکێکی ڕوونەو، بیرو بۆچونێکی بنەڕەتی یە لەو بنەمایانەی کە ئیسلام دایڕشتوون و مەبەستێکە لە مەبەستە گرنگەکانی ئیسلام کە (ئازادی)یە، ئازادی ڕاستی و (حەقیقی) بریتیە لە ئیسلام.

مامۆستا (محمد قطب) دەلێت: (ئیسلام لە تەنها یەك ووشەدا: کە (التحریر)ە ئازادی واتە: ئازاد بوون لە دەسەلاتەکانی سەرزەوی، ئازادی یەکانی بەشەر سنوردار دەکات یان دامەزراوی دەکات بۆ بەرەو پێش چوون لە ڕێگەی خەیردا).[٤٧١]

ڕێگا بۆ ژیانی ڕاستەقینە نییە بە بێ ئازادی تەواو، ئازادی لە ئیسلامدا، مافی تاك و مافی کۆمەلگایە، و ئازادی لە ئیسلامدا، ئازادی ڕەها نییە، بەلکو دامەزراو و ڕێك و پێك کراوە بە جۆرێکە زیانی بە ئازادی کەسانی تر نەگەیەنێت، و سنورەکانی تێنەپەڕێنێت کە پەروەردگار دیاری کردوون و بۆی داناوین.

بەلام ئەو ئازادی یەی کە ڕۆژئاوا بانگەشەی بۆ دەکات، ئەوە بانگەوازێکی گوماناوی و درۆیە، و کۆمەلە ووشەیەکی کەم نرخ و بێ نرخە و قسە و دروشمی بریقەدار و فڕوفێلاوین، واتە ئازاد بوون لە هەموو ڕێز و فەزیلەیەك، و خۆ تێوەگلاندنە لە حالەتە بێزراو و ناپەسەندو تێکشکاندنی بەها ئەخلاقی یە بەڕێزو جوانەکان، و هێرشکردنی دڕندانەیە بۆ سەر دینی ئیسلام و بەرنامە فێرکارییە بەهێز و دامەزراوەکەی.

---

[٤٧١]-شبهات حول الأسلام محمد قطب:ص:٢١ بە کورتی و دەستکاری یەوە.

ئەو ئازادییە ڕۆژئاوایی یەی کە دوژمنانی ئیسلام و بانگەشەکەرانی بەناو پێشکەوتن لە ئێمەیان دەوێت، ئەوەیە کە هەنگاو بنێین بۆ ئەو ئازادییە ناوەڕۆك بەتاڵە و ووشە بێ نرخ و ئاواز و دروشمە بریقەدارانەی کە ناوەڕۆکیان بەتاڵە، بێگومان ئەوانە ئازادی نوقم بونن لە ناو دەریای ئارەزووەکان و تێوەگلانە بە حاڵەتە ئارەزووەکانەوە بەبێ لێپرسینەوە و چاودێری کردن.

خاوەنی تەفسیری (في الظلال) لەم باسەدا ووتەیەکی جوانی هەیە لە تەفسیری ئایەتی: ﴿إِذْ قَالَتِ امْرَأَةُ عِمْرَانَ رَبِّ إِنِّي نَذَرْتُ لَكَ مَا فِي بَطْنِي مُحَرَّرًا﴾دا، دەڵێت: (...بە لێکدانەوەیەکی دڵسۆزانەی ڕەها دەری بڕیوە، چونکە ئازادکردن (تحرر) لێکدانەوەیەکی ڕاز بەخش دەگەیەنێت، کەس ناتوانێت بە حەق و ڕاستی شتێك ئازاد بکات مەگەر تەواو دڵسۆز بێت بۆ خوای گەورە و، بە هەموو مەبەستەکانیەوە ڕابکات بۆ لای خوا، و خۆی لە بەندایەتی هەموو تاکێك ڕزگار بکات، هەروەها لە هەموو بەهایەکی دنیایی، تەنها بەندایەتی بۆ خوای گەورە بێت کە تاك و تەنهایە، ئەوە ئازادی تەواوە، کەواتە...غەیری ئەوە بەندایەتی بۆ کەسێکی تر دەگەیەنێت، با لە شێوەی ئازادیشدا ببینرێت! لێرەدا شێوە و وێنەی یەکتاپەرستی لە پلەیەکی ئازادی بەرز و باڵا و نموونەییدا دەردەکەوێت، ئینسان ناتوانێت ئازاد بێت ئەگەر دینداری بۆ یەکێك لە غەیری خوا بکات بە شتێك کە لە ناو ناخیدا بێت، یان لە ناو شتە پەیوەندیدارەکانی ناو ژیانیدا بێت، یان لە ناو حاڵەت و بەها و پێوانە و یاسا و ئەو شەرع و دەستورانەدا بێت کە ئەم ژیانە لایان دەبات، هەروەها ئازاد نابێت ئەگەر شتێك لە دڵی ئینساندا هەبێت لە پەیوەندی بە شتە دنیایی یان چاوگێڕان بۆیان یان بەندایەتی کردن بۆ غەیری خوا، یان لە ژیانی خۆیدا شەریعەت یان بەهاو قیەم یان پێوانەیەکی هەبێت پەیوەندیدار بێت بە غەیری خواوە، کاتێك ئیسلام هات بەیەکتاپەرستی، بە وێنەیەکی تاك و پاك و جوانەوە هات تا ئازاد بێت لە دنیای ئینساندا.[٤٧٢]

ئازادی لە ئیسلامدا بریتییە لە ئازادبوون لە کۆتی هەوا و ئارەزووەکان و بەربەستەکانی، هەروەها خۆ ئازادکردن لە دیلی شەیتانەکانی ئینس و جن، و خۆ ئازادکردن لە زنجیر و داو و تاریکی و نەزانی و گومڕاییەکانیان.

---

[٤٧٢] –في الظلال القرآن لسید قطب ١: ٣٩٢ بە دەستکارییەوە.

ئازاد بوون لە هەموو ئەو شتانەی کە ئینسان لە حەق و ڕاستی و ڕێگای ڕاست دوور دەخاتەوە، و ئەو پەڕی ئازادی و پلە بەرزی بەندایەتی پاك ودڵسۆزانە بۆ خوای گەورە.
هەروەها بەندایەتی کردن بۆ خوای گەورە بریتییە لە هیدایەت و پارێزگاری و نور و ڕووناکی و حیکمەت و یارمەتیدانی خوایی و بەزەیی و فەزڵ و ڕێز و نیعمەت لە خواوە، و بەرز بوونەوە و گەورەیی و پاکی و پاك بوونەوە و سەر بەرزی و ڕێز و ڕێنمایی و بەردەوامی.
بەڵام بەندایەتی بۆ غەیری خوا بریتییە لە بێباوەڕی و سەرپێچی و سەرشۆڕی و تاوان و گوناه و بوهتان و گومڕایی و لادان و خۆ وون کردن. بێگومان ئەو ئازادییەی ڕۆژئاوا بانگەشەی بۆ دەکات، ئەوە بریتی یە لە بەندایەتی کردن و سەرشۆڕبوون و خۆ نزم کردنەوە بۆ ماڵ و سامان و ئافرەتان و پابەندبوون بە هەواو ئارەزوو.
بێگومان ئازادی ڕۆژئاوا بەپێی یاسای دانراوی جوولەکە بەڕێوە دەڕوات بۆ گەیشتن بە بەرژەوەندییەکانیان و جێ بەجێ کردنی مەبەستەکانیان لەناو (بروتوکولات حکماء صهیون) کە جوولەکە دایناوە وەك هەنگاو و ئامانج تا بەهۆیەوە بگەنە ئەوەی زاڵ بن بەسەر جیهانداو دەست بەسەر هەموویدا بگرن، بێگومان خوای گەورە ویستی کە ئەو ئامانج و نەخشانە ئاشکرا بن، پاش ئەوەی کە نهێنی و شاراوە بووە و بەس خۆیان زانیویانە.
لە (بروتوکول)ی یەکەمدا هاتووە دەڵێت: (بێگومان ئێمە یەکەم کەس بووین کە هاوارمان کرد بە هەموو جیهاندا لە چەرخەکانی ڕابردوودا بە (ئازادی و برایەتی و یەکسانی).[٤٧٣]
لە بروتوکولی سێ یەمدا هاتووە: (بێگومان ووشەی ئازادی پاڵ بە جەماوەرەوە دەنێت بۆ ململانێ لەگەڵ خوادا و بەرگری کردن لە سوننەتە کەونییەکانی، لەبەرئەوە کاتێك ووشەکە ببێتە هی ئێمە، ئەوا ووشەی (الحريّة) لە فەرهەنگی ژیاندا دەسڕینەوە، چونکە گۆڕاوە بۆ ڕەمزێك بۆ هێزی وەحشیگەرانە کە جاماوەری گۆڕیوە بۆ دۆخی ئاژەڵێکی تینوو بۆ خوێن ڕشتن.[٤٧٤]
لە ژێر دروشمی ئازادیدا جوولەکە ئافرەتی (إستغلال) کردووە، بە جۆرێکی لێ کردووە کە لەماڵی خۆی دەری کردۆتە دەرەوە، بۆ ئەوەی لە شوێنەکانی کارکردندا تێکەڵاوی پیاوان بکات و خۆی بە بەرگی ناشەرعی کورت و تەسك و تەنکەوە دەربخات، و تووشی

---

[٤٧٣] -بروتوكولات حكماء صهيون، البروتوكول الأول ص٤٤.
[٤٧٤] البروتوكول ثالث ص ٦٨.

ماندوو بوون و پێ هەڵخلیسکانی بکات و لە کارە گرنگەکانی خۆی دووری بخاتەوە، هەروەها ئافرەت سروشتی خۆی لەبیردەچێتەوە و لە فیترەت لادەدات و سەرقاڵ دەبێت بە شیعار و دروشمە بریقەدارەکانەوە – کە بریتین لە ئازادی و یەکسانی و دادپەروەری.

هەروەها لەژێر دروشمی ئازادیدا، ئافرەتیان کردووە بە کاڵایەکی بازرگانی، تا پیشان بدرێت و خۆی پیشان بدات و خۆی دەربخات و دەربخرێت وەك کاڵایەك کە هیچ پەیوەندییەکی بە جیهانی ئافرەتانەوە نییە. خۆ ئەگەر نا ئەوا ڕیکلامی جل و بەرگی پیاوان و گوێزانی سەرتاشین بە ئافرەتانەوە دەکەن! بێگومان حاڵ و بارودۆخی وا تووشی ئافرەتان کراوە کە زۆر نزمی کردۆتەوە لە خۆ دەرخستن لە شوێنە دیاری کراوەکاندا، تا سەرنجی خەڵکی پێڕابکێشێت! ئەمە لەفەڕەنسادا ڕووی داوە! وڵاتی نوور و ڕووناکی و ئازادی!.

هەروەها لەژێر دروشمی ئازادیدا، بازاڕی تایبەتی کردۆتەوە و ناوی جۆرا و جۆریان لێ ناوە بۆ نمایش کردنی ئافرەتان و پێشبڕکێ کردن بۆ دیاری کردن و هەڵبژاردنی شاجوانی ئافرەتان، کە خۆیان بەشێوە بەرگی سەرنج ڕاکێش داپۆشیوە لەبەردەمی زۆرێك لە خەڵکدا تا جوانترین ئافرەت هەڵبژێرن بەپێی ئەو باس و مەرجانەی دانراون و پێوانەیان پێ دەکرێت، کە شەیتانی ئینسانەکان دایان ناون!

ئایا دەبێت چ ڕێزێك بۆ ئافرەت هەبێت لە خۆڕوتکردنەوەدا، تا برسی یەکان پەلاماری بدەن و بەزمانی تیژیان پیا هەڵبدەن و، نەفسی خۆیانی پێوە سەرقاڵ بکەن، پاشان هەوڵیان بەفیڕۆ بدەن.

ئەوەی جێگای ئەسەف و خەفەتە، بێگومان ئەو نەخشە و پیلان و بۆچوونە شەیتانیانە، هەندێك لە ئافرەتانی موسڵمانی هەڵخەڵەتاندووە، هۆکاری ئەوەیش نەزانی و نەشارەزایی خۆیانە لەدین، و دورکەوتنەوەیانە لە بوارەکانی فێربوون و ئادابەکانی، و سەرقاڵ بوونیان بە شارستانیەتی ڕۆژئاوای ماددی بێ نرخەوە.

ئەو حەق و ڕاستی یەی کە گومانی تێدا نییە بریتییە لە: بێگومان ئیسلام دادپەروەرانە مامەڵەی لەگەڵ ئافرەتدا کردووە و ئازادی پێویستی بۆ دیاری کردووە و ڕێزی لێگرتووە، ئەو کە کەسێکی ئازاد و ڕێزلێگیراو و داوێنپاکە لە سێبەری فەرمان و بوارەکانی فێرکاری و یاسا و دەستور و دادپەروەری ئیسلامدا –نزیکترین نموونە لەسەر ئەمە– ئەم چیرۆکەی بەردەستمانە – چیرۆکی خێزانی عیمران و مەریەمی کچی،

کە خوای گەورە چۆن ڕێزی لێ گرت بەوەی کە لە قورئاندا باسی کردوون و لە حاڵی ئەوان بەشێوەی ڕازی بوون دواوە.
بێگومان ئیسلام هەموو مافێکی بە ئافرەت بەخشیوە، و فەرمانی کردووە بەوەی کە بە جوانی مامەڵە لەگەڵیاندا بکرێت، ئافرەتان دایکن، لە هەمان کاتدا خوشکیشن، هەروەها کچە و هاوسەرە و خێزانە و نزیکە و دراوسێ یەو، هەروەها شتانی تر، ئێمەش داوای ئەوە دەکەین کە چاکە و بەزەیی و سۆز لەگەڵیاندا بنوێنرێت.
هەروەها پێویستە ئافرەتان فێری کار و باری دینەکەیان بکرێن، تا لەسەر بەرچاوڕونی بن لە کار و باری خۆیاندا و هەتا چەمکەکانیان لێ تێکەڵ نەبێت و لێیان تێك نەچێت، و پێوانەکانیان لێ نەگۆڕێت، جوان بە ناشرین ببینێت و ناشرین بە جوان. و چاکە بە خراپە ببینێت و خراپە بە چاکە.

## ڕونکردنەوەیەك بە بۆنەی ئایەتی: ﴿وَلَيْسَ الذَّكَرُ كَالْأُنثَىٰ﴾ دەربارەی یەکسانی لە نێوان پیاوان و ئافرەتاندا

پێشتر باسی ئەوەمان کرد کە ئەم بەشەی ئایەتەکە، یان ئەوەتا لە تەواوکەری قسەکانی خێزانی عیمرانە واتە ئەو کوڕەی کەمن داوام دەکرد و دەمویست، وەك ئەوە نەبوو کە خۆم بووم کە کچ بوو، چونکە کچ (مێینە) گونجاو نییە بۆ خزمەتکردنی ئەو ماڵەی کە پێویست بوو، کە کوڕ گونجاو بوو بۆ ئەو کارە، یان ئەوەتا ئەو بەشەی ئایەتەکە لە تەواوکەری قسەکەی خوای گەورەیە، واتە بە گەورە و گرنگ دانانی کار وباری ئەو لەدایك بووە، و ڕوونکردنەوەی پلەو پایەو شوێنی بەرزی بەپێی ئەوەی کە خێزانی عیمران لێکی دەدایەوە بۆی دەرچوو پێشبینی بۆ دەکرد، و ئەم دەستەواژەیەش ماناو لێکدانەوەی خۆی هەیە. لەگەڵ ئەوەی کە دەستەواژەکە کورتە، بەڵام مانا و حیکمەتی زۆر لە خۆ دەگرێت.
(شێخ سعید حوی) دەڵێت: (مێینە وەك نێرینە نییە، نە لە پێکهاتەی جەستەیدا نە لە پێکهاتەی نەفسیدا، ئینجا لەگەڵ ئەوەدا، دەبێت کارەکانیان لەیەك جیاواز بێت، و دەبێت لەسەر بنەمای ئەو جیاوازیانە کار و بەرپرسیارێتییەکانیان لە ماف و ئەرکەکانیاندا دیاری بکرێت و ڕێکبخرێت، هەر کەس بیەوێت بە شێوەی ڕەها یەکسانی

بکات لە نێوانیاندا، یا یەکەم جار لە پێکهاتەی جەستەیی و نەفسیاندا یەکسانیان بکات ئینجا مەبەستەکەی خۆی داوا بکات.).[٤٧٥]

بۆ ڕوونکردنەوەی زیاتر دەڵێین: بێگومان زانست ئەوەی چەسپاندبوو کە جیاوازی زۆر لە پێکهاتەی ئەندامی و نەفسی لە نێوان پیاوان و ئافرەتاندا هەیە، ئەوانە جیاوازی زۆرن و بواری کورتکردنەوەیان نییە، بەڵام ئێمە لێرەدا هەندێکیان باس دەکەین.

-مامۆستا (محمد عثمان الخشت) لە کتێبی (مِن إعجاز القران وليسَ الذَكَرُ كالأنثى دراسة في منظور الأسلام وَ علوم الحديث)دا دەڵێت: (...ڕاستییەکی ڕوون هەیە کە زانایانی پسپۆڕ پێی گەیشتون، کە مێینە جیاوازییەکی زۆری هەیە لە ڕەگەزی نێرینە لە هەموو خانەیەك لە خانەکانی جەستەیدا، و لە هەموو ئەندامەکانیشیدا، لە سەرو هەموو ئەمانەیشەوە، کۆئەندامی دەمار.).[٤٧٦]

-هەروەها دەڵێت: (بێگومان ملیۆنەها خانە هەن، ئەو ڕاستییە جیاکەرەوەمان بۆ ڕوون دەکەنەوە لە نێوان نێرینە و مێینەدا، لەوانە: خانەکانی خوێن. ..خانەکانی ئێسك،... خانەکانی پێست. ...خانەکانی موو، خانەکانی مۆخ. ... هەموو خانەیەك لە خانەکانی لاشە، و هەموو گەردێك لە گەردەکانی پێکهاتەی. ...و هەموو هۆڕمۆنەکان، هەموو ئەو پێکهاتە و ڕاستییە جەوهەریانەی پێمان دەڵێن: ﴿وليس الذكر كالأنثى﴾.[٤٧٧]

لەگەڵ ئەوەی کە لەشی ئینسان لە ملیۆنەها خانە پێکهاتووە، جیاوازییەکی زۆر لە نێوان ئافرەت و پیاواندا هەیە لە ڕووی عەقڵی و نەفسییەوە، ئافرەت زوو هەڵدەچێت، و زوو وەڵامی پاڵنەرەکان دەداتەوە، زوو کاری تێدەکرێت بە سۆز و عاتیفە، لەگەڵ زۆرێکی تر لەو شتانەی کە تایبەتمەندی ئافرەتن، کە دەشتوانێت ڕۆڵی پێویست و داواکراوی خۆی وەك هاوسەر و دایك لە ژیاندا ببینێت، ئەگەر خوای گەورە لە ئافرەتاندا سۆز و عاتیفە و نەرم و نیانی بەدی نەهێنایە، ئەوا بێگومان دایکان منداڵەکانی خۆیانیان بەجێدەهێشت و ڕوویان لێوەردەگێڕان و گوێیان بەپەروەردەکردنیان نەدەدا، (دایکایەتی بە هەموو ئەو سۆز و عاتیفە جوان وکارە بەرز و ئارامییە زۆر و هەوڵدانە بەردەوامەی کە تایبەتن، هەروەها ئەو وردەکاری و تێبینییانەی لە جێ بەجێ کردنی کارەکانیدا: بێگومان ئەوانە پێکهاتە و چۆنیەتی بواری نەفسی و دەماری و فیکری ئەون کە لەگەڵ بوارە

---

[٤٧٥] الأساس في تفسير ٢: ٢٦٢.

[٤٧٦] من إعجاز القرآن (وليس الذكر كا لأنثى) دراسة في منظور الأسلام والعلوم الحديثة، محمد عثمان الخشب ص٤٥ بە دەستکاری یەوە.

[٤٧٧] -هەمان سەرچاوەی پێشوو ل:٤٥ بەدەستکارییەوە.

جەستەییەکەیدا لەبار و گونجاون، و هەریەکەیان لەگەڵ ئەوی تریاندا گونجاو و لە بارە و تەواوکەری یەکترن....)[٤٧٨]

بێگومان ئەو کەسانەی بانگەشە و داوای ئەوە دەکەن کە یەکسانی تەواو لە نێوان پیاو و ئافرەتدا هەبێت لە هەموو ماف و ئەرکەکاندا، بەوە هەوڵ نادەن بۆ بەختەوەرکردن و حەواندنەوەی ئافرەتان، بەڵکو هەوڵی ماندوو بوونی دەدەن. بەوە هەوڵ نادەن بۆ سەقامگیرکردنی دادپەروەری بۆ ئافرەتان، بەڵکو ئەوانە زۆرترینی ئەو کەسانەن کە ستەمی زۆر لە ئافرەتان دەکەن، بێگومان ئەوان هەوڵ دەدەن کە ئامانجی کۆنی شەیتان جێ بەجێ بکەن، کە ئەو نەخشەدانەری گۆڕانکاری بوو لە دروستکراوەکانی خوای گەورەدا، و شۆڕشێکی دژانەی بەسەر فیترەتی پاکیدا کرد.

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِنَّ اللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَاءُ وَمَن يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَالًا بَعِيدًا(١١٦) إِن يَدْعُونَ مِن دُونِهِ إِلَّا إِنَاثًا وَإِن يَدْعُونَ إِلَّا شَيْطَانًا مَّرِيدًا(١١٧) لَّعَنَهُ اللَّهُ وَقَالَ لَأَتَّخِذَنَّ مِنْ عِبَادِكَ نَصِيبًا مَّفْرُوضًا(١١٨) وَلَأُضِلَّنَّهُمْ وَلَأُمَنِّيَنَّهُمْ وَلَآمُرَنَّهُمْ فَلَيُبَتِّكُنَّ آذَانَ الْأَنْعَامِ وَلَآمُرَنَّهُمْ فَلَيُغَيِّرُنَّ خَلْقَ اللَّهِ وَمَن يَتَّخِذِ الشَّيْطَانَ وَلِيًّا مِّن دُونِ اللَّهِ فَقَدْ خَسِرَ خُسْرَانًا مُّبِينًا(١١٩) يَعِدُهُمْ وَيُمَنِّيهِمْ وَمَا يَعِدُهُمُ الشَّيْطَانُ إِلَّا غُرُورًا﴾(النسا ١١٦-١٢٠).

واتە: (بەڕاستی خوا خۆشنابێت لەوە، هاوەڵ و شەریکی بۆ بڕیار بدرێت وجگە لەو (هاوبەش دانانە)لە گوناهانی تر بۆ هەرکەس بیەوێتو شایستە بێتو پەشیمان بێت خۆش دەبێت، جا ئەوەی شەریکو هاوەڵ بۆخوا بڕیار بدات، ئەوە بەڕاستی گومڕا بووە بە گومڕایی یەکی زۆر دوور، (ئەو هەواڵگەرانە)ئەوەی هانا و هاواری بۆ دەبەن و دەیپەرستن، جگە لەخوا چەند پەرستراوێکی کارتێکراون(پەرستراو دەبێت کارتێکەر بێت، نەك كارتێکراو، بۆیە بتەکانیان بە مێینە ناوناوە وەك:لاتو عوززا)تەنها هانا و هاواریشیان هەر بۆ شەیتانی سەرکەش و یاخییە کە لە هەموو خەیرێك داماڵراوە. ئەو شەیتانەی کە خوا نەفرینی لێ کردووە وتوویەتی: سوێند بێت بە تۆ ئەی خوا، بەشێکی دیاریکراو لە بەندەکانت دائەبڕم لە ئیمانو خواناسی، سوێندبێت بەتۆ گومڕایان دەکەمو بەئاواتو خەیاڵی پووچەوە سەرگەرمیان دەکەم، خۆم فەرمانیان پێ دەدەمو هانیان دەدەمو ئینجا ئەوانیش بێگومان گوێی ئاژەڵەکانیان دەبڕن، هەروەها فەرمانیان

---

[٤٧٨] -شبهات حول الأسلام محمد قطب ص:١١٦-١١٧بە دەستکاری یەوە.

پێ دەدەم ئەوانیش دروستکراوانی خوا دەستکاری بکەن‌و بێگومان(لەم سەردەمەدا ئەڵقە لەگوێکانی بەناو زانا دەستکاری جینات‌و سیفاتی ڕەچەڵەکی دەکەن و بەگوێی شەیتان دەکەن، ئادەمیزاد و زیندووان تێکدەدەن، جگە لە هەندێکیان نەبێت کە مەبەستیان خزمەتی ئادەمیزادە) جا ئەوەی لەجیاتی خوا شەیتان بکاتە پشتیوانی خۆی، ئەوە بەڕاستی دووچاری زیان و خەسارەت مەندیەکی ئاشکرابووە، (شەیتان) بەڵێنیان دەداتێ، ئاوات‌و ئارەزودەڕازێنێتەوە بۆیان،دیارە کەشەیتانیش هیچ بەڵێنێکیان پێ نادات جگە لە فریودان‌و خەڵەتاندن نەبێت).

بێگومان پاداشتی گۆڕانکاری لە دروستکراوەکانی خوای گەورەدا و تێکدانی فیترەتیان، خەسارەتمەندیەکی ئاشکرایە، و ئەو بەڵێنانەی کە شەیتانەکانی ئینسان ڕەواجیان پێدەدات و دەیانکاتە دروشم و بەرزیان دەکاتەوە، ئەوانە تەنها بەڵێن و وەعدی درۆزن و دروشمی بریقەدارو فیلاوین.

– بانگەشەکردن بۆ یەکسان بوونی تەواو لە نێوان پیاوو ئافرەتدا، ئەوە بانگەوازێکی بێ نرخ و بەتاڵە بۆ یەکسان کردنێکی داواکراو و تەکلیف کراو، شتانێك دەدات بەسەر ئافرەتدا کە لە توانایدا نییە، ئینجا ئافرەت بەو کارە قورس و گرانە  نموونەی ئەو گیاندارەی لێ دێت کە بارێکی قورسی بەشانەوەیە  نە ئەوەتا بتوانێت پشتی خۆی ڕابگرێت و نە ئەوەتا بتوانێت هەنگاو بنێت و ئەرکەکەی سەرشانی بەجێ بگەیەنێت.

بێگومان بزوتنەوەکانی ڕزگاری خوازی ئافرەتان و هەوڵ دان بۆ یەکسانی کردنیان لەنێوان ئافرەت وپیاواندا، ئەوانە کۆمەڵە بزوتنەوەیەکی گوماناوی و دروستکراون و پەیوەندیدارن بە داگیرکەران و ئیستیعمارەوە، کە ڕقیان لەدڵدایە، کە هەوڵ دەدەن بۆ دورخستنەوەی موسڵمانان لە ئادابە جوانەکانی خۆیان، بەڵگەیش لەسەر ئەمە، بێگومان یەکەمین دیاردە لە دیاردەکانی بزوتنەوەی ڕزگاری خوازی ئافرەتانە لەمیسر، ئەوانە یەکەم کەس بوون کە دەستپێشکەربوون بۆ هاوەڵەکانی خۆیان  یەکەم بانگەوازیش کە کردیان بریتی بوو لە بانگەوازیان بۆ ئافرەتان کەئازادی تەواو بن و لە پاکی و ڕێز و گەورەیی خۆیان دەری بکەن، و تاجی پاکی و پاك داوێنی و هەیبەت و ڕێز لەبەریان بکەنەوە، و بەرگی شەرعی یان لەبەردابماڵن.

– مێژوو دیمەنێکی خەفەتاویمان بۆ دەگێڕێتەوە، و وێنەی –شانۆگەرییەکی گاڵتەجاڕیمان بۆ دەکێشێت لەساڵی (١٩١٩)دا، شۆڕشی میسری هەڵگیرسا و شەقامەکانی پڕکرد لە خۆپیشاندەران و لەدژی ئینگلیز دروشمیان دەکێشاو داوایان

دەکرد زوو دەربکرێن و بە زویی بکوژرێن، ئینجا ئینگلیزەکان بە شێوەیەکی هەڕەمەکی و عەشوائی ئاگریان لەو شەقام و ناوچانەدا کردەوە کە خەڵکی تیا کۆبووبوویەوە، و کوژراوو برینداری زۆری لێکەوتەوە، لە ناوەندی ئەو خۆپیشاندانەدا لەسەرشەقام، شانۆگەرییەکی گاڵتەجاڕی گێڕدرا، کە چەند ئافرەتێك نمایشیان دەکرد، لەسەرو هەمووشیانەوە (صفية الزغلول)بوو، کە ئافرەتان لەبەردەم شوێنێکی کۆشکەکانی نیلدا کۆدەکرانەوە- کە میدان التحرير- بوو، و دروشم و هوتافیان لەدژی ئینگلیز دەکێشا، پاشان بەهەمان نەخشەی پێشوو و بەبێ پێشەکیەکی دیار، حیجاب و بەرگەکانیان لەبەرخۆیان دادەماڵی و دەیانخستە سەر زەوی و ئاگریان تێ بەردەدا.![٤٧٩]

بەڵام چ پەیوەندییەك لەنێوان ئەم ڕووداوەو داگیرکاریدا هەیە، ئایا دەبێت ئەم کارە بۆ ڕازیکردنی ئینگلیزەکان بووبێت یان لە ڕقی ئەواندا بووە، ئایا دەبێت ئینگلیز حیجابی بەسەر ئەواندا فەرز کردبێت یان حیجابەکە خۆی هۆی دواکەوتنی موسڵمانان بووبێت؟ و کەوتبێتە ناو داو و تەڵەی داگیرکەر و بووبێتنە نێچیر؟ یان ئەو خۆ ڕوتکردنەوە و لادان لە شەرعە چارەسەرە و ڕێگایە بۆ ئازادی و ڕزگاری؟ دەڵێین: بێگومان خۆ ڕوتکردنەوە و بێ بەرگی ئافرەتان، پەڕپوت کردن و خراپە بەکارهێنانە بۆ ئافرەتان و ڕێز و پلە و پایەی لەکەدار دەکات. ئێمەیش هەموو موسڵمانێکی بەغیرەت و چاونەترس پێویستە بپرسین: بزوتنەوە ڕزگاری خوازەکانی ئافرەتان و یەکسان کردنیان لەگەڵ پیاواندا لە کوێن؟ ڕێکخراوەکانی ئافرەتان لە کوێن؟ ئەوان لە کوێن لە کۆسۆڤۆ ئافرەتانی موسڵمان تووشی ناڕەحەتی هاتوون، هەروەها لە بۆسنە و هەرسك و غەزەو فلسطين و کشمیر و شوێنانی تر کوا و چی لێ هات ڕێزی ئافرەتان، کوا ئازادییەکەیان، بەڵکو کوا سادەترین مافی ئادەمی بونیان، دەی با ئەو کەسانەی کە بانگەشەی ئازادی ئافرەتان دەکەن، وەڵاممان بدەنەوە و، ئەو کەسانەی پشتیوانی شارستانیەتی ڕۆژئاوا دەکەن و پارێزەری عیلمانین هەواڵمان بدەنێ و ئاگادارمان بکەن؟ لە وولاتی ئەمەریکا ئەگەر کەسێك شەقێك لە سەگێك هەڵبدات یان سجنی بکات، ئەوا هەزاران کەس دەردەپەڕن، بۆ پارێزگاری کردن، لەو سەگەو داکۆکی لەسەر ئازادی دەکەن، ئەی کوان خەم خۆران بۆ پارێزگاری لە ئافرەتاتنی کۆسۆڤۆ؟ کوا خەم خۆران و پارێزەران بۆ ئەو کچانەی کە لە ڕۆژی ڕووناك و لەبەرچاوی کەس و کاریان دەفڕێنرێن! کوا خەمخۆران و داکۆکی کاران لەو کۆرپانەی سزا دەدرێن و لەباردەبرێن!! کوا

---

[٤٧٩] -كتاب واقعنا المعاصر للأستاذ محمد قطب ص:٢٥٨.

خەمخۆران بۆ ئەو ئافرەتە پیرانەی کە دەردەکرێن و دەچەوسێنرێنەوە؟! ئایا ئافرەتان لە غەیری ئیسلامدا مافی یەکسان بوونیان دەست کەوتووە؟ مێژوو بۆمان دەگێڕێتەوە کە ئافرەت تووشی ماندووبوون و نارەحەتی و هیلاك بوون هاتووە، تەنانەت لە کۆمەڵگا پێشکەوتووەکان و وڵاتانی خاوەن شارستانیدا، بڕیاری مردنی بەسەردا دەدرێت ئەگەر سەرپێچی فەرمانی مێردەکەی بکات، یان زیاد لە پێویست لە ماڵەکەی خەرج بکات، لە هەندێك وڵاتدا بە ڕۆحی شەڕانی دایدەنێن و بەدروستکراوێکی بێ عەقڵی دادەنێن، وای لێك دەدەنەوە کە مافی نییە لە ژیانی دواییدا واتە زیندو ناکرێتەوە وەك ئەو کەسانەی کە خوا زیندویان دەکاتەوە، بەڵکو بەمردن ژیانی کۆتایی پێ دێت. [٤٨٠]

بەڵام ئیسلام هات کە یەکسانی لە نێوان ژن و پیاودا بڕیار بدات لە بیر و باوەڕ و ژیان ومەسەلەکانی گەڕانەوە بۆ قیامەت. بەڵام لە (المبدا) بیروباوەڕدا: بەڕاستی خوای گەورە ڕای گەیاند کە هەموو خەڵکی لە یەك بنەما و ئەسڵ بەدیهاتوون و دروستکراون، هیچ کەس ڕێزی بەسەر کەسی تردا زیاتر نییە، تەنها بە تەقوا و لە خواترسان نەبێت.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَىٰ وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ﴾(الحجرات:١٣).

واتە: (ئەی خەڵکینە بێگومان ئێمە هەموتانمان لە نێر و مێیەك دروستکردوە (کە باوکە ئادەم و دایکە حەوایە)کردومانن بەچەندەها گەل و تیرە و هۆزی جۆر بەجۆ، تا یەکتر بناسن و پەیوەندیتان خۆش بێت بەیەکەوە... بەڕاستی بەڕێزترینتان لای خوا ئەو کەسانەتانە کە زۆرتر لە خوا ترسە و فەرمانبەرداری خوایە، بێگومان خوا گەورە و زاناو ئاگایە بەهەمووان).

ئیسلام هات تا دەمارگیری هۆز و عەشیرەت ڕەتکاتەوە و جیاوازی چینایەتی نەهێڵێت و هەموو جیاوازییەکان بتوێنێتەوە و هەموو ئینسانەکان لەیەك ڕیزدا ڕێك بخاتەوە، و بیانخاتە ژێر یەك ئال ئ‌و بەیداخەوە و ئاراستەیان ڕووبکاتە یەك قیبلە، و فەرمانیان پێ بکات بە پەرستنی یەك خوا کە (الله) یەو هاوبەشی نییە.

-ئافرەت لە هەڵگرتنی بەرپرسیارێتیدا وەك پیاوە، با بەرپرسیارێتییەکەش بە نیسبەت سروشتی پیاو و ئافرەتەوە جیاواز بێت. ...بەڵام زۆرێك لە بەرپرسیارێتی هاوبەش لە نێوانیاندا هەیە، ئافرەت بەرپرسە لە نەفسی خۆی هەروەها لە ماڵەکەیشی، لە

---

[٤٨٠] -المجتمع الأسلامي كما تنظمة سورة النساء ص:٢٥ الشيخ محمد المدني.

فەرموودەیەکی پیرۆزدا هاتووە: (هەموتان) شوان و چاودێرن، و هەموویشتان بەرپرسن لەوەی کە سەرپەرشتی دەکەن، پیاو شوان و بەرپرسە لە ماڵەکەی خۆی، هەروەها بەرپرسە لەوەشی کە چاودێری دەکات، و ئافرەت بەرپرسە لەماڵی مێردەکەی و بەرپرسیشە لەوەی کە چاودێری دەکات، و خزمەتکار بەرپرسە لەماڵی گەورەکەی و، بەرپرسیشە لەوەی کە چاودێری دەکات، و هەموتان شوان و بەرپرسن، و هەموتان بەرپرسیان لەوەی کە چاودێری دەکەن.[٤٨١]

بێگومان بەرپرسیارێتی گشتی هەیە و بەرپرسیارێتی تایبەتیش هەیە. بەرپرسیارێتی تاك هەیە و بەرپرسیارێتی کۆمەڵیش هەیە.

کردەوە چاکەکان و پاداشت لەسەریان، فەرمانێکی هاوبەشە لەنێوان پیاو و ئافرەتدا، لەگەڵ ئەوەدا ئیسلام لە ئافرەتان خۆشبووە و بورارە کە بەشداری لە کاری جەنگاندن و سەربازیدا بکەن، کە ئەمانە کارانێکی قورسن و لەگەڵ سروشتی ئەواندا ناگونجێت، بەڵکو بۆ ئەوان شوێنی تر هەیە کە گونجاوە بۆ کارکردنیان کە پاداشت و خەیریان تیا دەست بکەوێت بە ئەندازەی پاداشتی تێکۆشەران لە ڕێگەی خوادا. ..

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَالْمُؤْمِنُونَ وَالْمُؤْمِنَاتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ يَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَيُقِيمُونَ الصَّلَاةَ وَيُؤْتُونَ الزَّكَاةَ وَيُطِيعُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ أُولَٰئِكَ سَيَرْحَمُهُمُ اللَّهُ إِنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾(التوبە:٧١).

واتە: (باوەڕداران لە پیاوان و لە ئافرەتان هەندێکیان خۆشەویست و پشتگیر و هاوکاری یەکترن (کە ئەمەیش سیفەتیانە): فەرمان بە چاکە دەدەن و قەدەغە لە خراپە دەکەن و نوێژەکانیان بە چاکی ئەنجام دەدەن و زەکاتی ماڵیشیان دەبەخشن و گوێڕایەڵی و فەرمانداری خوا و پێغەمبەرەکەی دەکەن، ئا ئەوانە خوا لە ئایندەدا ڕەحمییان پێ دەکات و سۆزی دەبێت بۆیان، بەڕاستی خوا باڵادەست ودانایە).

لەئایەتێکی تردا – کە ئەمە واتاکەیەتی – دەفەرموێت (ئەوەی کار و کردەوەی چاکەی کردبێت، پیاو بێت یان ئافرەت، لە کاتێکدا بڕوادار بێت، سوێند بەخوا بەژیانێکی کامەران و ئاسودە لە دنیادا دەیژێنین، لە قیامەتیشدا پاداشتیان بە جوانتر دەدەینەوە لەوەی کە ئەوان دەیانکرد) (النحل:٩٧).

---

[٤٨١] -پێشتر ڕیوایەت کراوە.

هەروەها لە ئایەتێکی تردا – کەئەمە واتاکەیەتی– دەفەرمووێت: (کاتێك باوەڕداران بەم شێوەیە نزایان کرد، کە پەروەردگاری ئازیزیان فێریان دەکات) بێگومان ئەو زاتە دوعاکانیان لێوەردەگرێت، بە هاناو هاواریانەوە دەچێت، بۆیە دەفەرمووێت: بەڕاستی من هەوڵ و کۆشش و کار و کردەوەی هیچ کام لە ئێوە بەزایە نادەم، چ نێرینە و پیاوتان، چ مێینە و ئافرەتتان، چونکە هاوکاری یەکتر بوون (لەچاکەو چاکەکاریدا)(ال عمران:١٩٥).

لە سوورەتی (الأحزاب)دا، –کە ئەمە ماناکەیەتی– دەفەرمووێت: (بەڕاستی پیاوان و ئافرەتانی موسڵمان، پیاوان و ئافرەتانی باوەڕدار،پیاوان و ئافرەتانی ملکەچ و فەرمانبەردار،پیاوان و ئافرەتانی ڕاستگۆ، پیاوان و ئافرەتانی خۆگر، پیاوان و ئافرەتانی لەخوا ترس، پیاوان و ئافرەتانی بەخشندەو، پیاوان و ئافرەتانی ڕۆژوەوان، پیاوان و ئافرەتانی داوێن پاك و ئەو پیاو ئافرەتانی کە زۆر یادی خوا دەکەن، بەخشین و لێبوردەیی و پاداشتی زۆر مەزن و بێسنوریان لەلایەن خوای گەورەوە بۆ ئامادەکراوە (هەرکە دنیایان جێ هێشت پێی شاد دەبن.) (الأحزاب:٣٥).

## وەفدی ئافرەتان

(البزار) لە (مسند)ەکەیدا، لە (إبن عباس)ەوە گێڕاویەتیەوە: کە (اسما ءکچی یزید الأنصاری) (خوا لێی ڕازی بێت) هات بۆ لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەو کاتەدا لەناو هاوەڵەکانیدا بوو، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ): من نوێنەری ئافرەتانم لای تۆ، بێگومان خوای گەورە تۆی بە حەق و ڕاستی ناردووە بۆ لای پیاوان و ئافرەتان، ئێمەیش باوەڕمان پێ هێناویت و شوێنت کەوتووین، بێگومان ئێمەی دەستە و گرۆی ئافرەتان، کە گەمارۆدراوی جێنشین کراوی ماڵەکانی ئێوەین و بەسك منداڵەکانتانمان هەڵگرتووە، و ئێوە دەستە و گرۆی پیاوان ڕێزدارکراون بەسەر ئێمەدا، بە کۆبوونەوە و نوێژی جەماعەت و سەردانی نەخۆش و شوێنکەوتنی تەرم بۆ سەرقەبران، و لەمانیش گەورەتر و ڕێزدارتر جیهاد و تێکۆشان لە ڕێگەی خوادا دەکەن، ئەگەر پیاو چوویە دەر بۆ جەنگ و جیهاد یان حەج یان عەمرە، ئەوا ئێمەین ماڵ و سامانەکەی ئێوەمان پاراستووە و جل و بەرگمان بۆ ئێوە چنیوە، و منداڵەکانمان بۆ پەروەردەکردن، ئیتر بۆ لەو خەیر و پاداشتانەدا بەشدار و هاوبەش نەبین لەگەڵ ئێوەدا ئەی پێغەمبەری خوا

(ﷺ)؟. ئینجا پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەرووی پیرۆزی ئاوڕی دایەوە بەلای هاوەڵە بەڕێزەکانیدا، پاشان فەرمووی: ئایا ئێوە قسە و وتەیەکتان باشتر و جوانتر لە قسەی ئەم ئافرەتە بیستووە لە کار وباری دینەکەیدا؟ ئینجا ئەوان وتیان: تا ئێستا نەمانزانیوە و گومانمان نەبردووە کە ئافرەتێك ڕێنمایی کرابێت بۆ ئەم جۆرە دەربڕینە؟ ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) ئاوڕی دایەوە بەلای ئافرەتەکەدا پاشان فەرمووی: (ئەی ئافرەتەکە ئیتر لای من جێ بهێڵەو بچۆ ئافرەتانی دوای خۆت فێربکە و پێیان ڕابگەیەنە کە بە چاکە مامەڵەکردنی خێزان لەگەڵ مێردەکەیدا و گوێڕایەڵی کردن و داوای ڕەزامەندی خوا بکات، ئەوا بەرامبەر دەبێت لەگەڵ ئەو کاروکردەوانەدا.).[٤٨٢]

لەم فەرموودەیەوە بۆمان ڕوون دەبێتەوە: بێگومان ئافرەتان لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) نەگەڕاون بەدوای یەکسان بوون یان ئازادی بێ نرخ، بەڵکو ئەوان هەوڵ و کۆششیان کردووە بۆ ڕەزامەندی خوا، تا پاداشتیان لەو دەست بکەوێت لە ڕۆژی قیامەتدا.

(أم سلمة) (خوا لێی ڕازی بێت) پرسیار دەکات لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) و پێی دەڵێت: (ئەی پێغەمبەری خوا، بۆچی باسی ئێمە لە قورئان ناکرێت وەك باسی پیاوان دەکرێت؟ ئینجا ئەم ئایەتە پیرۆزەی خوا دابەزی: ﴿فَاسْتَجَابَ لَهُمْ رَبُّهُمْ أَنِّي لَا أُضِيعُ عَمَلَ عَامِلٍ مِّنكُم مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ بَعْضُكُم مِّن بَعْضٍ﴾. (ال عمران:١٩٥). (پێشترمانا کراوە).

لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە:ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) نەم بیستووە کە خوای گەورە لە کۆچدا بە شتێك باسی ئافرەتانی کردبێت خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند.[٤٨٣]

﴿وَلَا تَتَمَنَّوْا مَا فَضَّلَ اللَّهُ بِهِ بَعْضَكُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ لِّلرِّجَالِ نَصِيبٌ مِّمَّا اكْتَسَبُوا وَلِلنِّسَاءِ نَصِيبٌ مِّمَّا اكْتَسَبْنَ وَاسْأَلُوا اللَّهَ مِن فَضْلِهِ إِنَّ اللَّهَ كَانَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمًا﴾(النسا ٣٢).

واتە: (ئاواتخوازی شتێك مەکەن کە خوا بەخشیویەتی بە هەندێکتان و (نەیبەخشیووە بە هەندێکتان، چونکە خوا دادپەروەرە و یاساکان لە ڕووی زانست و حیکمەتەوەیە، کاتێك هەندێك مافی داوە بە پیاوان، لە هەندێك ڕووی تریشەوە مافی داوە بە ئافرەتان...هتد). پیاوان بەشێکیان هەیە لەوەی کە بە دەستیان هێناوە، هەروەها

[٤٨٢] -رواه بزاز في مسنده و قال. لانعلمه يروى عن النبي (ﷺ) إلاّ من هذا الوجه، كشف الأستار حديث ١٤٤٧.

[٤٨٣] أسباب النزول للواحدي ص:١٠٠.

ئافرەتانیش بەشێکیان هەیە لەوەی کە بە دەستیان هێناوە، هەمیشە و بەردەوامیش داوای زیادە بەخشش و بەهرەی خوا بکەن، چونکە بەڕاستی خوا بە هەموو شتێك زانایە.).

بێگومان ئەو کەسەی بانگەشەی یەکسانی تەواو لە نێوان پیاوان و ئافرەتان دەکات، ئەوا بێگومان نەشارەزایە لە سروشتی هەردو لایان، و بێئاگایە لە سوننەتەکانی خوای گەورە لە بوونەوەردا، ئافرەت و پیاو با ئەگەر لە چەند شتێکیشدا یەکسان بن، بێگومان لە زۆر شتی تردا لەیەك جیاوازن، لەگەڵ ئەوەیشدا، هیچیان بە بێ پێویست بوونی ئەوی تریان نابێت، نموونەی پیاو و ئافرەت، وەك نموونەی شەو و ڕۆژ وایە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَاللَّيْلِ إِذَا يَغْشَى (١) وَالنَّهَارِ إِذَا تَجَلَّى(٢) وَمَا خَلَقَ الذَّكَرَ وَالْأُنْثَى(٣) إِنَّ سَعْيَكُمْ لَشَتَّى﴾(الليل:١-٤).

واتە: (سوێند بە شەو کاتێك دنیا دادەگرێت...، بەڕۆژ کاتێك دنیا ڕووناك دەبێت و تاریکی دەڕەوێنێتەوە، سوێند بەو زاتەی کە نێرو مێی دروست کردووە، بەڕاستی هەوڵ و کۆششی ئێوە جۆراو جۆرە،(هەتانە هەوڵ و کۆششی بۆ بەدەستهێنانی بەهەشتە، هەتانە بە پێچەوانەوە بە دەست و بردە بۆ ئەنجامدانی تاوان و خراپەکاری، هەتانە گوێڕایەڵ و هەتانە یاخی...هتد).

وەك ئەوەی کە شەو کار و گرنگی خۆیی هەیە، هەر بەو جۆرە نێرینەش ڕۆژ کار و گرنگی خۆی هەیە و مێینەیش کار و گرنگی خۆی هەیە، هەریەکەیان دەوری گرنگی خۆیان لە ژیاندا دەبینن. وەك ئەوەی کە شەو و ڕۆژ بێ پێویست نین و دەبێت هەبن، هەر بەو جۆرەیش پیاو و ئافرەت پێویستی یەکترن و هەردووکیان دوو دروستکراوی تەواوکار و پێویستی یەکترن.

لەم ئایەتە پیرۆزەی خوا ووردبەرەوە کە دەفەرموێت: ﴿وَهُوَ الَّذِي مَرَجَ الْبَحْرَيْنِ هَذَا عَذْبٌ فُرَاتٌ وَهَذَا مِلْحٌ أُجَاجٌ وَجَعَلَ بَيْنَهُمَا بَرْزَخًا وَحِجْرًا مَحْجُورًا﴾.(الفرقان:٥٣).

ئەم ئایەتەیش: ﴿مَرَجَ الْبَحْرَيْنِ يَلْتَقِيَانِ(١٩) بَيْنَهُمَا بَرْزَخٌ لَا يَبْغِيَانِ﴾(الرحمن: ١٩-٢٠).

دکتۆر (محمود محمد عمارة) دەربارەی ئەم ئایەتە دەڵێت: (بێگومان خەڵکی لەبەردەم دوو دەریادا ڕادەگرێت و دادەنێت کە بەیەك بگەن، و تینوێتی دەڕەوێنێتەوە، بەڵام ئەوی تریان ئاوێکی سوێرە بە کەڵکی خواردنەوەی ئینسان نایەت، سەرەڕای ئەوەی کە ئەم

دوو دەریایە بەیەك دەگەن و دەچنە ناو یەك لە بەرچاوی خەڵکی، بەڵام تێکەڵ بەیەکتری نابن، لەبەرئەوەی بە قودرەتی خوای گەورە بەربەستێك لە نێوانیاندا هەیە، هەریەکە لە ئاوەکان تایبەتمەندی خۆیان دەپارێزن و وەك خۆیان دەمێننەوە، بێگومان ئەوان یەکسان نابن، لەگەڵ ئەوەشدا ناکۆکیان نابێت و لێکچون لە نێوانیاندا هەیە و دەیانکاتە سەرچاوەیەك بۆ سامانی خۆراکی کانزایی، هەروەها بنەمایەك بۆ چالاکی بازرگانی لەبار، لەکاتێکدا ماددەی هەردوو دەریاکە لەیەك جیاوازبن و لەگەڵ ئەمەشدا لێکچونەکە لەدەست بدەن، هەر بەیەکەوە کاردەکەن، سەرەڕای ئەو جیاوازییەی کە لە سروشتدا هەیە. ئەوا کار و فەرمانەکە هەربەو شێوەیە نابێت بە نیسبەت نێرینە و مێینەوە، چونکە ماددە و بنەما سەرەکییەکەیان بریتییە لە ئاو (مەنی) و هەریەکەیان ڕۆڵ و دەوری خۆی هەیە لە ژیاندا و تەواوکەری ئەوی تریانە[٤٨٤].

## (القوامة) قەوامە: ئایا ستەمە لە ئافرەت؟

مەسەلەی (القوامة) سەرپەرشتیاری بەسەر ئافرەتانەوە، لەو مەسەلانەی کە دوژمنانی ئیسلام دەیکەنە بەڵگە و وەك چەکی دەستیان و وتەی دەمیان تانە و تەشەری پێ لێ دەدەن لە شەریعەتی خوا. کە بە _ درۆ و بەهتان _ وای لێك دەدەنەوە، کە بێگومان (القوامة) سەرپەرشتیاری بەسەر ئافرەتانەوە، ستەمە لە ئافرەتان و سوکایەتی کردنە بە کەرامەتیان و کەم کردنەوەی مافەکانیانە.پاشتر منافسەی ئەو باس و بانگەشانە دەکەین، کە ستەمکاران و شوێنکەوتوانی بە ناحەقی بانگەشەی بۆ دەکەن، دەڵێت: (القوامة) کاری سەرپەرشتیاری بەسەر ئافرەتانەوە، بڕیارێکی شەریعەتی ئیسلامی حەکیمە، بەڵگەیە لەسەر دادپەروەری ئیسلام و حەکیمی و چاودێری کردنی سروشتی نەفسی بەشەری و چاککردنی بەرنامەکەی و گونجاندنی بۆ هەموو کات و سەردەم و لەگەڵ هەموو جیل و نەوەکاندا لە هەموو حاڵەتەکاندا.

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿الرِّجَالُ قَوَّامُونَ عَلَى النِّسَاءِ بِمَا فَضَّلَ اللَّهُ بَعْضَهُمْ عَلَى بَعْضٍ وَبِمَا أَنْفَقُوا مِنْ أَمْوَالِهِمْ﴾(النساء:٣٤).

---

[٤٨٤] – صفحات من تاريخ المرأة المسلمة ص:٤٩تأليف:محمود محمد.

واتە: (پیاوان سەرپەرشتیارن بەسەر هاوسەرەکانیانەوە، ئەمەیش بەهۆی ڕێز و زیادە ئەرکێکەوە کە خوا داویەتی بە هەندێك بەسەر هەندێکی تردا (سەرەڕای ئەوەی کە) پیاوان لە ماڵ و سامانیان خەرج دەکەن(لە پێناو ئاسودەیی و خۆشگوزەرانی ئافرەتاندا). ئەسڵ و بنەمای (القوامة)یش بۆ شتێك بریتی یە لە: چاودێری کردن و پاراستنی لەوانەیش دوو شتن: (قیم المرأة)، خاوەنی (اللسان العرب) دەڵێت: - واتە: مێردەکەی چونکە هەڵدەستێت بە کار و بارەکانی، و ئەوەی کە ئەو پێویستێتی) و (قام الرجل علی المرأة) واتە: خواردن و ئازوخەی بۆ پەیدا و دابین دەکات، چونکە بێگومان پیاوەکە سەرپەرشتیاری هاوسەرەکەیەتی و گرنگی پێ دەدات و بەرپرسە لە کار و بارەکانی.[485] بەم جۆرە کاری (قوامة) کە، وەك ئەوەیە کە ئایەتەکە ڕوونی دەکاتەوە بە دوو فەرمان:فەرمانی یەکەم: - شتێکی فیتری خوا کردە: ﴿بِمَا فَضَّلَ اللَّهُ بَعْضَهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ﴾.

واتە: بەوەی کە خوای گەورە هەندێك ڕێز و فەزڵی داوە بە پیاوان بەسەر ئافرەتاندا، بەوەی کە ئاسۆیان فراوانە و بیریان تیژ و کاریگەرتر و تواناکیان بەهێزترە لەسەر نەخشەدانان و بەرەنگاری ناڕەحەتیەکان دەبنەوە و دەتوانن کێشە و گرفتەکان یەکلایی بکەنەوە کە تووشی کیانی خێزانەکان دێت.

فەرمانی دووەم: فەرمانی (کسبي) کاسبی و پیشەیی و پەیداکاری. کە ئەمە بەرپرسیارێتی پیاوانە بۆ هاوسەر و خێزانی و چاودێری و سەرپەرشتیان و نەفەقە کێشانیان و ئاراستەکردنیان، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ وَبِمَا أَنفَقُوا مِنْ أَمْوَالِهِمْ﴾.

لێرەدا سەرپەرشتیاری پیاوان بەسەر خێزانەکانیاندا یان سەرۆك و گەورەیان، هیچ شتێك لە ڕێزو کاری ئافرەتان کەم ناکاتەوە و ئەوە ناگەیەنێت کە (مسخر) ڕام کرابێتن بۆ پیاوان و پیاوان زاڵ بن بەسەریاندا، بەڵکو بەر پەرسیارێتی و ئیلتیزام و تەکلیفە.

وەك ئەوەی کە پیاوان بەرپرسیارێتیان هەیە و ئافرەتیش بەرپرسیارێتی خۆیان هەیە و هەمە جۆرن و کاری بەرپرسیارێتی پیاوان کەم ناکەنەوە، بەڵکو هاوسەنگ و بەرامبەری دەکات لە ئەجر و پاداشتدا ئەگەر بەچاکی پێی هەستا خۆ ئەگەر پیاوان سەرپەرشتیاری ئافرەتان نەبوونایە، ئەوا ئاراستەکەریان دەبوون، بەڕاستی ئیسلام فەرمانی کردووە بەچاکە تێکەڵ بوونیان و نەرم و نیان مامەڵە کردنیان.

---

[485] لسان العرب لأبن منظور مادة:ق و م.

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَعَاشِرُوهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ فَإِن كَرِهْتُمُوهُنَّ فَعَسَى أَن تَكْرَهُوا شَيْئًا وَيَجْعَلَ اللَّهُ فِيهِ خَيْرًا كَثِيرًا﴾(النسا ء١٩).

واتە: (هاوژینی جوان لەگەڵ ئافرەتاندا بەرنەسەر، خۆ ئەگەر خۆشتان نەویستن و لێیان بێزاربوون، ئەوە دوور نییە و دەشێت حەزتان لەشتێك نەبێت و خوابیکات بەمایەی خێرو بێری زۆرو بێ سنور.).

ئەوە پێغەمبەری خوا بوو (ﷺ) کە نمونەکەی بەرز و باڵا و پێشەنگێکی جوان و پێشەوایەکی چاك بوو، سنگی لە هەموو کەس کراوە و فراوانتربوو، و خورەوشتی جوان و گوێڕایەڵ بوو، و ڕاستگۆو وتە جوان بوو، و بەوەفابوو، و بەبەزەییترین کەس بوو بۆ ئافرەتان و منداڵان، و گاڵتەو گەمەو یاری لەگەڵ خێزانەکانیدا دەکرد و و زۆر نەرم و نیان و لەسەرخۆ بوو لەگەڵیاندا.

هەروەها لە ئامۆژگاری یەکانی پێغەمبەر (ﷺ) دەربارەی ئافرەتان: فەرموویەتی: (... لە خوا بترسن بەرامبەر ئافرەتان، چونکە ئەوان سپاردەی خوان لەلای ئێوە، بە ووشەی خوا حەلاڵتان کردوون، مافی ئێوە لەسەر ئەوان ئەوەیە، کەسێك نەهێننەماڵتان کە پێتان ناخۆش بێت، ئەگەر ئەمەیان کرد ئەوە بە لێدانێکی سووك تەمێیان بکەن، مافی ئەوانیش لەسەر ئێوە ئەوەیە کە ڕۆزی و پۆشاکیان دادپەروەرانە بۆ دابین بکەن، بێگومان من شتێکم لەناو ئێوەدا بەجێهێشتووە، ئەگەر پابەندی بن، هەرگیز گومڕا نابن، ئەویش پەیامی خوایە کە (قورئانە).[٤٨٦]

(قوامة) سەرپەرشتی کردن، بەزەیی و ڕەحمەت و چاودێرییە بۆ ئافرەتان و چاودێری کردنی سروشتێتی، ئەوە ناگەیەنێت کەسایەتی ئافرەت ڕەت بکاتەوە لەماڵ یان کۆمەڵگادا، بەڵکو ئەوە بەرپرسیارێتی ڕێکخستن و ئەرك و کاری شەرعییە لەناو بازنە و پێکهاتەی خێزاندا بۆ ئیرادە و پاراستنی و چاودێری پیاوان بۆیان، هەروەك چۆن کەشتی، پێویستی بە کەشتیوان هەیە و کاروان پێویستی بە پێشەوا هەیە، و کاریش پێویستی بە بەڕێوەبەر هەیە. بەو کەسانەی کەڕەخنە لەم کاری سەرپەرشتیاری کردنە دەگرن، دەڵێین: ئایا دەبێت کەشتی ژیانی هاوسەرداری بەبێ پێشەوا بەجێ بهێڵین؟ یان هەردوو هاوسەر بەیەکەوە بەڕێوەی بەرن؟ یان ئافرەت خۆی بەتەنها سەرپەرشتی بکات؟ ئەوا بۆچون و لێکدانەوەی یەکەم پێچەوانەیە لەگەڵ عەقڵ و ژیریدا، چونکە بەبێ

---

[٤٨٦] —رواه مسلم في صحيحه كتاب الحج:حديث:٢١٣٧.

پێشەوا دەمێنێتەوە، و بۆ چوون و لێکدانەوەی دووەم ئەوە دەگەیەنێت: بێگومان ئەگەر کەشتییەك دوو پێشەوای هەبێت ئەوا بەرە و نوقم بوونی دەبەن، بەڵام بۆچوون و لێکدانەوەی سێیەم بێگومان سروشتی ئافرەت لەگەڵ ئەم ئەرك و کارە گەورە و گرنگەدا یەك ناکەوێت و ناڕوات. ئەم وتەیە دەکەینە کۆتایی ئەم باسە کە مامۆستا (عبدالوهاب مطاوع) لە ڕۆژنامەی (الاهرام)ی ڕۆژی هەینی بەرواری (١٩٩٣/٣/١٢) کە لە دەمی شاعیری هۆڵەندی ناسراو بە(آلاب کاتس) هێناویەتی، دەڵێت: ماڵەکان هەڵدەگێڕینەوە و سەرو بنی دەکەین کاتێك کەڵەشێر بێ دەنگ ببێت و مریشك بقوقێنێت، و نوسەر ئەم وتەیە شی دەکاتەوە و دەڵێت: مەبەست بەم وتەیە بریتییە لە ژیانی هاوسەرداری کە بە کرداری تێك دەچێت، کاتێك هەرلایەك هەڵنەسن بە کاری دیاری کراوی خۆیان کە گونجاوە لەگەڵ سروشتیاندا، یان هەوڵ بدات دەورێکی تر ببینێت کە پێچەوانەی سروشتی بێت.

## مافی ئافرەت لە میراتدا

ئیسلام ئاینی دادپەروەری و ڕەزامەندی و پاکی و خۆشەویستی و بەزەیی و پێکەوە ژیان و سۆز و نەرم و نیانی و هاوکاری و دەستەبەرییە، یاساو دەستوری میرات لە ئیسلامدا، یاسایەکی دادپەروەرانە و حەکیمانەیە و یاسایەکی وورد و بەهێزی هەیە، چونکە لەلایەن خواوەیە، هەر خۆی فەرزی کردووە و دایناوە و دابەشی کردووە، هەر ئەو زاتە خۆی زانا و شارەزایە بەوەی کە چاك و گونجاوە بۆ بەندەکانە ئیتر زوو بێت یان درەنگ، لەدنیادا بێت یان لە قیامەتدا. بەڵام ئەوەی سەیرو غەریبە دوژمنانی ئیسلام تۆمەت بەجۆرێك بڵاو دەکەنەوە کە ئەو میراتیە ستەمە لە ئافرەت و کەم کردنەوەی مافێتی کە میراتیەکەی نیوەی میراتی پیاوانە، لەبەرئەوە داوای یەکسانبوونی ئافرەت دەکەن بە پیاوان، لە کاتێکدا کە هەندێك کەس داوا دەکەن کە چەند قاتی پیاوی پێ بدرێت، لەبەرئەوەی کە لاوازە و کەمتر شارەزای فێڵە. ئەوەی کە سەیرە بێگومان ئەو کەسانەی کە ڕەخنە دەگرن لە بڕیاری خوا لە میراتدا، ئەوەیان بە هۆکار هێناوەتەوە کە ئافرەت لاوازە و پێویستی بە یارمەتیدان هەیە، لە کاتێکدا کە ئافرەتان دەیانبینن ئەوان ئینکاری دەکەن و نەشارەزان بەرامبەر لاوازی ئافرەت و کەم و کورتی یەکانی، کاتێك کە دەدوێت دەربارەی (القوامة) سەرپەرشتیاری ئافرەتان و گەورە و سەرۆك بوونی پیاوان

بەسەریانەوە و دەبینن کە ئافرەت کارو باری بڕیاردان و دادوەری و کاری قورس دەگرێتە دەست، ئەوەیش نەفامی و گومڕایی ئەوان دەگەیەنێت بەرامبەر بە حەق و ڕاستی.بێگومان ئافرەت لەسەردەمی نەفامیدا بێبەش دەکرا لەمیرات، بەڵگەی کەسانی نەفامیش لە سەر ئەمە بریتی بوو لەوەی کە دەیانوت: ئافرەت چەك هەڵناگرێت و تووشی عادەی مانگانە دەبێت و هەندێك لە کارەکانی بۆ جێ بەجێ نابێت، وەك ئەوەی کە پیاوان دەیکەن و بۆیان دەکرێت. هەربەوەش وازیان نەهێنا کە بێبەشیان کرد لە میرات، بەڵکو کردیانە کالاو کڕین و فرۆشتنیان پێوە دەکرد، وەك چۆن کەل و پەلیان دەکردە میراتی ئەویشیان دەکردە میراتی کاتێك مێردەکەی بمردایە. لای یۆنانیەکانیش حاڵی ئافرەت هەر بەو شێوەیە بوو. دەفرۆشراو دەکڕرا، ئەوەیش لێسەندنەوەی ئازادی و لە دەست دانی کەسایەتی ئەوبوو. بەڵام لای (ڕۆمان) بێگومان بێبەش دەکرا لە مافی خۆی لەوەدا کە موڵکی بوو، و ماڵ و سامانەکەی بەکادەهێنراو کاری پێوە دەکرا. لە شەریعەتی (حەموڕابی)دا، ئافرەت کرابوویە (مملوك) بە موڵك دانراو وژێر دەست... یاسایەکیان هەبوو هەرکەس کچی پیاوێکی بکوشتایە، ئەوا کچێکی لێ دەسەند بۆ خاوەنەکەی یان بیکوشتایەتەوە یان بیکردایە بە موڵکی خۆی. لە حوکم و بڕیاری جولەکەکاندا، میرات بۆ ئافرەت نەبوو لە باوکییەوە کاتێك برای هەبوایە، و کاتێك ئافرەت مێردەکەی بمردایە، ئەوا وەك کالا دەبویە میراتی براکەی. لە ئەورووپا ستەم کردن لە ئافرەت و بە کەم سەیرکردنی و چەوساندنەوەی ئەوە دیاردەیەکی بلاوبوو، و ئەوەی کە سەیربوو، یاساو قانوونی ئینگلیزی تا ساڵی (١٨٠٥) ی زاینیش، ڕێگەی بە پیاو دەدا کە هاوسەرەکەی خۆی بفرۆشێت. بەڵام شۆڕشی فەڕەنسی ئافرەتی بەکەم و بچوك و بێ ئەهلیەت داناوە ئەوەیش بەردەوام بووە تا دەستکاری کردنی قانوونی فەڕەنسی (١٩٣٨) بەڵام دینی پاك و جوانی خۆمان، دینی سەماحەت و لێبووردەیی و ئاسانکاری و دادپەروەری و چاکەیە، بەڕاستی ڕێزی ئافرتی گرتووە و مافی خۆی بۆ گێراوەتەوە کە ئاینەتێکدارو و دەستکاری کراوەکان و مەزهەب و ڕێرەوە دانراوە بێنرخەکان و شارستانێتییە لەناو چووەکان لێیان سەندبوو، ئیسلام مافەکانی بۆ گێرانەوە لە موڵك و خەرجی و ساماندارى خۆیان کەدەبنە خاوەنی، و ئەو مافانەیش کە لە میراتدا دەستیان دەکەوێت.

**خوای گەورە فەرموویەتی:** ﴿ لِّلرِّجَالِ نَصِيبٌ مِّمَّا تَرَكَ الْوَالِدَانِ وَالْأَقْرَبُونَ وَلِلنِّسَاءِ نَصِيبٌ مِّمَّا تَرَكَ الْوَالِدَانِ وَالْأَقْرَبُونَ مِمَّا قَلَّ مِنْهُ أَوْ كَثُرَ نَصِيبًا مَّفْرُوضًا ﴾(النساء:٧).

**واتە: (پیاوان بەشیان هەیە لەو شتانەدا کە باوك و دایك و خزمان بە میراتی لەدوایان بەجێ دەمێنێت، هەروەها ژنانیش بەشیان هەیە لەو شتانەدا کە بە میراتی لە باوك و دایك و خزمان بوی جێ دەمێنێت، لەکەم و زۆری بەشی هەرکەسێك دیاری کراوە و دەبێت بیدرێتێ) خوای گەورە لە سوورەتی (النساء)دا لە ئایەتی(١١)دا -کەئەمە مانایەکەیەتی- دەفەرمووێت: (خوا ڕێنمونیتان دەکات و فەرمانتان پێ دەدات دەربارەی نەوەکانتان لە بواری میراتی گرتندا (ئەوەیش ئەوەیە) کە بەشی نێرینەیەکیان ئەندازەی بەشی دوو مێینەیانە، خۆ ئەگەر منداڵەکان تەنها ئافرەت بوون (دووان) و لە دوان زیاتر بوون، ئەوە دوو بەش لە سێ بەشی میراتەکە لەوان بەش دەکرێت، خۆ ئەگەر مردوەکە تەنها کچێکی هەبوو، ئەوە نیوەی داراییەکەی دەدرێتێ، شەشیەکیش دەدرێت بەهەریەك لە دایك و باوکی ئەگەر مردووەکە منداڵی هەبوو، خۆ ئەگەر مردووەکە منداڵی نەبوو، تەنها دایك و باوکی هەبوو، ئەوە دایکی سێیەکی دەبات و، ئەوی تریشیی بۆ باوکی دەبێت، خۆ ئەگەر باوکی نەبوو دایك و براو خوشکی هەبوو ئەوا شەشیەکی میرات بۆ دایکی دەبێت، ئەمانە هەمووی دوای وەسیەتێك کە مردووەکە کردوویەتی و دانەوەی قەرز و قەرزداری دەبێت، ئێوە نازانن کە باوانتان و نەوەکانتان نازانن کام لایان سودی زیاترە بۆتان(لە بەرئەوەی بەگوێرەی فەرمانی خوا میراتی دابەش بکەن، ئابەم شێوەیە میراتی دابەش کردن) قەرزە لەسەرتان کە پەیرەوی بکەن چونکە لەلایەن خواوە دیاری کراوە، بەڕاستی خوایش هەمیشە و بەردەوام زاناو دانایە)** (النساء:١١).

﴿ وَإِن كَانَ رَجُلٌ يُورَثُ كَلَالَةً أَوِ امْرَأَةٌ وَلَهُ أَخٌ أَوْ أُخْتٌ فَلِكُلِّ وَاحِدٍ مِّنْهُمَا السُّدُسُ فَإِن كَانُوا أَكْثَرَ مِن ذَٰلِكَ فَهُمْ شُرَكَاءُ فِي الثُّلُثِ ﴾(النساء: ١٢).

**واتە: (خۆ ئەگەر پیاوێك یان ئافرەتێك مرد منداڵ و باوك باپیر و برا و خوشکی دایك و باوکی نەبوو بەڵکو خوشکێك یان برایەکی هەبوو، ئەوە شەشیەك بەشی هەریەکێك لەوان دەبێت، خۆ ئەگەر برا و خوشك و دایکی لەیەك زیاتربوون ئەوە هەموویان هاوبەشن لە سێیەکی میراتییەکەدا (بە یەکسانی ژن و پیاو)ـ لە هەندێك حاڵەتدا ئافرەت میراتی دەبات بەڵام نێرینە نایبات لەگەڵ هەمان نزیکی و پلەدا، دایکی دایك میراتی دەبات،**

بەلأم باوکی دایك – کە لەهەمان پلەدایە – میراتی نابات ئەمە نموونەیەکی کردارییە بۆمان ڕوون دەکاتەوە کە میراتی پیاو و ئافرەت لە ئیسلامدا بە جۆرێك ڕاناگیرێت کە زیادە بدات بە پیاوان بەسەر ئافرەتدا، وەك ئەوەی کە دوژمنانی ئیسلام بانگەشەی بۆ دەکات، ئەوەی کە بڕیاردراوە و دانراوەو قەرزکراوە، ئەوە خوای گەورە کردویەتی کە زاتێکی زاناو کار بەجێ یە، خۆی دەزانێت کەچی باشە بۆ بەندەکانی لە دنیاو لە قیامەتدا. باوای دابنێین کە پیاوێك مردووە کوڕ و کچێکی هەیە، و ماڵ و سامانی لەدوای خۆی بۆ بەجێ هێشتوون، ئایا دەبێت چارەنوسی ئەو ماڵ و سامانە چی بێت پاش ئەوەی کە ماوەیەکی کەمی بەسەردا تێپەڕ دەبێت. بێگومان بە نسبەت کچەکەوە مافی کەم نابێتەوە و نەفەقەو خەرجی لەسەر براکەیەتی لەبەرئەوەی کە هێشتا ژنی نەهێناوە، هەندێك کات دەگونجێت کە ماڵ و سامانەکەی بە بازرگانی کردن زیادبکات یان هەرهۆکارێکی تر لە هۆکارەکانی بەرهەم هێنان، لەگەڵ ئەوەیشدا کە خوشکەکەی شوی کرد مارەیی خۆی لە هاوسەرەکەی وەردەگرێت و هیچ ئەرك و نارەحەتییەك لەکاری هاوسەرداری هەڵناگرێت و تەکلیفی ناکەوێتە سەر، هەروەها نەفەقە و خەرجییەکەشی لەسەر هاوسەرەکەیەتی تا لە ژیاندا بێت بۆ منداڵەکانیشی، بەلأم بەنسبەت براکەیەوە، ئەویش نەفەقە و خەرجی خۆی لەسەر خۆیەتی، و کاتێك ویستی هاوسەر پێکەوە بنێت، دەبێت مارەیی و مافی خۆی بدات بە هاوسەرەکەی و کەل و پەل و پێداویستی ماڵەکەیش دابین بکات پاش ئەوەیش نەفەقە و خەرجی خێزان و منداڵەکانی لەسەرە، ئایا لەدوای ئەوە حیکمەتێك هەیە کە دەبینن بە درێژایی کات ئافرەت سوودی پێ دەگەیەنرێت و بوراوە لە هەموو خەرجی و نەفەقەیەك؟ ئایا لەگەڵ ئەمەدا حیکمەتێك هەیە کە ئافرەتیش بەشی بە ئەندازەی پیاو بووایە لە هەموو حاڵەتەکاندا؟ ئایا ئەوان سەرسام نابن لە حیکمەتەکانی خوای گەورە، کە خوا زاناترین کەسە بە بەندەکانی و بەبەزەییترینی خاوەن بەزەییەکانە.

## حەز لە کەفالەتکردنی منداڵانی بێ باوك

زانا و پیاوە گەورە و ناسراوەکان لە نەوەی ئیسرائیل سووربوون لە سەرئەوەی کە مەریەم (علیها السلام) کەفالەت بکەن و پێش بڕکێ و منافەسەی یەکتریان دەکرد لەسەر ئەوە بەشێوەیەکی بەرێزانە، تاگەیشتنە ئەوەی (قرعة) تیروپشك و هەڵبژاردنی بۆ بکەن،

چونکە هەریەکەیان سووربوون لەسەر ئەوەی کە خەیر و پاداشتی زیاتریان دەست بکەویت، مەریەم کچی پێشەوا و مامۆستاکەیان بوو، منداڵێکی بێ باوك بوو، پێویستی بە دەستێکی یارمەتیدەر و بەبەزەیی و دڵێکی پڕ لە سۆز و نەرم و نیان بوو، تا یارمەتی بدات و ببیات بەرەو کەناری ئارامی. ئیسلام هانی داوین لەسەر کەفالەت کردنی منداڵانی بێ باوك و فەرمانی بەوە داوە کە حاڵ و گوزەرانیان باش بکرێت و بە باشی و بەجوانی مامەڵەیان لەگەڵ بکرێت و پارێزگاری ماڵ و سامانیان بکرێت و گەشەی پێ بدرێت، تاگەورە دەبن و پێ دەگەن.

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ وَٱبْتَلُواْ ٱلْيَتَٰمَىٰ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغُواْ ٱلنِّكَاحَ فَإِنْ ءَانَسْتُم مِّنْهُمْ رُشْدًا فَٱدْفَعُوٓاْ إِلَيْهِمْ أَمْوَٰلَهُمْ ۖ وَلَا تَأْكُلُوهَآ إِسْرَافًا وَبِدَارًا أَن يَكْبَرُواْ ۚ وَمَن كَانَ غَنِيًّا فَلْيَسْتَعْفِفْ ۖ وَمَن كَانَ فَقِيرًا فَلْيَأْكُلْ بِٱلْمَعْرُوفِ ۚ فَإِذَا دَفَعْتُمْ إِلَيْهِمْ أَمْوَٰلَهُمْ فَأَشْهِدُواْ عَلَيْهِمْ ۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ حَسِيبًا ﴾.(النساء:٦).

واتە: (هەتیوان تاقی بکەنەوە (بەوەی کەهەندێك پارەیان بدەنێ و خۆتان سەرپەرشتیان بکەن) هەتا ئەو کاتەی کە وەختی ئەوەیان دێت کە هاوسەربگرن، ئەوسا ئەگەر هەستتان کرد کە ژیر و سەلارن، پارە و سامانەکەیان پێ بدەنەوە، نەکەن ماڵ و سامانیان بخۆن بەزیادەڕەوی لە خەرجکردنیدا لەترسی ئەوەی نەوەکو گەورە بن و زوو لەدەستیان بسێننەوە، جا ئەوەی دەوڵەمەندە بادەستی بپارێزێت و ئەوەیش کە هەژارە بالێی بخوات و لەسنور دەرنەچێت و زیادە ڕەوی نەکات، جا کاتێك ماڵ و سامانەکانیان تەسلیم دەکەنەوە ئەوە شایەتیان لەسەر بگرن (هەرچەندە) تەنها خوا بەسە بۆ لێپرسینەوەو چاودێری.).

خوای گەورە نەهی کردووە لە نزیك بوونەوە لە ماڵی هەتیوان مەگەر کاتێك چاکەیان بەرامبەر بکرێت: ﴿وَلَا تَقْرَبُواْ مَالَ ٱلْيَتِيمِ إِلَّا بِٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ حَتَّىٰ يَبْلُغَ أَشُدَّهُۥ ۚ وَأَوْفُواْ بِٱلْعَهْدِ ۖ إِنَّ ٱلْعَهْدَ كَانَ مَسْـُٔولًا﴾(الاسراء:٣٤).

واتە: (نزیك ماڵی هەتیو مەکەون مەگەر بەجوانترین شێوە نەبێت (وەك ئەوەی بیخەنە بازرگانییەکەوە تا گەشە بکات) هەتا ئەگاتە هەرەتی لاوی، وەفا بکەن بە بەڵێن و پەیمان، چونکە بەڕاستی بەرپرسیارن لە بەرامبەر بەڵێن و پەیمانەوە)

* بێگومان خوای گەورە سزای ماڵ خواردنی هەتیوی ڕوون کردۆتەوە فەرموویەتی: ﴿إِنَّ الَّذِينَ يَأْكُلُونَ أَمْوَالَ الْيَتَامَى ظُلْمًا إِنَّمَا يَأْكُلُونَ فِي بُطُونِهِمْ نَارًا وَسَيَصْلَوْنَ سَعِيرًا﴾(النساء:١٠).

واتە: (بەڕاستی ئەوانە کە ماڵی هەتیوان بە ناحەق و ستەم دەخۆن، بێگومان ئەوانە تەنها ئاگر دەخۆن و ئەو ماڵە دەبێتە ئاگر لە سکیاندا، لە قیامەتیشدا دەچنە ناو ئاگری دۆزەخەوە.).

* بێگومان پێغەمبەری خوا (ﷺ) مژدەی شوێن و پلەی بەرزی داوە بەو کەسانەی کە سەرپەرشتی کار و باری هەتیوان دەکەن و چاکەیان لەگەڵ دەکەن و بەڵێن دەدەن بە کەفالەت کردنیان و پەروەردەیان دەکەن. پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (ئەو کەسەی هەوڵدەدات بۆ یارمەتیدانی بێوەژنان و هەژاران پاداشتی وەك تێکۆشەری ڕێگەی خوایە).[٤٨٧] لە (أبی هریرە) ەوە (خوای لێی ڕازی بێت) وتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (من و ئەو کەسەی کە سەرپەرشتی هەتیوان دەکات لە بەهەشتدا وەك ئەم دووانە وەهاین، ئینجا ئاماژەی کرد بۆ هەردوو پەنجەی شایەتمان و ئەوەی تەنیشتی.).[٤٨٨]

## ڕێزی پیاوچاکان و لەخواترسان

خوای گەورە لە چیرۆکی مەریەم (علیها السلام)دا فەرمووی: ﴿كُلَّمَا دَخَلَ عَلَيْهَا زَكَرِيَّا الْمِحْرَابَ وَجَدَ عِندَهَا رِزْقًا قَالَ يَا مَرْيَمُ أَنَّى لَكِ هَذَا قَالَتْ هُوَ مِنْ عِندِ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ يَرْزُقُ مَن يَشَاءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ﴾(ال عمران:٣٧). لەم ئایەتەدا بەڵگە لەسەر ئەوە هەیە کە پیاوچاکان و لە خواترسان ڕێز و کەرامەتیان هەبووە و ڕوویداوە بۆیان، ئەو ڕزق و ڕۆزی و ناز و نیعمەتە بێ ئەندازەیەی کە خوای گەورە دەینارد بۆ مەریەم (علیها السلام) بەو شێوازە سەیرە، ڕێزێك بوو بۆ مەریەم. کەرامەت و ڕێز فەرمانێکی سەیر و لە عادەت دەرچووە، خوای گەورە لە سەر دەستی پیاچاکێکدا نیشانی دەدات و دەری دەخات، بەبێ ئەوەی

---

[٤٨٧] –رواه البخاري كتاب الأدب ورواه المسلم في كتاب الزهد.

[٤٨٨] – رواه البخاري في كتاب الأدب.

بانگەشەی ئەوەی کردبێت کە پەیامی بۆ هاتبێت.[٤٨٩] ڕێز و کەرامەت شتێکی چەسپاو و جێگیرە بۆ خواناس و پیاو چاك کە پێی دەوترێت (الولي) کە باوەڕداری لەخوا ترسە، کە لەسەر بەرنامەکەی خوا دامەزراوە و بەردەوامە. خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿أَلَا إِنَّ أَوْلِيَاءَ اللَّهِ لَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ(٦٢) الَّذِينَ آمَنُوا وَكَانُوا يَتَّقُونَ﴾(يونس:٦٢-٦٣).

واتە: (ئاگاداربن کەبەڕاستی چاکان و خۆشەویستانی خوای میهرەبان نە ترس و بیم ڕوویان تێدەکات (لە سەرەمەرگ و لە ڕۆژی لێ پرسینەوە دا) نە غەم و پەژارە و دڵتەنگی دایان دەگرێت (بەڵکو فریشتەکان بە ڕووخۆشیەوە مژدەی سەرفرازی و خۆشنودیان دەدەنێ)...(ئەو بەختەوەرانە)ئەو کەسانەن باوەڕی بەتین و دامەزراو و پڕ سۆزیان هێناوە بە پەروەردگاریان و خۆشیان دەپارێزن لە خەشم و قینی خوا (بەهۆی ئەنجامدانی فەرمانەکانی خوا و خۆ بەدوورگرتنیان لە حەرام)).هەروەها لە سوورەتی (فصلت)دا –کە ئەمە مانایەکی– دەفەرموێت: (ئەوانەی بەڕاستی وتیان: پەروەردگارمان (الله) یە، لەوەو دوا بەردەوام پابەندی ئەو ڕێبازە ڕاستەبوون، ئەوە لە سەرەمەرگدا دەستە دەستە فریشتە دادەبەزن بۆ لایان، پێیان دەڵێن: هیچ ترس و بیمێکتان نەبێت لە داهاتوو، هیچ غەم و پەژارەیەکتان نەبێت بۆ ڕابردوو، مژدەتان لێ بێت بەو بەهەشتەی کە کاتی خۆی بەڵێنتان پێ دراوە...، (خوای گەورە و فریشتەکانیش دەفەرموون) ئێمە یار و یاوەر و هاوکار و پشتیوانی ئێوەین لەژیانی دونیا و قیامەتیشدا، مژدەتان لێ بێت لە بەهەشتدا هەرچی ئارەزووی دەکەن و داوای دەکەن بۆتان ئامادەیە....، ئەو بەهرەیەش لەلایەن پەروەردگارێکەوە پێشکەشتان دەکرێت کە لێبوردە و میهرەبانە.)(فصلت: ٣٠-٣٢).

خواناسی و خۆشەویستی خوایش چەند ئاستێکی هەیە، بەپێی پلەکانی ئیمان وتەقوا لەیەك جیاوازن.[٤٩٠]

گوێ لەم فەرموودە پیرۆزە بگرە: (ابو هريرە) (خوا لێی ڕازی بێت) فەرمووی: پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) فەرمووی: (خودای گەورەو سەروەر دەفەرموێت کەسێك دوژمنایەتی خۆشەویستێك و دۆستێکی من بکات، یان شەڕی پێ بفرۆشێت، ئەوە دوژمنایەتی لەگەڵ مندا دەکات و شەڕ بەمن دەفرۆشێت، کەواتە باخۆی ئامادە بکات بۆ شەڕکردن

---

[٤٨٩] –المختار من شرح البيجوري على الجوهرة المسمى تحفة المريد على جوهرة التوحيد. إبراهيم البيجوري ص:١٨٣.

[٤٩٠] –الفرقان بين أولياء الرحمن وأولياء الشيطان لأبن تيمية (مجموعة التوحيد ص:٤٤٤).

لەگەڵ خۆمدا، من خۆم شەڕی لەگەڵ دەکەم لە جیاتی ئەو دۆستە خۆشەویستەم بۆی دەچمە مەیدانی جەنگ، بەندەی من بەهیچ شتێکی باش و خۆشەویست وەك ئەوە خۆی لەمن نزیك ناکاتەوە، کەوەك بەکردنی ئەو شتانەی کە فەرز و پێویستم کردووە لەسەری خۆی لە من نزیك بکاتەوە، باشترین هۆکار بۆ نزیك بوونەوە لە خودای پەروەردگار جێ بەجێ کردنی فەرزەکانە، بەرە بەرە بەندەی من بە سوننەتەکان خۆی لەمن نزیك دەکاتەوە هەتا خۆشەویست دەبێت لەلام، کاتێك بەندە بە کردنی عیبادەتی جوان گەیشتە ئەو پایەیەی کە ببێت بە خۆشەویست و دۆستی من، ئیتر خۆم دەبم بە گوێ و چاوو دەست و پێ و بۆی، هەرچی بەدڵی من نەبێت و بۆ ڕازی بوونی من نەبێت، نەگوێی دەداتێ و نە تەماشای دەکات و نەدەستی بۆ دەبات و نە بۆی دەچێت، ئیتر منیش بێ دڵی ئەو ناکەم و دڵی ناشکێنم، هەرچیم لێ داوا بکات، بەبان چاو دەیدەمێ و بەدەستی خۆم دەیدەمێ و بەپێی خۆم بۆی دەبەم، ئەگەر پەنام بۆ بێنێت پەنای دەدەم، لەکردنی هیچ شتێکی وەك ئەوە سێ و دووی لێ ناکەم، وەك کێشانی گیانی موسوڵمان، سێ و دوو دەکەم، چونکە ئەو حەزی لە مردن نییە، منیش هەرچەند حەزم لە بێ دڵی ئەو نییە، بەلاّم مردنیش کارێکی ناچاری یە، هەر دەبێت ببێت.)[٤٩١] ئەوەی کە لە مەریەم (علیها السلام) ڕویدا بەڵگە بوو لەسەر ڕوودانی ڕێز و کەرامات بۆی، و ڕێز و کەراماتی زۆر لە ژیانی هاوەڵاّندا ڕویانداوە، هەروەها شوێنکەتوانیان و کەسانی تریش، لە دۆستان و خۆشەویستانی خوا و پیاوچاکان. لەوانیش جارێکیان (ابی بکر الصدیق) (خوای لێی ڕازی بێت) چەند میوانێك لەگەڵی چونەماڵەوە و ئەویش خواردنێکی بۆ ئامادەکردن، هەر کاتێك پاروویەکیان هەڵدەگرت و دەیانخوارد لە شوێنەکەیدا دروست دەبوویەوە و زیادی دەکرد، هەتا هەموو خواردنیان خوارد و تێربوون، بەلاّم دواتر خواردنەکە لە جاری یەکەم زیاتر بوو بوو! پاشان (ابوبکر) خواردنەکەی برد بۆ لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) و کۆمەڵێکی زۆری تریش لێیان خوارد.[٤٩٢]

* (عمری کوڕی خطاب) (خوا لێی ڕازی بێت) ڕێز و کەراماتی زۆری بووە لەوانە: کاتێك سوپایەکی موسوڵمانی نارد بۆ وولاّتی فارس، پیاوێکی کرد بە پێشەوا بەسەریانەوە پێیان دەوت (سارية) لە کاتێکدا (عمر) (خوای لێی ڕازی بێت) وتاری دەدا لە ناکاو لەسە مینبەرەکەوە هاواری کرد(یا سارية...الجبل..الجبل..). واتە: ئەی ساریە شاخەکە...

[٤٩١] –رواه البخاري في صحيحه كتاب الرقاق باب التواضع.

[٤٩٢] رواه البخاري في صحيحه عن عبدالرحمن بن أبي بكر، كتاب الأدب.

شاخەکە بگرە، کاتێك نوێنەری سوپاکە گەڕایەوە بە مژدەی سەرکەوتنی سوپای موسڵمانانەوە گەڕایەوە لە جەنگەکەدا بەسەرکردایەتی (سارية)، بە (عمر) ی وت: ئەی پێشەوای باوەڕداران، گەیشتین بە دوژمنەکەمان ئەوان زاڵبوون بەسەرماندا و کۆمەك و یارمەتی زۆریان بۆ هات و دەورەیان داین، ئینجا لەو کاتەدا ئێمە دەنگێکمان بیست لە دەنگی تۆ دەچوو، دەیوت: ئەی ساریە شاخەکە  ئینجا ئێمەیش پەنامان برد بۆ شاخەکە، وریزەکانمان ڕێك خستنەوە و خوای گەورەیش سەری خستین بەسەر دوژمنەکەماندا... ئەوەی کە دەیوت (یا سارية. ..الجبل) ئەوە گەورەمان(عمری کوڕی خطاب) بوو، ئەو هاوارکردنە دەنگێك بوو، و هۆکارێك بوو لە هۆکارەکانی سەرکەوتنی موسوڵمانان، و ڕێز و کەرامەتیش بوو بۆ پێشەوای باوەڕداران (عمر)(خوای لێی ڕازی بێت).[٤٩٣]

## ڕێگەدان بە (قرعة) تیر و پشك لە ئیسلامدا

### لەو بڕیارانەی لە چیرۆکەکە وەردەگیرێت:

### ڕێگەدان بە (قرعة) تیر و پشك

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ وَمَا كُنتَ لَدَيْهِمْ إِذْ يُلْقُونَ أَقْلَامَهُمْ أَيُّهُمْ يَكْفُلُ مَرْيَمَ وَمَا كُنتَ لَدَيْهِمْ إِذْ يَخْتَصِمُونَ﴾(ال عمران:٤٤). پێشەوا (القرطبي) دەڵێت: هەندێك لە زانایان ئەم ئایەتەیان بە بەڵگە هێناوەتەوە، لەسەر جێگیربوونی (قرعة) کە بنەمایەکە لە شەریعەتی ئیسلامدا بۆ هەموو ئەو کەسانەی کە دادپەروەرییان دەوێت لە دابەش کردندا، و ڕێگەیەکە لای زۆرینەی زانایانی (فقه) لە هەموو ئاستەکاندا بۆ بەڵگە هێنانەوە تا دادپەروەری بکرێت لەنێوانیاندا و دڵنیابن و گومانیان لەسە لابچێت لەو شتەدا کە بەشیان تیایدایە، هیچ یەکێکیان بەسەر هاوڕێ یەکدا پێش ناکەوێت ئەگەر کاتێك

---

[٤٩٣]- الفرقان بين أولياء الرحمن و اولياء الشيطان لأبن تيمية، مجموعة التوحيد ص:٥١١.

بەشکراوەکە لەیەك جۆر و ڕەگەز بێت. ئەمەیش بەپێی شوێنکەوتنی قورئان و سوننەت.[٤٩٤]

ئیمامی بوخاری (خوای لێی ڕازی بێت) لە (صحیح)ەکەیدا بەشێکی بەناوی – كتاب الشركة – دیاری کردووە (باب)ێکی ناوی (هل يقرعُ في القسمة؟)یە، هەروەها لە (كتاب الشهادات) دا (بابێك هەیە بە ناونیشانی (باب القرعة في المشكلات)، (نوعمانی کوڕی بشیر) (خوای لێی ڕازی بێت) دەفەرموێت:پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (وێنەی کەسێك کە ئاگای لە خۆی بێت و خۆی بپارێزێت لەو شتانەی کە خوا سنوری بۆ داناون، و ئەو سنورانە نەبەزێنێت، لەگەڵ ئەو کەسەدا کە گوێ نەداتێ و سنورەکانی خودا ببەزێنێت و بێ فەرمانی خوا بکات، وێنەی ئەم دوو جۆرە کەسە، وەك وێنەی کۆمەڵێك وایە، کە لەناو خۆیاندا لەسە جێگەی خۆیان، لەناو کەشتیەکی دوو قاتدا تیروپشك بکەن، تاقمێکیان قاتی سەرەوەیان بەربکەوێت و ئەوانی تر قاتی خوارەوەیان بەربکەوێت، ئەوانەی کە لە قاتی خوارەوەن بەسەر ئەواندا بچن بۆ ئاو کە لە قاتی سەرەوەدان لەبەرئەوە بڵێن: بۆچی ئێمە لەبەشی خۆماندا کونێکی تێ نەکەین و ئیتر ئەوەندە ئازاری ئەوانەی قاتی سەرەوە نەدەین و بەسەریاندا نەچین و نەیەین، جا ئەگەر ئەوانەی سەرەوە وازیان لێ بهێنن و ڕێگەی ئەوەیان پێ بدەن کە کونی تێ بکەن، ئەوا کەشتییەکە پڕ دەبێت لە ئاو و نوقم دەبێت و هەموویان وەکو یەك دەفەوتێن، بەڵام ئەگەر دەستیان بگرن و نەهێڵن ئەو هەڵەیە بکەن، ئەوا خۆشیان و ئەوانەی خوارەوەیش هەردوولا ڕزگار دەبن).[٤٩٥] (عائیشە) ی دایکی باوەڕداران (خوا لێی ڕازی بێت) فەرمووی: دەستوری پێغەمبەر (ﷺ) وابوو، کاتێك دەرۆیشت بۆ سەفەرێك لەنێوانی خێزانەکانیدا، تیروپشکی دەکرد، ئیتر بەناوی هەرکامێکیانەوە پشك دەربچوایە، ئەو خێزانەیانی لەگەڵ خۆی دەبرد بۆ ئەو سەفەرە...).[٤٩٦]

---

[٤٩٤] الجامع لأحكام القرآن للإمام القرطبي ٤: ٨٦.

[٤٩٥] رواه البخاري في صحيحه كتاب الشركه باب: هل يقرع في القسمة؟

[٤٩٦] –رواه البخاري في صحيحه كتاب الشهادات.

## وەڵام بۆ بۆچوونی هەڵەی هەندێك لە سۆفییەکان

هەندێك لە سۆفییەکان بۆچونیان وایە کە بەندەی خوا کاتێك گەیشتە پلەی (الولي) ئیتر دوای ئەوە تەکلیفی لەسەر لادەچێت بەپێی قسەی یەکێکیان ئیتر لەو کاتەدا (کاری لەسەر نانوسرێت). (الهجويري) لە کتێبی (کشف المحجوب) لە ڕوونکردنەوەی ئەم گومراییەدا دەڵێت: دەستەیەك لە گومڕاکان، کە پاڵ دراونەتە پاڵ سۆفییەکان، وتویانە: خزمەت و کارکردن پێویستە تا ئەو کاتەی بەندە دەبێتە (ولي)، کاتێك بوو بە (ولي) ئەوا خزمەت و کارکردنی لەسەر لادەچێت)[٤٩٧] (الهجويري) ڕەخنە لەم گومڕاییە دەگرێت دەڵێت: (لە ڕێگای هیچ پلەو پایەیەکدا نییە کە ڕوکنێك لە ڕووکنەکانی(خدمة) خزمەت و کارکردن لابچێت). هەروەها زۆرێك لە زانا و شارەزایانی سۆفی ڕەخنە لەسەر ئەم گومڕاییە دەگرن، و ڕونیان کردۆتەوە کە لە مەرجە پێویستیەکانی بوون بە (ولي) خۆشەویست و نزیك و دۆستی خوای گەورە، بریتییە لە پابەندبوون بە (کیتاب و سوننەتەوە)، (الجنيد) دەڵێت: (هەرکەس قورئانی لەبەر نەکردبێت و فەرموودەی نەنوسیبێت، ئەوا پەیڕەوی ئەم فەرمانەی نەکردووە – واتە تەسەوف – چونکە ئەم زانستەی ئێمە پابەندە بە کیتاب و سوننەتەوە)ئێمەیش دەڵێین: لە چیرۆکی مەریەمدا (عليها السلام) بەڵگەی ئەوە هەیە کە تەکلیف لەسەر بەندە لاناچێت، تەنانەت ئەگەر بۆ بەرزترین پلەیش بەرزببێتەوە و بچێتە بەرزترین پلەی ئیمانی، بەڵکو هەرکاتێك ئیمانی زیادی کرد ئەوا پلەیشی بەرز دەبێتەوە و زیاتر بەندایەتی و گوێڕایەڵی فەرمانەکانی خوا دەکات. ئەوە مەریەم (عليها السلام) بوو، کە فریشتەکان مژدەیان پێ دا، بەوەی کە خوای گەورە هەڵی بژاردووە و پاك و خاوێنی کردۆتەوە و بەسەر هەموو ئافرەتاندا هەڵی بژاردووە، پاشان فریشتە بەڕێزەکان دواتر پێویستییەکانی ئەم هەڵبژاردنەیان ڕوون کردەوە: کە دەبێت زیاتر تێبکۆشێت بۆ سوپاسگوزاری و گوێڕایەڵی زیاتری فەرمانەکانی خوا.

---

[٤٩٧] -کشف المحجوب للهجويري ٢: ٤٥٣.

خوای گەورە فەرمووی: ﴿ وَإِذْ قَالَتِ الْمَلَائِكَةُ يَا مَرْيَمُ إِنَّ اللَّهَ اصْطَفَاكِ وَطَهَّرَكِ وَاصْطَفَاكِ عَلَى نِسَاءِ الْعَالَمِينَ(٤٢) يَا مَرْيَمُ اقْنُتِي لِرَبِّكِ وَاسْجُدِي وَارْكَعِي مَعَ الرَّاكِعِينَ﴾(ال عمران: ٤٢-٤٣). (پێشتر ماناکراوە).

## ڕوونکردنەوەیەك دەربارەی ڕۆح کردن بە عیسادا (علیه السلام)

خوای گەورە فەرمووی: ﴿ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ لَا تَغْلُوا فِي دِينِكُمْ وَلَا تَقُولُوا عَلَى اللَّهِ إِلَّا الْحَقَّ إِنَّمَا الْمَسِيحُ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ رَسُولُ اللَّهِ وَكَلِمَتُهُ أَلْقَاهَا إِلَى مَرْيَمَ وَرُوحٌ مِنْهُ﴾(النساء:١٧١).

واتە: (ئەی خاوەنانی کتێب زیادەڕەوی مەکەن لە ئاینەکەتاندا، جگە لە حەق و ڕاستی هیچی تر بەدەم خواوە مەڵێن، بەڕاستی مەسیح عیسای کوڕی مەریەم جگە لەوەی کە پێغەمبەری خوایە (شتێکی ترنەبووە)لە دایك بوونەکەی بە فەرمانی خوا بووە کە لە مەریەمدا(بەرجەستەبوو) عیسا ڕۆح و گیانێکی (تایبەتییە) لەلایەن خواوە بەخشراوە) لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿ وَالَّتِي أَحْصَنَتْ فَرْجَهَا فَنَفَخْنَا فِيهَا مِنْ رُوحِنَا وَجَعَلْنَاهَا وَابْنَهَا آيَةً لِلْعَالَمِينَ﴾ (الانبیاء:٩١). (پێشتر ماناکراوە). هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَمَرْيَمَ ابْنَتَ عِمْرَانَ الَّتِي أَحْصَنَتْ فَرْجَهَا فَنَفَخْنَا فِيهِ مِنْ رُوحِنَا وَصَدَّقَتْ بِكَلِمَاتِ رَبِّهَا وَكُتُبِهِ وَكَانَتْ مِنَ الْقَانِتِينَ﴾ (التحریم:١٢). (پێشتر ماناکراوە). ووشەی ﴿وَرُوحٌ مِنْهُ﴾ و﴿مِنْ رُوحِنَا﴾، ئەوە ناگەیەنێت کە بەشێك یان هەندێك بێت لە خوا، حەرفی (من) لێرەدا بۆ (تبعیض)بە هەندێك دانانی نی یە، بەڵکو بۆ (إبتداء الغایة) بۆ سەرەتای مەبەستەکەیە. هەربەم بۆنەیەوە دەگێرنەوە: کە پزیشکێکی گاوور چارەسەری (الرشید)ی دەکرد، و چاوی کەوت بە (علی بن الحسین الواقدی المروزی). پۆژێکیان گاوور کە بە پێشەوا (علی بن الحسین الواقدی) وت: لە

کتێبەکەی ئێوەدا شتێك هەیە کە بەڵگە دەدات لەسەر ئەوی کە عیسا بەشێك بێت لە خوا، ئینجا ئەو ئایەتەی خوێندەوە کە باسمان کرد و لە سوورەتی (المائدة) دابوو دواتر (الواقدی) ئەم ئایەتەی بۆ خوێندەوە: ﴿وَسَخَّرَ لَكُم مَّا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ جَمِيعاً مِّنْهُ﴾(الجاثية:١٣). ئینجا وتی: کەواتە پێویست دەکات کە هەموو ئەو شتانەیش کەلەم ئایەتەدان بەشێك بن لە خوا؟ ئینجا پزیشکە گاورەکە بێدەنگ بوو و موسڵمان بوو، ئینجا (الرشید) زۆر دڵخۆشبوو، ئینجا (الواقدی) گەیشت بە زۆر شتی گەورە و بەنرخ).[٤٩٨] ئێمەیش دەڵێین حاڵی عیسا (علیه السلام) وەك حاڵی ئادەم (علیه السلام) و گشت بەشەرەکان بوو، خوای گەورە چۆنێتی دروستکردنی ئادەمی ڕوون کردۆتەوە و فەرموویەتی: ﴿إِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَائِكَةِ إِنِّي خَالِقٌ بَشَراً مِن طِينٍ (٧١) فَإِذَا سَوَّيْتُهُ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِن رُّوحِي فَقَعُوا لَهُ سَاجِدِينَ﴾(ص:٧٢-٧١). هیچ کەسیش نەیوتوە کە ئادەم (علیه السلام) خوا بووە، چونکە خوای گەورە لەلایەن خۆیەوە و بەفەرمانی خۆی ڕۆحی کردووە بە بەریدا.

(عبدالله ی کوڕی مسعود) (خوا لێی ڕازی بێت) دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) کە ڕاستگۆترین ڕاستگۆیە، فەرموویەتی: (هەر یەکێك لە ئێوە لە ماوەی چل ڕۆژدا لە سکی دایکیدا دروست دەکرێت، لەماوەی چل ڕۆژدا دەبێتە پارچەیەك گۆشت و خوێن، پاش ماوەی چل ڕۆژیش دەبێتە پارچەیەك گۆشت، پاش ئەوە خوای گەورە فریشتەیەك دەنێرێت ڕۆح دەکات بە بەریدا و فەرمانی بە چوار ووشەیش پێ دەکرێت، بە نوسینی ڕۆزیی، درێژی ژیانی (ئەجەل) و کاری و بەدبەختە یان بەختەوەر، سوێند بەوەی جگە لەو خوایەکی تر نییە، کەسی واتان هەیە کار و کردەوەی بەهەشت دەکات، هەتا لە نێوان ئەو و بەهەشتا ئەندازەی گەزێکی دەمێنێت، کەچی نوسراوەکە پێشی دەکەوێت و کار و کردەوەی دۆزەخیی دەکات و دەچێتە دۆزەخ، هەروەها کەسی وایشتان هەیە، کارو کرداری دۆزەخیی دەکات، هەتا بە ئەندازەی گەزێکی دەمێنێت و نوسراوەکەی پێشی دەکەوێت و کارو کردەوەی بەهەشتی دەکات و دەچێتە بە هەشتەوە)[٤٩٩]

---

[٤٩٨] إرشاد العقل السليم لأبي السعود ٢: ٢٥٩.

[٤٩٩]- رواه البخاري في صحيحه كتاب: بدء الخلق، ورواه مسلم في صحيحه كتاب:القدر.

## ڕوونکردنەوەیەك دەربارەی حوکمی ئاوات خواستن بە مردن

ئێستا لەبەردەم لێکۆڵینەوەی ئەم ئایەتەی لای خوارەوەداین کە چیرۆکی مەریەم (علیها السلام) دەگێڕێتەوە، لە کاتێکدا چۆتە بار و دۆخێکی ناڕەحەت و کارەکەی لەسەر قورس و ناڕەحەت بووە: ﴿فَأَجَاءَهَا الْمَخَاضُ إِلَى جِذْعِ النَّخْلَةِ قَالَتْ يَا لَيْتَنِي مِتُّ قَبْلَ هَذَا وَكُنتُ نَسْيًا مَّنسِيًّا﴾(مریم:٢٣). لێرەدا پرسیارێکمان بۆ دروست دەبێت: ئایا بۆ موسوڵمان ڕێگە پێدراوە کە ئاوات بە مردن بخوازێت؟ سەرەتا دەڵێین: بەڕاستی ژیان ناز و نیعمەتێکی گەورەی خواییە و ڕێڕەوە بۆ ژیانی کۆتایی کەپێویستە پێیدا تێپەڕین نەك تەنها ئاوەدانی بکەین بۆ خۆشی خۆمان بێت، بەڵکو بیکەینە شوێنی کار و چاکە و ئەنجامدانی خوا پەرستی و گوێڕایەڵی فەرمانەکانی، دنیا کێڵگەی قیامەتە، هەرکەس هەوڵ بدات بەرهەمی دەچنێتەوە، و هەرکەس بچێنێت بەرهەمەکەی دەدورێتەوە، بەپێی توانای کار و هەوڵدانەکەیش بەرهەم بەدەست دێت.

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَابْتَغِ فِيمَا آتَاكَ اللَّهُ الدَّارَ الْآخِرَةَ وَلَا تَنسَ نَصِيبَكَ مِنَ الدُّنْيَا﴾ (القصص:٧٧).

واتە: (هەوڵ بدە بەو ماڵ و سامانەی خوا پێی بەخشیویت، ماڵی قیامەت و بەهەشتی بەرین بکڕە، و بەشی حۆیشت لە دونیادا بە حەلاڵی فەرامۆش مەکە). بۆ باوەڕدار پێویستە کە هەموو ساتێکی ژیانی بقۆزێتەوە بۆ ئەنجامدان و کۆکردنەوەی کردەوە چاکەکان، مرۆڤ بەندکراوی تەمەنێکی کورتە و قەرزاری تەمەنێتی و هەرساتێك بەشێکی دەداتەوە.

* پێشەوا (احمد) (خوا لێی ڕازی بێت) لە (مسند) ەکەیدا لە (عبدالرحمن بن ابی بکرة) و ئەویش لە باوکیەوە گێراویەتی یەوە: پیاوێك وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) چ کەسێك باشترین کەسە؟ فەرمووی: (ئەو کەسەی کە تەمەنی درێژبێت و کارەکانی چاك بێت).[500]

[500] رواه الأمام أحمد في مسنده:الفتح الرّباني (كتاب الجنائز).

*هەر پێشەوا (أحمد) لە (مسند)ەکەیدا لە (أبي عنبة الخولاني) (خوالێی ڕازی بێت) گێراویەتیەوە دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (ئەگەر خوای گەورە ویستی خەیرو چاکە تووشی بەندەکانی بکات، دەرگای کردەوە چاکەکانی لێ دەکاتەوە پێش کاتی مردنی، پاشان لەسەر ئەو کردەوە چاکانە ڕۆحی دەکێشێت).[٥٠١]

لێرەدا گرنگی و گەورەیی کاتمان بۆ دەردەکەوێت لەژیانی موسوڵماناندا بێگومان درێژی تەمەن لەگەڵ ئەنجامدانی کردەوە چاکەکان خەیر و بەرەکەت و ناز و نیعمەتی خوای گەورەیە بۆ بەندەی باوەڕدار. بێگومان پێغەمبەری خوا (ﷺ) قەدەغەی کردووە کەئاوات و خۆزگە بە مردن بخوازرێت لەکاتی ڕوودانی ناڕەحەتی و دابەزینی زیان و بەلآدا.

(انس) (خوا لێی ڕازی بێت) دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (هیچ کەسێك لە ئێوە ئاوت بە مردن نەخوازێت لەبەرئەوەی تووشی بەلایەك بووە، ئەگەر زۆر پێویست بوو ئاوات بخوازێت، ئەوا با بڵێت: خوایە ئەگەر ژیان چاکترە بۆم، ئەوا بمژێنە، ئەگەر مردنیش چاکترە بۆم بممرێنە).[٥٠٢]

(ابو هريره) (خوا لێی ڕازی بێت) دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: با هیچ کەسێك لە ئێوە خۆزگە بەمردن نەخوازێت و دوعایشی بۆ نەکات پێش ئەوەی یەخەی پێ بگرێت، چونکە ئەگەر یەکێك لەئێوە مرد ئەوا کردەوەکانی کۆتایی پێ دێت، تەمەن زیادی بۆ موسوڵمانان هەر خێری زیاد دەکات).[٥٠٣]

ڕێگە دەدرێت بەدوعاو پاڕانەوە بۆ ئاوات خواستن بە مردن لەکاتی ڕوودانی فیتنەو ئاشوب و بەلآو ناڕەحەتی قورس و توندا، و لەوکاتەدا کە باوەڕدار دەترسێت نەفسی تووشی فیتنە و بەلآ ببێت، هەروەها لەوانەیش کەلە هەندێك لە کۆمەڵگاکاندا تووشی موسوڵمان دێت لە چەوساندنەوە و زەبرو زەنگ و ئازاردان.

(ابوهريره) (خوای لێی ڕازی بێت) دەلێت پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (قیامەت هەڵناسێت هەتا پیاو بەلای پیاوێکی مردوودا تێدەپەرێت و دەڵێت: ئای خۆزگە من لە شوێنی ئەو بومایە[٥٠٤] ـ لێرەدا بۆمان دەردەکەوێت کە ڕێگە پێدراوە لەکاتی دابارینی

---

[٥٠١] رواه الأمام أحمد في مسنده كتاب الجنائز.

[٥٠٢] رواه البخاري في الدعوات و مسلم في الذكر و الدعاء.

[٥٠٣] – رواه مسلم في صحيحه كتاب الذكر و الدعاء.

[٥٠٤] – رواه الأمام البخاري في صحيحه كتاب الفتن.

فیتنەو بەلاْو ئاشوبدا ئاوات و خۆزگە بەمردن بخوازرێت. دەربارەی ئەمەیش، پێشەوا (ابن کثیر) لە تەفسیرەکەیدا دەڵێت:(لە کاتی ڕودانی فیتنەو ئاشوب لە دیندا، ڕێگە دەدرێت ئاوات بە مردن بخوازرێت، پێشەوا (علی کوڕی ابی طالب) لە کۆتایی خەلافەتەکەیدا کاتێك بینی کارەکانی بۆ کۆ نابێتەوە و توندی و ناڕەحەتی زیادی کردووە، ووتی: ئەی خوایە بمبەیتەوە بۆ لای خۆت، بەڕاستی لێیان بێزاربووم، و ئەوانیش لە من بێزاربوون...)[٥٥٥]

لە پوختەی ئەمانەوە نرخی ژیان و گرنگی کردەوە چاکەکانمان بۆ دەردەکەوێت کە دەبنە توێشوی باوەڕدار لای خوای گەورە، بێگومان درێژی تەمەن لەگەڵ کردەوە چاکەکاندا، پلەو پایەیەکی بەرز و ڕێزدارن و ناز و نیعمەتێکی گەورەی خوایین، و بێگومان ئاوات خواستنی بە مردن لەکاتی بەلاْو ناڕەحەتی وەك نەخۆشی یان لەدەست دانی منداڵ یان هەژاری، ڕێگە پێدراو نیە، بەلاْم لەکاتی ڕوودانی فیتنەو ئاشوب لە دیندا و کاتێك باوەڕدار لە خۆی بترسێت تووشی فیتنە ببێت لە دینەکەیدا، ڕێگە پێدراوە، وەك پێشتر باسمان کرد ئەمە ئەوە ڕەتناکاتەوە کەسێك حەز بکات زوو بگاتەوە بەخوای گەورە، باوەڕدار حەزدەکات بگاتەوە بەخوای گەورە و لەهەموو کاتێك خۆی بۆ ئەوە ئامادە دەکات، و حەز بە دیداری پەروەردگاری دەکات و حەز دەکات ئەو پاداشتەی لای خوای گەورە دەست بکەوێت، بەلاْم کافر و لەخوا یاخی و سەرپێچی کاران بێگومان ڕقیان لە مردنە، چونکە لەزەتی دنیای لەدەست دەبڕێت، و دەترسێت لەو چارەنووسەی کە لەدوای مردن چاوەڕێی دەکات.

* خوای گەورە لە سوورەتی (البقرة) دا – کە ئەمە ماناکە یەتی – دەفەرمووێت: ((ئەی محمد (ﷺ) پێیان بڵێ: ئەگەر ڕاست دەکەن و باوەڕتان وایە کەماڵی ئەو دنیا (بەهەشت) لای خوا تایبەتمەندە بە ئێوە نەك خەڵکی تر، دە ئاواتی مردن بخوازن ئەگەر ڕاست دەکەن (تا زوو بچنە ناو بەهەشت)! (بەلاْم ئەوانە) هەرگیز بەهۆی ڕەفتاری نادروست و دەست پێشخەری ناپەسەندیانەوە ئاواتی مەرگ ناخوازن، خوایش چاك ئاگادارە لە حاڵی ستەمکاران، سوێندبێت ئەو جولەکانە دەبینیت کەلە هەموو خەڵك بە پەرۆشترن لەسەر دنیا و ژیانی دنیا بەهەر جۆرێك بێت، هەتا بگرە لە هاوەڵپەرست و موشریکەکانیش، هەریەك لەوانە ئاوات دەخوازێت کە: هەزار ساڵ تەمەنی بێت،

[٥٥٥] تفسير القرآن العظيم لأبن كثير ٢: ٤٩٢.

هەرچەندە وەنەبێت تەمەنی درێژیان لە سزا ڕزگاریان بکات، خوایش زۆر بینایە بەو کردەوانەی ئەنجامی دەدەن) (البقره: ٩٤-٩٦).

* (عائیشەی) هاوسەری پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: هەر کەسێك حەز بە دیداری خوا بکات، و خوایش حەز بە دیداری ئەو دەکات، و هەرکەس حەز لەدیداری خوا نەکات،و خودایش حەز لەدیداری ئەو ناکات، (عائیشە) (خوا لێی ڕازی بێت) فەرمووی: منیش ووتم: جا خۆ ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کەسمان حەز لە مردن ناکەین، گوایە دەبێت خوایش حەز لە ئێمە نەکات؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (مەبەست ئەمە نییە کە تۆ تێی گەیشتویت) بەڵام مەبەست ئەوەیە، کاتێك موسڵمان لەسەرەمەرگدا فریشتەی ڕەحمەت و ڕەزامەندیی و ڕێز لێگرتنی خودایی موژدەی دەدەنێ لەگەڵ نازو نیعمەت و بەهرەی بەهەشتدا، ئیتر ئەویش هیچی وەك ئەو دنیا پێ خۆش نابێت، و حەز لە دیداری خودا دەکات و خودایش حەز بەدیداری ئەو دەکات، ناموسڵمانیش کاتێك کە مردن یەخەی پێ دەگرێت و موژدەی سزای سەختی خودای پێ دەدرێت، ئیتر هیچی تری وەك ئەو جیهان پێ ناخۆش نابێت،و حەز لەدیداری خودا ناکات و خودایش حەز لەچارەی ئەو ناکات.[٥٠٦]

## پشت بەستن بەخوا، گرتنەبەری هۆکارەکان ڕەتناکاتەوە

خوای گەورە لە سوورەتی (مریم)دا فەرمووی: ﴿ وَهُزِّي إِلَيْكِ بِجِذْعِ النَّخْلَةِ تُسَاقِطْ عَلَيْكِ رُطَبًا جَنِيًّا (٢٥) فَكُلِي وَاشْرَبِي وَقَرِّي عَيْنًا﴾(مريم:٢٥-٢٦).

* پشت بەستن بەخوای گەورە فەرمانێکی پێویست و شەرعییە، واتە کارەکان بدرێنە دەست خوای گەورە و تەسلیم بوون بەخوا ڕابگەیەنرێت، و باوەڕدار بزانێت کە نەخشەدانانی خوای گەورە چاکتر و خەیرترە لەو نەخشانەی کەخۆی بۆخۆیی دادەنێت، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ وَمَن يَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ فَهُوَ حَسْبُهُ﴾ (الطلاق:٣).

واتە: (هەر کەس پشت بەخوای گەورە ببەستێت، ئەوەی بەسە). لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿فَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ إِنَّكَ عَلَى الْحَقِّ الْمُبِينِ﴾ (النمل: ٧٩).

---

[٥٠٦] -رواه مسلم في صحيحه بألفاظ متقاربة كتاب الذكر و الدعاء

واتە: ((ئەی پێغەمبەر (ﷺ) ئەی ئیماندار) کەواتە تۆ پشت بەخوا ببەستە، بە ڕاستی تۆ لەسەر حەق و ڕاستییەکی ئاشکرایت).

* لە فەرموودەیەکدا پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: (ئەگەر ئێوە پشت بەخوا ببەستن بە حەق و ڕاستی، ئەوا بێگومان خوای گەورە ڕزق و ڕۆزیتان دەدات، وەك ڕزقی ئەو باڵندەیە دەدات کە بەیانی بە سکی بەتاڵ دەردەچێت و بەسکی تێر دەگەڕێتەوە)[٥٠٧]

پشت بەستن بە خوای گەورە گرتنە بەری هۆکارەکان ڕەت ناکاتەوە، مریم (علیها السلام) ڕزق و ڕۆزی لەلایەن خوای گەورەوە بۆ دەهات، کاتێك ئازاری منداڵ بوونەکەی بۆ هات، خوای گەورە فەرمانی پێ کرد کە قەدی دار خورماکە ڕابوەشێنێت ئەمە گرتنەبەری هۆکار بوو.

## سوودی خورمای تەڕ بۆ ئافرەتی تازە منداڵ بوو

خواردنی مەریەم لە خورمای تەڕو تازە، ئاماژەیەکی بۆ ئەو ڕاستی یە تێدایە کە زانستی پزیشکی جێگیری کردووە لە سوود و گرنگی خورمای تەڕ و تازە بۆ ئافرەتی تازە منداڵ بوو، بە جۆرێك کە لێکۆڵینەوە زانستییەکان جێگیریان کردووە کە بەڕاستی خورمای تەڕ و تازە کۆمەڵێك ماددەی بەسوودی تیایە کاری ماسولکەکانی ڕەحم بەهێز دەکات لە مانگەکانی کۆتایی سکپڕیدا و یارمەتی لەدایك بوونی کۆرپە دەدات لەلایەکەوە، و لەلایەکی تریشەوە نەزیفی خوێن کەم دەکاتەوە، کەلە دوای منداڵ بوون دروست دەبێت، هەروەها ئەو خورمایە ئەندازەیەکی زۆری لە شەکری سووك تیایە کە بە ئاسانی هەرس دەبێت و دەمژرێت، وەك شەکری (جلوکۆز) ئەوەیش زانراوە کە ئەم شەکرانە سەرچاوەی ووزەی بنەڕەتین و خواردنێکی بەهێز و بەسوودن بۆ ماسولکەکان. ماسولکەکانی ڕەحمیش لە بەهێزترینی ماسولکەکانی جەستەن و هەڵدەستن بە ڕۆڵیکی گەورە لە کاتی لە دایکبوونی کۆرپەدا، کاتێك زاناو شارەزایانی بواری منداڵ بوون هەڵدەستن بە پێدانی ئاو و شەکر بە ئافرەتانی سکپڕ، ئەوە بێگومان ئایەتەکە پێشتر ئاماژەی پێداوە، و فەرموویەتی ﴿فَكُلِي وَاشْرَبِي﴾، وەك ئەوەی کە بێگومان خورمای تەڕ

---

[٥٠٧] رواه الترمذي في السنن عن عمر بن الخطاب كتاب الزهد.

و تازە پەستانی خوێن لای ئافرەتانی سکپڕ دادەبەزێنێت لە ماوەیەکی کەمدا، پاشان دەگەڕێتەوە سەر حاڵی ئاسایی خۆی، بە نزمبونەوەی پەستانی خوێنیش، نەزیفی خوێن کەم دەبێتەوە، هەروەها ئەو جۆرە خورمایە ماددەیەکی نەرم کەرەوەیە بۆ قۆڵۆن، لە ڕووی زانستی پزیشکییەوە ئەوە زانراوە کە نەرم کەرەوە ڕووەکییەکان سودی هەیە لە ئاسانکردن و ئارامکردنەوەی کاری لە دایکبوندا.[508]

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَزُرُوعٍ وَنَخْلٍ طَلْعُهَا هَضِيمٌ﴾(الشعراء:١٤٨).

واتە: (لەناو بێستان و دارخورمادا کە خورمای ناسك و نەرم و بەتام دەگرێت) هەروەها خواردن و هەرسکردنی ئاسانە.

## سوود و ڕونکردنەوەیەك دەربارەی ( الصمت ) بێدەنگ بوون

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَكُلِي وَاشْرَبِي وَقَرِّي عَيْنًا فَإِمَّا تَرَيِنَّ مِنَ الْبَشَرِ أَحَدًا فَقُولِي إِنِّي نَذَرْتُ لِلرَّحْمَٰنِ صَوْمًا فَلَنْ أُكَلِّمَ الْيَوْمَ إِنسِيًّا﴾(مريم:٢٦). بێ دەنگ بوون سوود و حیکمەتی خۆیی هەیە، هەندێك لە زانایان وتویانە: پابەندبە بە بێ دەنگیەوە، دەبیتە داناو حەکیم، یەکێك لە ڕەوانبێژانیش وتوویەتی:ڕەنگە کەسێکی بێدەنگ بوو ڕەوانبێژتربێت لە کەسێکی قسەکەر، هەندێك لە ئەدیبانیش وتویانە: کەسی بێدەنگ بەختەوەرە لە زمانی، و قسەکردنیشی توێشو خۆراکە، هەندێك لە زمانپاراوانیش وتویانە: زمانت بگرە تەنها لە ڕوونکردنەوەی حەق و ڕاستیدا نەبێت، یان ناحەقیەکی پێ داپۆشێت و لایبەرێت، یان حیکمەتێکی پێ بلاو بکەیتەوە، یان نیعمەتێکی پێ باسبکەیت و دەریبخەیت.[509]

بێدەنگ بوونی مەریەم (علیها السلام) بۆ ئەوە بوو، تا ڕێگە بدات بە کەسێکی تر کە بەڕێزتر و زمانپاراوتر بوو لە خۆی تا بێتاوانی و داوێنپاکی مەریەم بۆ ئومەتەکەی ڕونبکاتەوە و جێگیربکات، بێگومان قەومەکەی لە بێمێشکی و نەفامیدا گەیشتبوونە ئاستێکی بەرز، کە مەریەمیان تۆمەتبار کردبوو، لە کاتێکدا کە پاك و داوێنپاك بوو،

---

[508] مع الطب في القرآن الكريم تأليف د. عبد الحميد دياب، د. أحمد قرقوز ص٢٨–٢٩.

[509] – أدب الدنيا والدين للماوردي ص:٣٣١.

بەوەی کە بێتاوان بوو لەوەی کە ئەوان باسیان دەکرد، لەگەڵ ئەوەشدا قسەکردنی لێ قەدەغەکرابوو، هەروەها لەمەیشدا ئاماژە بۆ ئەوە هەیە کە پشتی لە قەومە بێمێشك و خراپەکارەکەی کردبوو، و خۆی لێ بەدوور دەگرتن.

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ وَعِبَادُ الرَّحْمَٰنِ الَّذِينَ يَمْشُونَ عَلَى الْأَرْضِ هَوْنًا وَإِذَا خَاطَبَهُمُ الْجَاهِلُونَ قَالُوا سَلَامًا ﴾(الفرقان:٦٣).

واتە: (بەندەکانی خوای میهرەبان ئەو کەسانەن کە زۆر بە هێمنی و سەلاری بەسەر زەویدا دەڕۆن، کاتێکیش نەفامان بە قسەو قسەلۆکی ناخۆش بەرەنگاریان دەبن، لە وەڵامیاندا دەڵێن: سلاو (ڕەوشت بەرزی خۆیان دەنوێنن) لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿خُذِ الْعَفْوَ وَأْمُرْ بِالْعُرْفِ وَأَعْرِضْ عَنِ الْجَاهِلِينَ﴾(الأعراف:١٩٩).

واتە: (کاری ئاسان لە خەڵکی داوا بکە و چاوپۆشی لە هەڵە و کەم و کوڕییەکانیان بکە و فەرمان بدە بە چاکە و کردەوەیەك کە پەسەندی شەرعە، و ڕوویش وەرگێڕە و پشت بکە لە نەفام و تێنەگەیشتوان)پشت کردن لەنەفام و تێنەگەیشتوان لە پیشەی کەسانی ژیر و بەڕێزە.

## حوکمی نەزرکردن لەسەر بێدەنگ بوون لە شەریعەتی خۆماندا

هەرکەس پابەند بوو بەوەی کە قسە لەگەڵ هیچ مرۆڤێکی تردا نەکات، یان نەزری کرد بێدەنگ بێت، ئەمە لەگەڵ ئەوەی کە لە شەریعەتەکانی پێشودا ڕێگە پێدراو بووە، ئەوا لە شەریعەتی ئیسلامدا ڕێگەی پێنادرێت.

لە شەریعەتی ئیسلامی خۆماندا ڕێگە بەکەس نادرێت کە نەزر بکات لەسەر بێدەنگ بوون و قسەنەکردن، چونکە ناڕەحەت بوون و سزای دەروونی تیایە.

لە(صحیح)ی (بوخاری)دا، لە (إبن عباس)ەوە، فەرموی: جارێکیان پێغەمبەر (ﷺ) وتاری دەدا پیاوێکی بینی لەبەر هەتاو ڕاوەستابوو، پرسی: بۆچی ئەو پیاوە وا بەپێوە ڕاوەستاوە؟ وتیان: ئەوە (أبو إسرائيل) ئەبوو ئیسرائیلە، نەزری کردووە کە بە پێوە لە بەر خۆ ڕابوەستێت و دانەنیشێت و نەچێتە بەر سێبەر و قسەنەکات و لەهەمان کاتدا

بەڕۆژوش بێت، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (فەرمانی پێبکە و لەزمانی منەوە پێی بڵێ: کە قسە بکات و بچێتە بن سێبەر و دابنیشێت، بەڵام با ڕۆژووەکەی تەواو بکات. [٥١٠]
بە کورتی لە شەریعەتی ئیسلامدا ڕێگە نادرێت نەزر بکرێت لەسەر بێدەنگ بوون و قسەنەکردن.

## ئەو پەند و وانانەی کە پەیوەندییان بە چیرۆکی یەحیا و زەکەریا (علیهما السلام)ەوە هەیە

### - حەز لە منداڵ فیترەتێکی ئینسانی یە

نەفسەکان لەسەر حەزکردن لە منداڵ ڕاهاتوون، منداڵ بینایی چاوەکانە و، بەروبومی دڵەکان و جگەرگۆشە و خۆشی و دەرون و جوانی ژیانی دونیایە.
خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَعُرِضُوا عَلَى رَبِّكَ صَفًّا لَّقَدْ جِئْتُمُونَا كَمَا خَلَقْنَاكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ بَلْ زَعَمْتُمْ أَلَّن نَّجْعَلَ لَكُم مَّوْعِدًا﴾(الكهف:٤٦).

واتە: (ماڵ و سامان و وەچە زینەت و جوانین بۆ ژیانی دونیا بەڵام دڵنیابن کردەوە چاکەکان کە بەرهەمیان دەمێنێتەوە، پاداشتیان چاکترە لای پەروەردگارت و ئومێد و هیوای چاکتریشی لێ دەکرێت بۆ خاوەنەکانیان).
منداڵ و وەچە بەخششی خوای گەورە و ناز و نیعمەتە لەلایەن خۆیەوە، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿لِلَّهِ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ يَخْلُقُ مَا يَشَاءُ يَهَبُ لِمَنْ يَشَاءُ إِنَاثًا وَيَهَبُ لِمَن يَشَاءُ الذُّكُورَ(٤٩) أَوْ يُزَوِّجُهُمْ ذُكْرَانًا وَإِنَاثًا وَيَجْعَلُ مَن يَشَاءُ عَقِيمًا إِنَّهُ عَلِيمٌ قَدِيرٌ﴾(الشورى:٤٩-٥٠).

واتە: (هەر بۆ خوایە خاوەنداریێتی ئاسمانەکان و زەوی، هەرچی بوێت دروستی دەکات، بە هەرکەس کە بیەوێت کوڕ دەبەخشێت، یاخود لە هەردوو جۆر، بە هەندێك خێزان دەبەخشێت، لە کوڕ و لە کچ، هەیشە ویستی خوا وایە هیچی نەداتێ و نەزۆك بێت، بەڕاستی ئەو زاتە زانا و بەدەسەڵاتە). لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿وَاللَّهُ جَعَلَ لَكُم

---

[٥١٠] رواه البخاري في صحيحه كتاب النذور الأيمان.

مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَاجاً وَجَعَلَ لَكُم مِّنْ أَزْوَاجِكُم بَنِينَ وَحَفَدَةً وَرَزَقَكُم مِّنَ الطَّيِّبَاتِ أَفَبِالْبَاطِلِ يُؤْمِنُونَ وَبِنِعْمَتِ اللَّهِ هُمْ يَكْفُرُونَ﴾(النحل:٧٢).

**واتە: (خوا هەر لە خۆتان هاوسەرانی بۆ فەراهەم هێناون، هەر لە ڕێگەی هاوسەرانتانەوە کوڕ و کوڕەزای پێ بەخشیون و لە هەموو ڕزق و ڕۆزییەکی چاك و پاك و بەسوود بەهرەوەری کردوون (لەگەڵ ئەو ڕاستیانەدا) ئایا ئەوانە هەر بڕوا بەشتی پوچ و ناحەقی دەکەن و لە بەرامبەر ناز و نیعمەتەکانی خواوە ئەوانە هەر ناشوکر و بێ باوەڕ دەبن)**

**دایك بۆنی منداڵە بچووکەکەی خۆی لەلا خۆشترە لە هەموو بۆنە خۆشەکانی تر.**

**پرسیارکرا لە ئافرەتێك دەربارەی ئەو منداڵەی کە زۆر خۆشەویستە لای، ئەویش وتی: بچووکەکەیان تا گەورە دەبێت، نەخۆشەکەیان تا شیفای بۆ دێت و چاك دەبێتەوە، گەشتیارەکەیان تا دەگەڕێتەوە.**

**بێگومان ئیسلام هات بەلاّم ئەم فیترە پاك و جوانەی نەسڕیەوە، و ئەم خۆشەویستییە ڕەت ناکاتەوە، ئەوە باوکی پێغەمبەران (علیهم السلام) لە خوای گەورە دەپاڕێتەوە دەفەرموێت:** ﴿رَبِّ هَبْ لِي مِنَ الصَّالِحِينَ﴾(الصافات:١٠٠).

**واتە: (پەروەردگارا، نەوەیەکی چاك و پاکم پێ ببەخشە).**

**پاشان خوای گەورە وەڵامی دوعا و پاڕانەوەکەی دەداتەوە، منداڵی چاکی پێ دەبەخشێت، دەفەرموێت:** ﴿فَبَشَّرْنَاهُ بِغُلَامٍ حَلِيمٍ﴾(الصافات:١٠١).

**واتە: (ئێمەیش مژدەی کوڕێکی بەئارام و خۆگر و ژیرمان پێ بەخشی کە _ ئیسماعیل_ بوو).**

**هەروەها خوای گەورە فەرمووی:** ﴿وَبَشَّرْنَاهُ بِإِسْحَاقَ نَبِيّاً مِّنَ الصَّالِحِينَ﴾(الصافات: ١١٢).

**واتە: مژدەی هاتنە دنیای ئیسحاقیشمان پێ بەخشی، کە ئەویش پێغەمبەرێکە لە چاکان).**

**خوای گەورە لە وەسفی بەندە چاکەکانی (الرحمن)دا فەرموویەتی:** ﴿وَالَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا هَبْ لَنَا مِنْ أَزْوَاجِنَا وَذُرِّيَّاتِنَا قُرَّةَ أَعْيُنٍ وَاجْعَلْنَا لِلْمُتَّقِينَ إِمَاماً﴾(الفرقان:٧٤).

**واتە: (بەندە چاکەکان ئەو کەسانەن کەدەڵێن: پەروەردگارا لە هاوسەران و نەوەکانمان کەسانێکمان پێ ببەخشە کە ببنە مایەی ڕووناکی و دیدەمان و شادومانی دڵمان و**

بمانکە بە پێشەوا بۆ پارێزگاران و خواناسان) زەکەریا پێغەمبەر (علیه السلام) لە خوا دەپارێتەوە و داوای منداڵی لێ دەکات و دەفەرموێت: ﴿قَالَ رَبِّ هَبْ لِي مِن لَّدُنكَ ذُرِّيَّةً طَيِّبَةً إِنَّكَ سَمِيعُ الدُّعَاءِ﴾. (بێگومان پێغەمبەری خوا (ﷺ) هانی داوین لە سەر دیاری کردن و هێنانی هاوسەرێك کە منداڵی ببێت، و دوعاو پاڕانەوەی بۆ (انس ی کوڕی مالك) کرد کە منداڵیان زۆربێت، فەرمووی: (.. ئەی خودایە ماڵ و منداڵی بۆ زۆر و زیاد بکەیت و بۆی فەڕو بەرەکەتدار بکەیت ئەوەی کە پێت بەخشیوە).[٥١١]

خوای گەورەیش بەڕاستی وەڵامی دوعاکەی پێغەمبەر (ﷺ) ی دایەوە و ماڵ و منداڵ و نەوەی زۆری پێ بەخشی و بۆی فەڕو بەرەکەتدار کرد.

* پێغەمبەری خوا (ﷺ) نەهی کردووە کە مرۆڤ خۆی بە ڕەبەنی بهێڵێتەوە، چونکە پێچەوانەی فیترەتە و لادانە لە سروشتی ئینسانی و بێ بەش بوونی خاوەنەکەیەتی لە منداڵ (سعدی کوڕی أبی و قاص) (خوا لێی ڕازی بێت) فەرمووی: (عثمانی کوڕی مظعون) ویستی لێ ببڕێ بۆ خوا و واز لە دنیا بهێنێت بەڕەبەنی بژی و ژن نەهێنێت، پێغەمبەریش (ﷺ) ڕێگەی ئەوەی نەدا، ئەگەر پێغەمبەر (ﷺ) بۆ ئەو کارە ڕێگەی ئەوی بدایە، ئێمەیش خۆمان دەخەساند و تەرکی دنیا و ژنهێنانمان دەکرد و سەرمان دەکردە خواپەرستی هەتا مردن).[٥١٢]

خۆش ویستنی منداڵ خواستێکی ئینسانی و سوننەتێکی فیترییە کە ئیسلام دانی پیادا ناوە، (عائیشە) (خوا لێی ڕازی بێت) فەرمووی: عەرەبێکی دەشتەکی هات بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) پێی وت:ئایا ئێوە منداڵی خۆتان ماچ دەکەن؟ ئێمە شتی وانا کەین و منداڵی خۆمان ماچ ناکەین پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرموو: (جامن دەستەڵاتی چیم هەیە بۆت؟ تۆ کە خودا خۆی ڕەحمەتی لە دڵت سڕیوەتەوە، من دەستە ڵاتی چیم هەیە بۆت؟).[٥١٣]

لێرەدا: بێگومان داوای منداڵی چاك فەرمانێکی پەسەند و خوازراوە، منداڵی چاك ڕەحمەت و بەزەیی و نیعمەتە لەلایەن خواوە، هەر بە هۆی ئەوەشەوە ماڵ و کۆمەڵگا

---

٥١١ – رواه البخاري في صحيحه، كتاب الدعوات.

٥١٢ – رواه البخاري في صحيحه كتاب النكاح.

٥١٣ – رواه البخاري في صحيحه كتاب الأداب، ورواه مسلم في صحيحه كتاب الفضائل.

چاك دەبێت و ژیان ڕاگیراو و ڕێك دەبێت، پێویستە لەسەرمان منداڵەکانمان ئامادە بکەین و ئەدەبی جوانیان فێر بکەین و پەروەردەیان بکەین تا چاك و چاکە کابن.

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَالَّذِينَ آمَنُوا وَاتَّبَعَتْهُمْ ذُرِّيَّتُهُم بِإِيمَانٍ أَلْحَقْنَا بِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ وَمَا أَلَتْنَاهُم مِّنْ عَمَلِهِم مِّن شَيْءٍ كُلُّ امْرِئٍ بِمَا كَسَبَ رَهِينٌ﴾(الطور:٢١).

واتە: (ئەوانەی باوەڕیان هێناوە و نەوەکانیشیان بە ئیمان و باوەڕەوە شوێنیان کەوتوون، ئەوانە لە بەهەشتدا پێك شاد دەکەینەوە (تا کامەرانی و خۆشیان زیاتر بێت) وە نەبێت ئەوانەی کە پلەی بەرزیان دەست کەوتووە دایان بەزێنن بۆ پلەی نزمتر، چونکە ئێمە پاداشتی کردەوەی کەس کەم ناکەینەوە(ئەگەر زیادی نەکەین). لەهەمان کاتدا هەرکەس بارمتەی کردەوەی خۆیەتی).

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: (بەڕاستی خوای گەورە پلەی بەندەی چاکەکار لە بەهەشتدا بەرز دەکاتەوە، هەتا دەڵێت: (ئەی پەروەردگارا من ئەم پلە بەرزەم لەکوێ بوو، پێی دەفەرموێت: بەهۆی داوای لێخۆشبوونی منداڵەکەتەوە بۆ تۆ). [٥١٤]

(ابو هريرة) دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (کاتێك کەسێك مرد، دەست بەرداری هەموو کردرێك دەبێت، جگە لە سێ شت: خێرێکی نەبڕاوە و بەردەوام یان زانستێك کە سوودی لێ ببینرێت، یان منداڵێکی باشی هەبێت نزای خێری بۆ بکات). [٥١٥]

## ڕوونکردنەوەیەك دەربارەی ئەدەبی دووعا کردن

دوعا و پاڕانەوەکەی زەکەریا (عليه السلام) ئەدەبی زۆر و مانای بەرز و جوانی تێدا بوو، لێرەدا هەندێکیان باس دەکەن: لەئایەتی: ﴿إِذْ نَادَىٰ رَبَّهُ نِدَاءً خَفِيًّا﴾. ئەوە دەگەیەنێت کە گەورەترین دوعا ئەوەیە لە نهێنی و شارەوەییدا بکرێت، چونکە زۆر نزیکە لە (إخلاص) دڵسۆزی و خشوع و تکای زیاترە بۆ قبوڵ بوون، لە دوعاکەی زەکەریاوە ئەوە فێر دەبین کە ئەو بەدوای کاتە بەنرخ و پیرۆزەکاندا دەگەڕا، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿هُنَالِكَ دَعَا زَكَرِيَّا رَبَّهُ قَالَ رَبِّ هَبْ لِي مِن لَّدُنكَ ذُرِّيَّةً طَيِّبَةً إِنَّكَ سَمِيعُ الدُّعَاءِ﴾. بێگومان کاتێك زەکەریا

---

[٥١٤] رواه الأمام أحمد في مسنده بإسناد صحيح عن أبي هريرة المسند ٢: ٥٠٩ و رواه الطبراني في الدعاء.

[٥١٥] رواه مسلم في صحيحه، كتاب الوصية.

مەریەمی بینی لە ڕێزلێگیراویدا بوو ئیمانی زیاد دەبوو، هەروەها دڵنیاییشی زیادی دەکرد، ئینجا دەستی کرد بە دوعا و پاڕانەوە کە لە شوێنێکی بەرز و پیرۆز و پایەداردا بوو، لەناو ماڵی پیرۆزی خوادا بوو، کە لەوێدا خەیر و بەرەکەت و بەزەیی دەڕژا بەسەردا، بێگومان بەرەکەتی کات لەگەڵ بەرزی پلە و پایە و بەرزی حاڵەتەکە، کە ئەو دوعای تێدا دەکرد کۆببووبونەوە، هەموو ئەم هۆکارانەیش لە پێش و بەهێزن بۆ قبوڵ بوون.

* لەو کاتە پیرۆز و بەنرخانەیش کە دوعای تیا وەڵام دەدرێتەوە: لە مانگەکانی ڕەمەزان – لە هەفتەدا ڕۆژی هەینی، دە ڕۆژی یەکەمی مانگی (ذی الحجة) و دەرۆژی کۆتای مانگی ڕەمەزان (ليلة القدر)، و کاتی بەرەبەیان و نێوانی بانگ و قامەت، و کاتی جیهاد و تێکۆشان لە ڕێگەی خوادا و کاتی باران بارین و، و کاتی قورئان خەتم کردن، و کاتی قنوت و سوجدە بردن و دوای (تحيات) لەناو نوێژدا، و دوای سەلام دانەوە و کاتی بەرۆژو بوون و ئامدەبوونی دڵ و خاوێن کردنەوەی دەرون. کاری جوان و دروست بۆ کەسی دوعاکار پێویستە لەکاتی پاك و خاوێنیدا بێت، و لە نیەتیدا دڵسۆز بێت و ڕووی کردبێتە قیبلە و تەوبەی کردبێت و، بەدوای خواردنی حەڵاڵ و پاکدا بگەڕێت. دوعا کردن لە مزگەوتدا نزیکترە بۆ قبوڵ بوون و وەڵامدانەوە. ئەو کەسەی دوعا و پاڕانەوە دەکات، پێویستە بە سوپاس و ستایشی خوای گەورە و سڵاوات دان لەسەر پێغەمبەر دەست پێ بکات و جوانترین و پیرۆزترین ووشە بۆ دوعاکانی دیاری بکات و هەڵبژێرێت و دەبێت دڵی ئامادە و سازش بێت و زۆر بەئاگا و ووریا و بێت و تکای گەورە و زۆر لە خوای گەورە بکات، بێگومان خوای گەورەیش بیسەر و نزیك و وەڵامدەرەوەیە.

## فەزڵ و گەورەیی (بەردەوامی) لەسەر یادی خوا

یەکێك لەو وانە گرنگ و بەسودانەی لەچیرۆکی زەکەریا(علیه السلام)دایە، فەزڵ و گەورەیی بەردەوامییە لەسەر یادی خوا، زیکر و یادی خوای گەورە لە گەورەترینی ئەو کردەوانەیە کە بەندەی پێ نزیك دەبێتەوە لە خوا، خوای گەورە فەرمانی پێ کردووین بە بەردەوامی لەسەر زیکر و یادی خوا، فەرموویەتی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اذْكُرُوا اللَّهَ ذِكْرًا كَثِيرًا (٤١) وَسَبِّحُوهُ بُكْرَةً وَأَصِيلًا﴾(الاحزاب: ٤١-٤٢).

واتە: (ئەی ئەو کەسانەی ئیمان و باوەڕتان هێناوە زۆر زۆر یادی خوا بکەن (هەمیشە ناوی پیرۆزی ئەوتان لەیاد بێت لە دڵ و دەروونتانا جۆش بخوات و بێتە سەر زارتان و تەسبیحات و ستایشی بکەن (هەموو کاتێك، بەتایبەت لە بەیانیان و دەمەو ئێواراندا).

لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿فَاذْكُرُونِي أَذْكُرْكُمْ وَاشْكُرُوا لِي وَلَا تَكْفُرُونِ﴾(البقرە:١٥٢).

واتە (ئەی ئیمانداران ئەگەر یادی من بکەن، منیش یادی ئێوە دەکەم و سوپاسگوزاری من بن و سپڵەیی بەرامبەرم مەکەن).

﴿الَّذِينَ يَذْكُرُونَ اللَّهَ قِيَامًا وَقُعُودًا وَعَلَى جُنُوبِهِمْ وَيَتَفَكَّرُونَ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَذَا بَاطِلًا سُبْحَانَكَ فَقِنَا عَذَابَ النَّارِ﴾(ال عمران:١٩١).

واتە: (ئەوانەی یادی خوا دەکەن لە کاتێکدا کە بەپێوەن یان دانیشتوون یان ڕاکێشاون (لە هیچ حاڵەتێکدا یادی ئەو زاتە فەرامۆش ناکەن) هەمیشە بیردەکەنەوە لە دروستبوونی ئاسمانەکان و زەوی (بیردەکەنەوە لە هەموو ووردەکارییەك، سەرنجی هەموو دیاردەیەك دەدەن، سەرئەنجام دەڵێن): پەروەردگارا تۆ ئەم هەموو دروستکراوانەت بێ هودە و بێ ئامانج دروست نەکردووە، پاکی و بێگەردی شایستەی تۆیە، دە تۆیش بمانپارێزە لە سزای ئاگری دۆزەخ). زەکەریا پێغەمبەر (علیە السلام) سەرەڕای ئەوەی زمانی بەسترا بوو لە قسەکردن لەگەڵ خەلکیدا، بەڵام خوای گەورە فەرمانی پێ کرد کە زیکر و یادی خوای گەورە بکات: ﴿قَالَ رَبِّ اجْعَلْ لِي آيَةً قَالَ آيَتُكَ أَلَّا تُكَلِّمَ النَّاسَ ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ إِلَّا رَمْزًا وَاذْكُرْ رَبَّكَ كَثِيرًا وَسَبِّحْ بِالْعَشِيِّ وَالْإِبْكَارِ﴾(ال عمران:٤١).

## وانەیەکی گرنگ لە بانگەواز کردن بۆ لای خوا لە چیرۆکی زەکەریا و یەحیا( علیهما السلام )دا

زەکەریا پێغەمبەر (علیە السلام) وانەیەکی گرنگمان فێردەکات لە بانگەواز کردن بۆ لای خوا، کە ئەویش بریتییە لەوەی کە بانگخواز نابێت هیچ کات لە بانگەواز خۆی دابرنێت، و بە بانگەوازەوە بژی و مامەڵەی پێوە بکات لە هەموو کات و شوێنێکدا و لە هەموو

حاڵەتێکدا، ونابێت کەم و کوڕی تیا بکات، ئیتر بەربەست و ناڕەحەتیەکان هەرچەند ڕێگرین، بە هەرچی لە توانا و دەسەلاتیدایە بۆی ئامادە بکات و ووزە و توانا و هەنگاونانێك بەکەم نەزانێت، با خۆی لە خۆیدا کەمیش بێت. زەکەریا (علیه السلام) قسە کردنی لێ قەدەغە کرابوو، بە لام لە بانگەواز کردنیدا پشتی بەستبوو بە ئاماژە کردن کە لە جێگای قسە کردن بوو، و هۆکارێکیش بوو لە هۆکارەکانی دەربڕین و گەیاندن.

خوای گەورە فەرمووی: ﴿فَخَرَجَ عَلَى قَوْمِهِ مِنَ الْمِحْرَابِ فَأَوْحَى إِلَيْهِمْ أَن سَبِّحُوا بُكْرَةً وَعَشِيًّا﴾ (مريم:١١). کاتێك بانگخوازان بێبەش کران لە هۆکارەکانی بانگەواز کردن دەبێت پەنا بەرنە بەر ڕێگا و شێوازی تر، ئەگەر دەرگاکەی بەردەمیان بە ڕوویاندا داخرا، دەبێت لە دەرگایەکی تر بدەن، هەرکەس بەردەوام لە دەرگاکان بدات ئەوا لێی دەکرێتەوە و بەرهەمدار دەبێت. پێویستە بانگخوازانی ڕێگەی خوا خۆیان بە خۆڕاگری و دڵنیایی بەهێز بکەن، و دەبێت بزانن کە بانگەوازکردن بۆ لای خوای گەورە وەك چۆن تایبەتمەندی و ڕێزە، لەگەڵ ئەوەیشدا بەرپرسیارێتی و تەکلیفە، لەگەڵ ئەوەی کارێکی جوان و ناوازەیە، بەلام ڕێگایەکی قورس و دڕکاویشە. داواکارین خوای گەورە دامەزراو و خۆڕاگرمان بکات لەسەر ڕێگای حەق و ڕاستی، و دڵسۆزی و ڕستگۆییمان پێ ببەخشێت.

* لەسەر باوکان و دایکان پێویستە کە جوانترین و خۆشەویسترین ناو بۆ منداڵەکانیان هەڵبژێرن و خۆیان لەناوە ناخۆش و ناپەسەندەکان بپارێزن.

* لەو ئایەتەدا کە خوای گەورە (یحیی) ی بە ﴿سيداً و حصوراً﴾. باس کرد، ڕونکردنەوەیەك دەدەین:

* (سیادة) گەورەیی ڕاستی و حەقیقی لە گوێڕایەڵی فەرمانی خوا و تەقوا و زانست و کارکردندایە. بەڕاستی ئەوەی ئەم وتەی فەرمووە، جوانی فەرمووە: لە خواترسان گەورەن، و زانایان پێشەوان و دانیشتن لەگەڵیاندا زیادە سوودە.

* لە ئایەتی: ﴿وَحَصُورًا﴾ لەم سیفەتەوە کە خوای گەورە (یحیی)ی پێ باسکرد، ئەوە وەردەگرین کە گرتنی نەفس لە شەهوەت و ئارەزووەکان فەرمانێکی پەسەند و جوانە و داوایەکی خوازراوە.

* لە ئایەتی: ﴿وَآتَيْنَاهُ الْحُكْمَ صَبِيًّا﴾ ڕێنماییە بۆ دایکان و باوکان کە بەجوانی و چاکی پەروەردەی منداڵەکانیان بکەن هەر لە سەرەتا و بچوکییانەوە، و بەشێوەیەك منداڵەکانیان ئاراستە بکەن کە سوود لە ژیان و هەواڵی پێغەمبەران وەربگرن بە تایبەتی کاتی منداڵی و بچوکیان.

*لە ئایەتی: ﴿وحنانا من لدنا﴾ ئەوە دەگەیەنێت کە سیفەتی بەزەیی و خۆشەویستی لە سیفەتە فیتریەکانە، کە خوای گەورە خستویەتییە ناو دڵی ئەو بەندانەی کە خۆی خۆشی دەوێن، بانگخوازی ڕێگەی خوا پێویستە خۆی بە سیفەتەکانی بەزەیی و خۆشەویستی و نەرم و نیانی برازێنێتەوە. (عائیشە) (خوای لێی ڕازی بێت دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (ئەی عائیشە بە ڕاستی خوا نەرم و نیانە و نەرم و نیانیشی خۆش دەوێت ئەوەی لە نەرم و نیانیشدا دەیبەخشێت لە توڕەیدا نایبەخشێت لە هیچ بارو دۆخێکی تریشدا نایبەخشێت).[٥١٦]

* هەروەها لە ﴿وزكواة﴾ کە باسە (یحیی) (علیه السلام)ی پێکرد، واتە پاکی و گەشەکردن، لێرەدا پاکی بریتییە لە پاکی نەفس و دڵ و دەرون، گە شەکردنیش بریتییە لە بەرزبوونەوە لە پلە و پایەوە ڕێزدارکردن و ڕەزامەندی پێویستە بانگخوازی ڕێگەی خوا هەڵبکات و کاربکات لەسەر پاکڕاگرتنی دەرون و گوێڕایەڵی و نزیك بوونەوە و زانست و کارکردن بەیەکەوە کۆبکاتەوە و بەدڵسۆزی ئەنجامیان بدات، تا بانگەوازەکەی سەرکەوتوانە بێت، ئەو کەسانەی کە هەڵدەسن بە کاری بانگەواز و لێهاتوو وئامادەن پێویستە جەخت بکەنەوە لەسەر لایەنی کرداری، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَمَنْ أَحْسَنُ قَوْلًا مِّمَّن دَعَا إِلَى اللَّهِ وَعَمِلَ صَالِحًا وَقَالَ إِنَّنِي مِنَ الْمُسْلِمِينَ﴾(فصلت:٣٣).

واتە: (چاکێ لەو کەسە جوان گوفتارتر و قسەی بەجێتره کە بانگەوازی کردووە بۆ لای خوا، کار و کردەوەی چاکیشی ئەنجامداوە، و وتوشیەتی: بەڕاستی من لە ڕیزی موسڵماناندام).

*هەروەها لە﴿وكان تقيا﴾ کە خوای گەورە وەسفی (یحیی)ی پێکرد، ڕێنماییمان دەکات بۆ گرنگی و بایەخی تەقوا و لە خواترسان کە نهێنی سەرکەوتنە و ڕێگای سەرفرازی و

[٥١٦] –رواه مسلم في صحيحه كتاب البّرو الأداب والصّلة.

بەختەوەرییە، خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿وَاتَّقُوا اللَّهَ وَيُعَلِّمُكُمُ اللَّهُ وَاللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ﴾ (البقرة:٢٨٢).

واتە: (لەخوا بترسن و خۆپارێز بن، و خوا فێری ئەو شتانەتان دەکات (کە خەیری تیایە بۆ دنیا و پاداشتی قیامەتی لەدوایە) و خوا بە هەموو شتێك زانایە). لە ئایەتێکی تردا دەفەرمووێت: ﴿قَالَ إِنَّمَا يَتَقَبَّلُ اللَّهُ مِنَ الْمُتَّقِينَ﴾(المائیده:٢٧).

واتە: (خوای گەورە تەنها لە پارێزکاران قوربانی و چاکە وەردە گرێت).

* هەروەها لە ئایەتی: ﴿ وَبَرًّا بِوَالِدَيْهِ وَلَمْ يَكُن جَبَّارًا عَصِيًّا﴾(مریم:١٤). ئەوە دەگەیەنێت کە بانگخواز لە خۆیدا پێشەنگ، و بە بەزەیی یە بە دایك و باوکی، چاکەیان لەگەڵ دەکات، بەوەیش دەگاتە بەرەکەت و ڕەزامەندی ئەوان و دوعای خەیریان سودی پێ دەگەیەنێت، بانگخواز هەمیشە ڕاستی و حەق دەڵێتەوە، خۆی بە گەورە نازانێت بەسەر دروستکراوەکاندا و هەوڵ دەدات خۆی لە سەرپێچی و تاوان بپارێزێت و بەدوای گوێڕایەڵیدا دەگەڕێت.

* هەر کەس خۆی بەم وەسفە جوانانە برازێنێتەوە کە لە یەحیا پێغەمبەری خوادا (علیەالسلام) کۆبوونەتەوە، بێگومان ڕێگای هیدایەت و سەرفرازی وئارامی وهێمنی دۆزیوەتەوە.

## خێزانەکەی زەکەریا ( علیهما السلام )

خێزانەکەی زەکەریا(علیه السلام) ئەو ئافرەتە چاکەکارە راستگۆ ئارامگرە بوو کە لەماڵی چاکەکاریدا گەورە بوو بوو،و بە نەزۆکی تاقی کرایەوە،و لەسەر ئەم کردەوەیە ئارامی گرت و ڕووی کردە گوێڕایەڵی و فەرمانبەرداری خوای گەورە و پێشبرکێ لە خەیر و چاکەدا و بەردەوام بوون لەسەر بانگەوازی چاکان، خوای گەورە لە وەسفی ئالی زەکەریادا فەرموویەتی: ﴿إِنَّهُمْ كَانُوا يُسَارِعُونَ فِي الْخَيْرَاتِ وَيَدْعُونَنَا رَغَبًا وَرَهَبًا وَكَانُوا لَنَا خَاشِعِينَ﴾(الانبیاء:٩٠). بەڕاستی خوای گەورە وەڵامی دوعا و پاڕانەوەکەی زەکەریا (علیه السلام)ی دایەوە و خێزانەکەی بۆ چاك کرد، بەوەی کە گونجاو و لەبار بێت و سکپڕ بوون و منداڵ بوون پاش ئەوەی کە نەزۆك بوو، بەوەی کە چاکەی لەسەر چاکە بۆ زیاد

کرد و یەحیا (علیه السلام)ی پیٚ بەخشی، و کە پیٚغەمبەرایەتی و چاکەکاری لە باوکییەوە وەرگرت، و چاکەکار بوو بەرامبەریان و چاکەی لەگەڵ کردبوون.

## بەشی دەیەم
## ئافرەتان لەسەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) کە خوای گەورە قورئانی دەربارەیان دابەزاندووە

### باسی یەکەم:
### ئەوەی دەربارەی ڕوداوی (أفك) بوهتانی خاتوو عائیشە دابەزیووە:

ئەم باسە لە سێ تەوەرە پێك دێت:

تەوەرەی یەکەم: چیرۆکی ڕوداوی (أفك) کە لە هەردوو (صحیح)دا هاتووە.

تەوەرەی دووەم: تەفسیری شیکاری بۆ ئایەتەکانی کە لە ڕوداوی (أفك)دا دابەزیووە.

تەوەرەی سێ یەم: وانە و سوودە گرنگەکان:

١. حوکمی ئەو کەسانەی کە بوهتانیان بۆ دایکی ئیمانداران (عائیشە) و سەرجەم ئافرەتەکان و دایکانی باوەڕدار ڕێکخستووە.

٢. ئایا کردەوە چاکەکان بە ئەنجامدانی تاوانی گەورە بەتاڵ دەبنەوە؟

٣. بەرنامەی ئیسلام لە پاراستنی ئابڕو و شەرەفدا.

### پێشەکی و دەست پێك:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) تووشی زۆرێك لە ناڕەحەتی و گرفت و تاقی کردنەوەی قورس و گران هاتووە، حاڵی ئەویش وەك حاڵی سەرجەم پێغەمبەران (علیهم السلام) بووە، کە خوای گەورە بە شێوازی قورس تاقی کردونەتەوە. لەو تاقی کردنەوە قورسانەی کە تووشی پێغەمبەر (ﷺ) هات، بریتی بوو لەو شاڵاوە کوێرانە و هەڕەمەکییەی کە دەربارەی عائیشە کردیان، و بوهتانیان بۆ ڕێك خست، لە کاتێکدا کە ڕاستگۆ بوو، و کچی (أبو بكر الصديق) بوو. ئەوەی سەرپەرشتی ئەم تاوان و بوهتانە گەورەیەی کرد، بڕبڕەی پشتی دوو ڕووەکان بوو کە (عبدالله کوڕی أبي سلول) بوو. بوهتان و درۆکەی دروست کرد و بەناو هەموو مەدینە و دەورو بەریدا بڵاوی کردەوە، تا بەو کارە ئازاری

پێغەمبەر (ﷺ) بدات و، تانە و تەشەر لە پێغەمبەرایەتییەکەی بدات و تا سەرقاڵی بکات و لە بانگەوازەکەی دووری بخاتەوە و وێنەی پێغەمبەر لەبەرچاوی خەڵکی بشێوێنێت.
بەم جۆرە و بەڕاستی خوای پەروەردگار دەربارەی پاکی و بێتاوانی عائیشە دوا و ئایەتی دەربارەی دابەزاند، و ڕەدی ئەوەی دایەوە کە کافران و بوهتانچییان دروستیان کردبوو، خوای گەورە چەند ئایەتێکی ڕوون و ئاشکرای دابەزاند، کە جوبرەئیل هێنای بۆ سەر دڵی پێغەمبەر (ﷺ). ئەم ئایەتە پیرۆزانە پاکی عائیشەیان سەلماند لەو درۆ و بوهتانەی کە بۆیان ڕێك خستنوو، و شایەتی پاکی و بێتاوانیان بۆدا. چەند ئایەتێکی ڕوون بوون کە حوکمی گەورە و ڕونکەرەوەیان تیابوو

**تەوەرەی یەکەم:**

**چیرۆکی ڕووداوی ( إفك ) کە لە هەردوو ( صحیح )دا هاتووە:**

(الزهـرة) دەڵێت: (سعیدی کوڕی المسیب) و (عتبەی کوڕی الزبیر) و(علقمەی کوڕی وقاص) و(عبدالله ی کوڕی عبدالله ی کوڕی عتبەی کوڕی مسعود) بۆیان گێڕاومەتەوە دەربارەی ڕووداوەکەی (عائیشە)(خوا لێی ڕازی بێت) خێزانی پێغەمبەر (ﷺ) کاتێك بوختانچییەکان ئەوەیان دەربارەی وت کە وتیان. هەریەك لەوانە چمکێك لە ڕیوایەتەکەی عائیشەیان بۆ گێڕاومەتەوە، بەڵام هەندێکیان لە هەندێکی تریان باشتر لەبەریان کردبوو، چیرۆکەکەیان باشتر دەزانی، منیش لە هەریەکەیانەوە ئەوەم لەبەرکردووە کەبۆی گێڕاومەتەوە، قسەی هەندێکیشیان لەناویەکدا ڕاستی قسەی ئەوانی تریان دەسەلمێنێت، دەڵێن: (عائیشە) (خوا لێی ڕازی بێت)) خێزانی پێغەمبەر (ﷺ) وتویەتی:کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) بچوایە بۆ سەفەر، لەنێوان ژنەکانیدا کامەیان پشکیان بەرکەوتایە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەگەڵ خۆی دەیبرد، (عائیشە) (خوا لێی ڕازی بێت)دەڵێت: لە یەکێك لە غەزاکاندا، تیروپشکی کردوو من دەرچوم، منیش لەخزمەت پێغەمبەردا (ﷺ) ڕۆیشتم پاش دابەزینی (ئایەتی) حیجاب من لەو سەفەرەدا کە لەناو کەژاوەکەمدا هەڵدەگیرام و دادەنرام، کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) لە جەنگەکەی بویەوە و بڕیاری گەڕانەوەی داو لە مەدینە نزیك بووینەوە، شەوێکیان بڕیاری ڕۆیشتنی دا، منیش لەو کاتەدا ڕۆیشتم لەسوپاکە دوورکەوتمە[illegible] کاتێك پێویستی سەرئاوم

ئەنجامدا، گەڕامەوە بۆلای کۆچ وبارەکە، دەستم دا لە سنگ و بەرۆکم، سەیر دەکەم ئەو ملوانکەیەی کە لەمورووی (ظفار) بوو، بچڕابوویەوە، بۆیە گەڕامەوە بەدوای ملوانکەکەمدا دەگەڕام، ئەو گەڕانە دوای خستم، ئەو چەند کەسەی کە کەژاوەکەی منیان باردەکرد، کەمن سواری دەبووم، وایان زانی بوو کەمنی تێدام، ئەو کاتەیش ژنان سووکەڵە بوون، ئەوەندە قەڵەو و گۆشتن نەبوون، کەم خۆر بوون، هەر ئەوەندەیان دەخوارد کە پێی بژین، ئەو خەڵکەیش کاتێك کەژاوەکەیان هەڵگرتبوو، بەرزیان کردبۆوە هەستیان بەسووکی کەژاوەکە نەکردبوو، منیش تازە ساڵ و تازە پێگەیشتوو بووم، ووشترەکەیان هەستاندبوو ڕۆیشتبوون، منیش ملوانکەکەم دۆزییەوە دوای ئەوەی سوپاکە کەوتبووە ڕێ، کە هاتمەوە هەروارگەکەیان، سەیردەکەم کەسی تێدا نەماوە، منیش گەڕامەوە بۆ ئەو شوێنەی کەتیایدا بووم، وامزانی خەڵکەکە بۆم دەگەڕێن و دێنەوە بەدوامدا لە کاتێکدا کەمن دانیشتبوم لە شوێنی خۆما خەو زۆری بۆهێنام و خەوم پیاکەوت (صەفوان) ی کوڕی (المعطل السلمي) لەدوای سوپاکەوە سەرخەوی شکاندبوو، لە کۆتایی شەودا کەوتبووە ڕێ، دەمەو بەیان گەیشتبووە شوێنەکەی من، تارمایی زەلامێکی خەوتووی بینی و هات بۆلام و ناسیبوومی، چونکە پێش فەرزکردنی حیجاب منی بینی بوو، منیش بەدەم ﴿إنا لله وإنا إليه راجعون﴾ی ئەوەوە خەبەرم بویەوە، کاتێك ناسیمەوە کت وپڕ بەچمکی چارشێوەکەم ڕوخسارم داپۆشی، بە خوا نەهیچ قسەیەکی لەگەڵ کردم و نە هیچ ووشەیەکم لێ بیست جگە لە ﴿إنا لله وإنا إليه راجعون﴾، یەکسەر ووشترەکەی ئیخ داو پێی لەسەر دەستی دانا و منیش سواری بووم جڵەوی ووشترەکەی گرت و هێنامی تا گەیشتینەوە بە سوپاکە، پاش ئەوەی لەناو جەرگەی نیوەڕۆدا لەبەر گەرما لایاندا بوو، ئەوەی دەمی وەردا لەوباسەی من تیاچوو، ئەوەی پشکی هەرە گەورەی بەرکەوت (عبدالله کوڕی أُبي کوڕی سلول) بوو، کاتێك هاتینەوە بۆ مەدینە، بۆ ماوەی مانگێك نەخۆش کەوتم، توومەس خەڵکی هەر قسەی بوختانچییەکان ئەم بەر و ئەوبەر پێ دەکەن و منیش ئاگام لە هیچ نییە، وەهەستی پێناکەم، بەڵام لەوەدا کەوتبوومە گومانەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) ئەو سۆز و بەپەرۆشەوە بونەی جارانی بۆم نەمابوو کە لەکاتی نەخۆشیمدا لێم دەدی، بەڵکو هەرئەوەندە نەبێت کە کاتێك دەهاتە ژوورەوە سەلامی دەکرد و، دەیفەرموو: (نەخۆشەکەتان چۆنە) منیش ئەوە دەیخستمە گومانەوە و هەستیشم بەهیچ خراپەیەك نەدەکرد، تاوەکو شەوێکیان پاش ئەوەی کەمێك

باش بووبوم، لەگەڵ دایکی (مسطح)دا چووین بۆ سەراوکردن ئەوە شوێن دانیشتنمان بوو، شەواو شەو دەردەچووین بۆ سەرئاو، ئەمەیش پێش ئەوەی سەرئاو دروست بکەین لەنزیک ماڵەکانماندا، کارو پیشەکان وەك کارو پیشەی عەرەبە پێشووەکان بوو، لە چوونە سەرئاودا حەزمان نەدەکرد کە ئاودەست لەپاڵ ماڵەکانماندا دروست بکەین، من و دایکی (مسطح) ی کچی (أبي رهم) ی کوڕی (عبدالمطلب) کوڕی (عبدالمناف) بووین، دایکیشی کچی (صخر)ی کوڕی(عامر)ی پووری (ابوبکر الصدیق) بوو (خوالێی ڕازی بێت)، کوڕەکەیشی(مسطح)ی کوڕی (أثاثة)ی کوڕی (عبد)ی کوڕی (عبدالمطلب) بوو، من و دایکی (مسطح) کاتێك سەرئاومان کرد هاتین بەرەو ڕووی ماڵەکەی من، دایکی (مسطح) پێی لە دامێنی کراسەکەی هەڵکەوت و وتی:دەك بەدبەخت بێت (مسطح)، منیش پێم وت چەند خراپت وت، نزا لە کەسێك دەکەیت کە ئامادەی جەنگی بەدر بووە؟، ووتی: ئەی داماوی باوان شێواو، ئەی نەت بیستووە چی دەڵێت؟ وتم: چی وتووە؟ دڵێت: ئیتر دەنگ و باسی بوختانچییەکانی بۆ گێڕامەوە، منیش ئەوەندەی تر نەخۆش کەوتم، کاتێك گەڕامەوە بۆ ماڵەوە پێغەمبەر (ﷺ) هاتە ژوورەوە بۆ لام سەلامی کرد و فەرمووی: (نەخۆشەکەتان چۆنە)، منیش وتم: ڕێگەم دەدەیت بچمەوە بۆ لای دایك و باوکم، دەمویست لەڕێگەی ئەوانەوە دڵنیابم لەو هەواڵە، پێغەمبەر(ﷺ) ڕێگەی دام، منیش هاتمەوە بۆلای دایك و باوکم، بەدایکم وت: دایە خەڵکی چی دەڵێن؟ وتی: ئەی کچۆڵەی خۆم گوێ مەدەرێ، بەخوا کەم ڕێك کەوتووە ژنێکی جوان لای پیاوێك بێت و خۆشی بووێت و سەربەهەوێ بێت ،و قسەی زۆری لەسەر نەکرێت، وتم: (سبحان الله) خەڵك ئەم قسەیەیان کرد؟دەڵێت:ئەو شەوە تا بەیانی گریام فرمێسکم نەدەنیشتەوە، خەو لەچاوم نەدەکەوت، بۆ بەیانیش هەر دەگریام، لەو ماوەیەدا وەحی دواکەوت، پێغەمبەر (ﷺ) (علي کوڕی أبي طالب) و (اسامەی کوڕی زید)ی بانگ کردبوو ڕاوێژی پێ کردبوون سەبارەت بە وازهێنان لە خێزانی، (أسامة) ئاماژەی بۆ کردبوو بەوەی کە دەیزانی لەپاکی خێزانی، و بەو خۆشەویستییەش کە دەیزانی لەدڵیدا هەیە، بەرامبەر بە خێزانی، وتبووی: ئەی پێغەمبەری خوا ئێمەیش لەچاکە بەولاوە هیچمان لێ نەدیووە، (علي کوڕی أبي طالب)یش وتبووی:ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) خۆ خوا تەنگی زەوی لێ نەهێناویەتەوە یەك، خۆ ژنانی تر جگە لە ئەو زۆرن، ئەگەر بیش چیتە لای کارەکەرەکەی ڕاستیت پێ دەڵێت، دەڵێت: پێغەمبەری خوا(ﷺ) (بريرة) بانگ دەکات و دەفەرمووێت: (ئەی بەریرە هیچ شتێکت لە عائیشە بینیوە کە بتخاتە گومانەوە)؟

بەریرەش دەڵێت:سوێند بەو کەسەی کە تۆی بەڕاستی ڕەوانەکردووە هەرگیز هیچ شتێکم لێ نەبینیوە کەلێی بەعەیب بگرم، ئەوەندە نەبێت کە ئەو کچێکی منداڵکاری تازە پێگەیشتووە لە ماڵەوە بەسەر هەویرەکەیدا خەوی لێ دەکەوێت، مەڕ وماڵات هەویرەکەی دەخوات، پێغەمبەر (ﷺ) چووە سەر مینبەر و هەندێك گلەیی و گازندەی لە (عبدالله کوڕی أُبي کوڕی سلول) کرد و فەرمووی:ئەی کۆمەڵگەی مسوڵمانان کێ هەیە پشتم بگرێت لە دژی پیاوێك کە ئەزیەت و ئازاری بۆم گەیشتۆتە خاو و خێزانیشم، بەخوا من لە ئەهل و خێزانی خۆم لەچاکە نەبێت هیچ شتێکی دیکەیان لەبارەوە نازانم، باسی پیاوێکیش دەکەن خەیر نەبێت هیچ شتێك لەبارەیەوە نازانم، لەگەڵ خۆمدا نەبێت نەهاتۆتە ماڵەوە)، (سعدی کوڕی معاذي الآنصاري) (خوا لێی ڕازی بێت) هەستا و وتی:من پشتت دەگرم لە دژی، ئەگەر لە (اوس)ە، دەدەین لە گەردنی ئەگەر لە برا (خەزرەجی)یەکانیشمانە، چۆن ئەمرمان پێ دەفەرموویت ئێمەیش ئەمرەکەت بەجێ دەهێنین، دەڵێت: (سعدی کوڕی عبادة) هەستا، کە سەرۆکی خەزرەج بوو پیاوێکی باش بوو، بەڵام دەمارگرتی و وتی: بەخوا درۆت کرد نایکوژین و نایشتوانیت بیکوژیت، (أُسید)ی کوڕی(حضیر)یش، کە ئامۆزای (سعدی کوڕی معاذ) بوو، بە (سعدی کوڕی عبادة)ی ووت: بە خوا درۆت کرد هەر دەبێت بیکوژین، چونکە تۆ دووڕیت، پاساو بۆ دووڕووەکان دێنیتەوە، هەروەها دوو هۆزەکە لە (أُس) و (خزرج) تێهەڵچوون، تا خەریك بوو دەست بدەنە یەکتری و بجەنگن، پێغەمبەر (ﷺ) هەر لەسەر مینبەرەکەوە خەریك بوو، بێدەنگی دەکردن، تا بێدەنگ بوون، ئەویش بێدەنگ بوو، دەڵێت: منیش ئەو ڕۆژە هەر دەگریام، فرمێسکم نەدەنیشتەوە، و خەو نەچووە چاوم پاشان بۆ شەوی داهاتویش هەر بە بەردەوامی دەگریام، فرمێسکم نەدەنیشتەوە و چاوم نە ئەچووە خەو، باوك و دایکیشم وا گومانیان دەبرد کە گریان جەرگم دەبڕێت، لە کاتێکدا ئەوان هەردوکیان لەلام دانیشتبوون، منیش دەگریام، ژنێکی (انصاری) داوای مۆڵەتی هاتنە ژوورەوەی کرد بێت بۆلای من، منیش مۆڵەتم دا، دانیشت دەستی کرد بەگریان، دەڵێت لە کاتێکدا بەو حاڵەوە دانیشتبوین پێغەمبەر (ﷺ) هاتە ژوورەوە و سەلامی کرد پاشان دانیشت، دەڵێت: لەو کاتەوە کە ئەوە دەربارەم وترا بوو، پێغەمبەر (ﷺ) لەلام دانەنیشتبوو، ماوەی مانگێك تێپەڕی کردبوو هیچ وەحییەکی دەربارەی من بۆ نەهاتبوو، دەڵێت: ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) دوای شایەتومان هێنان فەرمووی:ئەی عائیشە من لەبارەی تۆوە ئەوە و ئەوەم پێگەیشتووە، جا ئەگەر تۆ پاکیت ئەوا خوای باڵادەستیش پاکیت

دەردەخات، خۆ ئەگەر لە گوناهیش نزیك كەوتوویتەوە داوای لێخۆشبوون لەخوا بکە، و تەوبە بکە، چونکە بەندە ئەگەر کاتێك دانی نا بە گوناهێکدا پاشان تەوبەی کرد، خوا تەوبەکەی لێ وەردەگرێت، دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) قسەکانی تەواوکرد، فرمێسکم ووشکی کرد تاوەکو هەستم بەدڵۆپێك نەدەکرد لێی، بەباوکمم وت:لە بریتی من وەڵامی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بدەرەوە، ئەویش وتی: بەخوا نازانم چ وەڵامێکی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بدەمەوە، ئینجا بەدایکمم وت: لە بریتی من وەڵامی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بدەرەوە، ئەویش وتی: بەخوا نازانم چ وەڵامێکی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بدەمەوە،، منیش ووتم: لە کاتێکدا کە من ئافرەتێکی منداڵکاریش بووم، قورئانیشم زۆر نەدەزانی، بەخوا من چاك نازانم ئەمەی کە بیستوتانە بە تەواوەتی لە دڵتانا جێگیربووە و باوەڕتان پێی کردووە، جا ئەگەر من پێتان بڵێم: من پاکم -خوایش دەزانێت کە من پاکم -بەوە باوەڕم پێ ناکەن، خۆ ئەگەر دانیش بە شتێکدا بنێم بۆتان، کە خوایش چاك دەزانێت کە من پاکم ئەوە باوەڕم پێ دەکەن، بە خوا من هیچ نمونەیەکم دەست ناکەوێت بۆ خۆم و خۆشتان مەگەر هەر ئەوەنەبێت کە باوکی یوسف (علیهما السلام) فەرموی: ﴿فَصَبْرٌ جَمِيلٌ وَاللَّهُ الْمُسْتَعَانُ عَلَىٰ مَا تَصِفُونَ﴾. دەڵێت: پاشان ڕووم وەرگێڕا و لەسەر جێگاکەی خۆم پاڵکەوتم، دەڵێت: بەخوا من ئەو کاتە چاك دەمزانی کە پاکم، خوایش بەپاکی خۆم پاکیم دەردەخات، بەڵام باوەڕم نەدەکرد کە خوا لە بارەمەوە وەحی بنێرێت و بخوێنرێتەوە، خۆم لا بچوکتر بوو لەوەی کە خوای باڵادەست لەبارەمەوە بێتە گوفتار، بەڵام من ئومێدم وابوو کە پێغەمبەر (ﷺ) خەوێك ببینێت، خوا بەهۆیەوە پاکیم دەربخات، بەخوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە جێی خۆی نەجوڵا و کەسیش لە دانیشتوانی ماڵەکە دەرنەچوو بوون تاوەکو خوای گەورە وەحی نارده سەر پێغەمبەر (ﷺ) ئەوترس و لەرزەی کە لە کاتی دابەزینی (وەحی)دا، دایدەگرت لەوێشدا دایگرت تاوەکو بەڕادەیەك وەك وردە مرواری ئارەقی لێ دەچۆڕا لەڕۆژی سەرماو سۆڵەی زستاندا، لە قوورسایی و سەختی ئەو ووشەیەی دادەبەزییە سەری، دەڵێت: کاتێك (وەحی) کۆتایی هات پێغەمبەر (ﷺ) پێدەکەنی، یەکەم ووشە کە پێی هاتە گۆ ئەوە بوو کە فەرموی: ((مژدەت لێ بێت ئەی عائیشە خوا پاکی دەرخستیت)).دایکم پێی وتم: هەستە بەلایەوە، منیش ووتم: بەخوا هەڵناسم بەلایەوە تەنها سوپاسی ئەو خوایە دەکەم، ئەو خوایەی کە پاکی منی دەرخست، دەڵێت: خوای باڵا دەست دە ئایەتی نارده خوارەوە: ﴿إِنَّ الَّذِينَ جَاءُو﴾.

واتە: (بێگومان ئەوانەی بوختانەکەیان هەڵبەست دەستەیەك بوون لەخۆتان، وادەزانن کە ئەو بوختانە خراپ بوو بۆتان، بەڵکو خەیر بوو بۆتان). خوای گەورە و باڵادەست بەم ئایەتانە پاکی منی دەرخست، (ابوبکر) (خوالێی ڕازی بێت) -کە لەوەو پێش خەرجی (مسطح)ی دەکێشا لەبەر خزمایەتی و هەژاری و نەدارییەکەی -ووتی: بە خوا لەمەولا هەرگیز هیچ شتێکی نادەمێ، پاش ئەوەی کە بە عائیشەی ووت: خوای باڵا دەستیش ئەم ئایەتەی نارد: ﴿وَلَا يَأْتَلِ أُولُوا الْفَضْلِ﴾. واتە: (ئەوانەی کەخاوەنی سامان و بەخشندەیین لە ئێوە با سوێند نەخۆن کە یارمەتی خزمان و هەژاران و کۆچەران لەپێناوی خوادا نەدەن، با لێبوردە بن و چاوپۆشی بکەن، ئەی حەزناکەن خوا لێتان خۆش ببێت؟ خوایش لێبوردە و میهرەبانە). (حیان) ی کوڕی(موسی) دەڵێت: (عبدالله ی کوڕی موبارەك) دەڵێت: ئەم ئایەتە هیوابەخشترین ئایەتە لە قورئاندا، ئینجا (ابوبکر) (خوالێی ڕازی بێت) ووتی: بەڵێ بە خوا من حەز دەکەم خوا لێم خۆش ببێت بۆیە گەڕایەوە بۆ خەرجی کێشانی (مسطح) کە لەوەو پێش دەیکێشا و وتی:هەرگیز لێی ناگرمەوە، عائیشە(خوا لێی ڕازی بێت) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) پرسیاریشی لە (زینب)ی کچی (جحش)ی (خێزانیشی) کردبوو لەبارەیەوە: ((داخۆ هیچی لێوە دەزانێت؟))یان ((بینیوتە)) ئەویش وتبوی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) چاو و گوێم دەپارێزم خەیر نەبێت هچ شتێکی تر نازانم، عائیشە(خوا لێی ڕازی بێت) دەڵێت:لەناو خێزانەکانی پێغەمبەردا تەنها ئەو لە جوانیدا هاوشانی دەکردم، بەڵام بەخۆپارێزی و خواناسی خۆیەوە، خوا پاراستی، بەڵام(حمنة)ی خوشکی هەر لەسەری دەکردەوە تا تیاچوو لەگەڵ ئەوانەی کە تیاچوون. (الزهری) دەڵێت: ئەمە بوو بوختەی سەرگوزەشتەی ئەو چەند کەسەی کەپێیان گەیشتووە.[٥١٧]

[٥١٧]- رواه البخاري في صحيحه كتاب التفسير. ورواه المسلم في صحيحه كتاب التوبة.

**تەوەرەی دووەم:**

**تەفسیری شیکاری بۆ ئایەتەکانی کە لە ڕوداوی (إفك)دا دابەزیووە:**

**ڕونکردنەوەیەك دەربارەی ناوەڕۆك:**

کاتێك پێغەمبەری خوا (ﷺ) حوکمی بوهتانی بۆ ئافرەتانی پارێزراو و پاك داوێن ڕونکردەوە، و باسی گەورەیی کارەکەی کرد، پاش ئەمەیش حوکم و بڕیاری بوهتانی بۆ هاوسەرانی پاك داوێن ڕونکردەوە، پاش ئەوەیش حوکمی بوهتان وتۆمەتبارکردنی بۆ دایکانی باوەڕداران ڕونکردەوە، کە خێزانی کۆتا پێغەمبەری بەڕێز بوون بۆ مرۆڤایەتی بەگشتی، خوای گەورە، گەورەیی ئەم کارە و سزاکەی ڕونکردەوە هەروەك چۆن پاکی عائیشەی (ڕەزای خوای لێ بێت) ڕوون کردەوە.

خاوەنی تەفسیری (في الظلال) دەڵێت: (....پاش تەواو بون لە ڕونکردنەوەی حوکمی بوهتان، نمونەیەك لە تۆمەت ڕێکخستن و بوهتان دێت کە پیسی تاوان و ناپەسەندییەکەی دەردەخات، کە ماڵی پاك و بەڕێزی پێغەمبەر (ﷺ) دەگرێتەوە، و باسی شەرەفی پێغەمبەری خواو (ﷺ) -کە بەڕێزترین مرۆڤە لای خوا- و شەرەف و ئابڕوی هاوەڵە بەڕێزەکەی کە(ابی بکر الصدیق)ە، کە بەڕێزترین مرۆڤەل ای پێغەمبەر (ﷺ) وشەرەفی پیاوێك لە هاوەڵە بەڕێزەکان، کە (صفوان)ی کوڕی (معطل)ە، کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) شایەتی بۆ دەدات کە هیچی لێ نەدیوە تەنها خەیر و چاکە نەبێت.[518]

ئەو ڕوداوە بۆ ماوەی مانگێکی تەواو موسڵمانانی لە ناو شاری مەدینەدا سەرقاڵ کرد، بێگومان وەڵامێکی تێر و تەواو و چارەسەرێکی شیفا بەخش و بڕیارێکی یەکلایی کەرەوە لە باشترین بڕیاردەرەوە بەدوایدا هات، کە هیچ شتێکی لێ ناشاردرێتەوە، و هیچ شتێکی لێ ون نابێت نە لە زەوی و نەلەئاسماندا.

وەڵامێکی یەکلایی کەرەوە بەدەربڕینی پاکی و بێتاوانی بۆ عائیشە هات کە تۆمەت و بوهتانیان دابویە پاڵی بوهتان چییەکان.

---

[518]- في ظلال القرآن ٤/٢٤٩٤.

ئیمەیش هەڵوێستەیەك دەکەین لەگەڵ ئەو ئایەتە پیرۆزانەی کە لەم بارەیەوە دابەزین...
خوای گەورە فەرمووی: ﴿إِنَّ الَّذِينَ جَاءُوا بِالْإِفْكِ عُصْبَةٌ مِنْكُمْ﴾ ووشەی (الأفك) لە درۆ گەورەترە، (اصل)ەکەی بریتییە لە: (القلب)، ووشەی(المؤتفكة)ی لێوەرگیراوە، کە شارەکەی قەومی(لوط) (علیه السلام) بەو ناوەوە ناونرا، چونکە کێشانە و پێوانەکانیان هەڵگێڕابویەوە، بە جۆرێك شەڕیان کردبوویە خەیر و خەیریان کردبوویە شەڕ، چاکەیان کردبوویە خراپە و خراپەیان کردبوویە چاکە، خوای گەورەیش قەومەکەی لەناوبرد و (لوط) (علیه السلام)ی ڕزگار کرد لەگەڵ ئەو کەسانەی کە باوەڕیان هێنابوو.
خوای گەورە فەرموی: ﴿وَالْمُؤْتَفِكَةَ أَهْوَىٰ (٥٣) فَغَشَّاهَا مَا غَشَّىٰ﴾(النجم:٥٣-٥٤).
واتە: (هەر ئەو زاتە تاوانباران و شەروالْ پیسانیشی ژێرا و ژوور کرد، ئینجا ئەو دێهاتانەی داپۆشی، ئەوەی کە داپپۆشی (بە بەردباران)).
خوای گەورە هەمووی ژێرا و ژوور کرد، سەرەوەی خستە ژێرەوە و ژێرەوەی خستە سەرەوە، واتە لەو شێوە و شێوازەی کە هەیبوو گۆڕی، ئەو قسە و درۆ و بوهتانەی کە بۆ خاتوو عائیشەیان ڕێك خستبوو، خوای گەورە بە(إفك) ناوی برد، چونکە ئەوەی زانراو و ناسراو بوو لەودا پێچەوانەی ئەوە بوو کە باسکرا بوو، ئەو پاك و پاك داوێن و لەخواترس بو، دەربارەی ئەو دەربڕینەی کە هاتبوو دەربارەی ئەو دیار بوو کە دروستیان کردبوو، ڕێکیان خستبوو، و لەلایەن خۆیانەوە دروستیان کرد و دەریان بڕی و ئاشکرایان دەکرد، بەبێ ئەوەی هیچ بنەمایەکی هەبێت.
﴿عُصْبَةٌ مِنْكُمْ﴾.
واتە: ئەوکەسانەی کە ئەودرۆ و بوهتانەیان ڕێکخست هەر کۆمەڵ و دەستەیەك بوون لە ناو خۆتاندا بوون، کە سەرکردە و کەسانی دووڕو بون، کە لەسەروویانەوە(عبدالله ی کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول)بو، کە سەرکردەی دووڕووان بوو،و(زیدی کوڕی رفاعة)هەروەها ئەویش هەر لەدووڕووان بوو. و (حسان ی کوڕی ثابت) و (مسطح)ی کوڕی (أثاثة) و (حمنة)ی کچی (جحش) و کەسانی تریش کە لەم کارەوە تێوە گلابوون.

پێشەوا (الرازی) دەڵێت:(ووشەی ﴿مِّنكُمْ﴾. واتە: ئەوانەی کە بەدرۆ و بوهتانەکەوە هاتن دەربارەی عائیشە، کۆمەڵێك بوون لە خۆتان ئەی باوەڕداران، چونکە(عبدالله)لەناو ئەو دەستەدابوو، کە بە ئاشکرا حوکمی ئیمان وباوەڕی بەسەردا دەدرا.)[519]

﴿لَا تَحْسَبُوهُ شَرًّا لَّكُم بَلْ هُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ﴾(النور:11). بە ڕاستی ئەمە لەلایەن دوژمنانی دینەوە دەرکەوت لە دووڕووەکان لەوەی کە دڵەکانیانی لەسەر ڕاهاتبوو لە نیەت و مەبەستی خراپ و پیس و ناپەسەند، لە دەرخستن و ئابڕوچونیاندا خەیر وچاکەی تیابوو بۆ باوەڕداران بە جۆرێك کە باوەڕداران خۆیان لێ بە دوور دەگرتن و خۆیان لە نەخشە و پلانە پیسەکانیان دەپاراست.

خاوەنی تەفسیری (الکشاف) دەڵێت: (مانای ئەوەی کە دەڵێت خەیری تیایە بۆ ئەوان:بێگومان ئەوان بەو هۆیەوە پاداشتی گەورەیان دەست کەوت، چونکە تاقیکردنەوەیەکی ئاشکرا و بەڵاونارەحەتیەکی دیار بوو، و هەژدە ئایەت دەربارەی دابەزی، هەریەکەیان سەربەخۆ بوو بەوەی کە بەگەورە دانان بوو بۆ قەدر و پایەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) و دڵدانەوە بوو بۆی و پاك ڕاگرتن بوو بۆ دایکی باوەڕداران(سەلامی خوایان لێ بێت). و پاك ڕاگرتن بوو بۆ ئەهل و بەیتی پێغەمبەر (ﷺ) و مەترسی خستنەوە بوو بۆ ئەو کەسانەی کە لەو بارەیەوە یان قسەیان کردبوو یان بیستیان و بە ناپەسەندیان نەزانی و گوێیان لێ نەئاخنی).[520]

زانا (إبن کثیر) لە تەفسیرەکەیدا دەڵێت: ﴿بَلْ هُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ﴾ واتە: خەیر بۆ ئەوان لە دنیا و قیامەتیشدا، زمانحاڵی ڕاستییە لە دنیا و پلە بەرزی یە لە قیامەتدا، و دەرخستنی شەرەف و ڕێزە بۆ ئەوان، بەوەی کە خوای گەورە گرنگی دا بە عائیشە (خوا لێی ڕازی بێت) بەوەی کە پاکی ئەوی لە قورئاندا دابەزاند و جێگیری کرد: ﴿لَّا يَأْتِيهِ الْبَاطِلُ مِن بَيْنِ يَدَيْهِ وَلَا مِنْ خَلْفِهِ﴾(فصلت:42).

واتە: (هیچ ناحەقی و نادروستی و ناتەواوی یەك ڕوو ناکاتە قورئان لە هیچ لایەکەوە و لەهیچ کاتێکدا).

---

[519]- مفاتیح الغیب ٢٣\١٧٤.

[520]- الکشاف للزمخشری ٢١٨/٣.

کاتێك (إبن عباس) (خوا لێی ڕازی بێت) چویە لای عائیشە کە لە ساتە وەختی مردندا بوو، پێی فەرمووی: مژدەت لێ بێت: بێگومان تۆ خێزانی پێغەمبەری خوایت (ﷺ)، تۆی خۆشویستووە، بێجگە لە تۆیش کچی مارە نەکردوە و نەیکردۆتە هاوسەری خۆی، و پاکی و بێتاوانی تۆ لە ئاسمانەوە دابەزی. (إبن جریر) لە تەفسیرەکەیدا بە (سند)ێك، لە (محمد)ی کوڕی (عبدالله)ی کوڕی (جحش)ەوە گێڕاویەتییەوە، ووتی: (عائیشە و زینب) (خوا لێیان ڕازی بێت) شانازیان دەکرد، زینب ووتی: من ئەو کەسە بووم کە باسی هاوسەرگیریم لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) لە ئاسمانەوە دابەزی، پاشان عائیشە وتی: منیش ئەو کەسە بووم کە باسی پاکیم لە ئاسمانەوە دابەزی).[٥٢١]

هەروەها لەو خەیرەی کە لەم ڕووداوەدا بوو، چەند هەڵوێستێکی جوان و بینراوی تیا بەدیکرا و دەرکەوت بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) و هاوەڵە بەڕێزەکانی، پێغەمبەر (ﷺ) کەسایەتی یەکی وا بوو کە لە هەموو کەس زیاتر غیرەی زیاتر هەبوو لەسەر شەرەف و ئابڕوی خۆی، بەرگەی ئازار و ناڕەحەتی خەڵکی دەگرت لە شەرەف و ئابڕوی خۆیدا، خۆ ئەگەر بویستایە لە ملی هەرکەس بدات کە ئێوە گلابوون بەم ڕووداوەوە بێگومان لەملی دەدا.

کاتێك ئایەتەکان دەربارەی پاکی عائیشە دابەزین، بینیمان کە پێغەمبەری خوا داری حەدی لە کەس نەدا تەنها لەو کەسانە نەبێت کە تاوان و بوهتانەکەیان لەسەر ساغ بوویەوە و سەلما، ئەوە عائیشەی بەڕێز بوو کە ڕووبەڕووی ئەم ناڕەحەتی یە بوویەوە بەئارامگرتن و دامەزراوی و ڕووی کردە خوای گەورە، ئەوە (أبو بکر الصدیق) بوو، کە بەڕاستی سوێندی خوارد کە ئیتر یارمەتی کەسە نزیکەکەی خۆی نەدات کە (مسطح)ی کوڕی (اثاثة) بوو، کە بە ئابڕوی عائیشەوە تێوەگلا.

بەڵام دەربارەی ئەمە ئایەتی خوای گەورە دابەزی و فەرمووی: ﴿وَلَا يَأْتَلِ أُولُو الْفَضْلِ مِنكُمْ وَالسَّعَةِ أَن يُؤْتُوا أُولِي الْقُرْبَىٰ وَالْمَسَاكِينَ وَالْمُهَاجِرِينَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَلْيَعْفُوا وَلْيَصْفَحُوا أَلَا تُحِبُّونَ أَن يَغْفِرَ اللَّهُ لَكُمْ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾(النوور:٢٢).

واتە: (ئەوانەی کە خاوەنی سامان و بەخشندەیین لە ئێوە با سوێند نەخۆن کە یارمەتی خزمان و هەژاران و کۆچبەران لە پێناوی خوادا نەدەن (لەبەرئەوەی بەشداربوون لە

---

[٥٢١]- تفسیر إبن کثیر ٣/٢٧٢ بەدەستکاری یەوە.

وتنی بوختانکەدا). دەبا لێبوردەبن، دە با چاوپۆشی بکەن، مەگەر حەزناکەن خوا لێتان خۆش بێت، خوایش هەمیشە لێخۆشبوو میهرەبانە). (ابوبکر) (خوا لێی ڕازی بێت) دەڵێت: بەخوا بەڕاستی حەزدەکەم خوا لێم خۆش ببێت، و ئەو بەخشینەی کە دەیدا بە (مسطح) بۆی گێڕایەوە کە بڕیبووی، و وتی: سوێند بەخوا هەرگیز لێی نابڕم.

ئەوە هاوسەرانی تری پێغەمبەر (ﷺ) بوون -کە هەویەی عائیشە بوون- تەنها خەیر و چاکە نەبێت هیچ دەربارەی عائیشە ناڵێن، ئەمەیش بە جوانی لە هەڵوێستی (زینب ی کچی جحش)دا، بۆمان دەردەکەوێت کە غیرەی زۆری لە عائیشە دەکرد، بەڵام تەنها خەیر و چاکەی دەربارەی وت. عائیشە (خوا لێی ڕازی بێت) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەربارەی من پرسیاری کرد لە (زینب ی کچی جحش)، وتی: ئەی زینب، چیت زانیوە و چیت دیوە ئەویش وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) من گوێچکە و چاوی خۆم دەپارێزم، و سوێند بەخوا خەیر و چاکە نەبێت هیچ دەربارەی نەزانیوە، عائیشە وتی:ئەو خێزانی پێغەمبەر (ﷺ) بوو، کە چەند و چوونی زۆر لەگەڵ مندا دەکرد، بەڵام خوای گەورە بەهۆی وەرع و لەخواترسی یەکەیەوە پاراستی، بەڵام خوشکەکەی پێی هەڵخلیسکا.کە دژایەتی عائیشەی کرد، هەموو ئەوانەی کە تێوەگلابوون بە بوهتان و درۆ ڕێکخستنەکەوە تیاچوون و دوایان بڕا.

* هەروەها لەو خەیرانە:بێگومان ئەم ڕووداوە بەڵگەیەکی ڕوون و نیشانەیەکی یەکلایی کەرەوە بوو لەسەر ڕاستی پێغەمبەری خوا (ﷺ).

خوای گەورە ڕاست و جوانی فەرمووە دەربارەی قورئانەکەی: ﴿فَلَا أُقْسِمُ بِمَا تُبْصِرُونَ(٣٨) وَمَا لَا تُبْصِرُونَ(٣٩) إِنَّهُ لَقَوْلُ رَسُولٍ كَرِيمٍ(٤٠) وَمَا هُوَ بِقَوْلِ شَاعِرٍ قَلِيلًا مَا تُؤْمِنُونَ(٤١) وَلَا بِقَوْلِ كَاهِنٍ قَلِيلًا مَا تَذَكَّرُونَ(٤٢) تَنزِيلٌ مِّن رَّبِّ الْعَالَمِينَ(٤٣) وَلَوْ تَقَوَّلَ عَلَيْنَا بَعْضَ الْأَقَاوِيلِ(٤٤) لَأَخَذْنَا مِنْهُ بِالْيَمِينِ(٤٥) ثُمَّ لَقَطَعْنَا مِنْهُ الْوَتِينَ(٤٦) فَمَا مِنكُم مِّنْ أَحَدٍ عَنْهُ حَاجِزِينَ(٤٧) وَإِنَّهُ لَتَذْكِرَةٌ لِّلْمُتَّقِينَ(٤٨) وَإِنَّا لَنَعْلَمُ أَنَّ مِنكُم مُّكَذِّبِينَ(٤٩) وَإِنَّهُ لَحَسْرَةٌ عَلَى الْكَافِرِينَ(٥٠) وَإِنَّهُ لَحَقُّ الْيَقِينِ(٥١) فَسَبِّحْ بِاسْمِ رَبِّكَ الْعَظِيمِ﴾(الحاقة:٣٨ _ ٥٢).

واتە: (سوێند بەو شتانەی کە دەیبینن، بەوەیش کە نایبینن و نادیارن، بەڕاستی ئەم قورئانە لە زاری پێغەمبەرێکی بەڕێزەوە پێتان ڕادەگەیەنرێت، یاخود لەڕێگەی فرستادەیەکی بەڕێزەوە پێتان دەگات کە جوبرەئیلی فریشتەیە، دڵنیابن کە ئەم قورئانە

گوفتاری شاعیر نییە، ئەوە بۆ زۆر کەمتان باوەڕ دەهێنن؟! گوفتاری فاڵچی و زێوانیش نییە، ئەوە بۆ زۆرکەمتان یاداوەری وەردەگرن؟! بەڵکو ئەم قورئانە لەلایەن پەروەردگاری جیهانەکانەوە ڕەوانەکراوە ونێردراوەتە خوارەوە، خۆ ئەگەر محمد (ﷺ) هەندێك قسە و گوفتاری بەدەم ئێمەوە هەڵبەستایە، ئەوە بەهێز و دەستەلاتی خۆمان دەمانگرت، لەوەو دوا ڕەگی دڵی دەپچڕێنین و دەیمرێنین، ئەوسا هیچ کەسێك نییە لە ئێوە بەربەست و بەرگری بکات لە ئێمە، بەڕاستی ئەم قورئانە یاداوەری و یادخستنەوەیە بۆ پارێزکاران و خواناسان، ئێمە بەڕاستی چاك دەزانین کە لە ئێوەدا کەسانێك هەن، و پەیدا دەبن کە ئەم قورئانە بەدرۆ دەزانن، بێگومان قورئان لە ڕۆژی دواییدا دەبێتە هۆی ئاهو ناڵە و پەشیمانی بێ سنور بۆ بێباوەڕان، بەڕاستی ئەم قورئانە حەق و ڕاستییەکی دڵنیابەخشە بە ئیمانداران، کەواتە ئەی پێغەمبەر (ﷺ) ئەی ئیماندار، بەردەوام تەسبیحات و ستایشی پەروەردگاری مەزن و گەورەت بکە).

* دکتۆر (محمد عبدالله دراز) لە ڕونکردنەوەیەکیدا دەڵێت: بێگومان قورئان وتەی خوای گەورەیە، بێگومان پێغەمبەر (ﷺ) هیچ شتێکی لە خۆیەوە دەربارەی قورئان نەوتووە و نەهێناوە: بێگومان ئەوەی کە دەربارەی دابەزیوە، هانی داوە کە بڵێت، و پێویستی هەرە زۆر و گەورەی ئەو ئەوە بووە سور بووە لەسەر ئەوەی کە بدوێت بە جۆرێك ئەگەر کارەکە بۆ ئەو بێت، وتە و بوارێکی بۆ بینیوەتەوە، و بەڕاستی شەوان و ڕۆژان هاتوون و تێپەڕیون بەڵام لەو ماوەیەدا قورئانی بۆ دانەبەزیوە تا بەسەر خەڵکیدا بیخوێنێتەوە، ئایا دوو ڕووەکان بە باسی بوهتان و درۆ ڕاناچڵەکێن دەربارەی عائیشەی خێزانی پێغەمبەر (ﷺ)، وەحی دواکەوت، و کارەکە درێژەی کێشا و خەڵکیش لە قسە و گاڵتەجاڕیدان هەتا ئەوەی کە پێغەمبەر (ﷺ) زۆر نارەحەت بوو، ئەو ناتوانێت هیچ بڵێت تەنها ئەوە نەبێت –کە بەهەموو پارێزگاری و سنوردارکردنێکەوە–بڵێت: من هیچ نازانم تەنها خەیر نەبێت دەربارەی، پاش ئەوەی هەوڵ و تەقەلای خۆی خستەکار بۆ گەڕان و پرسیارکردن و ڕاوێژکردن، ئیتر مانگێك بە تەواوی تێپەڕی، هەموو دەڵێن: ئێمە هیچ خراپەیەکمان لە عائیشە نەبینیوە، پێغەمبەر (ﷺ) لەمە زیاتر هیچی تری نەوت، کە وتی:ئەی عائیشە من لە بارەی تۆوە ئەوە و ئەوەم پێگەیشتووە، جا ئەگەر تۆ پاکیت ئەوا خوای باڵادەستیش پاکیت دەردەخات، خۆ ئەگەر لە گوناهێکیش نزیك کەوتویتەتەوە ئەوا داوای لێخۆشبون لە خوا بکە و تەوبە بکە.[٥٢٢]

---

[٥٢٢] - ئەمەیش دەستەواژەیەکی نەشیاو بوو.

وەك ئەوەی کە تۆ قسەی کەسێك دەبیستیت کە غەیب نازانێت و قسەی ڕاستگۆیەك کە جێگیر بوو، وشوێن گومان نەدەکەوت، و شتێکی نەدەوت کە زانستی پێی نەبێت، لەسەر ئەوەی کە شوێنەکەی جێ نەهێشت پاش ئەوەی کە ئەو ووشانەی وت، هەتا ئایەتە پیرۆزەکان دابەزین لە سوورەتی (نور) کە پاکی عائیشەی ڕاگەیاند و سەلماندی و بریاری پاکی و بێ تاوانی درا، ئیتر بۆچی و چۆن پێغەمبەر (ﷺ) ئەوە ڕەت بکاتەوە، کە قورئان بە چەند ئایەت و ووشەیەك کارەکە چارەسەر و یەکلایی بکاتەوە و ڕێزی و ئابڕوی بپارێزێت، و کارەکەیان نیسبەت بداتە پاڵ وەحی ئاسمانی تا زمانی بوهتانچیانی پێ ببەستێت؟ قورئان لەوە بێدەگ نابێت کە درۆ بەدەم خەڵك و خواوە هەڵبەسترێت؟). [٥٢٣]

پێشەوا (إبن القيم) لێرەدا ووتەیەکی جوانی هەیە، حیکمەتی ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە بۆ ماوەیەك وەحی بڕا و دواکەوت لەگەڵ ئەوەی کە پێغەمبەر (ﷺ) زۆر پێویستی بوو، دەڵێت:(..تاقی کردنەوە و نارەحەتییەکە تەواو بوو، بەجێ گەیشت، بێگومان بۆ ماوەی مانگێك وەحی نەهات بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ)...تا باوەڕدارانی ڕاستگۆ ئیمان و باوەڕیان زیاد بکات و زیاتر دامەزراو بن لەسەر دادپەروەری و ڕاستگۆیی و گومانی باش بە خوا و پێغەمبەرەکەی و ئەهل و بەیتی و بەندە ڕاستگۆکانی،و تا دووڕووان زیاتر ئابڕویان بچێت بە هۆی بوهتان و درۆیانەوە، وتا نهێنی دووڕووەکان بۆ پێغەمبەر (ﷺ) و باوەڕداران دەربکەوێت، هەروەها لە حیکمەتەکانی درەنگ کەوتنی وەحی لە پێغەمبەر (ﷺ) ئەوە بوو کە ڕووداوەکە پێگەیشت و تەنی یەوە و دابەزی بۆ سەر دڵ و دەروونی باوەڕداران و زۆریان حەز دەکرد کە خوای گەورە وەحی بۆ پێغەمبەرەکەی (ﷺ) بنێرێت دەربارەی و، عائیشەیش بەوپەڕی تێڕوانینەوە بۆی دەڕوانی، تەنها وەحی بوو کە زۆر پێویست بوو بۆ پێغەمبەر (ﷺ) و ئەهل و بەیتەکەی و سەرجەمی باوەڕداران و ڕاستگۆیان بێت، وەحی خوایی دابەزی بۆ سەریان، هەروەك بارانی ڕەحمەت کە بەرزەویدا ببارێت کەزۆر پێویستی بێت، بەڕاستی وەحییەکە جێگەی خۆی گرت و بەناوازەترین شێوە دڵی خۆشی کردن و خۆ ئەگەر لە سەرەتای ڕوداوەکەدا خوای گەورە پێغەمبەری لە کارەکە ئاگاداربکردایە، و بەخێرایی و زوویی وەحی بۆ بهاتایە ئەوا ئەو حیکمەتانە و چەند قاتی ئەوەیش لە دەست دەچوون.} [٥٢٤]

[٥٢٣]- النبأالعظيم للدكتور محمد عبدالله دراز ص\٢٤ بەکورتی و دەستکارییەوە.

[٥٢٤]- زاد المعاد ٢\١١٤ بەدەستکارییەوە.

﴿لِكُلِّ امْرِئٍ مِنْهُمْ مَا اكْتَسَبَ مِنَ الْإِثْمِ﴾.

هەریەك لەوانەی کە تێوەگلابوون ودەستیان هەبوو لەدرۆ و بوهتانەکەدا، سزای خراپەی خۆیانیان وەرگرت بە ئەندازەی تاوان و تێوەگلانەکەیان.

﴿وَالَّذِي تَوَلَّى كِبْرَهُ مِنْهُمْ لَهُ عَذَابٌ عَظِيمٌ﴾(النور:١١).

واتە: (ئەو کەسەیش سەرۆك و گەورە و هەڵبەستی بوهتانەکەیە سزایەکی سەخت و گەورەی بۆ ئامادەیە). بەوەی کە ئاماژەی کرد بوو بۆ ماڵی پیرۆزی پێغەمبەر (ﷺ) کە ئەو بوهتانچییەش (عبدالله ی کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول) بوو. کە وتبوی:خێزانی پێغەمبەرەکەتان شەو لەگەڵ پیاوێکدا ماوەتەوە تاڕۆژ بووەتەوە پاشان هێناویەتیەوە...ئەم درۆزن و بوهتانچییە، ئەم درۆ و بوهتانە گەورەیەی دروست کرد و بڵاوکردەوە.

سزاکەی لە دنیادا ڕیسوایی و سەرشۆڕی بوو، بەوەی کە دووڕوویی دەرکەوت و ئابڕوی چوو، و لەسەر بێباوەڕی مرد، لە قیامەتیشدا سزای گەورە و بە ئازاری بۆ هەیە لەسەر بێباوەڕی و دووڕوویی و بوهتان.

بەم جۆرە لەسەر ئەم بوهتانە داری حەد و سزا لە (حسان کوڕی ثابت و مسطح کوڕی اثاثة و حمنة ی کچی جحش) درا، زانایان ڕاو بۆچوونی جیاوازیان هەیە، ئایا داری حەدیش لە سەرۆك و گەورەی دوو ڕووەکان دراوە یا نا؟ بەڵام ئەوەی کە ڕاست و پەسەندە لێی نەدراوە، لەبەرئەوەی کە لەم فەرموودەیەدا هاتووە کە (ترمذي و أبو داود) و کەسانی تر لە عائیشەوە (خوا لێی ڕازی بێت) گێڕاویانەتەوە، عائیشە ووتی: کاتێك لە ئاسمانەوە پاکی و بێتاوانی من دابەزی، پێغەمبەر (ﷺ) هەستا و چوویە سەر مینبەر، وئەو ئایەتانەی خوێندەوە و باسی کرد کە دەربارەی من دابەزی بوو لە قورئان، کاتێك لە مینبەرەکە دابەزی و هاتە خوارەوە، فەرمانی دا کە داری حەد لە (حسان کوڕی ثابت و مسطح کوڕی اثاثة و حمنة ی کچی جحش) بدرێت، کە دوو پیاو و ئافرەتێك بوون، ئینجا حەد و سزاکەیان بەسەردا جێ بەجێ کرا.[٥٢٥]

پێشەوا (إبن القيم) لە (زاد المعاد)دا دەڵێت: (کاتێك وەحی دەربارەی پاکی و بێتاوانی عائیشە دابەزی، ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی دا هەرکەس دانی ناوە بەم درۆ و بوهتانەدا سزای هەشتا داری حەدی لێ بدرێت، بەڵام داری حەدی لە (عبدالله کوڕی أُبي

---

[٥٢٥]– أخرجه الترمذي في السنن كتاب التفسير ورواه أبوداود في السنن كتاب الحدود.

کوڕی سلول) نەدا، لەگەڵ ئەوەی کە سەرکردە و گەورەی بوهتانچییەکان بووە. وتراوە: لەبەرەئەوە داری سزای لیَ نەدراوە، چونکە ئەو سزایە سوك کردنی تاوانە لەسەر خاوەنەکەی و دەبێتە کەفارەتی گوناه و تاوانەکەی، ئەویش کەسێکی پیس بوو شیاوی ئەوە نەبوو، و بێگومان خوای گەورە خۆی وەعدی سزای سەخت و بەئازاری پیَ دابوو لە ڕۆژی قیامەتدا، ئەوەی بەسە لەباتی سزاکەی دنیا).[٥٢٦]

﴿لَوْلَا إِذْ سَمِعْتُمُوهُ ظَنَّ الْمُؤْمِنُونَ وَالْمُؤْمِنَاتُ بِأَنفُسِهِمْ خَيْرًا وَقَالُوا هَٰذَا إِفْكٌ مُّبِينٌ﴾(النور:١٢).

واتە: (دەبوا هەرکە ئەو بوختانەتان بیست، ئیمانداران لە پیاوان وئافرەتان گومانی چاکیان بە خۆیان ببوایە، ئەمە بوختانێکی ئاشکرایە و (کاری ناڕەوای وا لەدایکی موسوڵمانان و هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) ناوەشێتەوە).

وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿النَّبِيُّ أَوْلَىٰ بِالْمُؤْمِنِينَ مِنْ أَنفُسِهِمْ وَأَزْوَاجُهُ أُمَّهَاتُهُمْ وَأُولُو الْأَرْحَامِ بَعْضُهُمْ أَوْلَىٰ بِبَعْضٍ فِي كِتَابِ اللَّهِ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُهَاجِرِينَ إِلَّا أَن تَفْعَلُوا إِلَىٰ أَوْلِيَائِكُم مَّعْرُوفًا كَانَ ذَٰلِكَ فِي الْكِتَابِ مَسْطُورًا﴾(الأحزاب:٦).

واتە: پێغەمبەر (ﷺ) نزیکترە بە ئیمانداران لە خودی خۆیان (واتە: دەبێت لەخۆیان زیاتر خۆشیان بوێت و فەرمانەکانی لەسەر و فەرمان و داخوازی خۆیانەوە بێت)، خێزانەکانیشی دایکانن (دایکی ئیماندارانن، دایکی مەعنەوییانن). عائیشە (خواڵی ڕازی بێت) دایکی ئیماندارانە، و خێزانی پیشەوای لە خواترسان و کۆتای پێغەمبەرانە، خاوەنی ڕێز و پلە و پایەی خۆیی و ژیاننامەی پاك و خاوێنی خۆیەتی، کە شایەتی پاکی و داوێن پاکی بۆ دەدات، و (صفوانی کوڕی معطل) هاوەڵێکی بەڕێز و بەندە و تێکۆشەرێکی پاك و داوێن پاك بوە. پێویستە لەسەرتان کە گومانی چاك بە دایکی خۆتان کە هاوسەری پێغەمبەرەکەتانە (ﷺ) بەرن کە تەنها خەیر و چاکەتان تێدا دیوە، و گومانی چاکە بەرن بە (صفوان) کە ناسراوە لاتان، وئینکاری ئەم درۆ و بوهتانە ڕوونە بکەن کە بەتاڵ و بێمانایە، کە عەقڵ و (منطق) ئینکاری دەکات و فیترەتی ساغیش ڕەتی دەکاتەوە.

﴿لَّوْلَا جَاءُوا عَلَيْهِ بِأَرْبَعَةِ شُهَدَاءَ فَإِذْ لَمْ يَأْتُوا بِالشُّهَدَاءِ فَأُولَٰئِكَ عِندَ اللَّهِ هُمُ الْكَاذِبُونَ﴾(النور:١٣).

---

[٥٢٦]- زاد المعاد ٢/١٤ _ ١١٥ بە کورتی و دەستکاری یەوە.

واتە: (دەبوا بوختانچییەکان چوار شایەتیان بۆ سەلماندنی بوختانەکەیان بهێنایە، کاتێك چوار شایەتەکەیان نەهێنا، ئەوە ئیتر دیارە ئەوانە لای خوایش لە ڕیزی درۆزنەکاندان). ئەو کەسانەی کە تۆمەت و بوهتان و درۆکەیان بۆ عائیشە ڕێك خست. هیچ بەڵگەیەکیان بەدەستەوە نەبوو لەسەر ئەو درۆ و لێکدانەوەیەیان، بەڵام بەڵگەی تەواو لەسەر ئەوان دەرکەوت و بەپێی شەرعی خوای گەورە بەدرۆزن دەرچوون.

خاوەنی (تەفسیری (الكشاف)) دەڵێت: (لەمەدا سەرزەنشت و گلەیی بۆ ئەو کەسانە هەبوو کە درۆ و بوهتانەکەیان بیست و نەیانتوانی ڕەدی بدەنەوە و ئینکاری بکەن، گلەیی و گازندەیان لەسەر بوو بەوەی کە دەرکەوت و ئاشکرا بوو لە شەرعدا: پێویست بوو کە ئەو کەسە بوهتانچییە بیٚ بەڵگانەیان بە درۆ بخستایەتەوە، و سەرزەنشتیان بکردنایە کاتێك ئەوان تۆمەت و بوهتان بۆ ئافرەتێکی پارێزراو و پاك دروست دەکەن و تانە و تەشەر لە شەرەف و ئابڕوی ئافرەتانی موسوڵمان دەدەن، ئیتر ئەگەر ئەو ئافرەتە دایکی باوەڕداران و ڕاستگۆ بێت، دەبێت چۆن بێت، کە (عائیشەی کچی أبي بكر) و حەرەمی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بووە؟).[٥٢٧]

دکتۆر (سید جبل) (خوا لێی ڕازی بێت) دەڵێت: (ئەو کەسانەی کە تۆمەتیان بۆ عائیشە دروست کرد، تۆمەتەکەیان لەسەر شتێك نەبووە کە بەچاو بینیبێتیان، تەنها بەزمان وتبویان، بەڵکو هەر بوهتان و درۆیەك بوو دروستیان کردبوو، لەسەر ئەوەی کە لە کاروانییەکە جێمابوو، پاشان گەیاندرابوویەوە بە سوپاکە لەسەر پشتی ووشترەکەی (صفوان)، ئەمەیش بوارێکی بۆ شك و گومان تیا نییە، بەڵکو گەیشتنەوەی لەسەر ئەو حاڵەت و شێوازە بۆ خۆی بەڵگەیەکی یەکلا کەرەوەیە لەسەر پاکی و بێتاوانی).[٥٢٨]

﴿وَلَوْلَا فَضْلُ اللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُ فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ لَمَسَّكُمْ فِي مَا أَفَضْتُمْ فِيهِ عَذَابٌ عَظِيمٌ﴾(النور:١٤).

واتە: (خۆ ئەگەر فەزڵ و گەورەیی خوا و بەخشندەیی یەکەی نەبوایە لەسەرتان لەدنیا و قیامەتدا، بەهۆی ئەو تاوانەتانەوە سزایەکی زۆر گەورە و سەختتان تووش دەبوو، بەهۆی ڕۆچونتان لەو دەنگ و باسەدا).

---

[٥٢٧]- الكشاف ٢١٩/٣.

[٥٢٨]- تفسير النور د.السيد أحمد خليل جبل.

زانا (إبن کثير) دەڵێت: (...هەرکەس ئیمانی هەبوو، خوای گەورە بەو هۆیەوە تەوبەی لێ وەردەگرت، وەك (مسطح و حسان و حمنة)، وئەوەشی کە ڕۆچوو تیایدا لە دووڕووەکان وەك (عبدالله کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول) و هاوشێوەکانی، ئەوا ئەو کەسانە ئایەتەکە نایان گرێتەوە کە تکایان بۆ بکرێت، چونکە ئیمان و کردەوەی چاکیان نەبوو کە بەرامبەربێت لەگەڵ ئەمەدا).[٥٢٩]

﴿إِذْ تَلَقَّوْنَهُ بِأَلْسِنَتِكُمْ وَتَقُولُونَ بِأَفْوَاهِكُم مَّا لَيْسَ لَكُم بِهِ عِلْمٌ وَتَحْسَبُونَهُ هَيِّنًا وَهُوَ عِندَ اللَّهِ عَظِيمٌ﴾(النور:١٥).

واتە: (ئەوە بۆهەر دەماو دەم قسە لە زمانی یەکترەوە وەردەگرن (بێ لێکدانەوە)، کاتێك بەزارتان شتێك دەڵێن کە هیچ ئاگاییتان دەربارەی نییە، ئێوە وا دەزانن ئەو بوختانە شتێکی سادە و ئاسانە؟ لە کاتێکدا ئەوە لای خوا زۆر گەورە و ناقۆڵایە). ﴿وَلَوْلَا إِذْ سَمِعْتُمُوهُ قُلْتُم مَّا يَكُونُ لَنَا أَن نَّتَكَلَّمَ بِهَٰذَا سُبْحَانَكَ هَٰذَا بُهْتَانٌ عَظِيمٌ﴾(النور:١٦).

واتە: (دەبوایە کاتێك گوێتان لەو بوختانە بوو، بتان وتایە: ئێمە بۆمان نییە قسەی وا بکەین، پاکی و بێگەردی بۆ خوا، ئاخر ئەمە بوختانێکی زۆر گەورە و ناقۆڵایە (کەی ئەوە لە دایکی ئیمانداران دەوەشێتەوە؟).

زانا (الزمخشري) دەڵێت: (ئەگەر وتت چۆن ڕێگە دراوە کە خێزانی پێغەمبەر بێ باوەڕ بێت وەك خێزانی نوح و خێزانی لوط و ڕێگە نەدراوە کە داوێن پیس بن؟ دەڵێین: چونکە پێغەمبەران (علیهم السلام) نێردراون بۆ لای کافران تا بانگەوازیان بکەن و سۆز و عەتفیان کەمەندکێش بکەن، پێویستە شتانێکیان پێ بێت کە ئەوان لایان هەڵنەیەن، و کافر بوونی ئەوانیش شتێك نییە لێیان بسڵەمێنەوە، بەڵکو زینا و داوێن پیسی ئەوشتەیەکە لێی بسڵەمێنەوە).[٥٣٠] چونکە هەرگیز ئەو کارە ناپەسەندە لە خێزانی پێغەمبەران ڕووی نەداوە.

ئایەتی: ﴿هَٰذَا بُهْتَانٌ عَظِيمٌ﴾ ئاماژە بوو بۆ ڕوودانی بوختانەکە، بوختانیش بریتی یە لە: باسکردنی شتێك لە ئینساندا کە تیایدا نەبووە و ڕوینەداوە لێی، لە (ابي هريرة)ەوە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (ئایا دەزانن غەیبەت چییە؟ وتیان: خوا و

---

[٥٢٩]- تفسير القرآن العظيم لإبن كثير ٢٧٤/٣. بەکورتی.

[٥٣٠]- الكشاف ٢٢١/٣ بە دەستکاری یەوە.

پێغەمبەرەکەی دەزانن. فەرمووی: ئەوەیە بەشتێك باسی براکەت بکەیت کەپێی ناخۆشە، وترا: ئەی ئەگەر ئەوەی باسکرا لە براکەمدا هەبوو؟ فەرمووی: ئەگەر ئەوەی تیابوو کە دەیڵێیت، ئەوا بەڕاستی غەیبەتت کردووە، خۆ ئەگەر تیایدا نەبوو ئەوەی کە دەیڵێیت ئەوا بەڕاستی بەختانت کردووە).[٥٣١]

بوختان، بریتی یە لەو شتەی کە باسبکرێت دەربارەی ئینسان، بەلاَم تایایدا نەبێت، کاتێك بوهتان بۆ کەسێك دروست دەکرێت، بێگومان ئەوە درۆیەکی ئاشکرایە، ئەو کارەیش گەورەترین بوهتان بووە، چونکە درۆیەکی گەورە و ئاشکرابووە بۆ گەورەمان خاتوو عائیشە (خوا لێی ڕازی بێت) کە دایکی باوەڕداران و خێزانی پێغەمبەر (ﷺ) بوو، کە ئافرەتێکی پاك و ڕاستگۆ بوو، و کچی پیاوێکی ڕاستگۆ بوو، کە تەنها خەیر و چاکەی لێ بینرا بوو، لەگەڵ داوێن پاکی و تەقوا و لەخواترسان.

﴿يَعِظُكُمُ اللَّهُ أَن تَعُودُوا لِمِثْلِهِ أَبَدًا إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ﴾(النور:١٧).

واتە: (خوا ئامۆژگاریتان دەکات کە نەکەن هەرگیز شتی ئاوا دووبارە بکەنەوە ئەگەر ئێوە ئیماندارن).

﴿وَيُبَيِّنُ اللَّهُ لَكُمُ الْآيَاتِ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾ (النور:١٨).

واتە: (خوا ئایەت و فەرمان و ڕێنموویيەکانی ڕوون دەکاتەوە بۆتان (تا یەکتر لەکەدار نەکەن)بێگومان خوا زانا و دانایە.

خوای گەورە بە ئایەتەکانی ڕوونی دەکاتەوە چی لە دنیا و قیامەتیشدا بۆ بەندەکان چاکە و خەیرە. مامۆستا (سید قطب)(ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێت: ﴿وَيُبَيِّنُ اللَّهُ لَكُمُ الْآيَاتِ﴾. لەسەر ئەو نموونەیەی کە لە ڕوودانی بوختانەکەدا ڕوونی کردەوە، و هەرچی لە پشتییەوە بوو هەمووی دەرخست، لە فێڵ و نەخشە و ڕووداو و هەڵەکان ﴿وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾ .خوای گەورە ڕاز و نیەت و مەبەست و ئامانجەکان دەزانێت، و ئاگادارە بە دەروازەی دڵەکان و ناوەڕۆکەکەیشی و شارەزا و بەئاگایە بەسەر نەفسەکاندا و دانا و کاربەجێ یە بۆ دیاریکردنی چارەسەری گونجاو و کار و بارەکانی ڕێك دەخات و یاسا و سنووری بۆ دادەنێت کە چاك و گونجاو بێت. ..).[٥٣٢]

---

[٥٣١]- رواه مسلم في صحيحه كتاب/البّر و الاداب باب تحريم الغيبة.

[٥٣٢]- في ظلال القرآن ٢٥٠٣/٤.

﴿إِنَّ الَّذِينَ يُحِبُّونَ أَن تَشِيعَ الْفَاحِشَةُ فِي الَّذِينَ آمَنُوا لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ وَاللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ﴾(النور:١٩). ئایەتەکانی پێشوو لە پاکی و بێتاوانی خاتوو عائیشە (خوا لێی ڕازی بێت) دووان و باسی درۆ و بوختانچێتی درۆزنانی دەکرد، و پێویستە کە بەشێوازی دروست و جوان بەدوای هەواڵ و ڕووداودا گەڕان بکرێت و گومانی باش بە کەسانی ڕێزدار و چاکەکار ببرێت، هەروەها خوای گەورە باسی ڕەحمەتی بێ پایانی بە بەندەکانی و فەزڵ و ڕێزی لەسەریان بە مۆڵەت پێدان و تەوبە لێ قبووڵ کردن کرد. لەم ئایەتەیشدا هەڕەشەی تۆڵە لێ سەندنەوە لەو کەسانە هەیە کە حەزدەکەن و پێیان خۆشە فاحیشە و داوێن پیسی لەناو کۆمەڵگای موسوڵمانانندا بڵاو ببێتەوە و لەزەتی لێ دەبینن کاتێك ڕۆدەچن لە مەسەلەی ئابڕو شەرەف کەسانی باوەڕداردا و گوێ نادەنە ئەوەی کە پاشتر چی لێ دەکەوێتەوە لە زیان و زەرەری گەورە و ئابڕو چوونی خۆیان، ئەو کەسە بوختانچی و تاوانبارانە سزای سەخت و بەئازاریان بۆ هەیە لە دنیا و لە قیامەتدا، دەگەنەوە بەوەی کە خۆیان دروستیان کردووە و ئەنجامیان داوە.

ئەم ئایەتەیش لەگەڵ ئەوەی کە لەپاش بەندی ڕووداوی بوختان و درۆ ڕێك خستنەکە دابەزی، بەڵام بەڕاستی گشتگیرە، چونکە پەند و عیبرەت وەرگرتنەکە گشتی دەبێت بەپێی وتەو دەربڕینی ئایەتەکە نەك بەتایبەتمەنی هۆکارەکە.

پێشەوا (الرازي) دەڵێت: (گومانی تیا نییە کە دیوی ئاشکرای ئایەتەکە: ﴿إِنَّ الَّذِينَ يُحِبُّونَ أَن تَشِيعَ الْفَاحِشَةُ﴾ گشتی دەگەیەنێت، گومانی تیادا نییە کە ئەم ئایەتە دەربارەی تۆمەتبارکردنی عائیشە دابەزی،...پێویستە بەسەر لایەنی گشتیدا جێ بەجێ بکرێت....).[٥٢٣]

بێگومان ئایەتەکە گشتی دەبێت لەسەر هەموو ئەو کەسانەی کە حەز دەکەن فاحیشە و خراپە لە نێوان باوەڕداراندا بڵاو بێتەوە ئیتر بەهەر هۆکارێك بێت، کە هەموو شێوازەکانی فاحیشە و خراپە دەگرێتەوە، بە تۆمەتبارکردنی ئافرەتانی پاك و پارێزراو و بێ ئاگا و باوەڕدار بۆ ئەوەی متمانە لەناو کۆمەڵگادا نەهێڵن، و ڕەگ و ڕیشەی شك و گومان لە نێوان خەڵکیدا بڵاو بکەنەوە، هەروەك ئەوەیش کە ئایەتەکە بەسەر ئەو کەسانەشدا جێ بەجێ دەبێت کە وروژێنەری فاحیشە و خراپەن، کە ئاگری ئارەزووەکان

٥٢٣- مفاتیح الغیب ٢٣\١٨٣ بەکورتی و دەستکارییەوە.

خۆش دەکەن و فوودەدەن کە خۆیان کپ و بێ دەنگ بوون و غەریزە داپۆشراو و شاراوەکان دەهەژێنن، ئەوەیش بە گۆرانی خراپ و دروشمی سەرنجراکێش، و وێنە و لافیتەی بێ بەرگ و ڕووت و فیلم و زنجیرە درامای کۆمیدی و بێ مانا و دوور لەڕەوشت و ئادابی کۆمەڵگای تەندروست، و شانۆگەری بێ نرخ و بێ بەها، ئەو کەسانە شێوازی جل و بەرگی نادروست و نەشیاو بڵاودەکەنەوە بە هۆکارە پیسەکانیان شاباش و دەست خۆشی لەبەکارهێنەرانیان دەکەن و هانیان دەدەن، هەروەها ئەم ئایەتە بەسەر ئەوکەسانەیشدا جێ بەجێ دەبێت کە حەز دەکەن فاحیشە و خراپە لەناو تەلار و باڵەخانە و شوێنە بەرز و فراوانەکان و شوێنی شانۆگەری و دراما و ڕەقس و سەما و مەلهاکانی شەو ونادی و لادێکان و کەناری دەریاکاندا بڵاو ببێتەوە.

هەروەها ئایەتەکە بەسەر ئەوکەسانەیشدا جێ بەجێ دەبێت کە دژایەتی شەرع و بەرنامەکەی خوا دەکەن و سزای کەسانی خراپ و بوختانچی و داوێن پیس دوا دەخەن، و دژایەتی هەموو بانگخوازێکی چاکەکاری و پاکی و داوێن پاکی دەکەن.

ئایەتە پیرۆزەکە بەسەر هەموو ئەوکەسانەشدا جێ بەجێ دەبێت کە حەز دەکەن فاحیشە و خراپە لە نێوان باوەڕداراندا بڵاو ببێتەوە بە هەموو ڕێگا و هۆکارەکان.

بێگومان سزای دنیا خێرا و بەپەلە تووشیان دێت و سزای قیامەتیش دواخراو و بەڵێندراوە و چاوەڕوانیان دەکات، ئەگەر تەوبە نەکەن و نەگەڕێنەوە بۆلای خوای گەورە.

﴿وَاللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ﴾.

خوای گەورە دەزانێت ئەو کەسانە کێن کە حەز بە بڵاوبونەوەی فاحیشە و خراپە دەکەن و نهێنی و ئاشکرایان دەزانێت و ئاگادارە بە نیەت و مەبەستەکانیان کە پیسە و ئاگادارە بە نەفسی فەرمانەدەر بە تاوانەکانیان و بەکردەوە خراپەکانیان دەزانێت و ئەوەیشی لەخراپە و تیاچوون و گومڕایی لێی دەکەوێتەوە.

پێشەوا (الرازي) دەفەرموێت: (ئایەتی: ﴿وَاللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ﴾ شوێنێکی جوانی هەیە لەم بابەتەدا، چونکە حەز و خۆشیەکانی دڵ شتێکی شاراوەن ئێمە نایانزانین تەنها بە نیشانەکانیدا نەبێت، بەڵام خوای گەورە هیچ شتێکی لێ شاراوە نییە، ئەم باسە گەیشتە کۆتایی لە پیاهەڵشاخاندا، چونکە هەرکەس حەز بکات فاحیشە و خراپە بڵاو ببێتەوە بازۆریش هەوڵیدا بێت ئەو حەزە لە ناخیدا بشارێتەوە، بەڵام بەڕاستی خوای گەورە لە خۆی زۆر زیاتر پێی ئاگادارترە، زانستی خوای گەورە بەوشتەی کە ئەو

شاردوویەتی یەوە، وەك هەمان زانست و شارەزایی یەتی بەو شتەی کە ئەو ئاشکرای کردووە و دەشزانێت چۆن پاداشتی دەداتێ).[٥٢٤]

﴿وَلَوْلَا فَضْلُ اللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُ وَأَنَّ اللَّهَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ﴾(النور: ٢٠).

خوای گەورە منەت و بەخششەکانی خۆی لەسەر بەندەکانی دووبارە کردەوە و فەزڵ و بەزەیی خۆی نیشاندان، بەوەی کە سزای بەپەلەیان تووش بکات، لێرەدا یادخستنەوەیەك هەیە بە گەورەیی فەزڵی خوا و رەحمەت و بەزەیی فراوانی، و یادخستنەوەیەکیش هەیە بە گەورەیی ئەو درۆ و بوهتانەی کە لەسەر خاتوو عائیشە (خوالێی ڕازی بێت) ڕێك خرا.

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَتَّبِعُوا خُطُوَاتِ الشَّيْطَانِ وَمَن يَتَّبِعْ خُطُوَاتِ الشَّيْطَانِ فَإِنَّهُ يَأْمُرُ بِالْفَحْشَاءِ وَالْمُنكَرِ وَلَوْلَا فَضْلُ اللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُ مَا زَكَىٰ مِنكُم مِّنْ أَحَدٍ أَبَدًا وَلَٰكِنَّ اللَّهَ يُزَكِّي مَن يَشَاءُ وَاللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾(النور: ٢١).

واتە: (ئەی ئەوانەی ئیمان و باوەڕتان هێناوە شوێنی هەنگاو و نەخشە و پلانەکانی شەیتان مەکەون، هەرکەس شوێنی هەنگاو و نەخشە و پلانی شەیتان بکەوێت زەرەر دەکات، چونکە بەڕاستی شەیتان هەمیشە فەرمان بەکار و کردەوەی خراپ و گوناه و تاوان و ناشیرینی دەکات، ئەگەر فەزڵ و میهرەبانی خوا نەبوایە لەسەرتان، ئەوە هەرگیز کەستان پاك و پوختە و ڕزگار نەدەبوون (لەدەست بوختانچییەکان، یاخود بەتەوبە پاك نەدەبونەوە) بەڵام خوا هەر کەسێکی بوێت و شایستە بێت، پاك و پوختەی دەکات و لە گوناهەکانی دەبورێت، خوایش هەمیشە بیسەر و زانایە (بەتەوبە و پەشیمانیتان و نیەتی دڵ و دەروونتان).

ئیسلام کاتێك زینای حەرام و قەدەغەکرد، هەموو ئەوشتانەیشی کە پەیوەندی پێوەی هەیە حەرامی کرد لە قسە یان کردار یان مەبەستی پیس.[٥٢٥]

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَا تَقْرَبُوا الزِّنَىٰ إِنَّهُ كَانَ فَاحِشَةً وَسَاءَ سَبِيلًا﴾(الأسراء:٣٢).

---

[٥٢٤]- مفاتيح الغيب للرازي٢٣\١٨٤ بەدەستکاری یەوە.

[٥٢٥]- لەوشتانەیش: سەیرکردن و تێڕوانین لەئافرەتانی نامەحرەم و مانەوە لەگەڵ ئافرەتانی بێگانە و تێکەڵاوبون لەگەڵ ئەوانەی نەهی کراوە و خۆڕازاندنەوە و گۆرانی و ووروژێنەر و شتانی تریش لەنەخشەکانی شەیتان.

واتە: (هەرگیز نەکەن توخنی زینا بکەون و لێی نزیك بنەوە، چونکە ئەوە بەڕاستی گوناه و تاوان و هەڵەو ڕێچکەیەکی زۆر ناقۆڵایە).
لە فەزڵ ومیهرەبانی خوای گەورە بەسەرمانەوە بریتییە لەوەی کە هیدایەتی داوین بۆ ئیمان و پشتیوانی و کۆمەکی کردوین بۆ ڕێگای پاکی و پارێزراوی، خوا ئەو زاتەیە کە دەرونەکان پاك دەکاتەوە و خاوێنی دەکات و بەرز و باڵای دەکات بۆ پلە بەرزەکانی ئیمان و چاکە، و خوا بیسەری هەموو وتەیەکە و زانایە بە هەموو مەبەست و کردارێك، خوا زانایە بەو کەسانەی کە هەمیشە خەیر و چاکە دەڵێنەوە زانایشە بەو کەسانەی کە مەبەستیان شەڕە و هەوڵی بۆ دەدەن.
﴿وَلَا يَأْتَلِ أُولُو الْفَضْلِ مِنكُمْ وَالسَّعَةِ أَن يُؤْتُوا أُولِي الْقُرْبَىٰ وَالْمَسَاكِينَ وَالْمُهَاجِرِينَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَلْيَعْفُوا وَلْيَصْفَحُوا أَلَا تُحِبُّونَ أَن يَغْفِرَ اللَّهُ لَكُمْ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾(النور:٢٢).

## هۆکاری دابەزینی ئایەتەکە

ئەم ئایەتە پیرۆزە دەربارەی (أبی بکر الصدیق) دابەزی، کاتێك سوێندی خوارد کە خەرجی (مسطح ی کوڕی أثاثة) نەکێشێت، پاش ئەوەی کە دەربارەی عائیشەی دایکی ئیمانداران قسەی کردبوو، بەڕاستی (مسطح) داری سزا (حد)ی لێ درا و تەوبەی کرد و گەڕایەوە بۆ لای خوا، کاتێك ئەم ئایەتە پیرۆزە دابەزی، (أبی بکر الصدیق) ووتی: بەڵکو سوێند بە خوا بەڕاستی ئیمە حەز دەکەین کە پەروەردگارمان لێمان خۆش ببێت، پاشان ئەوەی کە لە (مسطح)ی بڕیبو، بۆی گەڕاندەوە لە خەرجی و بەخشین،و وتی: سوێند بەخوا هەرگیز دەستی لێ هەڵناگرم).[٥٣٦]
مانای ئایەتەکە واتە: (ئەوانەی کە خاوەنی سامان و بەخشندەیین لە ئێوە با سوێند نەخۆن کە یارمەتی خزمان و هەژاران و کۆچبەران لە پێناوی خوادا نەدەن (لەبەر ئەوەی بەشداربوون لە وتنی بوختانەکەدا)دەبا لێبوردە بن، دەبا چاو پۆشی بکەن، مەگەر حەز ناکەن خوا لێتان خۆش ببێت، خوایش هەمیشە لێخۆشبو و میهرەبانە).

---

٥٣٦- أسباب النزول للواحدي ص\٢١٧ وأسباب النزول للسيوطي بهامش تفسير الجلالين ص٥٧٩.

بێگومان ئەم ئایەتەیش هەرچەندە دەربارەی(ابی بکر الصدیق) دابەزی، بەڵام گشتییە و هەموو کەس دەگرێتەوە، هەروەها لەم ئایەتەدا ئاماژەکراوە بۆ فەزڵ و ڕێز و گەورەیی پلە و پایەی(ابی بکر) لای خوای گەورە، ئەوەیشی تیاڕوون کراوەتەوە کە ڕێگە دەدرێت سوێند بشکێندرێت، ئەگەر کەسی سوێند خۆر زانی خەیری زیاتری تیایە ئەگەر سوێندەکەی شکاند.

خوای گەورە لە سوورەتی (المائدة)دا دەفەرموێت: ﴿لَا يُؤَاخِذُكُمُ اللَّهُ بِاللَّغْوِ فِي أَيْمَانِكُمْ وَلَكِن يُؤَاخِذُكُم بِمَا عَقَّدتُّمُ الْأَيْمَانَ فَكَفَّارَتُهُ إِطْعَامُ عَشَرَةِ مَسَاكِينَ مِنْ أَوْسَطِ مَا تُطْعِمُونَ أَهْلِيكُمْ أَوْ كِسْوَتُهُمْ أَوْ تَحْرِيرُ رَقَبَةٍ فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ ذَٰلِكَ كَفَّارَةُ أَيْمَانِكُمْ إِذَا حَلَفْتُمْ وَاحْفَظُوا أَيْمَانَكُمْ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ اللَّهُ لَكُمْ آيَاتِهِ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ﴾(المائدة:٨٩).

واتە: (خوا لێتان ناگرێت کاتێک بە سادەیی سوێند بەدەمتانا دێت و (لەسەری ڕاهاتوون) بەڵکو لەو سوێندانەتان دەپرسێتەوە کە بیر و هۆشتان لای هەبووە و بۆ مەبەستێك وتوتانە، جا کەفارەتی ئەو جۆرە سوێندانە نان و خۆراك دانە بەکەسی هەژار بە شێوەیەکی مامناوەندی کە بۆ خاو و خێزانتان سەرفی دەکەن، یاخود پۆشتەکردنەوەیان، یاخود ئازادکردنی بەندەیەك (ئەگەر بووی) ئەوەی (توانای ئەوشتانەی نەبوو) باسیٚ ڕۆژ بەڕۆژوو بێت، ئەوە کەفارەتی سوێندەکانتانە، کاتێك سوێند دەخۆن و نایبەنە سەر، جا تا دەتوانن سوێندەکانتان بپارێزن و مەیانشکێنن، ئابەو شێوەیە خوا ئایەتەکانی خۆیتان بۆ ڕوون دەکاتەوە بۆ ئەوەی سوپاس گوزاریی بکەن).

﴿إِنَّ الَّذِينَ يَرْمُونَ الْمُحْصَنَاتِ الْغَافِلَاتِ الْمُؤْمِنَاتِ لُعِنُوا فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ﴾(النور:٢٣).

واتە: (بەڕاستی ئەوانەی ئافرەتی ئیمانداری پاك داوێن و خاوەن مێرد و بیٚ ئاگا لە گوناه، تۆمەتبار دەکەن، ئەوانە نەفرینیان لیٚ کراوە لە دونیا و قیامەتدا و سزایەکی گەورە و سەخت ئامادەیە بۆیان (لە تۆڵەی لەکەدار کردنی پاکاندا)).

هەروەها ئەم ئایەتەیش لە پاشبەندی ڕووداوی (إفك) بوختانەکە دابەزی، بێگومان ئەمەیش گشتییەو هەموو لایەنێك دەگرێتەوە.

بەڕاستی شێخی زانایانی تەفسیر پێشەوا(الطبري) لە تەفسیرەکەیدا ئەم ئایەتەی هەڵبژاردووە کە: گشتییە.[٥٣٧]

هەروەها (أبو هريرة) (خوا لێی ڕازی بێت) دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (دوور بکەونەوە لەو حەوت گوناهەی کە ئادەمیزاد لەناو دەبەن) ووتیان: ئەوانە چین ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، فەرموی: (هاوەڵ بۆ خوا بڕیاردان، جادوو، کوشتنی ئادەمیزاد کە خوا حەرامی کردووە مەگەر بە حەقی خۆی، سووخواردن، خواردنی ماڵی هەتیو، پشت هەڵکردن لەڕۆژی جەنگی کافراندا، بوختان کردن بۆ ئافرەتانی باوەڕداری بێ ئاگای پاك داوێن).[٥٣٨]

زانا (ابن كثير) دەڵێت: زانایان یەك دەنگ و ڕان لەسەر ئەوەی کە هەر کەس قسە بە عائیشە بڵێت پاش ئەوەی پاکی و بێتاوانی دەرکەوت، وەك ئەوەی بوختان چییەکان پێیان وت، وتیان، بێگومان ئەو کەسە بێباوەڕە، چونکە سەرپێچی قورئانی پیرۆزی کردوە، هەروەها بۆ سەرجەم دایکانی تری ئیمانداران، دوو بۆچوون هەیە، کە ڕاسترینیان ئەوەیە، ئەوانیش وەك عائیشەن، و خوا زاناترە).[٥٣٩]

دەڵێین: بەڵام بە نیسبەت غەیری دایکانی ئیماندارانەوە، بێگومان حوکم و بڕیارەکە جیاواز دەبێت، هەرکەس تۆمەتێك بۆ ئافرەتێك لە غەیری خێزانەکانی پێغەمبەر (ﷺ) دروست بکات، ئەوە بێباوەڕ نابێت، بەڵکو تاوانی گەورەی ئەنجامداوە، ئەوەیش تاوانی گەورە ئەنجام بدات پێی کافر نابێت، ئەگەر بە حەلاڵ و دروستی نەزانیبێت، خۆ ئەگەر بە حەلاڵ و دروستی زانی ئەوە کافر دەبێت، چونکە ئینکاری شتێکی زانراوی گرنگی ناو دینی کردووە.

﴿يَوْمَ تَشْهَدُ عَلَيْهِمْ أَلْسِنَتُهُمْ وَأَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُم بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾(النور: ٢٤).

واتە: (لە ڕۆژێکدا کە زمان و دەست و قاچیان لێیان دەبێتە شایەتێکی گۆیا، لە بەرامبەر ئەو کردەوانەوە کە ئەنجامیان دەدا و (ئەو بوختانەی کە دەیانکرد.

خوای گەورە لە سوورەتی (فصلت)دا _کەئەمە ماناکەیەتی_ دەفەرموێت: (ڕۆژێك دێت کە دوژمنانی خوا تێکڕا کۆدەکرێنەوە و کێش دەکرێن بەرەو ئاگری دۆزەخ، بەرودوایان

[٥٣٧]– جامع البيان للطبري ١٨\٨٣.

[٥٣٨]– رواه البخاري كتاب الحدود و رواه مسلم كتاب الأيمان.

[٥٣٩]– تفسير القرآن لأبن كثير ٣/٢٧٦.

پاڵەپەستۆیانە، هەتا کاتێك دەگەنە ئاستی ئاگرەکە گوێیان وچاوەکانیان وپێستەکانیان شایەتیان لەسەر دەدات کەچ کار و کردەوەیەکی ناردوست و خراپیان ئەنجام دەدا، ئەوسا بە خەمباری یەوە بە پێستی خۆیان دەڵێن: بۆچی شایەتیتان لەسەرداین خۆ زەرەرتانە؟ لەوەڵامدا دەڵێن: ئەو خوایە ئێمەی هێناوەتە گوفتار کە دەتوانێت هەموو شتێك بهێنێتە قسە و گفتوگۆ، هەر ئەو زاتەیشە کە یەکەمجار بەدیهێناون و هەر بۆلای ئەویش دەبرێنەوە (بێگومان کارێکی ئاسانە بۆ خوا چونکە ئادەمیزاد جۆرەها ئامێری هێناوەتە قسە، دەم وزمان لێویشیان نییە !)، ئێوە کاتی خۆی ئەوەندە غەرِرا بوون، تاوان و گوناهەکانتان نەدەشاردەوە، چونکە مەترسیتان نەبوو کە گوێتان وچاوتان وپێستتان شایەتیتان لەسەر بدات، بەلآم گومانتان وابوو کە بەڕاستی خوا زۆر ئاگادارنییە بەو کار وکردەوانەی کە ئەنجامی دەدەن، ئا ئەوە بوو گومانی ناپەسەندتان کەبوتان بەرامبەر پەروەردگارتان، ئێستابوو بەهۆی داخزان وتیاچوونتان و بەهۆیەوە چوونە ڕیزی زەرەرمەندانەوە. جا ئەگەر بەناچاری خۆگری بنوێنن، ئەوە ئاگر جێگەیانە، ئەگەر داوای لێبوردن و چاوپۆشی بکەن، چاوپۆشییان لێ ناکرێت و داوایان لێ وەرناگیرێت).

﴿يَوْمَئِذٍ يُوَفِّيهِمُ اللَّهُ دِينَهُمُ الْحَقَّ وَيَعْلَمُونَ أَنَّ اللَّهَ هُوَ الْحَقُّ الْمُبِينُ﴾(النور:٢٥).

واتە: (ئەو ڕۆژە خوا بە گوێرەی کار و کردەوە و ئیمان وباوەڕی حەقیقیان پاداشتیان دەداتەوە، ئەوسا چاك بۆیان دەردەکەوێت کە بەڕاستی خوا خۆی زاتێکی ڕاست و دروستی ئاشکرایە(هیچی لێ وون نابێت).).

خوای گەورە لە سوورەتی(الأنبياء)دا _کەئەمە ماناکەیەتی_دەفەرموێت: (ئێمە پێوەر و تەرازووەکانی دادپەروەری لە ڕۆژی قیامەتدا دادەنێین، جا هیچ کەس بە هیچ شێوەیەك ستەمی لێ ناکرێت ئەگەر بەقەدەر تۆوە خەرتەلەیەك(کەزۆر بچووك و ووردە، کارێکی چاك یان خراپی ئەنجام دابێت) دەیهێنینەوە مەیدان، جا ئەوەندە بەسە بۆ ئێمە، کە ئاوا بە ووردی حیساب و لێپرسینەوە ئەنجام دەدەین) (الأنبياء:٤٧).

هەروەها لە سوورەتی (الكهف)دا _ کەئەمە ماناکەیەتی_ دەفەرموێت: (نامەی کردەوەی هەرکەس دادەنرێت (ئیمانداران دڵخۆشن)، بەلآم تاوانباران دەبینیت دڵە لەرزێ و دڵەڕاوکێیانە لە کار و کردەوەی ناپەسەندی تۆمارکراویان، بۆیە دەڵێن: هاوار لە ئێمە، ئەم نامە و دۆسیەیە چییە؟! هیچ گوناهێکی وورد و درشت بەجێ ناهێڵێن، بەڵکو

هـەمووی تۆمـارکردووە، ئـەو خەڵکـە هەرچییان کـردووە، (بـەدەنگ وڕەنگەوە)ئامادەیـە، بێگومان پەروەردگاری تۆ ستەم لە هیچ کەس ناکات). (الكهف:٤٩).

کاتێـك کارەکـە بـەم جـۆرە بێـت، کەواتـە دەبێـت بەنـدە هەمووسـات وکاتێـك ئاگـای لەپـەروەردگاری بێت لـە هـەموو وتـەو کردارێکیدا، و بزانێت کە خـوای گـەورە ئاگادارە بەسەری یەوە، و هیچ شتێکی لێ وون نابێت، بێگومان خوا حەقە، حەق و ڕاستی دەڵێت و بەحەق بڕیار دەدات، و بە وتـەی حـەق فـەرمان دەدات، خوا ڕوون وئاشکرایە وبەحـەق دەناسـرێت. هـەر خـوای گـەورە بـوو کـە پـاکی و بێتـاوانی خـاتوو عائیشـەی دەرخسـت وسـەلماند، و لـە ڕۆژی قیامەتیشـدا ئەندامـەکان دێنێتـە گـۆ تـا خۆیـان شـایەتی لەسـەر خاوەنەکەیان بدەن.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَوْمَ يَبْعَثُهُمُ اللَّهُ جَمِيعًا فَيُنَبِّئُهُم بِمَا عَمِلُوا أَحْصَاهُ اللَّهُ وَنَسُوهُ وَاللَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ﴾(المجادله:٦).

واتە: (لە ڕۆژێکدا کـە خـوا هـەموویان زینـدوو دەکاتـەوە پێکـەوە، ئەوسـا هـەواڵی هـەموو کار و کردەوەکانیان پێ ڕادەگەیەنێت، خوا ئاماری کردووە، ئەوان فەرامۆشیان کـردووە، خوایش شایەت وبەئاگایە بەسەر هەموو شتێکدا).

هـەروەها لـە سـوورەتی (غـافر)دا _کـە ئەمـە ماناکـەیـەتی_ دەفـەرموێت: ئـەو ڕۆژە (ڕۆژی قیامـەت) هـەموویان بـەدەرەوەن، (ڕوت و ڕەجـاڵ، نهـێنی وئاشـکرا وەك یەکـە) هـیچ شتێکیان لە خوا شاراوە نییە، ئەوسا پەروەردگاری مەزن دەفەرموێت: ئەمڕۆ پاشـایەتی و فەرمانڕەوایی شایستەی کێیە؟ کێ خاوەنی هەموو ئەم بوونەوەرەیە؟ کەس نییـە وەڵام بداتـەوە، خـۆی دەفـەرموێت: هـەر هـەمووی بـۆ خـوای تـاك و تـەنها و خـەشمگیرە، ئەمڕۆ هەموو کەس پاداشتی کار و کردەوەی خۆی وەردەگرێت، ئەمڕۆ هـیچ جـۆرە ستەمێك لـە کەس ناکرێت، بەڕاستی خوای گەورە بە خێرایی لێپرسینەوەکان ئەنجام دەدات (چونکە هەموو شت ڕوونەلای) (غافر:١٦_١٧).

﴿الْخَبِيثَاتُ لِلْخَبِيثِينَ وَالْخَبِيثُونَ لِلْخَبِيثَاتِ وَالطَّيِّبَاتُ لِلطَّيِّبِينَ وَالطَّيِّبُونَ لِلطَّيِّبَاتِ أُولَئِكَ مُبَرَّءُونَ مِمَّا يَقُولُونَ لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ﴾(النور:٢٦).

واتە: (ژنانی ناپاك بۆ پیاوانی ناپاك و، پیاوانی ناپوخت بۆ ژنانی ناپوخت، ئافرەتـانی پـاکیش بـۆ پیـاوانی پـاك، و پیـاوانی پـاکیش بـۆ ئافراتـانی پـاك، ئـەو پاکانـە بـەری و

بێتاوانن لەوتۆمەتانەی کە ناپاك هەڵی دەبەستن (چونکە محمدی پاك (ﷺ) هاوسەری عائیشەی پاکە) بۆ ئەو چاکانە لێخۆشبوون و ڕزق و ڕۆزی بەنرخ ئامادەیە).
زانا (إبن کثیر) دەڵێت: (ئەگەر عائیشە (خوالێی ڕازی بێت) ئافرەتێکی پاك نەبوایە، خوای گەورە نەیدەکردە هاوسەری پێغەمبەری خوا (ﷺ) چونکە پێغەمبەر (ﷺ) لە هەموو بەشەرەکان پاکتر بووە، پاکترینان بووە، خۆ ئەگەر عائیشە پاك و پوخت نەبوایە، ئەوا نەدەگونجا بۆ پێغەمبەر (ﷺ) نە بەشەرع و نە لەڕێز و پلەوپایەشدا، لەبەر ئەوە خوای گەورە فەرمووی: ﴿أُولَٰئِكَ مُبَرَّءُونَ مِمَّا يَقُولُونَ﴾.
واتە:ئەوان دوورن لەوەی کە درۆزن و بوختان چییەکان دەیڵێن).[٥٤٠]
ئایەتەکە تێگەیشتنێکی تریشی هەیە، ئەوە ڕەت ناکاتەوە کە باسمان کرد، ئەویش بریتییە لە: وتەی پیس وناپەسەند شیاوە بە ئەهلی پیس و ناپەسەندان لە خەڵکی و، وتەی جوان و پاکیش، شیاو ولەپێشترە بۆ پاکان و کەسانی پەسەند لە خەڵکی، ئەوەی کە دووڕووەکان خستیانە پاڵ عائیشە، بێگومان عائیشەیش هەر شیاوی پاکی و پەسەندی بووە.[٥٤١]
پاش ئەوەی کە خوای گەورە پاکی دایکی ئیمانداران عائیشەی دەرخست، مژدەی لێخۆشبوون و ڕزق وڕۆزیشی بە ڕێزەوە پێدا، کە بەهەشتی نەبڕاوە و ماڵی ڕێز وئارامگرتن و بەزەیی و حەوانەوەیە، کە خوای گەورە بۆ بەندە ڕێزدارەکانی ئامادەکردووە.
پێشەوا (الزمخشری) دەڵێت: (بەڕاستی خوای گەورە پاکی چواری بە چوارشت ڕاگەیاندووە و ڕوون کردۆتەوە: یوسف (علیە السلام)بە وتەی شایەتەکە پاك ڕاگرت: ﴿وَشَهِدَ شَاهِدٌ مِّنْ أَهْلِهَا إِن كَانَ قَمِيصُهُ قُدَّ مِن قُبُلٍ فَصَدَقَتْ وَهُوَ مِنَ الْكَاذِبِينَ﴾، و موسایشی لە قسەی جولەکەکان بەو بەردە پاك ڕاگرت کە جلەکانی موسای بەسەرەوە بوو ڕۆیشت.[٥٤٢]

---

[٥٤٠]- تفسير القرآن العظيم ٣/٢٧٨.

[٥٤١]- تفسير القرآن العظيم لأبن كثير ٣/٢٧٨.

[٥٤٢]- ئیمامی مسلم بە سەنەدێك لە (ابی هریرە)وە ڕیوایەتی کردووە کە دەڵێت: موسا(علیە السلام)پیاوێکی شەرمن بوو هیچ کات بە ڕوتی نەدەبینرا، نەوەی ئیسرائیل وتیان:هێلکەی گونی ئاوساوە، لەناو تەنکاوێکدا خۆی شۆرد، جلەکانی لەسەر بەردێك دانا، بەردەکە کەوتەڕێ و ڕۆیشت، موسا(علیە السلام)بە عەساکەیەوە دوای کەوت ولێی دەداو دەیفەرموو:ئەی بەرد جلەکانم، هەتا گەیشتە لای گۆمەڵێك لە نەوەی ئیسرائیل و وەستا، لەو بارەیەوە ئەم ئایەتە دابەزی﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَكُونُوا كَالَّذِينَ آذَوْا مُوسَىٰ فَبَرَّأَهُ اللَّهُ مِمَّا قَالُوا وَكَانَ عِندَ اللَّهِ وَجِيهًا﴾(الأحزاب:٦٩) واتە:ئەی باوەڕداران وەك ئەوانە

و مەریەمی(علیها السلام) بە قسەکردنی منداڵە بچووکەکە پاك ڕاگرت کە عیسا (علیه السلام) بوو، کە لە بێشکەدا بوو فەرمووی: ﴿قَالَ إِنِّي عَبْدُ اللهِ ..﴾ و عائیشەیشی بەو ژمارە ئایەتە پیرۆزە زۆر گەورەیە پاك ڕاگرت کە لە قورئاندا بوو، هەتا هەتایە دەخوێنرێتەوە، کە بە شێوازێکی ناوازە و جوان پاکی عائیشەی دەرخست، بڕوانە و بزانە نێوانی پاکی عائیشە و پاکی ئەوان چەند بووە؟ ئەمەیش تەنها بۆ بەرزی و پلەوپایەی پێغەمبەر (ﷺ) بووە، ئەمەیش ئاگادارکردنەوە بوو بۆ بەرزی وگەورەیی پلە و پایەی لەناو نەوەی ئادەم و باشترین کەسی پێشین ودوایین بووە و بەڵگە و نیشانەی خوا بووە بۆ گشت جیهان، هەرکەس دەیەوێت گەورەیی ڕێزی پێغەمبەر (ﷺ) جێ بەجێ بکات و هەنگاوەکانی پێش بخات، با ئەو ئایەتانە وەربگرێت و بخوێنێتەوە کە دەربارەی بوختان دروست کردن بۆ خاتوو عائیشە دابەزین و پەندیان لێ وەرگرێت و بیربکاتەوە وڕامێنێت وبزانێت کە چۆن خوای گەورە لەبەر ڕێزی پێغەمبەر (ﷺ) خەشمی هەستاو تووڕە بوو، و چۆن بە شێوازێکی جوان وناوازە هەموو تۆمەتەکانی ڕەت کردەوە).[٥٤٣]

## هەڵوێستێکی ناوازە

پێغەمبەرمان (ﷺ) بەم شێوازە جوانە مامەڵەی لەگەڵ خێزانەکانی کردووە: جارێکیان لای خاتوو عائیشە ئەبێت، خاتو حەفصە بانگی پێغەمبەر (ﷺ) دەکات، کە ئەچێتە لای خاتوو حەفصە لەگەنێکی پڕ لەگۆشت و چێشت دەدات بە پێغەمبەر (ﷺ) ئەویش زۆر دڵی پێ خۆش دەبێت، دای ئەنێت و بانگی هەندێك لە هاوەڵان دەکات بۆ خواردنی، خاتوو عائیشە غیرەتی هەوێی بوون دەیگرێت، لەگەنەکە کە (فەخفوری) بوو ئەیشکێنێت و گۆشت و چێشتەکەیش ئەڕژێنێت، سەرنج بدەئەگەر تۆ شتی لەو جۆرە ببینیت چی ئەکەیت؟ لای کەم ئەگەر زیاتریش نەبێت دەست ئەکەیت بە لێدانی ژنەکەت، بەڵام پێغەمبەر (ﷺ) هیچ تێك نەچوو، پێچەوانەی ئەوە کە هەندێك کەسێن احاڵی ئەڵێن:

---

مەبن کەئازاری موسایان دەدا، هەتا خوا خاوێنی کرد لەو تۆمەتانەی ئەوان دەیان وت، چونکە موسا لای خوا خاوەن ڕێز و پلەوپایەیە).

٥٤٣- الکشاف ٣/٢٢٣ _ ٢٤٤ بەکورتی ودەستکاری یەوە.

ئیسلام هانی پیاوان دەدات کە لە ژنان بدەن، پێغەمبەر (ﷺ) لە ژیانیدا نە لەژن و نە لە خزمەتکاری نەداوە.هاوەڵان ئەوانەی کە ئاگایان لەم ڕووداوە بوو زۆر شپرزە بوون، بەڵام پێغەمبەر (ﷺ) دەزانێت کە ئەمە غیرەتی هەوێیەتی بوو، ئەبێت وابێت.ئەزانن چارەسەری چییە؟چاوپۆشی و دان بەخۆدا گرتنە، پیاوی وا هەیە ئەڵێت: ژن لێی نەدەیت ڕێزت لێ ناگرێت، ئەم بۆچوونە زۆر هەڵەیە و دوورە لە ئیسلامەوە، بە پێچەوانەوە ژن ئەگەر لەگەڵی نەرم بیت باشتر ڕێزت لێ ئەگرێت، پێغەمبەر (ﷺ) چی کرد؟ گۆشتە ڕژاوەکەی کۆکردەوە و خستییەوە ناو لەگەنە شکاوەکە و ڕووانی هاوەڵان بەمە زۆر شپرزەن و دەستەڵاتیان نییە، پێی فەرموون: دایکتان غیرەتی هەوێیەتی جۆشاوە، پاشان فەرمووی: (چاکترین کەسی ئێوە ئەوەتانە زیاتر چاك بێت بۆ خێزانی، من چاکترینتانم بۆ خێزانەکانم).[٥٤٤]

ئایا ئەتوانیت ئاوا خۆگر بیت لە ئاستی هەڵەی خێزانت؟ پیاو هەتا زیاتر چاوپۆشی تیا بێت بۆ هەڵەی خێزانی زیاتر پیاوە، سەرنج بدەن پێغەمبەر (ﷺ) بە هاوەڵانی فەرمووی: دایکتان غیرەت گرتوویەتی. نەیفەرموو عائیشە یان خێزانەکەم، بەڵکو بە بەرێزترین ناوەوە ناوی برد: (أمکم) دایکتان. بەڵام بۆ ئەوەی جارێکی تر دایکە عائیشە شتی وا نەکات چوویە لایەوە و پێی فەرموو: لەگەنەکەی حەفصەت شکاند لەگەنێکی ساغی بۆ بنێرە، عائیشە هەستی بە هەڵەکەی خۆی کرد، ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ژنان زوو هەڵئەچن، داوای لێخۆشبونم بۆ بکە، پێغەمبەر فەرمووی: خوا لێت خۆش بێت.[٥٤٥]

پێغەمبەر (ﷺ) زۆر یادی دایکە خەدیجەی دەکرد لەپاش وەفاتی ئەوەندە خۆشی دەویست، جارێك دایکە عائیشە بە غیرەتی هەوێیەتی پێی فەرموو: ئەی پێغەمبەری خوا،چییە هەر باس باسی خەدیجەیە، پیرەژنێك بوو خوا بۆی گۆڕیت بەچاکتر، بەڵام پێغەمبەر (ﷺ) بەرپەرچی عائیشەی دایەوە بە جۆرێك کە ئازاری نەدات، فەرمووی: (نەبەخوا، بە باشتر بۆی نەگۆڕیوم، کاتێك خەدیجە دڵنەوایی منی دەکرد، خەڵکی دەریان دەکردم، کاتێك پشتگیری لێ دەکردم خەڵکی ڕێگری ئایینیان لێ دەکردم، بڕوای بەمن هێنا کاتێك خەڵکی بەدرۆیان دەخستمەوە، عائیشە فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا،

---

[٥٤٤] - أخرجه الترمذي برقم/٣٨٩٥ وأخرجه إبن ماجة برقم/١٩٧٧.

[٥٤٥] - أخرجه أبوداودبرقم/٣٥٦٧ وأخرجه النسائي برقم/٣٩٦٥وأخرجه إبن ماجه برقم/٢٣٣٤.

داوای لێ خۆشبوونم بۆ بکە لەخوا، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (تۆداوای لێ خۆشبوون بۆ خەدیجە بکە لەخوا، ئینجا منیش داوای لێ خۆشبوونت لەخوا بۆدەکەم.[٥٤٦]

**تەوەرەی سێیەم:**

**چەند ڕونکردنەوەیەکی گرنگ:**

**١-حوکمی ئەو کەسانەی کە بوهتانیان بۆ دایکی باوەڕداران عائیشە (خوالێی ڕازی بێت) و دایکانی تری باوەڕداران دروست کردووە.**

**٢- ئایا کردەوە چاکەکان بە ئەنجامدانی تاوانی گەورە دەفەوتێت؟**

**٣-بەرنامەی ئیسلام بۆ پاراستنی ئابڕو و شەرەف.**

## ١-حوکمی ئەو کەسانەی کە بوهتانیان بۆ دایکی باوەڕداران عائیشە (خوالێی ڕازی بێت) ودایکانی تری باوەڕداران دروست کردووە

زانا(ابن كثير) دەڵێت: زانایان یەك لایەنە کۆن لەسەر ئەوەی هەرکەس قسە بە عائیشە (خوای لێ ڕازی بێت) بڵێت، پاش ئەوەی پاکی و بێ تاوانی لە ئاسمانەوە دابەزی، و بوهتان و تۆمەتی بۆ دروست بکات بەوەی کە بوهتانچی و درۆزنان بۆیان دروست کرد، بێگومان کافرە و سەرپێچی قورئانی پیرۆزی کردووە.[٥٤٧]

زانا (السيوطي) دەڵێت: ﴿إِنَّ الَّذِينَ جَاءُوا بِالْإِفْكِ عُصْبَةٌ مِنْكُمْ﴾ ئەم ئایەتانە لە پاکی و بێ تاوانی عائیشەدا دابەزین، لەو تۆمەت و بوهتانە کە بۆی دروستکرا، زانایانی (فیقە) بۆچوونیان وابووە، ئەو کەسەی تۆمەتەکەی بۆ دروست کردووە کافر بووە، چونکە بێباوەڕ بووە بەرامبەر دەقێکی قورئانی.[٥٤٨]

[٥٤٦] - أخرجه الأمام أحمد في مسنده (١١٧/٦)وأخرجه الطبراني في(المعجم الكبير) /١٣/٢٣ وذكرابن حجرفي (الفتح الباري) ٣٢٦/٩ .

[٥٤٧]- تفسير القرآن العظيم لأبن كثير،٣\٢٧٦

[٥٤٨]- الإكليل في أستنباط التنزيل ص\١٦٠ بەدەستکاری یەوە.

پێشەوا (النووي) لە شەرحی (صحیح المسلم)دا، لە ژماردنی ئەو سوود و حیکمەتانەی کە پەیوەندیدار بوون بە ڕووداوی بوهتان و درۆکەوە، دەڵێت: (....چل ویەکهەم: پاکی و بێتاوانی عائیشە (خوالێی ڕازی بێت) لەو بوهتان و درۆیە، پاکییەکی بێ گومان و یەکلایی کراوەیە بەپێی دەقی قورئان، خۆ ئەگەر هەر کەسێك شك و گومانی تێیدا هەبێت، ئەوە بێگومان بێباوەڕ و هەڵگەڕاوەیە).[549]

ئەوەی بە دەست دێت لەم بۆچوونانەی پێشەوە: بێگومان هەرکەس تۆمەت بۆ عائیشە دروستبکات پاش دابەزینی پاکی و بێ تاوانی لە ئاسمانەوە، ئەوە کافر و هەڵگەڕاوەیە، بەڕێکەوتنی وتەی زانایان.و بۆ باقی دایکانی ئیمانداران دوو بۆچوون هەیە، ڕاست وپەسەندەکەیان ئەوەیە کەحاڵی دایکانی ئیماندارانیش هەروەك عائیشەیە (خوایان لێ ڕازی بێت).

زانای تەفسیر (الآلوسي) دەڵێت: (حوکمی تۆمەتبارکردنی دایکانی تری ئیمانداران هەموویان، هەروەك هەمان حوکمی تۆمەتبارکردنی عائیشەیە، هەروەها تۆمەتبارکردنی دایکان و هاوسەرانی پێغەمبەرانیش هەر بەهەمان شێوەیە، ئەوەی لای منە بێگومان حوکمی تۆمەتبارکردنی کچانی پێغەمبەر (ﷺ) هەر بەو جۆرەیە، بە تایبەتی فاتیمە بەشێکی پاك و پیرۆزی ئەوە..).[550]

(قاضي عیاض) دەڵێت: (هەرکەس قسە بە غەیری عائیشە بڵێت لە خێزانەکانی پێغەمبەر (ﷺ)، دوو بۆچوونی لەسەرە: یەکەمیان:دەکوژرێت، چونکە قسەی بە پێغەمبەر (ﷺ) ووتوە، بەهۆی ئەوەی کە هاوسەر و حەڵاڵی ئەوی تۆمەتبار کردووە، ئەوی تریان: بێگومان ئەوان وەك سەرجەم هاوەڵە ئافرەتەکان وان، و دەبێت بەپێی درۆ و بوهتانەکەیان داری سزای حەدیان لێ بدرێت – بەڵام یەکەمیان پەسەندترە.[551]

(ابن تیمیة) لە کتێبی (الصارم المسلول)دا، دەڵێت: بەڕاستی تۆمەتبارکردنی دایکی باوەڕداران عائیشە (خوالێی ڕازی بێت) بێباوەڕییە و هیچ گومانی تیا نییە، و لە تۆمەتبارکردنی باقی دایکانی ئیمانداراندا دوو بۆچوون هەیە، کە ڕاستەکەیان: بێگومان

---

[549]– صحیح مسلم بشرح النووي ١١٧\١٧–١١٨.

[550]– روح المعاني للآلوسي ١٢٨\١٨.

[551]– شرح الشفائي شمائل أصحاب الأصطفا للقاضي عیاض ٥٣٤\٥.

حوکمەکەی وەك حوکمی تۆمەتبارکردنی دایکی ئیمانداران عائیشەیە، ئەنجامدەرەکەی بێباوەڕ دەبێت.[٥٥٢]

## ٢- ئایا کردەوە چاکەکان بە ئەنجامدانی تاوانی گەورە دەفەوتێت؟

ڕێڕەوی (اهل السنة والجماعة) بۆچوونیان وایە بێگومان ئەنجامدەری تاوانی گەورە، بێباوەڕ نابێت، مەگەر کاتێك تاوانە حەرامەکە بە حەڵاڵ و دروست بزانێت، ئەگەر بە حەڵاڵ و دروستی زانی ئەوە بێباوەڕە، کردەوە چاکەکان بە ئەنجامدانی تاوانی گەورە نافەوتێن، مەگەر کاتێك حەڵاڵی بکات، ئەگەر بە حەڵاڵی زانی ئەوە کافر و هەڵگەڕاوە دەبێت لەدین.

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَمَن يَرْتَدِدْ مِنكُمْ عَن دِينِهِ فَيَمُتْ وَهُوَ كَافِرٌ فَأُولَٰئِكَ حَبِطَتْ أَعْمَالُهُمْ فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ وَأُولَٰئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ﴾(البقرە:٢١٧).

واتە: (هەر کەس لە ئێوە لە دینی خۆی هەڵگەڕێتەوە، جا بە کافری بمرێت، ئەوانە هەموو کار و کردەوەیان لە دنیا و قیامەتدا بە فیڕۆ و پوچەڵ دەڕوات، و ئەوانە هاوەڵی دۆزەخ دەبن و بەهەمیشەیی تیایدا دەمێنەوە).

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَلَقَدْ أُوحِيَ إِلَيْكَ وَإِلَى الَّذِينَ مِن قَبْلِكَ لَئِنْ أَشْرَكْتَ لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ وَلَتَكُونَنَّ مِنَ الْخَاسِرِينَ﴾(الزمر:٦٥).

واتە: (بەڕاستی بۆ تۆ (ئەی محمد (ﷺ) و پێغەمبەرانی پێش تۆیش وەحی کراوە، ئەگەر هاوبەش بۆ خوا بڕیار بدەیت، ئەوا کردەوەکانت دەفەوتێت و لە زەرەرمەندان دەبیت).

لەو بەڵگانەی ئەهلی (السنة) بە بەڵگە هێناویانەتەوە، کە کردەوە چاکەکان بە ئەنجامدانی تاوانی گەورە نافەوتێت، ئەم ئایەتە پیرۆزەیە: ﴿وَلَا يَأْتَلِ أُولُو الْفَضْلِ مِنكُمْ وَالسَّعَةِ أَن يُؤْتُوا أُولِي الْقُرْبَىٰ وَالْمَسَاكِينَ وَالْمُهَاجِرِينَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَلْيَعْفُوا وَلْيَصْفَحُوا أَلَا تُحِبُّونَ أَن يَغْفِرَ اللَّهُ لَكُمْ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ (النور:٢٢). (ماناکراوە). ئەم ئایەتە پیرۆزە پاش ڕووداوی درۆ و

---

[٥٥٢]- الصارم المسلول على شاتم الرسول ص/٢٦٢ _ ٢٦٧.

بوهتانەکە دابەزی، کە ئەویش بریتی بوو لە: (أبا بکر) بەڕاستی سوێندی خوارد کە خەرجی و بەخشینی (مسطح) نەکێشێت، پاش ئەوەی کە بە تۆمەت و وهتانەکەوە تێوە گلابوو، و (مسطح) نزیك بوو لە (أبا بکر)ەوە، لەو کۆچکردوانە بوو کە بەشداری جەنگی بەدری کردبوو، هەروەها لە دەستەی هەژارانیش بوو، خۆ ئەگەر بەهۆی ئەو تۆمەتەی کە بۆ عائیشە دروستکرا ئەویش بەشدار بوو تیایدا، کردەوە چاکەکانی بفەوتایە و بایەخیان نەمایە، ئەوا خوای گەورە باسی نەدەکرد کە لە کۆچکردوان بووە لە ڕێگەی خوادا، پاش ئەوەی کە کەوتبووە ناو تۆمەتەکەوە، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە پاداشتی کۆچکردنەکەی بە هۆی ئەو تاوانە گەورەیەوە نەفەوتاوە.

زانای تەفسیر پێشەوا (الرازی) دەڵێت: هاوەڵانمان بەم ئایەتە بەڵگەیان هێناوەتەوە کە کردەوە چاکەکان نافەوتێن و بێبایەخ نابن، وتویانە: بەڕاستی خوای گەورە (مسطح)ی بەیەکێك لە کۆچکردوان باس کردووە، پاش ئەوەی کە تاوانی گەورەشی ئەنجامداوە، ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی بێگومان پاداشتی کۆچکردنەکەی بەهۆی تاوانەکەوە نەفەوتاوە).[٥٥٣]

## ٣_ بەرنامەی ئیسلام بۆ پاراستنی ئابڕو و شەرەف

ئیسلام ئاینی پاکی و داوێن پاکی و دادپەروەری و خۆشەویستی و بەزەیی و ڕێزە، بەڕاستی ئەم ئاینە پاك و جوانە هات بە شەریعەتێکی پڕ حیکمەت و ئاداب و ڕەوشتی جوان و بەهێزەو، ئامانجی پارێزگاری بوو لەئابڕو شەرەف، و پاراستنی سنورە قەدەغە کراوەکان.

بەڕاستی ئیسلام زینا و داوێن پیسی و تاوانەکانی حەرام کردوە کە زەرەر و زیانی زۆر و مەترسیدار دەخەنەوە و داهاتو و پاشەڕۆژی ترسناك و بەئازاریان هەیە لەسەر تاکەکانی کۆمەڵگا، لەدنیا و قیامەتیشدا، لەوانە: شکداندنی ئابڕو ناموس و حەیاچوون و ناشیرین کردنی شتە جوانەکان و حەلاڵەکان و تێکەڵ و پێکەڵ بوونی نەوەو وەچە، و خستنەوەی منداڵی ناشەرعی، و بڵاوبوونەوەی ڕۆحی دوژمنایەتی و پەرەسەندنی تۆوی

---

[٥٥٣]– مفاتيح الغيب للرازي ١٩١/٢٣.

فیتنە و ئاشوب لەناو کۆمەڵگادا و شتانی تریش لە ناپەسەندی و بەڵاو دەرد کەلە داوێن پسی دەکەونەوە، لەبەرئەوانە ئیسلام حەرامی کردووە و سزای بۆ داناوە.[٥٥٤]
خوای گەورە هەموو ئەو ڕێگا و هۆکارانەیشی حەرام کردووە کە دەبنە هۆی ئەنجامدانی زینا.[٥٥٥]

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ وَلَا تَقْرَبُوا الزِّنَى إِنَّهُ كَانَ فَاحِشَةً وَسَاءَ سَبِيلًا﴾(الأسراء:٣٢). (ماناکراوە).

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَتَّبِعُوا خُطُوَاتِ الشَّيْطَانِ وَمَن يَتَّبِعْ خُطُوَاتِ الشَّيْطَانِ فَإِنَّهُ يَأْمُرُ بِالْفَحْشَاءِ وَالْمُنكَرِ وَلَوْلَا فَضْلُ اللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُ مَا زَكَا مِنكُم مِّنْ أَحَدٍ أَبَدًا وَلَكِنَّ اللَّهَ يُزَكِّي مَن يَشَاءُ وَاللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾. (النور:٢١) (ماناکراوە).

هەروەها ئیسلام تۆمەتبارکردنیشی حەرام و قەدەغەکردوە، لەبەر ئەوەی خراپەی لەسەر ئابرو و شەرەف لێدەکەوێتەوە وکەسانی بێتاوانی تیا تاوانبار دەکرێت و دەدرێنە بەر تانە و تەشەری بێ مانا.

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ وَالَّذِينَ يَرْمُونَ الْمُحْصَنَاتِ ثُمَّ لَمْ يَأْتُوا بِأَرْبَعَةِ شُهَدَاءَ فَاجْلِدُوهُمْ ثَمَانِينَ جَلْدَةً وَلَا تَقْبَلُوا لَهُمْ شَهَادَةً أَبَدًا وَأُولَٰئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ(٤) إِلَّا الَّذِينَ تَابُوا مِن بَعْدِ ذَٰلِكَ وَأَصْلَحُوا فَإِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ (النور:٤-٥).

واتە: (ئەو کەسانەی تۆمەتی زینا دەخەنە پاڵ ئافرەتانی داوێن پاك، پاشان چوار شایەت (بۆ ڕاستی قسەی خۆیان) ناهێنن، هەشتا دار لەو کەسانە بدەن، و ئیتر هەرگیز شایەتیان لێ وەرمەگرن و ئەوانە فاسیق و لە سنوور دەرچوون، مەگەر کەسانێك کە تەوبە بکەن وخۆیان چاك بکەن (کردەوە چاکەکان ئەنجام بدەن و نەگەڕێنەوە سەر خراپە)، جا بەڕاستی خوا لێخۆشبوو میهرەبانە). هەروەها خوای گەورە فەرمووی: ﴿إِنَّ الَّذِينَ يَرْمُونَ الْمُحْصَنَاتِ الْغَافِلَاتِ الْمُؤْمِنَاتِ لُعِنُوا فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ(٢٣) يَوْمَ تَشْهَدُ عَلَيْهِمْ

---

٥٥٤- خوای گەورە حوکمی داوە کە زیناکاری (هاوسەردار)چ پیاو چ ئافرەت دەبێت بەرد باران بکرێت تا دەمرێت، بەڵام زیناکاری بێ هاوسەر واتە: (کوڕ یان کچ) بە لێدانی سەد داری حەد.

٥٥٥- لەپێشتر باسکراوە.

أَلۡسِنَتُهُمۡ وَأَيۡدِيهِمۡ وَأَرۡجُلُهُم بِمَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ (٢٤) يَوۡمَئِذٖ يُوَفِّيهِمُ ٱللَّهُ دِينَهُمُ ٱلۡحَقَّ وَيَعۡلَمُونَ أَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلۡحَقُّ ٱلۡمُبِينُ﴾ (النور:٢٣ _ ٢٥). (پێشتر ماناکراون).

**مامۆستا (ابو الآعلى المودودي) لە کتێبی (الحجاب)دا، دەربارەی حیکمەتی حەرامکردنی تۆمەتبارکردن دەڵێت: (بەڕاستی تۆمەتبارکردنی ئافرەتی داوێن پاك، تەنها قسە و ناو و شۆرەتی خراپی لێناکەوێتەوە، بەڵکو دەبێتە هۆی بڵاوبوونەوەی فاحیشە و خراپە لەناو کۆمەڵگادا و پەیوەندییەکان خراپ دەکات و تێك دەدات و دوژمنایەتی لە نێوان خێزانەکاندا بڵاودەکاتەوە و گومان دەخاتە سەر نەوەکان و ڕەچەڵەکیان، و کەسێك دەبێتە هۆی پاڵنان بەدەیان کەسی ترەوە بۆ تووند و تیژی و ناڕەحەتی، بۆ ماوەی چەندین ساڵ، بەس تەنها بە هۆی ئەوەی کە تەنها ووشەیەك بە بوهتان لە دەمی دەرچووە).**

**شەرەف وئابڕو بەنرخترین شتە کە ئینسان خاوەنیەتی، کاتێك لە دەستی دا بە جۆرێك دەبێت کە گەڕانەوەی نییە. دەبێت لە پێناوی پارێزگاری کردنیدا ڕۆحی ماندو بکات و خوێنی بۆ بڕێژێت و زۆر بەخشندە و بەڕێز بێت بەرامبەر نەفسەکان، کاتێك موسوڵمان دەمرێت، ئەوا لە دەوری حەوزی کەوسەر کۆدەبێتەوە و پارێزگاری لە شەرەف و ناموسی خۆی کردووە، ئەوە پاداشتی وەکو شەهیدە، دەربارەی ئەمەیش پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (هەر کەس لە پێناو ماڵەکەیدا جەنگا و کوژرا ئەوە شەهیدە، هەر کەس لە پێناوی خوێنیدا جەنگا و کوژرا ئەوە شەهیدە، و هەرکەس لە پێناوی کەس وکارەکەیدا جەنگا و کوژرا ئەوە شەهیدە).[556]**

**بە دڵنیایی ئیسلام پارێزگاری لەشەرەف وئابڕو کردووە و هاوشانی کردووە بە حەرامکردنی خوێن ڕشتن، وەك لە وتاری حەجی ماڵئاواییدا هاتووە، کە پێغەمبەر (ﷺ) بۆ کۆمەڵێکی زۆری لە هاوەڵان خوێندەوە، کە تیایدا حەرامە وەك حەرامی ئەم ڕۆژەتان، لەم مانگە پیرۆزەتاندا، و لەم شارەتاندا، ئایا من گەیاندم. ..)[557]. هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) لە فەرموودەیەکی تردا فەرمووی: (...موسوڵمان برای موسوڵمانە.**

٥٥٦- رواه النسائي في السنن عن سعيد بن زيد، ك،تحريم الدم.

٥٥٧- رواه البخاري في صحيحه عن أبي بكرة، كتاب العلم.

..هەموو شتێکی موسوڵمان لەسەر موسوڵمان حەرامە، خوێنی و ماڵ و سامانی و شاراف و ئابڕوی).[٥٥٨]

لە ڕێنمایی یە جوانەکانی ئیسلام لە پاراستنی شەرەف و ئابڕودا، فەرمانی کردووە بە ووردبوونەوە و جوان گەڕان و لێکۆڵینەوە لە گوێزانەوە و دامەزراوکردنی هەواڵدا، هەروەها گاڵتە پێکردنی کەسانی تری حەرام و قەدەغە کردووە، هەروەها بەکەم زانینی ڕێزیان وگومانی خراپ و جاسوسی کردن و شوێنکەوتنی عەورەت و ئابڕوی خەڵکی و غەیبەت، هەروەها ئیسلام هانی موسوڵمانانی داوە کەئابڕو نهێنی یەکتری داپۆشن و پارێزگاری لەیەکتری بکەن.

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِن جَاءَكُمْ فَاسِقٌ بِنَبَإٍ فَتَبَيَّنُوا أَن تُصِيبُوا قَوْمًا بِجَهَالَةٍ فَتُصْبِحُوا عَلَىٰ مَا فَعَلْتُمْ نَادِمِينَ﴾ (الحجرات:٦).

واتە: (ئەی ئەو کەسانەی کە باوەڕتان هێناوە ئەگەر کەسێکی فاسیق و لە سنور دەرچوو و تاوانبار، هەواڵێکی بۆهێنان، لێی بکۆڵنەوە، نەبادا بەهۆی نەزانییەوە زیان بە خەڵکی بگەیەنن، پاشان لەو کارەی کردوتانە پەشیمان ببنەوە). دەبێت هەواڵەکە لێکۆڵینەوەی بۆ بکرێت و جوان وورد بکرێتەوە و بە متمانەوە وەرگیرێت و ڕوون و دامەزراو و جێگیر بێت و پشکنین و ووردەکاری بۆ بکرێت، ئینجا بگەیەنرێت.

لەئایەتێکدا کە دەربارەی ڕووداوی بوهتانەکە دابەزی، خوای گەورە فەرمووی: ﴿إِذْ تَلَقَّوْنَهُ بِأَلْسِنَتِكُمْ وَتَقُولُونَ بِأَفْوَاهِكُم مَّا لَيْسَ لَكُم بِهِ عِلْمٌ وَتَحْسَبُونَهُ هَيِّنًا وَهُوَ عِندَ اللَّهِ عَظِيمٌ﴾ (النور:١٥).

لە ئایەتێکی تردا _کە ئەمەماناکەیەتی_ دەفەرمووێت: (ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، هیچ کەس و هیچ هۆزێك گاڵتە بە کەس و هۆزێکی تر نەکات، چونکە ڕەنگە ئەوان چاکتربن لەوان، ژنانیش با گاڵتە بەیەك نەکەن و یەکتر زەلیل نەکەن. چونکە لەوانەیە ئەمان لەوان چاکتر بن، سوکایەتی بە خۆتان مەکەن (چونکە سوکایەتی بەیەکتر سوکایەتییە بە خۆتان) هەروەها ناو وناتۆرەی ناشرین بۆ یەکتر دامەتاشن، ئای کە چەندە ناشرینە ناو و ناتۆرەی خراپ لە دوای باوەڕهێنان و موسڵمان بوون، ئەوەیش

---

٥٥٨– رواه المسلم في صحيحه من حديث أبي هريرة كتاب البّر و الأدب.

تەوبەی نەکردبێت و پەشیمان نەبوبێتەوە لە گوناهەکانی، جا ئەو جۆرە کەسانە هەر ستەمکارن) (الحجرات:١١).

ئیسلام حەرامی کردووە گاڵتەکردن بەیەکتری و بەکەم زانینی یەکتر، چونکە ئەمە ناگونجێت لەگەڵ برایەتی ئیسلامیدا، هەروەك چۆن توانج و پلار و تانە و تەشەر و یەکتر عەیبدارکردنی حەرام کردووە.

هەروەها ئیسلام حەرامی کردووە ناو و ناتۆرەی ناشرین لە یەکتری بنرێت کە دەرونەکان ئازار دەدات، هەروەها گومانی خراپی بە موسڵمانان حەرامکردووە، هەروەها شوێنکەوتنی عەورەت و جاسوسی کردنیش.

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اجْتَنِبُوا كَثِيرًا مِّنَ الظَّنِّ إِنَّ بَعْضَ الظَّنِّ إِثْمٌ وَلَا تَجَسَّسُوا﴾(الحجرات:١٢).

واتە: (ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە، خۆتان زۆر بپارێزن لە گومانی خراپ لەڕاستیدا هەندێك لەو گومانانە گوناه و تاوانن، و بەشوێن کەم و کوڕی و عەیب و عاری یەکتریدا مەگەڕێن و سیخوڕی مەکەن).

هەروەها لە ئایەتی ڕووداوی (إفك) بوختانەکەدا خوای گەورە فەرمووی: ﴿لَّوْلَا إِذْ سَمِعْتُمُوهُ ظَنَّ الْمُؤْمِنُونَ وَالْمُؤْمِنَاتُ بِأَنفُسِهِمْ خَيْرًا وَقَالُوا هَٰذَا إِفْكٌ مُّبِينٌ(١٢) لَّوْلَا جَاءُوا عَلَيْهِ بِأَرْبَعَةِ شُهَدَاءَ فَإِذْ لَمْ يَأْتُوا بِالشُّهَدَاءِ فَأُولَٰئِكَ عِندَ اللَّهِ هُمُ الْكَاذِبُونَ﴾(النور:١٢-١٣). (ماناکراوە).

لەسەر موسڵمان پێویستە کە خۆی نەخاتە شوێنی گومانەوە و لەشوێنی تۆمەت و ئاشوبیشدا نەوەستێت کە جێگەی گومانە.

(زیدی کوڕی ثابت) فەرمویەتی:بێگومان من پێم ناخۆشە لە شوێنێکدا ببینرێم کە جێگەی گومانی خراپ بێت و خەڵکی گومانی خراپم پێ بەرێت. و(الربيع ی کوڕی انس) وتوویەتی: لە (الحكمة)دا نوسراوە: هەر کەس هاوەڵیی هاوڕێی خراپ بکات، سەلامەت نابێت، هەرکەس بچێتە شوێنی خراپەوە تۆمەتبار دەکرێت، وهەرکەس زمانی خۆی نەگرێت پەشیمان دەبێتەوە.

(صفية)ی هاوسەری پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: جارێکیان پێغەمبەر (ﷺ) لە دە ڕۆژی کۆتایی ڕەمەزان دا، لەناو مزگەوتدا دەمایەوە، وشەوێك چووم بۆ سەردانی و تاوێك لە خزمەتیدا مامەوە و قسە و گفتوگۆم لەگەڵدا کرد، هەڵسام بچمەوە بۆ ماڵەوە،

پێغەمبەریش (ﷺ) لەگەڵمدا هات، تا ڕەوانەم بکات،ماڵی (صفیة) لەو خانوەدا بوو کە دواتر بوو بەهی (ئوسامەی کوڕی زەید)، (صفیة) فەرموی: ڕۆیشتین تا گەیشتینە ئەودەرگایەی مزگەوت، کەوا لەلای دەرگای ماڵی (أم سلمة) دا، جا لەو کاتەدا دووپیاو- لە پشتیوانان(انصار)- لەوێوە تێپەڕ بوون، کاتێك کە پێغەمبەریان (ﷺ) دی لەگەڵ مندابوو، سڵاویان لێ کرد و پێیان هەڵگرت و ویستیان بە پەلە تێپەڕن، ئەویش پێی فەرموون: (پەلە مەکەن و مەپەشۆکێن ئەمە ((صفیة ی کچی حیی) یە کە هاوسەری خۆمە) ئەوانیش وتیان: پاك و بێگەردی بۆخوا! ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئێمە چۆن دڵ لە تۆ پیس دەکەین! و قسەکەی پێغەمبەری خوایان (ﷺ) بەلاوە گران بوو، کە بۆنی ئەوەی لێ دەهات، خوانەخواستە گومانی خراپ بە پێغەمبەر (ﷺ) بەرن، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (ئاخر شەیتان لەناو جستەی مرۆڤدا، وەکو خوێن هاتوچۆ دەکات، لەبەرئەوە ترسام کە شەیتان شتێك یان گومانێکی خراپ بخاتە ناو دڵتانەوە، و دڵتان لە من کرمێ ببێت و ئەوە ببێت بە هۆی سەرتیاچوونتان، خودا بە هۆی ئەو گومانە خراپەوە بە پێغەمبەرەکەی، ڕقتان لێ بگرێت).[559]

هەروەها ئیسلام غەیبەتیشی حەرام کردووە، چونکە ئابڕو و شکاندن و خراپکردنی کەسانی تری تیایە.

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَلَا يَغْتَب بَّعْضُكُم بَعْضًا أَيُحِبُّ أَحَدُكُمْ أَن يَأْكُلَ لَحْمَ أَخِيهِ مَيْتًا فَكَرِهْتُمُوهُ وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ تَوَّابٌ رَّحِيمٌ﴾(الحجرات:١٢).

واتە: (لە پاشملە باسی یەکتری و ناوی یەکتری بەخراپە مەبەن، ئایا کەستان خۆشی دێت لەوەی گۆشتی برای خۆی بە مردوویی بخوات؟! دیارە کاری واتان زۆر پێ سەخت و ناخۆشە، دەی کەواتە لەخوا بترسن و پارێزکار بن، چونکە بەڕاستی خوا گەڕانەوەی خەڵکی وەردەگرێت و میهرەبانە بۆیان).

لە (ابي هريرة)وە (خوالێی ڕازی بێت) بەڕاستی پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (ئایا دەزانن غەیبەت و لەپاشملە باس کردن چییە؟) ووتیان: خوا و پێغەمبەرەکەی دەزانن، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: بریتییە لە: (باسی براکەت بە شتێك بکەیت کە پێی ناخۆشە).

---

[559] -رواه البخاري في صحيحه كتاب الأعتكاف ومسلم كتاب السلام.

وترا: ئەگەر بینیت و زانیت ئەو شتە لە براکەمدا بوو کە دەیڵێم؟ فەرمووی: (ئەگەر ئەو شتەی تیا بوو کە دەیڵێیت، بێگومان غەیبەتت کردووە، خۆ ئەگەر تییدا نەبوو ئەو شتەی کە دەیڵێیت، بێگومان بوهتانت کردووە).[٥٦٠]

هەروەها ئیسلام بانگەشەی ئەوەی کردووە کە پارێزگاری لە شەرف و ئابڕوی خەڵکی بکرێت و غەیبەتیان نەکرێت و ڕەت بکرێتەوە.

لە (ابی الدرداء)ەوە، لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرمویەتی: (هەر کەس پارێزگاری لە شەرف و ئابڕوی برای موسڵمانی بکات و نەهێڵێت تووشی خراپە ببێت، لە ڕۆژی قیامەتدا خوای گەورە دەم و چاوی لە ئاگر دەپارێزێت).[٥٦١]

لە (ابي هريرة)وە (خوالێی ڕازی بێت) لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرمویەتی: (لە دنیادا بەندەیەك نییە کە ئابڕو و شەرەفی بەندەیەکی تر داپۆشێت، مەگەر خوای گەورە بە هۆیەوە عەیب و کەم و کوڕییەکانی ئەویش دادەپۆشێت).[٥٦٢]

هەموو موسڵمانێك پێویستە لەسەری کە زمان و گوێچکەی بپارێزێت و دەبێت بزانێت کە زمان و گوێچکە ئەمانەتی خوان، و بێگومان لە ڕۆژی قیامەتدا لەسەریان لێپرسینەوە دەکرێت.

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿وَلَا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ إِنَّ السَّمْعَ وَالْبَصَرَ وَالْفُؤَادَ كُلُّ أُولَٰئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْئُولًا﴾ (الأسرء:٣٦).

واتە: (ئەی (مرۆڤ) لە شتێك مەدوێ و شوێنی شتێك مەکەوە، کە زانست و زانیاریت دەربارەی نییە، چونکە بەڕاستی دەزگاکانی بیستن و بینین و تێگەیشتن هەر هەمووی بەرپرسیارە لە بەرامبەرییەوە).

هەروەها خوای گەورە لە سوورەتی (النور)دا، دەفەرموێت: ﴿يَوْمَ تَشْهَدُ عَلَيْهِمْ أَلْسِنَتُهُمْ وَأَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُمْ بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ (٢٤) يَوْمَئِذٍ يُوَفِّيهِمُ اللَّهُ دِينَهُمُ الْحَقَّ وَيَعْلَمُونَ أَنَّ اللَّهَ هُوَ الْحَقُّ الْمُبِينُ﴾(النور:٢٤-٢٥). (پێشتر ماناکراوە).

---

٥٦٠-رواه مسلم في صحيحه كتاب البرو والأدب، باب تحريم الغيبة.

٥٦١-رواه الترمزي في السنن.

٥٦٢-رواه مسلم في صحيحه كتاب البر والأدب.

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (لە جوانییەکانی ئیسلام ئەوەیە کە مرۆڤ دەست لە شتێك هەڵگرێت کە پەیوەندی بەوەوە نییە).[٥٦٣]

(أبي هريرة) (خوالێی ڕازی بێت) لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) دەفەرموێت: (وا ڕێك دەکەوێت کە بەندە قسەیەك دەکات لەو جۆرە قسانەی کە دەبن بە مایەی ڕەزامەندی خوا، هێندەیش دڵی ناداتێ، بە هۆی گوتنی ئەو قسەیەوە، خودا ئەو بەندەیە چەندین پلە بەرزدەکاتەوە، هەروەها ڕێکدەکەوێت کە بەندە قسەیەك دەکات، لەو جۆرە قسانەی کە دەبن بە هۆی تورەیی و خەشمی خودا، وناچێتە بنج و بنەوانی و بە باشی لێی ووردنابێتەوە، تا بزانێت قسەکەی کێ دەگرێتەوە، کەچی بە هۆی ئەو قسەیەوە، دەخرێتە ناو ئاگری دۆزەخەوە).[٥٦٤]

لە فەرمودەیەکی تردا (ﷺ) دەفەرموێت: (هەرکەس ئەوەی لە نێوان دوولێوی وئەوەی لە نێوان دووڕانیدایە بۆم زامن و پارێزراو بکات، منیش بەهەشتی بۆ زامن و مسۆگەر دەکەم).[٥٦٥]

ئیمامی شافیعی لە شیعرێکدا دەڵێت:

امْسِكْ لِسانَكَ أيُّها الإنسانُ ... لا يَلْدَغَنَّكَ إنه ثعبانُ

كَمْ في المقابر مِن قَتيلِ لِسانِه ... كانت تهاب لِقَاءَهُ الشجعانُ

إن شِئتَ أن تَحيا سليماً مِن الأذى ... وحظُكَ موفور وعرضُكَ صيِّنٌ

لِسانُكَ لا تذكر به عورة إمرِيءٍ ... فَكُلُّكَ عوراتٌ وللناسِ ألْسنٌ

وعينك إن أبدت اليكَ معايبَ ... فَصنها وقل ياعين للناسِ أعينُ

وعاشِر بِمعروف وسامح مَن اعتدى ... وفارق ولكن بالتي هي أحسن.[٥٦٦]

---

٥٦٣- رواه الترمزي في السنن عن أبي هريرة كتاب الزهد.

٥٦٤- رواه البخاري في صحيحه كتاب الرقاق.

٥٦٥- رواه البخاري في صحيحه كتاب الرقاق.

٥٦٦- ديوان الامام الشافعي ص:٨٥.

**باسی دووەم:**

**هاوسەرداری پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵ خاتوو (زەینەبی کچی جەحش) و حیکمەت لە ڕێگەدان بە فرە ژنی لە ئیسلامدا**

**ئەم باسەیش لەم بەشانە پێك دێت:**

**یەکەم: ئەو ئایەتانەی لەم بارەیەوە هاتوون.**

**دووەم: هۆکاری دابەزینی ئایەتەکان.**

**سێ یەم: تەفسیرێکی شیکاری بۆ ئایەتەکان.**

**چوارەم: حیکمەت لە ڕێگەدانی ئیسلام بە فرە ژنی.**

**پێنجەم: هەڵوێستی هەردوو ئایینی (یهودی و نصرانی) بەرامبەر بە فرە ژنی.**

**شەشەم: حیکمەت لە فرە ژنی پێغەمبەر(ﷺ).**

**پێشەکی:**

هاوسەرداری پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵ خاتوو زەینەبی کچی جەحش ڕوداوێکی گرنگ بوو لەو ڕووداوانەی کە قورئان دەربارەی دواوە بە تێڕوانین لەو پەند و وانانەی کە پەیوەندیدارن بە باسەکەوە.

لەم بەشەدا ئەو ئایەتە قورئانیایە دێنین کە لەم باسەدا دابەزیون و شییان دەکەینەوە، پاشان لە حیکمەتی فرەژنی لە ئیسلامدا دەدوێین و هەڵوێستی هەردوو ئایینی (یهودی) و (نصرانی) دەربارەی فرە ژنی ڕوون دەکەینەوە. و باسی حیکمەتی هاوسەرداری پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵ دایکانی ئیمانداران دەکەین.

## یەکەم: ئەو ئایەتانەی لەم باسەدا هاتوون:

﴿وَإِذْ تَقُولُ لِلَّذِي أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيْهِ وَأَنْعَمْتَ عَلَيْهِ أَمْسِكْ عَلَيْكَ زَوْجَكَ وَاتَّقِ اللَّهَ وَتُخْفِي فِي نَفْسِكَ مَا اللَّهُ مُبْدِيهِ وَتَخْشَى النَّاسَ وَاللَّهُ أَحَقُّ أَنْ تَخْشَاهُ فَلَمَّا قَضَى زَيْدٌ مِنْهَا وَطَرًا زَوَّجْنَاكَهَا لِكَيْ لَا يَكُونَ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ حَرَجٌ فِي أَزْوَاجِ أَدْعِيَائِهِمْ إِذَا قَضَوْا مِنْهُنَّ وَطَرًا وَكَانَ أَمْرُ اللَّهِ مَفْعُولًا (٣٧) مَا كَانَ عَلَى النَّبِيِّ مِنْ حَرَجٍ فِيمَا فَرَضَ اللَّهُ لَهُ سُنَّةَ اللَّهِ فِي الَّذِينَ خَلَوْا مِنْ قَبْلُ وَكَانَ أَمْرُ اللَّهِ قَدَرًا مَقْدُورًا (٣٨) الَّذِينَ يُبَلِّغُونَ رِسَالَاتِ اللَّهِ وَيَخْشَوْنَهُ وَلَا يَخْشَوْنَ أَحَدًا إِلَّا اللَّهَ وَكَفَى بِاللَّهِ حَسِيبًا (٣٩) مَا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَا أَحَدٍ مِنْ رِجَالِكُمْ وَلَكِنْ رَسُولَ اللَّهِ وَخَاتَمَ النَّبِيِّينَ وَكَانَ اللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمًا﴾ (الاحزاب:٣٧_٤٠).

## دووەم: هۆکاری دابەزینی ئایەتەکان:

زینەبی کچی جحش (خوا لێی ڕازی بێت): زەینەبی کچی جەحشی کوڕی (رئاب)ی کوڕی (یعمر) ی (الآسري)، (الهاشمي)، (القریشي)یە، دایکیشي ناوي (أمنة) ی کچی (عبدالمطلب) بووە، کە پووری پێغەمبەر (ﷺ) بووە، زەینەب موسوڵمان بوو، لەگەڵ براکەیدا (عبدالله ی کوڕی جحش) کۆچی کرد بۆ مەدینە.[٥٦٧]

(زەید)یش: زەیدی کوڕی حارثة ی کوڕی (شراحیل)ی کوڕی (کعب)ی (الکلبی) (القضاعي) (القحطاني) بوو، دایکی کە ناوی (سعدی) کچی (ثعلبة) بوو لەگەڵ خۆی بردی تا سەردانی کەس و کارەکەی بکات کە بریتی بوو لە (بنی معن)ی کوڕی (طيء)، ئەسپێك بردی، کە هی (بنی القین)ی کوڕی (جسر) بوو، گرتیانەوە و لێیان سەندەوە و بردیان فرۆشتیان بە یەکێك لە بازاڕەکانی عەرەب، ئینجا (حکیم) ی کوڕی (حزام)ی کوڕی (خویلد الآسدي) کڕی و بەدیاری دای بە پوری خۆی کە (خدیجەی کچی خویلد) بوو، وتراوە: کە (حکیم) بۆ پوری کڕی لە بازاڕی (عکاظ) بە چوارسەد درهەم، کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) خەدیجەی بە هاوسەری خۆی هێنا، خەدیجە (زید)ی بە دیاری دا بە

---

٥٦٧-الأصابة في معرفة الصحابة لأبن حجر ٤: ٣٠٧.

پێغەمبەر (ﷺ) و باوکی (زید)یش _حارثة کوڕی شراحیل _ بوو، ئارامی نەما و زۆر بەزەیی بە کوڕەکەیدا هاتەوە، و زۆر ئازاری کێشا پێوەی کە لێی جیا و دوور بوو، و زۆر هەوڵی دا بە گەڕان بەدوایدا، هەتا شوێنەکەی زانییەوە لە مەککە، لەگەڵ (کعب) ی برایدا چوون بۆئەوێ، و ماڵ و سامانێکی زۆریشیان پێ بوو، تا زەیدی پێ ئازاد بکەن، ئینجا هەردوکیان گەیشتنە لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە لەلای (بیت العتیق)دا بوو، پێیان وت: ئەی کوڕی گەورەی قەوم: ئێوە دراسێ و نزیکی ماڵ خوان، کەسانی لێقەوماو ئازاد دەکەن، و نان و خۆراك دەدەن بەدیل و ئەسیر، من بەڕاستی هاتووم بۆ لای تۆ بۆ زەیدی کوڕم، چاکەمان لەگەڵ بکە و بۆمان ئازادبکە، بێگومان لە داهاتوودا ئێمەیش دەیگێڕینەوە بۆت، ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئەی ئەگەر هی ئێوە نەبوو و هی یەکێکی تربوو؟ ئینجا وتیان: ئەوە کێیە؟ فەرمووی: ئادەی بانگی زەید بکەن و هەواڵی بدەنێ، ئەگەر ئێوەی هەڵبژارد ئەوە هی خۆتانە و بۆ خۆتان، بەبێ ئازادکردن و فیدیەدان، خۆ ئەگەر منیشی هەڵبژارد، ئەوا سوێند بە خوا من ئەو کەسەنیم فیدیە وەرگرتن هەڵبژێرم بەسەر کەسێکدا کە منی هەڵبژاردووە، ئینجا (زید) هات پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێی فەرموو: ئەم کەسانە دەناسیت؟ ووتی– بەڵێ: ئەمە باوکمە و ئەوەیش ماممە. ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: بێگومان من ئەمەم زانیبوو، وام بینی کە هاوەڵ و نزیکی تۆبم، یان ئەوەتا من هەڵبژێرە، یان ئەوان؟ ئینجا (زید) ووتی: من بۆم نییە کەسێك بەسەر تۆدا هەڵبژێرم، تۆ لە منیت لە جێگەی باوکم و مامی، ئینجا باوکی و مامی وتیان: لەناو چوون بۆ تۆ ئەی(زید) ئایا تۆ بەندایەتی بەسەر ئازادی و دایك و باوك و کەس و کارەکەتدا هەڵدەبژێریت؟ وتی: بەڕاستی ئەوەی من لەم پیاوەم بینیوە، تازە من ئەو کەسە نیم، کە کەسێکی تری بەسەردا هەڵبژێرم، کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) ئەمەی بینی دەستی گرت و بردی بۆ (حجر) و فەرمووی: ئێوە شایەت بن، بێگومان (زید) کوڕی منە، وەرەسە و میرات لە من دەبات و منیش وەرەسە و میراتی لێ دەبەم. ئەمە پێش بوون بە پێغەمبەر بووە.[٥٦٨]

ئیسلام بە بنەمای یەکسان کردنی خەڵك هات، و پێغەمبەری خوایش (ﷺ) ویستی ئەم بنەمایە بە شێوەیەکی کرداری بچەسپێنێت، هەتا ئەوە تەواو و چەسپاو بکات لە ژینگەیەکدا کەش و هەوای نەفامی حوکمی تیا دەکرد و دەمارگیری و هۆزایەتی دەستی هەبوو، بێگومان پێغەمبەر(ﷺ) نموونەیەکی کرداری هەڵبژارد لە کاری بەهاوسەرکردنی

---

٥٦٨– أسد الغابة ٢: ٢٢٤ والأصابة في معرفة الصحابة لأبن حجر ١: ٥٤٥.

زینەبی کچی جحش بە خێزانی (زید) _ کە زەید بەنە بوو، و ئازادی کرد _ و زینەبیش خاوەن ناو و ناوباگ و کەسایەتی و حەسەب و نەسەب و ڕەوشتی بەرز و پاکی بوو، کە ئەویش هەڵی بژارد بۆ هاوسەری لەگەڵ بەڕێزترین پیاو.

ئینجا پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕۆیشت، تا زەینەب خوازبێنی بکات بۆ (زید) بەڵام زەینەب حەزی لەم هاوسەردارییە نەکرد، و شێوەی ئەو پیاوەی لە (زید)دا نەبینییەوە کە بۆ هاوسەری خۆزگەی پێ دەخواست و حەزی تیای بوو، لەبەر ئەوە ڕەتی کردەوە، وتی من نابمە هاوسەری تۆ هەرگیز، من لە خانم و گەورەکانی نەوەی (عبد شمس)م.[٥٦٩] لەو بارەیەوە ئەم ئایەتە پیرۆزە دابەزی: ﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَمْرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ الْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ وَمَن يَعْصِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَالًا مُّبِينًا﴾ (الأحزاب:٣٦).

واتە: (بۆ هیچ پیاو ئافرەتێکی ئیماندار دروست نییە کاتێك خوا و پێغەمبەرەکەی (ﷺ) بڕیاری شتێك بدەن، ئەوان سەرپشك بن لە ئەنجامدانی ئەو کارەدا، چونکە ئەوەی سەرپێچی بکات لە فەرمانی خوا و پێغەمبەرکەی (ﷺ) ئەوە بەڕاستی بە ئاشکرا، گومڕا و سەرلێشێواوە). پاش دابەزینی ئایەتە پیرۆزەکە زەینەب ڕازی بوو ببێتە هاوسەری (زید) لەبەر گوێڕایەڵی و وەڵامدانەوەی بۆ ئەو ئاراستە خوایی یە، بەڵام ژیانی خێزانییەکە ئارام و لەسەر خۆ نەبوو، بەڵکو پڕ بوو لە ئاڵۆزی و گرفت و ناڕەحەتی، هەتا شکات و سکاڵای (زید) لەسەر (زینب) لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) زۆر بوون. کە ئەم ژیانە خۆش و گونجاو و لەبار نەبوو بۆی، (زینب) یش هیچ مەیل و ئارەزوویەك لەدڵیدا نەبوو بۆ (زید)، کاتێك ئایەتی قورئان دەربارەی حەرامکردنی (تبني) بە کوڕکردن دابەزی، کە عادەت و باوێك بوو لەناو کۆمەڵگادا بڵاو بوو، و ڕەگی داکوتا بوو لەسەردەمی کۆمەڵگای نەفامیدا، خوای گەورە لە سوورەتی (الاحزاب)دا فەرمووی: ﴿مَّا جَعَلَ اللَّهُ لِرَجُلٍ مِّن قَلْبَيْنِ فِي جَوْفِهِ وَمَا جَعَلَ أَزْوَاجَكُمُ اللَّائِي تُظَاهِرُونَ مِنْهُنَّ أُمَّهَاتِكُمْ وَمَا جَعَلَ أَدْعِيَاءَكُمْ أَبْنَاءَكُمْ ذَٰلِكُمْ قَوْلُكُم بِأَفْوَاهِكُمْ وَاللَّهُ يَقُولُ الْحَقَّ وَهُوَ يَهْدِي السَّبِيلَ (٤) ادْعُوهُمْ لِآبَائِهِمْ هُوَ أَقْسَطُ عِندَ اللَّهِ فَإِن لَّمْ تَعْلَمُوا آبَاءَهُمْ فَإِخْوَانُكُمْ فِي الدِّينِ وَمَوَالِيكُمْ وَلَيْسَ

---

٥٦٩ – طبقات إبن سعد ٨: ١٠١.

عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ فِيمَا أَخْطَأْتُم بِهِ وَلَٰكِن مَّا تَعَمَّدَتْ قُلُوبُكُمْ وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا﴾(الاحزاب:٤ _ ٥).

واتە: (خوا دوو دڵی دروست نەکردووە لە دەرونی هیچ کەسێکدا (دو بیروباوەڕ جێی نابێتەوە) ئەو هاوسەرانەتان کە پێیان دەڵێن: ئێوە لە جێی دایکمانن، خوا نەیکردون بە دایکتان، ئەوانەیش بە قسەی خۆتان دەیکەن بەکوڕی خۆتان، خوا نەیکردون بە کوڕتان، ئەوانە قسەیەکن کە بەزارتان دەیڵێن خوایش حەق بێژە و، هەر ئەو ڕێبازی ڕاست و دروست نیشانی بەندەکانی دەدات، ئەو کوڕانە بەناوی باوکی خۆیانەوە ناو بەرن و بانگیان بکەن، ئەوە پەسەندە لای خوا، ئەگەر باوکیتان نەدەناسی، خۆ برای دینیتانن، سەر بە ئێوەن و لە ئێوەن، (ئەگەر دوور لە سوکایەتی) هەڵەیکتان کرد ئەوە قەیناکات، بەلأم ئەگەر لە دڵتاندا، نییەتێکی ناپاك هەبێت بۆ سوکایەتی پێکردنیان، ئەوە لێپرسینەوەی دەبێت، هەمیشە و بەردەوامیش خوا لێخۆشبوو و میهرەبانە (لە هەڵەکانتان دەبوورێت ئەگەر لیی پەشیمان ببنەوە). کاتێك حەرامکردنی عادەتی بەکوڕکردن دابەزی، پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەمەی بۆ (زید) ڕوون کردەوە، کە بە (زید) دەوترا: (زیدی کوڕی محمد)، پێغەمبەری خوا (ﷺ)ئەم بەکوڕکردنەی بەتاڵ و پووچ کردەوە، و وای کرد کە بە (زیدی کوڕی حارثة)بانگ دەکرا، کە پێشتر کردبووی بە کوڕی خۆی، ویست و ئیرادەی خوای گەورە وابوو کە (زید)، زەینەب تەلأق بدات، پاشان پێغەمبەر (ﷺ) لە خۆی مارە دەکات، تا ئەو عادەتە بەتاڵ بکاتەوە کە خەڵکی لەسەری ڕاهاتبوون کە خێزانی بەکوڕ کراوەکە حەرام دەبێت لەسەر ئەو کەسەی کردویەتی بەکوڕی خۆی، و خوای گەورە پێغەمبەرەکەی (ﷺ) لەوە تێگەیاند، بەلأم ئەوەی لەسەر قورس و نارەحەت بوو، و دەترسا کە قسەی خراپی دەربارە بکرێت، بەڕاستی محمد (ﷺ) ئافرەتێکی تەلأق دراوی کردە هاوسەری خۆی کە خێزانی ئەو کەسە بوو کە کردبووی بەکوڕی خۆی، ترسا لەوەی کە بەهۆی ئەم ڕووداوەوە بکەوێتە بەر قسەی خەڵکی لە کاتێکدا کە سکالأ و شکاتی زەید لەسەر زەینەب لای پێغەمبەر (ﷺ) زۆر بوو بوو، هەموو جارێك کە زەید داوای مۆڵەتی لە پێغەمبەر(ﷺ) دەکرد دەربارەی تەلأقدانی زەینەب، پێغەمبەریش (ﷺ) پێی دەفەرموو: (بڕۆ خێزانی خۆت بگرە و با هاوسەرت بێت و لەخوا بترسە) ئینجا زەید فەرمانبەرداری و گوێڕایەڵی ئاراستە و ڕێنماییەکانی پێغەمبەر (ﷺ) دەبوو، و دەڕۆیشتەوە بۆ ماڵەکەی و تەنها ئەوەی لە خێزانەکەیدا دەبینی کە بەربەستی دروست دەرکد و پشتی لێی هەڵدەکرد، هەتا سنگ و

دەروونی زەید تەنگ و نارەحەت بوو ئارامی لەبەر بڕا و خۆی لەسەر ئەوە یەکلایی کردەوە کە تەلاقی بدات، پاش ئەوەی کە دڵنیا بوو بێگومان ژیانی لەگەڵ ئەودا ساف و ڕێك و پێك و پوخت نابێت و حاڵی جێگیر و ئارام و دامەزراو نابێت، ئینجا چوویەوە بۆ لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) و تا داوای مۆڵەتی لێ بکات تەلاقی بدات، ئینجا مۆڵەتی پێدا. کاتێك عیدەی زەینەب تەواو بوو، ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) زەیدی نارد تا خوازبێنی زەینەب بکات بۆ خۆی، ئینجا بوویە هاوسەری پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەبەر حیکمەتی جوان و ڕوون و مەبەستێکی گەورە کە بریتی بوو لە بەتاڵ کردنەوەی ئەو عادەت و دەستورەی خەڵکی لەسەر ڕاهاتبوون، لەوەی کە لایان حەرام بوو ژنی بە کوڕ کردوەکەیان لە خۆیان مارە بکەن.

## لێرەدا ئەو فەرموودە ڕاستانە دێنین کە لەم باسەدا هاتوون:

ئیمامی بوخاری لە (صحیح)ەکەیدا بە سەنەدێك لە (انس ی کوڕی مالك)ەوە گێڕاویەتییەوە، کە ئەم ئایەتە: ﴿وَتُخْفِي فِي نَفْسِكَ مَا اللَّهُ مُبْدِيهِ﴾(الاحزاب:٣٧). دەربارەی (زینب کچی جحش) و (زیدی کوڕی حارثة) دابەزیووە [٥٧٠].

هەروەها ئیمامی (بوخاری) لە (صحیح)ەکەیدا، لە (انس)ەوە گێڕاویەتی یەوە، فەرمووی: زەیدی کوڕی حارثة سکالاو گلەیی کرد، پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێی فەرموو: (لە خوا بترسەو خێزانی خۆت بگرە و بیبەرەوە)، ئەنەس وتی:ئەگەر پێغەمبەری خوا (ﷺ) شتێکی بشاردایەتەوە، ئەمەی دەشاردەوە. وتی:زەینەب فەخر و شانازی دەکرد بەسەر خێزانەکانی تری پێغەمبەردا (ﷺ)، دەیوت: ئێوە کەس و کارتان داویانن بەشوو، بەڵام من خوای گەورە لە سەر و حەوت ئاسمانەوە فەرمانی بەهاوسەرکردنم نارد). [٥٧١]

ئیمامی (مسلم) لە (صحیح)ەکەیدا، بە سەنەدێك لە (انس ی کوڕی مالك)ەوە گێڕاویەتی یەوە، کە فەرموویەتی: کاتێك ماوەی عیدەی زەینەب تەواو بوو، پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە زەیدی فەرموو: (بچۆ زەینەب خوازبێنی بکە بۆ من)وتی:زەید دەرچوو ڕۆیشت، هەتا گەیشتە لای زەینەب، ئەویش هەویرەکەی دادەپۆشی، زەید وتی: کاتێك بینیم بە گەورە

---

٥٧٠-رواه البخاري في صحيحه كتاب التفسير

٥٧١-رواه البخاري في صحيحه، كتاب التوحيد.

لە دڵمدا دەرکەوت هەتا وام لێهات نەمتوانی سەیری بکەم، بەڕاستی پێغەمبەر (ﷺ) باسی کردوو منیش پشتم تێ کرد و گەڕامەوە، بێگومان ترسا لێی و سڵەمیەوە، و جارێکی تر گەڕایەوە بۆلای لە بەرخاتری داواکەی پێغەمبەر تا خوازبێنی بکات بۆ پێغەمبەر (ﷺ) دەڵێت: وتم: ئەی زەینەب، پێغەمبەر (ﷺ) منی ناردووە کە تۆی بۆ خوازبێنی بکەم ببیتە هاوسەری، ئەویش وتی: من هیچ کارو داواو هەڵبژاردنێکم نییە هەتا پەروەردگارم فەرمان نەدات، ئینجا هەستا و چوویە شوێنی نوێژکردنەکەی خۆی لە ماڵەکەیدا، و قورئان بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) دابەزی.[٥٧٢]

ئینجا پێغەمبەر هات و یەکسەر چوویە لای بەبێ مۆڵەت وەرگرتن. (أنس) وتی: بەڕاستی بینیمان کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) خواردنی نان و گۆشتی بۆ ئامادەکردین کاتێك ئەو ڕۆژە درێژ بوویەوە، ئینجا خەڵك چوونە دەرەوە و چەند پیاوێك مانەوە لە ماڵەکەدا قسە و گفتوگۆیان دەکرد دوای خواردنەکە پێغەمبەر (ﷺ) چووە دەرەوە و زەینەبیش شوێنی کەوت و پێغەمبەر (ﷺ) ماڵی خێزانەکانی تری بەسەردەرکردەوە و سڵاوی لێ دەکردن ئەوانیش دەیان ووت: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) چۆن خێزان و کەس و کارەکەت دەبینیت؟ئەنەس وتی: نازانم من هەواڵم پێدا کە خەڵکەکە چوونەتە دەرەوە یان ئەو بوو هەواڵی پێ دام، ئینجا ڕۆسیشت دەرچوو هەتا گەیشتە ماڵەوە، منیش چووم لەگەڵی بچمە ژوورەوە، ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) پەردەیەکی لە نێوان من و خۆیدا دانا، ئینجا ئایەتی فەرزبوونی -حیجاب- دابەزی، وتی: ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) ئامۆژگاری قەومەکەی کرد بەو شێوەی کە کردی، (ابن رافع) لەفەرمودەکەیدا، ئەمەی زیادکرد-ئەم ئایەتەدابەزی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَدْخُلُوا بُيُوتَ النَّبِيِّ إِلَّا أَن يُؤْذَنَ لَكُمْ إِلَىٰ طَعَامٍ غَيْرَ نَاظِرِينَ إِنَاهُ

---

٥٧٢-واتە:ئەم ئایەتە پیرۆزە دابەزی (وَإِذْ تَقُولُ لِلَّذِي أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيْهِ وَأَنْعَمْتَ عَلَيْهِ أَمْسِكْ عَلَيْكَ زَوْجَكَ وَاتَّقِ اللَّهَ وَتُخْفِي فِي نَفْسِكَ مَا اللَّهُ مُبْدِيهِ وَتَخْشَى النَّاسَ وَاللَّهُ أَحَقُّ أَن تَخْشَاهُ فَلَمَّا قَضَىٰ زَيْدٌ مِّنْهَا وَطَرًا زَوَّجْنَاكَهَا لِكَيْ لَا يَكُونَ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ حَرَجٌ فِي أَزْوَاجِ أَدْعِيَائِهِمْ إِذَا قَضَوْا مِنْهُنَّ وَطَرًا وَكَانَ أَمْرُ اللَّهِ مَفْعُولًا (٣٧) مَّا كَانَ عَلَى النَّبِيِّ مِنْ حَرَجٍ فِيمَا فَرَضَ اللَّهُ لَهُ سُنَّةَ اللَّهِ فِي الَّذِينَ خَلَوْا مِن قَبْلُ وَكَانَ أَمْرُ اللَّهِ قَدَرًا مَّقْدُورًا (٣٨) الَّذِينَ يُبَلِّغُونَ رِسَالَاتِ اللَّهِ وَيَخْشَوْنَهُ وَلَا يَخْشَوْنَ أَحَدًا إِلَّا اللَّهَ وَكَفَىٰ بِاللَّهِ حَسِيبًا (٣٩) مَّا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَا أَحَدٍ مِّن رِّجَالِكُمْ وَلَٰكِن رَّسُولَ اللَّهِ وَخَاتَمَ النَّبِيِّينَ وَكَانَ اللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمًا) ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) بەبێ مۆڵەت خواستن چوویە لای، چونکە بوویە هاوسەری بەفەرمانی خوای گەورە (فَلَمَّا قَضَىٰ زَيْدٌ مِّنْهَا وَطَرًا زَوَّجْنَاكَهَا لِكَيْ لَا يَكُونَ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ حَرَجٌ فِي أَزْوَاجِ أَدْعِيَائِهِمْ إِذَا قَضَوْا مِنْهُنَّ وَطَرًا وَكَانَ أَمْرُ اللَّهِ مَفْعُولًا).

وَلَـٰكِنْ إِذَا دُعِيتُمْ فَادْخُلُوا فَإِذَا طَعِمْتُمْ فَانتَشِرُوا وَلَا مُسْتَأْنِسِينَ لِحَدِيثٍ إِنَّ ذَٰلِكُمْ كَانَ يُؤْذِي النَّبِيَّ فَيَسْتَحْيِي مِنكُمْ وَاللَّهُ لَا يَسْتَحْيِي مِنَ الْحَقِّ﴾ (الأحزاب:٥٣).[٥٧٣]

**تێبینی: ئەمە کۆمەڵێك فەرمودەی ڕاست بوون دەربارەی هاوسەرگیری پێغەمبەر (ﷺ) و زەینەبی کچی جەحش هاتوون، بێگومان لە هەندێك لە کتێبەکانی تەفسیر و فەرمودە و سیرەدا گێڕانەوەی (ضعیف) لاواز و پووچەڵ لەم بارەیەوە هێنراون ئەو گێڕانەوانەیش درۆ و بوهتانی هەڵبەستراوی تیایە لەسەر پێغەمبەری خوا (ﷺ)، پێویست ناکات بیانهێنین تا خوێنەر پرسیار و دوودڵی بۆدروست نەبێت..**

## سێیەم: تەفسیرێکی شیکاری بۆ ئایەتەکان

**پاش ئەوەی گێڕانەوە ڕاست و دروستەکانمان هێنا کە دەربارەی هاوسەرگیری پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵ (زینب)ی کچی (جحش)دا هاتبوون، پاش ئەوەی کە (زید) تەڵاقی دابوو، ئینجا دێینە سەر تەفسیر وشیکردنەوەی ئایەتە پیرۆزەکان کە لەو بارەیەوە هاتبوون.**

**خوای گەورە فەرمویەتی:** ﴿وَإِذْ تَقُولُ لِلَّذِي أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيْهِ﴾(الأحزاب:٣٧).

**واتە: (ئەی محمد (ﷺ) باسی کاتێك بکە کە تۆ دەڵێیت بە کەسێك کە خوا بەهرەی ڕشتووە بەسەریدا بەوەی کە خستیە سەر ڕێگای ڕاست و کردی بە موسڵمان، کە باشترین نازو نیعمەت بوو بۆ ئەو** ﴿وَأَنْعَمْتَ عَلَيْهِ﴾ **تۆیش چاکە و بەهرەت ڕشت بەسەریدا کە ئازاد کردن و پەروەردە و پێگەیاندن و چاودێری بە خێوکردن بە سۆز و بەزەیی و خۆشەویستی یەوە بوو، ئەو کەسەیش کە کەوتە ناو هەموونەم نازو نیعمەتەوە ئەوە (زیدی کوڕی حارثة) بوو** ﴿أَمْسِكْ عَلَيْكَ زَوْجَكَ﴾. **ژنەکەت لای خۆت بهێڵەرەوە و دەست بەرداری مەبە لەگەڵیدا.**﴿وَاتَّقِ اللَّهَ﴾ **لە خوا بترسەو لە مامەڵەکردن لەگەڵیدا و ستەمی لێ مەکە، وخۆ ئەگەر تۆیش ڕازی نیت پێی، ئەوە دادپەروەری پێویستە بکرێت لە ڕەزامەندی و لە تووڕەبوونیشدا.** ﴿وَتُخْفِي فِي نَفْسِكَ مَا اللَّهُ مُبْدِيهِ﴾ **لە دەرونی خۆتدا شتێك دەشاریتەوە کە خوا دەرخەرێتی و ئاشکرای دەکات، کە ئەویش تەڵاقدانی زەینەبە**

---

٥٧٣-صحیح مسلم النووی کتاب النکاح، بەدەستکاری یەوە.

لەلایەن زەیدەوە و پاشان خۆت دەیهێنیت بە هاوسەر بۆ خۆت، بۆ ئەوەی ڕەگ وڕیشەی (تبني) بەکوڕکردن لەبن دەرکێشیت، ئەوە ئەو شتە بوو کە خوای گەورە لەم ئایەتەدا دەری خست و ئاشکرای کرد، ئەمە وەڵامێکی حەق و یەکلایی کەرەوە بوو بۆ هەموو ئەو قسە و باسانەی بە ناڕاست لەم باسەدا وتراون. کە هەندێك لە خەڵکی بۆ چوونیان وابووە کە پێغەمبەر (ﷺ) خۆشەویستی زەینەبی لە دەرونیدا شاردبوویەوە و ئاوات و خۆزگەی ئەوە بووە کە زەید تەڵاقی بدات و خۆی مارەی بکات، و چونکە ئەوەی کە خوای گەورە بۆ ئەوی ئاشکرا کردووە بریتی بووە لە بەهاوسەرکردنی زەینەب بۆ خۆی، هەرچەندە خۆی ئەو حەزی هاوسەرگیری یەی لەدەرونیدا شاردبوویەوە، بەڵام خوای گەورە بۆی ئاشکرا کرد. ﴿وَتَخْشَى النَّاسَ وَاللَّهُ أَحَقُّ أَن تَخْشَاهُ﴾. تۆ ئەترسیت لە تانە و لۆمەی خەڵك، و ئەو ترسەیش لە تۆوە بەزەیی یە بۆ ئەوان، لەبەر ئەوە لە خەڵکی ئەترسیت کە تاقەتیان نەبێت گوێ لەم باس و حاڵەتە بگرن و نەتوانن بەرگەی بگرن، خۆ ڕەنگە مەترسیدار بێت بۆ حاڵیان ئەوەی توانا و تاقەتی ئەوان ڕەت بکاتەوە. [٥٧٤] خوای گەورە پێغەمبەرەکەی (ﷺ) ئاگادار کرد کە زەید دواتر زەینەب تەڵاق ئەدات، و پاشتر خۆی مارەی دەکات و دەبێتە هاوسەری، ئەوەیش لەبەر حیکمەتێکی ڕوون و جوان، کە بریتی بوو لە بەتاڵکردنەوەی ئەو عادەتەی خەڵکی لەسەری ڕاهاتبوون، کە حەرام بوو هاوسەری بە (کوڕکراو) بخوازنەوە. ﴿وَاللَّهُ أَحَقُّ أَن تَخْشَاهُ﴾ لە کاتێکدا خوا لەپێشتر و شایەنترە کە لێی بترسیت.

خاوەنی (التحرير و التنوير) دەڵێت: (ئەو ترسە لێرەدا بریتی بووە لەوەی کە پێغەمبەر (ﷺ) لەوە ترساوە و پێی ناخۆش بووە کە خەڵکی خراپ تۆمەت و گومانی بۆ دروست بکەن و بڵاوی بکەنەوە، لە کاری دووڕووەکان ترساوە، نەك ئەو ترسە ئاساییەی کە خەڵکی تووشی دێت، لە کاتێکدا کە پێغەمبەر (ﷺ) لە کەس نەترساوە کە هاوسەرداری لەگەڵ زەینەب ئاشکرا بکات، هیچ کات لەلایەن دوو ڕووەکانەوە تووشی ڕاچڵەکان نەبووە، بەڵکو پێغەمبەر (ﷺ) هەمیشە پیسی و چەپەڵی ئەوانەی بە ناپەسەند داناوە، کە قسە لەناو خەڵکیدا دروست دەکەن و بڵاوی دەکەنەوە، ئەو دەیزانی کە ئەوان چی دەڵێن و خۆی لێ دەپاراستن. ..ترسەکە بە جۆرێك نەبوو، ئەوەندە نەبوو کە ڕووی پێغەمبەر (ﷺ)لە کارەکە وەرگێڕێت، یان پەشیمانی بکاتەوە، بە بەڵگەی ئەوەی کە

٥٧٤- لطائف الأشارات ٥: ١٦٢.

دوودڵ نەبوو لە بەهاوسەرکردنی زەینەبدا دوای تەڵاقدانی لەلایەن زەیدەوە. بەڵکو ئەوە هەستێك بوو لە دەرونیدا دروست بوو، وای دانابوو کە دووڕووەکان قسەی پێوە بڵاوبکەنەوە). [٥٧٥]

﴿فَلَمَّا قَضَى زَيْدٌ مِّنْهَا وَطَرًا زَوَّجْنَاكَهَا﴾(الأحزاب:٣٧). ووشەی (الوطر) واتە: ئەو پێویستییە بوو کە خاوەنەکەی تێیدا هەبووە، ئایەتەکە واتە: ئیتر کاتێك زەید پێویستی نەما بەو ئافرەتە و بێزار بوو لێی تەڵاقی داوعیدەی تەواو بوو و بەسەرچوو، ئێمە ئەو ئافرەتەمان لێ مارەکردیت، ئەی پێغەمبەر (ﷺ). لە ئایەتەکەدا نەیفەرموو: (فلما طلقها) کە ئاماژەیە بۆئەوەی تەڵاقدانی زەینەب لەلایەن زەیدەوە، یەکسەر پاش ماوەیەك بوویە هاوسەری پێغەمبەر (ﷺ) بۆ ئەوەی کاری (تبني) کردنەکە بە یەکلایی کردنەوە هەڵوەشێتەوە، و پێغەمبەر (ﷺ) بەو کارە ببێتە پێشەنگێك بۆ قەومەکەی و ئەو عادەتە لە ڕیشە دەربکێشێت. خۆ ئەگەر بیفەرمووایە: (فلماطلقها) ئەوا دەگونجا ئەو تەڵاقە کاریگەری لەسەر ئەم هەڵوێستە ببوایە. واتە: بەڕاستی زەید تەڵاقیدا و بەڵام هەر پێویستیشی بوو، و تەڵاقیدا و بەڵام هەر حەزی لێیەتی. لەبەر ئەوە ئەم (كناية)یە هەڵبژێردرا لەم هەڵوێستەدا. ئەم جۆرە (كناية)یەیش لەم مەسەلانەدا نەبێت لە قورئاندا بەکار ناهێنرێت، کە ئاماژەیە بۆ ئەوەی زەید بە حەز و ڕەغبەتی خۆی زەینەبی تەڵاقداوە و خۆی کارەکەی هەڵبژاردووە. دوای ئەوەیش کە تەڵاقیدا هیچ حەزێکی لەسەری نەما و مەیلی نەدکرد و بەجیا بوونەوەیشی هیچ ناڕەحەت نەبووە. بە فەرمانی خوایی و لە ئاسمانەوە زەینەب لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) مارە کرا. ﴿لِكَيْ لَا يَكُونَ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ حَرَجٌ فِي أَزْوَاجِ أَدْعِيَائِهِمْ إِذَا قَضَوْا مِنْهُنَّ وَطَرًا﴾ (الاحزاب:٣٧). بۆ ئەوەی هیچ تەنگی و ناڕەحەتی و گوناه و تاوانێك نەمێنێت لەسەر بڕواداران لە خواستن و مارەکردنی ژنانی ئەوانەی کە بەکوڕیان ناو ئەبرێن و لەڕاستیدا کوڕی ئەوان نین، کاتێك کە ئەوان پێویستیان نەما پێیان و تەڵاقیان دان، و عیدەیان بەسەر چوو. ﴿وَكَانَ أَمْرُ اللَّهِ مَفْعُولًا﴾(الاحزاب:٣٧). بێگومان فەرمانەکانی خوا بە جۆرێکە ڕەت بوونەوەی بۆ نییە و بڕیارەکانیشی دواناکەوێت، ئەوە تەقدیرکار و ڕێکخەری کارەکانە و خۆی نەخشەی بۆ

---

٥٧٥–التحرير و التنوير ٢٢: ٣٣ بەدەستکاری یەوە.

دادەنێت، و بە هاوسەربوونی زەینەب بۆ زەید و پاشان تەلاقدانی و پاشتر بوونی بە هاوسەری پێغەمبەر، هەمووی بە تەقدیر و حیکمەتی خوای گەورە بووە.

﴿مَا كَانَ عَلَى النَّبِيِّ مِنْ حَرَجٍ فِيمَا فَرَضَ اللَّهُ لَهُ﴾ (الاحزاب:٣٨). کاتێك فەرمانی خوا بێتەدی و جێ بەجێ ببێت، ئیتر بۆچی دەبێت پێغەمبەر ناڕەحەت و تەنگەتاو ببێت لە شتێك کە لە فەرمانی خواوەیە و خۆی دایناوە و تەقدیری کردووە؟

﴿سُنَّةَ اللَّهِ فِي الَّذِينَ خَلَوْا مِن قَبْلُ﴾ (الاحزاب:٣٨). خوا بەو جۆرە سوننەت و ڕەوشتی خۆی دامەزراند لە ناو پێغەمبەراندا کە تێپەڕیان کرد لەمەو پێش کەواتە ئەم کارە بەدی دێت بەپێی سوونئەتی خوا، خوای گەورە سوونئەتی وابوو، فەرمانی بە پێغەمبەرانی پێشوو نەکردووە لە شتێکدا کە پێی ناڕەحەت و تەنگەتاو بن. ﴿وَكَانَ أَمْرُ اللَّهِ قَدَرًا مَّقْدُورًا﴾(الاحزاب:٣٨). کار و فەرمانی خوای گەورە شتێکی بڕیار داوە لەلایەن خۆیەوە، کەواتە دەبێت بەدی بێت، هیچ کەس و هیچ شتێك لە ڕوویاندا ناوەستێت و ناتوانێت بەگری بکات، هەموو کارێکی بە ئاگاداری و زانین و شارەزایی یەوە بڕیار داوە. خوای گەورە کاتێك فەرمانی دەرکرد بە هاوسەربوونی زەینەب بۆ پێغەمبەر (ﷺ)کە لە زەید جیا بوو بوویەوە، ئەوە خوای گەورە زانا بوو کە ئەو کارە لەبار و گونجاوە بۆ پێغەمبەر (ﷺ) هەروەك چۆن کاری گونجاوی تەقدیر کردوە بۆ کەسانی پێش ئەویش لە پێغەمبەران (علیهم السلام) لە نەخشە و قەدەری خوا بۆ پێغەمبەرانی بە جۆرێك بووە کە بەرگەی ناڕەحەتی و کارەسات بگرن لە ڕێگەی گەیاندنی پەیامەکانیاندا، و لە قەدەری خوا بە پێغەمبەرانی، هەندێك لە حوکم و بڕیاری لەسەریان فەرز کردووە کە تایبەت بووە بە خۆیان، کە هاوکار و پشتیوان بووە بۆ بڵاوکردنەوەی بانگەواز، لەوانە بەهاوسەر بوونی چوار ئافرەت بۆ پێغەمبەر (ﷺ) لەبەر چەند مەبەستێکی ڕێزدار و کۆمەڵە حیکەمتێك. ﴿الَّذِينَ يُبَلِّغُونَ رِسَالَاتِ اللَّهِ وَيَخْشَوْنَهُ وَلَا يَخْشَوْنَ أَحَدًا إِلَّا اللَّهَ وَكَفَى بِاللَّهِ حَسِيبًا﴾(الاحزاب:٣٩). کەسانێك بوون پەیامەکانی خوایان ڕاگەیاند ئەترسان لەخوا، و شەرم و بیمی خوا لە دڵیاندا جێگیر بوو، نە ئەترسان لە هیچ کەسی تر بێجگە لەخوا و شەرمیان لە کەسی تر نەدەکرد. ئەمە سروشت و پیشەی پێغەمبەران (علیهم السلام) بوو، ئەوان پووختترین ی دروستکراوەکانی خوا بوون و زاناترین کەس بوون بە حەق و

ڕاستی و بەترسترین کەس بوون لەخوا، و پێغەمبەری خوایش (ﷺ) بەرێزترینیان بووە لە ڕێز و پلەوپایە و لەخواترساندا.

ناکۆکی و دژیەك لەنێوان ئەم دوو ئایەتەدا نییە، ئایەتی: ﴿الَّذِينَ يُبَلِّغُونَ رِسَالَاتِ اللَّهِ وَيَخْشَوْنَهُ وَلَا يَخْشَوْنَ أَحَدًا إِلَّا اللَّهَ وَكَفَىٰ بِاللَّهِ حَسِيبًا﴾(الاحزاب:٣٩). و ئایەتی: ﴿وَتَخْشَى النَّاسَ وَاللَّهُ أَحَقُّ أَن تَخْشَاهُ﴾ (الاحزاب:٣٧).

(الطبرسي) دەڵێت: (...ئایەتی: ﴿وَتَخْشَى النَّاسَ وَاللَّهُ أَحَقُّ أَن تَخْشَاهُ﴾ بۆ پێغەمبەرانە. ترسەکە لێرەدا پەیوەندی بە گەیاندنی پەیامەوە نییە، بەڵکو پێغەمبەر (ﷺ) لێرەدا لە قسەی خراپی خەڵکی دەترسا، کەسی ژیر و بەهۆش خۆی لە زیان و مەترسی و گومانی خراپ و قسەی خراپ لەسەر خۆی دەترسێت، هیچ شتێك لەمانە پەیوەندی بە تەکلیف و داواکارییەوە نییە). [٥٧٦]

﴿مَّا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَا أَحَدٍ مِّن رِّجَالِكُمْ وَلَٰكِن رَّسُولَ اللَّهِ وَخَاتَمَ النَّبِيِّينَ وَكَانَ اللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمًا﴾(الاحزاب:٤٠). لەم ئایەتە پیرۆزەدا وەڵام بۆ ئەو کەسانە هاتووە کە وتوویانە: بەڕاستی محمد هاوسەری کوڕەکەی خۆی خواستووە کە زەید بووە، چونکە زەید کوڕی پێغەمبەر (ﷺ) نەبووە.

زانا (الزمخشري) دەڵێت: ﴿مِّن رِّجَالِكُمْ﴾ واتە: پێغەمبەر (ﷺ) باوکی هیچ پیاوێك نەبووە لەنێوە لەڕاستیدا، هەتا ئەوە دامەزراو و جێگیر بێت لە نێوان ئەو و نێوان کوڕیدا، کە لەنێوان باوك و کوڕی ڕاستیدا دەچەسپێت و جێگیر دەبێت لە حەرامی ئەوە و مارەبڕین و ژن هێنان و بەشودان...). [٥٧٧]

لێکدانەوە و دەربڕین بە دەستەواژەی ﴿مِّن رِّجَالِكُمْ﴾: لەبەرئەوە بوو، چونکە پێغەمبەر (ﷺ)تەنها سێ کوڕی پێ درابوو (القاسم و الطیب والطاهر) لە خاتوو خەدیجە، کە گەڕانەوە بۆ لای پەروەردگاریان پێش ئەوەی گەورە بن و پێبگەن، هەروەها دواتر (ابراهیم)یشی پێ بەخشرا لە خاتوو (ماریة)ی (قبطیة) (خوا لێی ڕازی بێت).

---

٥٧٦-مجمع البيان للطبرسي ٨: ٥٦٦ بەدەستکاری یەوە.

٥٧٧-الكشاف ٣: ٥٤٤.

زانا (الزمخشري) دەڵێت: (ئەگەر وتت: خۆ پێغەمبەر (ﷺ) باوکی (القاسم و الطيب والطاهر) بووە، چۆن دەبێت؟ ئەوا دەڵێین: ئەوانە لە نەفی کردنی ناو ئایەتە چوونەتە دەرەوە، لەبەر ﴿مِّن رِّجَالِكُمْ﴾لە دوو ڕووەوە:

یەکەمیان: ئەم چوار کوڕە نەگەیشتبوونەتە تەمەنی (رجال) پیاو.

دووەم: ناوی (رجال) (إضافة)کراوە بۆلای ناوی ئەوان، ئەوان پیاوی پێغەمبەر بوون نەك پیاوی خۆیان). [٥٧٨]

﴿وَلَٰكِن رَّسُولَ اللَّهِ وَخَاتَمَ النَّبِيِّينَ﴾ (الاحزاب:٤٠). (ابن عباس) دەفەرموێت: مەبەست لە ئایەتەکە ئەوەیە: بێگومان ئەگەر پێغەمبەر (ﷺ) کۆتا پێغەمبەر نەبوایە و بەو کۆتایی نەهاتایە، بەڕاستی خوای گەورە کوڕی پێ دەبەخشی کە لەپاش خۆی ببونایەتە پێغەمبەر. [٥٧٩]

(مقاتل) ی کوڕی (سليمان) دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) نەبۆتە باوکی هیچ یەکێك لەپیاوانی ئێوە، چونکە ئەگەر کوڕی ببوایە، بێگومان دوای خۆی دەبووە پێغەمبەر، بەڵام لەدوای ئەو پێغەمبەر نییە. [٥٨٠]

لەم ئایەتە پیرۆزەدا ئاماژە بۆ ئەوە کراوە کە پێغەمبەر (ﷺ) لەلایەن پەروەردگاریەوە ڕاسپێردراوە، و ئەوەی کەزەینەبی کردە هاوسەری، فەرمانی خوایی و حیکمەتێکی شەرعی بوو، کە بریتی بوو لە بەتاڵکردنەوەی پیشە و عادەت و باوی (تبني) بە کوڕکردن و ئەوەی لەسەری ڕاهاتبون.

﴿وَكَانَ اللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمًا﴾(الأحزاب:٤٠). خوای گەورە زانا و شارەزایە بە قسەکانتان و کارەکانتان و حاڵتان، و خوا زانایە بە هەموو ئەو شتانەی کە چاکە و خەیر و سەرفرازی و بەختەوەری بۆ بەندەکانی تیایە، لەهەردوو دنیادا..

---

٥٧٨–الكشاف ٣: ٥٤٤.

٥٧٩–زاد المسير لأبن الجوزي ٦: ٣٩٣.

٥٨٠–النكت والعيون للماوردي ٣: ٣٧٣.

## چوارەم: حیکمەت لە ڕێگەدانی ئیسلام بە فرە ژنی

ئیسلام دینی ئاسانکاری و لێبوردەیی یە و دینی پاکی و پاك داوێنی یە و دینی دادپەروەری و یەکسانی یە و خاوەنی شەریعەتێکی تەواو و گشتگیرە و دینی حوکمی دادوەرانەیە و بەرنامەکەی خواییە. لەگەڵ فیترەی ئیسلامیدا دەگونجێت، و بەرنامەکەی میانەڕەوی یە گونجاوی و پێکەوە بوون لە نێوان داواکانی ڕۆح و جەستەدا جێبەجێ دەکات، و هاوسەنگی تەواو دەکات لە نێوان بەرژەوەندی یەکانی تاك و کۆمەڵگادا.
ماموٚستا (سیدقطب) لە (في الظلال)دا، دەڵێت: (بەڕاستی ئیسلام یاسا و دەستورێکی ڕێك و پێکە بۆ ئینسان، و یاسایەکی واقیعی و ئیجابی یە، لەگەڵ فیترەت و پێکهاتەی ئینساندا دەگونجێت و لەگەڵ واقیع و پیویستی یەکانیدا لەگەڵ هەموو پێداویستی و گۆڕانکاری یەکانی ژیانیدا لە هەموو شوێن و کات و لەهەموو حاڵێکدا.
بێگومان ئیسلام یاساو دەستورێکی واقیعی و ئیجابییە ، ئینسان لەناو واقیعەی خۆیدا دەبینێتەوە کە تێیدایە، لەسەر ئەو هەڵویستەی کە لە سەریەتی، تا بەرزو بڵندی بکات بۆ پلەیەکی تر بەبێ ئەوەی ئینکاری فیترەتی بکات یان ئینکاری بکرێت، وبەبێ ئەوەی بێئاگای بکات لە واقیع و دەور و بەرەکەی یان ئیهمالی بکات و گوێی پێ نەدات، بەبێ ئەوەی زۆری لێبکات و بەرە و توند و تیژی پاڵی نێت!
یاسا و دەستورێکی وایە کە ڕەچاوی ئەخلاق و هەڵس و کەوتی ئینسان دەکات هەروەها پاك و خاوێنی کۆمەڵگا، و ڕێگە نادات بە پێکهێنانی واقیع و کۆمەڵگای ماددی، کە بە هۆیەوە ئەخلاق و ڕەوشتی جوان نەمێنێت و کۆمەڵگا پیس ببێت، و بکەوێتە ژێر چەکوش و پیاکێشانەوە کە نەگونجێت لەگەڵ ئەو واقیعەدا، بەڵکو ئەو هەمیشە حەز دەکات و ویستی وایە کە کۆمەڵگا و واقیعێك پێکبێت کە یارمەتی دەربێت لەسەر پاراستنی ئەخلاقە جوانەکان و پاك و خاوێن ڕاگرتنی کۆمەڵگا، لەگەڵ بەکاربردنی کەمترین هەوڵی تاك و کۆمەڵگاکە خەرجی دەکەن.[٥٨١]
لە یاساو دەستورە جوان و حەکیم و بەهێز و ڕێکەکانی ئیسلام: ڕێگەی داوە بە فرەژنی، خوای گەورە لە سوورەتی (النساء)دا فەرموویەتی: ﴿وَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تُقْسِطُوا فِي الْيَتَامَى

---

[٥٨١]- في ظلال القرآن ٥٧٩/١.

﴿فَانكِحُوا مَا طَابَ لَكُم مِّنَ النِّسَاءِ مَثْنَىٰ وَثُلَاثَ وَرُبَاعَ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تَعْدِلُوا فَوَاحِدَةً أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ ذَٰلِكَ أَدْنَىٰ أَلَّا تَعُولُوا﴾[٥٨٢] (النساء:٣).

---

[٥٨٢] - لەم ئایەتە پیرۆزەدا بەڵگەی ڕوون و تەواو لەسەر فرەژنی هەیە کە ڕێگەی پێدراوە بە مەرجێك لە چوار زیاتر نەبێت، کاتێك پیاو لە خۆیدا توانایەك دەبینێت لەسەر دادپەروەری کردن لە نێوانیاندا، لە نەفەقە و خەرجی و شوێنی نیشتەجێ بوون و مانەوە لەگەڵیاندا، ئەگەر ئەوەی لە خۆیدا بینی کە ناتوانێت دادپەروەری بکات لە نێوانیاندا، ئەوا پێویستە لەسەری کە بەیەك کیفایەت بکات (فإن خفتم ألا تعدلوا فواحدة أو ما ملكت أيمانكم)، (شێخ محمد محمد المدني)لە کتێبی {المجتمع الأسلامي كما تنظمه سورة النساء}دا دەڵێت: {ترسان لەوەی کە دادپەروەری ناکرێت، ئەوە حاڵەتێکی ویژدانی یە کە مرۆڤ هەستی پێ دەکات کاتێك کارەکانی خۆی ڕێك دەخات و توانا و ووزە ماددی و ئەدەبی یەکانی خۆی و (ظروف) بارودۆخی ژیانی خۆی دەزانێت، بێگومان ئەو لەو کاتەدا ترس لە نەفسی خۆیدا دەبینێتەوە یان دڵنیادەبێت واتە: دەتوانێت بڕیار بەسەر خۆیدا بدات و پێوانەی کاروبارەکانی بکات و بزانێت چۆن دەبن بە شێوەیەکی ڕاست، ئەوا دەترسێت ئەگەر زانی کەم و کورتی یەکی هەیە و دڵنیا و دڵ ئارام دەبێت ئەگەر زانی کیفایەت و ئامادەیی لە خۆیدا دەبینێت }.

لێرەدا دادپەروەری خوازراو ومەبەست لەم ئایەتەدا: (فإن خفتم ألا تعدلوا فواحدة) ، مەبەست پێی، دادپەروەری کردنە لە کارو بارە ماددی یەکاندا، لە نەفەقەو خەرجی و دابین کردنی شوێنی نیشتەجێ بوون و مانەوە لەگەڵیان و شتانی تریش، بەڵام مەیل و حەزی دڵ، ئەوە کارێکە کە لە تواناادا نییە، چونکە هەمیشە دڵەکان لە گۆڕانکاریدان، خۆ ئەگەر کاتێك مەیل و دڵی بەسەر دادپەروەریدا هەڵبژارد لە کار وبارە ماددی یەکاندا، بەوەی کە پیاوەکە لە مافی یەکێك لە هاوسەرەکانیدا کەم وکورتی نواند لە نەفەقە و خەرجی یان شوێنی نیشتەجێ بوون یان مانەوە لەگەڵیان بەهۆی حەز و خۆشەویستی و مەیلی زیاتری بۆ یەکێکی تریان، ئەمە ستەمێکی ڕوون و ئاشکرایە، و ئیسلام ئاگاداری و هۆشیاری دەربارەی داوە، لە فەرموودەیەکی پیرۆزدا پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (هەرکەس دوو ژنی هەبوو، و مەیل و حەزی بەلای یەکێکیاندا هەبوو، ئەوا لەڕۆژی قیامەتدا دێت و لایەکی لەدەست داوە) ( راوه أبو داود في السنن عن أبي هريرة ، كتاب النكاح). و أورده الأباني في صحيح سنن النسائي برقم (٣٦٨٢) – ٣/ ٨٢٧ وقال صحيح و أخرجه في غاية المرام في تخريج أحاديث الحلال و الحرام برقم /٢٢٩.

ئەو مەیلەی کە لە فەرموودەکەدا ئاماژەی بۆ کراوە بریتی یە لە فەزڵ دان بە یەکێك لە خێزانەکان بەسەر ئەوانی تردا لە نەفەقە و خەرجی و شوێنی نیشتەجێ بوون و مانەوە لەگەڵیان و شتانی تریش.

بەڵام مەیل و حەزی دڵی پیاو بۆ یەکێك لە هاوسەرەکانی ئەوە مەیل و حەزی دڵە لەگەڵ ڕەچاو کردنی مافی هەموویان پێکەوە و ڕاگیر کردنیان لەناو تەرازوی دادپەروەریدا لە کاروبارە ماددی یەکاندا، بێگومان ئەم حەز و مەیلەی دڵ، وەرگیراو نەبووە لێی، بەڵکو لەم ئایەتەدا ئامارەی بۆ کراوە: ﴿وَلَن تَسْتَطِيعُوا أَن تَعْدِلُوا بَيْنَ النِّسَاءِ وَلَوْ حَرَصْتُمْ فَلَا تَمِيلُوا كُلَّ الْمَيْلِ فَتَذَرُوهَا كَالْمُعَلَّقَةِ وَإِن تُصْلِحُوا وَتَتَّقُوا فَإِنَّ اللَّهَ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا﴾ (النسا ء/١٢٩).

واتە: (هەرگیز ئێوە ناتوانن لە نێوان هاوسەرەکانتاندا دادپەروەرانە ڕفتاربکەن، لە کاتێکدا ئەگەر زۆریش سوربن لەسەری، جاکەوابوو نەکەن هەر ڕوو لە یەکێکیان بکەن بەتەواوی ئەوی تر واز لێبهێنن وەك هەڵپەسێردراو، نە ئەوەیە مێرد درابێت، نە ئەوەیشە بێ مێرد بێت خۆ ئەگەر چاکسازی بکەن و ڕێك بکەون و خۆتان بپارێزن لەستەم، ئەوە بەڕاستی خوا هەمیشە و بەردەوام لێخۆشبوو میهرەبانە).

عائیشە (خوا لێی ڕازی بێت) فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەیەکسانی شتی لە نێوان خێزانەکانیدا دابەش دەکرد و دادپەروەری دەکرد، و دەیفەرموو: (ئەی خوایە ئەمە بەش و دابەش کردنی منە لەوەدا کە من هەمە و خاوەنیم) رواه الإمام أبو داود في السنن عن عائيشة (رضي الله عنها) ، كتاب النكاح ، باب في القسم بين النساء ، حديث رقم (٢١٣٤) – سنن أبي داود ٢/٢٤٢ ، و رواه الإمام الترمزي في السنن عن عائيشة ، كتاب النكاح ، باب ما جاء في التسوية بين الضرائر حديث رقم (١١٤٠) – ٣/٤٤٦.

واتە: (ئەگەر ترسان لە ئەنجامنەدانی دادپەوەری لەگەڵ کچە بێ باوکەکاندا (ئەگەر بیانکەنە هاوسەرتان، ئەوە واز لەوان بهێنن) ئەوە لە ئافرەتانی تر کە حەڵاڵن بۆتان ژن مارەبکەن، دوو دوو، یان سیان سیان، یان چوار چوار، (ئەڵبەتە لە یەك هاوسەر زیاتر مەرج و بار و دۆخی تایبەتی خۆی هەیە) خۆ ئەگەر ترسان لەوەی کە نەتوانن دادپەروەر بن، (لە نێوان هاوسەرەکانتان) ئەوە با یەك ژن مارەبکەن، یان ئەو کەنیزەکانەی هەتانن(کە دیاردەیەکی کاتی بوو ، ئیسلام بنەبڕی کرد) ئەوەی کە باسکرا نزیکترە لەوەی ستەم نەکەن (ئەگەر پەیڕەوی بکەن.).).

یاساو دەستوری فرە ژنی لێبوردەیی و حیکمەت و واقیعی بوونی ئیسلامەمان بۆ دەردەخات، لەگەڵ ئەوەشدا هێرشی دڕندانە دەبینین لە دوژمنانی ئیسلام و بانگەشەکانیانەوە لەسەر ئەم یاساو شەرعە جوان و پوختە، پاڵنەر و هۆکار لەپشت ئەم هێرشە لەرزۆك و نەزانانەوەیە بەرامبەر بە حەق و ڕاستی، و ئەو جۆرە کەسانە دەمارگیریان هەیە بەلای بەتاڵ و ناحەقدا و دڵیان بۆی لێدەدات.

(أستاذة) (مەریەم جەمیلە) [583] دەڵێت: هیچ حوکمێك لە حوکمەکانی شەریعەتی ئیسلامی نابینرێت بکەوێتە بەر هێرشی توند و تیژانە بە هێندەی کە بە ڕێژەیەکی زۆر زیاتر حوکمی فرە ژنی دراوەتە بەر ئەو هێرشە دڕندانەیە.

دوژمنانی خوا و ئیسلام ئەم فرە ژنییە وای لێکدەدەنەوە کە بەڵگەیە لەسەر کەم کردنەوە و نزم کردنەوەی پلەی ئافرەت لە ڕووی ڕێز و قەدری ئافرەتی موسڵمانەوە، وا شی دەکەنەوە کە یاسایەکی شەهوانی و ئارەزوو بازییە، کەمێك لە بانگخوازانی نوێگەر دەڵێن کە فرە ژنی یاسا و دەستورێکی دواکەوتووە و بەسەر چووە، بەکارنایەت تەنها بۆ کۆمەڵگا دواکەوتووەکان نەبێت.. لەڕاستیدا ئەو کەسانەی کە ڕەواج و بایەخ بەم جۆرە درۆیانە دەدەن، بەباشی و بە تەواوی دەزانن کە نەبوونی فرە ژنی (سنورردارکردنی و

---

و رواه الإمام النسائي في السنن عن عائيشة كتاب عشرة النساء ، باب ميل الرجُل الى بعض نسائه دون بعض – سنن النسائي ٧/٦٤ و رواه ابن ماجة في السنن عن عائيشة كتاب النكاح باب القسمة بين النساء حديث رقم (١٩٧٠) ، ١/٦٣٤ ، و أورده إبن حبان و صحيحه – كما في موارد الظمآنِ برقم (١٣٠٥) – ٤/٢٤٤ ، و رواه الحاكم في المستدرك و قال صحيح على شرط مسلم ولم يخرجاه – وَ وافقه الذهبي – المستدرك ٢/١٨٧.

[583] ئافرەتێکی ئەمەریکی یە ، خوای گەورە هیدایەتی داوە بۆ ئیسلام ، خۆی ئازاد کردووە و تاجی ئیسلامی لەسەرناوە دوای ئەوەی کە قەناعەتی بۆ دروست بووە و کتێبێکی بەنرخی هەیە بەناونیشانی: (لماذا أسلمتُ؟) طبعة المختار الأسلامي ، لەم کتێبەیدا لەوە دەدواوە کە چۆن لە جولەکەیەتی یەوە کۆچی کردووە بۆ ناو ئیسلام ، هەروەها کۆمەڵێك کتێبی تریشی هەیە دەربارەی ناساندنی ئیسلام و ڕەتدانەوەی گومانی دوژمنان.

حەرام کردنی و بە تاوان دانانی) ئەو شتەیە کە دەبێتە هۆی کەوتنە وەی فەساد و دواکەوتن لە کۆمەڵگادا لەسەردەمی نوێدا و دەبێتە هۆی سڕینەوەی ئەو حوکم و بڕیارە، لە کاتێکدا بە جۆرێکە کە ژمارەی ئافرەتان زۆر زۆر زیاترن لە پیاوان، بەهۆی جەنگ و کوشتار و تیاچون و فەساد و خراپە و وێڵ کردنی خەڵکی لەگەڵ بڵاوبونەوەی دەرد و نەخۆشی و ئاژاوە زیادی کردووە.[٥٨٤]

شێخ (محمد الغزالي) (خوالێی ڕازی بێت) دەڵێت: (من خوێندمەوە کە پاپای فاتیکان لە (قطر)ی (إفریقا)ی موسڵماندا وتاری داو، زۆر بە توندی دژایەتی فرە ژنی کرد و بە ناشیرینترین شێواز باسی کرد.... و پاشان پرسیاری ئەوە دروست بوو: ئایا دەربارەی فەوزا و ئاژاوە جنسی و ئارەزوو بازی یەکانی ئەوروپا چی دەڵێت؟ و چی دەڵێت دەربارەی کەسێك کە بەتوانایە لەسەر ئابڕو بردن و خراپ کردنی ناموسی دەیان کەس؟).[٥٨٥]

لە کتێبی (تحریر المرأة) دا (قاسم امین)دا[٥٨٦] دەڵێت: (فرە ژنی نیشانەیەکە بەڵگەیە لەسەر خراپ بوونی ئەخلاق و تێکچوونی هەستەکان و شەڕفرۆشتنی بۆ ئەوەی زیاتر لەزەت وەربگرێت).[٥٨٧]

هەروەها (ملك حفني ناصف) کە یەکێکە لە بانگەشەکەرانی ئازادی ئافرەت، لە کتێبەکەیدا (النسائیات) دەڵێت: (بێگومان فرە ژنی فەساد و خراپە کردنە بۆ پیاوان و تەندروستی و ماڵ و سامان و ئەخلاق و منداڵ و نەوە و دڵی خێزانەکانیان).[٥٨٨]

---

[٥٨٤] تحذیر الی المرأة المسلمة ص/٧ ، بە دەستکاری یەوە ، مریم جمیلة.

[٥٨٥] - الحق المر ص/٨٢ بەدەستکاری یەوە.

[٥٨٦] - یەکێك لەو کەسە گەورانەی بانگەشەی ئازادی کردووە لە میسردا و ئەو لەو بارەیەوە دوو کتێبی چاپکراوی هەیە: (المرأة الجدیدة) و (تحریرالمرأة) و بەڕاستی فکرە و بۆچونەکەی لە ڕۆژئاواوە وەرگرتووە و ویستویەتی کە ئافرەتی موسڵمان شێواو و ناشرین بکات ، و وەك ئافرەتی ڕۆژئاوای لێ بکات ، ئەوەش ناکرێت و تەواو نابێت مەگەر بە داماڵینی ئافرەتی موسڵمان لە فێرکراو و زانستە دینی و بەها بەرز و باڵاکان ، بێگومان بانگەشەکەی ڕەواج و بایەخی پەیدا کرد لەناو ئافرەتان و پیاواندا، کە دوورن لە تێگەیشتنی ئیسلامی و زانست و ئەحکامە ڕێك و پێکەکان.

[٥٨٧] - تحریر المرأة لقاسم أمین ص/١٢٢.

[٥٨٨] - النسائیات /لملك حفني ناصف ص/٣٠ (ملك حفني) ئافرەتێکە بانگەشەی ئافرەتانی موسڵمان دەکات کە ئازاد بن و چاو لە ئافرەتانی ڕۆژئاوا بکەن لە ئەخلاق و عادەتدا.

ئەمانە هەندێك بوون لەو گومانانەی کە دوژمنانی ئیسلام و بانگەشە چیانی دروستیان کردبوو، کە هێرش دەکەنە سەر ئەم یاسا و دەستورە ئیسلامییە حەکیم و جوانە و وای لێکدەدەنەوە کە یاسا و دەستورێکی زۆرداری و ستەمکارانەیە، و دەبێت بەهەر هۆکارێك بێت قەدەغە بکرێت.

ئەوەی کە دێت و پێویستە بکرێت، دەبێت ئەو تاریکی و پەردەیە لەسەر ئەو شوبهە و گومانانە لابرێت و عەدالەت و دادپەروەری یاسا و دەستوری فرە ژنی دەربخرێت و حیکمەتە بەنرخەکانی ڕوون بکرێتەوە، و پێویستیشە کە هەڵوێستی هەردوو ئاینی (یهودي) و (نصراني) دەربارەی فرە ژنی ڕوون بکەینەوە، بۆ سوود و ڕوون کردنەوەی زیاتر:

بێگومان فرەژنی حیکمەتی زۆری تیایە هۆکاری زۆرە لێرەدا هەندێکیان باسدەکەین:
فرە ژنی چارەسەرێکی نموونەیی یە بۆ ڕوو بە ڕوو بوونەوەی دیاردەی زۆربونی ژمارەی ئافرەتان بەسەر ژمارەی پیاواندا، ئەم زۆربونەیش سوننەتێکی کەونی یە، لێکۆڵینەوە و سەرژمێرییە زانستییەکان دەریان خستووە و دڵنیایان کردۆتەوە کە ئەگەر هەر پیاوێك ژنێکی بەس بوایە، ئەوا بە (ملیۆنەها) ژنمان دەبینی بەبێ هاوسەر دەمانەوە.
لە(دائرة المعارف)ی بەریتانیادا هاتووە کە دەڵێت: (مەترسی مردن لە ئافرەتاندا کەمترە هەتا پیاوان لە هەر قۆناغێکدا بێت لە قۆناغەکانی تەمەن بە شێوەی گشتی). [٥٨٩]
لە جەنگی جیهانی یەکەمدا (١٩١٤-١٩١٨)ی میلادی، زیاتر لە هەشت ملیۆن سەرباز کوژران بێجگە لەو مەدەنییانەی کە بوونە قوربانی جەنگ کە زۆرینەیان پیاوان بوون.
لە جەنگی جیهانی دووەمدا (١٩٣٩--١٩٤٥)ی میلادی ژمارەی قوربانییەکان (٦٥) ملیۆن کەس بوون لە نێوان کوژراو و بریندار و کەم ئەندامبوودا، کە زۆرینەیان پیاوان بوون.
لە جەنگی (عێراق – ئێران)دا (١٩٨٠ – ١٩٨٨) ی میلادی (٨٢) هەزار ئافرەتی ئێرانی و نزیکەی (١٠٠) هەزار عێراقی بێوەژن کرد.

---

[٥٨٩]- دائرة المعارف ٣٧/١.

لە گەڵ ئەمانەبشدا زۆرینەی ئەو کەسانەی کە زیندانی دەکرێن و دەستگیر دەکرێن لە جیهاندا زۆرینەیان پیاوانن، بۆ نموونە لە وولاتە یەکگتووەکانی ئەمەریکا کەوای لێکدەدەنەوە ڕەمز و نیشانەیە بۆ شارستانیەت و ناونیشانە بۆ ئازادی. دەبینین کە دەستەکانی دادگا و دادوەری ڕۆژانە مامەڵە لەگەڵ نزیکەی ملیۆنێك و سێ سەد هەزار کەسدا دەکات، کە زۆرێك لەوانە لە زینداندا دەهێڵرێنەوە، نیسبەتی نێرینە لەناو ئەواندا دەگاتە نزیکەی (٩٧٪).

هەروەها لە سەردەمی نوێدا دەبینین زۆرینەی قوربانیەکانی پێشکەوتنی پیشەسازی بریتین لە پیاوان، لە ئەنجامی کارەسات و دیاردە پیشەسازی یەکاندا، وەك ڕووداوەکانی ئۆتۆمبێل و فڕۆکە و کارگەکانی پیشەسازی و کشتوکاڵی نوێ، سەرەڕای ئەوەی کە ئەمانە دەبنە هۆی پێشکەوتنی زانستی گەورە. لە یەکێك لەسەر ژمێری یە نوێکاندا.[٥٩٠] بۆ هەندێك لە دەوڵەتە ئەوروپییەکان و یەکێتی سۆڤێتی پێشوو وولاتە یەککرتووەکان ئەمە دەبینین.

| دەوڵەتەکان | ڕێژەی نێرینە | ڕێژەی مێینە |
|---|---|---|
| نەمسا | ٪٤٧,٠٧٪ | ٪٥٢,٩٣٪ |
| ئەڵمانیا | ٪٤٨,٠٢٪ | ٪٥١,٩٨٪ |
| فەرەنسا | ٪٤٨,٩٩٪ | ٪٥١,٠١٪ |
| ئیتاڵیا | ٪٤٨,٨٩٪ | ٪٥١,٣٩٪ |
| پۆڵەندا | ٪٤٨,٦١٪ | ٪٥١,٣٩٪ |
| ئیسپانیا | ٪٤٩,٩٤٪ | ٪٥١,٠٦٪ |
| سویسرا | ٪٤٨,٦٧٪ | ٪٥١,٣٣٪ |
| یەکێتی سۆڤێتی پێشوو | ٪٤٦,٧٠٪ | ٪٥٣,٣٠٪ |
| وولاتە یەککرتووەکان | ٪٤٨,٥٨٪ | ٪٥١,٤٢٪ |

[٥٩٠] - دائرة المعارف البريطانية ط سنة ١٩٨٤ نقلاًعن (المرأة بين شريعة الأسلام و الحضارة الغربية ص/٢٢٠-٢٢١. وفي كتاب (درية شفيق) ، کە تیایدا باسی قەدەغەکردنی فرە ژنی هاتووە ، لە کۆتایی کتێبەکەدا سەرژمێری ساڵەکانی (٤٧ ، ٤٨ – ٤٩ – ٥٠ – ١٩٥١) ی هێناوە ، لەم سەرژێمێریانەدا بۆ هەموو ئەم ساڵانە دەبینین کە ژمارەی ئافرەتان لە ژمارەی پیاوان زیاترە ! دەتوانیت بگەڕێیتەوە بۆ (المرأة المصرية من الفراعنة إلى اليوم) ل ٢٨٣ و لاپەڕەکانی دواتری ط مطبعة مصر ١٩٥٥ م.

سەرژمێرییەکان لەساڵی (١٩٨٧) تەواو بووە، لە وولاتە یەکگرتووەکان دەبینین بەڕاستی ژمارەی ئافرەتان زیادی کردوو لە ژمارەی پیاوان بە ڕێژەی (٧,٨) ملیۆن ئافرەت، ئەمە واتە: ئەگەر هەموو پیاوەکان ببنە هاوسەردار، ئەوا (٧,٨) ملیۆن ئافرەت بەبێ هاوسەر دەمێننەوە.[٥٩١] دەبێت ئەم ئافرەتانە بچن بۆکوێ ! و دەبێت چۆن چارەسەری ئەم ڕووداو و واقیعە بکەین؟ و چۆن مامەڵەی لەگەڵدا بکەین؟ ئایا چاومانی لێ دابخەین و گوێمانی لێ کەڕ بکەین؟ ئایا دەستە و ئەژنۆ ڕاوەستین و بەبێ دۆزینەوەی چارەسەرێکی یەکلایەنە بۆ ئەم مەسەلەیە؟

مامۆستا (سید قطب) لە (في الظلال)دا دەڵێت: (... بێگومان شان هەڵتەکاندن ئەم گرفتە چارەسەرناکات! وەك ئەوەی کە واز لێبهێنرێت بۆ کۆمەڵگا چارەسەری ئەم واقیعە بکات بەپێی ئەوەی کە لەسەری ڕێك کەوتوون، هیچ ئینسانێکی باش کە ڕێز لە خۆی بگرێت و ڕێز لە ڕەگەز و جنسی بەشەری بگرێت، شتی وا ناڵێت! کەواتە دەبێت یاساو دەستورێك هەبێت، و دەبێت ئەوەیش پەیڕەوی بکرێت، و ئێمە لەم کاتەدا خۆمان لەبەردەم سێ لێکدانەوە و (إحتمال)دا دەبینینەوە:

١- کە هەموو پیاوێکی چاك تەنها یەك ئافرەتی چاك بە هاوسەر بۆخۆی بێنێت...پاشان ئەوەتا ئافرەتێك یان زیاتر دەمێنێتەوە بەبێ هاوسەر، ژیانی یان ژیانیان بەبێ هاوسەر بەسەر دەبەن، و پیاوان ناناسن!

٢- یان ئەوەتا هەر پیاوێك بە هاوسەرداری شەرعی ژنێك دێنێت، و لەدوای ئەوەیش تێکەڵاوی ئافرەتی تر دەکات بەبێ هاوسەرداری.

٣- یان ئەوەتاهەرپیاوێك چەند هاوسەرێك بهێنێت. [٥٩٢]

---

[٥٩١]- المرأة بين شريعة الإسلام و الحضارة الغربية وحيد دين خان.

[٥٩٢]- في ظلال القرآن ٥٧٩/١-٥٨٠ بەدەستکاری یەوە.

## شیکردنەوەی ( إحتمال ) و لێکدانەوەکان:

(إحتمال)ی یەکەمیان ستەمی بۆ ئافرەت تیایە و بێ بەش کردنێتی لە فەرمانی فیتری کەخۆزگەی پێ دەخوازێت.

* دکتۆر (عبدالناصر العطار) دەڵێت: (گومانی تێدا نییە، ئەگەر فرسەت و بوار نەدرێت بە ئافرەت بۆ هاوسەرگیری تاك بەشێوەی گونجاوو لەبار: ئەوا فرەژنی بۆ ئەو خێری زیاتری تیایە تائەوەی بەرەبەنی و قەیرەیی بژی یان، بەبێ ماف بمێنێتەوە).[٥٩٣]

* (وستر مارك)،[٥٩٤] لە کتێبی (تأريخ الزواج)دا دەڵێت: (بێگومان لە ئەفەریقا کۆمەڵە کۆمەڵگایەك هەن کە فرەژنی لەناویاندا بڵاوە، بە کەمی دەبینرێت کچێك هەبێت و بێ هاوسەربێت، ئەو کار و لێکۆڵینەوەی کە لێکۆڵەران لەگەڵی ڕۆیشتوون لە زانستی کۆمەڵناسیدا ئەوەیە کە: ئەو کۆمەڵگایەی کە فرەژنی تیایدا بڵاوە و پەیڕەو دەکرێت، دەبینرێت کە هەموو ئافرەتێك هاوسەری خۆی هەیە).[٥٩٥]

لێرەدا بەڕاستی دادپەوەری کۆمەڵایەتی ئەوە دەگەیەنێت کە فرەژنی ڕێگە پێدراو بێت، هەتا مۆڵەت و بوار بدرێت کە هەموو ئافرەتێك هاوسەری هەبێت ، ئەگەر بە پیاوێکی خاوەن هاوسەریش بێت، چونکە ژیانی بەبێ هاوسەر بێ بەش بونێتی لە مافەکانی کە سروشتین، سەرەڕای ئەوەی کە ژمارەی ئافرەتان زۆر زیاترە لە پیاوان. وەك پێشتر ڕونمان کردەوە.

* دەربارەی (إحتمال) و لێکدانەوەی دووەم: بێگومان ژمارەیەکی زۆری لە (دڵدار و هاوڕێ گرتن) لێ دەکەوێتەوە، ئەمەیش کەسانی ژیر و تێگەیشتو قبوڵی ناکەن، ئیتر چۆن دژایەتی فرەژنی بکەین کە حەڵاڵ و ڕێگە پێدراوە، و بچین لەباتی ئەمە دەرگا بەڕووی زۆرێك لە (دڵدار و هاوڕێ گرتن)دا بکەینەوە؟ چۆن دەبێت دەرگای هاوسەرداری حەڵاڵ دابخەین و دەرگای خراپەکاری بکەینەوە؟ چۆن دەبێت دەست لە ئافرەتانی هاوسەری پاك و حەڵاڵ هەڵگرین و شوێنی حەرام و پیس و ئەنجامدانی تاوان بکەوین؟

---

[٥٩٣]- تعدد الزوجات في شريعة الأسلامية تأليف: (عبدالناصر العطار ص /٧).

[٥٩٤]- لەگەورە زانایانی کۆمەڵناسی ڕۆژئاوایە.

[٥٩٥]- ٤١ History of marriagc Wester Mark opcit.

* بیریاری ئیسلامی مامۆستا (أنور الجندي) دەڵێت: (بێگومان داخستنی دەرگای فرەژنی واتە کردنەوەی دەیان دەرگای خراپەکاری و تاوان بە ڕێگەی ناشەرعی، بەڕاستی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان ئامارەیان بۆ ئەوە کردووە کە دنیا بە گشتی و لە ئێستادا لەگەڵ گرفتی ئەنجامدانی حەرامدا ڕووبەڕوو دەبێتەوە بە ڕێژەیەکی زۆرتر لە ئەنجامدانی حەڵاڵ و لەو منداڵانەدا کە لەدایك دەبن، بێگومان ڕێژەی منداڵانی ناشەرعی و نادروست لە هەندێك وڵاتدا بۆ ڕێژەی (٦٠٪) بەرز بۆتەوە، و لە هەندێك وڵاتی تردا بۆ ڕێژەی (٧٥٪) بەڵام لەناو گەل و کۆمەڵگا ئیسلامییەکاندا، پارێزراو بوون لەم دەرد و بەڵایە).[596]

ئێمەیش دەڵێین: (بێگومان دەستور و عادەتی هاوڕێ گرتن لە ڕۆژئاوادا، بڵاوە و گەشەی سەندووە بە شێوەیەکی فراوان، بێگومان وەزارەتی لێکۆڵینەوەی زانستی ئەڵمانی ڕایگەیاند کە لە (٩٩٪) لە ئەڵمانییەکان پەیرەو و مومارەسەی هاوڕێ گرتن دەکەن، نەك یەك هاوڕێ، بەڵکو چەندین هاوڕێ).[597]

لە وڵاتە یەکگرتووەکان ڕێژەی ئافرەتانی دووگیان بەبێ هاوسەر لە یەك ساڵدا گەیشتۆتە (٢٤٧٨) ئافرەتی سکپڕ، تەنها لە یەك قوتابخانەی (نیۆرك)دا.

لە یەکێك لە قوتابخانە ناوەندییەکاندا ڕێژەی کچانی سکپڕبوو گەیشتۆتە (٤٨٪) و سەرژمێرییەکان چەسپاندویانە کە بەلایەنی کەمەوە ملیۆنێك لەو منداڵانە لەبار دەبرێن، و هەزاران منداڵیش هەر لەگەڵ لەدایك بونیان دەکوژرێن.[598]

لە یەکێك لە سەرژمێرییەکاندا لە نەتەوە یەکگرتووەکان چەسپاوە کە لە (٩٠٪) لە گەنجانی ئەمەریکی توشی نەخۆشییە جنسییەکان هاتوون.[599]

* مامۆستا (وحید الدین خان) دەڵێت: لە ماوەی جەنگی جیهانی دووەمدا ملیۆنەها پیاو کوژران و تیاچوون، کە ئەوەیش بویە هۆی زیادبوونی ڕێژەیەکی زۆر لە ئافرەت بە نیسبەت پیاوانەوە، لە ئەنجامی ئەوەیشەوە ڕووی دەرەوەی ماڵانی هەندێك لەو ئافرەتانەی کە مێردەکانیان لەدەست داوە لە جەنگی جیهانی دووەمدا، لافیتە بەم

---

[596]- تصحيح المفاهيم أنور الجندي ص /١٩٩ ط دار الأعتصام.

[597]- جريدة الأهرام عدد ١٩٩٢/٢/٢٧.

[598]- الدّعوة الأسلامية و الأنقاذ العالمي عبدالله ناصح علوان ص/١١ – ١٣.

[599]- جاهلية القرن العشرين محمد قطب ص /١٦٤.

ناونیشانە نوسراوە: (مطلوب ضيف للمبيت) واتە: میوانمان دەوێت بۆ مانەوە لە گەڵماندا.

* تا ئێستایش ئەم دیاردە و حاڵەتە هەر لە ڕۆژئاوادا هەیە و گەشەی سەندووە هەتا دوای جەنگیش، ئەوەیش بەهۆی زۆر بوونی ژمارەی ئافرەتان بەسەر ژمارەی پیاواندا..[٦٠٠]

* لە وولاتی سویدیش ئافرەتی هاوسەردار هەقی ئەوە بە خۆی دەدات کە هاوڕێیەك بۆ خۆی هەڵبژێرێت، بۆ مێردەکەش هەمان ماف هەیە.

* لە فەرەنسا و ئینگلتەرا پیاو دەزانێت کە ژنەکەی هاوڕێیەك یان چەند هاوڕێیەکی هەیە، هەروەها ژنیش دەزانن کە مێردەکانیان هاوڕێیەك یان چەند هاوڕێیەکیان هەیە، هەر یەکەیشیان چاوی خۆیان لەمە دادەخەن و لێبوردن و چاو پۆشی لە نێوان خۆیاندا ئاڵوگۆڕ دەکەن، بۆ ئەوەی هەریەکەیان ئارەزووەکانی خۆیان تێربکەن. هەروەها دیاردەیەکی بڵاو لە فەرەنسا هەیە، پێی دەڵێن: (التعايش الثلاثي) واتە: (پێکەوە ژیانی سێ کەسی)، کە بریتییە لەوەی دڵدارێك لەگەڵ خۆشەویستێك و ژنەکەی خۆیدا پێکەوە لە ماڵێکدا کۆ دەبنەوە، و ئەم سێ کەسەیش لەسەر ڕێککەوتنی تەواو لەسەر ئەم حاڵەتە پێکەوە دەژین. بەڵکو شتی لەمە ناپەسەندتریش ڕوو دەدات، کە قەڵەم خەجاڵەت و شەرمەزار دەبێت لە نوسینی.[٦٠١]

ئایا دەبێت لە دوای هەموو ئەمانەوە ڕەخنە لە یاسا و دەستوری فرەژنی بگرن و عەیبی لێ بگرن، و گوێ نەدەن بەوەی کەچی لەلایان ڕوو دەدات لە ڕۆژئاوا لەوەی کە هەریەکە چەند خۆشەویست و دڵدارێك بۆخۆی دەگرێت؟

دوو حاڵەتی لەیەك جیاواز و پێچەوانە هەن، ئایا پیس و پاك یەکسان دەبن؟

* هۆکاری تریش هەیە بۆ فرەژنی لەوانەیش نەخۆش کەوتنی هاوسەر و لاوازبوون و پەك کەوتنی بە جۆرێك کە نەتوانێت بە ئەرکەکانی خۆی هەڵسێت بەرامبەر مێرد و ماڵەکەی، پیاوەکەی هاوسەرێکی تر دێنێت کە چاودێری هەردوکیان بکات.

* هەروەها لەو هۆکارانەی تری فرەژنی بریتییە لە: نەزۆکی ئافرەت و پێویستی پیاو بەبونی منداڵ ، کە ئەوەیش داواکارییەکی سروشتی و فیترییە.

---

[٦٠٠] تصحيح المفاهيم أنور الجندي ص /١٩٩.

[٦٠١] تعدد الزوجات في الأسلام ، إبراهيم محمد حسن الجمل ص/٩٠.

* هەروەها لەو هۆکارانە: زۆر بوونی کار و بارەکانی ئافرەت و پێویستی بە کەسێك کە هاوکاری بکات و یارمەتی بدات و بەشداربێت لە کاروبارەکانی ماڵەکەدا.
* هەروەها لە هۆکارەکانی: بێگومان پیاو هەندێك جار سەرسام دەبێت بە ئافرەتێکی تر بێجگە لە خێزانەکەی خۆی، و ناتوانێت بەسەر سۆز و عاتیفەکانیدا زاڵ بێت، لێرەیشدا یان ئەوەتا ژن دێنێت و پەنا دەبات بۆ چارەسەرێکی حەڵاڵ، یان ئەوەتا لە ڕێگەی حەرام و ناشەرعییەوە تێکەڵی دەبێت.
* بەم جۆرە فرەژنی سوودی زۆری تێدایە، ئەویش بە هێزبوونی پەیوەندییەکانە لە نێوان خەڵکیدا لە ڕێگەی ژن و ژن خوازییەوە، هەروەها زۆربوونی نەوە و خستنەوەی نەوەی نوێ، و کردنەوەی دەرگای فراوان لە ژیاندا، و بەرەکەت لە ڕزق و ڕۆزی و شتانی تریش لەو سودانە کە چەندەهان و حیکمەتی زۆریان تێدایە.

## پێنجەم: هەڵوێستی هەردوو ئاینی (یهودی) و (نصرانی) بەرامبەر فرەژنی

### ١-فرەژنی لە ئاینی (یهودي) جوولەکەکاندا

فرە ژنی لە ئاینی جوولەکەدا ڕێگە پێدراوە، ئەوەی شایەتی لەسەر ئەوە دەدات لە (العهد القدیم)دا هاتووە، لە چەند دەقێك کە بەڵگە لەسەر ئەوە دەدەن، لەوانە: بەڕاستی زۆرێك لە پێغەمبەران لەوانەی کە لە (العهد القدیم)دا باسکراون، زیاتر لە هاوسەرێکیان هەبووە.
١- لە (سفر التکوین)دا هاتووە کە ئیبراهیم (علیه السلام)، (سارە و هاجر) و ئافرەتێکی تریشی هێناوە کە پێیان وتووە (فطورة) هەروەها (سراري) زۆریشی هەبووە. لە (الأصحاح ٢٥ فقرة ١)دا هاتووە دەڵێت: (ئیبراهیم گەڕایەوە و ژنێکی هێنا ناوی (فطورة) بوو).
هەر لەهەمان (الأصحاح ، فقرة ٧)دا ، دەڵێت: (نەوەکانی (السراري) ئەوانە بوون کە هی ئیبراهیم بوون، ئیبراهیم بەخشینی زۆری پێدان و لە ئیسحاقی کوڕی بەڕێزی، جیای کردنەوە).

٢- هەروەها لە (سفر التكوين)دا هاتووە: کە یعقوب دوو کچی خاڵی خۆیی هێنا کە (لينة و راحيل) بوون ، هەروەها دوو خزمەتکارەکەی ئەوانیشی هێنا کە (زلفة و بلهة) بوون). بگەڕێرەوە بۆ (سفر التكوين) ، (إصحاح: ٣٠ ، ٣١ ، ٣٢ ، ٣٤ ، ٣٥).

٣- لە (العهد القديم)دا هاتووە کە موسا کچی خواپەرستەکەی (مدين)ی هێناوە ، هەروەها ئافرەتێکی (کوشی)شی هێناوە، بگەڕێرەوە بۆ (سفر الخروج) (إصحاح: ٢ ، فقرة: ١٦ ، ٢١) و (سفر العدد إصحاح ١٢ فقرة ١: ١٥).

٤- هەروەها لە (سفر أخبار الأيام الأولى في الأصحاح الثالث).

بێگومان داود ، حەوت ئافرەتی بە هاوسەری بۆخۆی هێناوە ، لەگەڵ زۆرێك لە (السراري) کە ژمارەیان لە (٤٠) کەمتر نییە ، بگەڕێرەوە بۆ (سفر صموئيل الثاني إصحاح ، فقرة ١٢ ، ١٣)

٥- هەروەها (سفر الملوك الأول عن سليمان (عليه السلام)دا هاتووە دەڵێت: (سلیمان (علیه السلام) ئافرەتی زۆری خۆشویستووە و حەوسەت خێزانی خانم و بەڕێزی هەبووە و سێ سەد (السراري)یشی هەبووە هەموو خێزانەکانی مەیلیان بەلای دڵیدا بووە) (سفر الملوك الأول إصحاح تر ١١).

* هەروەها لە (العهد القديم)دا، چەندین نموونەی تر هەیە لەسەر فرەژنی لەوانە کە لە (سفر التكوين)دا هاتووە، دەڵێت: (عیسو خێزانەکانی لە کچە کەنعانییەکان هێناوە) (إصحاح ٣٦ فقرة ٢ ، ٣).

* هەروەها لە (سفر القضاة)دا دەڵێت: ((جدعون) حەفتا کوڕی بووە کە لە پشتی خۆی بوون ، چەنکە خێزانی زۆری هەبوون) (سفر القضاة إصحاح ٨ فقرة ٣٠).

هەموو ئەم دەقانە بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە لەلای جوولەکەکان فرە ژنی ڕێگە پێدراو بووە، بە جۆرێك کە لە (العهد القديم)دا، نموونەی زۆر هاتووە کە بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە فرەژنی لای پێغەمبەران (علیهم السلام) و کەسانی تریش بووە، لە(العهد القديم)دا، دەقێك نییە کە قەدەغەی فرەژنی بکات، یان لە ژمارەیەکی دیاریکراودا سنورداری بکات و رایگرێت.

## ٢-هەڵوێستی گاورەکان دەربارەی فرە ژنی:

* پێشتر باسمانکرد کەلە (العهد القدیم)دا، هیچ دەقێك نییە کە فرەژنی حەرام بکات یان سنورداری بکات، بەڵکو چەندین دەقی زۆری تێدا هاتووە، کە بەڵگەیە لەسەر ڕوودانی فرەژنی.

هەر هەمان حالیش هەیە لە (العهد الجدید)دا، کە هیچ دەقێکی تێدا نەهاتووە، دان بنێت بەوەدا کە فرەژنی حەرامە، یان لە ژمارەیەکی دیاری کراودا ڕاگیری بکات، هیچ کەس لە گاورەکان بۆچونیا وا نەبووە لەسەردەمەکانی پێشوودا کە دینەکەیان فرەژنی حەرام کردبێت، کاتێك فرە ژنی ڕێگە پێدراو بێت لە (العهد القدیم)دا، ئیتر گاورەکان چۆن حەرامی دەکەن کە باوەڕیان بە هەموو دەقەکانی (العهد القدیم) هەیە، بەڕاستی لەسەر زمانی (المسیح) لە (العهد القدیم) دا هاتووە، دەڵێت: (وا گومان مەبەن کەمن هاتووم لە کار و باری فریشتە (جبریل) و پێغەمبەران کەم بکەمەوە، من نەهاتووم بۆ کەم کردنەوە، بەڵکو بۆ ئەوە هاتووم تەواوکار بم، بەڕاستی من حەق و ڕاستی بە ئێوە دەڵێم: هەتا ئەم زەوی و ئاسمانانە هەبێت و بمێنێت: هیچ حەرفێك یان خاڵ و نوکتەیەك نافەوتێت و بەردەوام دەبێت و دەمێنێت کە فریشتەی وەحی هێناویێتی، هەتا هەمووی تەواو دەبێت. ...) (متی إصحاح ٥ فقرات ١٧ – ٢١).

هەروەها لە (متی)دا هاتووە دەڵێت: (کاتێك (یسوع) وتاری دەدا بۆ کۆمەڵێك، و قوتابییەکان دەیانوت: (الکتبة و الفریسیون) لەسەر کورسی موسا دانیشتبوون، هەموو ئەو شتانەی کە وتیان بۆ ئێوە بووە کە لەبەری بکەن، ئێوەیش لەبەری بکەن و کاری پێ بکەن، بەڵام دەربارەی کار و کردەوەکانیان، کار مەکەن، چونکە ئەوان شتانێك دەڵێن کە خۆیان کاری پێناکەن.) (متی إصحاح ٢٣ فقرات١: ٤).

* کاتێك دەڕوانیتە گاورەکان بێگومان دەبینیت کە ڕێگەدان بە فرەژنی لای ئەوان شتێکی دروستە – بەتایبەتی لە کۆمەڵگاکانی ئەفەریقا و ئاسیادا کە فرەژنی تێدا بڵاوە

– دەبینین ئەوان حەرام و قەدەغەی ناکەن، بەڵکو بانگەوازی بۆ دەکەن تەنانەت قەشە و گاورەکانیشیان کەلە ئەفەریقادا مژدەدەرن بە ڕێگەپێدان بە فرەژنی، لە کاتێکدا کە ڕێگەی پێنادرێت بۆ قەشەکان خۆیان لە ئەوروپادا، ئەمەیش سیاسەتی کەنیسەیە، لە بڵاوکردنەوەی بانگەشەکەیدا، کە شت حەرام دەکات و حەڵاڵیشی دەکات، بۆ ئەوەی کە خەڵکی حەزیان لەوە بێت کە گەردن کەچ بوون بۆ بوون بە گاور.[٦٠٢]

* لە مێژوی گاورەکاندا نموونەی زۆرێك لە پیاوان دەبینین کە لە خێزانێك زیاتریان بووە، هیچ کەسیش ئینکاری ئەمەی لێ نەکردوون لە کەسانی ئیمبراتۆر شارلەمان کە دوو ژنی هەبووە، هەروەها چەند خزمەتکارێکیش، هەروەها ئیمبراتۆر (فلافیوس فالنتیان) ئەو کەسە بوو کە قانونێکی داهێناو پەیڕەو کرد کە ڕێگەی بە فرەژنی دەدا، و هیچ کەسیش لە پیاوانی کەنیسە ئینکاری ئەمەی لێ نەکرد، چونکە زۆرێك لەوان، پەیڕەوی ئەوان یاسای فرەژنیان دەکرد و هەریەکەیان چەند خۆشەویست و دڵداریان هەبووە، کارەکە بەم شێوازە یاسا و دەستورە بەردەوام بوو، هەتا (جستنیان) لەنێوان ساڵانی (٥٢٧–٥٦٥)دا هات که فرەژنی حەرام و قەدەغە کرد، بەڵام لەکاری حەرام کردنەکەدا سەرکەوتو نەبوو، ئینجا لە دوای ئەو کەسی تر هات کە ڕێگەی بە فرەژنی دا و حەڵاڵی کرد.[٦٠٣]

* بەم جۆرە دەبینین کە گاورەکان کاتێك فرەژنی ڕێگە پێ دەدەن و هەندێك کاتی تر حەرامی دەکەن، ڕەنگە لەگەڵ ئەوەشدا لە شوێنێك ڕێگەی پێبدرێت و لە شوێنێکی تر

---

٦٠٢- لە ئەندەنوسیا مژدەدەرە گاورەکان هەوڵ دەدەن کە یاسای خێزانی مەسیحی بگۆڕن ، بۆ ئەوەی ڕێگە بدەن بە فرە ژنی بەبێ سنور ، ئەوەش لە پێناو بڵاوکردنەوەی گاورێتی دا ، هەروەها لە تایلاند تا ئێستایش فرە ژنی هەر پەیڕەو دەکرێت بەبێ سنور بەدیار چاوو بەرگوێی خەڵکی مژدەدەرەوە ، ئەمە (أ.د: رؤوف شلبي (خوالێی ڕازی بێت) لە کتێبەکەیدا: (الدعوة الأسلامية في عهد المدني ص /٣٢١ – ٣٢٣) باسی کردووە.

دەتوانێت بۆ ئەم باسە بگەڕێیتەوە بۆ (المرأة الأسلام) ی ، (الدكتور: علي عبدالواحيد واقي ص /١٦١) بە دەستکاری یەوە. ط (دار نهضة مصر ط٢ – و الأسلام و النصرانية في أواسط أفريقا. تأليف: نورجية ص/٩٢ ، ٩٨) بە دەستکاری یەوە ، کەلە (نظام الأسرة في الأسلام) ی دکتور (محمد سالم محسين) و دکتور: _شعبان محمد إسماعيل) ص/٣٦) بە دەستکاری یەوە وەرگیراوە. ط. مطبعة الجمهورية.

هەروەها بگەڕێرەوە بۆ (بين الأسلام و المسيحية) ی (أبي عبيدة الخزرجي) ص/٨٩ بە دەستکاری یەوە. تحقيق دكتور (محمد شامة ط. مكتبة وهبة ط٢ سنة ١٣٩٥ ه

٦٠٣- المرأة في الأسلام د. علي عبدالواحد وافي ص/١٦١

حەرام و قەدەغە بکرێت. یان دەستە و تاقمێك حەرامیان کردبێت و دەستەو تاقمێکی تر حەلاڵیان کردبێت. کە ئەمەیش دیاردەی پێچەوانەیە و جێگەی ڕا و بۆچونی جیاوازە لە شەریعەتەکەی ئەواندا.

* مامۆستا (عباس العقاد) دەڵێت: (شتێکی ڕێگر نییە لەبەردەم فرەژنیدا، نە لە تەورات نە لە ئینجیلدا، بەڵکو ڕێگە پێدراوە و وەك لە پێغەمبەراندا(علیهم السلام) دەرکەوتووە هەر لە سەردەمی ئیبراهیمەوە (علیه السلام) تا لەدایکبوونی حەزرەتی عیسا (علیه السلام)، لە ئینجیلەکاندا تەنها دەقێك نەهاتووە کە ئەو شتە حەرام بکات کە لە (العهد القدیم)دا ڕێگەی پێدراوە بۆ باوکان و پێغەمبەران و کەسانی تر بێجگە لەوان لە تایبەت و لە گشتی، ئەوەی کە لە ئینجیلەکاندا هاتووە ئاماژە دەکات بۆ ئەوەی کە لەهەموو حاڵەتەکاندا ڕێگە پێدراو بووە تەنها لەیەك حاڵەتدا نەبێت: کە حاڵەتی (الأسقف) بوو، کاتێك تاقەتی نەبوو بە ڕەبەنی بمێنێتەوە، بە تەنها یەك خێزان قەناعەتی کرد، بە کەمترین و سوکترین شەڕ. (القدیس أوغسطین) پێی جوانە کە پیاو لەگەڵ هاوسەرەکەیدا کەنیزەکی هەبێت کاتێك کە ژنەکەی نەزۆك بوو، و لەسەری چەسپا کە نەزۆکە، بەڵام ئەمە لەسەر ژن حەرامە کاتێك کە سەلما پیاوەکەی نەزۆکە، چونکە خێزان نابێت دوو گەورەی هەبێت، و کەنیسە دانی ناوە بەوەدا کە (عاهل شارلمان) چەند کوڕێکی هەبووە لە چەند خێزانێك.

(وستر مارك) لە –العالم....وتأریخ الزواج–دا دەڵێت: بێگومان فرەژنی بە دانپیانانی کەنیسە هەتا سەدەی حەڤدەهەم مایەوە، و لەزۆر جاردا دووبارە و چەندبارە بۆتەوە لەو حاڵەتانەدا کە کەنیسە و دەوڵەت ناتوانن سەرژمێری بکەن.[٦٠٤]

بەم جۆرە دەنگ و هاواری جیا جیا لەملاو لەولا بەرز دەکرێتەوە و هاوار دەکەن بە ڕێگەدان بە فرەژنی، لە نێوان ئەو کەسانەشدا کە بانگی بۆ دەکەن: (أساقفة کانتربری – گەورەی کەنیسەی پرۆتستانتی–) کە دەڵێت: (چارەسەرێك بۆ قەدەغەکردنی دەستدرێژی بۆ سەر ئەخلاق و داڕوخانی خێزانی نابینرێت لە ڕۆژئاوادا مەگەر بە

[٦٠٤]– حقائق الأسلام و أباطیل خصومه عباس العقاد ، الأعمال الکاملة ٥/١٧٠.

ڕێگەدان بە فرەژنی چەند خێزانێك، ئەوە ئەو شتەیە کە ئافرەت قەدەغە دەکات لە داڕوخانی نەفسی، ئەمەیش ڕێز و سەربەرزی بۆ دەگێڕێتەوە.).[605]

(جوستاف لوبون) لە کتێبی (حضارة العرب)دا دەڵێت: (بێگومان یاساو دەستوری فرەژنی یاساو دەستورێکی جوانە، ئاستی ئەخلاقی لەو کۆمەڵگا و نەتەوەیەدا بەرز دەکاتەوە کە تێیدایە، و بە هۆیەوە خێزان زیاتر پەیوەندی توند و تۆڵتر دەبێت، و ڕێز و کەرامەت دەبەخشێت بە ئافرەت کە لە ئەوروپادا نابینرێت... بێگومان یاسایەکە لە باشترین ڕێکخراوەوە دەرچووە کە باشترین یاسایە بە ئەدەب و ئەخلاقی نەتەوە و گەلەکان کە دەچێتە ناویان و دەیانپارێزێت و باشترین یاسایە کە جێی متمانە بێت بۆ خێزانەکان، و ڕێگایەکە کە ئافرەتی موسڵمان والێ دەکات حاڵی بەختەوەر بێت و کاروباری ژیانی باشتربێت و شیاوتر و لە پێشتر بێت بە ڕێز گرتن لە پیاوان زیاتر لە خوشك و هاوڕێ بێگانەکەی).[606]

بەم جۆرە و بەڕاستی فەیلەسوفی ئەڵمانی بەناوبانگ (شوبنهور) مەدح و پیاهەڵدانی یاسا و دەستوری فرەژنی کردووە، و بە توندی قەدەغەکردنی ڕەت دەکاتەوە ، هەروەها ئەو زەرەر و زیانانەش کە لێی دەکەوێتەوە.[607]

لە ساڵی (١٩٤٨)دا کۆنگرەیەك بۆ کاروباری لاوان و گەنجان لە (میونغ) بەسترا، داوای ئەوەی تێدا کرا کە ڕێگە بدرێت بە فرەژنی، و لە ساڵی (١٩٤٩)دا، خەڵکی شاری (بۆن)ی پایتەختی ئەڵمانیای یەکگرتوو داوایان کرد لە دەستەڵاتی ئەڵمانی کە ڕێگە بدات بە فرەژنی[608]

[605]- تعدد الزوجات لا تعدد المشيقات د. عبدالحليم عويس ص/٢١.

[606]- حضارة العرب ، جوستاف لوبون ص/٤٨٢-٤٨٤ ، بە دەستکاری یەوە.

[607]- تعدد الزوجات في الأسلام إبراهيم الجمل ص٨٩.

[608]- الأسلام و الرسول في نظر مصنفي الشرق و الغرب تأليف أ. أحمد بن حجر ص/٥٨.

## شەشەم: حیکمەت لە فرەژنی پێغەمبەری خوا

### پێشەکی:

لەو گومانانەی کە دوژمنانی ئیسلام دەربارەی کەسایەتی پێغەمبەر وورووژاندویانە، وایان لێکداوەتەوە کە ئەو کەسە بەڕێزە کەسێکی(شەهوانی) ئارەزوباز بووە، بەڵگەشیان لەسەر ئەم لێکدانەوەیە بریتی بووە لە فرەژنی پێغەمبەر لە ڕاستیدا فرەژنی پێغەمبەر لەبەر چەند حەیکمەتی بەرز و مەبەستی گەورە بوون، خۆ ئەگەر پێغەمبەر (کەسایەتییەکی لەو جۆرە بوایە کە ئەوان لێکی دەدەنەوە ئەوا بێگومان چەندین کچی سنگ گەورە و گەنج و جوانی بۆ خۆی هەڵدەبژارد، بەڵام بێجگە لە (عائیشە) (خوالێی ڕازی بێت) هیچ کچێکی مارە نەبڕیوە و نەهێناوە، کە ئەویشی لە کاتێکدا هێنا کە تەمەنی لە (٥٠) ساڵ تێپەڕی کردبوو، بێگومان پێغەمبەر بەهۆی خاتوو خەدیجەی کچی خویلید، دایکی ئیمانداراناوە، ئاسانکارییەکی زۆر لە ژیانیدا دروست بوو، کاتێك خاتوو خەدیجەی هێنا کە تەمەنی پیرۆزی خۆی (٢٥) ساڵ بوو، و تەمەنی خەدیجەیش(٤٠)ساڵ بوو، لەگەڵیدا مایەوە هەتا خەدیجە وەفاتی کرد کە تەمەنی (٦٥) ساڵی بوو.

پاشان پێغەمبەر خاتوو (سودة کچی زمعة) ی هێنا کە ئافرەتێکی پیر و بەتەمەن بوو، هیچ مەبەستی و حەزی لە جوانیدا نەبوو.

پاشان خاتوو (عائیشەی کچی ابی بکر الصدیق)ی هێنا، هەروەها دایکانی تری ئیمانداری هێنا.

تێبینی ئەوە بکە کە پێغەمبەر لەدوای (٥٠) ساڵی تەمەنییەوە فرەژنی ئەنجامداوە، لەمەیشدا بێگومان وەڵامی جوان بۆ ئەو کەسە دوژمنکارانە هەبوو لە لێکدانەوەکانیاندا.

* ئەوە زانراوە کە کەسانی (شهوانی) ئارەزووباز، بەدوای ئارەزووبازیدا دەگەڕێن و دەسوڕێنەوە، و ژیان لە پێناو لەزەت وەرگرتندا بەسەر دەبەن، و تینون و هەناسە

بڕکێیانە بە دوای ڕابواردن و لەزەتدا، لە هەموو ئەو شتانە دەخۆن کە بەتام و خۆش بێت، ئایا پێغەمبەری خوا بەم جۆرە بووە؟

* بێگومان و لە ڕاستیدا پێغەمبەری خوا  بە ژیانی دنیا نەوستی و سادە و نەرمی ژیاوە، بەڵکو زۆر جار بە برسێتی ماوەتەوە و هیچی دەست نەکەوتووە بیخوات. و ڕۆژو گرتن و نوێژی زۆر بووە.

## لێرەدا چەند فەرمودەیەك لەم بارەیەوە باسدەکەین:

١- لە (عبدالله ی کوڕی مسعود)ەوە(خوا لێی ڕازی بێت) فەرموویەتی: (پێغەمبەر لەسەر حەسیرێك نوست، شوێنەواری حەسیرەکە لە لاتەنیشتیدا دەرچو بوو، ئێمەیش وتمان: ئەی پێغەمبەری خوا خۆزگە ڕاخەرێکی نەرم و شلمان بۆ دروست دەکردیت). ئەویش فەرمووی: (من لەکویێ و دنیا لە کویێ؟) من لە دنیادا وەك سوارێك وام و دەڕۆم لە ژێر سێبەری درەختێکدا پشوویەك دەدەم پاشان دەڕۆم و بەجێی دەهێڵم).[٦٠٩]

٢- لە (عروة)ەوە ئەویش لە (عائیشە)وە (خوا لێی ڕازی بێت)کە دەیوت: بەخوا -ئەی خوشکەزام- ئێمە جای وا بووە مانگی یەك شەوەمان بینیوە، دیسان دیومانە، سیێ مانگی یەك شەوە لە دوو مانگدا، لە ماڵەکانی پێغەمبەردا  ئاگر نەکراوەتەوە، دەڵێت: وتم: جا باشە پوریێ بەچی دەژیان؟ وتی: بەخورما و ئاو، بەڵام ئەوە هەیە پێغەمبەر چەند دراوسیێ یەکی لە یاریدەدەران -الأنصاري- هەبوو ، کاسە دراوسێیان هەبوو ، شیریان دەنارد بۆ پێغەمبەر ئەویش بەشی ئێمەی لێدەدا.).[٦١٠]

٣-(أبو هريرة) (خوا لێی ڕازی بێت) جارێك لەلای کۆمەڵێك پیاوەوە ڕەت بوو، مەڕێکی بریانیان بۆ دانرابوو، خەریکی خواردنی بوون، خوڵکی (ابو هریرە)یان کرد، کە لەگەڵیاندا لە گۆشتی ئەو مەڕە برژاوە بخوات، بەڵام ڕازی نەبوو، و لێی نەخوارد، و

[٦٠٩]- رواه الترمزي في السنن و قال حديث حسن صحيح كتاب الزهد باب ٤٤. و رواه أحمد و إبن ماجة و الحاكم ، صحيح على شرط البخاري.

[٦١٠]- رواه البخاري كتاب الرقائق و رواه مسلم في كتاب الزهد.

فەرمووی: (پێغەمبەر هەتا لە دنیا دەرچوو تێری لە نانی جۆ نەخوارد، ئیتر چۆن دڵم بەرایی بدات، کە قاورمە و گۆشتی بریانی بخۆم.[٦١١]

٤- لە (نعمان ی کوڕی بشیر) ەوە (خوا لێی ڕازی بێت) وتی: (بەڕاستی من پێغەمبەرەکەتانم بینی، چەند دەنکە خورمایەکی دەست نەدەکەوت کە سکی پێ تێر بکات.).[٦١٢]

هەروەها لەم بارەیەوە فەرموودە و بەڵگەی تر زۆرن کە لێرەدا بوار نییە هەموویان بهێنین. ئەوەندە بەسە.

وەك ئەوەی هەڵبژاردنی پێغەمبەری خوا بۆ خێزانەکانی، گەورە ترین بەڵگەبێت لەسەر دنیا نەویستی پێغەمبەر و سادەیی و سوکی ژیانی، ئەوە پێغەمبەر بوو، دیکانی ئیماندار دەهاتن بۆلای و داوای نەفەقە و خەرجییان لێدەکرد و دەیان ویست ژیانی فراوان بێت -کاتێك وولات ڕزگارکرا و غەنیمە زۆر بوو- پێغەمبەر لە خێزانەکانی توڕە دەبوو، هەتا خۆی لێ بەدوور گرتن، تا دواتر ئایەت دابەزی کە هەڵبژاردنی تیا بوو، خێزانەکانی خستە بواری ئەوەی کە شتێك هەڵبژێرن، ئەوانیش خوای گەورە و پێغەمبەرەکەی و قیامەتیان هەڵبژارد.

خوای گەورە لە سوورەتی (الأحزاب)دا فەرموویەتی: ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ قُل لِّأَزْوَاجِكَ إِن كُنتُنَّ تُرِدْنَ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا وَزِينَتَهَا فَتَعَالَيْنَ أُمَتِّعْكُنَّ وَأُسَرِّحْكُنَّ سَرَاحاً جَمِيلاً (٢٨) وَإِن كُنتُنَّ تُرِدْنَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَالدَّارَ الْآخِرَةَ فَإِنَّ اللَّهَ أَعَدَّ لِلْمُحْسِنَاتِ مِنكُنَّ أَجْراً عَظِيماً﴾(الاحزاب ٢٨-٢٩).

واتە: (ئەی پێغەمبەر بە هاوسەرانت بڵێ: ئەگەر ئێوە تەنها ژیانی دنیا و ڕازاوەییەکەیتان دەوێت، وەرن با هەندێك شت و مەك و پارە و سامانتان پێ ببەخشم، و لەوەو دوایش بە جوانترین شێوە دەست بەردارتان ببم (٢٨) خۆ ئەگەر ئێوە خوا و پێغەمبەرەکەی و پاداشتی ڕۆژی قیامەتتان دەوێت، ئەوە دڵنیابن کە خوا بۆ

[٦١١] -رواه البخاري في كتاب الأطعمة.

[٦١٢] - رواه مسلم في كتاب الزهد.

چاکەکارانتان پاداشتی زۆر گەورە و بێ ئەندازەی ئامادە کردووە، پێغەمبەر  هەموو هاوسەرانی یەك یەك تاقی کردەوە، هەموویان خوا و پێغمبەر و پاداشتی قیامەتیان هەڵبژارد)).

(جابری کوڕی عبدالله) (خوا لێی ڕزی بێت) دەڵێت: (ابو بکر) (خوا لێی ڕازی بێت) هات مۆڵەتی هاتنەژورەوە لە پێغەمبەر  وەرگرێت، بینی کۆمەڵێك خەڵك لەبەر دەرگاکەیدا دانیشتوون و مۆڵەت بەکەسیان نەدراوە، مۆڵەتی دا بە (ابو بکر) (خوا لێی ڕازی بێت)، چووە ژورەوە، پاشان (عمر) (خوا لێی ڕازی بێت) هات، داوای مۆڵەتی کرد، مۆڵەتی بەویش دا، بینی وا پێغەمبەر  مات و بێدەنگ دانیشتووە، و خێزانەکانی بە دەوریدان، (عمر) ووتی: ئێستا شتێك دەڵێم پێغەمبەر  دەهێنمە پێکەنین، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا گەر چاوت لێی بوایە کچەکەی خارجە {کە خێزانی بووە} داوای خەرجی لێکردم، منیش بۆی هەستام و میرازێکی باشم کرد، پێغەمبەری خوا  دەستی کرد بە پێکەنین و فەرمووی: (ئەوەتا ئەوانیش بە چوار دەورمدا دانیشتوون و داوای خەرجیم لێ دەکەن) (ابو بکر) (خوا لێی ڕازی بێت) هەستا بۆ (عائیشە) ، (عمر) یش (خوا لێی ڕازی بێت) هەستا بۆ (حفصة) لێی بدات، هەردووکیان بەدەم تووڕە بوونەوە دەیانوت: داوای خەرجی لە پێغەمبەردەکەن کە نییەتی؟ ئەوانیش وتیان: سوێند بە خوا قەت داوای شتێکی لێ ناکەین کە نەیبێت، پاشان پێغەمبەر  بۆ ماوەی مانگێك یان (٢٩) ڕۆژ لێیان دوور کەوتەوە، پاشان ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە کە ئەمە واتاکەیەتی: ئەی پێغەمبەر بە هاوسەرەکانت بلێ: ئەگەر ئێوە تەنها ژیانی دنیا و ڕازاوەییەکەیتان دەوێت، وەرن با هەندێکتان پێ ببەخشم و پاشان بە شێوەیەکی جوان ئازادتان بکەم، خۆ ئەگەر خوا و پێغەمبەرەکەیی و بەهەشتی ئەو جیهانەتان مەبەستە، ئەوە خوای میهرەبان پاداشتی زۆر گەورە و بێ سنوری بۆ چاکە خوازەکانتان ئامادە کردووە)) ئینجا لە (عائیشە) وە دەستی پێکرد و فەرمووی: (عائیشە دەمەوێت شتێك بخەمە بەردەستت، حەز دەکەم پەلە نەکەیت تا پرسی دایك و باوك دەکەیت)، (عائیشە) (خوا لێی ڕازی بێت)وتی: ئەو شتە چییە ئەی پێغەمبەری خوا؟ پێغەمبەریش  ئایەتەکانی بۆ خوێندەوە، عائیشە (خوا

لێی ڕازی بێت) ووتی: (سەبارەت بە تۆ پرسی دایك و باوکم بکەم؟): نەخێر من خوا و پێغەمبەرەکەیی و ژیانی ئاخیرەت هەڵدەبژێرم، داوات لێدەکەم لەبارەی ئەم قسەیەی منەوە هەواڵ نەدەیت بە هیچ یەکێك لە ژنەکانی تر، فەرمووی: ((هەر ژنێکیان پرسیارم لێ بکات، هەواڵی دەدەمێ خوای مەزن منی نەناردووە بێزارکەری خەڵك بم یان ببمە هۆی ئەوە خەڵکی بێزاری دەربڕێت، بەڵکو منی ناردووە مامۆستا و ئاسانکار بم)). [٦١٣]

پێشەوا (إبن كثير) لە تەفسیرەکەیدا دەڵێت: {ئەمە فەرمانێك بوو لە خوای گەورەوە بۆ پێغەمبەرەکەی بەوەی کە خێزانەکانی سەر پشك بکات لە نێوان ئەوەی کە لێیان جیا ببێتەوە یان شتێکی تر کە ئەوان ژیانی دنیان دەست بکەوێت لەگەڵ جوانی و ڕازاوەییەکانیدا، و لەنێوان ئارامگرتن لەسەر ئەوەی کە پێغەمبەری خوا هەیەتی، کە حاڵی ناڕەحەت بوو، و لای خوای گەورەی پاداشتی گەورەیان دەبێت ئەگەر بە پێغەمبەر ڕازی بن، ئەوانیش (خوا لێیان ڕازی بێت) ڕازی بوون و، خوا و پێغەمبەر و پاداشتی قیامەتیان هەڵبژارد، ئینجا لەدوای ئەوە خوای گەورە خەیر و بەرەکەتی هەردوو دنیا و بەختەوەری پێکەوە بۆ کۆکردنەوە.}. [٦١٤]

* بەم شێوەیە و بێگومان فرەژنی پێغەمبەری خوا تایبەتمەندییەك بوو لە تایبەتمەندییەکانی، کە خوای گەورە بۆ ئەوی تایبەت کردبوو بەسەر هەموو ئوممەتەکەیدا، ئەوەیش لەبەر حیکمەت و مەبەستی زۆر و ڕێزدار، کە لێی دەدوێین.

## یەکەم: حیکمەتی فێرکردن و بڵاوکردنەوەی زانست

دایکانی ئیمانداران (خوا لێیان ڕازی بێت) دەورێکی گەورە و گرنگیان بووە لە بڵاوکردنەوەی زانستدا بە شێوەیەکی گشتی و گوێزراوە و ڕونکردنەوەی حوکم و بڕیارە تایبەتەکان بە ئافرەتان بەشێوەی تایبەت.

---

[٦١٣]- رواه مسلم في كتاب الطلاق.

[٦١٤]- تفسير القرآن العظيم لأبن كثير ٣/٤٨٠ بە دەستکاری یەوە.

هەروەها دایكانی ئیمانداران لایەنی گەورە و گرنگیان لە ژیان و گەورەیی پێغەمبەردادەرخستووە، كە بریتی بوون لە ئەخلاق و هەڵسوكەوتی جوانی پێغەمبەر لەماڵەكەیدا و هەوڵ دان و كۆشش كردنی لە پەرستشدا لە ڕۆژوی سوننەت و شەونوێژ و زیكر ویادی خوای گەورە، هەروەها پەرستشەكانی تریش، لە كتێبەكانی فەرموودەدا، فەرموودەی زۆر هاتوون، كە دایكانی ئیمانداران ڕیوایەتیان كردووە، لە پێش هەمووشیانەوە خاتوو عائیشە (خوا لێی ڕازی بێت). كە زانست و زیرەكی و شارەزایی لە زۆرێك لە هاوەڵان زۆرتر بووە، لە شتێكدا لێیان تێك بچوایە دەگەڕانەوە بۆلای عائیشە.

خاتوو عائیشە (خوا لێی ڕازی بێت) لە كتێبەكانی فەرموودەدا (٢٢١٠) فەرموودەی هەیە، لە هەردوو كتێبە (صحیح)ە كەدا، (٣١٦) فەرموودە، لەوانە (١٩٤)یان (متفق علیە)یە. و (٥٤) فەرموودەیش كە تەنها (بخاري) ڕیوایەتی كردوە و(٦٨) فەرموودەیش كە تەنها (مسلم) ڕیوایەتی كردووە.

هەروەها دایكانی ئیمانداران (أم سلمة) (خوا لێی ڕازی بێت) (٣٧٨) فەرموودەی هەیە، لە هەردوو (صحیح)ەكەدا (٢٩) فەرموودەی هەیە، كە (١٣)یان (متفق علیە)یە و (٣) فەرموودەیش كە تەنها (بوخاری) و (١٣) فەرموودەیش كە تەنها (مسلم) ڕیوایەتی كردووە.

* هەروەها دایكی ئیمانداران (حفصة) (خوا لێی ڕازی بێت) (٦٠) فەرموودەی هەیە، لە هەردوو (صحیح)ەكەدا (١٠) فەرموودەی هەیە، كە (٤)یان (متفق علیە)یە و (٦) فەرموودەكەی تریش (مسلم) ڕیوایەتی كردووە.

* هەروەها (أم حبیبة) كە (رملة ی كچی أبو سفیان)ە، (٦٥) فەرموودەی هەیە، كە (٢) فەرموودەیان (متفق علیە)یە، و (مسلم)یش (٦) فەرموودەی بە تەنها ڕیوایەت كردووە.

* هەروەها دایكی ئیمانداران (زینەبی كچی جحش) (خوا لێی ڕازی بێت)، (١١) فەرموودەی هەیە، لەوانە (٢) فەرموودەیان (متفق علیە)یە.

* هەروەها دایکی ئیمانداران (صفیة) (خوا لێی ڕازی بێت) (١٠) فەرموودەی هەیە، لەوانە یەکێکیان (متفق علیه)یە.

* هەروەها دایکی ئیمانداران (میمونة) (خوا لێی ڕازی بێت) (١٣) فەرموودەی هەیە' لەوانە کە (٧) فەرموودەیان لە هەردوو کتێبە (صحیح)ەکەدایە.

* هەروەها دایکی ئیمانداران (جویریة)ی کچی (الحارث) (خوا لێی ڕازی بێت) (٧) فەرموودەی هەیە، کە فەرموودەیەکیان (بوخاری) ڕیوایەتی کردووە.

* هەروەها دایکی ئیمانداران (سودة کچی زمعة) (خوا لێی ڕازی بێت) پێنج فەرموودەی هەیە، لەوانە: فەرمودەیەکیان (بوخاری) و فەرموودەیەکیشیان (مسلم) ڕیوایەتی کردووە.[٦١٥]

* لەمانەی کە باسمانکرد حیکمەتی زانست و فێرکردنمان بۆ دەردەکەوێت لە فرەژنی پێغەمبەری خوادا کە خێزانەکانی دەورێکی باڵاو بەرزیان هەبووە لە بڵاوکردنەوەی فەرمووده و سوننەتی پێغەمبەر و گەیاندنیان بە خەڵکی.

* خاوەنی (سبل الهدی و الرشاد) دەڵێت: هەندێك لە زانایان وتوویانە: نهێنی زیاتر لە چوار هاوسەر بۆ پێغەمبەری خوا ڕێگە پێدراوە، بۆ ئەوە بووە کە خوای گەورە ناوەڕۆك و نهێنی و شاراوەکانی شەریعەت و دیوی ئاشکرایشی فێری پێغەمبەر کردبوو، و ئەوەی کە شەرمی دەکرد باسی بکات و ئەوەیشی کە شەرمی نەدەکرد، پێغەمبەری خوا لە هەموو کەس زیاتر خاوەنی (حیاء) و شەرم و شکۆ بووە. خوای گەورە بڕیاری ئەوەی دا کە چەند خێزانێکی هەبێت تا شەرع و ئەو شتانەی لە پێغەمبەریان دەبینی و دەبیست نەقڵی بکەن و بیگەیەنن بە خەڵکی، کە پێغەمبەر شەرمی دەکرد باسی کات ئەگەر پیاوان لەو شوێنەدا ئامادەبوونایە، لەبەر ئەوە بوو کە شەریعەتەکە تەواو بکات، ژمارەی خێزانەکانی زۆر بوون. تا ئەو کارانە بگەیەنن کە پێغەمبەر شەرمی دەکرد لای پیاوان دەری ببڕێت، ئەوانەیش لە خەوی پێغەمبەر و مانەوەی و شتانی تر کە بەڵگە بوون لەسەر پێغەمبەرایەتی، و هەوڵ و کۆشش و تێکۆشانی لە پەرستش و لەو کارانەدا

---

[٦١٥] –سیر أعلام النبلاء للذهبي ٢/٢٨٣:١٣٩.

كە هەموو خاوەن ژیرییەك شایەتیان بۆ دەدا كە نەدەبوون تەنها بۆ پێغەمبەر نەبێت، ئەو كارانەیش تەنها خێزانەكانی دەیانبینی، ئەوانیش بەوە خەیرێكی گەورەیان دەست دەكەوت.[٦١٦]

* (عائیشە) (خوا لێی ڕازی بێت) فەرمووی: (أسماء) (خوا لێی ڕازی بێت)، بۆ چۆنێتی خۆشۆردنی بێنوێژی لە پێغەمبەری پرسی، ئەویش فەرمووی: (هەركامێكتان كە ویستی خۆی بشۆرێت، ئاو و مۆردەكەی ئامادە بكات و خۆی پاك بكاتەوە و، تاراتێكی جوان بگرێت، ئینجا دەست نوێژێكی جوان بگرێت، ئینجا ئاو بكات بەسەر سەریدا و دەستی تێ بخات و زۆر باش هەڵی گلۆفێت تا ئاو دەگاتە بن مووەكانی سەری، ئینجا ئاو بكات بەسەر هەموو جەستەیدا، ئینجا لۆكەیەكی میسكاوی یان گوڵی خوری میسكاوی، یان پەڕۆیەكی بۆن خۆش بهێنێت، خۆی پێ پاك بكاتەوە و تاراتی پێ بگرێت!)).

(اسماء)یش باش تێنەگەیشت، ووتی: چۆن چۆنی خۆی پێ پاك بكاتەوە و تاراتی پێ بگرێت؟ فەرمووی: (سوبحانەڵلا سەیرە چۆن تێناگەیت؟) خۆتی پێ پاك بكەرەوە و تاراتی پێ بگرە و تەواو، عائیشەیش (خوا لێی ڕازی بێت) فەرمووی: منیش (اسماء)م ڕاكێشا بۆلای خۆم و كە كچی شەكەل بوو، وپێم گوت: وەرە با تێت بگەیەنم، بیهێنە بە شوێنی خوێنەكەدا و، داینێ لە ناویدا، تا ناو گیانت بۆن ساردی لێ نەیەت و بۆنی خۆش بێت، لە گێڕانەوەكەیدا پێغەمبەر سێ جار فەرمووی: پارچەیەكی میسكاوی بهێنە و تاراتی پێ بگرە، ئیتر پێغەمبەر شەرم گرتی و ڕووی وەرگێڕا بەولاوە، عائیشە (خوا لێی ڕازی بێت) دەیگوت: ژنانی یاریدەدەران(انصار) ژنانی چاكن، ئافەرین بۆ خۆیان! شەرم و شكۆ ڕێگەی ئەوەی لێ نەدەگرتن كە بۆ خۆیان شارەزایی ئایین ببن!).[٦١٧]

(أم سلمة) (خوا لێی ڕازی بێت) فەرمووی: (أم سلیم) ی دایكی (انس ی كوڕی مالك) هات بۆ لای پێغەمبەر ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا!! خوا لە ووتنی قسەی حەق و ڕەوا شەرم ناكات، كەوابوو، ئایا ئەگەر ئافرەت شەیتانی بوو، خۆشۆردنی لەسەرە یان نا؟ پێغەمبەر

[٦١٦]- سبل الهدى و الرشاد في سيرة الخير العباد للأمام محمد بن يوسف الصالحي الشامي ١٠/٤٣٨.

[٦١٧] -رواه البخاري: كتاب الحيض.

فەرمووی: بەڵێ، ئەگەر ئاوی بێتەوە و هەستی پێ بکات،(أم سلمة)یش ڕووی خۆی داپۆشی و فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا بۆچی ئافرەتیش شەیتانی دەبێت؟ فەرمووی: هەژارۆکە! ئەی چۆن؟ ئەی ئەگەر شەیتانی نابێت و ئاوی نایەتەوە بە چ شێوەیەك منداڵەکەی لێی دەچێت؟). [٦١٨]

## دووەم: حیکمەتی شەرعی و یاسایی

یەکێکی تر لە حیکمەتە جوانەکانی فرەژنی پێغەمبەر کە لە هاوسەرداریدا بۆمان دەردەکەوێت، ئەویش لە خاتوو زەینەبی کچی جەحشدا بەدیدەکرێت، بۆ بەتاڵ کردنەوەی ئەو خوو عادەتە بوو کە خەڵکی لەسەری ڕاهاتبوون کە (تبني) بەکوڕ کردن بوو، ئەو کەسەی ژنی تەلاقدراوی بە(تبني)کراوەکەی خۆی بهێنایە، حەرام بوو لەسەری.

ئەویش عادەت و پیشەیەك بوو کە لەناو عەرەبدا ڕەگی داکوتابوو لەپێش هاتنی ئیسلامدا، بە جۆرێك کە پیاو کوڕی کەسێکی تری دەکردە کوڕی خۆی، و پێی دەوت – تۆ کوڕی منیت وەرەسەت لێ دەبەم و تۆش وەرەسە لەمن دەبەیت– ئەو مافەی کە کوڕی ڕاستی (دایکی و باوکی) هەیبو، ئەویش هەیبو بە سەریدا جێ بە جێ دەکرا، لە مەسەلەکانی رەرەسە و میراتی و شوکردن و ژنهێنان و شتی تریش.

بێگومان ئەو عورف و عادەتە کە لەناو کۆمەڵگادا بڵاو بویەوە و تەشەنەی سەند، ئەوا بەتاڵ کردنەوە و لابرنی کارێکی قورس و گران دەبێت، مەگەر کەسانی هیمەت بەرز بتوانن ڕەتی بکەنەوە کە بەهێز و دامەزراو بن و خاوەنی عەقیدەی پاك و بەهێزبن، و خوای گەورە ویستی وابوو کە پێغەمبەر بەرگەی ئەوە بگرێت کە ئەو کارە بەتاڵ بکاتەوە و شوێنەواری لەناو کۆمەڵگادا نەهێڵت، و هاوسەرداری لەگەڵ خاتوو (زەینەبی کچی جحش) بکات دوای ئەوەی کە زەید تەلاقی دابوو، وەك باسمان کرد پێغەمبەر (زەید)ی

---

[٦١٨] –رواه البخاري في كتاب العلم. باب الحياء في العلم.

کردبوویە کوڕی خۆی، پێش ئەوەی وەحی دەربارەی ئەمە دابەزێت و (تبني) بە کوڕکراو حەرام بکات.

لەمەیشدا وانە و ڕوونکردنەوەی کرداری گەورەی تیابوو کە شوێنەواری بەرزیان هەبوو لە بەتاڵ کردنەوەی ئەو مەسەلەیەدا.

## سێ یەم: حیکمەتی کۆمەڵایەتی

کۆمەڵگای موسڵمانان کۆمەڵگایەکی بەهێز و پێکەوە بەستراوە، کە سۆز و خۆشەویستی و پێکەوە ژیان و هاوکاری و دەستەبەری، پێکەوە کۆیان دەکاتەوە، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَأَلَّفَ بَيْنَ قُلُوبِهِمْ لَوْ أَنفَقْتَ مَا فِي الْأَرْضِ جَمِيعًا مَّا أَلَّفْتَ بَيْنَ قُلُوبِهِمْ وَلَٰكِنَّ اللَّهَ أَلَّفَ بَيْنَهُمْ إِنَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾(الأنفال:٦٣).

واتە: (دڵەکانیشیانی بەست بەیەکەوە، ئەگەر هەرچی دارایی زەوی هەیە، هەرهەموویت خەرج بکردایە (ئەی محمد) تا دڵەکانیانت پەیوەند بکردایە بەیەکەوە، ئەوە نەت دەتوانی ئەو دڵانە پەیوەست بکەیت بەیەکەوە، (بەڵام خوا بەهۆی ئاینی ئیسلامەوە) خۆشی و یەکێتی و برایەتی لە نێوانیاندا بەرپاکرد، چونکە بەڕاستی ئەو زاتە باڵا دەست و دانایە).

بەڕاستی پێغەمبەری خوا زۆر سوور بوو لەسەر ئەوەی کە پەیوەندی و پێکەوە ژیان لە نێوان دڵەکاندا پێکەوە ببەستێت بە شێوازە جۆراوجۆرەکان، لەوانەیش تێکەڵاوی و ژن هێنان و شوکردن لەناو یەکتریدا، کە یەکێکە لە هۆکارەکانی پێکەوە ژیان و خۆشەویستی.

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَاجًا لِّتَسْكُنُوا إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ﴾(الروم:٢١).

واتە: (یەکێك لە نیشانە و بەڵگەکانی تری خوای گەورە ئەوەیە: کە هەر لە خۆتان هاوسەری بۆ دروست کردون بۆ ئەوەی ئارام بگرن لەلایدا و لە نێوانتاندا خۆشەویستی و سۆز و میهرەبانی فەراهەم هێناوە، بەڕاستی ئالەو دیاردانەدا نیشانە و بەڵگە هەیە بۆ کەسانێك بیردەکەنەوە و تێدەفکرن).

* پێغەمبەری خوا خاتوو عائیشەی (خوا لێی ڕازی بێت) بە هاوسەری بۆ خۆی هێنا، لەم هاوسەرداریيەدا زیاتر پەیوەندییەکان تووند بوون، و خۆشەویستی لە نێوان پێغەبەر و (أبوبکر الصدیق)دا قوڵ بوویەوە.

لە عائیشەوە (خوا لێی ڕازی بێت) دەڵێت: پێغەمبەر فەرمووی: (سێ جار تۆم نیشاندرا لە خەودا، فریشتەیەك تۆی دەهێنا بۆلام لەناو پارچەیەك ئاوریشمدا دەیوت: ئەمە خێزانەکەتە، لە دەم و چاوت وورد دەبومەوە، تۆ ئەویت، منیش دەموت: ئەگەر ئەم خەوە لە خواوە بێت ، دەیهێنێتە دی).[٦١٩]

* هەروەها هاوسەرداری پێغەمبەر لەگەڵ (حفصة ی کچی عمری کوڕی خطاب) (خوا لێی ڕازی بێت) ڕێز و چاکە و متمانە و بەهێزکردن و قوڵ کردنەوەی پەیوەندییەکان بوو بۆ پێغەمبەر.[٦٢٠]

* هەر بەم جۆرە و بێگومان پێغەمبەری خوا خاتوو (سودة ی کچی زمعة) ی هێنا، کە لە ئافرەتە کۆچ کردووەکان بوو، موسڵمان بوو و لەگەڵ هاوسەرەکەیدا –السکران بن عمر و الأنصاري– بۆ حەبەشە کۆچیان کرد.

مێردەکەی لەدوای گەڕانەوەی لە کۆچی دووەم مرد، ئینجا تەنها مایەوە و پشتیوان و هاوکار و یارمەتیدەری نەبوو، خۆ ئەگەر دوای مردنی مێردەکەی بگەڕایەتەوە بۆ ناو کەس و کارەکەی بێگومان سزایان دەدا بەتوندی تا تووشی فیتنەی بکەن لە دینەکەیدا. ئینجا پێغەمبەریش دەست پێشکەری کرد بۆ خواستن و مارەکردنی لەبەر سۆز و بەزەیی بۆی و تا پارێزەر بێت و هەروەها ڕێزگرتنێکیش بوو لەبەر ڕاستی ئیمان و دڵسۆزی و قوربانیدانی.

---

[٦١٩]- رواه البخاري في كتاب النكاح و مسلم في فضائل الصحابة.

[٦٢٠]- حديث زواج الرسول (صلى الله علية وسلم) بحفصة بعد أن عرضها عمر عليه ، رواه البخاري عن عبدالله بن عمر ، كتاب النكاح.

* بێگومان لە هاوسەرداری کردنی پێغەمبەر لەگەڵیدا، شوێنەوارێکی جوان و پەسەندی هەبوو لە دەروونی کەسانی قەومەکەیدا، (سودة) (خوا لێی ڕازی بێت) ئافرەتێکی خاوەن جوانی نەبوو، بەڵکو پیر و بەتەمەن بوو، لەمەیشدا ڕەتدانەوە هەبوو بۆ دوژمنانی ئیسلام، ئەوانەی کە وایان لێك دەدایەوە کە هاوسەری پێغەمبەر لەگەڵ دایکانی ئیمانداران لە پێناو تێرکردنی ئارەزوودا بووە، خۆ ئەگەر ئەوە بەو جۆرە بوایە، ئیتر پێغەمبەر چۆن دەچوو (سودة) ی دایکی ئیمانداران بهێنێت کە ئافرەتێکی خاوەن جوانی نەبوو، بەڵکو پیر بوو؟[٦٢١]

* هەروەها پێغەمبەر (أم سلمة)یشی هێنا. ئەمیش لە ئافرەتانی کۆچ کردوو بوو، باوەڕی هێنا و لەگەڵ هاوسەرەکەیدا (عبدالله ی کوڕی عبدالاسد ) کۆچی کرد، کەلە جەنگی (ئوحود)دا شەهید بوو.

ئینجا (أم سلمة) لەگەڵ چوار منداڵیدا مانەوە، پێغەمبەریش لەبەر سۆز و شەفەقەتی بەخۆی و منداڵە بێ باوکەکانی، هەروەها ڕێزێکیش بوو بۆ (أم سلمة) (خوا لێی ڕازی بێت).

(أم سلمة) (خوا لێی ڕازی بێت) دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەر بوو دەیفەرموو: ((هەر کەسێك تووشی بەڵایەك بێت و بڵێت: ﴿إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ﴾ (ئێمە هەر خوا خاوەنمانەو هەر بۆ لای ئەویش دەگەڕێینەوە) خوایە پاداشتم بدەرەوە لەسەر ئەو بەڵایەی توشم هاتووە و چاکتر لەوەی لێت سەندوم پێم ببەخشە، خوا پاداشتی چاکتری دەداتەوە و چاکتری پێ دەبەخشێت) (أم سلمة) دەڵێت: کاتێك (أبو سلمة) وەفاتی کرد، من ئەوەم وت کە پێغەمبەر فەرمانی پێدام، ئیتر ئەوەبوو خوای گەورە هاوسەری لەو باشتری پێ بەخشیم، کە پێغەمبەری خوایە.[٦٢٢]

(إبن مسعود) لە (الطبقات) بە سەنەدێك لە (أم سلمة)ەوە (خوا لێی ڕازی بێت) گێڕاویەتیەوە، کە (أبا سلمة) پێش مردنی خۆی دوعای بۆ (أم سلمة) کرد ووتی: خوایە

---

[٦٢١]– زوجات النبي (صلى الله عليه وسلم) الطاهرات و حكمة تعددهن–محمد محمود الصواف ص/٢٥: ٢٧.

[٦٢٢]– صحيح مسلم بشرح النووي /كتاب الجنائز.

**دوای من پیاوێکی لەمن چاکتر بە (أم سلمة) ببەخشیت کە خەفەتباری نەکات و ئازاری نەدات، کاتێك (أبو سلمة) مرد، وتم: ئایا دەبێت ئەمە کێ بێت کە لە (أبی سلمة) چاکتر بێت؟.. ئینجا (ابن سعد) وتارەکەی پێغەمبەری بۆ (أم سلمه) بیرکەوتەوە.[٦٢٣]**

*** هەروەها پێغەمبەر (أم حبیبة)ی هێنا ، کە (رملة ی کچی أبی سفیان) بوو، کە لە ئافرەتە کۆچ کردووەکان بوو.**

**موسڵمان بوو، و لەگەڵ مێردەکەیدا (عبدالله ی کوڕی جحش) کۆچیان کرد بۆ حەبەشە بەڵام مێردەکەی لە کاروباری دینەکەیدا تووشی فیتنە هات و هەڵگەڕایەوە و چویە ناو دینی گاورانەوە و بوو بە گاور. بەڵام (أم حبیبة) هەوڵی دا کە بیگێڕێتەوە سەر ڕێگەی ڕاست و ڕێنمایی، بەڵام پشتی لە حەق و ڕاستی هەڵکرد و، بێ باوەڕی بەسەر ئیماندا هەڵبژارد. ئینجا (أم حبیبة)ی لە نێوان پاشگەز بوونەوە و تەڵاقدا سەر پشك کرد، ئەویش تەڵاقی هەڵبژارد، پاشان تەڵاقی دا، ئینجا (أم حبیبة) بە تەنها مایەوە و سەری سوڕ دەماو نەیدەزانی چی بکات، ئایا بگەڕێتەوە ناو قەومەکەی و بکەوێتە ژێر ئازاردان و پیاکێشانی ئەوانەوە و قسەی پێ بڵێن؟ یان لە ماڵی غەریبی و ناڕەحەتی و فیتنەدا بمێنێتەوە؟ بەڕاستی کارو فەرمانەکانی خۆی دایە دەست خوای گەورە، خوای گەورەیش باشترین دۆست و پشتیوانە:** ﴿وَمَن يَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ فَهُوَ حَسْبُهُ إِنَّ اللَّهَ بَالِغُ أَمْرِهِ قَدْ جَعَلَ اللَّهُ لِكُلِّ شَيْءٍ قَدْرًا﴾ (الطلاق:٣).

**واتە: (جا ئەوەی پشت بە خوا ببەستێت، ئەو زاتەی بەسە، بۆ ئەوەی یاریدەدەری بێت، چونکە بەڕاستی خوا کارو فەرمانی خۆی بەجێ دەگەیەنێت، بێگومان خوا بۆ هەموو شتێك نەخشەیەکی دیاری کراوی بڕیارداوە، (کە دەبێت پەیڕەوی بکرێت).**

**پێغەمبەر بە حاڵی زانی و دڵی پێی سوتا ویستی لەسەر ئەو ئارامگرتن و دامەزراوییەی پاداشتی بداتەوە، داوایەکی نارد بۆ (النجاشي) پاشای حەبەشە، کردی بە وەکیل لە**

---

[٦٢٣]- الطبقات الکبری لأبن سعد ٨/٨٨.

کاروباری هاوسەرداری (أم حبيبة) دا، ئینجا (نجاشي)مارەیی و جیازی بۆ ئامادەکرد لەلایەن خۆیەوە و لەساڵی کۆچیدا لەگەڵ (شرحبيلی کوڕی حسنة )دا ناردییەوە. [٦٢٤]

بێگومان کاتێك پێغەمبەر بوویە هاوسەری (أم حبيبة) ڕوداوێکی خۆش و شوێنەوارێکی جوانی بوو لە دەرونی (أبو سفيان)دا، کاتێك هەواڵی ئەم هاوسەرداریيە موبارەکەی پێ گەیشت ووتی: بە ڕاستی ئەمە مێردێکی باش و ڕێزدارە و ڕەت ناکرێتەوە. [٦٢٥]

* هەروەها پێغەمبەری خوا خاتوو (زينب)ی کچی (خزيمة)ی هێنا، کە مێردەکەی (عبيدةی کوڕی حارث ی کوڕی عبدالمطلب) لە جەنگی (بەدر)دا شەهید بوو.

(زينب) کاری برین پێچی و تیماری بریندارەکان بوو، و خزمەتگوزاری سەرەتایی پێشکەش دەکردن، بەڵام شەهید بوونی مێردەکەی لە کارەکەی خۆی سەرقاڵی نەکرد کە دەست لە کارەکەی هەڵگرێت هەتا خوای گەورە لە جەنگی بەدردا سەرکەوتنی بۆ باوەڕداران نوسی و بڕیاردا، کاتێك پێغەمبەری خوا خواستی تەمەنی (٦٠) ساڵ بوو. بەڵام زۆر لە ماڵی پێغەمبەردا نەمایەوە پاش ماوەیەکی کەم کە پێغەمبەر خواستی، وەفاتی کرد. [٦٢٦]

## چوارەم: حیکمەتی سیاسی

پێغەمبەری خوا هەوڵی دا بۆ ڕاکێشان و کەمەند کێش کردنی دڵی هۆز و قەبیلە عەرەبەکان، بۆ شکاندنی ڕێگر و بەربەستەکان و دەست خستنی سۆز و عاتیفەیان و کۆکردنەوەی بەرودوایان و کردنەوەی ئاسۆیەکی نوێ بۆ بانگەوازی ئیسلامی.

بێگومان ئەم حیکمەتە جوان و ڕوونە سیاسی و حەکیمە لە ژیانی پێغەمبەری خوادا لە خواستنی (جويرية)ی کچی (الحارث)ی گەورەی (بني المصطلق) ڕەنگی دایەوە و دەرکەوت، کە (جويرية) کەوتە بەشی (ثابت ی کوڕی قيس ی کوڕی شماس) یان

---

٦٢٤ – المواهب اللدنية (٢٠٥/١) ، و سير الأعلام النبلاء (٢٢١/٢) ، إنسان العيون (٢٢٢/٣) ، والطبقات (٩٧/٨).

٦٢٥ –الطبقات (٩٩/٨) تأريخ الطبري (٩٠/٣) الأستعاب (١٨٤٥/٤).

٦٢٦ –سيرة إبن هاشم ٢٩٧/٤ و تأريخ الطبري ١٧٩/٣ السمط الثمين /١١٢.

(برازایەکی) خۆی، کە کردی بە (مکاتبة) لەسەر خۆی واتە: (بەندەیەك خۆی لە گەورەکەی بکڕێتەوە، تا لە ئیش و کاری خۆی کرێی نرخەکەی خۆیی بداتێ)، ئینجا چوو بۆلای پێغەمبەری خوا تا پرسیاری ئەم کارەی لیٚ بکات، چویە لای پێغەمبەر و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، من (جویریة ی کچی حارث)م، بێگومان من کارو بێکارێکم هەیە و لای تۆ شاراوە نییە.

من کەوتومەتە بەشی (ثابت ی کوڕی قیس ی کوڕی شماس) ەوە ، ومن بووم بە (مکاتبة) لەسەر خۆم، هاتووم بۆلای تۆ تاپرسیاری ئەم کارەم لەتۆ بکەم، پێغەمبەری خوا پێی ووت: ئایا تۆ شتێکی ترت دەوێت کە لەوە باشتربێت بۆت؟ ئەویش وتی: ئەو شتە چییە ئەی پێغەمبەری خوا فەرمووی: من (مکاتبة)کەت بۆ دەدەم و دەتکەم بە هاوسەری خۆم، ئەویش وتی: بەڵیٚ باشە ڕازیم ئەی پێغەمبەری خوا پێغەمبەریش فەرمووی: ئەوا بەڕاستی منیش کردم، ئینجا خەڵکی لەناو یەکتریدا بیستیان کە پێغەمبەر بەڕاستی (جویریة)ی خواستووە، ئینجا وتیان: کەسە تێکەڵەکانی پێغەمبەر داوای کڕینەوەی بەندە دەکەن؟ ئادەی هەرچی لەژێر دەستی ئێوەدایە بۆیان ئازاد بکەن.

خاتوو (عائیشە) (خوا لێی ڕازی بێت) دەڵێت: هیچ ئافرەتێکمان نەبینی کە بەرەکەتی لەو گەورەتر و زۆرتر بێت لەسەر قەومەکەی، بەهۆی ئەوەوە سەد کەسی لە ماڵەکان لە (بني المصطلق) ئازاد کران.[٦٢٧]

* هەروەها لەوانی تریش کە پێغەمبەر (صفیة)ی کچی (حیي)ی کوڕی (أخطب)ی خواست، کە کەوتبویە بەشی هەندێك لە موسڵمانەکانەوە دوای جەنگی (خیبر)، هەندێك لە هاوەڵان ووتیان: بێگومان ئەمە ناگونجێت و چاك نابێت مەگەر بۆ پێغەمبەری خوا، ئینجا کارەکەیان لای پێغەمبەر پێشنیار کرد، ئەویش (صفیة)ی بانگکرد و سەرپشکی کرد و لە نێوان دووکار و فەرماندا: یان ئەوەتا ئازادی دەکات و دەیخوازێت و دەبێتە هاوسەری، یان ئەوەتا ئازادی دەکات و دەچێتەوە بۆلای کەس و کاری و پەیوەندیان

---

[٦٢٧] –ئەم چیرۆکە لە (مسند) ی (امام احمد) دا هاتووە کە عائیشە گێڕاویەتیەوە ، ٢٧٧/٦ ، و (سنن ابو داود) کتاب العتق ٢٢/٤ و سندها صحیح.

پێوە دەکات؟ ئینجا (صفية)یش، ئازادبوون و بوون بە خێزانی پێغەمبەری هەڵبژارد، ئەمەیش لەبەرئەوەی رێز و قەدر و شکۆی پێغەمبەری بۆ دەرکەوت، هەروەها بۆی دەرکەوت کە پێغەمبەر چەند گەورە و پایەدار و کەسێکی مامەڵەجوانە، بەڕاستی خوای گەورە بە ئیسلام رێزی لەم ئافرەتە گرت.[٦٢٨] ((پێغەمبەر بەم هاوسەرداریەوە گەیشتەوە گەیشتەوە بە قەومەکەی، ئەو کەسانەی کە بۆ ماوەیەکی دوورو درێژی ژیانیان بەهۆی کێشەو ناکۆکییەوە لە پێغەمبەر بە دوور بوون.[٦٢٩]

* لەم باسانەی پێشەوە بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە لەکاری هاوسەرداری پێغەمبەردا حیکمەتی بەرز و بڕیاری بەهێز و گرنگ هەبوون.

---

[٦٢٨] - چیرۆکی هاوسەریی پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵ (جويرية) دا لە (صحيح البخاري) دا هاتووە کە (أنس) لە فەرموودەی (٩٤٧) (كتاب الخوف باب التكبر) دا هێناویێتی. هەروەها لە (صحيح مسلم) (كتاب النكاح) دا هاتووە

[٦٢٩]– زوجات النبي (ﷺ) الطاهرات و حكمة تعددهن محمد محمود الصواف ص/٧٦.

## باسی سێیەم:

## ئەوەی دەربارەی دایکانی ئیمانداران لە سوورەتی (التحریم)دا دابەزیوە:

### لەم باسەدا ئەم تەوەرانە هەیە:

یەکەم: ئایەتەکان کە لەم بارەیەوە دەدوێن.

دووەم: هۆکاری دابەزینی ئایەتە پیرۆزەکان و جێگیرکردنیان.

سێیەم: تەفسیری شیکاری ئایەتەکان.

چوارەم: مانای گشتی.

پێنجەم: سوود و وانە گرنگەکانی ناو ئایەتەکان.

### یەکەم: ئایەتەکان کەلەم بارەیەوە دەدوێن

خوای گەورە لە سوورەتی (التحریم)دا ، فەرموویەتی: ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ لِمَ تُحَرِّمُ مَا أَحَلَّ اللَّهُ لَكَ تَبْتَغِي مَرْضَاتَ أَزْوَاجِكَ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ (١) قَدْ فَرَضَ اللَّهُ لَكُمْ تَحِلَّةَ أَيْمَانِكُمْ وَاللَّهُ مَوْلَاكُمْ وَهُوَ الْعَلِيمُ الْحَكِيمُ (٢) وَإِذْ أَسَرَّ النَّبِيُّ إِلَىٰ بَعْضِ أَزْوَاجِهِ حَدِيثًا فَلَمَّا نَبَّأَتْ بِهِ وَأَظْهَرَهُ اللَّهُ عَلَيْهِ عَرَّفَ بَعْضَهُ وَأَعْرَضَ عَن بَعْضٍ فَلَمَّا نَبَّأَهَا بِهِ قَالَتْ مَنْ أَنبَأَكَ هَٰذَا قَالَ نَبَّأَنِيَ الْعَلِيمُ الْخَبِيرُ (٣) إِن تَتُوبَا إِلَى اللَّهِ فَقَدْ صَغَتْ قُلُوبُكُمَا وَإِن تَظَاهَرَا عَلَيْهِ فَإِنَّ اللَّهَ هُوَ مَوْلَاهُ وَجِبْرِيلُ وَصَالِحُ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمَلَائِكَةُ بَعْدَ ذَٰلِكَ ظَهِيرٌ (٤) عَسَىٰ رَبُّهُ إِن طَلَّقَكُنَّ أَن يُبْدِلَهُ أَزْوَاجًا خَيْرًا مِّنكُنَّ مُسْلِمَاتٍ مُّؤْمِنَاتٍ قَانِتَاتٍ تَائِبَاتٍ عَابِدَاتٍ سَائِحَاتٍ ثَيِّبَاتٍ وَأَبْكَارًا﴾(التحریم:١-٥).

## دووەم: هۆکاری دابەزینی ئایەتەکان

ئەم ئایەتە پیرۆزانەی کەلەسەرەتای سوورەتی (التحریم) دان، دوای ئەو ڕووداوە دابەزی کە لە ماڵی پێغەمبەردا ڕوویدا، کە ئەویش پێغەمبەر ﷺ هەندێك شتی لەسەر خۆی حەرام کردبوو کە خوای گەورە بۆی حەڵاڵ کرد، کە پێغەمبەریش ئەو قسە و شتە نهێنییەی لای یەکێك لە خێزانەکانی درکاند، کە (حفصة)ی دایکی ئیمانداران بوو، ئەویش هەواڵی دا بە عائیشە، ئینجا چەند ئایەتێکی ڕوون و پیرۆز لە قورئانی پیرۆز دابەزی کە گلەیی تیابوو بۆ پێغەمبەری خوا و هەروەها ئاگادارکردنەوەیش بوو بۆ دایکانی ئیمانداران.

- لێرەدا باسی هۆکاری دابەزینی ئایەتەکان دەکەین:

١- هەردوو پێشەوایان (البخاري) و (مسلم) لە (صحیح)ەکانیادا لە عائیشەوە (خوا لێی ڕازی بێت) گێڕاویانەتەوە، پێغەمبەر ﷺ هەر جارێك لای (زەینەبی کچی جحش)دەمایەوە، هەنگوینی لەلا دەخوارد، (عائیشە) (خوا لێی ڕازی بێت) دەڵێت: لەگەڵ _حفصة) دا ڕێککەوتم کە پێغەمبەر ﷺ تەشریفی هێنا بۆلای هەردووکمان، پێی بڵێین: بۆنی (مغافیر)ت لێ دێت، -(مغافیر) شیلەیەکی شیریی بۆن ناخۆشە- ئەرێ (مغافیر)ت خواردووە؟ ئەوە بوو پێغەمبەر ﷺ تەشریفی برد بۆلای یەکێکیان و ئەوەی پێ ووت: ئەویش فەرمووی: (نەخێر بەڵکو لای (زینب کچی جحش) هەنگوینم خواردووە، ئیدی جارێکی تر نایخۆم).

ئایەت هاتە خوارەوە: ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ لِمَ تُحَرِّمُ مَا أَحَلَّ اللَّهُ لَكَ...﴾. هەتا ئایەتی: ﴿إِن تَتُوبَا إِلَى اللَّهِ﴾ کە ڕووبەڕووی (عائیشە) و (حفصة)یە، هەروەها ئایەتی: ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ لِمَ تُحَرِّمُ مَا أَحَلَّ اللَّهُ لَكَ تَبْتَغِي مَرْضَاتَ أَزْوَاجِكَ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ (١) قَدْ فَرَضَ اللَّهُ لَكُمْ تَحِلَّةَ أَيْمَانِكُمْ وَاللَّهُ مَوْلَاكُمْ وَهُوَ الْعَلِيمُ الْحَكِيمُ (٢) وَإِذْ أَسَرَّ النَّبِيُّ إِلَى بَعْضِ أَزْوَاجِهِ حَدِيثًا فَلَمَّا نَبَّأَتْ بِهِ وَأَظْهَرَهُ اللَّهُ عَلَيْهِ عَرَّفَ بَعْضَهُ وَأَعْرَضَ عَن بَعْضٍ فَلَمَّا نَبَّأَهَا بِهِ قَالَتْ مَنْ أَنبَأَكَ هَذَا قَالَ نَبَّأَنِيَ الْعَلِيمُ الْخَبِيرُ﴾(التحریم:١-٣).

سەبارەت بە خواردنی هەنگوینەکەیە، کە ئەمە واتاکەیەتی: (ئەی پێغەمبەر بۆچی تۆ ئەو شتانە لە خۆت حەرام دەکەیت کە خوا بۆی حەڵاڵ کردویت، دەتەوێت ڕەزامەندی هاوسەرانت بەدەست بهێنیت؟ لە کاتێکدا خوا لێخۆشبوو میهرەبانە، بێگومان ئەو خوایە مۆڵەتی داوە کەفارەتی سوێندەکانتان بدەن، هەر خوایش پشتیوانتانە هەر ئەویش زاناو دانایە، کاتێك پێغەمبەر باسێکی گێڕایەوە بۆ یەکێك لە هاوسەرانی و هەواڵەکەی پێدا و خوایش هەموو شتێکی بۆ ڕوون کردەوە، هەندێکی باس کرد و لە هەندێکی خۆی بوارد، جا کاتێك بۆ ئەو هاوسەرەی باسکرد، ئەویش پرسی: ئەی پێغەمبەر کێ ئەم هەواڵەی پێدایت؟ ئەویش فەرمووی: ئەو زاتەی کە هەمیشە زانا و ئاگادارە ئەو هەواڵی پێدام.[٦٢٠]

٢- لە (انس ی کوڕی مالك)ەوە (خوا لێی ڕازی بێت)، پێغەمبەری خوا کەنیزەکێکی هەبوو لای دەمایەوە، (عائیشە) و (حفصة) یش وازیان لێ نەهێنا تا پێغەمبەریان وا لێ کرد کە لەسەر خۆی حەرامی کرد، ئینجا خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ لِمَ تُحَرِّمُ مَا أَحَلَّ اللَّهُ لَكَ تَبْتَغِي مَرْضَاتَ أَزْوَاجِكَ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَحِيمٌ﴾.[٦٢١]

٣- (إبن كثير) لە تەفسیرەکەیدا بە ڕیوایەتێك لە (الهيثم بن كليب) لە (مسند)ەکەیدا بە سەنەدێك لە (إبن عمر)ەوە (خوا لێی ڕازی بێت) هێناویێتی دەڵێت: پێغەمبەر بە (حفصة)ی ووت: هەواڵ نەدەیت بە هیچ کەس کە دایکی ئیبراهیم لەسەر من حەرام بووە، ئیتر پێغەمبەر نزیکی نەدەکەوت، هەتا (حفصة) هەواڵی دا بە (عائیشە) ئینجا خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿قَدْ فَرَضَ اللَّهُ لَكُمْ تَحِلَّةَ أَيْمَانِكُمْ﴾.[٦٣٢]

لەم باسانەی پێشەوە بۆمان دەردەکەوێت کە:

---

٦٢٠- رواه البخاري في كتاب الطلاق و مسلم أيضاً في كتاب الطلاق.

٦٣١- رواه النسائي في السنن كتاب الطلاق ١٥١/٦ ، و أخرجه أيضاً في السنن الكبرى في/عشرة النساء باب الغيرة و رجالهُ ثقات حديث/٣٩٥٩). و رواه الحاكم في المستدرك كتاب التفسير و قال هذا حديثٌ صحيح على شرط مسلم.

٦٣٢- تفسير القرآن العظيم لأبن كثير ٣٨٦/٤ و يراجع الأحاديث المختارة أو المستخرج من الأحاديث المختارة مما لم يخرجه البخاري و مسلم في صحيحهما –تأليف ضياء الدين أبو عبدالله محمد.

* گێڕانەوەی زۆر هەن دەربارەی هۆکاری دابەزینی ئایەتەکانی سەرەتای سوورەتی (التحريم).

* ئیمامی(الشوكاني) پاش ئەوەی کە چیرۆکی حەرامکردنی هەنگوینەکەو چیرۆکی خاتوو (مارية) ی (القطيي) هێناوە دەڵێت:

{ئەمانە دوو هۆکاری ڕاست بوون بۆ دابەزینی ئایەتەکان، و دەشگونجێت کە بەهۆی کۆی هەردوو مەسەلەکەوە بێت-واتە چیرۆکی هەنگوینەکەو خاتوو ماریە- کە قورئان دەربارەی هەموویان دابەزی، و پێغەمبەریش بۆ هەریەکەیان لای هەندێك لە خێزانەکانی درکاندی. ..}.[٦٣٣]

* هەروەها پێشەوا (إبن حجر) لە (الفتح)دا پاش ئەوەی کە گێڕانەوەکانی دەربارەی حەرامکردنی خاتوو (مارية) هێناوە دەڵێت: {ئەمە چەند ڕێگایەکە هەندێکیان هەندێکی تریان بەهێز دەکەن، دەگونجێت ئایەتەکە بەهۆی هەردوو هۆکارەکەوە دابەزیبێت}.[٦٣٤]

* ئیمامی (الطبري) لە (جامع البيان)دا پاش ئەوەی کە باسی ڕیوایەتەکان کردووە کە دەربارەی حەرامکردنی هەنگوینەکە و حەرامکردنی خاتوو (مارية)ی کردو دەڵێت: {ڕاست و دروستەکەی ئەوەیە کە بوترێت: ئەو شتەی کە پێغەمبەر لەسەر خۆی حەرامی کرد، خوای گەورە بۆ ئەوی حەڵاڵ کرد بوو، دەگونجێت ئەویش کەنیزەکەکەی بوبێت، و دەشگونجێت کە هەنگوین خواردنەکەی بوو بێت، و دەشگونجێت شتی تر بووبێت، بێگومان هەر شتێك بوو بێت لەوانە، ئەوە حەرامکردنی شتێك بووە کە خۆی لە خۆیدا حەڵاڵ بووە بۆ پێغەمبەر و خوای گەورەیش لەسەر ئەوە گلەیی لێ کردووە کە شتانێکی لەسەر خۆی حەرام کردووە کە حەڵاڵ بوون، و بۆی ڕوون کردەوە کە جارییەکەی بۆی حەڵاڵە).[٦٣٥]

ئێمەیش دەڵێین: قسەی لە پێشتر لە هۆکاری دابەزینی ئەم ئایەتانەدا بریتییە لەوەی کە دەربارەی حەرامکردنی خاتوو (مارية) (خوا لێی ڕازی بێت) هاتووە لەبەر گونجانی

---

٦٣٣- فتح القدير للشوكاني ٥/٢٥٢.

٦٣٤- يراجع الفتح ٥/٥٢٥.

٦٣٥- جامع اليان ١٠٢/١٢ ط دار المعرفة.

بابەتەکە لەگەڵ چیرۆکەکە و ناوەرۆکی ئایەتەکاندا، و مەسەلەی حەرامکردنی هەنگوینەکە، و قسەی هەندێك لە پێشین کە دەربارەی دابەزیوە ئەوە مەبەست بووە لە: ئایەتەکان مەسەلەکان بە گشتی دەگرێتەوە لەسەر ئەوەی کە لە پێشین زانراوە لە قسەکانیاندا کە لە شتێکدا دابەزیوە.

* پێشەوا (الزركشي) لە (البرهان)دا، دەڵێت: {ئەوەی زانایانی تەفسیر باسی دەکەن لە هۆکارەکان کە زۆرن دەربارەی هۆکاری دابەزینی ئایەتەکە، دەگونجێت کە لەم شێوەیە بێت، و بە تایبەت کە شتانێك لە عادەت و پیشەی هاوەڵان و شوێن کەوتوان زانراوە کە یەکێك لەوان ئەگەر بیوتایە: ئەم ئایەتە لەو بارە و بابەتەوە دابەزیوە، ئەوە مەبەستی ئەوە بوو، کە ئەم ئایەتە ئەو حوکمەی تیایە و دەیگرێتەوە، بەو مەبەستانە کە ئەمە هۆکاری دابەزینی ئایەتەکە بێت}. [٦٣٦]

## سێیەم: تەفسیری شیکاری ئایەتەکان گلەیی خوای گەورە لە خۆشەویست و هەڵبژێردراوی خۆی گەورەمان محمد(ﷺ)

خوای گەورە فەرمووی: ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ لِمَ تُحَرِّمُ مَا أَحَلَّ اللَّهُ لَكَ تَبْتَغِي مَرْضَاتَ أَزْوَاجِكَ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ (التحريم:١).

لەم ئایەتە پیرۆزەدا کە سەرەتای سوورەتەکەیە: خوای گەورە وتە و گلەیی خۆی ئاراستەی پێغەمبەرە بەڕێزەکەی دەکات و پێی دەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ﴾ بانگ کردنی پێغەمبەر لەسەر ئەم شێوازە ڕێزدارییە بۆ پێغەمبەر و هەست بەبەرزی و پلە و پایەی خۆی دەکات و ئاگادارکردنەوەیەکی دەربارەی گەورەیی ئەو کارەی کە لەدوای ئەو بانگ کردنەوە باس دەکرێت.

---

[٦٣٦]- البرهان في العلوم القرآن ٣٢/١.

﴿لِمَ تُحَرِّمُ مَا أَحَلَّ اللَّهُ لَكَ﴾ بۆچی تۆ واز لەو حەڵاڵ و پاکە دەهێنیت و لە خۆتی قەدەغە و حەرام دەکەیت، مەبەست لێرەدا ئەوە بووە کە پێغەمبەر خواردنی هەنگوینی لەسەر خۆی قەدەغە و حەرام کرد، وەك لە هەردوو (صحیح)دا هاتبوو، یان لەسەر خۆی حەرامی کرد کە بچێتەلای خاتوو (ماریة) (خوا لێی ڕازی بێت) وەك لە گێڕانەوە (صحیح) ڕاستەکاندا هاتبوو، و دووەم: ئەوە بووە کە لەگەڵ بابەت و ناوەڕۆکی ئایەتەکەدا ڕێك کەوتووە.

﴿تَبْتَغِي مَرْضَاتَ أَزْوَاجِكَ﴾. واتە: دەتەوێت بەو کارە هاوسەرەکانت ڕازی بکەیت؟ ئەوان لە پێشتر و شیاوترن کە تۆ لە خۆیان ڕازی بکەن، ئەوە واجب و پێویستە لەسەر ئەوان.

(الآلوسي) دەڵێت: (بەڕاستی خوای گەورە گلەیی لە پێغەمبەر کرد کە نەرم و نیانی و بەزەیی بەرامبەر نواندن و ڕێزی لە پلە و پایەی گرت). [٦٣٧]

﴿وَاللَّهُ غَفُورٌ رَحِيمٌ﴾ خوای گەورە لێخۆشبوو میهرەبانە.

* پێشەوا (القرطبي) دەڵێت: {﴿وَاللَّهُ غَفُورٌ رَحِيمٌ﴾. واتە خوا لێبوردەیە لەبەرئەوەی کە گلەیی لەسەر پێغەمبەر واجب کرد، و میهرەبانیشە، و ئەو شتەی ئەو بڕیاری دابوو لەسەری لادەبات، وتراوە: کە ئەوە تاوانی بچووك بووە. بەڵام ڕاستییەکەی ئەوە بووە کە گلەیی بووە لەسەر ئەوەی کە وازی لە یەکەمیان هێناوە، و پێغەمبەر نە تاوانی بچووك نە گەورەی نەبووە}. [٦٣٨]

﴿قَدْ فَرَضَ اللَّهُ لَكُمْ تَحِلَّةَ أَيْمَانِكُمْ وَاللَّهُ مَوْلَاكُمْ وَهُوَ الْعَلِيمُ الْحَكِيمُ﴾(التحريم:٢).

لێخۆشبوون و بەزەیی خوای گەورە بە بەندەکانی خۆی ئەوەیە کە هەڵوەشاندنەوەی سوێندەکانی بۆ بڕیار داون، لێرەدا ئاماژە بۆ ئەوە کراوە کە بەڕاستی پێغەمبەر ئەو شتەی کە لە خۆی قەدەغە و حەرامکرد بەستی بە سوێند خواردنەوە، وەك پێشتر باسمان کرد.

---

[٦٣٧] -روح المعاني للآلوسي ١٤٨/٢٨ بە کورتی.

[٦٣٨] - الجامع مع لأحكام القرآن ١٤٨/١٨.

﴿واللہ مولاکم﴾ واتە: خوای گەورە، گەورە و پشتیوان و یارمەتی دەرتانە.

﴿وهو العلیم الحکیم﴾ (التحريم:٢). واتە: هەر خوا خۆی زاتێکی زانا و دانایە، دەزانێت کە چی چاکە و بەرژەوەندی بەندەکانی خۆیی تیایە لە نزیك و لە داهاتوودا، هیچ شتێك لە حاڵی ئەوان لای خوا شاراوە نابێت، ئەو زاتێکی(الحکیم)ە، بە شتێك فەرمانتان پێ ناکات و نەهیتان لێ ناکات مەگەر حیکمەتێك بگەیەنێت.

## بڵاوبونەوەی نهێنییەك

خوای گەورە فەرمووی: ﴿وَإِذْ أَسَرَّ النَّبِيُّ إِلَى بَعْضِ أَزْوَاجِهِ حَدِيثاً فَلَمَّا نَبَّأَتْ بِهِ وَأَظْهَرَهُ اللَّهُ عَلَيْهِ عَرَّفَ بَعْضَهُ وَأَعْرَضَ عَن بَعْضٍ فَلَمَّا نَبَّأَهَا بِهِ قَالَتْ مَنْ أَنبَأَكَ هَذَا قَالَ نَبَّأَنِيَ الْعَلِيمُ الْخَبِيرُ﴾(التحريم:٣).

ئەم ئایەتەیش پەیوەندیدارە بەوەی پێشترەوە کە ڕوون و دیارە، پێغەمبەر هەنگوین خواردن و چوونە لای خاتوو (مارية) ی لەسەر خۆی حەرام کرد -بە پێی بۆچوونی ڕاست و دروست- بەڵام ئەم نهێنیەی لای (حفصة) درکاند.

﴿فَلَمَّا نَبَّأَت بِهِ﴾ کاتێك (حفصة) ئەم هەواڵەی گەیاند بە خاتوو عائیشە (خوا لێیان ڕازی بێت)، کە پێویست بوو (حفصة) ئەم نهێنیە بپارێزێت و بڵاوی نەکاتەوە ﴿وأظهره الله عليه﴾ ئینجا خوای گەورە ئەم کارەی لای پێغەمبەر ئاشکرا کرد کە (حفصة) ئەم نهێنیەی لای (عائیشە) درکاند و بڵاوی کردەوە ﴿عَرَّفَ بعضَهُ وأَعْرَضَ عَنْ بَعضٍ﴾ واتە: خوای گەورە باسی هەندێك لە ڕازەکەی کرد و باسی هەندێکی تری نەکرد، کە (حفصة) گەیانبووی بە (عائیشە) خوای گەورە لەبەر ڕێز و لێبوردن پێیان باسی هەندێکی نەکرد، عادەتی کەسانی بەڕێزیش وایە کە بێ ئاگان لە هەندێك لە پەلەکردن و هەڵەشەیی و لەسەرپێ

دووان لە لۆمەکردن و گلەییدا، ئەگەر ئەوە حاڵی بەڕێزان بێت، دەبێت حاڵی بەڕێزترینی بەڕێزەکان کە پێغەمبەرە چۆن دەبێت؟

﴿وَإِذْ أَسَرَّ النَّبِيُّ إِلَى بَعْضِ أَزْوَاجِهِ حَدِيثًا فَلَمَّا نَبَّأَتْ بِهِ وَأَظْهَرَهُ اللَّهُ عَلَيْهِ عَرَّفَ بَعْضَهُ وَأَعْرَضَ عَن بَعْضٍ فَلَمَّا نَبَّأَهَا بِهِ قَالَتْ مَنْ أَنبَأَكَ هَذَا قَالَ نَبَّأَنِيَ الْعَلِيمُ الْخَبِيرُ﴾(التحريم:٣). (پێغەمبەر گلەیی لە خاتوو (حفصة) کرد، دەربارەی درکاندنی نهێنییەکە) (حفصة) پرسی: کێ ئەم هەواڵەی تێ گەیاندیت؟ پێغەمبەر فەرمووی: خوای زانا و ئاگا منی ئاگادار کرد.

خوای گەورە زانایە بەحاڵی هەمووکەس و کردارەکانی و زانستی خوا هەموو شتێك دەگرێتەوە، نهێنی و ناوەڕۆکی کارەکان دەزانێت سەرەڕای دیوە ئاشکراکانیشیان

## (ترغیب...و ترهیب) دڵخۆشکردن و ترساندن

﴿إِن تَتُوبَا إِلَى اللَّهِ فَقَدْ صَغَتْ قُلُوبُكُمَا وَإِن تَظَاهَرَا عَلَيْهِ فَإِنَّ اللَّهَ هُوَ مَوْلَاهُ وَجِبْرِيلُ وَصَالِحُ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمَلَائِكَةُ بَعْدَ ذَلِكَ ظَهِيرٌ﴾ (التحريم:٤).

واتە: (بۆیە خوای گەورە بەرامبەر (حفصة و عائشة) دەدوێت) و پێیان دەفەرمووێت: ئەگەر هەردووکتان داوای تەوبە و پەشیمانی بکەن، (واتە شتێك لەواندا ڕویداوە کە پێویستی بە داوای تەوبەکردن هەیە، کە لایان دابو بۆ شتێك کە پێغەمبەر پێی ناخۆش بوو) و بگەڕێنەوە بۆلای خوا، ئەوە باشە، چونکە دڵەکانتان لەخشتە چوو بوو و ترازابوو، خۆ ئەگەر پشتی یەکتر بگرن دژ بە پێغەمبەر ئەوە چاك بزانن کە خوا خۆی یاریدەدەرێتی و هەروەها جوبرەئیل و ئیماندارە چاکەکان، و فریشتەکانیش پشتیوانن بۆی).

* زانا (الطباطبائي) دەڵێت: ﴿والملائكة بَعْدَ ذَالِكَ ظَهِيرٌ﴾: هەواڵ دان لە شێوەی تاکدا ئەوە دەگەیەنێت کە بێگومان ئەوان ڕێك کەوتوون لەسەر پشتیوانی پێغەمبەر، هەموو بەیەك

ڕیز ڕێك کەوتوون، و لەو کارەیاندا لەدوای پشتیوانی خوا و جوبرەئیل و باوەڕدارە چاکەکان، پشتیوانی فریشتەکانیش بە گشتی گەورەیی و ڕێزگرتن بوو لە پێغەمبەر.[٦٣٩]

﴿عَسَىٰ رَبُّهُ إِن طَلَّقَكُنَّ أَن يُبْدِلَهُ أَزْوَاجًا خَيْرًا مِّنكُنَّ مُسْلِمَاتٍ مُّؤْمِنَاتٍ قَانِتَاتٍ تَائِبَاتٍ عَابِدَاتٍ سَائِحَاتٍ ثَيِّبَاتٍ وَأَبْكَارًا﴾(التحريم:٥).

وتە و فەرمایشتی خوای گەورە لەم ئایەتەدا بۆ هەموو دایکانی ئیماندارانە. واتە: (ئەگەر پێغەمبەر تەڵاقتان بدات، ئەوە نزیکە خوا هاوسەرانی چاکتر لە ئێوەی پی ببەخشێت، موسڵمان و باوەڕدار، ملکەچی پەروەردگار، زوو لە هەڵە پەشیمان، خواپەرست و دیندار، ڕۆژووەوان، یان بیرو هۆشیان لەکاردایە و سەرنجی دروست کراوانی خوا دەدەن، هەروەها ئەو ئافرەتانە هەیانە بێوەژن و هەیانە کچن...).

زانا (الزمخشري) دەڵێت: ئەگەر ووتت: چۆن ئافرەتانێك هەن کە لەمان خەیرتر و چاکترین، کە لەسەر زەویدا ئافرەتانێك نەبوون کە لە دایکانی ئیمانداران چاکترین؟ دەڵێین: کاتێك کە پێغەمبەر تەڵاقیان دەدات و دەست بەرداریان دەبێت لەبەر سەرپێچییەکانیانە بۆ فەرمانەکانی و ئازاردانیانە بۆ پێغەمبەر ئەوانیش لەسەر ئەو ڕەوشتەیان نەمان، هەروەها ئەو خێزانانە لە سیفەتە باشەکانیان تێدابووە و لەگەڵیشیدا گوێڕایەڵی پێغەمبەریان کردووە، کاتێك پێغەمبەر دەیەوێت خوای گەورە لە خۆی ڕازی بکات ئەوە خەیرو چاکەیەکی گەورەترە، خوای گەورە ئەوەشی بە ﴿قَانِتَاتٍ﴾ دەربڕی و دەرخست، چونکە مل کەچ بوون بۆ فەرمانی خوای گەورە بریتییە لە ئەنجامدانی گوێڕایەڵی خوا، و گوێڕایەڵی پێغەمبەریش لە گوێڕایەڵی خوای گەورەدایە.[٦٤٠]

﴿مُسْلِمَاتٍ مُؤْمِنَاتٍ﴾واتە: پابەند بە بە بڕیار و حوکمە ئیسلامییەکان و ڕازاوە بە ڕەوشتی ئیمانی ﴿قَانِتَاتٍ﴾ ملکەچی بۆ پەروەردگار و هەستان بە گوێڕیەڵی فەرمانەکانی بە جوانترین شێوە.

---

٦٣٩- المیزان: ٣٣٢/١٩.

٦٤٠- الكشاف ٥٦٧/٤ بە کورتی و بە دەستکاری یەوە.

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ وَمَن يَقْنُتْ مِنكُنَّ لِلَّهِ وَرَسُولِهِ وَتَعْمَلْ صَالِحًا نُّؤْتِهَا أَجْرَهَا مَرَّتَيْنِ وَأَعْتَدْنَا لَهَا رِزْقًا كَرِيمًا﴾ (الأحزاب:٣١).

واتە: (ئەوەشتان فەرمانبەردار و ملکەچی خوا و پێغەمبەرکەی بێت، کردەوەی چاکیش ئەنجام بدات ئەوە دوو جار پاداشتی دەدەینەوە، هەروەها ڕزق و ڕۆزیەکی بەنرخ و پیرۆزمان بۆ ئامادەکردووە).

هەروەها خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَالصَّالِحَاتُ قَانِتَاتٌ حَافِظَاتٌ لِّلْغَيْبِ بِمَا حَفِظَ اللَّهُ﴾(النساء:٣٤).

واتە: (لەولاشەوە ئافرەتانی ژیر و دیندار و گونجاو هەمیشە گوێڕایەڵی مێردەکانیانن، نهێنی نێوان خۆیان و مێردەکانیان دەپارێزن (بەتایبەت ئەو نهێنیانەی خوا دەیەوێت پارێزراو بن) بەهۆی ئەوەی کە خوا مافەکانی ئەوانی پاراستووە).

﴿عَابِدَاتٍ﴾ خوا پەرستن و لەسەر بەندایەتی خوا ڕاهاتوون و دامەزراون کە بەرزترین ئامانج و مەبەستە لە بونەوەردا.

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ﴾ (الذاريات:٥٦).

واتە: (من پەری و ئادەمیزادم دروست نەکردووەتەنها بۆ ئەوە نەبێت کەمن بپەرستن و فەرمانبەردارم بن).

﴿سَائِحَاتٍ﴾ واتە: گەست کردن، بەڵام ڕاوبۆچوونی جیاوازی لەسەر هاتووە، وتراوە کە (الهجرة) کۆچکردن دەگەیەنێت واتە: ئەوان کۆچیان کردووە بۆ لای خوای گەورە ، لە ڕوشتەکانی کۆچکردنیش بریتییە لە کۆچکردن لە سەرپێچی و تاوانەکان، وتراویشە واتە ﴿الصائِمات﴾ ڕۆژوگران، کە ڕۆژوو دەگەیەنێت. (بێگومان بە ڕۆژوو دەوترێت ﴿سائِح﴾ چونکە بەردەوام دەبێت لەسەر خۆگرتنەوە لە خواردن و ئارەزووەکان، هەروەك چۆن ﴿سائِح﴾ گەشتیار بەردەوام دەبێت لەسەر گەشتەکەی بەسەر زەویدا).[٦٤١]

---

[٦٤١]- مجمع البيان ٥/١٧٥.

(الرازي) لە تەفسیرەکەیدا دەڵێت: (بە ڕۆژوو گوتراوە ﴿سائح﴾ گەشتیار، چونکە توێشوی پێ نییە، بەردەوام خۆی دەگرێت تادەگات بە کەسێك کە خواردنی بداتێ، شوبهاندویانە بە کەسی ڕۆژووگر کە خۆی دەگرێت تا ئەو کاتەی کاتی ڕۆژوو شکاندن دێت).[٦٤٢]

وتراویشە ﴿سائِحات﴾ واتە: کەسانی بەردەوام لەسەر گوێڕایەڵی خوا.

﴿ثَيِّبَاتٍ وَأَبْكَارًا﴾ (التحريم:٥).

﴿ثيِّباتٍ﴾ کۆی (ثَيِّب)ە، ئەو ئافرەتانەن کە کچێنییان لاچووە، بەوە ناونراون چونکە پاش شوکردنی یەکەمیان گەڕاونەتەوە بۆ ماڵی باوکیان، واتە (بێوەژن). بەڵام (البکر) کچانن کە هێشتا شوویان نەکردووە، بەو ناوە ناونراون چونکە هەر لەسەر حاڵەتی پێشووی خۆیانن کە لەسەری دروست کراون.

لە ئایەتەکەدا (حرف)ی (و) ی (عطف) لە نێوان ﴿ثيِّباتٍ﴾ و ﴿أبكاراً﴾دا هات، چونکە هەردوو وشەکە دوو (صفة)ی یەکتر نەفی کەرن کە هەردووکیان پێوە لە ئافرەتێکدا کۆ نابێتەوە ، ئافرەت یان ئەوەتا کچە ، یان ئەوەتا مێرد دارە ، ناکرێت لە یەك کاتدا هەردووکیان بێت ، بەڵام لە ڕەوشتەکانی پێشتردا ، (حرف) ی (و) ی (عطف) ی تێدا نەبوو: ﴿مسلِماتٍ مؤمِناتٍ قنِتات تَائِباتٍ عابِداتٍ سائحاتٍ﴾ چونکە ئەم ڕەوشتانە هەموویان پێکەوە دەگونجێت لەیەك کاتدا لە یەك کەسدا کۆببنەوە.

* (إبن کثیر) دەڵێت: (ئایەتی: ﴿ثيِّباتٍ وأبكاراً﴾ واتە: لەو ئافرەتانە هەن کە تیایاندا بووە بێوەژن بووە و تیایاندا بووە کچ بووە، بۆ ئەوەی خۆش بێت لای نەفس و دەروون چونکە جۆرا وجۆر کردن نەفس و دەروون دەکاتەوە....).[٦٤٣]

[٦٤٢] –مفاتيح الغيب ٢٩/٤٥.

[٦٤٣] –تفسير القرآن العظيم لأبن كثير ٤/٣٩٠.

پێشخستنی ﴿ثَيِّبَاتٍ﴾ بەسەر ﴿أَبْكَارًا﴾دا، بۆ ئەوە بووە کە گشت خێزانەکانی پێغەمبەر بێوەژن بوون، تەنها عائیشە نەبێت (خوا لێی ڕازی بێت) کە ئەو تەنها کچ بوو پێغەمبەر خواستی (خوای گەورەیش زانا ترە).

## چوارەم: مانای گشتی

ئایەتی یەکەم گلەیی بۆ پێغەمبەری خوا دەستی پێ کرد، بەوەی کە هەنگوین خواردن یان نزیك بوونەوە و چونە لای خاتوو (مارية)ی لەسەر خۆی حەرام کرد، ئەمە بە پێی بۆچوونی بەهێز و لەپێش، کە بۆ پێغەمبەر نەبوو ئەو کارە بکات بۆ ئەوەی ڕەزامەندی هاوسەرەکانی بەدەست بهێنێت، کە دەبوو خێزانەکانی هەوڵیان بدایە پێغەمبەر لە خۆیان ڕازی بکەن.

پاشان ئایەتی دووەم: لە بابەتێك دەدوێت کە دیاردەیەکە لە دیاردەکانی ڕەحمەت و میهرەبانی خوای گەورە و لێخۆشبونی کە ئەوەیش یاساو شەریعەتێك بوو بۆ کەفارەتی سوێند خواردن، کە سووك کردن و ئاسانکردنی بۆ نەتەوەی موسڵمانان تیایە. خوای گەورە زانا و شارەزایە بەوەی کە بۆ بەندەکانی چاکتر و لەبارترە ئیتر زوو بێت یان درەنگ و دانایە لەو یاسا و شەرعەدا کە بۆیان دادەنێت.

پاشان ئایەتی سێ یەم: لەو کار وفەرمانە دەدوێت کە لە ماڵی پێغەمبەردا ڕویدا، کە ئەوەیش: بێگومان پێغەمبەر کاتێك ئەوەی لەسەر خۆی حەرام کرد کە حەرامی کرد، ئەو نهێنییەی لای (حفصة) درکاند، ئەویش هەواڵەکەی گەیاند بە (عائیشە)، ئینجا خوای گەورە پێغەمبەری لەو ڕاز و باسە تێ گەیاند و ئاگاداری کرد کە (حفصة) گەیاندی بە (عائشة) گلەی لێ کردن و هەواڵی هەندێك لە ڕازەکانیدا بە پێغەمبەر، بەڵام هەواڵی هەمووی پێ نەگەیاند، ئەمەیش سروشتی کەسانی بەڕێز بوو کە شتێك نەگێڕنەوە، ئینجا (حفصة) سەری سوڕما کە چۆن پێغەمبەر ئەمەی زانیوە کە ئەو چی کردوەو هەواڵی داوە بە عائیشە، یان هەواڵەکە لە ڕێگەی (وەحی) خوایی یەوە هاتووە؟

﴿وَإِذْ أَسَرَّ النَّبِيُّ إِلَىٰ بَعْضِ أَزْوَاجِهِ حَدِيثًا فَلَمَّا نَبَّأَتْ بِهِ وَأَظْهَرَهُ اللَّهُ عَلَيْهِ عَرَّفَ بَعْضَهُ وَأَعْرَضَ عَن بَعْضٍ فَلَمَّا نَبَّأَهَا بِهِ قَالَتْ مَنْ أَنبَأَكَ هَٰذَا قَالَ نَبَّأَنِيَ الْعَلِيمُ الْخَبِيرُ﴾ (التحريم:٣).

**پاشان ئایەتی چوارەم دێت: ئەم ئایەتە بۆ (حفصة) و (عائشة) (خوا لێیان ڕازی بێت) هات، کە خوای گەورە پێی ڕاگەیاندن تەوبە بکەن و بگەڕێنەوە بۆلای خوا، کە دڵیان لایدابوو بەلای شتێکدا کە پێچەوانەی ئەوە بوو پێغەمبەر پێی ناخۆش بوو، ئەوەیش بەهۆی غیرەیەکی زۆرەوە و خوای گەورە ئاگاداری کردن کە نابێت ئەوان پشتی یەکتر بگرن لەسەر شتێك کە پێغەمبەری پێ ناڕەحەت بکەن، کە کۆ ببنەوە و ڕێك بکەون لەسەر ئەوەی کە پێغەمبەر پێی ناخۆشە.** ﴿وإن تظهرا عليه فإنَّ الله هوَ مولهُ وجبريل وصلحُ المؤمنين والملائكةُ بعدَ ذالك ظهير﴾. **خوای گەورە پشتیوان و یارمەتی دەرێتی، هەروەها جوبرەئیل و باوەڕدارانی چاکەکار، و فریشتە بەڕێزەکانیش، هەموویان پشتیوانی پێغەمبەرن.**

**ئایەتی پێنجەم دێت: هەڕەشەیەکی توندی تیایە بۆ هەموو دایکانی ئیمانداران:** ﴿عَسَىٰ رَبُّهُ إِن طَلَّقَكُنَّ أَن يُبْدِلَهُ أَزْوَاجًا خَيْرًا مِّنكُنَّ مُسْلِمَاتٍ مُّؤْمِنَاتٍ قَانِتَاتٍ تَائِبَاتٍ عَابِدَاتٍ سَائِحَاتٍ ثَيِّبَاتٍ وَأَبْكَارًا﴾ (التحريم:٥).

*** خاوەنی تەفسیری (الظلال) دەڵێت: (ئەوانە کۆمەڵە ڕەوشتێك بوون کە خێزانەکانی بۆ بانگ کرا لە ڕێگەی وەحی و پێگەیاندن و ئاماژەکردنەوە ، ئیسلام کە ووزە و توانای دەوێت تا هەستن بە جێ بەجێ کردنی فەرمانەکانی دین، ئیمان کە دڵ ئاوادان دەکاتەوە، ملکەچ بوون و فەرمانبەرداری کە ئەویش پەرستش و گوێڕایەڵی دڵە، تەوبە و گەڕانەوە، کە پەشیمان بونەوەیە لەو سەرپێچییانەی کە ڕویانداوە و ڕوکردنە گوێڕایەڵی و بەندایەتی کە ئامراز و هۆکاری پەیوەندی بوونە بە خوای گەورەوە و بەندایەتییە بۆ خوای گەورە، (السیاحة) کە ڕامان و بیرکردنەوە و تێڕوانینە لە بەدیهێنراوەکانی خوا و گەڕان و گەشەکردنە بە دڵ لە بوونەوەردا -لەگەڵ ئەم ڕەوشتانەیشدا- لە بێوەژنان و کچانن، وەك ئەوەی کە خێزانەکانی پێغەمبەر بێوەژن بوون و تەنها کچێکیان تێدا بوو،**

پێشخستنی ﴿ثَيِّبَاتٍ﴾ بەسەر ﴿أَبْكَارًا﴾دا، بۆ ئەوە بووە کە گشت خێزانەکانی پێغەمبەر بێوەژن بوون، تەنها عائیشە نەبێت (خوا لێی ڕازی بێت) کە ئەو تەنها کچ بوو پێغەمبەر خواستی (خوای گەورەیش زانا ترە).

## چوارەم: مانای گشتی

ئایەتی یەکەم گلەیی بۆ پێغەمبەری خوا دەستی پێ کرد، بەوەی کە هەنگوین خواردن یان نزیك بوونەوە و چونە لای خاتوو (مارية)ی لەسەر خۆی حەرام کرد، ئەمە بە پێی بۆچوونی بەهێز و لەپێش، کە بۆ پێغەمبەر نەبوو ئەو کارە بکات بۆ ئەوەی ڕەزامەندی هاوسەرەکانی بەدەست بهێنێت، کە دەبوو خێزانەکانی هەوڵیان بدایە پێغەمبەر لە خۆیان ڕازی بکەن.

پاشان ئایەتی دووەم: لە بابەتێك دەدوێت کە دیاردەیەکە لە دیاردەکانی ڕەحمەت و میهرەبانی خوای گەورە و لێخۆشبونی کە ئەوەیش یاساو شەریعەتێك بوو بۆ کەفارەتی سوێند خواردن، کە سووك کردن و ئاسانکردنی بۆ نەتەوەی موسڵمانان تیایە. خوای گەورە زانا و شارەزایە بەوەی کە بۆ بەندەکانی چاکتر و لەبارترە ئیتر زوو بێت یان درەنگ و دانایە لەو یاسا و شەرعەدا کە بۆیان دادەنێت.

پاشان ئایەتی سێ یەم: لەو کار وفەرمانە دەدوێت کە لە ماڵی پێغەمبەردا ڕویدا، کە ئەوەیش: بێگومان پێغەمبەر کاتێك ئەوەی لەسەر خۆی حەرام کرد کە حەرامی کرد، ئەو نهێنییەی لای (حفصة) درکاند، ئەویش هەواڵەکەی گەیاند بە (عائیشە)، ئینجا خوای گەورە پێغەمبەری لەو ڕاز و باسە تێ گەیاند و ئاگاداری کرد کە (حفصة) گەیاندی بە (عائشة) گلەی لێ کردن و هەواڵی هەندێك لە ڕازەکانیدا بە پێغەمبەر، بەڵام هەواڵی هەمووی پێ نەگەیاند، ئەمەیش سروشتی کەسانی بەڕێز بوو کە شتێك نەگێڕنەوە، ئینجا (حفصة) سەری سوڕما کە چۆن پێغەمبەر ئەمەی زانیوە کە ئەو چی کردوەو هەواڵی داوە بە عائیشە، یان هەواڵەکە لە ڕێگەی (وەحی) خوایی یەوە هاتووە؟

﴿وَإِذْ أَسَرَّ النَّبِيُّ إِلَى بَعْضِ أَزْوَاجِهِ حَدِيثًا فَلَمَّا نَبَّأَتْ بِهِ وَأَظْهَرَهُ اللَّهُ عَلَيْهِ عَرَّفَ بَعْضَهُ وَأَعْرَضَ عَنْ بَعْضٍ فَلَمَّا نَبَّأَهَا بِهِ قَالَتْ مَنْ أَنْبَأَكَ هَذَا قَالَ نَبَّأَنِيَ الْعَلِيمُ الْخَبِيرُ﴾ (التحريم:٣).

پاشان ئایەتی چوارەم دێت: ئەم ئایەتە بۆ (حفصة) و (عائشة) (خوا لێیان ڕازی بێت) هات، کە خوای گەورە پێی ڕاگەیاندن تەوبە بکەن و بگەڕێنەوە بۆلای خوا، کە دڵیان لایدابوو بەلای شتێکدا کە پێچەوانەی ئەوە بوو پێغەمبەر پێی ناخۆش بوو، ئەوەیش بەهۆی غیرەیەکی زۆرەوە و خوای گەورە ئاگاداری کردن کە نابێت ئەوان پشتی یەکتر بگرن لەسەر شتێك کە پێغەمبەری پێ ناڕەحەت بکەن، کە کۆ ببنەوە و ڕێك بکەون لەسەر ئەوەی کە پێغەمبەر پێی ناخۆشە. ﴿و إن تظهرا عليه فإنّ اللهَ هوَ مولهُ وجبريل وصلحُ المؤمنين والملائكةُ بَعْدَ ذالكَ ظهير﴾. خوای گەورە پشتیوان و یارمەتی دەرێتی، هەروەها جوبرەئیل و باوەڕدارانی چاکەکار، و فریشتە بەڕێزەکانیش، هەموویان پشتیوانی پێغەمبەرن.

ئایەتی پێنجەم دێت: هەڕەشەیەکی توندی تیایە بۆ هەموو دایکانی ئیمانداران: ﴿عَسَى رَبُّهُ إِن طَلَّقَكُنَّ أَن يُبْدِلَهُ أَزْوَاجًا خَيْرًا مِّنكُنَّ مُسْلِمَاتٍ مُّؤْمِنَاتٍ قَانِتَاتٍ تَائِبَاتٍ عَابِدَاتٍ سَائِحَاتٍ ثَيِّبَاتٍ وَأَبْكَارًا﴾ (التحريم:٥).

* خاوەنی تەفسیری (الظلال) دەڵێت: (ئەوانە کۆمەڵە ڕەوشتێك بوون کە خێزانەکانی بۆ بانگ کرا لە ڕێگەی وەحی و پێگەیاندن و ئاماژەکردنەوە ، ئیسلام کە ووزە و توانای دەوێت تا هەستێ بە جێ بەجێ کردنی فەرمانەکانی دین، ئیمان کە دڵ ئاوادان دەکاتەوە، ملکەچ بوون و فەرمانبەرداری کە ئەویش پەرستش و گوێڕایەڵی دڵە، تەوبە و گەڕانەوە، کە پەشیمان بونەوەیە لەو سەرپێچییانەی کە ڕویانداوە و ڕوکردنە گوێڕایەڵی و بەندایەتی کە ئامراز و هۆکاری پەیوەندی بوونە بە خوای گەورەوە و بەندایەتییە بۆ خوای گەورە، (السياحة) کە ڕامان و بیرکردنەوە و تێڕوانینە لە بەدیهێنراوەکانی خوا و گەڕان و گەشەکردنە بە دڵ لە بوونەوەردا –لەگەڵ ئەم ڕەوشتانەیشدا– لە بێوەژنان و کچانن، وەك ئەوەی کە خێزانەکانی پێغەمبەر بێوەژن بوون و تەنها کچێکیان تێدا بوو،

ئەوە هەڕەشە بوو بۆ ئەوان، کە دەبێت ئەوە بگەیەنێت کاریگەری فێڵ و نەخشەکانیان لەسەر دڵ و دەروونی پێغەمبەر دەرکەوتبێت، تەنها کەمێکیش تورە نەبووا بەراستی پاش دابەزینی ئایەتەکان دڵی پێغەمبەر ڕازی بوو، وتەو فەرمایشتی خوایش بۆخۆی و کەس و کار و خێزانەکانی بوو، ئەم حاڵە لە پێش دابەزینی ئایەتەکان لەم کارو ڕووداوە کە هەژاندنی و دڵنیا و دڵ ئارام بوونەوە، پێغەمبەر ئارامی و هێمنی و دڵنیایی بۆ کەڕایەوە بەهۆی ڕێنمایی خواوە، ئەمە ڕێزگرتن بوو لە ماڵی پێغەمبەر و چاودێری کردنێك بوو کە دەوری خۆیی گونجاند لە داڕشتنی بەرنامەکەی خوادا لەسەر زەوی و جێگیرکردن و دامەزراوکردنی پایەکانی).[٦٤٤]

## پێنجەم: سوود و وانە گرنەکانی ئایەتەکان

ئەم ئایەتانە لاپەڕیەکیان لە ژیانی ناو ماڵی پێغەمبەر بۆ ڕوون کردینەوە، هەروەها نمونەیەکیش بوو لە هەڵچوون و وەڵامدانەوە ئینسانی یەکان لە نێوان هەندێك لە خێزانەکانی لەگەڵ هەندێکی تریاندا، هەروەها لە نێوان ئەوان و پێغەمبەردا، ڕنگدانەوەی ئەم هەڵچوون و وەڵامدانەوانە لە ژیانی پێغەمبەردا لەوەوە پەیدا بوو کە پێغەمبەر هەندێك شتی لەبەر ڕەزامەندی خێزانەکانی حەرام کرد، و ئەم نهێنییەی لای (حفصة) باسکرد، ئەویش هەواڵی دابە (عائشة) کە دەنگونجا ئەم هەلوێستە لە ماڵی پێغەمبەردا ڕوبدات، بە شێوەیەکی سادە تێپەڕ بوایە، بەڵام خوای گەورە قورئانی دەربارەی دابەزاند، ئەوەش لەبەر ئەوەی هەڵوێستەکە هەڵسەنگێنێت و گەورەیی و پلەو پایەی پێغەمبەر دەربخات، هەروەها خوای گەورە گلەیی لە پێغەمبەر کرد، کە چۆن شتێك لەسەر خۆی حەرام دەکات، کە خوای گەورە ڕێگەی پێداوە بۆ ئەو و بۆی حەڵاڵ کردووە، کەلەسەر ئەوان پێویست بوو خۆیان سەرقاڵ بکەن و هەوڵ و کۆشش بکەن تا پێغەمبەر لە خۆیان ڕازی بکەن، لە کاتێکدا کە خوای گەورە گلەیی لە پێغەمبەرە

[٦٤٤]– في الظلال القرآن ٦/٣٦١٦ بە دەستکاری یەوە.

بەرێزەکەی دەکات، بەهۆی ئەوەی کە شتانێکی حەڵاڵی لەسەر خۆی حەرام کرد لەبەر خاتری ڕەزامەندی خێزانەکانی، دەبێت ئێمە چۆن بڕوانین بۆ ئەو کەسانەی کە هەوڵ دەدەن بۆ ڕازی کردنی خێزانەکانیان بە ئەنجامدانی حەرامەکان و کاری ناپەسەند و ناشایستە، دەبینین هەرکەس مافی دایك و باوکی پێشێل بکات و ڕەحم و بەزەیی خۆی دەپچڕێت بەرامبەریان بۆ ئەوەی خێزانەکەی پێ ڕازی بکات، دەبینین هەرکەس دەستی بۆ حەرام درێژ بکات تا وەڵامی داواکاریەکانی خێزانەکەی پێ بداتەوە کە داواکارییەکانی تەواو نابێت و کۆتایی نایەت، جا ئەمانە لەکوێ لە ئەخلاق و ڕەوشتی هاوسەرانی چاکەکار نییە، کە خوای گەورە دەربارەیان دەفەرموێت: ﴿مسلمات مؤمنات قنتات تائبات عابدات سائحات ثيبات وأبكارا﴾.

هاوسەران بەم ئەخلاق و ڕوشتانەوە چاکەکار و لە خواترس و ملکەچ و گەردن کەچن بۆ خوای گەورە، و گوێڕایەڵی هاوسەرەکانیان دەکەن و هاوکاریانن و دەستیان دەگرن بۆ ڕەزامەندی خوایی، و نهێنی و شاراوەکانی ژیانی بۆ دەرناخەن و بڵاوی ناکەنەوە، کە هەردووکیان نهێنی پارێز و داپۆشەری یەکترین، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿هن لباس لكم وأنتم لباس لهن﴾ (البقرة:١٨٧).

خێزانەکە پارێزەر و سنورپارێزی مێردەکەیەتی لەکاتی ئامادەبوونی و لەکاتی نائامادەییشی، داوای شتێکی لێ ناکات کە لە توانایدا نەبێت و لەبەر هەژاری و نەبوونی تانەو تەشەری لێ نادات و عەیبداری ناکات، بەڵکو ڕازییە بەوەی کە خوای گەورە بۆی بەش کردووە و بڕیویەتیەوە، و ئامۆژگاری دەکات کەلە خوا بترسێت و داوای لێ دەکات کە بە دوای کار و کەسابەتی حەڵاڵ و دروستدا بگەڕێت، وتەی ئافرەتێکی پێشین لەسەر ئەمە بە نموونە دەهێنینەوە، کاتێك کە مێردی یەکێکیان چووە بۆ کارکردن پێی دەڵێت: لەخوا بترسە لە کارەکەتدا بۆ ئێمە حەرامیان بۆ مەهێنەرەوە بەڕاستی ئێمە لەسەر برسێتی ئارام دەگرین بەڵام ناتوانین لەسەر ئاگری دۆزەخ ئارامگرین.

## باسی چوارەم:

## ئەوەی دەربارەی (خولەی کچی ثعلبة) دابەزی، کە (أوس)ی کوڕی (صامت)ی مێردی لە جێگەی دایکی داینا:

**لەم باسەدا:**

**یەکەم: ئایەتەکان لەم باسە دەدوێن.**

**دووەم: هۆکاری دابەزینی ئایەتەکان.**

**سێ یەم: تەفسیری شیکاری ئایەتەکان.**

**چوارەم: سوود و وانە گرنگەکانی ئایەتەکان.**

**پێنجەم: مانای گشتی.**

## یەکەم: ئایەتەکان کەلەم باسە دەدوێن

**خوای گەورە دەفەرمووێت:** ﴿قَدْ سَمِعَ اللَّهُ قَوْلَ الَّتِي تُجَادِلُكَ فِي زَوْجِهَا وَتَشْتَكِي إِلَى اللَّهِ وَاللَّهُ يَسْمَعُ تَحَاوُرَكُمَا إِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ بَصِيرٌ (١) الَّذِينَ يُظَاهِرُونَ مِنكُم مِّن نِّسَائِهِم مَّا هُنَّ أُمَّهَاتِهِمْ إِنْ أُمَّهَاتُهُمْ إِلَّا اللَّائِي وَلَدْنَهُمْ وَإِنَّهُمْ لَيَقُولُونَ مُنكَرًا مِّنَ الْقَوْلِ وَزُورًا وَإِنَّ اللَّهَ لَعَفُوٌّ غَفُورٌ (٢) وَالَّذِينَ يُظَاهِرُونَ مِن نِّسَائِهِمْ ثُمَّ يَعُودُونَ لِمَا قَالُوا فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مِّن قَبْلِ أَن يَتَمَاسَّا ذَلِكُمْ تُوعَظُونَ بِهِ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ (٣) فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ مِن قَبْلِ أَن يَتَمَاسَّا فَمَن لَّمْ يَسْتَطِعْ فَإِطْعَامُ سِتِّينَ مِسْكِينًا ذَلِكَ لِتُؤْمِنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ وَتِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ وَلِلْكَافِرِينَ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾(المجادلە:١-٤).

## دووەم: هۆکاری دابەزینی ئایەتەکان

دیاردەی (الظهار) واتە: دانانی هاوسەر لە جێگەی دایك و پێی بوترێت تۆ وەك دایکم وایت یان لەجێگەی ئەویت – ئەمە لەسەردەمی نەفامیدا کارێکی بڵاو بوو، لەو کارانە بوون کە کەسانی سەردەمی نەفامی دایان هێنابوو و لەسەری ڕاهاتبوون و خوویان پێوە گرتبوو، هەتا وەك شەرع و یاسای لێ هاتبوو لایان، پیاو هەبوو لە ناو ئەواندا ئەگەر ڕقی لە خێزانەکەی بوایە یان لێی تورە بوایە، پێی دەوت، تۆ لەجێگەی دایکمیت، ئیتر خێزانەکەی لەسەری حەرام دەبوو.

* لە سەردەمی ئیسلامدا، (أوسی کوڕی صامت) کە برای هاوەڵی بەڕێز (عبادة ی کوڕی صامت) بوو بە خێزانەکەی خۆی وت: کە تۆ لەجێگەی دایکمیت، کە خێزانەکەی بریتی بوو لە (خولة کچی ثعلبة)، پاش ئەوە مێردەکەی بۆی دەرکەوت کە دەبێت بچێتە لای، بەڵام ئافرەتەکە لە نەفسی خۆیدا نەیتوانی ئەمە بکات، ئینجا چوو بۆ لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) کەلەم کارەدا بڕیاری بۆ بدات، و لەگەڵیدا کەوتە موجادەلە، ئیتر خوای گەورەیش ئایەتێکی لەم بارەوە دابەزاند.

* پێشەوا (أبو داود) لە (السنن) دا لە(خویلة)ی[٦٤٥] کچی (مالك)ی کوڕی (ثعلبة) گێڕاویەتییەوە کە وتی: مێردەکەم منی لە شوێن دایکی خۆی دانا کە (أوسی کوڕی صامت)ە، منیش هاتم بۆ لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە سکاڵای لا بکەم، و پێغەمبەری خوا (ﷺ) گفتوگۆ و موجادەلەی لەگەڵ دەکردم دەربارەی مێردەکەم و دەیفەرموو:تۆ لە خوا بترسە، ئەوە کوڕی مامی خۆتە، زۆری پێ نەچوو هەتا ئایەتی قورئان بۆ پێغەمبەر دابەزی: ﴿ قَدْ سَمِعَ اللَّهُ قَوْلَ الَّتِي تُجَادِلُكَ فِي زَوْجِهَا وَتَشْتَكِي إِلَى اللَّهِ وَاللَّهُ يَسْمَعُ تَحَاوُرَكُمَا إِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ بَصِيرٌ﴾ تا کۆتایی ئایەتەکان،...ئینجا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی، با بەندەیەك

٦٤٥-(خویلة) بچوککراوەی (خولة)یە.

ئازاد بکات، منیش وتم:ناتوانێت و نیەتی، ئینجا فەرموی: با دوومانگ لەسەر یەك بەرۆژوو بێت، منیش وتم:ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بێگومان ئەو پیاوێکی پیرە لە رێگەی رۆژو گرتندا نەماوە، ئینجا فەرمووی: با خواردنی شەست کەس بدات.

منیش وتم: شتێکی وای نییە کە ببەخشێت، ئینجا مێردەکەی لەو کاتەدا هەندێك خورمای هێنا، ئافرەتە رموویەتی کە دەڵێت:منیش وتم:بە هێندەی خورماکەی خۆی یارمەتی دەدەم، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی:بەراستی کارێکی چاکت کرد برۆ خورماکە ببەخشەرەوە بەسەر شەست هەژاردا و پاشان بگەرێرەوە بۆ لای کورە مامەکەی خۆت).[٦٤٦]

## سێیەم: تەفسیری شیکاری ئایەتەکان

-خوای گەورە گوێی لە قسەی ئەو ئافرەتە بوو کە مێردەکەی پێی وت:تۆ لە جێگەی دایکمیت، خوای گەورەیش بەزەیی پێیدا هاتەوە.

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿قَدْ سَمِعَ اللَّهُ قَوْلَ الَّتِي تُجَادِلُكَ فِي زَوْجِهَا﴾ خوای گەورە قسەی ئەو ئافرەتەی بیست کە هات بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) تا دەربارەی مێردەکەی گفتو گۆی لەگەڵدا بکات،کە پێی وتبوو:تۆ لەجێگەی دایکمیت.

-زانا (ابو السعود) دەڵێت: (مانای ئەوەی کە خوای گەورە قسەکانی بیست، ئەوە وەڵامێك بوو بۆ دوعا و پاڕانەوەکەی، نەك تەنها ئەوەی کە خوا بیستوویەتی و زانیویەتی وەك لە ئایەتەکەدا هاتووە: ﴿وَاللَّهُ يَسْمَعُ تَحَاوُرَكُمَا﴾. واتە: ئاگای لێتان بوو کە گفتوگۆ و قسەتان دەکرد).

٦٤٦-أخرجه أبو داود في السنن كتاب النكاح باب الظهار حديث (٢١٩٩) (عون المعبود ٦: ٣٠١).

- خاوەنی (التحرير والتنوير) دەڵێت: (ووشەی (سماع) لە ئایەتەکەدا، واتە، خوای گەورە بیستی و داواکەی وەڵام دایەوە و قبوڵی کرد، بە تایبەتی کە (قد) چوتە سەر ووشەکە و واتە کارەکە بە تەواوی ڕویداوە، وەڵامی داواکە بە شوێنی خۆی گەیشتووە).

- زانا (الطباطبائي) لە (الميزان)دا دەڵێت: (مەبەست لە وشەی (السمع) لە ئایەتی: ﴿قَدْ سَمِعَ اللَّهُ﴾دا، بریتییە لە وەڵامدانەوەی دوعا و پاڕانەوەکە و بەجێ گەیاندنی کارەکە، ئەمە لە شێوەی (كناية)دایە، کە بڵاوە و بەڵگەیش لەسەری ئەم ئایەتەیە: ﴿تُجَادِلُكَ فِي زَوْجِهَا وَتَشْتَكِي إِلَى اللَّهِ﴾ دیوی ئاشکرایش لە ئایەتەکەدا ڕێگایەك دەگەیەنێت کە جیا بوونەوەی نەبووە لە مێردەکەی.

بەڵام ئایەتی ﴿وَاللَّهُ يَسْمَعُ تَحَاوُرَكُمَا﴾ ئەوا بیستنەکە لێرەدا بە مانا زانراوەکەی خۆیەتی).[٦٤٧]

﴿وَتَشْتَكِي إِلَى اللَّهِ﴾ واتە: ئافرەتەکە سکاڵای خۆی بۆ لای خوا دەبات.

﴿وَاللَّهُ يَسْمَعُ تَحَاوُرَكُمَا﴾ واتە: خوای گەورە گفتوگۆکەتان دەبیستێت، کە لەنێوان (خولەی کچی ثعلبة) و پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕویدا.

﴿إِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ بَصِيرٌ﴾ (المجادله:١). بەڕستی خوای گەورە بیسەر و بینەرە، هەموو شتێك دەبیستێت و هەموو شتێکیش دەبینێت.

باوەڕدار پێویستە بەرامبەر خوای گەورە ئاگاداربێت لە مامەڵەکردنی لەگەڵ خێزانی و لەگشت مامەڵەکانی تریشیدا.

_ دانانی هاوسەر لە جێی دایك حەرامە.

---

٦٤٧- الميزان للطباطبائي. ١٩:١٧٨.

﴿الَّذِينَ يُظَاهِرُونَ مِنكُم مِّن نِّسَائِهِم مَّا هُنَّ أُمَّهَاتِهِمْ إِنْ أُمَّهَاتُهُمْ إِلَّا اللَّائِي وَلَدْنَهُمْ وَإِنَّهُمْ لَيَقُولُونَ مُنكَرًا مِّنَ الْقَوْلِ وَزُورًا وَإِنَّ اللَّهَ لَعَفُوٌّ غَفُورٌ﴾ (المجادلە:٢).

**(الظهار) لە زمانەوانیدا: لە (الظهر) وەرگیراوە کە پێچەوانەی (البطن)ە، واتە دیار و ڕووکاری دەرەوەی. (ظاهرالرجُلُ إمراتَهُ مظاهرة و ظهاراً) بە خێزانەکەی خۆی وت: (انتَ عليَّ كظهر ذات رحم). واتە: تۆ لە جێگەی دایکمیت.** [٦٤٨]

**(الظهار) لە زاراوەدا: بریتییە لەوەی کە خێزانەکەی هاوشێوەی ئەو کەسانە بکات یان بە ئەندامێك لەوان داینێت کە لەسەری حەرام دەبن ، ئەگەر بۆ ماوەیەکیش بێت یان بە ئەندامێك لەوان.** [٦٤٩]

**هەروەها لە ئایەتی ﴿مِنكُم﴾دا، ئینکاری ئەو کارە دەکات و ڕوونی دەکاتەوە کە ئەو کارە ناگونجێت بۆ دەستە و تاقمی باوەڕداران، ئەوە تاوان و ستەم و خراپەیە.**

**ئایەتی:** ﴿الَّذِينَ يُظَاهِرُونَ مِنكُم مِّن نِّسَائِهِم مَّا هُنَّ أُمَّهَاتِهِمْ إِنْ أُمَّهَاتُهُمْ إِلَّا اللَّائِي وَلَدْنَهُمْ وَإِنَّهُمْ لَيَقُولُونَ مُنكَرًا مِّنَ الْقَوْلِ وَزُورًا وَإِنَّ اللَّهَ لَعَفُوٌّ غَفُورٌ﴾ **واتە: هاوسەرەکانیان بەو قسەیە نابنە دایکیان، چونکە دایکیان تەنها ئەوانەن کە ئەوانیان لێ بووە، ئەوانە قسەیەکی نابەجێ دەکەن و بوختانێکی ناپەسەند دەڵێن.**

**(إبن عاشور) دەڵێت: (ڕستەی ﴿مَّا هُنَّ أُمَّهَاتِهِمْ﴾ هەواڵ دانە لە ﴿الاَّ الذين﴾ واتە: خێزانەکانیان، دایکیان نین، تەنها بەوەی یەکێکیان بڵێت: تۆ لە جێگەی دایکمیت. ئەمە پێشەکییەکە بۆ بەتاڵ کردنەوەی) شوێنەواری (صیغة) ی (الظهار) لە حەرامکردنی خێزاندا، بەوەی ئاماژەدەکرێت کە دایکایەتی ڕاستییەکی جێگیرە ، و بە قسە دروست نابێت ، تەنها قسە ڕاستی شتەکان ناگۆڕێت.**

---

٦٤٨–لسان العرب ٤: ٢٧٧٠: ٢٧٦

٦٤٩– الفقة الأسلامي وأدلتة د. وهبة الزحيلي ٧: ٥٨٥.

وەك خوای گەورە لە سوورەتی (الأحزاب)دا فەرموویەتی: ﴿مَّا جَعَلَ اللَّهُ لِرَجُلٍ مِّن قَلْبَيْنِ فِي جَوْفِهِ وَمَا جَعَلَ أَزْوَاجَكُمُ اللَّائِي تُظَاهِرُونَ مِنْهُنَّ أُمَّهَاتِكُمْ وَمَا جَعَلَ أَدْعِيَاءَكُمْ أَبْنَاءَكُمْ ذَٰلِكُمْ قَوْلُكُم بِأَفْوَاهِكُمْ وَاللَّهُ يَقُولُ الْحَقَّ وَهُوَ يَهْدِي السَّبِيلَ﴾ (الأحزاب:٤).

واتە (خوا دوو دڵی دروست نەکردووە لە دەروونی هیچ کەسێکدا (دوو بیر و باوەڕ جێی نابێتەوە) ئەو هاوسەرانەتان کە پێیان دەڵێن: ئێوە لە جێی دایکمانن، خوا نەیکردوون بە دایکتان، ئەوانیش بە قسەی خۆتان دەیکەن بە کوڕی خۆتان ، خوا نەیکردوون بە کوڕتان ئەوانە قسەیەکن کە بە زارتان دەیڵێن ، خوایش حەق بێژە و هەر ئەو ڕێبازی ڕاست و دروست نیشانی بەندەکانی دەدات).

(الألوسي) دەڵێت: ﴿إِنْ أُمَّهَاتُهُمْ﴾ واتە: لە ڕاستیدا ئەوانە دایکیان نین، ﴿إِلَّا اللَّائِي وَلَدْنَهُمْ﴾ ناشوبهێنرێن بە دایکیان چونکە ئەوان لەسەریان حەرامن و هاوسەران حەلاڵن، ئەوەی کە پەیوەندی بووە لە نێوانیاندا شیرپێدان بووە کە خوا دایناوە، و خێزانەکانی پێغەمبەریش (ﷺ) دایکانی ئیماندارانن ئەمانیش لە شوێنی دایکانن و حوکمی ئەوانیان هەیە...).[٦٥٠]

﴿وَإِنَّهُمْ لَيَقُولُونَ مُنكَرًا مِّنَ الْقَوْلِ وَزُورًا وَإِنَّ اللَّهَ لَعَفُوٌّ غَفُورٌ﴾ ئەمەیش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە (ظهار) لە جێگەی دایك دانان حەرامە چونکە قسەیەکە بە تاوان و بوهتان وتراوە.

﴿لَعَفُوٌّ غَفُورٌ﴾واتە: (بێگومان خوا چاوپۆشی دەکات و لێخۆش دەبێت(ئەگەر ئەوان پەشیمان ببنەوە داوای لێخۆشبوون بکەن).

٦٥٠–روح المعاني الألوسي ٢٨: ٥ بەدەستکاری یەوە.

## چوارەم: کەفارەتی (الظهار) هاوسەر لەجێگەی دایك دانان

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَالَّذِينَ يُظَاهِرُونَ مِن نِّسَائِهِمْ ثُمَّ يَعُودُونَ لِمَا قَالُوا فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مِّن قَبْلِ أَن يَتَمَاسَّا ذَٰلِكُمْ تُوعَظُونَ بِهِ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ (٣) فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ مِن قَبْلِ أَن يَتَمَاسَّا فَمَن لَّمْ يَسْتَطِعْ فَإِطْعَامُ سِتِّينَ مِسْكِينًا ذَٰلِكَ لِتُؤْمِنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ وَتِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ وَلِلْكَافِرِينَ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ (المجادله: ٣-٤).

- خوای گەورە لەم دوو ئایەتە پیرۆزەدا کەفارەتی(ظهار) ی بۆ ڕون کردوینەتەوە، بۆ کەسێك کە بیەوێت پەشیمان بێتەوە لەوەی کە وتویەتی و بگەڕێتەوە بۆ لای هاوسەرەکەی و تێکەڵاوی بکات، پاش ئەوەی کە پێی وتبوو: تۆ لە جێگەی دایکمیت، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَالَّذِينَ يُظَاهِرُونَ مِن نِّسَائِهِمْ ثُمَّ يَعُودُونَ لِمَا قَالُوا﴾ گەڕانەوە لێرەدا، پەشیمان بوونەوەیە لەو قسەی کە وتراوە.

﴿فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ﴾ واتە: ئازادکردنی بەندەیەکی لەش ساغ و بێ عەیب، ئیتر بچووك بێت یان گەورە، نێر بێت یان مێ، گرفتی نییە.

﴿مِّن قَبْلِ أَن يَتَمَاسَّا﴾ واتە: پێش ئەوەی هیچ لێك کەتنێك لە نێوانیاندا ڕوو بدات لە (جماع) جوتبوون یان ماچ کردن یان هەر شتێك لەو شێوانە بێت بۆ لەزەت وەرگرتنن، ئەمەش ڕێڕەوی زۆرینەی زانایانی شەرع و (فیقه)ە.

﴿ذَٰلِكُمْ تُوعَظُونَ بِهِ﴾ واتە: ئەو بڕیارە ئێوەی پێ ئامۆژگاری دەکرێت تا دەست لە (ظهار) هەڵبگرن، لەبەر ئەوەی حەرامە و کەفارەتەکەی قورس و گەورەیە.

(الزمخشری) دەڵێت: حوکم و بڕیارەکە ئێوەی پێ ئامۆژگاری دەکرێت، چونکە حوکم و بڕیار بە کەفارەتدان، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە تاوانێك ئەنجامدراوە، پێویستە ئەو

حوکمە بە ئامۆژگاری وەرگرن تا جارێکی تر نەگەڕێنەوە بۆ سەر (ظهار) و لە سزا و تۆڵەی خوا بترسن لەسەر ئەنجامدانی).[651]

﴿وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ﴾(المجادله:٣).

واتە: (خوایش ئاگادارە بەو کار و کردەوانەی کە ئەنجامی دەدەن).

(الآلوسي) دەڵێت: ﴿وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ﴾ واتە: ئەو کارانەی کە ئێوە ئەنجامی دەدەن وەك: بێ باوەڕبوون و ئەو کارەی کە بە تاوان دادەنرێت وەك (ظهار)، (خبير) خوا ئاگادارە بە ئاشکرا و نهێنیان، و سزاتان دەدات لەسەری، جا ئێوەیش پارێزگاری لە سنورەکانی خوا بکەن کە دایناون لەگەڵ شتێك لەو خراپە و حەرامانەدا مەبن.[652]

خاوەنی تەفسیری (في ظلال) .دەڵێت: ﴿ذَٰلِكُمْ تُوعَظُونَ بِهِ﴾ کەفارەت یاد خستنەوە و ئامۆژگارییە، بەوەی کە نەگەڕێنەوە سەر (ظهار) کە بە پێی حەق و زانراو کارێکە نابێت ببێت ﴿وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ﴾ خوای گەورە زانا و شارەزایە بە ڕاستی و شارەزایە بە ڕوودانی کارەکە و و شارەزایشە بە نییەت و مەبەستتان لە کارەکەدا ئەمە پێش تەواو بوونی حوکمەکە دێت تا دڵەکان بە ئاگا بهێنێتەوە و پەروەردەی نەفسەکان بکات و بە ئاگایان بهێنێتەوە کە هەمیشە خوای گەورە ئاگادارە بەسەر کار و فەرمانەکاندا بە شارەزایی و زانستی خۆی بە ئاشکرا و بە نهێنیەکانیش).[653]

ئایەتی: ﴿فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ مِن قَبْلِ أَن يَتَمَاسَّا فَمَن لَّمْ يَسْتَطِعْ فَإِطْعَامُ سِتِّينَ مِسْكِينًا وَلِلْكَافِرِينَ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾(المجادله:٤).

واتە: ئەگەر هەر کەس نەیتوانی بەندەیەکی ساغ ئازاد بکات، ئەوا لە سەرێتی کە دوومانگ لەسەر یەك ڕۆژوو بگرێت، ئەگەر نەیتوانی ڕۆژووی دوومانگەکە بگرێت، ئەوا

---

٦٥١–الكشاف ٤: ٤٨٧.

٦٥٢–روح المعاني ٢٨: ١٣.

٦٥٣–الظلال ٦: ٣٥٠٦ –٣٥٠٧ بەدەستکاری یەوە.

لەسەری پێویستە کە خواردنی شەست هەزار بدات ﴿ذَٰلِكَ لِتُؤْمِنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ﴾ واتە: ئەوەی ئاماژەی بۆ کراوە لە حەرامکردنی (ظهار) و کەفارەتەکەی (لەبەر ئەوەیە کە باوەڕتان پتەوبێت بە خوا و پێغەمبەر (ﷺ) لە پێویستی یەکانی ئیمانیش ئەوەیە کە پابەند بن بەم حوکم و بڕیارانەوە.

﴿وَتِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ﴾ ئەوە سنوری دیاری کراوی خوایە و نابێت تێی بپەڕێنن و بیشکێنن.

﴿وَلِلْكَافِرِينَ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ (المجادلة:٤) بێ باوەڕنیش سزای بە ئازاریان هەیە، چونکە بێ باوەڕ بوون بە خوا و سنورەکانیان شکاند و تێیان پەڕاند).

## سوود و وانە گرنگەکانی ئایەتەکان

١- مانای (العودة) لە ئایەتی: ﴿ثُمَّ يَعُودُونَ لِمَا قَالُوا﴾دا:

زانایانی (فیقه) لەمانای (العودة)دا ڕا و بۆچونی جیاوازیان هەیە، و مەبەستەکانیان جیاوازە.

ڕێڕەوی (الظاهرية) بۆچونیان وایە کە، بۆ جاری دووەمیش دووبارەی کردۆتەوە، ئەمە لە ڕوکاری ئاشکرای دەقی ئایەتەکە وەردەگیرێت.[٦٥٤]

* بۆچوونی ڕێڕەوی (الشافعی) دەربارەی (العودة) دەڵێت: بۆ ماوەیەك خۆی لە خێزانەکەی بگرێتەوە کە بتوانێت دواتر تەڵاقی بدات لەو ماوەیەدا، بەڵام تەڵاقی نادات و نایکات.بەوەش بەڵگەیان هێناوەتەوە لەسەری کە (الظهار) بریتی بووە لە شوبهاندنی خێزانەکەی بە دایك، ئەوە دەگەیەنێت کە نابێت خۆی لێ بگرێتەوە، ئەگەر خۆی لێی گرتەوە، ئەوا گەڕاوەتەوە بۆ سەر ئەوەی کە وتوویەتی.[٦٥٥]

٦٥٤-المحلي لأبن حزم الظاهري ١٠: ٥٠.

٦٥٥-المجمع بشرح المذهب النووي ١٦: ٣٥٧.

* بۆ چوونی ڕێڕەوی (حەنەفییەکان) دەربارەی (العودة) دەڵێت: بێگومان مێردەکەی خۆی ئامادە کردوە و ویستویەتی لەگەڵ خێزانەکەیدا سەر جێگەیی بکات، ئینجا ئایەتەکە ﴿ثُمَّ يَعُودُونَ﴾ واتە: پاشان پاشگەز و پەشیمان بوونەوە لەوەی کە وتبویان کە کاری سەرجێگەیی ئەنجام بدەن، چونکە ئەوەی کە کەسی (مظاهر) ئەوکەسەی خێزانەکەی لە جێگەی دایکی دانابوو – وتبووی، بریتی بوو لەوەی کە حەرام بوو سەرجێگەیی لەگەڵ هاوسەرەکەی بکات، پەشیمان بوونەوە لەوەی کە شکاندبووی و هەڵی وەشاند بوویەوە، ئیتر بەوە ڕێگەی پێدەدرا کە سەر جێگەیی لەگەڵ خێزانەکەی بکات.[٦٥٦]

* ڕێڕەوەی (حەنەفییەکان) کە ڕێڕەوەی (حنبلی و مالکی) دەگێڕێتەوە بۆ چونیان وا بووە کە ویستویەتی سەر جێگەیی لەگەڵدا بکات و نیازی خۆی لە سەر دەربڕی.[٦٥٧]

* قسە و بۆچوونی لەپێش لەم مەسەلەیەدا، ئەوەیە کە زۆرینە بۆی چوون، کە بریتین لە: (حەنەفییەکان و حەنبەلیەکان و مالیکییەکان) و ڕێڕەوی (شافعییەکانیش) لەم مەسەلەیەدا، لە مانای ڕێڕەوی زۆرینەی نزیك بوونەتەوە، چونکە گەڕانەوە بۆ خۆگرتن یان جوت بوون و سەرجێگەیی، یان هێشتنەوەی دوای دەربڕینی (ظهار) و بەبێ تەڵاقدانی، ئەوە دەگەیەنێت کە ویستی بووە و مەبەستی بووە تێکەڵاوی لەگەڵ خێزانەکەیدا بکات، و نیازی بوە کە لەگەڵی جوتببێت. کە ئەمەیش بۆ چونی زۆرینەیە.

* بەڵام دەربارەی ڕێڕەوی (ظاهرییەکان) لەمانای (العودة)دا ئەوە (مذهب)ێکی بەتاڵ و ڕەتکراوەیە، ئیتر چۆن (عودة) بەوە تەفسیر دەکات کە جارێکی تر (ظهار) ی لە خێزانەکەی کردووە بەڕاستی قورئان بە شێوەیەك باسی ئەم کارەی کردووە کە تاوان و بوهتان و ستەم بووە.

(إبن العربی) دەڵێت: (ئەو قسە و بۆچونە ی کە دەڵێت (العودة) بریتی بووە لە گەڕنەوە بۆ سەر قسەکە و دووبارەی کردۆتەوە لە (ظها)دا ئەوە بە یەکلایەنە وتەیەکی پووچ و

---

٦٥٦–بدائع الصنائع للكساني ٣: ٢٣٦.

٦٥٧–المغني لأبن قدامة ٧: ٣٥٢ – والشرح الصغير١: ٤٧٨.

بەتاڵە و ڕاست نابێت، کە لەوە دەچێت لە نەزانییەکانی (داود الظاهري).[٦٥٨] و دەستەو تاقمەکانی ئەوبێت، و چیرۆکی (ظاهري)یەکان گێڕدراوەتەوە و لەباسی کەفارەتەکەدا باسی گەڕانەوە بۆسەر وتنەوەی (ظهار) نەکراوە، هەروەها ماناکە بەتاڵ دەکاتەوە، چونکە خوای گەورە وا باسی کردوە کە ئەو وتەیە تاوان و درۆ و بوهتان بوو، ئیتر چۆن بەو دەوترێت کە وتەکەی دووبارە کردبێتەوە کە حەرام بووە و هۆکارەکەش ئەوی لێ ئاگادار کراوە و کەفارەتیشی کەوتۆتە سەر؟ ئەمە ناگونجێت، ئایا نابینێت کە هەرچ هۆکارێك کەفارەتی بکەوێتە سەر مەرجی ئەوەی تێ ناکەوێت کە دووبارە بکرێتەوە لە کوشتن و جوت بوون و لە ڕۆژو و یان لەشتی تردا).[٦٥٩]

٢- پێش کەفارەتەکە (جوت بوون) حەرامە.

**ڕوونکردنەوەی حوکمی (لەزەت و ڕابواردن) بەبێ (جوت بوون):**

*زانایانی (فیقە) یەکدەنگن و ڕێك کەوتوون کە (جماع) کردن، واتە (جوت بوون) پێش کەفارەتەکە حەرامە، لەسەر ئەمەیش بە ڕواڵەت و ئاشکرای (کتاب) و (سنة) بەڵگەیان هێناوەتەوە.

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿وَالَّذِينَ يُظَاهِرُونَ مِن نِّسَائِهِمْ ثُمَّ يَعُودُونَ لِمَا قَالُوا فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مِّن قَبْلِ أَن يَتَمَاسَّا﴾

* لە (عکرمة)وە، لە (إبن عباس)ەوە (خوا لێیان ڕازی بێت): ((بەڕاستی پیاوێك (ظهار)ی لە خێزانەکەی کرد - واتە پێی وت تۆ وەك دایکمیت - پاشان لە گەڵیدا جوت بوو پێش ئەوەی کەفارەتەکەی بدات، ئینجا چوو بۆ لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) و هەواڵی دا پێی، پێغەمبەر فەرمووی: چی پاڵی پێوە نایت لەسەر ئەنجامدانی ئەم

٦٥٨-ئەوە (أبو سليمان داود بن علي بن خلف الأصبهاني)یە کە ناسراوە بە (ألظاهري)ناوەکەی نیسبەت دراوەتە پاڵ مەزهەبەکەی - ڕاوبۆچوونی زۆری هەیە کە تیایدایە پێچەوانەی ڕا و بۆچوونی زۆرینەیە و مەزهەبەکەی ئەوە پشت بەوە دەبەستێت کە لەڕواڵەتی دەقەکان بڕیار وەردەگرێت، و شوێنکەوتووی لە بەغداد و شیراز و شوێنانی تریش هەیە، و مەزهەبەکەی لە کۆتایی سەدەی پێنجەمی کۆچیدا کوژایەوە.

٦٥٩-احكام القرآن لأبن العربي المالكي ٤: ١٧٤١.

کارەت؟ وتی سپێتی قاچیم بینی. پێغەمبەر فەرمووی: خۆتی لێ بە دوور بگرە تا کەفارەتەکەی دەدەیت).[٦٦٠]

لەمانەی پێشەوە بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە حەرامە کەسێك لەگەڵ هاوسەرەکەی جوت ببێت کاتێك کە (ظهار)ی لێ کردووە، پێش ئەوەی کەفارەتەکەی بدات، ئەگەر کەسەکەی کە (ظهار) ی کردووە و لەگەڵ خێزانەکەیدا جوت بوو پێش کەفارەتدانەکە، ئەوە گوناهبار بووە و کەفارەتی تری ناکەوێتە سەر.

هەروەها لە چیرۆکی (سلمان) ی کوڕی (صخر البیاضی) دا کە (ظهار) ی لە خێزانەکەی کردبوو، پاشان لەگەڵی جوت بوو پێش ئەوەی کەفارەتەکەی بدات، و چوو بۆ لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە لەم کارەیدا بڕیاری بۆ بدات، ئەویش فەرمانی پێدا کە یەك کەفارەت بدات، دەقی فەرمودەکەیش لە (سنن الترمذي)دا بەم جۆرە هاتووە: (بەڕستی (سلمان) ی کوڕی (صخر الأنصاري البیاضي)، (ظهار) ی لە خێزانەکەی خۆی کرد، هەتا گەیشتە (رمضان) کاتێك نیوەی (رمضان) ڕۆیشت، شەوێکیان لەگەڵی جوت بوو، ئینجا هات بۆ لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) و ئەوەی بۆ باس کرد، پێغەمبەری خوایش (ﷺ) پێی فەرموو: ((بەندەیەك ئازاد بکە)) ووتی: ((نیمە و شك نابەم)) پێغەمبەر فەرمووی: ((دوو مانگی لەسەر یەك بەڕۆژو بە)) وتی: ((ناتوانم)) پێغەمبەر فەرمووی: ((خواردنی شەست کەسی هەژار بدە)) وتی ((نیمە و شك نابەم))، ئینجا پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە (فروە ی کوڕی عمرو) ی وت: ((ئەو (عرق)ە ی بدەرێ – واتە سەبەتە خورمایەك بوو شانزە (صاع) ی دەگرت – کە خواردنی شەست کەسی هەژار دەبوو).[٦٦١]

---

٦٦٠–رواه أبو داود في السنن كتاب الطلاق باب في الظهار حديث (٢٢٢١) ورواه الترمذي في السنن و قال: هذا حديث حسن صحيح غريب، سنن الترمذي كتاب الطلاق. باب في الظاهر حديث (١١٩٩). و رواه إبن ماجة في السنن كتاب الطلاق باب المظاهر بجامع قبل أن يكفر ١: ٦٦٦ حديث (٢٠٦٥) و ذكره الألباني في صحيح الترمذي برقم (٩٥٨)

٦٦١–رواه الترمذي في السنن و قال: حديث حسن، و العمل على هذا الحديث عند أهل العلم. سنن الترمذي كتاب الطلاق باب: ماجاء في كفارة الظهار حديث (١٢٠٠) –٣: ٥٠٣.

لەم فەرمودەیەدا بەڵگەی ئەوە هەیە کە کەسێك (ظهار) ی لە خێزانی کردبێت حەرامە لەسەری لە گەڵیدا جوت ببێت، و خۆ ئەگەر لەگەڵی جوت بوو پێش کەفارەت دانەکە، ئەوە گوناهبار بووە، پێویست بە کەفارەتدانی تر ناکات. [٦٦٢]

زانایانی (فیقە) ڕا و بۆچونی جیاوازیان هەیە دەربارەی ئەوەی کە (أستمتاع) بەبێ جوت بوون وەربگیرێت لێیان، ڕێڕەوی زۆرینە – حەنەفیەکان و حەنبەلیەکان و مالیکییەکان – بۆ چونیان وایە کە جوت بوون و (إستمتاع) لەزەت وەرگرتنیش حەرامە.

ڕێڕەوی (الشافعی لە (وتە)یەکیدا دەڵێت: ئەوەی کە حەرامە تەنها جوت بوونە. زۆرینەیش بەڵگەیان بە ئایەتەکە هێناوەتەوە کە فەرموویەتی: ﴿مِّن قَبۡلِ أَن یَتَمَآسَّا﴾ کە ئاماژە دەکات بۆ حەرام بوونی (إستمتاع) بە هەر شێوەیەك بێت. کەسێك کە (ظهار)ی لە خێزانی کردوە، کاتێك بە هاوسەرەکەی دەڵێت: تۆ وەك دایکمیت، ئەوا حەرام بوونەکە لێرەدا واتە (إستمتاع)یش حەرامە بە خێزانەکەی ئیتر بە هەر شێوەیەك بێت وەك چۆن (إستمتاع) لەگەڵ دایکدا حەرامە بە هەر شێوەیەك بێت.

بەڵگەی (الثوري) و (الشافعی) بریتی بوو لە: بێگومان ئایەتەکە باسی (مس)ی کردووە کە (کنایة)یە لەباتی (جماع) وەك ئەوەی کە حەرامە بەو مانایە نییە کە بڵێت: بە جوتبوون لە گەڵیدا بمێنێتەوە ئەوە لە (حیض) دەچێت کە حەرامە (إستمتاع) لە نێوان ناوك و ئەژنۆی بکرێت.

– بۆچوونی ڕاست و پەسەند لەم مەسەلەیەدا: ئەوەیە کە زۆرینە بۆی چوون لەبەر بەهێزی بەڵگەکانیان چونکە سەلامەتتر و بەهێزترە، چونکە هەرکەس ڕان لە دەوری خەرمانێك بلەوەڕێنێت ئەوا نزیکە بچێتە ناوی. [٦٦٣]

---

٦٦٢–المذهب ٢: ١١٧ و المغني ٧: ٣٦٧ و الشرح الصغير ٢: ٦٥١ ورد المختار ٤: ٨٠٠.

٦٦٣–المغني ٧: ٣٤٨، و بدائع الصنائع ٣: ٢٣٤ وأحكام القرآن للجصاص ٣: ٤٢٣ وأحكام القرآن لأبن العربي ٤: ١٧٤٠ وأحكام القرآن للصابوني ٢: ٥٢٧.

## پێنجەم: مانای گشتی

(أوس)ی کوڕی (صامت)، (ظهار)ی لە خێزانەکەی کرد کە (خولەی کچی ثعلبة)بوو، پاشان بۆی دەرکەوت کە دەبێت لە گەڵیدا جوت ببێت بەڵام لێی قەدەغە کرا و نەیتوانی لە خۆیدا کارەکە جێ بەجێ بکات، پاشان (خولە) بە خێرایی چوو بۆ ماڵی پێغەمبەر (ﷺ) تا داوای بڕیار لە پێغەمبەر بکات، دەستی کرد بە گفتوگۆ کردن لەگەڵ پێغەمبەردا لەو بارەیەوە، تا قورئان دەربارەی دابەزی و خوێندرایەوە.

چەند ئایەتێکی ڕوون بوو کە سەرەتای سوورەتی (المجادلة) بوو، کە سوورەتەکە بەناوی ئەو ڕووداوەوە ناوبراوە کە وەحی لە پێناویدا دابەزی خوای گەورە وتەی ئەو ئافرەتەی بیست و وەڵامی داواکەی دایەوە، خوای گەورە بیسەری هەموو وتە و ڕازێکە، و زانایشە بە هەموو کارێك کە ڕوو دەدات، (ظهار)یش وتەیەکی تاوان و درۆ و بوهتان و ستەمە، چونکە هاوسەر بە هاوشێوەی دایك دادەنرێت، نەفسە ساغەکان ئینکاری ئەمە دەکەن و ڕەتی دەکەنەوە، هەروەها فیترەتی ڕێك و ڕاستیش، ئەوە هاوشێوەی لێك کردنێکی پووچ و بەتاڵە و پێچەوانەی حەق و ڕاستییە، دایکایەتی ڕاستەقینە شتێکی چەسپاو و حەقە و بە قسە و دەربڕین دروست ناکرێت. چونکە قسە و دەربڕین ڕاستی شتەکان ناگۆڕێت.

خوای گەورە فەرمووی: ﴿مَا جَعَلَ اللَّهُ لِرَجُلٍ مِّن قَلْبَيْنِ فِي جَوْفِهِ وَمَا جَعَلَ أَزْوَاجَكُمُ اللَّائِي تُظَاهِرُونَ مِنْهُنَّ أُمَّهَاتِكُمْ وَمَا جَعَلَ أَدْعِيَاءَكُمْ أَبْنَاءَكُمْ ذَٰلِكُمْ قَوْلُكُم بِأَفْوَاهِكُمْ وَاللَّهُ يَقُولُ الْحَقَّ وَهُوَ يَهْدِي السَّبِيلَ﴾(الاحزاب:٤).

لێرەدا ئیسلام دیاردەی (ظهار)ی حەرام کردووە، چونکە وتە و دەربڕینێکی ناپەسەند و نەشیاوە و ستەم و بوهتانە بۆ ئافرەت و سوکایەتی پێکردنێتی و هەروەها ئاژاوەیە بۆ ماڵی موسوڵمانان و تێکدانی پەیوەندیەکانی خێزان و کۆمەڵگایە و حەرامە و بکەرەکەیشی تاوانبارە و پێویستی بە کەفارەتدان هەیە ئەگەر پەشیمان بوویەوە لە

وتنەکەی و نیازی بوو بگەڕێتەوە جارێکی تر بۆ تێکەڵاوی لەگەڵ خێزانەکەی کەفارەتەکەیشی بە پێی ریزبەندییەکەیە نەك هەڵبژاردنی خۆی.

* ئازادکردنی بەندە ئەگەر نەبوو ڕۆژووگرتنی دوو مانگی لەسەریەك، ئەگەر ئەوەیشی نەتوانی دەبێت خواردنی شەست هەژار بدات.

* لە هەڵوێستی ئیسلام بەرامبەر مەسەلەی (ظهار): بەڵگە و نیشانەیەکی روون و یەکلاکەرەوە هەیە لەسەر ڕێزگرتنی ئیسلام لە ئافرەت و پاراستنی و پارێزگاریکردن لە بەرژەوەندییەکانی، هەروەها ئیسلام سوورە لەسەر چاکسازی و جێگیرکردنی خێزانی موسڵمان.

لەم کەفارەتەیشدا ئەوەی کە بەسوود و قازانجی تاك و کۆمەڵگا دەگەڕێتەوە بریتییە لە ئازادکردنی بەندە، ئیسلام هەڵوێستێکی ناوازەو تاك وێنە و بەرنامەیەکی جوانی هەیە بۆ ئازادکردنی بەندە لە

* هەروەها لە بەڕۆژووبونی دوو مانگی لەسەر یەك ئەمەش پاڵنەتەکردنی ڕەوشت و ئەخلاق و ڕێککردنەوەی هەڵس وکەوت و وەرزشی دەروونی و پاك کردنەوەیەتی بەرزبوونەوەی ڕۆحە، ڕۆژووگرتن ڕاهێنانە بۆ خۆڕاگری لەسەر برسێتی و ملکەچ بوونە بۆ خوای گەورە و سەرنەوی کردنە بۆ هەموو پەرستشێك و حیکمەتی خۆی هەیە، ڕۆژووگرتن دیوە ئاشکراکەی نارەحەتی و سزایە، بەڵام ناوەرۆکەکەی رەحمەت و بەزەییە، مرۆڤ فێری ئارامگرتن دەکات و لەسەر کردەوە چاکەکان یارمەتی دەدات و ئاسۆی بیرکردنەوە و تێرامان فراوان دەکات و سنگ و دەرون دەکاتەوە، هەروەها بەخشینی خۆراك بە شەست هەژار ئاوڕدانەوەیەکی ڕێزدارانە وە جوانە بۆ بەزەیی نواندن بەرامبەر هەژاران و هەستکردن بە ئازار و نارەحەتییەکانیان و تێکەڵاوبوون بە ژیانیان و ئاگاداربوون لە حاڵیان، لەمە تیژکردنەوەی هەستەکان و نەرمکردنەوەی هەست و سۆز و پاککردنەوەی دڵەکان و نەفسەکان دەردەکەوێت.

هەر بەو جۆرە لە کەفارەتەکەیشدا چەند حیکمەتێکی جوان و بەر و بومێکی بەنرخ بۆ نەفسەکان و کۆمەڵگا بەدی دەکەین، لەگەڵ قورسی و نارەحەتی و گرانییەکەیدا کەچی





هەر بەزەیی و میهرەبانییە بە خەڵکی و هۆکار و بۆ دوورکەوتنەوە لەو کارە خراپ و درۆ و بوهتانە.

## ڕونکردنەوەی وانەیەکی گرنگ لە جوانی و ناوازەییەکانی مێژووی ئیسلامی

مێژووی ئیسلامی بۆمان دەگێڕێتەوە کە (خەولەی کچی ثعلبە) ڕۆژێکیان پێشەوای موسوڵمانان(عُومەری کوڕی خطاب)ی لەسەر ڕێگایەکدا ڕاوەستاند، ئافرەتەکە دەستی کرد بە گفتوگۆو ئەویش گوێی بۆ ڕاگرت تا قسەکانی درێژەی کێشا لەوەدا کە بۆ پێشەوای باوەڕدارانی دەوت، وتی: ئەو زەمان و سەردەمە دوورکەوتەوە کە بە تۆ دەوترا (عُمَیر) واتە (عمری بچوك) ئینجا چەند ڕۆژێکی وا تێپەڕ نەبوو ناونرایت بە (عمر) پاشان چەند ڕۆژێکی تری وا تێپەر نەبوو هەتا ناو نرایت بە (امیر المؤمنین) پێشەوای باوەڕداران، جا لە کار و خەلافەتەکەتدا لە خوای گەورە بترسە و بزانە هەرکەس لە سزای خوا و قیامەت بترسێت ئەوا دووری لێ نزیك ئەبێتەوە و هەرکەسیش لە مردن بترسێت ئەوا لە فەوتان دەترسێت (واتە مردنی کتوپڕ) ئینجا (الجارود) بە ئافرەتەکەی وت: تۆ بەڕاستی زۆرت وت لە سەرپێشەوای باوەڕداران، ئینجا (عمر) (خوا لێی ڕازی بێت)وتی: وازی لێبهێنە لە گێڕانەوەیەکدا هاتووە دەڵێت: (کەسێك بە (عمر)ی وت: لەبەر ئەم ئافرەتە پیرە خەڵکەکەت ڕاگرت لە گفتوگۆ؟ ).

(عمر)یش فەرمووی: لەناوچوون بۆ تۆ. ئایا تۆ دەزانیت ئەم ئافرەتە کێیە؟ ئەویش وتی: نەخێر، (عمر) وتی: ئەمە ئەو ئافرەتەیە کە خوای گەورە گوێی لە سکاڵا و داواکەی گرت لە سەرو حەوت ئاسمانەوە، ئەمە (خولەی کچی ثعلبة)یە، سوێند بێت بەخوا ئەگەر ئەم واز لەمن نەهێنێت هەتا شەویش، ئەوا منیش وازی لێ ناهێنم و جێی ناهێڵم هەتا کار و پێویستییەکەی تەواو دەبێت).[٦٦٤]

٦٦٤-السیرة لبرهان الدین الحلبي ٢: ٧٢٤ ط محمد علي صبیح ١٣٥٣ه.

## پلەو پایەی (فاطمة) ی کچی پێغەمبەر (ﷺ)

(مسور)ی کوڕی (مخرمة) (خوا لێی ڕازی بێت)دەڵێت: (علي کوڕی (ابوطالِب) (خوا لێی ڕازی بێت) خوازبێنی کچی(ابوجهل)ی کرد، لەو کاتەدا (فاطمة) (ڕەزای خوای لێ بێت) ئەوەی بیست، هاتە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) و پێی ووت: قەومەکەت دەڵێن: کە بەڕاستی تۆ ڕقت هەڵناسێت بۆ خاتری کچەکانت، واتە گوێیان نادەیتێ، ئەوەتا (علي) دەیەوێت کچی (ابوجهل) بخوازێت. (مسور) دەلێت: پێغەمبەر (ﷺ) هەستا گوێم لێی بوو شایەتومانی هێنا و ئینجا فەرمووی: (دوای ئەمە من ژنم دا بە (أبوالعاص)ی کوڕی (ربیع) وادەی پێدام و ڕاستی لەگەڵ کردم، بەڕاستی (فاطمة) ی کچی محمد پارچەیەکە لە من، تەنها لەوە دەترسم تووشی تاوان و تاقیکردنەوەی بکەن، بە ڕاستی و سوێند بەخوا کچی پێغەمبەری خوا و کچی دوژمنی خوا قەت کۆنابنەوە لای پیاوێك)ئیتر(علي) (خوای لێ ڕازی بێت) وازی لەو خوازبێنییە هێنا.[٦٦٥]

## پلە و پایەی بنەماڵە ی پێغەمبەر (ﷺ)

لە (یزید)ی کوڕی (حیان)ەوە دەڵێت: من و (حُصین)ی کوڕی (سبرة)و(عمر)ی کوڕی (مسلم) چووین بۆ لای (زید)ی کوڕی (أرقم)، کاتێك دانیشتین لەلای (حصین) پێی وت: ئەی (زید) تۆ چاکەی زۆرت تووش بووە، پێغەمبەرت (ﷺ)دیوە، گوێت لە فەرموودەی بووە، غەزرات لەگەڵ کردووە، لەپشتییەوە نوێژت کردووە، بەڕاستی خێری زۆرت تووشبووە، ئەی (زید) بۆمان باسبکە، چیت لە پێغەمبەر (ﷺ) بیستووە، وتی:ئەی برازام (والله) من تەمەنم گەورە بووە و وادەم بەسەرچووە، هەندێك شتم لە یاد چووە لەوانەی کە لەبەرم کردبوو لە پێغەمبەرەوە (ﷺ)، ئەوەی پێتان دەڵێم لێم وەربگرن، ئەوەی باسی ناکەم زۆرم لێمەکەن، پاشان وتی: پێغەمبەر (ﷺ) ڕۆژێك هەستا وتاری بۆ داین لەسەر ئاوێك ناودەبرا بە (خم) لە نێوان (مكة) و (مدینة)دا. سوپاس وستایشی خوای کرد و ئامۆژگاری کرد و یادی خستینەوە، لەپاشدا وتی: ((دوای ئەمە ئاگاداربن،

---

[٦٦٥] - رواه مسلم في كتاب فضائل الصحابة و رواه (البخاري)في فضائل ((الصحابة/٣٥٢٣).

ئەی ئادەمیزادەکان من بەشەرێکم نزیکە نێردراوی خوا بێت و وەڵامی بدەمەوە، من دووشتی گەورەتان بۆ بەجێ دێڵم، یەکەمیان:پەیامی خوایی، کەڕێنمایی ونووری تێدایە، پەیامی خوا بگرن و باوەشی پێدا بکەن. هانی دان بۆ پابەند بوون بە قورئانەوە. پاش ئەوە فەرمووی: ((بنەماڵەی من (أهل البیت) یادتان دەخەمەوە بە بنەماڵەی من، یادتان دەخەمەوە بە بنەماڵەی من، یادتان دەخەمەوە بەبنەماڵەی من)) سێ جار. (حصین) پێی ووت: کێن بنەماڵەی ئەو ئەی زید؟ خێزانەکانی بنەماڵەی ئەو نین؟ وتی: خێزانەکانی بنەماڵەی ئەون، بەڵام بنەماڵەی ئەو کەسێکە زەکاتی بۆ نەشێت دوای خۆی، ووتی: ئەوانە کێن؟ ووتی: ئالی عەلی و ئالی (جعفر) و ئالی (عباس). وتی: هەموو ئەوانە بێ بەشن لەزەکات؟ ووتی: بەڵێ.).[٦٦٦]

---

[٦٦٦] - رواه مسلم في (فضائل الصحابة).

## باسی پێنجەم:
## ئەوەی لە سوورەتی (الممتحنة)دا دەربارەی ئافرەتان دابەزیووە:

**ئەم باسەیش لەم بەشانە پێك دێت:**

**یەکەم: لە دادپەروەرییەکانی ئیسلام و لێبوردەیی لەگەڵ غەیری موسوڵمانان.**

**دووەم: ئەوەی دەربارەی تاقیکردنەوەی ئافرەتە باوەڕدارە کۆچکردووەکان دابەزی.**

**سێ یەم: ئەوەی دەربارەی پەیمانی ئافرەتان دابەزی.**

**چوارەم: سوود و وانە گرنگەکانی ناو ئایەتەکە.**

### یەکەم: لە دادپەروەرییەکانی ئیسلام و لێبوردەیی لەگەڵ غەیری موسوڵمانان

**خوای گەورە فەرموویەتی:** ﴿عَسَى اللَّهُ أَن يَجْعَلَ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَ الَّذِينَ عَادَيْتُم مِّنْهُم مَّوَدَّةً وَاللَّهُ قَدِيرٌ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ (٧) لَّا يَنْهَاكُمُ اللَّهُ عَنِ الَّذِينَ لَمْ يُقَاتِلُوكُمْ فِي الدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُم مِّن دِيَارِكُمْ أَن تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوا إِلَيْهِمْ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ (٨) إِنَّمَا يَنْهَاكُمُ اللَّهُ عَنِ الَّذِينَ قَاتَلُوكُمْ فِي الدِّينِ وَأَخْرَجُوكُم مِّن دِيَارِكُمْ وَظَاهَرُوا عَلَى إِخْرَاجِكُمْ أَن تَوَلَّوْهُمْ وَمَن يَتَوَلَّهُمْ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ﴾ (الممتحنة:٧-٩).

**واتە: نزیکە خوا خۆشەویستی و سۆز بەرپا بکات لە نێوان ئێوە و ئەواندا کە دوژمنایەتیتان لەگەڵ کردن لەوان و هەندێکیان باوەڕبێنن، هەمیشە خوا بەدەستەڵاتە، هەر ئەو خوایەش لێخۆشبوو میهرەبانە، چاوپۆشی لەڕابردوو دەکات (٧) دڵنیاش بن کە خوا قەدەغەی ئەوەتان لێ ناکات کە چاکرەفتاری و دادپەروەری بکەن لەگەڵ ئەو کەسانەدا جەنگیان دژ نەکردوون و دژایەتی ئاینییان نەکردون و لە شوێنەوارتان دەریان**

نەکردوون، چونکە بەڕستی خوا دادپەروەرانی خۆشی دەوێت (٨) بەڕاستی خوا تەنها قەدەغەی ئەوەتان لێ دەکات کە پشتیوانی بکەن لەوانەی کە جەنگیان بەرپا کرد دژی ئاین و دەریان کردن لە شوێنەواری خۆتان و پشتیوانی ئەوانیان کرد ڕۆڵیان هەبوو لە دەرکردنتاندا، ئەوەش پشتیوانیان بکات و خۆشی بوێن، جائا ئەوانە هەر ستەمکارن).

## - ڕونکردنەوەیەك دەربارەی ناوەڕۆکەکە :

سەرەتای سوورەتی (الممتحنة)بە نەهی کردن لە پشتیوانی و خۆشەویستی بۆ دوژمنانی خوا دەستی پێ کردووە، لەبەر ئەوەی کە ئەمە فەساد و خراپە و زیان ی خێرا و پەلە و درەنگیشی بۆ دین و دنیا تیایە.

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَتَّخِذُوا عَدُوِّي وَعَدُوَّكُمْ أَوْلِيَاءَ تُلْقُونَ إِلَيْهِم بِالْمَوَدَّةِ وَقَدْ كَفَرُوا بِمَا جَاءَكُم مِّنَ الْحَقِّ يُخْرِجُونَ الرَّسُولَ وَإِيَّاكُمْ أَن تُؤْمِنُوا بِاللَّهِ رَبِّكُمْ إِن كُنتُمْ خَرَجْتُمْ جِهَادًا فِي سَبِيلِي وَابْتِغَاءَ مَرْضَاتِي تُسِرُّونَ إِلَيْهِم بِالْمَوَدَّةِ وَأَنَا أَعْلَمُ بِمَا أَخْفَيْتُمْ وَمَا أَعْلَنتُمْ وَمَن يَفْعَلْهُ مِنكُمْ فَقَدْ ضَلَّ سَوَاءَ السَّبِيلِ (١) إِن يَثْقَفُوكُمْ يَكُونُوا لَكُمْ أَعْدَاءً وَيَبْسُطُوا إِلَيْكُمْ أَيْدِيَهُمْ وَأَلْسِنَتَهُم بِالسُّوءِ وَوَدُّوا لَوْ تَكْفُرُونَ﴾ (المتحنة:١-٢).

واتە (ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە، دووژمنانی من و دوژمنانی خۆتان مەکەنە دۆستی گیانی بە گیانی، لە کاتێکدا خۆشەویستی و سۆزی خۆتانیان بۆ دەر دەبڕن، بەڕاستی ئەوان بێباوەڕیش بوون بەوەی لەلایەن خواوە بۆتان هاتووە، ئەوانە پێغەمبەر و ئێوەیش دەردەکەن لە مەککە، لەبەر ئەوەی کە باوەڕ دەهێنن بە خوای پەروەردگارتان. (ئەمەم بەگوێ بکەن) ئەگەر ئێوە دەرچوون بۆ تێکۆشان لە پێناوی من و بەدەستهێنانی ڕەزامەندی مندا، بە نهێنی خۆشەویستی خۆتانیان پێ دەگەیەنن، لە کاتێکدا من ئاگادارم بەوەی شاردوتانەتەوە و بەوەیش کە ئاشکراتان کردووە، جا هەرکەس لە ئێوە کاری وا بکات، ئەوە بەڕاستی ڕێبازی ڕاستی وون کردووە (١) هەر کاتێك خوانەناسان

دەستەڵاتیان هەبێت و ئێوەیان دەست بکەوێت ئەوە دەبنە دوژمنتان و دەست و زمانیان بەخراپە درێژ دەکەن بۆتان (بە هەرچی بۆیان بکرێت) ئەوانە پێیان خۆشبووە و ئاواتیان خواستووە کە ئێوە لە ئاینەکەتان هەڵگەڕێنەوە).

خوای گەورە ئاگاداری و ووریایی داوە دەربارەی سەرئەنجامی پشتیوانی کردن و خۆشەویستی بۆ دوژمنانی خوا لە ڕۆژی قیامەتدا، بە جۆرێك کە تەنها ئیمان و باوەڕ و کردەوە چاکەکان سوود بە بەندە دەگەیەنێت.

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿لَن تَنفَعَكُمْ أَرْحَامُكُمْ وَلَا أَوْلَادُكُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ يَفْصِلُ بَيْنَكُمْ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ﴾ (الممتحنة:٣).

واتە: (خزمان و ڕۆڵەکانتان هەرگیز فریاتان ناکەون، چونکە لە ڕۆژی قیامەتدا لە یەکتان جیا دەکەتەوە، بەڕاستی خوا بینایە بەو کار و کردەوانەی کە دەیکەن.)

پاشان خوای گەورە نمونەیەکی لە(بەری کردن)ی ئیبراهیم و شوێنکەوتوانی باوەڕداری هێناوەتەوە، کاتێك خۆیان بەری کرد لە کەسە نزیکە هاوەڵدانەرەکانیان، خوای گەورە فەرمووی: ﴿قَدْ كَانَتْ لَكُمْ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ فِي إِبْرَاهِيمَ وَالَّذِينَ مَعَهُ إِذْ قَالُوا لِقَوْمِهِمْ إِنَّا بُرَآءُ مِنكُمْ وَمِمَّا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللَّهِ كَفَرْنَا بِكُمْ وَبَدَا بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ الْعَدَاوَةُ وَالْبَغْضَاءُ أَبَدًا حَتَّىٰ تُؤْمِنُوا بِاللَّهِ وَحْدَهُ إِلَّا قَوْلَ إِبْرَاهِيمَ لِأَبِيهِ لَأَسْتَغْفِرَنَّ لَكَ وَمَا أَمْلِكُ لَكَ مِنَ اللَّهِ مِن شَيْءٍ رَّبَّنَا عَلَيْكَ تَوَكَّلْنَا وَإِلَيْكَ أَنَبْنَا وَإِلَيْكَ الْمَصِيرُ (٤) رَبَّنَا لَا تَجْعَلْنَا فِتْنَةً لِّلَّذِينَ كَفَرُوا وَاغْفِرْ لَنَا رَبَّنَا إِنَّكَ أَنتَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ (٥) لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِيهِمْ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُو اللَّهَ وَالْيَوْمَ الْآخِرَ وَمَن يَتَوَلَّ فَإِنَّ اللَّهَ هُوَ الْغَنِيُّ الْحَمِيدُ﴾(الممتحنة:٤-٦).

واتە: (ئەی ئیمانداران بەڕاستی لە ئیبراهیم و ئەوانەی لەگەڵیدا بوون، نمونەیەکی چاکتان خراوەتە بەرچاو، کاتێك کە بە قەومەکەی خۆیانیان وت، دوای ساڵەها بانگەواز، ئێمە بەرین لە ئێوە و لەو شتانەیش کە لە جیاتی خوا دەیپەرستن، ئێمە باوەڕمان بەو دین و ئاینەی ئێوە نییە، ئیتر دوژمنایەتی و ڕقەبەرایەتی لە نێوانماندا بەرپا بووە تا ئەو کاتەی کە باوەڕ بە خوای تاك و تەنها دەهێنن، جگە لەو بەڵێنەی کە ئیبراهیم دای بە

باوکی و ووتی: پەروەردگارا هەر پشتمان بەتۆ بەستووە و هەر بۆ لای تۆیش گەڕاوینەتەوە، سەر ئەنجامیش هەر بۆلای تۆیە (٤) پەروەردگارا مەمانکە بە مایەی گومڕایی بۆئەوانەی بێباوەڕ بوون لێشمان خۆش ببە پەروەردگارمان، بەڕاستی هەر تۆ خوایەکی بالادەست و دانایت (٥) سوێند بە خوا بەڕاستی لە سەرگوزەشتە و ژیانی ئیبراهیم و ئەواندا نموونە و پێشەنگێکی چاك هەیە، بۆ ئەوەی چاویان لێ بکەن، بۆ ئەو کەسەی کە ئاوات و ئومێدی ڕەزامەندی خوایە و لە ڕۆژی دوایی دەترسێت و حسابی بۆ دەکات، ئەوە با بزانێت خۆی زەرەر دەکات، چونکە خوا هەر خۆی بێنیازە و شایستەی هەموو جۆرە سوپاسێکە).

پاشان سوورەتەکە لە دیاردەیەکی لێبوردەیی ئیسلام لەگەڵ غەیرە موسوڵمانەکاندا دەدوێت، ئەوانەی کە دوژمنایەتی موسوڵمانان ناکەن و لەگەڵیان ناجەنگێن، ئیسلام بانگەوازی کردووە کە چاکەیان لەگەڵ بکرێت.

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿عَسَى اللَّهُ أَن يَجْعَلَ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَ الَّذِينَ عَادَيْتُم مِّنْهُم مَّوَدَّةً وَاللَّهُ قَدِيرٌ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ (٧) لَا يَنْهَاكُمُ اللَّهُ عَنِ الَّذِينَ لَمْ يُقَاتِلُوكُمْ فِي الدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُم مِّن دِيَارِكُمْ أَن تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوا إِلَيْهِمْ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ (٨) إِنَّمَا يَنْهَاكُمُ اللَّهُ عَنِ الَّذِينَ قَاتَلُوكُمْ فِي الدِّينِ وَأَخْرَجُوكُم مِّن دِيَارِكُمْ وَظَاهَرُوا عَلَى إِخْرَاجِكُمْ أَن تَوَلَّوْهُمْ وَمَن يَتَوَلَّهُمْ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ﴾ (الممتحنة: ٧-٩).

**هۆکاری دابەزین:** ئیمامی (بوخاری) لە (صحیح)ەکەیدا، لە (اسماء ی کچی ابی بکر) (خوا لێیان ڕازی بێت) گێڕاویەتییەوە (اسماء) ووتی: دایکم هات بۆ لام کە بتپەرست بوو لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) منیش داوای ڕونکردنەوی بڕیارم لە پێغەمبەر

(ﷺ) کرد ووتم: بە ڕاستی دایکم هات بۆ لام و ئارەزومەندی بتەکانە، ئایا پەیوەندیم لەگەڵی هەبێت و سەردانی بکەم؟ فەرمووی: بەڵێ پەیوەنیت هەبێت و سەردانی بکە.[٦٦٧]

هەروەها (البخاری) لە (صحیح)ەکەیدا لە (أسماء ی کچی ابی بکر) (خوا لێیان ڕازی بێت) گێڕاویەتی یەوە کە (أسماء) ووتی: دایکم هات بۆلام سەردانی کردم کە ئارەزومەندی بتەکان بوو لە سەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ)، منیش پرسیارم لە پێغەمبەر (ﷺ) کرد: ئایا سەردانی بکەم؟ فەرمووی: بەڵێ (إبن عیینة) ووتی: ئینجا خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿لَا يَنْهَاكُمُ اللَّهُ عَنِ الَّذِينَ لَمْ يُقَاتِلُوكُمْ فِي الدِّينِ﴾(المتحنة:٨).[٦٦٨]

ئێمەیش دەڵێین: پەند و ئامۆژگاری بە گشتگیری وتەکە نەك بە تایبەتمەندی هۆکارەکە وەردەگیرێت. ئایەتە پیرۆزەکە: ﴿لَا يَنْهَاكُمُ اللَّهُ عَنِ الَّذِينَ لَمْ يُقَاتِلُوكُمْ فِي الدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُم مِّن دِيَارِكُمْ أَن تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوا إِلَيْهِمْ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ﴾ ئەوە دەگەیەنێت کە هەموو چین و پۆلەکان لە(دین دوورەکان) دەگرێتەوە بە تایبەتی کەسە نزیکەکان، کە سەردان کردنیان و پاراستنی پەیوەندیەکانیان پێویست و واجبە، ئەگەر بۆ بێباوەڕیش بێت، ئەو لەسەر دینی خۆیەتی و، ئەو کەسەیشی سەردانی دەکات لەسەر دینی خۆیەتی، بەڕستی خوای گەورە فەرمانی داوە کە چاکە لەگەڵ دایك و باوکدا بکرێت، تەنانەت ئەگەر هاوەڵ دانەریش بن.

خوای گەورە لە سوورەتی (لقمان)دا فەرموویەتی: ﴿وَوَصَّيْنَا الْإِنسَانَ بِوَالِدَيْهِ حَمَلَتْهُ أُمُّهُ وَهْنًا عَلَىٰ وَهْنٍ وَفِصَالُهُ فِي عَامَيْنِ أَنِ اشْكُرْ لِي وَلِوَالِدَيْكَ إِلَيَّ الْمَصِيرُ (١٤) وَإِن جَاهَدَاكَ عَلَىٰ أَن تُشْرِكَ بِي مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ فَلَا تُطِعْهُمَا وَصَاحِبْهُمَا فِي الدُّنْيَا مَعْرُوفًا وَاتَّبِعْ سَبِيلَ مَنْ أَنَابَ إِلَيَّ ثُمَّ إِلَيَّ مَرْجِعُكُمْ فَأُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾(لقمان:١٤-١٥).

---

٦٦٧-رواه البخاري في صحيحه كتاب الهبة باب الهدية للمشركين. ورواه مسلم في صحيحه كتاب الزكاة باب فضل النفقة و الصدقة على الأقربين والزوج والأولاد و الوالدين ولو كانوا مشركين. حديث (١٠٠٣).

٦٦٨-رواه البخاري كتاب الأدب باب صلة الوالد المشرك حديث:٥٩٧٨.

واتە: (لێرەدا خوا ئامۆژگارییەکان لە دەمی لوقمان وەردەگرێت و خۆی ئامۆژگاریمان دەکات و دەفەرموێت): ئێمە فەرمانمان داوە بە ئادەمیزاد بە چاکرەفتاری لەگەڵ دایك و باوکیدا، دایکی بە ئێش و ئازار و لاوازی و بێتاقەتییەکی زۆرەوە (بە پێستی سکی نۆ مانگ) هەڵی گرتووە، بڕینەوەیشی لە دوای دووساڵە، فەرمانمان پێدا کە ئەی ئینسان سوپاسگوزاری منیش و دایك و باوکیشت بە، دڵنیابن کە گەڕانەوەتان هەر بۆلای منە(١٤) ئەگەر دایك و باوکت کۆششیان لە گەڵتا کرد، تا بەبێ هیچ بەڵگە و زانیاریەك هاوەڵ بۆ من بڕیار بدەیت، ئەوە فەرمانداریان مەبە و بە قسەیان مەکە، لە دنیاشدا هاوڕێ و هاوەڵ و خزمەتگوزارێکی چاکبە بۆیان، لە هەموو بارودۆخێکدا، شوێنی ڕێبازی ئەوانە بکەوە، کە بۆ لای من گەڕاونەتەوە، لەوەو دوا گەڕانەوەتان هەر بۆلای منە، جا هەواڵتان دەدەمێ بەو کار و کردەوانەی کە دەتانکرد.).

ئیسلام دینی لێبوردەیی و ئاسانکارییە لە شەریعەت و دروشمەکانیدا، لە حاڵەتی ئاشتی و لە جەنگیشدا، بەزەیی و میهرەبانییە بۆ لاوازان و پیشتوانییە بۆ ستەملێکراوان، و دادپەروەریشە بۆ داگیرکراوان و ژێرخراوان.

* زانا (الشیخ الصابونی) دەڵێت: (...پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمانی کرد بە (أسماء) کە سەردانی دایکی بکات و پەیوەندی نەپچڕێنێت و دیاری یەکەشی لێ وەرگرێت و ڕێزی لێبگرێت و چاکەیشی لەگەڵدا بکات، شەریعەتی ئیسلام لەسەر ئەوە ڕاگیرکراوە کە سەلامەت بین لەگەڵ کەسێکدا کە لەگەڵمان سەلامەتە، و جەنگ لەگەڵ کەسێك بکەین کە دوژمنمانە، یان ڕێگای بانگەواز دەگرێت و بەربەستی بۆ دروست دەکات لەبەردەمی خەڵکیدا و خەڵکی لێ دوور دەخاتەوە، مەبەستی ئیسلام ئەوەیە کە خەڵکی لەژێر ئاڵای ﴿لاإله إلاّ اللّه﴾دا کۆبکاتەوە، و برا و خۆشەویستی یەکتر بن، هاوکاری یەکتر بن لەسەر چاکەکردن و لەخوا ترسان، ئینسان لەم دنیایەدا لەبەر بیر و بۆچوونەکەی دەژی، و دەیکات بە مەسەلەی گەورە و لەپێش لەگەڵ خۆیی و هەموو خەڵکیدا، نابێت کێشە و گرفت لەگەڵ بەرژەوەندیدا هەبێت، و نابێت کوشتار لەسەر دەمارگیری هەبێت لە پارچە زەوییەکدا یان لە عەشیرەتێکدا یان لەسەر ڕەگەز یان لەسەر نەسەب، بەڵکو جیهاد و

تێکۆشان بۆ ئەوە دەبێت کە ووشەی خوای گەورە بەرز و بالاّ بێت و دەبێت بۆ ئەوە بێت کە شەریعەتی خوا بەرنامە و مەنهەج بێت و لە ژیاندا جێبە جیّ بکرێت، لەبەر ئەوە نابێت دووژمنایەتی کەسێك یان لایەنێك بکرێت کە سەلامەتە و ئاشتی دەوێت و دڵسۆزە، بەڵکو شمشێر و چەك لە سەر کەس و لایەنێکە کە سنور دەشکێنن و فەساد و خراپە بەرپا دەکەن و دەیانەوێت فەساد لە زەویدا هەڵ گیرسێنن. ئەمە فەلسەفەی ئیسلامە بەرامبەر جیهاد و تێکۆشان).[٦٦٩]

## دووەم: ئەوەی دەربارەی تاقی کردنەوەی ئافرەتە باوەڕدارە کۆچکردووەکان دابەزی

**خوای گەورە فەرموویەتی:** ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا جَاءَكُمُ الْمُؤْمِنَاتُ مُهَاجِرَاتٍ فَامْتَحِنُوهُنَّ اللَّهُ أَعْلَمُ بِإِيمَانِهِنَّ فَإِنْ عَلِمْتُمُوهُنَّ مُؤْمِنَاتٍ فَلَا تَرْجِعُوهُنَّ إِلَى الْكُفَّارِ لَا هُنَّ حِلٌّ لَهُمْ وَلَا هُمْ يَحِلُّونَ لَهُنَّ وَآتُوهُمْ مَا أَنْفَقُوا وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ أَنْ تَنْكِحُوهُنَّ إِذَا آتَيْتُمُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ وَلَا تُمْسِكُوا بِعِصَمِ الْكَوَافِرِ وَاسْأَلُوا مَا أَنْفَقْتُمْ وَلْيَسْأَلُوا مَا أَنْفَقُوا ذَلِكُمْ حُكْمُ اللَّهِ يَحْكُمُ بَيْنَكُمْ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ (١٠) وَإِنْ فَاتَكُمْ شَيْءٌ مِنْ أَزْوَاجِكُمْ إِلَى الْكُفَّارِ فَعَاقَبْتُمْ فَآتُوا الَّذِينَ ذَهَبَتْ أَزْوَاجُهُمْ مِثْلَ مَا أَنْفَقُوا وَاتَّقُوا اللَّهَ الَّذِي أَنْتُمْ بِهِ مُؤْمِنُونَ﴾(الممتحنة:١٠-١١).

**واتە: (ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە کاتێك ئافرەتە ئیماندارەکان کۆچ دەکەن و دێن بۆ لاتان، تاقییان بکەنەوە و بەووردی پرسیاریان لیّ بکەن سەبارەت بە کۆچ و هۆی هاتنەکەیان، خوا ئاگادارە بە ئیمانەکەیان، جا ئەگەر زانیتان باوەڕدارن، نە ئەم ئافرەتانە حەلاڵی ئەو بیّ باوەڕانەن نە ئەو بیّ باوەڕانەیش حەلاڵن بۆ ئەم ئافرەتە ئیماندارانە، ئەو مارەییەی کە مێردە کافرەکانیان خەرجیان کردووە بۆیان بگێڕنەوە، ئیتر هیچ**

[٦٦٩]- قبس من نور القرآن الكريم للشيخ محمد علي الصابوني ١٤/٦٨-٦٩.

ڕەخنەیەکیش لەسەرتان نییە ئەو ئافرەتانە مارە بکەن، کاتێك مارەییان بدەنێ، ئافرەتانی کافر مەهێڵنەوە لای خۆتان، واتە مارەیان مەکەن، ئێوەیش ئەی ئیمانداران، ئەگەر مەسرەفێکتان کردووە لە ئافرەتێکی کافردا داوای بکەنەوە، ئەوانیش ئەگەر مەسرە فێکیان کردووە لە ئافرەتێکی ئیمانداردا با داوای بکەنەوە، ئا ئەوە حوکم و فەرمانی خوایە کە خۆی فەرمانڕەوایی دەکات لە نێوانیاندا خوای گەورەیش هەمیشە زانا و دانایە (١٠) خۆ ئەگەر یەکێك یان هەندێك لە هاوسەرانتان گەڕانەوە بۆ ناو کافران، لەوەو دوا جەنگ لە نێوان ئێوە و کافراندا بەرپا بوو و سەرکەوتن بەسەریاندا، ئێوە لە دەسکەوتی ئەو جەنگە زەرەری ئەو ئیماندارانە ببژێرن کە خێزانەکانیان ڕۆیشتوون، لەو خوایە بترسن کە ئێوە هەمیشە بڕوادارن پێی).

## هۆکاری دابەزینی ئایەتەکان

پێشەوا (الواحدي) لە (أسباب النزول)دا لە (إبن عباس)ەوە (خوا لێیان ڕازی بێت) هێناویێتی، دەڵێت: کافران و هاوەڵدانەرانی مەککە، لەگەڵ پێغەمبەری خوادا لەساڵی(حدیبیة)دا پەیماننامەیەکیان بەست و ڕێك کەوتن، لەسەر ئەوەی کە هەرچی لە خەڵکی مەککە هاتە ناو ئەوان بیگێڕنەوە بۆیان، هەرکەسیش لە خەڵکی مەککە لە هاوەڵانی پێغەمبەر هاتەوە ناو کافرانی قورەیش ئەوە بۆ خۆیان، لەسەر ئەمە نوسراوێکیان نووسی و مۆریان کرد، ئینجا (سبیعة ی کچی العرث ی الأسلمي) لە دوای نوسراوەکە هات و پێغەمبەریش (ﷺ) لە (حدیبیة) بوو، گەیشت بە مێردەکەی، کە مێردەکەی کافر بوو، مێردەکەی وتی: ئەی محمد، خێزانەکەمم بۆ بگێڕەرەوە، بەڕاستی تۆ مەرجت وا داناوە بۆمان کە هەرچی هات بۆ لای تۆ بۆمان بگێڕیتەوە، خۆ ئەوەتا هێشتا نوسراوەکە ووشك نەبۆتەوە، ئینجا خوای گەورە ئەو ئایەتەی دابەزان.[٦٧٠]

---

[٦٧٠] – أسباب نزول للواحدي النیسابوري ص/٢٨٤.

* هەروەها لە (اسباب النزول)ی (السیوطي)دا: {بەڕاستی (أم كلثوم)ی كچی (عقبةی كوڕی أبي معیط) لە كاتی پەیماننامەكەدا كۆچی كرد، ئینجا دوو براكەی كە (عمارة و الولید) كە كوڕنی (عقبة) بوون، دەرچوون تا گەیشتنە لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) و قسەیان لەگەڵ كرد دەربارەی (أم كلثوم) كە بۆیان بگێڕیتەوە، ئینجا خوای گەورە بۆ پێغەمبەری (ﷺ) ڕونكردەوە، كە ئەو پەیمان و ڕێككەوتنەی لە نێوان ئەو و نێوان هاوەڵدانەراندایە، بەسەر ئافرەتاندا جێ بەجێ نابێت، و پێویست ناكات بگەڕێنرێتەوە بۆ لای هاوەڵدانەران، ئینجا خوای گەورەیش ئایەتی (الأمتحان) ی دابەزاند...}.[٦٧١]

## تەفسیری شیكاری ئایەتەكان

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا﴾ ئەمە بانگكردنە لە خوای گەورەوە بۆ بەندە باوەڕدارەكانی.

﴿إِذَا جَاءَكُمُ الْمُؤْمِنَاتُ مُهَاجِرَاتٍ﴾ كاتێك ئافرەتە باوەڕدارە كۆچەرییەكان لەو شوێنەی كە كافرانی لێن هاتن بۆلای ئێوە كە باوەڕدارن.

﴿فَامْتَحِنُوهُنَّ﴾ تاقیان بكەنەوە، بزانن ئایا بەڕاست ئەوان باوەڕدارن؟ یان هاتوون لەبەر ئەوەی كە ڕقیان لە مێردەكانیان بووە یان مەبەستیانە لە دنیادا شتێكیان دەست بكەوێت؟

تاقی كردنەوەكەیش بەم جۆرە بوو كە (إبن عباس) دەفەرموێت: بڵێ بەخوا لە ڕق و قینی مێرد نەهاتووم، بەخوا بەنیازی دەرچون لە خاكێك بۆ خاكێكی تر نەهاتووم، بەخوا نەهاتووم لەبەر خۆشەویستی خوا و پێغەمبەر (ﷺ) نەبێت ئەگەر ئافرەتەكە لەسەر ئەوە سوێندی بخواردایە، ئەوا مارەیی و خەرجییەكەی دەداتەوە بە مێردەكەی و نەیدەناردەوە).[٦٧٢]

---

[٦٧١]– أسباب نزول للسیوطي بهامش تفسیر الجلالین ص/ ٧٦٥–٧٦٦ بەدەسكاریەوە.

[٦٧٢]– زاد المیسر لأبن الجوزي ٨/٢٤٠.

* (الزمخشري) دەڵێت: (ناوی نان (مؤمنات): چونکە بە زمانیان ڕاستیان ووت و شەهادەتیان هێنا و شتێکیان لێ دەرنەکەوت کە نەفی ئەمە بکات، یان بەڕێز و پارێزەر بوون بۆ دامەزراوی ئیمانەکەیان لەو تاقیکردنەوەیەدا).[٦٧٣]

﴿اللَّهُ أَعْلَمُ بِإِيمَانِهِنَّ﴾ خوای گەورە زانا و ئاگادارە بە هەموو شتێك، نهێنی بە ناوەڕۆکی شتەکان و شتە شاراوەکان هەیە، هەروەها ئاگاداریشە بە ئاشکرا و دیارەکان.

* زانا (الزمخشری) دەڵێت: (ئەگەر وتت: ئایەتەکەی خوای گەورە ﴿اللَّهُ أَعْلَمُ بِإِيمَانِهِنَّ﴾ سودی چی دەبێت، کە باوەڕ و ئیمانەکەیان شتێکی زانراوە و گومانی تیا نییە؟ دەڵێت: سودەکەی ئەوەیە کە ڕوون دەبێتەوە، بێگومان ڕێگایەك بۆ ئێوە نییە کە نەفس و دەرونتانی پێ دڵنیا بێت و دڵ هەست بەوە بکات و بزانێت کە ئیمانیان هەیە، بێگومان ئەوە شتێکە کە خوای گەورە خۆی هەڵی بژاردوە، بەڕاستی ئەوەی کە تاقی کردنەوە ئەنجامی دەدات بریتیە لە بەدەست هێنانی زانیاری پێویست لە کارەکەدا).[٦٧٤]

﴿فَإِنْ عَلِمْتُمُوهُنَّ مُؤْمِنَاتٍ﴾ ئەگەر زانیتان کە باوەڕدارن بەهۆی ئەوەی کە لە تاقی کردنەوەکەوە بۆتان دەردەکەوێت.

﴿فَلَا تَرْجِعُوهُنَّ إِلَى الْكُفَّارِ﴾ دەیانگێڕنەوە بۆ لای کافر و بێ باوەڕان، چونکە ئافرەتی باوەڕدار بۆ کافر حەلاڵ و دروست نییە، هەروەك چۆن پیاوی هاوەڵدانەر بۆ ئافرەتی باوەڕدار حەلاڵ نابێت.

﴿لَا هُنَّ حِلٌّ لَّهُمْ وَلَا هُمْ يَحِلُّونَ لَهُنَّ﴾ نە ئافرەتە باوەڕدارەکان بۆ کافران و هاوەڵ دانەران حەلاڵن.

﴿وَآتُوهُم مَّا أَنفَقُوا﴾ ئەو مارەیی و خەرجییەی کە مێردە کافرەکانیان خەرجیان کردووە بۆیان، بۆیان بگێڕێتەوە و بیاندەنەوە ئەم بڕیارە بەڵگەیە لەسەر لێبوردەیی و

---

٦٧٣- الكشاف ٥١٧/٤.

٦٧٤- الكشاف ٥١٨/٤ بەکورتی و بەدەسکاریەوە.

دادپەروەری ئیسلام، حیکمەتیش لە گەڕاندنەوەی مارەیی ئەو ئافرەتانە بۆ مێردە کافرەکانیان، بۆ ئەوەی کە دوو خەسارەت و زیانیان بەیەکەوە لەسەر کۆ نەبێتەوە: خەسارەتی خێزانەکەیان و خەسارەتی ئەو خەرجی و مارەیی یەی کە کردوویانە بۆیان.

– (مقاتل) دەڵێت: ئەمە کاتێك دەبێت کە موسوڵمانێك ئەو ئافرەتە بخوازێت، خۆ ئەگەر کەس نەیخواست، ئەوا هیچ شتێك بۆ مێردە کافرەکەی ناگەڕێنرێتەوە.[٦٧٥]

(قتادة) دەڵێت: حوکم و بڕیارەکە لەگەڕانەوەی مارەیی و خەرجی لەو ئافرەتانەدا دەبێت کە لەناو پەیمانەکەدان، خۆ ئەگەر کەسێکیان پەیمانی نەبوو لەگەڵ موسوڵماناندا ئەوا مارەییەکە ناگەڕێنرێتەوە بۆ هاوسەرە کافرەکانیان.

زانا (القرطبي) پاش ئەوەی کە بۆچوونەکەی (قتادة)ی هێناوە، دەڵێت: کارەکە بەم شێوەیە کە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ أَن تَنكِحُوهُنَّ إِذَا آتَيْتُمُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ﴾.

واتە: هیچ گوناهێکتان لەسەر نییە ئەو ئافرەتە کۆچەرییانە مارەبکەن کاتێك مارەییەکانیان بدەنێ، کاتێك کە موسوڵمان دەبن و عیدەکەیان تەواو دەبێت.

﴿وَلَا تُمْسِكُوا بِعِصَمِ الْكَوَافِرِ﴾ دەست مەگرن بەسەر هیچ لە ئافرەتە بێ بڕواکاندا و لەسەر ئەوە مەمێننەوە کە مارەیان بڕن، واتە هەر کەس هاوسەرێکی کافری هەبوو دوای دابەزینی ئەم ئایەتە با لێی جیا ببێتەوە، چونکە بە خێزانی ئەو ناژمێردرێت، و هەرکەس خێزانەکەی لێی پاشگەز بوویەوە و گەڕایەوە بۆ لای کافران ئەوا پەیوەندی پارێزراوی بەوانەوە پچڕاوە واتە: پەیمانی هاوسەرداری هەڵوەشاوەتەوە.

﴿وَاسْأَلُوا مَا أَنفَقْتُمْ وَلْيَسْأَلُوا مَا أَنفَقُوا﴾.

واتە: داوای بکەنەوە ئەوەی خەرجتان کردوە لەمارەیی لە خێزانەکانتاندا کە پەیوەندییان کردۆتەوە بە کافرانەوە، و با ئەوانیش –واتە کافران– داوای ئەو خەرجی و

[٦٧٥]– الجامع لأحكام القرآن للقرطبي ٦٥/١٨ و زاد المسير لأبن الجوزي ٢٤١/٨.

مارەییە بکەنەوە کە داویانە بە خێزانەکانیان کە کۆچیان کردووە و بوونەتە هاوسەری ئێوەی موسوڵمان، دوای ئەوەی کە موسوڵمان بوون.

﴿ذَلِكُمْ حُكْمُ اللَّهِ يَحْكُمُ بَيْنَكُمْ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾ ئەی موسوڵمانان ئەوەی کە باسکرا بۆتان، ئەوە حوکم و بڕیاری خوا بوو، کە بۆ ئێوەی دانابوو، و بەرژەوەندی و سەرفرازی ئێوەی تیایە بۆ دنیا و بۆ قیامەتتان، و لێی جیا مەبنەوە، و خوای گەورە زانایە بەوەی کە بۆ بەندەکانی چاکە زوو بێت یان درەنگ، و شەرعی خوا لەسەر بڕیار و حوکمی بەرز و بەنرخ مەبەستی بەرز و پیرۆز بنیات نراوە.

﴿وَإِن فَاتَكُمْ شَيْءٌ مِّنْ أَزْوَاجِكُمْ إِلَى الْكُفَّارِ فَعَاقَبْتُمْ فَآتُوا الَّذِينَ ذَهَبَتْ أَزْوَاجُهُم مِّثْلَ مَا أَنفَقُوا﴾(الممتحنة:١١). خۆ ئەگەر یەکێك یان هەندێك لە هاوسەرانتان گەڕانەوە بۆ ناو کافران لەوەو دوا جەنگ لە نێوان ئێوە و کافراندا بەرپا بوو و سەرکەوتن بەسەریاندا، ئێوە لە دەسکەوتی ئەو جەنگە زەرەری ئەو ئیماندارانە ببژێرن کە خێزانەکانیان ڕۆیشتوون.

﴿وَاتَّقُوا اللَّهَ الَّذِي أَنتُم بِهِ مُؤْمِنُونَ﴾(الممتحنة:١١). لەخوا بترسن و لە کارەکانتاندا ئاگاتان لە خوا بێت، و ئاگاداری سزاکەی بن ئەگەر سەرپێچی فەرمانەکانتان کرد، کە ئێوە هەمیشە بڕوا دارن پێی.

## سێیەم: ئەوەی دەربارەی پەیمانی ئافرەتان دابەزی

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِذَا جَاءَكَ الْمُؤْمِنَاتُ يُبَايِعْنَكَ عَلَى أَن لَّا يُشْرِكْنَ بِاللَّهِ شَيْئًا وَلَا يَسْرِقْنَ وَلَا يَزْنِينَ وَلَا يَقْتُلْنَ أَوْلَادَهُنَّ وَلَا يَأْتِينَ بِبُهْتَانٍ يَفْتَرِينَهُ بَيْنَ أَيْدِيهِنَّ وَأَرْجُلِهِنَّ وَلَا يَعْصِينَكَ فِي مَعْرُوفٍ فَبَايِعْهُنَّ وَاسْتَغْفِرْ لَهُنَّ اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ (١٢) يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَتَوَلَّوْا قَوْمًا غَضِبَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ قَدْ يَئِسُوا مِنَ الْآخِرَةِ كَمَا يَئِسَ الْكُفَّارُ مِنْ أَصْحَابِ الْقُبُورِ﴾(الممتحنة:١٢-١٣).

لەم ئایەتە پیرۆزانەدا ڕونکردنەوەیەك لە خوای گەورەوە بۆ پێغەمبەر (ﷺ) کراوە، دەربارەی چۆنێتی پەیمانی ئافرەتان، پەیمان دان و بڕیاری پەیمانەکە، پەیمان وەرگرتن لەسەر تێکۆشان و، گوێڕایەڵی و پشتیوانی کردن بۆ دینی خوا.

پێغەمبەر (ﷺ) کاتێك پەیمانی لە ئافرەتان وەرگرت دەستی نەخستە سەر دەستیان وەك ئەوەی کە بۆ پیاوان دەیکرد، چونکە دەست خستنە ناو دەستی ئافرەتی نامەحرەم حەرامە و ڕێگە پێنەدراوە.

* لە هەردوو (صحیح)ەکەدا هاتووە، لە (عائیشه)وە (خوالێی ڕازی بێت) فەرمووی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەر کەس کۆچی بکردایە بۆ لای لە ئافرەتانی باوەڕدار بەم ئایەتە تاقی دەکردەوە ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِذَا جَاءَكَ الْمُؤْمِنَاتُ﴾ هەتا ﴿غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ عائیشە فەرمووی: هەرکەس دانی بنایە بەو مەرجانەدا کەلە ئایەتەکەدا هاتووە لە ئافرەتە باوەڕدارەکان، پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێی دەفەرمووێت: ئەوا بە وتە و گوفتار پەیمانم لێ وەرگرتیت، و سوێند بە خوا هەرگیز دەستی نەدا لە دەستی ئافرەتێك لە پەیمان وەرگرتندا، تەنها بە وتە و گوفتار پەیمانی لێ وەردەگرتن، دەیفەرموو: لەسەر ئەوە پەیمانم لێ وەرگرتیت.[٦٧٦]

– پایەکانی ئەم پەیمان وەرگرتنە وەك ئایەتەکە ڕونی دەکاتەوە بریتین لە: ﴿أَن لَّا يُشْرِكْنَ بِاللَّهِ شَيْئًا﴾ پایەی یەکەم لەم پەیمانەدا بریتی بوو لە پاککردنەوەی عەقیدە و بیرو باوەڕ بۆ خوای گەورە، کە خوای گەورە تاك و تەنهایە و هاوەڵی نییە پێویستی بە کەس نییە و هەموو کەس پێویستی بە خوایە، عەقیدە و بیر و باوەڕی پاکیش بریتییە لە: بنەمایەکی بەهێز و قەڵایەکی قایم و پتەو و تیشکێکی ڕوون و ڕوناکە. ئیسلام لە سێ ووشە پێك دێت: (عقيدة، شريعة، أخلاق).

﴿وَلَا يَسْرِقْنَ﴾ ڕونکردنەوەی پایەی دووەمە لە پەیمانەکە نەهی کردنە لە دزی، کە بریتییە لە بردنی شتێك بە نهێنی و ستەمێکە کە لێخۆشبوونی نییە، لە سەر خیانەت و ناپاکی و دوژمنایەتی دەکرێت و نەفی ئیمانیش دەکات .

[٦٧٦]– رواه البخاري في صحيحه كتاب التفسير حديث (٤٨٩١) و رواه المسلم في صحيحه كتاب الأمارة باب كيفية بيعة النساء.

﴿وَلَا يَزْنِينَ﴾ زینا و داوێن پیسی لە ناشرینترینی تاوان و خراپەیە، تاوانێکی زۆر گەورە و ناشرین و ئابڕووبەرە و سزاکەی زۆر سەخت و ئازاراوییە و زیانی گەورەی لێ دەکەوێتەوە، ئافرەتی باوەڕداری ڕستگۆ: پاك و داوێن پاك و ئەمین و پارێزراو و بەڕێزە.
﴿وَلَا يَقْتُلْنَ أَوْلَادَهُنَّ﴾ خوای گەورە نەهی کردووە کە منداڵ بکوژرێت بە هەر شێوەیەك بێت کە لەناو کۆمەڵگای دواکەوتودا بڵاوە...﴿ وَلَا يَأْتِينَ بِبُهْتَانٍ يَفْتَرِينَهُ بَيْنَ أَيْدِيهِنَّ وَأَرْجُلِهِنَّ﴾ئافرەتی سەردەمی نەفامی ئەگەر لە مێردەکەی بترسایە لەبەر نەزۆکی تەڵاقی بدات، ئەوا منداڵێکی هەڵدەگرتەوە و نیسبەتی دەدایە لای مێردەکەی ئەمەش بە درۆ و بوهتان تا لای مێردەکەی بمایەتەوە.
خاوەنی تەفسیری (الكشاف) دەڵێت: (ئافرەت منداڵێکی هەڵدەگرتەوە، بە مێردەکەی دەوت ئەوە منداڵی منە لە تۆ، بوهتانێکی درۆ و هەڵبەستراوی دروست دەکرد لە نێوان دەست و پێی خۆیدا لەسەر ئەومنداڵەی کە نوساندبووی بە سنگییەوە، ئەم درۆ و بوهتانەی بۆ مێردەکەی دروست دەکرد، چونکە ئەو سکەی کە منداڵ هەڵدەگرێت لە نێوان دوو دەست دایە و ئەو شوێنەیشی کە منداڵەکەی لێ دێتە دەر لە نێوان هەردوو قاچدایە).[٦٧٧]
﴿وَلَا يَعْصِينَكَ فِي مَعْرُوفٍ﴾ خوای گەورە نەهی کردووە کە سەرپێچی فەرمانی پێغەمبەر (ﷺ) بکەن گوێڕایەڵی کردنی واجب و پێویستە لەسەر هەموو موسوڵمانێکی پیاو و ئافرەت.
خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ اللَّهَ فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللَّهُ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ(٣١) قُلْ أَطِيعُوا اللَّهَ وَالرَّسُولَ فَإِن تَوَلَّوْا فَإِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ الْكَافِرِينَ﴾(ال عمران:٣١-٣٢)

---

[٦٧٧]- الكشاف للزمخشري ٥٢٠/٤ وإرشاد العقل السليم لأبي السعود ٧١٥/٥.

واتە: (ئەی پێغەمبەر (ﷺ) بە ئیمانداران) بڵێ: ئەگەر ئێوە خواتان خۆش دەوێت دە شوێنی من بکەون و لە فەرمانی من دەر مەچن، ئەو کاتە خوایش ئێوەی خۆش دەوێت و لە گوناه و هەڵکانیشتان خۆش دەبێت، ئەو خوایە لێخۆشبوو میهرەبانە، (دووبارە) پێیان بڵێ: فەرمانبەرداری خوا و پێغەمبەر بن، خۆ ئەگەر سەرپێچی بکەن و پشتی تێ بکەن، ئەوە دڵنیابن خوا بێ باوەڕانی خۆش ناوێت).

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَمَا آتَاكُمُ الرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَاكُمْ عَنْهُ فَانتَهُوا﴾(الحشر:٧).

واتە: (ئەوەی کە پێغەمبەر (ﷺ) پێی بەخشیون وەری بگرن و هەر فەرمانێکی پێدان بە گوێی بکەن، و قەدەغەی هەر شتێکی لێ کردن مەیکەن).

پێغەمبەر (ﷺ)فەرموویەتی: (هەموو ئوممەتەکەم دەچنە بەهەشتەوە تەنها ئەوانە نەبێت کە ڕەتی دەکەنەوە) وترا: جا کێ ڕەتی دەکاتەوە ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی (هەرکەس گوێڕایەڵی منی کرد دەچێتە بەهەشت و هەرکەسیش سەرپێچی منی کرد ئەوە ڕەتی کردۆتەوە).[٦٧٨]

﴿فَبَايِعْهُنَّ وَاسْتَغْفِرْ لَهُنَّ اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾(الممتحنة:١٢).

واتە: ئەی پێغەمبەر (ﷺ) پەیمانیان لەگەڵ ببەستە و لە خوا داوای لێخۆشبونیان بۆ بکە، چونکە بەڕاستی خوا لێخۆسبوو میهرەبانە).

## ڕونکردنەوەیەك:

هەروەك چۆن لە سوورەتی (الممتحنة) نەهی کردن لە خۆشەویستی و پشتیوانی بۆ دوژمنانی خوا دەستی پێ کرد، ئەوە بەڕاستی کۆتایی یەکەیشی بریتییە لە دڵنیا کردنەوەی ئەو نەهی کردنە و یادمان دەخاتەوە. خوای گەورە لە کۆتایی سوورەتەکەدا

[٦٧٨]– رواه البخاري في صحيحه عن أبي هريرة كتاب الأعتصام بالكتاب والسنة.

دەفەرمویێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَتَوَلَّوْا قَوْمًا غَضِبَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ قَدْ يَئِسُوا مِنَ الْآخِرَةِ كَمَا يَئِسَ الْكُفَّارُ مِنْ أَصْحَابِ الْقُبُورِ﴾(الممتحنة:١٣).

واتە (ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە پشت مەبەستن بە کەسانێك خوا خەشمی لێ گرتوون و دۆستایەتییان مەکەن بێگومان ئەوانە نائومێد و بێ هیوا بوون لە پاداشتی قیامەت، هەروەکو کافران نائومێد بوون لە گەڕانەوەی نیشتەجێکانی گۆڕستان).

## سوود و وانە گرنگەکانی ناو ئایەتەکان بەبۆنەی یەکێك لە پایەکانی پەیمانەوە

﴿وَلَا يَسْرِقْنَ﴾ بەم بۆنەیەوە ئەو فەرمودەیە دەهێنین لە (صحیح ی بخاري) کە (عائیشە) (خوالێی ڕازی بێت) هێناویێتی دەڵێت: (هندی کچی عتبة) ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەڕاستی (اباسفیان) پیاوێکی بەخیل و ڕەزیلە، شتێکی خواردنی وام ناداتێ کە بەشی خۆم و منداڵەکەم بکات، تەنها ئەوە نەبێت کە بە نهێنی لێی دەبەم و ئەو پێی نازانێت؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: تۆیش ئەوەندەی کە بەشی خۆت و منداڵەکەت بکات لێی ببە بەڵام بەچاکە.[٦٧٩]

## حوکمی منداڵ لەبار بردن لە ئیسلامدا

بە بۆنەی ئەم ئایەتەوە: ﴿وَلَا يَأْتِينَ بِبُهْتَانٍ يَفْتَرِينَهُ بَيْنَ أَيْدِيهِنَّ وَأَرْجُلِهِنَّ﴾ لەباربردنی کۆرپە: بریتییە لە لەناوبردنی کۆرپەکە، کە هێشتا دروست بوونەکەی تەواو نەبووە بۆنەوەی پێش تەواو کردنی ماوەکەی لە (ڕەحم)دا، نەمێنێت.[٦٨٠]

---

٦٧٩– رواه البخاري في صحيحه كتاب النفقات باب إذا لم ينفق الرجل.

٦٨٠–المعجم الوسيط ١: ١٤٤.

ڕیشە و بنەچەی ووشکە واتە: قەدەغە کردن، پێشەوا (أبو حامد الغزالی) لە کتێبی (الأحیاء)دا ددربارەی (العزل فی الجماع) خۆ گرتنەوە لە جوت بووندا، دەڵێت: (ئەوە وەك لەباربردن و زیندە بەچاڵ کردن نییە، چونکە ئەم دوانە تاوان و گوناهێکن لەسەر شتێك ئەنجام دەدرێن کە بەدەست هاتوون، هەروەها پلەیشی هەیە، یەکەم پلەیشی بریتییە لەوەی کە (نطفة) بکەوێتە ناو ڕەحم و تێکەڵ بە ئاوی ئافرەتەکە ببێت و ئامادە بێت کە ژیان وەربگرێت ولەناوبردنی ئەوە تاوانە، ئەگەر بوو بە (مضغة) و (علقة) ئەوە تاوانەکە قورستر و خراپترە، و ئەگەر ڕۆحی کرا بەبەردا و دروست بوونەکەی تەواو بوو، ئەوە تاوانەکەی زیاترو گەورەتر دەبێت، و ئەوپەڕی تاوان و خراپەکەیش لە تاوانەکەدا دوای جیابونەوەیەتی کە زیندووە).[٦٨١]

* بەم جۆرە و بەڕاستی زانا موسڵمانەکان کۆ و یەکدەنگن لەسەر حەرامی لەبار بردنی کۆرپە پاش ئەوەی کە ڕۆحی دەکرێت بە بەردا واتە پاش (١٢٠) ڕۆژ کە دەبێتە کۆرپە، لەباربردنی پاش ڕۆح کردن بە بەر کۆرپەکەدا بەیەك لایەنی حەرامە تەنها لە یەك حاڵەتدا نەبێت، ئەویش کاتێك کە مانەوەی کۆرپەکە ببێتە مەترسی لە سەر ژیانی دایکەکە، پزیشکانی خاوەن متمانەیش شایەتی ئەوەیان داوە و بە دڵنیاییش زانایانی فیقە ڕێگەیان بەوە داوە، بەڵام پێش ئەوەی کە ڕۆحی بەبەردا بکرێت، ئەوا ڕاو بۆچوونی جیاواز لە نێوان زانایانی (فیقە) دا لەسەری هەیە، وەك لە خوارەوە ڕوونی دەکەینەوە.

## یەکەم: بۆچوونی حەنەفییەکان

## حەنەفییەکان لەم مەسەلەیەدا دوو بۆچونیان هەیە:

یەکەم: پێش ڕۆح کردن بەبەری کۆرپەکەدا حەرامە لەبار ببرێت بەبێ بوونی (عذر)، بێگومان ئاو (منی) پاش ئەوەی کەوتە ناو ڕەحم، ئومێدی ژیانی لێ دەکرێت، و حوکمی ژیانی هەیە، هەر وەك هێلکەی گیانلەبەرێك کە ڕاوکردنی حەرامە، کەسێك کە ئیحرامی

---

٦٨١-إحياء علوم الدين للغزالي ٢: ٥٣.

بەستووە، هێلکەکە بشکێنێت ئەوە تاوانی کردوە، چونکە ئەسڵ و بنەڕەتی ڕاوەکەیە.[٦٨٢]

بۆچونی دووەم: ڕێگە دان بە لەبار چونەکە پێش ڕوونبونەوەی ئەوەی کە شتێك دروست بوویێت، (الکمال بن الهمام) لە کتێبی (فتح القدیر)دا دەڵێت: ڕێگە دەدرێت بە لەبار بردنی دوای سکپڕبوون کە هێشتا شتێکی وای لێ دروست نەبوویێت.[٦٨٣]

(إبن نجیم المصري) لە کتێبی (البحر الرائق)دا دەڵێت: ئەگەر ئافرەتێك چارەسەری کرا بەوەی کە منداڵەکەی لەبار بەرێت، تاوانبار نابێت ئەگەر ڕوون نەبوویەوە کە شتێکی وا دروست بوو بێت.[٦٨٤]

لەو (عذر)انەی کە دروست و وەرگیراون بۆ لەباربردن لەلای حەنەفیەکان، ئەوەیە کە خاوەنی (الفتاوی الخانیة) باسی کردووە، کە ئەو وا نابینێت لەبار چون پێش ڕۆح بەبەردا کردن هەبێت مەگەر بە (عذر)ێك، وتویەتی: (ئافرەتی شیردەر، ئەگەر تیایدا دەرکەوت سکی هەیە و شیرەکەی بڕایەوە و لە توانای باوکیشیدا نەبوو دایەنێکی بەکرێ بۆ بگرێت، و دەشترسا منداڵەکەی لەناو بچێت، ئەوا وتویانە: ڕێگە دراوە کە خوێنەکەی بێتە خوارەوە لەبەر ئەوەی کە هێشتا سکەکەی (نطفة) یان (علقة) یان (مضغة)یە و ئەندامەکانی دروست نەبوون، و ئەو ماوەیەشیان بە ئەندازەی (١٢٠) ڕۆژ داناوە، بێگومان ڕێگەی پێ دەدرێت کە ئەو سکەی لەناوبەرێت بە کارێك کە خوێنەکەی بێننە خوارەوە، هێشتا نەبۆتە مرۆڤ، ڕێگەی پێ دەدرێت بۆ پاراستنی مرۆڤێکی زیندوو).[٦٨٥]

ڕێڕەوی مالیکییەکان: لەباربردنی حەرامە پێش ڕۆح بەبەردا کردن وەك یەکە ئیتر پێش چل ڕۆژ بێت یان دوای چل ڕۆژ. لە (الشرح الکبیر) ی (الدردیر)ی (فیقە المالکیة)دا

---

٦٨٢–الفتاوی العانیة (فتاوی قاضیخان للإمام فخردین حسن بن منصور الأوزجندي الفرغاني الحنفي ٣: ٤١٠.

٦٨٣–فتح القدیر للکمال بن الهمام ٢: ٤٩٥.

٦٨٤–البحر الرائق شرح کنز الدقائق إبن نجیم المصري ٨: ٢٣٣.

٦٨٥–الفتاوی العانیة ٣: ٤١٠.

هاتووە: (ڕێگە نادرێت مەنییە پێك هاتووەکە لە ڕەحمدا بخرێتە دەرەوە با پێش چل ڕۆژیش بێت، کاتێك ڕۆحی بەبەردا کرا، ئەوە بە کۆ دەنگی حەرامە). [٦٨٦]

– ڕێڕەوی شافعییەکان: لای شافعییەکان لەباربردن دوای چل ڕۆژ حەرامە، ئەمە بەرێکەوتن و بۆ چوونی زانایانی مەزهەبەکە، و لەپێش چل ڕۆژیش زانایان ڕاو بۆچونی جیاوازیان هەیە کە قسەی دروست و پەسەندیش لایان ئەوەیە کە حەرامە لە (نهایة المحتاج)دا هاتووە: ((زانایان ڕاو بۆچونی جیاوازیان هەیە دەربارەی (نطفة) لەپێش چل ڕۆژ دا، لەسەر دوور بۆچوون: وتراوە: حوکمی لە باربردن و زیندە بەچاڵ کردنی بەسەردا جێ بەجێ نابێت، هەروەها وتراویشە: حەرامە و ڕێگەی پێ نادرێت کەلەناو ببریت و هۆکارێك بۆ دەرکردنی لە ناو ڕەحم نییە پاش ئەوەی کە تیایدا جێگیر بووە، بە پێچەوانەی (عزل) کە گرتنەوەی ئاوی مەنییەکەیە پێش ئەوەی بچێتە ناو ڕەحم، واتە فڕێ بدرێتە دەرەوە). [٦٨٧]

* (الشبرا المسلي) لە (حاشية) یەکەیدا دەڵێت: (زانایان ڕاو بۆچونی جیاوازیان هەیە لە بەکارهێنانی هۆکارێکدا بۆ فڕێدانی (نطفة) بۆ دەرەوەی ڕەحم پاش جێگیر بوونی. (أبو إسحق المروزی) دەڵێت: ڕێگە پێدراوە کە (نطفة) و (علقة) فڕێ بدرێتە دەرەوەی ڕەحم. و ئەوەی لە (أبی حنیفة) و) (الإحیاء) ی (الغزالي)یەوە نەقڵ کردووە لە بەشی (العزل)دا کە دەڵێت: حەرامە، لەبەر چەند لایەنێك، چونکە دوای جێگیر بوونی مەیلی بەلای ئەوەدایە کە دروست ببێت و ئامادەیە بۆ ئەوەی کە ڕۆح بکرێت بە بەریدا، وەك (عزل) نییە). [٦٨٨]

* ڕێڕەوی حەنبەلییەکان: ڕێگە بە ئافرەت دەدرێت کە (نقطة) فڕێ بداتە دەرەوەی ڕەحم پێش چل ڕۆژی بە چارەسەرێکی ڕێگە پێدراو، لەمەوە وەردەگیرێت کە لەباربردنی بە خۆراك یان خواردنەوەی چارەسەرێك کە ڕێگە پێدراو بێت لەم ماوەیەدا حوکمەکەی دروستە، و (إبن قدامة) لە (المغني)دا هێناویتی: (بەڕاستی هەرکەس بکێشێت بە سکی

---

٦٨٦–الشرح الكبير للدردير بحاشية الدسوقي ٢: ٢٦٦.

٦٨٧–نهاية المحتاج للرملي ٨: ٤١٦ بەکورتی.

٦٨٨–حاشية أبي الضياء البشرا مسلي القاهري على نهاية المحتاج ٦: ١٧٩.

ئافرەتدا و منداڵەکەی فڕێبدات، ئەوا کەفارەتی لەسەرە، ئەگەر سکپڕەکە چارەسەرێکی خوارد و بەو هۆیەوە کۆرپەکەی فڕێدایە دەرەوە، ئەوا کەفارەتی دەکەوێتە سەر، واجب بوونی کەفارەتەکە ئەوە دەگەیەنێت کە بەڕاستی ئافرەتەکە گوناهبار بووە لەو کارەدا کە کردویەتی، و لەو دەقەدا کە (إبن قدامَة) بە بەڵگەوە هێناویێتی (ضمان) پاراستنەکە دەبێت بۆ کۆرپەکە بێت، کە بەڕاستی دەرکەوتووە کە ڕۆحی کراوە بە بەردا. [٦٨٩]

– ڕێڕەوی (ظاهري)یەکان: لە (المحلي)ی (إبن حزم الظاهري)دا هاتووە: (مەسەلەکە: کە ئافرەتەکە هەر سورە لەسەر ئەوەی کە کۆرپەکە لە بار بەرێت – ئەگەر ڕۆح نەکرابوو بە بەریدا ئەوە (دیة) یەکی لەسەرە، خۆ ئەگەر ڕۆح کرابوو بە بەریدا و مەبەستی نەبوو کۆرپەکەی بکوژێت، ئەوا (دیة) کەی لەسەر مێردەکەیەتی و کەفارەتەکەشی لەسەر خۆیەتی، و ئەگەر مەبەستی بوو بیکوژێت: ئەوا تۆڵەی خوێنێکی دەکەوێتە سەر، واتە (قِصاص) یان (فدیة) یەك بدات لەماڵەوە، ئەگەر ئافرەتەکە مرد لە هەموو ئەوانەدا پێش فڕێدانی کۆرپەکە، پاشان فڕێی دا، ئەوا (دیة) لە هەموو ئەوانەدا واجب و پێویست دەبێت لەکاتی بە هەڵە ڕوداندا لەسەر ئافرەتەکە، هەروەها لەکاری بە ئەنقەستیشدا پێش ئەوەی کە ڕۆح بکرێت بە بەریدا، خۆ ئەگەر ڕۆح کرابوو بە بەریدا ئەوا (خوێنێك) دەکەوێتە سەر تاوانبارەکە ئەگەر کەسێکی تریش بێت ئەگەر ژنەکە بێت ئەوا (خوێن) و (دیة) و هیچ شتێکی ناکەوێتە سەر، چونکە حوکم و بڕیار لەسەر مردو نادرێت [٦٩٠]

بەم شێوەیە (ظاهري)یەکان ڕێگە نادەن بە لەبار بردنی سك نە پێش چوار مانگ و نە دوای چوار مانگ، و (إبن حزم) هیچ (إستثناء)ێکی باس نەکردوە لەوەی کە ڕێگر بێت لە لەباربردن نە بۆ نەخۆشی نە بۆ شتی تر کە (عذر) بێت. [٦٩١]

* لە (فتوی) یەکی کەلە (دار الإفتاء المصرية) لەساڵی (١٩٦٨) بە ژمارەی (١٠٧٩) دەرچووە دەربارەی لە باربردن دەڵێت:

---

٦٨٩–المغني لأبن قدامة الحنبلي ٨: ٨١٥.

٦٩٠–المحلي ١١: ٣١ بەکورتی و بەدستکاری یەوە.

٦٩١–المفصل في أحكام المرأة والبيت المسلم د. عبدالكريم زيدان٣: ١٢٤.

* زانایانی (فیقه) لەسەر ئەوە ڕێك کەوتوون کە ڕێگە نادرێت کۆرپەی ناو ڕەحم لە دوای ڕۆح بە بەردا کردن لەبار ببرێت، لەباربردن لەم حاڵەتەدا بەتاوان لێکدراوەتەوە، و تاوان و گوناهێکە ئەنجامدەرەکەی سزا دەدرێت لە دنیاو لە قیامەتیشدا.

* ئەگەر کاتێك لەمانەوەی سکەکەدا بۆ کاتی دانانی مەترسییەك بۆ سەر ژیانی دایکەکە هەبوو بەپێی پشکنینی پزیشکە تایبەتمەند و لێهاتوو ئەمینەکان، ئەوا ڕێگە بە لەباربردنی دەدرێت، بەڵکو پێویست دەبێت کاتێك دیاری کرا کە ئەو لەبار بردنە دەبێتە هۆی ڕزگار کردنی ژیانی دایکەکە.

زانایانی (فیقه) ڕاو بۆچونی جیاوازیان هەیە دەربارەی حومکی لەبار بردنی کۆرپە پێش ڕۆح بە بەراکردن و ئاشکرای وتە و دەربڕینی حەنەفییەکان قسەیەکی لەپێشە کە ڕێگە بە لەباربردن نادرێت مەگەر بە بوونی (عذر). [٦٩٢]

* لە بڕیاری (مجلس هیئة کبار العلماء) بە ژمارە (١٤٠)ی بەرواری (١٤٠٧/٦/٢٠) ی کۆچی، ئەمە هاتووە: ڕێگە نادرێت بە لەبار بردنی کۆرپە لە قۆناغە جیاوازەکانیدا مەگەر بە هۆکارێکی شەرعی و ئەویش لە سنورێکی زۆر تەسکدا.

* ئەگەر کاتێك سکپڕییەکە لە دۆخی یەکەمدا بوو کە ماوەی چل ڕۆژییە، ئەوا لە لەباربردنیدا بەرژەوەندییەکی شەرعی هەبوو، یان لابردن و نەهێڵانی زیانێك ئەوا ڕێگە بە لەبار بردنی دراوە، بەڵام لەباربردنی لەبەر ناڕەحەتی و ترسی پەروەردە کردنی منداڵەکان یان ترسان لەوەی کەم توانا دەبن لە دابینکردنی بژێوی ژیان و فێرکردنیان یان لە پێناو دیاری کردنی داهاتوویاندا، یان ئەوەی کە هەردوو هاوسەرەکە هەیانە بەسیانە لە منداڵ، ئەوە ڕێگەی پێ نادرێت. خوای گەورە زاناترە.

---

٦٩٢–الفتاوى الأسلامية ٧: ٢٥٧٣ الصادرة عن(دار الأفتاء المصرية).

## باسی شەشەم:

## (أم جميل) ی ژنی (أبي لهب)

**لەم باسەدا:**

**یەکەم: ئەو ئایەتانەی دەربارەی (أم جميل) و مێردەکەی دابەزیوە.**

**دووەم: لەبەردەمی سوورەتی (المسد)دا.**

**سێیەم: تەفسیری شیکاری.**

**چوارەم: مانای گشتی.**

### یەکەم: دابەزینی سوورەتی (المسد) دەربارەی (أم جميل) و (أبو لهب)ی مێردی

**خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿تَبَّتْ يَدَا أَبِي لَهَبٍ وَتَبَّ (١) مَا أَغْنَىٰ عَنْهُ مَالُهُ وَمَا كَسَبَ (٢) سَيَصْلَىٰ نَارًا ذَاتَ لَهَبٍ (٣) وَامْرَأَتُهُ حَمَّالَةَ الْحَطَبِ (٤) فِي جِيدِهَا حَبْلٌ مِّن مَّسَدٍ﴾ (المسد:١-٥).**

### دووەم: لە بەردەمی سوورەتەکەدا

**- (أم جميل) ناوی (أروى ی کچی حرب ی کوڕی أمیه ی خوشکی (ابو سفیان ی کوڕی حرب) بوو.**

**(کنیة) کەی (أم جميل) بوو، کە خێزانی (ابي لهب)ی دوژمنی خوا بوو، کە بەرهەڵستی و دوژمنایەتی پێغەمبەری خوای (ﷺ) کرد، هیچ ڕەچاوی مافی دراوسێیەتی نەکرد، بەڕاستی خراپترین مام و دراوسێ بوو، تەنها بەوە وازی نەهێنا کە سەرشۆڕی کرد لە**

پشتیوانی برازاکەی و پاراستنی، بەڵکو دوژمنایەتی کرد و هەوڵی زۆری دا بۆ دروستکردنی بەربەست و ڕێگری.

– ئیمامی (بوخاری) لە (صحیح)ەکەیدا بە سەنەدێك لە (إبن عباس)ەوە ڕیوایەتی کردووە فەرموویەتی: (کاتێك ئایەتی: ﴿وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ الْأَقْرَبِينَ﴾ دابەزی، پێغەمبەری خوا (ﷺ) چوویە سەر کێوی (صفا) دەستی کرد بە بانگ کردن: ئەی (بنی فهر)، ئەی (بني عدي) – بانگی بە ناو قولاّیی قرەیشدا کرد – هەتا کۆ بوونەوە، هەر پیاوێك ئەگەر خۆی نەیتوانیایە دەرچێت و بچێت، ئەوا نوێنەرێکی دەنارد تا بزانێت کارەکە چییە، ئیجا (أبو لهب) و (قریش) هاتن، ئینجا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ئایا چۆن دەبینن ئەگەر هەواڵتان بدەمێ کە ڕەوە ئەسپێك لەو شیوەوە دەیەوێت سەرکەوێت و بدات بەسەرتاندا، ئایا ئێوە باوەڕم پێ دەکەن؟ وتیان: بەڵێ: تەنها ئێمە ڕاستیمان لە تۆ بیستوە ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: بەڕاستی من ئاگادارکەرەوەم بۆ ئێوە و لەبەردەم و پێشەوەی من سزایەکی سەخت و قورس هەیە، ئیجا (أبو لهب) وتی: دەك لەناوچیت سەرتاپای ڕۆژەکە، ئایا ئێمەت بۆ ئەمە کۆکردەوە؟ ئیجا ئایەتەکانی: ﴿تَبَّتْ يَدَا أَبِي لَهَبٍ وَتَبَّ (١) مَا أَغْنَىٰ عَنْهُ مَالُهُ وَمَا كَسَبَ﴾ تاکۆتایی سوورەتەکە دابەزی.[٦٩٣]

* دوژمنایەتی و خراپەی (أبو لهب) گەیشت بە پێغەمبەر (ﷺ) لە وەرزی حەج و لە ناو بازاڕدا شوێن پێغەمبەر دەکەوت باوەڕی پێ نەدەکرد و بەدرۆی دەخستەوە و بەخەڵکی دەوت: باوەڕی پێ مەکەن، من مامی ئەوم و لە هەموو کەس زیاتر دەیناسم.[٦٩٤] ئەوە برازامە و من باش دەزانم کە درۆزنە، و (أم جميل) دەچوو دڕك و داڵی هەڵدەگرت لە ڕێگاکەی پێغەمبەردا (ﷺ) بڵاوی دەکردەوە، ئافرەتێك بوو کە گیرۆدەی زمانی خۆی بوو.

---

٦٩٣-رواه البخاري في (صحيحه) كتاب التفسير باب (وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ الْأَقْرَبِينَ) (الشعراء:٢١٤) حديث (٤٧٧٠).

٦٩٤–سيرة إبن هاشم ١: ٤٤٧.

کاتێك سوورەتی (المسد) دابەزی (أم جمیل) توڕە و تەنگە تاو بوو، و بێزاری و ناڕەحەتی لەسەر پێغەمبەر و ئەوەی کە هێنابووی زیادی کرد و چوو بۆلای پێغەمبەر شەڕ لە گیانیدا سوڕی دەخوارد و ڕق و کین و خیانەت پاڵنەر و هاندەری بوو، هەتا گەیشتە لای پێغەمبەر ی خوا (ﷺ) ئەویش لەگەڵ (ابی بکر) لەلای (کعبة)دا دانیشتبوو و (أم جمیل) بەردێکی پڕ مشتی پێ بوو.

کاتێك لەبەردەم پێغەمبەردا (ﷺ) ڕاوەستا، خوای گەورە چاوی لە ئاستی پێغەمبەر کوێر کرد، هیچی نەبینی تەنها (ابی بکر) نەبێت، پێی وت:ئەی (ابا بکر) کوا هاوڕێیەکەت؟ بەڕاستی هەواڵم پێ گەیشتووە کە قسەم پێ دەڵێیت! سوێند بەخوا ئەگەر بیبینم، ئەم بەردەی پیا ئەکێشم، و سوێند بە خوا من شاعیریشم، پاشان ئەم شیعرەی ووت:

مذ مما عصینا. وامره ابینا. ودینه قلینا.

پاشان ئەو شوێنەی جێهێلا، ئینجا (ابو بکر) (خوا لێی ڕازی بێت) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەگەر سەیری بکردایە دەیبینیت؟ فەرمووی منی نەبینی، بەڕاستی خوای گەورە چاوی لە ئاستی من گرت.

ئینجا (أم جمیل) چوو بۆلای (ابو سفیان)ی برای و هانی دەدا و دەیوروژاند کە بچێت دژایەتی پێغەمبەر بکات، ئەویش سەری شۆڕکرد بەڕاستی (أم جمیل) بەختەوەر نابێت و گومانەکانی تیا دەچن و سەری لێ دەشێوێت، چونکە (ابا سفیان) جورئەتی ئەوەی نەکرد کە نزیکی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بکەوێتەوە، کاتێك گەیشت بە پێغەمبەر (ﷺ) شمشێرەکەی لە ملدابوو، مارێکی زۆر گەورەی بینی دەمی کردبویەوە، خۆی ئامادە کردبوو بۆ لەناوبردنی، ئینجا (ابا سفیان) ترسا و گەڕایەوە بۆ ئەو شوێنەی کە لێوەی هاتبوو.[٦٩٥]

* پێشەوا (الفخر الرازي) لە تەفسیرەکەیدا باسی کردووە دەڵێت: ﴿بەڕاستی (أم جمیل) بە (ابا بکر)ی ووت: بۆم باسکراوە کە هاوڕێیەکەت قسەی پێ وتووم! (ابوبکر) فەرمووی:

---

٦٩٥–سیرة إبن هاشم ١: ٣٦٦– ٣٦٧.

تا سوێند بە پەروەردگاری (بیت)کەعبە، قسەی پێ نەوتوویت، ئینجا پشتی هەڵکرد و دەیوت: قورەیش نەیانزانیوە کە من کچە گەورەکەیانم.

* بەڵام چۆن (ابوبکر) سوێند دەخوات بە پەروەردگاری (بیت) کەعبە کە پێغەمبەر (ﷺ) قسەی پێ نەوتووە؟

وەڵام: بەڕاستی (ابا بکر) ڕاستگۆیە لە هەر شتێکدا کە دەیڵێت، چونکە قورئان بە (هجو) جنێو و قسە ناوی نەبردووە، و چونکە قورئان قسە و گوفتاری خوایە نەك هی پێغەمبەر (ﷺ).[٦٩٦]

* بەڕاستی (أم جميل) زۆری لە هەردوو کوڕەکەی (عتبة و عتيبة)کرد، کە هەردوو کچەکەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە خێزانیان بوو تەڵاقی بدەن کە (ام كلثوم و رقية) بوون، بە هەردوو کوڕەکەی وت (سەری من لەسەری ئێوە حەرام بێت، ئەگەر هەردوو کچەکەی محمد تەڵاق نەدەن). ئینجا هەردوو کوڕکەی سەریان بۆ حەز و داوا چەپەڵ و پیسەکەی دایکیان شۆڕکرد، ئەو مەبەستەی کە لە پشتیەوە بوو، بریتی بوو لە پچڕاندنی پەیوەندی خزمایەتی و تێکەڵاوی و دروستکردنی خەفەت و خەم لەسەر دڵی پێغەمبەر (ﷺ) تا لە بانگەوازەکەی بێئاگا بێت و خۆی بە شتی تر سەرقاڵ بکات و نەتوانێت پەیامەکەی بە کرداری بگەیەنێت، پاشان (عتبة)و دواتر (عتيبة) کچەکانیان تەڵاقدا. ئینجا (عتبة) ویستی دەر بچێت بۆ شام، وتی: سوێند بێت دەبێت بچمە لای محمد و ئازاری بدەم، ئینجا هات، و ووتی: ئەی محمد: من کافر بووم بە ﴿والنجم إذا هوى﴾ و بە ﴿ثُمَّ دَنَا فَتَدَلَّى﴾، پاشان تفێکی کردە دەم و چاوی پێغەمبەری خوا (ﷺ) و کچەکەی بۆ ناردەوە و تەڵاقی دا، ئینجا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: خوایە سەگێك لە سەگەکانی خۆت زاڵ بکەیت بەسەریدا،و (ابو طالب) ئامادە بوو، کەمێك مات و بێدەنگ بوو پاشان وتی: ئای برازاکەم چەند خۆت لەم بانگەوازەدا ماندوو دەکەیت! ئینجا (عتبة) گەڕایەوە بۆ لای باوکی و هەواڵی دا پێی، پاشان دەرچوون بەرە و شام لە

---

٦٩٦–مفاتيح الغيب للرازي ٣٢: ٧٦٣ بەدەستكاری یەوە.

شوێنێکدا لایاندا، ئینجا ڕاهیبێك لە (دیر) هاتە لایان و پێی وتن: بەڕاستی ئەم شوێنە زەوییەکە گیانلەبەری دڕندەی زۆرە، ئینجا (ابو لهب) بەهاوەڵەکانی خۆی وت: ئەی گرۆی قوڕەیش ئەمشەو فریامان کەون، بەڕاستی من لە کوڕەکەی خۆم دەترسم کە محمد دوعای لێ کردووە، ئینجا ووشترەکانیان کۆ کردەوە و لە دەوری ئەواندا یەخیان پێ دادان و دەورەی (عتبة)یان پێ گرت، ئینجا دڕندەیەك هات بۆنی دەم و چاویانی دەکرد، هەتا (عتبة)ی دۆزیەوە و کوشتی. دەربارەی ئەمەیش (حسان ی کوڕی ثابت) وتویەتی:

من يرجع العامَ إلى أهله　　　فما أكيل السبع بالراجع.[٦٩٧]

## سێیەم: تەفسیری شیکاری بۆ سوورەتە پیرۆزەکە

- خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿تَبَّتْ يَدَا أَبِي لَهَبٍ وَتَبَّ﴾ واتە: خەسارەت مەند بوو، تیاچوو، فەوتا، و بێ بەش بوو لە هەموو خەیرێك و هەردوو دەستەکەی تایبەت کرد بە لەناو چوون و فەوتان چونکە زۆرێك لە کارەکان بە دەستەکان دەکرێت و وتراوە: مەبەست لە هەردوو دەستەکە خۆی دەگەیەنێت کە هەردوو دەست بە نەفسی کەسەکە خۆی لێکدەدرێتەوە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ذَٰلِكَ بِمَا قَدَّمَتْ يَدَاكَ وَأَنَّ اللَّهَ لَيْسَ بِظَلَّامٍ لِّلْعَبِيدِ﴾(الحج:١٠).

واتە: (ئەم سەرئەنجامە دەست پێشخەری خۆتە تووشت هاتووە) لەسەر ئەمە دەربڕینەکە بە بەشێك کراوە و بەڵام مەبەستی هەمووە، کە ئەمەیش جۆرێکی (مجاز)ە.

- (أبو لهب) ناوی (عبدالعزای) ی کوڕی (عبد المطلب) بوو. مامی پێغەمبەر (ﷺ) بوو. لە ئایەتەکەدا (کنیة)کەی هاتووە و ناوەکەی نەهاتووە، چونکە ناوەکەی (عبد العزی) بوو (العزی)بت بووە، خوای گەورە لە قورئاندا بەندایەتی بۆ لای ناوی بتەکان (إضافة) نەکردووە، واتە بەندایەتی نەداوەتە پاڵ ناوی بتەکان وتراویشە: چونکە بەڕاستی خوای

---

٦٩٧-الكشاف ص: ٤١٧.

گەورە ویستی ئەوە جێ بەجێ بکات کە نیسبەتی بداتە پاڵ ئاگر و کە بیکاتە باوکی ئاگر، ئەمەیش بۆ جێ بەجێ کردنی نەسەبەکەی و ئەو ڕەشبینی یەی کە بۆخۆیی هەڵبژارد بوو.[٦٩٨]

* وتراویشە بەو ناوە (کنیة)ی بۆ دانراوە بۆ ئەوەی ڕومەت و دەم وچاوی ئاگرین بێت ڕێگە دەدرێت بەو شێوەیە باس بکرێت لەبەر گاڵتە جاڕی کردن پێی، چونکە زۆر فەخر و شانازی دەکرد.[٦٩٩]

ئایەتی ﴿وتَبَّ﴾ واتە: بەڕاستی ئەوە بەدەست هات، وەك دەڵێیت: خوای گەورە ڕیسوا و سەرشۆڕی کرد، و بەڕاستی کارەکەی کرد و بەتەواوی لەناوی برد و فەوتاندی.[٧٠٠]

یەکەمیان دوعا بوو لەسەری کرابوو، و دووەمیان: هەواڵ بوو لە حاڵی و لە چارەنوس و داهاتووی، لەناوچوون و خەسارەتمەندی و سەرشۆڕی و تیاچوون و سەرئەنجامی ئازاراوی بوو لە دنیاو لە قیامەتدا.

- ﴿مَا أَغْنَى عَنْهُ مَالُهُ وَمَا كَسَبَ﴾ ماڵ و سامان و کار و کەسابەتەکەی سوودی پێ نەگەیاند و سزای ڕۆژی قیامەتی لێ دوور نەخستەوە، لە (إبن مسعود) (خوا لێی ڕازی بێت) باسکراوە، کە بەڕاستی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کاتێك بانگەوازی قەومەکەی کرد بۆ ئیمان و باوەڕ و ئاگاداری کردنەوە لە سزای ئاگر، (أبو لهب) ووتی: (ئەی برازاکەم ئەوەی کە تۆ دەیڵێیت ڕاست و حەق بێت، ئەوا بەڕاستی من خۆم و ماڵ و منداڵم فیداو بە قوربانی ئاگری دۆزەخ دەکەم لە ڕۆژی قیامەت)[٧٠١]

* ئینجا خوای گەورە ڕوونی کردەوە، کە بەڕاستی ماڵ و سەروەت و کارەکەی لە ڕۆژی قیامەتدا سوودی پێ ناگەیەنێت.

---

٦٩٨-الجامع لأحكام القرآن للقرطبي ٢٠: ٢٣٦-٢٣٧.

٦٩٩-الكشاف للزمخشري ٤: ٨١٤ بەدەستکاری یەوە.

٧٠٠-حاشية الجمل ٤: ٦٠١ و حاشية الصاوي ٤: ٤٩٥.

٧٠١-تفسير القرآن العظيم لأبن كثير ٤: ٥٦٤.

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿لَن تَنفَعَكُمْ أَرْحَامُكُمْ وَلَا أَوْلَادُكُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ يَفْصِلُ بَيْنَكُمْ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ﴾ (الممتحنة:٣) (پێشتر ماناکراوە).

لە ئایەتێکی تردا دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا لَوْ أَنَّ لَهُم مَّا فِي الْأَرْضِ جَمِيعًا وَمِثْلَهُ مَعَهُ لِيَفْتَدُوا بِهِ مِنْ عَذَابِ يَوْمِ الْقِيَامَةِ مَا تُقُبِّلَ مِنْهُمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ (٣٦) يُرِيدُونَ أَن يَخْرُجُوا مِنَ النَّارِ وَمَا هُم بِخَارِجِينَ مِنْهَا وَلَهُمْ عَذَابٌ مُّقِيمٌ﴾(المائدة:٣٦-٣٧).

واتە: (بێگومان ئەوانەی بێباوەڕ بوون، ئەگەر هەرچی سامانی زەوی هەیە هەیانبێت و ئەوەندەی تریشی لەگەڵ بێت و بیانەوێت خۆیانی پێ ڕزگار بکەن لە سزای ڕۆژی قیامەت، لێیان وەرناگیرێت، ئەوانە سزایەکی بە ئێشیان بۆ ئامادە کراوە (دەبێت تیایدا گیر بخۆن) ئەوانە دەیانەوێت لە دۆزەخ دەرچن (بەڵام خەیاڵیان خاوە) لەکاتێکدا دەرچونیان لێی نییە، ئەوانە سزایەکی بەردەوامیان بۆ ئامادەیە).

هەروەها خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿يَوْمَ لَا يَنفَعُ مَالٌ وَلَا بَنُونَ (٨٨) إِلَّا مَنْ أَتَى اللَّهَ بِقَلْبٍ سَلِيمٍ﴾ (الشعراء:٨٨-٨٩).

واتە: (ئەو ڕۆژەی نەماڵ سوود دەبەخشێت و (فریای ئادەمیزاد دەکەوێت) نە منداڵ و نەو، مەگەر کەسێك بە دڵ و دەروونی پاك و بێ گەرد و پڕ لە ئیمان بە خزمەت پەروەدگار گەیشتبێت).

﴿سَيَصْلَىٰ نَارًا ذَاتَ لَهَبٍ﴾ لە ڕۆژی قیامەتدا دەخرێتە ناو ئاگرێکەوە کە بڵێسەکەی توند و بەتینە و سزاکەی زۆر سەختە.

- تێبینی ئەوە بکە کە پەیوەنی لە نێوان (کنیة)ەکەی (ابو لهب) و چارەنوسەکەیدا ﴿سَيَصْلَىٰ نَارًا ذَاتَ لَهَبٍ﴾ هەیە، کە هەردووکیان چۆن لەگەڵ یەکدا ڕێك کەوتوون ئەمەیش بەلاغەی بەهێزی تیایە.

## لایەنێك لە ئیعجازی قورئانی

ئەگەر (ابو لهب) موسوڵمان ببوایە یان ژنەکەی موسوڵمان ببوایە، ئەوا دەیانتوانی بەڵگەیەکی زۆر بەهێز بهێنن بە پێچەوانەی ئەوەی کە لە قورئاندا هاتبوو، بەڵام هەردووکیان لەسەر کوفر و بێباوەڕییەکەیان مانەوە و کەللەڕەقییان نواند، هەتا خوای گەورە لەناوی برد. لەمەیشدا بەڵگەیەکی ڕوون و جوان هەیە لەسەر ڕاستی ئەوەی کە لە قورئاندا هاتووە.

* (إبن كثير) لە تەفسیرەکەیدا دەڵێت: (زانایان وتوویانە: لەم سوورەتەدا موعجیزەیەکی گەورە و ئاشکرا و بەڵگەیەکی ڕوون و دیار هەیە لەسەر پێغەمبەرایەتی، بەڕاستی پێغەمبەر (ﷺ) لەو کاتەی کە ئەم ئایەتە دابەزی ﴿سَيَصْلَى نَارًا ذَاتَ لَهَبٍ (٣) وَامْرَأَتُهُ حَمَّالَةَ الْحَطَبِ (٤) فِي جِيدِهَا حَبْلٌ مِّن مَّسَدٍ﴾. ئایەتەکان هەواڵی ئەوەیان دا کە (ابو لهب) و ژنەکەی بەدبەخت و چارە ڕەش دەبن و ئیمان ناهێنن، و چاوەڕێی ئەوەیان لێ نەکرا کە ئیمان بهێنن، تەنها یەکێکیشیان، نەبە نهێنی و نە بە ئاشکرا، نەبە شاراوەیی و نە لەبەرچاوی خەڵك، بەڕاستی ئەمەیش لە بەهێزترین بەڵگە ڕوون و دیارەکان بوو لەسەر پێغەمبەرایەتی ﴾.[٧٠٢]

﴿وَامْرَأَتُهُ حَمَّالَةَ الْحَطَبِ﴾ واتە: ژنەکەیشی دڕك و داڵی هەڵدەگرت و لە بەردەم ماڵی پێغەمبەردا (ﷺ) بڵاوی دەکردەوە، کە ئازار بوو بۆی، و بەڕاستی سزاکەی لە ڕۆژی قیامەتدا وەك شێوەی کارەکەی دنیای دەبێت، کە دڕك و داڵ و سوتەمەنی لەسەر پشتی هەڵدەگرێت لە ناو ئاگری دۆزەخدا، بۆ ئەوەی ئاگرەکە گەرمییەکەی زیاتر بێت و بڵیسە و تینی زۆرتر بێت لەسەر خۆی و لەسەر مێردەکەی، کە فووی ڕق و قینی دەکرد بە

---

٧٠٢-تفسير إبن كثير ٤: ٥٦٥ بەدەستکاری یەوە.

دەرونیدا و ئاگری تورەیی هەڵدەگیرساند و خۆشی دەکرد و هانی بەدا کە زیاتر حەسودی بە پێغەمبەر بەرێت و زیاتر بێزاری دەردەبری و زیاتر ئازاری دەدا.

– وتراوە: (أم جميل) بەناو خەڵکدا دەڕۆیشت و قسەی دەهێنا و قسەی دەبرد و ئاگری فیتنە و دوژمنایەتی خۆش دەکرد لە نێوانیاندا هەروەك ئاگر کە چۆن گڕ و بڵێسەی زیاد دەکات و گەرمی تین دەسەنێت، کاتێك کە دار و سوتەمەنی تیٚ دەخەیت.

* (القرطبي) دەڵێت: (إبن عباس) و (مجاهد) و (قتادة) وتوویانە: ﴿حَمَّالَةَ الْحَطَبِ﴾ واتە: لەنێوان خەڵکیدا دەڕۆیشت و قسەی دەهێناو قسەی دەبرد.

هەروەها (اكثم بن صيفي) بە کوڕەکەی دەڵێت: (خۆتان لە قسە هێنان و قسە بردن بپارێزن، بەڕاستی سوتێنەری دڵە، و کەسی قسە هاورد و برد لە ماوەیەکی کورتدا کاری وادەکات کە جادووکەر لە مانگێکدا نایکات.

وتراوە: (ئاگری ڕق و کینە ناکوژێتەوە) و پێغەمبەرە خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (کەسی قسە هاورد و برد ناچێتە بەهەشتەوە). [703]

وتراوە: ﴿حَمَّالَةَ الْحَطَبِ﴾ واتە: تانە و تەشەری لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەدا، بە هەژاری). [704]

وتراویشە: ﴿حَمَّالَةَ الْحَطَبِ﴾ واتە: هەڵگری تاوان و گوناه بوو، کاتێك دار و سوتەمەنی ئاگر هەڵگیرسێنێت، ئەوا تاوان و گوناه خاوەنەکەی دەخاتە دۆزەخەوە، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿قَدْ خَسِرَ الَّذِينَ كَذَّبُوا بِلِقَاءِ اللَّهِ حَتَّى إِذَا جَاءَتْهُمُ السَّاعَةُ بَغْتَةً قَالُوا يَا حَسْرَتَنَا عَلَى مَا فَرَّطْنَا فِيهَا وَهُمْ يَحْمِلُونَ أَوْزَارَهُمْ عَلَى ظُهُورِهِمْ أَلَا سَاءَ مَا يَزِرُونَ﴾(الأنعام:٣١).

واتە: (خراپەکاران هەموو تاوان و گوناهیان داوە بە کۆڵیاندا، ئاگاداربن کە چەندە خراپە کۆڵ و باری وا کە هەڵی دەگرن).

---

٧٠٣–أخرجه البخاري في صحيحه عن حذيفة بن اليمان كتاب الأدب.

٧٠٤–الجامع لأحكام القرآن ٢٠: ٢٤٠ بەدەستکاری یەوە.

﴿فِي جِيدِهَا حَبْلٌ مِنْ مَسَدٍ﴾ ووشەی (الجید) واتە (العنق) مل و گەردن، ﴿فِي جِيدِهَا﴾ واتە لە مل و گەردنیدا. (المسد) بریتی بوو لە (حبل) یێك لە موو یان لە خوری. [٧٠٥]

(سعیدی کوڕی (المسیب) دەڵێت: ملوانکەیەکی جوانی هەبوو کەشخە بوو، ئینجا (أم جمیل) سوێندی خوارد کە بیبەخشێت لە پێناو دووژمنایەتی کردنی (محمد)دا، خوای گەورە بۆی گۆڕی بە(حبل)ێك لە گەردنیدا لە (مسد) زنجیری ئاسنی ئاگری دۆزەخ. چونکە سزاکە لە جۆری کارەکەی دەبێت. [٧٠٦]

ڕاو بۆچوونی جیاوازی زۆر دەربارەی ئەو حەبلە هاتووە کە لە گەردنی (أم جمیل)دا بووە.

- (الشیخ سعید حوی) دەڵێت: (بۆچونی لە پێش و دروست بریتییە لەوەی کە ئاماژە کراوە بۆ جۆرێك لە سزا دانەکەی لە ڕۆژی قیامەتدا، کە حەبل و گوریسێکی ئاگرین یان زنجیرێك بووە کە حەفتا (ذراع) قۆڵ درێژ بووە یان ملوانکەیەك بووە لە ئاگر دروستکراوە). [٧٠٧]

- ئێمەیش دەڵێین: لەم سزایەدا ئیهانە و سوکایەتی و ئازاری تیایە هەروەها ئازارێکی (حسي) هەستی یە و لەهەمان کاتیشدا ئازارێکی مەعنەوییە.

(الجید) بەشێکە لە جوانییەکانی لەشی ئافرەت و جێگای سەرنج و ئارەزووەکانە، لەگەڵ ئەوەی کە بەملوانکەو بابەتی ڕازاندنەوەی گرانبەها دەڕزێنرێتەوە، جوانییەکەی زیاد دەکات.

ئەگەر ئافرەت هەوڵ بدات لە ڕازاندنەوەی (جید) مل و گەردانی خۆیدا بە بابەتی ڕازاندنەوەی گرانبەها، ئەوا بەڕاستی (أم جمیل) لەڕۆژی قیامەتدا بابەتی ڕازاندنەوەی نابێت بێجگە لەو حەبلە ئاگرینە کە گەمارۆی مل و گەردانی دەدات، ئەمەش سوکایەتی و ئیهانە و سەر شۆڕی یە بۆی.

---

٧٠٥-لسان العرب ٦: ٤١٩٩ بەکورتی.

٧٠٦-تفسیر القرآن العظیم لأبن کثیر ٤: ٥٦٤ بەدەستکارییەوە.

٧٠٧-الأساس في التفسیر ١١: ٦٧٤٢ بەدەستکارییەوە.

## چوارەم: مانای گشتی

ئەم سوورەتە پیرۆزە، سوورەتی (المسد) بەهەڕەشەیەکی توند و سەخت بۆ (ابی لهب) دەستی پێکردووە کە بەخیلی و حەسودی و لە خۆبایی بوون و خۆبەگەورەزانین پاڵنەری بوون بۆ دژایەتی کردن و ڕێگە گرتن لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەڕاستی لەناوچون و خەسارەتمەندی و سەر شۆڕی و لەناوچوون لە دنیا و لە قیامەتدا شیاوی خۆی بوو.[٧٠٨]

﴿تَبَّتْ يَدَا أَبِي لَهَبٍ وَتَبَّ (١) مَا أَغْنَىٰ عَنْهُ مَالُهُ وَمَا كَسَبَ﴾ پاشان سوورەتەکە دەربارەی هاوبەش و یارمەتی دەرەکەیشی دەدوێت لەو شاڵاوی دژایەتی کردنە ڕقاوییەدا، کە (أم جمیل) بوو، ئەو ئافرەتە بوو، کە ڕق وکینە چواردەوری دڵی گرتبو و تەنیبویەوە، ئەوەش بەهۆی قسەی خراپ و جنێوەوە لەسەر زمانی دەرکەوتبوو، هەروەها لەسەر سلوك و ڕەفتارەکانیشی ڕەنگی دابوویەوە، بە ناپەسەند دەرکەوت، و لەپشتی (أبو لهب)ەوە ڕادەوەستا، ژەهری پیسی خۆی فوو دەکرد بە گیانیدا و پاڵی دەنا بۆ دوژمنایەتی کردن و ئازاردان و ڕێگە گرتن لە بانگەوازی حەق و ڕاستی. کەسە نزیکەکەی (إبی لهب) لەم شاڵاوەدا، کەسی نزیکیشی دەبێت لە ئاگری دۆزەخدا.

٧٠٨-مێژوو باسی ئەو مردنەی (أبو لهب) ی بۆ کردوین، کە شێوەیەکی بێزاوی هەبوو تووشی دەرد و نەخۆشییەك هات، پێی دەوترا: (داء العدسة)کە بریتی بوو لە جۆرە برینێك کە هەموو جەستەی دەگرتەوە و زوو بڵاودەبویەوە، (أبولهب) دوای سەرکەوتنی موسڵمانان لە جەنگی(بدر)دا، تووشی ئەم نەخۆشییە هات، هەروەها تووشی حەسرەت و پەشیمانی و داخ هەڵکێشان و خەم و پەژارە هات، کاتێك تووشی ئەم دەردە هات کەس و کار و هۆزەکەی خۆیان لێ بە دوور دەگرت، حەوت شەو مایەوە بە تەنها، کە خەفەتبارو خەمۆك و حاڵ تێك چوو بوو، و کەس بایەخی پێ نەدەدا، هەتا لەناوچوو، و سێ ڕۆژیش مایەوە، کەس نزیکی تەرمەکەی نەدەکەوتەوە، کاتێك تەرمەکەی بۆگەنی کرد ئینجا کوڕەکانی ترسان تووشی قسە پێوتن و ئابڕوچوون بێن، ئەگەر وازی لێ بهێنن، بەبێ شاردنەوەی چاڵێکیان بۆ هەڵکەند و خستیانەوە ناویەوە بەهۆی لقەدارێکەوە، هەتا کەوتە نا و چاڵەکەوە، پاشان لە دوورەوە بەردیان فڕێدەدایە سەری تا تەرمەکەی بشارنەوە، وەك ئەوەی لێ هاتبوو کە بەردبارانی بکەن و دایپۆشن بەو بەرد بارانە. هەر بەو جۆرە ئەو پیاوە حەسود و ڕق لە دڵە دەمرێت بە خەم و خەفەت و ڕق و بێزارییەوە . یراجع سیرە إبن هاشم، ١: ٦٨٧-٦٨٨ والرحیق المختوم: ٢٦٤-٢٦٦.

﴿وَامْرَأَتُهُ حَمَّالَةَ الْحَطَبِ﴾ ئەم ناوەیشی (کنایة) بوو لەباتی ئەوەی کە قسەی دەهێناو دەبرد بۆ دژایەتی و ڕق دروست کردن بڵاوی دەکردەوە لەناو خەڵکیدا، وتراوە: دەربڕینێك بووە بۆ بەخیلیەکەی بە جۆرێك کە بەسەر پشتی دڕك و داڵ و سوتەمەنی دەهێنا، یان بە سەر سەری دەیهێنا، لەگەڵ ئەوەیشدا کە هێندە ماڵ و سامان و دارایی هەبوو کە بەشی بکات تا بەم کارانە هەڵنەسێت، و دەیتوانی کەسێك بۆ ئەم کارە بەکرێ بگرێت.

وتراوە: ئەمە هەواڵێك بووە لە دوژمنایەتییەکەی بەرامبەر پێغەمبەری خوا (ﷺ) و ئازار دانەکانی بۆی و دڕك و داڵی لەبەردەم ماڵەکەیدا بڵاو دەکردەوە.

﴿فِي جِيدِهَا حَبْلٌ مِّن مَّسَدٍ﴾ واتە لەمل و گەردنیدا حەبلێکی ئاگرین هەیە لەدۆزەخدا، کە سزا و ئازار و سەرشۆڕی و ئیهانەکەی زۆر بوو، کە دەچوو بۆشاخ حەبلێکی دەبرد و دەیئاڵاند بە ملیدا، لە ڕۆژی قیامەتیشدا حەبل دەخەنە ملی لەئاگر دروست کراوە کە سزایە بۆ کوفر و بێ باوەڕییەکەی، کە هەموو دڵی داگیر کردبوو.

و سۆز و بەزەیی و میهرەبانی لەدڵی دەرکێشرا بوو، و چاوی لە ئاستی ڕاستییەکان کوێر بوو بوو، و عەقڵیشی لەکار کەوتبوو، بەڕاستی (أم جمیل) نموونەیەکی خراپ و بەد بوو بۆ ئافرەتانی ڕق لەدڵ وحەسود، کەڕق وقین لەسنوری دەرکرد بوو و حەسویش چاوی کوێر کردبوو.

## کۆتایی

چیرۆکە قورئانییەکان، هەواڵ دانە لە خوای گەورە لە کتێبە پیرۆزەکەیدا دەربارەی حاڵی گەلە پێشووەکان و پێغەمبەرانی پێشوو و ڕووداو و کارەساتەکانی سەردەمی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەوانەیش وەك باسکردنی قورئان بۆ مەسەلەی (إسراء و معراج) شەو ڕەویی و بڵندبوونەوە، و کۆچ و جەنگەکانی (بدر و ئوحودو (الاحزاب) و پەیمانی حودەیبیەو جەنگی حونەین وتەبوك و هەروەها باسی قورئان دەربارەی کاری هاوسەرداری

